# تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز

بەرگی بیست وشەشەم

سوورەتەکانی

(الدخان) و (الجاثیة) و (الاحقاف) و (محمد)

عەلی باپیر

# تەفسیری سوورەتەکانی

# الدُّخَانُ و الجَاثِيَةِ و الأَحْقَافِ و مُحَمَّدٍ

نووسینی : عەلی باپیر

دیزاینی ناوەوە : زەردەشت کاوانی

چاپی یەکەم ١٤٤٣ك - ٢٠٢١ز

٧٨٠ لاپەڕە

١٧* ٢٤ سم

بابەت : ئایینی

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان - هەرێمی کوردستان

ژمارە سپاردنی ( ٧ ) ی ساڵی ٢٠١٢ پێدراوە

# پێشەکی ئەم تەفسیرە بەگشتیی

إنَّ الحَمْدَ للَّهِ نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعِينُهُ، وَنَسْتَغْفِرُهُ، وَنَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْ شرُورِ أَنْفُسِنَا، وَمِنْ سَيئَاتِ أَعْمَالِنَا، مَنْ يَهْدِه اللَّهُ فَلاَ مُضِلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضلِلْ فَلاَ هَادِيَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَن لاَ إلَهَ إلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسولُهُ.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴿١٠٢﴾ ﴾ آل عمران.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُوا۟ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَآءً ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ٱلَّذِى تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلْأَرْحَامَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا ﴿١﴾ ﴾ النساء.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَقُولُوا۟ قَوْلًا سَدِيدًا ﴿٧٠﴾ يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَٰلَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا ﴿٧١﴾ ﴾ الأحزاب .

أمَّا بَعْدُ: فإنَّ أَصْدَقَ الحَديث كَلامُ اللَّه، وَخَيْرَ الْهَدِي هدْيُ مُحَمَّد ﷺ وَشرَّ الأُمُورِ مُحْدَثاتُها، وَكُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَة، وَكُلَّ بِدْعَةٍ ضَلاَلَةٌ، وَكُلَّ ضَلاَلَةٍ فِي النَّار[١].

**خوێنەرە بەڕێزو خۆشەویستەکان!**

هیچ گومانی تێدانیە - بۆ مرۆڤی بڕوادار - کە ئەو تەمەنەی لە خزمەت دوایین کتێبی خوا (قورئان)دا بەسەردەبرێ، جا بە هەر شێوەیەك لە شێوەکانی لە خزمەتدابووندا بێ؛ خوێندنەوە، تێفکرین و ڕامان، فێرکردن، کارپێکردن ... هتد، بە باشترین جێگرتن جێگا دەگرێ و، خاوەنەکەی لە دنیاو دوارۆژدا لێی بەهرەمەندە.

---

(١) ئەوە پێی دەگوترێ: (خطبة الحاجة) کە پێغەمبەر ﷺ هاوەڵانی بەڕێزی فێردەکرد، پێش هەر قسەیەکی گرنگ، بیڵێن، وەك وتاری جومعەو داخوازییکردن (خِطْبة)و... هتدو، ئەم وتارە، هەرکام لە: الترمذي: (١١٠٥)، النسائي: (١١٠٤)، ابن ماجه: (١٨٩٢) أحمد: (٣٧٢٠)، الطَّبراني: (٢٤١٤) هێناویانەو (مسلم)یش بەشێکی هێناوە.

منیش - کە وەك باسکردنی چاکەی خوا (**التحدّث بنعمة اللّه**) دەیخەمەڕوو- لەوەتی فامم کردۆتەوە، خوای بەبەزەیی و بەخشەر چاکەی لەگەڵ کردووم و، بە فەرمایشتی بەرزو بێ وێنەی خۆیەوە سەرگەرمی کردوومو، بەر لە تەمەنی بیست ساڵیی یەوە هیدایەتی داوم، کە قورئانی بەرێزو پێز لەبەر بکەم و، سەرقاڵی خوێندنەوەی تەفسیرەکانی قورئان و تێوەرامانی ئایەتە پڕ بەرەکەتەکانی و، لێوردبوونەوەیان بم.

هەر بۆیەش تێکڕای کتێب و نامیلکەو وتارو دەرسەکانم، کەم و زۆر لەبەر ڕۆشنایی قورئان دابوون، کە دیارە هەر ئەمەش شتێکی سروشتییە؛ ئاخر ئایا ئیسلام بێجگە لە قورئان پاشان سوننەتی پێغەمبەر ﷺ، کە ئەویش هەر ڕوونکردنەوەی قورئان و چۆنیەتی جێبەجێکردن و کارپێکردنیەتی، شتێکی دیکەیە؟! بێگومان نەخێر.

ئنجا لەمێژ ساڵیش بوو، کە براو خوشکانێکی دڵسۆزی نزیك و ئاشنام، داوایان لێدەکردم کە دەست بکەم بە دانانی تەفسیرو لێکدانەوەیەکی قورئان، هەتا لە ڕەمەزانی ساڵی (١٤٢٨)دا هاتە دڵمەوە، کە ناوی خوای لێبهێنم و دەست بەو کارە گەورەو گرنگە بکەم، بەڵکو وردە وردە بەپێی بوارو دەرفەت، هەرساڵە هەندێکی لێ ئەنجام بدەم، لەگەڵ سەرقاڵیی زۆرو جۆراو جۆریشدا، هەتا دەرفەتێکی وام بۆ دەڕەخسێ کە بتوانم خێرایی تێدا بکەم و خۆمی بۆ یەکلایی (**متفرّغ**) بکەمەوەو، خوا پشتیوان بێ تەواوی بکەم، ئەگەر تەمەن بەبەریەوە مابێ.

سەرچاوەی دانانی ئەم تەفسیرو لێکدانەوەیەشم، وێڕای سەرنجدانی زۆربەی ئەو تەفسیرانەی کە باون و، دەستم پێیان گەیشتوە، بریتیە لە وردبوونەوەو تێوەرامانی خۆم لە خودی قورئان، چونکە بێگومان قورئان: هەندێکی هەندێکی ڕوون دەکاتەوە: (**القرآن يُفَسِّر بَعضُهُ بَعْضَاً**)، پاشان سوننەتی پێغەمبەری خوا ﷺ چونکە پێغەمبەری خواش ڕوونکەرەوە (مُبَيِّن)ی قورئانە، وەك خوا ﷻ فەرموویەتی:

﴿ ...وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٤٤﴾ ﴾ النحل.

واتـە: هەروەهـا زیکرمـان بـۆ لای تـۆ ناردۆتـە خـوار، تاکـو ئـەوەی بـۆ خـەڵکی نێرراوەتـە خـوار، بۆیـان ڕوون بکەیـەوە، وە بەڵـکو خۆشـیان بیـربکەنەوە.

ئومێدیشـم وایـە - بـە یارمـەتی خـوای بەخشـەر ﷻ - شـایسـتەیی ئـەوەم هـەبێ تەفسـیـرو لێکدانەوەیەکی وا بۆ قورئـان پێشـکەش بە مسـوڵمانانی کوردسـتان بکەم، کـە لـە قورئـان بوەشـێتەوەو، مایـەی بەهـرەو سـوودی خوێنـەران بـێ، بەتایبـەتیش کـە زیاتـر لـە سـی (٣٠) سـاڵە لەگـەڵ قورئـانی بـەرزو مـەزن و تەفسیـرەکانی و کتێبەکانی سـوننەتدا خـەریکم و، دەیـان کتێـب و بەرهـەمی جۆراوجـۆرم لـە زۆربـەی بـوارەکانی زانسـتەکانی شـەریعەتدا پێشـکەش کردوون.

شـایانی باسیشـە کـە ئەو بیسـت و دوو مانگ زیندانیـی کرانەم لەلایـەن ئەمریکاوە - لـە (٢٠٠٣/٧/١٠ تاکـو: ٢٠٠٥/٤/٢٨) - دەرفەتێـکی گـەورەو گرنـگ بـوو، بـۆ زیاتـر پێدا قووڵـبوونەوەی کتێبـی خـوا (تبـارك و تعالـی) و، بۆ پەیدابوونی تێگەیشـتنی تایبـەت لەبـارەی زۆرێـك لـە ئایەتـەکانی یـەوە، ئـەم ڕاسـتییەش لـە مەوسـووعەی: (**الإسـلام كـما يتجـلّى فـي كتـاب اللّـه تعالـى**)دا زۆر چـاك دەروشـاوەتەوە[1]، بـەڵام هـەڵبەتە ناڵـێم و هیچکەسیش بـۆی نیـە بڵـێ: کـە ئـەم تەفسیرەی من تێروتـەواوە، چونکـە وێـڕای سـنووردارbوونی توانـاو بڕسـتم، لـە بەرانبـەر کتێبـی لـە هـەموو ڕوویێکـەوە ڕەهـا (مطلـق)و بێسـنوور (لا محـدود)ی خـوادا، نەشـمویسـتوە کـە زۆر بەمـلاولادا بچـم و بچمـە نێو هـەندێك وردەکارییەوە، کە یان من تێیـدا پسپۆڕو

---

(١) ئەو مەوسـووعەیە کە ئێسـتا چـاپ کراوەو، کەوتۆتـە بەردەسـتی خوێنەران و، سـەرجەم هەشـت بەرگ و دەوری سـێ هـەزارو پێنج سـەد (٣٥٠٠) لاپەڕەیەو، هـەوڵـمداوە بەگشـتی تێیـدا باسـی سـەرجەم لایەنـەکانی ئیسـلام بکـەم و، تاکـە سـەرچـاوەشم قورئـان بـووە، وێـڕای دەقـەکانی سـوونەت، کـە لـە هـۆش (ذاکـرة)دا بـووون.

شـایانی باسـە ئەو مەوسـووعەیە لە چاپی دووەمی دا، کراوە بە دوازدە (١٢) کتێبـی سـەربەخۆ، بە مەبەستی ئاسـانتـر سـوود لێ بینـرانی .

شـــارەزا نیم، یـان خوێنـــەر پێویســـتی پێـی نیـە، لـە کاتێکـدا دەیـــەوێ لـە قورئان تێبگات و، بزانـێ خـوا (تبـارك وتعـالـى) ڕاسـتەوخۆ چـی پـێ فـــەرمووە؟!

ئنجـا هــەر لێرەشـەوە بە پێویسـتی دەزانم پڕ بە دڵ سـوپاسی ئەو بـرا گەنجە ڕووح سـووك و گـورج و گـۆڵ و دڵسـۆزە بکـەم (حـەزی نەکـرد نـاوی بهێنـم)، کـە هـەڵسـا بـە نووسـینەوەو هێنـانە سـەر کاغـەزو، پاشـان تایپکـردن و دوایـی پێداچوونـەوەو هەڵەگیـریی، سـەرجـەم ئـەم زنجیـرە دەرسـە، کـە لـە ئەسـڵدا لـە شێوەی وتـار (محـاضرة)دا پێشـکەش کراون، هــەروەها هـەڵسـا بـە (تخریج)ی سـەرجەم دەقەکانی سـوننەت، لـە سـەرچاوە متمانـە پێکراوەکانـەوەو، زەحمـەت و ماندووبوونێـکی زۆری بـە سـەرجەم بەرگـەکانی ئـەم تەفسیـرەوە کێشـــاوە، خـــوا بـە باشتـرین شـــێوە پاداشـتی بداتـەوەو، هــەر صـاڵح و سـاغ و سـەلامەت و سـەربەرزبێ[1]، لـە خـوای بـەرزو بێهـاوتاش داواکارم ئـەو جـۆرە گەنـج و لاوانـە لـە کـوڕان و کچـان، لەنێـو گەلەکەمانـدا، زۆر بـکات .

شـایانی باسیشـە کـە ئێمـە لـەم تەفسیـرەماندا، بـاسی بـەش (جـزء)ەکانی قورئـان و دابەشـکردنەکانی دیکـەی وەك: - (حـزب) - ناکەیـن، چونکـە هــەر ســوورەتێك بۆخـــۆی شـــتێکی ســەربەخۆیـــەو، سـەرجەم ئایەتـەکانی وەك ئاڵقـەکانی زنجیرێـك پێکـەوە پەیوەسـتن و، ئاشکراشـە کـە دابەشـکرانی سـەرجەم قورئـان بـۆ سـی (٣٠) بـەش (جـزء) و شەســـت (٦٠) (حـزب)، شـتێکە لەلایـەن زانایانـەوە کـراوە، بـۆ ئاسـانکاریی خوێنـدنی قورئـــان، دیـارە ئێمـە لـە دابەشـکردنی بەرگـەکانی ئـەم تەفسـیـرەشـدا، دیسـان حیســـاب بـۆ بەشـەکان (أجـزاء)ی ناکەیـن و، بـە گوێـرەی ســوورەتەکان، بەرگــەکانی دیـاریی دەکەیـن.

---

(١) ئـەو بـــرا دڵســۆزە ئێســـتاش پاش تەواوکردنـی زۆربـەی قورئـان، لێبڕاوانـە بەردەوامـە و عەزمیشـی جـەزم کردوە، کە ئەگەر تەمەنمـــان بەردەوام بێ، هەتـــا کۆتـــایی ئەم تەفسیـــرە ســەرگەرمی کارەکـەی بێ .

دوا قسـەشـم ئەوەیـە کە:

ئـەم تەفسـیرە - وەك پێشـتـر گوتمـان - لـە ئەسڵدا بەشـێوەی دەرس و وتـار پێشـکەش کـراوە، بـەڵام دواتـر خـۆم دووجـار بـە وردیـی پێیـدا چوومـەوەو، بەپێـی پێویسـت دەسـتکارییم کـردوە، دیـارە هــەموو دەرسـێکیش بەنـاوی خـواو سـتایشی خـوا ﷻ دەسـتی پێکـردوە، بـەڵام ئێمـە لـە سـەرەتای دەرسـەکانەوە، ئەوانەمـان لابـردوە، بـۆ زۆر دووبـارە نەبوونـەوەو، ئـەو (خطبـة الحاجـة)یەی لـە سـەرەتای ئـەم پێشـەکەییەوە هاتـوە، لەجیـاتی سـەرجەم دەرسـەکانە.

سُبْحَانَ رَبِّكَ رَبِّ الْعِزَّةِ عَمَّا يَصِفُونَ،

وَسَلامٌ عَلَى الْمُرْسَلِينَ، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ .

دووشەممە ٢٥ رجب ١٤٣٢

٢٠١١/٦/٢٧

هـەولـێر

# بەرچاو ڕوونییەکی گرنگ
# لەبارەی ئەم تەفسیرەوە

**خوێنەری بەڕێز !**

هەرچەندە لە (پێشەکی گشتیی) ئەم تەفسیرەدا باسمان کردوە کە بۆ نووسینی ئەم تەفسیرە، لە هەموو ئەو تەفسیرە باوانەی دەستم پێیان گەیشتوە، بەهرەمەندبووم، هەروەها لە کۆتایی هەر بەرگێکی ئەم تەفسیرەدا، سەرجەم ئەو تەفسیرانەی کەم و زۆر لێیان سوودمەند بووم، ناوەکانیانمان بە ڕیز نووسیون، بەڵام لێرەش وەك جەختکردنەوەی زیاترو بەرچاوڕوونیی باشتر بۆ ئێوەی بەڕێز دەڵێم :

مادام ناوی تەفسیرەکانمان نووسیوە، نە پێویست دەکات و نەدەشگونجێ، بۆ هەر تێگەیشتن و بیرۆکەیەك، کە زۆربەی تەفسیرەکان لەبارەی ئایەتێکەوە، یان ڕستەو بڕگەیەکی ئایەتێکەوە، دەیهێنین، ئێمە هەموو جارێ ناوی ئەو تەفسیرانە بێنین، بەڵام بێگومان هەر کات بیرۆکەو تێگەیشتنێکی تایبەتی یەکێك لە تەفسیرەکان هەبێ و بکەوێتە بەرچاوم، ئنجا چ پەسندی بکەم، چ ڕەفزی بکەم، هەر کات بە پێویستی بزانم، بە تایبەت ئاماژەی پێدەکەم، ئەگەرنا بە ئاماژەی گشتیی و بە نووسینی ناوی تەفسیرەکان لە کۆتایی هەر بەرگێك دا، ئیکتیفا دەکەم و، زۆریش لە ئەمانەتی زانستیی (الأمانة العلمیة) دەخەفتێم و مەبەستمە ڕەچاوی بکەم، چونکە ئەمینیی و ئەمانەت پارێزیی، ڕەوشتێکی گەورەو بەرزی مسوڵمانەتییە .

شایانی باسیشە جاری وا هەیە بیرۆکەو تێگەیشتنێکی تایبەتیی خۆمم، دەربارەی کۆمەڵە ئایەتێك یان ئایەتێك یان ڕستەو بڕگەیەکی ئایەتێك، بۆ دروست دەبێ، وەك تێگەیشتن و بۆچوونی خۆم دەینووسم، کەچی ڕەنگە لە تەفسیرەکانی

دیکەش - یەکێکیان یان زیاتر - دا هەبێ، ئەویش بەهۆی ئەوەوەیە کە من ئەو تەفسیرەم نەکەوتۆتە بەر دیدە، یان دیتوومەو لەیادم نەماوە.

# پێشەکی ئەم بەرگە

**الحمدلله وحده، وصلوات الله وسلامه وبركاته على من لانبي بعده، محمد وآله السالكين سبيله والملتزمين دربه.**

خوێنەرە بەڕێز و خۆشەویستەکان!

ئەم بەرگە بەرگی بیست و شەشەم (٢٦)ە لە تەفسیری قورئانی بەرزوبەپێز و هەر چوار سورەتەکانی:

(**الدخان ، الجاثية ، الأحقاف ، محمد**)ی تێدان.

ئەم بەرگەش بەهەمان شێواز و نەخشەی بەرگەکانی پێشووی ئامادە کراوەو، وێڕای ڕوونکردنەوەی چەمک و واتای ئایەتە بەپێزەکانی هەرکام لەو چوار سووڕەتە بەحەوت قۆناغ، ژمارەیەك کورتەباسیش لەکاتی تەفسیرکردنی هەر کامیان دا خراونە ڕوو، بەم شێوەیەی خوارێ:

### یەکەم سووڕەتی (الدخان):

١- کورتەباسێك لەبارەی شەوی تێدادابەزێنرانی قوڕئانەوە.

٢- کورتەباسێك لەبارەی (البطشة الكبرى) وە.

٣- هەڵبژاردنی بەنوو ئیسرائیل و پێدانی هەژدە نیشانە و نیعمەت.

٤- کورتەباسێك لەبارەی گەلی توببەعەوە.

٥- وتو وێژێکی نێوان سوکرات و ئەرستۆدیۆس.

٦- سەرنجدانەوەیەکی سێ بەڵگەکەی هەبوونی سزا و پاداشت.

## دووەم: سوورەتی (الجاثیة):

١- کورتەباسێك: وریابوون لەبارەی هۆی هاتنەخوارەوەی ئایەتەکانەوە.

٢- چەند دەقێکی سوننەت لەبارەی قسە نەگوتن بە ڕۆژگار و شوێننەکەوتنی هەوا و ئارەزووەوە.

٣- دوو فەرموودەی پێغەمبەری خوا لەبارەی گەورەیی و مەزنیی خوا و تەنیا پەرستنیەوە.

## سێیەم: سوورەتی (الأحقاف):

١- کورتەباسێك لەبارەی: حیکمەتیی زۆر باسکرانی ئامانجی دروستکردنی گەردوونەوە.

٢- هەڵوەستەیەکی پێویست لەبەردەم مشت و مڕێکی نێوان مەڕوانی کوڕی حەکەم و (عبدالرحمن)ی کوڕی (أبوبکر الصدیق)دا لەسەر حوکمی میراتیی و بنەماڵەیی.

٣- کورتەباسێک لەبارەی بەهرە وەرگرتن لە ناز و نیعمەتەکانی دنیاوە.

٤- هەڵوەستەیەکی کورت لەسەر بێ ئیمانیی و کوژانەوەی چرای عەقڵ.

٥- سەرنجێک لەسەر گشتگیریی و فراوانیی مەبەستەکانی قورئان .

٦- قسەیەك دەربارەی (أولوا العزم).

## چوارەم: سوورەتی (محمد):

١- هەڵوەستەیەکی پێویست لەبارەی هەڵوەشاندنەوەی نەسخکرانەوەی ئەو ئایەتەوە (محمد-٤-).

٢- کورتەباسێك: بەدیلگرتن لە جەنگدا و چۆنیەتیی مامەڵە کردن لەگەڵیاندا.

٣- کورتەباسێك: بەکۆیلەکردنی مرۆڤ لەم ڕۆژگارەدا تاوانە و دژی شەریعەتە.

٤- چەند وردەکارییەکی ڕەوانبێژیی لەئایەتی (١٥ - محمد)دا.

٥- کورتەباسێك دەربارەی: پێویستبوونی پەیداکردنی زانیاریی لەبارەی پەرستراوێتی خواوە.

٦- کورتەباسێك دەربارەی چەسپاندنی حوکمی ئەو ئایەتانە بەسەر یەزیدی کوڕی موعاویە.

٧- کورتە سەرنجێك لەسەر هەڵوەشاندنەوەی کردەوەی باش.

٨- پێنج وردە سەرنج.

## لەکۆتایی پێشەکی ئەم بەرگی بیست و شەشەمەشدا دەڵێم:

هیـوادارم هەمـوو لایـەك لەکاتـی خوێندنـەوەی ئـەم بەرگـە و بەرگەکانـی دیکـەی ئـەم تەفسـیرەدا، هەوڵبـدەن بـە تەواویـی عەقـڵ و دڵـی خۆیـان فـراوان بکـەن و، پاکیشـیان بکەنـەوە لەهەرچـی بیـروڕاو قەناعەتـی پێشـوەختەیە و، خۆیـان وا لێ بکەن ئامادەیـی وەرگرتـن و تەبەنیـی کردنـی هـەر بیـروڕاو بۆچونێکـی تـازەی هەڵقـوڵاو لـە قورئـان و سـوننەتیان هەبـێ و ، ڕێ نـەدەن هیـچ بیرووبۆچونێکـی پێشـووی خـوو پێوەگیـراوو پێـوە ڕاهاتـوو و بـار پێوەگرتـوو، عەقـل و دڵیـان ببەسـتێ و ، ڕێـی بیرکردنـەوەی ئازادانـەو ئازایانەیـان لـێ بگـرێ و، ئـەو ڕاسـتییەش بهێننـەوە بیریـان کـە ئاییـن و بەرنامـەی خـوا لەوەحیـی خـوادا بەرجەسـتەیەو، بـەس وەحیـی خـوا بـۆ ئێمـە پابەندکـەر (ملـزم)ەو غەیـری وەحیـی، تەنیـا بـە تێگەیشـتن لەبـارەی ئیسـلامەوەو، ئەزموونکـردن و مومارەسـەکردنی لەسـەر ئـەرزی واقیـع دادەنـرێ.

سبحانك اللهم وبحمدك، أشهد أن لا إله إلا أنت أستغفرك وأتوب إليك

١٢ / جمادی دووەم / ١٤٤٣ ك - ٢٠٢٢/١/٢٤ ز

هـــــــەولـــێر

بەرێـــزان!

ئەمڕۆ کە (٢٢)ی (**جمادي الأول**)ی، ساڵی (١٤٤١)ی کۆچییە، بەرانبەر (١٧/ ١/ ٢٠٢٠) ی زایینی، لە شاری دێرینی هەولێر، خوا پشتیوان بێ دەست دەکەین بە تەفسیری سوورەتی (**الدخان**)، سەرەتا وەک عادەتی خۆمان لەم تەفسیرەدا، پێناسەو نێوەڕۆکی ئەم سوورەتە موبارەکە دەخەینە ڕوو، تاکو بەر لەوەی بچینە نێو درێژەو قووڵایی ڕوونکردنەوەی چەمک و مەبەستی ئایەتە موبارەکەکانی ئەم سوورەتە، دیمەن و هێڵە گشتییەکان و، چوارچێوەی ئەم سوورەتە موبارەکەمان لەبەر چاو بێ:

## نێوەڕۆکی سووڕەتی (الدخان) و بابەتەکانی

### یەکەم: ناوی ئەم سووڕەتە:

ئەم سوورەتە ناوی (**سورة الدخان**)ەو، پێنجەمین سوورەتە لە خاوەن حامیمەکان (**ذوات حميم**)، ئەوانەی کە بە (**حميم**) دەست پێ دەکەن، کە یەکەم سوورەتیان (**غافر**) بوو، دووەمیان (**فُصلت**) بوو، سێیەمییان (**الشورى**)، چوارەمیان (**الزخرف**)، پێنجەمیان ئەم سوورەتەو، شەشەمیشیان (**الجاثية**)و، حەوتەمیشیان (**الأحقاف**)ە، ئەم سوورەتە تەنیا ئەم ناوەی بۆ بەکارهاتوە: (**سورة الدخان**)، چ لە موصحەفەکاندا کە لە دێر زەمانەوە بە دەستی مسوڵمانانەوە بوون، چ لە سەرچاوەکانی سوننەتدا، هۆکارەکەشی هەر ئەوەیە کە وشەی: (**الدخان**)، لە ئایەتی ژمارە (١٠)ی ئەم سوورەتەدا هاتوە: ﴿ فَٱرْتَقِبْ يَوْمَ تَأْتِى ٱلسَّمَآءُ بِدُخَانٍ مُّبِينٍ ﴿١٠﴾ ﴾، واتە: چاوەڕێی ئەو ڕۆژە بە، کە ئاسمان دوو کەڵێکی ئاشکرا دێنێ، هەرچەندە وشەی (**الدخان**)، لە سوورەتی (**فصلت**)یشدا هاتوە، کە پێش ئەم سوورەتە دابەزیوە و، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰٓ إِلَى ٱلسَّمَآءِ وَهِىَ دُخَانٌ ﴿١١﴾ ﴾فصلت، واتە: خوا ﷻ ویستی ئاسمان دروست بکات، لەو کاتەدا، دووکەڵ بوو، بەڵام (**الدخان**) لێرەدا، وەک

نیشـانەیەکی خـوا ﷻ هاتـوە، وەک دوایـی باسـی دەکەیـن، خـوا ﷻ بـە پێغەمبـەر ﷺ دەفەرمـوێ: چاوەڕێبـە تاکـو ئاسـمان ئـەو دوو کەڵـە دێنـێ، زانایانیـش لـەو بـارەوە قسـەو باسـیان زۆر کـردوە، کـە مەبەسـت پێیـی چییـە؟!.

## دووەم: شوێنی دابەزینی:

ئـەم سـوورەتە مەککەییـە، واتـە: هەمـووی لـە مەککـە دابەزیـوە، لـەو کاتـەدا کـە پێغەمبـەر ﷺ لـە مەککـە بـووە، ئنجـا جـاری وا هەیـە سـوورەتەکان، یاخـود هەندێـک لـە ئایەتەکانیـان لـە دەرەوەی سـنووری جوگرافیـای مەککـەش دابەزیـون، بـەڵام هـەر لـەو قۆناغـەدا بـووە کـە پێغەمبـەر ﷺ جـارێ لـە مەککـە بـووە، پێـش کۆچکردنـی بـۆ مەدینـە، بۆیـە هـەر پێیـان دەگوتـرێ: مەککەیـی.

هەندێـک لـە زانایـان گووتویانـە: بـۆ وێنـە: (**الزمخشـري، والقرطبي**) ئـەو ئایەتە کە دەفەرمـوێ: ﴿ إِنَّا كَاشِفُوا۟ ٱلْعَذَابِ قَلِيلًا ۚ إِنَّكُمْ عَآئِدُونَ ﴿١٥﴾ ﴾الدخـان، واتـە: ئێمـە کەمێـک لابـەری ئازاریـن، بـەڵام ئێـوە دوایـی دەگەڕێنـەوە.

ئەمـە مەدینەییـە، بـەڵام هیـچ بەڵگەیەکیـان نەهێناوەتـەوە و، لـە ڕاسـتییدا ئـەم سـوورەتە موبارەکـە وا پێدەچـێ بـە پێـی ئێوەڕۆکەکـەی و بـە پێـی بابەتـەکانی، کـە لـە دەوری سـاڵانی (٨ و ٩)ی پێغەمبەرایەتییـدا، دابەزیبـێ، واتـە: چـوار، پێنـج سـاڵ پێـش ئـەوەی پێغەمبـەری خـوا ﷺ لـە مەککـەوە، وێـڕای هاوەڵەکانـی کـۆچ بـکات بـۆ شـاری (**یثرب**) کـە دوای کۆچکـردن، نـاوی لێـنرا (**مدينة**)، یـان (**مدينة الرسول**) واتـە: شـار، یـان شـاری پێغەمبـەر ﷺ.

## سێیەم: ڕیزبەندیی لە موصحەف و هاتنە خواردا:

ئــەم ســوورەتە لــە ڕیزبەندیــی دابەزینــدا ژمــارە: (٦٣)یــەو، پێــش ســوورەتی (**الجاثيــة**)و، دوای (**الزخــرف**) دابەزیــوە، واتــە: شــوێنەکەی ئێســتا لــە (**مصحــف**)دا،

چۆنــە، لــە ڕیزبەندیــی دابەزینیشــیدا هەمــان شــوێنی هەبــووە و، کەوتۆتــە نێــوان ســوورەتی (**الزخـرف**) و (**الجاثيـة**)وە، لـە ڕیزبەندیـی (**مصحـف**)دا، ژمـارە (٤٤)ە، واتـە: کـە لـە سـوورەتی (**الفاتحـة**)، لـە لای ڕاسـتەوە دەسـت پێـدەکات، (٤٤)میـن سـوورەتە.

## چوارەم: ژمارەی ئایەتەکانی:

بـۆ ژمـارەی ئایەتـەکانی ئـەم سـوورەتە، زیاتـر (٥٩) تەبەننیـی کـراوە، بـەڵام پێشـتر ڕاجیایــی هەبــووە: زانایــانی مەدینــەو، مەککــەو، شــام، پێیــان وابــووە (٥٦)ەو، لــە لایـەن زانایـانی (**بصـرة**)ەوە، (٥٧) دانـراوە، بـەڵام لـە لای زانایـانی (**کوفـة**)، کـە زیاتـر لــە (**مصحف**)کانــدا، ئــەوە تەبەننیــی کــراوە، (٥٩) ئایەتــە، پێشــتریش گوتوومانــە: جیاوازیـی لـە ژمـارەی ئایەتەکانـدا، دەگەڕێتـەوە بـۆ کورتیـی و درێژیـی ڕسـتەکان، کـە هەنـدێ لـە زانایـان ئایەتێکیـان کـردوە بـە دوو ڕسـتەو، بۆتـە دوو ئایـەت، بـەڵام هەندێکیـان بـە یـەک ڕسـتەیان هێنـاوە ئـەو ئایەتـە، بۆیـە بـە یـەک ئایـەت سـەرژمێر کــراوە، واتــە: جیاوازیــی ژمــارەی ئایەتــەکان، ناگەڕێتــەوە بــۆ ئــەوەی زانایــەک گوتبێتـی: ئـەو ئایەتـە قورئانـەو، ئـەوەی دیکـە گوتبێتـی: نەخێـر، ئـەم ئایەتـە قورئـان نیـە، چونکـە زانایـان لـەو بـارەوە، نـەک لەسـەر ئایەتێـک، بەڵکـو لەسـەر ڕستەیەک و، بگـرە لەسـەر وشـەیەک و، بگـرە لەسـەر پیتێکیـش ڕا جیاییـان نیـە، کـە جـاری دیکـەش گوتوومانـە: قورئـان (١١٤) سـوورەتەو، (٦٢٣٦) ئایەتـە، بـەو سـەرژمێرییەی کـە زۆربەیـان لەسـەری پێکهاتـوون، هەروەهـا زانـاو پسـپۆڕان گوتوویانـە: (٧٧٤٣٩) وشـەیەو، (٣٢١١٨٠) پیتـە.

## پێنجەم: نێوەڕۆکی:

نێوەڕۆکـی ئـەم سـوورەتە موبارەکـە، هەمـان نێوەڕۆکـی قورئـانی مەککەییـەو ئـەو تـەوەرە سـەرەکییانەی قورئـانی مەککەیـی تێیانـدا دەسـووڕێ، ئەمیـش گرتوونیەخـۆی:

١- باسی خوا ﷻ، یانی: بەدیهێنەرایەتیی و خاوەندارێتیی و پەروەردگاریەتیی و، ناوو سیفەتەکانی خواو، تەنیا پەرستراوێتیی خوا.

٢- باسی پێغەمبەرایەتیی و وەحیی، ژیانی پێغەمبەران (**عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم**)و ڕەوشت و ئاکاری پێغەمبەران و، هەڵوێستی پێغەمبەران و، ئەو وەحیی و پەیامەی کە خوا بۆی ناردوون، پاشان باسی پەیامەکانی خوا، کتێبەکانی خوا ﷻ کە بۆ پێغەمبەرانی (**عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم**) ناردوون.

٣- تەوەری سێیەمیش باسی ڕۆژی دوایی، چ وەک ئاخیر زەمان، چ وەک قیامەت و زیندوو بوونەوەو هەڵسانەوە، چ وەک ڕۆژی دوایی بە گشتیی، چ وەک بە هەشت و دۆزەخ و سزاو پاداشتێک کە خوا بۆ مرۆڤەکان دایناوە، بە پێی ئیمان و کردەوەی چاک، یاخود کوفرو کردەوەی خراپیان.

ئەم سوورەتە موبارەکەش بە پێی ڕیزبەندیی ئایەتەکانی دەتوانین بڵێین: ئەم یازدە (١١) بابەتە دەگرێتە خۆی:

١- باسی دابەزێنرانی قورئان لە شەوێکی بە پیرۆز فەڕدا، ئەمە لە ئایەتەکانی: (١ - ٥)دا خراوەتە ڕوو.

٢- باسی خوا ﷻ کە دابەزێنەری قورئانەو، وەسفکردنی خوا بە نۆ لە سیفەتە ناوازەکانی ئەویش لە سێ ئایەتەکانی: (٦ - ٨)دا، ئەم بابەتە خراوەتەڕوو.

٣- باسی بێبڕوایەکان و هەڕەشە لێکردنیان، لە هەشت ئایەتەکانی: (٩ - ١٦)دا ئەم بابەتە خراوەتەڕوو.

٤- باسی ناردنی مووسا عليه السلام بۆ لای فیرعەون و دەستەو دایەرەو گەلەکەی و سەرەنجام دوای یاخیی بوون و، بوغڕا بوونیان لە بەرانبەر مووسا و پەیامی خوادا، کە پێیدا نێردراو بوو، سزادرانیان لە لایەن خواوە ﷻ بە نغرۆکران و خنکێنرانیان لە دەریای سووردا، ئەمیش لە حەڤدە ئایەتەکانی: (١٧ - ٣٣)دا خراوەتەڕوو.

٥- باسی نکووڵییکردنی کافرەکان لە زیندوو کرانەوە، کە لە سێ ئایەتەکانی: (٣٤ - ٣٦) دا خراوەتەڕوو.

٦- ئاماژەیەکی کورت بە گەلی (تُبَّع)، لە یەک تاکە ئایەتدا، ئایەتی ژمارە: (٣٧).

٧- باسی ئەوە کە گەردوون بێ حیکمەت و بە گەمەو گاڵتە دروست نەکراوە، ئەمیش لە دوو ئایەتەکانی: (٣٨ - ٣٩)دا، خراوەتە ڕوو.

٨- باسی ڕۆژی لێک هەڵاواردن و لێک جیاکردنەوەی پاک و پیسان و لێک جیاکردنەوەی بڕوادارو بێبڕوایان، ئەمەش لە سێ ئایەتەکانی: (٤٠ - ٤٢)، خراوەتە ڕوو.

٩- باسی درەختی زەققووم و سزاو ئازاری بێبڕوایان لە دۆزەخدا، کە لە حەوت ئایەتەکانی: (٤٣ - ٤٩)خراوەتەڕوو.

١٠- باسی پارێزکاران و پاداشتیان لە بەهەشتدا، کە لە هەشت ئایەتەکانی: (٥٠ - ٥٧)، خراوەتەڕوو.

١١- باسی ئاسانکردنی قورئان بۆ پەند وەرگرتن و، فەرمانکردنی خوا بە پێغەمبەر ﷺ بە چاوەڕوانیی کردن، واتە: چاوەڕوانکردنی ئەوەی ئەو خەڵکەی لەگەڵیاندا ڕووبەڕووبۆتەوە، کە نەیارینی و ناحەزینی، چییان لێ دێ؟ کێیان بڕوا دێنێ؟ کێیان بڕوا ناهێنێ؟ خوای دادگەریش، هەم لە دنیادا چییان بەسەردێنێ و، هەم لە ڕۆژی دواییدا چییان لێ دەکات؟ کە لە دوو ئایەتەکانی: (٥٨ - ٥٩)دا، خراوەتەڕوو.

## شەشەم: تایبەتمەندییەکانی ئەم سوورەتە:

لـە خسـتنەڕووی نێوەڕۆک و پێناسـەی ئەم سـوورەتە موبارەکـەدا، تایبەتمەندییەکانێ کـە وەک زۆر جـار گوتوومانـە: دەگونجـێ زۆر تایبەتمەندیـی لـە سـوورەتەکاندا بخرێنـە بەرچـاو، بـەڵام ئێمـە زیاتـر ئامـاژە دەکەیـن، بەوانـەی زیاتـر زەقـن و بەرچـاون کـە چـوارن:

**تایبەتمەندیی یەکەم:** لەم سوورەتە موبارەکەدا باسکراوە، کە قورئان لە شەوێکی بە پیٚزدا دابەزیوە، لە ئایەتی ژمارە سیٚ دا، کە تاکە شوێنێکە لە قورئاندا هاتبیٚ: ﴿ إِنَّآ أَنزَلۡنَٰهُ فِي لَيۡلَةٖ مُّبَٰرَكَةٍۚ إِنَّا كُنَّا مُنذِرِينَ ﴿٣﴾ ﴾الدخان، واتە: ئێمە دامانبەزاندوە لە شەوێکی بە پیٚزدا، لە شەوێکی بە فەڕدا، ئەو شەوەش وەک دوایی باسی دەکەین، هەر هەمان شەوی قەدرە، کە دەفەرمویٚ: ﴿ إِنَّآ أَنزَلۡنَٰهُ فِي لَيۡلَةِ ٱلۡقَدۡرِ ﴿١﴾ ﴾القدر، لێرە بە **(لَيْلَة مُبَارَكَة)** ناوی هێناوە، شەوێکی پڕ پیت و پیٚز، لەوێش بە شەوی **(القدر)**، واتە: شەوی پڕ ڕێز، ئەو شەوە، هەم بە پیٚز بووەو، هەم بەڕێز بووە، دەشگونجیٚ قەدر بە مانای ئەندازەگیریی بیٚ، واتە: شەوێک بووە کە خوا ﷻ تێیدا ئەندازەگیریی ساڵانەی هەڵسوکەوتەکانی مرۆڤەکان دەکات، وەک هەندێک لە زانایان گوتوویانە.

**تایبەتمەندیی دووەم:** لەم سوورەتەدا، باسی هاتنی دووکەڵ کراوە لە ئاسمانەوە: ﴿ فَٱرۡتَقِبۡ يَوۡمَ تَأۡتِي ٱلسَّمَآءُ بِدُخَانٖ مُّبِينٖ ﴿١٠﴾ ﴾الدخان، کە تەنیا لەم سوورەتەدا، باسی هاتنی دووکەڵ کراوە، ئنجا ئایا ئەو دووکەڵە چییەو چۆنە؟ دوایی قسەی لیٚ دەکەین.

**تایبەتمەندیی سێیەم:** باسی نەگریانی ئاسمان و زەوی لەسەر گەلی فەوتاوی فیرعەون، کە لە ئایەتی ژمارە: (٢٩)دا، خوا ﷻ دەفەرمویٚ: ﴿ فَمَا بَكَتۡ عَلَيۡهِمُ ٱلسَّمَآءُ وَٱلۡأَرۡضُ وَمَا كَانُواْ مُنظَرِينَ ﴿٢٩﴾ ﴾الدخان، واتە: نە ئاسمان و نە زەوی بۆیان نەگریان و چاوەڕوانییش نەکران و، مۆڵەت نەدران، دوای ئەوەی کاتی مەرگیان هات، مۆڵەت نەدران بگەڕێنەوەو پەشێمان ببنەوە، چونکە لەو دەرفەتەی کە پێیان درابوو، بەهرەمەند نەبوون و، کاتی تاقیکردنەوەکەش تەواو بووە.

**تایبەتمەندیی چوارەم:** باسی ئەوە کە پارێزکاران مردن ناچێژن لە بەهەشتدا، جگە لە مردنی یەکەم: ﴿ لَا يَذُوقُونَ فِيهَا ٱلۡمَوۡتَ إِلَّا ٱلۡمَوۡتَةَ ٱلۡأُولَىٰ ﴿٥٦﴾ ﴾الدخان، واتە: لە بەهەشتدا مردن ناچێژن، جگە لە مردنی یەکەم، واتە: ئەو مردنی یەکەمەی لە دنیادا چێژتوویانە، لە هەموو قورئاندا تەنیا لێرەدا

باسـی ئـەوە کـراوە، کـە پارێـزکاران لـە بەهەشـتدا مـردن ناچێـژن، جگـە لـە مـردنی یەکـەم کـە لـە دنیـادا چێژتوویانـە.

## حەوتەم: دابەشکردنی ئایەتەکان بۆ چەند دەرسێك:

### دابەشکردنی ئایەتەکانی ئەم سوورەتە موبارەکە، بۆ چوار دەرس:

**دەرسـی یەکـەم:** ئایەتـەکانی: (١ - ١٦)، شـازدە (١٦) ئایـەت دەگرێتـە خـۆی، کـە هەم باسـی دابەزێـنرانی قورئـان، لـە شـەوی پـڕ پیـت و پێـزدا، کـە شـەوی (**القـدر**)ە، واتـە: سـەرەتاو دەسـتپێکی دابەزێنـەرانی قورئـان و، هـەم باسـی کۆمەڵـێ لـە سیفەتەکانی خوا ﷻ کـە دابەزێنـەری قورئانـە، هـەم باسـی بێبڕوایەکان و هەڵوێسـتی نەرێنییان و، سـزاو جەزرەبـەی خـوا بۆیـان، بـە تایبـەت هاتنـی پەیدابـوونی دووکەڵێـک، یاخـود حاڵەتێـک کـە وەک دوو کـەڵ دێتـە بەرچاویـان، دەپاڕێنـەوە لـە خـوا ﷻ لێیـان لابـەرێ، کەچـی خـوا ﷻ کـە لێشـیان لادەبـات، دووبـارە دەگەڕێنـەوە بـۆ سـەر بەزمـی پێشـوویان.

**دەرسـی دووەم:** ئایەتـەکانی: (١٧ - ٣٣)، (١٧) ئایـەت دەگرێتـە خـۆی، هەمـووی باسـی مووسـایە ﷺو، بەرەنگاربوونـەوەی فیرعـەون و دارو دەسـتەکەی لـە دژی مووسـا ﷺو پەیامەکـەی، کـە ئەوانیـش سـەرەنجام خـوا ﷻ لـە دەریـای سـووردا نغرۆیـان دەکات و قڕەبڕیـان دەکات.

**دەرسـی سـێیەم:** ئایەتەکانـی: (٣٣ - ٤٢)، یانـی: نـۆ (٩) ئایـەت، کـە چەنـد بابەتێکـی جـۆراو جـۆرن، هـەم باسـی نکووڵیـی بێبڕوایـان لـە زیندووکرانـەوە، هـەم باسـی گەلـی (**تُبَّـع**)، هـەم بـاسی ئـەوە کـە خـوا ئـەو گەردوونـەی بـێ حیکمـەت و بـە هەوەنتـە دروست نەکـردوە، هـەم باسـی ڕۆژی لێـک هـەڵاواردنی پـاک و پیسـان.

**دەرسـی چـوارەم:** ئایەتـەکانی: (٤٣ - ٥٩)، حەڤـدە (١٧) ئایـەت، ئەویـش هـەم باسـی سـەرەنجامی شـوومی بێبڕوایـان، هـەم سـەرەنجامی پـڕ خێـرو خۆشـیی و سـەربەرزانەی پارێـزکاران.

لـە کۆتاییشـدا خـوا ﷻ باسـی قورئـان دەکات کـە قورئـانی ئاسـان کـردوە بـۆ لـێ تێگەیشـتن و لـێ فێربـوون، فەرمانیـش بـە پێغەمبـەر ﷺ دەکات، بـە چاوەڕێکـردنی فەرمـانی خـواو چاوەڕێکـردنی ئـەوەی خـوا ﷻ چـی بەسـەر ئـەو خەڵکـە دێنـێ کـە بـەو هەمـوو، کەللەڕەقییـە، لەگـەڵ پەیامەکـەی خـوادا ڕووبەڕووبوونـەوە!!

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان وەک پێشـتر گوتوومانـە: لـە شـازدە (١٦) ئایـەتی سـەرەتای سـووڕەتی (الدخـان)، ئایەتـەکانی: (١ - ١٦)، پێـک دێ، لـەو شـازدە (١٦) ئایەتـەدا، باسـی پێنـج بابـەتی سـەرەکیی کـراوە:

١- دابەزێنرانی قوڕئان لە شەوێکی بەپیێزدا.

٢- وەسفکردنی خوا بە نۆ لە سیفەتە بەرزو بێ وێنەکانی.

٣- هەڕەشەکردن لە کافرەکان، بە هاتنی دووکەڵێکی ئاشکرا، کە لە خوا دەپاڕێنەوە، خوا ﷻ لێیان دووربخاتەوەو، دەربازیان بکات لێی.

٤- گوتوویانە: ئەگەر خوا قوتاریان بکات، بڕوا دێنن، کەچی دواییش ڕاستیان نەکردووەو، گەڕاونەوە سەر حاڵەتی پێشێیان.

٥- هەڕەشە لێکرانیان بە سزادانی مەزن و، بڕەزاو تۆڵە لێکردنەوەیان.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿حمٓ ﴿١﴾ وَٱلْكِتَٰبِ ٱلْمُبِينِ ﴿٢﴾ إِنَّآ أَنزَلْنَٰهُ فِى لَيْلَةٍ مُّبَٰرَكَةٍ ۚ إِنَّا كُنَّا مُنذِرِينَ ﴿٣﴾ فِيهَا يُفْرَقُ كُلُّ أَمْرٍ حَكِيمٍ ﴿٤﴾ أَمْرًا مِّنْ عِندِنَآ ۚ إِنَّا كُنَّا مُرْسِلِينَ ﴿٥﴾ رَحْمَةً مِّن رَّبِّكَ ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٦﴾ رَبِّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَآ ۖ إِن كُنتُم مُّوقِنِينَ ﴿٧﴾ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ يُحْىِۦ وَيُمِيتُ ۖ رَبُّكُمْ وَرَبُّ ءَابَآئِكُمُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿٨﴾ بَلْ هُمْ فِى شَكٍّ يَلْعَبُونَ ﴿٩﴾ فَٱرْتَقِبْ يَوْمَ تَأْتِى ٱلسَّمَآءُ بِدُخَانٍ مُّبِينٍ ﴿١٠﴾ يَغْشَى ٱلنَّاسَ ۖ هَٰذَا عَذَابٌ

أَلِيمٌ ﴿١١﴾ رَّبَّنَا ٱكْشِفْ عَنَّا ٱلْعَذَابَ إِنَّا مُؤْمِنُونَ ﴿١٢﴾ أَنَّىٰ لَهُمُ ٱلذِّكْرَىٰ وَقَدْ جَآءَهُمْ رَسُولٌ مُّبِينٌ ﴿١٣﴾ ثُمَّ تَوَلَّوْا۟ عَنْهُ وَقَالُوا۟ مُعَلَّمٌ مَّجْنُونٌ ﴿١٤﴾ إِنَّا كَاشِفُوا۟ ٱلْعَذَابِ قَلِيلًا إِنَّكُمْ عَآئِدُونَ ﴿١٥﴾ يَوْمَ نَبْطِشُ ٱلْبَطْشَةَ ٱلْكُبْرَىٰٓ إِنَّا مُنتَقِمُونَ ﴿١٦﴾ ﴾.

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{بە ناوی خوای بەبەزەیی بەخشندە، حا میم ﴿١﴾ سوێند بە کتێبە ڕۆشن و ڕوونکەرەوەکە ﴿٢﴾ ئێمە لە شەوێکی بە پیتدا دامانبەزاندوە، مسۆگەر ئێمە وریاکەرەوەو ترسێنەر (ی خەڵک)ین ﴿٣﴾ لەو (شەوە)دا، هەموو کارێکی پڕ حیکمەت (وکارزانانە) ڕوون دەکرێتەوە ﴿٤﴾ (ئەوە) فەرمانێکە لە لایەن ئێمەوە، بێگومان ئێمە نێرەرین (بۆ پێغەمبەران کە پەیاممان بگەیەنن بە مرۆڤ و جند) ﴿٥﴾ (ئەوەش) بەزەییەکە لە پەروەردگارتەوە، بە ڕاستیی ئەو بیسەری زانایە ﴿٦﴾ پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەی نێوانیانە، ئەگەر زانیارو دڵنیابن (ئەو ڕاستییە دەزانن) ﴿٧﴾ هیچ پەرستراوێک نیە جگە لەو، دەژیەنێ و دەمرێنێ، پەروەردگاری خۆتان و باب و باپیرانی یەکەمتانە ﴿٨﴾ (بەڵام نەک خاوەنی زانیاریی دڵنیاکەرنین)، بەڵکو لە دوو دڵییدا یاریی دەکەن (خافڵاون) ﴿٩﴾ دەجا (ئەی موحەممەد!) چاوەڕێی ڕۆژێک بە، کە ئاسمان دووکەڵێکی ئاشکرا دێنێ ﴿١٠﴾ (ئەو دووکەڵە) خەڵک دادەپۆشێ، ئەمە ئازارێکی بە ئێشە ﴿١١﴾ (دەڵێن:) پەروەردگارمان! ئازارمان لێ لابەرە بێگومان ئێمە بڕواداریـن ﴿١٢﴾ چۆن بیریان دەکەوێتەوە (وپەند وەردەگرن) لە حاڵێکدا (پێشتر) پێغەمبەرێکی ڕۆشن و ڕوونکەرەوەی (هەق) یان بۆ هات (بەڵام لێی بەهرەمەند نەبوون)؟! ﴿١٣﴾ کەچی دوایی پشتیان تێکردو گوتیان: فێرکراوە، شێتە ﴿١٤﴾ ئێمە کەمێک لابەری ئازارین (لێیان)، بە دڵنیایی ئێوە گەڕاوەن (بۆ سەرحاڵەتی پێشووتان)

(١٥) ڕۆژێـک زەبـری هـەرە گەورەیـان لێدەدەیـن (و سـزای سـەختیان دەدەیـن) مسـۆگەر ئێمـە تۆڵەیـان لـێ دەكەینـەوە (١٦)}.

## شیكردنەوەی هەندێک لە وشەكان

(مُبَـٰرَكَةٍ): (البَرَكَـةُ: ثُبُـوتُ الخَـيْرِ الإِلَهِـيِّ فِي الـشَّيءِ، وَالْمُبَـارَكُ مَـا فِيْـهِ ذَلِـكَ الخَـيْر)، (بَرَكَـة): بریتیـە لـە چەسـپاندنی خێـرو چاكـەی خوایـی لـە شـتێكداو، (مُبَـارَك): هـەر شـتێكە، ئـەو خێـرو پیـت و پێـزەی تێـدا بـێ.

(مُنذِرِينَ): ترسـێنەرین، وریاكەرەوەیـن، (الإِنْـذَارُ: إِخْبَـارٌ فِيْـهِ تَخْوِيْـفٌ، كَـمَا أَنَّ التَّبْشِيْرَ إِخْبَـارٌ فِيْـهِ سُرُورٌ)، (إِنْـذَار): بریتیـە لـە هەواڵپێدانێـک كـە ترسـاندنی تێدابـێ، پێچەوانەكەشـی (تَبْشِـيْر): بریتیـە لـە هەواڵپێدانـەی كـە دڵخۆشـیی تێدایـە، یـان دڵخۆشـكردنی تێدابـێ.

(يُفْرَقُ): واتـە: جیادەكرێتـەوە، یاخـود ڕوون دەكرێتـەوە، یاخـود بڵاودەكرێتـەوە، (فَرَقْتُ بَيْنَ الشَّيْئَيْنِ: فَصَلْتُ بَيْنَهُـمَا، سَـوَاءٌ كَانَ ذَلِـكَ بِفصْلٍ يُدْرِكُـهُ البَصَرُ، أَو بفَصْـل تُدْرِكُهُ البَصِـيْرَة)، دەگوتـرێ: (فَرَقْـتُ بَـيْنَ الشَّـيْئَيْنِ)، دوو شـتەكەم لێـک جیاكردنـەوە، واتـە: لێكـم وە دوورخسـتن، ئنجـا ئـەو لێـک وەدوورخسـتنەو، ئـەو لێـک جیاكردنەوەیـە، چ لێـک دوور خسـتنەوەیەک بـێ، چـاو ببینـێ، واتـە: بەرهەسـت بـێ و، چ بـە عەقـڵ و دڵ بزانـرێ و نابـەر هەسـت و مەعنەویـی بـێ.

(مُوقِنِينَ): (اليَقِـيْنُ: مِـنْ صِفَـةِ العِلْـمِ فَـوْقَ المَعْرِفَـةِ وَالدِّرَايَـة، وَهُـوَ سُـكُونُ الفَهْـمِ مَـعَ ثَبَـاتِ الحُكْـمِ)، (يَقِـيْن): لـە سـیفەتەكانی زانینـەو لـە سـەرووی ناسـین و پەیپێبردنـە، یەقیـن: بریتیـە لـە چەسـپاندنی تێگەیشـتن لەگـەڵ چەسـپاویی بڕیـاردا، واتـە: شـتێک دوا بڕیـاری لـە بـارەوە بـدەی و، دوا زانیارییـت لـە بارەیـەوە هەبـێ.

(شَكٍّ): (الشَّكُّ: إِعْتِدَالُ النَّقِيْضَيْنِ عِنْدَ الإِنْسَانِ وَتَسَاوِيْهُمَا)، (شَك): بریتیە لەوە کە دوو شتی دژو پێچەوانەی یەکدی لە لای مرۆڤ یەکسان و هاوسەنگ بن، بە کوردیی (شَكّ) دەبێتە دوو دڵیی، (ظَن)یش: دەبێتە گومان، کە زۆر کەس (شَك) یش، هەر بە گومان لێک دەدەنەوە، بەڵام (شَك) بریتیە لە دوو دڵیی، شتێک کە لە نێوان بوون و نەبوونیدابێ، مرۆڤ نەتوانێ بوونی بەسەر نەبوونی دا، یان نەبوونی بەسەر بوونی دا، زاڵ بکات، بەڵکو لە نێوەڕاستێ بوەستێ، ئەوە پێی دەگوترێ: دوو دڵیی، بەڵام (ظَن). ئەوەیە کە لایەکیان بەسەر لایەکیاندا زاڵ بکات، چ بوونی بەسەر نەبوونی دا، چ نەبوونی بەسەر بوونیدا.

(يَلْعَبُونَ): (لَعِبَ فُلاَنٌ: إِذَا كَانَ فِعْلُهُ غَيْرُ قَاصِدٍ بِهِ مَقْصَدَاً صَحِيْحَاً)، دەگوترێ: فڵانکەس یاریی کرد، ئەگەر ئەو کردەوەی دەیکات، مەبەستێکی ڕاست و دروستی لە پشتەوە نەبێ و، جۆرێک بێ لە خۆخافڵاندن.

(فَٱرْتَقِبْ): چاوەڕێبە، (رَقِبْتُهُ، أي: حَفِظْتُهُ)، واتە: پاراستم، (الرَّقِيْبُ: الحَافِظ)، (رَقِيْب): بە مانای پارێزەر دێ، کەواتە: (فَارْتَقِب)، واتە: تۆ چاوەڕێ بە، بیانپارێزەو ئاگات لێیان بێ.

(بِدُخَانٍ مُّبِينٍ): دووکەڵێکی ئاشکرا، (الدُّخَانُ: كَالْعُثَانِ، المُسْتَصْحَبُ لِلْهِيْبِ)، (دُخَان): دووکەڵ کە لەگەڵ بڵێسەدا بەرز دەبێتەوە، دوایی لێی جیادەبێتەوە پێی دەگوترێ: (دووکەڵ) کە ڕەش دەچێ، بە عەرەبیی هەم (دُخَان)و، هەم (عُثَان)یشی، پێ دەڵێن.

(يَغْشَى ٱلنَّاسَ): واتە: خەڵک دادەپۆشێ، (غَشِيَ: سَتَرَ، وَالغِشَاوَةُ مَا يُغَطَّى بِهِ الشَّيء)، (غِشَاوَةُ) ئەوەیە شتێکی پێ بپۆشرێ و پەردەپۆش بکرێ.

(ٱكْشِفْ): لایبەرە، (الكَشْفُ: الإِزَالَةُ): (کشف) بریتیە لە لابردن و دوورخستنەوە، هەروەک چۆن (كَشْفُ) بە مانای دەرخستن دێ، بە مانای لابردنیش دێ.

(أَنَّىٰ): بە مانای (أيْنَ) لە کوێ، دێ، هەروەها بە مانای (كَيْفَ)چۆن، دێ.

(ٱلذِّكْرَىٰ): (التَّذَكُّرُ: (الإِعْتِبَارُ وَالإِتِّعَاظ)، (ذِكْرَى) بە مانای هاتنەوە بیرو، پەند وەرگرتن دێ.

(عَآئِدُونَ): گەڕاوەن، (العَـوْدُ: الرُّجُـوعُ إِلى الـشَّيءِ، بَعْـدَ الإِنْـصِرَافِ عَنْـهُ، إِمَّـا انْصِرَافَـاً بِالـذَّاتِ، أو بِالْقَـوْلِ وَالعَزِيْمَـة) (عَـوْد): بریتیـە لـە گەڕانـەوە بـەرەو لای شـتێک، دوای ئـەوەی لێـی دوور کەوتۆتـەوە، ئنجا چ لـێ دوورکەوتنەوەکـە بـە جەسـتە بووبـێ، چ دوورکەوتنەوەکـە قسـەو بـە بڕیـار بـێ، کەواتـە: گەڕانـەوە بـۆی، چ بـە قسـە بـۆی بگەڕێنـەوەو، چ بـە ئیـرادەو عـەزم، چ بـە جەسـتە و (خـود) بـێ.

(نَبْطِشُ): (البَطْـشُ: تَنَـاوُلُ الـشَّيءِ بَصَوْلَـةٍ) (بَطْـش): بریتیـە لـە داهاتنـە شـتێک، یـانی: زەبـر لێـدان و پەلامـاردان.

(مُنتَقِمُونَ): (النَّقْمَـةُ: العُقُوبَـةُ)، (نِقْمَـة): بـە مانـای سـزادان دێ، (مُنْتَقِمُـون)، واتـە: سـزادەدرین و تۆڵـە سـتێنەوەین.

## هۆی هاتنەخوارەوەی ئەم ئایەتانە

لەم بارەوە ئەم دوو گێرراوەیە دێنین:

١- لە بارەی هۆی هاتنەخواری ئەم ئایەتە موبارەکەوە کە دەفەرموێ: ﴿ فَٱرْتَقِبْ يَوْمَ تَأْتِى ٱلسَّمَآءُ بِدُخَانٍ مُّبِينٍ ﴿١٠﴾ ﴾الدخان، ئەم شوێنەوارە هەیە:

{عَـنْ عَبْـدِ اللّـهِ بـنِ مَسـعُودٍ ﷺ، قَـالَ: خَمْـسٌ قَـدْ مَضَـيْنَ: الدُّخَـانُ، وَاللِّـزَامُ، وَالـرُّومُ، وَالْبَطْشَـةُ، وَالْقَمَـرُ} (أخرجـه البخـاري: ٤٨٢، فِي كتـاب التفسـير، ومسـلم ٢٧٩٨).

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ﷺ، گوتوویەتی: پێنج شت هەن، تێپەڕیون:

**یەکەمیان:** (الدُّخَانُ): - کە دوایی لەو بارەوە ڕیوایەتێکی درێژتر دێنین - گوتراوە: ڕووداوێک بووەو تێپەڕیوە.

**دووەمیان: (اللِّزَامُ)**: کە لە سوورەتی (**الفرقان**)دا، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ فَسَوْفَ يَكُونُ لِزَامًا ﴿٧٧﴾ ﴾**الفرقان**، واتە: سزایەکی پەیوەست پێیانەوە.

**سێیەمیان: (الروم)** لە سوورەتی (**الروم**)دا، کە دەفەرموێ: ﴿ الٓمٓ ﴿١﴾ غُلِبَتِ ٱلرُّومُ ﴿٢﴾ فِيٓ أَدۡنَى ٱلۡأَرۡضِ وَهُم مِّنۢ بَعۡدِ غَلَبِهِمۡ سَيَغۡلِبُونَ ﴿٣﴾ فِي بِضۡعِ سِنِينَ ﴿٤﴾ ﴾، گوتوویەتی: ئەوەش تێپەڕیوە، جەنگێک بووە لە نێوان (ڕۆم و فارس)دا، کە بە تەئکید وایە، بۆ ئەوەی چاوەڕێ نەکرێ، کە ئەوە پەیوەندیی بە داهاتووەوە هەیەو لە داهاتوودا دێتە دی.

**چوارەمیان: (الْبَطْشَةُ)**: ﴿ يَوۡمَ نَبۡطِشُ ٱلۡبَطۡشَةَ ٱلۡكُبۡرَىٰٓ ﴾، واتە: ئەو ڕۆژەی زەبری گەورەتریان، لێ دەدەین، کە زۆربەی توێژەرەوان بە جەنگی بەدریان لێکداوەتەوەو، جەنگی بەدریش عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود کاتێک ئەوەی گوتوە لە مەدینە بووە، یانی: ئەوەش تێپەڕیوە.

**پێنجەمیان: (القَمَرُ)**: لە سەرەتای سوورەتی (**القمر**)دا، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ ٱقۡتَرَبَتِ ٱلسَّاعَةُ وَٱنشَقَّ ٱلۡقَمَرُ ﴿١﴾ ﴾، واتە: (**ساعة**) نیزیکەو مانگ لەت بوو، گوتوویەتی: ئەوەش تێپەڕیوە، ئەویش دوایی دەیگەینێ لە تەفسیری سوورەتی (**القمر**)دا، بەڵام هەم لە فەرموودەی صەحیحدا هاتوە، کە پێغەمبەر ﷺ ڕۆژێک هاوبەش خوادانەرانی مەککە، داوایان لێکردوە، موعجیزەیەکیان پێشان بدات، نیشانەیەکیان پێشان بدات، ئەویش فەرموویەتی: چیتان پیشان بدەم؟ لەو کاتەدا مانگی لە چواردە، یان لە پازدە، بووە، گوتوویانە: ئەو مانگەمان بۆ لەت بکە، پێغەمبەریش ﷺ بە پێی ئەو ڕیوایەتانە، ئاماژەی بۆ کردوەو مانگ لەت بووەو بۆتە دوو بەش، ئنجا عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود، گوتوویەتی: ئەوەش تێپەڕیوە، هەڵبەتە لەوانەیە هەندێکیان ئیمانیان هێنابێ، بەڵام زۆربەیان ئیمانیان نەهێناوەو، گوتوویانە: تۆ جادووگەری، لە سوورەتەکەدا دەفەرموێ: ﴿ ٱقۡتَرَبَتِ ٱلسَّاعَةُ وَٱنشَقَّ ٱلۡقَمَرُ ﴿١﴾ وَإِن يَرَوۡاْ ءَايَةً يُعۡرِضُواْ وَيَقُولُواْ سِحۡرٌ مُّسۡتَمِرٌّ ﴿٢﴾ ﴾**القمر**، ئاخیر زەمان نیزیک کەوتەوەو، مانگ لەت بوو، ئەگەر نیشانەیەک ببینن پشت هەڵ دەکەن و، دەڵێن: ئەوە جادوویەکی بەردەوامە.

واتە: ئەوەش وەک شتەکانی پێشترە، هەرچەندە پێغەمبەری خوا ﷺ زیاتر لە ڕێی عەقڵ و دڵەوە خەڵکی دواندوەو، موعجیزەیەکی بەرهەستی نەهێناوە،

تەحەدداى پێ بکات، موعجیزەکەی تەنها قورئان بووەو، بەڵگەکەی تەنیا قورئان بووە، بەڵام کە ئەوەیان دیوە، گوتوویانە: جادوویەکی بەردەوامە.

٢- هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو حەوت ئایەتە موبارەکانە، کە خوای بەرز دەفەرموێ: ﴿ فَٱرْتَقِبْ يَوْمَ تَأْتِى ٱلسَّمَآءُ بِدُخَانٍ مُّبِينٍ ﴿١٠﴾ يَغْشَى ٱلنَّاسَ هَٰذَا عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿١١﴾ رَّبَّنَا ٱكْشِفْ عَنَّا ٱلْعَذَابَ إِنَّا مُؤْمِنُونَ ﴿١٢﴾ أَنَّىٰ لَهُمُ ٱلذِّكْرَىٰ وَقَدْ جَآءَهُمْ رَسُولٌ مُّبِينٌ ﴿١٣﴾ ثُمَّ تَوَلَّوْا۟ عَنْهُ وَقَالُوا۟ مُعَلَّمٌ مَّجْنُونٌ ﴿١٤﴾ إِنَّا كَاشِفُوا۟ ٱلْعَذَابِ قَلِيلًا ۚ إِنَّكُمْ عَآئِدُونَ ﴿١٥﴾ يَوْمَ نَبْطِشُ ٱلْبَطْشَةَ ٱلْكُبْرَىٰٓ إِنَّا مُنتَقِمُونَ ﴿١٦﴾ ﴾، کە پێشتریش ڕیوایەتێکمان هێنا لە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوودەوە (خوا لێی ڕازی بێ) و گوتمان: دواتر ئەوەی لەو بارەوە هاتوە بە درێژیی دەیهێنین، کە ئەمەی ئێستایە:

{عن مسروق قال: جاء إلى عبدالله رجل فقال: تركت في المسجد رجلا يفسر القرآن برأيه (وفي رواية: كُنَّا عِنْدَ عبدِ اللهِ جُلُوسًا، وَهو مُضْطَجِعٌ بيْنَنَا، فأتَاهُ رَجُلٌ فَقالَ: يا أَبَا عبدِ الرَّحْمَنِ إنَّ قَاصًّا عِنْدَ أَبْوَابِ كِنْدَةَ يَقُصُّ وَيَزْعُمُ) يفسر هذه الآية، (يوم تأتي السماء بدخان مبين) قال: يَأْتِي النَّاسَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ دُخَانٌ، فَيَأْخُذُ بِأَنْفَاسِ الكُفَّارِ حَتَّى يَأْخُذَهُمْ مِنْهُ كَهَيْئَةِ الزُّكَامِ، فَقَالَ عَبْدُ اللهِ: وَجَلَسَ وَهُوَ غَضْبَانُ: يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا اللَّهَ، مَنْ عَلِمَ مِنْكُمْ عِلْمًا، فَلْيَقُلْ بِمَا يَعْلَمُ، وَمَنْ لَمْ يَعْلَمْ فَلْيَقُلْ: اللَّهُ أَعْلَمُ، فَإِنَّ مِنْ فِقهِ الرَّجُلِ بأَنْ يَقُولَ: لِمَا لاَ يَعْلَمُ: اللَّهُ أَعْلَمُ، فَإِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ قَالَ لِنَبِيِّهِ ﷺ: ﴿ قُلْ مَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُتَكَلِّفِينَ ﴿٨٦﴾ ﴾ص، إِنَّمَا كَانَ هَذَا، أَنَّ قُرَيْشًا لَمَّا اسْتَعْصَتْ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ، دَعَا عَلَيْهِمْ بِسِنِينَ كَسِنِي يُوسُفَ، فَأَصَابَهُمْ قَحْطٌ وَجَهْدٌ، حَتَّى جَعَلَ الرَّجُلُ يَنْظُرُ إِلَى السَّمَاءِ فَيَرَى بَيْنَهُ وَبَيْنَهَا كَهَيْئَةِ الدُّخَانِ مِنَ الْجَهْدِ، وَحَتَّى أَكَلُوا الْعِظَامَ، «وَفِي رِوَايَةٍ» إنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ لَمَّا رَأَى مِنَ النَّاسِ إدْبَارًا، فَقَالَ: اللَّهُمَّ سَبْعٌ كَسَبْعِ يُوسُفَ، قَالَ: فَأَخَذَتْهُمْ سَنَةٌ حَصَّتْ كُلَّ شَيْءٍ، حَتَّى أَكَلُوا الْجُلُودَ وَالْمَيْتَةَ مِنَ الْجُوعِ، وَيَنْظُرُ إِلَى السَّمَاءِ أَحَدُهُمْ فَيَرَى كَهَيْئَةِ الدُّخَانِ، فَأَتَى النَّبِيَّ ﷺ رَجُلٌ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ! اسْتَغْفِرِ اللَّهَ لِمُضَرَ، فَإِنَّهُمْ قَدْ هَلَكُوا، فَقَالَ: لِمُضَرَ؟ إِنَّكَ لَجَرِيءٌ، «وَفِي رِوَايَةٍ» فَأَتَاهُ أَبُو سُفْيَانَ فَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ! إِنَّكَ جِئْتَ تَأْمُرُ بِطَاعَةِ اللَّهِ، وَبِصِلَةِ الرَّحِمِ،

وَإِنَّ قَوْمَكَ قَدْ هَلَكُوا، فَادْعُ اللَّهَ لَهُمْ، قَالَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: ﴿ إِنَّا كَاشِفُوا۟ ٱلْعَذَابِ قَلِيلًا إِنَّكُمْ عَآئِدُونَ ﴿١٥﴾ ﴾، قَالَ: فَمُطِرُوا، فَلَمَّا أَصَابَتْهُمُ الرَّفَاهِيَةُ، قَالَ: عَادُوا إِلَى مَا كَانُوا عَلَيْهِ، قَالَ: فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: ﴿ فَٱرْتَقِبْ يَوْمَ تَأْتِى ٱلسَّمَآءُ بِدُخَانٍ مُّبِينٍ ﴿١٠﴾ يَغْشَى ٱلنَّاسَ هَٰذَا عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿١١﴾ ﴾، ﴿ يَوْمَ نَبْطِشُ ٱلْبَطْشَةَ ٱلْكُبْرَىٰٓ إِنَّا مُنتَقِمُونَ ﴿١٦﴾ ﴾، قَالَ: يَعْنِي يَوْمَ بَدْرٍ] (أخرجه البخاري: ١٠٠٧، ومسلم: ٢٧٩٨، وَاللَّفْظُ لِمُسْلِم)[1].

واتە: مەسڕووق (کە یەکێکە لە زانایانی تابیعین، واتە: جیلی دوای هاوەڵان)، دەڵێ: پیاوێک هاتە لای عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود، گوتی: پیاوێکم لە مزگەوت بەجێهێشت قورئانی بە ڕای خۆی لێک دەدایەوە، «لە ڕیوایەتێکدا»، [ئێمە لە لای عەبدوڵڵا دانیشتبووین، ئەویش پاڵی دابۆوە، پیاوێک هاتە لای، گوتی: ئەی ئەبوو عەبدوڕڕەحمان! (کونیەی عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوودە)، حیکایەت خوانێک لە لای دەرگاکانی (کیندە) بەسەرهات دەگێڕێتەوە، پێی وایە] ئەم ئایەتە تەفسیر دەکات، کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ئەو ڕۆژە کە ئاسمان دووکەڵێکی ئاشکرا دێنێ، پیاوەکە گوتی: ئەو حیکایەت خوانە، دەڵێ: لە ڕۆژی قیامەتدا دووکەڵێک بۆ خەڵکی دێ، هەناسەی کافرەکان دەگرێ، بەڵام بڕواداران وەک هەڵامەت دەیگرن، (واتە: هی ئەوان ئاسان دەبێ)، دەڵێ عەبدوڵڵا (خوا لێی ڕازی بێ)، دانیشت لە حاڵێکدا کە تووڕە بوو، گوتی: ئەی خەڵکینە! پارێز لە خوا بکەن، هەر کامێک لە ئێوە زانیارییەکی زانی، با بیڵێ، ئەگەر شتێکی نەزانی، با بڵێ: خوا زاناترە، چونکە لە تێگەیشتنی پیاوە بۆ شتێک کە نایزانێ بڵێ: خوا زاناترە، خوا (عَزَّوَجَلَّ) بە پێغەمبەرەکەی خۆی ﷺ فەرمووە: ﴿ قُلْ مَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُتَكَلِّفِينَ ﴿٨٦﴾ ﴾ص، واتە: بڵێ: من هیچ جۆرە کرێ و پاداشتێکتان لێ داوا ناکەم و من لە لاف لێدەران نیم، واتە: شتێک ناڵێم کە نەمبێ، یان نەتوانم بیکەم، ئەمە (واتە: ئەم ئایەتە لەو بارەوە بوو)، کاتێ هۆزی قورەیش لە پێغەمبەری خوا ﷺ یاخی بوون، تووکی لێکردن (نزای لێکردن)، کە ساڵانێکیان بەسەربێن،

---

(١) الإستيعاب في بيان الأسباب، ج٣، ص ٢٠٠ و ٢٠١ .

وەک ساڵەکانی: یوسووف، (واتە: ساڵانێکی گرانیی و قات و قڕیی)، ئیدی وشکە ساڵیی و گرانیی گرتنی، هەتا پیاوێک لەوان، تەماشای سەرێی دەکرد، لە نێوان خۆی و ئاسماندا، شێوەی دووکەڵی دەبینی، لەبەر وشکە ساڵیی و لەبەر زۆر برسێتی و قات و قڕی، تەنانەت، خۆراکیان ئێسقانی ئاژەڵ بوو، سەریان دەبڕین، «لە ڕیوایەتێکدا هاتووە» کە پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێک خەڵکی بینی، پشتی تێ دەکەن، فەرمووی: خوایە! حەوت ساڵ، وەک حەوت ساڵەکەی یوسووف، (واتە: حەوت ساڵ گرانییان بەسەردا بێنە)، دەڵێ: ئیدی ساڵێکی گرانیی گرتنی هەموو شتێکی لە بەین برد و کۆتایی پێهێنا، تەنانەت چەرمی ئاژەڵانیشیان خواردو مرداره وەبووشیان لە برسان خوارد، یەکێکیان تەماشای سەرێی دەکرد، وەک شێوەی دووکەڵی دەهاتە بەرچاو، (کە وشکە ساڵیی بوو تەپ و تۆز زۆر دەبێ، یاخود لە ئەنجامی ئەوەدا کە برسێتیی و ناڕەحەتیی تینی بۆ هێناون، بەرچاویان لێڵ و، تەماویی بووە)، پیاوێک هاتە لای پێغەمبەر ﷺ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ داوای لێبووردن لە خوا بکە بۆ (مُضَرَ) (واتە: قوڕیش و غەیری قوڕەیشیش)، چونکە ئەوانە فەوتان، فەرمووی: بۆ (مُضَرَ) بە ڕاستیی تۆ پیاوێکی بوێری، یانی: (ئایا دووعا بۆ هەمووان بکەم؟) «لە ڕیوایەتێکدا هاتووە» ئەبوو سوفیان هاتبووە لای و گوتی: ئەی موحەممەد! تۆ هاتووی فەرمان دەکەی بە فەرمانبەریی خواو، گەیاندنی پەیوەندیی خزمایەتیی، کەچی ئەوە کۆمەڵگایەکەت، (واتە: هۆزی قوڕەیش) فەوتان، بۆیان لە خوا بپاڕێوە، دەڵێ: پێغەمبەریش ﷺ بۆیان لە خوا پاڕایەوە، خوا ﷻ ئەم ئایەتەی ناردە خوار: ﴿ إِنَّا كَاشِفُوا الْعَذَابِ قَلِيلًا ۚ إِنَّكُمْ عَائِدُونَ ﴿١٥﴾ ﴾ **الدخان**، واتە: ئێمە ماوەیەکی کەم ئەو ئازارەتان لەسەر لادەبەین، بەڵام ئێوە دووبارە دەگەڕێنەوە، دەڵێ: ئیدی بارانیان بۆ باریی، بەڵام کاتێک خۆشگوزەرانییان بۆ هاتە پێش، دووبارە گەڕانەوە سەر ئەوەی لەسەری بوون [کوفرو لە دژایەتیی ئیسلام]، ئنجا خوا ﷻ ئەم ئایەتانەی دابەزاندن: ﴿ فَارْتَقِبْ يَوْمَ تَأْتِي السَّمَاءُ بِدُخَانٍ مُّبِينٍ ﴿١٠﴾ يَغْشَى النَّاسَ ۖ هَٰذَا عَذَابٌ أَلِيمٌ

﴿ رَبَّنَا ٱكۡشِفۡ عَنَّا ٱلۡعَذَابَ إِنَّا مُؤۡمِنُونَ ﴿١٢﴾ أَنَّىٰ لَهُمُ ٱلذِّكۡرَىٰ وَقَدۡ جَآءَهُمۡ رَسُولٞ مُّبِينٞ ﴿١٣﴾ ثُمَّ تَوَلَّوۡاْ عَنۡهُ وَقَالُواْ مُعَلَّمٞ مَّجۡنُونٌ ﴿١٤﴾ إِنَّا كَاشِفُواْ ٱلۡعَذَابِ قَلِيلًاۚ إِنَّكُمۡ عَآئِدُونَ ﴿١٥﴾ يَوۡمَ نَبۡطِشُ ٱلۡبَطۡشَةَ ٱلۡكُبۡرَىٰٓ إِنَّا مُنتَقِمُونَ ﴿١٦﴾ ﴾، ئـەم ئایەتانـە هاتنـە خـوار کـە مەبەسـت لـە: ﴿ ٱلۡبَطۡشَةَ ٱلۡكُبۡرَىٰٓ ﴾، ڕۆژی بـەدرە (جەنگـی بـەدرە).

ئەمـە هـۆی هاتنـە خوارەوەکەیـە و وەک گوتمـان: تیشـکی زیاتـر دەخاتـە سـەر نێوەڕۆکـی ئایەتـەکان، کـە دوایـی دێینـە سـەر تەفسـیر کردنیـان.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

سـەرەتا خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴾، بـە نـاوی خـوای بـە بەزەیـی بەخشـندە، واتە:دەسـتپێکردنم بـە نـاوی خوایـە، کـە پێویسـتە چـوار واتـا لـە عەقڵ و دڵـدا ئامادەبـن، لـە کاتـی گوتنـی ئـەو ڕسـتە موبارەکـەدا:

١ - ئەم کارە بە ناوی خوا ئەنجام دەدەم.

٢- ئەم کارە بۆ بەدەستهێنانی ڕەزامەندیی خوا ئەنجام دەدەم.

٣- ئەم کارە بە پێی شەرعی خوا دەکەم.

٤- بە تواناو یارمەتیی خوای پەروەردگار ئەم کارە دەکەم، نەک بە هێزو توانای خۆم.

﴿ حمٓ ﴾، ئەمانـە دوو پیـتن، کـە پیتـە پچـڕ پچڕەکانیـان پـێ دەڵێـن، پێشـتر زۆر لـە بارەوەیـان قسـەمان کـردوە، کـە لـە سـەرەتای بیسـت و نـۆ (٢٩) سـوورەت لـە قورئانـدا، ئـەو پیتانـە هاتـوون، ئنجـا هەیانـە یـەک پیتـەو، وەک: هـەر سـێ سـوورەتی: (**نـوون و قـاف وصـاد**)و، هەیانـە دوو پیتـە وەک: ئـەو (**حم**)انـە، کـە حـەوت سـوورەتن بـە دوایـی یەکـدا، هەروەهـا (**طـس و یـس و طـه**)و، هەیانـە سـێ پیتـە وەک: (**ألم، ألر**)،

کـە ئەوانیـش ژمارەیـەک لـە سـوورەتەکانن، هەروەهـا (**طسـم**)و، هەیانـە چـوار پیـتن وەک: (**ألمـر، ألمـص**)و، هەیانـە پێنـج پیتـە، وەک: (**حـم عسـق و کهیعـص**)، کـە تەنیـا لـە سـەرەتای ئـەو دوو سـوورەتەوە بـەو شـێوەیە هاتـوون.

ئێمـە لـە سـەرەتای تەفسـیری سـوورەتی (**یونـس**)دا، باسـێکی تـا ڕاددەیـەک تێـرو تەسـەلمان لـە بـارەی ئـەم پیتـە پچـڕ پچڕانـەوە کـردوە، هەروەهـا لـە سـەرەتای سـوورەتی (**الشعراء**)شـدا، شـتێکی دیکـەم لـەو بـارەوە باسـکردوە، وێـڕای ئـەوەی کاتی خـۆی لـە سـەرەتای تەفسـیری سـوورەتی (**البقـرة**)دا، شـتێکمان لەوبـارەوە باسـکردوە، گرنـگ ئەوەیـە، ئـەو پیتانـە ئەوەیـان لـێ دەفامرێتـەوە، کـە خـوای بـەرزی مـەزن بـە هـۆی هێنـانی ئـەو پیتانـەوە، ناڕاسـتەوخۆ بـە خەڵـک دەفەرمـوێ: بزانـن! کـە ئـەم قوڕئانـە فەرمایشـتی منـە، بـە بەڵگـەی ئـەوە کـە هـەر لـەو پیتانـەو، لـەو دەنگانـە پێـک هاتـوە، کـە ئێـوە قسـەیان پـێ دەکـەن، لـە (**ح، م، أ، ل، ر، ص، ط، هــ...هتـد**)، بـەڵام ئێـوە لـە بەرانبەریـدا دەستەوسـتان و دەسـتە پاچـەن، نـەک هـەر ناتوانـن وێنەیەکـی وەک ئـەو قوڕئانـە بێنـن، ناتوانـن دە (١٠) سـوورەتیش بێنـن، بەڵکـو ناتوانـن وێنـەی سوورەتێکیشـی بێنـن.

کەواتـە: بزانـن ئـەو کەسـەی لـەو کەرەسـتەیەی کە لـە بەردەسـتی ئێوەشـدا هەیە، ئـەم فەرمایشـتەی ڕەخسـاندوە، بزانـن ئـەوە خـوای پـەروەردگارە، نـە موحەممـەدە ﷺ خـۆی، نـە کەسـێکی دیکەشـە موحەممـەدی فێرکردبـێ، بەڵکـو ئـەوە فەرمایشـتی خوایـە، بـە بەڵگـەی ئـەوە کـە ئێـوە ناتوانـن، وێنـەی ئـەوە بەڵکـو وێنـەی بەشـێکی بچووکـی ئـەوە، کـە سـوورەتێکی سـێ ئایەتییـە، وەک: (**العـصر، الكوثـر، النـصر**) بێنـن.

﴿ وَٱلۡكِتَٰبِ ٱلۡمُبِينِ ﴾، سـوێند بـە کتێبـی ڕۆشـن، یاخـود سـوێند بـە کتێبـی ڕۆشـنکەرەوە، وشـەی (**مُبـِين**) دەگونجـێ لـە (**أَبَـانَ**)ی (لازم)ەوە بـێ، کـە بـەرکاری ناوێـت، واتـە: بـە مانـای (**بَانَ**)یـە، وەک (**بَـانَ القَمَـرُ**)، یـان (**أَبَـانَ القَمَـرُ**)، واتـە: مانگەکـە دەرکـەوت، دەشـگونجێ لـە (**أَبَانَ**)ی تێپەڕکـەر (**مُتَعَـدِّي**)ەوە بێ، کـە بەرکار

دەخوازێ، وەک (أَبَانَت الشَّمْسُ الأَرْضَ)، واتە: خۆر سەر زەمینی دەرخست، یان (أَبَانَ المُدَرِّسُ الدَّرْسَ)، واتە: وانەبێژەکە دەرسەکەی ڕوون کردەوە.

لێرەدا: ﴿ وَٱلْكِتَـٰبِ ٱلْمُبِينِ ﴾، واتە: سوێند بە کتێبی ڕۆشن، یان سوێند بە کتێبی ڕۆشنکەرەوە، چی ڕۆشن دەکاتەوە؟ هەموو ئەو ڕاستییانەی مرۆڤ پەکی لەسەریان کەوتووە، لە مەودای زانینی عەقڵدا نین، ئەم قورئانە ئەو ڕاستییانە هەموویان بۆ مرۆڤ ڕۆشن دەکاتەوە.

﴿ إِنَّآ أَنزَلْنَـٰهُ فِى لَيْلَةٍ مُّبَـٰرَكَةٍ ﴾، بە دڵنیایی ئێمە لە شەوێکی بە پێزدا دامانبەزاندوە، ئەمە سوێند لەسەر خوراو (مُقْسَمٌ عَلَيْهِ) ەکەیە، چونکە سوێند پێخوراو (مُقْسَمٌ بِهِ) ەکە: بریتیە لە: ﴿ وَٱلْكِتَـٰبِ ٱلْمُبِينِ ﴾، ئەوەش ڕای ڕاسترە کە (و) بۆ سوێندە، بەڵام سوێند لەسەر خوراو (مُقْسَمٌ عَلَيْهِ) بریتیە لە: ئێمە دامانبەزاندوە لە شەوێکی پڕ پیت و پێزدا، لە شەوێکی بە فەڕدا، ﴿ إِنَّا كُنَّا مُنذِرِينَ ﴾، بە دڵنیایی ئێمە ترسێنەرین، وریاکەرەوەین، واتە: لە میانی دابەزاندنی قورئاندا، مرۆڤەکان وریا دەکەینەوەو دەیانترسێنین، لەو چارەنووسەی چاوەڕێیان دەکات، کە بریتیە لە هاتنی ڕۆژی دوایی، بە هەردوو قۆناغی ئاخیر زەمان و قیامەت و زیندووبوونەوەوە و، ئەوەی لە ڕۆژی دواییدا دێتە دی، لە قۆناغی دووەمیدا کە بریتیە لە پێدرانەوەی نامەو لیستی کردەوەکان، پاشان وەرگرتنەوەی سزا یاخود پاداشت بە پێی کردەوەکان، ﴿ فِيهَا يُفْرَقُ كُلُّ أَمْرٍ حَكِيمٍ ﴾، لەو شەوەدا هەموو کارێکی پڕ حیکمەت ڕوون دەکرێتەوە، بڕیار دەدرێ و ڕادەگەیەنرێ، ئێمە دواتر بە وردیی لەوبارەوە قسە دەکەین، کە مەبەست لە: ﴿ لَيْلَةٍ مُّبَـٰرَكَةٍ ﴾، شەوی قەدرە، کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ إِنَّآ أَنزَلْنَـٰهُ فِى لَيْلَةِ ٱلْقَدْرِ ﴿١﴾ ﴾القدر، شەوی قەدریش لە شەوەکانی مانگی ڕەمەزانە، بە بەڵگەی ئەوە کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ شَهْرُ رَمَضَانَ ٱلَّذِىٓ أُنزِلَ فِيهِ ٱلْقُرْءَانُ ﴿١٨٥﴾ ﴾البقرة، واتە: مانگی ڕەمەزان کە قورئانی تێدا دابەزێندراوە، ئنجا کە خوا ﷻ فەرمووشیەتی: قورئانمان دابەزاندوە لە شەوێکی پڕ پێت و پێزدا، یان لە شەوێکی بە قەدرو

قیمەتدا، یان لە شەوی ئەندازەگیرییدا، وەک لە سووڕەتی (**القدر**)دا، هاتوە، واتە: دەستپێکی دابەزینی قورئان لەو شەوەدا بووە، ئەگەرنا هەمووی لەو شەوەدا دانەبەزیوە، ئەوەش کە دەگوترێ: دابەزینی یەکەمی قورئان بۆ ئاسمانی دنیا هەمووی لەو شەوەدا بووە، دوایی وردە وردە بە پێی پێداویستیی دابەزێندراوە، بەڵگەیەکی وای لەسەر نیە، بەڵکو دەستپێکی دابەزینی قورئان لەو شەوەدا بووە، کە دواتر قسەی لێ دەکەین، زۆربەی زانایان دوای لێکۆڵینەوەی ورد ڕایان وایە، کە لە شەوی (٢١)ی مانگی (**رمضان**)ی، ئەو ساڵەدا بووە، کە پێیگوتراوە: ساڵی ڕەوانەکرانی پێغەمبەری خوا ﷺ، کە دەکاتە ساڵی (٤١)ی دوای ڕووداوی (**فیل**)، واتە: (٤٠) ساڵ، یان (٤١) ساڵ دوای ڕووداوی هاتنی سوپای (ئەبڕەهە)، کە بە ساڵی فیل (**عام الفیل**) بەناوبانگ بووە، پێغەمبەری خوا ﷺ لەو ساڵەدا لە دایک بووەو چل (٤٠) ساڵ دوای ئەوەش، قورئان بۆ پێغەمبەری خاتەم ﷺ دابەزێنراوەو، موحەممەد کراوەتە کۆتا پێغەمبەری خوا.

﴿ أَمْرًا مِّنْ عِندِنَآ ﴾، واتە: ئەو کارە پڕ حیکمەتانەی لەو شەوەدا ڕادەگەیەنرێن و ڕوون دەکرێنەوە، فەرمانە لە لایەن ئێمەوە، ﴿ إِنَّا كُنَّا مُرْسِلِينَ ﴾، بێگومان ئێمە ڕەوانەکەرین، واتە: بۆ پێغەمبەری خاتەم ﷺ کە کۆتا پێغەمبەرەو، بۆ تێکڕای پێغەمبەرانیش لە پێش ئەودا.

﴿ رَحْمَةً مِّن رَّبِّكَ ﴾، چ ئەو دابەزاندنەی قورئان، چ ئەو ڕەوانەکردنەی پێغەمبەران (**عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم**)، بە تایبەت پێغەمبەری کۆتایی، بەزەییەکە لە پەروەردگارتەوە، ﴿ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴾، بە دڵنیایی ئەو بیسەری زانایە، واتە: هەموو شتێک دەبیستێ، دەزانێ حاڵ و باڵی مرۆڤەکان چۆنەو، زانایە بە حاڵ و باڵیان، دەزانێ کە ئەوان پێویستییان بە وەحیی و پەیام و بە بەرنامەی خوایە.

﴿ رَبِّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَآ ﴾، پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەی نێوانیانە، ﴿ إِن كُنتُم مُّوقِنِينَ ﴾، ئەگەر ئێوە لە دڵنیایی دەگەڕێن و، لە زانیارییەکی دڵنیایی دەگەڕێن، زانیاریی ڕاست و دروست، کە بریتیە لە

پەروەردگاریەتیی خوا بۆ ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەی نێوانیان، یاخود ئەگەر ئێوە زانیارییەکی تێرو تەواوو وردو جێی دڵنیاییتان هەبێ، دەزانن کە پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەی نێوانیان، خوای بەرزی مەزنی بێ وێنەیەو، هەر ئەویش دابەزێنەری قورئان و نێرەری پێغەمبەرانە (**عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ**).

﴿ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ﴾، بێجگە لەو هیچ پەرستراوێک نیە، کە شایستەی پەرستران بێ، ئەگەرنا پەرستراوانی ساختەو بێ نێوەڕۆک زۆرن، یانی: (لَآ إِلَٰهَ بِحَقٍّ إِلَّا هُوَ)، پەرستراوێک کە شایستەی پەرستن بێ و هەق بێ، تەنیا ئەوە، ﴿ يُحْيِۦ وَيُمِيتُ ﴾، دەژێنێ و دەمرێنێ، واتە: ژیان پەیدا دەکات و ژیانیش لە ژیانداران وەردەگرێتەوە، ﴿ رَبُّكُمْ وَرَبُّ ءَابَآئِكُمُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴾، پەروەردگاری ئێوەشەو پەروەردگاری باب و باپیرانی یەکەمیشتانە، ئەوانەی کە لە پێش ئێوەدا بوون، یان ئەوانەی لە سەرەتاوە هەبوون.

﴿ بَلْ هُمْ فِى شَكٍّ يَلْعَبُونَ ﴾، [ئەوانە خاوەنی یەقین و زانیاریی تێرو تەواوو جێی دڵنیایی نین]، بەڵکو ئەوانە لە دوو دڵییدا یاریی و گەمە دەکەن، واتە: لە دوو دڵیی خۆیاندا دێن و دەچن، وەک چۆن منداڵێک یان کەسێک گەمە دەکات، بەبێ ئامانج، بێ ئەوەی ئامانجێکی ڕاستی هەبێ بۆ جم و جۆڵەکانی.

﴿ فَٱرْتَقِبْ يَوْمَ تَأْتِى ٱلسَّمَآءُ بِدُخَانٍ مُّبِينٍ ﴾، ئنجا چاوەڕێ بە، هی ڕۆژێک کە ئاسمان دووکەڵێکی ڕوون و ئاشکرا دێنێ، چاوەڕێی ئەو ڕۆژە بە.

﴿ يَغْشَى ٱلنَّاسَ ﴾، (ئەو دووکەڵە) خەڵک دادەپۆشێ، وەک چۆن پۆشاکێک بەسەر خەڵکێکدا دادەدرێ، ئەو دوو کەڵە دایاندەپۆشێ، ﴿ هَٰذَا عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴾، ئەمە ئازارێکی بە ئێشە، ئەمە هەر فەرمایشتی خوایە، دەفەرموێ: ئەمە ئازارێکی بە ئێشە، یاخود: ئەوان کە سزا دەدرێن دەڵێن: (**يقولون**)، یانی: ئەمە گوتراوی قسەیەکی قرتێنراو (**مقول قول محذوف**)ە.

﴿ رَّبَّنَا ٱكْشِفْ عَنَّا ٱلْعَذَابَ إِنَّا مُؤْمِنُونَ ﴾، [دەپاڕێنەوەو، دەڵێن:] پەروەردگارمان! ئازارمان لێ لابەرە، ئێمە بڕواداریـن، واتـە: ئێمـە دەبینـە بـڕوادار، ئەگـەر ئازارمـان لـێ لابـەری.

﴿ أَنَّىٰ لَهُمُ ٱلذِّكْرَىٰ ﴾، چۆنیـان وەبیردێتـەوە، یـان چـۆن پەنـد وەردەگـرن، ﴿ وَقَدْ جَآءَهُمْ رَسُولٌ مُّبِينٌ ﴾، کـە بـە دڵنیایـی پێغەمبەرێکـی ڕۆشـنکەرەوەیان بـۆ هاتبـوو، یـان: پێغەمبەرێکـی ڕۆشـن و ڕوونیـان بـۆ هاتبـوو، کـە هیـچ پـەردە بەسـەر کەسـایەتیی ئـەوەوە نیـە، کـە موحەممـەدە ﷺ، هـەر کەسـێ لێـی وردبێتـەوەو تەماشـای بـکات و پێـی ئاشـنا بـێ، دەزانـێ کـە پێغەمبـەرەو ڕەوانەکـراوی خوایـە، کەچـی بڕوایـان پـێ نەهێنـا، ئنجـا کـە بڕوایـان بـەو نەهێناوە،چـۆن بـڕوا بـەو ڕووداوە دێنـن؟!.

﴿ ثُمَّ تَوَلَّوْا۟ عَنْهُ وَقَالُوا۟ مُعَلَّمٌ مَّجْنُونٌ ﴾، دوایـی پشـتیان تێکـردو گوتیـان: فێرکـراوە، شـێتە، واتـە: هەندێکیـان دەیانگـوت: فێرکـراوە و هەندێکیشـیان دەیانگـوت: شـێتە، وەک لـە بـارەی فێرکرانیـەوە، هاتـوە: ﴿ وَلَقَدْ نَعْلَمُ أَنَّهُمْ يَقُولُونَ إِنَّمَا يُعَلِّمُهُۥ بَشَرٌ ۗ لِّسَانُ ٱلَّذِى يُلْحِدُونَ إِلَيْهِ أَعْجَمِىٌّ وَهَٰذَا لِسَانٌ عَرَبِىٌّ مُّبِينٌ ﴿١٠٣﴾ ﴾**النحـل**، واتـە: ئێمـە بـە دڵنیایـی دەزانیـن کـە دەڵێـن ئـەوە مرۆڤێـک فێـری کـردوە، بـەڵام زمـانی ئـەو کەسـەی ئامـاژەی پـێ دەکـەن، (**أعجمي**)یـە، (کـە غوڵامێـک، یـان دوو غوڵامـی نەصرانیـی بـوون)، بـەڵام ئەمـە قورئانێکـی بـە زمـانی عەرەبیـی ڕۆشـن و ڕۆشـنکەرەوەیە.

کەواتـە: بابایەکـی غەیـری عەرەبیـی چـۆن ئـەو زمانـە عەرەبییـە ڕۆشـنە دەزانـێ، کـە زمـان پـاراوو ڕەوانبێژەکانی عەرەب، لـە بەرانبەریدا دەستەوسـان و دەسـتەپاچەن؟!

هەندێکیـش دەیانگـوت: شـێتە، ئەگەرنـا ئەوانـەی کـە گوتوویانـە: فێرکـراوە، هـەر ئەوانیـش نەیانگوتـوە شێتیشـە، چونکـە ئەگـەر شـێت بـێ، فێـر ناکـرێ، ئەوانـەش کـە گوتوویانـە: شـێتە، نەیانگوتـوە: فێرکـراوە، بەڵکـو هەندێـکان گوتوویانـە: فێرکـراوەو هەندێکیـان گوتوویانـە: شـێتە، بەڵکـو جـاری واش هەیـە، گوتوویانـە: جادووگـەرە، جـاری واشـە گوتوویانـە: کاهینـە، یـان شـاعیرە، وەک لـە شـوێنەکانی دیکـەدا هاتـوە.

﴿ إِنَّا كَاشِفُوا۟ ٱلْعَذَابِ قَلِيلًا ﴾، ئێمە بۆ ماوەیەكی كەم لابەری ئازارو سزاین، ﴿ إِنَّكُمْ عَآئِدُونَ ﴾، بە دڵنیایی (دوای لادانی سزاو ئازار لەسەرتان)، ئێوە گەڕاوەن دووبارە، لە جیاتی ئەوەی پەندی لێوەربگرن، ئێستا دەڵێن: بڕوا دێنین، بەڵام دوای ئەوەی سزاو ئازارەكە لادەچێ، بڕوا ناهێنن و دەگەڕێنەوە، واتە: دەگەڕێنەوە سەر بەزمی پێشێیان، كە كوفرو هاوبەش بۆ خوا دانانە.

﴿ يَوْمَ نَبْطِشُ ٱلْبَطْشَةَ ٱلْكُبْرَىٰٓ إِنَّا مُنتَقِمُونَ ﴾، ئەو ڕۆژە كە پەلاماری گەورە دەدەین، یاخود، زەبری گەورەتر دەوەشێنین، بە دڵنیایی ئەو ڕۆژە ئێمە تۆڵەستێنین، تۆڵەیان لێدەكەینەوە، یاخود سزا دەرین و سزایان دەدەین، ئەگەر بێت و لەسەر ئەو حاڵەی خۆیان هەر بەردەوام بن، كە وەک لە هۆی هاتنە خوارەوەكەی دا باسمان كرد، ڕای ڕاستتر ئەوەیە: مەبەست لە هاتنی ئەو دووكەڵە، ئەوە بووە كە گرانییساڵیان بەسەردا هاتوە، وشكە ساڵییان بەسەردا هاتووەو، قات و قڕیی بووەو بەرچاویان لێڵ بووە، كە تەماشای سەرەوەی خۆیان كردوە، وەک دووكەڵ هاتۆتە بەرچاو، دواییش پێغەمبەر ﷺ كە بۆیان پاڕاوەتەوەو، ئەو حاڵەیان لاچووە، پێشێ وایانپێشانداوە كە بڕوا دێنن و دوایی بڕوایان نەهێناوە، بۆیە خوا ﷻ دەفەرموێ: ئێمە ئەو سزایە كەمێک لادەدەین، بەڵام ئێوە دووبارە دەگەڕێنەوە، دوایی خوا ﷻ هەڕەشەی لێكردوون، كە ئەگەر هەر لەسەر ئەو حاڵە بەردەوام بن، ئێمە زەبری گەورەتر دەوەشێنین، پەلاماری گەورەتر دەدەین، لەو ڕۆژەدا ئێمە سزاتان دەدەین، كە بریتی بووە لە جەنگی (بەدر)، ئەوە بوو كە هەر بەردەوام بوون لەسەر كوفرو شیرک، تاكو ئەو بەڵا گەورەی جەنگی بەدریان بەسەرهات، كە حەفتا (٧٠) كەس لە زلەزلەكانیان كوژران و حەفتا (٧٠) شیان لێ بەدیل گیران، ئەوەش زەبرێكی زۆر گەورە بوو، بۆ ئەوان.

هەندێكیش گوتوویانە: ﴿ يَوْمَ نَبْطِشُ ٱلْبَطْشَةَ ٱلْكُبْرَىٰٓ ﴾، مەبەست پێی ڕۆژی دواییەو سزای دۆزەخە، بەڵام زیاتر، وا پێدەچێ مەبەست پێی سزای دنیایی بێ و، لە ڕاستییدا زەبرێكی گەورە بوو، لێیان وەشێندرا لە جەنگی

بـەدردا، ئەگـەر ئینسـان تەماشـای جەنگـی (بـەدر) بـکات، وەک کاتـی خـۆی لـە تەفسـیرکردنی سـوورەتی (**الأنفـال**)دا، باسـمانکردووەو بەسـەرهاتەکەمان هێنـاوە، ئەگـەر لێـی وردبیـەوە، بـە ئاشـکرا دەسـتی خـوای پـەروەردگاری تێـدا دەبینـی، چونکـە مسـوڵمانان سـێیەک (١/٣) ژمـارەی کافـرەکان بـوون، ئـەوان دەوری (٣١٤) بـوون و کافـرەکان دەوری هـەزار (١٠٠٠) کـەس یاخـود زیاتریـش بـوون و، پاشـان ئـەوان وڵاخ و تفـاق چـەک و هەمووشـتیان باشـتر بـوو، لـە هـی مسـوڵمانان، لەگـەڵ ئەوەشـدا کـە مسـوڵمانان بـە سـەرکردایەتیی پێغەمبـەر ﷺ بـۆ جەنگیـش نەچـوو بـوون، بـۆ ڕێگرتـن بـە کاروانەکەیـان چـوو بـوون، ئـەو کاروانـەی ئەبـوو سـوفیان سـەرقافڵەی بـووو لـە شـام دەگەڕایـەوە، واتـە: بـە نیـەتی جەنگکـردن نەچـوو بـوون، تاکـو چـاک خۆیـان ئامـادە بکـەن و، خەڵکێکـی زیاتـر بێنـن، لەگـەڵ ئەوەشـدا خـوا ﷻ شکسـت و فەشـەلێکی گـەورەی بەسـەر کافـرەکان هێنـاو، بـۆ مسـوڵمانانیش سـەرکەوتنێکی گـەورە بـوو، خـواش ﷻ نـاوی لێنـا: (**یـوم الفرقـان**)، (**یـوم التقـی الجمعـان**)، ڕۆژی لێـک جیاکـەرەوەی هـەق و ناهـەق، ئـەو ڕۆژە کـە دوو هێـزەکان پێـک گەیشـتن.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**قورئـان کتێبێکـی ڕۆشـن و ڕوونکەرەوەیـەو، لـە شـەوێکی بەپێـزو فـەڕدا، کـە شـەوی (قـدر)ە، دابەزێـنراوە، کـە هـەر بڕیارێکـی کارزانانـەی خـوای تێـدا دەدرێ، خـوای پەروەردگاریـش بیسـەرو زانـاو خـاوەنی گـەردوون و، تـا کـە پەرسـتراوو ژیێنـەرو مرێنـەرە:**

خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿حمٓ ۝١ وَٱلۡكِتَٰبِ ٱلۡمُبِينِ ۝٢ إِنَّآ أَنزَلۡنَٰهُ فِي لَيۡلَةٖ مُّبَٰرَكَةٍۚ إِنَّا كُنَّا مُنذِرِينَ ۝٣ فِيهَا يُفۡرَقُ كُلُّ أَمۡرٍ حَكِيمٍ ۝٤ أَمۡرٗا مِّنۡ عِندِنَآۚ إِنَّا كُنَّا مُرۡسِلِينَ ۝٥ رَحۡمَةٗ مِّن رَّبِّكَۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ ۝٦ رَبِّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَمَا بَيۡنَهُمَآۖ إِن كُنتُم مُّوقِنِينَ ۝٧ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ يُحۡيِۦ وَيُمِيتُۖ رَبُّكُمۡ وَرَبُّ ءَابَآئِكُمُ ٱلۡأَوَّلِينَ ۝٨ بَلۡ هُمۡ فِي شَكّٖ يَلۡعَبُونَ ۝٩﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە پازدە بڕگەدا:

١)- ﴿حمٓ﴾، حا، میم، دوو پیتن، پیتی (ح)و پیتی (م)، هەموو قورئان لەو (٢٨) پیتە پێکهاتوە، کە زمانی عەرەبییان لێ پێک دێ، واتە: کەرەستەی پێک هاتنی قورئان، هەر ئەو پیتانەن، کەچی نەک هەر گەلی عەرەب، بەڵکو مرۆڤایەتیی بە گشتیی، بەڵکو مرۆڤ و جند بە گشتیی، لە بەرانبەر تەحەددای قورئاندا، کە داوای هاتنە مەیدانی لێکردوون و پێشێ فەرموویەتی: قورئانێکی وا بێنن، دوایی بۆیان دابەزیوەو سووکی کردوەو فەرموویەتی: دە سوورەت بێنن، وەک لە سوورەتی (**هود -١٣-**)دا هاتوە، دوایی فەرموویەتی: سوورەتێک بێنن، وەک هەر کام لە سوورەتەکانی (**البقرة-٢٣-**) و، سوورەتی (**یونس-٣٨-**)دا، بەڵام هەر دەستە پاچەو دەستەوسان بوون و نەیانتوانیوە.

٢)- ﴿ وَٱلۡكِتَٰبِ ٱلۡمُبِينِ ﴾، سوێند بە کتێبی ڕۆشن، یاخود سوێند بە کتێبی ڕۆشنکەرەوە، (**الكتاب**) کە (أل)ی ناساندنی لەسەرە، ناساندنەکەی بۆ (عهد)ە، واتە: سوێند بە کتێبە ڕۆشنەکە، یان سوێند بە کتێبە ڕۆشنکەرەوەکە، کە قورئانە، وەک بە پێی سیاق دەردەکەوێ، زیاتریش وا پێدەچێ، لێرەدا: (**مُبِين**)، مەبەست پێی ڕوونکەرەوە بێ، واتە: لە (**أَبَان**)ی (**مُتَعَدِّي**)یەوە، هاتبێ، لەبەر ئەوەی قورئان ڕاستییەکان ڕووندەکاتەوە، بەڵێ قورئان ڕۆشنە، بەڵام لێرەدا وا پێدەچێ مەبەست پێی ئەوە بێ، قورئان هەموو ڕاستییەکان کە مرۆڤ پەکی لە سەریان کەوتوەو، ڕوونیان دەکاتەوە، ئەو ڕایەش پەسندترە کە (**و**) لە (**والكِتَاب**)دا، بۆ سوێند پێخواردن بێ، یانی: سوێند بە کتێبە ڕۆشنکەرەوە (**مُبِيْن**)ەکە، ﴿ وَٱلۡكِتَٰبِ ٱلۡمُبِينِ ﴾، سوێند پێ خوراوەکەیە، ئەدی سوێند لەسەر خوراو (**مقسم عليه**) چییە؟ ڕستەکەی دواییە کە دەفەرموێ:

٣)- ﴿ إِنَّآ أَنزَلۡنَٰهُ فِي لَيۡلَةٖ مُّبَٰرَكَةٍ ﴾، ئێمە دامانبەزاندوە لە شەوێکی پڕ پیت و پێزدا، ڕاناوەکە بۆ (**كِتَاب**) دەچێتەوە، ﴿ أَنزَلۡنَٰهُ ﴾، ئەو ڕاناوی (ه)یە بۆ قورئان دەچێتەوە، ئێمە ئەم کتێبەمان دابەزاندوە لە شەوێکی پڕ پیت و پێزدا.

زانایـان هەندێکیـان گوتوویانـە: ئـەو شـەوە، مەبەسـت پێـی نیـوەی شـەعبانە، زۆربەشـیان گوتوویانـە: شـەوی قـەدرە، کـە ئێمـە دوایـی لـەو بـارەوە کورتـە باسـێک، لـە بـارەی شـەوی تێـدا دابەزینـی قورئانـەوە دەکەیـن، بـەڵام زۆربـەی هـەرە زۆری زانایـان ڕایـان وایـە، کـە مەبەسـت پێـی شـەوی قـەدرە، ﴿ إِنَّآ أَنزَلۡنَٰهُ فِي لَيۡلَةِ ٱلۡقَدۡرِ ١ ﴾**القـدر**، واتـە: شـەوی قـەدرو شـەوی پێـز (شـەوی ڕێـزو شـەوی پێـز)، هـەر یـەک شـەون، کـە لـە مانگـی ڕەمەزانـدان، وەک دەسـتپێکی دابەزینـی قورئـان، لـە سـەرەتای تەمـەنی پێغەمبەرایەتیـی موحەمـەدەوە ﷺ، ئنجـا کـە دەفەرمـوێ: ﴿ إِنَّآ أَنزَلۡنَٰهُ فِي لَيۡلَةٖ مُّبَٰرَكَةٍ ﴾، ئێمـە لـە شـەوێکی بـە بەرەکەتـدا، پـڕ پیـت و پێـزدا دامانبەزانـدوە، د (**البَرَكَـةُ: ثُبُـوتُ الخَـيْرِ الإلَهِـي فِي الـشَّيء**)، بەرەکـەت: بریتیـە لـە چەسـپاندنی پیـت و پێـزی خوایـی لـە شـتێکدا (**مُبَـارَك**) شـتێکە ئـەو خێـرو پیـت و پێـزەی خـوای تێـدا چەسـپی بـێ.

٤)- ﴿إِنَّا كُنَّا مُنذِرِينَ﴾، بە دڵنیایی ئێمە وریاکەرەوەو، ترسێنەر بووین، واتە: هەروا بووین، بە درێژایی مێژووی بەشەر، پێغەمبەرانمان (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) ناردوون و کتێبەکانمان پەیامەکانی خۆمانمان دابەزاندوون، بۆچی؟ بۆ ترساندن و هۆشیارکردنەوەی مرۆڤەکان، تاکو بزانن بۆچی هاتوونە سەر ئەم زەوییە؟ چی چاوەڕێیان دەکات؟ دەبێ ژیانەکەیان چۆن بگوزەرێنن؟ ﴿إِنَّا كُنَّا مُنذِرِينَ﴾، (مُنْذِر): کەسێکە ئینزار دەکات، هەواڵ دەدات بە شتێک، کە زیانی تێدا هەیە، بە مەبەستی ئەوە کە بابای هەواڵ پێدراو وریا بێ و خۆی بپارێزێ.

کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّا كُنَّا مُنذِرِينَ﴾، هەروەها کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّا أَنزَلْنَاهُ﴾، ئەم: (إِنَّا)یە، کە لە سەرەتای ئەو دوو ڕستانەوە هاتوە، یان بۆ جەختکردنەوەی بەرپەرچدانەوەی نکوولّییکردنی ئەوەیە، کە خوا ﷻ پێغەمبەران بنێرێ، یاخود خوا ﷻ کتێب و پەیام دابەزێنێ، یاخود تەنیا بۆ گرنگیی هەواڵەکەیەو بۆ گرنگییدانە بە هەواڵەکە.

ئەم ئایەتە موبارەکەی ئێرەش وەک ئەو ئایەتە موبارەکەی سوورەتی (الإسراء)ە، کە دەفەرموێ: ﴿وَقُرْءَانًا فَرَقْنَٰهُ لِتَقْرَأَهُۥ عَلَى ٱلنَّاسِ عَلَىٰ مُكْثٍ وَنَزَّلْنَٰهُ تَنزِيلًا ﴿١٠٦﴾﴾، واتە: قورئانێک ڕۆشنمان کردۆتەوە، تاکو بەسەر خەڵکیدا بیخوێنیەوە، بە هێدیی و مەندیی، ئێمە بەش بەش دامانبەزاندوە، ﴿وَنَزَّلْنَٰهُ تَنزِيلًا﴾، (نَزَّلْـهُ)، واتە: بەش بەش دایبەزاند، (أَنْزَلَـهُ) واتە: هەمووی پێکەوە دابەزاند، ئنجا خوا ﷻ هەم وشەی (إنـزال)ی بەکارهێناوە، واتە: کۆی قورئان دابەزێنراوە، هەم وشەی (تَنزيـل)ی بەکارهێناوە واتە: بەش بەش دابەزێندراوە، هەروەها ئەم ڕاستییە لە سوورەتی (الفرقان) ئایەتی ژمارە: (٣٢)شدا هاتوە، کە کافرەکان ئەوەیان بە ڕەخنە دەگرت لە دابەزینی قورئاندا، بۆچی هەمووی پێکەوە دانەبەزیوە؟ وەک دەفەرموێ: ﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَوْلَا نُزِّلَ عَلَيْهِ ٱلْقُرْءَانُ جُمْلَةً وَٰحِدَةً ۚ كَذَٰلِكَ لِنُثَبِّتَ بِهِۦ فُؤَادَكَ ۖ وَرَتَّلْنَٰهُ تَرْتِيلًا ﴿٣٢﴾﴾، واتە: ئەوانەی بێبڕوان گوتیان: بۆچی قورئانی هەمووی بە یەک جار بۆ سەر دانەبەزیوە؟ (خواش ﷻ دەفەرموێ:) بۆیە بەو جۆرەمان دابەزاندوە، بە یەک جار نا، بەڵکو بەش

بەش، تاكو عەقڵ و دڵتی پێ بچەسپێنین و، بە كاوەخۆ بە ڕێك و پێكیی بەسەرتدا خوێندوومانەتەوە، تاكو باشتر لە عەقڵ و دڵتدا بچەسپێ، هەم هی تۆو، هەم هی مسوڵمانانێك كە قورئان لە تۆ وەردەگرن.

دوایی خوا ﷻ لە وەصفی ئەو شەوە بە پێزەدا، دەفەرموێ:

٥)- ﴿ فِيهَا يُفْرَقُ كُلُّ أَمْرٍ حَكِيمٍ ﴾، هەموو كارێكی پڕ حیكمەت لەو شەوەدا ڕوون دەكرێتەوە، (**يُفْرَقُ: أي يُبَيَّنُ، يُفَصَّلُ، الفَرْقُ: الفَصْلُ وَالقَضَاءُ**)، (**فصل**) بە مانای ڕوونكردنەوەو لێك جیاكردنەوە دێ، فەرموویەتی: ﴿ يُفْرَقُ ﴾: (**المُضَارِعُ: يَدُلُّ عَلَى اسْتِمْرَارِ الفَصْلِ فِي كُلِّ عَامٍ**)، كە دەفەرموێ: ﴿ فِيهَا يُفْرَقُ كُلُّ أَمْرٍ حَكِيمٍ ﴾: ئەمە ئاماژەیە بەوە، كە ئەو شەوی قەدرەی خوا ﷻ لە كاروباری پڕ حیكمەتی خۆی لەوێدا ڕوون دەكاتەوەو ڕادەگەیەنێ، بەردەوامەو دووبارە دەبێتەوە.

٦)- ﴿ أَمْرًا مِّنْ عِندِنَآ ﴾، ئەو كارە كارێكە لە لایەن ئێمەوە، كارێكی گەورەو گرنگە لە لایەن ئێمەوەو، هەر كارێكی گەورەو گرنگ لەو شەوەدا، خوا ڕوونی دەكاتەوە، ئنجا كە خوا ﷻ وشەی: (**أَمْراً**)ی هێناوەو دووبارەی كردۆتەوە، بۆ زیاتر خستنەڕووی گەورەیی ئەو كارانەیە.

كە دەشفەرموێ: ﴿ مِّنْ عِندِنَآ ﴾، واتە: ئەم كارە گەورەو گرنگانە تەنیا لەلای ئێمەوە، ئاوا ڕوون دەكرێنەوەو پڕن لە حیكمەت، یاخود كاری زۆر مەحكەم و پتەوو دامەزراون، چونكە حەكیم، دەگونجێ بە خاوەن حیكمەت بێ و، هەم دەشگونجێ بە: پتەوو قاییم مانا بكرێ، كە دیارە مەزنترین كاری پڕحیكمەت و، پتەوترین كار كە لەو شەوەدا بووە، بریتی بووە لە دەستپێكردنی دابەزاندنی قورئان، لەو شەوەدا كە سەرەتای تەمەنی پڕ پیت و پێزی پێغەمبەری خاتەمە ﷺ وەك كۆتا پێغەمبەری خوا.

٧)- ﴿ إِنَّا كُنَّا مُرْسِلِينَ ﴾، بە دڵنیایی ئێمە نێرەرین، ئەمە وەك ڕستەی پێشووە، كە فەرمووی: ﴿ إِنَّا كُنَّا مُنذِرِينَ ۝٣ ﴾، لێرەدا كە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّا كُنَّا مُرْسِلِينَ ۝٥ ﴾، بە

دڵنیایی ئێمە نێرەرین، ئەمە بۆ بەرپەرچدانەوەی نکووڵییکردنی کافرەکانە، کە خوای کارزان پێغەمبەران بنێرێ، یاخود هەر بۆ گرنگییدانە بە هەواڵەکە، کە خوا ﷻ نێرەری پێغەمبەرانە (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم).

٨)- ﴿ رَحۡمَةٗ مِّن رَّبِّكَ ﴾، بەزەییە لە پەروەردگارتەوە، ئەم (رَحْمَةً)، کە (منصوب)ە لەسەر حاڵەتی: (مفعول له)ە، واتە: بۆیە پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) دەنێرین و ڕەوانەکەری پێغەمبەرانین، چونکە بەزەییمان بە مرۆڤەکاندا دێ و، دەمانەوێ بەزەییان لەگەڵدا بنوێنین.

٩)- ﴿إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ ﴾، بە دڵنیایی هەر ئەو (خوا) بیسەری زانایە، ئەمەش هێنانەوەی هۆکارو پاساوە بۆ ڕستەی پێشوو، کە بۆچی خوا ﷻ نێرەری پێغەمبەرانەو بەزەیی هاتۆتەوە بە بەندەکانیدا، لەبەر ئەوەی بەس خوا ﷻ هەموو شتێک دەبیستێ لە بارەی بەندەکانیەوەو، هەموو شتێکیشیان لە بارەوە دەزانێ، کە دەفەرموێ: ﴿ رَحۡمَةٗ مِّن رَّبِّكَ ﴾، دەشیتوانی بفەرموێ: (رَحْمَةً مِنْهُ)، بەڵام لێرەدا ئەمە: (إِظْهَارٌ فِي مَقَامِ الإِضْمَار)، دەرخستنە لە شوێنی شاردنەوە، (لإِشْعَار أَنَّ الرُّبوبيَّة تَسْتَلْزِم الرَّحْمَة)، تاکو هەست بکرێ کە پەروەردگارێتیی خوا، خوازیاری بەزەیی نواندنیەتی لەگەڵ بەندەکانیدا.

١٠)- ﴿ رَبِّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَمَا بَيۡنَهُمَآ ﴾، پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەی نێوانیانە، ئەمە خوێندراویشەتەوە: (رَبُّ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ)، واتە: هەم بە ژێر (**كسرة**)و، هەم بە بۆر (**ضمة**) خوێندراوەتەوە و، هەردووکیان یەک واتایان هەیە، واتە: پەروەرگاری ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەی نێوانیانە.

١١)- ﴿إِن كُنتُم مُّوقِنِينَ ﴾، واتە: ئەگەر ئێوە زانیاریی تەواوتان هەیە، چونکە یەقین بریتیە لە زانیارییەک کە دڵ لە دڵدانی تێدا نەمابێ، لە (يَقَن المَاءُ: أي ثَبَت)، یانی: ئاوەکە چەسپا، (**يقين**)، بریتیە لە زانیارییەک کە ئینسان لە بارەیەوە هیچ تەم و مژو، دوو دڵیی نەمابێ، واتە: ئەگەر ئێوە زانیاریی تەواوتان هەیە، بێجگە لە خوا کەسی دیکە مەپەرستن، ئەمە واتایەکی.

یاخود: ئەگەر ئێوە زانیاریی تەواوتان هەیە، بەو ڕاستییەی هەواڵم پێدان، کە پەروەردگاری ئێوە پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوییە، ئەوەش کە هەواڵم پێدان، کە خوا ﷻ خاوەنی ئەو سیفەتانەیەو، ئەم قورئانەی دابەزاندوەو موحەممەد ڕەوانەکراوی ئەوە، ئەمەش هەر هەق و جێی دڵنیاییە، هەق و چەسپاوە، کەواتە: یەقین و دڵ دامەزراوییتان بەوەش هەبێ، وەک چۆن بڕوای پتەوو دڵ دامەزراوییتان هەیە، بەرانبەر بە شتەکانی دیکە، وەک: (**الطبري**)، گوتوویەتی، هەروەها واتایەکی دیکەی سێیەمیشی هەیە: ئەگەر ئێوە بە دوای یەقین و بڕوای پتەودا دەگەڕێن، ئەوە ڕێیەکەیەتی کە دان بە پەروەردگارێتیی خوادا بێنن بۆ ئاسمانەکان و زەوی و هەرچی هەیە.

١٢)- ﴿لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ﴾، جگە لەو هیچ پەرستراوێک نیە، ئەمە دەرەنجامی ئەوەیە، کە لە پێشێدا ڕابرد، مادام هەر ئەو پەروەردگاربێ و، ئەو ورياکەرەوەی بەندەکان و، نێرەری پێغەمبەران و، دابەزێنەری کتێبان بێ، کەواتە: دەبێ هەر ئەویش بپەرسترێ.

١٣)- ﴿يُحْيِۦ وَيُمِيتُ﴾، دەژیەنێ و دەمرێنێ.

١٤)- ﴿وَرَبُّ ءَابَآئِكُمُ ٱلْأَوَّلِينَ﴾، خاوەن و پەروەردگارو مشووخۆری ئێوەشەو، هی باب و باپیرانی یەکەمیشتان و، پێشێشتانە کە ئێوە کوێرانە شوێنیان دەکەون.

١٥)- ﴿بَلْ هُمْ فِى شَكٍّ يَلْعَبُونَ﴾، بەڵکو ئەوان لە دوو دڵییدا یاریی دەکەن: (بَلْ: لِلإِضْرَابِ الإِبْطَالِي)، واتە: نەک هەر ئەوانە خاوەنی یەقین و دڵدامەزراویی نین، بەڵکو لە دوو دڵیی خۆیاندا دێن و دەچن و، گاڵتە دەکەن، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە دوو دڵیی وا لە خاوەنەکەی دەکات، گاڵتەو گەمە بکات، شت بە جیددیی وەرنەگرێ، هەروەها ئەوەش دەگەیەنێ کە سەرگەرمبوون بە گەمەو یارییەوە، هەر مرۆڤ زیاتر تووشی دوو دڵیی دەکات.

ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿فِى شَكٍّ يَلْعَبُونَ﴾، ئەوە دەگەیەنێ کە ئەوانە هێندە لە دوو دڵییدا نغرۆ بوون، دوودڵییەکە بۆیان بۆتە توورەکەو زەرفێک و چوونە نێوی.

(محمد الطاهر بن عاشور) ڕەحمەتی خوای لێ بێ، تیشکێکی جوان دەخاتە سەر ئەوەو دەڵێ: (﴿ بَلْ هُمْ فِي شَكٍّ يَلْعَبُونَ ﴿٩﴾ ﴾الدخان، بَلْ لِلْإِضْرَابِ الْإِبْطَالِيِّ، رَدٌّ بِهِ أَنْ يَكُونُوا مُوقِنِينَ وَمُقِرِّينَ بِأَنَّهُ رَبُّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا، فَإِنَّ إِقْرَارَهُمْ غَيْرُ صَادِرٍ عَنْ عِلْمٍ وَيَقِينٍ ثَابِتٍ، بَلْ هُوَ كَالْعَدَمِ لِأَنَّهُمْ خَلَطُوهُ بِالشَّكِّ وَاللَّعِبِ، فَارْتَفَعَتْ عَنْهُ خَاصِّيَّةُ الْيَقِينِ وَالْإِقْرَارِ الَّتِي هِيَ الْجَرْيُ عَلَى مُوجَبِ الْعِلْمِ، فَإِنَّ الْعِلْمَ إِذَا لَمْ يَجُرَّ صَاحِبَهُ عَلَى الْعَمَلِ بِهِ وَتَجْدِيدِ مُلَاحَظَتِهِ، تَطَرَّقَ إِلَيْهِ الذُّهُولُ ثُمَّ النِّسْيَانُ فَضَعُفَ حَتَّى صَارَ شَكًّا لِانْحِجَابِ الْأَدِلَّةِ الَّتِي يَرْسَخُ بِهَا فِي النَّفْسِ)[1].

واتە: کە دەفەرموێ: ﴿ بَلْ هُمْ فِي شَكٍّ يَلْعَبُونَ ﴿٩﴾ ﴾، ئەمە بۆ گواستنەوەی هەڵوەشاندنەوەیە، (واتە: کە دەفەرموێ: ﴿ إِن كُنتُم مُّوقِنِينَ ﴿٧﴾ ﴾، ئەگەر ئێوە، خاوەنی زانیارییەکی جێگیرو جێی دڵنیایین)، خوا دەفەرموێ: بەڵکو ئەوان نەک خاوەنی یەقین و زانیاریی جێی دڵنیایی نین، بەڵکو لە دوودڵییدا گەمە دەکەن و دێن و دەچن، ئەمە هەڵوەشاندنەوەی ئەوەیە، کە ئەوان خاوەنی یەقین و جێی دڵنیایی بن و، دانپێداهێنەری ئەوەبن، کە خوا پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەی نێوانیانە، (چونکە هەرچەندە دانیان بەوەدا هێناوە، وەک خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَهُمْ لَيَقُولُنَّ اللَّهُ ﴿٨٧﴾ ﴾الزخرف، ﴿ وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ لَيَقُولُنَّ اللَّهُ ﴿٣٨﴾ ﴾الزمر، ئەگەر لێیان بپرسی: کێ دروستی کردوون؟ بە دڵنیایی دەڵێن: خوا)، (ئەگەر لێیان بپرسی: کێ ئاسمانەکان و زەوی دروست کردوون؟ دەڵێن: خوا ﷻ).

بەڵام ئەو دانپێداهێنانەیان لە زانیاریی و یەقینێکی چەسپاوەوە نەبووە، بەڵکو وەک نەبوون وابووە، چونکە لەگەڵ دوو دڵیی و لەگەڵ یاریی و گەمەدا، تێکەڵیان کردوە، بۆیە تایبەتمەندێتیی یەقینی نەماوە، چونکە دڵنیایی (یقین) ئەوەیە کە بە پێی زانیارییەکی پێویستکراو کاربکرێ، ئنجا زانیاریی ئەگەر

---

(١) التحرير والتنوير، ج٢٥، ص٢٨٤ - ٢٨٥.

خاوەنەکەی لەسەر کارپێکردنی بەردەوام نەبێ و تازەی نەکاتەوە، بێئاگایی پاشان لەبیر چوونەوەی تێکەڵ دەبێ و، وای لێ دێ، هێندە بێهێز دەبێ تاکو دەبێتە دوو دڵیی، لەبەر ئەوەی ئەو بەڵگانەی بە هۆیانەوە لە دەروووندا دەچەسپن، ئەو بەڵگانە پەنهان دەبن و نامێنن.

منیش تێبینییەکەیم زۆر پێ جوانە، چونکە ئەمە نەک هەر بۆ هاوبەش بۆ خوا دانەرەکانی ڕۆژگاری پێغەمبەر ﷺ، بەڵکو بۆ مسوڵمانانیش هەر وایە، مسوڵمانانیش زۆر کەس، دەڵێ: دەزانم خوا پەروەردگارەو بەدیهێنەرەو خاوەنە، بەڵام هەڵسوکەوت و ڕەفتارەکانی وەک هی مسوڵمانان نین، بە تایبەت هەندێ خەڵکی بەرپرس، کە خۆشیان بە مسوڵمان دەزانن و، قبووڵیش ناکەن هیچکەس بە نامسوڵمان ناوزەدیان بکات، بەڵام تەماشا دەکەی، هیچ پابەندییەکیان نیە بە شەریعەتەوە، وەک کابرا گوتی: دیتوومە ڕۆژووێ بخوات، بەڵام نەمدیتوە نوێژێ بکات! سەرباری ئەوەی ئەهلی شەڕابن، داوێن پیسن، زوڵم و خراپەو غەدر دەکەن، درۆ و خیانەت دەکەن، خۆشیان بە مسوڵمان دەزانن، ئنجا ڕەنگە یەکیان دەشڵێ: دەزانم خوا هەقەو، دەزانم زیندووبوونەوە هەیە، دەزانم موحەممەد پێغەمبەری خوایە، ڕەنگە جۆرێک لە قەناعەتی هەڵبزرکاوو سادە لە عەقڵ و دڵیدا هەبێ، بەڵام ئەو قەناعەت و دانپێداهێنانە، لەبەر ئەوەی هۆکارەکانی چەسپاندنی خەمیان لێ نەخوراوە، بۆیە وردە وردە ماوەتەوە، شتێکی هەڵبزرکاوی سادەی سەرکێڵ، کە خاوەنەکەی وا لێ ناکات، پابەندبێ بە شەریعەتی خواوە، بەپێی ئەو ئیددیعایەی دەیکات، کە مسوڵمانێتییە، ڕەفتارو هەڵسوکەوت بکات.

## کورتە باسێک لە بارەی شەوی تێدا دابەزێنرانی قورئانەوە

بەڕێزان! ئەم کورتە باسە لە پێنج بڕگەدا دەکەین، خوا ﷻ کە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّآ أَنزَلۡنَٰهُ فِي لَيۡلَةٖ مُّبَٰرَكَةٍۚ إِنَّا كُنَّا مُنذِرِينَ ۝٣ ﴾الدخان، واتە: ئێمە دامانبەزاندوە، (قورئان) لە شەوێکی بەپیێزدا، ئێمە ترسێنەرو وریاکەرەوە بووین بۆ مرۆڤەکان.

هەروەها لە سوورەتی (القدر)یشدا، کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ إِنَّآ أَنزَلۡنَٰهُ فِي لَيۡلَةِ ٱلۡقَدۡرِ ۝١ وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا لَيۡلَةُ ٱلۡقَدۡرِ ۝٢ لَيۡلَةُ ٱلۡقَدۡرِ خَيۡرٞ مِّنۡ أَلۡفِ شَهۡرٖ ۝٣ تَنَزَّلُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ وَٱلرُّوحُ فِيهَا بِإِذۡنِ رَبِّهِم مِّن كُلِّ أَمۡرٖ ۝٤ سَلَٰمٌ هِيَ حَتَّىٰ مَطۡلَعِ ٱلۡفَجۡرِ ۝٥ ﴾.

لێرەدا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّآ أَنزَلۡنَٰهُ فِي لَيۡلَةٖ مُّبَٰرَكَةٍ ۝٣ ﴾**الدخان**، لە شەوێکی بە پیێزدا، بەڵام لە سوورەتی (القدر)دا، دەفەرموێ: ﴿ إِنَّآ أَنزَلۡنَٰهُ فِي لَيۡلَةِ ٱلۡقَدۡرِ ۝١ ﴾، لە شەوی ڕێزو حورمەتدا، هەروەک وشەی (قدر) بە ئەندازەگیرییش دێ، کەواتە: خوا ﷻ ئەو شەوەی بەسێ وەسفان، پێناسە کردوە:

**یەکەم:** شەوێکی بەپیێزە.

**دووەم:** شەوێکی بەڕێزە.

**سێیەم:** شەوێکە ئەندازەگیریی تێدا دەکرێ.

کە لێرەدا دەفەرموێ: ﴿ فِيهَا يُفۡرَقُ كُلُّ أَمۡرٍ حَكِيمٍ ۝٤ ﴾، لە سوورەتی (القدر)یشدا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّآ أَنزَلۡنَٰهُ فِي لَيۡلَةِ ٱلۡقَدۡرِ ۝١ وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا لَيۡلَةُ ٱلۡقَدۡرِ ۝٢ لَيۡلَةُ ٱلۡقَدۡرِ خَيۡرٞ مِّنۡ أَلۡفِ شَهۡرٖ ۝٣ ﴾، واتە: ئێمە لە شەوی قەدردا دامانبەزاندوە، چووزانی شەوی قەدر چییە! شەوی قەدر لە هەزار (١٠٠٠) مانگ باشترە، ﴿ تَنَزَّلُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ وَٱلرُّوحُ فِيهَا بِإِذۡنِ رَبِّهِم مِّن كُلِّ أَمۡرٖ ۝٤ ﴾، ڕووح (جیبریل) و فریشتەکان، لەو شەوەدا دادەبەزن، ﴿ مِّن كُلِّ أَمۡرٖ ﴾، بۆ هەر کارێک، وەک چۆن لێرەدا دەفەرموێ: ﴿ فِيهَا يُفۡرَقُ كُلُّ أَمۡرٍ

حَكِيمٍ ﴿٤﴾﴾، لەوێشـدا دەفەرمـوێ: بـۆ هـەر کارێـک جیبریـل و فریشـتەکان تێـدا دادەبـەزن، ﴿سَلَٰمٌ هِيَ حَتَّىٰ مَطْلَعِ ٱلْفَجْرِ ﴿٥﴾﴾، ئـەو شـەوە هـەر پڕخێـرو خۆشـیی و ئاشـتییە، تاکـو بەرەبەیـان، کـە بـە پێـی سـوورەتی قـەدر، بەپێـی ئـەم ئایەتـەش لـە سـوورەتی (الدخـان) ئـەوە دەردەکـەوێ، کـە ئـەو شـەوەش شـەوێکی دووبارەبـووەوە بـێ، لـە هەمـوو سـاڵەکاندا، بەڵـێ شـەوێک بـووە قورئـانی تێـدا دابەزێـنراوە، وەک دەسـتپێک، بـەڵام ئـەو شـەوە، سـاڵانەش دووبـارە دەبێتـەوە.

ئێستاش بائەوەی بەکورتیی گوتمان لە پێنج بڕگەدا شی بکەینەوە:

**بڕگـەی یەکـەم:** زانایـان لـە بـارەی ئـەو شـەوە بـە پێـزەوە، یـان ئـەو شـەوە بەرێـزەوە کـە قورئـانی تێـدا دابەزێـنراوە، بـە گشـتیی دوو ڕایـان هـەن:

١- کە هی زۆربەی هەرە زۆریانە، گوتوویانە: ئەو شەوە هەمان شەوی ڕێز ﴿لَيْلَةِ ٱلْقَدْرِ﴾ە، کە لە سوورەتی (القدر)دا، هاتوە: ﴿إِنَّآ أَنزَلْنَٰهُ فِى لَيْلَةِ ٱلْقَدْرِ ﴿١﴾﴾، زۆربەی هەرە زۆریان وا دەڵێن.

٢- بەڵام ڕای هەندێکیان ئەوەیە کە ئەو شەوە شەوی نیوەی شەعبانە (**لَيْلَةُ النِّصْفِ مِنْ شَعْبَان**)، ئنجا زۆربەشیان (ئەگەر نەڵێین: هەموویان) دەڵێن: ئەو شەوە بە پێزو بەرێزە، یان ئەو شەوە کە ئەندازەگیریی تێدا دەکرێ (**لَيْلَةُ التَّقْدِيْر**)، لە مانگی ڕەمەزان دایە، چونکە خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿شَهْرُ رَمَضَانَ ٱلَّذِىٓ أُنزِلَ فِيهِ ٱلْقُرْءَانُ هُدًى لِّلنَّاسِ وَبَيِّنَٰتٍ مِّنَ ٱلْهُدَىٰ وَٱلْفُرْقَانِ ﴿١٨٥﴾﴾**البقرة**، واتە: مانگی ڕەمەزان کە قورئانی تێدا دابەزێندراوە، وەک ڕێنمایی بۆ خەڵک و، بەڵگە ڕۆشنەکان لە ڕێنمایی و لە لێک جیاکردنەوەی هەق و ناهەق.

**بڕگـەی دووەم:** ئایـا دابەزینـی قورئـان تەنیـا سـەرەتایەکەی لـە شـەوی بـە پێـزو ڕێـزدا بـووە، یاخـود هەمـووی؟!

لەوبارەشەوە، دیسان زانایان جۆرێک لە ڕاجیاییان هەیە:

**أ-** هەندێكیان دەڵێن: لە لایەن خواوە بۆ ئاسمانی یەكەم، یان بۆ (**بَیْتُ المَعْمُور**) دابەزیوە، دوایی وردە وردە لە ماوەی بیست و سێ (٢٣) ساڵدا، هەمووی دابەزیوە.

**ب-** هەندێكیان دەڵێن: دەستپێكی دابەزێنران و سەرەتایەكەی لەو شەوە دابووەو، ئەوەی دیكە كە بۆ ئاسمانی یەكەم و لەوێش بۆ (**بَیْتُ المَعْمُور**) دابەزیوە، كە خوای بەرز لە سوورەتی (**الطور**)دا، دەفەرموێ: ﴿وَٱلطُّورِ ۝١ وَكِتَٰبٖ مَّسۡطُورٖ ۝٢ فِي رَقّٖ مَّنشُورٖ ۝٣ وَٱلۡبَيۡتِ ٱلۡمَعۡمُورِ ۝٤﴾، لەوێدا باسی (**البَیْتُ المَعْمُور**)ی كردوە، بەڵام ئەوە كە (**البَیْتُ المَعْمُور**) لە ئاسمانی یەكەم، یان لە یەكێك لە ئاسمانەكاندا بێت، وەک چۆن (**كعبة**) لەسەر زەوییەو، وەک چۆن مرۆڤەكان لەسەر زەوی بە دەوری (**كَعْبَة**)دا، تەواف دەكەن، ئەو (**البَیْتُ المَعْمُور**)ەش، فریشتەكان تەوافی بە دەوردا بكەن، هیچ بەڵگەیەكی دڵنیاكەری لەسەر نیە، چونكە ئەو (**البَیْتُ المَعْمُور**)ەش، دەگونجێ مەبەست پێی (**البَیْتُ الحَرَام**) بێ، كە ئەویش ئاوەدانە بە **طاعەت** و بە كەسانێک كە حەج و، عومرە دەكەن، تەوافی بەدەوردا دەكەن.

كەواتـە: ئـەوەی دێتـە دەسـت ئەوەیـە، كـە ئـەو شـەوە هـەر دەسـتپێكی دابەزینـی قورئـان بـووە، بـۆ یەكەمجـار لـە تەمـەنی موبارەكـی پێغەمبـەردا ﷺو، هیـچ بەڵگەیـەک نیـە، كـە لـەو شـەوەدا هەمـوو قورئـان دابەزیـێ بـۆ ئاسـمانی یەكـەم، دوایـی لـە مـاوەی (٢٣) سـاڵدا دابەزیـێ.

هەڵبەتـە هـەر كام لـە: ١- ئایـەتی ژمـارە: (١٠٦) لـە سـوورەتی (**الإسراء**)، كـە پێشـتریش ئاماژەمـان پێـدا، كـە خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿وَقُرۡءَانٗا فَرَقۡنَٰهُ لِتَقۡرَأَهُۥ عَلَى ٱلنَّاسِ عَلَىٰ مُكۡثٖ وَنَزَّلۡنَٰهُ تَنزِيلٗا ۝١٠٦﴾، واتـە: ئەمـە قورئانێكـە ڕوونمانكردۆتـەوە، یاخـود بڵاومانكردۆتـەوە، تاكـو بەسـەر خەڵكیـدا بیخوێنیـەوە، بـە شـێنەیی بەكاوەخـۆ، بـەش بـەش دامانبەزانـدوە.

ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كە قورئان هەمووی پێكەوە دانەبەزیوە.

٢- هەروەها ئایەتەکەی سوورەتی (**الفرقان**)یش، کە خوا دەفەرمووێ: ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَوْلَا نُزِّلَ عَلَيْهِ ٱلْقُرْءَانُ جُمْلَةً وَٰحِدَةً ۚ كَذَٰلِكَ لِنُثَبِّتَ بِهِۦ فُؤَادَكَ ۖ وَرَتَّلْنَٰهُ تَرْتِيلًا ﴿٣٢﴾ ﴾، واتە: ئەوانەی بێبڕوابوون، گوتیان: دەبووایە ئەو قورئانە، بە یەک جار بۆی دابەزیبایە، (خوا ﷻ دەفەرمووێ): بەو شێوەیە دامانبەزاندوە، تاکو دڵتی پێ بچەسپێنین و بە شێنەیی بەسەر تۆماندا خوێندۆتەوە.

٣- هەروەها ئایەتەکەی سوورەتی (**طه**)ش، کە دەفەرمووێ: ﴿وَلَا تَعْجَلْ بِٱلْقُرْءَانِ مِن قَبْلِ أَن يُقْضَىٰٓ إِلَيْكَ وَحْيُهُۥ ۖ وَقُل رَّبِّ زِدْنِى عِلْمًا ﴿١١٤﴾ ﴾، واتە: پەلە مەکە لەوەدا کە قورئانت بۆ دادەبەزێ، تاکو ڕەوانەکردنەکەی تەواو دەبێ و بشڵێ: پەروەدگارم! زانیاریم بۆ زێدە بکە، هەموویان بەڵگەن لەسەر ئەوەی قورئان بەش بەش دابەزیوە، نەک هەمووی پێکەوە.

یـانی: جـاری وا هەبـووە پێغەمبـەری خاتـەم ﷺ بـە پەلـە بـووە، کـە قورئانەکـە لـە جیبریـل وەربگـرێ، بـەڵام خـوای پـەروەردگار فەرموویەتـی: پەلـەی لێمەکـە، لـە کاتی خۆیـداو، لـە شـوێنی خۆیـدا، ئـەو بەشـەو هـەر بەشـێکی دیکـە قورئـان بـۆ تـۆ دادەبـەزێ.

٤- هەروەها لە سوورەتی (**القیامة**)، ئایەتەکانی: (١٦ - ١٩)دا، ئەمیش دیسان بەڵگەیە لەسەر ئەوەی قورئان بەش بەش دابەزیوەو، پلە پلە دابەزیوە، وەک خوا ﷻ دەفەرمووێ: ﴿ لَا تُحَرِّكْ بِهِۦ لِسَانَكَ لِتَعْجَلَ بِهِۦٓ ﴿١٦﴾ إِنَّ عَلَيْنَا جَمْعَهُۥ وَقُرْءَانَهُۥ ﴿١٧﴾ فَإِذَا قَرَأْنَٰهُ فَٱتَّبِعْ قُرْءَانَهُۥ ﴿١٨﴾ ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنَا بَيَانَهُۥ ﴿١٩﴾ ﴾**القیامة**، واتە: زمانتی پێ مەجووڵێنە، تاکو پەلەی لێ بکەی، لەسەر ئێمەیە کە کۆی بکەینەوە، (لە دڵ و سینەی تۆدا)و، بەسەرتدا بخوێنینەوە، ئنجا ئەگەر خوێندمانەوە، تۆش بە دوای خوێندنەکەی بکەوە، دوایی ڕوونکردنەوەکەی لەسەر ئێمەیە (لە عەقڵ و دڵی تۆدا، چەمک و واتاو مەبەستەکانی ڕوون دەکەینەوە).

کەواتـە: تەنیـا دەسـتپێکی دابەزینـی قورئـان لـەو شـەوەدا بـووە، نـەک هەمـووی پێکـەوە دابەزیبـێ، ئـەوە هیـچ بەڵگەیەکـی لەسـەر نیـە.

**برگـەی سـێیەم:** ئایـا ئـەو شـەوە چ شـەوێکە؟! واتـە: ئـەو شـەوە لـە شـەوەکانی مانگـی (**رَمَضَـان**)دا، چ شـەوێکە؟ ئێمـە لـە کتێبـی [پوختـەی ژیاننامـەی پێغەمبـەری خـوا]دا ﷺ ڕوونمانکردۆتـەوە کـە دەسـتپێکی دابەزینـی قورئـان لـە شـەوی (٢١)ی (**رمضـان**)ی سـاڵی (٦١٠) زایینـی و، (٤٠)ەمیـن سـاڵ، یـان (٤١)میـن سـاڵی تەمـەنی پێغەمبـەری خاتـەم دابـووە ﷺ.

بـەڵام هەندێـک گوتوویانـە: لـە (١٧)ی (**رمضـان**)دا بـووە، ئـەم ئایەتەشـیان بـە بەڵگـە هێناوەتـەوە کـە دەفەرمـوێ: ﴿إِن كُنتُمْ ءَامَنتُم بِٱللَّهِ وَمَآ أَنزَلْنَا عَلَىٰ عَبْدِنَا يَوْمَ ٱلْفُرْقَانِ يَوْمَ ٱلْتَقَى ٱلْجَمْعَانِ ۗ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٤١﴾﴾**الأنفـال**، لـەوەوە وەریانگرتـوە، چونکـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ لـە بـەرە بەیـانی ڕۆژی جمعـەی (١٧)ی (**رمضـان**) لەگـەڵ کافـرەکانی مەککـە، لـە بـەدردا، ڕووبـەڕوو بـۆوەو ئـەوان شکسـتێکی گەورەیـان بەسـەردا هـات، کـە خـوا ﷻ نـاوی نـاوە: (**یـوم الفرقـان**).

بـەڵام لـە ڕاسـتییدا ئـەوە نابێتـە بەڵگـە لەسـەر ئـەوەی چونکـە نـاوی لێـنراوە: (**یوم الفرقان**)، لـەو ڕۆژەدا قورئـان دابەزیبـێ، بەڵکـو هـۆکاری ناونـرانی جەنگـی بـەدر بـە (**یـوم الفرقان**)، هـەر ئـەوە بـووە کـە لـە ڕۆژەدا هـەق و ناهـەق لێـک جیابوونـەوەو، هێزێکـی ژمـارە کەمـی، کـەم ئیمکانیـەت، بەسـەر هێزێکـی زەبەلاحـدا زاڵ ببـێ، کەواتـە: ئاشـکرایە کـە ئەوانـە لەسـەر هەقـن و، ئـەوانی دیکـە لەسـەر ناهەقـن.

هەروەهـا جەنگـی بـەدر ڕۆژی هاتنـە دی ئـەو هەمـوو بەڵێنانـەی خـوا ﷻ بـووە، بـۆ وێنـە:

أ- کە دەفەرموێ: ﴿يَوْمَ نَبْطِشُ ٱلْبَطْشَةَ ٱلْكُبْرَىٰٓ إِنَّا مُنتَقِمُونَ ﴿١٦﴾﴾**الدخان**.

ب- هەروەها لە سوورەتی (**القمر**)دا، کە دەفەرموێ: ﴿سَيُهْزَمُ ٱلْجَمْعُ وَيُوَلُّونَ ٱلدُّبُرَ ﴿٤٥﴾﴾، واتە: ئەو کۆمەڵە تێدەشکێن و ڕادەکەن ( و پشت لە ئەهلی ئیمان دەکەن)، پێشتر مسوڵمانان نەیانزانیوە کە ئەوە دەبێ و کاتێ دێ دێتە دی، بەڵام لە جەنگی بەدردا، ئەو موژدەو بەڵێنە هاتە دی.

ج- هەروەها لە سوورەتی (**الروم**)دا، کە دەفەرمویّ: ﴿وَيَوْمَئِذٍ يَفْرَحُ الْمُؤْمِنُونَ ﴿٤﴾ بِنَصْرِ اللَّهِ يَنصُرُ﴾، کە ئەوەی خوا ﷻ هەواڵی پێداوە، کە ڕۆم تێکشکاون لە بەرانبەر فارسدا، بەڵام جارێکی دیکە، ڕۆم سەردەکەون، لەو ڕۆژەدا ئیمانداران دڵخۆش دەبن، ئەو ڕۆژەش ڕێکەوتی هەمان ڕۆژ بوو، کە جەنگی بەدر تێیدا ڕووی دا.

ئنجا ئەوانە هەموویان بەڵگە بوون لەسەر لێک جیاکردنەوەی هەق و ناهەق.

(**عبدالرحمـن بـن نـاصر السـعدي**)، ڕەحمـەتی خـوای لـێ بـێ، لـە تەفسـیرەکەی خۆیـدا[1] دەڵـێ: [**وَذَلِكُم أَنَّ اللهَ ابْتَدَأَ بِإِنْزَالِهِ فِي رَمَضَان فِي لَيْلَةِ القَدْرِ، وَقَدْ تَوَاتَرتِ الأَحَادِيْث فِي فَضْلِهَا وَأَنَّهَا فِي رَمَضَان وَفِي العَشْرِ الأَوَاخِرِ مِنْهُ، خُصُوصاً فِي أَوْتَارِه وَهِيَ بَاقِيَةٌ فِي كُلِّ سَنَةٍ إِلى قِيَامِ السَّاعَة**].

دوای چەنـد قسـەیەک دەڵـێ: ئـەوەش بـە هـۆی ئـەوەوە کـە خـوا ﷻ، دەسـتیکرد بـە دابەزانـدنی قورئـان لـە ڕەمەزانـداو، لـە شـەوی قـەدردا، فەرمایشـتەکان(ی پێغەمبـەری خـوا ﷺ ) زۆرن، زۆر بـە دوای یەکـدا هاتـوون لـە بـارەی پلـەو پایـەی شـەوی قـەدرەوە، کـە لـە مانگـی ڕەمەزاندایـە و، لـە دە شـەوەکانی کۆتایـی دایـە، بـە تایبـەت لـە تاکەکانیانـداو، لـە هەمـوو ساڵێکدا دەمێنێتـەوەو، تاکـو ئاخیـر زەمـان.

**بڕگەی چوارەم:** ئایا ئەو شەوە ساڵانە دووبارە دەبێتەوە؟!

پێشتر قسەکەی: (**عبدالرحمن بن ناصر السعدي**)مان هێنا، ئێمەش دەڵێین:

١- بە پێی سوورەتی (**القدر**)، بەڵێ دووبارە دەبێتەوە، چونکە سوورەتەکە ئاوا دەفەرموێ: ﴿إِنَّا أَنزَلْنَاهُ فِي لَيْلَةِ الْقَدْرِ ﴿١﴾ وَمَا أَدْرَاكَ مَا لَيْلَةُ الْقَدْرِ ﴿٢﴾ لَيْلَةُ الْقَدْرِ خَيْرٌ مِّنْ أَلْفِ شَهْرٍ ﴿٣﴾ تَنَزَّلُ الْمَلَائِكَةُ وَالرُّوحُ فِيهَا بِإِذْنِ رَبِّهِم مِّن كُلِّ أَمْرٍ ﴿٤﴾ سَلَامٌ هِيَ حَتَّىٰ مَطْلَعِ الْفَجْرِ ﴿٥﴾﴾، (**تَنَزَّلُ**)، یانی: (**تَتَنَزَّلُ**) کەواتە: ساڵانە ئەو دابەزینی جیبریل و فریشتەکان لەو شەوەدا، دووبارە دەبێتەوە، ﴿مِّن كُلِّ أَمْرٍ﴾، بۆ جێبەجێکردنی هەر فەرمانێک، یاخود بۆ ڕوونکردنەوەو بڕیاردانی هەر فەرمانێک، کە خوا لە ژیانی بەشەردا لەسەر زەوی ویستوویەتی و دەیەوێ

---

(١) تيسير الكريم الرحمن في تفسير كلام المنان: ص٩٣١.

جێبەجێ بکرێ، کە دەشفەرموێ: ﴿ سَلَٰمٌ هِيَ حَتَّىٰ مَطْلَعِ ٱلْفَجْرِ ۝٥ ﴾، ئەو شەوە هەر ئاشتیی و خێرو خۆشییە، تاکو بەرەبەیان، مەبەست تێکڕای شەوە قەدرە دووبارە بووەکانە، لەیەك یەکی مانگی ڕەمەزانەکانی ساڵەکاندا.

٢- بەڵگەیەکی دیکەش لەوبارەوە فەرمایشتەکانی پێغەمبەرن ﷺ ، بۆ نموونە کە دەفەرموێ: {**اطْلُبُوهَا فِي الْعَشْرِ الْأَوَاخِرِ مِنْ رَمَضَانَ فِي ثَالِثَةٍ تَبْقَى، فِي خَامِسَةٍ تَبْقَى، فِي سَابِعَةٍ تَبْقَى، فِي تَاسِعَةٍ تَبْقَى**} (**أخرجه أحمد: ٢٥٢٠، والبخاري: ١٩١٧، وأبو داود: ١٣٨١**).

واتە: بۆ شەوی قەدر بگەڕێن، لە دەیەکانی کۆتایی مانگی ڕەمەزاندا، لە شەوی سێیەمدا کە لێیان دەمێنێتەوە، لەشەوی پێنجەمدا کە لێیان دەمێنێتەوە، لە شەوی حەوتەم دا کە لێیان دەمێنێتەوە، لە شەوی نۆیەمدا کە لێیان دەمێنێتەوە.

پێغەمبەری خوا ﷺ لە دواوە ڕا پێداهاتوە، لە شەوەکانی: (٢٧) و (٢٥) و (٢٣) و (٢١)، لەو چوار شەوەدا بۆی بگەڕێن، واتە: تاکەکانی مانگی ڕەمەزان، یان: (٢١)، یان (٢٣)، یان (٢٥)، یان (٢٧)، هەڵبەتە هەندێکیش گوتوویانە: (٢٩)ش، بەڵام پێغەمبەر ﷺ لەم فەرمایشتەدا بە شەوی (٢٧) کۆتایی پێهێناوە.

**برگەی پێنجەم:** کە ئەمە ئیشکال بۆ خەڵکێکی زۆر لا دەبات، شەوی قەدر شەوی پێزو ڕێزە، لەسەر هەموو خڕۆکەی زەوی دەسووڕێ، زۆر کەس پرسیاری کردوە، گوتوویەتی: کاتێک لە لای ئێمە شەوە لە لای ئەمریکییەکان ڕۆژە، هەروەها لە ئوستڕالیا ڕۆژە، بەپێچەوانەی ئێرە، ئایا ئەوە چۆنە! ئەگەر ئێرە شەوی قەدر بێ، لەوێ ڕۆژەو، کە لێرە شەو بەسەر دەچێ، لەوێ دەبێتە شەو، ئنجا ئەو کاتە لە لای ئەوان دەبێتە شەو، لێرەدا دەبێتە ڕۆژ؟

وەڵامەکەی ئەوەیە: خوای زاناو شارەزا کە دەفەرموێ: شەوی قەدر، واتە: بە نسبەت هەموو خەڵکی سەر زەوییەوەو، لە ماوەی (٢٤) سەعاتدا، شەو دەسووڕێ بەسەر هەموو گۆی زەویدا، سەرەتا لە ڕۆژهەڵاتی ئاسیاوە دەست پێدەکات، یان لە ئوستراڵیاوە کە هەشت نۆ سەعات پێش ئێرەن، لەوێوە دەست پێدەکات، پێشێ

ئـەویش دەبێتـە شـەو، دواتـر وردە وردە شـەوەکە بـەرەو ئێـرە دەکشـێ، دوایـی لێـرەوە بـەرەو ئەورووپـاو، دوایـی بـەرەو ئەمریـکاو ئەوانـە دەکشـێ، کەواتە: کە خـوا دەفەرموێ: شـەوی قـەدر، واتـە: ئـەو شـەوەی لـە مـاوەی بیسـت و چـوار (٢٤) سـەعاتدا، بـە دەوری هەمـوو گـۆی زەویـدا دەسـوورێ، چونکـە خـوا ﷻ قورئـانی بـۆ هەمـوو بەشـەر نـاردوەو، هەمـوو مرۆڤەکانیـش پێکـەوە دەدوێنـێ، لـە هـەر شـوێنێکی گـۆی زەویـدا بـن.

کەواتـە: دەبـێ ئـەو شـەوە گشـتگیر بـێ بـۆ هەمـوو خەڵکـی سـەر زەوی، لـە هـەر شـوێنێکی سـەر زەوی بن.

(الطـبري) ئـەم دەقـە دێنـێ، دەیکەینـە کۆتایـی ئـەم کورتـە باسـەمان: (**حَدَّثَنَـا مُجَاهِـدُ بْـنُ مُـوسَى قَـالَ: ثَنَـا يَزِيـدُ قَـالَ: أَخْبَرَنَـا رَبِيعَـةُ بْـنُ كُلْثُـومٍ قَـالَ: كُنْـتُ عِنْـدَ الْحَسَـنِ، فَقَـالَ لَـهُ رَجُـلٌ: يَـا أَبَـا سَـعِيدٍ، لَيْلَـةُ الْقَـدْرِ فِي كُلِّ رَمَضَـانَ؟ قَـالَ: «إِي وَاللَّـهِ، إِنَّهَـا لَفِـي كُلِّ رَمَضَـانَ، وَإِنَّهَـا اللَّيْلَـةُ الَّتِـي يُفْـرَقُ فِيهَـا كُلُّ أَمْـرٍ حَكِيـمٍ، فِيهَـا يَقْـضِي اللَّـهُ كُلَّ أَجَـلٍ وَأَمَـلٍ وَرِزْقٍ إِلَى مِثْلِهَـا**)[1].

واتـە: (**الطـبري**) بـە سـەنەدی خـۆی، دەڵـێ: موجاهیـدی کـوڕی مووسـا، بـۆی باسـکردین ئەویـش گوتوویـەتی: یەزیـد بـۆی باسـکردین: ئەویـش گوتوویـەتی: ڕەبیعـەی کـوڕی کولسـووم هەواڵـی پێدایـن، دەڵـێ: لـە لای حەسـەن بـووم، (**الحسن البصري**) پیاوێـک پێـی گـوت: ئـەی ئەبـوو سـەعید (کـە کونیـەی حەسـەنی بەصرایـی بـووە)، ئایـا شـەوی قـەدر لـە هەمـوو مانگـی ڕەمەزانێـک دایـە؟ ئەویـش گـوتی: بەڵـێ بەخـوا لـە هەمـوو مانگـی ڕەمەزانێکـدا هەیـەو، ئـەو شـەوەیە کـە هەمـوو کارێکـی پـڕ حیکمـەتی تێـدا بڕیـار دەدرێ و، ڕوون دەکرێتـەوە، خـوا ﷻ هـەر کاتێـک، هـەر ئاواتێـک، هـەر بژیوێـک تاکـو سـاڵی ئاینـدەی تێـدا بڕیـار دەدات.

کەواتـە: شـەوی قـەدر بـە نسـبەت هەمـوو مرۆڤەکانـەوەو، لـە هەمـوو ساڵەکاندا دووبـارە دەبێتـەوە، بـە نسـبەت هەمـوو مرۆڤەکانـەوە، واتـە: لـە هـەر گۆشـەو کەنارێکـی گـۆی زەویـدا بژیـن.

---

(١) جامع البيان في تفسير القرآن: ج٢٥، ص١١١، برقم: ٣١٠٨٣.

## مەسەلەی دووەم:

**فەرمانکردنی خوا ﷻ بە پێغەمبەرەکەی موحەممەد ﷺ کە چاوەڕێ بێ ڕۆژێک دێ، دووکەڵێکی ئاشکرای تێدا پەیدادەبێ و خەڵکی دادەپۆشێ و، خەڵکەکە لە خوا دەپاڕێنەوە کە ئەو ئازارە بە ئێشەیان لێ لابدات و بڕواشدێنن، بەڵام چۆن دێنەوە سەر حاڵ لە کاتێکدا کە پێغەمبەرێکی ڕوونیان بۆ هات، کەچی پشتیان تێکردو گوتیان: فێرکراوە، شێتە! خواش بەڵێنیدا کەمێک ئازاریان لێ لابدات، بەڵام بە دڵنیایی دوایی دەگەڕێنەوە سەر حاڵی پێشوویان، بۆیە سەرەنجام خوا زەبری گەورەتریان لێ دەوەشێنێ و تۆڵەیان لێ دەستێنێ:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ فَٱرْتَقِبْ يَوْمَ تَأْتِي ٱلسَّمَآءُ بِدُخَانٍ مُّبِينٍ ﴿١٠﴾ يَغْشَى ٱلنَّاسَ هَٰذَا عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿١١﴾ رَّبَّنَا ٱكْشِفْ عَنَّا ٱلْعَذَابَ إِنَّا مُؤْمِنُونَ ﴿١٢﴾ أَنَّىٰ لَهُمُ ٱلذِّكْرَىٰ وَقَدْ جَآءَهُمْ رَسُولٌ مُّبِينٌ ﴿١٣﴾ ثُمَّ تَوَلَّوْا۟ عَنْهُ وَقَالُوا۟ مُعَلَّمٌ مَّجْنُونٌ ﴿١٤﴾ إِنَّا كَاشِفُوا۟ ٱلْعَذَابِ قَلِيلًا إِنَّكُمْ عَآئِدُونَ ﴿١٥﴾ يَوْمَ نَبْطِشُ ٱلْبَطْشَةَ ٱلْكُبْرَىٰٓ إِنَّا مُنتَقِمُونَ ﴿١٦﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە دە بڕگەدا:

١)- ﴿ فَٱرْتَقِبْ يَوْمَ تَأْتِي ٱلسَّمَآءُ بِدُخَانٍ مُّبِينٍ ﴾، چاوەڕێبە، ئەو ڕۆژە کە ئاسمان دووکەڵێکی ئاشکراو ڕوون دێنێ، (يَوْم)، {**اسْمُ زَمَان مَفْعُول بِهِ لـ«ارتَقِبْ» مِثْلُ: يَخَافُونَ يَوْمَاً**}،

(**يَـوْم**) ناوی کاتە، بەرکارە بۆ (**ارتَقِبْ**) وەک: لە ڕۆژێک دەترسن، (**وَالإرْتِقَابُ: افْتِعَالٌ مِنْ رَقَبَهُ، إذَا انْتَظَرَهُ، وَإِنَّمَا يَكُونُ الإِنْتِظَارُ عِنْدَ قُرْبِ حُصُولِ الشَّيْءِ الْمُنْتَظَرِ**)، (**ارْتِقَابُ**) لەسەر کێشی (**افْتِعَال**)ە، لە (**رَقَبَهُ أي: انْتَظَرَهُ**)، چاوەڕێی کرد، چاوەڕێکردنیش کاتێک دەبێ کە شتێک، بویسترێ پەیدا ببێ، کاتەکەی نیزیک بێ.

٢)- ﴿ يَغۡشَى ٱلنَّاسَ ﴾، ( ئەو دووکەڵە) خەڵک دادەپۆشێ، ئەو دووکەڵە ڕوون و ئاشکرایە، خەڵک دادەپۆشێ، (أي **يُغطِّيهِم وَتلُفُّهم وَيُحِيْطَ بِهِمْ وَيَعُمُّهُم**)، واتە: دایاندەپۆشێ و دەوریان دەدات، گەمارۆیان دەدات، هەموویان دەگرێتەوە.

هەڵبەتە (**دخان**): کە بە کوردیی دەڵێین: (دووکەڵ)، ئەوەیە کاتێک ئاگر دادەگیرسێنرێ، لێی بەرز دەبێتەوە، کە دەگونجێ لێرەدا مەبەستی دووکەڵ نەبێ، وەک هەندێک لە زانایان گوتوویانە، بەڵکو ئەمە جۆرێک لە وێچواندنە، کە پێی دەگوترێ: (**التَشْبِيْهُ البَلِيْغ**)، واتە: ئەوپەڕی وێچواندن، یانی: وەک دووکەڵ وایە.

کە دەفەرموێ: ﴿ يَغۡشَى ٱلنَّاسَ ﴾، بێگومان وشەی (**النَّاسَ**)، هەرچەندە (أل) ی ناساندنی لەسەرە، بەڵام مەبەست پێی، خەڵکێکی دیاریکراون، کەواتە: (أل) بۆ ناساندنە، بەڵام بۆ (**عهد**)ە، واتە: خەڵکە هاوبەش دانەرو بێبڕوایەکە، کە هاوچەرخی پێغەمبەری خوا ﷺ بوون، ئەمە بەپێی سیاق و بەسەلیقە دەزانرێ، ئەگەرنا وشەی: (**النَّاس**)، یانی: تێکڕای خەڵک، بەڵام دەزانین کە لێرەدا مەبەست خەڵکێکی دیاریکراوە، کە هاوبەشدانەرو بێبڕوایەکانی ڕۆژگاری پێغەمبەر ﷺ بوون، ئەو خەڵکە دەڵێن: ئەمە ئازارێکی بە ئێشە، یاخود خوا ﷻ هەر بۆ خۆی دەفەرموێ: ئەمەیە ئازاری بە ئێش.

٣)- ﴿ هَٰذَا عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴾، ئەمە ئازارێکی بە ئێشە، ئەمە یان قسەی خوای بەرزەو، هەواڵدەدات، کە ئەمە ئازارێکی بە ئێشە، یاخود گوتراوی قسەی خەڵکە، (**يَقُولُونَ: هَذَا عَذَابٌ أَلِيْم**)، خەڵک دەڵێن: ئەمە ئازارێکی بە ئێشە.

٤)- ﴿ رَّبَّنَا ٱكۡشِفۡ عَنَّا ٱلۡعَذَابَ إِنَّا مُؤۡمِنُونَ ﴾، [خەڵکەکە دەڵێن:] پەروەردگارمان! ئازارمان لێ لادە، ئێمە بڕوادارین، ئەمە گێڕانەوەی قسەی ئەوانەیە کە سزاو ئازارەکە دایپۆشیون.

دەشگونجێ ئەمە فێرکردنی خوابێ بۆ مسوڵمانان، واتە: ئەی مسوڵمانینە! ئێوە بڵێن: پەروەردگارمان! ئازارمان لێ لابدە، ئێمە بڕوادارین، ئەو ئازارە لە

ئێمـە دووربخـەوە، هـەردوو واتایەکـەی گونجـاون، بـەڵام بـە پێـی ڕسـتەی دوایـی، کـە دەفەرمـوێ:

٥)- ﴿ أَنَّىٰ لَهُمُ ٱلذِّكْرَىٰ ﴾، بیرکردنەوەیان چۆن بۆ پەیدادەبێ؟، یان: لە کوێ بیریان دەکەوێتەوەو پەند وەردەگرن! ئەمە مانای یەکەمیان بەهێزتر دەکات، کە ئەمە قسەی بێبڕوایەکان بێ، کە کاتێ تینیان بۆ هاتوە، گوتوویانە: پەروەردگارمان! ئازارمان لێ لادە، ئێمە بڕوادارین، واتە: دەبینە بڕوادار، بۆیە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ أَنَّىٰ لَهُمُ ٱلذِّكْرَىٰ ﴾، (**أَنَّى**): لە ئەصڵدا بە مانای لە کوێ (**مِنْ أَيْنَ**)یە، بەڵام جاری وا هەیە، بە مانای (چۆن) (**كَيْفَ**) ش، بەکاردێ، (**الذِّكْرى**): بریتیە لە (**التَّذَكُّر والإتِّعَاظ**)، واتە: بیرکەوتنەوەو پەند وەرگرتن، واتە: چۆن بیریان دەکەوێتەوە، چۆن پەند وەردەگرن؟ بە هۆی ئەو ڕووداوەوە؟!

٦)- ﴿ وَقَدْ جَآءَهُمْ رَسُولٌ مُّبِينٌ ﴾، کە پێشتر پێغەمبەرێکی ڕوونکەرەوەیان بۆ هاتوە، یاخود: پێغەمبەرێکی ڕوون و ئاشکرایان بۆ هاتبوو.

٧)- ﴿ ثُمَّ تَوَلَّوْا۟ عَنْهُ وَقَالُوا۟ مُعَلَّمٌ مَّجْنُونٌ ﴾، دوایی پشتیان تێکردو گوتیان: فێرکراوە، شێتە، ﴿ ثُمَّ ﴾، (**للتَّرْتِيب الرُّتْبِي، لأَنَّ التَّوَلِّيَ أَفْظَعُ وَأَشْنَعُ مِنَ الشَّكِّ**)، ﴿ ثُمَّ ﴾، لێرەدا بۆ ڕیزبەندیی پلە پلەییە، چونکە پشت هەڵکردنەکە، ناقۆڵاترو دزێوتر بووە، لە دوو دڵییەکەیان.

کـە گوتوویانـە: ﴿ مُعَلَّمٌ مَّجْنُونٌ ﴾، (**الْمُعَلَّمُ: الَّـذِي يُعَلِّمُـهُ غَـيْرُهُ**)، یانـی: کەسـێک کـە جگـە لـە خـۆی فێـری دەکات، ئنجـا بـە تەئکیـد کەسـێک شـێت بـێ فێـر ناکـرێ و، بابـای فێرکـراو ناگونجـێ شـێت بـێ، بۆیـە خـوا ﷻ بـە واوی بادانـەوە (**واو العطـف**) یـش نەیهێنـاوە، نەیفەرمـووە: (**وَقَالُـوا: مُعَلَّـمٌ وَمَجْنُـون**)، دەفەرمـوێ: ﴿ مُعَلَّمٌ مَّجْنُونٌ ﴾، واتـە: هەندێکیـان گوتوویانـە: فێرکـراوەو هەندێکیـان گوتوویانـە: شـێتە، هـەروەک هەندێکیـان گوتوویانـە: جـادوو گـەرەو، هەندێکیـان گوتوویانـە: کاهینـەو، هەندێکیان گوتوویانـە: شـاعیرە، وەک لـە شـوێنی دیکـەدا هاتـوە.

ئنجـا لێـرەدا کـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَقَالُوا۟ مُعَلَّمٌ مَّجْنُونٌ ﴾، بۆیـە خـوا ئـەم دووەی هێنـاون، چونکـە ئـەم دووانـە یەکـدی هەڵدەوەشـێننەوە، کۆمەڵێکیـان گوتوویانـە:

فێرکـراوەو کۆمەڵکیـان گوتوویانـە: شـێتە، ئـەو دوو قسـەیە تێکدەگیرێـن، ئەگـەر فێرکـراو بـێ و بتوانـێ شـت فێـر ببـێ، لـە خەڵـک وەری بگـرێ، نابـێ شـێت بـێ و، ئەگـەر شـێت بـێ، نابـێ فێرکراوبـێ، واتـە: بۆیـە خـوا ئـەم دووەی هێنـاون، چونکـە ئـەو دووانـە یەکـدی هەڵدەوەشـێننەوەو تێکدەگیرێـن، بۆیـە خـوا ﷻ لـە سـوورەتی (ق)دا، دەفەرمـوێ: ﴿ فَهُمْ فِيٓ أَمْرٍ مَّرِيجٍ ۝٥ ﴾، واتـە: لـە قسـەیەکی تێکەڵـدان، لـە قسـەیەکی دژیەکـدان، هـەر کامێکیـان ئـەوەی دیکـە هەڵدەوەشـێنێتەوە.

٨)- ﴿ إِنَّا كَاشِفُوا۟ ٱلْعَذَابِ قَلِيلًا ﴾، ئێمە لابەری ئازارین بۆ ماوەیەکی کەم، ئەمە هەواڵدانە لە خوای بەرزەوە، کە هەواڵ بە پێغەمبەر ﷺ دەدات، واتە: ئێمە لە داهاتوودا بۆ ماوەیەکی کەم، ئەو ئازارەیان لەسەر لادەدین.

٩)- ﴿ إِنَّكُمْ عَآئِدُونَ ﴾، بە دڵنیایی ئێوە گەڕاوەن یانی: بۆ ڕێی چەوت، پێشێ ڕوو لە پێغەمبەر ﷺ دەکات کە ئێمە لابەری ئازارین لەسەریان، بۆ ماوەیەکی کەم، دوایی ڕوو دەکاتەوە ئەوان: ﴿ إِنَّكُمْ عَآئِدُونَ ﴾، ئێوە ئەی بێبڕوایان! دوای ئەوەی ئازاریشمان لەسەر لادان، دووبارە گەڕاونەوەو دەگەڕێنەوە بۆ ئەو ڕێیە چەوتە، کە لەسەرینی و بە بەڵێنەکەی خۆتان وەفادار نابن، کە دەڵێن: بڕوا دێنین.

١٠)- ﴿ يَوْمَ نَبْطِشُ ٱلْبَطْشَةَ ٱلْكُبْرَىٰٓ إِنَّا مُنتَقِمُونَ ﴾، ئەو ڕۆژە کە زەبری گەورەتر دەوەشێنین، ئێمە سزادەرین و تۆڵەستێنەرین.

ئەمـە دیـارە هـەم گفـت و بەڵێنێکـە بـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ دراوە، لەلایـەن خـوای بـەرزەوە، هـەم هەڕەشـەیەکە لـە بێبڕوایـەکان کـراوە، واتـە: ئـەو ڕۆژە کـە زەبـری گەورەتریـان لێدەوەشـێنین، ئـەو ڕۆژە ئێمـە تۆڵەیـان لـێ دەکەینـەوەو سـزایان دەدەیـن.

## کورتە باسێک لە بارەی (الْبَطْشَةُ الْكُبْرَى)ەوە

زەبـری گەورەتـر، بـە تەئکیـد مەبەسـت پێـی ئـەو زەبـرە بـوو کـە لـە جەنگـی بـەدردا، لـە بێبڕوایانـی مەککـە وەشـێنرا، کـە زلـە زلەکانیـان لـەو ڕۆژەدا پێکـران، ئـەوەی کـوژرا و ئـەوەی گیـرا، کـە بـە گشـتیی حەفتـا (٧٠)یـان لـێ کـوژرا، لـە نێویانـدا وەلیـدی کـوڕی موغیـرەو، عوتبـەو شـەیبەی کـوڕانی ڕەبیعـەو، ئەبـوو جەهـل و نـەضری کـوڕی حاریـس و، زۆر لـەو زلـە زلانـە، کـە سـاڵەها بـوو پێغەمبـەرو مسـوڵمانانیان لـە مەککـە ئەزیـەت و ئـازار دەدات، ئەوانـە کـوژران، ژمارەیەکـی بـەو ئەندازەیەشـیان، واتـە: حەفتا (٧٠)شـیان لـێ بەدیـل گیـران، زانایـان گوتوویانـە: پێکهاتـەی ئـەم ڕسـتەیە لـە ئەصڵـدا ئـاوا بـووە: (إِنَّـا مُنْتَقِمُـونَ يَـوْمَ نَبْطِـشُ بَطْشَـةَ الْكُبْرَى)، ئـەو ڕۆژە کـە زەبـری گەورەتریـان لـێ دەوەشـێنین، ئێمـە سـزایان دەدەیـن و تۆڵەسـتێنەرین لێیـان، (يَـوْمَ: مَنْصُـوبٌ عَـلَى الْمَفْعُـولِ فِيـهِ لِاسْـمِ الْفَاعِـلِ وَهُـوَ مُنْتَقِمُـونَ)، وشـەی (يَـوْم): دەبێتـە (الْمَفْعُـولِ فِيـهِ) چونکـە (مُنْتَقِمُـونَ) دەبێتـە نـاوی بکـەر (اسم فَاعِلِ)ەکـە، واتـە: لـەو ڕۆژەدا، کـە زەبـرە گەورەکـەکان لـێ دەوەشـێنرێ، ئێمـە سـزایان دەدەیـن، بـە نسـبەت دووکـەڵ (دخـان) ەوە، زانایـان چەنـد ڕایەکیـان هێنـاون، کـە ئێمـە سـێیان لـێ دێنیـن:

أ-{عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ أَنَّ قُرَيْشًا لَمَّا اسْتَعْصَتْ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَأَبْطَئُوا عَنِ الْإِسْلَامِ، قَالَ: اللَّهُمَّ أَعِنِّي عَلَيْهِمْ بِسَبْعٍ كَسَبْعِ يُوسُفَ، فَأَصَابَهُمْ قَحْطٌ وَجَهْدٌ حَتَّى أَكَلُوا الْعِظَامَ، فَجَعَلَ الرَّجُلُ يَنْظُرُ إِلَى السَّمَاءِ فَيَرَى مَا بَيْنَهُ وَبَيْنَهَا كَهَيْئَةِ الدُّخَانِ مِنَ الْجُوعِ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ: ﴿ فَٱرْتَقِبْ يَوْمَ تَأْتِي ٱلسَّمَآءُ بِدُخَانٍ مُّبِينٍ ﴾، فَأُتِيَ النَّبِيُّ ﷺ فَقِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ! اسْتَسْقِ اللَّهَ لِمُضَرَ، فَاسْتَسْقَى لَهُمْ فَسُقُوا، فَأَنْزَلَ اللَّهُ: ﴿ إِنَّا كَاشِفُواْ ٱلْعَذَابِ قَلِيلًا إِنَّكُمْ عَآئِدُونَ ﴾، فَلَمَّا أَصَابَتْهُمُ الرَّفَاهِيَةُ عَادُوا إِلَى حَالِهِمْ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ: ﴿ يَوْمَ نَبْطِشُ ٱلْبَطْشَةَ ٱلْكُبْرَىٰٓ إِنَّا مُنتَقِمُونَ ﴾، فَانْتَقَمَ اللَّهُ مِنْهُمْ يَوْمَ بَدْرٍ، فَقَدْ مَضَى الْبَطْشَةُ وَالدُّخَانُ وَاللِّزَامُ}، (أخرجه البخاري: ١٩٧، ومسلم: ٢٧٩٨، والترمذي: ٣٢٥١، والنسائي: ٥٠٣).

واتـە: عەبدوڵـڵای کـوڕی مەسـعوود (خـوا لێـی ڕازی بـێ) دەڵـێ: قوڕەیشـییەکان دوای ئـەوەی لـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ یاخیـی بـوون و سسـتییان نوانـد، کـە بـەرەو ئیسـلام بێـن، پێغەمبـەر ﷺ فەرمـووی: ئـەی خوایـە! یارمەتییـم بـدە لەسـەریان، بـە حـەوت سـاڵ وەک حـەوت ساڵەکەی یوسـف، (واتـە: حـەوت سـاڵی گرانیـی و وشـکە سـاڵیی و قـات و قڕیـی)، ئـەوە بـوو کـە گرانیـی و زەحمەتێکـی زۆریـان تـووش بـوو، تاکـو ئێسـقانیان خـوارد لـە برسـان، پیـاوی وایـان هەبـوو کـە تەماشـای سـەرێی دەکـرد، لـە نێـوان خـۆی و ئاسـماندا، شـێوەی دووکەڵـی دەبینـی لـە برسـان، (واتـە: بەرچاویـان تەماویـی بـوو بـوو)، ئنجـا خـوا ﷻ ئەمـەی دابەزانـد: ﴿ فَٱرۡتَقِبۡ يَوۡمَ تَأۡتِي ٱلسَّمَآءُ بِدُخَانٖ مُّبِينٖ ﴾، واتـە: چاوەڕێبـە ئـەو ڕۆژە کـە ئاسـمان دووکەڵێکـی ئاشـکرا دێنـێ، ئنجـا هاتنـە لای پێغەمبـەر ﷺ پێـی گوتـرا: ئـەی پێغەمبـەری خـوا! ﷺ داوای بـاران باریـن بکـە، بـۆ (مضر)، ئەویـش داوای بـاران بارینـی بـۆ کـردن، ئیـدی ئاویـان بـۆ دابەزایـنرا، خـواش ﷻ ئەمـەی دابەزانـد: ﴿ إِنَّا كَاشِفُواْ ٱلۡعَذَابِ قَلِيلًاۚ إِنَّكُمۡ عَآئِدُونَ ﴾، ئێمـە لابـەری سـزاو ئازاریـن، ماوەیەکـی کـەم، ئێـوە دووبـارە دەگەڕێنـەوە، دوای ئـەوەی کـە خۆشـگوزەرانییان تووشـبوو، دووبـارە گەڕانـەوە سـەر حاڵـی پێشـێیان، ئنجـا خـوا ﷻ ئەمـەی دابەزانـد: ﴿ يَوۡمَ نَبۡطِشُ ٱلۡبَطۡشَةَ ٱلۡكُبۡرَىٰٓ إِنَّا مُنتَقِمُونَ ﴿١٦﴾ ﴾، واتـە: ئـەو ڕۆژەی زەبـری گەورەتـر دەوەشـێنین، ئێمـە تۆڵـە دەسـتێنین، سزادەرین، ئیـدی خـوا ﷻ لـە جەنگـی بـەدردا، سـزای دان و تۆڵـەی لـێ سـتاندن، کەواتـە: (الْبَطْشَةُ وَالدُّخَانُ وَاللِّزَام)، ئەوانـە هەرسـێکیان تێپەڕیـون: هـەم زەبـر لێدانەکـەو، هـەم دوو کەڵەکـەو، هـەم (اللِّـزَامُ) کـە لـە سـوورەتی (الفرقـان)دا، هاتـووە: ﴿ فَسَوۡفَ يَكُونُ لِزَامَۢا ﴿٧٧﴾ ﴾الفرقـان، واتـە: سـزایان پێـوە پەیوەسـت دەبـێ.

**ب-** هەندێکیش گوتوویانە: ئەم دووکەڵە، دوو کەڵێکە لە ڕۆژی قیامەتدا دێ، وەک پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی و بە چەند ڕیوایەتێک هاتوەو، ئێمە یەکێک لە ڕیوایەتەکان دێنین:

**{عَـنْ حُذَيْفَـةَ بْـنِ أَسِـيدٍ الْغِفَـارِيِّ ﷺ، قَـالَ: اطَّلَـعَ النَّبِـيُّ ﷺ عَلَيْنَـا وَنَحْـنُ نَتَذَاكَـرُ، فَقَـالَ: مَـا تَذَاكَـرُونَ؟ قَالُـوا: نَذْكُـرُ السَّـاعَةَ، قَـالَ: إِنَّهَـا لَـنْ تَقُـومَ حَتَّـى تَـرَوْنَ قَبْلَهَـا عَشْرَ**

آيَـاتٍ، فَذَكَـرَ الدُّخَـانَ، وَالدَّجَّـالَ، وَالدَّابَّـةَ، وَطُلُـوعَ الشَّـمْسِ مِـنْ مَغْرِبِهَـا، وَنُـزُولَ عِيـسَى ابْـنِ مَرْيَـمَ عَلَيْـهِ السـلام، وَيَأْجُـوجَ وَمَأْجُـوجَ، وَثَلَاثَـةَ خُسُـوفٍ: خَسْـفٌ بِالْمَـشْرِقِ، وَخَسْـفٌ بِالْمَغْـرِبِ، وَخَسْـفٌ بِجَزِيـرَةِ الْعَـرَبِ، وَآخِـرُ ذَلِـكَ نَـارٌ تَخْـرُجُ مِـنَ الْيَمَـنِ، تَطْـرُدُ النَّـاسَ إِلَى مَحْشَرِهِـمْ} (أخرجـه مسـلم: ٢٩٠١، وأبـو داوود: ٤٣١١، والترمـذي: ٢١٨٣، النسـائي في الكـبرى: ١١٣٨٢، ابـن ماجـه: ٤٠٤١، ٤٠٥٥).

واتـە: حوزەیفـەی کـوڕی ئوسـەیدی غیفاریـی ﷺ، دەڵـێ: پێغەمبـەر ﷺ ڕۆژێـک بەسـەرماندا هـات، ئێمـە لـە شـوێنێک دانیشـتبووین، قسـەمان دەکـرد، فەرمـووی: باسـی چـی دەکـەن؟ گوتمـان باسـی ئاخیـر زەمـان دەکەیـن، فەرمـووی: ئاخیـر زەمـان نایـەت، تاکـو لـە پێشـیەوە، دە نیشـانان نەبینـن، ئنجـا باسـی ئەوانـەی کـرد: دووکـەڵ، دەججـال، ژیانـداری زەوی (**دابـة الارض**)، هەڵهاتنـی خـۆر لـە خۆرئـاواوەو، دابەزینـی عیسـای کـوڕی مەریـەم، دەرچـوونی یەئجـووج و مەئجـووج، سـێ ڕۆچـوونی زەوی، ڕۆچوونێـک لـە ڕۆژهـەڵات، ڕۆچوونێـک لـە ڕۆژئـاواوە، ڕۆچوونێـک لە نیـوە دوورگەی عـەڕەب، (نیشـانەی دەیـەم) کۆتاییەکەیـان ئەوەیـە کـە ئاگرێـک لـە یەمەنـەوە پەیدادەبـێ و، خەڵـک بـەرەو شـوێنی کۆکردنەوەیـان پـاڵ پێوەدەنـێ، (شـوێنی کۆکردنەوەیـان، مەبەسـت پێـی شـامە، کـە مرۆڤایەتیـی بـە تایبـەتی مسـوڵمانان لـە ئاخیـر زەمانـدا، زیاتـر لـەوێ کۆدەبنـەوە).

ج- ڕایەکی دیکەش هەیە، کە مەبەست لەو دووکەڵ (**دخان**)ە، ئەو دوو کەڵ و تەپ و تۆزە بووە، کە لە ڕۆژی فەتحی مەککەدا بووە: {**عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: كَانَ يَوْمَ فَتْحِ مَكَّةَ دُخَانٌ، وَهُوَ قَوْلُ اللَّهِ:** ﴿ فَٱرْتَقِبْ يَوْمَ تَأْتِي ٱلسَّمَآءُ بِدُخَانٍ مُّبِينٍ ﴾} (**أخرجه إبن سعد**)، واتە: ئەبوو هورەیرە ﷺ گوتوویەتی: ڕۆژی فەتحی مەککە ئازادکرانی مەککەو، دوو کەڵ و تەپ و تۆز بووە، ئەوەیە کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ فَٱرْتَقِبْ يَوْمَ تَأْتِي ٱلسَّمَآءُ بِدُخَانٍ مُّبِينٍ ﴾.

بـەڵام زۆربـەی زانایـان دەڵێـن: {**الرَّاجِـحُ مِنْهَـا أَنَّـهُ الدُّخـانُ الَّـذِي كانُـوا يَتَخَيَّلُونَـهُ مِـمَّا نَـزَلَ بِهِـمْ مِـنَ الجَهْـدِ وشِـدَّةِ الجُـوعِ، ولا يُنـافِي تَرْجِيـحُ هَـذا مـا ورَدَ أنَّ الدُّخـانَ مِـن آيـاتِ**

السَّاعَةِ، فَإِنَّ ذَلِكَ دُخَانٌ آخَرُ، ولا يُنافِيهِ أيْضًا ما قِيلَ: إنَّهُ الَّذِي كانَ يَوْمَ فَتْحِ مَكَّةَ، فَإِنَّهُ دُخانٌ آخَرُ عَلى تَقْدِيرِ صِحَّةِ وُقُوعِهِ}[1].

واتـە: قسـەی بەهێزتـر ئەوەیـە مەبەسـت ئـەو دوو کەڵەیـە کـە ئـەوان، هاتۆتـە بەرچاویـان، لـە ئەنجامـی برسـێتی و وشـکە سـاڵییدا، ئەمـەش لەگـەڵ ئـەوەدا تێکناگیـرێ، کـە هاتنـی دووکـەڵ، یەکـێ بـێ لـە نیشـانەکانی ئاخیـر زەمـان، کـە ئـەوە دووکەڵێکـی دیکەیـە، هەروەهـا لەگـەڵ ئەوەشـدا تێکناگیـرێ کـە لـە ڕۆژی فەتحـی مەککـەدا، تـەپ و تـۆزو گـەرد چۆتـە ئاسـمان، ئـەوەش دووکـەڵ و تـەپ و تۆزێکـی دیکەیـە، ئەگـەر گریـمان ئـەوە وا بووبـێ.

**(الطبري)** لـە تەفسـیرەکەی خۆیـدا دەڵـێ: {**عَنْ عِكْرِمَةَ قَالَ: قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: قَالَ ابْنُ مَسْعُودٍ: الْبَطْشَةُ الْكُبْرَى: يَوْمُ بَدْرٍ، وَأَنَا أَقُولُ: هِيَ يَوْمُ الْقِيَامَةِ**}[2].

واتـە: عیکریمـە، گێڕاویەتـەوە: گوتوویـەتی: عەبدوڵـڵای کـوڕی عەبباس، گوتوویـەتی: عەبدوڵـڵای کـوڕی مەسـعوود (خـوا لێیـان ڕازی بـێ) ڕای وابـووە، گوتوویـەتی: (**الْبَطْشَةُ الْكُبْرَى**)، زەبـری گەورەتـر، ڕۆژی جەنگـی بـەدرە، بـەڵام من دەڵێـم: ئـەوە ڕۆژی قیامەتە.

هەڵبەتـە ئـەوە ڕای عەبدوڵـڵای کـوڕی عەبباس بـووە (خـوا لـە خـۆی و بـابی ڕازی بـێ)، بـەڵام بـە تەئکیـد ڕایەکـەی عەبدوڵـڵای کـوڕی مەسـعوود (خـوا لێـی ڕازی بـێ) ڕاسـترەو، (**الطبري**)ش، هـەر ئـەو ڕایـەی تەرجیـح کـردوە، بـە ژمـارە (٣١١٣٩)، کـە گوتوویـەتی: (**الْبَطْشَةُ الْكُبْرَى: يَوْمُ بَدْرٍ**)، هـەروەک گوتـم: هـەر ئـەو توێژەرانـەی دیکـەی قورئانیـش زۆربەیـان هـەر ئـەوە ڕایـان بـووە.

لـە خـوای پـەروەردگار دەپاڕێینـەوە، بـە لوتـف و کەرەمـی خـۆی یارمەتییمانـدا، عەقـڵ و دڵـمان ڕۆشـنتر بـێ، بـۆ ئـەوەی باشـتر لـە ئایەتـەکانی خـوا تێبگەیـن،

---

(١) جامع البيان: ج٢٥، ص١١٧. فتح القدير: ج٤، ص٦٨٣. التحرير والتنوير: ج٢٥، ص٢٨٧.

(٢) جامع البيان: ٣١١٣٩.

یارمەتییشـمان بـدات هەمیشـە زانینەکەمـان بگۆڕیـن بـۆ توانیـن و، حاڵیـی بوونەکـە لـە خۆمانـدا بکەینـە حـاڵ و، زانیاریـی و شـارەزاییەکەمان لەسـەرمان نەبێتـە بەڵگـە، بەڵکـو بۆمـان ببێتـە بەڵگـە، هـەم خۆمـان کاری پـێ بکەیـن، هـەم دەوروبەریشـمانی پـێ چـاک بکەیـن.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان حەڤـدە (١٧) ئایـەت، ئایەتـەکانی: (١٧ - ٣٣) دەگرێتـە خـۆی، کـە هەموویـان لـە بـارەی چەنـد گۆشـەیەک لـە بەسـەرهاتی مووسـا عليه السلام و فیرعەونـەوەن: چـۆن خـوا ﷻ مووسـای ڕەوانکـردوە بـە بەڵگـە ڕوون و ئاشـکرایەکانەوە، کـە بەنـدەکانی خـوا، گەلـە چەوسـاوەکەی مووسـا (بەنـوو ئیسـرائیل) لـە ژێرچەنگـی فیرعـەون دەربێنـێ و، تەسـلیمی بکەنـەوە، کەچـی ئـەوان لەسـەر سـتەم و تـاوانی خۆیـان بـەردەوام بـوون و، ئامـادە نەبـوون ئـەو گەلـە چەوسـێنراوەیە کـە سـۆغرەو بێگاریـان پێکـراوە، لەگـەڵ مووسـادا عليه السلام بنێـرن، کـە خـوا ناردوویـەتی و وەک ئامانجێکـی سـەرەکیی پێـی سـپاردوە، کـە دەبـێ ئـەو گەلـە چەوسـاوەیە لـە ژێـر چنگـی فیرعـەون دەربێنـی و، چیدیکـە نەچەوسـێنرێنەوە، کەچـی ئامـادە نەبـوون ئـەو داواکارییـەی بـۆ جێبەجـێ بکـەن، پێـش ئـەوەش ئامـادە نەبـوون بـڕوای پـێ بێنـن، بۆیـە سـەرەنجام خـوا ﷻ فەرمانـی بـە مووسـا عليه السلام کـردوە، کـە لـە شـەوگاردا پێـش گەلەکـەی بکـەوێ، بـەرەو دەریـای سـوورو دەشـتی سـینا، بیانبـات.

سـەرەنجام فیرعـەون و سـوپایەکەی ڕاوەدوویـان نـاون و کەوتوونـە دوایـان، خواش ﷻ دەریـای سـووری بـۆ مووسـاو گەلەکـەی قڵیشـاندوە و، ئـەوانی دەربـاز کـردوەو فیرعـەون و سەربازەکانیشـی کـە هـەر بـە شـوێن مووسـاو گەلەکەیـەوە بـوون و ڕاوە دوویـان نـاون، ئەوانیشـی نغرۆکـردوون لـە دەریـای سـووردا، لـە ئاکامـدا فیرعـەون و گەلەکـەی، کۆشـک و تـەلارو بـاخ و بێسـتان و هەرچـی هەیانبـووە بۆتـە میراتیـان، گەلـی (بەنـوو ئیسرائیل)یـش لـە ئـازاری ڕیسـواکەر قوتارکـراون.

هەروەهـا خـوای میهرەبـان گەلێـک نیشـانەی نـاوازی، وەک تاقیکردنـەوە بـە بەنوو ئیسـڕائیل داون، کـە کەمـتر وابـووە خـوا ﷻ لـەو جـۆرە بـە گـەلانی دیکەیـان بـدات،

ئەویش لەبەر ئەو بارودۆخە تایبەتییەی کە لە میسر تێیدا بوون و، دواتریش کەوتوونە نێو هەڵ و مەرجێکی دیکەی زۆر سەخت و دژوارەوە.

﴿وَلَقَدْ فَتَنَّا قَبْلَهُمْ قَوْمَ فِرْعَوْنَ وَجَآءَهُمْ رَسُولٌ كَرِيمٌ ﴿١٧﴾ أَنْ أَدُّوٓاْ إِلَىَّ عِبَادَ ٱللَّهِ إِنِّى لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ ﴿١٨﴾ وَأَن لَّا تَعْلُواْ عَلَى ٱللَّهِ إِنِّىٓ ءَاتِيكُم بِسُلْطَٰنٍ مُّبِينٍ ﴿١٩﴾ وَإِنِّى عُذْتُ بِرَبِّى وَرَبِّكُمْ أَن تَرْجُمُونِ ﴿٢٠﴾ وَإِن لَّمْ تُؤْمِنُواْ لِى فَٱعْتَزِلُونِ ﴿٢١﴾ فَدَعَا رَبَّهُۥٓ أَنَّ هَٰٓؤُلَآءِ قَوْمٌ مُّجْرِمُونَ ﴿٢٢﴾ فَأَسْرِ بِعِبَادِى لَيْلًا إِنَّكُم مُّتَّبَعُونَ ﴿٢٣﴾ وَٱتْرُكِ ٱلْبَحْرَ رَهْوًا إِنَّهُمْ جُندٌ مُّغْرَقُونَ ﴿٢٤﴾ كَمْ تَرَكُواْ مِن جَنَّٰتٍ وَعُيُونٍ ﴿٢٥﴾ وَزُرُوعٍ وَمَقَامٍ كَرِيمٍ ﴿٢٦﴾ وَنَعْمَةٍ كَانُواْ فِيهَا فَٰكِهِينَ ﴿٢٧﴾ كَذَٰلِكَ وَأَوْرَثْنَٰهَا قَوْمًا ءَاخَرِينَ ﴿٢٨﴾ فَمَا بَكَتْ عَلَيْهِمُ ٱلسَّمَآءُ وَٱلْأَرْضُ وَمَا كَانُواْ مُنظَرِينَ ﴿٢٩﴾ وَلَقَدْ نَجَّيْنَا بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ مِنَ ٱلْعَذَابِ ٱلْمُهِينِ ﴿٣٠﴾ مِن فِرْعَوْنَ إِنَّهُۥ كَانَ عَالِيًا مِّنَ ٱلْمُسْرِفِينَ ﴿٣١﴾ وَلَقَدِ ٱخْتَرْنَٰهُمْ عَلَىٰ عِلْمٍ عَلَى ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٣٢﴾ وَءَاتَيْنَٰهُم مِّنَ ٱلْءَايَٰتِ مَا فِيهِ بَلَٰٓؤٌاْ مُّبِينٌ ﴿٣٣﴾﴾.

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{هەروەها پێش وانیش (پێش کۆمەڵگای موحەممەد)، کۆمەڵی فیرعەونمان تاقیکردەوەو، پێغەمبەرێکی بەڕێزو هەرەباشیان بۆ هات ﴿١٧﴾ کە (پێی گوتن:) بەندەکانی خوام وێبدەن (پێم بسپێرن لەگەڵ خۆمیان بەرم) بە دڵنیاییی من بۆ ئێوە پێغەمبەرێکی ئەمیندارم (سپاردە پارێزم) ﴿١٨﴾ لە بەرانبەر خواشدا خۆتان بەرز مەکەن (خۆتان بەزل مەگرن)، بێگومان من بەڵگەیەکی ئاشکراتان بۆ دێنم ﴿١٩﴾ پەناش بە پەروەردگاری خۆم و پەروەردگاری ئێوەش دەگرم، کە بەردبارانم بکەن، (وەک عادەتتان لەگەڵ نەیارەکانتاندا) ﴿٢٠﴾ ئەگەر بڕواشم بۆ ناهێنن، خۆتانم لێ کەنار بگرن (گێچەڵم پێ مەکەن) ﴿٢١﴾ ئیدی لە پەروەردگاری

پاڕایەوە کە: ئەوانە (فیرعەون و کۆمەڵەکەی) کۆمەڵێکی تاوانبارن ﴿٢٢﴾ (ئێمەش فەرمانمان پێکرد): شەوڕۆ بە بەندەکانم بکە، بە دڵنیایی ئێوە ڕاوەدوونراون (لە لایەن فیرعەون و کۆمەڵەکەیەوە) ﴿٢٣﴾ (لە دەریای سووریش بپەڕنەوەو) لە دەریاکەش گەڕێ بە قڵیشاویی و کراوەیی، بمێنێتەوە، چونکە مسۆگەر (بڕیاری خوایە) ئەوان (کۆمەڵی فیرعەون) سەربازانێکی خنکێنراوبن ﴿٢٤﴾ گەلێک باخ و کانیی و سەرچاوەیان (دوای خۆیان) بەجێهێشتن ﴿٢٥﴾ هەروەها (گەلێک کێڵگەی) کشتوکاڵ و جێگاو شوێنی پەسندو خۆش ﴿٢٦﴾ دیسان (زۆر) نازو نیعمەت کە تێیدا خۆشگوزەران و بە کەیف بوون ﴿٢٧﴾ (ئەوە) بەو جۆرە ڕوویداو هەرچیش بەجێیان هێشتبوو، بە میرات دامانە کۆمەڵێکی دیکە ﴿٢٨﴾ ئاسمان و زەویش بۆیان نەگریان و، لە مۆڵەت دراوان و دواخراوانیش نەبوون ﴿٢٩﴾ بەڕاستییش وەچەی ئیسرائیلمان لە ئازارێکی ڕیسواکەر ڕزگار کرد ﴿٣٠﴾ لە (ستەم و سۆغرەو بێگاری) فیرعەون، بێگومان ئەو خۆ بەرزکەرەوە بوو، لە زێدەڕۆییکاران ﴿٣١﴾ بە دڵنیاییش لە ڕووی زانیارییەوە بەسەر جیهانییان (ی ڕۆژگاری خۆیان)دا، هەڵمانبژارد بوون ﴿٣٢﴾ (ژمارەیەکی زۆر) لەو نیشانانەشمان پێدابوون کە تاقیکردنەوەیەکی ئاشکرایان تێدابوو بۆیان (داخۆ چۆنیان مامەڵە لەگەڵدا دەکەن؟) ﴿٣٣﴾ }

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(فَتَنَّا): واتـە: تاقیـمان کردنـەوە (إبْتَلَيْنَـا، إمْتَحَنَـا)، (أَصْـلُ الفَـتْنِ: إدْخَـالُ الذَّهَـبِ النَّـارَ لِتَظْهَـرَ جَوْدَتُـهُ مِـنْ رَدَاءَتِـهِ، وَاسْـتُعْمِلَ فِي إدْخَـالِ الإنْسَـانِ النَّـارَ، وَجُعِلَـتِ الفِتْنَـةُ كَالْبَـلَاءِ، فِيـمَا يُدْفَـعُ إلَيْـهِ الإنْسَـانُ مِـنْ شِـدَّةٍ وَرَخَـاء)، وشـەی (فَـتْن): لـە ڕیشـەدا بـە مانـای ئەوەیـە کـە زێـڕ بخرێتـە نێـو ئاگـر، تاکـو زێڕەکـە سـاغییەکەی لە ناسـاغییەکەی دەرکـەوێ، (ئەگـەر کانـزای دیکـەی ڕەگـەڵ خرابـێ، دەرکـەوێ، بۆیـە گوتـراوە: زێـڕی سـوور لـە ئاگـر ناترسـێ، زێـڕی سـاغ لـە ئاگـر ناترسـێ، هەرچەنـدە بیسـووتێنی، کـەم نـاکات)، هەروەهـا (فَـتْن) بەکارهێـنراوە بـۆ ئـەوەی مـرۆڤ بخرێتـە نێـو ئاگـرو سـزا بـدرێ، هەروەهـا وشـەی (فِتْنَـة) وەک وشـەی (بَـلَاء) بەکارهێـنراوە لـەوەدا کـە مـرۆڤ دەخرێتـە نێـوی لـە سـەختییان و ناخۆشـییان.

(كَرِيمٌ): (كُلُّ شَيءٍ شَرُفَ فِي بابِـهِ: فَهُـوَ كَرِيْـم، وَإذَا وُصِـفَ بِـهِ الإنْسَـانُ فَهُـو اسْـمٌ لِلأخْـلَاقِ وَالأَفْعَـالِ المَحْمُـودَةِ الَّتِـي ظَهَـرَت مِنْـهُ)، وشـەی (كَرِيْـم): بـۆ هـەر شـتێک بەکاربهێـنرێ، یانـی: ئـەو شـتە لـە جـۆری خـۆی، چاکـە، (زَوْجٍ كَرِيْـم): واتـە: هـەر ڕووەکێکـی بـە پیـت و پێـز، ئنجـا هـەر شـتێک کـە وشـەی (كَرِيْـم)ی بـۆ بەکاربهێـنرێ، ئەگـەر پۆشـاکە، واتـە: پۆشـاکێکی بـاش، ئەگـەر مـاڵ و سـامانە، یانی: ماڵ و سـامانێکی زۆر بـاش، بـەڵام ئەگـەر مـرۆڤ بـە (كَرِيْـم)، وەصـف بکـرێ، ئـەوە نـاوە بـۆ ڕەوشـت و ئـاکارە ستایشـکراوەکانی کـە لێـی دەرکەوتـوون.

(أَدُّوا إِلَيَّ): واتـە: تەسـلیمم بکـەن، (الأَدَاءُ: دَفْـعُ مَـا يَحِـقُّ دَفْعُـهُ وَتَوْفِيَتُـهُ)، (أَدَاء): بریتیـە لـە شـتێک کـە پێویسـت بێـت بـدرێ، تەسـلیم بـەو کەسـە بکـرێ، بـە چاکیـی بسـپێردرێ بـەو کەسـەی پێویسـتە پێـی بسـپێردرێ.

(**أَمِينٌ**): (**أَمِيْن وَأُمَّان: مَنْ يُؤْمَنُ بِهِ، الحَافِظُ وَالحَارِسُ، مَنْ يُجْعَل مُؤْتَمَناً عَلَى الشَّيءِ**)، وشەی (**أَمِيْن وَأُمَّان**)، واتە: کەسێک بە ئەمیندار دابنرێ، پارێزەرو چاودێر، هەروەها بە کەسێک دەگوترێ کە سپاردەیەکی پێ بسپێردرێ و، بە ئەمیندار دابنرێ لەسەری.

(**تَرْجُمُونِ**): (**الرِّجَامُ: الحِجَارَةُ، وَالرَّجْمُ: الرَّمِيُّ بِالرِّجَامِ، وَيُسْتَعَارُ الرَّجْمُ لِلشَّتْمِ وَالطَّرْدِ**)، ﴿ وَإِنِّي عُذْتُ بِرَبِّي وَرَبِّكُمْ أَن تَرْجُمُونِ ﴾، من پەنا بە پەروەردگاری خۆم و پەروەردگاری ئێوەش دەگرم کە بەردبارانم بکەن، وشەی (**تَرْجُمُون**): لە (**رِجَامُ**)ەوە هاتوە، (**رِجَام**): بە مانای بەرد دێ، (**رَجْم**)یش بریتیە لە هاویشتنی بەرد، یان: بەرد بە کەسێک دادان، خوازراویشتەوە بۆ قسەپێگوتن و دەرکردنیش، (**الشَّيْطَانِ الرَّجِيم**)، واتە: شەیتانی نەفرین لێکراوو، دوورکراوەو دەرکراو، بەڵام بە پێی سیاق دەزاندرێ ئایا مەبەست پێی جنێوە، یان دەرکرانە، یاخود بەردبارانکرانە؟

(**فَاعْتَزِلُونِ**): واتە: کەنار بگرن لێم، (**الإعْتِزَالُ: تَجَنُّبُ الشَّيءِ، بِالْبَدْنِ، أَو القَلْبِ**)، (**إعْتِزَال**): واتە: گۆشەگیریی، مەبەست کەنار گرتنە لە شتێک و دووریی گرتنەلێی بە جەستە، یاخود بە دڵ، یاخود بە هەردووکیان.

(**رَهْوًا**): (**سَاكِناً، أَو سَعَةً مِنَ الطَّرِيْق**)، (**رَهْواً**): بە مانای ئارام و بێ جووڵە دێ، هەروەها بە مانای قڵیشانیش دێ، واتە: دەریاکە بە قڵیشاوەیی، بە کراوەیی بەجێ بهێڵن، یانی: دووبارە گۆچانی لێمەدە، کە وێک بێتەوە، لێی گەڕێ با بە کراوەیی بمێنێتەوە.

(**وَمَقَامٍ**): (**مَصْدَرٌ، وَاسْمُ مَكَانِ القِيَامِ وَزَمَانِه، وَالْمُقَامُ: يُقَالُ لِلْمَصْدَرِ والْمَكَانِ وَالزَّمَانِ وَالْمَفْعُولِ**)، وشەی (**مَقَام**): چاوگە، بە مانای ناوی شوێنی لێراوەستان و، کاتەکەشی دێ، واتە: هەم بە مانای شوێنی لێ وەستان و مانەوە، هەم کاتی مانەوەو لێ وەستان، دێ (**مُقَامُ**)یش: بەمانای شوێن و، بەمانای کات و، بەمانای بەرکاریش بەکاردێ.

(وَنَعْمَةٍ): (النَّعْمَـةُ: التَّنَعُّـمُ، والنُّعْمَـة: الحَالَـةُ الحَسَـنَة، وَالنِّعْمَـةُ للجِنْـسِ، يُقَـالُ: للقَلِيْـلِ وَالكَثِـيْرِ)، (نَعْمَـة): بـە مانـای خۆشـگوزەرانیی و حاڵەتـی بـاش و نـازو نیعمەتـە، وشـەی (نِعْمَة)یـش، بـۆ جینسـە هـەم بـۆ زۆرو هـەم بـۆ کـەم بەکاردەهێـنرێ، کەواتـە: (نِعْمَـة)، بـە مانـای خۆشـیی و چاکـە دێ، بـەڵام (نَعْمَـة)، بـە مانـای خۆشـگوزەرانیی و کەیـف و سـەفاو بەهرەمەنـد بـوون لـە نیعمـەت، دێ.

(فَٰكِهِينَ): (الفُكَاهَـةُ: حَدِيْـثُ ذَوِي الأُنْـسِ، فَاكِهِيْنَ وَفَكِهِيْن، مُتَّصِفِيْنَ بِالْفُكَاهَـةِ، وَهِـيَ اللُّعِـبُ وَالمِـزَاحُ أي: فِي النِّعْمَـة يَلْعَبُـون)، (فَاكِهِـيْن): لـە (فُكَاهَـة) هاتـوە، (فُكَاهَة): قسـەی کۆمەڵێکـە کـە پێکـەوە کات بەسـەر بـەرن، بـەو واتایـەی کەیـف خۆشـبن، (فَکِهِـيْن) و (فَاكِهِـيْن): هەردووکیـان یـەک واتایـان هەیـە، واتـە: کومەڵێـک کـە لـە حاڵەتـی (فُكَاهَـة) دان، کـە بریتیـە لـە یاریـی و قسـەی سـوعبەت و، کەیـف و خۆشـیی.

(بَلَٰٓؤٌا): (أي: اخْتِبَـارٌ بِالْخَـيْرِ وَالـشَّرِ)، (بَـلَاء): بـە مانـای تاقیکردنـەوە، بـە خۆشـیی یـان ناخۆشـیی، واتـە: بـە شـتێک کـە مـرۆڤ حـەزی پێیەتـی و بـە شـتێکیش کـە حـەزی پێـی نیـە.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

وەک پێشـتریش گوتمـان: ئـەم حەڤـدە (١٧) ئایەتـە، زۆر بـە کورتیـی و پوختیـی، باسـی چەنـد گۆشـەیەک لـە بەسـەرهاتی مووسـا ﷺ، هەروەهـا هـارووني بـرای لەگەڵیـدا، بـەڵام لێـرەدا باسـی هـاروون نەکـراوە، گەلەکـەی بەنـوو ئیسـرائیل، لـە بەرانبەریشـیاندا فیرعـەون و دارو دەسـتەکەی، ئێمـە کـۆی بەسـەرهاتی مووسـا و هـاروون (علیهـم السـلام) و گەلەکەیـان (بەنـوو ئیسـرائیل)، لـە بەرانبەریشـیاندا فیرعـەون و هامـان و قـاروون و دارو دەسـتەکەیان، کردوومانـە، بـە سـێزدە (١٣) ئاڵقـە، پێنجیـان لـە تەفسـیری سـەرەتای سـوورەتی (القصـص)دا، خسـتوومانە ڕوو،

هەشتیشیان لـە میانی تەفسـیرکردنی (٦٩) ئایەتەکانی سـوورەتی (**الأعـراف**)دا، ئایەتەکانی: (١٠٣ - ١٧١)، هـی سـوورەتی (**القصص**)یـش، ئایەتـەکانی سـەرەتای سـوورەتی (**القصـص**)ن، ئایەتـەکانی: (١ - ٤٣)، بۆیـە ئێمـە لـە هـەر شـوێنێک بەسـەرهاتی مووسـامان ﷺ بێتـەوە پێـش، ئامـاژە دەکەیـن، بـەو شـوێنە کـە لەوێـدا درێـژەی ئـەو بەسـەرهاتەمان بـە هەمـوو قۆنـاغ و ئاڵقەکانیـەوە خسـتۆتە ڕوو، لێـرەدا خـوا ﷻ وەک گوتمـان: بـە کورتیـی و پوختیـی ئامـاژە دەکات، بـە هەندێـک لـەو قۆناغانـەی بەسـەرهاتی مووسـا ﷺ لەبـەر ئـەوەی لـە شـوێنەکانی دیکـەدا، هـەم لـە سـوورەتی (**الأعـراف**)داو، هـەم لـە سـوورەتی (**طـه**)داو، هەروەهـا لـە سـوورەتی (**الشـعراء**)داو، هەندێکـی لە سـوورەتی (**النمـل**)دا، هەروەهـا لـە سـوورەتی (**القصـص**)دا، دواتریـش لـە هەندێـک شـوێنی دیکـەدا، خـوا ﷻ بەسـەرهاتی مووسـای ﷺ باسـکردوە، بۆیـە لێـرەدا بـە کورتیـی دەفەرمـوێ: ﴿ وَلَقَدْ فَتَنَّا قَبْلَهُمْ قَوْمَ فِرْعَوْنَ وَجَآءَهُمْ رَسُولٌ كَرِيمٌ ﴾، بـە دڵنیایـی لـە پێـش ئەوانـدا، گەلـی فیرعەونمـان تاقیکـردەوەو ڕەوانەکراوێکـی بەڕێزیـان هاتـەلا. ڕانـاوی (**هُـم**)، دەگەڕێتـەوە بـۆ خەڵکـی ڕۆژگاری موحەممـەد ﷺ، واتـە: لـە پێـش ئـەو خەڵکـەی ڕۆژگاری تـۆدا، ئـەی موحەممـەدا! ﷺ خەڵـک و کۆمەڵـگای فیرعەونمـان تاقیکـردەوە، ﴿ وَجَآءَهُمْ رَسُولٌ كَرِيمٌ ﴾، پێغەمبەرێکـی بەڕێـزو خـاوەن پێگـەو گـران و سـەنگینیان بـۆ هـات، کـە مووسـایە ﷺ.

لێـردا خـوا ﷻ نـاوی مووسـای هـەر نەهێنـاوە، بـەڵام دەزانـرێ ئـەو پێغەمبـەرە بەڕێـزو حورمەتـەی کـە بـۆ لای فیرعـەون و کۆمەڵەکـەی ڕەوانـە کـراوە، مووسـا ﷺ بـووە، ﴿ أَنْ أَدُّوٓا۟ إِلَىَّ عِبَادَ ٱللَّهِ ﴾، پێیگوتـن: کـە بەنـدەکانی خـوام وێبـدەن، تەسـلیمم بکـەن و پێـم بسـپێرن، واتـە: ئـەو خەڵکـەی وەک ئەمانەتێـک بـوون، لـە لای ئێـوە لـە میسـر، ئـەو نەتـەوەی بەنـوو ئیسـرائیل، ئێسـتا تەسـلیمی منیـان بکـەن و چیدیکـە سـۆغرەو بێگاریـان پـێ مەکـەن و، مەیانچەوسـێننەوە، ﴿ إِنِّى لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ ﴾، بـە دڵنیایـی مـن پێغەمبەرێکـی ئەمینـدارم بـۆ ئێـوە، واتـە: ئەمینـدارم خـوا چ پەیامێکـی پێگەیانـدووم و، پێیدانـاردووم، پێتاندەگەیەنـم، کـە بەشـێکی گـەورەو

گرنگـی پەیامەکـەم ئەوەیـە کـە ئـەو گەلـەی بەنـوو ئیسـڕائیل دەربـاز بکـەم، لـەو واقیعـەی ئێـوە ئەوانتـان خسـتۆتە نێـوی، کـە بریتیـە لـەوەی نێرینەکانیـان سـەردەبڕن و، مێینەکانیــان دەهێڵنــەوەو، سـۆغرەو بێگاریــان پێدەکــەن، دەیانچەســێننەوەو سـووکایەتییان پـێ دەکـەن، ئنجـا مـن ئەمینـدارم، ئەگـەر ئەوانـەم تەسـلیم بکـەن، وەک سـپاردەیەک، دەیانپارێـزم، ئەمینداریشـم لـەو ڕووەوە کـە شـتێک ناڵێـم، وانەبـێ، خـوا ﷻ منـی بـەو پەیامـەوە بـۆ لای ئێـوە نـاردوە.

﴿وَأَن لَّا تَعْلُوا۟ عَلَى ٱللَّهِ﴾، هەروەهـا هاتـووم پێتـان ڕابگەیەنـم، کـە ئێـوە لـە ئاسـت خـوادا خۆتـان بـەرز مەکەنـەوەو خۆتـان بـەزل مەگـرن، ﴿إِنِّىٓ ءَاتِيكُم بِسُلْطَـٰنٍ مُّبِينٍ﴾، بـە دڵنیایـی مـن بەڵگەیەکـی ڕۆشـنتان بـۆ دێنـم، یاخـود بەڵگەیەکـی ڕۆشـنکەرەوەی حەقیقـەتی خـۆم و حەقیقـەتی پەیامەکەمتـان، بـۆ دێنـم کـە ڕاسـتین.

﴿وَإِنِّى عُذْتُ بِرَبِّى وَرَبِّكُمْ أَن تَرْجُمُونِ﴾، مـن پەنـام گرتـوە بـە پـەروەردگاری خـۆم و پـەروەردگاری ئێـوەش، کـە بـەرد بارانـم بکـەن، لەبـەر ئـەوەی ئـەوان عادەتیـان وابـووە، کەسـێک کـە نەیاریـان بـووەو بـە حیسـابی ئـەوان لێیـان یاخیـی بـووە، بـە سـزایەکی زۆر خـراپ کـە بریتیـە لـە بـەرد بـاران کـردن، کوشـتوویانە، واتـە: مـن پەنـا بـە خـوا دەگـرم، کـە ئێـوە مـن بـەرد بـاران بکـەن، هەندێـک لـە توێـژەرەوانی قورئـان، وشـەی: (**تَرْجُمُون**)یـان بـە جنێـو پێگوتـن یـان دەرکـردن، لێکداوەتـەوە، بـەڵام لـە ڕاسـتییدا ئـەوەی مووسـای ﷺ وا لێکـردوە، پەنایـان لـێ بـە خـوا بگـرێ، ئـەوە نەبـووە کـە قسـەی پـێ بڵێـن و، بڵێـن: بـڕۆ لـە کۆڵـمان بـەوە، بەڵکـو ئـەوە بـووە کـە بەردبـارانی بکـەن و بیکـوژن و، نەهێڵـن پەیامـی خـوا بگەیەنـێ و ئـەو ئەرکـەی خـوا پێـی سـپاردوە، جێبەجێـی بـکات، کـە بریتیـە لـە قوتارکـردن و دەربازکـردنی بەنـوو ئیسـڕائیل، لـە ژێـر چەکمـە و پۆسـتاڵی ستەمکارانەی ئـەوان.

﴿وَإِن لَّمْ تُؤْمِنُوا۟ لِى فَٱعْتَزِلُونِ﴾، ئەگـەر بـۆ منیـش بـڕوا ناهێنـن و بەڕاسـتم نازانـن، داوایەکەشـم جێبەجـێ ناکـەن، (**فَٱعْتَزِلُـون**) کەنـارم لـێ بگـرن، لێـم دوورە پەرێـز بـن،

واتـە: ئەگـەر بـڕوا دێنـن، پێغەمبـەری خـوام هاتـووم بـۆ لاتـان و بەڵگەشـم پێیـە، ئنجـا ئەگـەر بـڕوا بێنـن، مـن ئەرکـی خـۆم جێبەجـێ کـردووە، بـۆ ئێـوەش زۆر باشـە بـۆ دنیـاو دوارۆژتـان و مایـەی سـەرفرازییە، ئەگـەر بـڕواش ناهێنـن کەنـارم لێبگـرن، بـەڵام دەفەرمـوێ: ﴿ وَإِن لَّمْ تُؤْمِنُوا لِي ﴾، ئەگـەر بڕواشـم بـۆ ناهێنـن، چونکـە هێنـدەی پێخۆشـە، بـڕوا بێنـن، وەک بڕوایەکـە بـەس بـۆ ئەوبـێ، ئەگەرنـا لـە ڕاستییدا سـوودی بـڕوا هێنانەکـە بـۆ خۆیانـە، ئەگەرنـا ئـەو پێغەمبەرێکـی خوایـەو، پەیامـی خـوای پێگەیانـدوون، ئەگـەر کەمتەرخـەم نەبووبـێ، تـەواوی پاداشـتی خـۆی هەیـە، ئـەوان بـڕوا بێنـن یـان بـڕوا نەهێنـن، بـۆ ئـەو هیـچ فـەرق نـاکات، ئـەوە خۆیانـن کـە لـە بـڕوا هێنانیـان بەهرەمەنـدن، بـەڵام ئەمـە ئـەوە دەگەیەنـێ: مـن هێنـدەم پێخۆشـە، ئێـوە بـڕوا بێنـن، وەک بـۆ مـن بڕواتـان هێنابـێ، وەک کەسـێک بـە کەسـێک دەڵـێ: ئەوەنـدەم پێخۆشـە نوێژەکانـت دەکـەی، وا دەزانـم بۆمنیـان دەکـەی، یـان ئەوەنـدەم پێخۆشـە فڵانـە کارە چاکـەت کـردوە، وادەزانـم بـۆ منـت کـردوە.

کـە دەفەرمـوێ: (**فَاعْتَزِلُونِ**) کەنـارم لـێ بگـرن، واتـە: گێچەڵـم پـێ مەکـەن و، مەبنـە کۆسـپ لـە بەردەممـدا و وەک بەردێکـی خـڕ هەبـن، کـە دەکەوێتـە زاری کانیەکـەوە، بـۆ خۆشـی ئـاو ناخواتـەوەو، ڕێـی خەڵکیـش نـادات ئـاو بخۆنـەوە!

﴿ فَدَعَا رَبَّهُۥٓ ﴾، ئـەم (ف)ە کـە دەفەرمـوێ: ﴿ فَدَعَا رَبَّهُۥٓ ﴾، لـە زمـانی عەرەبییـدا، پێـی دەگوتـرێ: (**الفَـاء الفَصِيْحَـة**) فائـی ڕوونکردنـەوە، یاخـود (**فـاء التَّفْرِيـع**) فائـی لقانـدن و لـق لێکردنـەوە، کـە دەلالـەت لەسـەر ئـەوە دەکـەن، لـە پێـش ئەوەدا شـتی دیکـە بـووە، واتـە: بڕوایـان پـێ نەهێنـاوەو دژایەتییـان کـردووەو، ئامـادە نەبـوون، گـەلی بەنـوو ئیسـرائیلی تەسـلیم بکـەن، ئەویـش لـە پـەروەردگاری پاڕایـەوە، یـانی: (**لَـمْ يُؤْمِنُـوا بِـهِ، وَلَـمْ يَتَّبِعُـوه، وَلَـمْ يُسْـلِمُوا إِلَيْـهِ بَنِـي إِسْرَائِيْـلَ، فَدَعَـا رَبَّـهُ**)، ئەگەرنـا هـەر لـە خـۆوە لـە پـەروەردگاری نەپاڕاوەتـەوە، بەڵکـو لـە پـەروەردگاری پاڕایـەوە، دوای ئـەوەی لەگەڵیانـدا گەیشـتە بـن بەسـت، ﴿ أَنَّ هَٰٓؤُلَآءِ قَوْمٌ مُّجْرِمُونَ ﴾، کـە ئەوانـە کۆمەڵێکـی تاوانبـارن، واتـە: شایسـتەی ئـەوەن سـزایان بـدەی، هەڵبەتـە دوای ئـەوەی

گەیشـتۆتە بـن بەسـت و هیـچ ئومێدێکـی پێیـان نەمـاوە، کـە لـە شـوێنی خۆیـدا بـە تەفصیـڵ باسـمانکردوە، چەنـدان نیشـانەی پێشـانداوون، هـەر لـە سـوورەتی (**الزخـرف**) یشـدا، هاتـوە کـە پێـش ئـەم سـوورەتە تەفسـیرمان کـرد، خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ وَمَا نُرِيهِم مِّنْ ءَايَةٍ إِلَّا هِىَ أَكْبَرُ مِنْ أُخْتِهَا ﴿٤٨﴾ ﴾، واتـە: هیـچ نیشـانەو بەڵگەیەکـمان پێشـان نـەدەدان، مەگـەر (لـە دەسـتە خوشـکەکەی لـەوەی پێشـێی) گەورەتـر بـووە، نیشـانەکان یـەک لـە یەکـی گەورەتربـوون و، هەرجـارەش کـە نیشـانەیەکی پێشـان دەدان، تەنگیـان پـێ هەڵدەچـنراو نارەحـەت دەبـوون، دەهاتنـەوە لای مووسـا ﷺو، دەیانگـوت: بۆمـان لـە پـەروەرگارت بپاڕێـوە، ئەگـەر ئـەو بەڵایەمـان لـێ لابـەرێ، بـڕوا دێنیـن، ئەویـش بۆیـان دەپاڕایـەوە و خـوا بەڵایەکەشـی لـێ لادەبـردن، کەچـی هـەر بڕواشـیان نەدەهێنـا، واتـە: کـە لێـرەدا مووسـا دەفەرمـوێ: ﴿ فَدَعَا رَبَّهُۥٓ أَنَّ هَٰٓؤُلَآءِ قَوْمٌ مُّجْرِمُونَ ﴾، دەبێ بزانرێ ئەوە دوای گەیشـتنە بن بەسـت بووە و دوای و خۆڕاگرییەکی زۆری مووسـا ﷺو، گەلـە چەوسـێنراوەکەی بـووە، ئنجـا مووسـا لـە پـەروەردگاری دەپاڕێتـەوە کـە ئەوانـە کۆمەڵێکـی تاوانبـارن، کۆمەڵـی تاوانباریـش دیـارە شایسـتەی سـزان، واتـە: خوایـە! کاتی ئـەوە هاتـوە سـزایان بـدەی، ﴿ فَأَسْرِ بِعِبَادِى لَيْلًا ﴾، دیسـان ئـەم (ف)ەش، بـۆ (فصيحـة) یـان (تفريـغ)ە، واتـە: خـوا ﷻ بـە مووسـای فەرمـوو بـە گەلەکـەت، بڵـێ: خۆیـان ئامـادە بکـەن، بـۆ ئـەوەی دەربازبـن و میسـر بەجـێ بهێڵـن، ﴿ فَأَسْرِ بِعِبَادِى ﴾، تـۆ شـەورۆ بـە بەندەکانـم بکـە، واتـە: ئەگـەر بـە نوێـژی نیـوەڕۆ و لەبـەر چـاوی گـەلی فیرعـەون دەربچـن، ئـەوان ڕاوەدووتـان دەنێـن و دەتانگـرن، بـەڵام هـەرکات بـێ ئـاگا بـوون و، ئـەوان لـە شـیرینی خـەودا بـوون، ئێـوە دەربچـن، بەنـوو ئیسـرائیل پێشـتر دەبـێ خۆیـان ئامادەکردبـێ، ئەگەرنـا گەلێـک، ئەگـەر وەک (پەیـمانی کـۆن)، دەڵـێ: چەنـد سـەد هـەزار کەسـێک بووبـن، کـە ئـەوە زێدەڕۆییـە، بـەڵام ئەگـەر چەنـد سـەد هـەزار کەسـێکیش نەبووبـن و تەنیـا چەنـد هەزار کەسـێک یاخـود، چەنـد سـەد کەسـێکیش بووبـن، بـەلای کەمـەوە، پێویسـتیی بـەوە کـردوە کـە پێشـتر ئامـادە بکرێـن، ئنجـا دیـارە ئەوانـە ڕێکخسـتنێکی نهێنییـان هەبـووەو، مووسـا ﷺ کارێکـی وایکـردوە هەموویـان ئاگاداربـن و، نهێنییەکەشـیان دەرنەچـێ،

﴿ فَأَسْرِ بِعِبَادِي لَيْلًا ﴾، بەشـەوگار شـەورۆ بـە بەندەکانـم بکـە، ئـەم وشـەی: (لَيْلًا)، بۆ جەختکردنەوەیـە، ئەگەرنـا (أَسْرِ)، یانی: شـەورۆ بکـە، ﴿سُبْحَانَ الَّذِي أَسْرَىٰ بِعَبْدِهِ لَيْلًا ①﴾الإسراء، واتـە: پاکیـی بـۆ ئـەو خوایـەی کـە شـەورۆی بـە بەنـدەی خـۆی کـرد، لـە شـەودا، لەوێـش دیسـان (لَيْلًا)، هـەر بـۆ جەختکردنەوەیـە، ﴿إِنَّكُم مُّتَّبَعُونَ ﴾، بـە دڵنیایـی ئێـوەش ڕاوەدوونـراون، واتـە: شـوێنتان دەکـەون و بەدواتانـدا دێـن، ئێـوە بەدواداچـوو و ڕاوەدوونـراون، واتـە: هـەروا لێتـان ناگەڕێـن، وەک بەرزەکـی بانـان بـۆی دەربچـن.

﴿ وَاتْرُكِ الْبَحْرَ رَهْوًا ﴾، دەریایەکـەش بەکراوەیـی وازلێبێنـە، دوای ئـەوەی خـوا ﷻ دەریـای سـوور کـە بـۆی قڵیشـاندووی، هەندێـک لـە تەفسـیرەکان گوتوویانـە: مەبەسـت پێـی ڕووبـاری نیلـە، بـەڵام وانیـە، ڕووبـاری نیـل، هـەر نیزیـک بـووە لـەوێ، بـەڵام مەبەسـت دەریـای سـوورە، وەک پێشـتر باسـمانکردوە کـە کاتی خـۆی (بَحْرُ الْقُلْزُم)ی پێگوتـراوە، واتـە: ئـەو دەریایـە بـە ئاواڵەیـی و بـە قڵیشـاویی بەجـێ بهێڵـە و وازی لـێ بێنـە،

لـە سـوورەتی (الشـعراء)دا، هاتـوە کـە خـوا ﷻ فەرمـان بـە مووسـا عليه السلام دەکات، بـە گۆچانەکـەی لـە دەریـا بـدات، بـۆ ئـەوەی شـەق ببێـت، ئنجـا کـە مووسـا عليه السلام بـە گۆچانەکـەی لـە دەریاکـە دەدا، دەریـا شـەق دەبـێ، وەك خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ فَأَوْحَيْنَا إِلَىٰ مُوسَىٰ أَنِ اضْرِب بِّعَصَاكَ الْبَحْرَ ۖ فَانفَلَقَ فَكَانَ كُلُّ فِرْقٍ كَالطَّوْدِ الْعَظِيمِ ⑥③﴾الشـعراء، واتـە: سروشـمان بـۆ لای مووسـا کـرد، کـە بـە گۆچانەکـەت لـە دەریایەکـە بـدە، یەکسـەر دەریایەکـە شـەق بـوو (قڵیشـا)، هـەر بەشـێکی وەک کێوێکـی مـەزن وابـوو، چونکـە دەریـای سـوور، لـە هەنـدێ شـوێن قووڵاییەکـەی ڕەنگـە کیلۆمەتـر زیاتـر بـێ، یاخـود چەنـد کیلۆمەترێـک بـێ، ئنجـا ئـەوە لەسـەر ڕا تاکـو خـوارێ بیبەسـتێ و بێتـە داڵان، بێگومـان وەک کێـوی بـەرز بـووە، بـە پێـی ئـەوە کـە کاتی خـۆی تەفسـیرمان کـرد، هـۆزو تیـرەکانی بەنـوو ئیسـرائیل دوازدە تیـرە بـوون و دەریایەکـەش بۆتـە دوازدە داڵان و ڕێـگا، ئـەو دەریـای خـوا قڵیشـاندوویەتی

و شـەقی کـردوە، بـۆ ئـەوەی بەنـوو ئیسـرائیل پێیـدا دەربازبـن، بۆیـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَٱتْرُكِ ٱلْبَحْرَ رَهْوًا ﴾، دەریایەکە بـە قڵیشـاویی و بـە کراوەیـی بەجـێ بهێڵـە، ﴿ إِنَّهُمْ جُندٌ مُّغْرَقُونَ ﴾، مەشترسێن بڵێـن: بـە دەریایەکـەدا بەدوامـان دادێـن و پێـمان دەگەن! بـە دڵنیایـی ئـەوان سـەربازانێکی نغـرۆ بـوون، واتـە: خـوا ﷻ بڕیـاری بـۆ داون، کـە دەبـێ بخنکێـن لـەو دەریایـەدا.

دوایــی خــوا ﷻ باســی ســەرەنجامەکەیان دەکات، دەفەرمــوێ: ﴿ كَمْ تَرَكُوا۟ مِن جَنَّـٰتٍ وَعُيُونٍ ﴾، چەنــدان بــاخ و ســەرچاوەیان بەجێهێشــتن! هەڵبەتــە دوایــی فیرعــەون لـە کاتی خنکانیـدا پەشـێمان بۆتـەوەو، داوای لـە خـوا کـردوە کـە ئـەوە ئیـمانی هێنـاو ملکەچـە، بـە تایبـەت لـە سـوورەتی (یونـس)دا، کـە ئـەو ڕاسـتییە تەنیـا لەوێـدا هاتـوە بـەو شـێوەیە، کـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَجَـٰوَزْنَا بِبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ٱلْبَحْرَ فَأَتْبَعَهُمْ فِرْعَوْنُ وَجُنُودُهُۥ بَغْيًا وَعَدْوًا ۖ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَدْرَكَهُ ٱلْغَرَقُ قَالَ ءَامَنتُ أَنَّهُۥ لَآ إِلَـٰهَ إِلَّا ٱلَّذِىٓ ءَامَنَتْ بِهِۦ بَنُوٓا۟ إِسْرَٰٓءِيلَ وَأَنَا۠ مِنَ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴿٩٠﴾ ءَآلْـَٰٔنَ وَقَدْ عَصَيْتَ قَبْلُ وَكُنتَ مِنَ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿٩١﴾ فَٱلْيَوْمَ نُنَجِّيكَ بِبَدَنِكَ لِتَكُونَ لِمَنْ خَلْفَكَ ءَايَةً ۚ وَإِنَّ كَثِيرًا مِّنَ ٱلنَّاسِ عَنْ ءَايَـٰتِنَا لَغَـٰفِلُونَ ﴿٩٢﴾ ﴾، واتــە: بەنــوو ئیســرائیلمان، بــە دەریاکــەدا تێپەڕانــد، فیرعــەون و سەربازەکانیشــی ســتەمکارانە، بــە ڕاکــردن شــوێنیان کەوتــن، هەتــا کاتێـک (فیرعـەون) خنـکانی گەیشـتێ، گـوتی: بـڕوام هێنـا، کـە جگـە لـەوەی بەنـوو ئیسـرائیل بڕوایـان پێهێنـاوە هیـچ پەرسـتراوێکی دیکـە نیـەو، مـن لـە ملکەچانـم، (خـوا ﷻ وەڵامـی دایـەوە، یـان فریشـتەکان یـان وەڵامەکـەی ئـاوا دەدرێتـەوە:) ئـا ئێسـتا کـە پێشـتر سـەرپێچییتکردو تـۆ لـە تێکـدەران بـووی! ئەمـڕۆ جەسـتەکەت دەربـاز دەکەیـن، تاکـو بـۆ خەڵکـی دوای خـۆت ببـی بـە نیشـانەو پەنـد، زۆرێـک لـە خەڵکیـش لـە نیشـانەکانی ئێمـە بـێ ئـاگان.

ئێسـتاش جەسـتەی فیرعـەون لـە مۆزەخانـەی میصـرە، ئـەو فیرعەونـەی کـە لـە ڕۆژگاری مووسـادا، حوکمـڕان بـوو، کـە نـاوی (خۆفـۆ) بـووەو نـاوی دیکەشـی بـۆ بەکاردێنـن، ئێسـتا لـەوێ جەنازەیـەو ڕاکشـاوە، واتـە: خـوا ﷻ ئـەوەی فەرموویـەتی،

دوای (٤٠٠٠) ساڵ زیاتریش، ئەو حەقیقەتەی هێناوەتە دی، چونکە دەفەرموێ: تاکو بۆ خەڵکی دوای خۆت ببی بە پەندو نیشانە، ئنجا ئەگەر جەستەکەی فەوتابایە نەدەبووە پەندو نیشانە، بۆیە خوا ﷻ جەستەکەی پاراستوە، ﴿ فَٱلْيَوْمَ نُنَجِّيكَ بِبَدَنِكَ ﴾، ئەمڕۆ جەستەکەت قوتار دەکەین، ئەویش نەک وەک ڕێزگرتنێک لە خۆت، بەڵکو بۆ ئەوەی بۆ خەڵکی دوای خۆت ببی بە پەندو عیبرەت، ئایا ئەو کەسە ئەو فیرعەونە بوو، کە دەیگوت: ﴿ أَنَا۠ رَبُّكُمُ ٱلْأَعْلَىٰ ﴿٢٤﴾ ﴾**النازعات**، واتە: من پەروەردگاری هەرە بەرزتانم؟ ئایا ئەوە ئەو فیرعەونەیە کە دەیگوت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمَلَأُ مَا عَلِمْتُ لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرِى ﴾**القصص**، واتە: ئەی پیاو ماقووڵان! بڕیار بە دەستان! جگە لە خۆم پەرستراوێکی دیکەم، بۆ ئێوە پێ شک نایە؟ ئایا ئەو فیرعەونە بوو، کە دەیگوت: ﴿ مَآ أُرِيكُمْ إِلَّا مَآ أَرَىٰ وَمَآ أَهْدِيكُمْ إِلَّا سَبِيلَ ٱلرَّشَادِ ﴿٢٩﴾ ﴾**غافر**، بەس ئەوەتان پێ دەڵێم کە خۆم بەڕاستی دەزانم و ئەوەی منیش دەیڵێم، هەمووی ڕاستە؟ ئایا ئەوە ئەو فیرعەونە بوو، کە بە مووسای دەگوت: ﴿ لَئِنِ ٱتَّخَذْتَ إِلَٰهًا غَيْرِى لَأَجْعَلَنَّكَ مِنَ ٱلْمَسْجُونِينَ ﴿٢٩﴾ ﴾**الشعراء**، ئەگەر جگە لەمن پەرستراوێکی دیکە بگری، دەتخەمە لەگەڵ گیراوان، یانی: زۆری دیکەشم زیندانی کردوون، وەک تۆ؟ کەچی ئێستا بۆتە پەند! ئنجا خوا ﷻ دەفەرموێ: ئەوانە سەرەنجام: ﴿ كَمْ تَرَكُوا۟ مِن جَنَّٰتٍ وَعُيُونٍ ﴾، (كَمْ)، (خبرّية)یە، یانی: (**كثيراً تَرَكوا مِنْ جَنَّاتٍ وعُيُون**)، زۆریان لە باخ و بێستان و لە کانیی و سەرچاوان، بەجیهێشتن.

﴿ وَزُرُوعٍ وَمَقَامٍ كَرِيمٍ ﴾، هەروەها لە کێڵگەو کشتوکاڵ و جێگاو ڕێگاو، خانووبەرەی خۆش و پڕ نازو نیعمەت.

﴿ وَنَعْمَةٍ كَانُوا۟ فِيهَا فَٰكِهِينَ ﴾، هەروەها خۆشگوزەرانییەک کە ئەوان تێیدا زۆر بە کەیف و خۆشحاڵ بوون، لەوێدا قسەی سوعبەت و سەیرو سەمەرەیان دەکردو، سەرگەرمی یاریی و گەمەو قسەی خۆش و پێکەنین بوون، ﴿ كَذَٰلِكَ ﴾، هەر ئاوا بەو شێوەیە، واتە: بەو جۆرە کە باسمانکرد، ئاوا فەوتاندمانن.

﴿ وَأَوْرَثْنَاهَا قَوْمًا آخَرِينَ ﴾، ئـەو هەمـوو شـتانەی کـە لێیـان بەجـێ مابـوون، کردمانتـە میـرات بـۆ کۆمەڵێکـی دیکـە.

دوایـی ئێمـە لـە مەسـەلە گرنگەکانـدا بـاس دەکەیـن، کـە خـوا ﷻ لـە سـوورەتی (الشـعراء)دا، دەفەرمـوێ: ﴿ كَذَٰلِكَ وَأَوْرَثْنَاهَا بَنِي إِسْرَائِيلَ ﴿٥٩﴾ ﴾، واتـە: ئـەو نـازو نیعمەتـەی لـە دوای فیرعەونییـەکان بەجێـماوە، کردمانـە میـراتی بەنـوو ئیسـرائیل. ئنجـا ئایـا ئـەوە چـۆن بـووە؟

أ- یان وێنەی ئەوە کە لەوان بەجێماوە، خوا ﷻ بۆ بەنوو ئیسرائیلی ڕەخساندوە، لەو شوێنانەی دیکە، کە بۆی چوون، لە دەشتی سیناو لە فەڵەستین.

ب- یان بەشێک لە بەنوو ئیسرائیل، گەڕاونەوە بۆ میسرو، لەوێدا نیشتەجێ بوون و، بوونە خاوەنی ئەو کۆشک و تەلارو باغ و کانیی و سەرچاوەو نازو نیعمەتەی، فیرعەونییەکان بەجێیان هێشتوون، دوایی لە مەسەلە گرنگەکاندا زیاتر قسە لەو بارەوە دەکەین.

﴿ فَمَا بَكَتْ عَلَيْهِمُ السَّمَاءُ وَالْأَرْضُ ﴾، نـە ئاسـمان و نـە زەوی بۆیـان نەگریـان، ﴿ وَمَا كَانُوا مُنظَرِينَ ﴾، هەروەهـا لـە مۆڵەتـدراوان و چاوەڕوانکراوانیـش نەبـوون، کـە چاوەڕوانییـان بکـرێ داخـۆ تۆبـە دەکـەن و، پەشـێمان دەبنـەوە، یـان نـا؟

﴿ وَلَقَدْ نَجَّيْنَا بَنِي إِسْرَائِيلَ مِنَ الْعَذَابِ الْمُهِينِ ﴾، بـە دڵنیایـی ئێمـە بەنـوو ئیسـرائیلمان، لـە ئازارێکـی ڕیسـواکەرو پـڕ سـووکایەتیی دەربـاز کـرد، کـە ئـەوەی بەسـەر ئـەوان هاتبـوو، بەسـەر کـەم گـەلان هاتـوە، پیـاوەکان سـۆغرەو بێگاریـان پـێ دەکـراو، ئافرەتـەکان بـۆ کاری خـراپ و بـۆ کەیـف و ڕابواردنـی خۆیـان بەکاریـان هێنـاون، بـە گچکەییـش، کوڕەکانیـان سـەربڕیون و کچەکانیـان هێشـتوونەوە: ﴿ يُذَبِّحُ أَبْنَاءَهُمْ وَيَسْتَحْيِي نِسَاءَهُمْ ﴿٤﴾ ﴾القصـص، ئـەو سـووکایەتیی و حەقارەتـەی بـەوان کـراوە، بـە کـەم گـەل و نەتـەوان کـراوە، بۆیـە خـوا دەفەرمـوێ: ئێمـە بـە دڵنیایـی وەچـەی ئیسـرائیلمان (وەچـەی یەعقووبمـان) ﷺ گـەلی جوولەکەمـان لـە سـزاو

ئازارێکی ڕیسواکەر دەربازکردن، ﴿ مِن فِرْعَوْنَ ﴾، وەک فیرعەون خودی ئازارە ڕیسواکەرەکەبێ، لە فیرعەون دەربازمانکردن.

﴿إِنَّهُۥ كَانَ عَالِيًا مِّنَ ٱلْمُسْرِفِينَ ﴾، بە دڵنیایی ئەو خۆبەرزکەرەوە بووە، لە زێدەڕۆییکاران، واتە: زێدەڕۆیی کار بوو، لە نێو زێدەڕۆیکارانیشدا، زۆر خۆ بەزلگرو خۆ بەرزکەرەوە و خۆ سەپێنەربوو.

﴿ وَلَقَدِ ٱخْتَرْنَٰهُمْ عَلَىٰ عِلْمٍ عَلَى ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾، بە دڵنیایی ئێمە ئەوانمان هەڵبژارد، واتە: گەلی بەنوو ئیسرائیل، ﴿ عَلَىٰ عِلْمٍ عَلَى ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾، بە زانیارییەوە کە دەمانزانی چۆنن، بەسەر جیهانیانییاندا، دەمانزانی چۆنن بۆیەش هەڵمانبژاردن، یاخود: دەشمانزانی کە هەڵەو پەڵەشیان دەبێ و هەیە، لەگەڵ ئەوەشدا هەڵمانبژاردن، بەسەر جیهانییاندا، چونکە ئەو کاتە باشترین خەڵکی ڕۆژگاری خۆیان بوون، ﴿ عَلَى ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾، (أي: عَلَى العَالَمِيْنَ فِي زَمَانِهِم)، بەسەر جیهانییانی ڕۆژگاری خۆیاندا هەڵمانبژاردن، ئەگەرنا بە تەئکید ئێستا ئەوەی پێی دەگوترێ، گەلی جوولەکە کە دەوڵەتێکیان هەر بەناوی ئیسرائیل لەسەر زەمینی مسوڵماناندا سەپاندووەو، ئەو سەر زەمینەیان داگیرکردوە، بوونە مایەی ئازارو مەینەتیی بۆ گەلی مسوڵمانی فەڵەستین و، بوونە مایەی خەفەت و ئازار بۆ تێکڕای مسوڵمانان، ئێستا بە هیچ پێوەرێک ئەوانە بە گەلێکی باشیش دانانرێن، چ جای بە باشترینی گەلانی جیهان!

خوا ﷻ لە کۆتاییدا، دەفەرموێ: ﴿ وَءَاتَيْنَٰهُم مِّنَ ٱلْءَايَٰتِ مَا فِيهِ بَلَٰٓؤٌا۟ مُّبِينٌ ﴾، لە نیشانەکان پێماندان، شتانێک کە نیعمەتێکی ئاشکرا، یاخود تاقیکردنەوەیەکی ئاشکرا بوو، چ بە باری نیعمەتدا، چ بە باری سزادان و لێوەشاندنی زەبرو زللەی میهرەبانییدا، ئەوەی کە خوا ﷻ بۆ گەلی بەنوو ئیسرائیلی کردوە، بە پێی ئەوەی لە قورئاندا بۆ ئێمە دیارە، خوا ﷻ بۆ هیچ گەلێکی نەکردوە، چونکە ئەوەندە پێویستییەی ئەوان هەیانبووە، هیچ گەلێک هێندەی پێویست نەبووە، وەک (پیرەمێرد)ی شاعیر دەڵێ:

«کاکە خوا کاری نابەجێ ناکا ... تا کێو نەبینێ بەفری تێناکا».

دیـارە ئـەوان لـە حاڵەتێـک و بارودۆخێکـدا بـوون، کـە پێویسـتیی بـەوە کـردوە خـوا ﷻ ئـەو هەمـوو لوتـف و میهرەبانییەیـان لەگەڵـدا بنوێنـێ، بارودۆخەکەیـان وایخواسـتوە، نـەک لەبـەر ئـەوەی لەسـەر ئاسـتی مرۆڤایەتیـی و، لەسـەر ئاسـتی دنیا لـە هەمـوو کـەس باشـتر بووبـن، بەڵـێ باشـترین گـەلانی ڕۆژگاری خۆیـان بـوون و، لـە مێـژووی مرۆڤایەتییـدا، هیـچ کـەس بـە قـەدەر ئـەوان خـوای پـەروەردگار شـتی یاسادرو نـازو نیعمـەتی پـێ نەبەخشـیوە، لەبـەر ئـەوەی لـە هەمـوو کـەس پێویسـتتر بـوون بـۆ ئـەو شـتانە، نـەک لەبـەر ئـەوەی لـە هەمـوو کـەس باشـتر بووبـن لەسـەر ئاسـتی مرۆڤایەتیـی.

وشـەی (بَلَاء)، جـاری وا هەیـە لـە قورئانـدا بـە مانـای نـازو نیعمـەت و، جـاری واش بـە مانـای سـەختیی و ناڕەحەتییـە، جـاری واشـە هەیـە بـە مانـای تاقیکردنەوەیە، کـە لێـرەدا بـە تەئکیـد بـە مانـای تاقیکردنەوەیـە، واتـە: ئـەوەی پێمانـدا بـوون، لـە نیشـانەکان، تاقیکردنەوەیەکـی ئاشـکرا بـوو، یاخـود ئاشـکراکەربوو، بـۆ ئـەو گەلـە، واتـە: زۆر ڕوون و بەرچـاوو دیـار بـوو، کـە ئەوانـە دەسـتی خوایـان لـە پشـتەوە هەیـە، بـۆ وێنـە: کـە خـوا ﷻ هـەر لـە میسـر، چەنـدان بـەڵای بـە مـل فیرعـەون و دارو دەسـتەکەیدا هێنـاون، وەک دەفەرمـوێ: ﴿ وَلَقَدْ أَخَذْنَآ ءَالَ فِرْعَوْنَ بِٱلسِّنِينَ وَنَقْصٍ مِّنَ ٱلثَّمَرَٰتِ لَعَلَّهُمْ يَذَّكَّرُونَ ﴿١٣٠﴾ ﴾ الأعـراف، دوایـی دەفەرمـوێ: ﴿ فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمُ ٱلطُّوفَانَ وَٱلْجَرَادَ وَٱلْقُمَّلَ وَٱلضَّفَادِعَ وَٱلدَّمَ ءَايَٰتٍ مُّفَصَّلَٰتٍ فَٱسْتَكْبَرُوا۟ وَكَانُوا۟ قَوْمًا مُّجْرِمِينَ ﴿١٣٣﴾ ﴾ الأعـراف، هەروەهـا گۆچانەکـەی مووسـا عليه السلام کـە بۆتـە مـارو حەزیایەکـی گـەورە، هەروەهـا دەسـتی کـە وەک گلۆپێکـی زۆر بـە شـۆق ئایسـاوە، ئـەوە نـۆ نیشـانە. ﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَىٰ تِسْعَ ءَايَٰتٍۭ بَيِّنَٰتٍ ﴿١٠١﴾ ﴾ الإسراء، جگـە لـەوە دواییش لە کاتی دەربازبوونیانـدا، ئـەوەی کـە خـوا بـۆ بەنـوو ئیسـرائیلی کـردوە، بـۆ کەسـی نەکـردوە، دەریـای بـۆ شـەق کـردوون، ئـەو دەریـا زلـە قڵیشـاوە، ئـەو هەمـوو خەڵکـە بـەو دەریایـەدا، دوای قڵیشـانی دەربازبـوون، دوایـی دوژمنـەکانی خۆیـان بینیـوە، لـەدوای

وان، کـە ڕاوەدوویـان نـاون، خنـکاون لـە دەریـای سـووورداو، دوایـی ئـەوان کـە دەربازبـوون چوونەتـە دەشـتی سـیناو، لەوێـش خـوا ﷻ گـەزۆ و باڵنـدەی (**سـلوی**) ی بـۆ ڕەخسـاندوون، پاشـان هـەر لـەوێ، کانیـی و سـەرچاوەی بـۆ ڕەخسـاندوون: ﴿وَإِذِ ٱسْتَسْقَىٰ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِۦ فَقُلْنَا ٱضْرِب بِّعَصَاكَ ٱلْحَجَرَ ۖ فَٱنفَجَرَتْ مِنْهُ ٱثْنَتَا عَشْرَةَ عَيْنًا ﴿٦٠﴾﴾ **البقـرة**، واتـە: کاتـێ مووسـا داوای ئـاوی بـۆ گەلەکـەی کـرد، (لـە دەشـتی (**سـینا**) لـەو بیابانـە وشـک و قاقـڕو دێمـەکارەدا)، گوتمـان: بـە گۆچانەکـەت لـە بەردەکـە بـدە، (لـە چیایـەک) ئیـدی دوازدە کانیـی و سـەرچاوەی لـێ دەرقوڵیـن، هەروەهـا زۆر شـتی دیکـەش، کـە دوایـی ئاماژەیـان پێدەکەیـن، هەمـوو ئەوانـە بێگومـان تاقیکردنەوەیەکـی ڕوون و ئاشـکرا بـوون، تاقیکردنەوەیەکـی ئاشـکراکەرو ڕوونکـەرەوە بـوون بـۆ میهرەبانیـی خـوا بەرانبـەر بـەو گەلـە، لـە کاتی لێقەومـان و نەهامەتییـدا.

بۆیـە گەلـی جوولەکـە، کاتـێ مێـژووی خۆیـان دەخوێننـەوە کـە چەنـد لـە زەبوونیـی و چەوسـێنراوەیی دا بـوون، دەبووایـە هەرگیـز سـتەم نەکـەن، ئێسـتاش لـە پەیـمانی کۆنـدا ئـەو شـتانەی خـوا ﷻ لـە قورئانـدا ئامـاژەی پێکـردوون، زۆر بـە تەفصیـڵ و بەڕوونیـی، لەوێـدا بـە وردەکارییەکانیانـەوە باسـکراون، کـە ڕەنگـە هەندێکیـان زێدەڕۆیـی یـان کـەم و کورتییـان تێـدا هەبـێ، بـەڵام گرنـگ ئەوەیـە وەک ئەصڵەکەیـان، ڕاسـتن، دەبووایـە کاتـێ مێـژووی خۆیـان وەبیردێنـەوە، هەرگیـز زوڵـم لـە کـەس نەکـەن و، بزانـن کـە کاتی خـۆی فیرعـەون زوڵمـی لێکـردوون، چەنـدە حاڵیـان خـراپ بـووە، کـە زوڵمـی لـە بـاب و باپیرانیـان کـردوە، دەبووایـە بزانـن ئـەو زوڵمـەی فیرعـەون کـردی، سـەرەنجامەکەی ئـەوە بـوو کـە خـوا ﷻ ئـاوا فیرعـەون و دارو دەسـتەکەی لـە بەیـن بـرد، کەواتـە: ئـەو زوڵمـەی ئەوانیـش ئێسـتا دەیکـەن لـە خەڵکـی مسـوڵمانی فەڵەسـتین و مسـوڵمانان بـە گشـتیی، بـە تەئکیـد ئەو زوڵمـەش دوایـی سـزایەکی خـوای بـۆ لـە بۆسـەدا هەیـە، کـە سـەرەنجام پـەتی زوڵـم لـە ئەسـتووریدا دەپچـڕێ، ئەگـەر هـەر پەتێـک لـە باریکییـدا بپچـڕێ.

خـوا بـە لوتـف و کەرەمـی خـۆی هیدایـەت و یارمەتییـمان بـدات، کـە لـە بەسـەرهاتی پێغەمبـەران (عَلَيْهِـمُ الصَّـلَاةُ وَالسَّـلَام)و گـەلانی پێشـوو دەرس و پەنـدو عیبـرەت وەربگریـن، ئـەو هەڵـەو کـەم و کورییانـەی کـە گـەلانی پێشـوو لەسـەریان تووشـی سـزاو مەینەتیـی بـوون، خـوای بەبەزەیـی یارمەتییـمان بـدات، خۆمانیـان لـێ بـە دوور بگریـن و، ئـەو سـیفەتە چاکانـەی، خوازیـاری ئـەوە بـوون، کـە خـوا ﷻ لـە فریـای گەلـە پێشـووەکان، لـە فریـای مەزڵوومـان بـێ، ئێمـەش ئـەو سـیفەتانە لـە خۆمانـدا پەیـدا بکەیـن و خۆمانیـان پـێ برازێنینـەوە.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**نێردرانی مووسا ﷺ بۆ لای کۆمەڵی فیرعەون و، داواکردنی لێیان کە گەلی بەنوو ئیسرائیلی تەسلیم بکەن، خۆشیان لە ئاست خوادا بە بەرز نەگرن و، پەنا بە خوا گرتنی مووسا لە زیان و، لە شەڕو خراپەیان و، داواکردنی لێیان کە بە لای کەمەوە بێلایەن بن، بەڵام لامل بوونی فیرعەون و دارو دەستەکەی و، سەرەنجام لە خوا پاڕانەوەی مووسا ﷺو، ڕاگەیاندنی ئەو ڕاستییە کە ئەو خەڵکە کۆمەڵێکی تاوانبارن و، شایستەی سزاو جەزرەبەی خوان:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ فَتَنَّا قَبْلَهُمْ قَوْمَ فِرْعَوْنَ وَجَآءَهُمْ رَسُولٌ كَرِيمٌ ﴿١٧﴾ أَنْ أَدُّوٓاْ إِلَىَّ عِبَادَ ٱللَّهِ إِنِّى لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ ﴿١٨﴾ وَأَن لَّا تَعْلُواْ عَلَى ٱللَّهِ إِنِّىٓ ءَاتِيكُم بِسُلْطَٰنٍ مُّبِينٍ ﴿١٩﴾ وَإِنِّى عُذْتُ بِرَبِّى وَرَبِّكُمْ أَن تَرْجُمُونِ ﴿٢٠﴾ وَإِن لَّمْ تُؤْمِنُواْ لِى فَٱعْتَزِلُونِ ﴿٢١﴾ فَدَعَا رَبَّهُۥٓ أَنَّ هَٰٓؤُلَآءِ قَوْمٌ مُّجْرِمُونَ ﴿٢٢﴾﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە نۆ بڕگەدا:

١)- ﴿وَلَقَدْ فَتَنَّا قَبْلَهُمْ قَوْمَ فِرْعَوْنَ﴾، بە دڵنیایی پێش ئەوان، کۆمەڵی فیرعەونمان تاقیکردنەوە، واتە: با خەڵکی ڕۆژگاری موحەممەد ﷺ پەند لە گەل و کۆمەڵی فیرعەن وەربگرن، کە خوا ﷻ مووسای ﷺ بۆ ناردن، بە بەڵگە ڕوون و ئاشکرایەکانەوە، بە پەیامی خواوە، داوایەکی زۆر ڕەوای لێیان هەبوو، کە: چی دیکە ئەو گەلی بەنی ئیسرائیلە، مەچەوسێننەوەو، با وەک هاوڵاتییەکی بە حورمەت، لەم وڵاتەدا بژین، ئەگەرنا لێیان بگەڕێن، با من دەربازیان بکەم و بیانگوازمەوە.

کـە دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ فَتَنَّا قَبْلَهُمْ قَوْمَ فِرْعَوْنَ ﴾، (و) بـۆ بادانەوەو گێڕانەوەیە، (لَقَـد) هـەم (ل)ی سـوێند، هـەم (قَـد)ی سـاغکردنەوە (**تحقیـق**)، یـانی: بـە دڵنیایـی ئێمـە لـە پێش وانـدا کۆمەڵـی فیرعەونمـان تاقیکـردەوە، ئەمـە بـۆ ئەوەیـە کـە وەک ئـەوان نەیانزانیبـێ، کۆمەڵـی فیرعـەون تاقیکراونـەوەو، خـوا ﷻ مووسـای ؑ بـۆ نـاردوون و، دوایـی تووشـی بـەڵا بـوون، لـە ئەنجامـی لاملیـی و سـەرپێچییاندا، یانـی: ئێـوە دڵنیابـن کـە لـە پێـش ئەوانـدا، کۆمەڵـی فیرعەونمـان تاقیکردنـەوە، (فَتَنَّـا: **أي ابْتَلَيْنَا وَاخْتَبَرْنَا، وَقَـوْمُ الرَّجُـلِ: مِـنْ يَقُوْمُـونَ مَعَـهُ**)، (فَتَنَّـا): بـە مانـای: تاقیمانکردنـەوە، جەڕباندمانـن، قەومـی پیاوێـک: ئەوانـەن، کـە لەگەڵـی هەڵدەسـتن و لـە دەورنـی.

٢)- ﴿وَجَآءَهُمْ رَسُولٌ كَرِيمٌ ﴾، ڕەوانکراوێکی بەڕێزیان بۆ هات، دەڵێ: (**الكَرِيْم: النَّفِيْسُ الفَائِق فِي نَوْعِهِ**)، (**كَرِيْم**): لە هەر شتێکدا بریتیە لە هەرە چاک و هەرە پەسند، (**الطبري**) لە تەفسیرەکەی خۆیدا[1]، دەڵێ:

(**وَوَصَفَـهُ جَـلَّ ثَنَـاؤُهُ بِالْكَـرَمِ، لِأَنَّـهُ كَانَ كَرِيمَـاً عَلَيْـهِ، رَفِيعَـاً عِنْـدَهُ مَكَانُـهُ، وَقَـدْ يَجُـوزُ أَنْ يَكُـونَ وَصَفَـهُ بِذَلِـكَ، لِأَنَّـهُ كَانَ فِي قَوْمِـهِ شَرِيفًـا وَسِـيطًا**)، واتـە: خـوا ﷻ بۆیـە مووسـای بـە کەریـم وەسـف کـردوە، (کریـم، واتـە: پەسـندو چـاک و بەڕێـزو خـاوەن پێگـە)، لەبـەر ئـەوەی لـە لای خـوا ﷻ زۆر بەڕێـزو خـاوەن پێگـە بـووە، (کـە بـە تەئکیـد وابـووە)، دەشـگونجێ لەبـەر ئـەوە بـێ کـە لـە نێـو خەڵکەکـەی خۆیـدا، مووسـا ؑ خـاوەن ڕەچەڵـەک و، پێگـەی کۆمەڵایەتیـی بـاش بـووە.

دەڵێـم: لەڕاسـتییدا لـە یـەک کاتـدا مووسـا ؑ هەردووکیـان بـووە، هـەم لـە لای خـوا ﷻ خـاوەن پێگـەو ڕێـزو حورمـەتی زۆر بـووە، هـەم لـە نێـو بەنـوو ئیسـڕائیلیشـدا خـاوەن پێگـەو ڕێـزو حورمەتێکـی تایبـەت بـووە، ئەمـەش نـەک هـەر بـۆ مووسـا ؑ وابـێ، بەڵکـو خـوا ﷻ هیـچ کام لـە پێغەمبەرانـی نەنـاردوون، مەگـەر لـە ماڵ و بنەماڵـەو خەڵکێکـی بـاش بووبـن و، خـاوەن ڕێـزو حورمـەت و پێگـە بووبـن، پێـش

---

(١) جامع البيان: ج٢٥، ص١٢٢، برقم: ٣١١٤٣.

پێغەمبەرایەتییش، چونکە خەڵک عادەتیان وایە، کەسێک کە لەماڵێکی باش نەبێ و، لە خێزانێکی باش نەبێ و، خاوەن پێگەیەکی کۆمەڵایەتیی باش نەبێ، گوێی بۆ ناگرن.

٣)- ﴿ أَنْ أَدُّوٓا۟ إِلَىَّ عِبَادَ ٱللَّهِ ﴾، پێیگوتن: کە بەندەکانی خوام تەسلیم بکەن، یانی: (**سَلِّمُوا عِبَادِ اللهِ إِلَيَّ**)، بەندەکانی خوا تەسلیمی من بکەن (کە بریتین لە گەلی بەنوو ئیسرائیل، بەندەی ئێوە نین)، وەک لە سوورەتی (**المؤمنون**)دا، فیرعەون دەڵێ: ﴿ أَنُؤْمِنُ لِبَشَرَيْنِ مِثْلِنَا وَقَوْمُهُمَا لَنَا عَٰبِدُونَ ﴿٤٧﴾ ﴾، ئایا بڕوا بێنین بۆ دوو مرۆڤی وەک خۆمان، کە خەڵکەکەشیان کۆیلەو ملکەچی ئێمەن؟ بە دڵنیایی فیرعەون کە ئەو قسانەی کردوون، مووساش ﷺ وەڵامی دەداتەوە، دەڵێ: ﴿ أَنْ أَدُّوٓا۟ إِلَىَّ عِبَادَ ٱللَّهِ ﴾، یانی: بەندەکانی خوا تەسلیمی من بکەن، واتە: بەندەی تۆ نین ئەی فیرعەون و کۆیلەی تۆ نین، بەڵێ تۆ سۆغرەو بێگاریان پێ دەکەی و، دەیانچەوسێنیەوە، بەڵام ئەوانە بەندەی خوان، واتە: تەنیا خوا ﷻ شایستەی ئەوەیە، ئەوانە ئەوپەڕی ملکەچییان بۆی هەبێت و، تۆ زوڵمیان لێدەکەی.

واتایەکی دیکەی: ﴿ أَنْ أَدُّوٓا۟ إِلَىَّ عِبَادَ ٱللَّهِ ﴾، یانی: (**أَنْ أَدُّوا إِلَيَّ الطَّاعَةَ يَا عِبَادِ اللهِ**)، ئەی بەندەکانی خوا! (فیرعەون و دارو دەستەکەی)، ئێوە بەندەکانی خوان و ئەی بەندەکانی خوا! فەرمانبەریی بۆ من پێشکەش بکەن، واتە: بە قسەم بکەن و گوێڕایەڵم بن، پەیامی خوام لێ وەربگرن.

بەڵام مانای یەکەمیان بەهێزترە، چونکە ئەو مانای یەکەمە ئەگەر لێرە ئیحتیمالی هەیە: (**أَدُّوا**)، بە مانای (**أَدُّوا إِلَيَّ الطَّاعَةَ**) بێ، بەڵام لە سوورەتی (**الشعراء**)، ئایەتی ژمارە: (١٧)دا، فەرموویەتی: ﴿ أَنْ أَرْسِلْ مَعَنَا بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴿١٧﴾ ﴾، واتە: وەچەی ئیسرائیلمان لەگەڵ بنێرەو، تەسلیمیانمان بکە، دیسان لە سوورەتی (**طه**)شدا، هاتووە، کە خوا ﷻ دەفەرمووێ: ﴿ فَأْتِيَاهُ فَقُولَآ إِنَّا رَسُولَا رَبِّكَ فَأَرْسِلْ مَعَنَا بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ وَلَا تُعَذِّبْهُمْ ۖ قَدْ جِئْنَٰكَ بِـَٔايَةٍ مِّن رَّبِّكَ ۖ وَٱلسَّلَٰمُ عَلَىٰ مَنِ ٱتَّبَعَ ٱلْهُدَىٰٓ ﴿٤٧﴾ ﴾، واتە:

هەردووکتـان (مووسـاو هـاڕوون) بچن بـۆ لای فیرعەون، پێـی بڵێن: ئێمـە ڕەوانەکراوی پەروەردگارتیـن بـۆ لای تـۆ، ئنجا بەنـوو ئیسـڕائیلمان، (وەچـەی ئیسـڕائیلمان) لەگـەڵ بنێـرەو، چیدیکـە مەیانچەوسـێنەوەو، بـە دڵنیایـی لـە پەروەدگارتـەوە نیشـانەو بەڵگەیەکـمان بـۆ هێنـاوی، سـەلام و ئاشـتییش لەسـەر کەسـێک بـێ، کـە بـە دوای ڕێنمایـی خـوا دەکـەوێ.

کەواتـە: بەهـۆی ئـەو دوو شـوێنەوە، ئـەوەی لێـرە خـوا فەرموویـەتی، زۆر بـە ڕوونیـی مانایەکـەی دەزانیـن: ﴿ أَنْ أَدُّوٓا۟ إِلَىَّ عِبَادَ ٱللَّهِ ﴾، بەنـدەکانی خـوام تەسـلیم بکـەن، قوڕئانیـش هەندێکـی هەندێکـی ڕوون دەکاتـەوە، باشـترین شـێواز بـۆ چاکـتر تێگەیشـتنی قوڕئـان، ئەوەیـە هـەر بابەتێـک لـە قوڕئانـدا هاتـوە، بگەڕێیـن، ئایـا لـە قوڕئانـدا لـە کوێـی دیکـە باسـی ئـەو بابەتـە کـراوە! بـە دڵنیایـی بـە بـەراورد پێکـردنی ئایەتـەکان، هەموویـان، باشـتر تیشـکمان بـۆ دەخرێتـە سـەر چەمـک و واتـای ئـەو بابەتـەی هاتـوە.

٤)- ﴿ إِنِّى لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ ﴾، بە دڵنیایی من بۆ ئێوە ڕەوانەکراوێکی ئەمیندارم، (**أَمِينٌ عَلَى وَحْيِهِ وَرِسَالَتِهِ الَّتِي أَوْعَدَنِيهَا إِلَيْكُمْ**)، واتە: من ئەمیندارم بەسەر ئەو سروش و پەیامەی کە خوا ﷻ بەڵێنی پێداوم، بە ئێوەی بگەیەنم.

شـایانی باسـە: لێرەدا کە مووسـا ﷺ، دەڵێ: مـن پێغەمبەرێکی ئەمینـدارم و بەندەکانی خـوام تەسـیم بکـەن، بەنـوو ئیسـڕائیلی وەک سـپاردەیەک، کـە لـە لای فیرعەونـە، تەماشـا کـردوون، کـە دەبـێ تەسـلیمی خاوەنەکەییان بکاتـەوە، کە مووسـایە ﷺ.

٥)- ﴿ وَأَن لَّا تَعْلُوا۟ عَلَى ٱللَّهِ ﴾، هەروەها لە بەرانبەر خواداو لە ئاستی خوادا، خۆتان بەرز مەکەنەوە، خۆتان بە بەرز مەگرن، لووت بەرز مەبن، وەک (**الطبري**)، دەڵێ: (**أَنْ لَا تَطْغَوْا وَتَبْغُوا عَلَى رَبِّكُمْ، فَتَكْفُرُوا بِهِ وَتَعْصُوهُ، فَتُخَالِفُوا أَمْرَهُ**)، یاخیی مەبن و، سنوورشکێنیی مەکەن، لە بەرانبەر پەروەردگارتاندا، کە پێی بێبڕوا بن و سەرپێچیی لێ بکەن و، فەرمانەکەی جێبەجێ نەکەن، کە بە مندا ناردوویەتی.

٦)- ﴿إِنِّيٓ ءَاتِيكُم بِسُلۡطَٰنٖ مُّبِينٖ﴾، من هێنەری بەڵگەیەکی ڕوون و ئاشکرام، بۆ ئێوە، واتە: بەڵگەو نیشانەیەکم بۆ هێناون، کە ئێوە دڵنیابن، من ڕاست دەکەم و، پێغەمبەری خوام و لە لایەن خواوە ڕەوانکراوم، ئەو داوایەی لێتان دەکەم، خوا ﷻ منی پێ ڕاسپاردوە.

(**سُلْطَان**) بە مانای: (**حُجَّة**) بەڵگەیە، بۆیە وشەی: (**بُرْهَان**) هەندێک جار (**سُلْطَان**)ی بۆ بەکارهێنراوە، هەندێک جار (**بَيِّنَة**)ی بۆ بەکارهێنراوە، لەبەر ئەوەی بەڵگە، عەقڵ و دڵی بەرانبەرەکە دەخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە، ئەگەر (**بَيِّنَة**) بێ، واتە: زۆر ڕوون و ئاشکرا، کە (**بُرْهَان**)یش هەر بە مانای شتێکی ئاشکراو ڕوونە، کە مشت و مڕو چەندو چۆن، هەڵنەگرێ.

٧)- ﴿وَإِنِّي عُذۡتُ بِرَبِّي وَرَبِّكُمۡ أَن تَرۡجُمُونِ﴾، من پەنا بە پەروەردگاری خۆم و پەروەردگاری ئێوەش دەگرم، کە ئێوە بەرد بارانم بکەن، وشەی (**رَجم**): بە مانای بەرد بارانکردن دێ، بە مانای کوشتنیش دێ و، بە مانای جنێوپێدانیش دێ، بە مانای تۆمەتبارکردن و دەرکردنیش دێ، چەند واتایەکی هەن، بەڵام بە پێی سیاق، دەبێ سەرنج بدرێ: ئایا کام لەو واتایانە لەگەڵیدا دەگونجێ؟ لێرەدا وا دێتە بەرچاو، مەبەست پێی بەرد بارانکردن بێ، (**القُرْطُبي**)، دەڵێ: (**كَأَنَّهُمْ تَوَعَّدُوهُ بِالْقَتْلِ فَاسْتَجَار باللّٰه**)، کە دەڵێ: ﴿وَإِنِّي عُذۡتُ بِرَبِّي وَرَبِّكُمۡ أَن تَرۡجُمُونِ﴾، مووسا ﷺ هەر لە خۆوە وای نەگوتوە، چونکە ئەوان هەڕەشەیان لێکردوە، کە بەرد بارانت دەکەین، دیارە عادەتیان وابووە، بۆ کوشتنی نەیارەکانیان، بە خراپترین شێوە بیانکوژن کە بریتیە لە بەرد بارانکردن، بۆیەش مووسا گوتوویەتی: پەنا بە پەروەردگاری خۆم و پەروەردگاری ئێوەش دەگرم، کە بەرد بارانم بکەن، دیارە هەڕەشەیان لێکردوەو ئەویش لە بەرانبەر هەموو هەڕەشەکەیاندا پەنای بە خوا گرتوە.

٨)- ﴿وَإِن لَّمۡ تُؤۡمِنُواْ لِي فَٱعۡتَزِلُونِ﴾، ئەگەر بۆ منیش بڕوا ناهێنن، کەنار بگرن، وەک توێژەرەوان هەندێکیان گوتوویانە: (**دَعُونِي كَفَافاً لَا لِيَ وَلَا عَلَيّ**)، لێمگەڕێن، ئەگەر سوودیشم پێناگەیەنن، زیانیشم پێ مەگەیەنن، ئەگەر شوێنیشم ناکەون، دژایەتییشم مەکەن، من هاتووم ئەو خەڵکە بانگ دەکەم بۆ لای خوا ﷻو، دەربازیان دەکەم، لەو واقیعە سەخت و دژوارو ڕیسواکەرەی ئێوە ئەوانتان تێدا داناوە.

٩)- ﴿ فَدَعَا رَبَّهُۥٓ أَنَّ هَٰٓؤُلَآءِ قَوْمٌ مُّجْرِمُونَ ﴾، یەکسەر لە پەروەردگاری پاڕایەوە، کە ئەوانە کۆمەڵێکی تاوانبارن. وەک پێشتریش گوتمان: ئەم (**ف**)ە، کە دەفەرموێ: ﴿ فَدَعَا رَبَّهُۥٓ ﴾، بۆ بەدواهاتن (**تَعْقِيْب**)ەو، ئەم ڕستەیە بادەداتەوە سەر شتێک کە قرتێندراوە، بەڵام خوازیاری ئەو پاڕانەوەیەی مووسا بووە، واتە: (**فَلَمْ يُلَبُّوا طَلَبَهُ وَأَصَرُّوا عَلَى أَذَاهُ، وَكَفَرُوا وَاسْتَمَرُّوا عَلَى كُفْرِهِمْ، فَدَعَا رَبَّهُ**)، ئەوان داواکارییەکەیان بۆ جێبەجێ نەکردو، لەسەر ئەزیەت و ئازاری خۆیان بەردەوام بوون، هەر بێبڕوا بوون و بەردەوام بوون لەسەر بێبڕواییەکەیان، ئەویش لە پەروەردگاری پاڕایەوە.

پاڕایـەوە چـی فەرمـوو؟ فەرمـووی پـەروەردگارم! ئـا ئەوانـە کۆمەڵێکـی تاوانبـارن، ئیـدی بـە پێویسـتیی نەزانیـوە بفەرمـوێ: چییـان لێبکـەو چییـان پـێ بکـە، مـادام تاوانباربـن شایسـتەی ئـەوەن خـوا سـزایان بـداو، ئەوەنـدە بـەس بـووە تەنیـا بـە ئامـاژە باسـی ئـەوە بـکات: ئەوانـە شایسـتەی سـزادرانن، ئـەوی دیکـە هەمـووی عایـدی خـوای کاربەجێیـەو، خـۆی دەزانێـت ئـەو تاوانبارانـە چـۆن سـزا دەداو، چـۆن تۆڵـەی ئـەو گەلـە چەوسـاوەیان لـێ دەکاتـەوە!

## مەسەلەی دووەم:

**فەرمانکـردنی خـوا ﷻ بـە مووسـا عليه السلام کـە شـەورۆ بـە گەلەکـەی بـکات، چونکـە ڕاوەدوو دەنرێـن و، دوای قڵیشـانی دەریـای سـووریش بـە کـراوەی لێـی گـەڕێ و، دڵنیابـێ کـە فیرعـەون و سـوپایەکەی نغـرۆ دەبـن، پاشـان باسـی ئـەو نـازو نیعمەتانـەی جێیـان هێشـتوون و، خـوا کردوونیـە میـراتی کۆمەڵێکـی دیکـەو، ئەوانیـش ئاسـمان و زەوی بۆیـان نەگریـاون:**

خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ فَأَسْرِ بِعِبَادِى لَيْلًا إِنَّكُم مُّتَّبَعُونَ ﴿٢٣﴾ وَٱتْرُكِ ٱلْبَحْرَ رَهْوًا إِنَّهُمْ جُندٌ مُّغْرَقُونَ ﴿٢٤﴾ كَمْ تَرَكُوا۟ مِن جَنَّٰتٍ وَعُيُونٍ ﴿٢٥﴾ وَزُرُوعٍ وَمَقَامٍ كَرِيمٍ ﴿٢٦﴾ وَنَعْمَةٍ كَانُوا۟ فِيهَا فَٰكِهِينَ ﴿٢٧﴾ كَذَٰلِكَ ۖ وَأَوْرَثْنَٰهَا قَوْمًا ءَاخَرِينَ ﴿٢٨﴾ فَمَا بَكَتْ عَلَيْهِمُ ٱلسَّمَآءُ وَٱلْأَرْضُ وَمَا كَانُوا۟ مُنظَرِينَ ﴿٢٩﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە دە بڕگەدا:

١)- ﴿ فَأَسْرِ بِعِبَادِى لَيْلًا ﴾، ئنجا بەشەو شەورۆ بە بەندەکانم بکە. (ف)ی (فأسر)، دیسان (**الفَاءُ الفَصِيْحَة**) ، یان (**فَاءُ التَّفْرِيْع**)ی پێدەڵێن، (**وَهِيَ الوَاقِعَة جَوَاباً لِشَرْطٍ مُقَدَّرٍ كَأَنَّهُ قَالَ: إِنْ كَانَ الأَمْرُ كَمَا تَقُولُ فَأَسْرِ بِعِبَادِي**)، ئەم (ف)یە، ڕوونکەرەوەی چەند شتێکی دیکەیە، کە لە پێشەوە هاتوون و، وەڵامی مەرجێکی مەزەننەکراوە، وەک خوا ﷻ فەرمووبێتی: مادام حاڵ بەو شێوەیە کە دەڵێی، کەواتە: شەورۆ بە بەندەکانم بکە.

(**فَـأَسْرِ**)، خوێنراویشـەتەوە: (**فَـاسْرِ**)، چونکـە (**أَسْرَى وَسَرَى**)، هەردووکیـان، یـانی: شـەورۆی کـرد، سـەفەری شـەوی کـرد، وشـەی: (**لَيـلًا**)، (**ظَـرْفُ زَمَـانٍ مُتَعَلِّـق بـ(فَـأَسْرِ)**، (**لَيـلًا**) زەرفـی کاتـەو پەیوەسـتە بـە شـەورۆیەکەوە، ئایـا ئـەو شـەورۆییە کەنگـێ بـێ؟ دەبـێ شـەوبێ، هەڵبەتـە (أسری و سری) یانـی: سـەفەری شـەوی کـرد، بـەڵام (لیـلاً) بـۆ جەختکردنەوەیـە، وەك (يطيـر بجناحيـه).

**٢)- ﴿إِنَّكُم مُّتَّبَعُونَ﴾**، چونکە ئێوە ڕاوەدوو نراون، شوێنتان دەکەون، **(تَعْلِيْلٌ للأمْرِ بِالإِسْرَارِ لَيْلاً)**، ئەمە هۆکار هێنانەوەیە بۆ ئەوە، کە بۆچی دەبێ شەوڕۆییان پێبکات؟ چونکە ئێوە ڕاوەدوودەنرێن، واتە: شەوپەنهانە تاکو ماوەیەکی باش ببڕن و پێتان نەگەن.

ئنجا کە فەرموویەتی: ﴿إِنَّكُم مُّتَّبَعُونَ﴾، **(أُسْنِدَ الإِتِّبَاعُ إِلى غَيْرِ مذكور، لأنَّهُ مِنَ المَعْلُومِ، لأَنَّهُمْ قَوْم فِرْعَونُ وَجُنْدُه)**، بۆیە ڕاوەدوونرانەکە پاڵدراوەتە لای بکەرێک، کە ناوی نەهاتوە، چونکە دیارە کە مەبەست کێیە ڕاوەدووی گەلی بەنوو ئیسرائیل دەنێ، کە فیرعەون و سەربازەکانی.

**٣)- ﴿وَٱتْرُكِ ٱلْبَحْرَ رَهْوًا﴾**، لە دەریایەکەش گەڕێ بە کراوەیی، **(البَحْرَ)**، (أل)ی ناساندنی لەسەرەو، ئەلیف و لامەکە بۆ **(عهد)**ە، واتە: لە دەریایەکە گەڕێ، مەبەست پێی جینسی دەریا نیە، لە دەریایەکە گەڕێ، کە مەبەست پێی دەریای سوورەو پێشتر **(بحر القلزم)**ی پێگوتراوە، کەواتە: ئەوە کە هەندێک لە تەفسیرەکان، بۆ وێنە: تەفسیری (نموونە)[1]، دەڵێ: **(نَهْر النِّيْل)**، لە ڕاستییدا نەیپێکاوەو، نازانم لە کوێی هێناوە! ڕەنگە لە هەندێ تەفسیری دیکەشدا هەبێ، بەڵام مسۆگەر ئەوە هەڵەیەکی گەورەیە، چونکە ڕووباری نیل، زۆرجار هەر بە نێو میسڕدا هاتوە، ئەو شارەش کە بەنوو ئیسرائیلی تێدا بووبن، ئایا لەمبەری بووە، یان لەوبەری بووە؟ پاشان تاکو لەو شارەوە دەگەنە، ڕووباری نیل زۆر نزیکە، کەی بواری ئەوە دەبێ ئەوان ماوەیەک ببڕن؟ هەروەها گەلی فیرعەون بە خۆو بەو سوپایەش کە چەند هەزار کەسێک هەر بوون، ئەگەر چەند سەد هەزار کەسێکیش نەبووبن، پانتاییەکی باشیان دەوێ، کە جێی هەردووکیان تێدا بووبێتەوە، پێش ئەوەی بگەنە بەردەمی ئەو دەریایە.

کەواتە: بە دڵنیایەوە مەبەست پێی دەریای سوورە، کە ماوەیەکی باش بەنوو ئیسرائیل ڕۆیشتوون، تاکو گەیشتوونەتە دەریای سوور، ئیدی ئەوان گەیشتوونە ئەوێ، ئنجا دوایی فیرعەونیش بەخۆی و بە سوپایەکەیەوە، شوێنیان کەوتوون،

---

(١) ج٢٤، ص١٧٥.

ئنجا ئەو ڕاکردنەی بەنوو ئیسرائیل بە نیوە شەوو، حاڵەتێکی نەخافڵ بووەو، ئەو سوپایەی فیرعەونیش هەمووی یەکسەر بە پلاك و دوگمە ساز نابێ، هەتا خۆیان پێچاوەتەوەو تاکو وڵاخیان زین کردوون و هەتا عەرەبانەیان ساز کردوون، وەک لە پەیمانی کۆندا هاتوە، دەڵێ: بە چەند سەد عارەبانەوە، بێگومان ئەوە هەمووی کاتی ویستوە، بۆیە پێویستە پانتاییەکی جوگرافیی باش بووبێ، بۆ ڕاکردن و ڕاوەدوونانی مووسا عليه السلام و گەلەکەی لەلایەن فیرعەون و سوپایەکەیەوەو، ناگونجێ ڕووباری نیل بووبێ، ڕووباری نیلیش پانتاییەکەی هێندە نیە، کە فیرعەون و سوپایەکەی هەمووی بچنە نێوی و بشخنکێن، بەڵام دیارە دەریای سوور لە هەر شوێنێکی پەڕیبنەوە، لە تەسکترین شوێنیشەوە، بێگومان پانییەکەی چەندان کیلۆمەترەو، پانتایی ئەوەی تێدا دەبێ و، جێی ئەوەی تێدا بۆتەوە، کە فیرعەون بە هەموو سوپاکەیەوە بێتە نێوی، دەریایەکەیان لێ وێکبێتەوە.

ئنجا کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَٱتۡرُكِ ٱلۡبَحۡرَ رَهۡوًا ﴾، دەریایەکە لێگەڕێ بە قڵیشاوەیی و، بە کراوەیی، (رَهْواً أي: سَاكِناً وَمَفْتُوحَاً وَذَا سَعَةٍ)، لێی گەڕێ با بە فراوانیی و بەقڵیشاویی، بە کراوەیی بمێنێتەوە.

٤)- ﴿ إِنَّهُمۡ جُندٞ مُّغۡرَقُونَ ﴾، بە دڵنیایی ئەوان سەربازانێکی نغرۆکراون، واتە: بڕیاردراوە کە ئەوان دەبێ بخنکێنرێن، کەواتە: لێیان مەترسێن، ئەم ڕستەیە: ﴿ وَٱتۡرُكِ ٱلۡبَحۡرَ رَهۡوًا ﴾، حیکمەتەکەی ئەوەیە کە مووسا عليه السلام گۆچانی لە دەریا داوەو شەق بووە، وەک لە سوورەتی (الشعراء)دا، هاتوە، ﴿ أَنِ ٱضۡرِب بِّعَصَاكَ ٱلۡبَحۡرَۖ فَٱنفَلَقَ فَكَانَ كُلُّ فِرۡقٖ كَٱلطَّوۡدِ ٱلۡعَظِيمِ ٦٣ ﴾، ئنجا ئەگەر دووبارە گۆچانی لێ دابایە، دەریایەکە وێک دەهاتەوە، بە فەرمانی خوا ﷻ، بۆیە خوا فەرموویەتی: لە دەریایەکە گەڕێ و، مەشترسێن چونکە ئەوان بڕیاریان بۆ دراوە کە دەبێ لەو دەریایەدا بخنکێن.

٥)- ﴿ كَمۡ تَرَكُواْ مِن جَنَّٰتٖ وَعُيُونٖ ﴾، (یەکسەر خوا ﷻ، باسی ئەوە دەکات وەدەفەرموێ:) زۆر باغ و بێستان و کانیی و سەرچاوەیان بەجێهێشتن، چونکە (كَمْ) (كَمُ الخَبَرِيّةِ لِلْتَكْثِيرِ)، (كَمْ)ی خەبەریی بۆ زۆرییە، یانی: زۆریان بەجێهێشتن.

٦)- ﴿ وَزُرُوعٍ وَمَقَامٍ كَرِيمٍ ﴾، هەروەها زۆر کشتوکاڵ و شوێنی تێدامانەوەی پەسندو باشیان بەجێهێشتن، (**مقام**)، واتە: شوێنی تێدامانەوە، جێگاو ڕێگا، خانووبەرەی زۆر پڕ ڕێزو حورمەت.

٧)- ﴿ وَنَعْمَةٍ كَانُوا۟ فِيهَا فَـٰكِهِينَ ﴾، هەروەها نازو نیعمەتێک، خۆشیی و بەهرەمەندبوونێک، کە تێیدا زۆر کەیف خۆش و شادمان بوون، (**فَاكِهِين**)، خوێنراویشەتەوە: (**فَكِهِين**) هەردووکیان بە یەک واتان، واتە: لەوێدا قسەی خۆشیان دەکردو، شادمان بوون و بەهرەوەر گربوون.

(**النَّعْمَةُ: اسْمٌ لِلتنَعُّمِ، مَصُوغٌ عَلَى زِنَةِ الْمَرَّةِ، وَلَيْسَ الْمُرَادُ بِهِ الْمَرَّةَ، بَلْ مُطْلَقُ الْمَصْدَرِ، بِاعْتِبَارِ أَنَّ مَجْمُوعَ أَحْوَالِ النَّعِيمِ صَارَ كَالشَّيْءِ الْوَاحِدِ**)، وشەی: (**النَّعمة**) ناوە بۆ ڕابواردن و لەززەت وەرگرتن، (**نَعْمَة**)، لەسەر کێشی (**مَرَّة**)، داڕێژراوە، بەڵام مەبەست پێی یەکجار نیە، بەڵکو مەبەست پێی چاوگە، بە ئیعتیباری ئەوە کە کۆی حاڵەتەکەیان، وەک یەک شت وابووە، لە سووڕەتی (**الشعراء**)دا، دەفەرموێ: ﴿ فَأَخْرَجْنَـٰهُم مِّن جَنَّـٰتٍ وَعُيُونٍ ﴿٥٧﴾ وَكُنُوزٍ وَمَقَامٍ كَرِيمٍ ﴿٥٨﴾ ﴾، دەرمان هێنان، (کۆمەڵی فیرعەون) لە نێو چەند باغ و بێستانێک و، لە نێو چەند کانیی و سەرچاوەیەک، (**كُنُوز**) کۆی (**كَنْز**)ە، یانی: خەزنە، خەزێنە، پارەو سەروەت و سامانی وەسەریەکنراو، ﴿ وَمَقَامٍ كَرِيمٍ ﴾، جێگەو ڕێگەو خانووبەرەی پڕ ڕێزو حورمەت و خۆش و نایاب.

٨)- ﴿ كَذَٰلِكَ وَأَوْرَثْنَـٰهَا قَوْمًا ءَاخَرِينَ ﴾، ئا بەو شێوەیە بوو، (بەو شێوەیەی باسکرا، ئاوا ڕوویدا)، ئەوەی بەجێیانهێشتبوو کردمانە میراتی کۆمەڵێکی دیکە، یانی: ﴿ جَنَّـٰتٍ وَعُيُونٍ ﴿٢٥﴾ وَزُرُوعٍ وَمَقَامٍ كَرِيمٍ ﴿٢٦﴾ وَنَعْمَةٍ كَانُوا۟ فِيهَا فَـٰكِهِينَ ﴿٢٧﴾ ﴾، هەموو ئەوەمان کردە، میراتی کۆمەڵێکی دیکەو، خەڵکێکی دیکە.

لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿ كَذَٰلِكَ وَأَوْرَثْنَـٰهَا قَوْمًا ءَاخَرِينَ ﴾، هەر بەو شێوەیەو کردمان بە میراتی کۆمەڵە خەڵکێکی دیکە، ئەو کۆمەڵە خەڵکەی دیکە، کێ

بـوون؟ لـه سـووڕەتی (**الشـعراء**)دا، دەفەرمـوێ: ﴿ كَذَٰلِكَ وَأَوْرَثْنَٰهَا بَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ۝٥٩ ﴾، واتـه: هـەروا بـەو شـێوەیەی باسـکرا، ئـەو شـتانەمان کردنـه میـراتی وەچەی ئیسـڕائیل، لـه ئایەتـەکانی: (٥٧ - ٥٩)دا، خـوا ﷻ باسـی هەمـان مەبەسـت دەکات، بـەڵام لـەوێ دەفەرمـوێ: کردمـان بـه میـراتی گـەلی بەنـوو ئیسـڕائیل.

ئنجـا زانایـان لـەو بـارەوە مشـتومڕی زۆریـان بـووە، چونکـه بەنـوو ئیسـڕائیل کـه لـه دەریـای سـوور پەڕیونـەوە، جارێکـی دیکـه نەگەڕاونـەوە بـۆ میسـڕ، وەک ئاشـکرایە، هـەم لـه پەیـمانی کۆنـدا، هـەم لـه مێـژوودا، هـەم لـه قورئانـدا، بەڵکـو دوایـی هاتـوون بـەرەو دەشـتی سـیناو، بـەرەو فەڵەسـتین و، خـوای پـەروەردگار بەڵێنـی پێـداون، لـەوێ نیشـتەجێیان بـکات، گەلێکـی چەوسـاوە بـوون، ئەوێـش کـه سـەر زەمینێکـی پـڕ بەرەکەتـه، لـەوێ نیشـتەجێیان بـکات، نـەک بـەو شـێوەیە کـه بێـن، موڵـک و ماڵـی خەڵکـی دیکـه داگیـر بکـەن، ئـەو کاتـه مرۆڤایەتیـی ژمـارەی هێنـدە زۆر نەبـووە، سـەرزەوی شـوێنی چۆڵـی زۆری لـێ هەبـوون، سـەر زەمینـی شـام، شـوێنێکی فـراوان بـووەو جێـی خەڵکێکـی زۆری تێـدا بۆتـەوە، ئەوانیـش بچـن لـەوێ بـۆ خۆیـان، کۆمەڵگایـەک و قەوارەیـەک دروسـت بکـەن و، چیدیکـه لـه ژێـر چەپـۆک پۆسـتاڵی فیرعـەونی میسـڕ، یـان فیرعەونێکـی دیکـه دانەبـن و، خـاوەنی قـەوارەی سـەربەخۆی خۆیـان بـن و، ئـەو شـەریعەتەی خـوا بـۆی نـارد بـوون، کـه تەوراتـه، لـه ژیـانی خۆیانـدا جێبەجێـی بکـەن، ژیانـی خۆیـانی پـێ ڕێـک بخـەن، کەواتـه: بەنـوو ئیسـڕائیل نەگەڕاونـەوە بـۆ میسـڕ، ئـەدی چـۆن خـوا لـه سـووڕەتی (**الشـعراء**)دا، دەفەرمـوێ: ﴿ كَذَٰلِكَ وَأَوْرَثْنَٰهَا بَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ۝٥٩ ﴾؟

لێـرەدا زانایـان، وەک کاتی خـۆی لـه تەفسـیری (**الشعراء**)یشـدا، باسـمان کـردوە، چەنـد واتایەکیـان بـۆ ئـەوە کـردوون:

١- له جۆری ئەو شتانەی که فیرعەون و دارو دەستەکەی بەجێیان هێشتن، له جۆری ئەوەمان کردە میرات، کردمانە پشک و بەش بۆ بەنوو ئیسرائیل، نەک خودی ئەو

شتانە، بەڵکو لە جۆری ئەوانە، واتە: فیرعەون و دارو دەستەکەی باغ و بێستان و گوڵ و گوڵزاریان بەجێ هێشتوون، کانیی و سەرچاوەو، جۆگەو جۆبار، کۆشک و تەلارو، پارەو سامان، خۆشیی و نازو نیعمەت، خوای پەروەردگاریش هەموو ئەو شتانەی لە شوێنێکی دیکە، بە بەنوو ئیسرائیل داون، واتە: باغ و بێستانی پێداون، کانیی و کانیاوی پێداون، جۆگەو جۆباری پێداون، کۆشک و تەلاری پێداون، پارەو سامانی پێداون، خۆشیی و نازو نیعمەتی پێداون، لە سەر زەمینی شام، ئەم واتایەش زیاتر دەچێتە عەقڵ و دڵەوە.

٢- بەڵام هەندێکی دیکە، لە زانایان ڕایەکی دیکەیان هەیە، بۆ وێنە: **(الشوكاني)** لە تەفسیرەکەی خۆیدا[1]، دەڵێ: **(بَنُو إِسْرَائِيْل هُم الوَارِثُون)**، ئایەتەکەی سوورەتی **(الشعراء)**ی وا لێکداوەتەوە، کە دەفەرموێ: ﴿ قَوْمًا ءَاخَرِينَ ﴾، واتە: دامانە گەلی بەنوو ئیسڕائیل، دەڵێ: بەنوو ئیسڕائیل ئەو میراتگرانە بوون، هەندێک لە توێژەرانی قورئان، ڕایان وایە دەڵێن: دوای ئەوەی بەنوو ئیسڕائیل لە دەریای سوور پەڕینەوەو گەلی فیرعەون و، سوپایەکەی خنکاون، چوونەوە نێو میسڕ و لەوێ نیشتەجێ بوون و دوایی هاتوون بۆ دەشتی سینا!! بەڵام نە لە قورئاندا ئەوە باسکراوەو، نە مێژووش ئەوە دەردەخات کە بەنوو ئیسڕائیل دوای دەرباز بوونیان لە میسڕو، لە بەین چوونی فیرعەون و سوپایەکەی، گەڕابنەوە بۆ میصر، شتی وا باس نەکراوە.

**(الطبري)**یش، ئەمە وەک ڕایەک دەهێنێ، کە بەنوو ئیسڕائیل ئەو شوێنەیان بە میرات گرتبێ، نەک ئەوان گەڕابنەوە، دەڵێ: خەڵکێکیان لەوێ ماوەتەوە[2].

خاوەنی تەفسیری (نموونە)ش کە بە فارسییە، دەڵێ: هەندێکیان گەڕاونەوە بۆ میسڕ و لەوێ نیشتەجێ بوون[3].

---

(١) فتح القدير، ج٤، ص٦٨٧.

(٢) جامع البيان، ج٢٥، ص١٢٧.

(٣) تفسير نمونه، ج٢١، ص١٧٨.

٣- بەڵام (طنطاوي جواهري) لە تەفسیرەکەی خۆیدا[1] دەڵێ: (**المُرَادُ أَنْ قَوْماً غَيْرَ بَنِي إِسْرَائِيْلَ دَخَلُوْا مِصْرَ، وَذَلِكَ أَنَّهُ بَعْدَ هَذَا التَّارِيْخ تَغَلَّبَ عَلَى مِصْر، الآشُورِيُّون وَالبَابِلِيُّون تَارَةً، وَالحَبَشُ مَرَّةً أُخْرَى، وَالفُرْسُ مُدَّةً، وَاليُونَان آوِنَةً، وَالرُّومَان أَخِيْراً، ثُمَّ أُمَّةُ العَرَبِ، ثُمَّ الطَوْلُونِيون، وَالأَخْشَيدِيّون، وَالفَاطِمِيّون، وَالمَمَالِيْك البَرِيَّة وَالبَحْرِيَّة، وَالتُّرْكُ، وَالفَرَنْسِيُّون، وَالإِنْجِلِيْز، وَهَا نَحْنُ أُوْلَاءِ الآنَ فِي مِصْر نُجَاهِد فِي خُرُوجِهِمْ مِنْهَا، أَمَّا بَنُو إِسْرَائِيْل فَلَمْ يَتَغَلَّبُوْا عَلَيْهَا**) بە ڕاستیی ئەو (**طنطاوي**) ڕەحمەتی خوای لێ بێ، لەبەر ئەوەی هەم زۆر شارەزای مێژوو بووە، هەم زۆر شارەزای جوگرافیا بووە، هەم زۆر شارەزای زانستەکانی ڕۆژگاری خۆی بووە، تەفسیرەکەی پڕ کردوە لەو جۆرە زانیارییانە، کە جاری وایە زێدەڕۆییشی تێدا کردوە، بەڵام هەندێک شت ئەو باش تێیگەیشتوە و، ڕەنگە توێژەرەوانی دیکەی قورئان بەو شێوەیە تێینەگەیشتن، لەبەر ئەوەی ڕۆشنبیرییەکی زۆر گشتیی و فراوان و قووڵی هەبووە، لێرەدا دەڵێ:

مەبەست لەوە کە دەفەرموێ: ﴿قَوْمًا ءَاخَرِينَ﴾، واتە: کۆمەڵێکی دیکەی جیا لە بەنوو ئیسرائیل، هاتنە میسرەوە [بۆیە خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿قَوْمًا ءَاخَرِينَ﴾، لە سوورەتی (**الشعراء**)دا، دەفەرموێ: ﴿كَذَٰلِكَ وَأَوْرَثْنَٰهَا بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴿٥٩﴾﴾، بۆیە دەفەرموێ: (**كَذَٰلِكَ**)، واتە: هەر لە شێوەی ئەوە، کردمانە میراتی بەنوو ئیسرائیل، بەڵام نەک خودی ئەو شتانەی فیرعەون و دارو دەستەکەی بەجێیانهێشتن، بەڵکو لە شێوەی ئەوە، وەک باسمانکرد، لە باغ و باغات و، کشتوکاڵ و، کانیی و سەرچاوەو، خانووبەرەو، کۆشک و تەلارو، سەروەت و سامان، هەموو ئەوانەمان لە شوێنێکی دیکە، بە بەنوو ئیسرائیل دان]، چونکە دوای ئەو مێژووە، [دوای ئەوەی فیرعەون و سوپایەکەی نغرۆبوون، لە دەریای سووردا]:

١- جارێک ئاشوورییەکان، میسریان خستۆتە ژێر ڕکێفی خۆیانەوە.

٢- بابلییەکان ماوەیەک.

---

(١) الجواهر، ج١١، ص١٦.

٣- حەبەشەییەکان ماوەیەکی دیکە.

٤- فارسەکان و دەوڵەتی فارس، ماوەیەك.

٥- هەروەها یۆنانییەکان ماوەیەک.

٦- ڕۆمانەکان ماوەیەک.

٧- ئنجا دوایی کەوتۆتە ژێر ڕکێفی گەلی عەرەب.

٨- دوایی تۆڵۆنییەکان.

٩- ئنجا ئەخشیدییەکان، ئەوانیش هۆزێک و بنەماڵەیەک بوون بەو ناوە.

١٠- **فاطیمییە**کان کە شیعەی **فاطیمیی** بوون.

١١- هەروەها مەمالیکی وشکانیی و دەریایی، کە ئەوانیش دیارە دوو کۆمەڵ بوون.

١٢- تورکەکانیش ماوەیەک میسریان خستە ژێر ڕکێفی خۆیان.

١٣- فەرەنسییەکان، ماوەیەك.

١٤- ئینگلیزیش لەم ڕۆژگارەدا.

ئنجا دیارە لە ڕۆژگاری (**طنطاوي جوهري**)دا، کە لە ساڵانی سییەکاندا ئەو تەفسیرەی نووسیوە، دەڵێ: (**وَهَا نَحْنُ أُوْلَاءِ الآنَ فِي مِصْرَ نُجَاهِد فِي خُرُوجِهِمْ مِنْهَا**)، ئێستاش ئەوە ئێمە تێدەکۆشین و، خەبات دەکەین، بۆ ئەوەی ئینگلیز لە میسر دەربکەین، دەڵێ: بەڵام بەنوو ئیسرائیل زاڵ نەبوونەوە بەسەر میسردا و، مێژوو شتێکی ئاوای باس نەکردوە.

٩)- لە کۆتاییدا خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿فَمَا بَكَتْ عَلَيْهِمُ ٱلسَّمَآءُ وَٱلْأَرْضُ﴾، ئاسمان و زەوی بۆیان نەگریان.

١٠)- ﴿وَمَا كَانُوا۟ مُنظَرِينَ﴾، هەروەها مۆڵەتیشیان نەدراو، چاوەڕوانیشیان نەکرا لە چاوەڕوانیکراوان نەبوون.

کـە دەفەرمـوێ: ئاسـمان و زەوی بۆیـان نەگریـان، ئەمـە مەبەسـت پێـی گرنگیی پێ نەدانـە، واتـە: فەوتانیـان هـەروەک فەوتـانی غەیـری خۆیـان بـوو، نـەک کارەسـاتێکی مـەزن بووبـێ، وەک خۆیـان خەیاڵیـان دەکـرد، کـە ئەگـەر بێـت و فیرعـەون بفەوتێ و سـوپایەکەی بفەوتـێ، دنیـا تێکدەچـێ، نەخێـر فەوتاشـن و هیچیـش نەبـوو، ئەوانیـش وەک ئـەو خەڵکـە لـە بەیـن چـوون، کـە لـە پێـش ئەوانـدا، لـە بەیـن چـوو بـوون.

بـەڵام چەمکـی پێچەوانەیـی (مفهـوم المخالفـة)ی ئـەم ئایەتـە ئـەوە دەگەیەنـێ، کـە بڕوادارانـی بـۆ خـوا صوڵحـاو گـەردوون (کـون) و ئاسـمانەکان و زەوی کارلێـك (تفاعـل) لەگـەڵ ژیـان و مردنیـان دا دەکات ، وەك هەندێـك ئایەتـی قورئـان و دەقەکانـی سـوننەت دەیگەیەنـن.

## مەسەلەی سێیەم:

**دەربازکرانی بەنوو ئیسرائیل لە چنگی فیرعەون کە سزاو ئازارێکی ڕیسواکەری دەدان، چونکە ئەو لە خۆسەپێنەرانی زێدەڕۆییکار بوو، هەروەها هەڵبژێررانی بەنوو ئیسرائیل بەسەر جیهانییانی ڕۆژگاری خۆیانداو، پێدانی نیشانە گەلێک کە تاقیکردنەوەیەکی ئاشکرایان تێدابوو:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ نَجَّيْنَا بَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ مِنَ ٱلْعَذَابِ ٱلْمُهِينِ ﴿٣٠﴾ مِن فِرْعَوْنَ إِنَّهُۥ كَانَ عَالِيًا مِّنَ ٱلْمُسْرِفِينَ ﴿٣١﴾ وَلَقَدِ ٱخْتَرْنَٰهُمْ عَلَىٰ عِلْمٍ عَلَى ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٣٢﴾ وَءَاتَيْنَٰهُم مِّنَ ٱلْءَايَٰتِ مَا فِيهِ بَلَٰٓؤٌا۟ مُّبِينٌ ﴿٣٣﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە: لە پێنج بڕگەدا:

١)- ﴿وَلَقَدْ نَجَّيْنَا بَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ مِنَ ٱلْعَذَابِ ٱلْمُهِينِ﴾، بە دڵنیایی وەچەی ئیسرائیلمان لە سزایەکی ڕیسواکەر دەرباز کرد.

﴿ٱلْعَذَابِ ٱلْمُهِينِ﴾، (**تَعْبِيرٌ جَامِعٌ وَشَامِلٌ لِكُلِّ صنُوفِ العَذَابِ المُحْتَوِي عَلَى الإهَانَةِ وَالإِذْلَالِ**)، ﴿ٱلْعَذَابِ ٱلْمُهِينِ﴾، (ئازاری ڕیسواکەر)، دەربڕێکی زۆر فراوان و گشتگیرە، بۆ هەموو جۆرەکانی سزادان، کە هەموو جۆرەکانی سووکایەتیی و ڕیسوایی دەگرنە خۆیان.

٢)- ﴿مِن فِرْعَوْنَ﴾، لە فیرعەون (دەربازمان کردن)، دەڵێ: (**بَدَلٌ مِنَ العَذَابِ المُهِيْنِ، فَكَأَنَّهُ كَانَ نَفْسه عَذَاباً مُهِيْنَاً**)، فیرعەون دەبێتە جێگرەوە بۆ: ﴿ٱلْعَذَابِ ٱلْمُهِينِ﴾، وەک فیرعەون، خۆی سزا ڕیسواکەرەکە بووبێ.

٣)- ﴿إِنَّهُۥ كَانَ عَالِيًا مِّنَ ٱلْمُسْرِفِينَ﴾، بە دڵنیایی ئەو خۆ بەرزکەر بوو، لە زێدەڕۆیی کاران، (**العَالِي: المُتَكَبِّرُ المُتَجَبِّرُ**) (**عَالِي**) خۆ بەزلگری خۆسەپێنەر، (**المُسْرِفِيْن: المُكْثِرِيْنَ

**وَالْمُفْرِطِيْنَ فِي التَّعَالِي**)، ئەوانەی لە خۆ بەرزکردنەوەو، خۆ سەپاندندا زێدەڕۆییان کردبوو، تێیان پەڕاندبوو.

٤)- ﴿ وَلَقَدِ ٱخۡتَرۡنَٰهُمۡ عَلَىٰ عِلۡمٍ عَلَى ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴾، بە دڵنیایی (بەنوو ئیسرائیلمان) بە زانیارییەوە بەسەر جیهانییاندا هەڵمانبژاردبوون، یانی: خوا ﷻ بەسەر جیهانییانی ڕۆژگاری خۆیاندا، هەڵیبژارد بوون، چونکە پێیان زاناو شارەزا بوو، کە لێشاوەو شایستەن، یاخود پێشیان زانا بوو کە لا دەدەن، لە هەندێ حاڵاندا و کەم و کوڕییشیان دەبێ، بەڵام ئەوە هۆکاری نەبوو، کە خوا هەڵیان نەبژێرێ، وەک خاوەنی: (**البحر المديد في التفسير الكتاب المجيد**)[1]، دەڵێ: (**أي: كُنَّا عَالِمِيْنَ وعَلَى عِلْمٍ أي: كُنَّا عَالِمِيْنَ بِأَنَّهم أَحِقَّاء بِالإِخْتِيَار**)، ئێمە زانا بووین، بەوەی کە ئەوان شایستەن، خوا ﷻ هەڵیانبژێرێ، یاخود: (**كُنَّا عَالِمِيْنَ بِأَنَّهُمْ يِزِيْغُونَ فِي بَعْضِ الأَوْقَاتِ، وَيَكْثُرُ مِنْهُمْ الفُرُطَات، فَلَمْ يُؤَثِّر ذَٰلِكَ فِي سَوَابِقِ عِلْمِنَا، لِيُعْلَمَ أَنَّ الجِنَايَاتِ لَا تُؤثِر فِي الرِّعَايَات**).

واتــە: کــە دەفەرمــوێ: ﴿ عَلَىٰ عِلۡمٍ ﴾، واتــە: ئێمــە زانــا بوویــن بــەوەی ئــەوان شایســتەن، خــوا ﷻ هەڵیانبژێــرێ، لــە ڕۆژگاری خۆیانــدا لــە هەمــوو کــەس باشــتر بــوون، لەگــەڵ ئــەو هەمــوو کــەم و کوڕییانەشــدا، هــەر لــە گــەلان و نەتــەوەکانی دیکــە باشــتر بــوون، یاخــود مەبەســت لــە: ﴿ عَلَىٰ عِلۡمٍ ﴾، ئەوەیــە زانابوویــن بــەوەی ئــەوان لــە هەنــدێ حاڵــدا لادەدەن و، کــەم و کوڕیــان دەبــێ، بــەڵام ئــەوە کاریگەریی نەبــوو لــە زانیاریــی ئێمــەدا، تاکــو بزانــرێ کــە تاوانــەکان کاریگــەر نابــن، لــە ڕەچــاو کردنــەکانی خــوای بــەرزدا.

واتــە: کــەم و کوڕییــەکان لــە بەندەکانــدا، نابنــە هــۆکاری ئــەوەی خــوا ﷻ چاودێریــی خــۆی، ڕەچــاو کــردن و میهرەبانیــی خــۆی، لــە بەنــدەکانی بگرێتــەوە.

٥)- ﴿ وَءَاتَيۡنَٰهُم مِّنَ ٱلۡأٓيَٰتِ مَا فِيهِ بَلَٰٓؤٌاْ مُّبِينٌ ﴾، لە نیشانەکانیش پێماندان، ئەوەی کە تاقیکردنەوەیەکی ئاشکرای تێدا بوو، یاخود تاقیکردنەوەیەکی ڕوونکەرەوەی تێدا

---

(١) ج٧، ص٥٠.

بوو، (البَلَاءُ: الإِخْتِبَارُ بِالْخَيْرِ وَالشَّرِّ)، (بلاء) تاقیکردنەوەیە بە خۆشیی و بە ناخۆشیی، بە شتێک کە مرۆڤ پێی خۆشەو، شتێکیش کە پێی ناخۆشە.

(الْمُبِيْنِ)، واتە: ڕوون، لە (أَبَان)ی (لازم)ەوە هاتوە، بە مانای: (بَان)، یانی: (ظهر) ڕوون و ئاشکرا بوو، دەڵێم: دەشگونجێ لە (أَبَان)ی (مُتَعَدِّي)یشەوە، هاتبێ، واتە: تاقیکردنەوەیەکی ڕوونکەرەوە، واتە: ڕوونکەرەوە بۆ ماهیەتی ئەو مرۆڤە، کە ئایا چۆن دەردەچێ، یان ئەو خەڵکە، چۆن دەردەچن؟

لە باسی ڕوونکردنەوەی: ﴿ٱلْعَذَابِ ٱلْمُهِينِ﴾ دا، خاوەنی: (التَّحْرِير والتَّنْوِير)[1]، (محمد الطاهر بن عاشور)، دەڵێ: (والْعَذاب الْمُهِينِ: هُوَ مَا كَانَ يُعَامِلُهُمْ بِهِ فِرْعَوْنُ وَقَوْمُهُ من الإستعباد والإرهاق عَلَيْهِمْ فِي السُّخْرَةِ، وَكَانَ يُكَلِّفُهُمْ أَنْ يَصْنَعُوا لَهُ اللَّبِنَ كُلَّ يَوْمٍ لِبِنَاءِ مَدِينَتَي فَيْثُومَ ورَعْمسيس، وَكَانَ اللَّبِنُ يُصْنَعُ مِنَ الطُّوبِ وَالتِّبْنِ، فَكَانَ يُكَلِّفُهُمُ اسْتِحْضَارَ التِّبْنِ اللَّازِمِ لِصُنْعِ اللَّبِنِ وَيَلْتَقِطُونَ مُتَنَاثِرَهُ، وَيُذِلُّونَهُمْ وَلَا يَتْرُكُونَ لَهُمْ رَاحَةً).

واتە: ئەو ئازارە ڕیسواکەرە، ئەوە بووە کە فیرعەون و گەلەکەی، مامەڵەیان پێ لەگەڵ بەنوو ئیسرائیلدا کردوە، بە کۆیلەیان کردوون و، زۆر ئەزیەتیان داون، لە سۆغرەو بێگار پێکردندا، چونکە فیرعەون لەسەر وانی پێویست کردبوو، کە دەبێ هەموو ڕۆژێ خشت دروست بکەن، (خشتی سوور) بۆ دروستکردنی هەردوو شاری (فَيْثُومَ)و (رعمسيس) [ کە لە سەرچاوە مێژووییەکاندا هاتوە ئەو کاتەی فیرعەون ئەو دوو شارەی دروست کردوون، لە خشت دروستیکردوون] ئەو خشتەش دروست دەکرا، لە قوڕو کا، [کەواتە: دەگونجێ خشتی سوور نەبووبێ و خشتێکی دیکەی جیابووە، چونکە خشتی سوور، لە کا دروست نابێ، هەر لە قوڕ دروست دەبێ و قوڕەکە دەسووتێنرێ بە شێوەیەکی تایبەت]، ئنجا فیرعەون لەسەری پێویست کرد بوون، کە دەبێ کای پێویست بێنن، بۆ

---

(١) ج٢٥، ص٣٠٤.

دروسـتکردنی ئـەو خشـتە قوڕانـەو، ئەگـەر کایەکـە لـە ڕێگایـە ڕژابایـە، پێـی خـڕ دەکردنـەوەو، زەبوونیـان دەکـردن، نەیاندەهێشـت بـە هیـچ جۆرێـک پشـوو بـدەن.

تەنیـا خـوا ﷻ دەزانـێ چەنـد سـەد کـەس، یـان چەنـد هـەزار کەسـیان لـەو سـۆغرەو بێـگارەدا، فەوتـاون!

## هەڵبژاردنی بەنوو ئیسڕائیل و پێدانی هەژدە نیشانەو نیعمەت

کە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدِ اخْتَرْنَاهُمْ عَلَىٰ عِلْمٍ عَلَى الْعَالَمِينَ ﴾، ئێمە لە ڕووی زانیارییەوە بەسەر جیهانییاندا هەڵمانبژارد بوون، ﴿ وَآتَيْنَاهُم مِّنَ الْآيَاتِ مَا فِيهِ بَلَاءٌ مُّبِينٌ ﴾، ئەمە شوێنەواری هەڵبژاردنەکەیەو، دەرهاویشتەی هەڵبژاردنی خوایە، بۆیان، کە زۆر نیشانەی ڕوون و ئاشکرا، یاخود ڕوونکەرەوەو ئاشکرا کەری پێدابوون، لە موعجیزەکان، لە شتی یاسا دڕ، کە ئەگەر تەماشای قورئان بکەین، ئەم هەژدە (١٨) نیشانەو موعجیزەیەمان دەکەونە بەرچاو، کە نۆیان ئەوانەن، بە مووسا ﷺ درابوون: ﴿ وَلَقَدْ آتَيْنَا مُوسَىٰ تِسْعَ آيَاتٍ بَيِّنَاتٍ ...(١٠١) ﴾الإسراء، کە لە سووڕەتی (**الأعراف**)دا، باسمان کردوون، هەروەها خوا ﷻ لە سووڕەتی (**الإسراء**)دا، دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ آتَيْنَا مُوسَىٰ تِسْعَ آيَاتٍ بَيِّنَاتٍ ...(١٠١) ﴾، دیسان لە سووڕەتی (**النمل**)دا: ﴿ فِي تِسْعِ آيَاتٍ ...(١٢) ﴾، نۆ نیشانەی ڕوون و ئاشکرا، کە ئەو نۆ نیشانەیە وا پێدەچێ ئەمانە بن:

١- دەستی سپی مووسا ﷺ، (**الْيَدُ الْبَيْضَاء**)، کە دەستی ڕاستی بە فەرمانی خوا، دەخستە بن قۆڵی چەپی و دەری دەهێنا، وەک: گلۆپ دەئایسا بێ ئەوەی نەخۆشیی و گرفتێکی هەبێ.

٢- گۆچانەکەی مووسا ﷺ، کە فڕێی دەدا، دەبوو بە حەزیا، مار و هەژدیهایەکی زۆر گەورە.

ئەمانە دووانیان.

دووانیشیان ئەوەن کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ أَخَذْنَا آلَ فِرْعَوْنَ بِالسِّنِينَ وَنَقْصٍ مِّنَ الثَّمَرَاتِ (١٣٠) ﴾**الأعراف**، ئێمە شوێنکەوتوان و، دارو دەستەی فیرعەونمان سزادان بە:

٣- سالانی گرانیی (**السنین**).

٤- کەمیی بەروبووم (**نقص من الثمرات**).

پێنجەکەی دیکەشیان، ئەوانەن کە خوا ﷻ دەفەرمووێ: ﴿ فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمُ الطُّوفَانَ وَالْجَرَادَ وَالْقُمَّلَ وَالضَّفَادِعَ وَالدَّمَ ءَايَٰتٍ مُّفَصَّلَٰتٍ فَاسْتَكْبَرُوا۟ وَكَانُوا۟ قَوْمًا مُّجْرِمِينَ ﴿١٣٣﴾ ﴾**الأعراف**، ئنجا ناردمانە سەر دارو دەستەو شوێنکەوتووانی فیرعەون:

٥- (**الطُّوفَانَ**) ڕووباری نیل، هەڵدەستا دەبوو بە لافاو و لێزماوێک هەموو شتێکی وەبەرخۆدەدا.

٦- (**الجَرَادَ**) کوللە: کوللە لە کشتوکاڵیانی دەداو، هەمووی دەخوارد.

٧- (**القُمَّلَ**) ئەسپێ، یاخود کێچ کە لە جەستەیانی دەدا، یاخود لە وڵاخیانی دەدا.

٨- (**الضَّفَادِعَ**) بۆقەکان: بۆق زۆر دەبوون، هەتا لە تەفسیرەکاندا دەڵێت: هێندە زۆربوون، بۆیان دەهاتنە ماڵێ و، کەسێک قسەی دەکردو، زاری هەڵدەپچڕی، بۆق خۆی تێ دەهاویشت! کە بێگومان ئەوە ئەندازەیەک زێدەڕۆیی تێدایە.

٩- (**الدَّمَ**)، خوێن، خوێنیان ڕادەسا، هەندێک دەڵێن: ئاوەکەیان دەبوو بە خوێن، بەڵام وا پێدەچێ خوێنیان ڕاسابێ و پژابێ، ئەمانە نۆ (٩) یانن.

خوا ﷻ لە چەند شوێنێ لە قورئاندا، باسی ئەو نۆ نیشانانەی کردوە، کە خوا ﷻ تایبەت بە مووسای ﵇ داون، وەک موعجیزەو بەڵگە، بۆ ئیسپاتی ڕاستیی پێغەمبەرایەتیی خۆی، کە بۆ فیرعەون و دارو دەستەکەی بیسەلمێنێ، هەروەها بە لای کەمەوە نۆ (٩)ی دیکەش دەکەونە بەرچاو لە قورئاندا:

١٠- هەور لەسەرکردنە سێبەر، وەک خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَظَلَّلْنَا عَلَيْهِمُ الْغَمَامَ ...﴿١٦٠﴾ ﴾**الأعراف**، هەورمان بۆ کردنە سێبەر، کاتێک دەچنە دەشتی سینا، لەو بیابانە گەرمەدا، نە دارو درەخت، نە کانیی و سەرچاوە، نە پەنایەک هەیە، خوا ﷻ هەوری بۆ کردوونە سێبەر.

**١١و١٢**- دابەزاندنی گەزۆو باڵندەی سەلوا (**سَلْوَى: السُّماني**)، باڵندەیەکە وا پێدەچێ، وەک کەوو سوێسکە بێ، بە کوردیی شێلاقەی پێدەڵێن، کە لە ناوچەی ئێمەدا نیەو، لە شێوەی کەوو سوێسکەیە دایە: ﴿ وَأَنزَلْنَا عَلَيْكُمُ ٱلْمَنَّ وَٱلسَّلْوَىٰ ﴿٥٧﴾ ﴾ البقرە.

**١٣**- تەقاندنەوەی دوازدە (١٢) کانیی و سەرچاوە، لە گا بەردێک، یاخود لە پارچە چیایەکدا: ﴿ وَإِذِ ٱسْتَسْقَىٰ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِۦ فَقُلْنَا ٱضْرِب بِّعَصَاكَ ٱلْحَجَرَ ۖ فَٱنفَجَرَتْ مِنْهُ ٱثْنَتَا عَشْرَةَ عَيْنًا ... ﴿٦٠﴾ ﴾ **البقرة**، واتە:یادیش بکەوە کاتێک مووسا ﷺ داوای ئاوی کرد بۆ خەڵکەکەی، (لە دەشتی سینادا بێ ئاو بوون، بیابانێکی گەرمی بێ ئاو)، گوتمان: بە گۆچانەکەت لەو چیایە بدە، یەکسەر دوازدە کانیی و سەرچاوەی لێ دەرقوڵین.

**١٤**- لەتکران و قڵیشێنرانی دەریای سوور بۆیان و، پەڕینەوەیان بەوێدا: ﴿ فَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ أَنِ ٱضْرِب بِّعَصَاكَ ٱلْبَحْرَ ۖ فَٱنفَلَقَ فَكَانَ كُلُّ فِرْقٍ كَٱلطَّوْدِ ٱلْعَظِيمِ ﴿٦٣﴾ ﴾ **الشعراء**، واتە: سروشمان بۆ لای مووسا کرد کە بە گۆچانەکەت لە دەریا بدە، یەکسەر قڵیشاو هەر پارچەیەکی وەک چیای مەزن بوو.

**١٥**- پێدرانی تەوڕات بە مووسا بە نووسراوەیی لەسەر چەند (لوح)ێک تەختێک، کە دەڵێن: بەردی زۆر بە نرخ بوون، ئنجا گەوهەرو مرواریی بوون و، زومڕوت بوون، ئەو تەوڕاتە لەسەر ئەو لەوحانە نووسراوە، وەک خوا دەفەرموێ: ﴿ وَكَتَبْنَا لَهُۥ فِى ٱلْأَلْوَاحِ مِن كُلِّ شَىْءٍ ... ﴿١٤٥﴾ ﴾ **الأعراف**.

**١٦**- فەرمایشتکردنی خوا ﷻ لەگەڵ مووسادا ﷺ: ﴿ وَكَلَّمَ ٱللَّهُ مُوسَىٰ تَكْلِيمًا ﴿١٦٤﴾ ﴾ **النساء**، مووسا عليه السلام تاکە پێغەمبەرێک بووە، خوا ﷻ ڕاستەوخۆ فەرمایشتی لەگەڵدا بکات.

**١٧**- بەسەردا بەرزکرانەوەی چیای **طوور**، یان چیایەک تاکو خوا ناچارو واداریان بکات، دان بەوەدا بێنن، کە دەبێ پابەند بن بە تەوڕاتەوە: ﴿ وَإِذْ نَتَقْنَا ٱلْجَبَلَ فَوْقَهُمْ كَأَنَّهُۥ ظُلَّةٌ وَظَنُّوٓا۟ أَنَّهُۥ وَاقِعٌۢ بِهِمْ خُذُوا۟ مَآ ءَاتَيْنَٰكُم بِقُوَّةٍ وَٱذْكُرُوا۟ مَا فِيهِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴿١٧١﴾ ﴾ **الأعراف**، واتە: یاد بکەنەوە! کاتێک چیایەکەمان بەسەردا بەرز کردنەوە، وەک سێبەرو هەورێک

وابوو، پێیان وابوو دەکەوێتە سەریان (پێمان گوتن:) ئەوەی پێمانداون بە توندیی بیگرن و ئەوەی تێیدایە یادی بکەن بەڵکو پارێز بکەن.

١٨- زیندووکرانەوەی کوژراوێکی بەنوو ئیسرائیل بەهۆی لێدرانی ئەندامێکی مانگایەکی سەبڕاوەوە لە جەستەکەی، کۆتا موعجیزە، لەو بارەوە ئەوە بوو کە یەکێ لە بەنوو ئیسرائیل دەکوژرێ، بەڵام بکوژەکەی دیار نیە، مووساش ﷺ بەپێی فەرمانی خوا پێیان، دەڵێ: مانگایەک سەربڕن، کە مانگایەکە سەردەبڕن، ئەندامێکی مانگایەکە لە مردووەکە دەدەن و، مردووەکە زیندوو دەبێتەوەو، دەڵێ: فڵانەکەس کوشتمی: ﴿ فَقُلْنَا ٱضْرِبُوهُ بِبَعْضِهَاۚ كَذَٰلِكَ يُحْيِ ٱللَّهُ ٱلْمَوْتَىٰ وَيُرِيكُمْ ءَايَٰتِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴿٧٣﴾ ﴾البقرة، گوتمان: با ئەندامێکی مانگایەکە لەو جەنازەیە بدەن، (زیندوو دەبێتەوەو، ئیدی زیندوو بووەو، گوتی: فڵانکەس کوشتمی، دوایی بۆ خۆی مردەوە، لە کاتێکدا بەنوو ئیسرائیل هەموویان تەماشاچیی و، ئاگادار بوون).

کەواتــە: بــە لای کەمــەوە، خــوا ﷻ هــەژدە نیشــانەو موعجیــزەی بــە مووســاو گەلەکـەی دابـوون، کـە ئەگـەر وردتـر سـەرنج بدەیـن، شـتی دیکەشـمان دەکەوێتـە بەرچـاو، بـەڵام ئـەوەی کـە لـە قورئانـدا، دیـارن ئـەم هـەژدە، موعجیـزەو نیشـانەیەن کـە خـوا بـە مووسـا ﷺو گەلەکـەی دابـوون و، هەموویـان تاقیکردنەوەی ئاشـکرایان تێدابـوو، هــەر بۆیــە کاتێــک کــە ئــەو موعجیزانەیــان دیــون، دەبووایــە هەرگیــز ســەرپێچیی خــوا نەکەنــەوەو، بەهیــچ شــێوەیەک لاملیــی نەکــەن.

ئنجـا ئایـا بۆچـی خـوا ﷻ ئـەو هەمـوو موعجیـزەو بەڵگـە ڕوون و ئاشـکرایانەی بـەوان داون؟ چونکـە وای پێویسـت کـردوە، ئەوانـە سـاڵەهای سـاڵ سـۆغرەو بێگاریـان پێکـراوەو، چەوسـێنراونەوەو، سـەرەنجام کۆمەڵێـک نەخۆشـییان پەیدابـوون، پێویسـتی بـەوە کـردوە مووسـا ﷺ ئـەو هەمـوو موعجیـزەو بەڵگانـەی پێبن، تاکـو ئـەو خەڵکـە بێتـە ژێـر بـاری شـەریعەت، هەرچەنـدە ئـەو کاتـەش وەک پێویسـت هـەر نەهاتوونـە ژێـر بـار.

خـوا بـە لوتـف و کەرەمـی خـۆی یارمەتییـمان بـدات، هەمیشـە ئـەو هەقـەی بڕوامـان پێیـەتی و هەمیشـە ئـەو هەقـەی دەرکـی دەکەیـن، زانینەکەمـان بگۆڕیـن بـۆ توانیـن و، خـوا ﷻ یارمەتییـمان بـدات هەرچـی بۆمـان دەرکـەوت، لـە ئاییـن و بەرنامـەی خـوا، کـە هەقـەو ڕاسـتە، پێیـەوە پابەنـد بیـن و، خۆمـانی پـێ چـاک بکەیـن، پاکسـازیی و چاکسـازیی لـە کۆمەڵگـەو دەوروبەریشـماندا پـێ بکەیـن.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان لـە نـۆ (٩) ئایـەت پێـک دێ، ئایەتـەکانی: (٣٤ - ٤٢)، کـە تـەوەری سـەرەکییان بەرپەرچدانـەوەی نکوولّییکـردنی بێبڕوایانـە، لـە هاتنـی زیندووکرانـەوەو قیامـەت، ئەویـش بـە ئاماژەکـردن بـە:

١- بەسەرهاتی کۆمەڵی توببەع (تُبَّع) کە بە هۆی تاوانباریی و بێبڕواییەوە فەوتێنراون، کەواتە: دنیا شاری بێ خاوەن نیە، چاکەکاران و خراپەکاران چ لە دنیاو، چ لە دواڕۆژدا، ناگونجێ تەنیا یەک سەرەنجامیان هەبێ.

٢- دروستکردنی گەردوون کە بە گاڵتەو یاریی نیە، بەڵکو بە هەق و حیکمەت ئەم گەردوونە، دروستکراوە، بۆیە دەبێ سەرەنجامێکی هەق و پڕ حیکمەتیشی هەبێ، کە بریتیە لە سزاو پاداشت بۆ مرۆڤەکان.

٣- پێویست بوونی لێک هەڵاواردنی پاک و پیسان، چاک و خراپان، ڕاست و چەوتان، لە ڕۆژیی دواییدا، کە دیارە هەرچەندە ئەندازەیەک لە سزاو پاداشت، لە دنیادا، لە ئەنجامی کردەوە خراپ و چاکەکانی مرۆڤەکاندا پەیدادەبێ، بەڵام لێک هەڵاواردن و سزاو پاداشتی پڕ بە پێست، تەنیا لە ڕۆژی دواییدا دەبێ.

﴿ إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ لَيَقُولُونَ ﴿٣٤﴾ إِنْ هِىَ إِلَّا مَوْتَتُنَا ٱلْأُولَىٰ وَمَا نَحْنُ بِمُنشَرِينَ ﴿٣٥﴾ فَأْتُوا۟ بِـَٔابَآئِنَآ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٣٦﴾ أَهُمْ خَيْرٌ أَمْ قَوْمُ تُبَّعٍ وَٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۚ أَهْلَكْنَٰهُمْ ۖ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ مُجْرِمِينَ ﴿٣٧﴾ وَمَا خَلَقْنَا ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا لَٰعِبِينَ ﴿٣٨﴾ مَا خَلَقْنَٰهُمَآ إِلَّا بِٱلْحَقِّ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٣٩﴾ إِنَّ يَوْمَ ٱلْفَصْلِ مِيقَٰتُهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٤٠﴾ يَوْمَ لَا يُغْنِى مَوْلًى عَن مَّوْلًى شَيْـًٔا وَلَا هُمْ يُنصَرُونَ ﴿٤١﴾ إِلَّا مَن رَّحِمَ ٱللَّهُ ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٤٢﴾ ﴾

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{ئـەو (بێبڕوایـ)انـە بـە جەختکردنـەوەوە دەڵێـن: ﴿٣٤﴾ بەسـەرهات و سـەرەنجام بـەس مردنـە، یەکەمەکەمانـەو، ئێمـە بڵاوکـراوە (زینـدوو کـراوە) نابیـن ﴿٣٥﴾ (دەڵێن:) ئەگـەر ئێـوە لـە ڕاسـتانن (کـە زیندووکرانـەوە هەیـە)، بـاب و باپیرانمـان (کـە پێشـتر مـردوون) بهێنـن ﴿٣٦﴾ ئایـا ئـەوان باشـترن (لـە ڕووی هێـزو دەسترۆیشـتووییەوە)، یـان گەلـی توببـەع و ئەوانـەی پێـش ئـەوان، کـە فەوتاندمانـن، چونکـە تاوانباربـوون؟ (کەواتـە: ژیـانی دنیـا شـاری بـێ خـاوەن نیـە، سـزاو پاداشـتی لـە دوان) ﴿٣٧﴾ ئاسـمانەکان و زەوی و ئـەوەی نێوانیشـمان (بـێ ئامانـج و حیکمـەت و) گاڵتەکارانـە دروسـت نەکـردوون ﴿٣٨﴾ تەنیـا بـە هـەق دروسـتمان کـردوون، بـەڵام زۆربەیـان نازانـن (کـە ناگونجـێ خـوا کاری بێهـوودەو پـووچ بـکات) ﴿٣٩﴾ بـە دڵنیایـی ڕۆژی لێـک هـەڵاواردن (ی چـاک و خـراپ و، لـە یـەک جیاکردنـەوەی هـەق و ناهـەق) ژوانگـەی تێکڕایانـە ﴿٤٠﴾ ڕۆژێـک کـە هیـچ دۆسـت و نیزیکێـک، هیـچ سـوودێک بـە دۆسـت و نیزیکەکـەی ناگەیەنـێ و، پشتیوانییشـیان لـێ ناکـرێ (لـە بەرانبـەر سـزای خـوادا) ﴿٤١﴾ مەگـەر کەسێک خـوا بەزەیـی پێیدابـێ، بـە ڕاسـتیی هـەر ئـەو زاڵـی بـە بەزەییـە ﴿٤٢﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(تُبَّعٍ): (تُبَّعْ: كَانُوا رُؤَسَاءَ سُمُّوا بِذَلِكَ لاتِّبَاعِ بَعْضِهِمْ بَعْضاً فِي الرِّيَاسَةِ وَالسِّيَاسَةِ، وَقِيْلَ: تُبَّع مَلِكٌ يَتْبَعُهُ قَوْمُهُ، وَالجَمْعُ: التَّبَابِعَة)، وشەی (تُبَّعْ): یان كۆیە ناوی كۆمەڵێک سەرۆکە، بۆیە وا ناونراون، چونکە لە بەرپرسیارییەتی و سەرپەرشتیاریی كۆمەڵگاكەیاندا بە دوای یەكدا هاتوون، گوتراویشە: (تُبَّعْ) ناوی حوكمڕانێک بووە، خەڵكەكەی شوێنی كەوتوون، كۆی (تُبَّعْ)، (تَبَابِعَة)یە، وەک چۆن كۆی (هِرَقْل)، (هَرَاقِلة)یەو، كۆی (كِسْرَى)، (كَيَاسِرَة)یە.

(يَوْمَ ٱلْفَصْلِ): (اليَوْمُ الَّذِي يُبَيَّنُ فيه الحَقُّ مِنَ البَاطِلِ، وَيُفْصَلُ بَيْنَ النَّاسِ بِالْحُكْمِ)، (يَوْمُ فَصْلٍ): ئەو ڕۆژەی هەق و ناهەق تێیدا لێک جیادەكرێنەوەو، دادوەریی لە نێوان خەڵكدا دەكرێ، كێ لەسەر هەق بووەو، كێ لەسەر ناهەق بووە؟ كێ چاک بووە و كێ خراپ بووە، كێ بە ڕێی چەوتداو كێ بە ڕێی ڕاستدا ڕۆیوە؟ لێک جیادەكرێنەوە.

(مِيقَٰتُهُمْ): (المِيْقَاتُ: الوَقْتُ المَضْرُوبُ لِلشَّيءِ، وَالوَعْدُ الَّذِي جُعِلَ لَهُ وَقْتٌ)، (مِيْقَات): بریتیە لە كاتێكی دیاریكراو بۆ شتێک، هەروەها بەڵێنێک كە كاتێكی بۆ دیاریكراوە، (وَالمِيْقَاتُ: المَكَانُ الَّذِي يُجْعَلُ وَقْتاً لِلشَّيءِ كَمِيْقَاتِ الحَجِّ)، (مِيْقَات): ئەو شوێنەیە كە دەكرێتە كات بۆ شتێک، وەک میقاتەكانی حەج، كە ناوی شوێنن، بەڵام بۆ كارێک كە لە كاتێكی دیاریكراودا ئەنجامدەدرێ، كە خواپەرستییەكانی حەجن.

(مَوْلًى): (الوَلَايَةُ: النُّصْرَةُ وَالوِلَايَةُ: تَوَلِّي الأَمْرِ، وَقِيْلَ الوَلَايَةُ وَالوِلَايَةُ كَالدَّلَالَةِ وَالدِّلَالَةِ وَحَقِيْقَتُهُ: تَوَلِّي الأَمْرِ، وَالوَلِيُّ وَالمَوْلَى يُسْتَعْمَلَانِ فِي ذَلِكَ، كُلُّ وَاحِدٍ مِنْهَا يُقَالُ: فِي مَعْنَى الفَاعِلِ، وَفِي مَعْنَى المَفْعُولِ، أي: المُوَالَى)، (وَلَايَةُ): بە مانای یارمەتییدان و

سەرخستنە، بەڵام (**وِلَايَةُ**)، بە مانای کار بە ئەستۆوەگرتنە، هەندێکیش گوتوویانە: (**وَلَايَةُ**)، (**وِلَايَةُ**)، وەک (**دَلَالَةِ**)و (**دِلَالَةِ**)، واتە: ڕێ پیشاندان، هەر یەک واتایان هەیە، حەقیقەتی (**وَلَايَة**)یش یان (**وِلَايَةُ**)یش ئەوەیە کە کارێک بە ئەستۆوە بگیرێ، وشەی (**وَلِيُّ**) و (**مَوْلى**)، هەم بۆ بکەر بەکاردەهێنرێن، هەم بۆ بەکار، واتە: (**مُوَالًى**)، واتە: هەم وشەی (**وَلِيٌ**) و (**مَوْلى**)، هەم بۆ حاڵەتی (**فاعل**) هەم بۆ حاڵەتی (**مفعول**)ن و دەگونجێ بڵێی: (**أنا مَوْلى فُلَان**)، من سەرپەشتیار، یان دۆست و یارمەتیدەری فلانکەسم، یان (**هُوَ مَوْلای**)، ئەو سەرپەشتیارکراو و دۆستایەتییکراوی منە، واتە: هەم بۆ حاڵەتی بکەر، هەم بۆ حاڵەتی بەرکار، بەڵام ئەوە بە پێی سیاق دەردەکەوێ، داخۆ ئەو وشەیە کام لەو دوو حاڵەتەی وەرگرتووە.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

تەوەری سەرەکیی ئەم نۆ (٩) ئایەتە، وەک لە پێناسەی ئەم دەرسەدا، گوتمان: باسی بەرپەرچدانەوەی نکووڵییلێکردنی بێبڕوایانە لە هاتنی ڕۆژی دوایی و، ڕۆژی سزاو پاداشت، خوا ﷻ پێشتر بەسەرهاتی فیرعەون و گەلەکەی، لە بەرانبەر مووسا عليه السلام و پەیامەکەیدا باسکرد، کە چۆن فیرعەون و دەست و پێوەندەکانی و، دەستەو دایەرەکەی و، گەلەکەی بە گشتیی، دژایەتیی مووسا عليه السلام و هاڕوونی برای عليه السلام و پەیامەکەیانیان کردوە، بەڵام سەرەنجامیان ئەوە بووە، کە خوا ﷻ نغرۆی کردوون و لە دەریای سووردا قڕەبڕ بوون.

کەواتە: ئێوەش بترسێن، ئەی بێبڕوایەکانی ڕۆژگاری پێغەمبەر ﷺ و، ئەی هەموو ئەو کۆمەڵگایانەی کە مرۆڤایەتییان لێ پێک دێ، تاکو دنیا بە کۆتا دێ! بترسێن لە ڕەتکردنەوەو ڕەفزکردنەوەی پەیامی خوادا، کە هەمان سەرەنجام کە کاتی خۆی فیرعەون و گەلەکەی پێوەی گیرۆدە بوون، ڕوو لە ئێوەش بکات.

ئنجا لێرە خوا ﷻ دێتەوە سەر باسی بێبڕوایەکانی ڕۆژگاری پێغەمبەر ﷺ، کە نموونەیەکن لە کۆمەڵگاکانی بەشەر، کە لە پەیامەکانی خوا لامل بوون و، لامل دەبن، دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ لَيَقُولُونَ ﴾، ئەمانە دەڵێن: ﴿ هَٰٓؤُلَآءِ ﴾، ئاماژەیە بۆ کۆمەڵێکی نیزیک، بەڵام ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ﴾، ئاماژەیە بۆ کۆمەڵێکی دوور، بە زۆریی لە قورئاندا، ﴿ هَٰٓؤُلَآءِ ﴾، بۆ کۆمەڵگای ڕۆژگاری پێغەمبەر ﷺ بەکارهێنراوە، خوا ﷻ دەفەرموێ: بێگومان ئا ئەوانە، واتە: ئەم بێبڕوایانەی ڕۆژگاری پێغەمبەر ﷺ ﴿ لَيَقُولُونَ ﴾، بە جەختکردنەوەوە دەڵێن: ﴿ إِنْ هِىَ إِلَّا مَوْتَتُنَا ٱلْأُولَىٰ ﴾، ﴿ هِىَ ﴾ یان بۆ مردن دەچێتەوە، بەپێی هەندێک بۆچوون، واتە: هیچ مردنێک نیە، جگە لە مردنی یەکەممان، (**مَا هِيَ المَوْتَة إلاَّ مَوْتَتُنَا الأوْلِي**)، یاخود: ﴿ هِىَ ﴾، (**ضَمِيْر قِصَّة وَضَمْير العَاقِبَة**)، یانی: بەسەرهات و سەرەنجامی ژیانی ئێمە، بەس بریتیە لە مردنی یەکەم، واتە: ئەو مردنەی کە دەمرین، ژیانێکی دیکەی بەدوادا دانایەت، کە دوایی مردنی دیکەی بەدوادابێ، بەڵکو هەر ئەو مردنەیەو، هەموو شتێ کۆتایی پێ دێ، وەک یەکێ لە بێبڕوایەکان، گوتوویەتی: (**أَرْحَامٌ تَدْفَعُ، وَقُبُور تَبْلَعُ**)، منداڵدان دەرداوێن و گۆڕەکانیش هەڵدەلووشن و، هەموو شتێ کۆتایی پێ دێ! ﴿ وَمَا نَحْنُ بِمُنشَرِينَ ﴾، ئێمە لە زیندوو کراوان و لە بڵاوکراوان نین، (**نَشر**)، یانی: بڵاوکردنەوە، بەڵام مەبەست پێی زیندوو کرانەوەیە، چونکە لە ڕۆژی دواییدا، دوای ئەوەی ئەو خەڵکە زیندوو دەکرێتەوە، بڵاودەبنەوە، بەو گۆڕەپان و مەیدانەدا، کە لێی کۆدەکرێنەوە.

ئنجا تەحەددا دەکەن: ﴿ فَأْتُوا۟ بِـَٔابَآئِنَآ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴾، (دەڵێن): باب و باپیرانمان بێنن، ئەگەر ئێوە لە ڕاستانن، واتە: ئەو باب و باپیرانەی کە پێش ئێمە مردوون، کوان، بۆمان بێنن، بۆچی ئەوان هیچیان لێ زیندوو نەبوونەوە؟ ئنجا ئەو تەعبیرە ڕەنگە لە زۆربەی زمانەکاندا هەبێ، دەگوترێ: کەس لە گۆڕستان نەهاتۆتەوە، بە دڵنیایی کەس لەوێ نایەتەوە، چونکە بەپێی سیستمی خوا ﷻ کە بۆ ژیانی بەشەر داینـاوەو، بۆ ئەم گەردوونە داینـاوە، ژیانی مرۆڤ قۆناغ

قۆناغـە، قۆناغێـک بـووە، هیـچ شـتێک لـە ئـارادا نەبـووە، ﴿هَلْ أَتَىٰ عَلَى ٱلْإِنسَٰنِ حِينٌ مِّنَ ٱلدَّهْرِ لَمْ يَكُن شَيْـًٔا مَّذْكُورًا ۝١﴾ **الإنسـان**، قۆناغێـک بـووە، مـرۆڤ نـاوی لـە کوولەکـەی تـەردا نەبـووە، بەڵکـو قۆناغێـک بـووە، ئـەم گەردوونـە هیچـی نەبـووە، بەپێـی نوێترین بیـردۆزەی گەردوونیـی و فیزیایـی، دەڵێـن: (١٣) ملیـارو (٧٠٠) یـان (٨٠٠) ملیـۆن (١٣,٨٠٠,٠٠٠,٠٠٠) ساڵ لەمـەو پێش، بـەر لـەوەی لـە سیگولاریتی (Singularity) یـەوە: تەقینـەوەی گـەورە، بـە زاراوەی ئـەوان: (Big Bang)، (**الإنفجـار الكبـير**)، ڕوو بـدات، هیـچ شـتێک نەبـووەو، نـە ئاسـمان و نـە زەوی و نـە مـاددە، هیـچ شـتێک بـوونی نەبـووە، هەموویـان دوای ئـەو تەقینەوەیـە پەیدابـوون، واتـە: دوای ئـەوەی خـوا ﷻ لـە نەبوونـەوە هێناویەتـە دی، دوای ئـەوە خـوا ﷻ گـەردوونی هێناوەتـە دی، ئنجـا قۆنـاغ بـە قۆنـاغ، کەهکەشـانەکان پەیدابـوون، لـە نێویانـدا کەهکەشـانی ئێمـە، (ڕێـی کا کێشـان)و لـە نێویـدا: کۆمەڵـەی خـۆر، پاشـان زەوی لـە خـۆر جیابۆتـەوە، دوایـی وردە وردە ژیـان بـە گشـتیی لەسـەر زەوی پەیدابـووە، سـەرەنجام دوای ئـەوەی ئـەم زەوییـە وای لێهاتـوە، بـە کەڵکـی ئـەوە بـێ، مرۆڤـی لەسـەر بـژی، خـوا ﷻ ئـادەم و حـەووای خوڵقانـدوون و، وەچەیـان بـە زەویـدا بڵاوبۆتـەوە، نـەک وەک بیـردۆزەی داریۆنیـزم، دەڵـێ: کـە بـە خەیاڵـی ئـەو، مرۆڤیـش هـەر لـە ئەنجامـی پەرەسـەندن و گەشەسـەندنی، ژیاندارانـەوە پەیـدا بـووە، ئـەوە وەک زانایـان باسـیان کـردوە و ئێمـە لە مەوسـووعەی: (درەوشـاوەیی ئیـمان و پووچەڵیـی ئیلحـاد، لەبـەر ڕۆشـنایی زگـماک و عەقـڵ و زانسـت و وەحیـی دا)، باسـمان کـردوە، شـتێکی پووچـەو، زانسـت و عەقـڵ و زگـماک و، لـە سـەرووی هەمووشـیانەوە وەحیـی خـوای پـەروەردگار ڕەتـی دەکەنـەوە.

کەواتــە: کــە گوتوویانــە: ﴿فَأْتُوا۟ بِـَٔابَآئِنَآ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ﴾، ئەگـەر ئێـوە لـە ڕاسـتانن بـاب و باپیرانمـان بێنـن، ئـەوە داوایەکـی بـێ جێیـە، چونکـە خـوا ﷻ کـە مرۆڤـەکان تاقیدەکاتـەوە لەسـەر زەوی، هـەر کەسـێک تاقیکردنەوەی خـۆی ئەنجامدا، لا دەچـێ، ئـەو جیلـە لادەچـێ و جیلێکـی دیکـە دێـن، ئەوانیـش تاقیکردنـەوەی خۆیـان دەدەن، جیـل لـە دوای جیـل هەمـوو مرۆڤـەکان، لـەم سـەر زەوییـە تاقـی

دەكرێنەوە، هەر كەسەو بە شێوەی خۆی، دوای تاقیكرانەوەی دەڕواو، جارێكی دیكە نایەتەوە بۆ ژیانی دنیایە، گەردوون و ژیان گاڵتەی منداڵان نیەو، سیستەمی خوایە، خوا ﷻ سیستەم (**نظام**)ی داناوە، بۆیە خوا ﷻ سێ بەڵگان دێنێتەوە، ئەوەم نەبینیوە لە تەفسیرەكاندا ئاماژەی پێكرابێ، چۆنیەتیی پەیوەست بوونی ئایەتەكانی، دوایی بەم ئایەتانەی پێشەوە، نەمبینیوە بەو شێوەیە باسكرابێ.

بەڵام وای تێدەگەم كە خوا ﷻ، سێ بەڵگان دێنێتەوە بۆ بەرپەرچدانەوەی ئەو نكووڵییكردنەی ئەوان لە زیندوو كرانەوە:

**یەكەم:** ﴿ أَهُمْ خَيْرٌ أَمْ قَوْمُ تُبَّعٍ وَٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ﴾، ئایا ئەوان باشترن، ئەو بێبڕوایانەی ڕۆژگاری پێغەمبەر ﷺ كە نكووڵیی دەكەن، لە زیندوو كرانەوەو لە هەبوونی سزاو پاداشت، ئایا ئەوان باشترن، یاخود كۆمەڵی توببەع و ئەوانەی پێش وان، خوا چی لێكردن؟ خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ أَهْلَكْنَٰهُمْ ﴾، فەوتاندمانن، قڕەبڕمانكردن، لەبەرچی؟ ﴿ إِنَّهُمْ كَانُواْ مُجْرِمِينَ ﴾، چونكە ئەوان تاوانبار بوون، جارێ كە دەفەرموێ: ﴿ أَهُمْ خَيْرٌ ﴾ ئایا، ئەوان باشتر بوون، وشەی ﴿ خَيْرٌ ﴾: یانی: باشتر بوون، بەڵام مەبەست: لە ڕووی تواناو دەسەڵات و دەستڕۆیشتوویەوەیە، ئایا ئەمان، ئەو كافرانەی ڕۆژگاری تۆ ئەی پێغەمبەر! ﷺ بە هێزترن و، بە تواناترن، دەستڕۆیشتووترن، یاخود كۆمەڵی توببەع، كە حوكمڕانێك بووە لە یەمەن، حوكمی كردوەو بێبڕوایەكانی ڕۆژگاری پێغەمبەر ﷺو، ئەوانەی شارەزای مێژوو بوون، زانیویانە، توببەع حوكمڕانێكی دەستڕۆیشتوو بووە. ﴿ وَٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ﴾، ئەوانی پێش وانیش، ئەوانەی پێش گەل و كۆمەڵی توببەعیش، ئنجا گەلی نووحە، گەلی عادە، گەلی **سەموودە**، گەلی مەدیەنە، گەلی **لووطە**، هەموو ئەو گەلانە، ئایا ئەو كافرانەی ڕۆژگاری تۆ ئەی پێغەمبەر! ﷺ بە هێزترو بە تواناترن، یاخود ئەوان؟ بە تەئكید ئەوان دەستڕۆیشتووتربوون، بۆیە دەفەرموێ: ﴿ أَهْلَكْنَٰهُمْ ﴾، ئەوانمان فەوتاند، واتە: ئەو ئیمكانییەت و تواناو دەستڕۆیشتوویيە زۆرەی هەیانبوو، ڕێگر نەبوو كە بیانفەوتێنین، بەڵام خوا ﷻ لەبەرچی فەوتاندنی؟ ﴿ إِنَّهُمْ كَانُواْ مُجْرِمِينَ ﴾، چونكە ئەوان تاوانبارو خراپەكار بوون.

کەواتـە: ئێـوەش ئەگـەر لەسـەر تاوانباریـی بـەردەوام بـن، ئـەو خوایـەی خەڵکێکی لـە ئێـوە بـە تواناتـری فەوتانـدوە، بـە هۆی ئـەو تاوانانـەوە، ئێـوەش دەفەوتێنـێ، ئنجا هـەر بـە تەماشـاکردن و تێوەڕامـانی مێـژووی بەشـەر دەزانـرێ، کـە ئـەم گەردوونـەو ئـەم ژیـانی مرۆڤـە بـێ خـاوەن نیـەو، سەرپەرشـتیارێکی هەیـە، ئەوەتـا کەسـانێک کـە لادەدەن، تـاوان دەکـەن و خراپـە دەکـەن، سـزا دەدرێـن، ئنجـا ئەمـە هـەم بـۆ کۆمـەڵ وایـە، هـەم بـۆ تـاک تاکـی خەڵکیـش هەروایـە، هـەر کەسـێ خراپـەو تاوانـێ بـکات، هـەر لـە دنیـادا، لێـی زیانبـار دەبـێ، پێـش ڕۆژی دوایـی، کەواتـە: ئـەم ژیـانی دنیایـە، خاوەنێکـی هەیـەو، سەرپەرشـتیارێکی هەیـە، دنیـا شـاری بـێ خـاوەن نیـە، بۆیـە ئـەو سەرپەرشـتیارو خـاوەنی ئـەم مرۆڤـەو ئـەم ژیانـی دنیایـە، قۆناغێکیشـی دانـاوە بـۆ ئـەوەی هەرچـی لێـرە خەڵـک دەیـکات، لـەوێ سـزا یـان پاداشـتی لەسـەر وەربگرێتـەوە.

**دووەم:** ﴿ وَمَا خَلَقْنَا ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا لَٰعِبِينَ ﴾، بەڵگەیەکی دیکەش ئەوەیە کە: ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەی نێوانیانمان، بە گاڵتەکارانە نەهێناوەنە دی، بەڵکو بە حیکمەت و بە هەق هێناومانە دی.

﴿ مَا خَلَقْنَٰهُمَآ إِلَّا بِٱلْحَقِّ ﴾، ئێمـە تەنیـا بـە هـەق و حیکمـەت، ئـەم ئاسـمان و زەوی و ئـەوەی دەکەوێتـە نێوانیـان، هێناومانـە دی، ﴿ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴾، بـەڵام زۆربەیـان نازانـن.

کەواتــە: ئەمــەش بەڵگەیەکــی دیکەیــە: مــادام گــەردوون هەمــووی بەهــەق هێندرابێتـە دی، ژیانـی بەشـەریش لـە نێـو گەردووندا، ناگونجـێ گاڵتـە جـاڕ بـێ و، ناگونجـێ مـرۆڤ، وەک بەرزەکـی بانـان بـۆی دەربچـێ، چاکـی کردبـێ یـان خراپـی کردبـێ، سـزا یـان پاداشـت وەرنەگرێتـەوە، بۆیـە دەبـێ ڕۆژی دوایـی هەبـێ و، بڵاوکرانــەوەو زیندووکرانــەوە، پاشــان ســزاو پاداشــت هەبــێ.

**سێیەم:** ﴿إِنَّ يَوْمَ ٱلْفَصْلِ مِيقَـٰتُهُمْ أَجْمَعِينَ﴾، ئەمەش بەڵگەیەکی دیکەی سێیەمە: بە دڵنیایی ڕۆژی لێک هەڵاواردن، ژوانگەی هەموویانە، واتە: ئەو ڕۆژەی کە تێیدا لێک هەڵداوێردرێن، چاکەکاران و خراپەکاران و، بڕواداران و بێبڕوایان و، ستەمکاران و ستەملێکراوان، پاشان ڕاست و چەوت، دەبێ لێک هەڵاوێردرێن و، لێک جیابکرێنەوە، ڕۆژی لێک جیاکردنەوە، ژوانگەی هەموویانە، (**مِيقَات**): بریتیە لە کاتێک بۆ کارێک دیاری کرابێ، (**الوَقْتُ المَضْرُوب للشَّيء**)، بە کوردیی دەڵێن: ژوانگە، ئنجا ژوانگە، هەم بە شوێن دەگوترێ، هەم بەکاتیش دەگوترێ، ژوانگەی بۆ داناوە، واتە: شوێنێکی دیارییکراو یاخود کاتێکی دیاریکراو، (**مَواقِيتُ الحَجّ**): ئەو شوێنانەن کە لە کاتێکی دیارییکراودا، حاجی دەبێ لەوێ ئیحرام ببەستێ، ئنجا بچێتە سەر زەمینی حەڕامەوە، بۆ جێبەجێکردنی خوا پەرستییەکانی حەج، یاخود عومرە.

کەواتە: ڕۆژێک هەیە، دەبێ پاک و پیس و، چاک و خراپ، لێک هەڵاوێردرێن و، لێک جیابکرێنەوە، ئەویش ڕۆژی دواییە.

﴿يَوْمَ لَا يُغْنِى مَوْلًى عَن مَّوْلًى شَيْـًٔا﴾، ئەو ڕۆژەی هیچ دۆست و نیزیکێک سوود بە هیچ دۆست و نزیکێک ناگەیەنێ، هیچ جۆرە سوودێک، ﴿وَلَا هُمْ يُنصَرُونَ﴾، هیچ بەڵای لە کۆڵ ناکاتەوەو، سزاو ئازاری لە کۆڵ ناکاتەوە، بگرە پشتیوانییش ناکرێن، واتە: دۆست و نیزیکەکەی لە فریای نایەت و، کەسی دیکەش نایەت، بە هانایەوە بێ و پشتی بگرێ و سەری بخات.

﴿إِلَّا مَن رَّحِمَ ٱللَّهُ﴾، ئەمە وەک زانایان دەڵێن:

**أ**- دەگونجێ هەڵاواردنێکی پەیوەست (**إِسْتِثْنَاء مُتَّصل**) بێ، واتە: هیچ دۆستێک دەفریای دۆستێکی نایەت، مەگەر کەسێک خوا بەزەیی پێیدا بێتەوەو، خوا ﷻ دۆستی بووبێ، دۆستایەتیی خوا، بە تەئکید ئەو کاتە هەموو شتێکە،

**ب**- دەشگونجێ ئەم هەڵاواردنە، هەڵاواردنێکی دابڕاو، (**إِسْتِثْنَاء مُنْقَطِع**) بێ، واتە: هیچ دۆستێک جگە لە خوا، دە فریای کەس نایەت، مەگەر کەسێ خوا بەزەیی پێیدابێ، کە

ئەو کاتە هەڵاوێردراو (**مُسْتَثْنَى**)ە، لەبەر ئەوەی جیایە لە لێهەڵاوێردراو (**مُسْتَثْنَى منه**)، ئەو کاتە هەڵاواردنەکە پێی دەگوترێ: هەڵاواردنێکی دابڕاو، کەسێک کە خوا بەزەیی پێیدابێ، بێگومان لەو ڕۆژەدا لە فریای دێ و، دەربازی دەکات، ﴿إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ﴾، بە دڵنیایی هەر ئەو (خوا) زاڵی میهرەبانە، باڵادەست و، هەمەکارەیەو میهرەبانیشە، لە فریای دۆستەکانی دێ، هەروەک دەتوانێ سزای نەیارو ناحەزەکانی و پێغەمبەرەکانی (**عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ**)و پەیامەکانیشی بدات.

# مەسەلە گرنگەکان

## مەسەلەی یەکەم:

**لافلێدانی بێبڕوایان، کە جگە لە مردنی یەکەم، هیچ شتێکی دیکە لە ئارادا نیەو، زیندوو ناکرێنەوە، ئەگەرنا با باب و باپیرانی پێشوویان بۆ بگێڕنەوە! بەرپەرچدانەوەشیان بەوەی کە گەلی توبەع و ئەوانی پێشوویان لەوانیش بەهێزترو، دەستڕۆیشتووتر بوون، بەڵام بە هۆی تاوانەکانیانەوە سزادران، کەواتە: دنیا شاری بێ خاوەن نیەو، سزاو پاداشت هەیە:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ لَيَقُولُونَ ﴿٣٤﴾ إِنْ هِىَ إِلَّا مَوْتَتُنَا ٱلْأُولَىٰ وَمَا نَحْنُ بِمُنشَرِينَ ﴿٣٥﴾ فَأْتُوا۟ بِـَٔابَآئِنَآ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٣٦﴾ أَهُمْ خَيْرٌ أَمْ قَوْمُ تُبَّعٍ وَٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۚ أَهْلَكْنَٰهُمْ ۖ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ مُجْرِمِينَ ﴿٣٧﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە شەش بڕگەدا:

١)- ﴿إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ لَيَقُولُونَ ﴿٣٤﴾ إِنْ هِىَ إِلَّا مَوْتَتُنَا ٱلْأُولَىٰ وَمَا نَحْنُ بِمُنشَرِينَ﴾، بە دڵنیایی ئەوانە دەڵێن: هیچ نیە جگە لە مردنی یەکەممان و ئێمە بڵاوکراوەو زیندووکراوە نابین، ئەوانە، واتە: هاوبەش بۆ خوادانەرە هاوچەرخەکانی پێغەمبەر ﷺ بە زۆریی لە قورئاندا وشەی: (هَؤُلَاء)، واتە: ئەو کۆمەڵە، ئەمە ناوی ئاماژەیە بۆ نیزیک، بێبڕوایانێک کە لە ڕۆژگاری پێغەمبەر ﷺ دابوون، بەڵام: (أُولَئِك)، مەگەر بە ڕەوت و نیشانە دیار بکرێ، ئەگەرنا زیاتر بۆ کۆمەڵە خەڵکێکی دوورە.

وشەی: (إِنَّ)، وەک شارەزایانی زمانی عەرەبیی، دەڵێن: (**لَيْسَ إِنَّ هُنَا لِلتَّأْكِيد لأَنَّ إِضَافَة هَذَا القَوْلِ لِلْمُشْرِكِينَ لَا تَرَدُّدَ فِيه لِكَيْ تَحْتَاجَ إِلى التَّأْكِيد، بَلْ هُوَ لمجُرَّدِ الإِهْتِمَامِ بِالخَبَر**)، (**محمد الطاهر بن عاشور**)، ئاوا دەڵێ و قسەکەشیم پێ جوانە.

واتـە: هەرچەنـدە (إنَّ) بـۆ جەختکردنەوەیـە، بـەڵام لێـرەدا بـۆ جەختکردنـەوە نیـە، چونکـە پاڵـدانی ئـەو قسـەیە بـۆ لای هاوبـەش بـۆ خـوا دانـەرەکان، هیـچ دوو دڵیـی تێدانیـە، تاکـو پێویسـتیی بـە جەختکردنـەوەو داکۆکیـی لەسـەرکردن هەبـێ، (إنَّ) لێـرەدا تەنیـا بـۆ گرنگییدانـە بـە هەواڵەکـە، واتـە: بـە گرنگیـی پێدانـەوە، دەڵێیـن و ئـەو هەواڵەتـان پـێ ڕادەگەیەنیـن، ئەگەرنـا جێـی دوو دڵیـی نەبـووە، کـە ئـەو قسـەیە دەکـەن، تاکـو پێویسـت بـکات داکۆکیـی و جەختـی لەسـەر بکـرێ.

﴿ إِنْ هِيَ إِلَّا مَوْتَتُنَا ٱلْأُولَىٰ ﴾، هیـچ نیـە، جگـە لـە مـردنی یەکەمـمان، ﴿ وَمَا نَحْنُ بِمُنشَرِينَ ﴾، ئێمـە لـە بڵاوکـراوان و لـە زینـدوو کـراوان نابیـن، یـانی: ﴿ وَمَا نَحْنُ بِمَبْعُوثِينَ ﴿٢٩﴾ ﴾**الأنعـام**، ئێمـە زینـدوو ناکرێینـەوە، وەک لـە شـوێنی دیکـەدا، ئـەو تەعبیـرە هاتـوە.

کـە دەفەرمـوێ: ﴿ إِنْ هِيَ ﴾، (إنْ)، بـە مانـای: (مَا)یـەو بـۆ لابـردن (نفـي)ە، یـانی: (مَـا هِـيَ): (هِـيَ: **ضَمِـيْرُ الشَّـأْنِ أَو ضَمِـيْر القِصَّـةِ**)، (هِـيَ) ڕانـاوی حـاڵ و بەسـەرهاتەو دەچێتـەوە بـۆ شـتێک کـە بـە سـەلیقە دەزانـرێ، یـانی: سـەرەنجام بەسـەرهاتی ئێمەو، سـەرەنجامی ئێمـە، تەنیـا مـردنی یەکەممانـە.

یاخـود (هِـيَ) بـۆ (مَوْتـة) دەچێتـەوە، یـانی: (**إنِ المَوتَـةُ إلاَّ مَوْتَتُنَا الأُوْلَى**)، مـردن تەنیا مـردنی یەکەممانـە، مەبەسـتیان ئەوەیـە مـردنی یەکـەم کـە دەمـرن، کـە مەبەسـت لـە یەکەمیـش ئـەوە نیـە، دووەمیشـی هەبـێ، واتـە: هـەر ئـەو تاکـە مردنەیـە، کـە دەمریـن، ئیـدی دوای ئـەو مردنـە هیـچ شـتێکی دیکـە لـە گۆڕێـدا نیـە، هەمـوو شـتێک کۆتایـی پێـدێ، بـەو مردنـە، وەک دەڵێـن: مـرۆڤ دەبێتـە بـەردی بـن گۆمـێ و کۆتایـی پێـدێ، ئـەوان وایـان لاف لێـداوە، ئنجـا ئایـا بەڵگەشـیان چـی بـووە؟

٢)- ﴿ فَأْتُوا۟ بِـَٔابَآئِنَآ إِن كُنتُمْ صَـٰدِقِينَ ﴾، ئەگەر ئێوە لە ڕاستانن باب و باپیرانمان بێنن، بەڵگەیان هێناوەتەوە لەسەر ئەوەی زیندووکرانەوە نیەو، بەو بەڵگەیە کە هیچ کەس لە پێش واندا نەگەڕاوەتەوەو، لە گۆڕستانەوە نەهاتۆتەوە، بڵێ: من زیندووکراومەوە!

ئنجا خوا ﷻ لێرەدا وەڵامی ئەو قسە پووچەیان ناداتەوە، چونکە هێندە پووچە، هەر خوێندنەوەی و بیستنی بەسە بۆ ئەوەی بەرپەرچ بدرێتەوە، چۆن؟ خوا ﷻ ئەم ژیانی بەشەرەو ئەم گەردوونەی بە گشتیی و، ژیانی بەشەر لە نێویدا بە تایبەتی، قۆناغ قۆناغ خولقاندوویەتی، ئنجا ئەمە وەک ئەوە وایە یەکێک بڵێ: نەخێر من لە دایکم نەبووم، دەبابچمەوە نێو منداڵدانی دایکم!! تازە ئەو قۆناغە بەسەر چووە، تۆ لە نێو منداڵدانی دایکتدا حەوت قۆناغت گوزەراندوون، **نوتفە** بووی و، **عەلەقە** بووی و، **موضغە** بووی و، چی بووی چی بووی، چەند قۆناغت گوزەراندوون، دوایی لە دایک بووی، ئێستا کە لە منداڵدانی دایکت هاتوویە دەرێ و، هاتوویە نێو ژیانی دنیا، جارێکی دیکە ناگەڕێیەوە بۆ ئەوێ، بە هەمان شێوەش مرۆڤ کە دەمرێ، دوای ئەوەی تاقیکردنەوەی خۆی دەدا، خوای پەروەردگار ڕووحەکەی لە جەستەی جیادەکاتەوە، جەستەکەی دەچێتەوە نێو خاک لە کوێ دروست بووە، دەچێتەوە ئەوێ، ڕووحەکەش دەچێتە ئەو شوێنەی کە بەس خوا ﷻ دەیزانێ لە قۆناغی بەرزەخ و، جیهانی بەرزەخدا، کە ئەگەر چاکەکار بووبێ، لە بەهەشتە، یان لە شوێنێکە وەک بەهەشتەو، ئەگەر خراپەکار بووبێ لە دۆزەخ، یان شوێنێکی وەک دۆزەخە، جارێکی دیکە ئەو ڕووح و جەستەیە پێک ناگەنەوە، لە دنیادا، بەڵکو لە قۆناغی بەرزەخیشدا پێک ناگەنەوە، تەنیا لە قۆناغی قیامەتدا، خوا ﷻ وایداناوە جارێکی دیکە ڕووح و جەستە پێک بگەنەوە، ئەویش هەر خوا دەزانێ ئەو جەستەیە، لە چ جۆرە ماددەیەک دەبێ، وەک خوا دەفەرموێ: ﴿وَنُنشِئَكُمْ فِي مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٦١﴾﴾ **الواقعة**، واتە: بە شێوەیەک دروستتان دەکەینەوە، کە ئێستا نایزانن، کەواتە: ئەم جەستە خاکییە پۆشاکێکە لە خاک دروستکراوەو، بە بەر ڕووحدا کراوەو، لە قەدەر ئەم ژیانە دنیاییە، کە (٦٠ - ٧٠) ساڵ، (٨٠ - ٩٠) ساڵە، تاکو مرۆڤ لەوێ تاقیکردنەوەی خۆی بدات، ئنجا دوای ئەوەی ئەم قۆناغە بەسەر دەچێ، ڕووح ئەم کیف و بەرگەو، ئەم پۆشاکە خاکییە دادەنێ و لەبەری ناکاتەوە تاکو ڕۆژی دوایی، کە ڕۆژی دواییش هەر خوا ﷻ دەزانێ ئەو جەستەیە، لە چ ماددەیەک دروست دەبێتەوە، گرنگ ئەوەیە لەوێ ڕووح و جەستە پێک دەگەنەوە، بۆیە خوا ﷻ وەڵامی ئەوە ناداتەوە، بەڵکو دەفەرموێ:

٣)- ﴿ أَهُمْ خَيْرٌ أَمْ قَوْمُ تُبَّعٍ وَالَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ﴾، ئایا ئەوان باشترن (لە ڕووی تواناوە) یان گەلی توببەع و ئەوانەی پێشوویان؟ لە تەفسیرەکاندا نەمبینیوە بەم شێوەیە ئاماژەی پێکرابێ، بەڵام پێم وایە، ئەمە بەڵگەی یەکەمە، دواییش کە خوا ﷻ باسی دروستبوونی گەردوون دەکات، کە گاڵتەجارانە دروستی نەکردوە، بەڵکو بە حیکمەت دروستی کردوە، پاشان کە باسی ئەوە دەکات ڕۆژی لێک هەڵاواردن هەیە، ئەمانە هەر سێکیان بەڵگەن بۆ بەرپەرچدانەوەی نکووڵییلێکردنی بێبڕوایەکان، لە هاتنی ڕۆژی دوایی و، هاتنی ڕۆژی سزاو پاداشت، سەرەتا خوا ﷻ وەک:

**بەڵگەی یەکەم:** دەفەرموێ: ﴿ أَهُمْ خَيْرٌ أَمْ قَوْمُ تُبَّعٍ ﴾، ئایا ئەوان باشترن، یاخود کۆمەڵ و خەڵکی توببەع، ﴿ وَالَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ﴾، هەروەها ئەوانەی پێش گەلی توببەعیش، کە دەفەرموێ: باشترن، واتە: باشترن لە ڕووی هێزو دەسترۆیشتوویی و تواناوە، یانی: (**هُمْ: لَيْسُوا بِأَفْضَلَ قُوَّةً وَإِمْكَانِيَاتٍ مِنْ قَوْمِ تُبَّعٍ وَالأَقْوَامِ الأُخْرَى، الَّذِيْنَ اسْتَأْصَلْنَاهُمْ بِسَبَبِ إِجْرَامِهِم**)، ئەوان ئەو خەڵکەی ڕۆژگاری تۆ، ئەو کافرانە، باشتر نین، لە کۆمەڵی توببەع و، لە کۆمەڵ و گەلانی دیکەی پێش گەلی توببەعیش، کە فەوتاندمانن، قڕەبڕو بنبڕمان کردن، چونکە تاوانباربوون، کەواتە: ئەو خەڵکەی ڕۆژگاری تۆش ئەی پێغەمبەر! ﷺ، ئەگەر لەسەر ئەو تاوان و خراپەو ستەمە بڕۆن، هەمان چارەنووس چاوەڕێیان دەکات، کەواتە: ئەم دنیایە شاری بێ خاوەن نیە، خوا ﷻ سەرپەرشتیی ئەم کەون و کائینات و گەردوونە دەکات، لە نێویدا ژیانی مرۆڤ، ئەوەتا کەسانێک کە لادەدەن و، تاوان و خراپە دەکەن، خوا سزایان دەدات، ئنجا وەک چۆن لە دنیادا سزادانێکی بەشی (جزئی) هەیەو، لێپرسینەوەو سزاو پاداشتێک هەیە، لە قۆناغێکی دیکەشدا سزاو پاداشتی پڕ بە پێست و، لێپرسینەوەی تێرو تەواو هەیە، لەسەر هەموو شتێک.

کەواتە: مادام خوا ﷻ بەسەر گەلانی ستەمکاردا بازی نەداوە، چ کۆمەڵی توببەع و، چ کۆمەڵ و گەلانی دیکە، بەڵکو بە هۆی تاوانیانەوە لە بەینی بردوون و سزای داون، ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە ئەم دنیایە شاری بێ خاوەن نیە،

خـوا ﷻ ناهێڵـێ ئـەو خەڵکـە وەک بەرزەکـی بانـان بـۆی دەربچـێ، بەڵکـو کاتێکـی دیکـەو قۆناغێکـی دیکـەی دانـاوە، بـۆ سـزادان و پاداشـت دانـەوەی مرۆڤـەکان، بـە پێـی کوفـرو خراپەکارییـان، یاخـود ئیـمان و چاکەکارییـان.

## کورتە باسێک لە بارەی گەلی توببەعەوە

بـەر لـەوەی ئـەم مەسـەلەی یەکەمـە بەجـێ بهێڵیـن، کورتـە باسـێک لـە بـارەی گـەلی توببەعـەوە دەکەیـن، لـە شـەش بڕگـەداو سەرچاوەکەشـم تەفسـیری: **(التحرير والتنويـر)**[1]ەو هەندێـک لـە زانیارییەکانـم لـەو وەرگرتـوون، هەندێکیشـیان لـە: **(الجواهـر فِي تفسـير القـرآن الكريـم)**[2]، هەندێکیشـیان لـە هەندێـک لـە تەفسـیرەکانی دیکـە.:

١- وشەی **(تُبَّع)**.: **(لَقَبٌ لِمَنْ يَمْلِكُ جَمِيعَ بِلَادِ الْيَمَنِ حِمْيَرًا وَسَبَأً، وَحَضْرَمَوْتَ، فَلَا يُطْلَقُ عَلَى الْمَلِكِ لَقَبُ تُبَّعٍ إِلَّا إِذَا مَلَكَ هَذِهِ الْمَوَاطِنَ الثَّلَاثَةَ)**، واتە:: وشەی توببەع نازناو بووە بۆ هەر کەسێک کە حوکمڕانی هەموو وڵاتی یەمەن بوو بێ، هەم حیمیەرو، هەم سەبەئو هەم حەزرەمەوت، ناوی توببەع بە هیچ حوکمڕانێک نەگوتراوە، مەگەر ئەو سێ شوێنەی لە وڵاتی یەمەن لە ژێر ڕکێفدا بووبن.

**(تُبَّـع)** کۆیەکـەی **(تَبَابِعَة)**یـە، وەک چـۆن **(كِـسْرى)**، کۆیەکـەی **(أَكَاسِرَة)**یـە، **(فِرعَوْن)** کۆیەکـەی **(فَرَاعِنَة)**یـەو، **(خَاقَـان)** کۆیەکـەی **(خَواقِـين)**ەو، **(قَيْـصَر)** کۆیەکـەی **(قَيـاصِرة)**یـە، نـاوی حوکمـڕانی یەمـەن، توببـەع بـووەو، هـی فارسـەکان **(كِسْرى)**یـان پێگوتـوەو، هـی میسـڕ **(فِرعَوْن)**یـان پێگوتـوەو، هـی تورکـەکان **(خَاقَان)**یـان پێگوتـوە، هـی ڕۆمـەکان **(قَيْصَر)**یـان پـێ گوتـوە.

---

(١ ) ج٢٥، ص٣٠٩.

(٢ ) ج٢١، ص١٧.

**٢-** لە قورئاندا دوو جار ناوی (تُبَّع) هاتوە، بەڵام هەر بە: (قَوْم تُبَّع):

**یەکەم:** لە سوورەتی (الدخان)، ئایەتی ژمارە: (٣٧)دا، هەر بە گەلی (تُبَّع)، هاتوە.

**دووەم:** لە سوورەتی (ق)، ئایەتی ژمارە: (١٥)دا، دیسان هەر بە گەلی (تُبَّع) هاتوەو، لە هەردووکیشیاندا باسی ئەوە کراوە، کە خوا ﷻ کۆمەڵ و گەلی (تُبَّع)ی فەوتاندوە.

**٣-** لە سوننەتیشدا، ئەم دوو دەقە دێنین:

**أ-** {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا أَدْرِي أَتُبَّعُ لَعِينًا كَانَ أَمْ لَا...»} **(أخرجه الحاكم: ٢١٧٤، وَقَالَ: هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ عَلَى شَرْطِ الشَّيْخَيْنِ وَلَمْ يُخَرِّجَاهُ، التعليق من تلخيص الذهبي: ٢١٧٤، صحيح على شرط البخاري ومسلم).**

واتـە: ئەبـوو هورەیـرە ﷺ دەگێڕێتـەوە، کـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرموویـەتی: نازانـم توببـەع نەفریـن لێکـراو بـووە، یـان نـا ...

واتـە: نازانـم خراپـەکار بـووە، یاخـود چاکـەکار بـووە، چونکـە خـوا ﷻ کـە زەم و سـەرزەنشـت دەکات، هـی خەڵکەکـەی و کۆمەڵگاکـەی دەکات، نـەک هـی خـۆی.

**ب-** {عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ ﷺ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: «لَا تَسُبُّوا تُبَّعًا، فَإِنَّهُ قَدْ كَانَ أَسْلَمَ»} **(أخرجه أحمد: ٢٢٩٣١، والطبراني في الصغير: ١٤١٩، وَصَحَّحَهُ الألباني في صَحِيح الجَامِع: ٧٣١٩).**

واتـە: سـەهلی کـوڕی سـەعد ﷺ دەگێڕێتەوە، کـە پێغەمبەری خـوا ﷺ فەرموویەتی: جنێـو بـە (تُبَّـع) مـەدەن، قسـەی پـێ مەڵێـن، چونکە مسـوڵمان بووە.

**٤-** لەو دوو شوێنەشدا کە خوای پەروەردگار باسی (تُبَّع)، دەکات، باسی گەلەکەی دەکات، بەڵام لە هەردووکیاندا، وا باسی دەکات کە فەوتاندوونی.

**أ-** لە سوورەتی (الدخان)دا، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ أَهُمْ خَيْرٌ أَمْ قَوْمُ تُبَّعٍ وَالَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ أَهْلَكْنَاهُمْ إِنَّهُمْ كَانُوا مُجْرِمِينَ ﴿٣٧﴾ ﴾.

ب- لە سوورەتی (ق)یشدا، خوا ﷻ ناوا باسی گەلی (تُبَّع)، دەکات، دەفەرمووێ: ﴿ كَذَّبَتْ قَبْلَهُمْ قَوْمُ نُوحٍ وَأَصْحَٰبُ ٱلرَّسِّ وَثَمُودُ ﴿١٢﴾ وَعَادٌ وَفِرْعَوْنُ وَإِخْوَٰنُ لُوطٍ ﴿١٣﴾ وَأَصْحَٰبُ ٱلْأَيْكَةِ وَقَوْمُ تُبَّعٍ كُلٌّ كَذَّبَ ٱلرُّسُلَ فَحَقَّ وَعِيدِ ﴿١٤﴾ ﴾، لە هەردوو شوێندا وەک زەمکردن و سەرزەنشتکردن و، پاشان سزادانیان باسیان کراوە، بەڵام وەک گەلەکەی و خەڵکەکەی.

بۆیە پێغەمبەر ﷺ بەپێی دەقی یەکەم، دەبێ پێشێ لێی دیار نەبووبێ، داخۆ (توببەع) چۆن بووە، بەڵام دیارە خوا ﷻ ئاگاداری کردۆتەوە کە بڕواداربووە، بە نسبەت هەموو ئەو شتانەوەش کە نادیارن، پێغەمبەری خوا ﷺ جاری وابووە بە بۆچوونی خۆی شتێکی فەرمووە، بەڵام دوایی کە خوا ئاگاداری کردۆتەوە، ئەوەی خوا ﷻ فەرموویەتی، بێگومان ئەوە هەق بووەو، تەبەنیی کردوە.

٥- لە سەرچاوەکاندا هاتوە کە (**تُبَّع**)، کە لەو دوو سوورەتەدا خوای پەروەردگار باسی کردوە، ناوی (**أسعد**) بووەو، کونیەکەی (**أبِي كَرْب**) بووە، کە دەستەڵاتێکی زۆری هەبووەو، هەموو ناوچەی عەرەبی خستۆتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە، هەروەها چۆتە مەککەو، چۆتە **یەثریب**، کە دواتر ناونراوە (**مدينة**)و، گەیشتۆتە عێراق و دەگوترێ: ئەو بووە کە شاری (**الحِيْرَة**)ی لە عێراق، بنیات ناوە.

لە هەندێک ڕیوایەتاندا هاتوە، کە چووە بۆ **یەثریب**، خەڵکەکەی کە بەرهەڵستییان کردوە، بەتەما بووە ئەو شارە بڕووخێنێ و بسووتێنێ، بەڵام گوایە هەندێ لە خاوەن کتێبەکان، کە جوولەکەکان لەوێ بوون، گوتوویانە: ئەوە مەکە، چونکە لە کتێبەکانی ئێمەدا هەیە، کە کۆتا پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ بەشەری دەنێرێ، لەم شارەدا نیشتەجێ دەبێ، ئەویش وا پێدەچێ بە پێی حەدیسەکەبێ، دەبێ بڕواداربێ و دەستی لێ پاراستوە.

٦- (**الشيخ الطنطاوي**) لە تەفسیرەکەی خۆی (**الجواهر في تفسير القرآن الكريم**)دا[1]، دەڵێ: {**وَكَانَتْ دَوْلَةُ تُبَّع فِي سَنَةِ أَلْفٍ قَبْلَ البِعْثَةِ الْمُحَمَّدِيَّة، وَقِيْلَ كَانَ فِي حُدُودِ سَبْعِ**

---

(١) ج١١، ص١٧.

مِائَةِ قَبْلَ بِعْثَةِ النَّبِيِّ ﷺ]، دەوڵەتی توببەع لە ساڵی هەزار (١٠٠٠)ی پێش ڕەوانەکرانی پێغەمبەر ﷺدا بووە و گوتراویشە: دەوری حەوتسەد (٧٠٠) ساڵ پێش ڕەوانەکران (ی پێغەمبەر) دابووە، کەواتە: لە پێش زایینیشدا بووە، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ لە ساڵی (٦١٠)ی زایینی کراوەتە پێغەمبەرو، لە: (٥٧٠) زایینی لە دایک بووە، لە ساڵی فیلدا، بەڵام توببەع (١٠٠٠) ساڵ یان حەوتسەد ساڵ پێش ئەوەی پێغەمبەر ﷺ بکرێتە پێغەمبەر، واتە: نزیکەی (٤٠٠) یان لانی کەم (١٠٠) ساڵ پێش ئەوەی عیساش عليه السلامش لە دایک بێ، ئەو حوکمڕانیی کردوە لە یەمەندا، ئنجا هەر (**طنطاوي**)، دەڵێ: بزانە کە پادشاو حوکمڕانەکانی (**حمِير**) دوو چین بوون:

**چینـی یەکەمیـان**: حوکمڕانـەکانی: (**سـبأ**) و (**ریـدان**) بـوون، کـە لـە سـاڵی (١١٥)ی پێـش زاییـن، تاکـو سـاڵی (٢٧٥)ی دوای زاییـن حوکمیـان کـردوە.

**چینــی دووەمیــان**: حوکمڕانــەکانی: (**ســبأ وریــدان وحضرمــوت وشــحر**)و غەیــری ئەوانـەش بـوون، کـە لـە سـاڵی (٢٧٥)ی دوای زاییـن، تاکـو سـاڵی (٥٢٥)ی دوای زاییـن حوکمڕانییـان کـردوە.

دوا حوکمــڕانی حوکمڕانــەکانی (ســبأ)، یــان حوکمڕانــەکانی یەمــەن، (**ذو نَــوَاس**) بـووە، ئـەوەی کـە لـە ئایەتەکـە وەردەگیـرێ، ئەوەیـە کـە توببـەع دەبـێ دەربـازو سـەرفراز بووبـێ، بـەڵام خـوا ﷻ خەڵکەکـەی و کۆمەڵگایەکـەی فەوتانـدوە، چونکـە وا پێدەچـێ، یـان لێـی هەڵگەڕاونـەوە، یـان لەگەڵـی نەبـوون، یـان بـە هەر شـێوەیەک لە شـێوەکان، ئـەوان تاوانبـار بـوون، بـەڵام هـەم بەپێـی فەرمایشـتەکەی پێغەمبـەر ﷺو بـە پێـی ئایەتەکانیـش، کـە خـوا ﷻ باسـی گەلەکـەی دەکات، وەک چـۆن دەفەرمـوێ: گـەلی نووحـمان فەوتانـدو، گـەلی هوودمـان فەوتانـدو، گـەلی صاڵحـمان فەوتانـد، بەڵام بـە تەئکیـد نـووح و، هـوودو، صاڵـح دەربـاز بـوون، وا پێدەچـێ توببەعیـش بـۆ خـۆی قوتـار بووبـێ، بـەڵام خەڵکەکـەی تاوانبـارو خراپـەکار بـوون و، وەک گـەلانی دیکـە فەوتێـنراون.

### مەسەلەی دووەم:

**خـوای زانـاو کارزان، ئاسـمانەکان و زەوی و ئـەوەی دەکەوێتـە نێوانیانـەوە، بـە گاڵتـەو بـێ حیکمـەت و بـێ ئامانـج دروسـت نەکـردون، بەڵکـو تەنیـا بـە هـەق ئـەم گەردوونـەی وەدیهێنـاوە، بـەڵام زۆربـەی خەڵکـی ئـەو هـەق و حیکمەتـە نازانـن، یاخـود نازانـن کـە خـوا ﷻ لێـی ناوەشـێتەوە کاری بـێ حیکمـەت و، بـێ ئامانـج و هەوەنتـە بـکات:**

**بەڵگەی دووەم:** لەسەر زیندووکرانەوە و سزا و پاداشت:

خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ وَمَا خَلَقْنَا ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا لَٰعِبِينَ ﴿٣٨﴾ مَا خَلَقْنَٰهُمَآ إِلَّا بِٱلْحَقِّ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٣٩﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە لە سێ بڕگەدا:

١)- ﴿ وَمَا خَلَقْنَا ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا لَٰعِبِينَ ﴾، ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەی نێوانیانمان گاڵتەکەرانە نەهێناونە دی.

٢)- ﴿مَا خَلَقْنَٰهُمَآ إِلَّا بِٱلْحَقِّ ﴾، تەنیا بە هەق هێناومانە دی، وشەی (حق)، وەک لە سەرەتای تەفسیری سووڕەتی **(الزمر)**دا، گوتوومانە: لە ئەصڵدا بە مانای: دامەزراوو چەسپاوو نەلەخشاوە، بەڵام بە پێی ئەو سیاقانەی تێیاندا دێ، مانایەکەی دەگۆڕێ، جاری وا هەیە بە مانای حیکمەتەو، جاری وایە بە مانای دادگەرییەو، جاری وایە بە مانای شتی ڕاستە، لە بەرانبەر شتی ناڕاستدا، بەو شێوەیە بە پێی ئەو سیاقانەی کە وشەکە تێیاندا دێ، مانایەکەی دیاریی دەکرێ، هەر وەک چۆن وشەی (**فِتْنَة**) بە چەند واتایەک دێ، بەڵام سیاقەکە دیاریی دەکات، کام واتایەی مەبەستە، خوا ﷻ دەفەرموێ: ئێمە ئاسمانەکان و زەویمان، تەنیا بە هەق هێناونە دی، ئەو هەقەش خوا ﷻ لە سووڕەتی **(الجاثية)**دا، ڕوونی کردۆتەوە، بریتیە لەچی؟ دەفەرموێ: ﴿ وَخَلَقَ ٱللَّهُ

ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ بِٱلۡحَقِّ وَلِتُجۡزَىٰ كُلُّ نَفۡسِۢ بِمَا كَسَبَتۡ وَهُمۡ لَا يُظۡلَمُونَ ﴿٢٢﴾ ﴾الجاثية، واتە: خوا ئاسمانەکان و زەوی بە هەق هێناونە دی و، بۆ ئەوەی هەر کەسە بە پێی ئەوەی کردوویەتی، سزا یان پاداشتی بدرێتەوەو، ستەمیان لێ ناکرێ.

کەواتـە: هەقەکـە لـەوەدا بەرجەسـتە دەبـێ، کـە مرۆڤـەکان تاقیدەکرێنـەوەو، دوایی سـزاو پاداشـت دەدرێنـەوە، یـان بـە لای کەمـەوە تاقیکرانـەوەو بەرانبـەر درانـەوەی مـرۆڤ، بەشـێکە لـەو هەقـە، کـە خـوا گـەردوونی بـۆ چەسـپاندنی هێناوەتـە دی.

٣)- ﴿وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَهُمۡ لَا يَعۡلَمُونَ ﴾، بەڵام زۆربەیان نازانن، یانی: زۆربەیان ئەو ڕاستییە نازانن، کە خوا ﷻ ناگونجێ هیچ کارێک بەبێ حیکمەت و بە گاڵتەو هەوەنتە ئەنجام بدات، مرۆڤ دەگونجێ وا بکات، بەڵام خوا ﷻ پاک و دوورو بەرییە لە هەرچی نوقسانیی و کەم و کوڕییە، خوای بەرز بەهەرچی سیفەتی بەرزو پەسەندو چاک و جوانە، ڕازاوەیە، (**سَبْحَان الله**): (خوا بە پاک دەگرم)، یان (خوا پاک و بێگەردە)، تەعبیر دەکات لە بێ هەڵەیی و بێ پەڵەیی و بێ کەم و کوڕیی خوا، (**الحَمْد لله**) (ستاییش بۆ خوا)، تەعبیر دەکات لە خاوەندارێتیی خوا ﷻ بۆ هەرچی ناوو سیفەتی بەرزو پەسەندو چاکە، بۆیە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {**سُبْحَانَ اللهِ، وَالْحَمْدُ للهِ، تَمْلَآنِ**[1]}، گوتنی: (**سُبْحَانَ اللهِ، وَالحَمْدُللهِ**)، پڕ دەکەن، واتە: نێوان ئاسمان و زەوی پڕ دەکەن لە پاداشت، ئەگەر مرۆڤ بە عەقڵ و دڵ و بە ئاگا لێ بوونەوە، بیانڵێ، ئەم دوو وشەیە زۆر گەورەن.

شـایانی باسـە: ئێمـە لـە تەفسـیری سـوورەتی (**یونـس**)دا، لـە کاتی توێژینـەوەی ئایەتی ژمـارە (٥)دا باسـێکی تێـرو تەسـەلمان، لـە بارەی ئـەم بابەتـەوە کردوە و دەرمانخسـتوە کـە لـە دەوری پـازدە (١٥) شـوێندا، خـوا ﷻ ئـەو ڕاسـتییەی دووبـارە کردۆتـەوەو دووپاتکردۆتـەوە و جەختـی لەسـەر کردۆتـەوە کـە خـوا ئاسـمانەکان و زەوی، بـە

(١) {عَنْ أَبِي مَالِكٍ الْأَشْعَرِيِّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «الطُّهُورُ شَطْرُ الْإِيمَانِ، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ تَمْلَأُ الْمِيزَانَ، وَسُبْحَانَ اللهِ وَالْحَمْدُ لِلَّهِ تَمْلَآنِ، «أَوْ تَمْلَأُ» مَا بَيْنَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ، وَالصَّلَاةُ نُورٌ، وَالصَّدَقَةُ بُرْهَانٌ وَالصَّبْرُ ضِيَاءٌ، وَالْقُرْآنُ حُجَّةٌ لَكَ أَوْ عَلَيْكَ، كُلُّ النَّاسِ يَغْدُو فَبَايِعٌ نَفْسَهُ فَمُعْتِقُهَا أَوْ مُوبِقُهَا} (أخرجه أحمد: ٢٢٩٥٣، ومسلم: ٢٢٣، والترمذي: ٣٥١٧، وقال: صحيح.

گاڵتـەو، بـێ حیکمـەت نەخوڵقانـدوون، بەڵکـو بـە هـەق و بـۆ چەسـپاندنی هـەق هێناونیـە دی، بۆیـە کەسـێک بیـەوێ درێـژەو وردەکاریـی ئـەم بابەتـە بزانـێ، دەبـێ بگەڕێتـەوە بـۆ ئـەوێ، لێرەدا ئـەوەی گرنگـە بزانـرێ، ئەوەیـە کـە خـوا گەردوونـی بـە هـەق و حیکمـەت هێناوەتـەدی، ئەمـەش بەڵگـەی دووەمـە بـۆ بەرپەرچدانـەوەی قسـەی کافـرەکان کـە نکوولّییـان کـردوە لـە هەبـوونی ڕۆژی زیندووکرانـەوەو، سـزاو پاداشـت درانـەوە.

ئـەوەی پێشـێ خـوا ﷻ سـەرنجی بـۆ مێـژوو ڕاکێشـان، واتـە: ئەگـەر تەماشـای مێـژووی بەشـەر بکـەن، دەزانـن کە دنیا شـاری بـێ خاوەن نیـە، گەلی توببـەع و گەلان و کۆمەڵگاکانی پێـش گـەلی توببەعیـش کـە بـە هـۆی تاوانکاریـی و خراپەکارییانـەوە، خـوا فەوتاندوونـی و بنەبـڕی کـردوون، کەواتـە: خـوا ﷻ سەرپەرشـتیی ژیـانی بەشـەر دەکات، ئەوەتـا کەسـێک لابـداو، تـاوان بـکات و خراپـە بـکات، سـزای خـوا بـۆی لـە بۆسـەدایە، بۆیـە بزانـن کـە دەبـێ قۆناغێکـی دیکـە هەبـێ، ئەوانـەی لـە دنیـادا نەگونجـاوە پاداشـت بدرێنـەوە لەسـەر چاکەکانیـان، یـان لەسـەر خراپەکانیـان سـزا بدرێـن، دەبـێ قۆناغێکـی دیکـە هەبـێ، سـزاو پاداشـتی تێدابـێ، ئەگـەر تەماشـای ژیـانی بەشـەر بکەیـن، ئـەو ئەنجامگیرییەمـان دێتـە دەسـت.

پاشـان ئەگـەر تەماشـای گەردوونیـش بکەیـن، کـە خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: بـە گاڵتـەو بـە هەوەنتـە نەمانخوڵقانـدوە، بەڵکـو بـە هـەق دروسـتمانکردوە، دەبینیـن ئامانجـی لـە پشـتەوەیەو، هیـچ شـتێ نیـە، لـەم گەردوونـەدا حیکمـەت و ئامانجێکـی لـە پشـتەوە نەبـێ، ئـەدی کـۆی گـەردوون چـۆن بـێ حیکمەتـە؟! وەک لـە کتێبـی یەکەمـی مەوسـووعەی: (**الإسـلام كـما يتجـلى في كتـاب اللـه**)، بـە ناونیشـانی: (**الإسـلام معرفـة صحيحـة بالخَالـق والخلـق**)، لـە بەشـی دووەمـدا کـە باسـی گەردوونـم کـردوەو، باسـی ئـەوەم کـردوە کـە، هەمـوو شـتێک لـە گەردوونـدا بـەو پـەڕی وردەکاریـی و لێزانیـی و کارامەییـەوە دروسـتکراوەو، کـۆی گەردوونیـش بـە هەمـان شـێوە[1].

---

(١) هەروەهـا لـە کتێبـی پێنجەمـی مەوسـووعەی: (بـەرەو باشـتر تێگەیشـتن و پێگەیشـتن)، بـە

کەواتـە: هەمـوو شـتێ ئامانجێکی لە پشـتەو، کـۆی گەردوونیش ئامانـج و حیکمەتێکی لـە پشـتە، ئەمـەش بەڵگەیەکـی دیکەیە، کـە دەبێ ڕۆژی سـزاو پاداشـت هەبێ.

## وتووێژێکی نێوان سوکڕات و ئەڕستۆدیمۆس

هەرچەنـدە ئێمـە هـەم لە تەفسـیری سـوورەتی (**یونس**)دا، لـە بـارەی گەردوونەوەو لـە بـارەی خـۆرو زەوی و مانگـەوە دواویـن و، لـە سـەرەتای سـوورەتی (**المؤمنون**)دا، لە بـارەی دروسـت بـوونی مرۆڤـەوە قسـەمان کـردوە، لـە ڕووی زانسـتیی و عەقڵییـەوە، بـەڵام لێـرەدا بـە باشـم زانی ئـەم وتوێـژەی نێـوان (سـوقڕات) (ئەڕسـتۆ دیمـۆس) کـە هەردووکیـان دوو فەیلەسـووفی یۆنانییـن، بهێنـم، سـوقڕات دیـارە خوانـاس بـووەو، (ئەڕسـتۆ دیمـۆس) وا پێدەچـێ پێـش دەسـت پێکـردنی دیالـۆگ و وتوێژەکـە، مولحیـد بووبـێ و، بـڕوای بـە هیـچ نەبووبـێ، پێـم چـاک بـوو ئـەو وتوێـژە نەقـڵ کـەم، بـەڵام ڕێـک مانـا کوردییەکـەی دێنـم و، دەقـە عەرەبیەکـەی ناخوێنمـەوە، چونکـە زۆرە، لـە تەفسـیری: (**الجواهـر في تفسير القـرآن الكريـم**)[1]ەوە دەیهێنـم:

دەڵـێ: سـوقڕات زانی کە ئەڕسـتۆ دیمـۆس قوربانییان سـەرنابڕێ و، کاروبـارە دینییەکان بـە سـووک تەماشـا دەکات و، گاڵتـەش بـە کەسـێک دەکات کـە گرنگیـی بـە خواپەرسـتیی دەدات، بۆیـە سـوقڕات بـە ئەڕسـتۆ دیمۆسـی گـوت: ئایـا لـە نێـو خەڵکیـدا کـەس هەیـە، کـە تـۆ سەرسـام بـی بـە پیشـەکەی، شـتێکی کردبـێ و پێـی سەرسـام بی؟

---

ناوونیشـانی: (پایەکانـی بووناسـیی و ڕوونکردنـەوەی ئیـمان)دا ئـەو بابەتەمـان توێژیوەتـەوەو، کتێبـی ناوبراویـش پوختـەو گـوشراوی هـەردووک کتێبـی یەکـەم و دووەمـی مەوسـووعەی: (الإسـلام كـما يتجلـى في كتـاب الله)یـە .

(١) الجواهـر في تفسير القـرآن الكريـم، الْمُشْـتَمِلِ عَـلَى عَجَائِـبِ بَدَائِـعِ الْمُكَوَّنَـات، وَغَرَائِـبِ الآيَـاتِ البَاهِـرَات، الْمُسَـمَّى تَفْسِـيْرُ الطَّنْطَـاوِي جَوْهَـرِي، تأليف الأسْـتَاذ الحَكِيْم الشَـيْخ: الطَنْطَـاوي جَوْهَرِي المـصري، ج١١، ص٣٧ و ٣٨.

ئەرستۆ دیمۆس گوتی: بەڵێ، باسی شاعیرەکان و باسی وێنەکێشەکانی کرد، کە هەیانە یەکێکیان لەوەی دیکە دەست ڕەنگینترەو کارامەترە.

سوقڕات پێیگوت: لە لای تۆ کامیان پێگەی بەرزترە، ئایا کەسێک کە ئەو پەیکەرانە، دروست دەکات، کە هیچ جووڵەیان نیە، عەقڵ و هۆشیان نیە، یاخود کەسێک کە ئەو پەیکەرانە دروست دەکات، کە زیندوون و جووڵەیان هەیە؟

ئەرستۆ دیمۆس گوتی: بە تەئکید ئەوەی کە پەیکەرە زیندووە جووڵاوەکان دروست دەکات، ئەوە زیاتر بە لای منەوە پێگەی بەرزترە، بەڵام مەگەر ئەو پەیکەرو کەلەشانە بە هۆی ڕێکەوت و بەهۆی هەڵکەوتەوە هاتبنە دی، نەک بە هۆی عەقڵەوەو، کاری عەقڵ نەبن و کاری ڕێکەوت بن!

سوقڕات پێیگوت: ئەگەر گریمان هەندێک شتمان دانان کە ئامانج و مەبەستیان تێدا نابینرێ و، هەندێک شتی دیکەشمان دانان کە سوودو ئامانجیان تێدا ببینرێ، ئایا قسەت لە بارەی ئەو شتانەوە چییە؟ کامیان پێت وایە کاری عەقڵەو، کاری پڕ وردەکارییە؟

ئەرستۆ دیمۆس گوتی: بێگومان ئەوەی کە ئامانجەکەی تێدا دیارەو، سوودی تێدا دیارە، لە کاری عەقڵەو، ئەوە وردەکاریی تێدا ڕەچاو کراوە.

سوقڕات پێی گوت: ئایا نابینی کە دروستکەری مرۆڤ، هەر لە سەرەتاوە ئەو ئەندامانەو، ئەو هەستانەی بۆ ڕەخساندوون و، لەو ئەندامانەیدا سوودی ئاشکرا دیارە، بۆ وێنە: دوو چاوی پێداون، دوو گوێی پێداون، تاکو بەچاوان ببینێ و بە گوێیەکان ببیستێ، ئەوەی کە سوودی هەیە بۆ ژیانی دابینی بکات، پاشان ئایا سوودی ئەو بۆنانە چییە، ئەو بۆنانەی هەن؟ ئەگەر مرۆڤ لووتی نەبووایە، مەلاشووی نەبووایە پێی بۆن بکات، دوایی چۆن تامەکانمان دەزانین و، جیاوازییمان دەکرد لە نێوان شیرین و تاڵ و مزردا، ئەگەر زمانێکمان نەبووایە پێی بچێژین، ئنجا چاوەکەمان لەبەر ئەوەی ئەگەری هەیە تووشی

گرفت و کێشە ببێ، نابینی چۆن دەستەڵاتی خوایی گرنگیی پێداوە، پێڵووی بۆ دروستکردوون، پێڵووەکان وەک دەرگا وان، تاکو ڕێگە بگرێ لەوەی کە تووشی چاو دێ، وەختێک مەترسییەک بەرەو چاو هات، چاو بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکیی لە مێشکەوە فەرمانی بۆ دێ و، پێڵوەکان دادەخات، هەروەها برژانگی هەن، کە وەک بێژینگ وان کە لە زیانی باو تەپ و تۆز بیپارێزێ، ئنجا لە بارەی ئامێری بیستنەوە کە ئەو هەموو دەنگانە، پێشوازیی دەکات، کەچی هەر پڕیش نابێ، چی دەڵێی؟

دوایی تەماشاناکەی هەم مرۆڤ و هەم ژیاندارانی دیکە، چۆن ددانەکانیان ڕیزکراون، ددانەکانی پێشەوە بۆ ئەوەی شتیان پێ ببڕێ، دوایی حەواڵەی خرێنەکان دەکرێ، بۆ ئەوەی وردی بکەن و بیهاڕن، ئەگەر لە ڕیزبەندیی ئەوانە ورد ببیەوە، ئایا دەتوانی بڵێی: ئەوانە کاری ڕێکەوتن یان کاری عەقڵن؟!

ئەڕستۆ دیمۆس گوتی: بەڵێ ئەگەر بیر لەوانە بکەینەوە، دوو دڵ نابین کە لە کاری دروستکەرێکی کارزان و، زۆر مشوورخۆرن بۆ دروستکراوەکانی.

سوقرات پێی گوت: سەرنج بدە! چۆن نێرینەکان، (واتە: لە مرۆڤ و ئاژەڵ و هەرچی ژیاندارە)، چۆن پێیان خۆشە وەچەیان ببێ و، سەرنج بدە مێینەکان چۆن خوای بەدیهێنەر وای ڕاهێناون کە سۆزو بەزەییان هەبێ بۆ بەچکەکانیان، کە ئەوە لە هەموو ژیاندارێکدا داندراوە، ئەو هەستەی تامەزرۆیە بۆ ژیان و ڕقی لە مردنە، ئایا ئەمە هەمووی مشوورخۆریی بەدیهێنەر نیە، بۆ ئەوەی دروستکراوەکانی بمێننەوەو خۆیان بپارێزن؟ ئنجا ئەگەر تۆ دڵنیای کە عەقڵ هەیە، لە تۆدا، ئەدی چۆن گومان دەبەی کە عەقڵ نیە، لە دەرەوەی تۆ، لە حاڵێکدا کە تۆ کاتێ بیر لە فراوانیی زەوی دەکەیەوەو، جەستەی خۆت لەگەڵ زەویدا بەراورد دەکەی، بۆت دەردەکەوێ کە تۆ لە پانتایی زەویدا، قەبارەیەکی بچووکت هەیە، بەشێکی زۆر بچووک و کەمت هەیە، هەروەها ئەگەر ئەو ئاوو

تەرایيـەی کـە لـە جەسـتەی تـۆدا هەیـە، بـەراوردی بکـەی لەگـەڵ ئـەو تەرایـی و ئـاوەی کـە لـە سـەر گـۆی زەوی هەیـە، تەماشـا دەکـەی بەشـێکی زۆر بچـووک بـە تـۆ بـڕاوە، هەروەهـا هەرچـی لـە جەسـتەی تـۆدا هەیـە، لـەو پێکهاتانـە، ئەگـەر بـەراوردی بکـەی، لەگـەڵ پێکهاتـەکانی دیکـەی کـە لـە زەویـدا هـەن، تـۆ بەشـێکی زۆر کەمـت پـێ بـڕاوە، ئـەدی چـۆن پێـت، وایـە لـەم جیهانـەدا تەنیـا تـۆ عەقڵـت هەیـەو ئـەو جیهانـە فراوانـە عەقڵێکـی تێدانیـە،( ئـەو مەبەسـتی ئـەوە بـووە خوایەک ﷻ کـە بەڕێـوەی بـەرێ)، چـۆن ئـەو هەمـوو دروسـتکراوانەی کـە ناژمێردرێـن و، ئـەو سیسـتمە نـاوازەی تێیانـدا هەیـە، چـۆن لـە عەقڵێکـەوەو لـە زانیارییەکـەوە سـەرچاوەی نەگرتـوە؟!

ئەرِستۆ دیمـۆس گـوتی: نـا سـوێند بـە خـوا، بـەڵام ئایـا بۆچـی خـاوەنی ئـەو شـتە سەرسـووڕهێنەرانە، نابینـم، وەک چـۆن خـاوەنی پەیکـەرەکان و، وێنـەو دیمەنـە دروسـتکراوەکان دەبینـم؟ (واتـە: بۆچـی پەیکـەر تاشـەکان و، وێنـە کێشـەکان دەبینم، بـەڵام خـاوەنی ئـەو هەمـوو شـتە سەرسـوڕهێنەرانە، کـە خوایـە، نابینـم)؟!

سـوقڕات پێیگـوت: تـۆ ڕووحـی خـۆت کـە سەرپەرشـتیی جەسـتەت دەکات، نابینـی، ئنجـا لەبـەر ئـەوەی ڕووحەکـەت نابینـی، ئایـا دەبـێ ئـەوە وات لـێ بـکات، بڵێـی: کـردەوەکانی مـن لـە ڕێکەوتـەوەو لـە هەڵکەوتـەوە پەیـدا بـوون، نـەک لـە عەقڵێکـەوە؟

ئەرِسـتۆ دیمـۆس گـوتی: مـن پەرسـتراوو، خـوا بـە کـەم ناگـرم، بـەڵام پێـم وایـە لـەوە بەرزتـرە کـە پێویسـتیی بـە پەرسـتنی مـن بـێ، (لـەوە مەزنـترەو لـەوە بەرزتـرە، پێویسـتیی بـەوە بـێ کـە مـن بەندایەتیـی بـۆ بکـەم).

سـوقڕات پێیگـوت: ئەگـەر خـوا لـەوە بەرزتـر نەبـێ، کـە خـەم لـە تـۆ بخـوات، (واتـە: هەرچەنـدە زۆر بـەرزە، بـەڵام خەمـی لـێ خـواردووی)، کەواتـە: لەسـەرت پێویسـتە کـە ڕێـزی بگـری، (واتـە: بەندایەتیـی بـۆ بکـەی).

(هەڵبەتــە قســەکەی ســوقڕات زۆر جوانــە، دەڵــێ: خــوا زۆر زۆر بــەرزە، بــەڵام لەگـەڵ ئـەو هەمـوو بەرزیـی و مەزنییەشـیدا، خەمـی لـە تـۆ خـواردوەو، ئـەو وردە شـتانەی بـۆ تـۆ فەڕاهـەم هێنـاون، چ لـە ڕووی جەسـتەیی و، چ لـە ڕووی ژیـان و گوزەرانتـەوە، کەواتـە: کـە هێنـدە بـەرزەو ئـاوا مشـووری لـێ خـواردووی، پێویسـتە ڕێـزی بگـری و بەندایەتیـی بـۆ بکـەی!)

دوایــی ســوقڕات پێیگــوت: بزانــە ئــەی خۆشەویســتەکەم! کــە ڕووحــت هەتــا لــە نێــو جەســتەتدا بــێ، جەســتەت بەڕێــوە دەبــات، بۆیــە پێویســتە بــڕوات وابــێ کــە ئــەو حیکمەتــەی ئــەو گەردوونــە بەڕێــوە دەبــات، ئەویــش ئــاگای لــە موڵــک و دروســتکراوانی خۆیــەتی، ئایــا پێــت وایــە چــاوت ئــەو شــتانە دەبینــێ کــە لێشــت دوورن، بــەڵام دیتنــی خــوا ﷻ ناتوانــێ کــە دەوری هەمــوو شــتەکانی خــۆی بــدات.

واتــە: مــادام تــۆ بــە چــاوی خــۆت هەمــوو پێداویســتییەکانی خــۆت دەبینــی، کەواتــە: ئــەو کەســەو، ئــەو زاتــەش، کــە ئــەم گەردوونــەی ڕەخســاندوە، ئــاگای لــە هەمــوو شــتێکیەتی.

هەڵبەتـە ئـەوە قسـەی سـوقڕات بـووە، کـە تەنیـا لـە ڕووی عەقـڵ و تێگەیشـتنێک کـە خـوا بـە مرۆڤـەکانی داوە، باسـی خـوای پـەروەردگاری کـردوە، ئەگەرنـا بابەتـی خواناسـیی یەکجـار فـراوان و قووڵـە.

### مەسەلە سێیەم و کۆتایی:

**دەبێ ڕۆژێک هەبێ پاک و پیس و، ڕاست و چەوت، لە یەک جیاببنەوە، کە لەو ڕۆژەدا مەگەر کەسێک خوا بەزەیی پێیدابێ، ئەگەرنا هیچ کەس دادی هیچ کەس نادات:**

**بەڵگەی سێیەم:** لەسەر زیندووکردنەوەو سزا و پاداشت:

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿إِنَّ يَوْمَ الْفَصْلِ مِيقَاتُهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٤٠﴾ يَوْمَ لَا يُغْنِي مَوْلًى عَن مَّوْلًى شَيْئًا وَلَا هُمْ يُنصَرُونَ ﴿٤١﴾ إِلَّا مَن رَّحِمَ اللَّهُ إِنَّهُ هُوَ الْعَزِيزُ الرَّحِيمُ ﴿٤٢﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە پێنج بڕگەدا:

١)- ﴿إِنَّ يَوْمَ الْفَصْلِ مِيقَاتُهُمْ أَجْمَعِينَ﴾، بە دڵنیایی ڕۆژی لێک هەڵاواردن و، ڕۆژی لێک جیاکردنەوە، ژوانگەی تێکڕایانە، (وَيَوْمَ الْفَصْلِ: **هُوَ يَوْمُ الْحُكْمِ، لِأَنَّهُ يُفْصَلُ فِيهِ الْحَقُّ مِنَ الْبَاطِلِ، وَالْمِيقَاتُ: اسْمُ زَمَانِ التَّوْقِيتِ، أَيِ: التَّأْجِيلِ**)، کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ يَوْمَ الْفَصْلِ﴾، بە دڵنیایی ڕۆژی لێک جیاکردنەوە، واتە: ڕۆژی دادوەریی کردن، کە دادوەریی دەکرێ لە نێوان هەق و ناهەقدا، ئەو کەسەی هەقی بەدەستەو، ئەو کەسەی لەسەر ناهەقە، لێک جیادەبنەوە، ڕاست و چەوت، لێک جیادەبنەوە، وشەی (**مِيقَات**): ناوە بۆ کاتێک کە دیاریی کراوە و دانراوە بۆ شتێک، ئنجا ڕۆژی لێک هەڵاواردن، ئەو ژوانگەیە کە بۆ تێکڕایان داندراوە، تێکڕای مرۆڤەکان، کە لەوێدا لە دادوەرییان لە نێواندا بکرێ و، هەق و ناهەق لێک جیابکرێنەوە:

٢)- ﴿يَوْمَ لَا يُغْنِي مَوْلًى عَن مَّوْلًى شَيْئًا﴾، ئەو ڕۆژەی هیچ دۆست و نیزیکێک، سوود بە هیچ دۆست و نیزیکێک ناگەیەنێ، وشەی: (**مَوْلَى**): وەک پێشتر گوتمان: بە چەند واتایەک هاتوە،: (**الْقَرِيْب، الحَلِيْف، النَّاصِر**)، نیزیک و، هاوپەیمان و، پشتیوان، لە ئەصڵدا وشەی (**مَوْلَى**) لە (**وَلِي**)یەوە هاتوە، (**الوَلِيُ القُرْب**) واتە: نیزیکیی، ئنجا هەم (**وَلِيّ**) لە (**وَلِي**)

دروست دەکرێ و، هەم (مَوْلَى)شی لێ دروست دەکرێ، واتە: هیچ دۆست و پشتیوانێک هیچ سوودێک بە هیچ دۆست و پشتیوانێک ناگەیەنێ.

٣)- ﴿وَلَا هُمْ يُنصَرُونَ﴾، ئەوان یارمەتییش نادرێن، سەریش ناخرێن، چونکە جاری وایە مرۆڤ دۆست و پشتیوانێکی دێت، کارەکەی بۆ دەکات، جاری وایە نەخێر دۆست و پشتیوانەکەی و، سەرپەرشتییارەکەی نایەت، بەڵام کەسێکی دیکە دێ، هاوکاریی دەکات، ئنجا خوا ﷻ دەفەرموێ: ئەوانە نە دۆست و پشتیوانیان، سوودیان پێدەگەیەنێ، نە هیچ کەسیش لە فریایان دێ، هەر تۆزە هاوکارییەکیان بکات، واتە: (مَوْلَى) دۆست و نیزیک و سەرپەرشتیاری ئەو کەسەیە، کە بەردەوام هاوکاریی مرۆڤ دەکات، بەڵام (ناصر) ئەو کەسەیە بە شێوەیەکی کاتیی بۆ جارێک لە جاران دێت، سەری دەخات و پشتی دەگرێ، ئنجا ئەوانە نە مشوورخۆرێکی بەردەوامیان هەیەو، نە سەرخەرێکی کاتیی و چاکیشیان هەیە.

٤)- ﴿إِلَّا مَن رَّحِمَ ٱللَّهُ﴾، مەگەر کەسێک خوا بەزەیی پێیدا هاتبێتەوە، پێشتریش گوتمان: ئەمە دەگونجێ بڵێین:

أ- هەڵاواردنێکی پەیوەست، (إِسْتِثْنَاءٌ مُتَّصِل)ە، واتە: مەگەر ئەوەی خوا بەزەیی پێیدابێتەوە، لە دۆست و نیزیکەکان، ئەوە خوا مۆڵەت دەدا، تکا بکات، هەروەها مۆڵەتیش دەدا، تکابۆکراو تکای بۆ بکرێ.

ب- دەشگونجێ بڵێین: ئەمە هەڵاواردنێکی دابڕاو (إِسْتِثْنَاء مُنْقَطِع)ە، چونکە ئەوەی خوا بەزەیی پێیدابێ، ناکەوێتە بازنەو جوغزی ئەوانەوە کە سوود بە یەکدی ناگەیەنن، کەواتە: ئەم سێ ئایەتە موبارەکەش بەڵگەی سێیەم پێک دێنن، بۆ بەرپەرچدانەوەی نکووڵییکردنی بێبڕوایان لە زیندوو کرانەوەو هەبوونی ڕۆژی سزاو پاداشت.

٥- ﴿هُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٤٢﴾﴾، هەر ئەویش (بەس خواش) زاڵی میهرەبانە.

## سەرنجدانەوەیەکی

## سێ بەڵگەکەی هەبوونی سزاو پاداشت

**بەڵگەی یەکەم:** سزادانی خوا بۆ گەلی توببەع و گەلانی پێشوو، ئەگەر تەماشای مێژوو بکەین دەستی خوا دەبینین لە سزادانی تاوانباراندا، کەواتە: دنیا شاری بێ خاوەن نیەو، وەک چۆن سزادانێکی بەشیی **(عقاب جزئي)** هەیە، دەبێ قۆناغێکی دیکەش هەبێ، کە سزادانێکی گشتیی تێدا هەبێ، ئەو خوایەی کە لە دنیادا بەسەر تاوانباران و ستەمکاراندا، بازی نەداوە، بە تەئکید کەسانێکیش هەن، کە لە دنیادا سزای خۆیان وەرناگرن، هەروەها کەسانێکی زۆریش هەن، کە پاداشتی خۆیان وەرناگرنەوە، بۆیە دەبێ قۆناغێکی دیکە هەبێ سزای پڕ بە پێست بۆ بێبڕواو تاوانباران و خراپەکاران هەبێ و پاداشتی پڕ بە پێستیش بۆ بڕواداران و چاکەکاران هەبێ.

**بەڵگەی دووەم:** ئەگەر تەماشای گەردوون بکەین، دەبینین ئەم گەردوونە هەموو شتێکی لەجێی خۆیدایە، هیچ شتێکی نیە، لە جێی خۆیدا نەبێ، هەر کام لە زانایان کە لێ دەکۆڵێتەوە، زانایانی فیزیازان، کیمیازان، زەویناس، زیندەوەرزان، ڕووەکزان، توێکاریی،...هتد. هیچ زانایەک نەیگوتوە: فڵانە شتە نەدەبوو وا بووایە، بۆ وێنە:

١- بەرگە هەوا، توخمەکانی هەوا کە دابەشکراون: ٧٨٪ نایترۆجینە، (٢١٪) ئۆکسجینە، (٠،٣٠٪) دووەم ئۆکسیدی کاربۆنە، ئەو ڕێژانە ئەگەر کەمتر یان زیاتر بوونایە، ژیانی بەشەر دروست نەدەبوو.

٢- هەروەها بەرگە ئاویی کە دەوری زەوی داوە، کە (٤/٥) پانتایی زەوی، ئاو داپۆشیوە، دەبووایە هەر ئەوەندە بێ، نەدەبوو کەمتر یان زیاتر بێ.

٣- هەروەها بەرگە خاکیی، کە زەوی داپۆشیوە، لەو شوێنانەدا کە وشکانییە، دیسان ئەویش ئەستوورییەکەی و ماددەکانی و پێکهاتەکانی چۆنن، دەبووایە هەروابن، بۆ ئەوەی بتوانرێ هەرچی ڕووەک و شیناوردو دارو درەخت و میوەیە، سەوزی بکات.

٤- هەروەها ئەو ئەندازە بایەی لەسەر زەوی هەیە، کە هەڵدەکات، ئەگەر لەوەی هەیە بە هێزتربێ، دەبێتە هۆکاری کاولکاریی، کە جار جار خوای پەروەردگار وەک پیشاندانی دەستی خۆی، ئەو بایە بە هێزتر دەکات.

٥- هەروەها ئاو لە هەندێ شوێن کە ڕێژەیەکی زیاتر دادەبارێ، دەبێتە هۆی تسۆنامیی و دەبێتە هۆی لافاو و لێزماوو، باو باران هەموو شتێک ڕادەماڵێ، کەواتە: هەموو ئەو شتانەی خوا ﷻ خوڵقاندوونی، هەموویان بە ئەندازەگیریین.

٦- هەروەها دووریی نێوان مانگ و زەوی، پاشان قەبارەی مانگ و بارستاییەکەی و هێزی کێشکردنەکەی بۆ زەوی.

٧- هەروەها سووڕانەوەی زەوی بە دەوری خۆیدا لە (٢٤) سەعاتدا جارێک، کە دەبێتە هۆی پەیدا بوونی شەوو ڕۆژ، بە هاوکۆییش شەو (١٢) سەعات و ڕۆژ (١٢) سەعات و، کورت و درێژیش دەبن.

٨- هەروەها سووڕانەوەی زەوی بە دەوری خۆردا کە دەبێتە هۆی پەیدابوونی چوار کەشەکان، سووڕانەوەی زەوی بە دەوری خۆیدا، لە هەر خولەکێکدا (٣٠)کم خێرا دەڕوا، بەڵام سووڕانەوەی زەوی بە دەوری خۆردا، لە هەر چرکەیەکدا (٣٠)کم، واتە: (٦٠) هێندەی سووڕانەوەی بە دەوری خۆیدا خێراترە.

٩- هەروەها دووریی زەوی و خۆرو، ئەو هێزی کێشکردنەی کە لە نێوان زەوی و خۆردایە، کە دەبێتە هۆی ئەوەی زەوی بە دەوری خۆردا بخولێتەوە.

١٠- دیسان قەبارەی خۆرو ئەندازەی تیشکەکەی، کە لە ڕۆژێکدا ملیۆنان تەن تیشک دەبەخشێ بە کۆمەڵەکەی خۆی، کە ئەگەر زیاتر بووایە یان کەمتر بووایە.

١١- هەروەها دووریی زەوی و خۆر، ئەگەر زیاتر بووایە، سەر زەوی دەبوو بە بەستەڵەک و، ئەگەر نیزیکتر بووایە، دەیسووتاندو دەبوو بە خۆڵەمێش.

ئنجا کاتێک کە تەماشای هەموو گەردوون دەکەین و، تەماشای جەستەی خۆمان دەکەین، وەک ئەو دیالۆگەی لە نێوان سوقڕات و ئەرستۆ دیمۆسدا هێنام، دڵنیا دەبین هیچ شتێک نیە لەجێی خۆیدا نەبێ و، هیچ شتێک نیە کە ئەندازەگیریی کراو نەبێ، وەک خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَخَلَقَ كُلَّ شَيْءٍ فَقَدَّرَهُۥ تَقْدِيرًا ﴿٢﴾﴾ الفرقان، یان دەفەرموێ: ﴿إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَٰهُ بِقَدَرٍ ﴿٤٩﴾﴾ القمر، واتە: هەموو شتێکمان بە ئەندازە دروستکردوە، کە مادام هەموو شتێک ئەو پەڕی وردەکاریی و ڕێک و پێکیی تێدایە، کەواتە: لە کۆی گەردوونیشدا ئەو پەڕی ڕێک و پێکیی هەیە، ئنجا ئەو گەردوونە ڕێک و پێک و، سیستماتیکە، بێگومان ئامانج و حیکمەتێکی لە پشتەوەیە، ئامانج و حیکمەتەکە بە عەقڵ و زگماکیش هەستی پێ دەکرێ، کە خوا ﷻ ئێمەی بۆ ئامانجێک لێرە داناوە، بەڵام ئەوەی کە ئەو حیکمەت و ئامانجە بۆ مرۆڤان دەردەخات، وەحییە، وەحیی خوای پەروەردگارە.

هەر بۆیەش خوا ﷻ لە سوورەتی (النساء)دا، دەفەرموێ: ﴿رُّسُلًا مُّبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى ٱللَّهِ حُجَّةٌۢ بَعْدَ ٱلرُّسُلِ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا ﴿١٦٥﴾﴾، دوای ئەوە ناوی دوازدە (١٢) لە پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام) دێنێ: ﴿إِنَّآ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ كَمَآ أَوْحَيْنَآ إِلَىٰ نُوحٍ وَٱلنَّبِيِّـۧنَ مِنۢ بَعْدِهِۦ ۚ وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰٓ إِبْرَٰهِيمَ وَإِسْمَٰعِيلَ وَإِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ وَٱلْأَسْبَاطِ وَعِيسَىٰ وَأَيُّوبَ وَيُونُسَ وَهَٰرُونَ وَسُلَيْمَٰنَ ۚ وَءَاتَيْنَا دَاوُۥدَ زَبُورًا ﴿١٦٣﴾ وَرُسُلًا قَدْ قَصَصْنَٰهُمْ عَلَيْكَ مِن قَبْلُ وَرُسُلًا لَّمْ نَقْصُصْهُمْ عَلَيْكَ ۚ وَكَلَّمَ ٱللَّهُ مُوسَىٰ تَكْلِيمًا ﴿١٦٤﴾﴾ النساء، دوایی دەفەرموێ: ﴿رُّسُلًا مُّبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ ...﴾، پێغەمبەرانێکی دڵخۆشکەرن و ترسێنەرن، بۆچی؟ ﴿لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى ٱللَّهِ حُجَّةٌۢ بَعْدَ ٱلرُّسُلِ﴾، تاکو لە دوای پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام)، خەڵک بەڵگەی

نەبێ لەسەر خوا، کەواتە: ئەگەر خوا پێغەمبەرانی نەناردبان، خەڵک بەڵگەو بیانووی دەبوو، کە یەکێکیان بڵێ: خوایە! من نەمدەزانی تۆ چیت لەمن ویستوە، دەمزانی تۆ هەی، بە عەقڵ و زگماکم، دەمزانی ئەم دنیایە شاری بێ خاوەن نیەو، من خاوەنێکم هەیەو، سەرپەرشتیارێکم هەیە، بەس نەمدەزانی چیت لەمن دەوێ و، من دەبێ چۆن بژیم و، چی بکەم و چۆن بکەم؟ خەڵک پاساوو بەڵگەی هەبوو، بەڵام لە دوای پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام)، خەڵک بیانوو بڕ کراوەو، بیانوو بڕاو کراوە.

کە دەفەرموێ: ﴿ وَمَا خَلَقْنَا السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا لَاعِبِينَ ﴿٣٨﴾ مَا خَلَقْنَاهُمَا إِلَّا بِالْحَقِّ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٣٩﴾ ﴾، واتە: ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەی نێوانمانیان، گاڵتەکەرانە نەخوڵقاندوون، ﴿مَا خَلَقْنَاهُمَا إِلَّا بِالْحَقِّ ﴾، واتە: ئەگەر بە هەق و حیکمەت دروست نەکرابان، ئەم گەردوونە دەبووە، گاڵتەجار، دەبوو بە شتێکی پووچ، وەک لە کۆتایی سوورەتی (المؤمنون)دا، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَاكُمْ عَبَثًا وَأَنَّكُمْ إِلَيْنَا لَا تُرْجَعُونَ ﴿١١٥﴾ فَتَعَالَى اللَّهُ الْمَلِكُ الْحَقُّ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ رَبُّ الْعَرْشِ الْكَرِيمِ ﴿١١٦﴾ ﴾، واتە: ئایا پێتان وایە ئێوەمان بە پووچ خوڵقاندوەو، بۆ لای ئێمە ناگێڕدرێنەوە؟ بەرزیی بۆ خوای حوکمڕانی هەق، جگە لەو هیچ پەرستراوێک نیە، خاوەنی تەخت و بارەگای مەزنە، کەواتە: ئەوەش بەڵگەی دووەم.

**بەڵگەی سێیەم:** ئەوەیە کە خوا ﷻ فەرمووی: ﴿ إِنَّ يَوْمَ الْفَصْلِ مِيقَاتُهُمْ أَجْمَعِينَ ﴾، ڕۆژی لێک هەڵاواردن، ژوانگەی تێکڕایانە، ئەو ڕۆژە کە هیچ دۆست و نیزیکێک سوود بە هیچ دۆست و نیزیکێک ناگەیەنێ و، پشتیوانییش ناکرێن، مەگەر کەسێ خوا بەزەیی پێیدا بێ، کە هەر ئەو خاوەنی ئەو پەڕی عیززەت و باڵادەستیی و دەسترۆیشتوویی و، ئەو پەڕی میهرەبانیی و بەزەییشە.

کەواتە: لەبەر ئەوەی لە خوا ﷻ ناوەشێتەوە هەق و ناهەق، چاک و خراپ، دیندارو بێ دین، وەک یەک مامەڵەیان لەگەڵدا بکات، دەبێ ڕۆژێک هەبێ،

لێکیان هەڵباوێرێ و لێکیان جیابکاتەوە، هەر کەسە بە پێی ئەوە کە شایستەیەتی، مامەڵەی لەگەڵدا بکات، چاکەکاران پاداشتیان وەربگرنەوەو، خراپەکارانیش سزا بدرێن.

کەواتە: بەم سێ بەڵگەیە خوا ﷻ نکووڵییکردنی بێبڕوایان لە هەبوونی ڕۆژی سزاو پاداشت، پووچەڵ دەکاتەوە، لەم چەند ئایەتە موبارەکەدا.

خوا بە لوتف و کەرەمی خۆی یارمەتییمان بدات، زیاتر لە نهێنییەکانی فەرمایشتەکەی تێبگەین و، یارمەتییمان بدات، زیاتر کارلێک لەگەڵ ڕاستییەکانی فەرمایشتی خوادا بکەین، لە ژیانی تاکیی و، ژیانی خێزانیی و، ژیانی کۆمەڵایەتییماندا، ئەوەی کە خوا ﷻ پێی خۆشە، بەو شێوەیە ڕەفتار بکەین و، ئەوەی کتێبی خوا ﷻ فەرموویەتی و، پێغەمبەری خوا ﷺ لە ژیانی خۆیدا بەرجەستەی کردوە، لە دوو توێی ڕێبازەکەیدا، بەو شێوەیە ڕەفتار بکەین و، هەوڵبدەین تێمەش کۆمەڵگاو دەوروبەری خۆمان، پاکسازیی تێدا بکەین و، چاکسازیی تێدا بکەین و، ڕاستی بکەینەوەو چاکی بکەین و، وای لێ بکەین، جێگای ڕەزامەندیی خوابێ، تاکو سەرەنجامی ئەم ژیانەی دنیامان سەربەرزیی بێ و، لە ڕۆژی دواییشدا سەرفرازو سەربڵند بین، لە خزمەت خوای پەروەردگارو، پێغەمبەری پێشەوامان‌دا ﷺ.

**سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.**

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان لـە حەڤـدە (١٧) ئایـەتی کۆتایـی سـوورەتی (**الدخـان**) پێکـدێ، ئایەتـەکانی: (٤٣ - ٥٩)، کـە تێیانـدا سـەرەتا باسـی سـەرەنجامی شـووم و دژوارو پـڕ مەینەتیـی و ئـازاری بێبڕوایـانی گوناهـکار کـراوە، بـە تایبـەت درەختـی زەققـووم، کـە بەرومیوەکـەی خۆراکـی سـەرەکیی دۆزەخییەکانـە.

پاشـان باسـی سـەرەنجامی پـڕ خێـرو خۆشـیی پارێـزکاران کـراوەو، چەنـدان نـازو نیعمـەتی ناوازەیـان خراونـە ڕوو:

١- بێ ترس و بیم بوونیان و، ئارامیی و هێمنیی بۆ فەراهەم هێنرانیان.

٢- باغ و بێستانەکان.

٣- کانیی و سەرچاوەکان.

٤- پۆشاکی ئاوریشمی تەنک و ئەستوور.

٥- ڕووبەڕووی یەکدی دانیشتن.

٦- جووتکرانیان لەگەڵ ئافرەتانی شۆخ و شەنگدا.

٧- هەبوونی هەموو جۆرە میوەیەکی بە تام و چێژ.

٨- دووریی لە مردن.

٩- دووریی لە ئاگری دۆزەخ.

لـە کۆتاییشـدا خـوا ﷻ بـە پێغەمبەرەکـەی ﷺ دەفەرمـوێ: ئێمـە قورئانمـان بـە زمـانی خـۆت، واتـە: بـە زمـانی عەرەبیـی، بـۆ ئاسـان کـردووی، تاکـو خەڵـک تێیبگـەن، واتـە: سـەرەتا کۆمەڵگاو دەوروبـەری خـۆت، باشـت لـێ تێبگـەن، وەک لـە سـوورەتی

(إبراهیـم)دا، دەفەرمـوێ: ﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن رَّسُولٍ إِلَّا بِلِسَانِ قَوۡمِهِۦ لِيُبَيِّنَ لَهُمۡ ﴿٤﴾ ﴾، واتـە: هیـچ پێغەمبەرێکمان نەناردوە، مەگـەر بـە زمانی خـۆی و، کۆمەڵەو خەڵکەکـەی خـۆی، تاکـو بۆیـان ڕوونبکاتـەوە، کەواتـە: تـۆ چـاوەڕوان بـە، ئەوانیـش چاوەڕوانـن، تـۆ چـاوەڕوان بـە کـە یارمەتیـی خـوات بـۆ دێ و، سـەرت دەخـات، لـەو بارودۆخـە پـڕ تەنگـژەو مەینەتییـەی کـە لـە مەککـەدا خـۆت و هاوەڵانـت دەیگوزەرێنـن، دەربـازت دەکات و، ئەوانیـش بـا چـاوەڕوان بـن، کـەی بـە خەیاڵـی خۆیـان تـۆ وەفـات دەکـەی و، پەیامەکـەت کۆتایـی دێ، بـە لای ئێمەشـەوە بـا ئـەوان چـاوەڕوان بـن، کـەی سـەرکەوتنی ئیسـلام دەبینـن و، شکسـتی خۆیـان دەبینـن، هـەر لـە دنیـاداو، ئەگـەر بـڕواش نەهێنـن، لـە دواڕۆژیشـدا سـزاو ئـازاری، خـوای دادگـەر دەبینـن، واتـە: دڵنیابـە سـەرەنجامی چـاک هـی تۆیـەو، ئـەوان سـەرەنجامێکی شـووم و پـڕ مەینەتیـی چاوەڕێیانـە.

﴿ إِنَّ شَجَرَتَ ٱلزَّقُّومِ ﴿٤٣﴾ طَعَامُ ٱلۡأَثِيمِ ﴿٤٤﴾ كَٱلۡمُهۡلِ يَغۡلِي فِي ٱلۡبُطُونِ ﴿٤٥﴾ كَغَلۡيِ ٱلۡحَمِيمِ ﴿٤٦﴾ خُذُوهُ فَٱعۡتِلُوهُ إِلَىٰ سَوَآءِ ٱلۡجَحِيمِ ﴿٤٧﴾ ثُمَّ صُبُّواْ فَوۡقَ رَأۡسِهِۦ مِنۡ عَذَابِ ٱلۡحَمِيمِ ﴿٤٨﴾ ذُقۡ إِنَّكَ أَنتَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡكَرِيمُ ﴿٤٩﴾ إِنَّ هَٰذَا مَا كُنتُم بِهِۦ تَمۡتَرُونَ ﴿٥٠﴾ إِنَّ ٱلۡمُتَّقِينَ فِي مَقَامٍ أَمِينٖ ﴿٥١﴾ فِي جَنَّٰتٖ وَعُيُونٖ ﴿٥٢﴾ يَلۡبَسُونَ مِن سُندُسٖ وَإِسۡتَبۡرَقٖ مُّتَقَٰبِلِينَ ﴿٥٣﴾ كَذَٰلِكَ وَزَوَّجۡنَٰهُم بِحُورٍ عِينٖ ﴿٥٤﴾ يَدۡعُونَ فِيهَا بِكُلِّ فَٰكِهَةٍ ءَامِنِينَ ﴿٥٥﴾ لَا يَذُوقُونَ فِيهَا ٱلۡمَوۡتَ إِلَّا ٱلۡمَوۡتَةَ ٱلۡأُولَىٰۖ وَوَقَىٰهُمۡ عَذَابَ ٱلۡجَحِيمِ ﴿٥٦﴾ فَضۡلٗا مِّن رَّبِّكَۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ ﴿٥٧﴾ فَإِنَّمَا يَسَّرۡنَٰهُ بِلِسَانِكَ لَعَلَّهُمۡ يَتَذَكَّرُونَ ﴿٥٨﴾ فَٱرۡتَقِبۡ إِنَّهُم مُّرۡتَقِبُونَ ﴿٥٩﴾ ﴾.

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{بە دڵنیایی (بەری) درەختی زەققووم (زەقنەمووت، ئەو پەڕی تاڵ و ناخۆشە) ﴿٤٣﴾ خۆراکی (مرۆڤی) زۆر گوناهکارە ﴿٤٤﴾ وەک کانزای تواوەیە لە سکاندا دەکوڵێ ﴿٤٥﴾ وەک کوڵینی ئاوی داغ (و ئەوپەڕی گەرم) ﴿٤٦﴾ ئەی فریشتەکان! بیگرن (ئەو بێبڕوا گوناهکارە)، پەلکێشی بکەن بۆ نێوە ڕاستی کڵپەی ئاگر (ی دۆزەخ) ﴿٤٧﴾ ئنجا لە ئازاری ئاوی کوڵیو و داغی بەسەر تەپڵی سەردا بکەن ﴿٤٨﴾ (پێی دەگوترێ:) بیچێژە! بەڕاستیی هەر تۆی دەسترۆیشتووی بەڕێز! (وەک لە دنیادا لافت لێ دەدا) ﴿٤٩﴾ ئەی بێبڕوایەکان! بێگومان ئەم (سزای دۆزەخ) ە، ئەوەیە کە تێیدا دوو دڵ بوون، شەڕە قسەتان لە بارەیەوە دەکرد ﴿٥٠﴾ بە دڵنیایی پارێزکاران لە نشینگەیەکی هێمن و بێترس و بیم دان ﴿٥١﴾ لە نێو باخ و سەرچاواندا ﴿٥٢﴾ لە حاڵێکدا کە بەرەو ڕووی یەکدی دانیشتوون، لە ئاوریشمی تەنک و ئەستوور دەپۆشن ﴿٥٣﴾ (پاداشتیان) بەو شێوەیەو لەگەڵ ئافرەتانی سپی و سۆڵ و چاوگەشدا کردوومانن هاودەم ﴿٥٤﴾ بە هێمنیی و بێ ترسیی، لە هەموو میوەیەکی (خۆش و بە تامی) تێدا داوا دەکەن ﴿٥٥﴾ جگە لە مردنی یەکەم (کە لە دنیادا چێژتیان)، مردنی تێدا ناچێژن و (خوا) لە ئازاری کڵپەی ئاگری (دۆزەخ) پاراستنی ﴿٥٦﴾ ئەوەش بەخششە لە پەروەردگارتەوە، ئا ئەوەیە بردنەوەو بە مراد گەیشتنی مەزن ﴿٥٧﴾ بێگومان بۆیە بە زمانی تۆ ئاسانمان کردوە (ئەم قورئانە)، بەڵکو (خەڵکەکەت) لێی تێبگەن و پەند وەربگرن ﴿٥٨﴾ (بەڵام بێبڕوایەکانیان پەندیان وەرنەگرت)، دەجا چاوەڕوان بە (سزایان بۆ بێ)، بێگومان ئەوانیش چاوەڕێن ﴿٥٩﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(ٱلزَّقُّومِ): (عِبَارَةٌ عَنْ أَطْعِمَةٍ كَرِيهَةٍ مِنَ النَّار، زَقَمَ فُلَانٌ وَتَزَقَّمَ: ابْتَلَعَ شَيْئاً كَرِيهاً)، زەققووم: بریتیە لە خواردنە ناخۆشەکانی نێو ئاگر (زَقَمَ فُلَانٌ وَتَزَقَّمَ) یانی: شتێکی ناخۆشی قووتدا. زانایان لە بارەی درەختی زەققوومەوە: چییەو چۆنەو بەرەکەی چۆنە؟ زۆر قسەیان کردوە، هەندێک گوتوویانە: جۆرە درەختێکە لە هەندێک ناوچەی ولاتی عەرەبییدا دەڕوێ، گەلایەکەی وردە، بەرەکەی زۆر زۆر تاڵ و گەرمە، سووتێنەرە، بەلام من وای تێدەگەم کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ إِنَّهَا شَجَرَةٌ تَخْرُجُ فِىٓ أَصْلِ ٱلْجَحِيمِ ﴿٦٤﴾ طَلْعُهَا كَأَنَّهُۥ رُءُوسُ ٱلشَّيَٰطِينِ ﴿٦٥﴾ ﴾الصافات، واتە: درەختێکە لە تەختی دۆزەخ دێتە دەرێ و، بەرو میوەکەی وەک سەری شەیتانان وایە، هیچکەسیش سەری شەیتانانی نەبینیوە، بەلام لە خەیاڵ و ئەندێشەی هەموو کەسدا سەری شەیتانان شتێکی دزێو و قێزەون و ناشیرینە، کە ئەم زەققوومە پەیوەست بێ بە دۆزەخەوەو، لە دنیادا وێنەی نەبێت، بەلام هەندێک لە ڕوونکەرەوانی واتاکانی قورئان گوتوویانە: زەققووم بریتیە لە خواردنە ناخۆشە دزێوەکان لە ئاگردا، واتە: هەموو ئەو خواردنانەی ناخۆشن، زەققووم دەیانگرێتەوە، بەلام من پێم وایە زەققووم جۆرە میوەیەکی تایبەتە لە درەختێکی تایبەت، کە خوا ﷻ باسی کردوە، دەگوترێ: (زَقَمَ فُلَانٌ وَتَزَقَّمَ: ابْتَلَعَ شَيْئاً كَرِيهاً)، وشەی (زَقَمَ) و (تَزَقَّمَ)، قووتیدا، بۆ قوتدانی شتێکی ناخۆش و بێزلێکراو بەکاردەهێندرێ.

(ٱلْأَثِيمِ): (آثِمْ)، بە مانای گوناهکار، گوناهبار، بەلام (الأثِيمْ)، واتە: زۆر گوناهکار، چونکە ڕێژگەی زێدەڕۆیی، (صِيْغَةُ الْمُبَالَغَة)ی (آثم)ە، هەروەک چۆن (عالِم)، بە مانای زانا دێ، بەلام (عَلِيْم)، واتە: زۆر زانا، بۆیە (أثِيمْ: كَثِيْرُ الإِثْمْ)، زۆر گوناهکار، زۆر گوناهبار.

(كَٱلۡمُهۡلِ): وەک (مُهـل) وایـە، (المُهْـلُ: دُرْدِيُّ الزَّيْـتِ، النُّحَـاسُ المُـذَابُ، المَعْـدِنُ المُذَاب)، زانایـان لـە بـارەی (مُهْلْ)یشـەوە دیسـان زۆریـان قسـە کـردوە، هەندێکیـان گوتوویانـە: بـە خڵتـی زەیـت دەگوتـرێ، زەیـت کـە دەکوڵێـنرێ بـۆ ئـەوەی ببێتـە زەیـت، خڵتەکـەی بنـەوەی کـە زۆر گەرمـە، پێـی دەگوتـرێ: (مُهْـل)، هەروەهـا بـە مسـی تـواوەش دەگوتـرێ، هەروەهـا بـە هـەر کانزایەکـی تـواوەش بـا زێـڕو زیویـش بـێ، هـەر دەگوتـرێ: (مُهْـل).

(يَغۡلِي): واتـە: دەکوڵـێ (الغَـلْيُ وَالغَلَيَـانُ فِي القِـدْرِ، إذَا طَفَحَـتِ القِـدْرُ)، (غَـلِيُ وَغَلَيَانُ)، واتـە: مەنجـەڵ کـە دەکوڵـێ، هەندێـک لـەوەی کـە لـە نێـوی دایـە دەهـاوێ و بڵقـان دەدات لـە زۆر گەرمییـان، پێـی دەگوتـرێ: (غَـلِي وَغَلَيَان).

(ٱلۡحَمِيمِ): (الحَمِيْـمُ: المَـاءُ الشَّـدِيْدُ الحَـرَارَة)، (حَمِيـم): ئاوێکـی زۆر گـەرم، واتـە: ئـاوی کـوڵاو و داغ.

(فَٱعۡتِلُوهُ): (العَتْـلُ: الأَخْـذُ بِمَجَامِـعِ الـشَّيءِ وَجَـرُّهُ بِقَهْـرٍ)، (عَتْـل): بریتیـە لـە شـتێک بـە زۆر ڕابکێـشرێ، بـە کوردیـی پەلکێـش کردنـی پـێ دەڵێـن: پەلکێشـی بکـەن و، ڕای کێشـن بـە توندیـی.

(صُبُّواْ فَوۡقَ رَأۡسِهِۦ): واتـە: بەسـەر تەپڵـی سـەریدا بڕێـژن، (صَـبُّ الـمَاءِ: إِرَاقَتُـهُ مِـنْ أَعْـلَى)، ئەوەیـە کـە لـە سـەرڕا ئـاو بڕێـژرێ.

(تَمۡتَرُونَ): (أَي: تَشُـكُّوْن)، واتـە: تێیـدا دوو دڵـن، هـەروەک (تَمْـتَرُون)، بـە مانـای :(شـەڕە قسـەو دمبەدمـە دەکەن)یـش دێ.

(وَزَوَّجۡنَٰهُم): (قَرَنَّاهُـمْ)، واتـە: جووتمـان کـردن، کردماننـە هاونیشـین و هاودەمـی یەکـدی، ئەگەرنـا (زَوَّجْنَاهُـمْ) بـە مانـای لـێ مارەکـردن نیـە، چونکـە لـە بەهەشـتدا مارەکـردن نیـە، لـەوێ هـەر کەسـێک کـە ئـەو هاوسـەرەی دەدرێتـێ، پێویسـتیی بـە مارەکـردن نـاکات، بەهەشـت وەک دنیـا نیـەو، مارەکـردن بـۆ دنیایـە، کەواتـە:

(زَوَّجْنَاهُـمْ)، واتـە: (قَرَنَّاهُـمْ)، لەگـەڵ ئەوانـدا جووتمـان کـردن و پێکـەوە کردمانـە هـاودەم و هاونیشـین و هـاوڕازی یەکـدی.

(بِحُورٍ): (حُـور: جَمْـعُ حَـوْرَاء وَأَحْـوَر، وَالحَـوْرُ: ظُهُـور قَلِيْـلٍ مِـنَ البَيَـاضِ فِي العَـيْنِ مِـنْ بَـيْنِ السَّـوادِ، وَذَلِـكَ نِهَايَـةُ الحُسْـنِ مِـنَ العَـيْنِ، وَحَـوَّرْتُ الـشَّيءَ: بَيَّضْتُـهُ)، (حُـور) کـۆی (حَـوْرَاء)ە، بـۆ مێینـە (مؤنـث) هەروەهـا دەشـگونجێ کـۆی (أَحْـوَر) بـێ، بـۆ نێرینـە (مذکـر)، واتـە: زۆر زۆر سـپیی، (حَـوْر): بریتیـە لـەوە کـە لـە چـاودا سـپێنەکەی زۆر بـێ و، ڕەشـکێنەکەی زۆر ڕەش بـێ، کـە ئـەوە لـە چـاودا زۆر جوانـە، واتـە: هـەم سـپییەکەی زۆر صـاف بـێ و، هـەم ڕەشییەکەشـی، دەگوتـرێ: (حَـوَّرْتُ الـشَّيءَ: بَيَّضْتُهُ)، واتـە: شـتەکەم سـپیی کـرد، هەتـا گوتـراوە: حەوارییەکانـی عیسـا ﷺ بۆیـە پێیـان گوتـراوە: حەواریـی، چونکـە بەرگـی سـپییان لەبـەر کـردوە، یـان لەبـەر ئـەوەی بـەرگ سـپییکەرەوە بـوون، وەک چـۆن لـە ئوتووخانـە ئەوانـەی بـەرگ و پۆشـاک دەشـۆن و پـاک و خاوێـن و سـپیی دەکـەن.

(عِينٍ): (جَمْـعُ عَيْنَـاء)، بـۆ چـاوی گـەش و جـوان بەکاردەهێـنرێ، بـە مانگـە کێویـی و، بـە ئاسـکە کێویـی دەگوتـرێ: (عَيْنَـاء)، لەبـەر ئـەوە چـاوی زۆر گـەورەو جوانـە، ئـەو ئافرەتانـەش کـە خـوا لـە بەهەشـتدا دەیانڕەخسـێنێ، چاویـان چوێـنراوە بـە چـاوی مانـگا کێویـی، یاخـود چـاوی بـە ئاژەڵـەوە کـە چـاوی زۆر جوانـە، بـەڵام لـە ڕاسـتییدا وا ڕاسـترە و وا باشـترە بڵێیـن: (حُـور: جَمْـعُ حَـوْرَاء)، واتـە: ئافرەتـی سـپیی و سـۆڵ و گـەش و جـوان، (عِـيْن جَمْـعُ عَيْنَـاء)،: چاویـان جوانـە، واتـە: هـەم جەسـتەیان سـپیی و سـۆڵ و بـێ پەڵـەو بـێ لەکەیـە، هـەم چاویشـیان زۆر جوانـن.

## هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتانە

هـۆی هاتنـە خـواری ئـەم ئایەتـە موبارەکانـە، کـە دەفەرمـوێ: ﴿ ذُقۡ إِنَّكَ أَنتَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡكَرِيمُ ﴿٤٩﴾ إِنَّ هَٰذَا مَا كُنتُم بِهِۦ تَمۡتَرُونَ ﴿٥٠﴾ ﴾، لـەو بـارەوە ئـەم گێڕدراوەیـە هەیـە:

{عَـنْ قَتَـادَةَ رَحِمَـهُ اللَّـه: ﴿ ثُمَّ صُبُّواْ فَوۡقَ رَأۡسِهِۦ مِنۡ عَذَابِ ٱلۡحَمِيمِ ﴿٤٨﴾ ﴾، نَزَلَـتْ فِي عَـدُوِّ اللَّـهِ أَبِي جَهْـلٍ لَقِـيَ النَّبِـيَّ ﷺ، فَأَخَـذَهُ فَهَـزَّهُ، ثُـمَّ قَـالَ: أَوْلَى لَـكَ يَـا أَبَـا جَهْـلٍ فَـأَوْلَى، ثُـمَّ أَوْلَى لَـكَ فَـأَوْلَى، ذُقْ إِنَّـكَ أَنْـتَ الْعَزِيـزُ الْكَرِيـمُ، وَذَلِـكَ أَنَّـهُ قَـالَ: أَيُوعِـدُنِي مُحَمَّـدٌ، وَاللَّـهِ لَأَنَـا أَعَـزُّ مَـنْ مَـشَى بَـيْنَ جَبَلَيْهَـا « وَفِيـهِ نَزَلَـتْ: ﴿ وَلَا تُطِعۡ مِنۡهُمۡ ءَاثِمًا أَوۡ كَفُورٗا ﴿٢٤﴾ ﴾الإنسـان، وَفِيـهِ نَزَلَـتْ: ﴿ كَلَّا لَا تُطِعۡهُ وَٱسۡجُدۡ وَٱقۡتَرِب ﴿١٩﴾ ﴾العلـق، وَقَـالَ قَتَـادَةُ: نَزَلَـتْ فِي أَبِي جَهْـلٍ وَأَصْحَابِـهِ الَّذِيـنَ قَتَـلَ اللَّـهُ تَبَـارَكَ وَتَعَـالَى يَـوْمَ بَـدْرٍ: ﴿ أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ بَدَّلُواْ نِعۡمَتَ ٱللَّهِ كُفۡرٗا وَأَحَلُّواْ قَوۡمَهُمۡ دَارَ ٱلۡبَوَارِ ﴿٢٨﴾ جَهَنَّمَ يَصۡلَوۡنَهَاۖ وَبِئۡسَ ٱلۡقَرَارُ ﴿٢٩﴾ ﴾إبراهيـم}[1]،

واتـە: قەتـادە ڕەحمـەتی خـوای لـێ بـێ، دەڵێ: ئـەم ئایەتـە موبارەکـەی دەفەرموێ: دوایـی بەسـەر تەپڵـی سـەریدا بکـەن، لـە ئـازاری ئـاوی کـوڵاو، لـە بـارەی دوژمنـی خـوا ئەبـوو جەهلـەوە هاتۆتـە خـوار، کـە ڕۆژێـک دەگاتـە پێغەمبـەر ﷺ پێغەمبـەری خـواش دەیگـرێ و ڕایدەوەشـێنێ و، پێـی دەفەرمـوێ: سـزای سـەخت بـۆ تـۆ ئـەی ئەبـوو جەهـل! سـزای سـەخت بـۆ تـۆ، جارێکـی دیکـەش سـزای سـەخت بـۆ تـۆ، ﴿ ذُقۡ إِنَّكَ أَنتَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡكَرِيمُ ﴾، بیچێـژە ئایـا تـۆی کـە خـۆت زۆر بـە بـاڵا دەسـت و دەسترۆیشـتوو و بەڕێـز دەزانی؟ (بـە هـۆی ئـەوەوە پێغەمبـەر ﷺ وای پـێ فەرمـوو)، کـە ئەبـوو جەهـل گوتبـووی: ئایـا موحەممـەد هەڕەشـەم لـێ دەکات، بـە

---

(١) أخرجه الطبري: ٣١٢٢٧، ج٢٥، ص١٣٨، وقال: إسناده مرسل.

خـوا مـن زاڵـترو دەسترۆیشـتووترین کەسـم، کـە لـە نێـوان دوو چیایـەکانی مەککـەدا، ڕۆیشـتوە.

هـەر لـە بـارەی ئەویشـەوە، ئـەم ئایەتـەی سـوورەتی (الإنسـان) دابـەزی، ئایـەتی ژمـارە (٢٤) کـە خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ وَلَا تُطِعْ مِنْهُمْ ءَاثِمًا أَوْ كَفُورًا ﴿٢٤﴾ ﴾، فەرمانبەریی و گوێڕایەڵیـی، ئـەو کەسـەیان کـە گوناهبـارە، یاخـود سپڵەیە مەکـە، هەروەهـا هـەر لـە بـارەی ئـەوەوە، ئـەم ئایەتـە هاتـە خـوار، لـە سـوورەتی (العلـق)دا، کـە دەفەرمـوێ: ﴿ كَلَّا لَا تُطِعْهُ وَٱسْجُدْ وَٱقْتَرِب ﴿١٩﴾ ﴾، نەخێـر (بـا واز بێنـێ)، فەرمانبەریـی مەکـەو، کڕنـووش بـۆ خـوا بـەرەو لـە خـوا نیزیـک ببـەوە.

هەروەهـا (قتـادة) گوتوویـەتی: هـەر لـە بارەی ئەبـوو جەهـل و هاوەڵەکانیـەوە، کە خـوا ﷻ لـە جەنگـی بـەدردا کوشـتنی، (وایکـرد کـە بـە دەسـتی هـاوەڵان بکوژرێـن)، ئـەم ئایەتـەی سـوورەتی (إبراهیـم) هاتـە خـوار: ﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ بَدَّلُوا۟ نِعْمَتَ ٱللَّهِ كُفْرًا وَأَحَلُّوا۟ قَوْمَهُمْ دَارَ ٱلْبَوَارِ ﴿٢٨﴾ ﴾، ئایـا سـەرنجی ئەوانـە نادەی کـە لـە بەرانبـەر چاکـەی خـوادا، سـپڵەییان نوانـدو، خەڵکەکـەی خۆیـان تووشـی ماڵوێرانیـی کـرد؟!

هەروەهـا لـە بـارەی ئایەتەکانـی: ﴿ إِنَّ شَجَرَتَ ٱلزَّقُّومِ ﴿٤٣﴾ طَعَامُ ٱلْأَثِيمِ ﴿٤٤﴾ ﴾، تـا کۆتایـی، (ابـن المنـذر)، هێناویـەتی لـە یەکێـک لـە تابیعینـەوە، کـە دیـارە (ابـن المنـذر) یەکسـەر لـە تابیعینـەوە نەقـڵ نـاکات، بـەڵام ئـەو کەسـەی لێیـەوە نەقـڵ کـردوە، باسـی نەکـردوە، یـان لـەو کتێبـەدا نەهاتـوە، دەڵـێ: (أُخْـبِرْتُ أَنَّ أَبَـا جَهْـلٍ قَـالَ: يَـا مَعْشَرَ قُرَيْـشٍ أَخْـبِرُونِي مَـا اسْـمِي؟ فَذُكِـرَتْ لَـهُ ثَلَاثَـةُ أَسْـمَاءٍ: عَمْـرٍو، والجِـلَاس، وَأَبُـو الحَكَـم، قَـالَ: مَـا أَصَبْتُـم اسْـمِي، أَلَا أُخْبِرُكُـمْ؟ قَالُـوا: بَـلَىَ، قَـالَ: اسْـمِي الْعَزِيـزُ الْكَرِيـم، فَنَزَلَـتْ: ﴿ إِنَّ شَجَرَتَ ٱلزَّقُّومِ ﴿٤٣﴾ طَعَامُ ٱلْأَثِيمِ ﴿٤٤﴾ كَٱلْمُهْلِ يَغْلِى فِى ٱلْبُطُونِ ﴿٤٥﴾ كَغَلْىِ ٱلْحَمِيمِ ﴿٤٦﴾ خُذُوهُ فَٱعْتِلُوهُ إِلَىٰ سَوَآءِ ٱلْجَحِيمِ ﴿٤٧﴾ ثُمَّ صُبُّوا۟ فَوْقَ رَأْسِهِۦ مِنْ عَذَابِ ٱلْحَمِيمِ ﴿٤٨﴾ ذُقْ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْكَرِيمُ ﴾)، (أخرجـه السـيوطي في الـدر المنثـور: ج٧، ص٤١٩)[1].

---

(١) الإستيعاب فـي بيان الأسباب: ج٣، ص٢٠٣.

واتــە: (**ابــن المنــذر**) هێناویــەتی، لــە یەکێکــەوە دەڵــێ: هەواڵــم پێــدرا کــە ئەبــوو جەهــل، ڕۆژێــک گوتوویــەتی: ئــەی کۆمەڵــی قورەیــش! لــە بــارەی نــاوی خۆمــەوە، هەواڵــم پــێ بــدەن، نــاوم چییــە؟ ئەوانیــش ســێ ناویــان بــۆ باســکردوون: عەمــر، جیــلاس، ئەبــوو لحەکــەم، ئەویــش پێیــان دەڵــێ: نەخێــر، نــاوی منتــان نەپێــکاوە، هەواڵتــان پــێ بــدەم نــاوم چییــە؟ دەڵێــن: بــا، هەواڵــمان پێبــدە، دەڵــێ: نــاوم (**الْعَزِيـزُ الْكَرِيـم**)ە، دەستڕۆشـتووی بەڕێـز، ئیـدی لـەو بـارەوە ئـەم ئایەتانـە: ﴿إِنَّ شَجَرَتَ ٱلزَّقُّومِ ﴿٤٣﴾ طَعَامُ ٱلْأَثِيمِ ﴿٤٤﴾ كَٱلْمُهْلِ يَغْلِى فِى ٱلْبُطُونِ ﴿٤٥﴾ كَغَلْىِ ٱلْحَمِيمِ ﴿٤٦﴾ خُذُوهُ فَٱعْتِلُوهُ إِلَىٰ سَوَآءِ ٱلْجَحِيمِ ﴿٤٧﴾ ثُمَّ صُبُّوا۟ فَوْقَ رَأْسِهِۦ مِنْ عَذَابِ ٱلْحَمِيمِ ﴿٤٨﴾ ذُقْ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْكَرِيمُ﴾، تـا کۆتایـی دابەزیـون.

دیـارە ئێمـە لـە هـۆی هاتنـە خوارەوەکانـدا، ئـەوەی زۆر عەقڵـمان نەیبـڕێ، لـە ڕووی سـەنەدەکەیەوە شـایانی بـاس نەبـێ، نایهێنیـن، بـەڵام مەرجیـش نیـە، ئەوانـەی دەیانهێنیـن، هەموویـان سـەنەدەکەیان ڕاسـت و دروسـت بـێ، بـە بۆچـوونی مـن.

بــەڵام شــتێک هەندێــک لــە زانایــان یاخــود زۆربەیــان لــە تەفســیرەکانیاندا دەیهێنــن، منیــش جاروبــار ئــەوەی زۆرێــک لــە توێــژەرەوان بیهێنــن، دەیهێنــم، بــۆ بەرچــاو ڕوونیــی زیاتــر خســتنە ســەر مانــاو چەمکــی ئایەتــەکان.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

خـوای بـەرزی مـەزن لـە کۆتایـی ئـەم سـوورەتە موبارەکـەدا، کـە هـەر وەک لـە سـەرەتاوە باسـمانکرد، ئـەم سـوورەتە موبارەکـە، باسـی قورئانـەو، پاشـان باسـی یەکتایـی خـوا لـە بەدیهێنەرایەتیـی و، پەروەردگارێتیـی و، تەنیـا پەرسـتراوێتیی دایـە، هەروەهـا باسـی ڕۆژی دواییـە، ئاماژەیـەک بـە بەسـەرهاتی مووسـا علیه السلامو، فیرعـەون و دەسـتە و دایەرەکەیەتـی، کـە دژایەتییـان کـردوە، بـەڵام دوایـی خـوا جل جلاله لـە بەینـی بـردوون، هەروەهـا دوایـی ئاماژەیـەک بـە کۆمەڵـی توببـەع، گەلی توببـەع و، گـەلانی پێشـتر، کـە ئەوانیـش خـوا جل جلاله، لەگـەڵ ئەوەشـدا زۆر دەستڕۆیشـتووتر بـوون لـە کۆمەڵـگای عـەرەب، لـە کۆمەڵـگای ڕۆژگاری پێغەمبـەر صلی الله علیه وسلم، بـەڵام بـە هـۆی گوناهـو تـاوان و بـەدرۆ دانـانی پەیامـی خـواوە، خـوا جل جلاله لـە بەینـی بـردوون و سـزای داون.

پاشـان ئـەوە باسـکراوە کـە خـوا جل جلاله ڕۆژی دوایـی دێنێتـە پێـش، کـە ڕۆژی سـزاو پاداشـتە، بـە بەڵگـەی ئـەوە بـە درێژایـی مێـژووی بەشـەر، خـوا جل جلاله هـەر کەسـێک لایدابـێ و تـاوان و، خراپـەی کردبـێ، بـە کۆمـەڵ، دووچـاری سـزاو جەزرەبـەی کـردوون، هەروەهـا گەردوونیـش بـە هـەق دروسـتکراوە، پاشـان دەبـێ ڕۆژێکیـش هەبـێ، تێیـدا ئـەو خەڵکـە لێـک هەڵاوێـردرێ.

دوای ئـەوە خـوا جل جلاله هـەم باسـی سـەرەنجامی شـووم و خـراپ و پـڕ مەینەتیـی و ئـازاری بێبڕوایـان و، هاوبـەش بـۆ خـوا دانـەران دەکات، هـەم باسـی سـەرەنجامی پڕخێـر و خۆشـیی و بەختەوەریـی و پـڕ هێمـن و ئاسـاییش و، پـڕ نـازو نیعمـەتی بـڕوادارانی پارێـزکار دەکات، تاکـو:

أ- ئەوانەی تاکو ئێستا ڕێی ڕاستی خوایان نەگرتوەو، ئەو پەیامە ڕاست و دروستەی خوای پەروەردگاریان، لە باوەش نەگرتوە، کە بە کۆتا پێغەمبەری خۆیدا صلی الله علیه وسلم ناردوویەتی و لە دوا

کتێبی خۆیدا ناردوویەتی کە قورئانە، هەم ئەوان لە لایەکەوە بترسێن، لە سزاو جەزرەبەی خوا، کە بۆ بێبڕوایان و هاوبەش بۆ خوادانەران و تاوانباران و ستەمکارانی داناوە.

ب- بڕوادارانیش دڵخـۆش بن و، زیاتر دەستگرتووبن بەو ڕێبـازو پەیـامەی خوای پەروەردگارەوە، کە بڕوایـان پێهێناوە، کە لە دنیادا سـەریان بەرز دەکاتەوەو، لە دواڕۆژییشدا تووشی بە مراد گەیشتن و بردنەوەی هەرە مەزن و سەرفرازییان دەکات،

ج- بێبڕوایانیش ئەو پاداشتەی کە خوا بۆ بڕواداران دایناوە، هاندەرو، پاڵنەریان بێ، کە ئەوانیش واز لە بێبڕوایی و، هاوبەش بۆ خوا دانان و سەرەڕۆیی و، لە کەللە ڕەقیی بێنن و، بە چاوی عەقڵ و دڵ تەماشای پەیامی خوا ﷻ بکەن و، سەرنج بدەن و هەڵوەستە بکەن و، بگەڕێنەوە.

سـەرەتا خـوا باسـی سـەرەنجامی شـوومی بێبڕوایـانی تاوانبـار دەکات، بـەڵام لـە چییـەوە دەسـت پـێ دەکات؟ لـە خـواردن و خۆراکیانـەوە دەسـت پـێ دەکات، ئـەوەم لـە تەفسـیرەکاندا نەدیـوە، بـەڵام وای تێدەگـەم، بۆیـە خـوا ﷻ لێـرەدا بـە خـواردن و خـۆراک دەسـت پێـدەکات، چونکـە لـە ڕاسـتییدا مرۆڤـی بێبـڕواو، خەڵکـی بێبـڕوا گرنگتریـن شـت بـە لایـەوە، خـواردن و خۆراکـە، گرنگتریـن شـت بەلایـەوە گـەدەو داوێنـە، چونکـە لـە چوارچێـوەی غەریـزەکانی خۆیـدا دەخولێتـەوە، وەک چـۆن کاتی خـۆی وڵاخیـان بەکارهێنـاوە بـۆ ناعـوور، کـە لـە دەوری ئـەو ناعـوورە سـووڕاوەو، ئـاوی هەڵکێشـاوە، ئەوانـەش هـەر لـە دەوری غەریـزەکانی خۆیـان دەخولێنـەوەو، تاکـە شـتێک بیـری لـێ بکەنـەوە: تێرکـردنی گـەدەو تێرکـردنی داوێنیانـە، بۆیـە خـوا ﷻ لـە خـواردن و خۆراکـە هـەرە خراپەکەیانـەوە دەسـت پێـدەکات، کـە بێبڕوایـنـە! ئـەوە خـواردن و خۆراکتانـە، ئەگـەر ئێـوە لـە دنیـادا تەنیـا بیـر لـە گـەدەو داوێنتـان بکەنـەوەو لـە پڕکـردنی گیرفانتـان و، سـەر هەڵنەبـڕن، کـە خاوەنتـان چـی لـێ داواکـردوون، بۆچـی لێـرەی دانـاون و، دەبـێ چـۆن بژیـن و، چ پەیامێکی بۆ نـاردوون؟ بزانـن کـە چارەنووسـێکی ئـاوا دژوار، چاوەڕێتانـەو کـە خـواردن و خۆراکتـان بـەو شـێوەیە، ﴿إِنَّ شَجَرَتَ ٱلزَّقُّومِ طَعَامُ ٱلْأَثِيمِ﴾، بـە دڵنیایـی درەختـی زەققـووم، خۆراکـی بابـای زۆر گوناهـکارە.

کوردەواریی خۆمان کە لە یەکێک تووڕە دەبن، کە شتێك دەخوات دەڵێن: (یاخوا بە ژەقنەبووتی بێ)، وا پێدەچێ لە زەققوومەوە هێنابیان، یان دەڵێن: (ژەقنە مووتی خوارد)، واتە: شتێکی زۆر تاڵ و تفت و کە قووت نەدرێ، ئنجا خوا ﷻ دەفەرموێ: بێگومان درەختی زەققووم، واتە: بەری درەختی زەققووم، ﴿طَعَامُ الْأَثِيمِ﴾، خۆراکی بابای زۆر گوناهکارە، بۆیەش دەڵێم: لێرەدا مەبەست لە درەختی زەققووم بەرو میوەکەیەتی، چونکە لە سوورەتی (**الصافات**)دا، کە پێشتر تەفسیرمان کردوە، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿طَلْعُهَا كَأَنَّهُ رُءُوسُ الشَّيَاطِينِ ﴿٦٥﴾﴾، واتە: بەری درەختی زەققووم، [(**طَلْع**) واتە: ئەو میوەو بەرەی دەری دەکات]، وەک سەری شەیتانان وایە، بێگومانیش هیچکەس سەری شەیتانانی نەدیوە، بەڵام بۆ قێزەون و ناقۆڵا پێشاندانیەتی، ئەمانەش ئەو ئایەتانەن: ﴿أَذَٰلِكَ خَيْرٌ نُّزُلًا أَمْ شَجَرَةُ الزَّقُّومِ ﴿٦٢﴾ إِنَّا جَعَلْنَاهَا فِتْنَةً لِّلظَّالِمِينَ ﴿٦٣﴾ إِنَّهَا شَجَرَةٌ تَخْرُجُ فِي أَصْلِ الْجَحِيمِ ﴿٦٤﴾ طَلْعُهَا كَأَنَّهُ رُءُوسُ الشَّيَاطِينِ ﴿٦٥﴾ فَإِنَّهُمْ لَآكِلُونَ مِنْهَا فَمَالِئُونَ مِنْهَا الْبُطُونَ ﴿٦٦﴾ ثُمَّ إِنَّ لَهُمْ عَلَيْهَا لَشَوْبًا مِّنْ حَمِيمٍ ﴿٦٧﴾ ثُمَّ إِنَّ مَرْجِعَهُمْ لَإِلَى الْجَحِيمِ ﴿٦٨﴾﴾ الصافات.

پێشێ باسی جێگەو ڕێگەو نازو نیعمەتی کە بۆ بەهەشتیان دانراوە دەکات، ئنجا دەفەرموێ: ئایا ئەوە باشترە بۆ میوانداریی لێکردن . یاخود درەختی زەققووم؟ ئێمە کردوومانە بە هۆی سزاو ئازار، یان هۆی تاقیکردنەوە بۆ ستەمکاران، (کە بڵێن: چۆن درەخت لە نێو ئاگردا دەڕوێ؟)، ئەوە درەختێکە کە دەردێ لە تەختی بنی دۆزەخ، بەرەکەی وەک سەری شەیتانان وایە، ئەوانە لێی دەخۆن، ورگی خۆیانی لێ دەئاخنن، [لەبەر ئەوەی هیچی دیکەیان دەست ناکەوێ]، دواییش تێکەڵەیەکیان بۆ هەیە لە ئاوی کوڵاوو داغ، دوای ئەوەش ئنجا دووبارە دەگەڕێنەوە نێو کڵپەی دۆزەخ.

کەواتە: کە لێرەدا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ شَجَرَتَ الزَّقُّومِ﴾، واتە: بەرو میوەی درەختی زەققووم، ﴿طَعَامُ الْأَثِيمِ﴾، خۆراکی بابای زۆر گوناهکارە، مەبەست

بەرو میوەکەیەتی نەك خووی درەختەکە، بەڵام چونکە لە سوورەتی (الصافات)دا باسکراوە، لێرە بەپێویست نەزانراوە دووبارە بکرێتەوە.

﴿ كَٱلْمُهْلِ ﴾، وەک: کانزای تواوەیە، هێندە گەرمە، کانزای تواوەش، زێرو زیوە، ئاسن و مسە، هەرچی هەیە کە دەتوێنرێتەوە، دەبێ ئەو پەڕی گەرم بێ، ﴿ يَغْلِي فِي ٱلْبُطُونِ ﴾، لە سکاندا دەکوڵێ، لە نێو سک و، لە نێو ورگیاندا دەکوڵێ، واتە: دوای خواردنیشی هەر دەکوڵێ.

﴿ خُذُوهُ فَٱعْتِلُوهُ إِلَىٰ سَوَآءِ ٱلْجَحِيمِ ﴾، بیگرن و پەلکێشی بکەن، ڕایکێشن بەرەو نێوەڕاستی کڵپەی دۆزەخ.

﴿ ثُمَّ صُبُّواْ فَوْقَ رَأْسِهِۦ مِنْ عَذَابِ ٱلْحَمِيمِ ﴾، دوایی لە ئازاری ئاوی کوڵاوو داغ، بەسەر تەپڵی سەریدا بکەن.

﴿ ذُقْ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْكَرِيمُ ﴾، (پێی دەگوترێ:) بیچێژە، هەر تۆی دەستڕۆیشتووی بەڕێز! وەک لە دنیادا لافت لێ دەدا.

ئەمە ئەگەر لە بارەی ئەبوو جەهلیشەوە هاتبێتە خوار، (وەک پێشتر باسمان کرد) بەڵام دیارە وەک زانایان گوتوویانە: (**إنَّ خُصُوصَ السَّبَبِ لَا يَمْنَعُ شُمُولَ المَعْنَى**)، تایبەت بوونی هۆی هاتنە خوار، ڕێ لە گشتگیر بوونی واتا ناگرێ.

ئەگەرنا ئەم ئایەتانە، یەکەم جار کە هاتوونەتە خوار، چ ئەوانەی باسی پارێزکاران و ئیمانداران دەکەن، چ ئەوانەی کە باسی بێبڕوایان و خراپەکاران دەکەن، دیارە یەکەم جار ئایەتەکان بەسەر کەسانێک لە کۆمەڵگای پێغەمبەردا ﷺ جێبەجێ بوون و چەسپاون، بەڵام بە تەئکید هەر کەسێکی دیکە، کە ئەو سیفەتانەیان هەبن، بەسەریاندا دەچەسپێن، خوا ﷻ ناوی کەسی نەهێناوە لە قورئاندا، نە لە بڕواداران کە بفەرموێ: فڵانکەس و، نە لە بێبڕوایان، بەڵکو تەنیا سیفەتەکانیانی باسکردوون، تاکو هەر کەسێ ئەو سیفەتەی تێدابوو، ئەو

ئایەتـە بیگرێتـەوە، ئنجـا ئەوەشـە وا دەکات قورئـان گشـتگیربێ بـۆ هەمـوو کات و شـوێنەکان و، بـۆ هەمـوو کۆمەڵگایـەکان.

﴿ إِنَّ هَٰذَا مَا كُنتُم بِهِۦ تَمۡتَرُونَ ﴾، بـە دڵنیایـی ئەمـە ئەوەیـە کـە ئێـوە لێـی دوو دڵ بـوون، یاخـود شـەڕە قسـەتان لـە بارەیـەوە دەکـرد، ئەمـە بـە نسـبەت سـەرەنجامی شـوومی بێبڕوایـانی تاوانبـارو خراپـەکارەوە، ئنجـا بابزانیـن بـڕواداراني پارێـزکار، حاڵیـان چۆنـە؟

﴿ إِنَّ ٱلۡمُتَّقِينَ فِي مَقَامٍ أَمِينٖ ﴾، بـە دڵنیایـی پارێـزکاران لـە نشـینگەیەکی پـڕ دڵنیایی دان، پـڕ هێمنیـی و ئاسـاییش، بێگومـان لـە ڕۆژی دواییـدا، خوازراوتریـن شـت و گرنگتریـن شـت، پـڕ بایەختریـن شـت، بریتیـە لـە هێمنیـی و ئاسـاییش و، ڕەوینـەوەی تـرس و دڵەڕاوکـە لـە سـزای دۆزەخ، بۆیـە خـوا ﷻ پێـش هەمـوو شـتێک دەفەرمـوێ: پارێـزکاران لـە جێگـەو ڕێگـە و نشـینگەیەک و، خانووبەرەیەکـی پـڕ هێمنیـی و ئاساییشـدان.

ئنجـا دوایـی بـاس دەکات، ئـەو جێگـەو ڕێگەیـە، ئـەو نشـینگە پـڕ هێمـن و ئاساییشـە، چـی تێدایـە:

﴿ فِي جَنَّٰتٖ وَعُيُونٖ ﴾، لـە نێـو بـاغ و بێسـتان و گـوڵ و گوڵـزارو، کانیـی و سـەرچاواندان.

ئنجـا ئایا بەرگ و پۆشـاکیان چۆنـە؟ ﴿ يَلۡبَسُونَ مِن سُندُسٖ وَإِسۡتَبۡرَقٖ مُّتَقَٰبِلِينَ ﴾، لـە ئاوریشـمی تەنـک و ئەسـتوور دەپۆشـن، واتـە: پۆشـاکەکەیان لـە ئاوریشـمە، چ هـی تەنـک، چ هـی ئەسـتوور، هـەر کامێکیـان جـۆرە جوانییەکـی خـۆی هەیـە، ئەگەرنـا بەهەشـت وەک دنیـا نیـە، مـرۆڤ بڵـێ: بـا بەرگێکـی ئەسـتوور لەبـەر بکـەم، تاکـو سـەرمام نەبـێ! یـان بـا هـی تەنـک لەبـەر بکـەم، بـۆ ئـەوەی گەرمـام نەبـێ! بەهەشـت سـەرماو گەرمـای لـێ نیـەو، بەڵام ئـەو دوو جـۆرە پۆشـاکە هـەر کامێکیـان جوانییەکـی هەیـە، کـە هـەر خـوا ﷻ دەزانـێ چۆنـن؟

(سُندسٌ وإسْتَبْرَق)، (رَقِيقُ الدِّيْبَاجِ وَغَلِيْظُهُ)، (سُندسٌ) واتە: ئاوریشمی تەنک، (إسْتَبْرَق) کە لە (ستبرک)ی فارسییەوە هاتوە، بە مانای ئەستوور دێ، لە دنیادا نایابترین شت، کە بەرگ و پۆشاکی لێ دروست بکرێ، ئاوریشمە، دیارە ئاوریشم بۆ پیاوان قەدەغەیە، مەگەر پاساوێکی نەخۆشیی پێستیان هەبێ، وەک پێغەمبەر ﷺ بۆ هەندێک لە هاوەڵان، کە نەخۆشیی پێستیان هەبووە ڕێی داوەو مۆڵەتی داوە لەبەری بکەن، ئەگەرنا ئاوریشم هەر بۆ ئافرەتان بەکاردێ، وەک بەکارهێنانی زێڕیش هەر بۆ ئافرەتانە.

بەڵام بە تەئکید ئەو ئاوریشمەی لە بەهەشتدا هەیە، وەک ئەوە نیە، کە لە دنیادا هەیە، هەروەها ئەو زێڕو زیوەی کە لە بەهەشتدا هەیە، جیایە لەوەی کە لە دنیادا هەیە، هەر وەک ئاگری دۆزەخیش کە دواڕۆژدا هەیە، جیایە لە ئاگرەکەی دنیا، وەک پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژێ بە هاوەڵانی فەرموو: ئاگری دۆزەخ، حەفتا هێندەی ئاگری دنیا گەرمە، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! ئەم ئاگرەی دنیاش بەس بوو، پێی سزا بدرێین! فەرمووی: سوێند بەوەی گیانی منی بە دەستە، ئاگری دۆزەخ حەفتا هێندە گەرمە[1]، وا پێدەچێ حەفتا هێندەکەش، بۆ تێگەیاندن بێ، بۆ زێدەڕۆیی بێ، ئەگەرنا مەرج نیە، تەنیا حەفتاش بێ، ئێستا دەرکەوتوە کە دەگونجێ، ملیۆنان پلەی گەرمیی هەبێ، ئاگر لە پلەی سەدیی دەکوڵێنێ، بەڵام دەگونجێ ئاگری زۆر گەرمتر هەبێ ئەو کوورانەی چەکیان تێدا دروست دەکرێ، چەند سەد جار، یان چەند هەزار جار، لەو ئاگرەی کە ئاوی پێ دەکوڵێنرێ، یاخود ئەو ئاگرەی شتی پێ دەسووتێنرێ و، دەبرژێنرێ، گەرمترە.

---

(١) {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ: نَارُكُمْ هَذِهِ الَّتِي يُوقِدُ ابْنُ آدَمَ جُزْءٌ مِنْ سَبْعِينَ جُزْءاً مِنْ حَرِّ جَهَنَّمَ، قَالُوا: وَاللَّهِ إِنْ كَانَتْ لَكَافِيَةً يَا رَسُولَ اللَّهِ! قَالَ: فَإِنَّهَا فُضِّلَتْ عَلَيْهَا بِتِسْعَةٍ وَسِتِّينَ جُزْءًا كُلُّهَا مِثْلُ حَرِّهَا} (أخرجه أحمد: ١٠٢٠٤، والبخاري: ٣٠٩٢، ومسلم: ٢٨٤٣، والترمذي: ٢٥٨٩، وقال: حسن صحيح.

ئنجا دەفەرمـوێ: ﴿ يَلْبَسُونَ مِن سُندُسٍ وَإِسْتَبْرَقٍ مُّتَقَٰبِلِينَ ﴾، پۆشـاکی ئاوریشـمی تەنـک و ئەسـتوور لەبـەر دەکـەن، ﴿مُّتَقَٰبِلِينَ ﴾، ڕووبـەڕووی یەکدی، بەرانبـەر بـە یەکـدی دانیشـتوون، لـە شـوێنەکانی دیکـەدا هاتـوە، بـە تایبـەت لـە سـوورەتی (الصَّافـات)دا، کـە پێشـتر تەفسـیرمان کـردوە، کـە لـە بەهەشـتدا کـۆڕو مەجلیـس دەبەسـتن و، یـادی دنیـا دەکەنـەوەو، یـادی هـاوەڵ و ئاشـنا ناسـیاوەکانیان دەکەنـەوە، ئەگـەر لـە دۆزەخیشـدا بـن و قسـەیان لەگەڵـدا دەکـەن.

﴿ كَذَٰلِكَ وَزَوَّجْنَٰهُم بِحُورٍ عِينٍ ﴾، ئـاوا بـەو شـێوەیە حـاڵ و باڵـی پارێـزکاران و، سـەربارەش جووتمانکـردن و، کردماننـە هاونشـین لەگـەڵ ئافرەتانـی سـپیی و سـۆڵ و، جەسـتە ناسـک و شـۆخ و شـەنگ، چـاوو بـرۆ گـەورەو ڕەش و جوانـدا، (حُـور) کـۆی (حَـوْرَاء)ە، بـە مانـای ئافـرەتی سـپی و سـۆڵ، کـە جەسـتەی بـێ پەڵـەو بـێ لەکـە بـێ، (عِـيْن) کـۆی (عَيْنَـاء)ە، واتـە: ئافرەتـانی زۆر چـاو جـوان، کـە هـەم ڕەشـکێنەی چاویـان، هـەم سـپێنەی چاویـان زۆر تـۆخ و جـوان بـێ.

﴿ يَدْعُونَ فِيهَا بِكُلِّ فَٰكِهَةٍ ءَامِنِينَ ﴾، لەوێـدا هێمنانـەو دڵنیایانـە (لـەو بەهەشـتەدا)، هـەر جـۆرە میوەیـەک داوا دەکـەن، لـە هەمـوو میوەیـەک داوا دەکـەن، لـە هەمـوو میوەیـەک، لەوانـەی کـە لـە دنیـادان، ئێمـە دەزانیـن چیـن و، لـەو میوانەشـی کـە بـەس خـوا ﷻ دەزانـێ بەهەشـت چ میوەیەکـی دیکـەی لێیـە، دنیایـەک کـە بـۆ تاقیکردنـەوەی مرۆڤـان دانـدراوەو، زیاتـر کافـرو بێبڕوایـەکان لێـی بەهرەمەنـدن، لـە نـازو نیعمەتـەکانی، ئـەو هەمـوو شـتانەی تێدابـن، بەهەشـتێک کـە خـوا ﷻ تایبـەت بـۆ دۆسـتەکانی خـۆی دەیڕەخسـێنێ، دەبـێ چـی تێدابـێ! ئـەوەی کـە خـوای بـەرزی مـەزن دەفەرمـوێ: ﴿ فَلَا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَّآ أُخْفِيَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعْيُنٍ جَزَآءًۢ بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٧﴾ ﴾الأحقـاف، واتـە: هیـچ کەسـێک نازانـێ ئـەوەی بـۆی پەنهانکـراوە، لـەوە کـە جێـی شـادمانیی و دڵخۆشـییەتی، بەهـۆی ئـەوەوە کـە دەیانکـرد.

کـە دەفەرمـوێ: ﴿ يَدْعُونَ فِيهَا بِكُلِّ فَٰكِهَةٍ ءَامِنِينَ ﴾، لـە هەمـوو جـۆرە میوەیەکـی تێـدا داوا دەکـەن، دڵنیـاو بـێ ترسیشـن، ئـەوەی پێشـێ بـە گشـتیی فەرمـووی: لـە جێگـەو ڕێگـەو نشـینگەیەکی پـڕ هێمـن و ئاسایشـدان، بـەڵام ئەمەیـان ئـەم ئاسـاییش (**أمـن**)ە، پەیوەندیـی بـە خـواردن و خۆراکەکـەوە هەیـە، واتـە: ئـەو خـواردن و خۆراکـە، ئـەو جـۆرە میوانـە دەخـۆن و، دڵنیـاو بێترسـن، کـە بـە هـۆی خواردنـی ئـەو میوانـەوە، تووشـی نەخۆشـیی و، دەرهاویشـتەی خـراپ نابـن، وەک خواردنـەکانی دنیـا، کـە مـرۆڤ دوو پـاروان لـە خـۆی زیاتـر دەخـوات، دوایـی ناڕەحـەت دەبـێ.

﴿ لَا يَذُوقُونَ فِيهَا ٱلْمَوْتَ إِلَّا ٱلْمَوْتَةَ ٱلْأُولَىٰ ﴾، لـەو بەهەشـتەدا مـردن ناچێـژن، جگـە لـە مـردنی یەکـەم، ئنجـا مـردنی یەکەمیـان لـە دنیـادا چێژتـوە، نـەک لـە بەهەشـتدا، بـەڵام لێـرەدا خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: لـە بەهەشـت دا، مـردن ناچێـژن جگـە لـە مردنـە یەکەمەکـەو، مردنـە یەکەمەکـەش لـە دنیـاداو لـە بەهەشـتدا چێـژراوە، ئـەم تەعبیـرەش وەک دوایـی باسـی دەکەیـن، لـە مەسـەلە گرنگەکانـدا، لەبـەر ئەوەیـە کـە بـڕواداران، هـەر کـە ڕووحیـان لـە جەسـتەیان جیابـۆوە، یەکسـەر دەچنـە بەهەشـت، بۆیـە وەک ئـەو مردنـە، هـەر لەبەهەشـتدا ڕوویدابـێ، یاخـود مانایەکـەی: لـە بەهەشـتدا مـردن ناچێـژن، جگـە لـەو مردنـەی کـە لـە دنیـادا چێژتوویانـە، کـە ئـەو کاتـە دەبـێ بڵێیـن: هەڵاواردنەکـە، هەڵاواردنێکـی دابـڕاوە، بـەڵام ئەگـەر بڵێیـن هەڵاواردنەکـە پەیوەسـتە، دەبـێ مانایەکـەی ئاوابـێ: مـردن لـە بەهەشـتدا ناچێـژن، جگـە لـەو مردنـەی کـە لـە دنیـادا چێژتیـان.

﴿ فَضْلًا مِّن رَّبِّكَ ﴾، ئـەوە بەخششـە لـە پەروەردگارتـەوە، واتـە: ئـەو بەهەشـتەی دەیچنـێ، بارتەقـای کردەوەکانیـان نیـەو، کردەوەکانیـان هـۆکارن، ئیـمان و کـردەوە باشـەکان هـۆکارن، بـۆ چوونـە بەهەشـت، بـەڵام نـرخ و بەهـای بەهەشـت نیـن، بەڵکـو ئـەوە هـەر بەخشـشێکە لـە پەروەردگاریانـەوە، ﴿ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴾، ئـا ئەوەیـە بـە مـراد گەیشـتن و بـە ئـاوات گەیشـتن و، بردنـەوەی مـەزن، نـەک ئـەوەی لە

دنیادا، کافرەکان خۆیانی پێ با دەدەن، کە چوار عانەیان لە گیرفاندایەو، شەش کەس قەڵەباڵغییان بە دەورەوە هەیە، لووتیان دەچێتە ئاسمانێ و هەوایەکیان دەچێتە کەللەوە، بە هەق لەگەڵ کەس ناکەن! نەخێر ئەوە بە ئاوات گەیشتن و بەمراد گەیشتن و بردنەوەی مەزن نیە، بەڵکو بردنەوەی مەزن، ئەوەیە کە خوا ﷻ باسی دەکات و لە بەهەشتدا دێتە دی.

لە کۆتایی دا خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ فَإِنَّمَا يَسَّرْنَٰهُ بِلِسَانِكَ ﴾، بۆیە ئێمە بە زمانی تۆ ئاسانمان کردوە، واتە: قورئانمان ئاسان کردوە، ﴿ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ ﴾، بەڵکو پەند وەربگرن و تێی بگەن، واتە: خەڵکەکەت و کۆمەڵگایەکەت، پێش هەموو کەس کە هاوچەرخی تۆن، بۆیە بە زمانی خۆت قورئانمان ئاسان کردوە، ﴿ فَٱرْتَقِبْ إِنَّهُم مُّرْتَقِبُونَ ﴾، ئەم (ف)ە، (فاء **التَّفْرِيع**)ی پێ دەڵێن، واتە: بەلام بێبڕوایەکان پەندیان وەرنەگرت، لێی ورد نەبوونەوەو، لێی بەهرەمەند نەبوون، بۆیە چاوەڕێ بە، خوا سزایان دەدات، ﴿ إِنَّهُم مُّرْتَقِبُونَ ﴾، ئەوانیش چاوەڕێن، ئەوان چاوەڕێن کە تۆ بمری و پەیامەکەت کۆتایی پێبێ، یاخود: چاوەڕێن ئەوەی تۆ دەیڵێی، بێتە دی، تۆش چاوەڕێ بەو، ئەوانیش دیارە چاوەڕوانن، کە بە تەئکید ئەوەی پێغەمبەری خاتەم ﷺ چاوەڕوانیی کرد، لە دنیادا هاتە دی، کە سەرکەوتنی ئیسلام و، سەقامگیر بوونی پەیام و هیدایەتی خوا بوو، لەسەر گۆی زەوی و، ئەوەی ئەوان چاوەڕێیان دەکرد، کە موحەمەد ﷺ بمرێ و پەیامەکەی نەمێنێ و، چرایەکەی کە بە مۆڵەتی خوا هەڵیکردوە، چرای ئیمان و هیدایەت بکوژێتەوەو خەفە ببێ، ئەوەی ئەوان چاوەڕێی بوون، هەر لە دنیادا هاتە دی و، لە دواڕۆژییشدا بۆیان دەرکەوتوە، کە زۆر بە هەڵەدا چوو بوون، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ چەندە لە دنیادا ناووناوبانگی بەرزکردەوە، وەک دەفەرموێ: ﴿ وَرَفَعْنَا لَكَ ذِكْرَكَ ۝٤ ﴾ **الشرح**، بە تەئکید لە دواڕۆژدا ناوو ناوبانگی بەرزتریشە، هەڵبەتە شوێنکەوتووانیشی هەروان، هەر کەسە بەپێی خۆی، ئەم ئیسلامە هەر کەسێک دەستی تێبگرێ، هەر کەسێک ئەو پەیامی خوایە وەربگرێ و،

خزمـەتی پـێ بـکات، هـەم لـە دنیـادا پێـی بەرزدەبێتـەوە، هـەم لـە دوارۆژیشـدا، وەک پێغەمبـەر ﷺ لـە فەرمایشـتێکدا، دەفەرمـوێ: {إِنَّ اللـهَ يَرْفَـعُ بِهَـذَا الْكِتَـابِ أَقْوَامَـاً وَيَضَـعُ بِـهِ آخَرِيـنَ} (**أخرجـه مسـلم: ٨١٧**)، واتـە: خـوا بـەم کتێبـە، کۆمەڵانێـک بـەرز دەکاتـەوەو، کۆمەڵانێکیـش نـزم دەکاتـەوە.

ئەوانـەی کـە دژایەتیـی دەکـەن و پشـتی تـێ دەکـەن و پشـت گوێـی دەخـەن، نـزم دەبنـەوەو، ئەوانـەش کـە گوێـی لـێ دەگـرن و لێـی تـێ دەگـەن، بەرزدەبنـەوە.

خـوا لـەو کەسـانەمان بگێـڕێ کـە بـە هـۆی قورئانـەوە زیاتـر پێدەگـەن، زیاتـر لـە خـوا نیزیـک دەبنـەوە، زیاتـر پـاک و چـاک و ڕاسـت و سـاغ دەبـن.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

میوەی درەختی ژەقنە مووت، خۆراکی بابای گوناهکارە، کە وەک کانزای تواوە لە سکاندا دەکوڵێ، وەک کوڵینی ئاوی داغ، خوای دادگەر فەرمان بە فریشتەکان دەکات، کە بابای بێبڕواو گوناهکار بگرن و، پەلکێشی نێوەڕاستی ئاگری دۆزەخی بکەن و، دوایی ئاوی داغ و کوڵاوی بە تەپڵی سەردا بکەن و، پێی بگوترێ: بیچێژە! بێگومان تۆی دەسترۆیشتووی بەڕێز! وەک لافت لێ دەدا لە دنیادا، ئەمەش ئەو سزایە بوو کە تێیدا دوو دڵ بوون، مشتومڕتان لە بارەیەوە دەکرد:

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ شَجَرَتَ ٱلزَّقُّومِ ﴿٤٣﴾ طَعَامُ ٱلْأَثِيمِ ﴿٤٤﴾ كَٱلْمُهْلِ يَغْلِى فِى ٱلْبُطُونِ ﴿٤٥﴾ كَغَلْىِ ٱلْحَمِيمِ ﴿٤٦﴾ خُذُوهُ فَٱعْتِلُوهُ إِلَىٰ سَوَآءِ ٱلْجَحِيمِ ﴿٤٧﴾ ثُمَّ صُبُّوا۟ فَوْقَ رَأْسِهِۦ مِنْ عَذَابِ ٱلْحَمِيمِ ﴿٤٨﴾ ذُقْ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْكَرِيمُ ﴿٤٩﴾ إِنَّ هَٰذَا مَا كُنتُم بِهِۦ تَمْتَرُونَ ﴿٥٠﴾ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە حەوت بڕگەدا:

١)- ﴿ إِنَّ شَجَرَتَ ٱلزَّقُّومِ ﴿٤٣﴾ طَعَامُ ٱلْأَثِيمِ ﴾، بەدڵنیایی درەختی زەققووم، خۆراکی گوناهکارە، وا پێدەچێ ژەقنە مووتی کوردیی لە زەققوومەوە هاتبێ، بێگومان کە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ شَجَرَتَ ٱلزَّقُّومِ ﴿٤٣﴾ طَعَامُ ٱلْأَثِيمِ ﴿٤٤﴾ ﴾، بە دڵنیایی درەختی زەققووم خۆراکی گوناهکارە، واتە: بەری درەختی زەققووم، وەک لە سوورەتی (الصافات) دا، پێشتر هێنامان، کە دەفەرموێ: ﴿ أَذَٰلِكَ خَيْرٌ نُّزُلًا أَمْ شَجَرَةُ ٱلزَّقُّومِ ﴿٦٢﴾ إِنَّا جَعَلْنَٰهَا فِتْنَةً

لِّلظَّٰلِمِينَ ﴿٦٣﴾ إِنَّهَا شَجَرَةٌ تَخْرُجُ فِىٓ أَصْلِ ٱلْجَحِيمِ ﴿٦٤﴾ طَلْعُهَا كَأَنَّهُۥ رُءُوسُ ٱلشَّيَٰطِينِ ﴿٦٥﴾ فَإِنَّهُمْ لَءَاكِلُونَ مِنْهَا فَمَالِـُٔونَ مِنْهَا ٱلْبُطُونَ ﴿٦٦﴾ ثُمَّ إِنَّ لَهُمْ عَلَيْهَا لَشَوْبًا مِّنْ حَمِيمٍ ﴿٦٧﴾ ثُمَّ إِنَّ مَرْجِعَهُمْ لَإِلَى ٱلْجَحِيمِ ﴿٦٨﴾ ﴾، کە لە تەفسیری سوورەتی (**الصافات**)دا، بە درێژیی لەو بارەوە قسەمان کردوە و، ئەم ئایەتانەمان تەفسیر کردوون.

کەواتــە: لێــرەدا کــە هــەر ڕێــک دەفەرمــوێ: درەختــی زەققــووم خۆراکــی بابــای گوناهــکارو زۆر تاوانبــارە، واتــە: میوەکــەی و بەرەکــەی کــە دەری دەکات، نــەک خــودی درەختەکــە هەمــووی، بــەڵام لەبــەر ئــەوەی لــەوێ باســی (**طَلْع**)و میوەکــەی کــردوە، لێــرەدا بــە پێویســت نەزانــراوە، بــە زۆریــی وایــە، خــوا ﷻ هەنــدێ شــت کــە یەکجــار بــاس بکــرێ، لــە شــوێنی دیکــە، دووبــارەی ناکاتــەوە، بــەڵام جــاری واش هەیــە، هەقیقەتێــک لــە ســەدان شــوێندا بــاس دەکات، یــان لــە دە شــوێندا باســی دەکات، یــان لــە چــوار شــوێندا باســی دەکات، ئەوەنــدەی پێویســت دەکات، لــە چەنــد شــوێنێکدا باســی درەختــی زەققــووم کــراوە، بــەڵام باســی میوەکــەی کرابــێ و چوێنرابــێ بــە ســەری شــەیتانانەوە، تەنیــا لــە ســوورەتی (**الصافات**)دایــە، ئیــدی کــە لــەوێ باســکراوە، لــە شــوێنەکانی دیکــە پێویســت نەکــراوە، دووبــارە بکرێتــەوە، ئنجــا کــە دەفەرمــوێ: ﴿ إِنَّ شَجَرَتَ ٱلزَّقُّومِ ﴾، بــە دڵنیایــی بــەری درەختــی زەققــووم، یەکســەر دەفەرمــوێ:

﴿ طَعَامُ ٱلْأَثِيمِ ﴾، خواردنــی بابــای زۆر گوناهــکارە، دیــارە: ﴿ شَجَرَتَ ٱلزَّقُّومِ ﴾، مەنصووبــەو دەبێتــە نــاوی (إِنَّ) (إســم إِنَّ)، ﴿ طَعَامُ ٱلْأَثِيمِ ﴾یــش، دەبێتــە گــوزارە، (**خَبَر**)ەکــەی، بــەڵام دەشــگونجێ مانایەکــەی ئــاوا بــێ: بێگومــان درەختــی زەققــووم، هەتــا بڵێــی تــاڵ و ناخۆشــە، خۆراکــی بابــای گوناهبــارە، وەک مــن لــە مانــای دەقــاو دەقەکەیــدا وام هێنــاوە.

(**الأَثِيْــم**): واتــە: (**كَثِيْر الإِثـم**)، زۆر گوناهبــار، چونکــە (**آثِــمْ**) بــە مانــای گوناهبــار، بــەڵام (**أَثِيْــم**)، واتــە: زۆر زۆر گوناهبــار، وەک: (**عَالِــم**)، بــە مانــای: زانــا، (**علیــم**) واتــە:

زۆر زانـا، لێـرەدا کـە دەفەرمـوێ: (**أثیـم**) واتـە: زۆر گوناهـکار، (**الطـبري**) قسـەیەکی جـوان دەکات، دەڵـێ: (**الإثـمُ الـذِي هُـوَ الكُفْـرُ بِرَبِّـهِ، دُونَ غَـيْرِهِ مِـنَ الآثَـام**)، لێـرەدا مەبەسـت لـە گوناهـ ، ئـەو گوناهەیـە کـە بریتیـە لـە بێبڕوایـی بـە پـەروەردگاری، نـەک گوناهـەکانی دیکـە، واتـە: ئـەو گوناهـەی کـە پێـی دەچێتـە دۆزەخ و، ئـەو سـزا سـەختەی پـێ دەدرێ، بریتیـە لـە بێبڕوایـی، ئەگەرنـا نـەک هـەر گوناهێکـی دیکـە، هەنـدێ گونـاه، گوناهـی گچکـەن و، هەنـدێ گونـاه مسـوڵمانانیش تووشـیان دەبـن و، ئیمانیشـیان هەیـە، بـەڵام دوایـی بـە تەوبـە کـردن، یـان بـە شـەفاعەتی پێغەمبـەر ﷺ، یاخـود بـە سـزای قۆناغـی بـەرزەخ، ئـەو گوناهەیـان لـە کـۆڵ دەبێتـەوە، ئەوانـە نـا، بەڵکـو ئـەو گوناهـەی کـە دەیـکات، پێـی بچێتـە دۆزەخ و پێـی لـە بـەری زەققـووم بخـوات، بریتیـە لـە بێبڕوایـی و، هاوبـەش بـۆ خـوا دانـان.

٢)- ﴿كَٱلْمُهْلِ يَغْلِي فِي ٱلْبُطُونِ﴾، وەک کانزا لە سکاندا دەکوڵێ، (**المُهْلُ: الرَّصَاصُ أوِ الفِضَّةُ أو مَا يُذَابُ فِي النَّارِ إذَا أُذِيْبَ فِيْهَا فَتَنَاهَت حَرَارَتُهُ وَاشتَدَّتْ حَمِيَتُهُ فِي شِدَّةِ السَّوادَ**)، (**مُهْل**): بریتیە لە مس، یاخود زیو، یان هەر کانزایەک کە لە ئاگردا بتوێنرێتەوە، کە گەرماییەکەی دەگاتە ئەوپەڕی و، یەکجار زۆر گەرم دەبێ، یەکجار زۆر ڕەشیش دەبێ.

هەڵبەتـە مـەرج نیـە، هەمـوو کانزایـەک ڕەش ببـێ، بەڵکـو جـاری وا هەیـە سـوور دەبێتـەوە، گرنـگ ئەوەیـە (**مُهْـل**) بـە مانـای کانـزای تـواوە دێ، هەندێکیـش گوتوویانـە: تڵتـی زەیـت، زەیتیـش کـە زەیتوونەکـە دەکوڵێـنرێ، بـۆ ئـەوەی زەیـت بەرهـەم بـێ، ئنجـا تڵتەکـەی زۆر گەرمـە، ئەویـش وەک نیمچـە کانزایەکـی تـواوە وایە لـە بـەر گەرمییـان، (**يَغْـلِي**)، ئـەو میـوەی درەختـی زەققوومـە دەکوڵـێ، (**يَغْـلِي الطَّعَـامُ، وَتَغْـلِي الثَمَـرَة**) چونکـە (**يَغْـلِي**) بـە (**تَغْلِي**)یـش خوێنراوەتـەوە، ئنجـا ئەگـەر (**يَغْـلِي**) بـێ، واتـە: خۆراکەکـە دەکوڵـێ لـە سـکیاندا، کـە درەختـی زەققوومـە، ئەگـەر بـە (**ت**) ش بخوێنرێتـەوە (**تَغْـلِي**) ڕاناوەکـەی دەچێتـەوە بـۆ میـوەی درەختـی زەققـووم، (**ثَمَـرَة**) مێینـەی مەجازییـەو، ڕاناوەکـە بـۆ ئـەو دەچێتـەوە.

چۆن دەكوڵێ لە سكیاندا؟

٣)- ﴿كَغَلۡيِ ٱلۡحَمِيمِ﴾، وەک كوڵینی ئاوی كوڵاو و داغ، (وَهُوَ المُسَخَّن الَّذِي قَدْ أوقِدَ عَلَيْهِ حَتَّى تَنَاهَتْ شِدَّةُ حَرِّهِ)، ئەو ئاوەیە كە ئاگری دەدرێتە بەر، تاكو گەرماییەكەی دەگاتە ئەوپەڕی.

لـە بـارەی زەققوومـەوە، ئەمـە گێڕدراوەتـەوە: {عَـنِ ابْـنِ عَبَّـاسٍ رضي اللهُ عَنْهُـمَا، لَـوْ أَنَّ قَطْـرَةً مِـنَ زَقُّـومِ جَهَنَّـمَ أُنزِلَـتْ إلى الدُّنْيَـا، لَأَفْسَـدَتْ عَـلَى النَّـاسِ مَعَايِشَـهُمْ} (أخرجـه الطبري: ٣١٢٠٦).

واتـە: عەبدوڵـڵای كـوڕی عەبباس (خـوا لێیـان ڕازی بـێ)، دەڵـێ: ئەگـەر دڵۆپێـک لـە زەققوومـی دۆزەخ دابەزێنرێتـە سـەر دنیـا، ژیـان و گـوزەرانی هەمـوو خەڵـک تێـک دەدات، هەڵبەتـە ئـەو شـتانەی خـوا دایناون، لـە ڕۆژی دواییـدا، چ وەک پاداشـت بـۆ پارێـزكاران و بـڕواداران، چ وەک سـزا بـۆ بێبڕوایـان و خراپـەكاران، لەگـەڵ ئـەوەی دنیـادا ناچنـە تـای تـەرازووەوەو، بـە خەیاڵـی مرۆڤیـش دانایـەن، لەبـەر ئـەوە نابـێ ئـەو قسـەیەمان پـێ زۆر بێـت، كـە یـەک دڵۆپـە لـە زەققوومـی دۆزەخ هەمـوو دنیـا دەگـۆڕێ و، تێكـی دەدا.

٤)- ﴿خُذُوهُ فَٱعۡتِلُوهُ إِلَىٰ سَوَآءِ ٱلۡجَحِيمِ﴾، بیگرن ئنجا ڕایكێشنە نێوەڕاستی دۆزەخ، لێرەدا شتێک قرتێنراوە كە بە سیاق و سەلیقە دەزانرێ، واتە: (يُقَالُ لِلْمَلَائِكَةِ: خُذُوهُ فَاعْتِلُوه)، بە فریشتان دەگوترێ: بگرن و ڕایكێشن، یان (يَقُولُ الله لِلْمَلَائِكَةِ)، خوا بە فریشتەكان دەفەرموێ: بیگرن، (فاعتِلُوهُ)، واتە: ڕایكێشن، پەلكێشی بكەن، ﴿إِلَىٰ سَوَآءِ ٱلۡجَحِيمِ﴾، بەرەو نێوەڕاستی كڵپەی دۆزەخ، (فاعتِلُوهُ)ش، بە دوو شێوە خوێندراوەتەوە:

أ- (فاعتُلُوهُ)،

ب- (فاعتِلُوهُ)، (عَتَلَهُ: يَعْتِلُهُ ويَعْتُلُهُ: عَتْلاً، إذَا سَاقَهُ بِالدَّفْعِ وَالجَذْب)، (عَتَلَهُ: يَعْتِلُهُ وَيَعْتُلُهُ) هەردووكیان، (عَتْلًا)، چاوگەكەیانە، واتە: ڕایكێشا بە پاڵ پێوەنان و بە ڕاكێشان، بە كوردیی پێی دەگوترێ: پەلكێشكردن، یان پاڵەستۆدان.

٥)- ﴿ ثُمَّ صُبُّواْ فَوۡقَ رَأۡسِهِۦ مِنۡ عَذَابِ ٱلۡحَمِيمِ ﴾، دوایی بەسەر تەپڵی سەریدا بڕێژن، لە ئازاری ئاوی کوڵاوو داغ، تەعبیرەکە ئاوایە: (**مِنْ حَمِيْمِ العَذَاب**)، ئاوی کوڵاو کە مایەی سزاو ئازارە، بەڵام بۆیە فەرموویەتی: ﴿ مِنۡ عَذَابِ ٱلۡحَمِيمِ ﴾، (**أي: مِنَ الحَمِيْمِ الَّذِي هُوَ سَبَبُ العَذَاب**)، لەو ئاوە کوڵاوو داغەی کە هۆکاری ئازارو ئێشە.

وشـەی (**سَـوَاء**): بـە مانـای نێوەڕاسـت دێ، ﴿ إِلَىٰ سَوَآءِ ٱلۡجَحِيمِ ﴾، بـۆ نێوەڕاسـتی دۆزەخ پەلکێشـی بکـەن و، دوایـی لـە ئـاوی کـوڵاوی بەسـەر تەپڵـی سـەردا بکـەن، جگـە لـەوەی ئـەو خواردنـەی خواردوویـەتی لـە سـکیدا، دەکوڵـێ، وەک: مـس و کانزای تـواوە وایـە، دەکوڵـێ و، سـەربارەش ئـاوی کوڵاویشـی بەسـەر تەپڵـی سـەردا بکـەن و، پەلکێشـی بکـەن، ڕایکێشـنە نێوەڕاسـتی ئاگـری دۆزەخ.

(**جَحِيْم**)یـش: (**النَّـارُ المُتَأجِّجَـة**)، ئـەو ئاگـرەی کڵپـەی سـەندوە، کڵپەکـەی سـەوز بـووە لـە بەهێزیـان.

٦)- ﴿ ذُقۡ إِنَّكَ أَنتَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡكَرِيمُ ﴾، بچێژە بە دڵنیایی هەر تۆی دەستڕۆیشتووی زاڵی خاوەن ڕێزو حورمەت، واتە: بەو گوناهکارە بەدبەختە دەگوترێ: بچێژە ئەو ئازارو سزایەی ئێستا پێی سزا دەدرێی، بەڕاستی تۆ بووی دەستڕۆیشتوو بووی، لە نێو کۆمەڵەکەتداو، لە لایان بەڕێز بووی، ئەمەش دوو واتای هەن:

أ- دەگونجێ مەبەست پێی ئەوە بێ، کە لە نێو خەڵکەکەیدا دەستڕۆیشتوو بووەو، ڕێز لێگیراویش بووە.

ب- دەشگونجێ ئەمە بە توانج و تەوسەو بێ، واتە: بیچێژە تۆ بووی کە دەتگوت: من زۆر دەستڕۆیشتووم و زۆریش بەڕێزو حورمەتم، دە بیچێژە دەی! دەستڕۆیشتن و ڕێزو حورمەتەکەت بە خۆسەپاندن و بەستەم، زۆرو بە ناهەق بوو، بۆیە ئاوا لەسەری سزا دەدرێی، کەواتە: بەم واتایە بێ، ئەمە سەرزەنشتکردنە، بە واتایەکەی دیکە بێ، ڕوونکردنەوەی حاڵ و واقعیەتی لە دنیادا، کە تۆ لە دنیادا وا بووی.

٧)- ﴿ إِنَّ هَٰذَا مَا كُنتُم بِهِۦ تَمۡتَرُونَ ﴾، بە دڵنیایی ئەمە، (ئەم ئازارو سزایە)، کە تێیدا دوودڵ بوون، یاخود تێیدا مشتومڕتان دەکردو، شەڕە قسەتان دەکرد، ئەوە ئێستا فەرموون تووشی بوون.

با لە بارەی (**مُهْل**)ەوە، ئەم دەقە بێنین، کە چەمک و واتایەکەی زیاتر ڕوون دەکاتەوە، (**الطبري**) لە تەفسیرەکەی خۆیدا[1] ئەم دەقە دێنێ:

(**عَنِ الْحَسَنِ قَالَ: بَلَغَنِي أَنَّ ابْنَ مَسْعُودٍ ﷺ، سُئِلَ عَنِ الْمُهلِ الَّذِي، يَقُولُونَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ شَرَابُ أَهْلِ النَّارِ، وَهُوَ عَلَى بَيْتِ الْمَالِ؟ قَالَ: فَدَعَا بِذَهَبٍ وَفِضَّةٍ فَأَذَابَهُمَا، فَقَالَ: «هَذَا أَشْبَهُ شَيْءٍ فِي الدُّنْيَا بِالْمُهْلِ الَّذِي هُوَ لَوْنُ السَّمَاءِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، وَشَرَابُ أَهْلِ النَّارِ، غَيْرَ أَنَّ ذَلِكَ هُوَ أَشَدُّ حَرّاً مِنْ هَذَا**)، واتە: حەسەنی بەصرایی (ڕەحمەتی خوای لێبێ)، دەڵێ: پێم گەیشتوە کە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ﷺ لە بارەی (**مُهل**)ەوە پرسیاری لێکراوە، ئەو (**مُهْل**)ەی کە گوتوویانەو دەگوترێ: ڕۆژی قیامەت، خواردنەوەی دۆزەخییانە، ئەوانەی لە نێو ئاگری دۆزەخدان، (ئەو کاتە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود بەرپرسی خەزێنەی دەوڵەت بووە، ئەویش دەیەوێ بەڵگەیەکی کردەیی و واقیعییان بۆ بێنێتەوەو، بە شێوەیەکی واقیعیی بۆیان وێنا بکات) بانگ دەکات دەڵێ: هەندێ زێڕو زیو بێنن، (لە ڕیوایەتی دیکەدا هاتوە، دەڵێ: ئەوەی کە پارچەو شکاوو، پکاو بووەو لە خەزێنەی دەوڵەتدا ماوەتەوە) دەیانتوێنێتەوە، (دوای ئەوەی قاڵ دەبێتەوە ڕەنگەکەی سوور دەبێ، تەواو تەواو گەرم دەبێ)، دەڵێ: ئەمە لەشتی دنیادا وێچووترین شتە بەو (**مُهْل**)ەی خوا ﷻ باسی دەکات، کە ڕەنگەکەی وەک ڕەنگی ئاسمانە، لە ڕۆژی دواییدا، (شین دەبێ)و، خواردنەوەی ئەوانەیە کە لە ئاگری دۆزەخدا دەبن، بەڵام ئەوەی لە قیامەت هەیە، لە دۆزەخدا هەیە، زۆر گەرمترە لەو کانزا تواوەی ئێستا لێرە دەیبینن.

---

(١) جامع البيان، ج٢٥، ص١٣٥، برقم: ٣١٢١٥ .

### مەسەلەی دووەم:

**پارێزکاران لە ڕۆژی دوایی دا سەلامەت و بێ بەڵان، لە نێو باغ و سەرچاواندا، پۆشاکی ئاوریشمی تەنک و ئەستوور دەپۆشن، ڕووبەڕووی یەکدی دادەنیشن و لەگەڵ ئافرەتانی سپی و سۆڵ و قەشەنگ و چاوگەشدا، دەبنە هاونشین و، هەموو جۆرە میوەیەکیان دەبێ و، بێ ترس و بیم دەبن و، مردن ناچێژن، جگە لەو مردنەی یەکەم کە ڕابردووە، ئەوەش هەمووی وەک بەخششی پەروەردگاریان و هەر ئەوەش سەرفرازیی مەزنە:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلْمُتَّقِينَ فِى مَقَامٍ أَمِينٍ ﴿٥١﴾ فِى جَنَّٰتٍ وَعُيُونٍ ﴿٥٢﴾ يَلْبَسُونَ مِن سُندُسٍ وَإِسْتَبْرَقٍ مُّتَقَٰبِلِينَ ﴿٥٣﴾ كَذَٰلِكَ وَزَوَّجْنَٰهُم بِحُورٍ عِينٍ ﴿٥٤﴾ يَدْعُونَ فِيهَا بِكُلِّ فَٰكِهَةٍ ءَامِنِينَ ﴿٥٥﴾ لَا يَذُوقُونَ فِيهَا ٱلْمَوْتَ إِلَّا ٱلْمَوْتَةَ ٱلْأُولَىٰ ۖ وَوَقَىٰهُمْ عَذَابَ ٱلْجَحِيمِ ﴿٥٦﴾ فَضْلًا مِّن رَّبِّكَ ۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿٥٧﴾ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە دە بڕگەدا:

١)- ﴿ إِنَّ ٱلْمُتَّقِينَ فِى مَقَامٍ أَمِينٍ ﴾، بە دڵنیایی پارێزکاران لە نشینگەیەکی پڕ هێمن و ئاساییش و دڵنیاییدان، وشەی (مَقَام) واتە: شوێنی لێوەستان، کە خانووبەرەو جێگەو ڕێگەو، ئەوەی کە پێیەوە پەیوەستە، دەگرێتەوە، خوێنراویشەتەوە: **(فِي مُقَامٍ أَمِين) (مُقام)** یش واتە: شوێنی تێدا نیشتەجێ بوون، واتە: (مَقام)، یانی: شوێنی تێدا وەستان، **(مُقام)** یش واتە: شوێنی تێدا نیشتەجێ بوون و مانەوە، مانایەکەیان لێک نیزیکە.

کە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلْمُتَّقِينَ فِى مَقَامٍ أَمِينٍ ﴾، یان **(مُقام أمين)**، **(أي: الأَمِيْن ساكِنُهُ)**، یانی: ئەو کەسەی تێیدا نیشتەجێ بێ، بێ ترس و بیمەو هەست بە هێمنیی و ئاساییش دەکات، هەروەها دەشگونجێ بگوترێ: شوێنەکە هیچ مەترسیی بە دەوریەوە نیە، لەسەر نیە و وەک شوێنەکانی دنیا کە دەگونجێ لافاویان بۆبێ،

بوومەلەرزەیان بۆ بێ، ئاگرپژێن لێیان بدات، تسۆنامی لێیان بدات، درندەیان بۆ بێ، دوژمن هەڵکوتێتە سەریان، ئەو مەترسییانەی هیچ کام لەسەر نین، بۆیە هەندێک لە توێژەرەوان کە گوتوویانە: (**أَمِيْنٌ سَاكِنُهُ**)، یان (**أَمِنٌ سَاكِنُه**)، پێم وایە مەرج نیە ئەو کەسەی لەوێدا نیشتەجێیە، بەس ئەویان ئەمین و دڵنیاو بێ ترس بێ، بەڵکو شوێنەکەش وەک جوگرافیا ترس و بیم و مەترسی و نارەحەتییەکان رووی تێناکەن.

٢)- ﴿ فِي جَنَّٰتٖ وَعُيُونٖ ﴾، لە باخ و کانیاوان دان، دوایی سەرژمێری ئەو نازو نیعمەتانە دەکەین، کە هەموویان یازدە نازو نیعمەتن، بەڵام جارێ پێیاندا دەڕۆین، لە نێو باخ و گوڵ و گوڵزارو، کانیی و سەرچاواندان.

ئەدی پۆشاکیان چییە؟

٣)- ﴿ يَلۡبَسُونَ مِن سُندُسٖ وَإِسۡتَبۡرَقٖ ﴾، ئاوریشمی تەنک و ئەستوور دەپۆشن، (**مِنْ: لِبَيَانِ الجِنْسِ، وَالْمُبَيَّنُ مَحْذُوفُ دَلَّ عَلَيه يَلْبَسُون**)، (**يَعْنِي: يَلْبَسُون مِنْ ثِيَابِ سُنْدسٍ وَإِسْتَبْرَق**)، ئەم: ﴿ مِن ﴾ە، بۆ ڕوونکردنەوەی جینسی لەبەرکراوو پۆشراوەکەیە، ئنجا پۆشراوەکە قرتێنراوە، چونکە وشەی ﴿ يَلۡبَسُونَ ﴾: دەلالەتی لەسەر دەکات، یانی: (**يَلْبَسُونَ ثِيَابَاً**) یان (**لِبَاسَاً مِنْ سُنْدسٍ وَإِسْتَبْرق**)، (**سُنْدسٍ**) بە ئاوریشمی تەنکی زۆر گرانبەها دەگوترێ، (**إِسْتَبْرق**)یش بە ئاوریشمی ئەستووری گران و بە قیمەت دەگوترێ.

٤)- ﴿ مُّتَقَٰبِلِينَ ﴾، ڕووبەڕووی یەکدی دانیشتوون، (**مُتَوَاجِهِيْن**)، ڕووبەڕووی یەکدی دادەنیشن، لە شوێنەکانی دیکەی قورئاندا خوا ﷻ باسی کردوە: ﴿ إِخۡوَٰنًا عَلَىٰ سُرُرٖ مُّتَقَٰبِلِينَ ﴿٤٧﴾ ﴾**الحجر**، واتە: برایانە لەسەرتەختان ڕووبەڕوون، لە شوێنی دیکە لە سوورەتی (**الحجر**) دا، دەفەرموێ: ﴿ وَنَزَعۡنَا مَا فِي صُدُورِهِم مِّنۡ غِلٍّ ... ﴿٤٧﴾ ﴾، هەرچی کینەو بوغزو غەرەزو هەستیارییە بەرانبەر بە یەکدی، هەموویمان لە دڵ دەرهاویشتن، هەروەها لە سوورەتی (**الأعراف**)یشدا ئاماژە بەوە دەکات و، لە سوورەتی (**الصافات**)یش، باس دەکات، ئەوانە کە دادەنیشن باس و یادی دنیا دەکەنەوە، نەک هەروا بە وشکیی دابنیشن.

٥)- ﴿ كَذَٰلِكَ وَزَوَّجْنَٰهُم بِحُورٍ عِينٍ ﴾، حاڵیان وایەو جووتیشمان کردن لەگەڵ ئافرەتانی سپیی و سۆڵ و چاوگەش و گەورەدا. (كَذَٰلِكَ) واتە: حاڵیان بەو شێوەیە، یاخود ئەوانە لە نازو نیعمەت و، لە حاڵێکی هێندە خۆش دان، مەگەر هەر بچوێنرێ بە خۆیەوە، ئەگەرنا هیچ شتێکی دیکە نیە، بگوترێ: وەک ئەو، ﴿ وَزَوَّجْنَٰهُم بِحُورٍ عِينٍ ﴾، جووتمانکردوون، یان کردوومانن بە هاونشین لەگەڵ ئافرەتانی سپی و سۆڵ و سافدا، لە ڕووی جەستەو دیمەنەوە، ﴿ عِينٍ ﴾، چاو گەورەو چاوگەش و جوان، کەواتە: لێرەدا ﴿ وَزَوَّجْنَٰهُم ﴾، وەک هەموو توێژەرەوانی قورئان گوتوویانەو قسەکەشیان ڕاستە، مەبەست ئەوە نیەو، کە خوا ﷻ هاوسەرگیریی بۆ کردوون و لێکی مارەکردوون، چونکە لە بەهەشتدا مارەکردن نیە و، ئەوە بۆ دنیایە، بەڵام لە بەهەشتدا، هەر کەسە ئەوەی خوا ﷻ پێی بدات، ئەوەی هەیەو پێویست بە مارەکردن ناکات، هەر پێدانی خوای موتەعال، بۆ خۆی ئەوە مارەکردنەکەیە، هەروەک خوا ﷻ زەینەبی بە وشەی موبارەکی خۆی لە پێغەمبەری خوا ﷺ مارە بڕی، کە کچە پووری خۆشی بوو، فەرمووی: ﴿ فَلَمَّا قَضَىٰ زَيْدٌ مِّنْهَا وَطَرًا زَوَّجْنَٰكَهَا ﴿٣٧﴾ ﴾**الأحزاب**، واتە: کاتێک زەید کاری پێی نەماو، لێک جیابوونەوە، لە تۆمان مارە بڕی، ئنجا دوایی زەینەب، وەک لە تەفسیری سوورەتی **(الأحزاب)دا** باسمان کردوە، شانازیی دەکرد، بەسەر هاوسەرانی دیکەی پێغەمبەردا ﷺ هەر کامێکیان شانازیی بە شتێکەوە کردوە، ئەویش دەیگوت: {**زَوَّجَكُنَّ أَهَالِيكُنَّ وَزَوَّجَنِي اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ مِنْ فَوْقِ سَبْعِ سَمَوَاتٍ**} (**أخرجه الترمذي: ٣٢١٣، قال: هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَصَحَّحَهُ الألبَانِي**)، واتە: ئێوە خزم و کەستان مارەیان بڕیون، (لە پێغەمبەر ﷺ)، بەڵام من خوا ﷻ لە سەرووی حەوت ئاسمانانەوە منی مارە بڕیوە.

کە بێگومان شانازییەکی گەورە بووەو، بەس بۆ ئەویش وابووە، (**حُور**) کۆی (**حَوْرَاء**)ە، واتە: ئافرەتی سپی و سۆڵ، کە جەستەی خاڵ و پەڵەو لەکەی پێوە نەبێ، (**عِيْن**)یش کۆی (**عَيْنَاء**)ە، واتە: ئافرەتی چاوگەش و جوان، کە هەم سپێنەی چاوی زۆر سپی بێ، هەم ڕەشکێنەی چاوی زۆر ڕەش بێ، مەرجیش نیە، تەنیا چاویان ڕەش و سپی بێ و چاوڕەش بن، چونکە (**عَيْنَاء**) واتە: چاویان گەورەو

جـوان بـێ، ئنجـا چاویـان شـینە، یـان چاویـان سـەوزە، یـان چاویـان کاڵـە، بۆیـەش لێـرە دەیڵێـم، چونکـە لـە تەفسـیرەکاندا نەمبینیـوە ئەمـە بـاس کرابـێ، هـەر دەڵێـن: سـپێنەی چاویـان زۆر سـپییەو، ڕەشـکێنەی چاویشـیان زۆر ڕەشـە، چوێـنراون بـە چاوی مانـگای کێـوی، یـان چـاوی ئاسـک و مامـزەوە، کـە چاویـان گـەورەو جوانـە، بـەڵام پێـم وایـە وشـەی: (عِـيْن) کـە کـۆی (عَيْنَـاء) واتـە: ئافـرەتی چـاو گـەش و چـاو گـەورەو جـوان، ئنجـا ئیـدی چاوەکـەی ڕەشـە، ڕەش و سـپیە، سـەوزو سـپیە، چـاوی شـینە، چـاوی کاڵـە، هەمـووی دەگرێتـەوە، لەبـەر ئـەوەی هەنـدێ لـە توێـژەرەوانی قورئـان، تەماشـای زەوق و سـەلیقەی خۆیـان، یاخـود دەوروبـەرو ژینگـەی خۆیـان کـردوە، لـەوەوە تەماشـای نیعمەتـەکانی خوایـان کـردوەو، هـەر بـەو شـێوەیەش، بـەو پاشـینە کلتوورییـەی خۆشـیان قورئانیـان تەفسـیر کـردوە، کـە ئـەوە مـرۆڤ تووشـی هەڵـە دەکات، ئەگەرنـا (حُـور) کـۆی (حَـوْرَاء)ە، کـە جەسـتەیان پـاک و بـێ پەڵـەو لەکەیـە، کـە ئەویـش هەرچەنـدە زۆربەیـان دەڵێـن: سـپی و سـۆڵ، بـەڵام دەشـگونجێ بـە مانـای: جەسـتە سـافیی و بـێ پەڵەیـی و بـێ لەکەیـی و، سـاغ و سـاف و جـوان و بەرچاوبـێ، ئنجـا بـا ئەسـمەریش بـێ، بـا هـەر ڕەنگێکـی دیکـەش بـێ، هەروەهـا: (عِيْن)یـش کـە کـۆی (عَيْنَـاء)، واتـە: چـاو گـەش و چـاو گـەورەو جـوان، ئنجـا ڕەنگـی چاوەکـە هەرچییـەک بـێ، کـە بـە پێـی زەوق و سـەلیقەی گـەلان و، نەتـەوەکان و بەپـێ کلتـوری ئـەو گـەل و نەتەوانـە، کـە بەشـێکە لـە پێکهاتەیـان، تێگەیشـتنیان بـۆ جوانییـەکان دەگـۆڕێ، یـانی: بـۆ جـۆری جوانییـەکان تێگەیشـتنەکەیان دەگـۆڕێ، هەیـە چـاوی ئـەم جـۆرەی پـێ جوانـە، هەیـە چـاوی جۆرێکـی دیکـەی پـێ جوانـە، هەیـە ڕەنگـی سـپی پـێ جوانـەو، هەیـە ڕەنگـی ئەسـمەری پـێ جوانـەو، تـا کۆتایـی.

٦)- ﴿يَدْعُونَ فِيهَا بِكُلِّ فَٰكِهَةٍ ءَامِنِينَ﴾، لەوێدا (لە بەهەشتدا)، هێمنانە هەموو جۆرە میوەیەک داوا دەکەن، واتە: هەرچی بیخوازن لێیەتی، (**الفَاكِهَةُ: مَا يُتَفَكَّهُ بِهِ وَيُتَلَذَّذُ بِهِ بِطَعْمِهِ مِنَ الثِّمَارِ وَنَحْوِهَا**)، (**فَاكِهَة**): هەر شتێکە چێژی لێ وەربگیرێ، لەززەتی لێ وەربگیرێ لە خواردنەکەی، ئنجا چ لە میوە، چ لە غەیری میوەش، واتە: ئەویش مەرج

نیە، تەنیا میوە بێ، بەڵکو هەر شتێ کە مایەی چێژ لێوەرگرتن و خۆشی لێوەرگرتن بێ، بێ ئەوەی لەبەر برسییەتیی، یان لەبەر لە کۆڵ خۆکردنەوەی ئازاری برسیەتیی بخورێ.

﴿ءَامِنِينَ﴾، (آمِنِينَ: حَالٌ مِنْ ضَمِيرِ يَدْعُونَ، وَالْمُرَادُ هُنَا أَمْنٌ خَاصٌّ، وَهُوَ الْأَمْنُ مِنَ الْغَوَائِلِ وَالْآلَامِ مِنْ تِلْكَ الْفَوَاكِهِ عَلَى خِلَافِ حَالِ الْإِكْثَارِ مِنَ الطَّعَامِ فِي الدُّنْيَا)، وشەی: (آمنين) حاڵە لە ڕاناوی (يَدْعُونَ) یانی: کاتێک داوای هەموو جۆرە میوەیەک دەکەن، ئەمین و دڵنیاو هێمن و، بێ ترسن، ئەمەش بێ ترسییەکی تایبەتە، کە بریتیە لە بێ ترسیی و دڵنیایی، لەو ئازارو دەرهاویشتە خراپانەی لەو خواردنانە، کە دەیانخۆن، پەیدا دەبن کە بۆ لەززەت و چێژ دەیانخۆن، بە پێچەوانەی هی دنیاوە، کە ئەگەر کەسێک لە شتێک زۆر بخوات، دوایی تووشی ناڕەحەتیی دەبێ و، دەرهاویشتەی خراپی دەبێ.

٧)- ﴿لَا يَذُوقُونَ فِيهَا ٱلْمَوْتَ إِلَّا ٱلْمَوْتَةَ ٱلْأُولَىٰ﴾، لەوێدا مردن ناچێژن، جگە لە مردنی یەکەم، وەک پێشتر باسمانکرد، ئەوە دوو واتای هەن:

أ- ئەم: (إلاَّ)یە، ئەگەر بگوترێ: هەڵاواردنی پەیوەست (**الإِسْتِثْنَاء المُتَّصِل**)ە، واتە: لە بەهەشتدا مردن ناچێژن، جگە لەو مردنەی یەکەم جار، لەبەر ئەوەی مرۆڤی بڕوادار کە ڕووحی لە جەستەی جیادەبێتەوە، یەکسەر ڕووحەکەی دەچێتە بەهەشت، ئنجا وەک لە بەهەشتدا مردبێ وایە.

ب- بەڵام ئەگەر (إلَّا)، بە مانای (غَيْرَ) بێ، نەک بە مانای جگە، یانی مردن ناچێژن لە بەهەشتدا، جگە لەو مردنەی کە لە دنیادا چێشتوویانە، ئەو کاتەش پێی دەگوترێ: هەڵاواردنێکی دابڕاو (**الإِسْتِثْنَاء المُنْقَطِع**).

چونکە پەیوەست، ئەوەیە کە هەڵاوێردراو (**مُسْتَثْنى**)، بەشێک بێ، لە لێ هەڵاوێردراو (**مُسْتَثْنى مِنْهُ**)، بەڵام ئەگەر هەڵاوێردراو بەشێک نەبێ لە لێ هەڵاوێردراو، ئەو کاتە پێی دەگوترێ، هەڵاواردنی دابڕاو.

٨)- ﴿ وَوَقَىٰهُمۡ عَذَابَ ٱلۡجَحِيمِ ﴾، ئەو (خوا ﷻ) پاراستنی، چەپاڵەی دان لە ئازاری کڵپەی دۆزەخ.

٩)- ﴿ فَضۡلٗا مِّن رَّبِّكَ ﴾، ئەوە بەخششە لە پەروەردگارتەوە، ﴿ فَضۡلٗا ﴾، (حَالٌ مِنَ المَذْكُورَات)، هەموو ئەوەی باسکرا، بەخششە لە پەروەردگارتەوە، بەو واتایە: کە ئیمانیان هەبووەو کردەوەی چاکیان هەبووە، هۆکار بووە بۆ چوونە بەهەشتیان، بەڵام بەهەشت و، ئەو هەموو نازو نیعمەتانە، بەهاو تێچوو و نرخەکەیان ئەوەندە ئیمان و کردەوەی باشەی ئەوان نەبووە، بەڵکو تەنیا هۆکار بووە، بەڵام ئەو بەهەشت و نازو نیعمەتە، لە ڕاستییدا بەخششێکە لە پەروەردگارەوە دەدرێ و، ئیمان و کردەوەی چاکیش هۆکاریەتی.

١٠)- ﴿ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ ﴾، ئا ئەوەیە دەربازبوون و قوتاربوونی مەزن، یاخود: ئا ئەوەیە سەرکەوتن و بردنەوەی مەزن و، بە مراد گەیشتنی مەزن، لێرەدا ڕاناوی جیاکردنەوە (**ضمير الفصل**) کە (**هُوَ**)یە، هێنراوە بۆ تایبەت کردنی ئەو بردنەوەو بە مراد گەیشتنە، بە بەخششی پەروەردگارەوە، ئەمیش ئەوە دەگەیەنێ کە جگە لە بەخششی پەروەردگار، بردنەوەو بە مراد گەیشتنێکی دیکە بوونی نیەو، ئەگەر بردنەوە هەبێ، بەس ئەوەیە.

ئنجا بە پێی ئەو مانایەی ئێمە کردمان:

(**إبـن قُتيبـة**) وەک (**الشـوكاني**) لـە (**فتـح القدير**)ەکـەی خۆیـدا[1]، لێی خواسـتۆتەوەو، منیـش دەقەکـەی دێنـم، دەڵێ:

(**إِنَّمَـا اسْـتَثْنَى الْمَوْتَـةَ الْأُولَى وَهِـيَ فِي الدُّنْيَـا، لِأَنَّ السُّـعَدَاءَ حِـينَ يَمُوتُـونَ يَصِـيرُونَ بِلُطْفِ اللّـهِ وَقُدْرَتِـهِ إِلَى أَسْـبَابٍ مِـنَ الْجَنَّـةِ، يَلْقَـوْنَ الـرَّوْحَ وَالرَّيْحَـانَ، وَيَـرَوْنَ مَنَازِلَهُـمْ مِـنَ الْجَنَّـةِ، وَتُفْتَـحُ لَهُـمْ أَبْوَابُهَـا، فَـإِذَا مَاتُـوا فِي الدُّنْيَـا فَكَأَنَّهُـمْ مَاتُـوا فِي الْجَنَّـةِ، لِاتِّصَالِهِـمْ بِأَسْـبَابِهَا**

(١) ج٤، ص٦٩٢ و ٦٩٣.

وَمُشَاهَدَتِهِمْ إِيَّاهَا، فَيَكُونُ الإِسْتِثْنَاءُ عَلَى هَذَا مُتَّصِلًا. وَاخْتَارَ ابْنُ جَرِيرٍ أَنَّ إِلَّا بِمَعْنَى بَعْدَ، وَاخْتَارَ كَوْنَهَا بِمَعْنَى سِوَى ابْنُ عَطِيَّةَ).

(ابْنُ قُتَيْبَةَ) کە زانایەکی زۆر وردە، قسەی زۆری کردووە لە بارەی ئەو ئایەتانەوە، کە مانایان جۆرێک لە ئیشکال و، تەم و مژی بەسەرەوەیە، بە لای زۆربەی خەڵکیەوە، دەڵێ:

بۆیە خوا ﷻ مردنی یەکەمی هەڵاواردوە: ﴿ لَا يَذُوقُونَ فِيهَا ٱلْمَوْتَ إِلَّا ٱلْمَوْتَةَ ٱلْأُولَىٰ ﴾، لە حاڵێکدا کە مردنی یەکەم لە دنیادا بووە، چونکە بەختەوەران کاتێک دەمرن، بە لوتف و توانای خوا دەچنە نێو هۆکارەکانی بەهەشتەوە، لەوێ تووشی (رَوْحٌ وَرَيْحَانٌ)، بەزەیی خواو نازو نیعمەتی خوا دەبن و، شوێنەکانی خۆیان لە بەهەشتدا دەبینن و، دەروازەکانی بەهەشتیان بە ڕوودا دەکرێنەوە، ئنجا کاتێک لە دنیادا دەمرن، وەک ڕێک لە بەهەشتدا مردبن، چونکە یەکسەر پەیوەست دەبن بە هۆکارەکانی بەهەشتەوەو، بەهەشت دەبینن، بۆیە ئەو هەڵاواردنە پێی دەگوترێ: هەڵاواردنێکی پەیوەست، وەک مردنەکە یەکسەر لە بەهەشتدا بووبێ، چونکە بەوێوە پەیوەستە.

بەڵام (ابْنُ جَرِيرٍ) گوتوویەتی: (إِلَّا) لێرەدا بە مانای [دوای] (بَعْد)یە، (لَا يَذُوقُونَ فِيْهَا الْمَوْتَ بَعْدَ الْمَوْتَةَ الأُوْلَى) لە دوای مردنی یەکەم کەلە دنیادا بووە، مردن ناچێژن، ئنجا ئەمە پێی دەگوترێ: هەڵاواردنی دابڕاو.

(ابْنُ عَطِيَّةَ) گوتوویەتی: (إِلَّا) لێرەدا بە مانای: [جگە](سِوَى)یە، (لَا يَذُوقُونَ فِيْهَا الْمَوْتَ سِوَى الْمَوْتَةَ الأُولَى)، جگە لە مردنی یەکەم کە لە دنیایەدا چێشتوویانە، مردن ناچێژن، کەواتە: لە هەردوو حاڵاندا دەبێتە هەڵاواردنێکی دابڕاو.

کەواتە: خوا پاداشتی پارێزکارانی لە یازدە بڕگەدا خستۆتە ڕوو:

١- ﴿ إِنَّ ٱلْمُتَّقِينَ فِي مَقَامٍ أَمِينٍ ﴾، بە دڵنیایی پارێزکاران لە نشینگەیەکی پڕ دڵنیایی و، هێمنیی و، ئاساییشدان.

٢- ﴿ فِي جَنَّٰتٖ وَعُيُونٖ ﴾، لە نێو باغ و بێستان و کانیی و سەرچاوان دان.

٣- ﴿ يَلۡبَسُونَ مِن سُندُسٖ وَإِسۡتَبۡرَقٖ ﴾، پۆشاکی ئاوریشمی تەنک و ئەستوور دەپۆشن.

٤- ﴿ مُّتَقَٰبِلِينَ ﴾، ڕووبەڕووی یەکدی دانیشتوون.

٥- ﴿ كَذَٰلِكَ وَزَوَّجۡنَٰهُم بِحُورٍ عِينٖ ﴾، ئەو نازو نیعمەتە بە جۆرێکە، کە مەگەر هەر بە خۆی بچوێنرێ و، کردوومانن بە هاونشین و هاوڕاز لەگەڵ ئافرەتانی جەستە پاک و بێ پەڵەو بێ لەکەو، چاو گەش و جواندا.

٦- ﴿ يَدۡعُونَ فِيهَا بِكُلِّ فَٰكِهَةٍ ﴾، هەموو جۆرە میوەیەکی تێدا داوا دەکەن.

٧- ﴿ ءَامِنِينَ ﴾، لە حاڵێکدا کە بێ ترسن لە دەرهاویشتەی ئەو میوەیە، هەرچەندە زۆری لێ بخۆن.

٨- ﴿ لَا يَذُوقُونَ فِيهَا ٱلۡمَوۡتَ إِلَّا ٱلۡمَوۡتَةَ ٱلۡأُولَىٰ ﴾، لە بەهەشتدا مردن ناچێژن، جگە لە مردنی یەکەم، کە لە دنیادا چێژتوویانە، بەڵام پەیوەست بۆتەوە بە بەهەشتەوە، لەبەر ئەوەی بڕواداران هەر کە گیانیان، لە جەستەیان جیا بۆوە، یەکسەر دەچنە بەهەشت، وەک مردنەکە لە بەهەشتدا ڕوویدابێ.

٩- ﴿ وَوَقَىٰهُمۡ عَذَابَ ٱلۡجَحِيمِ ﴾، خوا ﷻ چەپاڵەیدان و پاراستنی لە سزاو ئازاری کڵپەی دۆزەخ.

١٠- ﴿ فَضۡلٗا مِّن رَّبِّكَ ﴾، ئەوەش بەخششە لە پەروەردگارتەوە.

١١- ﴿ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ ﴾، ئا ئەوەیە بردنەوەو بە مراد گەیشتن و بە ئاوات گەیشتنی هەرە مەزن.

## مەسەلەی سێیەم و کۆتایی:

**خـوا ﷻ قورئـان بـە زمـانی عەرەبیـی کـە زمـانی پێغەمبـەری خاتـەم موحەممـەد ﷺو گەلەکەیـەتی، ئاسـان کـردوە، تاکـو پەنـد وەربگـرن و، بیـر بکەنـەوە، کەچـی ئەوانـەی بێبـڕوان پشـتیان تێکـرد، بۆیـە فەرمـان بـە پێغەمبـەر دەکات، کـە چـاوەڕێ بـێ، کـەی خـوا سـزایان دەدات، ئەوانیـش چاوەڕێـن بـەو خـەون و خەیاڵانـەوە کـە لـە کەللـەو مێشـکیاندا هەبـوون:**

خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ فَإِنَّمَا يَسَّرْنَٰهُ بِلِسَانِكَ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ ۝٥٨ فَٱرْتَقِبْ إِنَّهُم مُّرْتَقِبُونَ ۝٥٩ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە چوار بڕگەدا:

١- ﴿ فَإِنَّمَا يَسَّرْنَٰهُ بِلِسَانِكَ ﴾، بە دڵنیایی ئێمە بە زمانی تۆ ئاسانمان کردوە.

بێگومـان ڕانـاوی (يسّرنـاه) دەچێتـەوە بـۆ قورئـان، چونکـە هـەر لـە سـەرەتاوە تـا کۆتایـی، بـاس باسـی قورئانـە، بـاسی پەیامـی خوایـە، باسـی پێغەمبـەری خوایـە ﷺ، واتـە: ئـەم قورئانەمـان ئاسـانکردوە، بـە زمـانی تـۆ: (**إِطْلَاقُ اللِّسَانِ عَلَى اللُّغَةِ مَجَازٌ شَائِعٌ، لِأَنَّ أَهَمَّ مَا يُسْتَعْمَلُ فِيهِ اللِّسَانُ الْكَلَامُ**)، بەکارهێـنانی وشـەی (لِسَـان): کـە بـە مانـای زمـانی گۆشـتینە، بـۆ (لغـة) کـە ئاخاوتنـە، مەجازێکـی بـاوە، چونکـە گرنگتریـن شـتێک کـە زمـانی بـۆ بـەکاردێ، بریتیـە لـە قسـەکردن، دەفەرمـوێ: ئێمـە قورئانمـان بـە زمـانی تـۆ (کـە زمـانی عەرەبییـە)، ئاسـان کـردوە، بۆچـی؟

٢)- ﴿ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ ﴾، بەڵکو پەند وەربگرن، لێی تێبگەن و، بیربکەنەوە.

وەک لـە سـوورەتی (**الأحقـاف**)، ئایـەتی ژمـارە: (١٢)دا هاتـوە، کـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَهَٰذَا كِتَٰبٌ مُّصَدِّقٌ لِّسَانًا عَرَبِيًّا لِّيُنذِرَ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ وَبُشْرَىٰ لِلْمُحْسِنِينَ ۝١٢ ﴾، واتـە: ئەمـە کتێبێکـە، بـە ڕاسـت دانـەرە بـە زمـانی عەرەبیـی، تاکـو ئەوانـەی سـتەمکارن، بیانترسـێنێ و، هۆشـدارییان پـێ بـدات و، موژدەشـە بـۆ چاکـەکاران

لێـرەدا کـە دەفەرمـوێ: ﴿ فَإِنَّمَا يَسَّرۡنَٰهُ بِلِسَانِكَ ﴾. پێویسـتە دوو سـەرەنجانی لـێ بدەیـن:

یەکـەم: بۆچـی بـە (فَ) دەسـت پێـدەکات، ﴿ فَإِنَّمَا ﴾؟ شـارەزایانی قورئـان و ڕێزمـانی عەرەبیـی دەڵێـن: (**الْفَـاءُ لِلتَّفْرِيـعِ إِشَـارَةٌ إِلَى أَنَّ مَـا بَعْدَهَـا مُتَفَـرِّعٌ عَـمَّا قَبْلَهَـا، حَيْـثُ كَانَ الْمَذْكُـورُ بَعْـدَ الْفَـاءِ فَذْلَكَـةً لِلسُّـورَةِ، أَيْ إِجْـمَالٌ لِأَغْرَاضِهَـا بَعْـدَ تَفْصِيلِهَـا فِيـمَا مَـضَى**)، واتـە: (فَ) بـۆ لـق دەرکردنـەو، ئاماژەشـە بـەوە کـە ئـەوەی لـە دوایـەوە دێ، پەیدابـووە لـەوەی لـە پێشـەوە بـووە، چونکـە ئـەوەی لـە دوای (ف)ەکـەوە هاتـوە: ﴿ فَإِنَّمَا يَسَّرۡنَٰهُ بِلِسَانِكَ لَعَلَّهُمۡ يَتَذَكَّرُونَ ٥٨ ﴾، ئەمـە وەک خوڵاسـەو گـوشراوی هەمـوو سـوورەتەکەیە، واتـە: کورتـەی مەبەسـتەکانی سـوورەتەکەیە، دوای ئـەوەی درێژەکـەی لـە ئایەتـەکانی پێشـێدا هاتـوە.

ئنجـا کـە دەفەرمـوێ: ﴿ فَإِنَّمَا يَسَّرۡنَٰهُ بِلِسَانِكَ ﴾، واتـە: ئەوەیەکـە بـە زمـانی تـۆ ئاسـانمان کـردوە، بـە زمـانی عەرەبیـی هۆکارەکـەی چییـە؟ ﴿ لَعَلَّهُمۡ يَتَذَكَّرُونَ ٥٨ ﴾، بەڵکـو بیـر بکەنـەوەو پەنـد وەربگـرن، ڕاسـتییەکانیان بێتـەوە بیـر، کـە وشـەی (**إِنَّمـا**)ش بەکارهێـنراوە، کـە (**إِنَّمـا**)، ئامـرازی کورتـە هەڵێنـان و چەسـپاندنە، واتـە: تەنیـا بۆیـە بـە زمـانی تـۆ ئاسـانمان کـردوە، ئـەم قورئانـە، ﴿ لَعَلَّهُمۡ يَتَذَكَّرُونَ ﴾، (**لَعَـلَّ: لِلتَّعْلِيـل أي: لأجَـلِ أن يَتَذَكَّـروا بـهِ**)، واتـە: لـە پێنـاوی ئـەوەدا کـە پەنـدی لـێ وەربگـرن و، پێـی تەمبـێ خـواردوو بـن، ڕاسـتییەکانیان پێـی بیـر بکەوێتـەوە، هەڵبەتـە لێـرەدا مەبەسـت لـە قۆناغـی یەکەمدایـە، ئەگەرنـا، بـە تەئکیـد قورئـان بـە زمـانی عەرەبیـی هاتـوەو، کۆمەڵـگای پێغەمبـەر ﷺ یەکەمیـن کەسـانێک بـوون، لەبـەر ئـەوەی بـە زمـانی خۆیـان بـووە، لێـی بەهرەمەنـد بـوون، بـەڵام دواتـر کۆمەڵـگاکانی دیکـەش لێـی بەهرەمەنـد بـوون، وەک لـە ئایەتـەکانی دیکـەدا باسـکراوە، کـە دەفەرمـوێ: ﴿ إِنۡ هُوَ إِلَّا ذِكۡرٞ لِّلۡعَٰلَمِينَ ٨٧ ﴾ص، ﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا رَحۡمَةٗ لِّلۡعَٰلَمِينَ ١٠٧ ﴾الأنبيـاء.

کەواتــە: کەســانێک کــە دێــن ئایەتێــک لــە ســیاقی خــۆی دەردێنــن، دەیانــەوێ بیگشــتێنن بەســەر تێکــڕای ئایەتــەکانی قورئانــداو دەڵێــن: قورئــان بــەس بــۆ گــەلی عــەرەب هاتــوە، چونکــە خــوا ئــاوا دەفەرمــوێ! دەڵێیــن: نــا لێــرەدا وا دەفەرمــوێ، بــەڵام لــە شــوێنەکانی دیکــەدا، باســی ئــەوە دەکات کــە قورئــان پەیامــی خوایــە، بــۆ هەمــوو مرۆڤایەتیــی، بــەڵام لێــرەدا بــە پلــەی یەکــەم و، یەکەمیــن کەســانێک کــە لــە قورئــان بەهرەمەنــد بــوون، ئــەو کۆمەڵــگا عەرەبییــە بــوون، کــە لــە ڕۆژگاری پێغەمبــەر ﷺ دابــوون، لەبــەر ئــەوەی قورئــان بــە زمــانی خۆیــان بــووە، هــەر بۆیــەش ئــەوان لــە گــەلانی دیکــە بەرپرســیارتر بــوون و، بێگومــان ســزابارتریش دەبــن، ئەگــەر پشــتی تێبکــەن، هــەر بۆیــەش دوایــی خــوا ﷻ دەفەرمــوێ:

٣)- ﴿ فَٱرۡتَقِبۡ ﴾، واتە: تۆ چاوەڕێ بە، (**فَارْتَقِبِ النَّصْرَ**)، تۆ چاوەڕێی سەرخستن بە، یاخود چاوەڕێ بە، ئەوان لە ئەنجامی ئەوەدا کە پشتیان لەم قورئانە کردوە، لەو پەیامی خوایە کردوە، بەڵایان بەسەر بێت.

٤)- ﴿إِنَّهُم مُّرۡتَقِبُونَ ﴾، ئەوانیش چاوەڕێن، واتە: ئەوانیش چاوەڕێن بەسەر تۆدا، زاڵبن، یان چاوەڕێن تۆ پەیامەکەت کۆتایی پێ بێ.

کــە دەفەرمــوێ: ﴿ فَٱرۡتَقِبۡ إِنَّهُم مُّرۡتَقِبُونَ ﴾، ئەمــەش دیســان ئــەوە دەگەیەنــێ کــە شــتێک لــە پێــش ئــەوەوە باســکراوە، واتــە: ﴿ فَإِنَّمَا يَسَّرۡنَٰهُ بِلِسَانِكَ لَعَلَّهُمۡ يَتَذَكَّرُونَ ٥٨ ﴾، (**لَكِنَّهُــمْ أَعْرَضُــوا عَنْــهُ فَارْتَقِــب**)، بــەڵام ئــەوان پشــتیان تێکــردو، ڕوویــان لــێ وەرگێــڕا، بۆیــە چــاوەڕێ بــە، واتــە: چــاوەڕێ بــە، بــەڵای خــواو، ســزای خوایــان بــۆ بــێ، یــان چــاوەڕێ بــە، خــوا تــۆ ســەربخات، ئــەو خــەون و خەیاڵــە خراپانــەی ئــەوان، ببنــە نەخــش و بڵقــی ســەر ئــاوو نەیەنــە دی، تــۆ چــاوەڕێ بــە، ﴿إِنَّهُم مُّرۡتَقِبُونَ ﴾، بــە دڵنیایــی ئەوانیــش چاوەڕێــن.

(**الطـبري**) ئــەم ئایەتــە موبارەکــە ئــاوا مانــا دەکات: (**فَانْتَظِــرْ أَنْــتَ يَـا مُحَمَّــدُ الْفَتْـحَ مِـنْ رَبِّـكَ، وَالنَّصْــرَ عَـلَى هَـؤُلَاءِ الْمُشْرِكِينَ بِاللَّـهِ مِـنْ قَوْمِـكَ مِـنْ قُرَيْـشٍ، إِنَّهُـمْ مُنْتَظِـرُونَ**

عِنْدَ أَنْفُسِهِمْ قَهْرَكَ وَغَلَبَتَكَ بِصَدِّهِمْ عَمَّا أَتَيْتَهُمْ بِهِ مِنَ الْحَقِّ مَنْ أَرَادَ قَبُولَهُ وَاتِّبَاعَكَ عَلَيْهِ)[١].

واتـە: ئـەی موحەممـەد! ﷺ چـاوەڕێ بـە، سەرخسـتن لـە خـواوە، یارمەتیـی و سـەرکەوتن بەسـەر ئـەو هاوبـەش بـۆ خـوا دانەرانـەدا، کـە هاوبەشـیان بـۆ خـوا داناوە، لـە (خەڵکەکـەت)، لـە هـۆزی قوڕەیـش ئەوانیـش لـەلا خۆیانـەوە چاوەڕێـن، کـە تـۆ زەبـوون بـی و بەسـەرتدا زاڵ بـن، بـەوە کـە ئەوانـەی تـۆ هەقـت بـۆ هێنـاون و، دەیانـەوێ پەسـەندی بکـەن و شـوێنت بکـەون، ئەوانـە بگێڕنـەوە و لایـان بـدەن.

وەک لـە جێیەکـی دیکـەدا دەفەرمـوێ: ﴿ قُلْ يَٰقَوْمِ ٱعْمَلُوا۟ عَلَىٰ مَكَانَتِكُمْ إِنِّى عَامِلٌ ﴿١٣٥﴾ ﴾**الأنعـام**، واتـە: بڵـێ: ئـەی خەڵکەکـەم! ئـەی کۆمەڵەکـەم! ئێـوە کاری خۆتـان بکـەن، (هەرچـی لـە تواناتانداپـە)، ئێمـەش کاری خۆمـان دەکەیـن.

ئەمـەش دەکاتـە ئـەو پـەڕی لەخـۆ ڕادیتوویـی و، بەرچـاو ڕوونیـی، کـە بێگومـان بـە هـۆی ئەوەوەیـە کـە خوایـەک ﷻ کـەون و کائینـاتی بەدەسـتە، شـتێکی پـێ بفەرمـوێ، بـە دڵنیایـی هـەر وادەبـێ، وەک لـە کۆتایـی تەفسـیری سـوورەتی (**ص**) دا، باسـمانکرد کـە خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ لِّلْعَٰلَمِينَ ﴿٨٧﴾ وَلَتَعْلَمُنَّ نَبَأَهُۥ بَعْدَ حِينٍۭ ﴿٨٨﴾ ﴾، لەوێـدا باسـمانکرد، کـە ئـەوە ئیعجازێکـی مێژووییـە لـە قوڕئانـدا کـە خـوا دەفەرمـوێ: ئـەم قوڕئانـە، تەنیـا بیرخەرەوەیـە بـۆ هەمـوو جیهانییـان، ﴿ وَلَتَعْلَمُنَّ نَبَأَهُۥ بَعْدَ حِينٍۭ ﴿٨٨﴾ ﴾، بـە دڵنیایـی هەواڵەکـەش دوای ماوەیەکـی کـەم دەزانـن، دوای ماوەیەکـی کـەم، هـەر لـە مـاوەی (٢٣) سـاڵی تەمـەنی موبارەکـی پێغەمبـەردا ﷺ، ئـەم ئایەتـە کـە لـە سـوورەتی (**ص**)دایـە، هەروەهـا ئـەوەی (الدخـان) لـە مەککـە دابەزیـون، کـە قۆناغـی مەککـە (١٣) سـاڵ بـوو، دوایـی زۆری پـێ نەچـوو هـەر لـە تەمـەنی موبارەکـی پێغەمبـەردا ﷺ، ئیسـلام گەیشـتە فـارس و ڕۆم و دنیـا، پێغەمبـەری خـوا ﷺ نامـەی نووسـی بـۆ پادشـای میسـڕو، پادشـای حەبەشـەو، پادشـای فـارس و، پادشـای ڕۆم، کـە ئـەو کات ئـەوان گەورەتریـن دەوڵـەتی دنیـا بـوون، دوای خۆشـی،

---

(١) جامع البيان: ج٢٥، ص١٤٣.

چـوار جێنشـینە ڕاشـیدەکان: (أبوبکـر و عمـر و عثـمان و عـلي)، خـوا لێیـان ڕازی بـێ، ئیسـلامیان بـە زیاتـر لـە نیـوەی دنیـای ئـەو کاتـە گەیانـد.

کەواتـە: خـوا ﷻ کە دەفەرمـوێ: ﴿ وَلَتَعْلَمُنَّ نَبَأَهُۥ بَعْدَ حِينِۭ ﴿٨٨﴾ ﴾ص، دوای ماوەیەکی کـەم هەواڵەکـەی دەزانـن، ئەمـە ئیعجازێکـی مێژووییـە، ئیسـلامێک کـە گرفتـار بـوو بـوو لـە نێـوان چـوار دیـواری چیـاو چۆڵـی مەککـەدا و کافـرەکان بەتەمـا بـوون، هـەر لـەوێ سـەر بنێتـەوە، کەچـی خـوا ﷻ ئـەو کاتـە فەرموویـەتی: ئـەم پەیامـە بـۆ هەمـوو جیهانییانـە و، لەمـەودوا هەواڵەکـەی دەزانـن، ئنجـا دوای ماوەیەکـی کـەم، هەواڵەکەشـیان زانی و ئیسـلام بـە هەمـوو دنیـادا، بـڵاو بـۆوە، ئەوانـەش کـە دژایەتیـی ئیسـلامیان کـرد: ئەبـوو جەهـل و عوتبـەو شـەیبەو وەلیـدی کـوڕی موغیرەو نەضـڕی کـوڕی حاریـس و ئومەییـەی کـوڕی خەڵـەف، کـێ و کـێ، فـڕێ درانـە نێـو زبڵـدانی مێـژوو، مەگـەر وەک مێـژوو بەسـەرهاتیان بـاس بکـرێ، ئەگەرنـا ناویـان لـە کوولەکـەی تـەڕدا نەمـا!

لێـرەدا کۆتایـی بە تەفسـیری سـوورەتی (الدخـان)، دێنین و لە خـوای پەروەردگاریش داواکاریـن یارمەتییـمان بـدات، چاکـتر لـە کتێـب و فەرمایشـتەکەی تێبگەیـن و، باشـتر پێیـدا قـووڵ ببینـەوەو، لێـی بەهرەمەنـد بیـن، یارمەتییشـمان بـدات هەرچـی لێـی تێدەگەیـن، بەهۆیـەوە پێبگەیـن، هەرچـی لێـی دەزانیـن بیتوانیـن و، هەرچـی لێـی حاڵیـی دەبیـن لـە خۆمانـدا بیکەینـە حـاڵ و، پێشـێ خۆمانـی پـێ چـاک بکەیـن، ئنجـا دەوروبـەرو کۆمەڵگامـان، بێگومـان قورئانیـش ڕۆشـنایی خـواو، بەرەکـەت و هیدایـەتی خوایـە، بـۆ تێکـڕای مرۆڤایەتیـی، بـەڵام ئێمـە ئەرکـی سـەر شـانمانە پێشـێ ئەوانـەی لێـمان نیزیکـن، دوایـی کۆمەڵـگاو دەوروبەرمـان لـەم نـوورو هیدایەتـە بەهرەمەنـد بکەیـن، خـوای بەخشـەرو ئـەو کارەمـان بـۆ ئاسـان بـکات.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## دەستپێک

بەڕێـــــــزان!

ئەمـــڕۆ کـــە (٢٨)ی (**جـــمادی الأولی**)ی ســـاڵی (١٤٤١)ی کۆچییـــە، بەرانبـــەر (٢٠٢٠/١/٢٣)ی زاینیـی، لـە شـاری هەولێـر، دەسـت دەکەیـن بـە تەفسـیری سـوورەتی (**الجاثیـة**)، کـە وەک عـادەتی خۆمـان سـەرەتا پێناسـە و نێوەڕۆکـی ئـەم سـوورەتە موبارەکـە دەخەینـە ڕوو، ئەویـش لـە حـەوت بڕگـەدا:

## نێوەڕۆکی سوورەتی (الجاثیة) و بابەتەکانی

### یەکەم: ناوی ئەم سوورەتە:

ئـەم سـوورەتە کـە سـوورەتی شەشـەمە لـە (**حوامیـم**)، یـان (**ذواتُ حـم**)، نـاوی هـەرە بـاوی بریتیـە لـە: (**سـورةُ الجَاثیـة**)، بـەڵام هـەر کام لـە: (**حـم و الجاثیـة**)، و (**سـورة الشَّریعـة**)، و (**سـورةُ الدَّهر**)یـشی پێگوتـراوە، بـەڵام زیاتـر بـە (**سـورة الجاثیـة**) نـاسراوە.

### دووەم: شوێنی دابەزینی:

ئـەم سـوورەتە مەککەییـەو لـە قۆناغـی مەککـەدا دابەزیـوە، ئـەوە بـەلای زۆربـەی هـەرە زۆری زانایانـەوە، بـەڵام هەندێکیـان لـە عەبدوڵـڵای کـوڕی عەببـاس (خـوا لـە خـۆی و بـابی ڕازی بـێ)و، قەتـادەوە، کـە یەکێکـە لـە زانایـانی شـوێنکەوتووان (**تابعین**)، هێناویانـە، کـە هـەردووک ئایـەتی (١٤ و ١٥) کـە خـوا ﷻ تێیانـدا دەفەرمـوێ: ﴿قُل

﴿ لِّلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ يَغْفِرُوا۟ لِلَّذِينَ لَا يَرْجُونَ أَيَّامَ ٱللَّهِ لِيَجْزِىَ قَوْمًۢا بِمَا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ ﴿١٤﴾ مَنْ عَمِلَ صَٰلِحًا فَلِنَفْسِهِۦ ۖ وَمَنْ أَسَآءَ فَعَلَيْهَا ۖ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّكُمْ تُرْجَعُونَ ﴿١٥﴾ ﴾الجاثية.

گوتوویانە: ئەم دوو ئایەتە لە مەدینە هاتوونە خوار، گوایە لە بارەی عومەری کوڕی خەتتابەوە (خوا لێی ڕازی بێ)، کە پیاوێکی هاوبەش دانەر قسەی پێگوتوە، یاخود یەکێک لە زانایانی جوولەکە قسەیەکی بێ جێی کردوە بەرانبەر بە خوا ﷻو، عومەریش تووڕە بووەو ویستوویەتی سزای بدات، بەڵام دوایی پێغەمبەر ﷺ پێیزانیوەو ڕێی لێگرتوە، دوایی ئەوە باسی دەکەین، کە ئەو ڕیوایەتانەی لەو بارەوە هاتوون، یاخود لە بارەی ڕووداوێکی دیکەوە کە گوایە لە مەدینە ڕوویداوە، هیچیان سەنەدەکەیان جێی پشت پێ بەستن نیە، بۆیە ئێمە هەر لەسەر ئەو ڕایەین، کە ئەم سوورەتە هەمووی شوێنی دابەزینی بریتیە لە مەککەو، لە قۆناغی دا مەککە دابەزیوە.

## سێیەم: ڕیزبەندیی لە موصحەف و هاتنەخواردا:

زۆربەی هەرە زۆری زانایان ئەم سوورەتەیان لە ڕیزبەندیی دابەزین (**ترتيب النزول**)دا، ژمارە (٦٤)یان، بۆ داناوە و، لە دوای سوورەتی (**الدخان**)و، پێش سوورەتی (**الأحقاف**) دابەزیوە، واتە: هەر لەو شوێنەی کە ئێستا لە موصحەفدا تێیدا دانراوە، ڕیزبەندییەکەی لە دابەزینیشدا لە ڕووی شوێنە جوگرافییەکەیەوە، نەک لە ڕووی ژمارەی ڕیزبەندیی موصحەفەوە، چونکە لە ڕیزبەندیی موصحەفدا، ژمارەکەی (٤٥)ە، دیارە ئەمیش بە پێی ئەوە کە ژمارە (٦٤) بێ، واتە: (٦٤)ەمین، سوورەت بێ دابەزیبێ، بە مەزەندە دەکەوێتە ساڵانی هەشت و نۆ و، ئەو دەوروبەرەی قۆناغی مەککەوە.

## چوارەم: ژمارەی ئایەتەکانی:

ژمارەی ئایەتەکانی سوورەتی (**الجاثیة**)، بە لای خەڵکی مەدینە و مەککە و شام و بەصرەوە: (٣٦)ە، بەڵام بە لای خەڵکی کووفەوە: (٣٧)ە، هۆکاری ڕاجیاییەکەشیان ئەوەیە کە بێژەی (**حم**) ئایەتێکی سەربەخۆیە، یان نا؟!

زانایانی کووفە (**حم**)یشیان، بە ئایەتێکی سەربەخۆ دانـاوە، بۆیە ژمارەی ئایەتەکان بۆتە (٣٧)، بەڵام ئەوانی دیکە (**حم**)یان، بە بەشێک لە ئایەتێک داناوە، نەک ئایەتێکی سەربەخۆ، بۆیە ژمارەی ئایەتەکان بۆتە (٣٦)، هەمیشە جیاوازیی ژمارەی ئایەتەکان دەگەڕێتەوە -- وەک پێشتریش گوتوومانە -- بۆ کورتیی و درێژیی ڕستەکانی قورئان.

## پێنجەم: نێوەڕۆکی:

ئەم سوورەتە، هەمان نێوەڕۆکی سوورەتە مەککەییەکانی هەیە، کە ئێمە لە بەرگی پێنجی ئەم تەفسیرەدا، لە کاتی تەفسیر کردنی سوورەتی (**الأنعام**)دا، لە سەرەتاکەیەوە باسێکی تا ڕادەیەک تێرو تەسەلمان کردوە، لە بارەی قورئانی مەککەیی و قورئانی مەدینەیی و، نێوەڕۆکی هەردووکیان و هێڵە گشتییەکانیانەوە، ئەم سوورەتەش هەمان نێوەڕۆکی قورئانی مەککەیی و سوورەتە مەککەییەکانی هەیە، بەڵام دوای ئاماژەیەکی کورت بە قورئان، زۆرترین پانتایی بۆ خستنەڕووی بەڵگە و نیشانەکانی بەدیهێنەرایەتیی و، پەروەردگارێتیی خوا تەرخانکراوە، لەم سوورەتەداو، دوای ئەویش بۆ ڕۆژی دوایی بە تایبەتی قۆناغی قیامەت و زیندووکرانەوەو سزا و پاداشتدرانەوە، لە نێواخنی ئەوەشدا سزا و ئازاری بێبڕوایان و سەرەنجامی شوومیان، باسکراوەو، ئاماژەیەکیش بە پاداشت و نازو نیعمەتێک کە خوا کە بۆ بڕوادارانی داناوە، کراوە.

هەروەها ئاماژەیەک بە هەڵس و کەوتی لێبوردانەی بڕواداران لەگەڵ بێبڕوایاندا کراوەو، ئاماژەیەکیش بە ئەزموونی شکستخواردووی جوولەکەکان لە دینداریيدا، کراوەو، ئاماژەیەکیش بە مولحیدەکان کراوە، ئەوانەی بڕوایان بە خوا ﷻ نیە، وەک بەدیهێنەر و پەروەردگار و خاوەنی گەردوون و ئاسمان و زەوی و ژیانی مرۆڤ، بڕواشیان بە زیندووکرانەوە نیەو، بڕواشیان بەوە نیە کە خوا ﷻ هیچ کەسێکی بە ناوونیشانی پێغەمبەر ڕەوان کردبێ و، هیچ کتێبێکی بە ناوونیشانی پەیام و بەرنامەی خۆی ناردبێ، دیارە کەسێک بڕوا بە خوا نەهێنێ، ئەو شتانەی دیکە کە پەیوەندییان بە خواوە هەیە، چ ناردنی پێغەمبەران، چ دابەزاندنی کتێبان، چ زیندوو کرانەوەی مرۆڤان، بڕوای بە هیچیان نیە وەک دەرهاویشتەیەکی ئاسایی ئیلحادەکەی.

## شەشەم: تایبەتمەندییەکانی:

پێنج تایبەتمەندیی ئەم سوورەتە موبارەکەمان خستوونە ڕوو و ناشڵێم: هی دیکەشی نین:

١- تەنیا لەم سوورەتەدا بە ڕوونیی باسی کەسانێکی مولحید کە لە مێژوودا بە: (**الدَّهريون، الملاحدة، الزَّنَادِقة**) ناسراون، کراوە، لە ئایەتی ژمارە (٢٤)دا کە خوا دەفەرمووێ: ﴿ وَقَالُوا۟ مَا هِىَ إِلَّا حَيَاتُنَا ٱلدُّنْيَا نَمُوتُ وَنَحْيَا وَمَا يُهْلِكُنَآ إِلَّا ٱلدَّهْرُ ۚ وَمَا لَهُم بِذَٰلِكَ مِنْ عِلْمٍ ۖ إِنْ هُمْ إِلَّا يَظُنُّونَ ﴿٢٤﴾ ﴾، هەڵبەتە لە شوێنی دیکەشدا باسکراوە، بەڵام لێرەدا زۆر بە ڕوون و ڕاشکاویی، ئەگەرنا لە سوورەتی (**الطور**)یشدا کە خوا دەفەرمووێ: ﴿ أَمْ خُلِقُوا۟ مِنْ غَيْرِ شَىْءٍ أَمْ هُمُ ٱلْخَٰلِقُونَ ﴿٣٥﴾ أَمْ خَلَقُوا۟ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ ۚ بَل لَّا يُوقِنُونَ ﴿٣٦﴾ ﴾، ئەوەش هەر ئاماژەیەکە بە پووچەڵیی بیرۆکەی ئیلحاد، واتە: ئایا بەبێ بەدیهێنەر هێنراونە دی، یان خۆیان بە دیهێنەرن؟، یان ئایا ئاسمانەکان و زەوییان وەدیهێناون؟، بەڵکو زانیارییەکی جێی دڵنیاییان نیە (بۆیە ئەو قسانە دەکەن)، ئێمە لە مەوسووعەی: (ئیمان و ئیلحاد)دا، هەموو ئەو ئایەتانەی ئاماژە دەکەن بە ئیلحاد هێناومانن، چونکە هەندێک لە زانایانی هاوچەرخ گوتوویانە: لە قورئاندا هیچ ئایەتێک نیە لە بارەی ئیلحادەوە، بەڵام ئەو ڕایە ڕاست نیە.

٢- تەعبیری: ﴿إِنَّا كُنَّا نَسْتَنسِخُ مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٢٩﴾﴾، واتە: ئێمە ئەوەی ئێوە دەتانکرد، نوسخەمان لەبەر دەگرتەوە، ئەوەش تەنیا لەم سوورەتەدا هاتوە.

٣- وشەکانی (**شَرِيْعَة**)و، (**دَهر**)و، (**جَاثِيَة**)، تەنیا لەم سوورەتەدا هاتوون، دیارە لە سوورەتی (**المائدة**)دا، باسی (**شِرْعَة**) کراوە، هەروەها لە سوورەتی (**الشورى**)دا، (**شَرَعُوا**) و (**شَرَعَ**) هاتوون، بەڵام تەنیا لەم سوورەتەدا وشەی (**شَرِيْعَة**) هاتوە، هەروەها وشەی (**دَهر**)یش تەنیا یەکجارو لەم سوورەتەدا هاتوەو، وشەی (**جَاثِيَة**)ش، هەر یەکجارو تەنیا لەم سوورەتەدا هاتوە.

٤- تەعبیری: ﴿إِن نَّظُنُّ إِلَّا ظَنًّا وَمَا نَحْنُ بِمُسْتَيْقِنِينَ ﴿٣٢﴾﴾یش، تەنیا لەم سوورەتەدا هاتوەو، ئەو تەعبیرەش ئەو ڕاستییەمان بۆ دەردەخات کە (**يقين**) و (**ظن**)، دژ و پێچەوانەی یەکدین، (**يَقِين**) واتە: دڵنیایی، (**ظَنّ**) واتە: گومان، (**شَكّ**)یش، یانی: دوو دڵیی، (**شَكّ**): ئەوەیە کە لە نێوان بوون و نەبوونی شتێکدا، مرۆڤ دوو دڵ بێ و، دوو ئەگەری یەکسان دابنێ بۆ هەردووکیان، بەڵام (**ظن**): ئەوەیە کە بوونی ئەو شتە، یان نەبوونی، زاڵ بکات بەسەر لایەکیاندا.

کەواتە: زۆر کەس کە پێی وایە (**شَك**) و (**ظَن**)، یەک واتایان هەن، وانیە، (**شَكّ**) واتە: دوو دڵیی، (**ظَن**) واتە: گومان، (**يقين**)یش واتە: دڵنیایی.

٥- تەعبیری: ﴿وَسَخَّرَ لَكُم مَّا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا مِّنْهُ ﴿١٣﴾﴾، کە وشەی (**مِنْهُ**)ی لەگەڵدابێ لە ئایەتی ژمارە (١٣)دا، تەنیا لەم سوورەتەدا هاتوە، واتە: هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە، تێکڕای لە لایەن خۆیەوە، بۆ ئێوە دەستەمۆو ملکەچ کردوە.

## حەوتەم: دابەشکردنی ئایەتەکانی بۆ چەند دەرسێك:

ئێمە کۆی ئەو (٣٧)، ئایەتەی ئەم سوورەتە، بۆ سێ دەرس دابەش دەکەین:

**دەرسی یەکەم:** ئایەتەکانی: (١ - ١٥)، واتە: پازدە ئایەتی سەرەتا کە تەوەری سەرەکییان، باسی نیشانە و بەڵگەکانی پەروەردگارێتیی خوایە، وێڕای باسی قورئان

و ڕێنماییەکی گرنگ بۆ بڕواداران، لە بواری مامەڵەیان لەگەڵ نەیارەکانیاندا، لەگەڵ بێبڕوایاندا.

**دەرسی دووەم:** ئایەتەکانی: (١٦ - ٢٦)، واتە: یازدە ئایەت، تەوەری سەرەکییان، باسی ئەزموونی جوولەکەیە لە دینداریی یاندا، کە لێرەدا زیاتر باسی شکستخواردنیان کراوە لە ئەزموونی دینداریی یاندا، کە بریتییە لە دووبەرەکیی و ناکۆکیی و پەرتەوازەیی یان، پاشان باسی پابەندییە بە شەریعەتەوە، یانی: فەرمان کردنە بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ و شوێنکەوتووانی، پابەندبن بەو شەریعەتەوە کە خوا بۆی دابەزاندوون، هەروەها باسی حیکمەتی دروستکرانی گەردوون و، باسی مولحیدان و، نکوولییان لە قیامەت و بەئاماژە بەرپەرچدانەوەیان، ئەم دەرسە ئەو باس و بابەتانەی تێدان.

**دەرسی سێیەم و کۆتایی:** ئایەتەکانی (٢٧ - ٣٧)، واتە: یازدە ئایەت دەگرێتە خۆی، کە تەوەری سەرەکییان، باسی قیامەت و چارەنووسی شوومی بێبڕوایانەو، سەرزەنشتکرانیانە، لە کۆتاییشدا ڕاگەیاندنی ستایش و پایە بەرزیی و گەورەیی و مەزنیی خوای بەرزی بێ وێنەیە.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسی یەکەمە، لە پازدە (١٥) ئایەتی سەرەتای ئەم سوورەتە پێکدێ، ئایەتەکانی: (١ - ١٥)، کە وێڕای ئاماژەیەکی کورت بە قورئان و، ئایەتەکانی و، هەڵوێستی نەرێنییانەی بێبڕوایان لە بەرانبەریاندا، جگە لەوە، ئەم پازدە ئایەتە هەموویان بۆ خستنەڕووی بەڵگە و نیشانەکانی پەروەردگاریتیی خوا، تەرخانکراون و، بەگشتیی ئەم هەشتە باسکراون:

١- ئاسمانەکان و زەوی.

٢- دروستکرانی مرۆڤان.

٣- بڵاوکردنەوەی ژیانداران لە زەویدا.

٤- جیاوازیی و جێگۆڕکێی شەوو ڕۆژان.

٥- دابەزاندنی ئاو لە ئاسمانەوەو، پێ ژیاندنەوەی زەوی، دوای مردنی.

٦- جۆراوجۆر کردنی بایەکان لە ڕووی هەڵکردنیانەوە و، لە ڕووی ئەندازەی بەهێزیی و، سووکییان و، لە ڕووی ماهیەتییانەوە.

٧- دەریا و کەشتییەکانی نێوی و بازرگانیی پێکردنیان.

٨- ڕامکردنی هەرچی لە ئاسمانەکان و زەوی دا هەیە، وەک بەڵگە لەسەر پەروەردگاریتیی خوا، کە هاوکات نیعمەت و چاکەی خواشن لە ژیانی مرۆڤدا.

لە کۆتاییشدا ئامۆژگاریی بڕواداران کراوە، کە چۆن لەگەڵ نەیارەکانیاندا مامەڵە بکەن؟ دەبێ چاوپۆشییان لێبکەن و، سینگ فراوان و لێبوردەبن، ئەو ڕاستییەش ڕاگەیەنراوە، کە هەر کەسە لە چاکەی خۆی بەهرەمەندەو، لە خراپەکەشی زەرەرمەندە.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿ حمٓ ﴿١﴾ تَنزِيلُ ٱلْكِتَٰبِ مِنَ ٱللَّهِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَكِيمِ ﴿٢﴾ إِنَّ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ لَءَايَٰتٍ لِّلْمُؤْمِنِينَ ﴿٣﴾ وَفِى خَلْقِكُمْ وَمَا يَبُثُّ مِن دَآبَّةٍ ءَايَٰتٌ لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ ﴿٤﴾ وَٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ وَمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مِن رِّزْقٍ فَأَحْيَا بِهِ ٱلْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا وَتَصْرِيفِ ٱلرِّيَٰحِ ءَايَٰتٌ لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ ﴿٥﴾ تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱللَّهِ نَتْلُوهَا عَلَيْكَ بِٱلْحَقِّ فَبِأَىِّ حَدِيثٍ بَعْدَ ٱللَّهِ وَءَايَٰتِهِۦ يُؤْمِنُونَ ﴿٦﴾ وَيْلٌ لِّكُلِّ أَفَّاكٍ أَثِيمٍ ﴿٧﴾ يَسْمَعُ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ تُتْلَىٰ عَلَيْهِ ثُمَّ يُصِرُّ مُسْتَكْبِرًا كَأَن لَّمْ يَسْمَعْهَا فَبَشِّرْهُ بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٨﴾ وَإِذَا عَلِمَ مِنْ ءَايَٰتِنَا شَيْـًٔا ٱتَّخَذَهَا هُزُوًا أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ مُّهِينٌ ﴿٩﴾ مِّن وَرَآئِهِمْ جَهَنَّمُ وَلَا يُغْنِى عَنْهُم مَّا كَسَبُوا۟ شَيْـًٔا وَلَا مَا ٱتَّخَذُوا۟ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَوْلِيَآءَ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿١٠﴾ هَٰذَا هُدًى وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِمْ لَهُمْ عَذَابٌ مِّن رِّجْزٍ أَلِيمٌ ﴿١١﴾ ٱللَّهُ ٱلَّذِى سَخَّرَ لَكُمُ ٱلْبَحْرَ لِتَجْرِىَ ٱلْفُلْكُ فِيهِ بِأَمْرِهِۦ وَلِتَبْتَغُوا۟ مِن فَضْلِهِۦ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿١٢﴾ وَسَخَّرَ لَكُم مَّا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا مِّنْهُ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴿١٣﴾ قُل لِّلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ يَغْفِرُوا۟ لِلَّذِينَ لَا يَرْجُونَ أَيَّامَ ٱللَّهِ لِيَجْزِىَ قَوْمًۢا بِمَا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ ﴿١٤﴾ مَنْ عَمِلَ صَٰلِحًا فَلِنَفْسِهِۦ وَمَنْ أَسَآءَ فَعَلَيْهَا ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّكُمْ تُرْجَعُونَ ﴿١٥﴾ ﴾

## مانای دەقا ودەقی ئایەتەکان

{بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە، حا میم (١) دابەزاندنی ئەم کتێبە لە لایەن خوای زاڵی کاربەجێ وەیە (٢) بە ڕاستیی لە ئاسمانەکان و زەوی دا، بۆ بڕواداران بەڵگە و نیشانە(ی زۆر) هەن (لەسەر بەدیهێنەرایەتیی و پەروەردگارێتیی خوا) (٣) هەروەها لە دروستکردنی خۆتان و ئەو ژیاندارانەی (خوا لە زەویدا) بڵاوی کردوونەوە، بەڵگەو نیشانە(ی زۆر) هەن، بۆ دڵنیایان (لە بڕوایاندا) (٤) دیسان جیاوازیی و جێگۆڕکەی شەو و ڕۆژ و، ئەو بژیوەی خوا لە ئاسمانەوە دایبەزاندوەو، دوای مردن (و وشک هەڵگەڕانی) زەوی پێ ژیاندۆتەوە، بەڵگەو نیشانەن بۆ کۆمەڵێک بفامن (٥) ئەوانە ئایەتەکانی خوان بە هەق بەسەرتیاندا دەخوێنینەوە، ئنجا ئایا (بێبڕوایان) دوای خواو ئایەتەکانی، بە چ قسەیەک بڕوا دێنن؟ (٦) سزای سەخت بۆ هەر درۆزنێکی زۆر گوناهکار (٧) گوێبیستی ئایەتەکانی خوا دەبێ بەسەریدا دەخوێنرێنەوە، کەچی دوایی خۆبەزلگرانە هەر سوور دەبێ (لەسەر بێبڕوایی) وەک هەر نەیبیستبێ! دەجا موژدەی ئازارێکی بە ئێش و ژانی بدەیە (٨) ئەگەر شتێکیش لە ئایەتەکانمان بزانێ، بە گاڵتەجاڕیان دەگرێ (گاڵتەیان پێ دەکات)، ئەوانە ئازارێکی ڕیسواکەریان هەیە (٩) دۆزەخ لە پشتیانەوەیە (چاوەڕێیانە)و، ئەوەی وەدەستیان هێناوە (لە ماڵ و سامان)و، ئەوانەش کە لە جیاتی خوا بە دۆست و سەرپەرشتیاریان گرتوون (و پەرستوویانن)، هیچ سوودیان پێ ناگەیەنن و، ئازارێکی مەزنیشیان هەیە (لە ڕۆژی دوایی دا) (١٠) ئەوە (کە باسکرا) ڕێنماییەو، ئەوانەش کە بێبڕوان بە ئایەتەکانی پەروەردگاریان، ئازاریان لە (سزایەکی) هەژێنەری بە ئێش هەیە (١١) خوا ئەو کەسەیە دەریای بۆ ڕامکردوون، تاکو بە فەرمانی وی کەشتییەکانی پێدا بڕۆن (و کاسبیی بکەن)و، لە بەخششی وی (بژیو) بخوازن و، بەڵکو سوپاسگوزارییش

بکەن ﴿١٢﴾ هەروەها هەرچی لە ئاسمانەکان و لە زەویدایە، تێکڕای لە لایەن خۆیەوە بۆی ڕام و ملکەچ کردوون، بێگومان لەوەدا بەڵگە و نیشانە(ی زۆر) هەن (لەسەر پەروەردگارێتیی خوا) بۆ کۆمەڵێک بیربکەنەوە و ڕامێنن ﴿١٣﴾ (ئەی موحەممەد!) بەوانەی بڕوایان هێناوە بڵێ: با لەوانە ببوورن کە (بێبڕوان و) بە ئومێدی ڕۆژەکانی (دیداری) خوا نین، تاکو (سەرەنجام خوا) بە پێی ئەوەی کردوویانە، سزای کۆمەڵێک بدات (لە ڕۆژی دوایی داو، با سزایەکەیان بۆ ئەوێ بێ) ﴿١٤﴾ هەر کەس چاکە بکات، بە سوودی خۆیەتی و، هەر کەسیش خراپە بکات، بە زیانی خۆیەتی، دواییش بۆ لای پەروەردگارتان دەگێڕدرێنەوە ﴿١٥﴾].

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(وَمَا يَبُثُّ): (البَثُّ: التَّفْرِيقُ وَإِثَارَةُ الشَّيءِ، كَبَثُّ الرِّيحِ التُّرَابَ) (بَثّ): بریتیە لە بڵاوکردنەوەو لە شوێنی خۆ جوولاندنی شتێک، وەک چۆن با گڵ و خۆڵ لە شوێنی خۆی هەڵدەقەنێ و بڵاوی دەکاتەوە.

(مِن دَآبَّةٍ): (الدَّآبَّةُ: يُسْتَعْمَلُ فِي كُلِّ حَيَوَانٍ: ﴿إِنَّ شَرَّ ٱلدَّوَآبِّ عِندَ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ﴿٥٥﴾﴾الأنفال، عَامَّةٌ فِي جَمِيعِ الحَيوَانَات)، وشەی (دَآبَة): بەکاردەهێنرێ بۆ هەر ژیاندارێک، وەک خوا فەرموویەتی: ﴿إِنَّ شَرَّ ٱلدَّوَآبِّ عِندَ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ﴿٥٥﴾﴾الأنفال، واتە: بە دڵنیایی خراپترین ژیاندار کە دەڕۆن لەسەر زەوی لە لای خوا، ئەوانەن کە بێبڕوان، ئەمە تێکڕای ژیانداران دەگرێتەوە، چونکە خوا ﷻ بێبڕوایانیشی بە بەشێک لە (دآبّة) لە قەڵەم داوە، هەروەها لە شوێنی دیکە خوا دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ يُؤَاخِذُ ٱللَّهُ ٱلنَّاسَ بِمَا كَسَبُواْ مَا تَرَكَ عَلَىٰ ظَهْرِهَا مِن دَآبَّةٍ ﴿٤٥﴾﴾فاطر، کەواتە: هەرچی لەسەر زەوییە بە مرۆڤ و ئاژەڵ و پەڕەوەر و زیندەوەرە وە، هەمووی وشەی (دآبّة)، دەیگرێتەوە، بۆیە من لە هەندێ شوێنان

وشەی (دآبَـةٍ)، بە پێـڕۆ، یاخـود بـە ژیانـدار، مانـا دەکـەم، پێـڕۆش مـەرج نیـە پێـی هەبـن و بـە پێیـان بـڕوا، چونکـە باڵنـدەش هـەر بـە (دآبَـة) لـە قەڵـەم دەدرێـن، هەرچەنـدە زیاتـر بـە باڵانیـش دەفـڕن.

(يُوقِنُونَ): واتـە: دڵنیـان، دڵنیـا دەبـن، (اليَقِـيْنُ: سُـكُونُ الْفَهْـمِ مَـعَ ثَبَـاتِ الْحُكْـمِ، وَاليَقِـينُ مِـنْ صِفَـةِ الْعِلْـمِ فَـوْقَ الْمَعْرِفَـةِ وَالدِّرَايَـةِ)، (يَقِـيْن): بریتیـە لـە وەسـتانی تێگەیشـتن لەگـەڵ چەسـپانی بڕیـاردان، تێگەیشـتن لـە بـارەی شـتێکەوە بوەسـتێ و چیدیکـە دەرفـەتی نەبـێ بـڕوا، بڕیـار لـە بارەیـەوە چەسـپاو بـێ، (يَقـين) لـە سـیفەتی زانیارییـە لـە سـەرووی ناسـین و، پەیپێبردنەوەیـە، واتـە: خـوای پـەروەردگار (عِلـم اليَقـين)ی باسـکردوە، زانیارییـەک کـە خاوەنەکـەی تێیـدا دڵنیـا بێـت، هەروەهـا (عَـينُ اليقين)یـش، هاتـوە لـە قورئانـدا و (حَـقُّ اليَقين)یـش، هاتـوە، (يَقـين): بـە مانـای دڵنیایی تـەواو لـە شـتێکداو، لـە (يَقَـنَ)ەوە، هاتـوە، (يَقَـنَ: أي رَكَـدَ وَثَبَـتَ) واتـە: چەسـپا، ئنجـا مـرۆڤ ئەگـەر لـە شـتێکدا تـەواو گەیشـتە قەناعـەت و دڵنیایـی، مانـای وایـە یەقینـی بـۆ پەیـدا بـووە، چونکـە تێگەیشـتنەکەی لـەوێ دەوەسـتێ و، بڕیارەکـەشی چەسـپاو دەبـێ لـە بارەیـەوە.

(وَتَصْرِيفِ ٱلرِّيَٰحِ): واتـە: جـۆراو جـۆر کـردنی بایـەکان (الـصَّرْفُ: رَدُّ الـشَّيءِ مِـنْ حَالَـةٍ إلَى حَالَـةٍ، أَو إبْدَالُـهُ بغَـيْرِهِ، وتَصْريـفُ الرِّيَـاحِ: هُـوَ صَرْفُهَـا مِـنْ حَـالٍ إلَى حَـالٍ)، وشـەی (صَرْفُ): بریتیـە لـەوەی شـتێک لـە حاڵێکـەوە بگـۆڕدرێ بـۆ حاڵێـک، یاخـود لـە حاڵێکـەوە بگوازرێتـەوە بـۆ حاڵێـک، یـان بـە حاڵێکـی دیکـە بگـۆڕدرێ.

(وَيْلٌ): (رَاغِـب الأصفهـاني)، دەڵـێ: (وَيـلٌ: قُبْـحٌ، ويُسْـتَعْمَلُ فِي التَّحَـسُّر)، (ويـل) یانـی: ناشـیرینیی، دزێویـی و، بەکاریـش دەهێـنرێ بـۆ خەفـەت خـواردن.

بـەڵام کـە تەماشـای قورئـان دەکەیـن (وَيـلٌ) وشـەیەکە، بەکاردەهێـنرێ بـۆ سـزا، وەک خـوا دەفەرمـوێ: ﴿وَيْلٌ لِّكُلِّ هُمَزَةٍ لُّمَزَةٍ ﴿١﴾﴾الهمـزة، هەروەهـا دەفەرمـوێ: ﴿وَوَيْلٌ لِّلْكَٰفِرِينَ مِنْ عَذَابٍ شَدِيدٍ ﴿٢﴾﴾إبراهيـم، کەواتـە: (وَيـل) بەشـێکە لـە

سزایەکی سەخت، بەهەرحاڵ (وَیل) لە قورئاندا بەکارهاتوە، بە مانای سزا و، ئازار و، هاوار بۆ فڵانکەس و، وای بۆ ئەو، واتە: چ مەترسییەکی لە پێشدایە!

هەڵبەتە دوایی بە مانای دیکەش بەکارهاتوە، وەک: (ویلَهُ)، یان (ویلٌ لَكَ)، هەموو کات مەرج نیە بە مانای سزا بێ، یانی: هاوار بۆ تۆ، یاخود خەفەت و داخ بۆ تۆ، بۆیە (راغب) گوتوویەتی: (وَیُستَعمَلُ فِي التَّحَسُّرِ).

(أَفَّاكٍ): (الْإِفْكُ: كُلُّ مَصْرُوفٍ عَنْ وَجْهِهِ الَّذِي يَحِقُّ أَنْ يَكُونَ عَلَيْهِ، وَاسْتُعْمِلَ فِي الكَذِبِ)، (إِفْك): بریتیە لە هەر شتێک لەو ڕووەی لابدرێ کە دەبووایە لەسەری بێ، بەڵام دوایی بەکاریشهێنراوە لە درۆدا، کەواتە: (أَفَّاكٍ)، یانی: (كَذَّاب)، زۆر درۆکەر، بە کوردیی دەڵێن: درۆزن، درۆکەر: کەسێکە یەکجار درۆ بکات، پێی دەڵێن: درۆکەرە، بەڵام درۆزن: ئەوەیە کە عادەتی بە درۆیانەوە گرتبێ، بۆیە پێم وایە وشەی (أَفَّاكٍ): لە بەرانبەرەکەیدا درۆزن دابنرێ پڕ بە پێستیەتی، بە پێی ئەم سیاقە، ئەگەرنا لە ئەصڵدا: ﴿فَأَنَّىٰ يُؤْفَكُونَ ﴿٦١﴾﴾ العنكبوت، یانی: (فَأَنَّى يُصْرَفُون)، یان (يُقلبون)، بۆ کوێ لادەدرێن؟ بۆ کوێ ڕوویان پێ وەردەگێڕدرێ؟.

(يُصِرُّ): سوور دەبێ، سامەرەستوو دەبێ، مکوڕ دەبێ، (الإِصْرَارُ: كُلُّ عَزْمٍ شَدَدْتَ عَلَيهِ، والإِصْرارُ: التَّعَقُّدُ فِي الذَّنْبِ والتَّشَدُّدُ فيهِ، وَالإِصْرَارُ مُلازَمَةُ الشَّيءِ، وَعَدَمُ الإِنْفِكَاكِ عَنهُ)، زانایان بە چەند تەعبیرێک ویستوویانە مانای (إِصْرَار) بکەن، (صِرّ): بە مانای بای سارد دێ، (صَرّ) بە مانای گوشین و گرێدانیش دێ، (صُرَّة): پرێسکەیەکە شتی تێکرابێ و توند بەسترابێ، (إِصْرَار): هەر ویستێکە، بە سەختیی گرتبێت، (إِصْرَار)یش، بریتیە لەوەی کەسێک دڵی خۆی لەسەر گوناە چەسپاندبێ، هەروەها (إِصْرَار): بریتیە لە هاوەڵیی کردنی شتێک و لێی جیا نەبونەوەی، بە کوردیی (إِصْرَار) دەبێتە سوور بوون لەسەر شتێک، سامەرەستوو بوون لەسەری، مکووڕ بوون لەسەری.

(هُزُوًا): (الهُـزْءُ: مَـزْحٌ فِي خِفْيَـةٍ)، (هُـزْء): بریتیـە لـە گاڵتـە پێکردنێکـی پەنهـان، (هُـزْء): چـاوگ (مصـدر)ە، بـەڵام بـە مانـای بـەرکار (مَفعـولٌ بـهِ) بەکارهاتـوە، یـانی: (مَهْـزوء)، گاڵتـە پێکـراو.

(مُّهِينٌ): (أي: مُخْـزِي، مُستَخِفّ، مُـذِلّ)، (مُّهِينٌ): بـە مانـای ڕیسـواکەر، زەبوونکـەر، ملپێکەچکـەر.

(رِّجْزٍ): (أَصْلُ الرِّجْزِ: الإِضْطِرَابُ)، وشەی (رِجْز):

أ- لە ئەصڵدا بە مانای جووڵەجووڵ و بە مانای خۆنەگرتنە، لە قورئاندا خوای پەروەردگار وشەی (رِجْز)ی، لە چەند سیاقێکدا بەکارهێناوە، بۆ وێنە:

ب- لە سوورەتی (الأنفال)دا، دەفەرمووێ: ﴿ وَيُذْهِبَ عَنكُمْ رِجْزَ ٱلشَّيْطَٰنِ ﴿١١﴾ ﴾، (رِجْز) ی، شەیتانتان لێ لابەرێ، کە لێرەدا لەوانەیە بە مانای خوتخوتەی شەیتان بێ، کە دەبێتە هۆی جووڵە جووڵی مرۆڤ و، هۆی لە دەستدانی سەقامگیریی و دامەزراویی.

ج- (رِجْز)، بە مانای (رِجس)یش، هاتوە (رِجْز) بە (ز)، (رِجس) بە (س)، هەردووکیان بە مانای (قَذَر)، شتی پیسن، وەک (مُختارُ الصِّحاح)، هێناویەتی.

د- (رِجْز): بە مانای سزا و ئازاریش دێ، بە بەڵگەی ئایەتی (١٣٤) لە سوورەتی (الأعراف): ﴿ لَئِن كَشَفْتَ عَنَّا ٱلرِّجْزَ لَنُؤْمِنَنَّ لَكَ وَلَنُرْسِلَنَّ مَعَكَ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴿١٣٤﴾ ﴾، واتە: ئەگەر تۆ (رِجْز)مان لێ لابەری واتە: سزاو ئازارمان لێ لابەری، بەڵامان لێ لابەری، بە دڵنیایی بڕوات پێ دێنین و بەنوو ئیسرائیلیشت لەگەڵ ڕەوان دەکەین.

لـە سـوورەتی (الزُخرف)یـش دا، بـە بەڵگـەی ئـەوە دەزانیـن (رِجْـز) بـە مانـای سـزا و ئـازارە، چونکـە هـەر لـە سـوورەتی (الزُخـرف)، لـە ئایـەتی (٥٠)دا دەفەرمـوێ: ﴿ فَلَمَّا كَشَفْنَا عَنْهُمُ ٱلْعَذَابَ إِذَا هُمْ يَنكُثُونَ ﴿٥٠﴾ ﴾، کـە لـە هـەر هەمـان سیاقداو لـە هەمـان بارەوەیـە: کاتێـک ئازارمـان لـێ لابـردن، ئـەوان ئـەو بەڵێنـەی دابوویـان (کـە بـڕوا بێنـن و بەنـوو ئیسـرائیل تەسـلیمی مووسـا بکەنـەوە)، هەڵیانوەشـاندەوە.

کەواتە: ﴿ لَئِن كَشَفْتَ عَنَّا ٱلرِّجْزَ ﴿١٣٤﴾ ﴾الأعراف، یانی: (لَئِنْ كَشَفتَ عَنَّا العَذَابَ)، بە کورتیی: (رِجْز):

**١**- بە مانای سزا و ئازاریش و،

**٢**- بە مانای پیسییش و،

**٣**- بە مانای خوتخوتەی شەیتانیش و،

**٤**- بە مانای جووڵەجووڵێکیش دێت کە هاوسەنگیی مرۆڤ تێکدەدات.

﴿ وَيُذْهِبَ عَنكُمْ رِجْزَ ٱلشَّيْطَٰنِ ﴿١١﴾ ﴾الأنفال، دەڵێ: (**مَا يَدْعُوا إلَيْهِ مِنَ الكُفْرِ وَالبُهْتَانِ وَالفَسَادِ**)، ئەوەی کە شەیتان بانگەشەی بۆ دەکات لە بێبڕوایی و تۆمەتی ناڕەواو، تێکدان، هەروەها (**رِجْز**) بە مانای سەختترین ئازارو سزاش دێ: ﴿ فَأَنزَلْنَا عَلَى ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ رِجْزًا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ ﴿٥٩﴾ ﴾البقرة، واتە: دامانبەزانـدە سەر ئەوانەی ستەمیان کردبوو (**رِجْز**)ێک لەسەرێوە، واتە: ئازارێکی زۆر سەخت.

(أَيَّامَ ٱللَّهِ ): (**أَيَّام**) کۆی (**يَوْم**)ە، (**يَوْم**)، ڕۆژ، (**أَيَّام الله**) واتە: ڕۆژەکانی خوا، (**الأَوْقَاتُ الَّتِي حَصَلَتْ فِيهَا نَصْرُ اللهِ، أو فَضْلُهُ، أو أَيَّامُ جَزَائِهِ فِي الآخِرَةِ، أو وَقْتُ عِقَابِهِم**)، ﴿ لَا يَرْجُونَ أَيَّامَ ٱللَّهِ ﴾، واتە: بە ئومێدی دیداری ڕۆژەکانی خوانین، ڕۆژەکانی خواش ئەو ڕۆژانەن کە سەرخستنی خوایان تێدا هاتۆتە دی، یان بەخششی خوایان تێدا هاتۆتە دی، لە دنیادا، یاخود: ئەو کات و ڕۆژانەی خوا ﷻ سزا و پاداشتی خۆییان تێدا بەرجەستە دەکات، پاداشت بۆ دۆستەکانی و، سزا و تۆڵە بۆ نەیارەکان و ناحەزانی خۆی و، پێغەمبەرەکانی (**عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ**)و پەیام و بەرنامەکانی.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

خــوا ﷻ لــەم پــازدە (١٥) ئایەتــەدا، وەک لــە پێناســەی ئــەم دەرســەدا گوتمــان، پانتاییەکــی زۆری تەرخانکــردوە، بــۆ خســتنە ڕووی بەڵگــەو نیشــانەکانی بەدیهێنەرایەتیــی و پەروەردگاریتیــی و، خاوەنداریتیــی خــۆی، تێکهەڵکێــش لەگــەڵ هەڵوێســتی نەرێنییانــەو کەللەڕەقانــەی بێبڕوایــان لــە بەرانبــەر ئایەتــەکانی خــوا، واتــە: ئایەتــە خوێنراوەکانییــدا، کــە دیــارە ئــەو دیــاردەو دیمەنانــەش کــە لــەو ئایەتــە خوێنراوانــەدا دەیانخاتــە ڕوو، ئەوانیــش دیســان لــە نیشــانەکان (آیــات)ی خــوان و نیشــانە نەبینراوەکاننــی :

خــوا ﷻ دەفەرمــوێ: ﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ﴾، مــادام خــوا ﷻ ســەدو چــواردە (١١٤) جــاران لــە قورئــان دا فەرموویەتــی: ﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ﴾، ئــەوە دەهێنــێ کــە مانایەکەشــی دووبــارە بکرێتــەوە، ئنجــا لــە کاتێــک دا مــرۆڤ دەڵــێ: بــە نــاوی خــوای بــە بەزەیــی بەخشــندە، دەبــێ بەلایەنــی کەمــەوە، چــوار واتایــان لــە عەقــڵ و دڵــی خۆیــدا ئامــادە بــکات:

١- بۆ کردنی ئەو کارە بە ناوی خوا دەست پێ دەکەم، نەک بە ناوی خۆم، یان هەر شتێکی دیکە.

٢- ئەو کارە بۆ ڕازیکردنی خوا ئەنجام دەدەم.

٣- ئەو کارە بە پێی بەرنامەی خوا ئەنجام دەدەم.

٤- ئەو کارە بە یارمەتیی و هاوکاریی خوا ئەنجام دەدەم، نەک بە شان و شەوکەتی خۆم.

خــوا دەفەرمــوێ: ﴿حمٓ﴾، ئەمانــە دوو پیــتن، پیتــی (**حــا**)، و پیتــی (**میــم**)، کــە پێیــان دەگوتــرێ: پیتــە پچــڕ پچــڕەکان (**الحــروف المُقَطَّعَــة**)، چونکــە بەســەر یەکــەوە

ناخوێنرێنەوە، کە بگوترێ: (**حام**)، دەبێ بە جیا جیا بخوێنرێنەوەو، پێشتر باسمان کردوە کە لە سەرەتای تەفسیری سوورەتی (**یونس**)دا، باسێکی تێرو تەسەلمان لەو بارەوە کردوە، ئەو پیتانەش کە کۆی هەموویان چوارده (١٤) پیتن لە سەرەتای (٢٩)، سوورەت لە سوورەتەکانی قورئاندا هاتوون، باشترین واتایەک کە لێیان وەردەگیرێ، ئەوەیە کە خوا ﷻ بە بەندەکانی دەفەرموێ: ئەم فەرمایشتەی لەبەر دەستتانەو دەیخوێننەوەو گوێبیستی دەبن و تێیەوە ڕادەمێنن، هەر لەو پیت و دەنگانە پێکهاتوە کە ئێوە قسەیان پێدەکەن، کەواتە: ئەو پیت و دەنگانە وەک کەرەستەیەکی خاو لەبەر دەست ئێوەشدا هەن، بەڵام ئەو کەرەستە خاوە و ئەو پیت و دەنگانە، خوای بەدیهێنەر، ئەم فەرمایشتەی لێ پێکهێناون، بەڵام ئێوە قسەی ئاساییان لێ پێک دێنن، هەر بەوەڕا بزانن کە ئەم فەرمایشتە هی خوایە ﷻ ، کە فەرمایشتێکی پێکهێناوە لەو پیت و دەنگانەی لەبەر دەستی ئێوەشدا هەن، کە ئێوە نەک هەر ناتوانن وێنەی ئەو فەرمایشتەی بێنن کە هەموو قورئانە، بەڵکو وێنەی دە (١٠) سوورەتی، بگرە وێنەی سوورەتێکی سێ ئایەتییش بێنن، وەک: (**العصر**) و (**الکوثر**) و (**النّصر**).

کەواتە: بزانن کە بێژەری ئەم فەرمایشتە خوایە ﷻ، وەک چۆن خوا ﷻ لە گەردیلەکان و لە گەردەکان، لە ماددەی بێ ژیان، ژیاندار دروست دەکات، کە تاکو ئێستا مرۆڤ لە بەرانبەر دیاردەی ژیاندا سەراسیمەو دەستەوسانە، تەنانەت ژیانی ژیاندارێکی زۆر سادەی وەک (ئەمیبا)ش، وەک چۆن مرۆڤ کەل و پەلی دیکە دروست دەکات، کە ژیانیان تێدانیە، بە هەمان شێوە خواش ﷻ ئەم فەرمایشتەی خۆی ڕەخساندوەو پێکهێناوە لەو پیت و دەنگانە، کە ڕووحێکە بە بەر ژیانی مرۆڤدا دەکرێ و، ڕووناکیی و بەرەکەت و پێزێکەو، تەنیا فەرمایشتی خوا ﷻ ئەو تایبەتمەندییانەی هەن.

﴿تَنزِيلُ ٱلْكِتَٰبِ مِنَ ٱللَّهِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَكِيمِ﴾، لە ڕووی ڕێزمانی عەرەبییەوە، یانی: (**هَـذَا تَنْزِيـلُ الكِتَـابِ**)، ئەمە دابەزاندنی کتێبە، یاخود (**تَنْزِيـلُ الكتـابِ**)، دەبێتە نیهاد

(مُبْتَدَأ) و ﴿مِنَ ٱللَّهِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَكِيمِ﴾یش، دەبێتە دەبێتە گوزارە (خَبر)، دابەزاندنی کتێب لە لایەن خوای باڵا دەستی کاربەجێ وەیە، یاخود: خوای زاڵی کارزانەوەیە، کەواتە: بزانن! سەرچاوەی ئەو کتێبە خوایەکە ﷻ، خاوەنی هەموو عیززەتێک و باڵا دەستیی و، دەستڕۆیشتوویێکەو، خاوەنی هەموو لێزانیی و، کارزانیی و کاربەجێییەکە، بۆیەش ئەو سیفەتانەی خوا لەو کتێبەی دا بەرجەستە بوون، ئنجا دوای ئەم ئاماژە کورتە بە قورئان، خوا دێتە سەر باسی خستنەڕووی بەڵگەکانی بەدیهێنەرایەتیی و پەروەردگارێتیی خۆی:

﴿إِنَّ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ لَءَايَٰتٍ لِّلْمُؤْمِنِينَ﴾، بە دڵنیایی لە ئاسمانەکان و زەویدا نیشانە هەن بۆ بڕواداران، واتە: نیشانە هەن کە پەروەردگار و خاوەن و بەدیهێنەری خۆیان پێ بناسن، چونکە خوای پەروەردگار چۆن پەی پێببەین؟ بێگومان لە ڕێی نیشانەکانیەوە، نیشانەکانیشی: یان لە کتێبە خوێندراوەکەیدان، کە قورئانە، یان لە کتێبە بینراوەکەیدان، کە گەردوونە.

﴿وَفِى خَلْقِكُمْ وَمَا يَبُثُّ مِن دَآبَّةٍ ءَايَٰتٌ لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ﴾، پێشێ فەرمووی: لە ئاسمانەکان و زەویدا نیشانەی زۆر هەن بۆ بڕواداران، ئنجا دەفەرمووێ: لە دروستکرانی خۆتانداو لەوەدا کە خوا بڵاوی کردۆتەوە لە ژیانداران لە زەویدا، نیشانە هەن بۆ کۆمەڵێک کە دڵنیابن، واتە: دڵنیاییان هەبێت و لە بڕوایەکەیاندا گەیشتبنە قەناعەت و دڵنیایی تەواو.

ئنجا دەفەرمووێ: ﴿وَٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ وَمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مِن رِّزْقٍ﴾، هەروەها جیاوازیی و جێگۆڕکەی شەوو ڕۆژان و، ئەوەی خوا دایبەزاندوە لە سەرێوە لە بژێو، ئەو بژێوەی خوا دایبەزاندوە، هەرچەندە زۆربەی زانایان هەر بە مانای بارانیان لێکداوەتەوە، بەڵام هەمیشە کە خوا دەفەرمووێ: ئاو (مَاءً)، یان لێرەدا دەفەرمووێ: بژێو (رِزق)، لەبەر ئەوەیە کە وشەی: (مَاء)، باران و بەفر و تەرزەو ئاونگ و هەڵمی ئاو، هەمووی دەگرێتەوە، (رِزق)یش تەنیا ئاو ناگرێتەوە، بەڵکو

تیشکی خۆریش و جۆرە تیشکەکانی دیکەش کە لە کەهکەشان و ئەستێرەکانی دیکەوە دێن و، سەرجەم ئەو شەپۆلانەش کە لێیانەوە دێن، هەموویان دەبنە هۆی بژیو بۆ مرۆڤ، بەڵام (رزق) بە پلەی یەکەم ئەو ئاوە دەگرێتەوە کە لە سەرێوە دادەبەزێ، کە دەفەرموێ: ﴿ فَأَحۡيَا بِهِ ٱلۡأَرۡضَ بَعۡدَ مَوۡتِهَا ﴾، زەوی پێ زیندوو کردۆتەوە، دوای مردنەکەی، کە هەڵبەتە زەوی وەک چۆن بە ئاو زیندوو دەبێتەوە، بە تیشکی خۆریش، زیندوو دەبێتەوەو، ئەگەر تیشک نەبێ لە دەریا بدات، هەڵمی ئاویش پەیدا نابێ و، باران و بەفرو تەرزەش پەیدانابن، هەروەها تیشك بۆ گەشەکردنی ڕووەك بەهۆی تیشکە پێکهاتن (التمثیل الضوئي)یەوەش هەر پێویستە.

﴿ وَتَصۡرِيفِ ٱلرِّيَٰحِ ﴾، هەروەها جۆراو جۆرکردنی بایەکان، جۆراوجۆرکردنیش بەس لە ڕووی ئەو شوێنەوە نیە کە لێی هەڵدەکەن، ئایا ڕەشەبایە، شەماڵە، لەسەرێوەیە، لە خوارێوەیە، لە باکوورە، لە باشوورە!؟ هەر ئەوەندە، نا، بەڵکو جۆراو جۆر کردنی بایەکان لە ڕووی چۆنییەتییانەوە، پاشان لە ڕووی ئەندازەیانەوە، بەهێزن، یان نەرم و سووکن؟ ئەوانە هەموویان ﴿ ءَايَٰتٞ لِّقَوۡمٖ يَعۡقِلُونَ ﴾، نیشانەن بۆ کۆمەڵێک بفامن.

دوایی لە مەسەلە گرنگەکاندا باس دەکەین: بۆچی پێشێ دەفەرموێ: ﴿ لِّلۡمُؤۡمِنِينَ ﴾، دوایی دەفەرموێ: ﴿ لِّقَوۡمٖ يُوقِنُونَ ﴾، دوایی دەفەموێ: ﴿ لِّقَوۡمٖ يَعۡقِلُونَ ﴾، جیاوازیی ئەو سێ حاڵەتانە چییە؟

﴿ تِلۡكَ ءَايَٰتُ ٱللَّهِ نَتۡلُوهَا عَلَيۡكَ بِٱلۡحَقِّۖ ﴾، ئەوانە ئایەتەکانی خوان بە هەق بەسەر تۆیاندا دەخوێنینەوە، وشەی (حق): بە پێی ئەو سیاقە کە تێیدا دێ، مانایەکەی دەگۆڕێ، جاری وایە بە مانای ڕاستە، جاری وایە بە مانای دادگەرییە، جاری وایە بە مانای حیکمەتە، جاری وایە بە مانای شتی چەسپاوە، کە ئەصڵی مانای هەقە، ﴿ فَبِأَيِّ حَدِيثِۭ بَعۡدَ ٱللَّهِ وَءَايَٰتِهِۦ يُؤۡمِنُونَ ﴾، بە چ قسەیەک لە دوای خوا و، ئایەتەکانی بڕوا دێنن؟

واتە: ئەگەر بڕوا بە ئایەتەکانی خوا نەهێنن، بە چ قسەیەکی دیکە بڕوا دێنن؟ ئەگەر بڕوا بە خوا نەهێنن ﷻ وەک خاوەن و بەدیهێنەری ئەم کەون و کائیناتە، ئەدی کێ بە خاوەنی کەون و کائینات دادەنێن؟!

﴿ وَيۡلٞ لِّكُلِّ أَفَّاكٍ أَثِيمٖ ﴾، سزای سەخت بۆ هەر درۆزنێکی، زۆر گوناهبارو تاوانبار.

دوایی پێناسەی دەکات ئەو کەسە کێیە؟

﴿ يَسۡمَعُ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ تُتۡلَىٰ عَلَيۡهِ ﴾، گوێبیستی ئایەتەکانی خوا دەبێ، بەسەریدا دەخوێنرێنەوە، کە دەفەرموێ: ﴿ تُتۡلَىٰ عَلَيۡهِ ﴾، کەواتە: ﴿ ءَايَٰتِ ﴾، مەبەست پێی ئایەتە خوێنراوەکانن، ڕستەکانی قورئانن، ئایەتەکانی خوا گوێبیست دەبێ، بەسەریدا دەخوێنرێنەوە، ﴿ ثُمَّ يُصِرُّ مُسۡتَكۡبِرٗا ﴾، دواییش سوور دەبێ، واتە: لەسەر بڕوا نەهێنان، لەسەر بێبڕوایی، ﴿ كَأَن لَّمۡ يَسۡمَعۡهَا ﴾، وەک هەر نەیبیستبێ، ﴿ فَبَشِّرۡهُ بِعَذَابٍ أَلِيمٖ ﴾، ئنجا موژدەی پێ بدە، بە ئازارێکی بە ئێش.

بێگومان موژدە بۆ شتی خۆش و چاکە، بەڵام ئەمە بە توانج و تەوسەوەیە، یاخود: ئەگەر هەواڵێکی دڵخۆشکەر و موژدەیەک بۆ ئەوان هەبێ، هەر سزاو ئازاری بە ئێشە.

﴿ وَإِذَا عَلِمَ مِنۡ ءَايَٰتِنَا شَيۡـًٔا ٱتَّخَذَهَا هُزُوًا ﴾، ئەگەر شتێک لە ئایەتەکانی ئێمەشی زانی، بە گاڵتەجاری دەگرێ، واتە: شتێک لە ئایەتەکانی لەبەر کرد، هەندێ کەس هەندێ ئایەتی قورئان لەبەر دەکات، یان فەرمایشتێکی پێغەمبەر، یان قسەی کەسێک، دوایی لاسایی دەکاتەوەو بە شێوەیەکی دیکە دەیڵێ، وەک گاڵتەپێکردن، بۆیە دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا عَلِمَ مِنۡ ءَايَٰتِنَا شَيۡـًٔا ﴾، ئەگەرنا گاڵتە بە کۆی ئایەتەکان دەکات، بەڵام لێرەدا مەبەست گاڵتە پێکردنێکی تایبەتە، ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ عَذَابٞ مُّهِينٞ ﴾، مادام ئەوانە گاڵتە بە ئایەتەکانی خوا دەکەن و بە کەم تەماشایان دەکەن، سزایەکی ڕیسواکەرو زەبوونکەریان هەیە، چونکە هەمیشە سزا بە پێی کردەوەیە.

﴿ مِّن وَرَآئِهِمْ جَهَنَّمُ ﴾، لە پشتیانەوە دۆزەخ هەیە، لەبەرئەوەی نادیدەیان گرتوە، بۆیە دەفەرموێ: لە پشتیانەوە، ئەگەرنا ئەوەی بۆ تۆ دێ و تۆ بەرەو رووی دەچی، لە پێشتەوەیە ﴿ مِّن وَرَآئِهِمْ ﴾، واتە: نادیدەیان گرتوە، یاخود: ﴿ مِّن وَرَآئِهِمْ ﴾، واتە: شتێکی زۆر ترسناکە، مەترسیی کە لە پشتتەوە بۆت بێ، زیاتر جێی ترسە، دۆزەخ لە پشتیانەوەیە، ﴿ وَلَا يُغْنِي عَنْهُم مَّا كَسَبُوا شَيْـًٔا وَلَا مَا اتَّخَذُوا مِن دُونِ اللَّهِ أَوْلِيَآءَ ﴾، هەرچی وەدەستیان هێناوە سوودیان پێ ناگەیەنێ، هەروەها ئەوانەی لە جیاتی خوا کردوویانن بە دۆست و سەرپەرشتیار، سوودیان پێناگەیەنن (پەرستراوەکانیان)، ﴿ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴾، ئەوانە ئازارێکی مەزنیان بۆ هەیە.

﴿ هَٰذَا هُدًى ﴾، ئەمە رێنماییە، ﴿ وَالَّذِينَ كَفَرُوا بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِمْ لَهُمْ عَذَابٌ مِّن رِّجْزٍ أَلِيمٌ ﴾، ئەوانەش کە بێبڕوان بە ئایەتەکانی پەروەردگاریان، ئازاریان بۆ هەیە لە سەختترین سزای بە ئێش.

ئەگەر سەرنج بدەین دەبینین: لێرەدا خوا ﷻ سزای ئەوانەی زۆر بە سەختیی باسکردوە:

﴿ بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ﴾، ﴿ عَذَابٌ مُّهِينٌ ﴾، ﴿ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴾، ﴿ عَذَابٌ مِّن رِّجْزٍ أَلِيمٌ ﴾، کە دوایی باس دەکەین، بۆچی خوا ئەو هەموو وەسفانەی داناون، بۆ سزا دانی ئەوانە؟!

دووبارە خوا ﷻ دەگەڕێتەوە سەر پێشاندانی بەڵگە و نیشانەکانی پەروەردگارێتیی و بەدیهێنەرایەتیی خۆی: ﴿ اللَّهُ الَّذِي سَخَّرَ لَكُمُ الْبَحْرَ لِتَجْرِيَ الْفُلْكُ فِيهِ بِأَمْرِهِ ﴾، خوا ئەو کەسەیە دەریای بۆ دەستەمۆ کردوون، کەشتییەکان پێیدا دەڕۆن بە مۆڵەتی خوا واتە: بە پێی ئەو سیستەمەی خوا دایناوە، ﴿ وَلِتَبْتَغُوا مِن فَضْلِهِ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴾، تاکو لە بەخششی خوا داوا بکەن (بە هۆی کەشتییەکانەوە بار و سوار دەکەن) و بەڵکو سوپاسگوزاریی بکەن (لە ئەنجامی ئەوەدا).

﴿ وَسَخَّرَ لَكُم مَّا فِي السَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ جَمِيعًا مِّنْهُ ﴾، (خوا) هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە، تێکڕای لە لایەن خۆیەوە بۆ ئێوە دەستەمۆ و ڕام کردوە، ﴿ إِنَّ فِي

﴿ ذَٰلِكَ لَآيَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴾، بە دڵنیاییی لەوەدا نیشانەی زۆر هەن بۆ کۆمەڵێک ڕادەمێنن و بیر بکەنەوە.

لە کۆتاییدا دەفەرموێ: ﴿ قُل لِّلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ يَغْفِرُوا۟ لِلَّذِينَ لَا يَرْجُونَ أَيَّامَ ٱللَّهِ ﴾ بەوانە بڵێ: کە بڕوایان هێناوە، لێبووورن لەوانەی بە ئومێدی ڕۆژەکانی خوا نین، یانی: بە ئومێدی دیداری خوا نین، یا چاوپۆشییان لێ بکەن، لە وردە هەڵەو پەڵە، لێیان ببوورن، ﴿ لِيَجْزِىَ قَوْمًۢا بِمَا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ ﴾، تاکو کۆمەڵێک بەوەی وەدەستی دێنن، سزایان بداتەوە، واتە: سزایەکەی ئەوان هەڵدەگیرێ بۆ ڕۆژی دوایی و، با ئەوان بیر لە سزادانیان نەکەنەوە.

﴿ مَنْ عَمِلَ صَٰلِحًا فَلِنَفْسِهِۦ ﴾ هەر کەسێک چاکە بکات، سوودەکەی بۆ خۆیەتی، ﴿ وَمَنْ أَسَآءَ فَعَلَيْهَا ﴾، هەر کەسێک خراپەش بکات، زیانەکەی بۆ خۆیەتی، ﴿ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّكُمْ تُرْجَعُونَ ﴾، دوایی بۆ لای پەروەردگارتان دەگێڕدرێنەوە، هەروەها خوێنراویشەتەوە: (تَرجِعون) دەگەڕێنەوە.

کەواتە: پاداشتی چاکان و سزای خراپان، لەوێ هەیە، دنیا مەکەنە شوێنی تەصفیەی حیساب و تۆڵە لە یەکدی ستاندنەوە، پێکەوە مودارا بکەن و یەکدی تەحەممول بکەن، بە تایبەتی ئەهلی ئیمان، لەگەڵ نەیارانیاندا دەبێ بەو شێوەیە مامەڵە بکەن.

# مەسەلە گرنگەکان

## مەسەلەی یەکەم:

**قورئـان کتێبێکـە لـە لایـەن خوای زاڵـی کارزانـەوە دابەزێـنراوەو، لە ئاسـمانەکان و زەویـی و، دروسـتکرانی مرۆڤـان و بڵاوکردنـەوەی ژیانـداران لـە زەوی داو، جێگۆڕکێـی شـەوو ڕۆژان و، بژیـوی دابەزێـنراو لـە ئاسـمانەوەو، گۆڕینـی بایەکانـدا، بەڵگـە و نیشـانەی زۆر هـەن، لەسـەر بەدیهێنەرایەتیـی و پەروەردگارێتیـی خـوا، بۆ بـڕواداران و دڵنیایـان و عاقڵمەنـدان:**

خـوا دەفەرمـوێ: ﴿حمٓ (١) تَنزِيلُ ٱلْكِتَٰبِ مِنَ ٱللَّهِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَكِيمِ (٢) إِنَّ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ لَءَايَٰتٍ لِّلْمُؤْمِنِينَ (٣) وَفِى خَلْقِكُمْ وَمَا يَبُثُّ مِن دَآبَّةٍ ءَايَٰتٌ لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ (٤) وَٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ وَمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مِن رِّزْقٍ فَأَحْيَا بِهِ ٱلْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا وَتَصْرِيفِ ٱلرِّيَٰحِ ءَايَٰتٌ لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ (٥) تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱللَّهِ نَتْلُوهَا عَلَيْكَ بِٱلْحَقِّ فَبِأَىِّ حَدِيثٍۭ بَعْدَ ٱللَّهِ وَءَايَٰتِهِۦ يُؤْمِنُونَ (٦)﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە دوازدە بڕگەدا:

١)- ﴿حمٓ﴾، زۆرجار دووبارەمان کردۆتەوە، ئەمانە دوو پیتن، لەو پیتانەی خوا ﷻ قورئانی لێ پێکهێناون و، ئێمە ڕۆژانە بەکاریان دێنین لە قسەکردن و نووسینمان دا، ئەو پیتانە کە لە سەرەتای بیست و نۆ (٢٩) لە سوورەتەکاندا هاتوون، ئاماژەیان تێدایە کە ئەو قورئانەش هەر لەو پیت و دەنگانە پێکهاتوە کە ئێوە بەکاریان دێنن، بەڵام خوا ﷻ قورئانێکی لێ پێکهێناون کە لەبەر دەستتانەو ئێوە لە بەرانبەریدا دەستەوسانن، نەک لە بەرانبەر هەمووی، بەڵکو لە بەرانبەر دە (١٠) سوورەتی و، بگرە لە بەرانبەر سوورەتێکیشیدا، کەواتە: بزانن بێژەرەکەی ئەو، کەسەی ئەو فەرمایشتەی فەرمووە، خوای بەدیهێنەری پەروەردگاری کەون و کائیناتە.

٢)- ﴿ تَنزِيلُ ٱلْكِتَٰبِ مِنَ ٱللَّهِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَكِيمِ ﴾، دابەزێنرانی کتێبەکە لە لایەن خوای زاڵی کارزانەوەیە، وشەی (**الكِتاب**): کە (**أل**)ی، ناساندنی لەسەرە، ناساندنەکە بۆ (**عَهد**)ە، واتە: دابەزاندنی کتێبەکە، ئەو کتێبە کە زانراوەو ناسراوە کە قورئانە، لە کوێوەیە؟ ﴿ مِنَ ٱللَّهِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَكِيمِ ﴾، لەلایەن خوای زاڵی کارزانەوەیە، ئەمە لە ڕووی ڕێزمانی عەرەبییەوە پێی دەگوترێ: ڕستەیەکی دەستپێکردن (**جُمْلَة إبْتِدَائِيَّة**)، کە لە نیهادو گوزارە (**مُبتَدأ وَخَبر**)، پێکهاتوە: دابەزاندنی کتێبەکە (کە قورئانە) لە لایەن خوای زاڵی کارزانەوەیە، بۆ ئەوەی هەر لە سەرەتاوە تۆ بزانی، کە ئەم سوورەتە دەخوێنی، یان هەر سوورەتێک دەخوێنی، کە بەشێکە لە قورئان، بزانی سەرچاوەکەی کێیەو لە کوێوە هاتوە؟ لە لایەن خواوە هاتوە، خواش ﷻ خاوەنی هەموو سفەتێکی بەرزو پەسندە، بەڵام لێرەدا ئەو دوو سیفەتەی زیاتر بەرجەستە کراون، کە بریتین لە عیززەت و حیکمەت، چونکە دوایی باسی سزادان و هەڵوێستی نەرێنییانەی بێبڕوایان کراوە، کە خوا بە عیززەتی خۆی لەگەڵیاندا ڕووبەڕوو دەبێتەوە، هەروەها باسی بڕواداران کراوەو مامەڵەیان لەگەڵ نەیارانیاندا، کە دەبێ حیکمەت بەکاربێنن و، خوای پەروەردگاریش بە حیکمەتی خۆی تەگبیری حاڵی مسوڵمانان دەکاو، پشتیان دەگرێ و، هاوکاریان دەبێ، هەروەک خوا بە عیززەت و حیکمەتی خۆی واتە: زاڵیی و کارزانیی خۆی، لەگەڵ پێغەمبەری خۆیدا دەبێ ﷺ، پەیامەکەی خۆی کە بە پێغەمبەردا ناردوویەتی ﷺ، مشووری لێ دەخوات ئەو پەیامە بچەسپێ و بڵاوبێتەوەو ئامانجەکانی خۆی بپێکێ.

لێرەدا خوا کە دەفەرموێ: ﴿ تَنزِيلُ ٱلْكِتَٰبِ مِنَ ٱللَّهِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَكِيمِ ﴾، ئەم تەعبیرە یانی: ئەوە کە قورئان دابەزێنراوە، هیچ جێی مشتومڕ نیە، بەڵام لە لایەن کێوە دابەزێنراوە؟ لە لایەن خوای باڵادەستی کاربەجێ وە.

٣)- ﴿ إِنَّ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ لَءَايَٰتٍ لِّلْمُؤْمِنِينَ ﴾، دوای ئەو ئاماژە کورتە بە قورئان و، بە سەرچاوەی لێوە هاتنی قورئان، یەکسەر خوا ﷻ دێتە سەر باسی نیشانە و بەڵگەکانی بەدیهێنەرایەتیی و پەروەردگاریتیی و خاوەنداریتیی خۆی لە گەردووندا، دەفەرموێ: بە دڵنیایی لە ئاسمانەکان و، لە زەویدا نیشانە هەن بۆ بڕواداران، لێرەدا ئاسمانەکان

و زەوی کراون بە زەڕفێک، بۆ ئەو بەڵگەو نیشانانەی دەمانگەیەنن بە ناسینی خواو، دەمانگەیەنن بە دانپێداهێنان بە بەدیهێنەرایەتیی و پەروەردگارێتیی و خاوەندارێتیی خوادا ﷻ، ئێمە کاتی خۆی لە تەفسیری سوورەتی (**یونس**)دا، هەم باسی گەردوونمان کردوە بە گشتیی، هەم باسی خۆرمان کردوە، هەم باسی زەوی و، باسی مانگمان کردوە، هەروەها لە تەفسیری سوورەتی (**فصلت**)دا، باسی دروستکرانی گەردوونمان کردوە لە کورتە باسێکدا، کە کاتێک مرۆڤ تەماشای ئەم گەردوونە دەکات، بە کەهکەشانەکان و بە گەلە کەهکەشانەکانەوە، پاشان بە پێکهاتەی کەهکەشانەکانەوە، لە ئەستێرەکان و خڕۆکەکان، بە تایبەتی خۆری خۆمان و کۆمەڵەکەی، ئەو نۆ خڕۆکەیەی بە دەوریدا دەخولێنەوە، تەماشای ئەندازەکانیان دەکات، تەماشای مەسافەکانیان دەکات، تەماشای وردەکارییەکان دەکات، ئەگەر چ بڕ عەقڵ و ویژدان بەکاربێنێ، دەزانێ کە ئەم گەردوونە، ئەم کەون و کائیناتە، ئەم دروستکراوانەی خوا، بە سەرو خواریانەوە، خاوەنێکیان هەیە، بۆیە خوا دەفەرمویٚ: لە ئاسمانەکان و زەویدا نیشانە هەن بۆ بڕواداران، واتە: ئەوانەی لە بڕواهێنان بگەڕێن، ئەم گەردوونە، ئەم ئاسمانەکان و زەوییە، پڕن لە نیشانەو بەڵگە بۆ بڕوا هێنان.

٤)- ﴿ وَفِي خَلْقِكُمْ وَمَا يَبُثُّ مِن دَابَّةٍ ءَايَٰتٌ لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ ﴾، هەروەها لە دروستکرانی خۆتان و لەوەدا کە بڵاوی کردۆتەوە لە ژیانداران، نیشانە هەن بۆ کۆمەڵێک دڵنیابن، (**اليَقِيْنُ ضِدُّ الظن**)، دڵنیایی (**يَقِيْن**): دژی گومان (**ظَنّ**)ە، بە بەڵگەی ئەوە کە هەر لەم سوورەتی (**الجاثية**)دا هاتوە، دەڵێ: ﴿إِن نَّظُنُّ إِلَّا ظَنًّا وَمَا نَحْنُ بِمُسْتَيْقِنِينَ ﴿٣٢﴾﴾، بەس گومانمان دەبردو، ئێمە لە دڵنیایان نەبووین، کەواتە: گومان ئەوەیە، ئەگەر (**إحتمال**) دابنێی بۆ بوون و نەبوونی شتێک، ئنجا یان بوونەکەی زاڵبکەی، یان نەبوونەکەی، بەڵام دڵنیایی (**يَقِيْن**)ت نەبێ، لە بوونی یان نەبوونیدا، لێرەدا خوا ﷻ باسی گەردوون دەکات، دەفەرمویٚ: لە گەردووندا چەندان نیشانە هەن بۆ بڕواداران.

بەڵام دوایی کە دێتە سەر دروستکرانی خۆمان و ژیاندارانی دیکە، دڵنیایی (یقین) دەکاتە بەرهەمی تێوەڕامانیان: ﴿ وَفِي خَلْقِكُمْ ﴾، لە دروستکرانی خۆتاندا،

واتــە: پەیداکرانتــان و، ڕێــک و پێــک خســتنتان و، وەچــە لێکەوتنەوەتــان و، زۆر بوونتــان و بڵاوبوونەوەتــان بــە زەویــدا.

﴿ وَمَا يَبُثُّ مِن دَآبَّةٍ ﴾، هەروەهــا لــە ژیانــدارو پێرۆیانــەی خــوا بــڵاوی کردوونــەوە بــە زەویــدا، ئەوانــەش هەموویــان: ﴿ ءَايَٰتٌ ﴾، خوێنراویشــتەوە: (**آیاتٍ**) بــە هــەردوو شــێوە خوێنراوەتــەوە، ﴿ لِّقَوۡمٍ يُوقِنُونَ ﴾، بــۆ کۆمەڵێــک کــە زانیارییەکــی جێــی دڵنیاییــان هەبێــت، لەبــەر ئــەوەی ئەگــەر پێشــێ بــە گشــتیی تەماشــای گــەردوون بکــەی، دەتگەیەنــێ بــە ئیــمان، بــەڵام دوایــی ئەگــەر بتــەوێ یەقیــن پەیــدا بکــەی، دەبــێ زیاتــر ڕامێنــی لــە خــۆت و لــە پێکهاتــەکانی گــەردوون، لــە شــتەکان زیاتــر وردبیــەوە: لــە زینــدەوەران، لــە ژیانــداران، ئەگــەر بتــەوێ دڵنیایــی پەیــدا بکــەی لــە بــڕوا هێنانەکەتــدا، واتــە: ئەگــەر تەماشــای گــەردوون بکــەی، دەتگەیەنــێ بــە ئیــمان، بــەڵام بــۆ زیاتــر قووڵبوونــەوەی ئــەو ئیمانــە کــە ببــێ بــە جێــی دڵنیایــی، دەبــێ ســەرنجی وردتــر بــدەی لــە خــۆت و، لــە دەوروبــەرت.

کــە خــوای پــەروەردگار دەفەرمــوێ: ﴿ وَفِي خَلۡقِكُمۡ ﴾، لــە دروســتکردنی خۆتــان، وەک لــە شــوێنی دیکــە دەفەرمــوێ: ﴿ وَفِيٓ أَنفُسِكُمۡۚ أَفَلَا تُبۡصِرُونَ ٢١ ﴾**الذاریات**، هەروەهــا لــە خۆشــتان دا ئایــا نابینــن و ســەرنج نــادەن! یــان دەفەرمــوێ: ﴿ فَلۡيَنظُرِ ٱلۡإِنسَٰنُ مِمَّ خُلِقَ ٥ ﴾**الطـارق**، بــا مــرۆڤ ســەرنج بــدات لــە چــی دروســتکراوە!

ئێمــە لــەم تەفســیرەدا، لــە چەنــد شــوێنێک دا لــە بــارەی مــرۆڤ و ژیاندارانــەوە باســمان کــردوە، لــە ســەرەتای تەفســیری ســوورەتی (**المؤمنون**)دا، باسێکمان کــردوە لــە بــارەی دروســتبوونی مرۆڤــەوە، هەروەهــا لــە بــارەی ژیاندارانــەوە لە ســوورەتی (**النحل**) دا، لــە چەنــد شــوێنێکدا باســمان کــردوە، دیســان لــە بــارەی ڕووەک و شــیناوردەوە لــە ســەرەتای تەفســیری ســوورەتی (**الشعراء**)دا، کورتــە باســێکمان کــردوە.

بــە دڵنیایــی بــە ئەنــدازەی ئــەوەی کــە ئینســان ورد دەبێتــەوە لــە شــتەکان، بــە تایبــەتی لــە ژیانــداران و لــە وردەکاریــی و نهێنییەکانیــان تێــدەگات، زیاتــر پــەی بــە

سیفەتە بەرزو بێ وێنەکانی خوا دەبات، دیارە ژیانداران چەندان جۆریان هەن، جگە لە مرۆڤ: ئەوە ئاژەڵانن کە چوار جۆرن: (حوشترو ڕەشەوڵاخ و مەڕو بزن)، هەروەها ئاژەڵانی دیکە هەن، کە من پێم وایە وشەی (**أنعام**) وێڕای ئەو چوار جۆرە، ئاژەڵانی دیکەش دەگرێتەوە، هەموو ئەوانەی مرۆڤ لێیان بەهرەمەند دەبێ لە گۆشتیان و، بۆ بارو سوار بەکارهێنان و، بەرهەمەکانیان، ئەوجار پەڕەوەرەکان هەن، دیسان ژیانداری دەریایی هەن، ژیانداریی هەوایی هەن، هەروەها زیندەوەران هەن، هەموو ئەوانە ئەگەر ئینسان لێیان وردبێتەوە، پتر دەگاتە زانیاریی جێی دڵنیایی و ئیمانی دامەزراوو نەلەخشاو، بۆیەش پێشینانی خۆمان لە کاتی ڕازو نیازدا گوتوویانە: (ئەی خوای هەشتا هەزار عالەم!)، کە لە ڕاستییدا، عالەمەکان زۆر زۆر لە هەشتا هەزار زیاترن و، بەس خوا خۆی دەزانێ چی هێناوەتە دی لەم زەوییەدا، چ جای لە گەردووندا!!

٥)- ﴿ وَٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ ﴾، هەروەها جێگۆڕکەو جیاوازیی شەوو ڕۆژان، شەوو ڕۆژ، هەم جێگۆڕکە دەکەن، شەو دێتە جێی ڕۆژ، ڕۆژ دێتە جێی شەو بەردەوام، هەم جیاوازیشن، شەو تاریکەو ڕۆژ ڕووناکەو، بە دوای یەکدا دێن، ئەو بە دوای یەکدا هاتن و ئەم جیاوازییەیان و، جێگۆڕکەیان، نیشانەی پەروەدگارێتیی خوان.

٦)- ﴿ وَمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مِن رِّزْقٍ ﴾، هەروەها لەو بژیوەدا کە خوا دایبەزاندوە لە سەرێوە، ئەو بژیوەش زۆربەی زانایان بەس بە بارانیان لێکداوەتەوە، بەڵام وێڕای باران، بەفرو تەزرەش دەگرێتەوەو، هەموو ئەو شتانەی دیکەش دەگرێتەوە، کە لە ئاسمانەوە دێن، وەک: جۆرەکانی تیشک.

٧)- ﴿ فَأَحْيَا بِهِ ٱلْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا ﴾، دوایی زەوی پێ زیندوو کردۆتەوە دوای مردنی، واتە: دوای ئەوەی زەوی خاڵیی بۆتەوە لە ڕووەک، بەهۆی تیشک و ئاوی لەسەرێوە دابەزێنراوەوە، ژیاوەتەوە.

٨)- ﴿ وَتَصْرِيفِ ٱلرِّيَٰحِ ﴾، هەروەها جۆراوجۆر کردنی بایەکان، واتە: لە ڕووی جۆریانەوەو، لە ڕووی ئەو لایەوە کە لێی هەڵدەکەن لە باکوورەوە دێن، یان لە باشوورەوە، یان لە

ڕۆژهەڵاتەوە، یان لە ڕۆژئاواوەو، لە ڕووی جۆرو چۆنیەتیی بایەکەوە، ئایا ئەو بایە گەرم و وشکە وەک ڕەشەباو بای ژوورو، یاخود فێنک و شێدارە، وەک شەماڵ، ئنجا ئەو بایە ئەندازەکەی چەندەو ڕێژەی هێزەکەی چەندە؟ کە ئێستا مرۆڤ چەندان پێوەری دروستکردوون بۆ پێوانی باو، بۆ پێوانی باران، خوا ﷻ جاری وایە ئەندازەیەک لە ڕێژەو ئەندازەی تایبەتیی با زیاد دەکات، دەبێتە هۆی تسۆنامیی و، دەبێتە هۆی ئەوە کە داروبەرد بە یەکدا بدات!!، لە جۆراوجۆر کردنی بایەکان لە هەموو ڕووەکانیانەوەو، لەو شتانەی دیکەشدا:

٩)- ﴿ءَايَٰتٞ لِّقَوۡمٖ يَعۡقِلُونَ﴾، نیشانە هەن بۆ کۆمەڵێک بفامن، هەروەها خوێنراویشتەوە: (آياتٍ)، ﴿لِّقَوۡمٖ يَعۡقِلُونَ﴾، بۆ کۆمەڵێک بفامن، یانی: بەس عەقڵی خۆیان بەکاربێنن، ئەوانە هەموویان بۆیان دەبنە نیشانەو بەڵگە لەسەر بەدیهێنەرایەتیی و پەروەردگارێتیی و خاوەندارێتیی خوا ﷻ، چونکە پێشێ مرۆڤ ئیمان دێنێ، لە دوای ئیمان هێنان، دەبێ هەوڵبدات بیگەیەنێتە پلەی یەقین و دڵنیایی، دوای ئەوەش شتێک نامێنێ لە ڕووی ئیمانەوە پێی بگات، مەگەر عەقڵی خۆی زیاتر بەکاربێنێ، تاکو ئەو یەقینەی بەردەوام بێ، یەقینیش بە تەئکید پلە پلەیەو دەبێ هەوڵبدات یەقینەکەی دامەزراوتر بێ، ئەگەرنا لە دوای یەقینەوە، پلەیەک نیە لە ڕووی ئیمانەوە مرۆڤ پێی بگات، بۆیە خوا ﷻ دوای باسکردنی ئەو نیشانانەی دیکە دەفەرموێ: بۆ کۆمەڵێک کە بفامن، واتە: تۆ دەبێ بەردەوام عەقڵ و هۆشی خۆت بەکاربێنی بۆ بەهێز کردنی یەقینەکەت و مانەوەی یەقین و زێدەبوونی.

١٠)- ﴿تِلۡكَ ءَايَٰتُ ٱللَّهِ نَتۡلُوهَا عَلَيۡكَ بِٱلۡحَقِّ﴾، ئەوانە ئایەتەکانی خوان کە بە هەق بەسەر تۆیاندا دەخوێنینەوە، واتە: کاتێک بەسەر تۆیاندا دەخوێنینەوە، ئێمە هەق و ڕاستین، کەواتە: (**بِالحَقِّ**)، دەبێتە حاڵ بۆ بکەر (**فَاعِل**)ی، (**نَتْلُوا**)، یانی: (**نَتْلُوهَا عَلَيْك مُحِقِّين**)، کاتێک ئەو ئایەتانەت بەسەردا دەخوێنینەوە، ئێمە لەسەر هەقین و ڕاستین، یاخود (**بِالحَقِّ**) دەبێتە حاڵ بۆ بەرکار (**مفعول به**)ەکەی یانی: (**مُتَلَبِّساً بالحَقّ**)، ئەم ئایەتانە کە بەسەر تیاندا دەخوێنینەوە لە خودی خۆیاندا، هەقن، یاخود: (**بِالحَقِّ**)، یانی: (**بِسَبَبِ الحَقِّ**)،

بۆ ئەوەی هەق بچەسپێنین بە هۆی ئەو ئایەتانەوە کە بەسەر تۆیاندا دەخوێنینەوە، کەواتە: (**بِالحَقِّ**) چ کە لێرەدا، چ کە لە هەر شوێنێکی دیکەی قورئاندا هاتوە، سێ مانای هەن:

أ- ئێمە کە ئایەتەکان دەخوێنینەوە هەقین.

ب- ئایەتەکان تێکەڵ و ئاوێتەن لەگەڵ هەقدا.

ج- ئایەتەکان دەخوێنینەوە بۆ ئەوەی هەق بچەسپێنن، هەقیش ئەوەیە کە خوا ﷻ بە ڕاست و چاکی دەزانێ بۆ بەشەر.

١١)- ﴿فَبِأَيِّ حَدِيثٍ بَعْدَ ٱللَّهِ وَءَايَٰتِهِۦ يُؤْمِنُونَ﴾، ئنجا ئایا لە دوای خوا ﷻ و ئایەتەکانی، نیشانەکانی، بە چ قسەیەکی دیکە بڕوا دێنن؟! واتە: ئەگەر بڕوا بە فەرمایشتی خوا نەهێنن! بڕوا بە چ قسەیەکی دیکە دێنن؟ ئەگەر بڕوا بە خوا ﷻ نەهێنن کە خاوەن و پەروەردگارو مشوورخۆری گەردوون (ئاسمانەکان و زەوی)ە، ئەدی بڕوا بە کێ دێنن؟ وشەی (**يُؤْمِنُون**): خوێنراویشەتەوە: (**تُؤْمِنُون**)، ئەو کاتە لە دواندنی نادیارەوە دەیگۆڕێ بۆ دواندنی ڕووبەڕوو (**خِطاب**).

لێرەدا بە چاکی دەزانم ئاماژەیەک بکەم بە قسەیەکی ئیمام (**فخرالدين الرازي**)، هەرکام لە توێژەرەوانی قورئان جار جار قسەیەک کە زۆر تایبەت بێ و کردبیان، ئەگەر بە دڵم بێ دەیهێنم، جاری واش هەیە قسەیەکیان کردوە عەقڵم نایبڕێ و بە پێویستی دەزانم ڕەخنەی لێ بگرم، ئەگەرنا مەرج نیە هەر قسەیەک کە بە دڵم بێ، بیهێنم و، هەر قسەیەکیش کە بە دڵم نەبێ، ڕەخنەی لێ بگرم، بەڵام هەندێک جار ئەوە بە پێویست دەزانم، ئێستا ئەو قسەیەی (**الرازي**)یم پێ جوانە کە لە تەفسیرەکەی خۆیدا[1] دەڵێ:

(**وَاعْلَمْ أَنَّ كَثِيراً مِنَ الفُقَهاءِ يَقُولُونَ: إِنَّهُ لَيْسَ فِي القُرْآنِ العُلُومُ الَّتِي يَبْحَثُ عَنْها المُتَكَلِّمُونَ، بَلْ لَيْسَ فِيهِ إِلّا ما يَتَعَلَّقُ بِالأَحْكامِ والفِقْهِ، وذَلِكَ غَفْلَةٌ عَظِيمَةٌ لِأَنَّهُ لَيْسَ**

(١) التفسير الكبير: ج٢٥، ص٢٣٠.

**فِي القُرْآنِ سُورَةٌ طَوِيلَةٌ مُنْفَرِدَةٌ بِذِكْرِ الأَحْكَامِ، وفِيهِ سُوَرٌ كَثِيرَةٌ خُصُوصَاً المَكِّيَاتُ لَيْسَ فِيها إِلَّا ذِكْرُ دَلائِلِ التَّوْحِيدِ والنُّبُوَّةِ والبَعْثِ والقِيامَةِ، وكُلُّ ذَلِكَ مِن عُلُومِ الأُصُولِيِّينَ).**

دەڵێ: بزانە کە زۆرێک لە شەرعزانان گوتوویانە: لە قورئاندا ئەو زانیارییانەی کە زانایانی عیلمی کەلام (واتە: زانایانی کە باسی بووناسیی و، ئیمان و عەقیدە دەکەن، بیرمەندانی ئیسلام)، قسەی لە بارەوە دەکەن، لە قورئاندا باس و خواسیان نیە، بەڵکو ئەوەی لە قورئاندا هەیە تەنیا ئەوەیە کە پەیوەستە بە حوکمە شەرعییەکانەوەو بە فیقهەوە! بەڵام ئەوە بێئاگاییەکی مەزنە، چونکە لە هەموو قورئاندا سوورەتێکی درێژ نیە کە تەنیا حوکمە شەرعییەکانی تێدابن، بەڵام زۆر سوورەتی تێدا هەن بە تایبەتی سوورەتە مەککەییەکان، کە تەنیا باسی بەڵگەکانی یەکتایی خواو، پێغەمبەرایەتیی و، زیندووکرانەوەو قیامەتیان تێدا هەیە، ئەوانەش هەموویان لەو زانیارییانەن کە زانایانی بنچینەکانی دین (زانایانی ئیمان و عەقیدە) قسەیان لە بارەوە دەکەن.

لە ڕاستییدا قورئان زۆر لەوە مەزنترە کە تەنیا کتێبی فیقه بێ، فیقهیش بە مانا باوەکەی، واتە: باسی حوکمە کردەییەکان (**الأحكام العملية**)، بەڵکو قورئان وێڕای باسی حوکمە کردەییەکان و پێش ئەوە، باسی بووناسیی و، ئیمان و عەقیدەو، ڕەوشت و ئاکارەکان و، هەموو ئەو شتانەیە کە مرۆڤ پێویستیی پێیانە، بۆ بەڕێوەبردنێکی تەندروستانەی ژیانی دنیا، لە ڕووی تاکیی و، خێزانیی و، کۆمەڵایەتیی و سیاسییەوە، هەموو ئەوانەی تێیدایە، بەڵام وەک دەگوترێ: (هەر کەسە بە یاری خۆی هەڵا دەڵێ)، یان (هەر کەسە لە هەمبانەی خۆیدا گوێز دەژمێرێ)، شەرعزانان کە زیاتر سەرگەرمی حوکمە فیقهییەکان بوون، هەر ئەوەیان لە قورئاندا بینیوەو، ڕەنگە ئەوانەش کە سەرگەرمی عەقیدەو عیلمی کەلام بوون، زیاتر ئەوەیان تێدا ببینیێ و، زانایانی تەزکیە و تەصەووفیش، ڕەنگە زیاتر ئەو لایەنەیان تێدا ببینیێ، بەڵام لە ڕاستییدا قورئان هەموو ئەوانەیەو زۆر شتی زیاتر لەوانەشە.

### مەسەلەی دووەم:

**هەڕەشە کردن بە سزای سەخت، لە ناحەزانی پەیامی خواو، ناساندنیان بە: درۆزن و، تاوانبارو، خۆ بە زلگرو، گاڵتەکەر بە ئایەتەکانی خواو، وەسفی سزایەکەشیان بە ئازارگەیەنەرو، ڕیسواکەرو، پیس و، بە ئێش و ژان، یانی: ئەوان چەند سیفەتی خراپیان تێدا هەن، خوای دادگەریش سزایەکەیانی هێندە وەسفەی بۆ داناون:**

خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿وَيْلٌ لِكُلِّ أَفَّاكٍ أَثِيمٍ ﴿٧﴾ يَسْمَعُ آيَاتِ اللَّهِ تُتْلَىٰ عَلَيْهِ ثُمَّ يُصِرُّ مُسْتَكْبِرًا كَأَنْ لَمْ يَسْمَعْهَا ۖ فَبَشِّرْهُ بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٨﴾ وَإِذَا عَلِمَ مِنْ آيَاتِنَا شَيْئًا اتَّخَذَهَا هُزُوًا ۚ أُولَٰئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ مُهِينٌ ﴿٩﴾ مِنْ وَرَائِهِمْ جَهَنَّمُ ۖ وَلَا يُغْنِي عَنْهُمْ مَا كَسَبُوا شَيْئًا وَلَا مَا اتَّخَذُوا مِنْ دُونِ اللَّهِ أَوْلِيَاءَ ۖ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿١٠﴾ هَٰذَا هُدًى ۖ وَالَّذِينَ كَفَرُوا بِآيَاتِ رَبِّهِمْ لَهُمْ عَذَابٌ مِنْ رِجْزٍ أَلِيمٌ ﴿١١﴾﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە چواردە بڕگەدا:

١)- ﴿وَيْلٌ لِكُلِّ أَفَّاكٍ أَثِيمٍ﴾، سزای سەخت بۆ هەر درۆزنێکی زۆر گوناهبار، پێشتریش باسمان کردوە، (**وَيْلٌ: كَلِمَةُ دُعَاءٍ بِالشَّرِّ، وَأَصْلُ الوَيْلِ الشَّرُّ وحُلُولُهُ**)، (ويْل): لە ئەصڵدا بریتیە لە تووک و داواکردنی خراپە، نزا کردن بە خراپە، ئەصڵی (ویْلٌ)، بریتیە لە خراپەو زیان و هاتنی ئەو خراپەو زیانە، بەڵام جاری وایە بە مانای مەجازییشیان بەکارهێناوە، واتە: هاوار بۆ تۆ، وای بۆ تۆ، بەڵام لە ئەصڵدا بە مانای سزای سەختە، وەک لە قورئاندا دەفەرموێ: ﴿وَوَيْلٌ لِلْكَافِرِينَ مِنْ عَذَابٍ شَدِيدٍ ﴿٢﴾﴾ إبراهیم، کەواتە: (ویْل) بەشێکە لە سزای سەخت، لێرەدا دەفەرموێ: ﴿وَيْلٌ لِكُلِّ أَفَّاكٍ أَثِيمٍ﴾، سزای سەخت بۆ هەر درۆزنێکی زۆر گوناهبار، لە کوردییدا کەسێک درۆ بکات، دەڵێن: درۆکەر، یان درۆی کرد، بەڵام ئەگەر زۆر درۆیان بکات پێی دەڵێن: درۆزن.

بۆیە پێم وایە وشەی (أفَّاك): لە کوردییدا بەرانبەرەکەی دەبێتە درۆزن، ئەصڵی وشەی (أفَّاك) یانی: (القَوِيُّ الإفْكِ)، کەسێک (إفك)ەکەی، زۆر بەهێزە، (إفْك)، لە ئەصڵدا بە مانای هەڵگێڕانەوەیە و بە مانای لادانە، لەبەرئەوەی درۆش بریتیە لە هەڵگێڕانەوەی قسە، یان بریتیە لە بەراوەژوو کردنی شتێک، پێچەوانەی هەق، بۆیە وشەی (إفْك): بە مانای درۆ بەکاردێ، ئەگەرنا ئەصڵی واتایەکەی ئەوە نیە، بەڵام لێرەدا بە پێی سیاق، واتە: کەسێک کەشت هەڵدەگێڕێتەوەو درۆ دەکات، زۆریش گوناهبارە.

٢)- ﴿ يَسْمَعُ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ تُتْلَىٰ عَلَيْهِ ﴾، گوێبیستی ئایەتەکانی خوا دەبێ بەسەریدا دەخوێنرێنەوە، واتە: ئەوە نیە کە بۆ خۆی بچێت بیانخوێنێتەوە، بەڵکو ئایەتەکان بەسەریدا دەخوێنرێنەوە، کە بە تەئکید مەبەست پێی پێغەمبەری خوایە ﷺ، ئایەتەکانی بەسەردا خوێندوونەوە.

٣)- ﴿ ثُمَّ يُصِرُّ مُسْتَكْبِرًا كَأَن لَّمْ يَسْمَعْهَا ﴾، دوایی خۆبەزلگرانە سوور دەبێ، وەک هەر نەیبیستبێ! سوور دەبێ لەسەر چی؟ لێرەدا ئەوەی لەسەری سوور دەبێ، قرتێنراوە چونکە بە سیاق و سەلیقە دەزانرێ، یانی: (يُصِرُّ على الكُفْر مُسْتَكْبِرًا)، لەسەر کوفرو بێبڕوایی هەر سوور دەبێ بەردەوام دەبێ، لە ڕووی خۆ بەزلگرییەوە، ﴿كَأَن لَّمْ يَسْمَعْهَا ﴾، وەک ئەو ئایەتانەی هەر نەبیستبێ، (الإصْرَارُ: مُلازَمَةُ الشَّيْءِ، وعَدَمُ الإنْفِكَاكِ عَنْهُ، وحُذِفَ مُتَعَلَّقُ يُصِرُّ لِدَلالَةِ المَقَامِ عَلَيْهِ، أيْ: يُصِرُّونَ عَلَى كُفْرِهِمْ)، واتە: (إصرار) پەیوەستبوون بە شتێکەوەو لێ جیا نەبوونەوەیەتی، ئەوەی (يُصِرُّون)ی پێوە پەیوەستە قرتێنراوە، چونکە حاڵەکە دەیگەیەنێ، یانی: لەسەر بێبڕواییان سوور دەبن.

لە قورئاندا قرتاندن زۆرە، بەهۆی ئەوەوەش ئەو فەرمایشتەی خوا کورت بۆتەوە، هەر شتێک کە بە عەقڵ و سەلیقە بزانرێ، خوای پەروەردگار کتێبی خۆی پێ قەڵەباڵغ نەکردوە، ئێستا لێرە: ﴿ ثُمَّ يُصِرُّ مُسْتَكْبِرًا ﴾، یانی: خۆ بەزلگرانە سوور دەبێ لەسەر بێبڕوایی، ئەوەی ئیسرارەکەی پێوە پەیوەستە، کە بریتیە لە

کوفـر، قرتێـنراوە لەبـەر ئـەوەی بـە سیاق و سـەلیقە دەزانـرێ، بابـای زۆر درۆزنـی زۆر گوناهـکار، کـە ئایەتەکانـی خـوا دەبیسـتێ بەسـەریدا دەخوێنرێنـەوە، لەسـەر بێبڕوایـی سـوور دەبـێ، لـەڕووی خـۆ بەزلگرییـەوە، ﴿كَأَن لَّمْ يَسْمَعْهَا﴾، وەک هـەر نەیبیسـتبێ، ئەمـە ئاماژەیـە بـەوە کـە هـەر کەسێک بەڕاسـتیی گـوێ بـۆ ئایەتەکانـی خـوا هەڵبخـات، وەریاندەگـرێ و بڕوایـان پێدێنـێ، بۆیـە دەفەرمـوێ: ﴿يَسْمَعُ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ تُتْلَىٰ عَلَيْهِ﴾، گوێبیسـت دەبـێ ئایەتـەکانی خـوا بەسـەریدا دەخوێنرێنـەوە، دوایـی خۆبەزلگرانـە لەسـەر کوفـر سـوور دەبـێ، ﴿كَأَن لَّمْ يَسْمَعْهَا﴾، وەک نەیبیسـتبێ، یانـی: هـەر کەسێک ئایەتـەکان ببیسـتێ و گوێـی دڵیـان پـێ بـدات، بڕوایـان پێدێنـێ، بـەڵام ئـەو وەک هـەر نەیبیسـتبێ و لەڕاسـتییدا بـە گوێـی دڵ گوێـی بـۆ هەڵنەخسـتوون، یاخـود هـەر پێشـێ نیەتـی هێنـاوە وەریـان نەگـرێ، واتـە: قەناعـەت هێنانـی پێـش بیرکردنـەوە ڕێـی لێگرتـوە.

٤)- ﴿فَبَشِّرْهُ بِعَذَابٍ أَلِيمٍ﴾، ئنجا موژدەی پێبدە، بە ئازارێکی بە ئێش، واتە: ئەگەر شتێک هەبێ بۆ ئەو موژدە بێ و، جێی دڵخۆشیی بێ، هەر ئەوەیە، کە پێی بڵێن: سزاو ئازارێکی بەئێش چاوەڕێت دەکات! ئەگەرنا هیچ دڵخۆشییەکی دیکە بۆ ئەو نیە لەڕۆژی دواییدا.

یاخـود لێـرەدا مەبەسـت لـە: ﴿فَبَشِّرْهُ بِعَذَابٍ أَلِيمٍ﴾ ئەوەیـە کـە بـە توانجـەوەو بـە تەوسـەوە، ئـەو تەعبیـرەی بـۆ بەکارهێـنراوە، وەک یەکێـک بـە یەکێکـی دیکـە دەڵـێ: مـوژدەت لێبـێ، ئـەوە فـڵان کەسیشـت مـرد، یـان مـوژدەت لێبـێ فـڵان شـتەت بەسـەرهات، کـە بـە تەوسـەوە پێـی دەڵـێ، چونکـە هەواڵەکـە لـە خـودی لـە خۆیـدا شـتێکی دڵخۆشـکەر نیـە.

٥)- ﴿وَإِذَا عَلِمَ مِنْ ءَايَٰتِنَا شَيْـًٔا ٱتَّخَذَهَا هُزُوًا﴾، ئەگەر شتێک لە ئایەتەکانی ئێمەش بزانێ، بە گاڵتە پێکراویان دەگرێ، لێرەدا مەبەست لە (عَلِمَ): ﴿وَإِذَا عَلِمَ مِنْ ءَايَٰتِنَا شَيْـًٔا﴾، بریتیە لە گوێبیست بوون و لەبەرکردن، ئەگەرنا ئەو کەسە گاڵتە بە هەموو ئایەتەکانی خوا دەکات، بەڵام ئەگەر شتێک لە ئایەتەکانی خوا بزانێ، واتە: هەندێکیان لێ لەبەر بکات،

بە گاڵتە پێکردنەوە دەیانڵێتەوە، هەندێک کەس لاسایی قسەی کەسێک دەکاتەوە، یان قسەکەی دووبارە دەکاتەوە، بەڵام بە شێوەیەک کە بۆنی گاڵتە پێکردنی لێدێ، دیارە ئەو بێبڕوایانەی ڕۆژگاری پێغەمبەر ﷺ زۆر جۆریان تێدا هەبوون، ئەوانەشیان هەبووە، کە ئایەتێکیان لە پێغەمبەری خوا ﷺ گوێ لێبووە، یان لە یەکێک لە هاوەڵان، ئەوانیش ئەو ئایەتەیان لەبەر کردووەو، دوایی دووبارەیان کردۆتەوە بە گاڵتە پێکردنەوە.

٦)- ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ عَذَابٞ مُّهِينٞ ﴾، ئەوانە ئازارێکی ڕیسواکەرو زەبوونکەریان بۆ هەیە، چونکە: (**الجَزَاءُ مِنْ جِنْسِ العَمَل**)، ئەو کەسە گاڵتەی کردوە بە ئایەتەکانی خواو، ئایەتەکانی خوای بە کەم تەماشا کردوون و بەگاڵتەجاڕی گرتوون، خوای کاربەجێش سزایەکی دەدا لە قەدەر خۆی، پڕ بە پێستی خۆی، سزایەک کە زەبوون و ڕیسواو سەرشۆڕی دەکات.

٧)- ﴿ مِّن وَرَآئِهِمۡ جَهَنَّمُۖ ﴾، لە پشتیانەوە دۆزەخ هەیە، وەک پێشتریش گوتمان: ئەو شتەی کە ئینسان بەرەو ڕووی دەچێ، لە پێشیەوەیەتی، بەڵام لێرەدا خوا دەفەرمویٚ: ﴿ مِّن وَرَآئِهِمۡ جَهَنَّمُۖ ﴾، وەک لە سوورەتی (**الكهف**)یشدا، دەفەرمویٚ: ﴿ وَكَانَ وَرَآءَهُم مَّلِكٞ يَأۡخُذُ كُلَّ سَفِينَةٍ غَصۡبٗا ٧٩ ﴾، ئەم تەعبیرە هەندێک لە زانایان گوتوویانە: (**وَرَاء**)، بە مانای (**أَمَام**)ە، بەڵام لەڕاستییدا پێویست بەوە ناکات و (**وَرَاء**)، یانی: پشتەوە (**خَلْفَ**)و، (**أَمَام**) یانی: (**قُدّام**) پێشەوە، بەڵام ئەم تەعبیرە وەک یەکێک لە توێژەرەوانی قورئان دەڵێ: (**تَمْثِيلٌ لِلإقْتَرَابِ وَالغَفْلَة**)، وێنە هێنانەوەیە بۆ نیزیکیی ئەو شتەو بۆ بێئاگایی، واتە: ئەو دۆزەخەی کە چاوەڕێیان دەکات، لە پێشیانەوەیە، بەڵام وەک لە پشتیانەوەبێ، چونکە مەترسییەک، کە لە پشتتەوە دەبێ، تۆ نایبینی، واتە: ئەوان ڕۆژی دواییان نادیدە گرتوە، وەک لە پشتیانەوەبێ، ئەها خەریک بێ بەسەر ملیاندا بکەوێ! هەم لێیان نیزیکە، هەم ئەوانیش لێی بێئاگان، ئەوە بۆ وێناکردنی ئەو حاڵەتەیانە، حاڵەتی بێئاگایی لەو مەترسییەو نادیدەگرتنی و نیزیکییشی.

٨)- ﴿ وَلَا يُغۡنِي عَنۡهُم مَّا كَسَبُواْ شَيۡـٔٗا ﴾، هەرچی وەدەستیان هێناوە، هیچ سوودیان پێناگەیەنێ، (**الإِغْنَاءُ: الكِفَايَة وَالنَّفْعُ**)، (**إغناء**): بە مانای ئەوەیە شتێک بۆ شتێک کافی

بێ، بەس بێ و سوودی پێ بگەیەنێ، ئنجا بۆیە: ﴿ وَلَا يُغْنِي عَنْهُم ﴾، ﴿ يُغْنِي ﴾، بە (عَن)، تەعەددای پێکراوە بۆ بەرکار (**مفعول**)، و بۆ خواستن بەرکار، تاکو مانای (پاڵپێوەدەنێ) ی بخرێتە نێو، (**وعُدِّيَ بِحَرْفِ «عَنْ» لِتَضْمِينِهِ مَعْنَى يَدْفَعُ، يَعْنِي: وَلَا يَدْفَعُ عَنْهُم مَا كَسَبُوا شَيْئاً**)، ئەوەی وەدستیان هێنا هیچ سوودیان پێناگەیەنێ و، هیچ شتێکیان لێ دوور ناخاتەوە.

وشەی (**شَيْئاً**): دەبێتە بەرکار (**مفعول بە**)، یانی: (**وَلاَ يُغْنِي عَنْهُم ما كَسَبُوا شَيْئًا مِنَ الإِغْنَاء**)، هیچ جۆرە سوودێکیان پێ ناگەیەنێ، هیچ جۆرە دوورخستنەوەیەک سزاو ئازاریان لێ دوورناخاتەوە.

٩)- ﴿ وَلَا مَا ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَوْلِيَآءَ ﴾، هەروەها ئەوانەی جگە لە خوا بە دۆست و سەرپەرشتیاریان گرتوون (هیچ سوودیان پێ ناگەیەنن)، هەم ئەوەی وەدەستیان هێناوە لە سەروەت و سامان بە حەرامیی، کە بە زۆریی سەروەت و سامانەکەیە پێی بوغرا دەبن و، بە زۆریی بەهۆی ئەو بەزم و بازارە حەرامەوەیە، ئامادەنین گوێ بۆ پەیامی هەق بگرن، چونکە بەزم و بازارەکەیان لێ تێکدەچێ قۆرخکاریی و گەندەڵییەکەیان لێ تێکدەچێ، دەست بەسەر سەروەت و سامانی وڵات داگرتنیان لێ تێکدەچێ، ئەگەر ملکەچ بن بۆ پەیامی خوا، هەم ئەوە سوودیان پێ ناگەیەنێ، ﴿ وَلَا مَا ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَوْلِيَآءَ ﴾ هەروەها ئەوانەش کە جگە لە خوا کردوویانن بەسەرپەرشتیاری خۆیان و، بە پەرستراوی خۆیان، ئەوانەش هیچ سوودیان پێناگەیەنن.

١٠- ﴿ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴾، بۆ ئەوانیش ئازارێکی مەزن هەیە، ئنجا شتێک خوا پێی بفەرموێ: مەزن، دیارە زۆر مەزنە، هەندێک لە ڕوونکەرەوان گوتوویانە: ﴿ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴾، واتە: لە دنیادا، بەڵام ئەو ڕایە ڕاسترە کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴾، واتە: لە ڕۆژی دواییدا، چونکە بەڵێ بێبڕوایان جاری وایە لە دنیاشدا سزا دراون، بە تایبەتی بێبڕوایانی ڕۆژگاری پێغەمبەر ﷺ لە دنیاشدا لە جەنگی بەدردا زەبوونیی و سەرشۆڕیی و ئازارو مەینەتییەکی زۆریان بەسەرهات، هەروەها لە جەنگەکانی دیکەشدا، وێڕای

ئەوە کە بێبڕوایی خۆی جۆرێکە لە ئازارو مەینەتیی و ئێش و ژان، بابای بێبڕوا بەر چاوی لێڵ و تاریکە، تەماشای ڕابردووی دەکات، تاریکە، تەماشای ئێستای دەکات، تاریکە، تەماشای داهاتووی دەکات، تاریکە، لە سەراسیمەییدایە، بێبڕوایی هەر خۆی ئازارو مەینەتیی و ئێش و ژانە[1]، بەڵام سزاو ئازارێک خوا بە مەزن وەسفی بکات، لە دنیادا جێی نابێتەوەو لە ڕۆژی دواییدایە.

لە کۆتایی دا خوا دەفەرموێ:

١١)- ﴿ هَٰذَا هُدًى ﴾، ئەمە ڕێنماییە، واتە: قورئان ڕێنماییکار (هادي)ەو ڕێ پێشان دەدات، بەڵام بۆیە بە (**هُدًى**)، کە چاوگە وەسف کراوە، واتە: ئەوپەڕی ڕێنمایی تێدایە.

١٢)- ﴿ وَالَّذِينَ كَفَرُوا بِآيَاتِ رَبِّهِمْ ﴾، ئەوانەش کە بێبڕوا بوون بە نیشانەکانی پەروەردگاریان (کە لە گەردووندا هەن)، یاخود: بە ئایەتەکانی پەروەردگار کە لە فەرمایشتەکەیدا هەن و بەسەریاندا دەخوێنرێنەوە.

١٣)- ﴿ لَهُمْ عَذَابٌ مِّن رِّجْزٍ أَلِيمٌ ﴾، ئازاریان بۆ هەیە لە پیسییەکی بە ئێش، (**رِجْز**)، پێشتریش گوتمان: بە چەند واتایەک هاتوە:

أ- هەم بە مانای (**أَشَدُّ العَذَاب**) سەختترین سزا هاتوە.

ب- هەم بە مانای پیسیی هاتوە.

ج- هەم بە مانای سزایەک هاتوە کە مرۆڤ بشڵەژێنێ و بیجووڵێنێ، (**رِجْز**)یش، لە ئەسڵدا بە مانای جووڵاندن و هەژاندن دێ.

وشەی (**أَلِيم**): خوێنراویشەتەوە: (**أَلِيمٍ**)، کە ئەو کاتە دەبێتە وەسف بۆ (**رِجْز**)، ئەگەر (**أَلِيمٌ**)یش بێ دەبێتە وەسف بۆ (**عَذابٌ**)، ﴿ لَهُمْ عَذَابٌ مِّن رِّجْزٍ أَلِيمٌ ﴾، بە هەردوو شێوەکە خوێندراوەتەوە.

---

(١) لە تەفسیری ئایەتی (فلا تدعوا مع الله إلهاً آخر فتكون من المعذّبين) الشعراء - ٢١٣- دا، لەو بارەوە کورتە باسێکمان کردوە.

وشەی (مِنْ)، کە خراوەتە سەری: ﴿ لَهُمْ عَذَابٌ مِّن رِّجْزٍ أَلِيمٌ ﴾، بۆ ڕوونکردنەوەیە، یاخود بۆ بەشێکە.

ئەگەر تەماشای کۆی ئەم ئایەتە موبارەکانە بکەین، دەبینین ئەو بێبڕوایانە کە نەیارو ناحەزی قورئان و ئیسلام و پێغەمبەر ﷺ بوونە، خوا بە پێنج وەسف پێناسەیان دەکات:

١- ﴿ أَفَّاكٍ ﴾، درۆزن.

٢- ﴿ أَثِيمٍ ﴾، زۆر گوناهبار.

٣- ﴿ يَسْمَعُ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ تُتْلَىٰ عَلَيْهِ ثُمَّ يُصِرُّ مُسْتَكْبِرًا ﴾، دەبیستێ ئایەتەکانی خوای بەسەردا دەخوێنرێتەوە، دوایی هەر سووردەبێ لەسەر کوفرو خۆ بەزلگریی.

٤- ﴿ كَأَن لَّمْ يَسْمَعْهَا ﴾، وەک هەر گوێبیستیان نەبووبێ.

٥- ﴿ ٱتَّخَذَهَا هُزُوًا ﴾، بە گاڵتەیان دەگرێ.

لە بەرانبەر ئەو پێنج وەسفانەدا، خوای پەروەردگار ئەو ئازارو سزایەی کە بۆی داناون، ئەویش بە پێنج وەسف، پێناسەی دەکات:

١- ﴿ عَذَابٌ مُّهِينٌ ﴾، سزایەکی ڕیسواکەر.

٢- ﴿ فَبَشِّرْهُ بِعَذَابٍ ﴾، موژدەی پێبدە بە ئازارێکی بە ئێش.

٣- ﴿ مِّن وَرَآئِهِمْ جَهَنَّمُ ﴾، لە پشتیانەوە دۆزەخ هەیە.

٤- ﴿ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴾، ئازارێکی مەزن.

٥- ﴿ عَذَابٌ مِّن رِّجْزٍ أَلِيمٌ ﴾، ئازارێک لە پیسییەکی بە ئێش.

خوا ﷻ بەپێی کردەوەکانی هەر کەسێک سزای دەداو، بەپێی چاکەکانی هەر کەسێک پاداشتی دەداتەوە، ئەوانە چونکە سیفەتی خراپیان زۆر تێدا هەبوون و

هەڵوێستی خراپیان زۆر بوون، خواش ﷻ سزاو ئازارەکەیانی بە چەند وەسفێک پێناسە کردوە، چونکە خوا ﷻ هەر کەسە بە پێی تاوانی خۆی سزای دەدات، تاوانی زۆر بووبێ، بە سزای زۆرو، کەمتر بووبێ کەمتر، چاکەی زۆر بووبێ پاداشتی زۆرو، چاکەی کەمتر بووبێ کەمتر.

مەسەلەی سێیەم:

**ڕام و دەستەمۆکرانی دەریـا، کـە کەشـتییەکانی پێـدا دەڕۆن و، خەڵـک بـە هۆیانـەوە کارو کاسـبیی دەکـەن، هەروەهـا ڕامکرانـی هەرچییـەک کـە لـە ئاسـمانەکان و زەویدایـە لـە لایـەن خـواوە بـۆ مرۆڤـەکان، ئەوانـە نیشـانەی زۆری بـۆ کەسـانی بیرکـەرەوە تێـدان و، هاندەریشـیانە بـۆ سوپاسـگوزاریی:**

خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ٱللَّهُ ٱلَّذِى سَخَّرَ لَكُمُ ٱلْبَحْرَ لِتَجْرِىَ ٱلْفُلْكُ فِيهِ بِأَمْرِهِۦ وَلِتَبْتَغُوا۟ مِن فَضْلِهِۦ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿١٢﴾ وَسَخَّرَ لَكُم مَّا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا مِّنْهُ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴿١٣﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە شەش بڕگەدا:

١)- ﴿ٱللَّهُ ٱلَّذِى سَخَّرَ لَكُمُ ٱلْبَحْرَ﴾، خوا ئەو کەسەیە ﷻ دەریای بۆ دەستەمۆ کردوون، کە دەفەرموێ: (**البَحرَ**)، واتە: هەموو ئەو ئاوەی کە سێ لەسەر چواری، یاخود چوار لەسەر پێنجی، پانتایی گۆی زەوی داپۆشیوە، کە لەڕاستییدا لەسەر زەوی، خوا مەخلووقێکی گەورەتر لە ئاوی نەخوڵقاندوە.

کـە دەفەرمـوێ: خـوا ئـەو کەسـەیە دەریـای بـۆ ئێـوە دەسـتەمۆ و ملکـەچ کـردوە، پێشـێ خـوا باسـی بەڵگەکانـی بەدیهێنەرایەتیـی و پەروەردگارێتیـی خـۆی کـرد، ئنجـا باسـی هەندێـک لـە چاکەکانـی خـۆی دەکات، کـە دیسـان هـەر بەڵگـەن لەسـەر بەدیهێنەرایەتیـی و پەروەردگارێتیـی خـوا، بـەڵام هاوکاتیـش زیاتـر سـیفەتی چاکـەو نیعمـەت بوونیـان بـۆ مـرۆڤ تێـدا دەدرەوشـێتەوە، وەک ئەوانـی پێشـێ زیاتـر بەڵگـە بوونیـان تێـدا دەبیـنراو، نیشـانە بوونیـان لەسـەر پەروەردگارێتیـی خـوا تێـدا دەبیـنرا، بـەڵام ئەمجـارە لـەو ڕووەوە کـە سـوودو کەڵکیـان تێدایـە بـۆ خەڵـک.

ئێمـە هـەروا بـە سـادەیی تەماشـای دەریـا دەکەیـن، بەلـەم و کەشـتیی و پاپـۆڕو ژێـر دەریـا تێیـدا دەڕۆن، بـەڵام بـا ئینسـان بیهێنێتـە بەرچـاوی خـۆی، ئەگـەر ئاویـش

وەک گڵ و بەردو کانزاو زێڕو زیوو ئاسن بووایە، کێ دەیتوانی بەسەریدا بڕوات؟ بەڵام خوای پەروەردگار گەردەکان (جُزَئیات) (مۆڵۆکۆڵەکان)ی ئاوی وا خولقاندوون بەسەر یەکدا بخزن، هەروەک مۆڵوکۆڵەکانی هەوای بە جۆرێک خولقاندوون، کە فڕۆکەو باڵندە بتوانن پێیدا بفڕن، بەڵام لەبەر ئەوەی مرۆڤ کە بە شتێکەوە ڕادێ، زۆر سەرنجی نادات، ئەگەرنا تۆ تەماشا بکە! هەوا دەتوانرێ باڵندە پێیدا بڕواو باڵ ڕاوەشێنێ، هەروەها فڕۆکە پێیدا بڕوا، بەڵام دەریا بە جۆرێکی دیکەیە، ماددەی هەوا جیایە لە هی ئاو، هی ئاویش جیایە لەهی گڵ و بەردو دارو ئاسن و مس و کانزایەکان، بۆچی خوا دەریای ئاوا بۆ دەستەمۆ کردووین؟

٢)- ﴿ لِتَجْرِيَ ٱلْفُلْكُ فِيهِ بِأَمْرِهِۦ ﴾، تاکو بە مۆڵەتی خوا کەشتییەکانی پێدا بڕۆن.

(**الفُلْكُ**)، هەم بە مانای تاک دێ، یانی: (**سفینة**)، هەم بە مانای کۆ دێ، واتە: (**سُفُن**)، بۆ ئەوەی کەشتییەکان پێیدا بڕۆن بە مۆڵەتی خوا، کە دەفەرموێ: (**بأَمْرِهِ**)، یانی: خوا وای داناوە کەشتیی بتوانن پێیدا بڕۆن.

٣)- ﴿ وَلِتَبْتَغُوا۟ مِن فَضْلِهِۦ ﴾، تاکو سەرەنجام (بە هۆی ئەو کەشتییانەوە و، ئەو بارو سوارە کە بە دەریادا دەیکەن)، لە بەخششی خوادا داوا بکەن، واتە: کارو کاسبیی بکەن و، ڕزقی حەڵاڵ لە بەخششی خوا پەیدا بکەن، کە ئەمە هەموو جۆرە بەهرە وەرگرتنەکانی مرۆڤ دەگرێتەوە، نەک تەنیا کارو کاسبیی، هەموو جۆرە بەهرەوەرگرتنەکان ئەگەر ڕاو و شکاری ماسییە، ڕاوی ژیاندارانی دیکەیە، دەرهێنانی گەوهەرو مروارییە، دەرهێنانی شتانی دیکەیە، کە لە داهاتوودا بەشەر پەییان پێ دەبات، هەمووی دەگرێتەوە.

٤)- ﴿ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴾، بۆ ئەوەش کە سوپاسگوزاریی بکەن، بۆیە خوا بۆی دەستەمۆ کردوون، سوپاسگوزارییش بریتیە لە بەکارهێنانی چاکەکانی خوا لەڕەزامەندیی خوادا.

٥)- ﴿ وَسَخَّرَ لَكُم مَّا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا مِّنْهُ ﴾، هەرچی لە ئاسمانەکان و لە زەویدا هەیە، تێکڕای لە لایەن خۆیەوە بۆ ئێوە دەستەمۆ کردوە، بۆ ئێوەی ڕام و ملکەچ

کردوە، کە دەفەرموێ: (مِنْهُ أي: من قِبَلِهِ وَبِإِرَادَتِهِ)، لەلایەن خۆیەوەو بەویستی وی، یاخود (مِنْهُ: مُتَعَلِّق بِمُبْتَدَأ مَحْذُوفٍ أي: كُلُّ ذَلِكَ رَحْمَةٌ مِنْه لِعِبَادِهِ)، (منه) پەیوەستە بە قرتێنراوێکەوە، یانی: ئەوە هەمووی لە لایەن ئەوەوە بەزەییە بەرانبەر بە بەندەکانی.

٦)- ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يَتَفَكَّرُونَ﴾، بە دڵنیایی لەوەدا (لە دروستکرانی شتانی نێو ئاسمانەکان و زەوی و دەستەمۆکران و، ڕامکرانیان بە شێوەیەک کە مرۆڤەکان بتوانن لێیان بەهرەمەند بن)، نیشانە هەن بۆ کۆمەڵێک بیربکەنەوەو ڕابمێنن.

بەڵێ چاکەو نیعمەتەکانی خوا لە ژمارە نایەن، بەڵام بەشەر زۆر شتی خراپ کردوەو تێکداوە کە بە هۆی زێدە تەماع و دنیا ویستییەوە، ڕەچاوی پاراستنی ژینگەی نەکردوە، بە تایبەتی لەم ڕۆژانەدا ئاگرەکەی ئوستورالیا هەرچەندە دوای ماوەیەکی زۆر خامۆش بووەوە، بەڵام هەزاران جۆرە ژیاندار هەر قڕەبڕبوون و نەمان، چونکە هەر لەوێ هەبوون و ئەوێش هەمووی سووتاوەو پرووکاوە، هەروەها دەریاکان زۆر ژیاندارانیان تێدا دەفەوتێن، هەمووی لە ئەنجامی ئەوەدا کە ئەو کارگانەی چەک دروست دەکەن، ئەو دووکەڵەی لێیان پەیدا دەبێ بەرز دەبێتەوەو چینی ئۆزۆن کون دەبێ و، زیاد لەوەی کە پێویستە تیشکی ژێر سوورو سەروو وەنەوشەیی دێتە نێو زەوییەوەو، دەبێتە هۆی ئەوەی هەم بەستەڵەکەکان بتوێنەوەو، ڕێژەی ساردیی لە زەوییدا کە کەم بێتەوەو، پلەی گەرمیی بەرز بێتەوەو، هەم هەوا تێکبچێ، هەم دەریا تێکبچێ، هەم ژینگە تێکبچێ، ئنجا ئەگەر ئینسان بیری لێبکاتەوە، کە خوا ﷻ لە ئەصڵدا ئەم گەردوونەی چاک و ڕێک خوڵقاندوە، ئەم سەر زەویەی باش خوڵقاندوە، بەڵام مرۆڤ تێکی دەدات، بۆیە خوا ﷻ لە دوو شوێنی قورئاندا دەفەرموێ: ﴿وَلَا تُفۡسِدُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ بَعۡدَ إِصۡلَٰحِهَا ۝٥٦﴾الأعراف، واتە: تێکدان مەکەن لە زەویدا، دوای ئەوەی چاک دروستکراوە، دوای ئەوەی چاککراوە تێکی مەدەن، واتە: بە جۆرێک دەستکاریی مەکەن لەبەر زێدە تەماع، کە ژینگە تێکبچێ و سەر زەویتان لێ تێکبچێ و ژیانتان لێ تاڵ بێ.

لەو کۆبوونەوەیەی لەم ڕۆژانەی ڕابردوودا لە (داڤۆس) کرا، گوترا: مەترسیی هەیە کە ژیانی بەشەر ماوەیەکی دیکەی کەم بتوانێ بەردەوام بێ لەسەر زەوی، بە هۆی ئەوەوە کە دارستانەکان زیاتر گڕ دەگرن و، بەستەڵەکەکان زیاتر دەتوێنەوەو، ئاستی ئاو بەرزتر دەبێتەوەو، وشکانیی زیاتر دادەپۆشێ، ئەو حاڵەتە نەویستراوانەی کە ڕوو دەدەن، زیاتر ڕوودەدەن.

لە خوای پەروەردگار دەپاڕێینەوە کە یارمەتییمان بدات زیاتر لە فەرماییشتەکەی تێبگەین، یارمەتییشمان بدات کە تێگەیشتنەکەمان بکەینە هۆی پێگەیشتنی زیاتر، بۆ خۆمان و دەوروبەرمان، خوا یارمەتییمان بدات کە ئەم قورئانە وەک خوا ﷻ ویستوویەتی و بە ئامانجی گرتوە، بیکەینە مایەی هیدایەت و ڕێنمایی و ڕاستەڕێ بوون، بۆ خۆمان و دەوروبەرمان، کە بێگومان ئەم قورئانە هەمووی نوورو هیدایەت و بەرەکەتە بۆ هەموو مرۆڤایەتیی.

## مەسەلەی چوارەم:

**ئامۆژگاریی بڕواداران کە بە لێبوردن و چاوپۆشییەوە، مامەڵە لەگەڵ بێبڕوایانی نەیارو ناحەزیاندا بکەن، چونکە لە ڕۆژی دواییدا خوا سزاو پاداشتی پڕ بە پێستی هەموو لایەک دەداتەوە، مرۆڤ خۆی لە چاکەکەی بەهرەمەندەو، هەر خۆشی لە خراپەکەی زەرەرمەندە، گەڕانەوەش تەنیا بۆ لای خوایە:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿قُل لِّلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ يَغْفِرُوا۟ لِلَّذِينَ لَا يَرْجُونَ أَيَّامَ ٱللَّهِ لِيَجْزِىَ قَوْمًۢا بِمَا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ ﴿١٤﴾ مَنْ عَمِلَ صَـٰلِحًا فَلِنَفْسِهِۦ ۖ وَمَنْ أَسَآءَ فَعَلَيْهَا ۖ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّكُمْ تُرْجَعُونَ ﴿١٥﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە پێنج بڕگەدا:

١)- ﴿قُل لِّلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ يَغْفِرُوا۟ لِلَّذِينَ لَا يَرْجُونَ أَيَّامَ ٱللَّهِ﴾، بەو کەسانە بڵێ کە بڕوایان هێناوە، لەوانە ببوورن کە بە ئومێدی ڕۆژەکانی خوا نین.

(خوا ﷻ بە پێغەمبەری خاتەم موحەممەد ﷺ دەفەرموێ:) بەو کەسانە بڵێ: کە بڕوایان هێناوە، واتە: بڕوایان هێناوە بە هەموو ئەو شتانەی پێویستە بڕوایان پێ بهێنرێ، بڕوایان هێناوە بە خوا ﷻ، بەدیهێنەرایەتیی و پەروەردگارێتیی و خاوەندارێتیی و تەنیا پەرستراوێتیی و، خاوەنی هەموو ناوو سیفەتێکی هەرە باش و پەسەند بوونی خوا، پاشان بڕوایان هێناوە بە ڕۆژی دوایی و، بڕوایان هێناوە بە فریشتەکان و بە کتێبەکانی خواو بە پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام)، بڕوایان هێناوە بە ئەندازەگیریی و ڕاپەڕاندن (**قدر و قضاء**) ی خوا بۆ هەموو کاروبارەکانی بوون، بەوانە بڵێ: کە بڕوایان هێناوە (يَغْفِرُوا۟ لِلَّذِينَ لَا يَرْجُونَ أَيَّامَ ٱللَّهِ)، ببوورن لەو کەسانەی کە بەهیوای ڕۆژەکانی خوا نین، واتە: لە بێبڕوایان ببوورن و چاوپۆشییان لێ بکەن.

(**الرَّجَاءُ: تَرَقُّب وتَطَلّب الأَمْرِ المحْبُوبِ**)، چاوەڕێکردن و داواکردنی کارێک، یان شتێکە خۆشویستراو بێ، (أَيَّامَ ٱللَّهِ : **الأَوْقَاتُ الَّتِي تَجَسَّدَ فِيهَا نَصْرُ اللهِ أَو فَضْلُه**)، ئەو کاتانەی یارمەتیی خواو پشتیوانیی خوا بۆ دۆستەکانی تێیاندا بەرجەستە بووە، یاخود بەخشش و چاکەی خوا تێیاندا بەرجەستە بووە، بۆ دۆستەکانی، دەشگونجێ بڵێین: ئەو ڕۆژانەی کە تۆڵەو سزای خوایان تێدا بەرجەستە بووە بۆ دوژمنان و ناحەزانی، ئایا بۆچی بڕواداران لەگەڵ بێبڕوایاندا کە بە هیوای دیداری خوا نین، بە هیوای ئەو کاتانە نین کە تایبەتن بە خوای پەروەردگارەوەو بەخششی خوایان تێدا بەرجەستە دەبێ بۆ چاکەکاران و، سزاو تۆڵەو جەزرەبەی خوایان تێدا بەرجەستە دەبێ بۆ خراپەکاران، بەلێبوردەیی مامەڵە بکەن؟

٢)- ﴿لِيَجْزِيَ قَوْمًۢا بِمَا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ﴾، تاکو سزاو پاداشتی کۆمەڵێک بداتەوە بە پێی ئەوەی کردوویانە، خوێندراویشەتەوە: (**لِنَجْزِيَ**)، بۆ ئەوەی سزا و پاداشت بدەینەوە، (قَوْمًۢا)، کۆمەڵێک (بِمَا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ)، بەپێی ئەوەی کردوویانە، واتە: بۆ ئەوەی سزاو پاداشتی پڕ بە پێستی خوا بێتە دی، بۆ کەسانێک بە پێی کردەوەکەیان، جا ئەوەی بڕوادارو کردار چاک بووبێ، دیارە پاداشتی خوایان بۆ دەستەبەر دەبێ، بە ئەندازەی ئیمان و کردەوە باشەکانیان و، کەسانێک کە بێبڕواو خراپەکاریش بووبن، سزاو جەزرەبەی خوایان بۆ بەرجەستە دەبێ و دەڕەخسێ، بەپێی بێبڕوایی و خراپەکانیان، ئەمە دوایی زیاتر تیشکی دەخەینە سەر.

٣)- ﴿مَنْ عَمِلَ صَٰلِحًا فَلِنَفْسِهِۦ﴾، هەر کەسێک چاکە بکات، سوودەکەی بۆ خۆیەتی.

٤)- ﴿وَمَنْ أَسَآءَ فَعَلَيْهَا﴾، هەر کەسێک خراپەش بکات، زیانەکەی بۆ خۆیەتی.

٥)- ﴿ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّكُمْ تُرْجَعُونَ﴾، دواییش بەس بۆ لای پەروەردگارتان دەگێردرێنەوە، وێرای (تُرْجَعُونَ)، خوێندراویشەتەوە: (**تَرْجِعُون**)، واتە: دەگەڕێنەوە، کەواتە: ئێوە لە دنیادا مودارا بکەن، لەگەڵ نەیارەکانتانداو مەیکەنە شوێنی لێکدەرکردن و تەصفیە حیساب، بەڵکو پێکەوە مودارا بکەن و وێک هەڵبکەن و پێکەوە بسازێن، بەڵام شوێنی پاداشتدرانەوەی

ئێوە لەسەر چاکەکانتان و لە نێو ئەو چاکانەشدا: چاوپۆشیی و لێبوردن لە هەڵەو پەڵەی بەرانبەرەکانتان و، شوێنی سزای پڕ بە پێست بۆ بێبڕوایان لەسەر خراپەکانیان، لە نێو خراپەکانیشیاندا: ئەزیەت و ئازاردانی ئێوە، ڕۆژی دواییە، بۆیە هەر کەسێک چاکە بکات، خۆی لێی بەهرەمەندە، لە دنیاو لە دواڕۆژیشدا، چاکە لە دنیادا مایەی سەربەرزیی و سەلامەتیی و پاکیی و چاکییە، لە ڕۆژی دواییشدا مایەی سەربەرزییە، مایەی سەرفرازیی و ڕووسوورییە لە لای خوا، خراپەش لە دنیادا مایەی عەیبدارییەو، لە قیامەتیشدا مایەی گوناهباریی و شەرمەزارییە، مادام هەر بۆ لای پەروەردگاریشتان دەگێڕدرێنەوەو، دەگەڕێنەوە، کەواتە: بزانن نە چاکەی ئێوە زایە دەبێ، نە خراپەی ئەوانیش دەفەوتێ، ئەوانیش وەک بەرزەکی بانان بۆی دەرناچن.

چۆنیەتیی پەیوەست بوونەوەی ئەم دوو ئایەتە موبارەکەش بە ئایەتەکانی پێشەوە ئاوایە: پێشتر باسی گاڵتە پێکردنی کافرەکان بە قورئان کرا، کە ئەمەش ورووژێنەرە بۆ هەست و سۆزی بڕواداران، بۆیە پێویست بووە لە بارەی دان بە خۆدا گرتنەوە، ڕێنمایی بکرێن و دڵنیاش بن کە هەر کەسە چی بکات، دێتەوە ڕێی، ئەوانیش و نەیارە بێبڕوایەکانیشیان.

کەواتە: با لە دنیادا بە سینە فراوانیی و تەحەممول و صەبرو حەوسەڵە، مامەڵە بکەن و، وەک فیشەکە شێتە دەرنەپەڕن و، وەک شیر زوو هەڵنەچن و، لە قەدەر ئایین و بەرنامە تێرو تەواوەکەی خۆیان بن، ئایینەکەیان لێیان داوا دەکات، کە لە هەموو شتێکدا لە لووتکەدا بن، بە تایبەت لە بواری هەڵسوکەوت لەگەڵ خەڵکدا، ئەگەر بێت و مسوڵمانان وەک نامسوڵمانان بکەن، لە هەموو شتێکداو ئەوان چییان کرد، مسوڵمانانیش وا بکەن، مانای وایە چاکەو ئیمتیازو پلەیەکیان بۆ نامێنێتەوە بەسەر بەرانبەرەکانیاندا! ئەمەش ئەوەی لێوەردەگیرێ کە بەرنامەو ئایینەکەی ئەوان چۆنە، بەرنامەو ئایینی مسوڵمانانیش بەهەمان شێوەیە! کە واش نیە، بۆیە هەر کەسە دەبێ لە قەدەر بەرنامەی خۆی بێ، ئەگەر بەرنامەی ئەوان جنێوی تێدا بوو، بوختانی تێدا بوو، درۆو دەلەسەی

تێدا بوو، شەڕ پێ فرۆشتن و گێچەڵ پێکردن و تەشقەڵەی تێدا بوو، بێگومان بەرنامەی ئیسلام سەراپا ڕەوشتی بەرزو جوان و ئاکاری پەسندو لێبوردەیی و ڕەحم و سۆزە، تەنانەت بەرانبەر بە نەیارانیش.

## کورتە باسێک

## وریا بوون لە بارەی هۆی هاتنە خواری ئایەتەکانەوە

ئەم کورتە باسە لە پێنج (٥) بڕگەدا دەخەینەڕوو، کە پێویستە وریابین لە هۆی هاتنە خواری ئایەتەکان، کە لە سەرچاوەکاندا هاتوون، چ لە تەفسیرەکاندا، چ لەو کتێبانەدا کە تایبەت بە هۆیەکانی هاتنەخوار (**أسباب النزول**)ەوە، نووسراون، دەبێ زۆر وریابین، هەم لە ڕووی وردبوونەوە لە سەنەدیان و زنجیرەی ڕاوییەکان، کە تا چ ڕاددەیەک ڕاستەو جێی متمانەیە، ئەو شتە کە پاڵ دەدرێتە لای پێغەمبەر ﷺ و پێغەمبەری خوا فەرموویەتی، یان کردوویەتی، یان دانی پێدا هێناوە؟ هەروەها وێڕای سەنەدو زنجیرەی ڕاوییەکان لە ڕووی نێوەڕۆکیشەوە: ئایا ئەو دەقە، یان ئەو بەسەرهاتە، تاکو چ ڕاددەیەک لە ڕووی نێوەڕۆکەوە، لەگەڵ قورئاندا دەگونجێ و، لەگەڵ عەقڵدا دەگونجێ و، لەگەڵ سیرەو ژیانی پێغەمبەردا دەگونجێ؟ پاشان تاکو چ ڕاددەیەک لەگەڵ ئەو ئایەتە، یان ئەو چەند ئایەتەدا دەگونجێ کە بەوانەوە پەیوەست کراوە؟

### بڕگەی یەکەم:

**سێ هۆی هاتنە خوار، کە لەڕووی سەنەدەوە ڕاست نین:**

لە بارەی ئەم دوو ئایەتەوە، بە تایبەت ئایەتی یەکەمیان: ﴿قُل لِّلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ يَغْفِرُوا۟ لِلَّذِينَ لَا يَرْجُونَ أَيَّامَ ٱللَّهِ لِيَجْزِىَ قَوْمًۢا بِمَا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ ﴿١٤﴾﴾، بەوانە بڵێ: کە

بڕوایان هێناوە، با چاوپۆشیی بکەن، لەوانەی بە هیوای ڕۆژەکانی خوا نین، تاکو کۆمەڵێک بەپێی ئەوەی کردوویانە، سزایان بداتەوە، یاخود پاداشتیان بداتەوە، هەردووک لایان دەگرێتەوە، بەڵام زیاتر وا پێدەچێ مەبەست پێی سزادان بێ، چونکە وشەی (**جزاء**) لە قورئاندا، هەم بە مانای سزا (**عقاب**) دێ، هەم بە مانای پاداشت (**ثواب**) دێ.

بەڵام من تاکو ئێستا لە زمانی کوردییدا وشەیەکی وام لێ هەڵنەکەوتوە، مانایەکەی پڕ بە پێستی وشەی (**جزاء**) بێ، ئێمە یان دەبێ بڵێین: سزا، یان دەبێ بڵێین: پاداشت، هەر بۆیە کە کاتێک وشەی (**جزاء**) تەفسیر دەکەم دەڵێم: سزاو پاداشت، دەشگونجێ بگوترێ: بەرانبەر.

چەند بەسەرهاتێک لەو بارەوە گێڕدراونەوە، وەک هۆی هاتنەخواری ئەم ئایەتە، کە بێگومان هیچیان سەنەدەکەیان ڕاست نیە، بەڵام مەگەر چۆن ئەگەرنا هەموو تەفسیرەکانیش هێناویانن:

١- یەکێک لە بەسەرهاتەکان کە (**الواحدي**) لە (**أسباب النزول**)ەکەی خۆیدا هێناویەتی، بە ژمارە (٧٤٣)، ئەمەیە:

ڕۆژێک عومەری کوڕی خەتتاب (خوا لێی ڕازی بێ)، لەگەڵ عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلوول لە غەزوەی (**بني المصطلق**)، کاتێک کە سوپایەکە دابەزیە سەر بیری (**المريسيع**)، عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلوول غوڵامەکەی خۆی، کە ئەویش هەر ناوی عەبدوڵڵا بوو، ناردی ئاوی بۆ بێنێ، (ئاویان بۆ هەڵێنجێ لە بیرەکەو دواکەوت)، کە گەڕایەوە گوتی: بۆچی دواکەوتی؟ (دیارە بیرەکە بە مەزەندەی ئەو، هێندە دوور نەبووە، ئەوەندەی پێ بچێ)، ئەویش گوتی: غوڵامەکەی عومەر لەوێ بوو، گوتی: تاکو ئاو بۆ پێغەمبەر ﷺ دوایی بۆ ئەبوو بەکرو دوایی بۆ عومەر هەڵنەهێنجم، ڕێ نادەم کەس ئاوی لێ هەڵبهێنجێ، ئیدی لەسەر ئەوە من دوا کەوتم، (دیارە دەستەڵاتی ئەو نێردراوەی عومەری نەبووە خوا لێی ڕازی بێ)،

عەبدوڵـڵای کـوڕی ئوبـەی کـوڕی سـەلوول (کـە بـە سـەرۆکی مونافیقەکانـی مەدینـە دادەنـرێ و پێـش ئـەوەی پێغەمبـەری خـوا ﷺ بچـێ بـۆ مەدینـە، تاجیـان بـۆ چنیـوە، بـۆ ئـەوەی بیکەنـە پادشـاو حوکمڕانـی خۆیـان، زۆر حەسـوودیی بـە پێغەمبـەر بـردوەو، هـەر بـە نیفاقـەوە ژیـاوەو بـە نیفاقـەوە مـردوە، قسـەیەکی ناشـیرینی کـرد، پەندێکـی عەرەبانـە)، گـوتی: (سَـمِّنْ كَلْبَـكَ يَأْكُلْـكَ)، سـەگەکەت قەڵـەو بکـەو دوایـی خـۆت دەخـوات و بەلەکـت دەگـرێ، ئنجـا گوتـی: ئەوانـە لـە شـاری خۆیـان دەرکرابـوون، (واتە: لـە مەککـە)، ئێمـە پەنامانـدان و حاواندماننـەوەو، هاوکارییمانکـردن، کەچـی ئێسـتا لێـرە حوکمڕانییـمان بەسـەردا دەکـەن!!

دیـارە دوایـی ئـەو قسـەیەی عەبدوڵـڵا - ئەگـەر ئـەم ئایەتـەش بەهۆیـەوە نەهاتبێتە خـوار، وا پێدەچـێ ئـەو ئایەتانـەی سـوورەتی (**منافقـون**) بەهۆیـەوە دابەزیـبن کـە خـوا پشـتیوان بـێ، ئەگـەر تەمـەن بـەردەوام بـێ، دەیگەینـێ- ئـەو قسـەیەی عەبدوڵـڵای کـوڕی ئوبـەی کـوڕی سـەلوولیش دەرهاویشـتەی دەبـێ، چونکـە بـە پێغەمبـەر دەگاتـەوەو کوڕێکـی عەبدوڵـڵاش، کـە دیسـان نـاوی عەبدوڵـڵا بـووە، ڕێگـە بـە بابـی دەگـرێ، چونکـە عەبدوڵـڵای کـوڕی ئوبـەی کـوڕی سـەلوول وێـڕای ئـەو قسـەیە، قسـەیەکی دیکـەش دەکات دەڵـێ: (لَـئِنْ رَجَعْنَـا إِلَى الْمَدِينَـةِ لَيُخْرِجَـنَّ الْأَعَـزُّ مِنْهَـا الْأَذَلَّ)، کـە خـوای پـەروەردگار هـەر دەقـی قسـەکەی هێنـاوە: ئەگـەر گەڕاینـەوە بـۆ مەدینـە، ئـەو کەسـەی بـاڵا دەسـتە، دەبـێ ئـەو کەسـەی زەبوونـە، دەربـکات، (واتـە: ئێمـە کـە خەڵکـی مەدینەیـن (خـۆی و مونافیقـەکان) دەبـێ موحەممـەدو هـاوەڵانی دەربکەیـن)، ئنجـا کوڕەکەشـی لـە شـوێنێک ڕێ بـە بابـی دەگـرێ و دەڵـێ: دەبـێ دانـی پێـدا بێنـی کـە موحەممـەد پێغەمبـەری خـوا ﷺ عەزیـزەو باڵادەسـتەو، تـۆش زەبـوونی، ئەگەرنـا ڕێگـەت نـادەم بچیـەوە نێـو شـار، هەتـا پێغەمبـەر ﷺ بـە وێـدا دێ و، دەڵـێ: ڕێگـەی بـدە، دەڵـێ: ئێسـتا مـادام پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرمـان بـکات، ئـەوە ڕێـگات دەدەم.

ئنجـا دەڵێیـن: ئـەم ئایەتـە هیـچ پەیوەندیـی نیـە، بـەو بەسـەرهاتەوە، کـە بەداخـەوە هەندێـک لـە توێژەرەوانـی قورئـان، هۆکارێـک یاخـود بەسـەرهاتێک

بەسەر پێنج شەش ئایەتدا دەچەسپێنن، ئنجا ئەو بەسەرهاتەی باسم کرد، بەسەرهاتەکە ڕاستە، بەڵام نەک بە نسبەت ئەو ئایەتەوەو، هیچ پەیوەست نیە بەو ئایەتەوە، بەڵکو پەیوەستە بە سوورەتی (**المنافقون**)ەوە، کە دوای خوا پشتیوان بێ دەیگەیێنێ.

**٢-** هەر لەو بارەوە بەسەرهاتێکی دیکەش گێڕدراوەتەوە دەڵێ: دوای ئەوەی ئەم ئایەتە موبارەکە هاتە خوار: ﴿مَّن ذَا ٱلَّذِي يُقْرِضُ ٱللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا فَيُضَٰعِفَهُۥ لَهُۥٓ أَضْعَافًا كَثِيرَةً ۚ وَٱللَّهُ يَقْبِضُ وَيَبْصُۜطُ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٢٤٥﴾﴾ **البقرة**، واتە: کێ هەیە قەرزی باش بداتە خوا، خوا پاداشتەکەی بۆ چەند بەرانبەر دەکات؟خواش وەتەنگ دێنێ و فراوان دەکات و بەس بۆ لای ویش دەگێڕرێنەوە.

(**فنحاص**)ی جوولەکە کە یەکێک بووە لە زانایانی جوولەکە، گوتی: (**احْتَاجَ رَبُّ مُحَمَّدٍ**)، پەروەردگاری موحەممەد نەدارەو ئاتاجە، (بۆیە داوای قەرز دەکات)!! کاتێک عومەر (خوا لێی ڕازی بێ) ئەو قسەیە دەبیستێ، شمشێرەکەی هەڵدەگرێ و بۆی دەچێ، بەڵام خوا جیبریل دەنێرێ و دایدەبەزێنێ و، هەواڵ بە پێغەمبەر دەدات کە عومەری کوڕی خەتتاب بە تەمای سزادانی فەنحاصە، پێغەمبەریش ﷺ نەفەرێک دەنێرێ و عومەر دەگێڕنەوە.

بەڵام ئەم بەسەرهاتەش کە هەر (**الواحدي**)، هێناویەتی لە (أسباب النزول) ەکەی دا، بە ژمارە: (٧٤٢) سەنەدەکەی بێ هێزەو جێی پشت پێ بەستن نیە.

**٣-** هەر لەو بارەوە ئەو ڕیوایەتەش هاتوە، دەڵێ: پیاوێک لە هۆزی قوڕەیش (واتە: ئەو کاتەی بێبڕوا بوون) قسەیەک یان جنێوێک بە عومەری کوڕی خەتتاب دەڵێ، ئەویش دەیەوێ دەستی لێ بوەشێنێ و پەلاماری بدات، بەو بۆنەوە ئەم ئایەتە دابەزیوە.

بەڵام ئەم ڕیوایەتەش کە (**القرطبي**)[1]، لە (**ابن العربي**)یەوە دەیهێنێ، دەڵێ: (**وَهَذَا لَمْ يَصِحّ**)، ئەم گێڕدراوەیە سەنەدەکەی ڕاست نیە.

---

(١) الجامع لأحكام القرآن، ج١٦، ١٢٧.

کەواتە: سێ هۆی هاتنە خوار لە بارەی ئەو ئایەتەوە لە تەفسیرەکاندا هاتوون، ڕەنگە هی دیکەش هەبن، بەڵام ئەو سێیە سەرەکییەکانیانن، هیچیان یان هەر سەنەدیان نیە، وەک ڕیوایەتی یەکەمی (**الواحدي**)، کە هیچ سەنەدێکی نیە، یاخود سەنەدەکەیان بێهێزە، واتە: جێی متمانە پێکردن نیە، کە پەیوەست بکرێ، بە چەمک و واتای ئەو ئایەتە موبارەکەوە.

## بڕگەی دووەم:

### بە مەنسووخ دانرانی ئەو ئایەتە:

(**الطبري**)، دەڵێ: (**وَهَـذِهِ الآيَـةُ مَنْسُـوخَةٌ بِأَمْرِ اللهِ بِقِتَالِ المُشْرِكِين، وَإِنَّمَا قُلْنَا: هِيَ مَنْسُـوخَةٌ لِإِجْمَاعِ أَهْلِ التَّأْوِيلِ عَلَى ذَلِكَ**)، واتە: ئەم ئایەتە نەسخ کراوەتەوە بە فەرمانکردنی خوا بە جەنگکردن لە دژی هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان، بۆیەش دەڵێین: ئەم ئایەتە نەسخ کراوەتەوە، لەبەر یەکڕایی و یەکدەنگیی زانایانی کە قورئانیان تەفسیر کردوە، لەسەر ئەوە.

بەڵام بابزانین ئەو دەعوایەی (**طبري**) ڕاستە؟!

(**الطبري**)، پێنج ڕیوایەتان دێنێ، بۆ پشتگیریی ئەوە کە یەکدەنگیی زانایان لەسەر ئەوەیە، ئەو ئایەتەی دەفەرموێ: ﴿ قُل لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ يَغْفِرُواْ لِلَّذِينَ لَا يَرْجُونَ أَيَّامَ ٱللَّهِ لِيَجْزِىَ قَوْمًۢا بِمَا كَانُواْ يَكْسِبُونَ ﴿١٤﴾ ﴾، نەسخ کراوەتەوەو کاری پێناکرێ:

**١- {عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَوْلَهُ:** ﴿ قُل لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ يَغْفِرُواْ لِلَّذِينَ لَا يَرْجُونَ أَيَّامَ ٱللَّهِ ﴾**الجاثية: ١٤، قَالَ: «كَانَ نَبِيُّ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يُعْرِضُ عَنِ الْمُشْرِكِينَ إِذَا آذَوْهُ، وَكَانُوا يَسْتَهْزِئُونَ بِهِ، وَيُكَذِّبُونَهُ، فَأَمَرَهُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ أَنْ يُقَاتِلَ الْمُشْرِكِينَ كَافَّةً، فَكَانَ هَذَا مِنَ الْمَنْسُوخِ»}**[1].

---

(١) جامع البيان: ٣١٢٤٧.

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕووی لە هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان وەردەگێڕا، کە ئەزیەتیان دەداو، گاڵتەیان پێ دەکردو بە درۆیان دادەنا، بەڵام دوایی خوا فەرمانی پێکرد کە لە دژی هەموو هاوبەش بۆ خوا دانەران بجەنگێ، {کە دەفەرموێ: ﴿ قَاتِلُوا الْمُشْرِكِينَ كَافَّةً ﴾، التوبة: ٣٦}، بۆیە ئەم ئایەتە کە دەفەرموێ: لێیان ببوورن و چاوپۆشییان لێ بکەن، نەسخ کرایەوە.

٢- {عَنْ قَتَادَةَ، فِي قَوْلِهِ: ﴿ قُل لِّلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ يَغْفِرُوا۟ لِلَّذِينَ لَا يَرْجُونَ أَيَّامَ ٱللَّهِ ﴾الجاثية: ١٤، قَالَ: «نَسَخَتْهَا مَا فِي الْأَنْفَالِ» ﴿ فَإِمَّا تَثْقَفَنَّهُمْ فِي الْحَرْبِ فَشَرِّدْ بِهِمْ مَنْ خَلْفَهُمْ لَعَلَّهُمْ يَذَّكَّرُونَ ﴾الأنفال: ٥٧، «وَفِي بَرَاءَةَ» ﴿ قَاتِلُوا الْمُشْرِكِينَ كَافَّةً كَمَا يُقَاتِلُونَكُمْ كَافَّةً ﴾التوبة: ٣٦، أَمَرَ بِقِتَالِهِمْ حَتَّى يَشْهَدُوا أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ}[١].

واتە: قەتادە لە بارەی ئەو ئایەتە موبارەکەوە دەڵێ: ئەو ئایەتەی سوورەتی (الأنفال)، {ئایەتی ژمارە (٥٧) و، ئایەتەکەی سوورەتی (براءة)، ئایەتی ژمارە (٣٦)}، ئەو ئایەتەیان نەسخ کردۆتەوە ئەو دوو ئایەتە بە هەردووکیان ئەویان نەسخ کردۆتەوە!

٣- {عَنِ الضَّحَّاكِ فِي قَوْلِهِ: ﴿ قُل لِّلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ يَغْفِرُوا۟ لِلَّذِينَ لَا يَرْجُونَ أَيَّامَ ٱللَّهِ ﴿١٤﴾ ﴾، قَالَ: «هَذَا مَنْسُوخٌ، أَمَرَ اللَّهُ بِقِتَالِهِمْ فِي سُورَةِ بَرَاءَةَ»}[٢].

واتە: لە (ضحاك)ەوە هاتوە لە بارەی ئەم ئایەتەوە: ﴿ قُل لِّلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ يَغْفِرُوا۟ لِلَّذِينَ لَا يَرْجُونَ أَيَّامَ ٱللَّهِ ﴿١٤﴾ ﴾، گوتوویەتی: ئەم ئایەتە نەسخ کراوەتەوە، چونکە خوا ﷻ فەرمانی کردوە بە جەنگ لە دژکردنیان لە سوورەتی (براءة)دا، {واتە: سوورەتی (التوبة)}.

---

(١) جامع البيان: ٣١٢٥٠.

(٢) جامع البيان: ٣١٢٥٢.

٤- {عَنْ أَبِي صَالِحٍ: ﴿قُل لِّلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ يَغْفِرُوا۟ لِلَّذِينَ لَا يَرْجُونَ أَيَّامَ ٱللَّهِ ﴿١٤﴾﴾ الجاثية، قَالَ: نَسَخَتْهَا الَّتِي فِي الْحَجِّ: ﴿أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَاتَلُونَ بِأَنَّهُمْ ظُلِمُوا﴾ الحج: ٣٩]}[1].

واتـە: ئەبـوو صاڵیحیـش دەڵـێ: ئایـەتی ژمـارە (١٤)ی سـوورەتی (**الجاثيـة**)، ئایـەتی ژمـارە (٣٩) سـوورەتی (**الحـج**)، نەسـخی کردۆتـەوە، (واتـە: لەسـەر لابـەر (ناسـخ)ەکەی ئـەوە جـارێ چـوار ڕا پەیدابـوون!!).

٥- {قَالَ ابْنُ زَيْدٍ، فِي قَوْلِهِ: ﴿قُل لِّلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ يَغْفِرُوا۟ لِلَّذِينَ لَا يَرْجُونَ أَيَّامَ ٱللَّهِ ﴿١٤﴾﴾ الجاثية، قَالَ: هَؤُلَاءِ الْمُشْرِكُونَ قَالَ: وَقَدْ نُسِخَ هَذَا وَفُرِضَ جِهَادُهُمْ وَالْغِلْظَةُ عَلَيْهِمْ}[2].

واتـە: ئیبنـو زەیـد دەڵـێ: ئـەم ئایەتـە: ﴿قُل لِّلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ يَغْفِرُوا۟ لِلَّذِينَ لَا يَرْجُونَ أَيَّامَ ٱللَّهِ ﴿١٤﴾﴾ **الجاثيـة**، مەبەسـت پێـی هاوبـەش بـۆ خـوا دانەرەکانـە، دوایـی دەڵـێ: ئەمـە نەسـخ کراوەتـەوەو، جەنـگ لـە دژ کردنیـان و زبریـی بەرانبـەر نواندنیـان، فـەرز کـراوە.

(**الطبري**)، ئەمەشـی بـە ژمـارە (٣١٢٥٣) هێنـاوە، کەواتـە: (**الطبري**)، بـە ژمـارەکانی: (٣١٢٤٧، ٣١٢٥٠، ٣١٢٥٢، ٣١٢٥٣، ٣١٢٥٤)، پێنـج ڕیوایـەت دێنـێ، لـە هـەر کام لـە عەبدوڵـڵای کـوڕی عەبباس و لـە قەتادەو لـە ئەضضحـاک و لـە ئەبـوو صاڵیـح و لـە ئیبنـو زیـدەوە، (کـە دیـارە هـەر عەبدوڵـڵای کـوڕی عەببـاس هاوەڵـەو، ئـەوانی دیکـە هـەر چواریـان لـە زانایـانی تابیعینـن)، بـۆ پشتڕاسـتکردنەوەی ئـەو ڕایـەی دەڵـێ: ئـەم ئایەتـە نەسـخ کراوەتـەوەو کاری پێناکـرێ، بـەڵام لەوبـارەوە ئایـا: چ ئایەتێـک ئـەو ئایەتـەی نەسـخ کردۆتـەوە؟ پێنـج ڕای جیاجیـا هـەن:

أ- عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس دەڵێ: بەوە نەسخ کراوەتەوە، کە خوا فەرمانی کردوە لە دژی هاوبەش بۆ خوا دانەران، بەگشتیی جەنگ بەرپا بکرێ، مەبەستی پێی ئایەتەکەی سوورەتی (**البراءة**)یە: ﴿وَقَـٰتِلُوا۟ ٱلْمُشْرِكِينَ كَآفَّةً ﴿٣٦﴾﴾.

---

(١) جامع البيان: ٣١٢٥٤.

(٢) جامع البيان: ٣١٢٥٣.

**ب**- قەتادە هەم ئایەتی (٢٦)ی سوورەتی (**التوبة**) و هەم ئایەتی (٥٧)ی سوورەتی (**الأنفال**)، بە نەسخکەرەوەی ئەو ئایەتە دەزانێ.

**ج**- ئەضضحاكیش دەڵێ: ئەوەی كە لە سوورەتی (**البراءة**)دا هەیە، كە ڕەنگە مەبەستی هەر ئەو ئایەتە بێ، یان ڕەنگە مەبەستی ئایەتی دیكەش بن.

**د**- ئەبوو صاڵیح دەڵێ: ئایەتی (٣٩)ی سوورەتی (**الحج**)، نەسخی كردۆتەوە.

**هـ**- ئیبن زەیدیش دەڵێ: نەسخ كراوەتەوەو، فەرمانكراوە كە جیهادیان لە دژ بكرێ و، زبرییان بەرانبەر بنوێنرێ، كەواتە: مەبەستی ئەو ئایەتەیە: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ قَٰتِلُواْ ٱلَّذِينَ يَلُونَكُم مِّنَ ٱلْكُفَّارِ وَلْيَجِدُواْ فِيكُمْ غِلْظَةً وَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلْمُتَّقِينَ ﴿١٢٣﴾ ﴾**التوبة**، مانای وایە بەلای كەمەوە پێنج ڕای جیاواز هەن لە بارەی نەسخ كەرەوەی ئەو ئایەتەوەو، لەسەری یەكدەنگ نین!

هەڵبەتـە لـە ڕووی سەنەدیشـەوە، ئـەو ڕیوایەتانـە هیچیـان جێـی متمانـە نیـن، چونكـە هەموویـان بـە مورسـەل دادەنرێـن، واتـە: یەكسـەر ئـەو زانایـەی تابیعیـن پاڵـی دەداتـە لای پێغەمبـەر ﷺ یـان لای هـاوەڵان، یاخـود بـۆ وێنـە: عەبدوڵـڵای كـوڕی عەببـاس (خـوا لـە خـۆی و بابـی ڕازی بـێ) كـە ئـەوە بـۆ چـوونی خۆیـەتی، دەڵـێ: پێغەمبـەر ﷺ پشـتی لـە هاوبـەش بـۆ خـوا دانـەرەكان دەكـرد، كـە ئازاریـان دەداو گاڵتەیـان پـێ دەكـردو بـە درۆیـان دادەنـا، بـەڵام دوای ئـەوەی خـوا فەرمانی پێكـرد كـە لـە دژیـان بجەنگـێ، ئـەوە نەسـخ بـۆوە! كـە ئـەوەش بۆچـوونی ئـەوە، نەك شـتێك بـێ بڵـێ: پێغەمبـەر ﷺ وای فەرمـووە، هەڵبەتـە دەشـگونجێ سـەنەدەكەشی ڕاسـت نەبـێ و عەبدوڵـڵا شـتی وای نەگوتبـێ.

## بڕگەی سێیەم:

### ڕا جیایی لەسەر نەسخ کرانەوەی ئایەتەکە:

هەندێک لە زانایانی دیکە گوتوویانە: ئەم ئایەتە موبارەکە نەسخی بەسەردا نەهاتوە، هەروەک ئێمە ڕامان وایە، کە هیچ ئایەتێک لە قورئاندا مەنسووخ نیە بەو واتایەی ئایەتێک هەبێ لە قورئانداو ئێستا کاری پێ نەکرێ، بەڵێ دەگونجێ ئایەتێک هەبێ، حوکمێکی گشتیی تێدابێ و دوای ئەو حوکمە، ئایەتێکی دیکە هاتبێ تایبەتی کردبێ، هەروەها دەگونجێ ئایەتێک هەبێ حوکمێکی ڕەهای تێدابێ و، ئایەتێکی دیکە حوکمەکەی بەنددار (**مقیّد**) کرد بێ و، ئایەتێک هاتبێ حوکمێکی کورت (**مجمل**)ی تێدابێ، ئایەتێکی دیکە یان چەند ئایەتێکی دیکە، هاتبن تەفصیڵیان دابێتێ، یاخود دەگونجێ لە بارەی حوکمێکەوە چەند ئایەتێک هاتبن، وەک پلەپلەیی، بەڵام هیچ کەس ناتوانێ ئایەتێک بێنێ بڵێ: فڵان ئایەتە لە قورئاندا هەیەو، کاری پێ ناکرێ و، ئێمە تاکو ئێستا کە گەیشتووینەتە کۆتایی جوزئی (٢٥)، ئایەتێکی وامان نەهاتۆتە پێش ناچار بین، بڵێین: ئەو ئایەتە لەگەڵ فڵان ئایەتەی دیکەدا تێک دەگیرێ، یان ئەو ئایەتە کاری پێناکرێ، بە هەر حاڵ با تەماشای قسەی چوار لە زانایان بکەین، کە دووانیان دەڵێن: ئەم ئایەتە نەسخ بۆتەوەو، دووانیشیان دەڵێن: نەخێر نەسخ نەبۆتەوە.

**١)**- یەکێک لەوانەی دەڵێ: ئەم ئایەتە نەسخ بۆتەوەو ڕایەکی وا دێنێ (**القرطبي**)یە[1]، کە دەڵێ: ئەگەر ئەم ئایەتە لە مەککە هاتبێتە خوار، ئەوە نەسخ بۆتەوە، بەڵام ئەگەر لە مەدینە هاتبێتە خوار، نەسخ نەبۆتەوە.

کەواتە: ئەو ئەگەری نەسخ بوونەوەو، نەسخ نەبوونەوە دادەنێ.

**٢)**- (**الشوكاني**)یش بە (**قيل**)، دەیهێنێ و دەڵێ: (**قِيلَ: الآيَةُ مَنْسُوخَةٌ بِآيَةِ السَّيْفِ**)، گوتراوە: ئەم ئایەتە نەسخ کراوەتەوەو حوکمەکەی لابراوە، بە ئایەتی شمشێر.

---

(١) الجامع لأحكام القرآن، ج٢٥، ص٧.

ئێمە لە سووڕەتی (**التوبة**)دا باسمان کردوە، کە وشەی (**سيف**) لە هەموو قورئاندا نەهاتوە، بەس وشەی (**أسلحة**) هاتوە، کە کۆی (**سلاح**)ە، واتە: چەک، بەڵام وشەی (**سيف**) لە قورئاندا نەهاتوە، ئەدی ئایەتی شمشێریان لە کوێ هێنا؟ مەبەستیان پێی ئایەتی ژمارە (٥)ی سووڕەتی (**التوبة**)یە، کە ئێمە لە شوێنی خۆی لە سووڕەتی (**التوبة**)دا، بە تەفصیل قسەمان لێکردوە، بەڵام ئێستا بەس دەقی ئایەتە دەخوێنینەوەو کورتە مانایەکی دەکەین، بۆ ئەوەی دەربکەوێ، ناگونجێ ئەو ئایەتە نەسخ کرابێتەوە، ئایەتەکە دەفەرموێ: ﴿ فَإِذَا ٱنسَلَخَ ٱلْأَشْهُرُ ٱلْحُرُمُ فَٱقْتُلُوا۟ ٱلْمُشْرِكِينَ حَيْثُ وَجَدتُّمُوهُمْ وَخُذُوهُمْ وَٱحْصُرُوهُمْ وَٱقْعُدُوا۟ لَهُمْ كُلَّ مَرْصَدٍ ۚ فَإِن تَابُوا۟ وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُا۟ ٱلزَّكَوٰةَ فَخَلُّوا۟ سَبِيلَهُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٥﴾ ﴾، هەموو ئەوانەی دەڵێن: فڵان ئایەتەو، فڵان ئایەتە، بە ئایەتی شمشێر نەسخ بۆتەوە، مەبەستیان لە ئایەتی شمشێر ئەم ئایەتەیە، کە هەندێک لە زانایان گوتوویانە: ئەم ئایەتە سەد (١٠٠) ئایەت، یان (١٥٠) ئایەت، یان (١٦٠) ئایەتی نەسخ کردۆتەوە!! کە لە ڕاستییدا ئایەتی شمشێرمان لە قورئاندا نیە، بەڵام بەداخەوە هەندێ لە زانایان بە هەڵە ئەم ئایەتەیان کردوە بە شمشێرێک و، ملی زۆر ئایەتانیان پێ هەڵبڕیوە، بە ناهەق!! ئایەتەکە دەفەرموێ: ئەگەر مانگە جەنگ تێدا قەدەغە کراوەکان ڕابردن، {واتە: ئەو مانگانەی کە خوا مۆڵەتی داوە لە سەرەتاوەو دەفەرموێ: ﴿فَسِيحُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ ..... ﴿٢﴾ ﴾التوبة، واتە: چوار مانگتان بۆتان هەیە، بەزەویدا بڕۆن ئەی ئەوانەی پەیمانتان هەیە لەگەڵ پێغەمبەری خواو لەگەڵ مسوڵماناندا! ئەی ئەو هاوبەش بۆ خوا دانەرو کافرانەی هاوپەیمانن، بەڵام پابەند نین بە پەیمانەکانتانەوە! ئەوە چوار مانگ مۆڵەت نەک چوار مانگە حەڕامەکان، بەڵکو چوار مانگ مۆڵەت، چاو بە خۆتاندا بگێڕنەوە، یان پابەندبن بە جیددیی، یاخود ئیعلان دەکرێ کە پەیمانتان نەماوە، نەک لە پەنای پەیمان هەبووندا زەبر لە مسوڵمانان بدەن، لە پشتەوە خەنجەری غەدر بوەشێنن، کەواتە: ئەم چوار مانگە، ئەو چوار مانگە مۆڵەت

دراوەن، ئنجا ئەگەر ئەو چوار مانگە تێپەڕین، کە جەنگیان تێدا قەدەغە کراوە}، ﴿فَٱقۡتُلُواْ ٱلۡمُشۡرِكِينَ حَيۡثُ وَجَدتُّمُوهُمۡ وَخُذُوهُمۡ وَٱحۡصُرُوهُمۡ وَٱقۡعُدُواْ لَهُمۡ كُلَّ مَرۡصَدٖۚ فَإِن تَابُواْ وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُاْ ٱلزَّكَوٰةَ فَخَلُّواْ سَبِيلَهُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ٥﴾ التوبة، هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان بکوژن لە هەر شوێنێک بەر پەلتان کەوتن، بیانگرن و ئابڵووقەیان بدەن لە هەموو بۆساندا بۆیان دابنیشن، ئنجا ئەگەر پەشێمان بوونەوەو نوێژیان بەرپا کردو زەکاتیان دا (واتە: مسوڵمان بوون) ڕێیان بەردەن، بەدڵنیایی خوا لێبووردەی بەبەزەییە.

ئایا کە دەفەرموێ: ﴿فَٱقۡتُلُواْ ٱلۡمُشۡرِكِينَ﴾، کە (أل)ی ناساندنی لەسەرە ( ٱلۡمُشۡرِكِينَ )، لێرەدا مەبەستی پێ کۆی موشریکەکانە، یاخود مەبەست هاوبەش بۆ خوادانەرانێکی تایبەتە، واتە: (أل)ەکە بۆ (**عهد**)ە، واتە: هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان تایبەتەکان؟

بە تەئکید مەبەست پێی هاوبەش بۆ خوا دانەرانێکی تایبەتە، ئەوانەی پەیمانیان هەبووە لەگەڵ پێغەمبەرو لەگەڵ مسوڵماناندا، کە لە سەرەتای سوورەتەکەوە ناویان هاتووە: ﴿بَرَآءَةٞ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦٓ إِلَى ٱلَّذِينَ عَٰهَدتُّم مِّنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ١﴾ **التوبة**، واتە: ئەمە دووریی و حاشاکردنە لە خواو پێغەمبەرەکەیەوە، بۆ ئەو هاوبەش بۆ خوا دانەرانەی پەیمانتان لەگەڵدا بەستوون.

کەواتە: ئەو هاوبەش بۆ خوا دانەرانە، جەنگیان ڕەوایە، دوای ئەو چوار مانگە، کە پەیمانیان هەیە لەگەڵ مسوڵماناندا، بەڵام بە پەیمانەکەیانەوە پابەند نین، چونکە هەر لە سیاقی ئەو ئایەتانە، لە ئایەتی ژمارە (٤)دا، دەفەرموێ: ﴿إِلَّا ٱلَّذِينَ عَٰهَدتُّم مِّنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ثُمَّ لَمۡ يَنقُصُوكُمۡ شَيۡـٔٗا وَلَمۡ يُظَٰهِرُواْ عَلَيۡكُمۡ أَحَدٗا فَأَتِمُّوٓاْ إِلَيۡهِمۡ عَهۡدَهُمۡ إِلَىٰ مُدَّتِهِمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُتَّقِينَ ٤﴾ **التوبة**، واتە: جگە لەو هاوبەش بۆ خوا دانەرانەی کە پەیمانتان لەگەڵدا بەستوون، دوایی هیچ کەمیی و کورتییان نەبووە لە پەیمانەکەیانداو، یارمەتیی هیچ دوژمنێکیان نەداوە لە دژی ئێوە،

ئەوانـە پەیمانەکەیـان تاکـو کاتـی دیارییکـراو لەگـەڵ تـەواو بکـەن، بێگومـان خـوا پارێزکارانـی خۆشـدەوێن، واتـە: ئەوانـەی پەیـمان دەپارێـزن و، کەسـانێکی پابەنـدن بـە پەیـمان و بەڵێنـەوە.

ئنجـا ئـەو ئایەتـەش بـە ناهـەق نـاوی لێـنراوە: ئایـەتی شمشـێرو وشـەی شمشێریشـی هـەر تێدانیـەو، لـە ڕاسـتییدا ئـەو ئایەتـەش بریتـی نیـە لـە ئیعلانـی جەنـگ بەرانبـەر بـە هەرچـی کافـرو موشریکـە، بەڵکـو بریتیـە لـە ئیعلانـی جەنـگ بەرانبـەر بـە هاوبـەش بـۆ خـوا دانەرانێـک، کـە پابەندنیـن بـە پەیمانەکەیانـەوەو، لـە پەنـای هەبـوونی بەڵێـن و پەیمانـدا خەنجـەری غـەدر دەوەشـێنن، ئەویـش دوای ئـەوەی چـوار مانـگ مۆڵـەت دراون، چـوار مانـگ مۆڵـەت دەدرێـن، بـڕۆن چـاو بـە خـۆدا بگێڕنـەوەو بـۆ خۆتـان هەڵیسـەنگێنن، ئایـا بەرژەوەندییتـان وایـە پابەندبـن بـە بەڵێـن و پەیمانـەوە، یاخـود یەکجاریـی ئیعلانـی بکـەن کـە بەڵێـن و پەیمانمـان پێکـەوە نەمـا؟!

ئنجـا بـا قسـەی دوو لـە زانایـانی دیکـەش بێنیـن، کـە ڕایـان جیـاوازەو پێیـان وانیـە ئـەم ئایەتـە مەنسـووخ بـێ:

**٣)-** (**عبدالرحمن بن ناصر السعدي**)، له تەفسیرەکەی خۆی: (**تيسير الكريم الرحمن في تفسير الكلام المنان**)دا[١]، ئەم ئایەتە موبارەکە دێنێ تەفسیری دەکات و باسی نەسخی تێدا ناکات.

**٤)-** ئەوەی کە بە بۆچوونی من قسەیەکی زۆر باشی لە بارەوە کردوەو زۆر بەدڵمە (فخرالدين الرازي)یە، کە لە تەفسیرەکەیدا[٢]، دەڵێ: (**وَأَكْثَرُ المُفَسِّرِينَ يَقُولونَ إِنَّهُ مَنْسُوخٌ، وَالأَقْرَبُ أَنْ يُقَالَ: إِنَّهُ مَحْمُولٌ عَلَى تَرْكِ المنَازَعَةِ فِي المُحَقَّرَاتِ، وَالتَّجَاوزِ عَمَّا يَصْدُرُ عَنْهُمْ مِنَ الكَلِمَاتِ المؤْذِيَةِ وَالأَفْعالِ المُوحِشَةِ**).

---

(١) ص ٧٧٦،

(٢) مفاتيح الغيب، ج٢٥، ص٢٣٣.

واتـە: زۆربـەی توێـژەرەوان گوتوویانـە، ئـەم ئایەتـە نەسـخ کراوەتـەوە، بـەڵام ئـەوە نزیکـترە، (واتـە: ئـەوە نیزیکـترە لـە ڕاسـتییەوە) کـە بگوتـرێ: مەبەسـت لـەم ئایەتـە ئەوەیـە کـە واز لـە دووبەرەکیـی و ناکۆکیـی و مشـتومڕ لەسـەر شـتی بچـووک بهێـنرێ و، چاوپۆشـیی بکـرێ [لـە هاوبـەش بـۆ خـوا دانـەر و بێبڕوایـەکان]، لـەوەی لێیانـەوە دەردەچـێ لـە وشـەیەکی بریندارکـەر، یاخـود لـە ڕەفتارێکـی نامـۆو خـراپ.

## بڕگەی چوارەم:

ئەگـەر تەماشـای سـیرەو ژیاننامـەی پێغەمبـەری خـوا ﷺ بکەیـن، هـەم لەگـەڵ جوولەکـەکان و، هـەم لەگـەڵ دەغـەڵ و مونافیقـەکان، هـەم لەگـەڵ هاوبـەش بـۆ خـوا دانەرەکانـدا، پێغەمبـەر ﷺ ڕێـک ئـەو ئایەتـە موبارەکـە چـی دەفەرمـوێ، وای ڕەفتـار کـردوە، وەک لـەم دەقـەدا هاتـوە: {**عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، فِي هَذِهِ الْآيَةِ: وَكَانَ النَّبِيُّ ﷺ وَأَصْحَابُهُ يَعْفُونَ عَنِ الْمُشْرِكِينَ وَأَهْلِ الْكِتَابِ، كَمَا أَمَرَهُمُ اللَّهُ، وَيَصْبِرُونَ عَلَى الْأَذَى**} (**أخرجه البخاري: ٤٥٦٦**).

واتـە: ئوسـامەی کـوڕی زەیـد (خـوا لێیـان ڕازی بـێ) لـە ڕوونکردنـەوەی چەمکـی ئـەو ئایەتـەدا گوتوویـەتی: پێغەمبـەری خـوا ﷺ و هـاوەڵانی خـوا لێیـان ڕازی بـێ، چاوپۆشـییان دەکـرد لـە هاوبـەش بـۆ خـوا دانـەرەکان و لـە خـاوەن کتێبەکانیـش، وەک خـوا فەرمـانی پێکـردوون، ئارامگـرو خۆڕاگـر بـوون لەسـەر ئەزیـەت و ئازاریـان، کەواتــە: سـیرەی پێغەمبەریـش ﷺ ڕێـک ئایەتەکـە چ دەفەرمـوێ: ئەویـش هـەر وابـووە.

## بڕگەی پێنجەم و کۆتایی:

### لێبوردن و چاوپۆشیی بنچینەیەکی گشتییە لە مامەڵەدا:

ئەمە قسەی خۆمە دەڵێم: لێبوردن و چاوپۆشیی لە مامەڵەدا، بنچینەیەکی گشتییەو، ئەم ئایەتە موبارەکەش تەعبیر دەکات، لەو بنچینە گشتییە کە لە هەموو قورئاندا هەیە، تەماشا بکەن:

١- لە سوورەتی (**الزخرف**)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿ فَٱصۡفَحۡ عَنۡهُمۡ وَقُلۡ سَلَٰمٞۚ فَسَوۡفَ يَعۡلَمُونَ ﴿٨٩﴾ ﴾، واتە: چاوپۆشییان لێ بکەو ڕوویان لێوەرگێڕەو بڵێ: سەلامتان لێ بێ، یانی: خوا حافیز.

٢- لە سوورەتی (**الفرقان**)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿ وَعِبَادُ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلَّذِينَ يَمۡشُونَ عَلَى ٱلۡأَرۡضِ هَوۡنٗا وَإِذَا خَاطَبَهُمُ ٱلۡجَٰهِلُونَ قَالُواْ سَلَٰمٗا ﴿٦٣﴾ ﴾.

٣- هەروەها لە سوورەتی (**القصص**)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا سَمِعُواْ ٱللَّغۡوَ أَعۡرَضُواْ عَنۡهُ وَقَالُواْ لَنَآ أَعۡمَٰلُنَا وَلَكُمۡ أَعۡمَٰلُكُمۡ سَلَٰمٌ عَلَيۡكُمۡ لَا نَبۡتَغِي ٱلۡجَٰهِلِينَ ﴿٥٥﴾ ﴾، مەدحی کەسانێک دەکات و دەفەرموێ: هەرکات گوێبیستی پووچ بوون ڕووی لێ وەردەگێڕن و دەڵێن: کردەوەی خۆتان بۆ خۆتان، سەلامتان لێ بێ، ئێمە نەفامان ناخوازین (کە لەگەڵیان بچینە تەرازوویەوە).

کەواتە: ئەمە بنچینەیەکی گشتییە لە هەموو قورئانداو، پێشتریش لە تەفسیری سوورەتی (**الشورى**)دا، باسمانکرد: ﴿ وَجَزَٰٓؤُاْ سَيِّئَةٖ سَيِّئَةٞ مِّثۡلُهَاۖ فَمَنۡ عَفَا وَأَصۡلَحَ فَأَجۡرُهُۥ عَلَى ٱللَّهِۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٤٠﴾ ﴾، واتە: سزای خراپەیەک خراپەیەکی وەک خۆیەتی، بەڵام کەسێک چاوپۆشیی بکات و چاکەکاریی بکات، ئەوە پاداشتی لەسەر خوایە، بێگومان ئەو ستەمکارانی خۆشناوێن.

بۆیە باسی مەنسووخ بوونی ئەو ئایەتە، هیچ واتایەکی نیەو، ئەگەر گریمان ئەو ئایەتەش مەنسووخ بێ چەندان ئایەتی دیکە هەن، کە فەرمان دەکەن بە لێبوردن و چاوپۆشیی و بە خۆشخوڵقیی و تەحەممول و صەبر، دەبێ هەموویان

مەنسووخ بن، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێک تەماشای سەراپای ژیانی دەکەی، چ لە مەککەو، چ لە مەدینە، ئەوپەڕی صەبرو ئارامیی و لێبوردن و چاوپۆشیی بە خەرج داوە، چ لەگەڵ خاوەن کتێبەکاندا، کە قسەی ناڕێکیان کردوە، چ لەگەڵ موونافیقەکاندا، چ لەگەڵ هاوبەش بۆ خوا دانەراندا، چ لەگەڵ ئەعرابییەکاندا، لەگەڵ هەموو خەڵکدا، ئەوە شتێکی ئاشکراو زانراوە، ئنجا ئەو ڕیوایەتانەش کە باسمانکردن، هیچیان سەنەدەکەیان جێی پشت پێ بەستن نیەو، ئەگەر گریمان لە ڕووی سەنەدیشەوە ڕیوایەتێک هەبێ سەنەدەکەیشی ڕاست بێ، بەڵام پێچەوانەی ئاراستەی گشتیی قورئان و، ئەو بنەما گەورە قورئانییە بێ، کە دەیان ئایەت داکۆکییان لەسەر کردوە، کە پێویستە ئەهلی ئیمان چاوپۆشییان هەبێ و، لێبوردنیان هەبێ و بەصەبرو حەوسەڵە بن، لە مامەڵە لەگەڵ غەیری خۆیاندا، ئەگەر گریمان ڕیوایەتێک هەبێ سەنەدەکەشی ڕاست بێ، مادام لەگەڵ ئەو هەموو ئایەتانەو سیرەو ژیانی پێغەمبەری خواو هاوەڵانی دا دژو تێکگیراو بێ، کاری پێناکرێ و گوێی پێنادرێ، دوای ئەوەی لە تێگەیشتنی واتایەکەیدا وردەکاریی تەواو دەکرێ لە لایەن خەڵکی شارەزاو پسپۆڕەوە.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان ئایەتەکانی: (١٦ - ٢٦)، واتە: یازدە (١١) ئایەت دەگرێتە خۆی، کە تەوەری سەرەکییان پابەندییە بە وەحیی و پەیام و بەرنامەی خواوە.

سەرەتا لە دوو ئایەتی یەکەم: (١٦ - ١٧)دا، باسی ئەزمووونی بەنوو ئیسرائیل کراوە، لە بواری دینداریی‌دا، کە وێڕای ڕێزلێنان و هەڵبژاردنی خوا بۆیان، سەرکەوتوو نەبوون و، دووچاری ناکۆکیی و دووبەرەکیی زۆر بوون، نەک لە ڕووی نەزانیی‌شەوە، بەڵکو لە ڕووی ستەم و سنوورشکێنیی و، حەسوودیی بە یەکدی بردن و، سنووربەزاندنەوە بەرەو لای یەکدی.

دوایی باسی تایبەتکرانی پێغەمبەری خاتەم ﷺ کراوە بە بەرنامەیەکی سەربەخۆوە، لە ئایینی گشتیی خواو، فەرمانی پێکراوە کە پێیەوە پابەندبێ و، شوێن ئارەزووەکانی نەزانان نەکەوێ.

ئنجا پێناسەی دوا پەیامی خوا کراوە، بە بەرچاو ڕوونیی بۆ خەڵک بە گشتیی و، بە ڕێنمایی و بەزەیی بۆ بڕواداران بە تایبەت.

پاشان خراوەتە ڕوو، کە ناگونجێ خراپەکاران و بڕوادارانی چاکەکار، وەک یەک دابنرێن، چ ژیانیان و چ مردنیان، دوایی باسی حیکمەت و ئامانجی دروستکرانی گەردوون کراوە، کە بریتیە لە سزاو پاداشت درانەوەی پڕ بە پێستی مرۆڤەکان، یان یەکێک لە حیکمەتەکان ئەوەیەو، خوا گەردوونی بە هەق هێناوەتە دی.

لە چوار ئایەتی کۆتایی دا، ئایەتەکانی: (٢٣ - ٢٦)، باسی کەسانێکی بێبڕوای ئارەزووی خۆپەرستی، دنیا ویستی، مۆر بەسەر دڵ و گوێوە نراوو، پەردە بەسەر چاو هەڵکشاو، کراوە، کە جگە لە ژیانی دنیا، بڕوایان بە هیچ شتێک نیەو، لە کاتی بەسەردا خوێنرانەوەی ئایەتەکانی خواشدا، تاکە بەڵگەیان بۆ نکووڵییکردنیان

له قیامەت، هەر ئەوەیە کە بۆچی باب و باپیرانمان بۆ ناهێننەوە؟! واتە: لە گۆڕستانەوە بۆمان بێننەوە!!

خواش ﷻ فەرمان بە پێغەمبەرەکەی موحەممەد ﷺ دەکات، کە پێیان بڵێ: خوا دەتانژیەنێ و دەتانمرێنێ، دواییش بۆ ڕۆژی قیامەت کۆتان دەکاتەوە، بەڵام زۆربەی خەڵکی نەزانن! واتە: نازانن کە خوا هەموو شتێک دەتوانێ، یاخود نازانن کە ناگونجێ ژیانی دنیا کۆتا قۆناغ بێ و، ئەم قۆناغەی ژیان، قۆناغی دیکەی بەدوادا نەیەن.

﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحُكْمَ وَٱلنُّبُوَّةَ وَرَزَقْنَٰهُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَفَضَّلْنَٰهُمْ عَلَى ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٦﴾ وَءَاتَيْنَٰهُم بَيِّنَٰتٍ مِّنَ ٱلْأَمْرِ ۖ فَمَا ٱخْتَلَفُوٓا۟ إِلَّا مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَهُمُ ٱلْعِلْمُ بَغْيًۢا بَيْنَهُمْ ۚ إِنَّ رَبَّكَ يَقْضِى بَيْنَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ فِيمَا كَانُوا۟ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ ﴿١٧﴾ ثُمَّ جَعَلْنَٰكَ عَلَىٰ شَرِيعَةٍ مِّنَ ٱلْأَمْرِ فَٱتَّبِعْهَا وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَآءَ ٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٨﴾ إِنَّهُمْ لَن يُغْنُوا۟ عَنكَ مِنَ ٱللَّهِ شَيْـًٔا ۚ وَإِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍ ۖ وَٱللَّهُ وَلِىُّ ٱلْمُتَّقِينَ ﴿١٩﴾ هَٰذَا بَصَٰٓئِرُ لِلنَّاسِ وَهُدًى وَرَحْمَةٌ لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ ﴿٢٠﴾ أَمْ حَسِبَ ٱلَّذِينَ ٱجْتَرَحُوا۟ ٱلسَّيِّـَٔاتِ أَن نَّجْعَلَهُمْ كَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ سَوَآءً مَّحْيَاهُمْ وَمَمَاتُهُمْ ۚ سَآءَ مَا يَحْكُمُونَ ﴿٢١﴾ وَخَلَقَ ٱللَّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِٱلْحَقِّ وَلِتُجْزَىٰ كُلُّ نَفْسٍۭ بِمَا كَسَبَتْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿٢٢﴾ أَفَرَءَيْتَ مَنِ ٱتَّخَذَ إِلَٰهَهُۥ هَوَىٰهُ وَأَضَلَّهُ ٱللَّهُ عَلَىٰ عِلْمٍ وَخَتَمَ عَلَىٰ سَمْعِهِۦ وَقَلْبِهِۦ وَجَعَلَ عَلَىٰ بَصَرِهِۦ غِشَٰوَةً فَمَن يَهْدِيهِ مِنۢ بَعْدِ ٱللَّهِ ۚ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ﴿٢٣﴾ وَقَالُوا۟ مَا هِىَ إِلَّا حَيَاتُنَا ٱلدُّنْيَا نَمُوتُ وَنَحْيَا وَمَا يُهْلِكُنَآ إِلَّا ٱلدَّهْرُ ۚ وَمَا لَهُم بِذَٰلِكَ مِنْ عِلْمٍ ۖ إِنْ هُمْ إِلَّا يَظُنُّونَ ﴿٢٤﴾ وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُنَا بَيِّنَٰتٍ مَّا كَانَ حُجَّتَهُمْ إِلَّآ أَن قَالُوا۟ ٱئْتُوا۟ بِـَٔابَآئِنَآ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٢٥﴾ قُلِ ٱللَّهُ يُحْيِيكُمْ ثُمَّ يُمِيتُكُمْ ثُمَّ يَجْمَعُكُمْ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ لَا رَيْبَ فِيهِ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٢٦﴾ ﴾.

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{(هەروەها) بە دڵنیاییەوە کتێب و حیکمەت و پێغەمبەرایەتییمان بە وەچەی ئیسرائیل (یەعقووب) دابوو و، لە بژیوە پاک و چاکەکانمان پێدابوون و، بەسەر جیهانییان (ی ڕۆژگاری خۆیان)دا هەڵمانبژاردبوون ﴿١٦﴾ لە بارەی کاروبار یـ(دینداریی)شیانەوە، بەڵگە ڕۆشنەکانمان دابوونێ (کە چی لە نێو خۆیاندا ناکۆک بوون و) تەنیا دوای ئەوەی زانیارییشیان بۆ هات بە هۆی دەستدرێژیی و ستەمەوە، لە نێو خۆیاندا ناکۆک بوون، بێگومان پەروەردگارت لە ڕۆژی قیامەتدا، لە بارەی ئەوەوە کە تێیدا کەوتبوونە ناکۆکییەوە دادوەرییان لە نێواندا دەکات ﴿١٧﴾ دوایی (ئەی موحەممەد!) تۆمان خستە سەر بەرنامەیەک لە کاروبار (ی ئایین)، دەجا شوێنی بکەوەو، بە دوای ئارەزووەکانی ئەوانە مەکەوە کە نازانن ﴿١٨﴾ بە دڵنیایی ئەوان لە بەرانبەر (سزای) خوادا، هیچ سوودێکت پێناگەیەنن و، بێگومان ستەمکارانیش هەندێکیان دۆست و پشتیوانی هەندێکیانن و، خواش سەرپەرشتیاری پارێزکارانە ﴿١٩﴾ ئەم (قورئان)ە بۆ خەڵکی کۆ بەرچاوڕوونییەو، بۆ کۆمەڵێکیش کە دڵنیابن (لە بڕوایاندا) ڕێنمایی و بەزەییە ﴿٢٠﴾ یان ئایا ئەوانەی (کردەوە) خراپەکان ئەنجام دەدەن، پێیان وایە: وەک ئەوانەیان دادەنێین کە بڕوایان هێناوەو (کارە) باشەکانیان کردوون، لە ژیان و مردنیاندا یەکسانن؟ خراپترین دادوەریی دەکەن (بەو جۆرە قسانەیان) ﴿٢١﴾ هەروەها خوا ئاسمانەکان و زەوی بە هەق هێناونە دی و، تاکو هەر کەسەش بەپێی ئەوەی وەدەستی هێناوە، سزاو پاداشت بدرێتەوەو، ئەوان (لە سزاو پاداشت درانەوەدا) ستەمیشیان لێ ناکرێ ﴿٢٢﴾ ئایا ئەو کەسەت دیوە کە ئارەزووی خۆی کردۆتە پەرستراوی و، خوا بەزانیارییەوە گومڕای کردوەو، مۆری بەسەر بیستن و دڵیەوە ناوەو، پەردەی بەسەر چاوی هەڵکێشاوە، ئنجا ئایا کێ دوای خوا ڕاستە ڕێی دەکات؟ ئایا (هەق

و ڕاستیی) بیرتان ناکەوێتەوەو پەند وەرناگرن؟ ﴿٢٣﴾ هەروەها (بێبڕوایان) گوتیان: ژیان تەنیا ژیانی دنیامانە، (هەندێکمان) دەمرین و (هەندێکیشمان) دەژین و، تەنیا ڕۆژگار لە بەینمان دەبات! هیچ جۆرە زانیارییەکیشیان لەوبارەیەوە نیە، ئەوان (لەو قسانەیاندا) بەس گومان دەبەن و، بە گۆترە قسە دەکەن ﴿٢٤﴾ هەر کات ئایەتە ڕۆشنەکانیشمانیان بەسەردا بخوێنرێنەوە، بەڵگەیان (لەسەر زیندوو نەکرانەوەیان) بەس ئەوەیە کە دەڵێن: ئەگەر ئێوە لە ڕاستانن (کە قیامەت هەیە) باب و باپیرانمان بێنن (با ئێستا زیندووببنەوە!) ﴿٢٥﴾ بڵێ: خوا دەتانژیەنێ، دوایی دەتانمرێنێ، دوایی بەرەو لای (گۆڕەپانی) ڕۆژی هەڵسانەوە (کە دوو دڵیی تێدانیە) کۆتان دەکاتەوە، بەڵام زۆربەی خەڵکی نازانن (کە ئەو ڕۆژە مەزنە چاوەڕێیانە بۆیە خۆی بۆ ئامادە ناکەن) ﴿٢٦﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(وَٱلۡحُكۡمَ): لێرەدا بە مانای حیکمەتە، وەک لە سووڕەتی (**مریم**)دا، خوا کە باسی یەحیا عليه السلام دەکات، دەفەرموێ: ﴿يَٰيَحۡيَىٰ خُذِ ٱلۡكِتَٰبَ بِقُوَّةٖۖ وَءَاتَيۡنَٰهُ ٱلۡحُكۡمَ صَبِيّٗا ﴿١٢﴾﴾، واتە: ئەی یەحیا بە توندیی کتێبەکە بگرەو، هەر بە مێرد منداڵیی حیکمەتمان پێدابوو، کە مەبەستی لە (حکم) حوکمڕانیی نیە، چونکە حوکم لە قورئاندا بە زۆریی بە مانای دادوەریی دێ و، بە مانای حیکمەتیش دێ، هەروەک جاری وایە بە مانای حوکمڕانییش و بە مانای دیارییکردنی حەڵاڵ و حەرام و بەرنامە دانانیش، دێ.

(**الحِكْمَةُ: إِصَابَةُ الحَقِّ بالعِلْمِ وَالعَمَلِ**)، (**حِكْمَة**): بریتیە لە پێکانی هەق لە ڕووی زانیاریی و لە ڕووی کردەوەوە، واتە: مرۆڤ هەم لە ڕووی تیۆریی و زانینەوە، هەق بپێکێ، هەم لە کردەوەکەشی بەپێی هەق بێ و پڕ بە پێست و ڕاست بێ.

(والحِكْمَــةُ: إتْقَــانُ الأمُــورِ)، (حِكْمَــة): بــە کارامەیــی و ئەنجامــدانی کارەکان بەوردەکارییــش، مانــا کــراوە.

(الحِكْمَــةُ: مَعْرِفَــةُ الموجُــودَاتِ وَفِعْــلُ الخَــيْرَات)، (حِكْمَــة): بــە زانینــی شــتەکان و ئەنجامــدانی چاکەکانیــش، مانــا کــراوە.

وەک پێشــتر گوتمــان: (حُكْــم)، لــەم ســیاقەدا، نــا، بــەڵام لــە قورئانــدا بــە مانــای قــەزاو دادوەرییــش هاتــوە، هەروەهــا بــە مانــای حوکمڕانیــی و باڵادەســتییش هاتــوەو، بــە مانــای دیارییکــردنی حــەڵاڵ و حەرامیــش هاتــوە.

(بَغۡيَۢا بَيۡنَهُمۡۚ): واتــە: لــە ڕووی ســتەمەوە لــە نێــو خۆیانــدا (البَغِــيُ: التَّعَــدِّي)، ســنوور شــکاندن، (وَكُلُّ مُجَــاوَزَة وَإفْــرَاط عَــلَى المقْــدَارِ الَّــذِي هُــوَ حَــدّ الــشَّيء، هُــوَ بَغِــي)[1]، هــەر سنوور بەزاندنێــک و هــەر تێپەڕاندنێــک لــەو ئەندازەیــەی کــە ســنووری شــتێکە، ئــەوە پێــی دەگوتــرێ: (بَغــي).

(شَرِيعَةٖ): (الشَّرِيْعَــةُ: مَشْرَعَــةُ المَــاءِ، وَهِــيَ مَــورِدُ الشَّــارِبَة، وَمَــا شَرَعَ اللــهُ لِعِبَــادِهِ مِــنَ الدِّيْــن)، شــەریعەت لــە ئەصڵــدا بــەو ڕێیــە دەگوتــرێ، کــە خەڵــک لێیــەوە دەچــێ بــۆ هێنانــی ئــاو، (وَهِــيَ مــورِد الشَّــارِبَة)، ئــەو شــوێنەیەو ئــەو ڕێیەیــە کــە ئــاو خــۆرەوەکان دەچــن، ئــاوی لــێ دێنــن، دوایــی وشــەی (شَرِيْعَــة)، خوازراوەتــەوە بــۆ: (مَــا شَرَعَ اللــهُ لِعِبَــادِهِ مِــنَ الدِّيــن)، ئــەوەی خــوا لــە ئاییــن بــۆ مرۆڤــەکانی کردووەتــە بەرنامــە، دەگوتــرێ: (شَرَعَ وَشَرَّعَ، شَرَّعَ يُــشَرِّعُ تَشْرِيْعــاً، وَشَرَعَ يَــشْرَعُ شَرْعَــاً).

(مِّنَ ٱلۡأَمۡرِۖ): واتــە: لــە ئایینــی گشــتیی، لــە کاروبــاری ئاییــن (الأَمْــرُ: الشَّــأْنُ، وَجَمْعُــهُ أُمــور، وَمَصْــدَر أَمَرْتُــهُ إذَا كَلَّفْتَــهُ أَنْ يَفْعَــلَ شَــيْئَاً، وَهُــوَ لَفْــظ عَــامِ للأَقْــوَالِ وَالأَفْعَــال)، وشــەی (أمــر): بــە مانــای پێگــە (شــأن)و حــاڵ دێ، کــە بــە (أمــور) کۆدەکرێتــەوە، هەروەهــا (أمــر)، دەگونجــێ چاوگــی (أَمَرْتُــهُ) بــێ، ئەگــەر کەســێک کارێکــی پــێ

---

(١) مختار الصحاح كلمة : بغى.

بسپێرێ دەڵێ: (أَمَرْتُهُ بِأَمْرٍ، أَمَرْتَهُ أَمْراً)، وشەی (أَمْر): بێژەیەکی گشتییە بۆ قسان و بۆ کردەوان.

(بَصَـٰٓئِرُ ): (جَمْعُ بَصِيرَة: وَهُوَ المَعْرِفَةُ وَالتَّحَقُّق)، (بَصِيْرَة): بریتییە لە ناسین و ساغکردنەوەی شتێک، (بَصِيرَة: أَن تُبْصِرَ الشَّيْءَ فَتَشْهَدَ عَلَيْهِ)، (بَصِيْرَة): بەوەش دەگوترێ کە شتێک ببینی و شایەدیی لەسەر بدەی، لە ئەصڵدا (بَصِيْرَة) بە مانای (مُبْصِرة) دێ، واتە: پێبینەر، جاری واش هەیە، بە مانای عیبرەت دێ، کە بە هۆی ئەو عیبرەتەوە خەڵک لە شت تێدەگات و شت دەبینێ.

من (بصائر)م، بە (کۆ بەرچاو ڕوونیی) لێکداوەتەوە، چونکە (بَصِيْرَة)، بە مانای بەرچاو ڕوونییش دێ، (بَصَائِر)یش کۆیەکەیەتی.

(ٱجْتَرَحُواْ ): (الإِجْتِرَاحُ: إِكْتِسَابُ الإِثْمِ)، (إِجْتِرَاح): بریتییە لە وەدەستهێنانی گوناح، واتە: ئەنجامدانی گوناح.

(إِلَـٰهَهُۥ ): (إله):

یان لە:

١- (أَلَه يَأْلَهُ إِلَهَة)ەوە هاتوە، (أَي: عَبَدَ يَعْبُد عِبَادَةً)، پەرستی، دەیپەرستێ، پەرستن.

٢- یان لە (أَلِه)ەوە هاتوە، (أَلِه: أَي تَحَيَّر)، واتە: سەرسام بوو، لەبەر ئەوەی خوا خەڵک لە ناسینی دا، سەرسام دەبێ.

٣- یاخود لە (لاه يَلُوهُ لِيَاهَاً)ەوە، هاتوە، (أَي: احْتَجَبَ يَحْتَجِبُ إِحْتِجَاباً)، لەبەر ئەوەی خوا پەنهانە.

٤- یاخود وەرگیراوەو داتاشراوە لە: (وِلاهُ و وَالِه: أَي: مُشْتَاق)، لەبەر ئەوەی خوا دڵەکان بۆی تامەزرۆن و عەوداڵن، واتە: دەگونجێ لە یەکێک لەو چوار ڕیشانەوە وشەی (إله) هاتبێ.

(هَوَىٰهُ): (**الهَـوَى: مَيْـلُ النَّفْـسِ إلى الشَّـهْوَةِ، وَالهَـوِيُّ: السُّـقُوطُ مِـنْ عُلـوٍ إلى سُـفْلٍ**)، (**هَـوَى**): بریتیـە لـە لادانی نەفـس بـەرەو لای ئـارەزوو، یـان چـوونی نەفـس بـەرەو ئـارەزوو، (**هـوِيّ**): بـە مانـای بەرزبوونـەوەو کەوتنـە لـە سـەرەوە بـۆ خـوار، ئنجـا لەبـەر ئـەوەی شـوێن کەوتنـی ئـارەزوو، مـرۆڤ لەسـەرێوە دێنـێ بـۆ خـوارێ، بۆیـە نـاوی لێنراوە: (**هَـوَى**)، (**وَمَـنِ تُّبَـعَ الهَـوَى هَـوَى**)، هـەر کەسـێ شـوێن ئـارەزوو بکـەوێ دەکـەوێ، (**هـوى**)، یـانی: (**سَـقَطَ**) کـەوت.

(وَخَتَمَ عَلَىٰ سَمْعِهِۦ): واتـە: خـوا مـۆری بەسـەر گوێیـەوە نـاوە، (**الخَتْـمُ: الطَّبْـعُ، وَهُـوَ تَأْثِيرُ الـشَّيءِ كَنَقْـشِ الخَاتِـم وَالطَّابِـع**)، (**ختـم**): بـە مانـای (**طَبْـع**) دێ، ئەویـش بریتیە لە شـوێنەواری شـتێک، وەک نەخشـی ئەنگوسـتیلە، یاخـود مـۆر کـە بەسـەر شـتێکیەوە دەنێـی، (**والأثَـرُ الحَاصِـلُ عَـنِ النَّقْـشِ**)، ئـەو شـوێنەوارەی کـە بەهـۆی نەخشـێکەوە پەیـدا دەبـێ، پێـی دەگوتـرێ: (**ختـم**)، یـان (**طبـع**).

(غِشَٰوَةً): (**الغِشَـاوَةُ: مَـا يُغَطَّـى بـِهِ الـشَّيء**)، (**غِشَـاوة**)، پـەردە، هـەر شـتێک کـە شـتێکی پـێ دادەپـۆشرێ.

(ٱلدَّهْرُ): (**اسْـم لِـمُدَّةِ العَالَـمِ مِـنْ مُبـدأ وُجُـودِهِ إلى انْقضَائِـهِ، ثُـمَّ يُعَـبَّر بـِهِ عَـنْ كُلِّ مُـدَّة كَثيرَةٍ، وَهُـوَ خِـلاَفِ الزَّمَـانِ الَّـذِي يَقَـعَ على الـمُدَّةِ القَلِيْلَـةِ وَالكَثِيرَةِ، وَدَهْـرُ الفُـلاَنِ: مُـدَّةُ حَيَاتِـهِ**)، وشـەی (ٱلدَّهْرُ): نـاوە بـۆ مـاوەی بـەردەوام بـوونی جیهـان لـە سـەرەتای پەیـدا بوونیـەوە، تاکـو کۆتایـی هاتنـی، دوایـی تەعبیـری پـێ دەکـرێ لـە هـەر ماوەیـەک زۆر کـە زۆربـێ، بۆیـە وشـەی (ٱلدَّهْرُ)، بەپێچەوانـەی (**زمـان**)ە، (**زمـان**)، بـۆ مـاوەی کـەم و زۆر بـەکاردێ، بـەڵام (ٱلدَّهْرُ) بـۆ مـاوەی زۆر بـەکاردێ و، دەگوتـرێ: (**دهـر فـلان، أي: مـدة حياتـه**)، مـاوەی ژیانەکـەی تەمەنەکـەی، پێـی دەگوتـرێ: (**دهـر فـلان**)، واتـە: ڕۆژگاری فـڵان، یاخـود تەمـەنی فڵانکـەس.

## هۆی هاتنەخوارەوەی ئایەتەکان

دەربارەی هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە موبارەکەی، دەفەرموێ: ﴿أَفَرَءَيْتَ مَنِ ٱتَّخَذَ إِلَٰهَهُۥ هَوَىٰهُ وَأَضَلَّهُ ٱللَّهُ عَلَىٰ عِلْمٍ وَخَتَمَ عَلَىٰ سَمْعِهِۦ وَقَلْبِهِۦ وَجَعَلَ عَلَىٰ بَصَرِهِۦ غِشَٰوَةً فَمَن يَهْدِيهِ مِنۢ بَعْدِ ٱللَّهِ ۚ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ﴿٢٣﴾﴾، ئەم گێردراوەیە هاتوە:

**{عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا: فِي هَذِهِ الْآيَةِ: ﴿أَفَرَءَيْتَ مَنِ ٱتَّخَذَ إِلَٰهَهُۥ هَوَىٰهُ ﴿٢٣﴾﴾ الجاثية، قَالَ: كَانَ أَحَدُهُمْ يَعْبُدُ الْحَجَرَ، فَإِذَا رَأَى مَا هُوَ أَحْسَنُ مِنْهُ، رَمَى بِهِ وَعَبَدَ الْآخَرَ} (أخرجهُ النسائي في تفسيره: (٥٠٥)، والحاكم في المستدرك، ج٢، ص٤٥٢، ٤٥٣، والسيوطي في الدر المنثور، ج٧، ص٤٢٦)**[1].

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ)، دەربارەی ئەم ئایەتە: ﴿أَفَرَءَيْتَ مَنِ ٱتَّخَذَ إِلَٰهَهُۥ هَوَىٰهُ ﴿٢٣﴾﴾ **الجاثیة**، دەڵێ: یەکێکیان، (واتە: یەکێک لە هاوبەش بۆ خوا دانەرو بتپەرستەکان)، بەردێکی دەپەرست، ئەگەر بەردێکی بینیبایە لەو جوانتر، ئەوەی پێشێی فڕێ دەداو ئەوەی دوایی دەپەرست، خوا ﷻ بەو بۆنەوە ئەوەی دابەزاند.

هەڵبەتە ئەو ئایەتە موبارەکە ئەوەی عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ)، گێڕاویەتەوە، دەیگرێتەوە، شتی دیکەش دەگرێتەوە، بەڵام مەبەستی عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (خوا لێیان ڕازی بێ)، ئەوە بووە ئەو ئایەتە موبارەکە، ئەو جۆرە ڕەفتارەی هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان دەگرێتەوە، بەڵام ئەوە کە تایبەت بەوە هاتبێتە خوار، پێویستیی بە بەڵگە هەیە، کە نیە.

کەواتە: دەبێ وریابین لە هۆی هاتنە خوارەوەکاندا، جاری وا هەیە هاوەڵان (خوا لێیان ڕازی بێ)، چەمک و واتای ئایەتێک کە شتێک دەگرێتەوە، گوتوویانە:

---

(١) الإستيعاب في بيان الأسباب: ج٣، ص٢٠٤، قال المؤلفا: إسناده حسن.

لەوبارەوە هاتۆتە خوار کە مەرج نیە، تەنیا لەم بارەوە بووبێ، بەڵام چەمک و واتای ئەو ئایەتە، ئەو ڕووداوە، یان ئەو قسەیە، یان ئەو بەسەرهاتەش دەگرێتەوە.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

ئەو یازدە (١١)، ئایەتە موبارەکە، پێنج بابەتیان گرتوونە خۆیان:

١- ئایەتی (١٦و ١٧)، باسی گەلی جوولەکەو ئەزموونی دینداریيان دەکات، کە دوایی چۆن تێیدا شکست خواردوو بوون، بۆیە دەبێ پەندیان لێوەربگیرێ.

٢- بابەتێکی دیکو کە ئایەتەکانی: (١٨و ١٩و ٢٠)، دەیگرنە خۆیان، باسی شەریعەت و بەرنامەی سەربەخۆیە، کە خوا بۆ پێغەمبەری کۆتایی موحەممەد ﷺ و ئۆممەتەکەی ناردوە.

٣- یەکسان نەبوونی خراپەکارو چاکەکاران، چ لە ڕووی ژیان، چ لە ڕووی مردنیانەوە، ئایەتی ژمارە (٢١)، گرتوویەتە خۆی.

٤- گەردوون بە هەق دروستکراوەو، بۆ ئەوەی هەر کەسە بە پێی کردەوەکەی خۆی سزاو پاداشت وەربگرێتەوە، ئەمیش ئایەتی ژمارە (٢٢)، گرتوویەتە خۆی.

٥- بابەتی پێنجەم کە ئایەتەکانی: (٢٣ - ٢٦)، گرتوویانە خۆیان، ئارەزووپەرستانی ڕۆژگار پەرست، کە لەبەر شوێنکەوتنی ئارەزوو، لەبەر زۆر ڕووکردنە دنیاو، دنیا لە باوەشگرتن، هەستەوەرەکانی خۆیان لە کارخستوون، نە عەقڵیان وەک پێویست شتەکان دەرک دەکات، نە گوێیان هەق دەبیستێ، نە چاویان هەق دەبینێ و، هەر ئەوەش پاڵنەرو هاندەریانە بۆ نکووڵییکردن لە هاتنی ڕۆژی دوایی و قیامەت، وەک خوا ﷻ لە سوورەتی **(القيامة)**دا، دەفەرموێ: ﴿ بَلۡ يُرِيدُ ٱلۡإِنسَٰنُ لِيَفۡجُرَ أَمَامَهُۥ ﴿٥﴾ يَسۡـَٔلُ أَيَّانَ يَوۡمُ ٱلۡقِيَٰمَةِ ﴿٦﴾ ﴾، مرۆڤ (واتە: مرۆڤی بێبڕوا) دەیەوێ هەر بە گوناهو تاوان بیداتە بەر، بۆیە دەپرسێ: ڕۆژی قیامەت کەنگێیە؟!.

کەسێک بیەوێ لە دنیادا شوێن ئارەزووەکانی بکەوێ، نکووڵیی دەکات لە قیامەت، بۆ ئەو وا باشە قیامەت هەر نەبێ، کە مرد هەمووو شت کۆتایی پێ بێ، نەک لەسەر شوێنکەوتنی ئارەزووەکانی سزا بدرێ، بۆیە ئەوانەی چاویان لە گوناهو تاوان و خراپەکارییە، حەز دەکەن قیامەت و ڕۆژی سزاو پاداشت و لێپرسینەوە نەبێ.

دوای ئاماژەکردن بە پێنج بابەتە سەرەکییەکەی ئەم یازدە (١١) ئایەتە، ئنجا با سەرنجێکی گشتییان لێ بدەین:

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدۡ ءَاتَيۡنَا بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحُكۡمَ وَٱلنُّبُوَّةَ ﴾، بە دڵنیایی ئێمە بە وەچەی ئیسرائیلمان دابوو، کتێب و حیکمەت و پێغەمبەرایەتیی، یاخود حوکم واتە: حوکمڕانیی و دادوەرییکردن و، پێغەمبەرایەتییشمان پێدابوون، ﴿ وَرَزَقۡنَٰهُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ ﴾، لە شتە خۆش و بە تامەکان، یاخود: لە پێداویستییە چاک و پەسەندەکانیش، بەشمان دابوون، بژیومان دابوون، کە مەرج نیە (ٱلطَّيِّبَٰتِ) تەنیا بە مانای خواردن و خواردنەوە بێ، بەڵکو: بەرگ و پۆشاک دەگرێتەوە، کەل و پەل دەگرێتەوە، ماڵ و سامان دەگرێتەوە، خانوو بەرەی چاک دەگرێتەوە، هەمووی دەگرێتەوە، ﴿ وَفَضَّلۡنَٰهُمۡ عَلَى ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴾، بەسەر جیهانییاندا، (جیهانییانی ڕۆژگاری خۆیاندا) هەڵمانبژاردبوون، لەگەڵ ئەو هەمووو کەم و کوڕییانەش کە گەلی جوولەکە هەیانبوون، بەڵام هەر چۆن بێ، باشترین خەڵکی ڕۆژگاری خۆیان بوون.

کەواتە: ئەی مسوڵمانینە؟ ئێوە تەماشای گەلی جوولەکە بکەن، کە خوا ﷻ لە پێش ئێوەدا کتێبی پێدابوون، هەم تەوڕات، هەم ئینجیل، هەم زەبوور، لە پەیمانی کۆندا باسی کۆمەڵێک کتێبی دیکەش دەکات، کە ئێمە ناتوانین بڵێین: ئەوان، نەوانین، ئەوەی لە قورئاندا باسکراوە: تەوڕات بە مووسا دراوەو، زەبوور بە داوود دراوەو، ئینجیل بە عیسا دراوە، (صەڵات و سەلامی خوا لەسەر هەر

سێکیان بێ)، بەڵام دانیال و حیسقیال و ئەوانی دیکە، کە ناویان هاتوە، ئایا ڕاستە ئەوانیش کتێبیان بوو بێ؟ بۆ ئێمە دیار نیە، ڕەنگە وابێ و ڕەنگە واش نەبێ، گرنگ ئەوەیە خوا دەفەرموێ: کتێبمان پێدابوون و حوکمیشمان پێدا بوون، حوکم دەگونجێ بە مانای حیکمەت بێ، واتە: دوای ئەوەی کتێبمان پێدابوون کە بەرنامە فیکریی و تیۆرییەکەی تێدایە، حیکمەتیشمان پێدابوون، شارەزامان کردبوون ئەو کتێبە چۆن پراکتیزە بکەن و جێبەجێی بکەن، وەک چۆن ئێمە دەڵێین: قورئانمان هەیەو ڕێبازی پێغەمبەریشمان هەیە، ڕێبازی پێغەمبەریش ﷺ بریتیە لە چۆنیەتیی پیادەکردن و بەرجەستە کردنی قورئان لەسەر ئەرزی واقیع.

پێغەمبەرایەتییشمان پێدابوون و، لە بژێوە پەسندو چاکەکانیش، چ خواردن و خۆراک، چ بەرگ و پۆشاک، چ خانووبەرەو، چ کەل و پەل، چ پێداویستییەکان، ئەوانەشمان پێدابوون و، بەسەر جیهانییانیشدا بەرزمانکردبوونەوە، جیهانییانی ڕۆژگاری خۆیان، ﴿ وَءَاتَيْنَٰهُم بَيِّنَٰتٍ مِّنَ ٱلْأَمْرِ ﴾، بەڵگە ڕۆشنەکانمان لە کاروباردا پێدابوون واتە: کاروباری دیندارییان و کاروباری دنیادارییان، بەرچاومان ڕۆشن کردبوونەوە، بەهۆی ئەو کتێب و حیکمەت و پێغەمبەرایەتییەوە، ﴿ فَمَا ٱخْتَلَفُوٓاْ إِلَّا مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَهُمُ ٱلْعِلْمُ بَغْيًۢا بَيْنَهُمْ ﴾، ناکۆک و ڕاجیا نەبوون، مەگەر دوای ئەوەی زانیارییان بۆ هات، بە هۆی ستەم و دەستدرێژیی نێوخۆیانەوە، واتە: ناکۆکییەکەیان پەیدابوو لە دەستدرێژیی و سنوور شکێنیی نێو خۆیان، لە ئەنجامی ئەوەدا کە چاویان لەوە بوو، خۆیان بەسەر یەکدیدا بسەپێنن و فەرز بکەن، دەستدرێژیی بۆ سەریەک بکەن، ستەم لە یەکدی بکەن، لە ئەنجامی ئەوەدا ناکۆکییان پەیدابوو، ناکۆکییەکەیان بە هۆی نەزانییەوە نەبوو، بەڵکو بەرچاویان ڕوونکرابوو، دەیانزانی هەق و ناهەق چۆنە، عەقڵیان زانیاریی ڕاستی تێدابوو، بەڵام دڵ و دەروونیان نیەتی باش و، ئامانجی باش و، مەبەستی باشی تێدانەبوو، خەلەل و کەم و کوڕییەکە لە عەقڵیانەوە نەبوو، کە نەزانن، بەڵکو لە دڵیانەوە بوو، کە شەیتان زەفەری پێبردبوون و، نیازو مەبەستی خراپ چوو بووە

دڵیانەوە، حەسوودیی بە یەکدی بردن، ستەم لە یەکدی کردن، خۆ سەپاندن و دەستدرێژیی کردن بۆ سەر یەکدی، وشەی (بغي)، هەموو ئەوانە دەگرێتەوە، وەک پێشتریش باسمانکرد.

﴿إِنَّ رَبَّكَ يَقْضِي بَيْنَهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ﴾، بەدڵنیایی پەروەردگارت لە ڕۆژی قیامەتدا دادوەرییان لە نێواندا دەکات، ﴿فِيمَا كَانُوا فِيهِ يَخْتَلِفُونَ ﴿١٧﴾﴾، لەوەدا کە تێیدا کەوتوونە کێشەو دووبەرەکییەوە، پەروەردگارت دادوەرییان لە نێواندا دەکات، کێ لەسەر هەقەو کێ لەسەر ناهەق بووە؟ کە دادوەرییان لە نێواندا دەکات، دیارە سزای ئەوانەش دەدات، کە چاویان لە ستەم و خراپەکاریی بووە.

دوای ئەوان، ئنجا دێتە سەر باسی شەریعەت و بەرنامەی تایبەت و سەربەخۆ پێدانی پێغەمبەری خاتەم ﷺ، دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ﴾، واتە: لە دوای ئەزموونی خاوەن کتێبەکان، بە تایبەت دوای ئەزموونی جوولەکەکان، ﴿جَعَلْنَاكَ عَلَىٰ شَرِيعَةٍ مِّنَ الْأَمْرِ﴾، تۆمان دانا لەسەر بەرنامەیەک لە کاروبار، یاخود لە ئایینی گشتیی خۆمان، بەرنامەیەکی تایبەت و سەربەخۆمان بە تۆدا، ﴿فَاتَّبِعْهَا﴾، دەجا شوێنی بکەوە، ﴿وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَاءَ الَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٨﴾﴾، شوێن ئارەزووی ئەوانە مەکەوە کە نازانن، ئەوانەی نازانن کێن؟ چ هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان بن، کەوا پێدەچێ زیاتر مەبەست پێی ئەوان بێ، چونکە ئەوان هیچ جۆرە شارەزایی و زانیارییەکیان نەبووە، بەڵام خوای پەروەردگار بە نسبەت جوولەکەکان و خاوەن کتێبەکانەوە دەفەرموێ: (مِنْ بَعْدِ مَا جَاءَهُمُ الْعِلْمُ)، بە دوای ئارەزووی ئەوانە مەکەوە کە نازانن، ئنجا چ بتپەرستەکان بن، چ هەر کەسێکی دیکە بێ، چونکە زانایان گوتوویانە: (**كُلُّ مَنْ عَصَى اللهَ، فَهُوَ جَاهِلٌ**)، هەر کەسێ سەرپێچیی خوا بکات، نەزانە، ﴿إِنَّهُمْ لَن يُغْنُوا عَنكَ مِنَ اللَّهِ شَيْئًا﴾، بە دڵنیایی ئەوان لەلایەن خواوە، هیچ سوودێکت پێ ناگەیەنن، واتە: لە بەرانبەر سزای خوادا، هیچ سوودێکت پێ ناگەیەنن، کە سزای خوات لێ دوور بخەنەوە، یاخود هیچ سوودێکت پێ ناگەیەنن، کە بۆ تۆ ببنە جێدارو بەدیلی خوا ﷻ، ﴿وَإِنَّ الظَّالِمِينَ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ﴾، بە دڵنیایی

ستەمکارانیش، هەندێکیان دۆست و پشتیوان و سەرپەرشتیاری هەندێکیانن، ﴿ وَٱللَّهُ وَلِيُّ ٱلْمُتَّقِينَ ﴾، خواش سەرپەرشتیارو دۆستی پارێزکارانە.

کەواتە: مەکەوە ژێر کاریگەرییان، ئەوانە دۆست و پشتیوانی تۆ نین، دڵسۆزی تۆ نین، دڵسۆزو سەرپەرشتیارو دۆست و نیزیکی تۆ، تەنیا خوایە، بەس ئەویش سەرپەرشتیاری پارێزکارانە.

﴿ هَٰذَا بَصَٰٓئِرُ لِلنَّاسِ وَهُدًى وَرَحْمَةٌ لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ ﴾، ئەمە، ئەم قورئانە، یان ئەوەی کە باسکرا، کۆ بەرچاو ڕوونییە بۆ خەڵک بە گشتیی و، ڕێنمایی و بەزەییشە بۆ کۆمەڵێک کە دڵنیابن، دڵنیابن لە ئیمان و بڕوا هێنانیانداو، دڵنیابن لە ڕاستیی و تێرو تەواویی پەیامی خوادا.

ئنجا خوا ﷻ دێتە سەر بابەتی سێیەم، کە بریتیە لە یەکسان نەبوونی چاکەکاران و خراپەکاران و دەفەرموێ: ﴿ أَمْ حَسِبَ ٱلَّذِينَ ٱجْتَرَحُوا۟ ٱلسَّيِّـَٔاتِ أَن نَّجْعَلَهُمْ كَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ سَوَآءً مَّحْيَاهُمْ وَمَمَاتُهُمْ ۚ سَآءَ مَا يَحْكُمُونَ ﴾، یان ئایا ئەوانەی خراپەکانیان ئەنجام داون، پێیان وایەو خەیاڵیان وایە، وەک ئەوانەیان دابنێین، وەک ئەوانە مامەڵەیان لەگەڵدا بکەین کە بڕوایان هێناوەو کردەوە باشەکانیان ئەنجام داون، کە ژیان و مردنیان یەکسان بێ و وەک یەک بن؟ (سَآءَ مَا يَحْكُمُونَ )، ئەوە خراپترین دادوەرییە دەیکەن و، خراپترین بڕیارە دەیدەن، چۆن پاک و پیس، ڕاست و چەوت، بڕوادارو بێبڕوا، وەک یەک دەبن؟

ئنجا نۆرەی بابەتی چوارەمە: ﴿ وَخَلَقَ ٱللَّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِٱلْحَقِّ ﴾، خوا ئاسمانەکان و زەوی بە هەق هێناونە دی، واتە: بەحیکمەت و بە ئامانجەوە و بۆ چەسپاندنی هەق، ﴿ وَلِتُجْزَىٰ كُلُّ نَفْسٍۭ بِمَا كَسَبَتْ ﴾، بۆ ئەوەی هەر کەسێک بەپێی ئەوەی کردوویەتی سزا، یاخود پاداشت بدرێتەوە، ﴿ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴾، ئەوانیش ستەمیان لێ ناکرێ، ستەمیان لێ ناکرێ، کە لە پاداشتیان کەم بکرێتەوە، یاخود لە سزایان زیاد بکرێ.

ئنجا دێتە سەر بابەتی پێنجەم و کۆتایی: ﴿أَفَرَءَيْتَ مَنِ ٱتَّخَذَ إِلَٰهَهُۥ هَوَىٰهُ وَأَضَلَّهُ ٱللَّهُ عَلَىٰ عِلْمٍ﴾، ئایا ئەو کەسەت بینیوە یان هەواڵم پێ بدە، لە بارەی ئەو کەسەوە کە ئارەزووی خۆی کردۆتە پەرستراوی خۆی، پەرستراوەکەی بریتیە لە ئارەزووی خۆی و، خواش بە زانیارییەوە گومڕای کردوە، واتە: خوا دەزانێ شایستەی گومڕاییەو گومڕای کردوە، یاخود: دوای ئەوەی زانیاریشی هەبووە، ئنجا خوا گومڕای کردوە، لەبەر ئەوەی پابەند نەبووە بە زانیارییەکەیەوە، ﴿وَخَتَمَ عَلَىٰ سَمْعِهِۦ وَقَلْبِهِۦ﴾، مۆری بەسەر بیستنی و بەسەر دڵیەوە ناوە، ﴿وَجَعَلَ عَلَىٰ بَصَرِهِۦ غِشَٰوَةً﴾، پەردەشی بەسەر دیتن و چاوی هەڵکێشاوە، ﴿فَمَن يَهْدِيهِ مِنۢ بَعْدِ ٱللَّهِ﴾، لە دوای خوا کێ ڕاستە ڕێی دەکات؟ ﴿أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ﴿٢٣﴾﴾، ئایا پەند وەرناگرن و بیر ناکەنەوە!

هەڵبەتە لێرەدا خوا ﷻ کەسێک کە شوێن ئارەزووی کەوتوە، وامان بۆ وێنا دەکات کە لە زانیارییەکەی خۆی بەهرەمەند نەبووەو، لە هێزی بیستنی بەهرەمەند نیەو، لە هێزی عەقڵ و دڵی بەهرەمەند نیەو، لە هێزی چاویشی بەهرەمەند نیە، چونکە هەستەوەرەکانی لە کارخستوون، لە ئەنجامی شوێنکەوتنی ئارەزوودا، وەک گوتراوە: (**حُبُّكَ الشَّيْءَ يُعْمِي وَيُصِمُّ**)، خۆشویستنت بۆ شتێک، کوێریش دەکات و کەڕیش دەکات.

﴿وَقَالُوا۟ مَا هِىَ إِلَّا حَيَاتُنَا ٱلدُّنْيَا﴾، گوتیان: هیچ شتێک لە ئارادا نیە، بەسەرهاتی ئێمە هیچ نیە، جگە لە ژیانی دنیامان، ﴿نَمُوتُ وَنَحْيَا﴾، دەمرین و دەژین، واتە: هەندێکمان دەمرین و هەندێک دوای ئێمە دەژین، یاخود: ئێمە دەمرین و ڕۆڵەکانمان دەژین، یان: هەروا مردن و ژیان بە دوای یەکدا دێن، ﴿وَمَا يُهْلِكُنَآ إِلَّا ٱلدَّهْرُ﴾، تەنیا ڕۆژگار دەمانمرێنێ و دەمانفەوتێنێ، ئەمانە دیارە مولحید بوون و نکوولییان کردوە لە بوونی خوا، ﴿وَمَا لَهُم بِذَٰلِكَ مِنْ عِلْمٍ﴾، خوا دەفەرموێ: لەو بارەوە هیچ زانیارییان نیە، ﴿إِنْ هُمْ إِلَّا يَظُنُّونَ﴾، ئەوانە بەس گومان دەبەن، بەس شوێن گومان و خەیاڵ و گۆترەکاریی کەوتوون، هەر لە خۆوە قسە دەکەن،

بەڵگەی ئەوەش کە هیچ زانیارییان نیەو، هەر بە دوای گومان و خەون و خەیاڵ کەوتوون، ئەوەیە:

﴿ وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُنَا بَيِّنَٰتٍ ﴾، کاتێک ئایەتە ڕۆشنەکانی ئێمەیان بەسەردا بخوێنرێنەوە، ﴿ مَّا كَانَ حُجَّتَهُمْ إِلَّآ أَن قَالُوا۟ ٱئْتُوا۟ بِـَٔابَآئِنَآ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴾، بەڵگەیان بەس ئەوە بوو کە گوتیان: باب و باپیرانمان بێنن، ئەگەر ئێوە لە ڕاستانن! ئاخر ئەوە کەی بەڵگەیە! بابایەک بڵێ: ئەگەر ڕاستە زیندوو کرانەوە هەیە، بابم بۆ بێننەوە لە گۆڕستان!، ئەوە هەر بەڵگە نیە، چونکە بەپێی سیستمی خوا، ئەو کەسەی دەمرێ، لە دنیادا نایەتەوە، چونکە تازە تاقیکردنەوەی خۆی داوەو، ئەو قۆناغە بەسەر چووە بۆ ئەوو، لە قۆناغێکی دیکەدا کە قۆناغی بەرزەخەو دواتر قۆناغی قیامەتە، دەچێتە نێو ژیانێکی دیکە.

بۆیە خوا لە کۆتاییدا دەفەرموێ: ﴿ قُلِ ٱللَّهُ يُحْيِيكُمْ ثُمَّ يُمِيتُكُمْ ثُمَّ يَجْمَعُكُمْ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ لَا رَيْبَ فِيهِ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴾، بڵێ: خوا دەتانژیەنێ، دوایی دەتانمرێنێ، دوایی بۆ ڕۆژێک کە هیچ دوو دڵیی تێدا نیە، کۆتان دەکاتەوە، بەڵام زۆربەی خەڵکی نازانن، واتە: زۆربەی خەڵکی نازانن، کە ناگونجێ دنیا شاری بێ خاوەن بێ و، ناگونجێ ژیانی ئینسان، تەنیا لەم پێنج و دوو ڕۆژەی دنیادا کورت هەڵبێ و، قۆناغێکی دیکەی بەدوادا نەیەت و، ئینسان لەسەر خراپەکانی سزا نەدرێ و، لەسەر چاکەکانی پاداشت وەرنەگرێتەوە.

خوا لەو کەسانەمان بگێڕێ کە هەرچی زیاتر لە فەرمایشتی خوا ورد دەبنەوەو، ڕادەمێنن و تێدەگەن و، دوای تێگەیشتنەکەشی بە هۆی تێگەیشتنی باش و چاک و قووڵەوە، زیاتر پێدەگەن، زیاتر خۆیان بە جۆرێک لێدەکەن کە جێگای ڕەزامەندیی خوابن، پاشانیش هەوڵدەدەن لەسەر دەورووبەرو و کۆمەڵگایان کار بکەن و، کۆمەڵگاشیان بە جۆرێک لێ بکەن، کە لە لای خوا پەسەندو چاک بێ، تاکو سەرەنجام، هەم ژیانی دنیامان ژیانێک بێ، کە شایستەی مرۆڤ بێ، هەم لە ڕۆژی دواییشماندا، سەرفرازیی و ڕوو سوورییمان پێ ببڕێ، لە بەرانبەر خوای پەروەردگاردا.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**گەلی جوولەکە هەرچەندە خوای بەخشەر کتێب و، حیکمەت و، پێغەمبەرایەتیی و، بژیوە پاک و چاکەکان و، بەڵگە ڕۆشنەکانی دینداریی پێدا بوون و، بەسەر جیهانییاندا هەڵبژارد بوون، کەچی بە هۆی ستەم و دەستدرێژیی نێو خۆیانەوە، ناکۆکییان کەوتە نێوان و، خوای دادگەریش لە قیامەتدا دادوەرییان لە نێواندا دەکات:**

خوا دەفەرمووێ: ﴿وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحُكْمَ وَٱلنُّبُوَّةَ وَرَزَقْنَٰهُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَفَضَّلْنَٰهُمْ عَلَى ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٦﴾ وَءَاتَيْنَٰهُم بَيِّنَٰتٍ مِّنَ ٱلْأَمْرِ ۖ فَمَا ٱخْتَلَفُوٓا۟ إِلَّا مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَهُمُ ٱلْعِلْمُ بَغْيًۢا بَيْنَهُمْ ۚ إِنَّ رَبَّكَ يَقْضِى بَيْنَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ فِيمَا كَانُوا۟ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ ﴿١٧﴾﴾.

### شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە هەشت بڕگەدا:

بەڕێزان! خوا ﷻ لەم دوو ئایەتە بە پێزەدا بۆ مسوڵمانان باسی ئەزموونی جوولەکە دەکات، لە دینداریيان داو، ئەو ڕاستییە دەخاتەڕوو، کە خوا ﷻ لەگەڵ ئەو گەلەدا، واتە: وەچەی ئیسرائیل، نەوەکانی یەعقووب ﷺ (بەگشتیی لەگەڵ هەموو مرۆڤەکاندا)، بەڵام بە تایبەت لەگەڵ ئەواندا، زۆر میهرەبانانە و بەخشەرانە مامەڵەی کردوە، هەرچی پێویست بووە، بۆ ئەوەی سەرکەوتووبن لە گوزەراندنی ژیانی دنیادا، بە شێوەیەک کە جێگای ڕەزامەندیی خوا بێ، پێیداون، هەر لە کتێب و بەرنامەوە بگرە، تاکو حیکمەت و لێزانیی و کارامەیی، یاخود ڕێبازێک کە ئەو بەرنامەیەی پێ بەرجەستە ببێ، لەلایەن پێغەمبەرانەوە (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ)، پاشان

پێغەمبەرایەتیی و، دوایی بەڵگە ڕۆشنەکان کە دڵنیایان بکات، ڕێی ڕاست چۆنە؟ دڵنیایان بکات ئەوەی خوا پێیداون، ئەو ڕاستە شەقامەیە، کە بە ئامانجی دنیا و دوا ڕۆژیان دەگەیەنێ، هەروەها خوا لە هەموو پێداویستییە پاک و چاکەکان، بە تایبەت لە بژیوەکان پێیدابوون و، بەسەر جیهانییانی ڕۆژگاری خۆیاندا هەڵبژاردبوون، کەچی لە ئەزموونی دینداریياندا سەرکەوتوو نەبوون، بە هۆی ئەوەوە کە لە نێو خۆیاندا ستەمیان لە یەکدی کرد، سنوورشکێنییان بەرەو لای یەکدیی کرد، ئەوەش بوو بەهۆی پەیدابوونی دوو بەرەکیی و ناکۆکیی و پەرتەوازەییان، کە هەمیشە دادگەریی دەبێتە هۆی تەبایی و، ستەم و زۆر و خۆسەپاندو دەستدرێژیی، دەبێتە هۆی پەرتەوازەیی و، تێکچوونی شیرازەی کۆمەڵگا.

هەڵبەتە ئەوەش بۆ ئەوەیە کە مسوڵمانان پەند وەربگرن، لە هەڵەکانی گەلی بەنوو ئیسرائیل و، لە چاکەکانیشیان دەرس وەربگرن و، هەوڵبدەن ئەو شتانەی ئەوان تێیاندا سەرکەوتوو بوون و لە خۆیاندا هێناویاننە دی، مسوڵمانانیش لە خۆیانیاندا بێننە دی و، ئەو شتانەش کە بەهۆیانەوە شکستیان خواردوە، لە دینداریياندا، لە گوزەراندنی ژیانێکی ڕێک و پێکی خوا پەسندانەدا، پەند و عیبرەتیان لێ وەربگرن.

١)- ﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحُكْمَ وَٱلنُّبُوَّةَ ﴾، بە دڵنیاییش کتێب و حیکمەت و پێغەمبەرایەتییمان بە وەچەی ئیسرائیل دابوو.

(و) بۆ بادانەوەیەو گێڕەرەوە (**عاطفة**)یە، ئەم قسەو باسە دەگێڕێتەوە سەر قسەو باسی پێشەوە، (لَقَد): (ل)ەکە بۆ سوێند بۆ خواردنە، یان بۆ زەمینە خۆشکردنە بۆ سوێند، (**اللاَّمُ لِلْقَسَم أو مُمَهِّدة لِلْقَسَمِ**)، (قد) بۆ ساغکردنەوەیە، ﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحُكْمَ وَٱلنُّبُوَّةَ ﴾، واتە: بە دڵنیایی و، بە جەختکردنەوەوە بە وەچەی ئیسرایلمان دابوو، کتێب و حیکمەت و پێغەمبەرایەتیی، هەرچی کتێبە (ٱلْكِتَٰبَ)، کە (أل)ی ناساندنی لەسەرە، مەبەست پێی جینس نیە، واتە: هەرچی کتێبی خوا بووە، نەدراوە بەوان، کەواتە: مەبەست

پێی (عهد)ە، واتە: کتێبەکانمان پێدابوون، لە پێش هەموویانەوە (تەورات و زەبوورو ئینجیل)، ئەو سێ کتێبە کە خوا ناوی هێناون، هەڵبەتە لە پەیمانی کۆندا ناوی ژمارەیەکی دیکەش هێنراوە، بە ناوونیشانی پێغەمبەران، بۆ هەر کامێکیان، یان بۆ زۆربەیان باسی کتێبێک کراوە، لە پەیمانی کۆندا سەرجەم: سی و نۆ (٣٩)، بەسەرژمێرێک و، چل و نۆ (٤٩) بەسەرژمێرێکی دیکە، بە پێغەمبەرو خاوەن پەیام لەلایەن خواوەوە ناوزەد کراون، کتێبێک یان نامیلکەیەکیش پاڵدراوەتە لای هەر کامێکیان، ئنجا ئایا چەندی ڕاستە و چەندی ڕاست نیە؟ بێگومان هەر قسەیەکیش لەو کتێبانەدا هەبێ و پاڵدرابێتە لای ئەو کەسانەو، ڕێک لەگەڵ وەحیی خوای پەروەردگاردا، تێکبگیرێ، ئەوە دڵنیاین کە هی خوای بەرزو مەزن نیە، بەڵام ئەوەی دیکە، وەک پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {لاَ تُصَدِّقُوا أَهْلَ الكِتَابِ وَلاَ تُكَذِّبُوهُمْ} (أخرجه البخاري: ٤٢١٥)، واتە: خاوەن کتێبەکان، نە بەڕاست دابنێن، نە بە درۆشیان دابنێن، لێیان بێدەگ بن، مەگەر شتێک بزانرێ کە پێچەوانەی وەحیی، یان عەقڵ، یان پێچەوانەی عیلم، یان واقیعە، دەڵێین: لەوەدا ڕاستتان نەکردوە.

وشەی (الحُكم)، وێڕای حوکمڕانیی بە حیکمەتیش لێکدراوەتەوەو، پێشتریش پێناسەی حیکمەتمان کرد کە ڕەنگە کورتترین پێناسەی ئەوە بێ: (إِصَابَةُ الحَقِّ عِلْماً وَعَمَلاً)، پێکانی هەق لە ڕووی زانیاریی و کردەوە وە، واتە: مرۆڤ هەم باش تێ بگات، لە شتەکە، هەم چاک کار بکات، بەو شتەی کە باشی لێ تێگەیوە، هەندێک لە زانایان (حکم) یان بە: (الفَهْمُ بالكِتَاب) چاک تێگەیشتن لە کتێبی خوا، لێکداوەتەوە.

واش پێدەچێ (حکم) و (حکمة) مەبەست پێی ئەو ڕێبازە بێت، کە ئەو پێغەمبەرە ﷺ گرتوویەتەبەر بۆ جێبەجێ کردنی ئەو کتێبە، هەروەک ئێستا ئێمە دەڵێین: (الكتاب والسنة)، سوننەتەکەش ئەو ڕێباز و چۆنیەتییەیە کە پێغەمبەری خوا موحەممەد ﷺ گرتوویەتەبەر بۆ جێبەجێکردنی کتێبەکەی خوا،

وەک لە زۆر لە کتێبەکانی خۆمدا باسم کردوە، بۆیە باشترین پێناسە بۆ سوننەت یانی: ڕێبازی پێغەمبەر ﷺ، بە واتای ئەو چۆنیەتییەی کە موحەممەد ﷺ کتێبی خوای پێ جێبەجێ کردوە، هەر بۆیەش پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: {**عَلَيْكُمْ بِسُنَّتِي وَسُنَّةِ الْخُلَفَاءِ الرَّاشِدِينَ الْمَهْدِيِّينَ بَعْدِي، عَضُّوا عَلَيْهَا بِالنَّوَاجِذِ**}، (**أخرجه أبو داود: ٤٦٠٧، والترمذي: ٢٦٧٦ وَغَيْرهما**)، واتە: ڕێبازی من و ڕێبازی جێنشینە سەر ڕاستە ڕێنماییکراوەکانی دوای من بگرن، کەڵبانی لەسەر ڕۆبگرن.

ئنجا ئەگەر مەبەست لە (**سنة**) وەحییەکی تایبەت بێ کە بۆ پێغەمبەر هاتوە، بێگومان خەلیفە ڕاشیدەکان وەحییان بۆ نەهاتوە، کەواتە: سوننەت لێرەدا بە مانای ڕێبازو چۆنیەتیی جێبەجێ کردن، دێ، واتە: بەرجەستە کردنی ئەوەی خوا لە قورئاندا دایبەزاندوە، بە تایبەت لە ڕووی ئیدارەدانی کۆمەڵگا و لە ڕووی سیاسیی و کۆمەڵایەتییەوە، ئەگەرنا بێگومان خەلیفە ڕاشیدەکانی پێغەمبەر ﷺ شتێکی زیادەیان نەخستۆتە گەڵ ئایین، بەڵام بە ڕێکیی وەک پێغەمبەری خوا ﷺ قورئانیان جێبەجێ کردوە، هەروەها ئەوەی کە لە پێغەمبەرەوە ﷺ پێیان گەیشتوە، وەک لێکدانەوەی قورئان و لێ تێگەیشتنی قورئان و جێبەجێ کردنی قورئان، یان وەک وەحییەکی زیادە کە پێغەمبەر ﷺ وێرای قورئان بۆی هاتوە، جێنشینە سەر ڕاستەکانی پێغەمبەر ﷺ باش باش ئەوەیان جێبەجێ کردوە.

کەواتە: لێرەدا: ﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ٱلْكِتَٰبَ ﴾، (**الكتاب**) یانی: کتێبی خوا، (**الحُكم**)، حیکمەت، ئەوەیە کە چاک چاک ئەو کتێبە جێبەجێ بکەن، بە ڕێبازێک و چۆنیەتییەکی ڕاست و دروست، (وَٱلنُّبُوَّةَ ) پێغەمبەرایەتیی.

٢- ﴿ وَرَزَقْنَٰهُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَفَضَّلْنَٰهُمْ عَلَى ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾، لە بژیوە خۆش و پاک و چاکەکانمان پێدابوون، ئنجا هەندێک لە زانایان گوتوویانە: مەبەست لە: (ٱلطَّيِّبَٰتِ): (**المَنّ وَالسَّلْوَى**) (گەزۆ و سەلوا)یە، کە لەسەر زەمینی شام خوا بۆی ڕەخساندوون، دوای ئەوەی لە چنگی فیرعەون و سوپا و دارو دەستەکەی دەربازیان بوو، بە دەریای سووردا پەڕینەوەو کەوتنە بیابانی (**سینا**)، هیچ خواردن و خۆراکیان نەبوو، خوا ﷻ گەزۆی بۆ ڕەخساندن و شێلاقە

(**سلوی**)ش کە جۆرە باڵندەیەک بوو، بۆی ڕەخساندن، هەرچەندە دوایی قەناعاتیشیان بەو دووانە نەکردوە، وەک لە سوورەتی (**البقرة**)دا هاتوە: ﴿وَإِذْ قُلْتُمْ يَـٰمُوسَىٰ لَن نَّصْبِرَ عَلَىٰ طَعَامٍ وَاحِدٍ فَادْعُ لَنَا رَبَّكَ يُخْرِجْ لَنَا مِمَّا تُنْبِتُ الْأَرْضُ مِنْ بَقْلِهَا وَقِثَّائِهَا وَفُومِهَا وَعَدَسِهَا وَبَصَلِهَا ﴿٦١﴾﴾، بیانوویان بە مووسا عليه السلام گرت، کە خواردنی جۆراو جۆر کە کاتی خۆی لە میسرەوە پێیانەوە ڕاهاتبوون، بۆیان برەخسێنێ، بەڵام بێگومان چەمکی (الطَّيِّبَٰتِ) زۆر لە گەزۆو شێلاقە (**المنَّ والسَّلوى**) فراوانترەو، گرنگ ئەوەیە خوا لێرە دەفەرموێ: ئێمە لە بژیوە پاک و چاکەکان پێمان دابوون، ئنجا مەرج نیە، تەنیا ئەو کاتەی لە دەشتی (**سینا**) بوون، بەڵکو دوایی کە نیشتەجێش بوون لە هەندێک شارو ئاوەدانییەکاندا.

٣- ﴿وَفَضَّلْنَـٰهُمْ عَلَى الْعَـٰلَمِينَ﴾، هەڵمانبژارد بوون بەسەر جیهانییاندا، واتە: بەسەر ئەو کۆمەڵگایانەی کە لە ڕۆژگاری ئەواندا بوون هەڵمانبژاردبوون، واتە: (**فضلناهم على عالمي أهل زمانهم**)، لەبەر ئەوەی بەنوو ئیسرائیل لەگەڵ هەموو کەم و کورییەکانیشیاندا، لە قەدەر خەڵکی و ڕۆژگاری خۆیان و کۆمەڵگایەکانی دیکە، لە هەموویان باشتر بوون، لە سۆنگەی ئەوەوە کە ئەوان دینیان هەبووەو، بەپێی دینەکەش دنیاو ژیان و کۆمەڵگایەکەی خۆیانیان بەڕێوەبردوە، ئنجا با کەم و کورییشیان بووبێ، هەرچۆن بێ، چاکتربوونە لەوانەی کە سەریان بەرەو ئاسمان بەرز نەکردۆتەوەو، سەرنجیان نەداوە: داخۆ ئەو خوایەی هێناونیە دی، چی لێیان دەوێ و، چۆنی فەرمان پێکردوون و، پێی خۆشە، چۆن ژیانی دنیایان بگوزەرێنن؟

٤)- ﴿وَءَاتَيْنَـٰهُم بَيِّنَـٰتٍ مِّنَ الْأَمْرِ ﴿١٧﴾﴾، بەڵگە ڕۆشنەکانیشمان لە بارەی کاروبارەوە پێدابوون، (بَيِّنَـٰتٍ)، یانی: بەڵگە ڕۆشن و ئاشکرایەکان، کە دەفەرموێ: (مِّنَ الْأَمْرِ)، ئەمە دوو واتای هەن:

أ- لە بارەی کاروبارو کۆمەڵگاو ئۆممەتەوە، بەڵگە ڕۆشنەکانمان پێدابوون، کە بەڵگە ڕۆشنەکانیش هەر لەو دوو توێی کتێب و حیکمەت و پێغەمبەرایەتیی دابوون، بەڵام خوا ﷻ بە جیا باسی کردوون، واتە: ئەو کتێب و حیکمەت و پێغەمبەرایەتییە، بوونە هۆی ئەوی کە بەرچاویان ڕۆشن بێ و، بەڵگەیان بە دەستەوە بێ بۆ دینداریی یەکەی خۆیان.

**ب-** یاخود (**أمر**): مەبەست پێی کاروباری دینداریيە، واتە: لە دینداریياندا بەرچاو ڕۆشنمان کرد بوون، دینداریيەک کە دنیاشی پێ بەڕێوە دەبەن، چونکە لە ڕاستییدا ئایین بۆیە هاتوە دنیا ڕێک بخات و بەڕێوەبەرێ و پاکی بکات و چاکی بکات، کەواتە: وشەی (**أمر**): یان بە مانای ئۆممەتە، (مِّنَ ٱلۡأَمۡرِ)، یانی: (**مِنَ أَمْر الأُمَّة**)، یاخود بە مانای: ئایینە، یانی: (**من أمر الدين**)، کە لە ڕاستییدا دینیش هەر بۆ بەڕێوەبردنی ئۆممەت و کۆمەڵگا هاتوەو، کۆمەڵگایەکی ڕاست و تەندروستیش ئەو کۆمەڵگایەیە کە بەپێی دینی خوا، بەپێی وەحیی خواو پەیامی خوا، بەڕێوە دەچێ.

٥)- ﴿فَمَا ٱخۡتَلَفُوٓاْ إِلَّا مِنۢ بَعۡدِ مَا جَآءَهُمُ ٱلۡعِلۡمُ﴾، نەشکەوتنە ڕاجیاییەوە، مەگەر دوای ئەوەی زانیارییان بۆ هاتبوو.

(**ف**)، لێرەدا بۆ (**تفريع**)ە، واتە: لە پێش ئەوەدا قسەیەک هاتوە، یانی: (**فَاخْتَلَفُوا، وَمَا اخْتَلَفُوا إلاَّ مِنْ بَعْدِ مَا جَاءَهُمُ العِلْم**)، ناکۆک بوون لە نێو خۆیاندا، ناکۆکیش نەبوون، مەگەر دوای ئەوەی زانیارییان بۆ هات، واتە: ناکۆک بوونەکەیان لە نێو خۆیاندا، بە هۆی نەزانییەوە نەبوو، بەڵکو دوای ئەوەی زانیارییان بۆ هاتوەو بەرچاو ڕوونکراون و، بیانوو بڕاو کراون، ناتەباو ناکۆک بوون.

٦)- ﴿بَغۡيَۢا بَيۡنَهُمۡۚ﴾، لە ئەنجامی سنوور شکێنیی نێو خۆیانەوە، (**البَغي: الظُّلْمُ وَالتَّجَاوُزُ، أَي: كَانَ اخْتِلاَفُهُمْ عَنْ عَمْدٍ وَمُكَابَرَةٍ**)، (بَغۡيَۢا): بە مانای ستەم و سنوورشکێنیی دێ، واتە: ناکۆکییەکەیان و نا تەباییەکەیان لە ئەنجامی ستەمی نێو خۆیانەوە بوو، وشەی (بَغۡيَۢا): لە ڕووی ڕێزمانی عەرەبییەوە دوو حاڵەتی هەن:

**أ-** یان دەبێتە بەرکاری پێناو (**مفعول لأجلِهِ**).

**ب-** یاخود دەبێتە حاڵ، (**بتأويل المصدر باسم الفاعل**)، کە چاوگەکە بگۆڕێ بۆ ناوی بکەر، واتە: (**بَاغِيْنَ بَيْنَهُم**) یانی: ناکۆک نەبوون، لە نێو خۆیاندا، مەگەر دوای ئەوەی زانیارییان بۆ هات، لە حاڵێکدا کە لە نێو خۆیاندا ستەمیان دەکرد، یاخود بە هۆی ستەمی نێوخۆیانەوە، ئەو ناکۆکییەیان لە نێواندا پەیدابوو.

وشەی (بَغِي): توێژەرەوانی قورئان بە زۆر واتا لێکیان داوەتەوە:

١- هەندێکیان گوتوویانە: (**البَغِي: الحَسَدُ**).

٢- هەندێکیان گوتوویانە: (**البغي: الظُّلْمُ والتَّجَاوُزُ**).

٣- هەندێکیان گوتوویانە: (**بَغْياً بَيْنَهُم، أي: طَلَباً للرِّيَاسَاتِ**)، بەڵام وشەی (**بَغِي**) لە ئەسڵدا وەک پێشتر لە (**مختار الصِّحاح**)ەوە، هێنامان: (**كُلُّ مُجَاوَزَةٍ وَإِفْرَاطٍ عَلَى المقْدَارِ الَّذِي هُوَ حَدّ الشَّيء، فَهُوَ بَغِيٌّ**)، هەر تێپەڕاندنێک و زێدەڕۆییەک لەو ئەندازەیەی کە سنووری شتێکە، پێی دەگوترێ: (**بغي**)، ئنجا دیارە ئێرەیی (**حسد**) دەگرێتەوەو، ستەم دەگرێتەوەو، سنوور شکێنییش دەگرێتەوەو، خۆسەپاندنیش دەگرێتەوەو، ماڵی یەکدی داگیرکردنیش دەگرێتەوەو، دەستدرێژییکردن بۆ نەفس و نامووس و هێمن و ئاساییشی یەکدیش دەگرێتەوە، خوا ﷻ وشەیەکی بەکارهێناوە کە هەرچی لادان و تاوان و خراپەو دەستدرێژییە، بیگرێتەوە.

٧)- ﴿إِنَّ رَبَّكَ يَقْضِي بَيْنَهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ﴾، بە دڵنیایی پەروەردگارت دادوەرییان لە نێواندا دەکات لە ڕۆژی هەڵسانەوەدا، چونکە ڕاجیایی ئەوە دەخوازێ، کە هەندێک لەسەر هەق بن و، هەندێک لەسەر ناهەق بن، ئنجا ئەوەش چۆن یەکلابکرێتەوە و ساغ بکرێتەوە؟ پێویستیی بە ڕۆژێک هەیە، کە تێیدا دادوەریی بکرێ: کێ لەسەر هەق بووەو، کێ لەسەر ناهەق بووە؟ بۆیە دەفەرموێ:

٨)- ﴿فِيمَا كَانُوا فِيهِ يَخْتَلِفُونَ﴾، لەوەدا کە تێیدا کەوتبوونە ڕاجیایی و ناکۆکیی و دووبەرەکییەوە، بە دڵنیایی پەروەردگارت لە ڕۆژی قیامەتدا دادوەرییان لە نێواندا دەکات، ئەوە هەمووی هۆشدارییدانە بە ئوممەتی پێغەمبەر موحەممەد ﷺ و بە مسوڵمانان، کە ئێوەش نەچن بە هۆی سنوورشکێنیی و خۆسەپێنیی و دەستدرێژیی کردنەوە بۆ سەر یەکدی و مافەکانی یەکدی، ناکۆکیی و دووبەرەکییتان لە نێواندا پەیدابێ، ئەگەرنا ئەگەر لە دنیاشدا ستەمکاران و خۆسەپێنەران و مافی خەڵک زەوتکەران، بە سزای خۆیان نەگەن، لە ڕۆژی دواییدا دادگایی دەکرێن و، خوا دادوەرییەکی دادگەرانەیان لە نێواندا

دەكات، كەواتە: ئێوەش وریا بن! بە مەرەدی خاوەن كتێبە پێشووەكان نەچن، ئەگەرنا لە ڕۆژیی دواییدا تووشی هەمان چارەنووس و سەرەنجام دەبن، دادگایی دەكرێن و، خوا دادوەرییتان لە نێواندا دەكات و، هەر كەسە بەپێی هەڵوێست و كردەوەكەی خۆی، ئەگەر خراپەكار بوو بێ سزا، ئەگەرنا پاداشت دەدرێتەوە، ئەگەر لەسەر ناهەق بووبێ سزاو، ئەگەر لەسەر هەقیش بوو بێ، پاداشت دەدرێتەوەو، هەقی بۆ لە بەرانبەرەكەی دەكرێتەوە.

بێگومـان ئـەوەی خـوا ﷻ فەرموویـەتی، بـۆ ئەزمـوونی شكسـتخواردووی خـاوەن كتێبـەكان، كـە بـە هـۆی سـتەم و دەسـترێژییەوە، ناكۆكییـان لـە نێوانـدا پەیدابـوو و دوایـی پەرتەوازەیـی، هەمـان دەرد بەداخـەوە بەسـەر ئۆممـەتی پێغەمبەریشـدا هـات، بـە تایبـەت لـە دوای چـوار خەلیفـە ڕاشـیدەكانی پێغەمبـەر ﷺ خـوا لێیـان ڕازی بـێ، ئەبـوو بەكـر و عومـەر و عوسـمان و عـەلی، كـە هـەر یەكێكیـان بـە ڕێژەیـەک بـە ئەنـدازەی خـۆی، بـە ڕێبـازی پێغەمبـەرەوە پابەنـد بـوو.

بـە نسـبەت ئەبـوو بەكـر و عومـەرەوە خـوا لێیان ڕازی بێ بـە ڕێژەیەكـی زۆر زۆرو، بـە نسـبەت عوسـمان و عەلییشـەوە خـوا لێیـان ڕازی بـێ، بەڕێژەیەكـی لـەوان كەمـتر، لەبـەر بـارودۆخ و ژینگـە، یـان لەبـەر هەنـدێ سیفەتی شـەخصیی و تایبـەتی خۆیـان، بـە تایبەتیـی (**عثـمان**)، خـوا لێـی ڕازی بـێ، بـەڵام گرنـگ ئەوەیـە بەگشـتیی، هـەر بـەو ڕێبـازە دا كـە پێغەمبـەر ﷺ پێیـدا ڕۆیشـتبوو و كۆمەڵـگای پـێ ئیـدارە دابـوو، هـەر بـەو شـێوەیە بەڕێـوە چـوون، بـەڵام لـە دوای ئەوانـەوە: یەكـەم شـت شـێوازی دانـدرانی حوكمـڕان، گـۆڕا لـە شـووڕاوە كـە بناغـەی حوكمڕانییـە لـە ئیسـلامدا، بناغەی پێسـپێردرانی بەرپرسـیارەێتییە: ﴿وَأَمۡرُهُمۡ شُورَىٰ بَيۡنَهُمۡ ٣٨﴾، ئـەو بناغەیـە لاچـوو و كـرا بـە بنەماڵەیـی و میراتیـی، لەسـەردەمی موعاوییـەوەو بـە دەسـتی وی.

### مەسەلەی دووەم:

**دانانی بەرنامەیەکی سەربەخۆ لە ئایینی گشتیی خوا، بۆ پێغەمبەری خاتەم موحەممەد ﷺ و ئوممەتەکەی و پابەند کردنیان پێیەوەو، هۆشداریی پێدانیان کە بکەونە دوای ئارەزووەکانی نەزانان، واتە: لە خۆیان وریا بن، تووشی ئەوە نەبن، کە دوایی هیچ دادیان نادەن لە ڕۆژی دوایی دا و، لە دنیاشدا ستەمکاران پشتیوانی یەکدی و، خواش پشتیوانی پارێزکارانەو، قورئانیش بۆ خەڵکی بە گشتیی کۆ بەرچاو ڕوونیی و، بۆ بڕوادارانیش بە تایبەتی ڕاستەڕێکەر و بەزەیی خوایە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ جَعَلْنَاكَ عَلَىٰ شَرِيعَةٍ مِّنَ الْأَمْرِ فَاتَّبِعْهَا وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَاءَ الَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٨﴾ إِنَّهُمْ لَن يُغْنُوا عَنكَ مِنَ اللَّهِ شَيْئًا ۚ وَإِنَّ الظَّالِمِينَ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ ۖ وَاللَّهُ وَلِيُّ الْمُتَّقِينَ ﴿١٩﴾ هَٰذَا بَصَائِرُ لِلنَّاسِ وَهُدًى وَرَحْمَةٌ لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ ﴿٢٠﴾ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە حەوت بڕگەدا:

١)- ﴿ ثُمَّ جَعَلْنَاكَ عَلَىٰ شَرِيعَةٍ مِّنَ الْأَمْرِ ﴾، دوایی تۆمان خستە سەر بەرنامەیەک لە ئایینی خۆمان.

خوای پەروەردگار پێغەمبەری خاتەم موحەممەد ﷺ دەدوێنێ، دەفەرموێ: (ثُمَّ) دوایی (ثم) بۆ بەدواداهاتنی پلە پلەییە، واتە: دوای خاوەن کتێبەکان و، ئەو ئەزموونەی بۆمان باسکردن، تۆمان دانا لەسەر بەرنامەیەک لە ئایینی گشتیی خۆمان، یان لە کاروبارێ کە دەبێ کۆمەڵگای پێ بەڕێوە ببردرێ، بەپێی وەحیی و پەیامی خوا، تۆمان لەسەر بەرنامەکی سەربەخۆ دانا.

٢)- ﴿ فَاتَّبِعْهَا وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَاءَ الَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ ﴾، ئنجا شوێنی بکەوە، شوێنی ئەو بەرنامەیە بکەوەو، بە دوای ئارەزووەکانی ئەوانە مەکەوە کە نازانن.

کـە دەفەرمـوێ: (عَلَىٰ شَرِيعَةٖ مِّنَ ٱلۡأَمۡرِ)، (عَلَىٰ: **للإستعَلاءِ الْمَجَازِيّ، أي: التَمكُّنِ وَالثَّبَات**)، (**علی**) بـۆ بەرزبوونـەوەی مەجازییـە، یـانی: چەسـپان و دامـەزران، دوایـی تۆمـان خسـتۆتە سـەر ڕاسـتە شـەقامێک، تەنوینـی سـەر (عَلَىٰ شَرِيعَةٖ)، بـۆ بـە مەزنگرتـن (**تَعْظِيـم**)ە، واتـە: شـەریعەتێک، بەرنامەیەکـی نـاوازە، بەرنامەیەکـی بـێ وێنـە، (فَٱتَّبِعۡهَا)، ئنجـا بـەردەوام بـە لەسـەر شـوێنکەوتنی، ئەگەرنـا پێغەمبـەری خاتـەم ﷺ هـەر لـە سـەرەتاوە کـە خـوای پـەروەردگار پەیامـی بـۆ نـاردوە، پابەنـد بـووە بـەوەوەی خـوا بـۆی نـاردوە، بـەو ڕێبـازو بەرنامەیـەوە.

(وَلَا تَتَّبِعۡ أَهۡوَآءَ ٱلَّذِينَ لَا يَعۡلَمُونَ)، بـە دوای ئـارەزووەکانی ئەوانـە مەکـەوە کە نازانن، بـە زۆریـی: ئەوانـەی نازانـن (ٱلَّذِينَ لَا يَعۡلَمُونَ) لـە قورئانـدا بـۆ بتپەرسـتان و هاوبـەش بـۆ خـوا دانـەران و ئەوانـەی کـە شـارەزاییان نەبـووە، لـە کتێـب و بەرنامـەی خـوا پـەروەردگارداو، شـارەزاییان نەبـووە بـە وەحیـی، بـە زۆریـی بـۆ ئـەوان بەکاردەهێنرێ، کـە لـە ڕۆژگاری ئێسـتای ئێمـەدا، سیکۆلاریسـتەکان دەگرێتـەوە، لائیکـەکان، ئەوانـەی کـە دان ناهێنـن بـە وەحیـی و پەیامـی خـوادا، کـە بەرنامـەی ژیـان بـێ و، ڕێکخـەری ژیـانی مـرۆڤ بـێ.

٣)- ﴿إِنَّهُمۡ لَن يُغۡنُواْ عَنكَ مِنَ ٱللَّهِ شَيۡـٔٗا﴾، بە دڵنیایی ئەوان لە بەرانبەر خوادا، لە بەرانبەر سزای خوادا، هیچ سوودێک بە تۆ ناگەیەنن، (**ضُمِّنَ أَغْنَى مَعْنَى دَفَعَ، فَعُدِّيَ بِـ «عَنْ» وَشَيْئاً مَفْعُول مطلق**)، کە دەفەرموێ: (إِنَّهُمۡ لَن يُغۡنُواْ عَنكَ مِنَ ٱللَّهِ شَيۡـٔٗا)، (يُغۡنُواْ)، یانی: کەڵێن بۆ گرتن، (**أَغْنَاهُ يُغْنِيهِ**)، واتە: کەڵێنی بۆ گرت، کەڵێنی بۆ دەگرێ، بەڵام لێرە (يُغۡنُواْ)، مانای لا دەبات (**يدفع**)ی خراوەتە نێو، واتە: هیچ لە بەڵاو سزای خوا لە تۆ ناگێرنەوە و لێت لا نادەن، (شَيۡـٔٗا)یش، بەرکارێکی ڕەهایە، واتە: هیچ جۆرە سوودێکت پێ ناگەیەنن و، هیچ بەڵایەکت لێ دوور ناخەنەوە، ئەگەر لابدەی، وشەی (أَهۡوَآءَ: **جَمْعُ هَوَى، وَهُوَ المَحَبَّةُ وَالمَيْلُ وَمُشْتَهَى النَّفْس**)، (**هوى**) بریتیە لە خۆشویستن و ئارەزووکردن و، شتێک کە نەفس ئارەزووی بکات.

بێگومـان کـە خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ فَاتَّبِعْهَا وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَاءَ الَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ ﴾، ڕووی دوانـدن لـە موحەممـەد پێغەمبـەری خاتەمـە ﷺ، بـەڵام دوو شـتی تێدا ڕەچـاو کراون:

**یەکەم:** کە هاوبەش بۆ خوا دانەرو کافرەکان ئەوە ببیستن، تاکو تەما بڕاوبن و، هیچ ئومێدیان نەبێ بەوەی پێغەمبەر ﷺ بە لای ئەواندا بشکێ.

**دووەم:** ئەمە هۆشدارییدانە بە شوێنکەوتووانی پێغەمبەری خاتەم ﷺ و بە مسوڵمانان، کە لە خۆیان وریا بن و، هەتا هودای خوا لەوێ بێ، بە دوای هەوای خەڵکی نەزان و نەفام نەکەون، ئەگەرنا دوایی دووچاری سزاو تۆڵەی خوا دێن و، ئەوانەش کە نەزان بوون و، بە دوای ئارەزووەکانیان کەوتوون، هیچ دادیان نادەن و سوودیان پێناگەیەنن.

هەندێک لە زانایانیش ئەم تەعبیرەیان ئاوا لێکداوەتەوە:

ئەوانـە هیـچ سـوودێک بـە تـۆ ناگەیەنـن، یاخـود کەمێکیـش لـە سـوود گەیانـدن، وەک جێگـرەوە بـۆ تۆڵـەو سـزای خـوا بـە تـۆ ناگەیەنـن، واتـە: یـەک تۆزیـش لـە سـزاو جەزرەبـەو تۆڵـەی خـوا، لە تـۆ دوورناخەنـەوە، ئەگـەر بـە دوای ئارەزووەکانیـان بکەوی.

٤)- ﴿ وَإِنَّ الظَّالِمِينَ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ ﴾، ستەمکارانیش هەندێکیان دۆست و پشتیوان و سەرپەرشتیاری هەندێکیانن.

٥)- ﴿ وَاللَّهُ وَلِيُّ الْمُتَّقِينَ ﴾، خواش دۆست سەرپەرشتیاری پارێزکارانە، دیارە موحەممەدیش ﷺ کۆتا پێغەمبەری خواو سەروەری پێغەمبەران، پێشەوای پارێزکاران بووە، کەواتە: خوا ﷻ لە هەموو کەس زیاتر سەرپەرشتیی کردوەو، مشووری خواردوەو پشتیوانی بووە، وشەی (إغناء)، کە لە قورئاندا زۆر هاتوە، دەڵێ: (**الإِغْنَاءُ: جَعْلُ الغَيْرِ غَنِيًّا غَيْرَ مُحْتَاجٍ**)، (**إغناء**): بریتیە لەوەی ئەو کەسە، ئەو بەرانبەرە، بێنیاز بکەی و وای لێ بکەی، ئاتاج نەبێ، واتە: ئەگەر تۆ بە دوای ئارەزووی ئەوانە بکەوی، کە نازانن، تۆیان پێ بێ نیازو دەوڵەمەند ناکرێ، لە سزای خوا، یاخود تۆیان پێ دەرباز ناکرێ و، سزای خوایان پێ لە تۆ دوور ناخرێتەوە.

پاشان ستەمکاران دۆست و سەرپەرشتیاری یەکدین لە بەینی خۆیاندا، بەڵام دۆست و سەرپەرشتیاری پارێزکاران تەنیا خوایە ﷻ، واتە: بە تەمای کەسی دیکە مەبەو بە کەسی دیکە ئومێدەوار مەبە، ئنجا ئەمە لەلایەک: ڕووی دواندن لە پێغەمبەرە ﷺ و لەلایەکەوەش: تەمابراو کردنی کافرو بێبڕوایەکانە، لەوەدا کە تەماعیان هەبێ پێغەمبەر ﷺ یان ئەهلی ئیمانی ڕاستەقینەی شوێنکەوتووی پێغەمبەریان ﷺ بەلادا بشکێ، هەروەها هۆشدارییدانە بە شوێنکەوتووانی پێغەمبەریش ﷺ کە بە هیچ جۆرێک بیر لەوە نەکەنەوە، خەڵک ڕازیی بکەن لەسەر حیسابی لادان لە شەریعەت، لادان لە بەرنامەی خوا، چونکە ئەوە نە لە دنیادا، هیچ شتێک ئەوەیان بۆ قەرەبوو دەکاتەوەو، نە بۆ دواڕۆژیشیان هیچ شتێک سزای خوایان لێ لادەدات.

لە کۆتایی دا خوا دەفەرموێ:

٦)- ﴿ هَٰذَا بَصَٰٓئِرُ لِلنَّاسِ ﴾، ئەمە کۆ بەرچاو ڕوونییە بۆ خەڵک، واتە: ئەوەی باسکرا لە فەرمایشت، یاخود (هَٰذَا)، ناوی ئاماژەیە بۆ قورئان، واتە: ئەم قورئانە (بَصَٰٓئِرُ لِلنَّاسِ)، واتە: کۆ بەرچاو ڕوونییە، (بَصَٰٓئِرُ) کۆی (**بصيرة**)یە، یانی: بەرچاو ڕوونیی، (بَصَٰٓئِرُ : **جَمْعُ البَصِيرَة، وَهِيَ حَاسّة باطِنَة، وَبِمَا أن لِكُلّ إِنْسَانٍ بَصِيْرَة، لَذَا جُمِعَت: بَصَائِر**)، (**بَصَائِر**) کۆی (**بَصيرة**)یە، ئەویش بریتیە لە هەستێکی دەروونیی مرۆڤ هەقی پێدەناسێ و لە ناهەق جیای دەکاتەوە، ئنجا لەبەر ئەوەی هەموو مرۆڤێک ئەو هەستە دەروونییەی هەیە، ئەگەر لە خۆی دا گەشەی پێ بدا و فراژووی بکات، بۆیە بە (**بصائر**) کۆکراوەتەوە.

٧)- ﴿ وَهُدًى وَرَحْمَةٌ لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ ﴾، هەروەها ڕاستەڕێکەرو بەزەییە بۆ کۆمەڵێک دڵنیایانە بڕوا بێنن، ﴿ لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ ﴾، بۆیە وشەی (**قوم**) بەکارهاتوە، (**لأَنَّ اليَقِيْنَ أَصْبَحَ مُقَوِّماً لَهُم**)، دڵنیایی و زانیاریی تەواو و قەناعەت هاتنی تەواو، بۆتە ڕاگری ئەو کۆمەڵە، کە مەبەست پێی بڕواداران و مسوڵمانانە، بۆچی لێرەدا خوا دەفەرموێ: ﴿ هَٰذَا بَصَٰٓئِرُ لِلنَّاسِ ﴾، ئەم قورئانە، یاخود ئەوەی باسکرا: کۆ بەرچاو ڕوونییە بۆ خەڵک بە گشتیی، بەڵام: ﴿ وَهُدًى وَرَحْمَةٌ لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ ﴾، ڕاستەڕێکەرە و بەزەییە بۆ کۆمەڵێک

بڕواداری دڵنیابن؟ **وەڵام:** (بَصَٰٓئِرُ لِلنَّاسِ)، کۆ بەرچاو ڕوونییە بۆ خەڵک، لەبەرئەوەی قورئان ڕوونکەرەوەیە بۆ خەڵک بە گشتیی و خەڵک بە گشتیی دەتوانێ لێی بەهرەمەند بێ، بەڵام ڕاستە ڕێکردن و بەزەیی، تایبەتکراون بە کۆمەڵێکەوە کە بڕواداری دڵنیابن، چونکە ئەو ڕوونکردنەوەو بەرچاو ڕوونییەی قورئان، ڕێی ڕاستی پێناگرێ و، پێی ناگاتە ئامانج، مەگەر کەسێک لێی دڵنیابێ، لە ڕاستییەکانی دڵنیابێ، هەروەها بۆ هیچکەس نابێتە هۆی ئەوەی بە هۆی ئەم قورئانەوە، خوا بەزەیی لەگەڵ بنوێنێ، مەگەر کەسێک بە ئیمان و یەقینەوە، شوێنی بکەوێ، وشەی (**یقین**)، پێشتریش گوتوومانە: ناوی سیفەتی زانیارییە، واتە: زانیارییەک کە دوو دڵیی تێدا نەمابێ، ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿لِّقَوۡمٖ يُوقِنُونَ﴾، یانی: دڵنیان لە بڕوا هێنانەکەیاندا، یاخود: دڵنیان بە ڕاستییەکانی قورئان و، لە ڕاستییەکانی قورئاندا، دڵنیان و دڵ لە دڵدانیان نەماوە، (**یقین** ) و (**ظن**)یش -- وەک دواییش دەیگەیەنێ -- پێچەوانەی یەکدین، وەک هەر لەم سوورەتە موبارەکەدا هاتوە: ﴿إِن نَّظُنُّ إِلَّا ظَنّٗا وَمَا نَحۡنُ بِمُسۡتَيۡقِنِينَ ٣٢﴾، واتە: ئێمە هەر گومان دەبەین و، لە دڵنیایان نین، کەواتە: دڵنیابوون پێچەوانەی گومان هەبوونە.

هەندێـک لـە زانایـان دەڵێـن: وەک چـۆن مـرۆڤ بـە هـۆی چـاو (**بـصر**)ەوە، شـتە بەرهەسـتەکان دەبینـێ، بـە هـۆی (**بصیرة**)یشـەوە، شـتە پەنهانـەکان دەبینـی، بۆیـە ئەگـەر (**بَـصَر**) بـۆ شـتە بەرهەسـتەکان دەرککـەرو بینـەرە، (**بصیرة**)یـش بـۆ شـتە مەعنەوییـەکان، زانـەرو پەیپێبـەرە.

(**البَصِـيرَةُ: إِدْرَاكُ العَقْـلِ الأُمُـورَ عَـلَى حَقَائِقِهَـا، شُـبِّه بِبَـصَرِ العَـيْنِ، وفُـرِّق بَيْنَهـمَا بِصِيغَـة «فعيلـة» للمُبَالَغَـة**)، (**بصـيرة**): بریتیـە لـە دەرککردنـی عەقـڵ، یاخـود پەیپێـبردنی عەقـڵ بـۆ کاروبـارەکان، وەک چییـەت و ڕاسـتیی خۆیـان، بۆیـەش چوێـنراوە بـە دیتنـی چـاوەوە، بـەڵام دوایـی لێـک جیاکراونـەوە، بـەوە کـە (**بصـیرة**) لەسـەر کێشی (**فعیلـة**) یـە بـۆ زێدەڕۆیـی، واتـە: زۆرچـاک دیـتن، دیتنـی عەقـڵ، دیتنـی دڵ و دەروون، بـۆ ڕاسـتییە مەعنەوییـەکان.

مەسەلەی سێیەم:

**بێبڕوایانی خراپەکارو بڕوادارانی چاکەکار، ژیان و مردنیان یەکسان نیەو، کەسێک پێی وابێ وەک یەکن، بۆچوونێکی یەکجار هەڵە و لاری هەیە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ أَمْ حَسِبَ ٱلَّذِينَ ٱجْتَرَحُوا۟ ٱلسَّيِّـَٔاتِ أَن نَّجْعَلَهُمْ كَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ سَوَآءً مَّحْيَاهُمْ وَمَمَاتُهُمْ ۚ سَآءَ مَا يَحْكُمُونَ ﴿٢١﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە بە پێزە، لە چوار بڕگەدا:

لەبەر ئەوەی لە ئایەتەکانی پێشێ دا، باسی کەسانێک کرا کە بڕوادارو کردار چاکن، هەروەها باسی کەسانێکیش کرا، کە بێبڕواو کردار خراپن، ئنجا خوا ﷻ باسی نایەکسان بوونی سەرەنجامیان دەکات:

١)- ﴿ أَمْ حَسِبَ ٱلَّذِينَ ٱجْتَرَحُوا۟ ٱلسَّيِّـَٔاتِ ﴾، یان ئایا ئەوانەی خراپەکانیان ئەنجام داون پێیان وایەو وا خەیاڵ دەکەن:

٢)- ﴿ أَن نَّجْعَلَهُمْ كَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ ﴾، وەک ئەوانەیان دابنێین کە بڕوایان هێناوە و، کردەوە باشەکان ئەنجام دەدەن؟

٣)- ﴿ سَوَآءً مَّحْيَاهُمْ وَمَمَاتُهُمْ ﴾، یەکسان بێ ژیان و مردنیشیان؟

٤)- ﴿ سَآءَ مَا يَحْكُمُونَ ﴾، ئەوە خراپترین حوکمەو، خراپترین دادوەرییە دەیکەن، وشەی: ﴿ أَمْ ﴾، کە دەفەرموێ: ﴿ أَمْ حَسِبَ ٱلَّذِينَ ٱجْتَرَحُوا۟ ٱلسَّيِّـَٔاتِ ﴾، دەڵێ: (أَمْ: **لِلإِضْرابِ الإِنْتِقالِي**)، (أم): بۆ گواستنەوەیە، واتە: وەک ئەوان دەڵێن وانیە، ئایا ئەوانەی خراپەکانیان ئەنجام داون، وا دەزانن و وا گومان دەبەن، ئێمە وەک ئەوانەیان دابنێین، کە بڕوایان هێناوە، بە هەموو ئەو شتانەی پێویستە بڕوایان پێبهێنرێ و، چاکەکانیشیان ئەنجامداون، ئایا پێیان وایە وەک یەکیان دابنێین؟ ﴿ سَوَآءً مَّحْيَاهُمْ وَمَمَاتُهُمْ ﴾، (سَوَآءً)، خوێندراویشەتەوە: (سَوَاءٌ)، یانی: کە ژیانیشیان و مردنیشیان، یەکسان بێ؟ یاخود: ئایا

وەک چۆن لە ژیان دا یەکسان بوون و، وەک یەک ژیاون، مردنیشیان یەکسان دەبێ و وەک یەکیش دەمرن و، دوای مردنیش وەک یەک دەبن؟ یان: ئایا ژیانیشیان لەگەڵ بڕواداران دا یەکسانەو، مردنیشیان یەکسانە؟! بە دڵنیایی نەخێر! ژیانی ئیمانداران ژیانێکی بەرچاو ڕوونانەیە، ژیانێکی مرۆڤانەیە، ژیانێکی پاک و ڕاست و چاکە، مردنەکەشیان هەر جیایە، بابای بڕوادار، هەر حاڵەتی مردنەکەی جیایە، موژدەی بەهەشتی پێ دەدرێ، پاشان لە دوای مردنیش، لەوێ تەواو لێک جیادەبنەوە، کە لە دنیادا تەواو تێکەڵن، بەڵام لە دوای مردنەوە، ئنجا هەر کەسە دەچێت بۆ مەنزڵگای خۆی، هەر لە قۆناغی بەرزەخیشدا، چ جای لە قیامەتیشدا، کەواتە: وەک یەک نین، بۆیە دەفەرموێ: ﴿سَآءَ مَا يَحْكُمُونَ﴾، ئەوە خراپترین حوکمە کە دەیدەن، خراپترین دادوەرییە کە دەیکەن.

دیـارە هەندێـک لـە تەفسـیرەکان دەڵێـن: موشریـک و هاوبـەش بـۆ خـوا دانـەرەکان بـە مسـوڵمانانیان دەگـوت: ئێمـە وەک چـۆن لـە دنیـادا بارودۆخـمان لـە ئێـوە باشـترەو، ژیـان و گوزەرانمـان لـە ئێـوە خۆشـترە، لـە دوای مردنێـش هـەر ئێمـە لـە ئێـوە چاکـتر دەبیـن! هەڵبەتـە مسـوڵمانی واش هەیـە، مسـوڵمانی گێلۆکـە، یـان ئیـمان دانەمـەزراو، مسـوڵمانی دڵ پـڕ لـە گومـان، بیسـتوومە دەڵێـن: ئـەو کافرانـە وەک چـۆن لـە دنیـادا ژیانیـان خۆشـترە، لـە قیامەتێـش هـەروا دەبـن! لـە ڕاسـتییدا ئـەوە نەزانییـەو، ئەگـەر بـە قووڵـی تەماشـا بکـرێ و بـە پـۆزش بـە نەزانیـی **(العـذر بالجهـل)** پاسـاوی بـۆ نەهێنرێتـەوە، ئـەوە کوفـرە!

لێـرەدا خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ئـەوە خراپتریـن دادوەرییـە کـە دەیکـەن، کـە پێیـان وابـێ ئەوانـەی بێبـڕوان و خراپەکانیـان کـردوون، وەک بـڕوادارانی کـردار چاکـن!! کـە مەبەسـت پێیـان هاوبـەش بـۆ خـوا دانـەران و کافرەکانـە، چونکـە بابـای بێبـڕوا، ڕێـی لـە بەردەمـدا، ئاچووغـە، هـەر خراپەیـەک دەکات، بـە پێچەوانـەی بـڕوادارەوە، کـە پابەنـدەو چوارچێـوەی بـۆ دانـراوە، ئـەوە حەڵاڵـە و ئـەوە حەڕامـە، ئـەوە چاکـەو ئـەوە خراپـە، بـەڵام بابـای بێبـڕوا کـە بـڕوای نیـە، حەواڵـەی غەریـزەو ئـارەزووەکانی خـۆی کـراوە، چـی پێخۆشـە دەیـکات.

## برا و خوشکانی بەڕێـــز!

گومانی تێدا نیە کە ژیانی ئیماندارانە، ژیان لە سایەی ئیماندا، وەک من لەو بارەوە نامیلکەیەکم هەیە (ژیان لە سایەی ئیمان داو، ڕەواندنەوەی گومانەکان)، ژیان لە سایەی ئیماندا، ژیانێکی پاک و چاک و بەرچاو ڕوونانەیەو، ژیانێکی پڕ لە دڵنیایی و هێمنیی و ئاساییش و ئۆخژنە، دەزانی لە کوێوە هاتووی؟ دەزانی بۆچی هاتووی؟ دەزانی کێ هێناوی؟ دەزانی بۆ کوێ دەچی؟ دەزانی دەبێ چۆن بژی؟ دیسان خودی پرۆسەی مردن و گیانکێشران و جیابوونەوەی ڕووح لە جەستەش، بۆ بابای بڕوادار جیایە لە بابای بێبڕوا، ئنجا دوای مردنیش بێگومان ئەو کاتە، جیاوازییە گەورە و سەرەکییەکە دەردەکەوێ.

خوا بە لوتف و کەرەمی خۆی ئێمە بە خاوەن ئیمانی ڕاستەقینە بگێڕێ، تاکو ژیانێکی ئیماندارانە بگوزەرێنین و، مردنێکی ئیماندارانە بمرین و، زیندووبوونەوەکی ئیماندارانەش زیندووببینەوە.

### مەسەلەی چوارەم:

**خوای کاربەجێ گەردوونی بە هەق و حیکمەت خوڵقاندووەو، بۆ ئەوەش کە سزاو پاداشتنی هەر کەس بە پێی کردەوەکەی بداتەوە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ وَخَلَقَ ٱللَّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِٱلْحَقِّ وَلِتُجْزَىٰ كُلُّ نَفْسٍۭ بِمَا كَسَبَتْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿٢٢﴾ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتە موبارەکە، لە سێ برگەدا:

١)- ﴿ وَخَلَقَ ٱللَّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِٱلْحَقِّ ﴾، خوا ئاسمانەکان و زەوی بە هەق هێناونە دی، (و) بۆ بادانەوەو گێڕانەوەیە، ئەم مەبەستە کە لێرە باس دەکرێ، دەیگێڕێتەوە بۆ سەر مەبەستەکانی پێشێ، واتە: هەروەها وەک چۆن خوا ﷻ ئەوانەی پێشێی فەرموون، یان کردوون، ئاسمانەکان و زەویشی بە هەق هێناونە دی، کە دەفەرموێ: (بِالْحَقِّ)، واتە: بە هۆکاری هەق، واتە: کە ئاسمانەکان و زەوی هێناونە دی، ئاوێتە بوون لەگەڵ هەق دا، لەگەڵ حیکمەت و ڕاستیی دا، وشەی (**حق**)یش: (**اسْمٌ جَامِعٌ لِـما شَأْنُهُ أَنْ يَحِقَّ وَيَثْبُتَ**)، (**حق**) ناوێکی کۆکەرەوەیە بۆ هەر شتێک کە بچەسپێ و بێتە دی.

بەپێی سیاق مانای وشەی (**حـق**) دەگۆڕێ، جاری وایە بە مانای حیکمەت دێ، جاری وایە بە مانای هێنانەدی ئامانجێک دێ، جاری وایە بە مانای ڕاستیی دێ، جاری وایە بە مانای چەسپاندنی شتێک دێ،

خوا ﷻ لێرەدا هەواڵمان پێدەدا کە ئاسمانەکان و زەوی، واتە: دروست کراوەکانی خوا بە سەرو خوارەوە، زەوی بۆ ئێمە خوارەوەی دروستکراوەکانەو، ئاسمانیش سەرەوەیانە، کە لەم ڕۆژگارەدا، زاراوی گەردوون، یان بوونەوەر بە عەرەبیی (**کون**)، یان (گێتی) بە فارسیی، بەکاردەهێنرێ، بەڵام لە ڕاستییدا وشەی گەردوون، بوونەوەر (**کون**)، تەنیا جێی ئەوەی تێدا دەبێتەوە کە تاکو ئێستا بە تەلسکۆپەکان مرۆڤ

توانیەتی دەرکی بکات، کە بە مەزەندەی زانایانی گەردووناس، ئەم دروستکراوانەی خوا بەسەرو خواریانەوە، ئەوەی تاکو ئێستا مرۆڤ پەی پێبردوە، دەڵێن: گەردوون تیرەکەی سێزدە ملیارو حەوتسەد، یاخود هەشتسەد ملیۆن (١٣,٧٠٠,٠٠٠,٠٠٠) ساڵی تیشکییە، تیشک کە لە چرکەیەکدا (٣٠٠,٠٠٠) کیلۆمەتر دەبڕێ، دەبێ سێزدە ملیارو حەوتسەد، یاخود هەشتسەد ملیۆن ساڵ بڕوا، ئنجا ئەمسەرو ئەوسەری گەردوون دەکات، شایانی باسە: ئێمە لە تەفسیری سوورەتی **(فصلت)**دا، لە بارەی دروستبوونی گەردوونەوە، باسێکمان کردوە، هەروەها لە سوورەتی **(یونس)**یشدا، باسێکمان کردوەو، لە تەفسیری سوورەتی (الرحمن)یش دا بە هەمان شێوەو، لە مەوسووعەی: (ئیمان و ئیلحاد)دا، درێژتر باسی گەردوونمان کردوە.

ئنجا بەپێی ئایەتەکانی خواش هەرچی ئەستێرەیەو کەهکەشانەو دەبینرێ، هەمووی لە سنووری ئاسمانی نزیکتر لە ئێمەدان، چونکە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰٓ إِلَى ٱلسَّمَآءِ وَهِىَ دُخَانٌ فَقَالَ لَهَا وَلِلْأَرْضِ ٱئْتِيَا طَوْعًا أَوْ كَرْهًا قَالَتَآ أَتَيْنَا طَآئِعِينَ ﴿١١﴾ فَقَضَىٰهُنَّ سَبْعَ سَمَٰوَاتٍ فِى يَوْمَيْنِ وَأَوْحَىٰ فِى كُلِّ سَمَآءٍ أَمْرَهَا وَزَيَّنَّا ٱلسَّمَآءَ ٱلدُّنْيَا بِمَصَٰبِيحَ وَحِفْظًا ذَٰلِكَ تَقْدِيرُ ٱلْعَزِيزِ ٱلْعَلِيمِ ﴿١٢﴾ ﴾فصلت.

ئەوەی جێی مەبەستمە، ئەوەیە: ﴿ وَزَيَّنَّا ٱلسَّمَآءَ ٱلدُّنْيَا ﴾، **(الدُّنيَا: مُؤَنَّث الأَدْنَى)**، یانی: **(المخلوق الأَقْرَب)**، ئەو دروستکراوەی لێتانەوە نیزیکترە، بەڵام دیارە (ٱلسَّمَآءَ)، **(مُؤَنَّث)**ەو دەبێ ئەو وشەیەش کە لەگەڵی بەکاردەهێنرێ هەروابێ، (ٱلسَّمَآءَ ٱلدُّنْيَا)، یانی: ئاسمانی نیزیکتر لە ئێوە، **(الشَّيء الأَقْرَب)**، ئەوەی لە ئێوە نیزیکترە، ئەوە رازێنراوەتەوە بە چرایان، کەواتە: چرایەکان مەبەست پێی ئەستێرەو خرۆکەکانن ئەوانەی کە ئێمە دەیانبینین، ئنجا هەرچی ئەستێرەیەو هەرچی کەهکەشانەو هەرچی گەلەکەهکەشانە هەمووی، وشەی **(مصابیح)** دەیگرێتەوە.

کەواتە: هەمووی لە سنووری ئاسمانی نزیکتر لە ئێمەدایە، ئاسمانی یەکەم، ئاسمانی بنەوە، ئنجا لەسەرویەوە شەش ئاسمانی دیکە هەن و، لەسەر ئەویشەوە **(سِدْرَةُ المُنْتَهَى)** هەیەو، لەسەرووی ئەویشەوە عەرشی خوا ﷻ هەیە، کەواتە:

ئەوەی تا ئێستا بەشەر پەی پێ بردوە، تیرەکەی ئەوەندەیە بە مەزەندە، ئەو حیسابانەش مەرج نیە، ڕێک و کت و مت وابن، بەڵام ئەوەی تاکو ئێستا بەشەر پەی پێبردوە، هەمووی لە سنووری ئاسمانی یەکەم دایە، ئەو سنوورەش لە کوێ کۆتایی پێ دێ؟ تاکو ئێستا زانست لەو بارەوە قسەی نەکردوەو، گەردووناسان لەوبارەوە نەیانگوتوە: لەوێ سنوورێک هەیەو کۆتایی پێ دێ و تەواو دەبێ.

ئنجا ئێمە لەبەر ئەوەی لەو سەرچاوانەو، شوێنانەدا کە ئاماژەمان پێدان، لەو بارەوە بە درێژیی قسەمان کردوە، بە تایبەت، لە مەوسووعەی: (**ئیمان و ئیلحاد**)دا، بۆیە لێرە بەوەندە باسکردنە لێی دەگەڕێین.

خوا دەفەرموێ: خوا ئاسمانەکان و زەوی بە هەق دروستکردوون، واتە: بە حیکمەت، یاخود بۆ چەسپاندنی هەق.

٢)- ﴿وَلِتُجْزَىٰ كُلُّ نَفْسٍ بِمَا كَسَبَتْ﴾، هەروەها بۆ ئەوەی هەر کەسە بەپێی ئەوەی وەدەستی هێناوە، سزا و پاداشت بدرێتەوە، ئەمە لێرەدا: (**تَفْصِيل بَعْدَ إِجْمَال**)، درێژەپێدانە دوای ئەوەی بە کورتیی باسی کردوە، سەرەتا دەفەرموێ: خوا ئاسمانەکان و زەوی بە هەق دروستکردوون، دوایی تەفصیلی پێدەدات و ڕوونی دەکاتەوە، ئەو هەقە چییە؟ ئەوەیە کە هەر کەسە بەپێی ئەوەی کردوویەتی، سزا و پاداشت بدرێتەوە، پیشتریش باسمکرد: (**جْزَاء**) لە زمانی عەرەبییدا، هەم پاداشت (**ثَوَاب**)، هەم سزا (**عِقَاب**) دەگرێتەوە، (**الجَزَاءُ: الثَّوَابُ وَالعِقَاب**)، بەڵام لە کوردییدا وشەیەکمان نیە، کە پڕ بە پێستی مانای (**جَزَاء**) بێ، تاکو ئێستا نەمبینیوە! بۆیە هەمیشە دەبێ بڵێین: ﴿وَلِتُجْزَىٰ﴾، یانی: بۆ ئەوەی سزاو پاداشت بدرێتەوە، ئەوەی خراپەی کردوە، سزاو، ئەوەی چاکەی کردوە، پاداشت.

٣)- ﴿وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ﴾، لە حاڵێکدا ئەوان ستەمیان لێناکرێ، بەوە کە لە پاداشتیان کەم بکرێتەوە، یاخود لە سزایان زیاد بکرێ، ئەمەش هەر جەختکردنەوەی ئەو هەقەیە، کە لە سەرەتاوە باسکرا، هەڵبەتە لە شوێنی دیکەش باسمکردوە: بە شێک لەو هەقەی

خوای دادگەر باسیکردوە، ئەوەیە کە مرۆڤ تاقیی بکرێتەوە لەو گەردوونەداو، دوایی سزاو پاداشت ڕووی تێ بکات، بەڵام ئایا ئەم گەردوونە، ئەم دروستکراوانە، بەس بۆ ئەوە دروستکراون، یان زۆر شتی دیکەش هەیە و زۆر ئامانج دیکەش و حیکمەتی دیکەش هەن، کە ئێمە پەییان پێ نابەین؟ ئەوەی بۆ ئێمە زانراوەو، خوای پەروەردگار بۆ ئێمەی باسکردوە ئەوەیەو، ئەم ڕاستییە لە زیاتر لە پازدە (١٥) شوێنی قورئان دا، خوا ﷻ خستوویەتە ڕوو، لەو باسەی لە تەفسیری سوورەتی (**یونس**)دا، کردوومە، هەموو ئەو شوێنانەی کە لە قورئاندا هاتوون، لەو بارەوە هێناومن، کەواتە: هەقێک کە بۆ ئێمە دیارەو گەردوونی بۆ دروستکراوە، ئەوەیە کە مرۆڤ تاقیبکرێتەوەو، لەسەر خراپەکانی سزاو، لەسەر چاکەکانی پاداشت بدرێتەوە، بەڵام ناتوانین بڵێین: حیکمەتی خوا لە دروستکردنی ئەم دروستکراوانەو، ئەم گەردوونەدا، بەس ئەوەیە، بەڵام بە نسبەت ئێمەوە ئەوە یەکێکە یان حیکمەتێکە، خوای پەروەردگار ئەو گەردوونەی بۆ هێناوەتە دی، دەگونجێ بەس ئەو حیکمەتە هەبێ و، دەشگونجێ حیکمەتی دیکەش هەبن، کە ئێمە نایانزانین، یاخود پەیوەندییان بەئێمەوە نیە.

## مەسەلەی پێنجەم:

**باسی شوێن ئارەزووکەوتووانی دنیا پەرست و، بەهرەوەرنەگر لە عەقڵ و هەستەوەرەکانیان و، نکووڵییکەران لە قیامەت و، ڕاگەیاندنی ئەو ڕاستییە کە خوا ژیێنەرو مرێنەرو زیندووکەرەوەو کۆکەرەوەی مرۆڤەکانە لە ڕۆژی دوایی دا:**

خوا دەفەرموێ: ﴿أَفَرَءَيْتَ مَنِ ٱتَّخَذَ إِلَٰهَهُۥ هَوَىٰهُ وَأَضَلَّهُ ٱللَّهُ عَلَىٰ عِلْمٍ وَخَتَمَ عَلَىٰ سَمْعِهِۦ وَقَلْبِهِۦ وَجَعَلَ عَلَىٰ بَصَرِهِۦ غِشَٰوَةً فَمَن يَهْدِيهِ مِنۢ بَعْدِ ٱللَّهِ ۚ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ﴿٢٣﴾ وَقَالُوا۟ مَا هِىَ إِلَّا حَيَاتُنَا ٱلدُّنْيَا نَمُوتُ وَنَحْيَا وَمَا يُهْلِكُنَآ إِلَّا ٱلدَّهْرُ ۚ وَمَا لَهُم بِذَٰلِكَ مِنْ عِلْمٍ ۖ إِنْ هُمْ إِلَّا يَظُنُّونَ ﴿٢٤﴾ وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُنَا بَيِّنَٰتٍ مَّا كَانَ حُجَّتَهُمْ إِلَّآ أَن قَالُوا۟ ٱئْتُوا۟ بِـَٔابَآئِنَآ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٢٥﴾ قُلِ ٱللَّهُ يُحْيِيكُمْ ثُمَّ يُمِيتُكُمْ ثُمَّ يَجْمَعُكُمْ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ لَا رَيْبَ فِيهِ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٢٦﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە پازدە بڕگەدا:

١)- ﴿أَفَرَءَيْتَ مَنِ ٱتَّخَذَ إِلَٰهَهُۥ هَوَىٰهُ﴾، ئایا ئەو کەسەت دیوە (زانیوە) کە ئارەزووی کردۆتە پەرستراوی!.

چۆنیەتیی پەیوەستبوونی ئەم ئایەتانە، بەوانەی پێش خۆیانەوە، ئەوەیە کە ئەوەی لە ڕابردوودا باسکرا، وا لە مرۆڤ دەکات بە دوای (هدى) بکەوێ، بە دوای ڕێنمایی خوا بکەوێ، نەک بە دوای هەواو ئارەزوو بکەوێ، دوای ئەوەی خوا ﷻ باسیکرد، کە ئەم گەردوونە بە هەق خوڵقێنراوە، هەروەها باسیکرد کە ئەوانەی بە دوای ڕێنمایی خواو هیدایەتی خوا دەکەون و، ئەوانەی بە دوای هەواو ئارەزوو دەکەون، وەک یەک نین، ژیان و مردنیان وەک یەک نیە، ئنجا خوای بەرزی مەزن، وردتر باسی ئەوانە دەکات کە بە دوای هەواو ئارەزووی خۆیان دەکەون، دەفەرموێ: ﴿أَفَرَءَيْتَ مَنِ ٱتَّخَذَ إِلَٰهَهُۥ هَوَىٰهُ﴾، ئایا سەرنجی ئەو کەسەت داوە، کە ئارەزووی خۆی کردۆتە پەرستراوی خۆی؟ ئایا دەیزانی؟ ئایا

بینیوتـە؟ ئایـا دەینـاسی؟ هەواڵـم پـێ بـدە، لـە بارەیـەوە، بـە هەمـوو ئـەو واتایانـە: (أَفَرَءَيْتَ) مانـا کـراوە، کـە دەفەرمـوێ: ﴿أَتَّخَذَ إِلَٰهَهُۥ هَوَىٰهُ﴾، زانایـان دوو واتایـان بـۆ لێکداونـەوە:

**یەکەم:** هەواو ئارەزووی خۆی وەک پەرستراوێک لێکردوە، سەرپێچیی هیچ فەرمانێکی ناکات و، هەرچی ئارەزووی پێی بڵێ، وا دەکات.

**دووەم:** پەرستراوێک دەپەرستێ، لەبەر ئەوەی حەز دەکات بیپەرستێ، دەیپەرستێ، نەک لەبەر ئەوەی ڕاست و هەقەو شایستەیە.

ئیبنـو عەبباس و حەسـەنی بەصرایـی و قەتـادە خـوا لێیـان ڕازی بـێ، گوتوویانـە: (**ذَلِـكَ الكَافِـر اتَّخَـذَ دِيْنَـهُ مَـا يَهْـوَاهُ، فَـلاَ يَهْـوَى شَـيْئَاً إِلاَّ رَكِبَـهُ**)، واتـە: ئـەوە بابـای بێبڕوایـە کـە دینەکـەی بریتیـە لـەوەی ئـارەزووی دەکات، ئـارەزووی هیـچ شـتێک نـاکات، مەگـەر ئەنجامـی دەدا، گـوێ ناداتـە حـەڵاڵ و حـەڕام و، چـاک و خـراپ.

عیکریمـە دەڵـێ: (**أَفَرَأَيْـتَ مَـنْ جَعَـلَ إِلَهَـهُ الَّـذِي يَعْبُـدهُ، مَـا يَهْـوَاهُ، أَو يَسْتَحْسِـنَهُ، فَإِذَا اسْتَحْسَـنَ شَـيْئاً وَيَهْوِيَـهُ، اتَّخَـذَهُ إِلَهَـاً**)، ئایـا ئـەو کەسـەت بینیـوە: پەرسـتراوەکەی کـە دەیپەرسـتێ، بریتیـە لـەوەی ئـارەزووی دەکات، یاخـود پێـی چاکـە، ئنجـا هـەر کاتێـک شـتێکی پـێ چـاک بـوو و ئـارەزووی کـرد، دەیکاتـە پەرسـتراوی خـۆی.

ئەمە وەک شاعیرێکی عەرەب دەڵێ:

وَمَنْ أَبَاحَ النَّفْسَ مَا تَهْوَاهُ　　فَـإِنَّمَـا إِلَـهُـــــهُ هَـــوَاهُ

واتــە: هــەر کەسـێک نەفـسی چــی ئـارەزووی کــرد، بــۆی ڕەوا بــکات، ئــەوە ئــارەزووی خــۆی کردووەتــە پەرســتراوی خــۆی.

٢)- ﴿وَأَضَلَّهُ ٱللَّهُ عَلَىٰ عِلْمٍ﴾، خواش بە زانیارییەوە گومڕای کردوە، ئەمیش دوو واتایان بۆ لێکداونەوە کە زیاتر بە دڵەوە بنووسێن، ئەگەرنا زانایان زۆریان قسە لێ کردوە:

**یەکەم:** خوا ئەو کەسەی گومڕاو سەرگەردان کردوە، هەرچەندە ئەو کەسە ڕێنمایی و گومڕاییش دەزانێ، بەڵام ئەو زانیارییە سوودی پێنەگەیاندوەو، خوا گومڕای کردوە.

**دووەم:** خوا گومڕای کردوەو، پێی زانایە کە شایستەی ئەوەیە، بە هۆی ئەوەوە کە بۆ خۆی گومڕایی دەوێ.

کەواتە: ﴿عَلَىٰ عِلْمٍ﴾، یان: پەیوەستە بە بکەر (**فاعل**)ەوە، کە پەروەردگارە، خوا گومڕای کردوەو، دەشزانێ کە شایستەیە گومڕا بکرێ.

یاخود (عَلَىٰ عِلْمٍ)، پەیوەستە بە بەرکار (**مفعول به**)ەکەوەو بۆ ڕاناوی (هـ)یەکە دەچێتەوە کە لەسەر ﴿وَأَضَلَّهُ﴾یە، واتە: خوا گومڕای کردوە لە حاڵێکدا کە ئەو کەسە زانیاریشی هەبوو، بەرچاو ڕوونیش بوو، هەق و ناهەقی لێک جیا دەکردنەوە، بەڵام بەرژەوەندیی لە شوێنکەوتنی هەق دانەبوو، لە شوێنکەوتنی ناهەقدا هەبوو، ئەوەش گەورەترین گرفت و کێشەی بەشەرە، کە ناتوانێ هەمیشە توانینەکەی بەپێی زانینەکەی بێ، ناتوانێ حاڵیبوونەکە لە خۆیدا بکاتە حاڵ، بابایەکی جگەرەکێش، بابایەکی شەڕاب خۆرەوە، بابایەکی نێرگەلەکێش و تلیاک کێش، دەزانێ ئەو شتانە زیانیان هەیە، هەر کامێکیان بە ئەندازەی خۆی، بەڵام دەستی بۆ لێی هەڵناگیرێ، واتە: زانیاریی پێی هەیە، بەڵام دەستی پێ لێ هەڵناگیرێ، چونکە هێزێکی دیکەی هەیە، کە هێزی دڵ و ئارەزوو و ویستنیەتی، زاڵبووە بەسەر هێزی عەقڵ و هۆش و زانینیدا، مرۆڤ کۆمپیوتەر نیە، هەر شتێکی زانی بیشیتوانێ! مرۆڤ ئامێر نیە، مرۆڤ کائینێکی زۆر ئاڵۆزە، دەزانێ هەق لەوێیە، کەچی شوێنی ناکەوێ، وەک خوا ﷻ لە بارەی فیرعەون و دارو دەستەکەیەوە دەفەرموێ، کاتێک مووسا هات بۆ لایان: ﴿وَجَحَدُوا۟ بِهَا وَٱسْتَيْقَنَتْهَآ أَنفُسُهُمْ ظُلْمًا وَعُلُوًّا ۚ فَٱنظُرْ كَيْفَ كَانَ عَـٰقِبَةُ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿١٤﴾﴾، نکووڵییان لێکردن (لە نیشانەکانی مووسا)، لە دەروونیشیان دا لێیان دڵنیابوون (کە ڕاستن)، بۆچی؟ ﴿ظُلْمًا وَعُلُوًّا﴾، چاویان لە ستەم و خۆسەپاندن و خۆ بەرزکردنەوە بوو، ﴿فَٱنظُرْ كَيْفَ كَانَ عَـٰقِبَةُ ٱلْمُفْسِدِينَ﴾، سەرنج بدە! سەرەنجامی تێکدەران چۆن بووا!

هەروەها ئەبوو جەهل و وەلیدی کوڕی موغیرەو نەزری کوڕی حاریس و ئوممەیەی کوڕی خەلەف و ئەو زلە زلانەی قوڕەیش، دەیانزانی موحەممەد ﷺ پێغەمبەری خوایەو ڕاستە، کەسێک تاکو تەمەنی گەیشتۆتە چل (٤٠) ساڵیی درۆی لەگەڵ مرۆڤاندا نەکرد بێ، ئایا ئێستا لە دوای چلەوە، دوای ئەوەی لاجانگی[1] سپیی بوون بە ناوی خواوە درۆ دەکات؟! حاشای ئەو، بەڵام بۆچی شوێنی نەکەوتوون؟ کاتی دیکەو لە بۆنەی دیکەدا باسمان کردوە، لە تەفسیری ئایەتی دیکەدا، لەبەر ئەوەی گوتوویانە عەشیرەتی ئێمە لەگەڵ عەشیرەتی موحەممەددا ﷺ هەر پێشبڕکەیان بووە، وەک دوو ئەسپی پێشبڕکەکار (**كفرسي الرِّهان**) ئەوان شتێکیان کردوە، ئێمەش شتێکمان کردوە، ئێستا ئەوان دەڵێن: ئێمە پێغەمبەرێکمان لە نێودا هاتوە، ئایا ئێمە پێغەمبەرێک لە کوێ بێنین؟ دەبێ بە دوای هۆزی ئەوان بکەوین!! ئەوان خستوویانەتە ئەو قاڵبەوە، فیرعەونیش بۆیە بە دوای مووسا نەدەکەوت، چونکە بەپێی پەیامەکەی مووسا، فیرعەون کە دەیگوت: (من پەروەردگاری هەرە بەرزتانم)، (بێجگە لە خۆم پەرستراوێکی دیکەم بۆ ئێوە پێ شک نایەت)، دەبووایە واز لەو قسەو لافلێدانانە بهێنێ و، ئەو کاتەش فیرعەون و **قیبطییە**کان لەگەڵ بەنوو ئیسرائیلییەکی چەوسێنراوەدا، کە سۆغرەو بێگاری پێدەکراو، خاوەن هیچ شتێکی خۆی نەبوو، یەکسان دەبوونەوەو، فیرعەون بواری فیرعەونایەتیی نەدەما، بۆیە ئامادە نەبوو مل بدات بۆ پەیامەکەی مووسا، ئێستاش هەروایەو، ئێستاش لە پانایی و درێژایی جیهانی ئیسلامیی دا، ئەو هەموو حوکمڕانە بوودەڵەو بووکەڵە کارتۆنییانەی دروستکراون و، ئەو هەموو داشی دامانەی دانراون و بەسەر مسوڵماناندا فەرز کراون، ئەو حوکمڕانە گوێ لەمستانە بۆ ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا، گوێ لەمستانە بۆ زایۆنیستانی جوولەکەو ئەمەریکا، بۆ زلهێزان، بۆچی دانوویان لەگەڵ تەوژمی ئیسلامییدا ناکوڵێ؟ بۆچی دانوویان لەگەڵ کەسانێکدا ناکوڵێ کە دەڵێن: دەبێت

---

(١) هەر مرۆڤێك دوو لاجانیگی هەن، کە بریتین لەو مووانەی کۆتایی سەر کە بەملاولای ڕوومەتەکان دا دێنە خوارو خەنافیسەکان درێژ بوونەوەیانن.

شـەریعەتی خـوا، سـایەو سـێبەری ئـەو خەڵکـە مسـوڵمانە بـێ؟ لەبـەر ئـەوەی ئەگـەر شـەریعەت حاکـم بـێ، ئـەوان ئـەو بـەزم و بازاڕەیـان لـێ تێکدەچـێ، وەک چـۆن جوولەکـەکانی مەدینـە دەیانـزانی کـە موحەممـەد ﷺ پێغەمبـەری خوایـەو، لـە کتێبـەکانی ئەوانـدا مـوژدەی هاتنـی موحەممـەد ﷺ هەبـوو، وەک خـوا دەفەرمـوێ: ﴿يَعْرِفُونَهُۥ كَمَا يَعْرِفُونَ أَبْنَآءَهُمْ﴾البقرة، وەک چـۆن کـوڕەکانی خۆیـان دەناسـیی، ئـاوا موحەممەدیـان دەناسـیی، بـە ناوونیشـانەکانی، کـە ئێسـتاش لـە کتێبەکانیانـدا مـاون، دوای ئـەو هەمـوو دەسـتکاریی و گۆڕانکارییـەش، بـەڵام بۆچـی شـوێنی نەدەکەوتـن؟ چونکـە ئـەو بـەزم و بـازاڕەی پێکیـان وەنابـوو لـە سـایەی دیندارییەکـی گـۆڕراوو سـاختەدا، ئەوەیـان لـێ تێکدەچـوو، ئنجـا ئێسـتاش هەروایـە، عەلمانییـەکان، ڕژێمـە تاغووتییـەکان، حوکمڕانـە خۆسـەپێنەکان، کـە ئیددیعـای مسـوڵمانەتییش دەکـەن، ئەگـەر شـەریعەتی خـوا حاکـم بـێ:

١- جارێ پێش هەموو شتێک شەریعەت دەڵێ: دەبێ شێوەی حوکمڕانیی و شێوەی دانانی بەرپرسان: ﴿وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ﴾الشورى، بە ڕاوێژ بێ، ڕاوێژێکی ڕاستەقینە، نەک هەڵبژاردنی ساختەو پڕ تەزویرو درۆو دەلەسەو، فێڵ لە خەڵککردن و خەڵک چەواشەکردن و، خەڵک ترساندن.

٢- دواییش شەریعەت دەڵێ: دەبێ دادگەرانە حوکمڕانیی بکرێ و، حوکم بە شەریعەت بکرێ، ئەوەی شەریعەت بە حەڵاڵی داناوە، بە حەڵاڵ دابنرێ و، ئەوەی قەدەغەی کردوە، دەبێ بە قەدەغە دابنرێ، ئنجا کە ئاوا بکرێ، ئەوان ئەو بەزم و بازاڕە ناشەرعییەی پێکیانەوە ناوە، لە سایەی حوکمی دیکتاتۆریی و میراتیی دا، لە سایەی سیکۆلاریزم و، لیبڕالیزیم و، سۆسیالیزم و کاپیتالیزم دا، لێیان تێکدەچێ.

کەواتە: ﴿وَأَضَلَّهُ ٱللَّهُ عَلَىٰ عِلْمٍ﴾، یانی:

أ- خوا بەزانیارییەوە گومڕای کردوە، واتە: لەگەڵ ئەوەشدا زانیاریی هەیە، بەڵام شوێنی ناکەوێ.

ب- یاخود: خوا گومڕای کردوە، لەبەر ئەوەی دەزانێ شایستەی گومڕاییە، بۆچی شایستەیە؟ چونکە هەق دەزانێ، دەبینێ، دەیبستێ، بەڵام شوێنی ناکەوێ، ئنجا کە شوێنی ناکەوێ، مانای وایە بە پێی سیستمێک کە خوا دایناوە لە ژیانی مرۆڤ دا، شایستەی ئەوەیە گومڕا بێ و سەرگەردان و سەر لێشێواو بێ.

٣)- ﴿ وَخَتَمَ عَلَىٰ سَمْعِهِۦ وَقَلْبِهِۦ ﴾، خوا مۆری بەسەر بیستنی و بەسەر دڵیەوە ناوە.

٤)- ﴿ وَجَعَلَ عَلَىٰ بَصَرِهِۦ غِشَٰوَةً ﴾، هەروەها پۆششێکی لەسەر دیتنی داناوە، (غِشَٰوَةً)، خوێنراویشەتەوە: (غَشَاوَة)، هەردووکیان بە مانای پەردەو پۆشش دێن، پۆششێکی لەسەرچاوی داناوە.

شایانی باسە: لە سوورەتی (البقرة)دا خوا دەفەرموێ: ﴿ خَتَمَ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ وَعَلَىٰ سَمْعِهِمْ ۖ وَعَلَىٰٓ أَبْصَٰرِهِمْ غِشَٰوَةٌ ﴾، بەڵام لێرەدا دەفەرموێ: ﴿ وَخَتَمَ عَلَىٰ سَمْعِهِۦ وَقَلْبِهِۦ وَجَعَلَ عَلَىٰ بَصَرِهِۦ غِشَٰوَةً ﴾، بۆچی؟ چونکە ڕەوتەکە لێرە قسەکردنە لە بارەی کۆمەڵێکەوە، کە دڵی خۆیان چەسپاندوەو، بڕیاریانداوە هەر بە دوای گومڕای بکەون، گوێ بۆ هەق هەڵناخەن و گوێ ناگرن، بە بەڵگەی ئەوە کە خوا پێشتر ئاوا پێناسەی کردوون، دەفەرموێ: ﴿ أَفَرَءَيْتَ مَنِ ٱتَّخَذَ إِلَٰهَهُۥ هَوَىٰهُ وَأَضَلَّهُ ٱللَّهُ عَلَىٰ عِلْمٍ ﴾، بۆیە لێرەدا (سَمْع)ی پێشخستوە، واتە: گوێناگرن و گوێ هەڵناگرن و لەسەر کوفر عەزمیان جەزم کردوەو، قەناعەتی پێش بیرکردنەوەیان هەیە، قەناعەتهێنانی پێش گوێگرتنیان هەیە، ئنجا قەناعەتەکەیان و عەزم جەزم کردنەکەیان، لەسەر شوێنکەوتنی گومڕایی وای لێکردوون، کە هەر گوێ هەڵنەخەن، بۆیە دەفەرموێ: ﴿ وَخَتَمَ عَلَىٰ سَمْعِهِۦ وَقَلْبِهِۦ وَجَعَلَ عَلَىٰ بَصَرِهِۦ غِشَٰوَةً ﴾، بەڵام لە سوورەتی (البقرة)دا دەفەرموێ: ﴿ خَتَمَ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ وَعَلَىٰ سَمْعِهِمْ ﴾، لەوێ (البقرة) باسی کۆمەڵێکە لە بێبڕوایان و باسی حاڵەتی ڕۆچوونی کوفر دەکات، تێیاندا، ئنجا پێش هەموو شتێ کوفر عەقڵ و دڵی مرۆڤ دادەگرێ، ئنجا دوایی بیستنی، دوایی چاوی، لەوێ باسی حاڵەتی لە نێو کوفردا بوونیان دەکات، بۆیە پێشێ باسی مۆرکرانی دڵیانی کردوە، ئنجا هی بیستنیان، دوایی پەردە بەسەر چاوهەڵکشانیان، بەڵام

لێرەدا لە بارەی کۆمەڵێکەوەیە، کە شوێنکەوتووی ئارەزووی خۆیانن و، ئارەزووی خۆیان کردۆتە پەرستراوی خۆیان، کەواتە: بڕیاریان داوە گوێ هەڵنەخەن.

﴿وَجَعَلَ عَلَىٰ بَصَرِهِۦ غِشَٰوَةً﴾، خوێندراوەتەوەش: (غَشَاوَة)، یانی: پەردەی بەسەرچاویان هەڵکێشاوە، هەڵبەتە لێرەدا مەبەست پێی ئەوە نیە خوا مۆرێکی هێنابێ و لەسەر دڵیان بدات و، لەسەر بیستنیان بدات و، پەردەیەک بێنێ بەسەر چاویان هەڵکێشێ، بەڵکو هەموو ئەو تەعبیرانە مەجازیین، واتە: ئەوانە لە ئەنجامی ڕووکردنە بێبڕوایی و خراپەکاریی و شوێنکەوتنی ئارەزووی خۆیاندا، کارێکیان بەسەر خۆیان هێناوە، دڵیان وەک چۆن نامەیەک کە بویسترێ کۆتایی پێ بهێنرێ، لە خوارێ مۆر دەکرێ، یان جاری وایە مۆرێکیان لەسەر زەرفەکەشی داوە، تاکو نەکرێتەوە، ئەوانەش ئاوایان لە خۆیان کردوە، نەک خوای دادگەر ئاوای لێکردبن، بەڵام بۆچی خوا پاڵیداوەتە لای خۆی؟ لە سۆنگەی ئەوەوە کە بەپێی سیستمێک ئەو گۆڕانکاریی و حاڵەتەیان بەسەردا هاتوە، کە خوا دایناوە، لەو ڕووەوە خوا پاڵیدەداتە لای خۆی ﷻ، ئەگەرنا بە دڵنیاییەوە، خوا ڕقی لە مرۆڤەکان هەڵناستێ، دڵیان دابخات و گوێیان بگرێ و، چاویان پەردەی بەسەر هەڵکێشێ، تاکو هەق نەبینن و، هەق نەبیستن و، هەق دەرک نەکەن، بەڵام خوای کاربەجێ ئەو شتانە پاڵدەداتە لای خۆی، لەبەر ئەوەی بەپێی سیستمێک کە خوا دایناوە، ئەو حاڵەتانە ڕوویانداوە.

٥)- ﴿فَمَن يَهْدِيهِ مِنۢ بَعْدِ ٱللَّهِ﴾، ئنجا ئایا کێ ڕاستە ڕێی دەکات لە دوای خوا؟ لێرەدا (يَهْدِيهِ) بە مانای ڕێنماییکردن نیە، چونکە ڕێنماییەکەی هەر کردوون، بەڵکو بە مانای ڕاستە ڕێکردن و بە ئامانج گەیاندنە، پرسیارکردنەکەش لێرەدا: (فَمَن يَهْدِيهِ: **الإستفهام للإنكار**)، پرسیارکردنی نکووڵیلێکەرانەیە، چونکە بە دڵنیایی جگە لە خوا هیچکەس ناتوانێ ئەوانە بە ئامانج بگەیەنێ و ڕاستە ڕێیان بکات.

٦)- ﴿أَفَلَا تَذَكَّرُونَ﴾، ئایا بیرناکەنەوە؟ خوێنراویشتەوە: (**أَفَلاَ تَذَّكَّرون**)، یانی: (**تَتَذَكَّرُون**)، کە هەر یەک واتایان هەیە، ئایا پەند وەرناگرن، ئایا بیر ناکەنەوە، ئایا وەبیریان نایەتەوە؟

ئنجا دێتە سەر باسی قسەیەکی دیکەیان:

٧)- ﴿ وَقَالُوا مَا هِيَ إِلَّا حَيَاتُنَا الدُّنْيَا ﴾، هەروەها گوتیان: هیچ لە ئارادا نیە، جگە لە ژیانی دنیامان، لە سوورەتی (الأنعام)دا دەفەرموێ: ﴿وَقَالُوا إِنْ هِيَ إِلَّا حَيَاتُنَا الدُّنْيَا وَمَا نَحْنُ بِمَبْعُوثِينَ ﴿٢٩﴾ ﴾، واتە: ژیان تەنیا ژیانی دنیامانەو، ئێمە لە زیندوو کراوان، نابین، بەڵام لێرە دەفەرموێ: ﴿مَا هِيَ إِلَّا حَيَاتُنَا الدُّنْيَا ﴾، (**إن هي**)، (**إن النافية: ما هي**)، (**إنْ**)ی لابەرە (**نافية**) و (**ما**)ی لابەرە، یەک واتایان هەیە.

(**هـي**) هـەم لـە ئایەتەکـەی سـوورەتی (**الأنعـام**)داو، هـەم لێـرەدا: (**ضَمِـيرِ القِصَّـةِ وَالشَّأْنِ أَي: قِصَّـةُ الخَـوْضِ فِي البَعْـثِ تَنْحَـصِرُ أَن لاَ حَيَـاةَ بَعْـدَ المَـمَاتِ**)، واتـە: بەسـەرهاتی باسـکردنی زیندووبوونـەوە، لـەوەدا خوڵاسـە دەبێتـەوە، کـە لـە دوای ئـەم ژیـانی دنیایەمـان، هیـچ شـتێکی دیکـە لـە ئـارادا نیـە، ژیانێکـی دیکـە نیـە، دوای ئـەو ژیانـە دنیایەمـان کـە بەسـەر دەچـێ، ژیانێکـی دیکـە نابـێ.

هەندێـک لـە ڕوونکەرەوانیـش گوتوویانـە: ﴿مَا هِيَ إِلَّا حَيَاتُنَا الدُّنْيَا ﴾، (**يَعنـي: مَـا الحَيَـاةُ إِلاَّ حَيَاتُنَـا الدُّنيَـا**)، واتـە: ژیـان نیـە، جگـە لـەم ژیانـە دنیاییەمـان، ئەگـەر بڕایـەوە دەبڕێتـەوەو، جارێکـی دیکـە زینـدوو ناکرێینـەوە.

٨)- ﴿ نَمُوتُ وَنَحْيَا ﴾، دەمرین و دەژین، بە ڕواڵەت دەبووایە گوترابا: دەژین و دەمرین، بەڵام لێرەدا مردن پێشخراوەو، مانایەکەی ئاوایە: (**نَمُوتُ نَحْنُ وَيَحْيَى أَبْنَاؤُنا**)، ئێمە دەمرین و ڕۆڵەکانمان لە دوای ئێمە دەژین، یاخود: (**يَمُوتُ بَعْضُنَا وَيَحْيى بَعْضُنَا**)، هەندێکمان دەمرین و هەندێکمان دەژین، بەڵام بۆچی مردن پێشخراوە؟ (**تَقْدِيمُ المَوْتِ لأَنَّهُ الأَهَمُّ إِذْ هُمْ بصَدَدِ إِثْبَاتِ أَنْ لاَ حَيَاةَ بَعْدَ المَوْت**)، مردن بۆیە پێشخراوە، چونکە ئەوە گرنگترەو، ئەوان خەریکی ئیسپات و سەلـماندنی ئەوە بوون، کە لە دوای ئەم ژیانە دنیاییە مردن دێ، ژیانێکی دیکە نیە، ئنجا بە لای ئەوانەوە گرنگەکە مردنەکەیە، تاکو بیسەلمێنن کە لە دوای مردن ژیانی دیکە نیە، بۆیە مردنیان پێشخستوە.

٩)- ﴿وَمَا يُهۡلِكُنَآ إِلَّا ٱلدَّهۡرُ﴾، تەنیا ڕۆژگار ئێمە دەفەوتێنێ، وشەی: (ٱلدَّهۡرُ): پێشتریش باسمان کرد، کە بە مانای کاتێکی درێژبووەوەیەو، فەرقی لەگەڵ (زَمَن) و (وقت) و (عُمُر) دا، ئاوایە: (العُمُر) تەمەنی کەسێکی دیارییکراو، (الزَّمَن) و (الوَقْت) هەم بۆ کاتی کەم و، هەم بۆ کاتی زۆریش بەکاردێن، بەڵام (ٱلدَّهۡرُ)، بۆ ڕۆژگارێکی دوورو درێژ بەکاردێ، یانی: تەنیا ڕۆژگاری درێژ ئێمە دەفەوتێنێ و، کەس نیە سەرپەرشتییمان بکات، ئێمەی هێنابێ و بژیەنێ و بمرێنێ، بەڵکو بەس بە تێپەڕبوونی کات ئێمە دەمرین و زیندووکرانەوەش نیە.

١٠)- ﴿وَمَا لَهُم بِذَٰلِكَ مِنۡ عِلۡمٍ﴾، {خوا ﷻ هەر ئەوەندە وەڵامی ئەو قسەیان دەداتەوە، دەفەرمویّ:} زانیارییان لەو بارەوە نیە، هەر بە نەزانیی قسە دەکەن و، هیچ زانیارییان نیە، کە دەڵێن: ئەوەی ئەوان دەمرێنێ، تەنیا ڕۆژگارە، لە خۆوە قسە دەکەن، لە ڕاستییدا ئەوەی ئەوان دەژیەنێ و دەمرێنێ و زیندوو دەکاتەوە، خوایە ﷻ، ئەگەرنا ژیان و مردن لە خۆوە پەیدانەبوون و، پەیدانابن، وەک لە سوورەتی (الملك)دا، دەفەرمویّ: ﴿ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلۡمَوۡتَ وَٱلۡحَيَوٰةَ لِيَبۡلُوَكُمۡ أَيُّكُمۡ أَحۡسَنُ عَمَلٗا﴾، واتە: خوا مردن و ژیانی ڕەخساندوون، تاکو تاقییتان بکاتەوە، کامەتان کردەوەی باشترە؟

١١)- ﴿إِنۡ هُمۡ إِلَّا يَظُنُّونَ﴾، ئەوان تەنیا گومان دەبەن، (إنْ) لابەرە (نافية)یە، (جِيءَ بالمُضَارِعِ للتَّجَدُّد)، بۆیە دەفەرمویّ: ﴿يَظُنُّونَ﴾، ئەوان تەنیا گومان دەبەن و، بە کرداری (مُضَارِع) هێناویەتی، چونکە بۆ تازەبوونەوەیە، واتە: گومان لە دوای گومان دەبەن، یانی: تەنیا پشت بە وەهم و پێوانە خەیاڵییەکان دەبەستن، دەڵێن: کوا کەس لە قەبرستان نەهاتۆتەوە؟ قیاسی خوای پەروەردگار دەکەن لەسەر خۆیان، کەسێک کە دەمرێ، ناتوانن زیندووی بکەنەوە، هەروەها ناتوانن ژیان پەیدا بکەن، ئنجا پێیان وابووە خوای بەرزو مەزنیش هەروایە، بە زۆریی هۆکاری شیرک و بە هەڵەداچوونی مرۆڤ لەوەدایە، کە پێوانە (قیاس)ی خوای تاک و پاک دەکات لەسەر خۆی و، لە هەنبانەی خۆیاندا گوێز دەژمێرن.

بۆیەش خوا ﷻ تەنیا ئەوەندە دەفەرمویّ: کە ئەوانە تەنیا گومان دەبەن، چونکە ڕاستییەکەی هەروایە، هەرچی ئەو بیردۆزەو میردۆزانەن لێیان بکۆڵەوەو

بچۆ بنج و بنەوانیان، هەمووی گومان و خەیاڵ و بۆچوونی کرچ و کاڵ سەرچەنگ چوونەو، هیچی ناچێتەوە بۆ شتێکی ڕیشەدارو بەڵگەیەکی ڕوونی جێی دڵنیایی.

**ئنجا** خوا یەکێک لە گومانەکانیان، یان یەکێک لە بەڵگە پووچەکانیان دەخاتەڕوو، دەفەرموێ:

١٢)- ﴿ وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُنَا بَيِّنَٰتٍ ﴾، کاتێک ئایەتە ڕوونەکانی ئێمەیان بەسەردا بخوێنرێنەوە، یانی: ئایەتە ڕۆشنەکان و درەوشاوەکان، کە گومان و دوو دڵیی لە دڵی کەسانێکدا کە ئایەتەکانی خوا بە ڕاست دادەنێن، لا دەبات و دڵیان خاوێن و ڕۆشن دەکاتەوە.

١٣)- ﴿ مَّا كَانَ حُجَّتَهُمْ إِلَّآ أَن قَالُوا۟ ٱئْتُوا۟ بِـَٔابَآئِنَآ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴾، بەڵگەیان تەنیا ئەوەبوو کە گوتیان: هیچ بەڵگەیەکیان نەبوو، جگە لەوەی گوتیان: باب و باپیرانمان بێنن، ئەگەر ئێوە لە ڕاستانن، **(لَمْ يَكُنْ لَهُم حُجَّةٌ إلاَّ قَوْلُهم: أَحيُوا أَبَاءَنَا مِنَ القُبُور)**، بەڵگەکەیان هەر ئەوە بوو کە گوتیان: باب و باپیرانمان لە گۆڕەکانیاندا زیندوو بکەنەوە!

ئنجا ئەوە کەی بەڵگەیە؟ خوا ﷻ مرۆڤی داناوە لەسەر زەوی، ئەم قۆناغە، قۆناغی ژیانی دنیاو تاقیکردنەوەیە، کاتێک ئەم قۆناغە بەسەرچوو، قۆناغێکی دیکە دێ، ناگونجێ ئەوەی لە قوناغێکی دیکەدا دێ، ئەویش ئێستا بهێنرێتە ئێرە، ئەمە دەکاتە تێکەڵیی و پێکەڵیی! هەروەک منداڵ لە منداڵدانی دایکی دێتە دەرێ، وەک کۆرپەلەیەک شیر دەخوات، دوایی وردە وردە گەورە دەبێ و ددانی لێدەڕوێن و، ئەگەر هەتا تەمەنی دوو ساڵیی، ژیانی لەسەر دوو مەمکی دایکی بووە، ئنجا ژیانی دەکەوێتە سەر دەم و ددانی خۆی، پێشێ دارە دارە دەکات، دوایی پێرۆچکە دەبێ و، گەورە دەبێ و دەڕوات، ئنجا قۆناغی منداڵیی و، قۆناغی هەرزەکاریی و، قۆناغی گەنجێتیی، ناکرێ مرۆڤ بگاتە قۆناغی کامڵبوون، دوایی بێتەوە بۆ قۆناغی شیرە خۆرەیی! کەواتە: خوا ﷻ ئەم گەردوونەو لە نێویدا ژیانی مرۆڤی بە سیستم داناوە، بۆ هەر کام لە قۆناغەکان یاسای داناوە، قۆناغێک کە دەگوزەرێنرێ، ناگونجێ دوایی مرۆڤ بۆ لای بگێڕدرێتەوە، ئایا دەگونجێ کەس بچێتەوە نێو منداڵدانی دایکی، دوای ئەوەی لێوەی هاتۆتە دەر؟ نەخێر!

کەواتـە: کەسـێکیش کـە تاقیکردنـەوەی ژیـانی دنیـای داوەو، چۆتـە قۆناغـی بەرزەخـەوە، جەستەکەی چووەتـەوە بـۆ نێـو خـاک و، ڕووحەکـەشی چـووە بـۆ ئـەو شـوێنەی کـە ئەگـەر ئەهـلی پاداشـت بـێ، وەک بەهەشـتە، یـان لـە نێـو بەهەشـتەو، ئەگـەر ئەهـلی سـزا بـێ، وەک دۆزەخـە، یاخـود لـە نێـو دۆزەخـە، ناگونجـێ لەوێـوەوە بێتـەوە بـۆ دنیـا، چونکـە ئـەو قۆناغـە بەسـەرچووە، بۆیـە ئـەوان ئێسـتا چوونەتـە قۆناغـی بەرزەخـەوەو، لـە دوای ئـەو قۆناغـی بەرزەخـەش، قۆناغـی قیامەتیـش دێ، بـەڵام بێبڕوایـەکان ویسـتوویانە هەمـوو شـتێک تێکـەڵ و پێکـەڵ بکەن، وەک چێشـتی مجێـور! بـەڵام نەخێـر، بۆیـە خـوا دەفەرمـوێ: ئەگـەر ئایەتـە ڕۆشـنەکانی ئێمەیـان بەسـەردا بخوێنرێنـەوە، بەڵگەیـان هـەر ئـەوە بـوو کـە گوتیـان: بـاب و باپیرانمـان بێنـن، ئەگـەر ڕاسـت دەکـەن، واتـە: هەمـوو عەقڵەکەیـان ئەوەنـدە بـوو، هەمـوو بەڵگەکەیـان ئـەوە بـوو، لـەوە زیاتـر بەڵگەیـان بەدەسـتەوە نەبـوو، ئـەوەش هیـچ بەڵگـە نیـە، بۆیـە خـوا ﷻ دەفەرمـوێ:

١٤)- ﴿ قُلِ ٱللَّهُ يُحۡيِيكُمۡ ثُمَّ يُمِيتُكُمۡ ثُمَّ يَجۡمَعُكُمۡ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ لَا رَيۡبَ فِيهِ ﴾، بڵێ: خوا ﷻ دەتانژیەنێ، دوایی دەتانمرێنێ، دوایی بەرەو ڕۆژی قیامەت زیندووتان دەکاتەوە، کە هیچ دوو دڵیی تێدانیە.

١٥)- ﴿ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ ﴾، بەڵام زۆربەی خەڵکی نازانن، واتە: کەوتنە گومان و دوو دڵیی زۆربەی خەڵکی، بە هۆی ئەوەوەیە کە زانیارییان نیە، بەبوونی بەڵگەکانی زیندووکرانەوەو هەبوونی سزاو پاداشت، یاخود نکووڵییکردنی زۆربەی خەڵکی بەهۆی ئەوەوەیە، کە حەقیقەتی ئەو ڕۆژە نازانن، یان لەبەر ئەوەی زانیارییان نیە بە دەستەڵاتی خوا، کە دەسەڵاتەکەی بێ سنوورەو، دەتوانێ مردووانیش زیندوو بکاتەوە، وەک چۆن کاتی خۆیشی ژیانیان نەبوو، خوا ژیانی پێداون، ئێستاش کە ژیانی لێوەرگرتوونەوە، دەتوانێ جارێکی دیکە ژیانیان پێ بداتەوە، چونکە ئەوان دەستەڵاتی بێ سنووری خوا، سیفەتە بێ سنوورەکانی خوا نازانن، بۆیە نکووڵیی لە ژیینرانەوەیان دەکەن.

## چەند دەقێکی سوننەت لە بارەی
## قسە نەگوتن بە ڕۆژگارو شوێننەکەوتنی هەواو ئارەزووەوە

### یەکەم: قسە نەگوتن بە ڕۆژگار:

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمایشتی هەن لە بارەی ڕۆژگارەوە، کە نابێ مرۆڤ قسە بە ڕۆژگار بڵێ، کە بەداخەوە زۆر لە شاعیرە کوردەکانیش قسە بە ڕۆژگار دەڵێن، قسە بە زەمانە دەڵێن، قسە بە دنیا دەڵێن، ئەوەش پێچەوانەی ئەو فەرمایشتانەی پێغەمبەرە ﷺ، بۆ وێنە:

١- {**عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ: قَالَ اللهُ عَزَّ وَجَلَّ: «يَسُبُّ ابْنُ آدَمَ الدَّهْرَ، وَأَنَا الدَّهْرُ، بِيَدِيَ اللَّيْلُ وَالنَّهَارُ**} (**أخرجه البخاري: ٤٨٢٦، ومسلم: ٢٢٤٦**)، واتە: ئەبوو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: خوای زاڵی پایەدار فەرموویەتی: ڕۆڵەی ئادەم قسە بە ڕۆژگار دەڵێ، من ڕۆژگارم، شەوو ڕۆژ بە دەستی منن، دەیانهێنم و دەیانبەم.

٢- {**عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: يَقُولُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: يُؤْذِينِي ابْنُ آدَمَ، قَالَ: يَقُولُ: يَا خَيْبَةَ الدَّهْرِ، فَإِنِّي أَنَا الدَّهْرُ، أُقَلِّبُ لَيْلَهُ وَنَهَارَهُ، فَإِذَا شِئْتُ قَبَضْتُهُمَا**} (**أخرجه البخاري: ٦١٨٢، ومسلم: ٢٢٤٦**)، واتە: ئەبوو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: خوای زاڵی پایەدار دەفەرموێ: نەوەی ئادەم قسەم پێ دەڵێ، فەرمووی: دەڵێ: ئەی بەدبەختیی بۆ ڕۆژگار، یاخود: پەشێمانیی بۆ ڕۆژگار، چونکە من خۆم ڕۆژگارم، شەوەکەی و ڕۆژەکەی هەڵدەسووڕێنم و، هەر کاتێک ویستیشم، شەوو ڕۆژان لادەبەم، (خوا شەوو ڕۆژان بەسەر زەوی دادێنێ، ئەگەر زەوی نەما، شەو و ڕۆژ نامێنن).

٣- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، عَنْ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: لَا تَسُبُّوا الدَّهْرَ، فَإِنَّ اللَّهَ هُوَ الدَّهْرُ} (أخرجه مسلم: ٢٢٤٦)، واتە: ئەبوو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: قسە بەڕۆژگار مەڵێن، خوا خۆی ڕۆژگارە.

بەو واتایە کە خوا ﷻ ڕۆژگار دەسووڕێنێ، هەڵبەتە قسە گوتن بە زەمان و بە ڕۆژگار، شتێکی نامەنتیقییە، چونکە ڕۆژگارو زەمان، شتێکی بێلایەنە، وەک توورەکەیەک وایە، تۆ کارەکەی تێدا ئەنجام بدەی، ئنجا چاکەی تێدا بکەی، چاکەو، خراپەی تێدا بکەی، خراپە، کەواتە: بەهۆی چاکەکەی خۆتەوە، کاتەکەت چاک دەبێ و، بە هۆی خۆتەوەش کاتەکە لە خۆت خراپ دەکەی، ئەگەرنا کات لە خودی خۆیدا، نە چاکەو نە خراپە، بەو واتایەی بگوترێ: فڵانە کاتە چاکەو، فڵانە کاتە خراپە، ئەوە کردەوەکانی مرۆڤن کە لە کاتدا ئەنجامیان دەداو، خێرو فەڕو پیت و پێز، یاخود نەگبەتیی مرۆڤ، بەرهەمی کردەوەکانی خۆیەتی.

## دووەم: بە دوای ئارەزوو نەکەوتن:

لەو بارەوەش ئەم دەقەی سوونەتی پێغەمبەر ﷺ دێنین: { فَقَالَ رسول الله ﷺ: ثَلَاثٌ مُهْلِكَاتٌ: شُحٌّ مُطَاعٌ، وَهَوًى مُتَّبَعٌ، وَإِعْجَابُ الْمَرْءِ بِنَفْسِهِ. وَثَلَاثٌ مُنْجِيَاتٌ: خَشْيَةُ اللهِ فِي السِّرِّ وَالْعَلَانِيَةِ، وَالْقَصْدُ فِي الْفَقْرِ وَالْغِنَى، وَالْعَدْلُ فِي الْغَضَبِ وَالرِّضَا} (أخرجه الطبراني في الأوسط: ٥٧٥٤، وحسَّنه الألباني في صَحِيح الْجَامِع: ٣٠٣٩ ، ٣٠٤٥ ، صَحِيح التَّرْغِيبِ وَالتَّرْهِيبِ: ٥٣) واتە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: سێ سیفەت فەوتێنەرن و، سێ سیفەتیش ڕزگارکەرن، سێ فەوتێنەرەکان:

١- چرووکییەکی فەرمانبەریی بۆ کراو.

٢- ئارەزوویەکی پەیڕەویی لێکراو.

٣- سەرسام بوونی مرۆڤ بە خۆی.

سێ دەربازکەرەکانیش:

١- هەیبەت و سام بەرانبەر بە خوا لە کاتی پەنهان و ئاشکرادا.

٢- میانجیی بوون لە کاتی دەوڵەمەندیی و هەژاریی دا.

٣- دادگەربوون لە کاتی ڕازییبوون و تووڕەبوون دا.

بە ڕاستیی هەم سێ سیفەتە فەوتێنەرەکان، هەم سێ سیفەتە ڕزگارکەرەکان، زۆر سیفەتی گرنگن، سێ سیفەتە فەوتێنەرەکان:

١- چرووکییەک کە خاوەنەکەی بە قسەی بکات، ئنجا چرووکیی لە بەخشینی ماڵدا، لە بەخشینی زانستدا، لە بەخشینی هاوکارییدا، هاوکاریی مەعنەویی، خێرخوازیی لەگەڵ خەڵک، چرووکییەک کە خاوەنەکەی بە قسەی بکات، سیفەتەکی زۆر فەوتێنەرە.

٢- پاشان ئارەزوویەک کە پەیڕەویی لێ بکرێ، کەسێک کە هەواو ئارەزووی خۆی پەیڕەویی لێ بکات، کوێرانە گوێ لە مستی بێ و شوێنی بکەوێ.

٣- سەرسامبوون بەخۆ، مرۆڤ کە بە خۆی سەرسام بوو، بەو واتایەی کە پێی وابوو زۆر گەورەو گرنگە، قسە لە کەس وەرناگرێ، هەندێ کەس دەبینم، ئەوانەی مامەڵەیان لەگەڵدا دەکەم، تەماشا دەکەم هەیە زۆر لە خۆی ڕازییەو، زۆر بە خۆی دەنازێ، زۆر بە خۆی سەرسامە، ئنجا کە مرۆڤ وابوو، گوێ بۆ کەس ناگرێ و، شت لە کەس وەرناگرێ، پێی وایە لەو سەری هاتۆتەوە، پێویستیی بە عیلمی کەس نیە، پێویستیی بە عەقڵی کەس نیە، پێویستی بە دڵسۆزیی کەس نیە، بۆ خۆی هێندە هەموو شتێکی هەیە، لێی زیادە!!

جاری وا هەیە کەسانێک کە پێیان وایە شوێنکەوتنی سەلەفی صاڵح و شوێنکەوتنی قورئان و سوننەت لەسەر ئەوان تاپۆ و قۆرخکراوەو، بەشی کەسی دیکەی پێوە نەماوەو، خۆیان پێ بڕواداری مومتازەو ئامۆژگاریی خەڵک دەکەن، کەچی ئەو سیفەتەشیان هەیەو، پێیان وایە پێویستییان بە کەس نیەو، بۆ خۆیان

هەموو شتێکیان بە زیادەوە هەیە! کە بە تەئکید بەس خوا ﷻ پێویستیی بە کەس نیەو، تەنیا خوایە کە هەموو شتێکی هەیەو، هەموو شتێک دەتوانێ و هەموو شتێک دەزانێ، بەڵام مرۆڤەکان کەسیان وانین.

ئنجا سێ سیفەتە دەربازکەرەکانیش:

١- کە مرۆڤ سام و هەیبەتی بەرانبەر بە خوا هەبێ، لە کاتێکدا کە پەنهانەو، لە کاتێکدا کە ئاشکرایە.

٢- میانجیی بێ لە ماڵ بەخشیندا لە کاتی هەبوونداو لە کاتی نەبوون دا.

٣- دادگەر بێ لە کاتی توورە بوون و لە کاتی ڕازیبووندا، هەم کە ڕازییە دادگەر بێ و، کەسێک لەبەر ئەوەی لێی ڕازییەو خۆشی دەوێ، بۆی تێنەپەڕێنێ، هەروەها کەسێکیش کە لێی توورەیە، لە کاتی توورەبوونیشدا، دیسان کورتی نەهێنێ و، دادگەر بێ و ستەمی لێ نەکات، هەم سێ سیفەتە فەوتێنەرەکان زۆر زۆر خراپن و، هەم سێ سیفەتە دەربازکەرەکانیش، زۆر زۆر چاکن.

خوا بە لوتف و کەرەمی خۆی وامان لێ بکات، کە سیفەتە دەربازکەرەکان لە خۆماندا بێنینە دی و، خۆمانیان پێ برازێنینەوە، سیفەتە فەوتێنەرەکانیش لە خۆمان دابڕنین و، خۆمانیان لێ بژار بکەین و پاک بکەینەوە.

کۆتایی ئەو دەرسەشمان بەو قسەیەی (**أبو الدرداء رضي الله عنه**) دێنم یەکێک لە هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەر ﷺ، دەڵێ: (**إِذَا أَصْبَحَ الرَّجُلُ اجْتَمَعَ هَوَاهُ وَعَمَلُهُ وَعِلْمُهُ، فَإِنْ كَانَ عَمَلُهُ تَبَعاً لِهَوَاهُ، فَيَوْمُهُ يَوْمُ سُوء، وَإِنْ كَانَ عَمَلُهُ تَبَعاً لِعِلْمِهِ، فَيَوْمُهُ يَوْمٌ صَالِح**)[1]، واتە: پیاو کە ڕۆژ دەکاتەوە، ئارەزووەکەی و کردەوەکەو زانیارییەکەی کۆدەبنەوە، ئەگەر کردەوەکەی بە دوای ئارەزووەکەی کەوت، ئەوە ڕۆژەکەی ڕۆژێکی خراپە، بەڵام ئەگەر کردەوەکەی بە دوای زانیارییەکەی کەوت، ڕۆژەکەی ڕۆژێکی باشە.

---

(١) الجامع لأحكام القرآن: ج٢٥، ص١٣٣.

ئەو قسەیە قسەیەکی زۆر زۆر دانایانەیە! هەر لە هاوەڵانی بە ڕێزی پێغەمبەر ﷺ دەوەشێتەوە خوا لێیان ڕازی بێ.

خوا بە لوتف و کەرەمی خۆی، ئێمە لەو کەسانە بگێڕێ، کە هەمیشە کردەوەمان بەپێی ئەو زانیارییە ڕاست و دروستە بێ، کە لە وەحیی خواوە هەڵیدەهێنجین و وەریدەگرین، یان لە عەقڵی سەلیمەوە وەریدەگرین، کە عەقڵی سەلیمیش هەر شەرع فەرمانی کردوە، کە بە پێی عەقڵی سەلیم بەڕێوەبچین و، خوا بمانپارێزێ لەوەی کە بکەوینە ژێر کاریگەریی هەواو ئارەزووی خۆمان، یاخود جگە لە خۆمان.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان لە یازدە (١١) ئایەتی کۆتایی سوورەتی (الجاثیة) پێک دێ، کە بریتین ئایەتەکانی: (٢٧ - ٣٧)، تەوەری سەرەکییان باسی ڕۆژی قیامەتە، ڕۆژی سزاو پاداشت و لێپرسینەوە، دوای ئاماژەیەکی کورت بە سەرەنجامی خێری بڕوادارانی کردار باش، لە یەک ئایەتدا، ئایەتی ژمارە (٣٠).

ئەوی دیکە ئایەتەکانی: (٣١ - ٣٥)، هەمووی بۆ خستنە ڕووی سەرەنجامی شوومی بێبڕوایانی تاوانبارو خراپەکار، تەرخانکراوە، خراوەتە ڕوو کە ژمارەیەکی زۆر لە خەسڵەت و کردەوە خراپەکانیان، بەو سەرەنجامە دژوارو بێبەزاییەی گەیاندوون، کە سەرجەم دە (١٠) خەسڵەت و ڕەفتاری خراپن:

١- بێبڕوایی.



٢- خۆبەزلگریی.

٣- تاوانباریی.

٤- نەزانیی.

٥- گوماندارێی و دڵ پڕ لە گومان و دوو دڵیی بوون.

٦- خراپەکاریی.

٧- گاڵتەپێکردنی قیامەت.

٨- لە بیرکردنی دیداری خوا.

٩- گەمەکردن بە ئایەتەکانی خواو پێڕابواردنیان.

١٠- فریو خواردن بە ژیانی دنیا.

لـە کۆتاییـش دا لـە دوو ئایـەتی: (٣٦ و ٣٧)دا کـە کۆتـا ئایـەتی ئـەم سـوورەتە موبارەکـەن، ستایشـکردنی خـوا ﷻ وەک پـەروەردگارو خـاوەنی گـەردوون و جیهانییـان واتـە: گـەردوون بەسـەرو خواریـەوە بـە ئاسـمانەکان و زەویـەوەو جیهانییـان تێکـڕاو، ڕاگەیانـدنی بەرزیـی و گەورەیـی ڕەهـای خـوا ﷻ لـە گەردوونـدا.

﴿ وَلِلَّهِ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ وَيَوْمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ يَوْمَئِذٍ يَخْسَرُ ٱلْمُبْطِلُونَ ﴿٢٧﴾ وَتَرَىٰ كُلَّ أُمَّةٍ جَاثِيَةً ۚ كُلُّ أُمَّةٍ تُدْعَىٰٓ إِلَىٰ كِتَٰبِهَا ٱلْيَوْمَ تُجْزَوْنَ مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٢٨﴾ هَٰذَا كِتَٰبُنَا يَنطِقُ عَلَيْكُم بِٱلْحَقِّ ۚ إِنَّا كُنَّا نَسْتَنسِخُ مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٢٩﴾ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فَيُدْخِلُهُمْ رَبُّهُمْ فِى رَحْمَتِهِۦ ۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَوْزُ ٱلْمُبِينُ ﴿٣٠﴾ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ أَفَلَمْ تَكُنْ ءَايَٰتِى تُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ فَٱسْتَكْبَرْتُمْ وَكُنتُمْ قَوْمًا مُّجْرِمِينَ ﴿٣١﴾ وَإِذَا قِيلَ إِنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ وَٱلسَّاعَةُ لَا رَيْبَ فِيهَا قُلْتُم مَّا نَدْرِى مَا ٱلسَّاعَةُ إِن نَّظُنُّ إِلَّا ظَنًّا وَمَا نَحْنُ بِمُسْتَيْقِنِينَ ﴿٣٢﴾ وَبَدَا لَهُمْ سَيِّـَٔاتُ مَا عَمِلُوا۟ وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُوا۟ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ ﴿٣٣﴾ وَقِيلَ ٱلْيَوْمَ نَنسَىٰكُمْ كَمَا نَسِيتُمْ لِقَآءَ يَوْمِكُمْ هَٰذَا وَمَأْوَىٰكُمُ ٱلنَّارُ وَمَا لَكُم مِّن نَّٰصِرِينَ ﴿٣٤﴾ ذَٰلِكُم بِأَنَّكُمُ ٱتَّخَذْتُمْ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ هُزُوًا وَغَرَّتْكُمُ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا ۚ فَٱلْيَوْمَ لَا يُخْرَجُونَ مِنْهَا وَلَا هُمْ يُسْتَعْتَبُونَ ﴿٣٥﴾ فَلِلَّهِ ٱلْحَمْدُ رَبِّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَرَبِّ ٱلْأَرْضِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٣٦﴾ وَلَهُ ٱلْكِبْرِيَآءُ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٣٧﴾ ﴾.

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{حوکمڕانیی و دەسەڵاتی ئاسمانەکان و زەوی، تەنیا هی خوایەو، ئەو ڕۆژەش کە کاتی بەرپابوونی قیامەت دێ، (مرۆڤە) ناهەقەکان دۆڕاوو زیانبار دەبن ﴿٢٧﴾ (لەو ڕۆژەدا) هەموو کۆمەڵێک (لە مرۆڤان) دەبینی (لە ترس و بیم و حەژمەتان) لەسەرچۆکان کەوتوون، هەر کۆمەڵێک بۆ (لیستی) نووسراوی خۆی بانگ دەکرێ (پێیان دەگوترێ:) ئەمڕۆ بەپێی ئەوەی کردووتانە، سزاو پاداشتتان دەدرێتەوە ﴿٢٨﴾ ئەمە نووسراوی ئێمەیە بە هەق و ڕاستیی لەسەرتان دەدوێ (شایەدییتان لەسەر دەدات)، مسۆگەر ئێمە کاتی خۆی ئەوەی دەتانکرد، لەبەرمان دەگرتەوە (فۆتۆکۆپییمان دەکرد) ﴿٢٩﴾ ئنجا ئەوانەی بڕوایان هێناوەو چاکەکانیان ئەنجام داون، پەروەردگاریان دەیانخاتە نێو بەزەیی خۆیەوەو، هەر ئەوەیە بردنەوەو بە مراد گەیشتنی ئاشکرا ﴿٣٠﴾ بەڵام ئەوانەی بێبڕوابوون (پێیان دەگوترێ:) ئایا ئایەتەکانمتان بەسەردا نەدەخوێنرانەوە، کەچی (لە بەرانبەریاندا) خۆتان بەزلگرت و کۆمەڵێکی تاوانبار بوون؟ ﴿٣١﴾ هەر کاتیش گوترابایە: بێگومان بەڵێنی خوا هەق و ڕاستەو، قیامەت ڕاستەو هیچ دوو دڵیی هەڵناگرێ، دەتانگوت: نازانین قیامەت چییە! تەنیا گومان دەبەین و بە مەزەنەی دەزانین و، ئێمە لە دڵنیایان نین (ئەو ڕۆژە بێ) ﴿٣٢﴾ (دەرهاویشتەو شوێنەوارە) خراپەکانی ئەوەی کردبوویان بۆیان دەرکەوتن و، (سزای) ئەوەی گاڵتەیان پێدەکرد، گەمارۆی دان ﴿٣٣﴾ (پێشیان) گوترا: ئەمڕۆ لە بیرتان دەکەین (پشتگوێتان دەخەین) وەک چۆن ئێوە دیداری ئەمڕۆتان لە بیر کرد بوو (نادیدە گرتبوو)و، جێی حەوانەوەشتان ئاگرەو، هیچ پشتیوانیشتان نین ﴿٣٤﴾ ئەو (ئاگری دۆزەخ)ە شتان بە هۆی ئەوەوەیە کە ئێوە ئایەتەکانی خواتان بە گاڵتە گرتبوون و، ژیانی دنیاش فریوی دابوون، بۆیەش ئەمڕۆ لێی ناهێنرێنە دەرێ و، داواشیان لێ ناکرێ داوای لێبوردن (لە خوا) بکەن

(و خوا ڕازیی بکەن) ﴿٣٥﴾ ستایشیش تەنیا بۆ (خوا)ی پەروەردگاری ئاسمانەکان و، پەروەردگاری زەوی و، پەروەردگاری جیهانییانە ﴿٣٦﴾ هەروەها مەزنیی و باڵایی ڕەها لە ئاسمانەکان و زەویدا، بەس هی ویەو، تەنیا ئەو زاڵی کارزانە ﴿٣٧﴾ }.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(يَخۡسَرُ): (خَسِرَ يَخْسَرُ خُسْرًا وَخُسْرَانًا، بَابُهُ: فَرِحَ يَفْرَحُ، عَكْسُ: رَبِحَ، أَي: ضَاعَ رَأْس مَالِهِ، وخَسَرَ يَخْسِرُ الشَّيءَ: نَقَصَهُ بَابُهُ: ضَرَبَ يَضْرِبُ)، وشەی (يَخۡسَرُ)، کە ڕابردووەکەی (خَسِرَ)یە، (خَسِرَ يَخْسَرُ خُسْرًا وَخُسْرَانًا) لە سەر کێشی (فَرِحَ يَفْرَح) یە، واتە: دۆڕا، سەرمایەکەی لە دەستچوو، زیانباربوو، (خَسِرَ يَخْسَر)، پێچەوانەی (رَبِحَ يَرْبَحُ)یە، (رَبِحَ يَرْبَح)، واتە: قازانجی کرد، قازانج دەکات، بەڵام (خَسِرَ يَخْسَرُ)، واتە: زیانی لێکەوت و دەستمایەکەی فەوتا، (خَسِرَ يَخْسَرُ خُسْرًا وَخُسْرَانًا) جیایە لە (خَسَرَ يَخْسِرُ الشَّيءَ)، (خَسَرَ)، (عَيْنُ الفِعْل)ەکەی سەر (فتحة)ی هەیە، بەڵام (خَسِرَ) ژێر (کسرة)ی هەیە، (وخَسَرَ يَخْسِرُ الشَّيءَ)، واتە: شتەکەی کەم کرد، کەم دەکات، ئەمە لەسەر کێشی (ضَرَبَ يَضْرِبُ)ە، وەک خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَيۡلٞ لِّلۡمُطَفِّفِينَ ﴿١﴾ ٱلَّذِينَ إِذَا ٱكۡتَالُواْ عَلَى ٱلنَّاسِ يَسۡتَوۡفُونَ ﴿٢﴾ وَإِذَا كَالُوهُمۡ أَو وَّزَنُوهُمۡ يُخۡسِرُونَ ﴿٣﴾ ﴾، یانی: (ينقصون)، ئەگەر شتیان بۆ خۆیان کێشا، یان پێوا، بە تەواویی وەری دەگرن، بەڵام ئەگەر بۆیان پێوان یان بۆیان کێشان، لێی کەم دەکەن.

(ٱلۡمُبۡطِلُونَ): (الَّذِينَ يُبْطِلُونَ الحَقَّ، وَالبَاطِلُ: نَقِيضُ الحَقِّ، وَهُوَ مَا لاَ ثَبَاتَ لَهُ عِنْدَ الفَحْصِ)، (مُبْطِلُون) کۆی (مُبْطِل)ە، (مُبْطِل): کەسێکە بیەوێ هەق بپووچێنێتەوە، هەڵگری ناهەق بێ، (باطِل): پێچەوانەی (حق)ە، هەق یانی: شتی چەسپاو و دامەزراو، یان شتێک کە ڕاست بێ، بەڵام (باطل) یانی: شتی پووچ و بێ نێوەڕۆک و، شتێک کە ناڕاست بێ.

(جَاثِيَةً): (جَثَى عَلَى رُكْبَتَيهِ، يَجْثُو جُثُوّاً وجَثِيّاً فَهُوَ جَاثٍ، وَالجَمْعُ جُثِيّ مِثْلُ: بَاكٍ وَبُكِيٌّ، بَرَكَ عَلَى رُكْبَتَيهِ)، واتە: لەسەر ئەژنۆیان، لەسەر چۆکان دانیشت، (يَجْثُو جُثُوّاً وجَثِيّاً، فَهُوَ جَاثٍ)، یانی: ئەو لەسەر ئەژنۆیە، کۆیەکەی بریتیە لە: (جُثيّ) وەک: (بَاكٍ)، گریاو، (وبُكِيٌّ)، گریاوەکان، ئنجا ﴿أُمَّةٍ جَاثِيَةً﴾، یانی: کۆمەڵێک کە لەسەر ئەژنۆ کەوتوون لەپەو ڕوو کەوتوون، لەسەرچۆکان لەبەر زەبوونییان کەوتوون.

(يَنطِقُ): واتە: دەدوێ، (الكِتَابُ نَاطِقٌ، لَكِنْ نُطْقَهُ تُدْرِكُهُ العَيْنُ، كَمَا أَنَّ الكِتَابَ كَلاَمٌ، لَكِنْ يُدْرِكُهُ السَّمْعُ)، دیارە نووسراویش بێژەرە، بەڵام بێژتنەکەی چاو دەیبینێ، هەروەک کتێبیش قسە دەکات، بەڵام گوێ قسەکەی دەبیستێ.

(نَسْتَنسِخُ): واتە: نوسخەی لەبەر دەگرینەوە، (النَّسْخُ: إزَالَةُ الشَّيءِ بِشَيءٍ يَتَعَقَّبُهُ)، (نسخ): بریتیە لەوەی شتێک بە شتێک لابەری، بە دوایدا بێ، (وَنَسْخُ الكِتَابِ: نَقْلُ صُورَتِه المجَرَّدَة إلى كِتَابٍ آخَر، والإسْتِنْسَاخُ: التَّقَدُّمُ بِنَسْخِ الشَّيءِ)، (نَسْخُ الكِتَاب): بریتیە لەوەی وێنەکەی بگوازیەوە بۆ کتێبێکی دی، بۆ نووسینێکی دیکە، لەو نووسراوە بیگوازیەوە بۆ نووسینێکی دیکە، لەبەر گرتنەوە، (إسْتِنْسَاخ): داوا کردنی لەبەرگرتنەوەیە، کە وەک دوایی باسی دەکەین، ئەمە ئیعجازێکی عیلمیی تێدایە.

﴿ٱلْفَوْزُ﴾: (الظَّفرُ بالخَيْرِ مَعَ حُصُولِ السَّلاَمَةِ)، (فَوْز): بریتیە لە وەدەستهێنانی قازانج و خێر، لەگەڵ هەبوونی بێمزەڕەتیی و بێ دەردو بەڵاییدا.

(هُزُواً): (الهُزْءُ: مَزْحٌ فِي خِفْيَةٍ)، (هُزْء): بریتیە لە گاڵتەپێکردنێکی پەنهان.

(وَغَرَّتْكُمُ): فریودان، هەڵیخەڵەتاندن، (الغِرَّةُ: غَفْلَةٌ فِي اليَقَظَة، وَغَرَّهُ: خَدَعَهُ يَغُرُّهُ غُرُوراً)[1]، (غِرَّة): بە مانای بێ ئاگایی دێ، (عَلَى غِرَّةٍ)، یانی: لە کاتی بێئاگاییدا، بەڵام بێئاگاییەکە لە حاڵەتی بێدارییدا، کەسێک کە بێدارەو خەوتوو نیە، بەڵام

(١) مُختار الصحاح، ص٤٧٢.

لەو کاتەدا خافڵاوە، کەسێک زەفەری پێدەبات، (**غَرَّهُ: خَدَعَهُ يَغُرُّهُ غُرُوراً**)، واتە: فریوی دا، فریویدەدا، فریودان، وەک ئەوەی لە کاتێکدا ئەو خافڵاوە، زەفەری پێبردبێ، جاری وا هەیە با خافڵاویش نەبێ، بەڵام وەک چۆن بابای خافڵاو، کەسێک لە ناکاو زەبرێکی لێدەدا، یان شتێکی لێ دەڕفێنێ، بەهەمان شێوە.

(وَلَا هُمۡ يُسۡتَعۡتَبُونَ): (**أَعْتَبَ وَاسْتَعْتَبَ: طَلَبَ أَنْ يُعْتَبَ وَاسْتَعْتَبَهُ، فَأَعْتَبَهُ: اسْتَرْضَاهُ، فَأَرْضَاهُ، العُتْبَى: الرِّضَا**)، (**عُتْبَى**): بە مانای ڕازیی بوون دێ، (**أَعْتَبَ وَاسْتَعْتَبَ: طَلَبَ أَنْ يُعْتَبَ**)، داوای کرد لێی ڕازیبن، (**وَاسْتَعْتَبَهُ**): واتە: داوای لێبوردنی کرد، یان داوای ڕازیبوونی کرد، (**فَأَعْتَبَهُ**)، ئەویش لێی ڕازیبوو، (**اسْتَرْضَاهُ، فَأَرْضَاهُ**)، داوای ڕازیبوونی لێکرد، ئەویش لێی ڕازی بوو، (**عُتْبَى**)، بە مانای ڕازیبوون (**رِضَا**) دێ.

(وَلَا هُمۡ يُسۡتَعۡتَبُونَ)، (**أي: لاَ يُطلَبُ مِنْهُمْ أَنْ يُزِيلوا عَتْبَ رَبِّهِم عَلَيْهِم**)، داوایان لێناکرێ، گلەیی پەروەردگاریان لەسەرخۆیان لابەرن، کە ئەمیش کینایەیە بۆ ڕازیکردنی خوای بەرز، واتە: لێیان داوا ناکرێ لەو ڕۆژەدا، خوا عزوجل لە خۆیان ڕازیی بکەن، چونکە تازە تێپەڕیوە، یانی: داوای ڕازیکردنی خواو داوای لێبوردن کردن لە خوای پەروەردگاریان لێناکرێ.

(ٱلۡكِبۡرِيَآءُ ﴾: واتە: ئەوپەڕی مەزنیی، ئەوپەڕی گەورەیی، ئەوپەڕی شکۆداریی، (**كَبُرَ: عَظُمَ، كِبَراً فَهُوَ كَبِير، وَكُبَّار مبالغة فيه...**)، (**كَبُرَ**) مەزنبوو، (**كبير**) گەورە، (**كُبَّار**) زێدەڕۆییە تێیدا، یانی: زۆر گەورە.

(**الكِبْرِيَاء: العَظَمَةُ وَالمُلْكُ، أو كَمَالُ الذَّاتِ وَكَمَالُ الوُجود**)[1]، (**كبرياء**) یانی: مەزنیی و حوکمڕانیی، یاخود تەواویی لە خود داو تەواویی لە بووندا.

---

(١) صفوة البيان، لحسنين محمد مخلوف، ص٦٢٧.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

خـوا ﷻ لـە کۆتایـی ئـەو سـوورەتە موبارەکـەدا، بۆمـان بـاسی سـەرەنجامی مرۆڤـەکان دەکات بـە گشـتیی، کـە لـە ڕۆژیـی دوایـی دا چییـان لـێ دێ و چـۆن دەبـن؟ کەواتـە: بـا لـە ئێسـتاوە خەمـی ئـەو ڕۆژە بخـۆن و، ئێسـتا بـە شـێوەیەک بژیـەن، کـە لـەو ڕۆژەدا سەربەسـت و سـەلامەت و سـەرفراز و بەختـەوەر بـن، بـەڵام پـتر پانتایـی ئـەم یـازدە ئایەتـە تەرخانکـراوە بـۆ سـەرەنجامی شـوومی بێبڕوایـان و، ئاماژەیەکـی کـورت کـراوە لـە یـەک ئایەتـدا بـۆ سـەرەنجامی پـڕ خێـرو خۆشـیی بـڕوادارانی کـردار بـاش، ئەگەرنـا ئـەوی دیکـە هەمـووی بـاسی سـەرەنجامی شـووم و دژوارو سـەختی بێبڕوایانـە.

سـەرەتا خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿وَلِلَّهِ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾، حوکمڕانیـی و دەسـەڵاتی ئاسـمانەکان و زەوی تەنیـا هـی خوایـە ﷻ، تەنیـا خـوا حوکمـڕان و باڵادەسـتە لـە ئاسـمانەکان و زەویـدا، ﴿وَيَوْمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ يَوْمَئِذٍ يَخْسَرُ ٱلْمُبْطِلُونَ ﴿٢٧﴾﴾، ئـەو ڕۆژەش کاتەکـە ﴿ٱلسَّاعَةُ﴾، هەڵدەسـتێ و بەرپـا دەبـێ، لـە کوردەواریـی دا دەڵێـن: قیامـەت ڕابـوو، لێـرەدا: ﴿ٱلسَّاعَةُ﴾، وەک بـە پێـی ڕەوتەکـەی بۆمـان دەردەکـەوێ، یـانی: ئـەو کاتـەی زینـدوو کرانـەوەو سـزاو پاداشـتی تێـدا دێتـە دی، ئەویـش بـە دوو بەڵگـە:

أ- وشەی ﴿تَقُومُ﴾، هەڵدەستێ، کە بەردەوامبوون دەگەیەنێ و، هەڵسانی خەڵکیش دەگەیەنێ.

ب- خوا ﷻ باسی سەرەنجامی هەر کام لە بڕوادارو بێبڕوایان دەکات، ئەوەش لە ڕۆژیی قیامەتدا دەردەکەوێ، نەک لە ئاخیر زەماندا، کە دەفەرموێ: ﴿يَوْمَئِذٍ يَخْسَرُ ٱلْمُبْطِلُونَ﴾، لەو ڕۆژەدا ئەوانەی لەسەر ناهەقن، ئەوانەی دەیانەوێ هەق بپووچێننەوە، زیانبار دەبن،

دۆڕاو دەبن، مایە پووچ دێنە دەرێ، لەو ڕۆژەدا ئەوانەی هەموو هەوڵ و تێکۆشانیان بۆ ئەوەیە، هەق بپووچێننەوەو، هەڵگری ناهەقن، ئەوانە دۆڕاوو زیانبار دەبن.

﴿وَتَرَىٰ كُلَّ أُمَّةٍ جَاثِيَةً﴾، هەر کۆمەڵێک دەبینی لەسەر ئەژنۆیان کەوتوە، (جَثَى عَلَى رُكْبَتَيْهِ: بَرَكَ عَلَى رُكْبَتَهِ)، لەسەر ئەژنۆیان یان لەسەر چۆکان کەوت، (جاثية) سیفەتی ئۆممەتە، (شَخْصٌ جاثٍ، وأُمَّةٌ جاثية)، کەسێک کە لەسەرئەژنۆیان کەوتبێ و، کۆمەڵێک کە لەسەرئەژنۆیان کەوتبن.

خوا دەفەرموێ: هەموو کۆمەڵەکان دەبینی لەسەر ئەژنۆیان کەوتوون، لێرەدا خوا ﷻ هەموو مرۆڤەکان بەوە وەسف دەکات، بە چاک و خراپەوە، لەو ڕۆژەدا لە سام و هەیبەتی ئەو ڕۆژەو لە ترس و بیمی ئەو چارەنووسەی چاوەڕێیان دەکات، هەموویان بەسەر ئەژنۆدا کەوتوون و، چاوەڕێی دادگاییکران دەکەن.

﴿كُلُّ أُمَّةٍ تُدْعَىٰ إِلَىٰ كِتَابِهَا﴾، هەر کۆمەڵە بانگ دەکرێ بۆ نووسراوەکەی خۆی، بۆ لیستی کردەوەکانی، دەگونجێ هەر ئۆممەتێک لیستێکی گشتیی هەبێ، ناوی هەموو تاکەکانی تێدابێ، کردەوەی هەر کامێکیان و سزا، یان پاداشتی هەر کامێکیان، دەشگونجێ تاکەکان هەر کامێکیان نووسراوی تایبەتی خۆی هەبێ، وێڕای ئەو نووسراوە گشتییە، هەر کامێکیان نووسراوێکی تایبەتی خۆی هەبێ، کە خوای شارەزا لە چەند شوێنان ئاماژە بەوە دەکات، بۆ وێنە:

١- لە سوورەتی (الإسراء)دا: ﴿اقْرَأْ كِتَابَكَ كَفَىٰ بِنَفْسِكَ الْيَوْمَ عَلَيْكَ حَسِيبًا ﴿١٤﴾﴾، واتە: نووسراوەکەت بخوێنەوە، ئەمڕۆ بەسە خۆت لێپرسینەوە لەگەڵ خۆتدا بکەی.

٢- لە سوورەتی (الحاقة)دا: ﴿يَا لَيْتَنِي لَمْ أُوتَ كِتَابِيَهْ ﴿٢٥﴾﴾، واتە: خۆزگە نووسراوەکەم وەرنەگرتبایەوە.

٣)- لە سوورەتی (الحاقة)دا، خوا دەفەرموێ: ﴿وَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَابَهُ بِشِمَالِهِ ﴿٢٥﴾﴾، واتە: بەڵام کەسێك بەچەپەی نووسراوەکەی وەربگرێتەوە...

کەواتە: هەر کەسێک لیستی کردەوەی خۆی هەیە، بەس خواش دەزانێ ئەوە چۆنە! یاخود مەبەست ئەوەیە کە هەر کۆمەڵگایەک و هەر کۆمەڵە خەڵکێک، بانگ دەکرێن، هەر کامێکیان بۆ نووسراوەکەی خۆی، ﴿ٱلْيَوْمَ تُجْزَوْنَ مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾، (**هذا مقول قول محذوف**)، ئەمە گوتراوی قسەیەکی قرتێنراوە کە بە سیاق و سەلیقە دەزانرێ (**يُقَالُ لَهُمْ أو قِيلَ لَهُمْ**: ٱلْيَوْمَ تُجْزَوْنَ مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ)، پێیان دەگوترێ، پێیان گوترا: ئەمڕۆ ئەوەی کردبووتان، لەسەری سزاو پاداشت دەدرێنەوە، واتە: سزا و پاداشتی ئەوەی کردبووتان دەدرێنەوە.

﴿هَٰذَا كِتَٰبُنَا يَنطِقُ عَلَيْكُم بِٱلْحَقِّ﴾، ئەمە نووسراوەکەمانە بە هەق لەسەرتان دەدوێ، واتە: بەڕاستیی و، بە شێوەیەکی چەسپاو بە بێ زێدەڕۆیی و کەم و کورتیی، ﴿إِنَّا كُنَّا نَسْتَنسِخُ مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ﴾، ئەمە بەڵگە هێنانەوەیە بۆ ڕستەی پێشێ، کە دەفەرموێ: ئەمە نووسراوی ئێمەیە بە هەق لەسەرتان دەدوێ، بە شێوەیەکی ڕاست و ڕێک، ئنجا بەڵگە دێنێتەوە: ئێمە ئەوەی ئێوە دەتانکرد، نوسخەمان لەبەر دەگرتەوە، واتە: ڕێک کردەوەکە کۆپی دەکراو نوسخەی لەبەر دەگیرایەوە، وەک دوایی لە مەسەلە گرنگەکاندا باسی دەکەین، ئەمە ئیعجازێکی عیلمیی تێدایە، چونکە زانایانی پێشێ وایانزانیوە هەر بە نووسین دەنووسرێ، بەڵام ئێستا کە زانیاریی تەکنۆلۆژیای مەعلووماتیی بەرەو پێشەوە چووە، ئێمە لە چەمک و واتای ئەوە تێدەگەین، لەبەری دەگرینەوە یانی چی؟! ئەگەر ئێستا بەشەر بتوانێ کامێرای چاودێریی وا دابنێ، کە دوایی تۆمارەی بکات و بڵێن: ئەوە نیە، ئەوەتا تۆی فڵانە کارە دەکەی؟ لە سوپەرمارکێت و لە شوێنە گشتییەکان، ئێستا کامێرای چاودێریی دادەنرێ، دوایی دێن تۆماری ئەو کامێرایە لێدەدەنەوە، دەڵێن: ئەو ڕووداوە بەو شێوەیە ڕوویدا، ئەو کەسە ئاوا ئەو دووکانەی بڕی، یان ئەو کەسە ئاوا فڵانکەسی کوشت، یان ئەو دزییەی کرد، ئنجا ئەگەر بەشەر بتوانێ کاری وا بکات، دەبێ خوای بەشەر ﷻ چ ئامێرێکی زۆر سەرسوڕهێنەرو زۆر کۆنترۆڵکەرو وردی دابێتە دەست فریشتەکان و، چ توانایەکی بەو فریشتانە دابێ،

کە تایبەتن بە تۆمارکردنی هەڵسوکەوت و قسەو کردارو نیەت و نیازو مەبەستی نێو دڵی مرۆڤەکان! وەک دەفەرموێ: ﴿ وَإِنَّ عَلَيْكُمْ لَحَافِظِينَ ﴿١٠﴾ كِرَامًا كَاتِبِينَ ﴿١١﴾ يَعْلَمُونَ مَا تَفْعَلُونَ ﴿١٢﴾ ﴾**الإنفطار**، واتە: چەند پارێزەرێکتان بەسەرەوەن، زۆر بەڕێزن، نووسەرن، تۆمارکەرن، دەزانن چی دەکەن، واتە: بە عەقڵ و دڵ، چ خولیاو نیازو مەبەستێکتان لە عەقڵ و دڵتاندا هەیە، هەروەها بە زمانتان تەعبیرەکانتان، ئەندامەکانتان هەموو جموجۆڵ و چالاکییەکانتان دەزانن و، تۆماریان دەکەن، هەر کامەی بەشێوەی خۆی.

﴿ فَأَمَّا الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ فَيُدْخِلُهُمْ رَبُّهُمْ فِي رَحْمَتِهِ ﴾، ئنجا ئەوانەی بڕوایان هێناوەو، کردەوە باشەکانیان ئەنجام داون، پەروەردگاریان دەیانخاتە نێو بەزەیی خۆیەوە، ئەم تەعبیرە: ﴿ فَيُدْخِلُهُمْ رَبُّهُمْ فِي رَحْمَتِهِ ﴾، پەروەردگاریان دەیانخاتە نێو بەزەیی خۆیەوە، وەک عەرەب دەڵێن: (**كُلُّ الصَّيْدِ فِي جَوْفِ الفَرَى**)، هەموو نێچیرەکان لە نێو هەناوی (**فَرى**)دان، (**الفَرى**) پێم وایە بە کوردیی چوارلوویە، یان کوڕەبەشەیە، ئاژەڵێکە بە قەدەر گیسکێک، بەرخێک دەبێ، بەڵام زۆر قەڵەوە، یەک بە یەکێک دەڵێ: دەڵێی چوار لوویە، یان دەڵێی: کوڕەبەشەیە زۆر قەڵەوە، واتە: ڕاوچی، ئەگەر زەفەر بەو ئاژەڵە ببات، کەڵێنی هەموو نێچیرەکانی دیکەی بۆ دەگرێ، با ڕاویشیان نەکات.

ئەوەش کە خوا دەفەرموێ: ئەوانەی بڕوایان هێناوەو کردەوە باشەکانیان ئەنجام داون، پەروەردگاریان دەیانخاتە نێو بەزەیی خۆیەوە، خرانە نێو بەزەیی خوا، هەموو شتێک دەگرێتەوە، چوونە بەهەشت دەگرێتەوە، لێ ڕازیبوونی خوا دەگرێتەوە، هەموو نازو نیعمەتە ماددیی و مەعنەوییەکان دەگرێتەوە، سەرفرازیی دەگرێتەوە، بێ بەڵایی و بێمزەڕەتیی دەگرێتەوە، لەو ڕۆژەدا هەموو شتێک دەگرێتەوە، ﴿ ذَٰلِكَ هُوَ الْفَوْزُ الْمُبِينُ ﴾، هەر ئەوەیە بردنەوەو بە ئامانج گەیشتنی ڕوون و ئاشکرا.

﴿ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ ﴾، بەڵام ئەوانەی بێبڕوابوون، یانی: بێبڕوابوون بە خوا، بە پێغەمبەر ﷺ، بە کتێبی خوا، بە ڕۆژیی دوایی و بە دیداری خوا، بە سزاو پاداشتی خوا، ﴿ أَفَلَمۡ تَكُنۡ ءَايَٰتِي تُتۡلَىٰ عَلَيۡكُمۡ ﴾، یانی: (پێیان دەگوترێ:)، ئایا ئایەتەکانمتان بەسەردا نەدەخوێنرانەوە؟ بەڵام (**يُقَالُ لَهُم**)، قرتێنراوە، چونکە بە سیاق و سەلیقە دیارەو، خوای پەروەردگاریش کتێبی خۆی قەڵەباڵغ نەکردوە، بە هیچ وشەو تەعبیرێک کە عەقڵ و سەلیقەی سەلیم دەرکی پێ دەکات و پەی پێ دەبات، واتە: پێیان دەگوترێ: ئایا ئایەتەکانی منتان بەسەردا نەدەخوێنرانەوە؟ ئەم (أ)یە، هەمزەی پرسیارکردنە، بەڵام دەگونجێ بۆ نکوولییلێکردن بێ، یانی: ئایەتەکانی منتان بەسەردا دەخوێنرانەوە، دەشگونجێ بۆ چەسپاندن (**تقرير**) بێ، چونکە لەوێ نکوولیی لەوە ناکەن کە ئایەتەکانی خوایان بەسەردا خوێنراونەوە، ﴿ فَٱسۡتَكۡبَرۡتُمۡ وَكُنتُمۡ قَوۡمٗا مُّجۡرِمِينَ ﴾، کەچی ئێوە خۆتان بە زلگرت و، کۆمەڵێکی تاوانبار بوون، واتە: تاوانکردن، ڕاگری ئەو کۆمەڵەی ئێوە بوو، حیکمەتی تەعبیری (**كُنتُم قَوماً مجُرِمِين**)، ئەوەیە یانی: ئەوانە کە تەماشات دەکردن، تاوانبارییان لێ دەباریی و، تاوانباریی پێناسەیان و پێکهاتەیان و بناغەی بوونیان بوو.

﴿ وَإِذَا قِيلَ إِنَّ وَعۡدَ ٱللَّهِ حَقّٞ ﴾، کاتێک دەگوترا: بە دڵنیایی بەڵێنی خوا ڕاستەو چەسپاوە، ﴿ وَٱلسَّاعَةُ لَا رَيۡبَ فِيهَا ﴾، کاتەکەش هیچ دوو دڵیی تێدا نیە، واتە: ئەو کاتەی قیامەتی تێدا دێ، هیچ دوو دڵیی تێدا نیە، یاخود (**ساعة**) دەگونجێ مەبەست پێی ئاخیر زەمان بێ، واتە: ئەم دنیا ڕوونە، هەروا بەردەوام نابێ، کاتێک دێ، خوا دەیپێچێتەوە، لاپەڕەی ئەم ژیانە دنیاییە دەپێچێتەوەو، قۆناغێکی دیکە و ژیانێکی دیکە دێتە پێشێ، ئەوە هیچ دوو دڵیی تێدانیە، ﴿ قُلۡتُم مَّا نَدۡرِي مَا ٱلسَّاعَةُ ﴾، ئێوە دەتانگوت ئێمە نازانین کاتەکە (**الساعة**) چییە!؟ ﴿ إِن نَّظُنُّ إِلَّا ظَنّٗا ﴾، ئێمە بەس گومان دەبەین، بەس بە مەزەندە پێمان وایە، دەگونجێ قیامەت، یان ئاخیر زەمان هەبێ، ﴿ وَمَا نَحۡنُ بِمُسۡتَيۡقِنِينَ ﴾، بەڵام ئێمە لە دڵنیایان

نین، واتە: ئێمە لەوانەنین دڵنیابین، کە ئاخیر زەمان یاخود قیامەت دێ، ئێوە واتان دەگوت.

﴿ وَبَدَا لَهُمْ سَيِّئَاتُ مَا عَمِلُوا ﴾، خراپەی ئەوەی دەیانکرد، بۆیان دەرکەوت، واتە: سزای خراپەکانی کە ئەنجامیان دەدان، سزایەکەیان بۆ دەرکەوت، ﴿ وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُوا بِهِ يَسْتَهْزِئُونَ ﴾، دەورەو ئابڵووقەی دان، ئەوەی گاڵتەیان پێ دەکرد، یانی: خودی گاڵتە پێکراوەکە دەورەی دان، کە دۆزەخە، یاخود: سزای گاڵتە پێکراوەکە، ئەگەر پەیامی خوا بووە، یان پێغەمبەر بووە، یان هەرچی بووە، سزایەکەی، دەورەی دان.

﴿ وَقِيلَ الْيَوْمَ نَنسَاكُمْ ﴾، گوتراش: ئەمڕۆ لە بیرتان دەکەین و فەرامۆشتان دەکەین، نادیدەتان دەگرین و پشت گوێتان دەخەین، ئەگەرنا خوا ﷻ هیچ شتێکی لێ ون نابێ: ﴿ وَمَا كَانَ رَبُّكَ نَسِيًّا ﴿٦٤﴾ ﴾مریم، واتە: پەروەردگارت هەرگیز هیچ شتێکی لێ ون نابێ و لە یاد ناچێ، بەڵام ئەوە پەیوەست (لازم)ەکەی مەبەستە، واتە: کەسێک شتێکی لە بیر بچێ، ئاگای لێ نامینێ و فەرامۆشی دەکات و پشتگوێی دەخات، واتە: ئێمەش ئەمڕۆ ئێوە پشتگوێ دەخەین، وەک چۆن کەسێک شتێک کە لە بیری چووە، پشتگوێی دەخات.

﴿ كَمَا نَسِيتُمْ لِقَاءَ يَوْمِكُمْ هَٰذَا ﴾، وەک چۆن ئێوە دیداری ئەمڕۆژەتانتان لە بیرچوو بوو، فەرامۆش کردبوو، ئێمەش ئەمڕۆ لە بیرتان دەکەین و پشتگوێتان دەخەین و نادیدەتان دەگرین، وەک هەر نەبن، ﴿ وَمَأْوَاكُمُ النَّارُ ﴾، جێی حەوانەوەشتان ئاگرە، شوێنێک کە پەنای بۆ دەبەن و تێیدا دەحەوێنەوەو، تێیدا پشوو دەدەن، بریتیە لە ئاگر، خوا پەنامان بدات، ﴿ وَمَا لَكُم مِّن نَّاصِرِينَ ﴾، هیچ پشتیوانیشتان نیەو، هیچ کەس نیە، هاوکارتان بێ و سەرتان بخات و بەرگرییتان لێ بکات، یەکێک دەڵێ: لەبەرچی؟

﴿ ذَٰلِكُم بِأَنَّكُمُ اتَّخَذْتُمْ آيَاتِ اللَّهِ هُزُوًا وَغَرَّتْكُمُ الْحَيَاةُ الدُّنْيَا ﴾، ئەم سزایەشتان بە هۆی ئەوەوە بوو، کە ئایەتەکانی خواتان بە گاڵتە پێکراو گرتبوو، ئایەتەکانی

خواتـان کـرد بـوون بـە گاڵتەجـاڕ، وا پێدەچـێ ئایەتـەکان (**آیـات**) مەبەسـت پێیـان ڕسـتەکانی فەرمایشـتی خـوا بـێ لـەم سـیاقەدا، چونکـە هەمـووی بـاسی قورئانـەو بـاسی ئایەتەکانـە، لـە سـەرەتاوە خـوای پـەروەردگار بـاسی قورئـانی کـرد، ﴿ حمٓ ١ تَنزِيلُ ٱلۡكِتَٰبِ مِنَ ٱللَّهِ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡحَكِيمِ ٢ ﴾، هەروەهـا دوایـی: ﴿ تِلۡكَ ءَايَٰتُ ٱللَّهِ نَتۡلُوهَا عَلَيۡكَ بِٱلۡحَقِّۖ فَبِأَيِّ حَدِيثِۭ بَعۡدَ ٱللَّهِ وَءَايَٰتِهِۦ يُؤۡمِنُونَ ٦ ﴾، هەروەهـا دوایـی: ﴿ وَإِذَا عَلِمَ مِنۡ ءَايَٰتِنَا شَيۡـًٔا ٱتَّخَذَهَا هُزُوًا ﴾، لێـرەش دەفەرمـوێ: ئـەم سـزایەتان بەهـۆی ئەوەوەیـەو، لـە سـۆنگەی ئەوەوەیـە، کـە ئایەتـەکانی خواتـان بەگاڵتـە پێکـراو گرتبـوون و کردبووتانـن بەگاڵتەجـاڕو پێتـان ڕادەبـواردن، ﴿ وَغَرَّتۡكُمُ ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَا ﴾، ژیـانی دنیـاش فریویـدان، ژیـانی دنیـا لـە ڕووە ماددییەکەیـەوە، هەڵیخەڵەتانـدن و فریویـدان، ﴿ فَٱلۡيَوۡمَ لَا يُخۡرَجُونَ مِنۡهَا وَلَا هُمۡ يُسۡتَعۡتَبُونَ ﴾، ئەمـڕۆ نـە لێـی دەبرێنـە دەرێ و، نـە داواشـیان لێدەکـرێ داوای لێبـوردن بکـەن (لـە خـوا)، یاخـود نـە داواشـیان لـێ دەکـرێ خـوا ﷻ لـە خۆیـان ڕازیبکـەن.

وشـەی: ﴿ يُخۡرَجُونَ ﴾، خوێنراویشـەتەوە: (**يَخْرُجُـون**)، واتـە: ئەمـڕۆ لێـی ناچنـە دەرێ و، لێـی نابرێنـە دەرێ، ﴿ وَلَا هُمۡ يُسۡتَعۡتَبُونَ ﴾، داوای داوای لێبوردنکردنیشـیان لێناکـرێ، واتـە: داوایـان لێناکـرێ، داوای لێبـوردن بکـەن، یاخـود: داوای ڕازییکـردنی خـوای پەروەردگاریشـیان لێناکـرێ، چونکـە ئـەوە تێپـەڕی و کاتی نەمـاوە.

﴿ فَلِلَّهِ ٱلۡحَمۡدُ رَبِّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَرَبِّ ٱلۡأَرۡضِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴾، سـتایش هـەر هـی خوایـە، پـەروەردگاری ئاسـمانەکان، پـەروەردگاری زەوی، پـەروەردگاری جیهانییـان.

﴿ وَلَهُ ٱلۡكِبۡرِيَآءُ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ ﴾، هەرچـی مەزنیـی و گەورەیـی و باڵادەسـتیی و شـکۆ هەیـە، هـەر هـی ئـەوە، لـە ئاسـمانەکان و زەویـدا، ﴿ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ﴾، هـەر ئـەو بـاڵا دەسـت و زاڵ و کارزانـە ﷻ.

خـوا ﷻ کۆتایـی ئـەم سـوورەتە موبارەکـە، بـەم دوو ئایەتـە دێنـێ و، ڕایدەگەیەنێ کـە هەرچـی سـتایش و پـێ هـەڵا گوتـن و مـەدح و سـەنا هەیـە، هـی خوایـە،

هەرچی سیفەتی بەرزو جوان و پەسند هەیە، هەمووی هی خوایە کە خاوەن و پەروەردگارو مشوورخۆری ئاسمانەکانە، خاوەن و پەروەردگار و مشوورخۆری زەوییە، خاوەن و پەروەردگارو مشوورخۆری جیهانییانە، جیهانییان واتە: جیهانی فریشتان، جیهانی مرۆڤان، جیهانی جند، هەروەها جیهانی ماددەی بێ ژیان، جیهانی ڕووەک، جیهانی ئاژەڵان، ئاژەڵیش بە هەموو جۆرەکانیەوە، پەڕەورو زیندەوەرو هی نێو ئاوو، هی نێو هەواو، هی ژێر زەوی، هەروەها جیهانی فراوانی گەردوون، کە پێشتر فەرمووی: ﴿ رَبِّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ ﴾، یانی: جیهانی فراوانی گەردوون، چ ئەوەی بۆ ئێمە دیارییکراوەو زانراوە، بە زانین یان بە مەزەندە، چ ئەوەی پەنهانەو نەزانراوە، هەروەها هەموو گەورەیی و شکۆو بەرزییەک بۆ خوا لە ئاسمانەکان و زەویداو، هەر ئەو زاڵی کارزانە.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**حوکمڕانیی و دەسەتەڵاتی گەردوون هی خوایە ﷻ، لە ڕۆژی قیامەتیشدا بێبڕوایانی هەوڵدەر بۆ لابردنی هەق و پووچەڵکردنەوەی، زیانبار دەبن، تێکڕای ئوممەتان لەو ڕۆژەدا لەسەر ئەژنۆیان دەکەون، بەرەو لیستی تۆماری کردەوەکانیان بانگ دەکرێن و پێیان دەگوترێ: ئەمە نووسراوی ئێمەیە بەڕاستیی و بە هەق لە سەرتان دەدوێ، چونکە هەرچی کردووتانە، لەبەری گیراوەتەوەو کۆپیی کراوە:**

خوا دەفەرموێ: ﴿وَلِلَّهِ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَيَوْمَ تَقُومُ السَّاعَةُ يَوْمَئِذٍ يَخْسَرُ الْمُبْطِلُونَ ﴿٢٧﴾ وَتَرَىٰ كُلَّ أُمَّةٍ جَاثِيَةً كُلُّ أُمَّةٍ تُدْعَىٰ إِلَىٰ كِتَابِهَا الْيَوْمَ تُجْزَوْنَ مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٢٨﴾ هَٰذَا كِتَابُنَا يَنطِقُ عَلَيْكُم بِالْحَقِّ إِنَّا كُنَّا نَسْتَنسِخُ مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٢٩﴾﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە حەوت بڕگەدا:

١)- ﴿وَلِلَّهِ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ﴾، {لە زمانی عەرەبییدا کاتێک **(الجارّ والمجرور)**، پێش دەخرێن، مانای کورتهەڵێنان دەگەیەنێ}، حوکمڕانیی و باڵادەستیی لە ئاسمانەکان و زەویدا، تەنیا هی خوایە ﷻ، **(الطبري)** لە تەفسیرەکەی خۆیدا[1]، ئاوا ئەم ڕستەیە شیی دەکاتەوەو مانا دەکات: **(وَللهِ سُلْطَانُ السَّمَوَاتِ والأرض، دُونَ مَا تَدْعُونَهُ لَهُ شَرِيْكَاً)**، باڵا دەستیی و حوکمڕانیی حەوت ئاسمانەکان و زەوی، تەنها هی خوایە، نەک هی ئەوانەی وەک هاوبەش بۆ خوا بانگەشەیان بۆ دەکەن و، لێیان دەپاڕێنەوە.

---

(١) جامع البيان، ج٢٥، ص ١٥٨ ، ١٥٩.

٢)- ﴿وَيَوۡمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ يَوۡمَئِذٖ يَخۡسَرُ ٱلۡمُبۡطِلُونَ﴾، ئەو ڕۆژەش کە کاتەکە (ٱلسَّاعَةُ) هەڵدەستێ و قیامەت ڕا دەبێ، هەڵگرانی ناهەق زیانبار دەبن، لێرەدا (ٱلسَّاعَةُ)، مەبەست پێی قیامەتە، ئەگەرنا (ٱلسَّاعَةُ) یانی: کاتێکی دیارییکراو کە خوا ﷻ کردوویەتی بە ناوێکی عەلەم، هەم بۆ ئاخیر زەمان، کۆتایی هاتنی ئەم گەردوونەو ئەم دنیایە، هەم بۆ قیامەت و هەڵسانەوەو زیندووکرانەوەش، ئنجا بەپێی سیاق دەزانرێ کە (ٱلسَّاعَةُ) ئایا مەبەست پێی ئاخیر زەمانە، یان قیامەتە؟ بەڵام لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿وَيَوۡمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ يَوۡمَئِذٖ يَخۡسَرُ ٱلۡمُبۡطِلُونَ﴾، بە نیشانەی ئەوە کە دەفەرموێ: ئەو ڕۆژەی (ٱلسَّاعَةُ) هەڵدەستێ بەرپا دەبێ، ئەو ڕۆژە ناهەقان زیانبار دەبن، واتە: ئەو کاتەی کە سزاو پاداشت و لێپرسینەوەی تێدا دێتەگۆڕێ.

﴿يَخۡسَرُ ٱلۡمُبۡطِلُونَ﴾، ئەوانەی کە لەسەر ناهەق بوون، یان ئەوانەی ویستوویانە هەق لابەرن، زیانبار دەبن، ئەوانەی لە دنیادا قسەی ناهەق و بانگەشەی ناهەقیان کردووە، هاوبەشیان بۆ خوا داناوە، لەو ڕۆژەدا زیانبار دەبن، (خَسِرَ يَخْسَر، أي: غُبِنَ يُغْبَنُ)، دۆڕا، دەدۆڕێ، زیانی کرد، واتە: (ضَاعَ رَأْسَمَالِه) سەرمایەکەی فەوتا، بەڵام (خَسَرَ يَخْسِرُ)، بە مانای: (نَقَصَ يَنْقُصُ)، کەمی کرد، کەم دەکات، یانی: شتێک لێی کەم کردو لێی کەم دەکات.

(الطبري) لە تەفسیری ئەو ئایەتە موبارەکەدا کە دەفەرموێ: ﴿وَيَوۡمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ يَوۡمَئِذٖ يَخۡسَرُ ٱلۡمُبۡطِلُونَ﴾، دەڵێ: (وَيَوْمَ تَجِيءُ السَّاعَةُ الَّتِي يَنْشُرُ اللهُ فِيهَا الْمَوْتَى مِنْ قُبُورِهِمْ، وَيَجْمَعُهُمْ لِمَوْقِفِ الْعَرْضِ ﴿يَخۡسَرُ ٱلۡمُبۡطِلُونَ﴾ الجاثية: ٢٧، يَقُولُ: يُغْبَنُ فِيهَا الَّذِينَ أَبْطَلُوا فِي الدُّنْيَا فِي أَقْوَالِهِمْ وَدَعْوَاهُمْ لِلَّهِ شَرِيكًا، وَعِبَادَتِهِمْ آلِهَةً دُونَهُ بِأَنْ يَفُوزَ بِمَنَازِلِهِم مِنَ الْجَنَّةِ الْمُحِقُّونَ، وَيُبَدَّلُوا بِهَا مَنَازِلَ مِنَ النَّارِ، كَانَتْ لِلْمُحِقِّينَ، فَجُعِلَتْ لَهُمْ بِمَنَازِلِهِمْ مِنَ الْجَنَّةِ، ذَلِكَ هُوَ الْخُسْرَانُ الْمُبِينُ)[1]، واتە: ئەو ڕۆژەی ساعە دێ و خوا مردووەکان تێیدا زیندوو دەکاتەوە، لە گۆڕەکانیان و بۆ ڕانواندن کۆیان

---

(١) جامع البيان: ج٢٥، س١٠٠.

دەکاتـەوە، لـەو ڕۆژەدا ئەوانـەی لـە دنیـادا قسـەی ناهـەق و بانگەشـەی ناهەقیـان کـردوە، کـە هاوبەشـیان بـۆ خـوا دانـاوە، ئەوانـە دۆڕاو دەبـن و، ئەوانـەی لەسـەر هـەق بـوون، ئـەو مەنزڵـگاو جێـگاو ڕێـگا گریـمان کراوانـەی بـۆ بێبڕوایـەکان لـە بەهەشـتێ دانـراون، لێیـان بـە میـرات دەگـرن، لـە جیاتـی ئـەوەش ئـەو جێـگاو ڕێـگا گریمانکراوانـەی دانـدراون، بـۆ ئەوانـەی کـە ئەهـلی ئیـمان و کـردەوەی چاکـن، (ئەگـەر بێبـڕواو کـردار خـراپ بوونایـە، دەچوونـە ئـەو جێـگاو ڕێگایانـە)، ئـەو جێگەو ڕێگایانـەش دەدرێـن بـە بێبڕوایـەکان.

(هـەر کامێکیـان جێگـەو ڕێـگای ئـەوی دیکـە، بـە میـرات دەگـرن، ئیمانـداران لـە بەهەشـتدا، جێـگاو ڕێگایـان بـە میـرات دەگـرن و، بێبڕوایانیـش لـە دۆزەخـدا جێـگاو ڕێـگای ئیمانـداران بـە میـرات دەگـرن).

٣)- ﴿ وَتَرَىٰ كُلَّ أُمَّةٍ جَاثِيَةً ﴾، تۆ هەر کۆمەڵێک دەبینی لەسەر چۆکان، ئەژنۆیان کەوتوە، (**بَارِكِينَ عَلَى الرُّكَبِ مُسْتَوفِزِينَ عَلَى هَيْئَةِ المذْنِبِ المنْتَظِرِ بِمَا يَكْرَه**)، واتە: لەسەر ئەژنۆیانیان کەوتوون و لەسەر هەستن، وەک شێوەی بابایەکی تاوانباری چاوەڕێی سزا.

٤)- ﴿ كُلُّ أُمَّةٍ تُدْعَىٰٓ إِلَىٰ كِتَٰبِهَا ﴾، هەر کۆمەڵە بانگ دەکرێ بۆ نووسراوەکەی خۆی، نووسراوێکی گشتیی کە هی تاک تاکیانی تێدایە، یاخود: هەر کۆمەڵێک بانگ دەکرێ بۆ نووسراوەکەی خۆی، واتە: تاک تاکی کۆمەڵەکە، هەر کامیان لیست و نووسراو و بڕوانامەی خۆی وەردەگرێتەوە.

٥)- ﴿ ٱلْيَوْمَ تُجْزَوْنَ مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴾، (پێشیان دەگوترێ:) ئەمڕۆ بە پێی ئەوەی دەتانکرد، سزاو پاداشت دەدرێنەوە، (**يَكُونُ جَزَاؤُهُم عَلَى وفْقِ أَعْمَالِهِم**)، سزا یان پاداشتیان بەپێی کردەوەکانیانە.

٦)- ﴿ هَٰذَا كِتَٰبُنَا يَنطِقُ عَلَيْكُم بِٱلْحَقِّ ﴾، (پێیان دەگوترێ:) ئەمە نووسراوەکەمانە بە هەق و ڕاستیی، لە دژتان دەدوێ، قسەتان لەسەر دەکات و شایەدییتان لەسەر دەدات، (**عُدِّيَ يَنْطِقُ بـ «عَلَى» لإفَادَةِ مَعْنَى: يَشْهَدُ**)، (يَنطِقُ) پێویستیی بە (**عَلَى**) نیە، (يَنطِقُ)، یانی: دەدوێ،

بەڵام کە دەفەرموێ: (یَنطِقُ عَلَیۡكُم)، بەهۆی (على)وە وشەی (یَنطِقُ) مانای (یَشْهَدُ)شی، خراوەتە نێو، وێڕای مانای (دەدوێ)، مانای (شایەدیی دەدا)شی خراوەتێ، چونکە بنچینەی (تَضْمِيْن)، (خرانە نێو) لە زمانی عەرەبییدا، وەختێک کردارێک کە عادەت نیە، بە پیتێک تەعەددا بکات و بەرکار بخوازێ، بەو پیتە بەرکار دەخوازێ، وێڕای مانای خۆی، مانایەکی دیکەش دەگەیەنێ و لە یەک کاتدا، دوو واتایان دەگەیەنێ.

واتە: ئەمە نووسراوەکەی ئێمەیە، بە شێوەیەکی ڕاست لە بارەتانەوە دەدوێ و شایەدییتان لەسەر دەدات.

٧)- ﴿إِنَّا كُنَّا نَسۡتَنسِخُ مَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ﴾، ئێمە ئەوەی دەتانکرد، لەبەرمان دەگرتەوە، ئەمە بەڵگە هێنانەوەیە بۆ ڕستەی پێشێ، واتە: بۆیە بەڕاستیی شایەدییتان لەسەر دەداو، لە بارەتانەوە دەدوێ، ئەو نووسراوەی ئێوەو، ئەو تۆمارەی ئێمە، چونکە ئێمە ئەوەی دەتانکرد کاتی خۆی، لەبەرمان دەگرتەوە

وشەی (نَسۡتَنسِخُ):

**أ**- زانایان هەندێکیان گوتوویانە: (**نَكْتُبُ**)، دەمانووسیی.

**ب**- هەندێکیان گووتویانە: (**نُكَلِّفُ المَلَائِكَةَ بِكِتَابَتِهِ**)، فریشتەکانمان ئەرکدار کردبوون، کە بینووسن.

**ج**- هەندێکیان گووتویانە: (**نَنْقُلُ مِنَ اللَّوْحِ المحْفُوظِ**)، لە لەوحی پارێزراوەوە ئەوەی کە خوا هەموو زانیارییەکانی خۆی تێدا تۆمار کردون، لەوێوە دەمانگواستەوە، بەڵام مانا ڕاستەکەی ئەوەیە: (**نُسَجِّلُ وَنُصَوِّرُ**)، ئێمە تۆمارمان دەکردو وێنەمان لێ دەگرتەوە، وەک چۆن مرۆڤ ئێستا دەتوانێ ئەوە بکات، کە ئەمە بێگومان ئاماژەیەکی عیلمییەو ئیعجازێکی زانستییە، کە خوا ﷻ هەزارو چوارسەدو ئەوەندە ساڵ پێش ئەوەی مرۆڤ بتوانێ ئەو ئامێرانە دابێنێ، کە بە دەنگ و وێنەوە، شتان تۆمار دەکەن و هەڵیدەگرن و لە کاتی پێویستدا لێ دەدرێنەوە، خوا ئاماژەی بەوە کردوە.

هەروەک لە سووڕەتی (**الكهف**)یشدا، کە لەوێ قسەمان لەو بارەوە کردوە، بۆیە لێرە دووبارەی ناکەینەوە، دەفەرموێ: ﴿ وَوَجَدُواْ مَا عَمِلُواْ حَاضِرًاۗ وَلَا يَظۡلِمُ رَبُّكَ أَحَدًا ٤٩ ﴾، خوا دەفەرموێ: ئەوەی کردبوویان بە ئامادە کراویی بینییان، واتە: خودی کردەوەکە دەبیننەوە، خودی قسەکە دەبیننەوە، خودی هەڵسوکەوتەکە دەبیننەوە، نەک نووسراوێک لە لیستێکدا، ﴿ وَوَجَدُواْ مَا عَمِلُواْ حَاضِرًا ﴾، ئەوەی کردبوویان بە ئامادەکراویی بینییان، دەگوترێ: ئەوە تۆی ئەها تەماشا بکە، ئەوە دەنگت، ئەوە وێنەکەی تۆ، ئەوە هەڵسوکەوتەکەی تۆ، هەم ئایەتەکەی سووڕەتی (**الكهف**)، هەم ئەم ئایەتە، زۆر بە ڕوونیی دەلالەت لەسەر ئەوە دەکەن، هەروەها ئەو ئایەتەی سووڕەتی (**الزلزلة**)یش، کە دەفەرموێ: ﴿ فَمَن يَعۡمَلۡ مِثۡقَالَ ذَرَّةٍ خَيۡرٗا يَرَهُۥ ٧ وَمَن يَعۡمَلۡ مِثۡقَالَ ذَرَّةٖ شَرّٗا يَرَهُۥ ٨ ﴾، واتە: هەر کەسێک بە گرانایی گەردێک چاکە بکات، دەیبینێ، (کردەوەکە دەبینێتەوە)، هەروەها هەر کەسێک بە گرانایی گەردێک خراپە بکات، دەیبینێ، (واتە: خودی کردەوەکە دەبینێتەوە).

لە بارەی ئەوەوە کە خوا ﷻ دەفەرموێ: لەو ڕۆژەدا، ئەوانەی لەسەر ناهەقن، زیانباردەبن، زانایان زۆریان قسە کردوە، بەڵام زۆر گەڕام، دەقێکم نەبینی لەو بارەوە، دەقێک لە پێغەمبەرەوە ﷺ بەڵام هەموویان ئەو قسەیان لەو بارەیەوە کردوە، کە ئیمانداران شوێنی بێبڕوایان لە بەهەشتدا بە میرات دەگرن و، بێبڕوایانیش شوێنی ئیمانداران لە دۆزەخدا بە میرات دەگرن.

(**الشيخ حسنين محمد مخلوف**) لە تەفسیری ئەم ئایەتە لە سووڕەتی (**التغابن**) دا: ﴿ يَوۡمَ يَجۡمَعُكُمۡ لِيَوۡمِ ٱلۡجَمۡعِۖ ذَٰلِكَ يَوۡمُ ٱلتَّغَابُنِۗ ٩ ﴾، دەڵێ: (**أي: يَوْمٌ غَبَنَ فِيهِ بَعْضُ النَّاس بَعْضاً بنُزُولِ السُّعَدَاءِ مَنَازِلَ الأَشْقِيَاءِ الَّتِي كَانُوا يَنْزِلُونَهَا لَوْ كَانُوا سُعَدَاءَ، وَنُزُول الأَشْقِيَاء مَنَازِل السُّعَدَاء الَّتِي كَانُوا يَنْزِلُونها لَوْ كَانُوا أَشْقِياء، مُسْتَعَارٌ مِنَ (تَغَابُنِ القَوْمُ فِي التِّجَارَةِ) إِذَا غَبَنَ بَعْضُهُم بَعْضاً فِيهَا، وَفِعْلُهُ مِنْ بَاب: ضَرَبَ، وَفِيهِ**

**تَهَكَّمُ بالأَشْقِيَاءِ لأَنَّهُم بنُزُولِهِم مَنَازِلَهم مِنَ النَّارِ، لاَ يَغِبنُونَ السُّعَدَاءَ)**[1]، واتە: لەو ڕۆژەدا کە هەندێکیان زیان لە هەندێکیان دەدەن، بەهۆی ئەوەوە کە بەختەوەران دەچنە شوێنی بەدبەختان، کە ئەگەر بەختەوەر بوونایە، دەیانچوونەتێ لە بەهەشتێ و، بەدبەختان و خراپەکارانیش دەچنە شوێنی بەختەوەران لە دۆزەخدا، کە ئەگەر خراپەکاربوونایە، دەیچوونەتێ، ئەمیش خوازراوەتەوە لە (**تَغَابَنَ القَوْمُ فِي التِّجَارَة**) واتە: کۆمەڵە خەڵکێک لە بازرگانیی دا زیانیان لە یەکدیی دا، ئەگەر هەندێکیان زیانیان لە یەکدی دا تێیدا، کردارەکەشی لە جۆری: (**ضرب**)ەوە هاتوە {**غَبَنَ يَغبِن، ضَرَبَ يَضْرِب**}، ئەمە جۆرێک لە گاڵتە پێکردنیشە بە بەدبەختان و بێبڕوایەکان، چونکە ئەوان کە لە دۆزەخدا، شوێنی بەهەشتییەکان، شوێنی ئیمانداران بە میرات دەگرن، لە ڕاستییدا، زیان لە ئیمانداران نادەن، {هەر سزاو ئازار بۆ خۆیان زیاد دەکەن}.

---

(١) صفوة البيان لمعاني القرآن، ص٧٢٧ و ٧٢٨.

### مەسەلەی دووەم:

**بڕوادارانی کردار باش کە خوا دەیانخاتە نێو بەزەیی خۆیەوە، بردنەوەو بە مراد گەیشتنی مەزنیان پێ دەبڕێ و، بێبڕوایانی خۆ بە زلگرو تاوانباریش، کە هەمیشە لە گومان و دوو دڵیی دابوون، لە بارەی پەیامی خواو لە بارەی ڕۆژی دوایی و، دیداری خواوە، خراپەکانیانیان بۆ دەردەکەون و، سزای ئەوەی گاڵتەیان پێدەکرد، دەوریان دەدات:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فَيُدۡخِلُهُمۡ رَبُّهُمۡ فِي رَحۡمَتِهِۦۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡمُبِينُ ﴿٣٠﴾ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَفَلَمۡ تَكُنۡ ءَايَٰتِي تُتۡلَىٰ عَلَيۡكُمۡ فَٱسۡتَكۡبَرۡتُمۡ وَكُنتُمۡ قَوۡمٗا مُّجۡرِمِينَ ﴿٣١﴾ وَإِذَا قِيلَ إِنَّ وَعۡدَ ٱللَّهِ حَقّٞ وَٱلسَّاعَةُ لَا رَيۡبَ فِيهَا قُلۡتُم مَّا نَدۡرِي مَا ٱلسَّاعَةُ إِن نَّظُنُّ إِلَّا ظَنّٗا وَمَا نَحۡنُ بِمُسۡتَيۡقِنِينَ ﴿٣٢﴾ وَبَدَا لَهُمۡ سَيِّـَٔاتُ مَا عَمِلُواْ وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُواْ بِهِۦ يَسۡتَهۡزِءُونَ ﴿٣٣﴾ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە سێزدە بڕگەدا:

١)- ﴿ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ ﴾، ئنجا ئەوانەی بڕوایان هێناوەو کردەوە باشەکانیان ئەنجامداون.

٢)- ﴿ فَيُدۡخِلُهُمۡ رَبُّهُمۡ فِي رَحۡمَتِهِۦ ﴾، پەروەردگاریان دەیانخاتە نێو بەزەیی خۆیەوە.

٣)- ﴿ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡمُبِينُ ﴾، ئا ئەوە بە ئامانج گەیشتن و بردنەوەی مەزن و ئاشکراو ڕوونە.

لێرە کە دەفەرموێ: ﴿ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ ﴾، (فَ)ی (فأمّا): (لِعَطْفِ الْمُفَصَّلِ عَلَى الْمُجْمَلِ، وَهَـذَا تَفْصِيلٌ لِـ: ﴿ وَتَرَىٰ كُلَّ أُمَّةٖ جَاثِيَةٗ ﴾)، کە دەفەرموێ: ( فَأَمَّا )، ئەم (ف)ە بۆ بادانەوەیە، بادانەوەی قسەی ڕوون و ئاشکرا لەسەر قسەیەک کە پێشتر بە کورتیی کراوە، ئەوەی بە کورتیی کراوە، ئەوەیە کە دەفەرموێ:

﴿ وَتَرَىٰ كُلَّ أُمَّةٍ جَاثِيَةً ﴾، هەر کۆمەڵێک دەبینی لەسەر ئەژنۆیان، ئنجا دێتە سەر درێژەکەی: ئەوانەی لەسەر ئەژنۆیانن، کە هەموو مرۆڤەکانن، بەڵام ئەوانەیان کە بڕوایان هێناوەو کردەوە باشەکانیان ئەنجام داون، ﴿ فَيُدْخِلُهُمْ رَبُّهُمْ فِى رَحْمَتِهِۦ ﴾، پەروەردگاریان دەیانخاتە نێو بەزەیی خۆیەوە، ئەمە بۆ ئەوەیە هەم بڕواداران دڵخۆش بکرێن و موژدەیان پێ بدرێ، هەم بۆ خراپەکارانیش دیارە هەواڵێکی ناخۆشەو، زیاتر مایەی خەفەت و مەینەتییانە، ﴿ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَوْزُ ٱلْمُبِينُ ﴾، (**الفَوْزُ: الظَّفَرُ بالخَيْرِ مَعَ حُصُولِ السَّلاَمَة**)، (فَوْز): بریتیە لەوە کە ئینسان چاکەو خێرو بەرژەوەندیی بۆ دابین بێ، لەگەڵ سەلامەتیی و بێمزەڕەتیی و بێ بەڵاییشدا، چونکە جاری وایە ئینسان قازانج دەکات، یاخود خۆشییەکی دێتە ڕێ، بەڵام ناڕەحەتییانیش دەبینێ، بەڵام (فَوْز) ئەوەیە کە بەبێ دیتنی ناڕەحەتیی، خێرو خۆشیی ببینێ.

ئنجا دێتە سەر باسی حاڵ و گوزەرانی ئەوانەی بێبڕوان:

٤)- ﴿ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ ﴾، بەڵام ئەوانەی بێبڕوان، واتە: بێبڕوابوون بە خوا ﷻ، یاخود بڕوایان بە خوا هەبووە، وەک بەدیهێنەرو پەروەردگار، بەڵام بێبڕوابوون بە یەکتایی خوا لە پەرستران دا، یان: بێبڕوابوون بە پەیام و پێغەمبەری خوا ﷺ، یاخود بڕوایان بەوەش بووە، بەڵام بێبڕوابوون بە دیداری خوا، ئەوانەی بێبڕوابوون بە هەر شێوەیەک لە شێوەکانی بێبڕوایی.

٥)- ﴿ أَفَلَمْ تَكُنْ ءَايَٰتِى تُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ ﴾، ئایا ئایەتەکانمتان بەسەردا نەدەخوێنرانەوە؟ وەک پێشتریش گوتمان: ئەمە لێرەدا شتێک قرتێنراوە، کە بە سیاق و سەلیقە دەزانرێ، واتە: (**يقال لهم**)، پێیان دەگوترێ: (أَفَلَمْ تَكُنْ ءَايَٰتِى تُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ)، ئەدی ئایەتەکانی منتان بەسەردا نەدەخوێنرانەوە؟ ئەمە پرسیارکردنەو پرسیارکردنەکەش دەگونجێ بۆ سەرزەنشت بێ، دەشگونجێ بۆ چەسپاندن بێ، واتە: خۆتان دەزانن ئایەتەکانتان بەسەردا دەخوێنرایەوە، یان بۆ هەردووکیانە، بۆ سەرزەنشتیشەو بۆ چەسپاندنیشە، بەڵام بە تەئکید بۆ

نکووڵییلێکردن نیە، چونکە لەوێ کەس نکووڵیی لەوە ناکات، کە ئایەتەکانی خوای پێگەیشتن و بەسەریدا خوێنرانەوە.

٦)- ﴿ فَٱسۡتَكۡبَرۡتُمۡ وَكُنتُمۡ قَوۡمٗا مُّجۡرِمِينَ ﴾، کەچی ئێوە خۆتان بە زلگرت و، کۆمەڵێکی تاوانبار بوون، کە دەفەرموێ: (وَكُنتُمۡ قَوۡمٗا مُّجۡرِمِينَ)، لە جیاتی ئەوەی بفەرموێ: (**وكنتم مجرمين**) بۆیە وا دەفەرموێ: تاکو ئەوە بگەیەنێ کە تاوانباریی بۆتە خەسڵەتێکی ڕیشەداریان و، تێکەڵ بە دەروونیان بووە، تاکو وای لێهاتوە بۆتە ڕاگر (**مُقَوِّم**)ێک لە ڕاگرەکانی کۆمەڵبوونیان.

کەواتە: لێرە خوا ﷻ سێ مۆریان بەنێو چەوانەوە دەنێ:

**یەکەمیان:** ﴿ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ ﴾، بێبڕوایی.

**دووەمیان:** ﴿ فَٱسۡتَكۡبَرۡتُمۡ ﴾، خۆ بەزلگەریی.

**سێیەمیان:** ،﴿ وَكُنتُمۡ قَوۡمٗا مُّجۡرِمِينَ ﴾، تاوانباریی.

کە لە ڕاستییدا ئەو سێیە تێکهەڵکێشن و یەکدی پەلکێش دەکەن، هەر کەس بێبڕوا بێ، خۆ بەزلگریش دەبێ، هەر کەس دان بە بوونی خوادا نەهێنێ، یان دان بە بوونی خوادا بێنێ، بەڵام دان بە ڕاستیی پێغەمبەردا نەهێنێ، یاخود بڕوای بە دیداری خواو ڕۆژیی دوایی نەبێ، کەسی وا هەر لە خۆوە بوغڕا دەبێ و، خۆی لەلا زل دەبێ، ئەوەش سەر دەکێشێ بۆ ئەوەی تاوانباریی بکات و، ڕێی گوناح و تاوانی لە بەردەمدا ئاچووخ و تەخت دەبێ، وەک خوا ﷻ لە سوورەتی (**القيامة**)دا دەفەرموێ: ﴿ بَلۡ يُرِيدُ ٱلۡإِنسَٰنُ لِيَفۡجُرَ أَمَامَهُۥ ۝٥ يَسۡـَٔلُ أَيَّانَ يَوۡمُ ٱلۡقِيَٰمَةِ ۝٦ ﴾، مرۆڤی بێبڕوا دەیەوێ لە پێشیەوە، گوناهو تاوان بکات، خراپەکاریی بکات، بۆیە دەپرسێ: ڕۆژی قیامەتی کەنگێیە؟

لە ڕاستییدا ڕۆژی قیامەت و بڕوابوون بە ڕۆژی دوایی، بە سزاو پاداشتی خوا، لەمپەرو کۆسپێکە لە بەردەم ئینساندا، کە تاوان و لادان بکات، بەڵام کەسێک بڕوای بەوە نەبێ کە دەچێتەوە خزمەت خوای پەروەردگارو خاوەنی خۆی، ئەو

کاتـە لـە لای وی: مانایـەک بـۆ حـەڵاڵ و حـەڕام و، مانایـەک بـۆ چاکـەو خراپـە نامێنـێ، چونکـە ئیـمان ئـەو چاوگەیـە، مانـا دەدات بـە هەرچـی ڕەوشـت و بەهایـە، کـە ئیـمان نەبـوو، هەمـوو ڕەوشـت و بەهایـەکان بـێ پشـتیوان دەبـن، وەکـو پـارەی بـێ پشـتیوان (رصیـد) و ڕەوشـت و بەهایـەکان، هیـچ واتایەکیـان نامێنـێ، بـەڵام ڕاسـتیی و پاکیـی و چاکیـی و هەمـوو سـیفەتە بـەرزەکان، ئیـمان واتـاو نێوەڕۆکیـان پێـدەدا، وەک لـە مەوسـووعەی (ئیـمان و ئیلحـاد)دا، باسـمان کـردوە لـە ڕاسـتییدا لەگـەڵ لەگـەڵ ئیلحـادو بێبڕوایـی دا، واتایـەک بـۆ ڕەوشـت و بەهـا بـەرزەکان نامێنێتـەوەو، خەسـڵەتە پەسـندەکان ئـەو پشـتیوانەیان نابـێ، بـوون و پاسـاوو بەردەوامییـان پێبـدات.

٧)- ﴿ وَإِذَا قِيلَ إِنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ ﴾، هەر کاتێک (لە دنیادا پێتان) دەگوترا: بەدڵنیایی بەڵێنی خوا ڕاستە، یانی: (**وَعْدُ اللهِ بِمَجِئِ السَّاعَةِ الَّتِي يُبْعَثُونَ فِيْهَا، ثَابِتٌ**)، بەڵێنی خوا، بەو کاتەی تێیدا زیندوو دەکرێنەوە، ڕاست و چەسپاوە.

٨)- ﴿ وَٱلسَّاعَةُ لَا رَيْبَ فِيهَا ﴾، ئەو کاتە دیارییکراوەش، هیچ دوو دڵیی تێدانیە، وشەی (**الساعة**) کە بە (**أل**) ناسێنراوە، بۆ (**عهد**)ە، (**التَّعْرِيفُ لِلْعَهْدِ، وَهِيَ سَاعَةُ البَعْثِ**)، واتە: ئەو کاتە دیارییکراوەی کە زیندووکرانەوەی تێدا ئەنجام دەدرێ، هیچ دوو دڵیی تێدانیە، واتە: دوو دڵیی تێدانیە، ئەگەر بە چاوی عەقڵ و مەنتیق تەماشای بکەی، بە چاوی ویژدان تەماشای بکەی، ئەگەرنا ئەوەتا بێبڕوایان تێیدا، لە گومان دابوون و، تێیدا دوو دڵ بوون، لەبەر ئەوەی بە چاوی عەقڵ و مەنتیق تەماشایان نەکردوەو، بە چاوی وەحییش هەر هیچ تەماشایان نەکردوەو، عەقڵی سەلیمی خۆشیان تێدا چاک بەکارنەهێناوە، کاتێک پێتان دەگوترا: بەڵێنی خوا ڕاستەو چەسپاوە، قیامەتیش جێی دوو دڵیی نیە.

٩)- ﴿ قُلْتُم مَّا نَدْرِى مَا ٱلسَّاعَةُ ﴾، ئێوە گوتتان: ئێمە نازانین کاتەکە چییە؟ واتە: نازانین ئەو کاتەی ئێوە دەڵێن: خەڵکی تێدا زیندوو دەکرێتەوە، چییە؟! ئنجا ئەمە نکووڵییکردنە هەر لە خودی هەبوونی (**سَاعَة**)، کە شتێک نیە بزانرێ و دەرک بکرێ و عەقڵ پەی پێ ببات، واتە: شتێکی ناماقووڵە، ئەم تەعبیرە ئەوە دەگەیەنێ.

١٠)- ﴿إِن نَّظُنُّ إِلَّا ظَنًّا﴾، ئێمە تەنیا بەگومانێكی بێهێز گومان دەبەین، لێرەدا كە دەڵێ: (إِن نَّظُنُّ إِلَّا ظَنًّا)، ئەمە پێی دەگوترێ: (الإِسْتِثْنَاءُ المُفَرَّغ)، هەڵاواردنی بەتاڵكراو، خاڵییكراوە، ئنجا شارەزایان و ڕێزمانزانانی عەرەبیی، ئیشكالێكیان لێرەدا باسكردوە، كە گوتوویانە: (لاَ يَصِحُّ أَنْ يَكُونَ الإِسْتِثْنَاء مُفَرَّغاً للمَفْعُول المُطْلَق، لاَنْتِفَاء فَائِدَةِ التَّفْرِيغ)، هەڵاواردنی خاڵییكەرەوە لەبەركاری ڕەها، ڕاست نیە، چونكە خاڵییكردنەوەكە سوودی نامێنێ، (إِن نَّظُنُّ إِلَّا ظَنًّا)، یانی: (مَا نَظُنُّ إلاَّ ظَنّاً)، گومان نابەین، جگە لە گومان، دەڵێن: ئەمە واتایەكی بۆ نامێنێتەوە، گومان نابەین، جگە لە گومان!

بەڵام (ابن هشام) لە (مغني اللَّبِيْب)دا، كە كتێبێكی ڕێزمانی عەرەبییە دەڵێ: (مُصَحِّحُ اسْتِثْنَاء الظَّن مِنْ نَفْسِهِ، أَنَّ المُسْتَثْنَى هُوَ الظَّن الموصُوف بِمَا دَلَّ عَلَيْهِ تَنْكِيرُهُ مِنَ التَّحْقِيرِ المُشْعِرِ بِهِ التَّنْوِينُ)، ئەوەی وایكردوە گومان (ظَن)، لە خۆی هەڵباوێردرێ، (إِن نَّظُنُّ إِلَّا ظَنًّا)، ئەوەیە كە هەڵاوێردراو، بریتیە لەو گومانەی كە مادام بە نەناسراو (نكرة) هاتوە، مانای وایە شتێكی كەم و بچووك و كەم بایەخە، واتە: ئێمە گومان نابەین، جگە لە گومانێكی بێ هێز، ئنجا ئەمە وایكردوە كە ئەو هەڵاواردن (إستثناء)ە، لێرەدا دروست بێت، ئەوە تەئویلێك.

هەندێكی دیكەش گوتوویانە: (ضُمِّنَ (نَّظُنُّ)، مَعْنَى نَعْتَقِدُ، يَعْنِي إِنْ نَعْتَقِدُ إلاَّ ظَنّاً)، (نَظُنُّ) مانای (نَعتَقِد)ی خراوەتە نێو، یانی: قەناعەت و بڕوامان نیە، جگە لە گومان، واتە: پێمان وانیە قیامەت بێ و قەناعەتمان پێی نیە، جگە لە گومان.

بە بۆچوونی من هەردووكیان جوانن، لە هەردوو حاڵاندا دەڵێ: (مَفْعُولا: (نَّظُنُّ)، مُحْذُوفَانِ لِدَلاَلَةِ الكَلاَمِ عَلَيْهِمَا أَي: إِنْ نَظُنُّ السَّاعَةَ وَاقِعَةً)، هەردووك بەركاری (نَظُنُّ) قرتێنراون، چونكە سیاقی قسەكە دەیانگەیەنێ، پێمان وانیە (ساعة) بێ و بقەومێ، چونكە (نَّظُنُّ: ظَنَّ مُحَمَّدٌ زَيْداً وَاقِفاً)، (نَظُنُّ) دوو بەركار (مفعول بە)ی دەوێن، كە لێرەدا هەردووكیان قرتێنراون، چونكە دیارن، واتە: ئێمە پێمان وانیە (ساعة) بێ، پێمان وانیە كاتەكە یان قیامەت بێ، (الساعة)،

بـەرکاری یەکەمیـەتی و (**واقعـة**) بـەرکاری دوومیـەتی و، هەردووکیـان قرتێـنراون، لەبـەر ئـەوەی بەپێـی سـەلیقەو سـیاق زانـراو و دیـارن.

١١)- ﴿وَمَا نَحْنُ بِمُسْتَيْقِنِينَ﴾، ئێمەش لە دڵنیایان نین، واتە: ئێمە لە دڵنیایان نین، بەهاتنی ڕۆژی قیامەت، ئەمەش دەریدەخات کە (**الیقین والظن**)، وەک پێشتریش گوتوومانە: ڕێک دژو پێچەوانەی یەکدین، لە هەر شوێنێک یەقین هەبێ، گومان نابێ و، پێش گومانیش دوو دڵیی (**شك**) نابێ، (**الظن**)، واتە: گومان، (**الشك**)، واتە: دوو دڵیی، ئنجا ئەگەر گومان نەبێ، دوو دڵیی هەر نابێ، چونکە دەفەرموێ: (إِن نَّظُنُّ إِلَّا ظَنًّا وَمَا نَحْنُ بِمُسْتَيْقِنِينَ ﴿٣٢﴾)، تەنیا گومانێکی بێ هێزمان دەبرد، یاخود قەناعەتمان وابوو، تەنیا بە گومان قەناعەتمان وابوو و، ئێمە لە دڵنیایان نەبووین، کەواتە: دڵنیایی و گومان (**الیقین و الظن**)، دژو پێچەوانەی یەکدین.

١٢)- ﴿وَبَدَا لَهُمْ سَيِّئَاتُ مَا عَمِلُوا﴾، سزای کردەوە خراپەکانی کە وەدەستیان هێنا بوون، بۆیان دەرکەوت، یاخود: ئەو شوێنەوارە خراپانەی وەدەستهێنانەکەیان - کە لەسەر کوفر بنیاتنرابوو - پەیدای کردبوون، بۆیان دەرکەوتن.

١٣)- ﴿وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُوا بِهِ يَسْتَهْزِءُونَ﴾، ئەوەی پێشتر گاڵتەیان پێ دەکرد گەمارۆی دان، (وَحَاقَ) بە مانای (**نزل**) دێ و، بە مانای (**أَحَاط**)ش دێ، واتە: دابەزیە سەریان، گەمارۆی دان، (مَّا كَانُوا بِهِ يَسْتَهْزِءُونَ ﴿٣٣﴾)، ئەوەی پێشتر گاڵتەیان پێ دەکرد، واتە: سزایەکەی گەمارۆی دان، یاخود: خودی گاڵتەپێکراوەکە، کە سزای خوایەو، دۆزەخە گەمارۆی دان.

**مەسەلەی سێیەم:**

**بە بێبڕوایان دەگوترێ: ئەمڕۆ پشتگوێتان دەخەین، وەک چۆن ئێوە دیداری ئەمڕۆتان پشتگوێ خستووە، جێگاشتان ئاگرە لە سۆنگەی گاڵتەکردنتانەوە بە ئایەتەکانی خواو، فریو خواردنتان بە ژیانی دنیا، کە سەرەنجام لە دۆزەخدا هەمیشەیی دەبن و، ڕێشتان نادرێ، خوا ڕازیی بکەن و، گلەیی خوا لەسەر خۆتان نەهێڵن:**

خوا دەفەرموێ: ﴿وَقِيلَ ٱلْيَوْمَ نَنسَىٰكُمْ كَمَا نَسِيتُمْ لِقَآءَ يَوْمِكُمْ هَٰذَا وَمَأْوَىٰكُمُ ٱلنَّارُ وَمَا لَكُم مِّن نَّٰصِرِينَ ﴿٣٤﴾ ذَٰلِكُم بِأَنَّكُمُ ٱتَّخَذْتُمْ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ هُزُوًا وَغَرَّتْكُمُ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا ۚ فَٱلْيَوْمَ لَا يُخْرَجُونَ مِنْهَا وَلَا هُمْ يُسْتَعْتَبُونَ ﴿٣٥﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە هەشت بڕگەدا:

١)- ﴿وَقِيلَ ٱلْيَوْمَ نَنسَىٰكُمْ﴾، گوتراش: ئەمڕۆ لە بیرتان دەکەین، (فەرامۆشتان دەکەین و پشت گوێتان دەخەین)، بە کێ گوترا؟ بە دڵنیایی بە بێبڕوایان گوتراو، لەو سیاقەشدا، دیاریی نەکراوە بێژەرەکە کێیە، ئەمەش جۆرێکە لە بە کەم تەماشاکردن، یانی: کەسێک ڕاسپێردرا ئەوەیان پێ بڵێ، کە مسۆگەر فریشتەکانن، وشەی (نَنسَىٰكُمْ)، (**نَتْرُكُكُم تَرْكاً مُؤَبَّداً، لأنَّ النِّسْيَان تَرْكُ الشَّيءِ المنْسِيّ، أو النِّسيَان مُسْتَعَارٌ للإهْمَال وَعَدَم المُبَالَاة**)، (وَقِيلَ ٱلْيَوْمَ نَنسَىٰكُمْ)، واتە: وازتان لێ دێنین بە یەکجارەکیی، چونکە لە بیرچوون بریتیە لە وازهێنانی لە شتێک بە یەکجاریی، یاخود لێرەدا وشەی (النِّسْيَانُ، نَنسَىٰكُمْ)، خوازراوەتەوە بۆ پشتگوێخستن و گوێ پێنەدان و بایەخ پێنەدان، واتە: ئەمڕۆ پشتگوێتان دەخەین و بایەختان پێنادەین.

٢)- ﴿كَمَا نَسِيتُمْ لِقَآءَ يَوْمِكُمْ هَٰذَا﴾، وەک چۆن ئێوە دیداری ئەمڕۆژەتان لە بیر چوو بوو، یان: فەرامۆش کردبوو و پشتگوێتان خستبوو، (**اللِّقَاءُ: وِجْدَانُ الشَّيء شَيْئاً فِي مَكَانٍ: لَقِيَ**

**زَیْد عَمْرَاً**)، (**اللِّقَاء**) بریتیە لەوەی شتێک لە شوێنێک شتێکی لێ هەڵکەوێ، وەک دەڵێ: (**لَقِيَ زَيْد عَمْرَواً**)، زەید تووشی عەمر بوو، یانی: لە کات و شوێنێکی دیارییکراودا.

٣)- ﴿وَمَأْوَىٰكُمُ ٱلنَّارُ﴾، جێگەو ڕێگەی حەوانەوەتان ئاگرە، (**المأوى: المَكَانُ الَّذِي يَأْوِي إِلَيْهِ الشَّخْص بَعْدَ أَعْمَالِهِ**)، (**المأوى**): بریتیە لەو شوێنەی کەسێک پەنای بۆ دەبات، دوای ئەنجامدانی کارەکانی، کە ماندوو دەبێ و، نارەحەت دەبێ، دەچێ لەوێدا پشوو بدات و ئیسراحەت بکات، واتە: شوێنی پشوودان و حەوانەوە، ئەگەر بۆ ئێوە هەبێ لە ڕۆژیی دواییدا، ئاگری دۆزەخە، خوا پەنامان بدات.

٤)- ﴿وَمَا لَكُم مِّن نَّٰصِرِينَ﴾، هیچ پشتیوان و سەرخەرو هاوکاریشتان نین، (**لَيْسَ لَكُمْ، أَي: نَاصِرٍ مَهْمَا كَانَ**)، (﴿وَمَا لَكُم مِّن نَّٰصِرِينَ ٣٤﴾)، ئەم (مِن)ە، کە بۆ دەستپێکە (**إبتدائية**)، واتە: هەر لە سەرەتای سەرخەرو پشتیوانانەوە، تاکو کۆتاییان، هەر لە بچووکیان تاکو گەورەیان، هیچ پشتیوانێکتان نیە، نە کەم، نە زۆر.

٥)- ﴿ذَٰلِكُم بِأَنَّكُمُ ٱتَّخَذْتُمْ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ هُزُوًا﴾، ئەمەشتان {ئەم سزایەتان، یان ئەم سەرەنجامە شووم و پڕ مەینەتییەتان}، بەهۆی ئەوەوەیە کە ئێوە ئایەتەکانی خواتان بەگاڵتەپێکراو گرتبوون، گاڵتەتان پێ دەکردن، بە گاڵتەجاڕتان گرتبوون، دیارە وشەی (هُزُوًا: **الهُزءُ: مَصْدَرٌ مُرَادٌ بِهِ اسْم المَفْعُول مِثْلُ: خَلْق وَمَخْلُوق، (هُزُوًا)، أَي: مَهْزُوءاً**)، واتە: ئەوە بەهۆی ئەوەوەیە کە ئایەتەکانی خواتان گاڵتە پێکراو گرتبوون، بەگاڵتەجاڕتان گرتبوون، (**هزء**)، چاوگە بە مانای (**مهزوء**)**و** بەرکار (**مفعول به**)، وەک چۆن (**خلق**)، بە مانای (**مخلوق**)ە، دروستکراو.

٦)- ﴿وَغَرَّتْكُمُ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا﴾، {وێڕای ئەوەی ئایەتەکانی ئێمەتان بە گاڵتەجار گرتبوون}، ژیانی دنیاش فریوی دان، (**التَّغْرِيرُ: الإِطْمَاع البَاطِلُ**)، (**تغرير**) بریتیە لە بەتەما کردنێکی پووچ، بە تەماکردنێکی بێ بنەما، بە کوردیی دەگوترێ: هەڵخەڵەتاندن، فریودان، کڵاو لەسەرنان.

٧)- ﴿فَٱلْيَوْمَ لَا يُخْرَجُونَ مِنْهَا﴾، ئەمڕۆ ئێوە لێی نابرێنە دەرێ، خوێنراویشەتەوە: (**لا يَخْرُجُونَ**

**مِنْهَا**)، ئەمڕۆ ئێوە لێی ناچنە دەرێ، واتە: لە ئاگر ناچنە دەرێ، یاخود لێی نابرێنە دەرێ، لێی دەرباز ناکرێن.

٨)- ﴿وَلَا هُمْ يُسْتَعْتَبُونَ﴾، داواشیان لێ ناکرێ، داوای لێبوردن بکەن، یاخود: داواشیان لێ ناکرێ، پەروەردگاریان ڕازیی بکەن، داوایان لێناکرێ گلەیی پەروەردگاریان لەسەرخۆیان لابەرن و، سەرەنجام پەروەردگاریان ڕازیی بکەن، بۆیە زانایان هەندێکیان گوتوویانە: (وَلَا يُسْتَعْتَبُونَ: **أي: لاَ يُطْلَبُ مِنْهُم إِرْضَاءِ الله**)، داوایان لێناکرێ خوا ڕازیی بکەن، هەندێکیشیان گوتوویانە: (وَلَا يُسْتَعْتَبُونَ)، یانی: داوایان لێناکرێ داوای لێبوردن بکەن، واتە: گلەیی خوا لەسەر خۆیان لابەرن، وەک پێشتریش گوتم: ئێمە لە تەفسیری سوورەتی (**فصلت**)و، لە تەفسیری سوورەتی ( **النحل**)یشدا، بە درێژیی لە بارەی وشەی (**إِعْتَاب، وإِسْتِعْتَاب**)ەوە قسەمان کردوە.

## مەسەلەی چوارەم و کۆتایی:

**ستایشکردنی خوای پەروەردگاری گەردوون و جیهانییان، کە مەزنیی و، بەرزیی و گەورەیی ڕەها، لە بووندا تەنیا هی ویەو، خوا زاڵ و کاربەجێیە:**

خوا دەفەرمووێ: ﴿فَلِلَّهِ ٱلۡحَمۡدُ رَبِّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَرَبِّ ٱلۡأَرۡضِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٣٦﴾ وَلَهُ ٱلۡكِبۡرِيَآءُ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ﴿٣٧﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە چوار بڕگەدا:

١)- ﴿فَلِلَّهِ ٱلۡحَمۡدُ﴾، ستایش تەنیا هی خوایە، (ف)ی سەر (فَلِلَّه)، (فَاء للتَفْرِيعِ، فَإِنْشَاءُ الحَمْد للهِ تَعَالى وَتَخْصِيْصه بِهِ، وَحَصْرُهُ عَلَيْهِ، مُتَفَرِّعٌ عَمَّا سَبَقَ فِي هَذِه السُّورَةِ المبَارَكَةِ مِنْ ذِكْر آيَاتِ اللهِ وَنِعَمِهِ وَهِدَايَتِهِ وَلُطْفِهِ مَعَ عِبَادِهِ)، واتە: (ف) بۆ لق لێکردنەوەیەو، ئەوە دەگەیەنێ کە ئەوەی لێرەدا دەگوترێ، لەوەی پێشەوە سەرچاوە دەگرێ، چونکە: ڕاگەیاندنی ستایشکردن بۆ خوای بەرزو پێوە تایبەتکردنی و، تێدا کورتهەڵهێنانی، هەمووی پەیدابووە لەوەی کە لەم سووڕەتە موبارەکەدا، پێشتر باسکراوە، لە باسی نیشانەکانی خواو چاکەکانی خواو ڕێنمایی و هیدایەتی خواو لوتف و کەرەم و بەزەیی خوا لەگەڵ بەندەکانیدا، ئنجا پەروەردگارێک وابێ، هەموو ستایشێک تەنیا شایستەی ئەوە.

٢)- ﴿رَبِّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَرَبِّ ٱلۡأَرۡضِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾، پەروەردگاری ئاسمانەکان، پەروەردگاری زەوی و، پەروەردگاری جیهانییان، سێ جاران دووبارە کردنەوەی پەروەردگارێتیی خوا، لێرەدا لەبەر ئەوەیە کە پێگەو شوێنەکە دەیخوازێ، پەروەردگارێتیی خوا، واتە: مشوورخواردنی خواو بەسەر ڕاگەیشتنی و خاوەندارێتیی و پەروەردەکردنی خوا، تایبەتمەندترین سیفەتی خوایە، لە پەیوەندیی لەگەڵ دروستکراوەکانیدا.

٣)- ﴿وَلَهُ ٱلۡكِبۡرِيَآءُ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ﴾، هەرچی مەزنیی هەیە، هەر بۆ وییە لە ئاسمانەکان و زەویدا، (ٱلۡكِبۡرِيَآءُ): **(العَظَمَةُ المُطْلَقَة، وَالعُلُوّ المُطْلَق، وَالجَلاَلُ وَالجَمَالُ وَالكَمَالُ**

**فِي الذَّات وَالصِّفَات**)، (ٱلْكِبْرِيَآءُ) بە مانای: مەزنیی ڕەها، بەرزیی ڕەها، گەورەیی ڕەها، هەروەها جەلال و جەمال و کەمال لە زات و لە سیفەتەکانی دا.

(جلال)، واتە: شکۆو هەیبەتی خوا، (جمال)، واتە: جوانیی خوای پەروەردگار، وەک بۆ خوای پەروەردگار شایستەیە، (کمال)، واتە: تەواویی خوا ﷻ، هەم لە زاتیدا، هەم لە سیفەتەکانیدا، تەنیا هی خوایە.

٤)- ﴿وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ﴾، هەر ئەو زاڵی کارزانە، بێگومانیش (**عزة**) سیفەتێکی کۆکەرەوەیە بۆ هەموو سیفەتەکانی هێزو دەسەڵات و هەیبەت و، (**حكمة**)یش، کۆکەرەوەیە بۆ هەرچی پەیوەندیی هەیە بە زانیاریی و شارەزایی و ئاگاداریی خواوە ﷻ لە بارەی دروستکراوەکانیەوە.

## دوو فەرموودەی پێغەمبەری خوا ﷺ لەبارەی گەورەیی و مەزنیی خوا و تەنیا پەرستنییەوە: هاتوە:

١- فەرموودەیەك لەوبارەوە کە هەرکەس گەورەیی و مەزنیی بخوازێ - بەسەر خەڵکدا - وەك ئەوەیە ناکۆکیی هەبێ لەگەڵ خوادا لەسەر گەورەیی و مەزنیی، کە دوو سیفەتی هەرە تایبەتی خوان:

{**عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يَقُولُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: الْكِبْرِيَاءُ رِدَائِي، وَالْعَظَمَةُ إِزَارِي، فَمَنْ نَازَعَنِي شَيْئًا مِنْهُمَا، أَلْقَيْتُهُ فِي جَهَنَّمَ»} (أَخْرَجَهُ أحمد: ٩٧٠٣، ومُسْلِم: ٢٦٢٠، وَالبُخَارِيّ فِي «الأدب المفرد»: ٥٥٢، وَأَبُو دَاوُد: ٤٠٩٠، وابن ماجه: ٤١٧٤).**

واتە: ئەبوو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: خوا (**عَزَّ وَجَلَّ**) دەفەرموێ: گەورەیی کراسمە، (یان گەورەیی و شکۆی هەرە بەرز کراسمە)و مەزنیی پۆشاکمە، هەر کەسێک لە یەکێک لەو دووانەمدا لەگەڵم ناکۆک بێ، دەیخەمە نێو ئاگر.

واتە: گەورەیی و مەزنیی، سیفەتی تایبەتی خوان، بۆیە هەر کەسێک خۆی بە گەورە بگرێ و، خۆی بە مەزن بگرێ لە بەرانبەر مرۆڤەکاندا، ئەوە مانای وایە، ناکۆکیی هەیە لەگەڵ خوادا لەسەر ئەو دوو سیفەتانەی کە تایبەتن بە خواوە ﷻ، هیچ کەسێک بۆی نیە لافی ئەو دوو سیفەتە لێ بدات، ئەگەرنا مانای وایە بوغزا بووەو لە کەوڵی خۆی دەرچووەو، تووشی سزای خوا دەبێ.

**٢-** فەرمایشتێکی پێغەمبەری خوا ﷺ لە بارەی خوا پەرستان و جگە لە خوا پەرستانەوە لە قیامەت دا:

ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەر ﷺ دێنین، کە شیکردنەوەو ڕوونکردنەوەی ئەو ئایەتە موبارەکەیە کە دەفەرموێ: ﴿وَتَرَىٰ كُلَّ أُمَّةٍ جَاثِيَةً ۚ كُلُّ أُمَّةٍ تُدْعَىٰ إِلَىٰ كِتَابِهَا ﴿٢٨﴾﴾، هەموو کۆمەڵێک دەبینی لەسەر ئەژنۆیان کەوتوون، هەر کۆمەڵێک بۆ نووسراوەکەی خۆی بانگ دەکرێ:

لە فەرموودەیەکدا[1]، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: (عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ قَالَ: قُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، هَلْ نَرَى رَبَّنَا يَوْمَ الْقِيَامَةِ؟ قَالَ: « هَلْ تُضَارُونَ فِي رُؤْيَةِ الشَّمْسِ وَالْقَمَرِ إِذَا كَانَتْ صَحْوًا؟ ». قُلْنَا: لَا. قَالَ: « فَإِنَّكُمْ لَا تُضَارُونَ فِي رُؤْيَةِ رَبِّكُمْ يَوْمَئِذٍ، إِلَّا كَمَا تُضَارُونَ فِي رُؤْيَتِهِمَا ». ثُمَّ قَالَ: « يُنَادِي مُنَادٍ: لِيَذْهَبْ كُلُّ قَوْمٍ إِلَى مَا كَانُوا يَعْبُدُونَ. فَيَذْهَبُ أَصْحَابُ الصَّلِيبِ مَعَ صَلِيبِهِمْ، وَأَصْحَابُ الْأَوْثَانِ مَعَ أَوْثَانِهِمْ، وَأَصْحَابُ كُلِّ آلِهَةٍ مَعَ آلِهَتِهِمْ، حَتَّى يَبْقَى مَنْ كَانَ يَعْبُدُ اللَّهَ مِنْ بَرٍّ أَوْ فَاجِرٍ، وَغُبَّرَاتٌ مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ، ثُمَّ يُؤْتَى بِجَهَنَّمَ تُعْرَضُ كَأَنَّهَا سَرَابٌ، فَيُقَالُ لِلْيَهُودِ: مَا كُنْتُمْ تَعْبُدُونَ؟ قَالُوا: كُنَّا نَعْبُدُ عُزَيْرَ ابْنَ اللَّهِ. فَيُقَالُ: كَذَبْتُمْ، لَمْ يَكُنْ لِلَّهِ صَاحِبَةٌ وَلَا وَلَدٌ، فَمَا تُرِيدُونَ؟ قَالُوا: نُرِيدُ أَنْ تَسْقِيَنَا. فَيُقَالُ: اشْرَبُوا. فَيَتَسَاقَطُونَ فِي جَهَنَّمَ، ثُمَّ يُقَالُ لِلنَّصَارَى: مَا كُنْتُمْ تَعْبُدُونَ؟ فَيَقُولُونَ: كُنَّا نَعْبُدُ الْمَسِيحَ ابْنَ اللَّهِ. فَيُقَالُ: كَذَبْتُمْ، لَمْ يَكُنْ لِلَّهِ صَاحِبَةٌ وَلَا وَلَدٌ، فَمَا تُرِيدُونَ؟ فَيَقُولُونَ: نُرِيدُ أَنْ تَسْقِيَنَا.

---

(١) أخرجه البُخَارِيّ: ٤٥٨١، وَمُسْلِم: ١٨٣، عَنْ أَبِي سَعِيد الخُدرِيّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ.

فَيُقَالُ : اشْرَبُوا. فَيَتَسَاقَطُونَ، حَتَّى يَبْقَى مَنْ كَانَ يَعْبُدُ اللَّهَ مِنْ بَرٍّ أَوْ فَاجِرٍ، فَيُقَالُ لَهُمْ : مَا يَحْبِسُكُمْ وَقَدْ ذَهَبَ النَّاسُ ؟ فَيَقُولُونَ : فَارَقْنَاهُمْ وَنَحْنُ أَحْوَجُ مِنَّا إِلَيْهِ الْيَوْمَ، وَإِنَّا سَمِعْنَا مُنَادِيًا يُنَادِي : لِيَلْحَقْ كُلُّ قَوْمٍ بِمَا كَانُوا يَعْبُدُونَ. وَإِنَّمَا نَنْتَظِرُ رَبَّنَا. قَالَ : فَيَأْتِيهِمُ الْجَبَّارُ، فَيَقُولُ : أَنَا رَبُّكُمْ. فَيَقُولُونَ : أَنْتَ رَبُّنَا. فَلَا يُكَلِّمُهُ إِلَّا الْأَنْبِيَاءُ، فَيَقُولُ : هَلْ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُ آيَةٌ تَعْرِفُونَهُ ؟ فَيَقُولُونَ : السَّاقُ. فَيَكْشِفُ عَنْ سَاقِهِ، فَيَسْجُدُ لَهُ كُلُّ مُؤْمِنٍ، وَيَبْقَى مَنْ كَانَ يَسْجُدُ لِلَّهِ رِيَاءً وَسُمْعَةً، فَيَذْهَبُ كَيْمَا يَسْجُدَ فَيَعُودُ ظَهْرُهُ طَبَقًا وَاحِدًا)، واتە: لە ڕۆژی قیامەتدا هەر کۆمەڵێک چی پەرستبێ، بۆی وێنا دەکرێ، {بەردیان پەرست بێ، پەیکەریان پەرستبێ، تەختەو داریان پەرستبێ، ئاژەڵێکیان پەرستبێ، هەرچییان پەرستبێ، ئەو شتە وێنا دەکرێتەوەو دەهێنرێتە گۆڕێ}، دوایی بە هەر کەسێک کە شتێکی پەرستوە، دەگوترێ: هەر کەسێک هەر شتێکی پەرستوە، شوێنی بکەوێ، ئیدی هەر کەسەو دەچێ بەرەو پەرستراوی خۆی، {یاخود: ئەو پەرستراوانە، دەکرێنە پێشەنگ و سەرقافڵە بۆ ئاگر}، هەتا ئەو خەڵکەی کە لە دنیادا پەرستوویانن، دەکەونە شوێنیان تاکو دەیانخەنە نێو ئاگری دۆزەخەوە، ئنجا ئۆممەتی موحەممەد ﷺ دەمێنێتەوە لەگەڵ خاوەن کتێبان، {کە لێرەدا باسی جوولەکە و نەصرانییان کراوە}، پێشێ بە جوولەکەکان دەگوترێ: ئێوە چیتان دەپەرست؟ دەڵێن: خوامان دەپەرست و (عوزەیر)یشمان دەپەرست، جگە لە کەمێکیان (کەمێکیان کە تەنیا خوایان پەرستوەو عوزەیریان نەپەرستوە)، پێیان دەگوترێ: عوزەیر، نە لە ئێوەیەو ئێوەش لەوی نین، عوزێر بەندەیەکی صاڵحی خوا بووەو بەس خوا پەرست بووە، بۆیە بە لای چەپدا دەگیرێن، {یانی: ڕەپێچەک دەدرێن و کۆ دەکرێنەوە}، ئیدی ئەوان دەچن و ناتوانن بمێننەوە، (ڕێک بە پێشخۆ دەدرێن، بەرەو دۆزەخ)، دوایی بانگی نەصرانییەکان دەکرێ، پێیان دەگوترێ: ئێوە چیتان دەپەرست لە دنیادا؟ دەڵێن: ئێمە خوامان دەپەرست و (مەسیح)یشمان دەپەرست، جگە لە کەمێکیان، (کەمێکیان دیارە بەس خوایان پەرستوە)، پێیان دەگوترێ: عیسا نە لە ئێوەیەو نە ئێوەش لەوین، چونکە ئەو تەنیا خوا پەرست بووە، ئەوانیش بە لای چەپدا دەگیرێن و دەبرێن و، دەڕۆن و ناتوانن بمێننەوە، {واتە: بەرەو دۆزەخ

دەبرێن)، ئۆممەتی موحەممەد ﷺ دەمێنێتەوە، پێیان دەگوترێ: ئێوە چیتان دەپەرست؟ ئەوانیش دەڵێن: ئێمە تەنیا خوامان دەپەرست، ئێمە بۆیە لەوانە جیابووینەوە لە ترسی ئەمڕۆ، بۆیە ئێمە تەنیا خوامان پەرستوە، ئیدی مۆڵەت دەدرێ بە بڕواداران کە کڕنووش بەرن، بڕواداران کڕنووش بۆ خوا دەبەن، بەڵام لە لای هەر بڕوادارێکەوە، موونافیقێک و دەغەڵێک هەیە، بابای مونافیق پشتی ڕەق دەبێ و ناتوانێ کڕنووش بەرێ و، کڕنووش بردنی بڕواداران دەبێتە مایەی سەرزەنشت و بچووکیی و پەشێمانیی و داخ و خەفەت بۆی (سەرەنجام ئەوانیش هەر بەرەو دۆزەخ بەرێ دەکرێن).

لە خوای پەروەردگار دەپاڕێمەوە کە بە لوتف و کەرەمی خۆی، یارمەتیی ئێمەو سەرجەم مسوڵمانان بدات، هەرچی زیاتره لە فەرمایشتەکەی وردترو قووڵتر حاڵیی بین، پاشان دوای وردو قووڵ تێگەیشتنی، هەوڵیش بدەین باشیش لە ژیانی تاکی خۆمان داو، لە ژیانی خێزانییمان و، لە ژیانی کۆمەڵایەتییمان و، لە ژیانی سیاسییماندا، پیادەی بکەین، ئەم قورئانە بە دڵنیایی هەمووی نوورو بەرەکەتە، خوێندنەوەکەی بەرەکەتە، لێوردبوونەوەی بەرەکەتە، لەبەرکردنی بەرەکەتە، کارپێکردنیشی بەرەکەتە، بەڵام بەرهەم و بەرەکەتی هەرە زۆری ئەم قورئانە، لە لێتێگەیشتن و کارپێکردنی دایە.

لە ڕاستییدا قورئان بۆیە عیبادەتە بخوێنرێتەوەو، عیبادەتە لەبەر بکرێ و، عیبادەتە تەماشا بکرێ، تاکو چاک دەرک بکرێ و، لێی حاڵیی بین، پاشان کاری پێ بکەین.

**چەند پەردەو نێوانێك لە نێوان بەشێک لە مسوڵمانان و قورئان دا:**

بەداخەوە بەشێك لە مسوڵمانان، پەردەو نێوانی زۆر کەوتووتە نێوان ئەوان و قورئانەوە، ئنجا ئەو پەردەو نێوانانە:

١- هەندێکیان هەر پەیوەندییان بە خودی قورئانەوە هەیە، کە بریتیە لە تەفسیرکردن و شیکردنەوەو ڕوونکردنەوەی قورئان، بە شێوەیەک کە شایستەی قورئان نیە، مانایەکی هەڵبزڕکراو و کرچ و کاڵ، پێدانی!.

٢- هەندێکییان پەیوەندییان هەیە بە سوننەتی پێغەمبەرەوە ﷺ واتە: مامەڵەی هەڵە لەگەڵ ڕێبازی پێغەمبەردا ﷺ، هەندێک کەس پێیان وایە: ڕێبازی پێغەمبەر ﷺو فەرمایشتەکانی جێگرەوە (**بدیل**)ن بۆ قورئان، کە لە ڕاستییدا هیچ شتێک بە دیلی قورئان نیە، ئنجا تەنیا فەرمایشتی خوا (**کلام الله**) بەرنامەو ڕێبازی پێغەمبەری خوا ﷺ بووە، پێغەمبەری خوا جگە لەم کتێبە، جگە لە قورئان، بەرنامەیەکی دیکەی پێ نەبووە، فەرمایشتەکانی پێغەمبەر ﷺ چ ئەوەی کە بە زاری موبارەکی فەرموونی، چ ئەوەی بە کردەوە کردوونی، چ ئەوەی لە پێش چاوی کراون، یان بیستوونی و دانی پێدا هێناون، واتە: (**قول وفعل وتقریر**)ی، هەمووی هەر لەبەر ڕۆشنایی قورئاندا بووەو، لە چوارچێوەی قورئاندا بووەو، بۆ کەسی شارەزای قورئان و سوننەت، ئەمە شتێکی زۆر ڕوون و ئاشکرایە.

٣- هەندێکیش لەو پەردەو تەم ومژانە پەیوەندییان هەیە بە بەرهەمی دیکەی زانایانەوە، چ لە بواری (**فقه**)دا، چ لە بواری بنچینەکانی دین (**أصول الدین**) و عقیدەدا، چ لە بواری بیرکردنەوەی مسوڵماناندا، چ لە بواری تەزکیەو تەصەووفدا، چ لە بوارەکانی دیکەدا، زۆرجار شتانێک لە نێو ئەو زانستە ئیسلامییانەداو، لە نێو ئەو کەلەپوورەی مسوڵمانان دا هەیە، کە ناکۆک و نامۆیە بە قورئان و بە ڕووحی قورئان، وەک من لە کتێبی: (با لە خزمەت قورئاندا بین)دا، ڕوونکردنەوەی باشم داوە لەو بارەوە و، زۆر گرنکە ئێمە بتوانین جارێکی دیکە عەقڵی خۆمان ئازاد بکەین، دڵ و دەروون و هەناو عەقڵ و هۆشی خۆمان بژار بکەین، لە هەرچی خڵتەو خاڵ و لیتەو لاڵەو نامۆیە لەگەڵ قورئاندا، نامۆیە لەگەڵ فەرمایشتی خوای پەروەردگارداو، لەگەڵ ڕێبازو ڕاستە شەقامی پێغەمبەری خوادا ﷺ، کە وەک زۆرجار گوتوومە: هیچ گومانی تێدانیە: ڕێبازو ڕاستە شەقامی پێغەمبەریش ﷺ هەناوو هەوێن و جەوهەرەکەی هەر قورئان بووە، بۆیە ئەو جۆرە تێگەیشتنە کە گوایە: قورئان شتێکەو، ڕێبازو سوننەتی پێغەمبەر ﷺ شتێکی دیکەیە، زۆر هەڵەیە، وەک لەو بارەوە نامیلکەیەکم نووسیوە بە ناوی: (قورئان و سوونەت وەک ڕووح و جەستە تێکهەڵکێشن)، لە ڕاستییدا قورئان جیا نیە لە سوننەت و، سوننەت جیا نیە لە قورئان، چونکە قورئان لە میانی ڕێبازی پێغەمبەردا ﷺ پراکتیزە کراوەو ڕوونکراوەتەوە، ﴿ وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ ﴾النحل، سوننەتیش هەناوو هەوێنەکەی هەر بریتیە لە قورئان، کەواتە: سوننەت،

بە مانا ڕاستەقینەکەی، واتە: چۆنیەتیی جێبەجێ کردنی پێغەمبەر ﷺ بۆ قورئان، چۆنیەتیی پابەندبوونی پێغەمبەر ﷺ بە قورئانەوە، لە ژیانی تاکیی و خێزانیی و کۆمەڵایەتیی و سیاسییدا.

ئەگەر بمانەوێ بە شێوەیەکی فیکریی و تیۆریی بزانین ئیسلام چییە؟ تەماشا قورئان دەکەین، بەڵام ئەگەر بمانەوێ بە شێوەیەکی کردەیی و بە بەرجەستە کراویی بزانین ئیسلام چییە؟ تەماشای ڕێبازی پێغەمبەر ﷺ دەکەین، چونکە ڕێبازەکەی پێغەمبەریش ﷺ هەر قورئانی تێدا بەرجەستە کراوە[١].

خوا بە لوتف و کەرەمی خۆی لە ئایین و بەرنامەی خۆیدا، زیاتر شارەزامان بکات، بە هۆی وردترو قووڵتر تێگەیشتن لە قورئان و، باشتر ئاشنا بوون بە ڕێبازو ڕێ و شوێنی پێغەمبەرەوە ﷺ.

**سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.**

---

(١) زۆرجار گوتوومانەو دووبارەی دەکەینەوە: ئاشکراو ڕوونە کە پێغەمبەری کۆتایی موحەممەد ﷺ، وێڕای قورئان وەحیی دیکەشی بۆ نێرراوە، بەڵام هەر لە سیاقی قورئان داو، هەرگیز ڕێبازی پێغەمبەری خاتەم لە قورئان جیا نیەو، لەگەڵی تێك ناگیرێ و، هەمیشە سوننەت دەبێ بە تەرازووی قورئان هەڵسەنگێنرێ.

بەڕێـــزان!

ئەمــڕۆ کــە (٦)ی (جــمادي الثانــي)ی ســاڵی (١٤٤١)ی کــۆچییە، بەرانبــەر (٢٠٢٠/١/٢٩)ی زایینیـی، لـە شـاری هەولێـر خـوا پشـتیوان بێـت، دەسـت دەکەیـن بـە تەفسـیرکردنی سـوورەتی (الأحقـاف).

## پێناسەی سوورەتی (الأحقاف) و بابەتەکانی

### یەکەم: ناوی ئەم سوورەتە:

ئـەم سـوورەتە لـە تێکـڕای موصحەفـەکان و، کتێبـەکانی سـوننەت و سـیرەدا، هـەر بـە (**سُـوَرةُ الأَحْقَـاف**) ناوبـراوە، هەرچەنـدە ئـەم دەقـە وای لـێ دەفامرێتـەوە، کـە نـاوی (**ثلاَثِينَ**)یـشی بـۆ بەکارهاتبـێ:

{**عَـنْ عَبْـدِ اللَّـهِ بْـنِ مَسْـعُودٍ ﷺ، قَـالَ: أَقْـرَأَنِي رَسُـولُ اللَّـهِ ﷺ سُـورَةَ مِـنَ الثَّلاَثِـينَ، مِـنْ «آلِ حـم» قَـالَ: يَعْنِـي الأَحْقَـافَ، قَـالَ: وَكَانَـتِ السُّـورَةُ إِذَا كَانَـتْ أَكْـثَرَ مِـنْ ثَلاَثِـينَ آيَـةً، سُـمِّيَتِ الثَّلاَثِينَ**} (**أخرجـه أحمـد ٣٩٨١، تعليـق شـعيب الأرنـؤوط: إسـناده حسـن**).

واتـە: عەبدوڵـڵای کـوڕی مەسـعوود ﷺ، دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا ﷺ سـوورەتێکی لـە ئـالی حامیـم، {واتـە: لـە حـەوت سـوورەتەکانی کـە پێیـان دەگوتـرێ: (**آلِ حـم**) یـان (**ذوات حـم**)}، بەسـەردا خوێنـدم، یـان: پـێ خوێندمـەوەو فێـری کـردم، کـە بریتیـە: لـە (**الأَحْقَـاف**)، ئـەو کاتیـش سـوورەتێک ئەگـەر لـە سـی (٣٠) ئایـەت زیاتـر بووایـە، پێـی دەگوتـرا: (**ثلاَثِينَ**) واتـە: سـیی، یـان سـی ئایەتیـی.

بـەڵام بێگومـان هـەر سـوورەتێک لـە سـی ئایـەت زیاتـر بووبـێ، مەبەسـتی ئەوەیە لـە نێـوان سی و چلـدا بووبـێ، ئنجـا هـەر سـوورەتێک وابووبـێ، نـاوی (**ثلاَثِينَ**)ی بـۆ

بەکارهاتبێ، کەواتە: تایبەت نیە، بە سوورەتی (حم) یان (الأَحْقَاف)ەوە، بۆیە بە ناوی ئەم سوورەتە دانانرێ.

هەروەها لەو بارەوە ئەم دەقەش هەیە: {**عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ ﷺ، قَالَ: أَقْرَأَنِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ سُورَةَ الْأَحْقَافِ**} (**أخرجه أحمد ٤٣٢٢، تعليق شعيب الأرنؤوط: صحيح، وهذا إسناد حسن**).

واتە: ئیبنو مەسعوود ﷺ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ سوورەتی ئەحقافی فێرکردم و بەسەردا خوێندمەوە، یان پێی خوێندمەوە.

کەواتە: ئەم سوورەتە هەر ناوی سوورەتی (**الأَحْقَاف**) بووەو، هۆی ئەو ناوەشی ئاشکرایە کە بریتیە لە هاتنی وشەی (**الأَحْقَاف**) کە تەنیا یەکجار لە هەموو قورئاندا هاتووەو، تەنیا لەم سوورەتەشدا هاتوە، (**أَحْقَاف**)یش کۆی (**حِقْف**)ە، واتە: کۆ لم، لمێک کە کۆدەبێتەوە سەر یەک، تەپۆلکەی لم، بە مەرجێک لە باری درێژییدا بێت و، بە شێوەیەکی درێژ کۆببووبێتەوە سەر یەک.

## دووەم: شوێنی دابەزینی:

بە یەکدەنگیی زانایان ئەم سوورەتە مەککەییە، واتە: بە گشتیی سوورەتێکی مەککەییە، هەرچەندە باسی هەڵاواردنی چەند ئایەتێک کراوە کە مەدینەیین، بە تایبەت ئایەتی ژمارە دە (١٠)، کە دەفەرموێ: ﴿ قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِن كَانَ مِنْ عِندِ ٱللَّهِ وَكَفَرْتُم بِهِۦ وَشَهِدَ شَاهِدٌ مِّنۢ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ عَلَىٰ مِثْلِهِۦ فَـَٔامَنَ وَٱسْتَكْبَرْتُمْ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٠﴾ ﴾**الأحقاف**.

هەروەها ئایەتی ژمارە سی و پێنج (٣٥)، ئایەتی کۆتایی ئەم سوورەتە، کە دەفەرموێ: ﴿ فَٱصْبِرْ كَمَا صَبَرَ أُو۟لُوا۟ ٱلْعَزْمِ مِنَ ٱلرُّسُلِ وَلَا تَسْتَعْجِل لَّهُمْ ۚ كَأَنَّهُمْ يَوْمَ يَرَوْنَ مَا يُوعَدُونَ لَمْ يَلْبَثُوٓا۟ إِلَّا سَاعَةً مِّن نَّهَارٍۭ ۚ بَلَٰغٌ ۚ فَهَلْ يُهْلَكُ إِلَّا ٱلْقَوْمُ ٱلْفَٰسِقُونَ ﴿٣٥﴾ ﴾**الأحقاف**.

هەندێکیش ئایەتەکانی: (١٥ - ١٨)شیان بە مەدینەیی داناون، کە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَوَصَّيْنَا ٱلْإِنسَٰنَ بِوَٰلِدَيْهِ إِحْسَٰنًا ۖ حَمَلَتْهُ أُمُّهُۥ كُرْهًا وَوَضَعَتْهُ كُرْهًا ۖ وَحَمْلُهُۥ وَفِصَٰلُهُۥ ثَلَٰثُونَ شَهْرًا ۚ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ أَشُدَّهُۥ وَبَلَغَ أَرْبَعِينَ سَنَةً قَالَ رَبِّ أَوْزِعْنِىٓ أَنْ أَشْكُرَ نِعْمَتَكَ ٱلَّتِىٓ أَنْعَمْتَ عَلَىَّ وَعَلَىٰ وَٰلِدَىَّ وَأَنْ أَعْمَلَ صَٰلِحًا تَرْضَىٰهُ وَأَصْلِحْ لِى فِى ذُرِّيَّتِىٓ ۖ إِنِّى تُبْتُ إِلَيْكَ وَإِنِّى مِنَ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴿١٥﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ نَتَقَبَّلُ عَنْهُمْ أَحْسَنَ مَا عَمِلُوا۟ وَنَتَجَاوَزُ عَن سَيِّـَٔاتِهِمْ فِىٓ أَصْحَٰبِ ٱلْجَنَّةِ ۖ وَعْدَ ٱلصِّدْقِ ٱلَّذِى كَانُوا۟ يُوعَدُونَ ﴿١٦﴾ وَٱلَّذِى قَالَ لِوَٰلِدَيْهِ أُفٍّ لَّكُمَآ أَتَعِدَانِنِىٓ أَنْ أُخْرَجَ وَقَدْ خَلَتِ ٱلْقُرُونُ مِن قَبْلِى وَهُمَا يَسْتَغِيثَانِ ٱللَّهَ وَيْلَكَ ءَامِنْ إِنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ فَيَقُولُ مَا هَٰذَآ إِلَّآ أَسَٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿١٧﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ حَقَّ عَلَيْهِمُ ٱلْقَوْلُ فِىٓ أُمَمٍ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِم مِّنَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ ۖ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ خَٰسِرِينَ ﴿١٨﴾ ﴾**الأحقاف.**

بەڵام تەنیا ئایەتی ژمارە (١٠) وەک دوایی باسی دەکەین، ڕیوایەتی هۆی هاتنە خوارەوەکەی متمانەی پێ دەکرێ و سەنەدەکەی ڕاستە، وەک لە سەرچاوەکاندا هاتوە، کەواتە: ئەم سوورەتە بە گشتیی سوورەتێکی مەککەییە، بەڵام ئایەتی ژمارە (١٠)، وا پێدەچێ کە لە مەدینەدا دابەزیبێ و، دوایی خرابێتە ئەو شوێنەی ئێستا خراوەتێی، بەس ئەم سوورەتەش وانیە، سوورەتی دیکەش هەیە لە مەککە دابەزیوە، دوایی ئایەتێک لە مەدینە دابەزیوەو خراوەتە نێوی.

## سێیەم: ڕیزبەندیی لە دابەزین و لە موصحەفدا:

ڕیزبەندیی لە دابەزیندا، ژمارە شەست و پێنج (٦٥)ە، لە موصحەفیشدا ژمارە چل و شەش (٤٦)ە، ئەم سوورەتە لە دوای سوورەتی **(الجاثية)**یەو، پێش **(الذاريات)** هاتوەو، بە مەزندە کە ئەوە ڕای خۆمە، لەساڵانی نێوان حەوت (٧) تاکو دە (١٠)ی پێغەمبەرایەتیی دا دابەزیوە، واتە: سێ ساڵ پێش ئەوەی مسوڵمانان و پێغەمبەر ﷺ کۆچ بکەن بۆ شاری **(يثرب)**و ناوەکەی بگۆڕدرێ بۆ مەدینە، یان شاری پێغەمبەر **(مَدِينَة الرَّسُول)**.

## چوارەم: ژمارەی ئایەتەکانی:

لـە لای زۆربـەی خەڵکـی شـارەکان، وەک (**محمـد الطاهـر بـن عاشـور**)و زانایـانی دیکـەش گوتوویانـە: ژمـارەی ئایەتـەکانی سی و چـوار (٣٤)ە، بـەڵام لـە لای خەڵکـی کووفـە ژمارەیـان سـی و پێنـج (٣٥)و، زیاتـر ژمـارەی (٣٥) تەبەننیـی کـراوە، لـەو موصحەفانـەی لەبـەر دەسـتی ئێمـەدا هـەن، ڕاجیاییەکـەش بەهـۆی (**حم**)وەیـە، کـە ئایـا ئایەتێکـی سـەربەخۆیە، کـە ئـەو کاتـە ژمـارەی ئایەتـەکان دەبێتـە (٣٥)، یاخـود بەشـێکە لـە ئایەتێـک: ﴿حمٓ تَنزِيلُ ٱلۡكِتَٰبِ مِنَ ٱللَّهِ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡحَكِيمِ ۝٢﴾، هەمـووی بەسـەریەکەوە ئایەتێـک بـێ، ئـەو کاتـە ژمارەکـەی دەبێتـە (٣٤)، بـۆ سـووڕەتی (**الجاثیـة**)ش هەروابـوو، لـە حیسـاب کـردن و نەکـردنی (حـم) لـە ڕیـزی ئایەتـەکان دا.

## پێنجەم: نێوەڕۆکی ئەم سووڕەتە:

واتـە: هێڵـە گشـتییەکانی و چوارچێوەکـەی و نێوەڕۆکەکـەی، هەمـان نێوەڕۆکـی قورئـانی مەککەییـە، بـە هەرسـێک تـەوەری سـەرەکیی: ١- خـوا بەیەکگرتـن و، ٢- وەحیی و پێغەمبەرایەتیی و قورئان و، ٣- ڕۆژی دوایی و سزاو پاداشتی خواو، دۆزەخ و بەهەشتەوە، لـەم سـووڕەتە موبارەکـەدا پانتاییەکـی زۆر بـۆ باسی پووچاندنـەوەی شـیرک و، بـاسی قورئـان و پێغەمبەرایەتیـی و، بـاسی قیامـەت تەرخانکـراوەو، ئاماژەیەکـی باشـییش بـە بەسـەرهاتی هـوودو گـەلی عـاد کـراوە، جارێـک نـاوی (**بَنـو إِسۡرَٰٓءِيـل**) هاتـووەو، دوو جاریـش نـاوی مووسـا هاتـوە، جگـە لـە سـووڕەتی (**الجـن**) یـش، کـە خـوا پشـتیوان بـێ دوایـی پێـی دەگەیـن، تەنیـا لـەم سـووڕەتەدا ئەوەنـدە بـە درێژیـی باسـی (**جـن**) کـراوە، چـوار ئایـەت بـۆ باسـی (**جـن**) لـەم سـووڕەتە موبارەکـەدا تەرخانکـراون.

## شەشەم: تایبەتمەندییەكانی:

حەوت تایبەتمەندیی ئەم سوورەتەمان هێناون:

**تایبەتمەندیی یەكەم:** ئەم سوورەتە سوورەتی حەوتەم و كۆتاییە، لە (**حَوامِیم**)، یان (**آلِ حم**)، واتە: كۆتا سوورەتە لەو حەوت سوورەتەی پێشتر باسمانكردن و، بە سوورەتی (**غَافِر**) دەست پێدەكەن و بەم سوورەتە كۆتاییان دێ: (**غَافِر، فُصِّلَت، الشُّورى، الزُّخْرف، الدُّخَان، الجَاثِيَة، الأَحْقَاف**).

**تایبەتمەندیی دووەم:** تەنیا لەم سوورەتەدا، باسی شایەدیدانی شایەدێك لە (**بَنُو إِسْرَائِيل**) كراوە: ﴿ قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِن كَانَ مِنْ عِندِ ٱللَّهِ وَكَفَرْتُم بِهِۦ وَشَهِدَ شَاهِدٌ مِّنۢ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ عَلَىٰ مِثْلِهِۦ فَـَٔامَنَ وَٱسْتَكْبَرْتُمْ ﴿١٠﴾ ﴾، هەڵبەتە لە زۆر شوێنی دیكە لە قورئاندا باسی (**بَنُو إِسْرَائِيل**) كراوە، بەڵام بەم تەعبیرە تەنیا لێرەدا هاتووە، كە وەك دوایی باس دەكەین، ئەم ئایەتە موبارەكە، هۆی هاتنە خوارەوەیەكی زۆر گەورەو گرنگ و مانادارى هەیەو، بە سەنەدێكی ڕاست (**صحیح**) لە سەرچاوە متمانە پێكراوەكاندا هاتووە.

**تایبەتمەندیی سێیەم:** تەنیا لەم سوورەتەدا، بەراورد لە نێوان بابایەكی بڕوادارى چاكەكار لەگەڵ باب و دایكی داو، بابایەكی بێبڕواو خراپەكار لەگەڵ باب و دایكیدا كراوە، ئایەتەكانی: (١٥ - ١٩) بۆ ئەوە تەرخانكراون.

**تایبەتمەندیی چوارەم:** تەنیا لەم سوورەتەدا سەرزەمین و شوێنی گەلی عاد بە (**الأَحْقَاف**) ناوبراوە، لە ئایەتی ژمارە (٢١)داو، تەنیا یەكجار وشەی (**الأَحْقَاف**) لە هەموو قورئاندا هاتووە، ئەویش لەم سوورەتەداو، وەك ناو بۆ ئەو شوێنە جوگرافییەی گەلی عاد، كە پێغەمبەرەكەیان هوود عليه السلام بووە، تێیدا ژیاون.

**تایبەتمەندیی پێنجەم:** تەنیا لەم سوورەتەدا باسی ناردنی خوا بۆ كۆمەڵێك لە جند بۆ لای پێغەمبەرو ﷺ گوێگرتنیان لە قورئان كراوە، لە ئایەتەكانی: (٢٩ - ٣٢)داو، شایانی باسە: ئەو كۆمەڵە جندە وا باسكراون، كە وێڕای شارەزایی

پێشتر بە کتێب و بەرنامەکانی خوا، چەمکەکانی خواناسیی و دینداریشیان زۆر باش زانیون و، زۆریش بە ئەدەب بوون لە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و قورئانداو، زۆریش هەستییان بە بەرپرسیاریەتیی کردوە، چونکە یەکسەر کە قورئانیان وەرگرتوە، گەڕاونەوە بۆ لای خەڵکەکەیان و، دەستیانکردوە بە بانگەوازکردنیان بۆ لای خواو بۆ لای ئیسلام.

**تایبەتمەندیی شەشەم:** تەنیا لەم سوورەتەدا تەعبیری: ﴿فَاصْبِرْ كَمَا صَبَرَ أُوْلُوا الْعَزْمِ مِنَ الرُّسُلِ (٣٥)﴾، هاتوە، کە زۆربەی هەرە زۆری توێژەرەوانی قورئان بە جۆرێک واتایان کردوە کە مەبەست لە: ﴿أُوْلُوا الْعَزْمِ مِنَ الرُّسُلِ﴾، چەند پێغەمبەرێکی دیاریکراون، بە تایبەتی: نووح و ئیبراهیم و مووسا و عیسا (**عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام**)، کە بە پێغەمبەری خاتەمەوە ﷺ موحەممەد دەبنە پێنج، بەڵام من ڕایەکی دیکەم هەیە، کە لە کاتی تەفسیرکردنی ئایەتەکەدا دەیخەمە ڕوو.

**تایبەتمەندیی حەوتەم و کۆتایی:** چەند تەعبیرو وشەیەک تەنیا لەم سوورەتەدا هاتوون:

**١)**- لە ئایەتی ژمارە چوار (٤)دا: ﴿أَوْ أَثَارَةٍ مِّنْ عِلْمٍ﴾، واتە: پاشماوەیەک لە زانیاریی.

**٢)**- لە ئایەتی ژمارە نۆ (٩)دا: ﴿قُلْ مَا كُنتُ بِدْعًا مِّنَ الرُّسُلِ﴾، واتە: من داهێنراوێک نیم، پەیداکراوێک نیم، یاخود: تازە بابەتێک نیم لە پێغەمبەران کە پێشینەم نەبووبێ.

**٣)**- لە ئایەتی ژمارە نۆ (٩)دا: ﴿وَمَا أَدْرِي مَا يُفْعَلُ بِي وَلَا بِكُمْ (٩)﴾، واتە: نازانم من و ئێوەش چیمان پێ دەکرێ، چیمان لێ دەکرێ، واتە: لە ڕووی سەرەنجامی ژیانی دنیاییەوە، ئەگەرنا سەرەنجامی قیامەتیی لەلا ڕوون بووە، کە خۆی و شوێنکەوتوانی بەهەشتیین و، نەیارو ناحەزەکانیشی ئەهلی سزان.

**٤)**- لە ئایەتی ژمارە یازدە (١١)دا: ﴿إِفْكٌ قَدِيمٌ (١١)﴾، تەنیا لێرەدا هاتوە، (**إفْك**) واتە: هەڵگێڕدراوە، بەڵام لێرەدا مەبەست پێی: درۆیە، (**قديم**)یش واتە: لە مێژینە، کات بەسەرداچوو، دێرین.

٥)- لە ئایەتی ژمارە دوازدە (١٢)دا: ﴿إِمَامًا وَرَحْمَةً ﴿١٢﴾﴾، واتە: پێشەواو بەزەیی، دیارە ئەم دوو وشەیە بە جیا لە قورئاندا زۆر هاتوون، بەڵام پێکەوە تەنیا لەم سوورەتەدا هاتوون.

٦)- لە ئایەتی ژمارە بیست و یەک (٢١)دا: ﴿بِٱلْأَحْقَافِ ﴿٢١﴾﴾، واتە: تەپکۆڵکە لماوییەکان، کە وەک گوتمان: سوورەتەکەش بەو ناوە ناونراوە .

٧)- لە ئایەتی ژمارە بیست و هەشت (٢٨)دا: ﴿قُرْبَانًا ءَالِهَةً ﴿٢٨﴾﴾، واتە: پەرستراوانی هۆکاری نیزیککەوتنەوە، چونکە (**قُرْبَان**) واتە: (**مَا يُتَقَرَّبُ بِهِ**) ئەوەی کە پێی نزیک دەبنەوە لە خوا، (**آلِـهة**)ش کۆی (**إله**)ە، واتە: پەرستراوەکان.

٨)- لە ئایەتی ژمارە بیست و نۆ (٢٩)دا: ﴿صَرَفْنَآ إِلَيْكَ نَفَرًا مِّنَ ٱلْجِنِّ ﴿٢٩﴾﴾، واتە: کۆمەڵێک، یان کەسانێکمان لە جند ناردن بۆ لای تۆ، بۆ گوێبیست بوونی قورئان.

٩)- لە ئایەتی ژمارە سی و پێنج (٣٥)دا: ﴿أُوْلُواْ ٱلْعَزْمِ مِنَ ٱلرُّسُلِ ﴿٣٥﴾﴾، واتە: خاوەن عەزیمەتەکان لە پێغەمبەران.

١٠)- هەر لە ئایەتی ژمارە سی و پێنج (٣٥)دا، وشەی: ﴿بَلَٰغٌ ﴿٣٥﴾﴾، کە بەم ڕێژگە (**صیغة**)یە، تەنیا لەم سوورەتەدا هاتوە، ئەگەرنا بە شێوەی دیکە زۆر هاتوە: ﴿وَمَا عَلَى ٱلرَّسُولِ إِلَّا ٱلْبَلَٰغُ ٱلْمُبِينُ ﴿١٨﴾﴾**العنكبوت**، بەڵام وشەی (بَلَاغ) بەبێ ئەلیف و لام، تەنیا لەم سوورەتە موبارەکەدا هاتوە.

## حەوتەم: دابەشکردنی ئایەتەکان بۆ چەند دەرسێك:

**دەرسی یەکەم:** ئایەتەکانی: (١ - ١٤)، واتە: چواردە (١٤) ئایەتی سەرەتای ئەم سوورەتە موبارەکەمان کردوون بە دەرسێک، کە باسی قورئان و بە هەق دروستکرانی گەردوون، پووچەڵکردنەوەی شیرک و، ڕەواندنەوەی تەم و مژو ئیشکال لە دەوری پێغەمبەرایەتیی (**محمد** ﷺ)و، باسی هەڵوێستی نالۆژیکییانەو

ناماقووڵانـەی کافـرەکان و، پێناسـەی بـڕواداران و، سـەرەنجامی خێریـان لـەم چـوارده ئایەتـەدا کـراون.

**دەرسـی دووەم:** ئایەتەکانی: (١٥ - ٢٠)، واتە: شـەش (٦) ئایەت، باسـی بەراوردکردنی نێـوان دوو کەسـی دژ بـە یـەک کـراوه، بڕوادارێکـی بەڕێـزو چاکـەکار لەگـەڵ بـاب و دایکیـداو، بێبڕوایەکـی بەدڕەفتـار لەگـەڵ بـاب و دایکیـداو، سـەرەنجامی شایسـتەی هـەر کامیـان، بەهەشـت و ڕەزامەندیـی خـوا بـۆ بـڕوادارانی چاکـەکارو بەڕێـز لەگـەڵ بـاب و دایکیـان داو، سـزای ڕیسـواکەرو سـەختی بێبڕوایـانی خراپـەکارو بـێ ڕێـز لەگـەڵ بـاب و دایکیـان داو، خۆشـگوزەران لـە دنیـادا.

**دەرسـی سـێیەم:** ئایەتـەکانی: (٢١ - ٢٨)، واتـە: هەشـت (٨) ئایـەت، بـاسی بەسـەرهاتی هـوود ﷺ و گەلەکـەی گـەلی عـاد کـراوه، کـە بانگـی کـردوون بـۆ یەکتـا پەرسـتیی و، ئەوانیـش ڕەفزیـان کـردوه، سـەرەنجام بایەکـی زۆر بەهێـز کـە ئـەوان بـە هـەوری تێگەیشـتوون، خـوا ناردوویەتـە سـەریان و، بـە هۆیـەوە فەوتـاون، ئاماژەیەکیـش بـە ئاوەدانییـە فەوتـاوەکانی دیکـەی، دەوروبـەری کۆمەڵگای پێغەمبـەر ﷺ کـراوه، کـە پەرسـتراوەکانیان هیـچ دادیـان نـەداون، لـە کاتێکـدا کـە سـزاو بـەڵای خوایـان بـۆ هاتـوه.

**دەرسـی چـوارەم:** ئایەتـەکانی: (٢٩ - ٣٥) واتـە: حـەوت (٧) ئایـەت، کـە لـەو حـەوت ئایەتـەدا، چواریـان ئایەتـەکانی: (٢٩ - ٣٢)، نـاردنی خـوا بـۆ کۆمەڵێـک جنـد باسـکراوه، کـە گـوێ لـەو قوڕئانـە بگـرن کـە موحەممـەد ﷺ خوێندوویـەتی، پاشـان گەڕانەوەیـان بـۆ لای گەلەکەیـان و هۆشـداریی پێدانیـان و، بانگەوازکردنیـان بـۆ لای خـوا، لـە ئایەتـەکانی: (٣٣ - ٣٥)یـش دا، سـێ بابـەت باسـکراون:

**أ-** ئیسپاتی زیندووکرانەوە، بە بەڵگەیەکی لۆژیکیی زۆر بەهێز.

**ب-** دیمەنی دانپێداهێنانی کافرەکان لە قیامەتدا.

ج- فەرمانکردنی خوا بە پێغەمبەر ﷺ کە وەک پێغەمبەرانی خاوەن عەزیمەت و خۆڕاگرو پشوو درێژ بێ و، دامەزراوو نەلەخشاوبێ و، پەلەش نەکات لە هاتنی سزای هەڕەشە پێ لێکراویی بێبڕوایان و، دڵنیاش بێ، کە ئەگەر لەسەر ئەو بێبڕوایی و خراپەکارییەی خۆیان بەردەوام بن، سەرەنجام سزای خوا ﷻ هەر یەخەیان دەگرێ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان چـوارده (١٤) ئایـەتی سـەرەتای سـووڕەتی (**الأحقـاف**) دەگرێتـەوە، ئایەتـەکانی: (١ - ١٤)، ئـەم چـوارده ئایەتـە کۆمەڵێـک بابـەتی جـۆراو جـۆر، بـەڵام پێکـەوە پەیوەسـت و تێکهەڵکێشـیان تێـدا خراونـەڕوو، کـە حـەوت بابەتـن:

١)- دابەزاندنی قورئان، ئەو زاتەی سەرچاوەی دابەزاندنی قورئانە، خوای باڵا دەستی کارزانە، لە ئایەتەکانی: (١ - ٢)دا.

٢)- حیکمەتی دروستکرانی گەردوون، لە ئایەتی: (٣)دا.

٣)- خستنەڕووی پووچەڵیی شیرک، لە ئایەتەکانی: (٤ - ٦)دا.

٤)- هەڵوێستی نەرێنییانەی کافرەکان بەرانبەر بە قورئان، لە هەردوو ئایەتی: (٧ - ٨)دا.

٥)- ڕوونکردنەوەی پێغەمبەری خاتەم ﷺ بۆ بەرنامەکەی و، بۆ هەڵوێستی خۆی، لە دوو ئایەتی: (٩ - ١٠)دا.

٦)- هەڵوێستی بێ بەڵگەو پاساوی کافرەکان لە بەرانبەر قورئان و ئیسلام و پێغەمبەردا ﷺ، کە هیچ بەڵگەیەکیان بەدەستەوە نیەو، هیچ پاساوێکی ماقووڵ و لۆژیکییان نیە، کە قورئان و ئیسلام و پێغەمبەر ﷺ ڕەفز دەکەن، لە دوو ئایەتی: (١١ - ١٢)دا.

٧)- وەسفی بڕوادارانی کردار باش و سەرەنجامی خێریان، لە دوو ئایەتی: (١٣ - ١٤)دا.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿ حمٓ ﴿١﴾ تَنزِيلُ ٱلْكِتَٰبِ مِنَ ٱللَّهِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَكِيمِ ﴿٢﴾ مَا خَلَقْنَا ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَآ إِلَّا بِٱلْحَقِّ وَأَجَلٍ مُّسَمًّى ۚ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ عَمَّآ أُنذِرُواْ مُعْرِضُونَ ﴿٣﴾ قُلْ أَرَءَيْتُم مَّا تَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَرُونِى مَاذَا خَلَقُواْ مِنَ ٱلْأَرْضِ أَمْ لَهُمْ شِرْكٌ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ ۖ ٱئْتُونِى بِكِتَٰبٍ مِّن قَبْلِ هَٰذَآ أَوْ أَثَٰرَةٍ مِّنْ عِلْمٍ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٤﴾ وَمَنْ أَضَلُّ مِمَّن يَدْعُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَن لَّا يَسْتَجِيبُ لَهُۥٓ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ وَهُمْ عَن دُعَآئِهِمْ غَٰفِلُونَ ﴿٥﴾ وَإِذَا حُشِرَ ٱلنَّاسُ كَانُواْ لَهُمْ أَعْدَآءً وَكَانُواْ بِعِبَادَتِهِمْ كَٰفِرِينَ ﴿٦﴾ وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُنَا بَيِّنَٰتٍ قَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لِلْحَقِّ لَمَّا جَآءَهُمْ هَٰذَا سِحْرٌ مُّبِينٌ ﴿٧﴾ أَمْ يَقُولُونَ ٱفْتَرَىٰهُ ۖ قُلْ إِنِ ٱفْتَرَيْتُهُۥ فَلَا تَمْلِكُونَ لِى مِنَ ٱللَّهِ شَيْـًٔا ۖ هُوَ أَعْلَمُ بِمَا تُفِيضُونَ فِيهِ ۖ كَفَىٰ بِهِۦ شَهِيدًۢا بَيْنِى وَبَيْنَكُمْ ۖ وَهُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٨﴾ قُلْ مَا كُنتُ بِدْعًا مِّنَ ٱلرُّسُلِ وَمَآ أَدْرِى مَا يُفْعَلُ بِى وَلَا بِكُمْ ۖ إِنْ أَتَّبِعُ إِلَّا مَا يُوحَىٰٓ إِلَىَّ وَمَآ أَنَا۠ إِلَّا نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴿٩﴾ قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِن كَانَ مِنْ عِندِ ٱللَّهِ وَكَفَرْتُم بِهِۦ وَشَهِدَ شَاهِدٌ مِّنۢ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ عَلَىٰ مِثْلِهِۦ فَـَٔامَنَ وَٱسْتَكْبَرْتُمْ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٠﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَوْ كَانَ خَيْرًا مَّا سَبَقُونَآ إِلَيْهِ ۚ وَإِذْ لَمْ يَهْتَدُواْ بِهِۦ فَسَيَقُولُونَ هَٰذَآ إِفْكٌ قَدِيمٌ ﴿١١﴾ وَمِن قَبْلِهِۦ كِتَٰبُ مُوسَىٰٓ إِمَامًا وَرَحْمَةً ۚ وَهَٰذَا كِتَٰبٌ مُّصَدِّقٌ لِّسَانًا عَرَبِيًّا لِّيُنذِرَ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ وَبُشْرَىٰ لِلْمُحْسِنِينَ ﴿١٢﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ قَالُواْ رَبُّنَا ٱللَّهُ ثُمَّ ٱسْتَقَٰمُواْ فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿١٣﴾ أُوْلَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلْجَنَّةِ خَٰلِدِينَ فِيهَا جَزَآءًۢ بِمَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ ﴿١٤﴾ ﴾.

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{«بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە»، حا میم (١) دابەزاندنی ئەم کتێبە لە لایەن خوای باڵادەستی کارزانەوەیە (٢) ئاسمانەکان و زەوی ئەوەی نێوانیانمان تەنیا بە هەق و حیکمەت و بۆ کاتێکی ناوبراو (دیارییکراو) هێناونە دی، لە حاڵێکدا ئەوانەی بێبڕوان لەوەی لێی ترسێنراون (و لە بارەیەوە وریاکراونەوە) لامل و پشت هەڵکردوون (٣) (ئەی موحەممەد! ﷺ) بڵێ: (ئەی هاوبەشدانەرەکان!)، ئایا ئەوانەتان دیوە کە جگە لە خوا لێیان دەپاڕێنەوە، پێشانم بدەن چییان لە زەویدا دروستکردوە، یان ئایا لە (دروستکردنی) ئاسماناندا بەشدارن؟! ئەگەر لە ڕاستانن (بۆ ئیسپاتی قسەکەتان) کتێبێکم پێش ئەم (قورئان)ە، بۆ بێنن، یان پاشماوەیەک لە زانیاریی (بەرهەمی عەقڵ) (٤) هەروەها (وێڕای ئەوەش) کێ لەو کەسە گومڕاترە، کە جگە لە خوا لە کەسێک (و لە شتێک) دەپاڕێتەوە، کە هەتا ڕۆژی قیامەت وەڵامی ناداتەوەو (بگرە) ئەوان (پەرستراوەکان) لە پاڕانەوەو بانگکردنەکەشیان بێ ئاگان؟! (٥) کاتێکیش خەڵک کۆکرانەوە (لە قیامەتدا) ئەو (پەرستراو)انە، لێیان دەبنە دوژمن و، بە پەرستنەکەشیان بێبڕوادەبن (و نکووڵیی لێدەکەن!) (٦) کاتێکیش ئایەتە ڕۆشنەکانمانیان بەسەردا بخوێنرێنەوە، ئەو کەسانەی بێبڕوان بە (قورئانی ڕاست و) هەق، هەر لەگەڵ بۆیان هات، دەڵێن: ئەمە جادوویەکی ئاشکرایە! (٧) یان ئایا دەڵێن: (موحەممەد ﷺ بە ناوی خواوە) هەڵیبەستوە؟ بڵێ: ئەگەر (گریمان) هەڵمبەستبێ، ئێوە لە بەرانبەر (سزای) خوادا هیچ شتێکتان بۆ من (بەدەست نیەو) لە دەست نایەت، ئەو زاناترە بەو (قسەو تۆمەت)ەی، تێیدەڕژێن (و بەنێوی دەکەون) ئەو بەسە لە نێوان من و ئێوەدا شایەد بێ (کە من ڕاستگۆم) و، هەر ئەویش لێبووردەی میهرەبانە (٨) بڵێ: من داهێنراو (و بێ پێشینە) نیم لە پێغەمبەران و ناشزانم

(لـه ژیـانی دنیـادا) چـی بـه مـن و ئێـوەش دەکـرێ، تەنیـا شـوێن ئـەوە دەکـەوم کـە بـۆم سروش دەکـرێ و، مـن بـەس ترسـێنەرو وریاکەرەوەیەکـی ئاشـکراو ڕوونکـەرەوەم ﴿٩﴾ بڵـێ: ئایـا (بـە چـاوی عەقـڵ و دڵ) بینیوتانـە! ئەگـەر (ئـەم قورئانـە) لـە لایـەن خـواوە بـێ و، ئێـوەش پێـی بێبڕوابـن و، شـایەدێکیش لـە (گـەلی جوولەکـە) وەچـەی ئیسـرائیل شـایەدیی لەسـەر (ڕاسـتیی) وێنـەی ویـدا، ئنجـا بـڕوای هێنـاو ئێـوەش خۆتـان بەزلگـرت (لـە ئاسـتی داو بڕواتـان پێـی نەهێنـا)، ئایـا کـێ لـە ئێـوە گومڕاتـرە؟ بـە دڵنیایـی خـوا کۆمەڵـی سـتەمکاران ڕاسـتە ڕێ نـاکات ﴿١٠﴾ ئەوانـەی بێبڕواشـن بەوانەیـان گـوت کـە بڕوایـان هێنـاوە: ئەگـەر (قورئـان) چـاک (و هـەق) بووایـە (لـە بـڕوا پێهێنانیـدا) ئەوانـە پێشـمان نەدەکەوتنـەوە، ئنجـا چونکـە بەهۆیـەوە ڕێـی ڕاسـتگرتوو نەبـوون (لێـی بەهرەمەنـد نەبـوون) دەڵێـن: ئـەوە درۆیەکـی دێرینـە! ﴿١١﴾ (لـە حاڵێکـدا) لـە پێـش ویشـدا کتێبەکـەی مووسـا عليه السلام (تـەورات) پێشـەواو بەزەیـی (خـوا) بـوو، ئـەم (قورئـان)ەش، کتێبێکـی بەڕاسـتدانەر(ی کتێبـەکانی پێشـوویەو)، بـە زمانێکـی ڕۆشـنە، (نێـردراوە) تاکـو ئەوانـەی سـتەمیان کـردوە، بترسـێنێ و هۆشـیار بکاتـەوەو، موژدەشـە بـۆ چاکـەکاران ﴿١٢﴾ بـە دڵنیایـی ئەوانـەی گوتیـان: پەروەردگارمـان خوایـە، ئنجـا ڕاوەسـتاوو دامەزراویـش بـوون، هیـچ ترسـیان لەسـەر نیـەو خەمباریـش نابـن ﴿١٣﴾ ئەوانـە هـاوەڵانی بەهەشـتن تێیـدا هەرمـاو دەبـن (ئـەوەش) پاداشـتی ئەوەیـە کـە دەیانکـرد ﴿١٤﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(أَثَـٰرَةٍ مِّنْ عِلْمٍ): (أَثَـرُ الـشَّيء: حُصُولُ مَـا يَـدُلُّ عَـلَى وُجُـودِهِ، أَثَـرْ وَإِثَـرْ، وَالجَمْـعُ آثَـار، يُقَـالُ: سَـمَنَّتُ الإِبِـلَ عَـلَى أَثَـارَةٍ، أَي: عَـلَى أَثَـرٍ مِـنْ شَـحْمٍ، وَأَثَـارَةٌ مِـنْ عِلْـم، وَقُـرِئَ أَثَـرَةٌ، مَـا يُـرْوَى أَو يُكْتَـبُ فَيَبْقَـى لَـهُ أَثَـرٌ)، کـە خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: (أَثَـارَةٍ مِـنْ عِلْـمٍ)، (أَثَـرُ الـشَّيء) پەیدابـوونی شـوێنەوارێکە بەڵگـە بـێ لەسـەر بـوونی ئـەو شـتە، {شـوێن پـێ بەڵگەیـە لەسـەر ڕۆیشـتنی پێـڕۆو، دروسـتکراو بەڵگەیـە لەسـەر بەدیهێنـەر}، کـۆی (أَثَـرْ) بریتیـە لـە (آثَـار)، عـەرەب دەڵێـن: (سَـمَّنْتُ الإِبِـلَ عَـلَى أَثَـارَةٍ) واتـە: حوشترەکەم قەڵـەو کـرد لەسـەر پاشـماوەیەک لـە چەوریـی و پیـو، (وَأَثَـارَةٌ مِـنْ عِلْـمٍ) بـە (أَثَـرَةٍ)ش خوێندراوەتـەوە، بریتیـە لـەو ئەنـدازە زانسـتەی کـە دەگێڕدرێتـەوە، یاخـود دەنـووسرێ و شـوێنەوارەکەی دەمێنێتـەوە، کەواتـە: (وَأَثَـارَة مِـنْ عِلْـم) واتـە: زانیارییـەک، پاشـماوەیەکی زانیاریـی لـەوەی عەقڵ بەرهەمـی هێنـاوە.

(افْتَرَىٰهُ): (الفَـرِيُ: قَطْـعُ الجِلْـدِ لِلخَـرْزِ وَالإِصْلَاحِ، وَالإِفْـتِرَاءُ: الكَـذِبُ، وَالظُّلْـمُ، وَالـشِّرْكُ)، وشــەی (إِفْــتِرَى) لــە (فَرِي)یــەوە هاتــوە، (فَــرِي): بریتیــە لــە بڕینــی چــەرم بــۆ پینەکـردن {کاتێ خـۆی پێڵاویـان بـە چـەرم پینـە کـردوەو، بـۆ چاککـردن و، جـاری وایـە پێسـتەکەیان، چەرمەکەیـان بڕیـوە بـۆ ئـەوەی شـتێکی لـێ دروسـت بکـەن}، بـەڵام دوایـی وشـەی (إِفْـتِرَى) لـە قوڕئانـدا بەکارهێـنراوە بـۆ درۆو، سـتەم، هەروەهـا بـۆ هاوبـەش بـۆ خوادانـان.

(تُفِيضُونَ فِيهِ): واتـە: دەڕژێنـە نێـوی، وەنێـوی دەکـەون، دەگوتـرێ: (فَـاضَ المَـاءُ: سَـالَ مُنْصَبًّـاً وَأَفَـاضَ إِنَـاءَهُ: مَـلَأَهُ حَتَّـى أَسَـالَهُ، وَالإِفَاضَـةُ: الإِنْدِفَـاعُ فِي شَيءٍ)، (فَـاضَ المَـاءُ) واتـە: ئاوەکـە هەڵـڕژا، (أَفَـاضَ إِنَـاءَهُ) واتـە: قاپەکـەی پڕکـرد، تاکـو لێـی ڕژا، (إِفَاضَـة): بریتیـە لـە ڕژانـە نێـو شـتێک بـە گـوژم بچیـە نێـوی، کـە دەفەرمـوێ: (تُفِيْضُـون فِيْـهِ) واتـە: ئـەو قسـانەی دەچنـە نێویـان، وەک چوونە نێـو باتـڵاغ (تَخُوضُـون) و (يَخُوضُـون)،

(**خَاضَ، يَخُوضُ**) واتـە: چـووە نێـو باتڵاغێکـەوە، یـان چـووە نێـو ئاوێکـەوە، هـەروەک (**فَاضَ المَاءُ يَفِيضُ**) واتـە: ئاوەکـە ڕژا، دەڕژێ، بـەڵام (**أَفَاضَـهُ**) واتـە: ڕژاندیـی و پـڕی کـرد، تاکـو لێـی ڕژا، لێـرەدا مەبەسـت پێـی چوونـە نێـو ئـەو قسـەو باسـانەیە کـە ڕاسـت نیـن، وەک چـۆن کەسێک دەچێتـە نێـو باتڵاغێکـەوە.

(**بِدْعًا**): واتـە: شـتێکی تـازەو بـێ پێشـینە، (**الإِبْـدَاعُ: إِنْشَـاءُ صُنْعَـةٍ بِـلَا احْتِـذَاءٍ وَاقْتِـدَاء، يُقَـالُ: رَكِيَّـةٌ بَدِيْـعٌ: جَدِيْـدَة الحَفْـرِ**)، (**إِبْدَاع**): بریتیـە لـە دروسـتکردنی شـتێک بەبـێ چاولێکـردن و، بەبـێ پێشـینە هەبـوون، لـە نـوێ دروسـت بکـرێ، بـە کوردیـی داهێنـانی پـێ دەڵێـن، دەگوتـرێ: (**رَكِيَّـةٌ بَدِيْـعٌ**)، (**رَكِيَّـة**) بیـر، بیرێـک کـە تـازە هەڵقەنرابـێ و پێشـینەی نەبووبـێ، نـەک بیرێـک کـۆن بووبـێ و پاککرابێتـەوە، (**بِدْعَاً مِـنَ الرُّسُـل: مُبْدَعَـاً لَـمْ يَتَقَدَّمْـهُ رَسُـولٌ**)، واتـە: تـازە پەیدابوویـەک هیـچ پێغەمبـەری پێـش نەکەوتـبێ، یاخـود (**مُبْدِعَـاً فِيْـمَا أَقُولُـه**)، داهێنەربـم لـەوەدا کـە دەیڵێـم، واتـە: داهێنەربـم لـەوەدا کـە هاتـووم، یـان داهێنەربـم لـەوەدا کـە دەیڵێـم و پێـش مـن کـەس وای نەکردبـێ لـە پێغەمبـەران (**عَلَيْهِـمُ الصَّـلاةُ وَالسَّـلام**).

(**إِفْكٌ**): (**الإِفْـكُ: كُلُّ مَـصْرُوفٍ عَـنْ وَجْهِـهِ الَّـذِي يَحِـقُّ أَنْ يَكُـونَ عَلَيْـهِ وَيُسْـتَعَارُ لِلْكَـذِبِ**)، (**إِفْـك**): بریتیـە لـە هـەر شـتێک لـەو ڕووەی کـە پێویسـتە لەسـەری بـێ، لێـی لابـدرێ، دەشـخوازرێتەوە بـۆ درۆ، ئەگەرنـا ئەسـڵی وشـەی (**إِفْـك**) بـە مانـای هەڵگێڕانـەوەو سـەرەو بـن کـردن دێ، بۆیـە ئاوەدانییـەکانی گـەلی لـووط ناویـان لێـنراوە (**الـمُؤْتَفِكَات**)، واتـە: هەڵگێـڕدراوەکان.

(**قَدِيمٌ**): واتـە: دێریـن، کات بەسـەرداچوو، (**أَكْـثَرُ مَـا يُسْـتَعْمَلُ القَدِيْـمُ باعْتِبَـار الزَّمَـانِ، وَلَـمْ يَـرِدْ فِي القُـرآنِ وَالسُّـنَّةِ «قَدِيْـم»، كَصِفَـةٍ للـهِ، وَالمُتَكَلِّمُـون يَصِفُونَـهُ بِـهِ وَيَسْـتَعْمِلُونَهُ**)، وشـەی (**قَدِيْـم**) بـە زۆریـی لـە ڕووی کاتـەوە، کـە کاتی بەسـەرداچووە، بـە کوردیـی دەڵێیـن: «دێریـن، یـان کـۆن، یـان لـە مێژینـە»، بـەڵام نـە لـە قورئـان، نـە لـە سـوننەتدا وشـەی (**قَدِيْـم**)، وەک سـیفەتێک بـۆ خـوا بەکارنەهاتـوە، بـەڵام

زانایانی بواری ئیمان و عەقیدە {کە (مُتَكَلِّمُون)یان پێ گوتراوە}، خوایان ﷻ بەو سیفەتە وەسفکردوە.

دەڵێم: هەروەها وشەی (صَانِع)یشیان، بۆ خوا ﷻ بەکارهێناوە، کە لە قورئان و سوننەتدا نەهاتوە، زانایان وشەی دیکەشیان بەکارهێناون، هەم پسپۆڕانی عەقیدە (مُتَكَلِمُون)، هەم: پسپۆڕانی تەزکیەو تەصەووف (أَهْلِ التَّصَوّف)، هەندێ وشەو تەعبیر بەکاردەهێنن بۆ تێگەیاندنی خەڵک کە لە قورئان و سوننەتدا نەهاتوون، لەو بارەوەش لە نێوان زانایاندا مشت و مڕ هەیە، بەڵام من وای تێدەگەم سەلامەتتر وایە، هەر وشەیەک خوا ﷻ وەک ناو یان سیفەت بۆ خۆی بە کاری نەهێنا بێ، ئێمە بەکاری نەهێنین، مەگەر پێویست بکات، جاری وایە سیفەتێکی خوا ﷻ یان ناوێکی خوا شی دەکەیەوەو مانایەکەی ڕۆشن دەکەیەوە، دەگونجێ بڵێی: ماناکەی ئاوایە، بەڵام کە ئەو وشەیە، بۆ خوا ﷻ بەکاربهێنرێ، پێم شتێکی باش نیە، چونکە بۆ وێنە: وشەی (قَدِيم) ئەوەیە کە کاتی بەسەردا تێپەڕی بێ، بەڵام سەرەتای هەبێ، بەڵام خوا بێ سەرەتایە، یان وشەی (صَانِع) واتە: سەنعەتکار کەسێک کە شتێکی دروست کردبێ بە شێوەیەکی ڕێک، بەڵام ئەوە ئەگەر لە ڕوویێکەوە لەگەڵ خوای پەروەردگاردا دەگونجێ، بەڵام لە ڕووی شکۆوە، لەگەڵی ناگونجێ، بۆیە هەر وشەیەک لە قورئان و سوننەتدا نەهاتبێ، واباشە بۆ خوا ﷻ بەکاری نەهێنین، بە لای کەمەوە باشە، ئەگەرنا هەندێک لە زانایان هەر بە قەدەغەی دەزانن بەکاربهێنرێ.

(إِمَامًا): (الإِمَامُ: المُؤْتَمُّ بِهِ إِنْسَاناً كَانَ، أَو كِتَاباً، أَو غَيْرَ ذَلِكَ، مُحِقّاً كَانَ، أَو مُبْطِلاً وَجَمْعُهُ أَئِمَّة)، وشەی (إِمَامْ) هەر کەسێکە، یان هەر شتێکە، ئنجا مرۆڤ بێ، یاخود کتێب بێ، یان جگە لەوان، کە بکرێتە پێشەواو سەر مەشق، پاشان ئەو مرۆڤە، یاخود ئەو کتێبە، چ هەقی گرتبێتە نێو خۆی، چ ناهەقی گرتبێتە نێو خۆی، کۆی (إمَام)یش (أَئِمَّة)یە، پێشەوایەکان.

## هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکان

دەربارەی هـۆی هاتنـە خـوارەوەی ئـەم ئایەتـە موبارەکە، کـە خـوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِن كَانَ مِنْ عِندِ ٱللَّهِ وَكَفَرْتُم بِهِۦ وَشَهِدَ شَاهِدٌ مِّنۢ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ عَلَىٰ مِثْلِهِۦ فَـَٔامَنَ وَٱسْتَكْبَرْتُمْ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٠﴾ ﴾، ئـەم دوو گێڕراوەیـە دێنیـن:

أ/ {عَنْ عَوْفِ بْنِ مَالِكٍ الأَشْجَعِي ﵁، قَالَ: انْطَلَقَ النَّبِيُّ ﷺ وَأَنَا مَعَهُ، حَتَّى دَخَلْنَا كَنِيسَةَ الْيَهُودِ بِالْمَدِينَةِ يَوْمَ عِيدِهِمْ، وَكَرِهُوا دُخُولَنَا عَلَيْهِمْ، فَقَالَ لَهُمْ رَسُولُ اللهِ: يَا مَعْشَرَ الْيَهُودِ! أَرُونِي اثْنَا عَشَرَ رَجُلاً يَشْهَدُونَ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللهِ ﷺ، يَحُطُّ اللَّهُ عَنْ كُلِّ يَهُودِيٍّ تَحْتَ أَدِمِ السَّمَاءِ الْغَضَبَ الَّذِي غَضِبَهُ عَلَيْهِ، قَالَ: فَأَمْسَكُوا مَا أَجَابَهُ مِنْهُمْ أَحَدٌ، ثُمَّ رَدَّ عَلَيْهِمْ، فَلَمْ يُجِبْهُ أَحَدٌ، ثُمَّ ثَلَّثَ فَلَمْ يُجِبْهُ أَحَدٌ، فَقَالَ: أَبَيْتُمْ؟ فَوَاللهِ إِنِّي لأَنَا الْحَاشِرُ، وَأَنَا الْعَاقِبُ، وَأَنَا الْمُقَفَّى، آمَنْتُمْ، أَوْ كَذَّبْتُمْ، ثُمَّ انْصَرَفَ وَأَنَا مَعَهُ، حَتَّى دَنَا أَنْ نَخْرُجَ، فَإِذَا رَجُلٌ مِنْ خَلْفِنَا يَقُولُ: كَمَا أَنْتَ يَا مُحَمَّدُ! قَالَ: فَقَالَ ذَلِكَ الرَّجُلُ: أَيُّ رَجُلٍ تَعْلَمُونِ فِيكُمْ يَا مَعْشَرَ الْيَهُودِ؟ قَالُوا: مَا نَعْلَمُ كَانَ فِينَا رَجُلٌ أَعْلَمُ بِكِتَابِ اللهِ، وَلاَ أَفْقَهَ مِنْكَ، وَلاَ مِنْ أَبِيكَ مِنْ قَبْلِكَ، وَلاَ مِنْ جَدِّكَ قَبْلَ أَبِيكَ، قَالَ: فَإِنِّي أَشْهَدُ لَهُ بِاللهِ أَنَّهُ نَبِيُّ اللهِ الَّذِي تَجِدونَهُ فِي التَّوْرَاةِ، قَالُوا لَهُ: كَذَبْتَ ثُمَّ رَدُّوا عَلَيْهِ، وَقَالُوا لَهُ شَرًّا، قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: كَذَبْتُمْ لَنْ يُقْبَلَ قَوْلُكُمْ، أَمَّا آنِفاً فَتُثْنُونَ عَلَيْهِ مِنَ الْخَيْرِ مَا أَثْنَيْتُمْ، وَأَمَّا إِذَا آمَنَ كَذَّبْتُمُوهُ، وَقُلْتُمْ مَا قُلْتُمْ، فَلَنْ يُقْبَلَ قَوْلُكُمْ، قَالَ: فَخَرَجْنَا، وَنَحْنُ ثَلاَثَةٌ: رَسُولُ اللهِ ﷺ، وَأَنَا، وَعَبْدُ اللهِ بْنُ سَلاَمٍ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ فِيهِ: ﴿ قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِن كَانَ مِنْ عِندِ ٱللَّهِ وَكَفَرْتُم بِهِۦ ﴿١٠﴾ ﴾} (أخرجه أحمد: ٢٤٠٣٠، وابن حبان: ٧١٦٢، وَغَيْرُهُمَا، قَالَ شُعَيْب الأَرنؤوط: إسناده صحيح).

واتـە: عـەوفی کـوڕی مالیکـی ئەشـجەعیی خـوا لێـی ڕازی بـێ، دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا ﷺ ڕۆیشـت، مـن لـە خزمەتیـدا بـووم، تاکـو چووینە نێـو پەرسـتگای جوولەکەکان لـە مەدینـە لـە ڕۆژی جەژنیانـدا، پێیـان ناخـۆش بـوو کـە چووینـە لایـان، پێغەمبـەری خـوا ﷺ پێیگوتـن: ئـەی کۆمەڵـی جوولەکـە! دوازدە پیاوانـم پێشـان بـدەن، شـایەدیی

بدەن، کە بێجگە لە خوا ﷻ هیچ پەرستراو نین و، من ڕەوانەکراوی خوام، خوا ﷻ ئەو تووڕەییەی کە نواندوویەتی بۆ سەر هەر جوولەکەیەک، لە ژێر سێبەری ئاسماندا، (ئەو تووڕەییە لەسەر جوولەکان) لای دەبات، دەڵێ: بێ دەنگ بوون و هیچ کامیان وەڵامیان نەدایەوەو، دووبارەی کردەوە، دیسان هیچ کەس وەڵامی نەدایەوەو، سێ بارەی کردەوە، هیچ کەس وەڵامی نەدایەوە، ئنجا فەرمووی: ئامادەنین بڕوام پێ بێنن؟ سوێند بە خوا منم حاشیر، (واتە: ئەو دەبێتە پێشکەوتوو و سەر مەشق بۆ کۆکردنەوەی خەڵک و دەستپێکردنی لێپرسینەوەو سزاو پاداشت) و من عاقیبم (واتە: کۆتایی پێغەمبەران کە بە دوایان دادێ) و من موقەففام (واتە: ئەوەی کراوەتە کۆتایی پێغەمبەران، لە دوای ئەوەوە کەسی دیکە نایەت)، ئێوە بڕوابێنن یان بە درۆ دابنێن، دوایی ڕۆیشت و منیش لە خزمەتیدابووم، هەتا نیزیک بوو بچێتە دەرێ لە کڵێسایەکەیان، پیاوێک لە دوامانەوە گوتی: ئەی موحەممەد! لە شوێنی خۆت بە، دەڵێ: ئنجا ئەو پیاوە ڕووی لە جوولەکەکان کردو گوتی: ئەی کۆمەڵی جوولەکە! چۆن کەسێکم دەزانن؟ گوتیان: نەمانزانیوە، هیچ پیاوێک زاناتربێ بە کتێبی خواو، شارەزاتربێ لە تۆ و لە بابت لە پێش تۆداو، لە باپیرت لە پێش بابتدا، ئەویش گوتی: من شایەدیی دەدەم بە خوا کە ئەوە ئەو پێغەمبەرەی خوایە ﷺ کە لە تەوراتدا دەیبینن، گوتیان: درۆ دەکەی و، بەرپەرچیان دایەوەو، قسەی خراپیان پێگوت، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: ئێوە درۆ دەکەن و، قسەتان وەرناگیرێ، پێشتر ستایشتان کردو، پێتان هەڵگوت و قسەی خێرتان بۆ کرد، بەڵام دوای ئەوە بڕوای هێنا، بە درۆتان داناو، ئەوەتان گوت، کە گوتتان، بۆیە قسەکەتان وەرناگیرێ، دەڵێ: هەرسێکمان دەرچووین، پێغەمبەری خوا ﷺو، من و عەبدوڵڵای کوڕی سەلام، خواش ﷻ لە بارەی ئەوەوە ئەم ئایەتەی ناردە خوار: ﴿ قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِن كَانَ مِنْ عِندِ ٱللَّهِ وَكَفَرْتُم بِهِۦ وَشَهِدَ شَاهِدٌ مِّنۢ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ عَلَىٰ مِثْلِهِۦ فَـَٔامَنَ وَٱسْتَكْبَرْتُمْ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٠﴾ ﴾.

هەر لەو بارەی ئەم ئایەتە موبارەکەوە، ئەم گێڕراوەیەش دێنین:

**ب/ {عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ ﷺ، قَالَ: مَا سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ لأَحَدٍ يَمْشِي عَلَى الأَرْضِ إِنَّهُ مِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ، إِلاَّ لِعَبْدِ اللهِ بْنِ سَلاَمٍ، قَالَ: وَفِيهِ نَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ:** ﴿وَشَهِدَ شَاهِدٌ مِّنۢ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ عَلَىٰ مِثْلِهِۦ فَـَٔامَنَ وَٱسْتَكْبَرْتُمْ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٠﴾﴾**} (أخرجه البخاري: ٣٨١٢، ومسلم: ٢٤٨٣).**

واتە: سەعدی کوڕی ئەبی وەققاص ﷺ، دەڵێ: نەمبیستوە پێغەمبەری خوا ﷺ بە هیچ کەسێک کە لەسەر زەوی ڕۆیشتوە، بفەرموێ: لە خەڵکی بەهەشتە، جگە لە عەبدوڵڵای کوڕی سەلام (ئەوەی بەو فەرمووە)و لە بارەی ئەویشەوە، ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿وَشَهِدَ شَاهِدٌ مِّنۢ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ عَلَىٰ مِثْلِهِۦ فَـَٔامَنَ وَٱسْتَكْبَرْتُمْ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٠﴾﴾، کە دواییش دەیگەینێ مشت و مڕ هەیە، لە نێوان زانایاندا، کە ئایا ئەویش هەر لە نێو سوورەتی **(الأحقاف)**دا، لە مەککە دابەزیوە، یاخود بە جیا لە مەدینە دابەزیوەو، دوایی خراوەتە ئەو شوێنە؟ بەپێی ئەو ئەم دوو ڕیوایەتە دەردەکەوێ، کە ئەم ئایەتە موبارەکە بە جیا لە مەدینە دابەزیبێ، لە کاتێکدا عەبدوڵڵای کوڕی سەلام کە یەکێک بووە، لە زانا هەرە دیارەکانی جوولەکەکان بە دان پێداهێنانی خۆیان، مسوڵمان بووە، لەو کاتەدا دابەزیوە، بەڵام دوایی خراوەتە نێوان دوو ئایەتەکانی: (٩ و ١١)، لە سوورەتی **(الأحقاف)**.

## ماناى گشتيى ئايەتەكان

وەک لە پێناسەی ئەم سوورەتەدا، گوتمان لەم سوورەتە بەپێزەدا، پانتاییەکی زۆر تەرخانکراوە بۆ باسی قورئان و پێغەمبەرایەتیی، پاشان باسی بەرپەرچدانەوەی شیرک و هاوبەش بۆ خوادانەران، هەروەها باسی ڕۆژی دوایی و سزاو پاداشت، وێڕای چەند شتێکی دیکە، کە تێکەڵکێش کراون لەگەڵ ئەو بابەتانەدا، سەرەتا خوا ﷻ دەفەرموێ:

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە، واتە: دەستپێکردنم بە ناوی خوایە، کە مەبەستی پێ ئەوەیە:

١- ئەم کارە تەنها بە ناوی خواوە ئەنجام دەدەم.

٢- ئەم کارە تەنیا بۆ ڕەزامەندیی ئەنجام دەدەم.

٣- ئەم کارە بە پێی بەرنامەی خوا ئەنجام دەدەم.

٤- هەروەها ئەم کارە بە تواناو یارمەتیی خوای پەروەردگار دەکەم.

ئنجا خوا دەفەرموێ: ﴿حمٓ﴾، کە ئەمانە دوو پیتن لە پیتە پچڕپچڕەکان، واتە: پچڕپچڕ دەخوێنرێنەوە، نەک بەسەریەکەوە، کە وەک پێشتر گوتوومانە: لە تەفسیری سوورەتی (**یونس**)دا، لە سەرەتاکەیدا باسێکی درێژمان لە بارەی ئەو بیست و نۆ (٢٩) سوورەتەوە کردوە، کە سەرجەم چواردە لەو پیتانە لە پێشیانەوە هاتوون، ئنجا هەندێکیان یەک پیتیین و وەک (ص) و (ق) و (ن)و، هەندێکیان دوو پیتیین، وەک (**حم**)ەکان و (**یس و طه و طس**)، هەندێکیشیان سێ پیتیین وەک (**ألر**)یەکان، یان (**ألم**)کان و، (**طسم**)ەکان و، هەندێکیان چوارییین

وەک (الـر) و (المـص)و، هەندێکیـان پێنجییـن وەک (کهیعـص)، کـۆی ئـەو پیتانـەی لـە سـەرەتای ئـەو بیسـت و نـۆ سـوورەتانە هاتـوون، چـواردە (١٤)ن و هەمـوو جـۆرە پیتەکانیـان تێـدان.

زانایـان زۆریـان قسـە کـردوە لـە بـارەی ئـەو پیتـە پچـڕ پچڕانـەوە، ئایـا حیکمـەتی چییـە خـوا خسـتوونیە پێـش بیسـت و نـۆ لـە سـوورەتەکانی قورئـان؟ هەندێکیـان گوتوویانـە: بـەس بـۆ ئاگادارکردنـەوەی پێغەمبـەر بـووەو ﷺ، هەندێکیـان گوتوویانـە: بـۆ ئـەوە بـووە کـە سـەرنجی مرۆڤـەکان ڕابکێشـێ کـە ئـەو قورئانـەی لەبـەر دەستتانە، هـەر لـەو پیـت و دەنگانـە پێـک دێ، ئێمـەش تاکـو ئێسـتا ئـەو مانایەمـان لـە هەمـووان زیاتـر بـە دڵـەوە نووسـاوە، بـە بەڵگـەی ئـەوە کـە هـەر یەکسـەر لـە دوای ئـەو پیتانـە بـاسی قورئانـە: ﴿طه ١ مَآ أَنزَلۡنَا عَلَيۡكَ ٱلۡقُرۡءَانَ لِتَشۡقَىٰٓ ٢﴾طـه، ﴿يسٓ ١ وَٱلۡقُرۡءَانِ ٱلۡحَكِيمِ ٢﴾یـس، ﴿حمٓ ١ تَنزِيلُ ٱلۡكِتَٰبِ مِنَ ٱللَّهِ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡعَلِيمِ ٢﴾غافـر، ﴿الٓمٓ ١ تَنزِيلُ ٱلۡكِتَٰبِ لَا رَيۡبَ فِيهِ مِن رَّبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ٢﴾السـجدة، هـی هەموویـان وان، جگـە لـە هـەردووک سـوورەتی (العنکبـوت) و (الـروم)، هـەر کاتێـک ئـەو پیتانـە هاتـن، یەکسـەر باسـی قورئانـە، واتـە: ئـەو قورئانـە هـەر لـەو پیـت و دەنگانـە پێـک دێ، کـە لەبـەر دەسـتی ئێوەشـدا هـەن، وەک کەرەسـتەیەکی خـاو، بـەڵام ئێـوە نـەک هـەر ناتوانـن، وێنـەی قورئـان بێنـن، یـان وێنـەی دە (١٠) سـوورەت، بەڵکـو وێنـەی سـوورەتێکی سـێ ئایەتییـش بێنـن، وەک سـوورەتەکانی: (العـصر) و (الکوثـر) و (النّـصر).

کەواتـە: بزانـن! ئـەو خوایـەی ﷻ ئـەو فەرمایشـتە بـەرزو نـاوازەو بـێ وێنەیـەی، لـەو پیـت و دەنگانـە پێـک هێنـاوە، کـە وەک کەرەسـتەیەکی خـاو، لەبـەر دەسـتی ئێوەشـدا هـەن، بـەڵام ئێـوە دەستەوەسـان و دەسـتەپاچەن لـە بەرانبەریـدا، بزانـن بێـژەری ئـەو فەرمایشـتە خوایـە ﷻ، نـە موحەممـەد ﷺ بـۆ خۆیـەتی، نـە کـەسی دیکـەش فێـری موحەممـەدی ﷺ کـردوە، ئەگەرنـا وەک چـۆن خەڵـک توانیویـەتی قسـە بـە دەمـی پێغەمبـەرەوە ﷺ هەڵبەسـتێ، ئەگـەر قورئانیـش هـی خـۆی بووایـە،

دەیانتوانی چەند ئایەتێ، یان چەند سوورەتێکیش هەڵبەستن، بەڵام ئەم قورئانە بەرزو مەزنە، نەک ئایەتێکی تێدا کەم و زیاد نەکراوە، بەڵکو وشەیەک و پیتێکیش، چونکە زانایان وێڕای ئەوەی کە سەرژمێری ئایەتەکانیان کردوە، کە دیارە قورئان هەمووی سەدو چواردە (١١٤) سوورەتە و، شەش هەزارو دوو سەدو سی و شەش (٦٢٣٦) ئایەتە، هەڵبەتە هەندێکیان کەمتریان گوتوە، بەڵام ئەم ژمارەیە زیاتر لەسەرینی و، کەمیی و زۆریی ژمارەی ئایەتەکانیش دەگەڕێتەوە بۆ کورتیی و درێژیی ڕستەکان، ئەگەرنا لەسەر وشەکانی قورئانیش ڕێککەوتوون، کە حەفتاو حەوت هەزارو چوار سەدو سی و نۆ (٧٧٤٣٩) وشەیەو، لەسەر پیتەکانیشی ڕێک کەوتوون، کە سێسەدو بیست و یەک هەزارو سەدو هەشتا (٣٢١١٨٠) پیتەو، ئەو قورئانە مەزنە، هیچ کەس نەیتوانیوەو ناتوانێ نەک وێنەی بێنێ، نەک وێنەی دە سوورەت و سوورەتێکی بێنێ، بەڵکو ئەگەر وشەیەک و پیتێکیشی لێ بگۆڕرێ، یەکسەر هەستی پێ دەکرێ.

ئنجا خوا ﷻ دەفەرمووێ: ﴿ تَنزِيلُ ٱلْكِتَٰبِ مِنَ ٱللَّهِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَكِيمِ ﴾، دابەزێنرانی کتێبەکە، ئەم کتێبە لە لایەن خوای زاڵی کارزانەوەیە، (**العَزِيْزُ: من لَا يُغْلَب**)، کەسێک کەس پێی نەوێرێ، هیچ هێزێک لە بەرانبەریدا نەوەستێ، بۆیە ئەگەر لە زمانی کوردییدا (**عَزِيْز**) بە: باڵادەست، زاڵ، دەستڕۆیشتوو، ئەوپەڕی توانادار، مانا بکرێ، جێی خۆیەتی، (**الحَكِيْم**) واتە: کارزان، کاربەجێ، زاتێک کە کارەکانی هەموویان لە جێی خۆیاندان و، فەرمایشتەکانی هەموویان بە جێن.

کەواتە: ئەم قورئانە لە لایەن خوایەکەوە دابەزیوە، کە خاوەنی ئەوپەڕی عیززەتەو، خاوەنی ئەوپەڕیی حیکمەتە، هەر بۆیەش عیززەت و حیکمەتێ، کە خوا ﷻ هەینی، لە کتێبەکەشیدا، لە فەرمایشتەکەشدا، ڕەنگیان داوەتەوەو، بە دڵنیایی هەر کەسێک بە ئەندازەی ئەوە کە هۆگری ئەم قورئانە دەبێ، کارتێکراو دەبێ بەم قورئانەو لە خزمەت قورئاندا، دەبێ، هەم عیززەت، هەم حیکمەتیش لە قورئانەوە وەردەگرێ، هەڵبەتە هەر کەسە لە قەدەر خۆی.

دوایــی دەفەرمــوێ: ﴿ مَا خَلَقْنَا ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَآ إِلَّا بِٱلْحَقِّ وَأَجَلٍ مُّسَمًّى ﴾، دوای ئاماژەکــردن بــە قورئــان و پێناســەکردنی قورئــان، ئنجـا خـوا ﷻ ئـەو بابەتـە زۆر گــەورەو گرنگــە بــاس دەکات، کــە وەک دوایــی ڕوونی دەکەینــەوە، لــە کورتــە باسێکدا، بـە لای کەمـەوە لـە حەڤـدە شـوێنی قورئانـدا، باسـکراوە، ئەویـش ئەوەیـە کـە: خـوا ئاسـمانەکان و زەوی و ئـەوەی نێوانیـان، واتـە: کـەون و کائینـات و، گەردوون بوونـەوەری بـە هـەق و حیکمـەت دروسـتکردوەو، ئامانـج و مەبەسـت لـە پشـتیەوە هەیـەو، بـە هەوەنتـە و گاڵتـە نیـەو، بـێ ئامانـج و بـێ حیکمـەت نیـە، ﴿ مَا خَلَقْنَا ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَآ إِلَّا بِٱلْحَقِّ ﴾، ئاســمانەکان و زەوی و ئــەوەی نێوانیانمــان دروسـت نەکـردوون، مەگـەر بـە هـەق، تەنیـا بـە هـەق دروسـتمان کـردوون، هـەق بریتیـە: لـە شـتی چەسـپاو، بـەڵام جـاری وایـە (حـق) بـە مانـای ڕاسـتیی دێ و، جـاری وایـە بـە مانـای حیکمـەت دێ و، جـاری وایـە بـە مانـای ئامانـج و مەبەسـتێکی بـە جـێ دێ و، جـاری وایـە بـە مانـای دادگەریـی دێ، بەپێـی سـیاقەکان، بـەڵام لێـرەدا واتــە: بـە حیکمـەت و ئامانجێـک کـە پەیوەسـتە بـە دروسـتکراوەکانەوە، نـەک بـە خـوای پـەروەردگارەوە، خـوا کاربەجێیـەو خـاوەن حیکمەتـەو هیـچ شـتێکی بێجـێ نـاکات، بـەڵام بێگومـان خـوا هیـچ ئیشـێکی بـە هیـچ کـەس و هیـچ شـتێک نیـە، هیـچ ئامانجێکـی نیـە، کـە بـە هـۆی ئەنجامـدانی کارێکـەوە، بیهێنێتـەدی، بەڵکـو ئـەوە ئامانجـی دروسـتکراوەکانە، خـوا دەیهێنێتـە دی، نـەک ئامانجـی خـۆی، چونکـە خـوا ﷻ ئەگـەر ئامانجێـک بهێنێتـە دی، بـە هـۆی دروسـتکردنی گەردوونـەوە، کەواتـە: پێویسـتیی بـەو ئامانجەیـە؟! بـەڵام نـەء خـوا ئامانجێـک دێنێتـە دی کـە پەیوەسـتە بـە دروسـتکراوکانەوەو، خـواش ﷻ بەپێـی سـیفەتەکانی خـۆی، مامەڵـە دەکات لەگـەڵ دروســتکراوەکانیدا.

خـوا ﷻ خـاوەنی ئەوپـەڕی کـەرەم و بەخشـشـەو، ئەوپـەڕی بەزەییـەو، ئەوپـەڕی توانایــەو، ئەوپــەڕی حیکمەتــە، بۆیــە ئــەم گەردوونــەی هێناوەتــە دی، وەک بەرهەمێکـی، سـیفەتەکانی خـۆی، کـە خـوا بەدیهێنـەرە، ئـەو دروسـتکراوانەی هێناونـە

دی، بـەڵام بۆچـی؟ بـۆ ئامانجێـک کـە پەیوەسـتە بـە دروسـتکراوەکانیەوە، خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ئێمـە ئاسـمانەکان و زەوی و ئـەوەی نێوانیانمـان بـە هـەق نەبـێ نەهێناونـە دی، ﴿ وَأَجَلٍ مُّسَمًّى ﴾، هەروەهـا بـۆ کاتێکـی ناوبـراوو دیارییکراویـش، واتە: ئـەوە نیـە، ئـەم گەردوونـە هەتـا هەتایـە بـڕوا، بەڵکـو بـۆ کاتێکـی دیارییکـراوەو، قۆناغێکـە قۆناغـی دیکـەی بـەدوادا دێ، ﴿ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ عَمَّآ أُنذِرُواْ مُعۡرِضُونَ ﴾، لـە حاڵێکـدا کـە ئەوانـەی بێبـڕوان، لـەوەی پێـی ترسـێنراون و لێـی ورياکراونـەوە، پشـت هەڵکـردوون، ڕوو وەچەرخێنـەرن، گـوێ پـێ نـەدەرن.

﴿ قُلۡ أَرَءَيۡتُم مَّا تَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ ﴾، بڵـێ: ئایـا ئەوانـە دەبینـن کـە لـە جیـاتی خـوا، یـان جگـە لـە خـوا، لێیـان دەپاڕێنـەوە! یاخـود: هەواڵـم پـێ بدەن، لـە بـارەی ئەوانەوە کـە لـە جیـاتی خـواو، جگـە لـە خـوا لێیـان دەپاڕێنـەوە، ﴿ أَرُونِي مَاذَا خَلَقُواْ مِنَ ٱلۡأَرۡضِ ﴾، پێشـانم بـدەن، چییـان لـە زەوی دروسـتکردوە، دەنکـە لمێـک، پـەڕە مریشـێک، دەنکـە چەوێـک، بەردێـک، دارێـک، ﴿ أَمۡ لَهُمۡ شِرۡكٞ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ ﴾، یـان ئایـا هاوبەشـییان هەیـە، لـە ئاسـمانەکاندا، بـە دڵنیایـی ئەمـە جۆرێکـە لـە توانـج تێگرتـن و، بە تەوسـەوە قسـە لەگـەڵ کردنیـان، ئەگەرنـا مـادام ئـەوان توانـای چوونـە ئاسـمانیان هـەر نیـەو، مـادام لـە زەویـدا هیچیـان نەخوڵقاندبـێ، ئـەدی چـۆن دەسـتیان گەیشـتە ئاسـمان! ﴿ ٱئۡتُونِي بِكِتَٰبٖ مِّن قَبۡلِ هَٰذَآ أَوۡ أَثَٰرَةٖ مِّنۡ عِلۡمٍ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ﴾، ئەگـەر ڕاسـت دەکـەن، ئـەو شـتانەی دەیانپەرسـتن، شایسـتەی پەرسـترانن، بـۆم بێنـن، کتێبێـک پێـش ئەمـە دابەزیبـێ، یاخـود پاشـماوەیەک لـە زانیارییـم بـۆ بێنـن، واتـە: بەڵگەیەکـی نەقڵییـم بـۆ بێنـن، یـان بەڵگەیەکـەی عەقڵیـی، کتێبێـک کـە پێـش ئـەم قورئانـە دابەزیبـێ، بـاسی هاوبـەش بـۆ خوادانـانی تێدابـێ، بـۆم بێنـن، یاخـود پاشـماوەیەک لـە زانیارییـم بـۆ بێنـن، وەک بەڵگـە، کـە بـە تەئکیـد هیـچ کامیـان نیـن، نـە بەڵگـەی نەقڵییـان بەدەسـتەوەیە، نـە بەڵگـەی عەقڵیـی، نـە هیـچ نەقڵێـک و، وەحییـەک، بـاسی ڕەوایـی هاوبـەش بـۆ خـوا دانـانی کـردوە، نـە هیـچ عەقڵێکیـش، هیـچ عەقڵێکـی سـەلیمیش شـتی وای گوتـوە.

﴿ وَمَنْ أَضَلُّ مِمَّن يَدْعُوا۟ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَن لَّا يَسْتَجِيبُ لَهُۥٓ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَـٰمَةِ ﴾، ئایا کێ گومڕاترە لە کەسێک کە لە جیاتی خوا، جگە لە خوا، لە شتێک، لە کەسێک دەپاڕێتەوە کە هەتا ڕۆژی قیامەت وەڵامی ناداتەوە، ئنجا ئایا ڕۆژی قیامەت وەڵامی دەداتەوە، نەخێر، واتە: هەر وەڵامی ناداتەوەو، هیچ داواکارییەکی بۆ جێبەجێ ناکات، ﴿ وَهُمْ عَن دُعَآئِهِمْ غَـٰفِلُونَ ﴾، ئەوان لە بانگکردن و لە هاوار تێبەستنی ئەوان بێ ئاگان، ئنجا ئەمە هەرچەندە ڕاناوی عاقڵانی بۆ بەکارهێناوە، بەڵام زیاتر مەبەست پێی بت و صەنەم و پەیکەرەکانن، بەڵام ئەگەر مەبەست ئەوانی دیکەش بێ، نەصرانییەکان کە عیسایان پەرستوەو، ئەوانی دیکە کە فریشتەکانیان پەرستوون، جوولەکە کە عوزێریان پەرستوەو، کەسانی دیکە شتانی دیکەیان پەرستوون، ئەو پەرستراوانە ئاگایان لە پەرستەرەکان نەبووەو، بە دڵنیایی وەڵامیشیان نادەنەوە.

﴿ وَإِذَا حُشِرَ ٱلنَّاسُ كَانُوا۟ لَهُمْ أَعْدَآءً ﴾، کاتێکیش خەڵک کۆ دەکرێنەوە، واتە: بۆ سزاو پاداشت کۆدەکرێنەوە، ﴿ كَانُوا۟ لَهُمْ أَعْدَآءً ﴾، ئەوانە، ئەو پەرستراوانە بۆیان دەبنە دوژمن، واتە: لە پەرستەرەکانیان دەبنە دوژمن، ﴿ وَكَانُوا۟ بِعِبَادَتِهِمْ كَـٰفِرِينَ ﴾، بە پەرستنەکەشیان بێبڕوا دەبن و، نکووڵییان لێ دەکەن و ڕەخنەیان لێ دەگرن: بۆچی ئێمەتان پەرستوە؟ لێرە کە ڕاناوی عاقڵان بەکاردێنێ، یان بۆ زاڵکردنی عاقڵانی پەرستراوەکانە، ئەگەر فریشتەن، ئەگەر پێغەمبەرانن (**عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلاَم**)، ئەگەر مرۆڤە چاکانن، بەسەر ئەوانی دیکەدا، یاخود لەبەر ئەوەیە کە لە خەیاڵ و ئەندێشەی بتپەرستەکاندا، وابووەو، ئەو بت و صەنەم و پەیکەرانە، وەک عاقڵ مامەڵەیان لەگەڵدا کردوون، پێیان وابووە ئاگایان لە شت هەیە، ئەگەر مانگ و خۆرە، ئەگەر دارو بەردن، ئەگەر پەیکەرن، هەرچی هەن، خوا ﷻ لێرەو لە جێی دیکەش بە پێی عەقڵی ئەوان ئەو ڕاناوەی بۆ عاقڵان بەکارهێناوە، چونکە ئەوان وەک کەسانێکی خاوەن ویست و عەقڵ و ئیدراک لەگەڵ بت و صەنەمەکانی خۆیاندا مامەڵەیان کردوە.

ئەوەی ڕابرد هەمووی بۆ پووچەڵکردنەوەی بیرۆکەی هاوبەش بۆ خوا دانان بوو.

ئنجا دێتە سەر باسی هەڵوێستی نەرێنییان بەرانبەر بە ئایەتەکانی قورئان و، بەرانبەر بە پێغەمبەر ﷺ، دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُنَا بَيِّنَٰتٍ ﴾، کاتێک ئایەتە ڕۆشنەکانی ئێمەیان بەسەردا دەخوێنرێنەوە، ﴿ قَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لِلْحَقِّ لَمَّا جَآءَهُمْ ﴾، ئەوانەی بێبڕوابوون بەو هەقە، دەڵێن کە بۆیان دێ، یەکسەر کە ئەو هەقەیان بۆ هاتوە، گوتوویانە: ﴿ هَٰذَا سِحْرٌ مُّبِينٌ ﴾، ئەمە جادوویەکی ئاشکرایەو، ڕوونە کە جادوویە.

﴿ أَمْ يَقُولُونَ ٱفْتَرَىٰهُ ﴾، بە نسبەت قورئانەوە دەڵێن: ئەوە جادوویە، بە نسبەت موحەممەدەوەش ﷺ دەفەرموێ: یان دەڵێن ئایا، هەڵیبەستوە، واتە: بە ناوی خواوە هەڵیبەستوەو، جادوو نیە، بەڵام هەڵبەستراوە بۆ خۆی گوتوویەتی، ﴿ قُلْ إِنِ ٱفْتَرَيْتُهُۥ فَلَا تَمْلِكُونَ لِى مِنَ ٱللَّهِ شَيْـًٔا ﴾، بڵێ: ئەگەر هەڵمبەستبێ، ئێوە لە بەرانبەر خوادا هیچ شتێکتان بۆ من پێ ناکرێ، خاوەنی هیچ شتێک نین بۆ من، هیچ شتێکتان لە دەست نایەت بۆ من، کە لە سزای خوا بمپارێزن، ﴿ هُوَ أَعْلَمُ بِمَا تُفِيضُونَ فِيهِ ﴾، خوا زاناترە بەوەی ئێوە تێیدەڕژێن، وەنێوی دەکەون، لە قسەی پووچ و بۆش، ﴿ كَفَىٰ بِهِۦ شَهِيدًۢا بَيْنِى وَبَيْنَكُمْ ﴾، بەسە ئەو شایەد بێ لە نێوان من و ئێوەدا، ﴿ وَهُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴾، ئەو لێبووردەی میهرەبانە، لێرەدا ئەمە تەماع و وەبەرنانێکە بۆ ئەوان کە ئەگەر بگەڕێنەوەو، واز لە کەللەڕەقیی و عینادیی بێنن، با بزانن کە هەمیشە خوا دەرگای لێبوردن و بەزەیی ئاوەڵایەو کراوەیە.

ئنجا ئەمە لە چەند شوێنێکدا لە قورئاندا هاتوە، بۆ ڕەتدانەوەی ئەو تۆمەتە کە گوتوویانە: موحەممەد ﷺ بۆ خۆی قورئانی هەڵبەستوە!.

بۆ وێنە: لە سوورەتی (الطور)دا، دەفەرموێ: ﴿ أَمْ يَقُولُونَ تَقَوَّلَهُۥ ۚ بَل لَّا يُؤْمِنُونَ ﴿٣٣﴾ فَلْيَأْتُوا۟ بِحَدِيثٍ مِّثْلِهِۦٓ إِن كَانُوا۟ صَٰدِقِينَ ﴿٣٤﴾ ﴾، واتە: یان ئایا دەڵێن: بۆ خۆی گوتوویەتی و هەڵیبەستوە، بەڵکو بڕوا ناهێنن، ئەگەرنا با فەرموودەیەکی دیکەی وەک ئەو بێنن، ئەگەر ڕاست دەکەن.

هەروەها لە سوورەتی (**الحاقة**)دا، خوا ﷻ دەفەرمووێ: ﴿ وَلَوۡ تَقَوَّلَ عَلَيۡنَا بَعۡضَ ٱلۡأَقَاوِيلِ ﴿٤٤﴾ لَأَخَذۡنَا مِنۡهُ بِٱلۡيَمِينِ ﴿٤٥﴾ ثُمَّ لَقَطَعۡنَا مِنۡهُ ٱلۡوَتِينَ ﴿٤٦﴾ فَمَا مِنكُم مِّنۡ أَحَدٍ عَنۡهُ حَٰجِزِينَ ﴿٤٧﴾ ﴾، واتە: ئەگەر هەندێ قسەمان بە دەمەوە هەڵبەستێ، ئێمە قۆڵی ڕاستی دەگرین و، لە ڕەگی ملی دەدەین و، ئێوەش هیچ کامتان ناتوانن، ببنە پەردەو نێوان و نەهێڵن.

بۆیە لێرەدا خوا بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: پێیان بڵێ: ﴿ قُلۡ إِنِ ٱفۡتَرَيۡتُهُۥ فَلَا تَمۡلِكُونَ لِي مِنَ ٱللَّهِ شَيۡـًٔاۖ ﴾، واتە: بڵێ: ئەگەر هەڵمبەستبێ، ئێوە لە بەرانبەر خوادا هیچتان بۆ من لە دەست نایەت و، خوا ﷻ سزام دەدات، چۆن لێ دەگەڕێ کەسێک لە خۆوە، بڵێ: خوا وایفەرمووە؟!، خواش ﷻ زاناترە بەوەی ئێوە تێیدەڕژێن و بە نێوی دەکەون، خوا ﷻ بەسە شایەد بێ و چاودێر بێ، شایەدییدەرو گەواهییدەر بێ لە نێوان من و ئێوەدا، کە من ڕاست دەکەم و ئێوە درۆ دەکەن، ﴿ وَهُوَ ٱلۡغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴾، ئەو لێبووردەی میهرەبان و بە بەزەییە، بە بەڵگەی ئەوەش خوا ﷻ شایەدیی ڕاستیی موحەممەدی ﷺدا، کە ئەوەتا پەیامەکەی موحەممەد ﷺ بە هەموو دنیادا بڵاوبۆتەوەو، ئەوانەی نەیاریشی بوون، بوونە پەندی زەمانەو فڕێدرانە زبڵدانی مێژووەوە، کەواتە: ئەم فەرمایشتە، ئەم پەیامەی خوا بە کۆتا پێغەمبەری خۆیدا ناردوویەتی، خوا خاوەنداریێتیی کردووەو خۆی مشووری لێ خواردوە، هەم لە پەیامەکەشی، هەم لە پەیامبەرەکەشی، پەیامەکەی چەسپاندوەو، پێغەمبەرەکەشی ﷺ پاراستوەو، سەر خستوە.

﴿ قُلۡ مَا كُنتُ بِدۡعٗا مِّنَ ٱلرُّسُلِ ﴾، پێیان بڵێ: من داهێنراوێک نیم، لە پێغەمبەران (**عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام**)، واتە: پێغەمبەرێک نیم کە تازە بابەت بم، یەکەمینی پێغەمبەران (**عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام**) نیم و، داهێنراوێک نیم بێ پێشینەبم، ﴿ وَمَآ أَدۡرِي مَا يُفۡعَلُ بِي وَلَا بِكُمۡۖ ﴾، ناشزانم چی بە منیش و بە ئێوەش دەکرێ، واتە: چاوەڕوانیی شتێکم لێ مەکەن، کە لە توانای مندا نیە، زۆرجار بێبڕوایان داوای بەڵگەو موعجیزەی وەک هی پێغەمبەرانی پێشوویان لێ دەکرد، نەیاندەزانی

کـە پێغەمبـەرانی پێشـوو (عَلَيْهِـمُ الصَّـلاةُ وَالسَّـلام) کاتێـک هاتـوون، کـە مرۆڤایەتیـی لـە قۆناغـی سـاواییدا بـووە، بۆیـە زیاتـر خـوا ﷻ موعجیـزەو بەڵگـەی وای داونـە پێغەمبـەران (عَلَيْهِـمُ الصَّـلاةُ وَالسَّـلام) کـە هەسـتەوەرەکانی مرۆڤانیـان دوانـدوون، بـەڵام دوای ئـەوەی مرۆڤایەتیـی گەیشـتۆتە قۆناغـی کامـڵ بـوون، موعجیزەیەکـی داوەتـە پێغەمبـەری کۆتایـی ﷺ کـە عەقڵـی خەڵـک دەدوێنـێ و لەگـەڵ عەقڵیانـدا مامەڵـە دەکات، ئەوانـەش ویسـتوویانە هـەر بگەڕێنـەوە بـۆ قۆناغـی پێشـێ، بـەڵام نەخێـر ئـەو قۆناغـە بەسـەرچوو، ئێسـتا مرۆڤایەتیـی گەیشـتۆتە قۆناغێکـی دیکـەی باشـترو کامڵـترو، پێویسـتە لـە ڕێـی عەقڵـەوە بدوێـنرێ، بۆیـە خـوا فەرموویـەتی: تـۆ بفەرمـوو: ﴿ وَمَآ أَدۡرِي مَا يُفۡعَلُ بِي وَلَا بِكُمۡۖ ﴾، ناشـزانم چیـم لـێ دەکـرێ و، چیتـان لـێ دەکـرێ، ئەمـە بێگومـان مەبەسـت پێـی دنیایـە، واتـە: نازانـم لـە ڕووی دنیاییـەوە مـن چیـم لـێ دێ، ئێـوەش چیتـان لـێ دێ، ئایـا خـوا سـەرم دەخـات، یـان وەک هەندێـک لـە پێغەمبـەران (عَلَيْهِـمُ الصَّـلاةُ وَالسَّـلام) شـەهید کـراون، منیـش شـەهید دەکرێـم؟ ئێـوەش ئایـا خـوا دەتانفەوتێنـێ، یـان دەتانهێڵێتـەوە، یـان ئایـا بـە چ جـۆرە سـزایەک سـزاتان دەدات، نازانـم، بـەڵام بـۆ ڕۆژی دوایـی، بـە تەئکیـد پێغەمبـەری خـوا ﷺ بەرچـاو ڕوون بـووەو، دڵنیابـووە کـە ئـەو پێغەمبـەری خوایـە ﷺو، شـوێنکەوتووانیشی ئەهـلی بەهەشـتن، نەیارەکانیـشی ئەگـەر لەسـەر ئـەو بیروباوەڕیـەی خۆیـان بـڕۆن، دیـارە سـەرەنجامیان دۆزەخـە، ﴿ إِنۡ أَتَّبِعُ إِلَّا مَا يُوحَىٰٓ إِلَيَّ ﴾، (إنْ) لێـرەدا لابـەرە (نافیـة) یـە، بـە مانـای (مَا)یـە، واتـە: (إن النَّافِيَة)یـە، ﴿ إِنۡ أَتَّبِعُ إِلَّا مَا يُوحَىٰٓ إِلَيَّ ﴾، تەنیـا شـوێن ئـەوە دەکـەوم کـە بـۆم سروش دەکـرێ، ﴿ وَمَآ أَنَا۠ إِلَّا نَذِيرٞ مُّبِينٞ ﴾، منیـش تەنیـا ورياکـەرەوەو ترسـێنەرێکی ڕۆشـن و ئاشـکرام، یاخـود ڕوونکـەرەوەم.

﴿ قُلۡ أَرَءَيۡتُمۡ إِن كَانَ مِنۡ عِندِ ٱللَّهِ وَكَفَرۡتُم بِهِۦ ﴾، بڵـێ: ئایـا دەبینـن، دەزانـن ئەگـەر ئـەم (قورئـان)ە لـە لایـەن خـواوە بـوو، ئێـوەش پێـی بێبڕوابـوون، ﴿ وَشَهِدَ شَاهِدٞ مِّنۢ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ﴾، لـە وەچـەی ئیسـرائیلیش، وەچـەی یەعقووبیـش عليه السلام، واتـە: لـە گـەلی جوولەکـە، شـایەدێک شـایەدییدا ﴿ عَلَىٰ مِثۡلِهِۦ ﴾، لەسـەر وێنـەی ئـەوە، واتـە:

شـایەدییدا کـە پێشـتریش خـوا ﷻ تـەوراتی نـاردوە، یاخـود ﴿ عَلَىٰ مِثْلِهِۦ ﴾، هـەر مەبەسـت پێـی قورئانـە، واتـە: لەسـەر وێنـەی ئەمـە شـایەدییدا کـە ڕاسـتە. ﴿ فَـَٔامَنَ وَٱسۡتَكۡبَرۡتُمۡ ﴾، ئـەو بـڕوای هێنـاو ئێـوە خۆتـان بەزلگـرت، وەڵامەکـەی لێـرەدا قرتێنراوە، واتـە: کـێ لـە ئێـوە گومڕاتـرە؟ کـێ لـە ئێـوە بەدبەختـترە؟ کـێ لـە ئێـوە زیانبارتـرە؟ یەکێکـی دیکـەی جگـە لـەم کۆمەڵگایـە، کـە جوولەکەیـە بڕوابێنـێ، کەچـی ئێـوە کـە قورئـان بـە زمـانی خۆتـان دابەزێـنراوە، بـڕوا نەهێنـن، کـێ لـە ئێـوە زیانبارتـرە؟! ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾، بـە دڵنیایـی خـوا کۆمەڵـی سـتەمکاران، ڕاسـتە ڕێ نـاکات. هەندێـک لـە توێـژەرەوانی قورئـان چەنـد جارێکـی دیکـەش باسـمانکردوە، کـە وشـەی (هِدَايَة)یـان هەمیشـە بـە یـەک واتـا بەکارهێنـاوە، واتـە: ڕێنمایی، لە تەفسیرە کوردییەکانیشـیدا ئـەو هەڵەیـە هـەر زۆر زۆرە، واتـە: خـوا کۆمەڵـی سـتەمکاران ڕێنمایـی نـاکات، بـەڵام ئەمـە ڕاسـت نیـە، خـوا سـتەمکارو سـتەملێکراو، چـاک و خـراپ، هەموویـانی ڕێنمایـی کـردوون، خـوا ﷻ نـاوی لـە قورئـان نـاوە: (هُـدَىً للعَالَمِين) و (ذكر للعَالَمِيْن)، بـەڵام هیدایـەت لێـرەدا بـە مانـای ڕاسـتە ڕێ کـردن و، بـە ئامانـج گەیاندنـە، خـوا سـتەمکاران بـە ئامانـج ناگەیەنـێ، ڕاسـتە ڕێیـان نـاکات، نایانخاتـە سـەر ڕێـی ڕاسـت، نـەک ڕێـی ڕاستیان پێشـان نـادات، پیشـانی داون، ئنجا ئەگـەر ئـەو ڕێ پێشـاندانەی خوایـان قبـووڵ کـردو ڕێنماییەکەیـان وەریانگـرت، ئـەو کاتـە خـوا ڕاسـتە ڕێیـان دەکات و بـە ئامانجیـان دەگەیەنـێ، بۆیـەش دەفەرمـوێ: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾، ئەوانـەی سـتەم دەکـەن، سـتەم لـە پەیامـی خـوا دەکـەن، سـتەم لـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ دەکـەن، سـتەم لـە خۆیـان دەکـەن، خـوا بـە شایسـتەی ئەوەیـان نازانـێ، ڕاسـتە ڕێیـان بـکات و بـە ئامانجیـان بگەیەنـێ.

﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾، ئەوانـەی بێبڕواشـن بەوانەیـان گـوت کـە بڕوایـان هێنـاوە، ﴿ لَوۡ كَانَ خَيۡرٗا مَّا سَبَقُونَآ إِلَيۡهِ ﴾، ئەگـەر ئـەم (قورئـان)ە چـاک بووایـەو، پەسـند بووایە، ئەوانە یانی: مسـوڵمانە ڕەش و ڕووت و چەوسـێنراوەکان، بۆ لای قورئان و ئیسـلام، پێشـمان نەدەکەوتنـەوە لـە پێشـی ئێمـەدا بـڕوای پـێ بێنـن، گوتوویانـە: ئەگـەر ئیسـلام

خێری تێدابێ، ئێمە شایستەین، نەک ئەو ڕەش و ڕووتانە، کافرەکان هەر بە پێ و دانگی خۆیان شتیان هەڵسەنگاندوە و، بە پێوەرە لارەکەی خۆیان پێواویانە، ﴿ وَإِذْ لَمْ يَهْتَدُوا بِهِ ﴾، ئنجا ئێستا کە ڕێی ڕاستیان پێ نەگرتوەو لێی بەهرەمەند نەبوون، ﴿ فَسَيَقُولُونَ هَٰذَا إِفْكٌ قَدِيمٌ ﴾، دەڵێن: ئەوە درۆیەکی لە مێژینەو هەڵبەستراوێکی دێرینە، وەک کوردەواریی خۆمان دەڵێن: (دەمی نایگاتێ دەڵێ ترشە)!، ئەوانەش لەبەر ئەوەی بەهرەمەند نەبوونە لەو هیدایەتەی خوا ﷻ، گوتوویانە: ئەگەر ئیسلام هەق بووایەو ڕاست بووایە، ئێمە کە زۆر خاوەن عەقڵ و تێگەیشتنین، پێشتر بڕوامان پێ دەهێنا، نەک ئەو ڕەش و ڕووت و کەودەن و نەفامانە! هەمیشە خۆبەزلگرو خۆسەپێنەکان، خۆشگوزەرانەکان، خەڵکی هەژارو نەداریان لە خۆیان بە کەم عەقڵترو کەم هۆشتر زانیوە، ئنجا ئەوەیان کردۆتە بەڵگەو گوتوویانە: مادام ئێمە بڕوامان پێی نەهێناوە، کەواتە: دیارە خێرو چاک نیەو، ڕاست نیە.

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَمِن قَبْلِهِ كِتَابُ مُوسَىٰ إِمَامًا وَرَحْمَةً ﴾، لە پێش ویشدا کتێبەکەی مووسا ﷺ پێشەوا بوو و بەزەیی بوو، پێشەوا بوو، کە پێش خەڵکی بکەوێ بەرەو هەق، مایەی بەزەیی خواش بوو، واتە: ئەم قورئانە، لە پێش ئەویشدا پێشینە هەبووە، ﴿ وَهَٰذَا كِتَابٌ مُّصَدِّقٌ لِّسَانًا عَرَبِيًّا ﴾، ئەمەش کتێبێکە بەڕاستدانەرە، واتە: بەڕاستدانەرە بۆ کتێبەکانی پێش خۆی، ﴿ لِّسَانًا عَرَبِيًّا ﴾، بە زمانێکی ڕۆشنە، چونکە وشەی (عَرَبِي) وەک چۆن مانای زمانی عەرەبییە، هی نەتەوەیەکی دیاریکراوە کە نەتەوەی عەرەبن، بە هەمان شێوە بە مانای ڕۆشنیش دێ، کە لێرەدا پێم وایە (عربي) بە مانای زمانێکی ڕۆشن هاتوە، بۆچی؟ ﴿ لِّيُنذِرَ الَّذِينَ ظَلَمُوا ﴾، تاکو ئەوانەی ستەمیان کردوە بیانترسێنێ، وریایان بکاتەوە، هۆشدارییان پێ بدات، ﴿ وَبُشْرَىٰ لِلْمُحْسِنِينَ ﴾، هەروەها مژدەو دڵخۆشکەریشە بۆ چاکەکاران.

لە کۆتاییدا خوا ﷻ پێناسەی ئەو چاکەکارانەمان بۆ دەکات، کە قورئان مژدەو دڵخۆشکەرە بۆیان، دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ الَّذِينَ قَالُوا رَبُّنَا اللَّهُ ثُمَّ اسْتَقَامُوا ﴾، بە

دڵنیایی ئەوانەی گوتیان: پەروەردگارمان خوایەو، دواییش ڕاوەستاو و بەردەوام بوون، نەلەخشاو بوون، لەسەر گوتنی ئەو قسەیەو، کارکردن بەپێی ئەو قسەیەو، بەڕێوەچوون بەپێی ئەو قسەیە، ﴿ فَلَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ ﴾، هیچ ترسیان لەسەر نیە، واتە: بۆ داهاتوو، ترس و دڵەڕاوکێیان نیە، ﴿ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ ﴾، خەمبارو پەژارەداریش نابن، واتە: بۆ ڕابردوو، ئەوەی پەرێزی پاکە، بێ باکە، ئەوەی پەرێزی پاکە بەرچاوی ڕووناکە.

﴿ أُوْلَـٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَنَّةِ خَٰلِدِينَ فِيهَا ﴾، ئەوانە هاوەڵانی بەهەشتن، یان خاوەنانی بەهەشتن، (**أصْحَاب**) کە کۆی (**صَاحِب**)ە، دەگونجێ بە مانای خاوەن بێ، دەشگونجێ بە مانای هاوەڵ بێ، کە ئەوان (بەهەشتییەکان) هەم دەبنە خاوەنی بەهەشت، هەم دەبنە هاوەڵی بەهەشتیش، ﴿ خَٰلِدِينَ فِيهَا ﴾، لەوێدا هەرماو دەبن، واتە: بەردەوام دەبن لە ژیاندا، بێ بڕانەوە، ﴿ جَزَآءَۢ بِمَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴾، ئەوەش پاداشتی ئەوەیە کە دەیانکرد، پاداشتدرانەوەیانە بەپێی ئەوەی دەیانکرد.

جاری دیکەش گوتوومانە: وشەی (**عمل**) لە قورئاندا، هەم بە مانای نیەتی نێو دڵ، دێ، هەم بە مانای تەعبیری زمان، هەم بە مانای کردەوەی ئەندامەکان، واتە: ئەوەی کە بە دڵ و زمان و ئەندامەکانیان، ئەنجامیان دەدا، لە ئیمان هێنان و پابەندیی بە ئیسلامەوە، لە پاداشتی ئەوەدا، خوا ﷻ دەیانکاتە خاوەن و هاوەڵی بەهەشت، کە لەوێدا هەرماو دەبن و بە هەمیشەیی دەبن.

خوا بە لوتف و کەرەمی خۆی ئێمە لەو کەسانە بگێڕێ و، یارمەتییمان بدات کە هەرچی زیاتر لەم فەرمایشتە بەرزو بە پێزەی خوا ﷻ وردبینەوەو ڕامێنین و حاڵیی بین، تەوفیقیشمان بدات کە پێیەوە پابەند بین، لە ژیانی تایبەتیی خۆمان، لە ژیانی خێزانییمان، لە ژیانی کۆمەڵایەتییمان، ژیانی سیاسییماندا، هەروەها هەوڵیش بدەین کە ئەم قورئانە بکەینە چرایەک و، کۆمەڵگای خۆمانی پێ ڕۆشن بکەینەوە، بیکەینە سایەو سێبەرێک و، کۆمەڵگای خۆمانی لە ژێردا بحەسێنینەوە.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**دابەزێنەری قورئان خوای زاڵی کارزانەو، گەردوونیش بە هەق و حیکمەت و بۆ کاتێکی دیاریکراو وەدیهێنراوە، کەچی بێبڕوایان لەوەی پێی ترسێنراون و پێی هۆشیارکراونەوە، ڕوو وەچەرخێنەرن، پشتهەڵکەرن:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿حمٓ ۝١ تَنزِيلُ ٱلۡكِتَٰبِ مِنَ ٱللَّهِ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡحَكِيمِ ۝٢ مَا خَلَقۡنَا ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ وَمَا بَيۡنَهُمَآ إِلَّا بِٱلۡحَقِّ وَأَجَلٖ مُّسَمّٗىۚ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ عَمَّآ أُنذِرُواْ مُعۡرِضُونَ ۝٣﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە پێنج بڕگەدا:

١)- ﴿حمٓ﴾، پێشتر زۆر قسەمان لەسەر کردوە، ئەمانە دوو پیتن لە بیست و هەشت پیتەکانی زمانی عەرەبیی و، خوا ﷻ بە هێنانی ئەو پیتانە، ئاماژە بەوە دەکات کە ئەم قورئانە، هەر لەو پیت و دەنگانە پێکهاتوە، کە بە شێوەی ئاسایی مرۆڤەکان، بەکاریان دێنن لە خوێندن و نووسین و وتاردا، دەستەوسانن لە بەرانبەر قورئاندا، کەواتە: بزانن ئەو زاتەی ئەو قورئانەی ئەو فەرمایشتەی لەو کەرەستە خاوەی بەردەستی ئێوە پێکهێناوە، خوای بەرزی بێ وێنەیە.

٢)- ﴿تَنزِيلُ ٱلۡكِتَٰبِ مِنَ ٱللَّهِ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡحَكِيمِ﴾، دابەزاندنی کتێبەکە، ئەم کتێبە لەلایەن خوای زاڵی کاربەجێ وەیە، لە ڕووی ڕێزمانی عەرەبییەوە: ﴿تَنزِيلُ ٱلۡكِتَٰبِ﴾، دەگونجێ ببێتە گوزارە (**خَبَر**)، بۆ نیهاد (**مبتدأ**) یێک کە بە سەلیقە دەزانرێ و بەمجۆرەیە: (**هَذَا تَنْزِيْلُ الكِتَاب**)، (**هَذَا**) ئەو کاتە دەبێتە نیهاد (**مُبْتَدَأ**) و (**تَنْزِيْلُ الكِتَاب**) دەبێتە گوزارە (**خَبَر**)، دەشگونجێ: ﴿تَنزِيلُ ٱلۡكِتَٰبِ﴾، هەمووی لە شوێنی (**رَفع**) دابێ و (**مُبْتَدأ**)بێ و، ﴿مِنَ ٱللَّهِ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡحَكِيمِ﴾، ئەویش هەمووی لە شوێنی (**رَفع**)دا بێ و (**خَبَر**) بێ.

شایانی گوتنە: ئەو شێوە تەعبیرە، لە سەرەتای سوورەتی (**الجاثیة**)ش: (حمٓ ۝١ تَنزِيلُ ٱلْكِتَٰبِ مِنَ ٱللَّهِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَكِيمِ) و، لە سەرەتای سوورەتی (**غافر**)یش: ﴿حمٓ ۝١ تَنزِيلُ ٱلْكِتَٰبِ مِنَ ٱللَّهِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْعَلِيمِ ۝٢﴾و، لە سەرەتای سوورەتی (**فصلت**)یش: ﴿حمٓ ۝١ تَنزِيلٌ مِّنَ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ۝٢﴾، بە تەعبیری جۆراوجۆر هاتوە، تاكو بزانرێ كە ئەم كتێبە، ئەم قورئانە یەكێكە لە شتە زۆر ڕوون و ئاشكرایەكان كە دابەزێنراوە، واتە: نەگوتراوەو هەڵنەبەستراوە لەلایەن موحەممەدەوە ﷺ حاشای ئەو، بەڵكو بۆ لای دابەزێنراوەو، بۆ سەری دابەزێنراوە لە لایەن زاتێكەوە كە خاوەنی ئەوپەڕی باڵا دەستیی و زاڵیی و عیززەتەو، خاوەنی ئەوپەڕی شارەزایی و لێزانیی و حیكمەتە.

وشەی (**الكِتَاب**) پێشتریش باسمانكردوە كە (**أل**)ی ناساندنی لەسەرە، لێرەدا بەپێی سیاق دەزانرێ كە ئەلیف و لامەكە بۆ عەهدە، واتە: ئەو كتێبەی زانراوەو ناسراوە، كتێبەكە، یان قورئان، ئەو كتێبەی پێشتر باسمكردوەو زانراوە، دابەزاندنی ئەو كتێبە لە لایەن خوای باڵا دەستی كاربەجێ وەیە.

٣)- ﴿مَا خَلَقْنَا ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَآ إِلَّا بِٱلْحَقِّ﴾، ئاسمانەكان و زەوی ئەوەی نێوانیانمان بە هەق نەبێ نەهێناونە دی، یەكسەر دوای دابەزاندنی كتێبەكە، خوا ﷻ باسی ئەو ڕاستییە گەورەو گرنگە دەكات، كە وەك دوایی لە كورتە باسێكدا دەیخەینەڕوو، بە لای كەمەوە لە حەڤدە شوێنی قورئاندا باسكراوە، كە بریتیە لەوەی خوا ﷻ دەفەرموێ: ئاسمانەكان و زەوی و ئەوەی دەكەوێتە نێوانیانەوە بە هەق نەبێ نەمان هێناونە دی.

٤)- ﴿وَأَجَلٍ مُّسَمًّى﴾، بۆ كاتێكی ناوبراو، واتە: ئاسمانەكان و زەوی و ئەوەی دەكەوێتە نێوانیانەوە بە هەق نەبێ، نەمانهێناونە دی، هەروەها بۆ كاتێكی دیاریكراویش نەبێ، نەمانهێناونە دی.

٥)- ﴿وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ عَمَّآ أُنذِرُوا۟ مُعْرِضُونَ﴾، لە حاڵێكدا ئەوانەی بێبڕوان لەوەی پێی ترسێنراون، لەوەی لێی ورياكراونەوە، پشت هەڵكردوون، ڕوو وەچەرخێنەرن.

(**الطَّبَرِي**) ڕەحمەتی خوای لێ بێ لە تەفسیرەکەی خۆی دا[1]، ئاوا مانای ئەم ئایەتە موبارەکە دەکات: (**مَا أَحْدَثْنَا السَّمَوَات وَالْأَرْض فَأَوْجَدْنَاهُمَا خَلْقاً مَصْنُوعاً، وَمَا بَيْنهمَا مِنْ أَصْنَاف الْعَالَم إِلَّا بِالْحَقِّ، يَعْنِي: إِلَّا لِإِقَامَةِ الْحَقّ وَالْعَدْل فِي الْخَلْق، وَإِلَّا بِأَجَلٍ لِكُلِّ ذَلِكَ مَعْلُوم عِنْده، يُفْنِيه إِذَا هُوَ بَلَغَهُ، وَيَعْدَمهُ بَعْد أَنْ كَانَ مَوْجُودًا بِإِيجَادِهِ إِيَّاهُ**).

واتە: ئەم ئاسمان و زەوییەمان پەیدانەکردوون و نەمانهێناونە دی، وەک بەدیهێنراوێکی دروستکراوو، ئەوەی دەکەوێتە نێوانیانەوە لە جۆرەکانی دروستکراوان، مەگەر بە هەق، یانی: بۆ ئەوەی هەق بچەسپێ و دادگەریی لە نێوان دروستکراوەکاندا بێتە دی، هەروەها نەمانهێناونە دی، مەگەر بۆ کاتێکی زاندراو لە لای خوا، کە هەر کات ئەو دروستکراوانە، ئەو ئاسمان و زەوی و ئەوەی نێوانیان گەیشتنە ئەو کاتە، نایانهێڵێ و لە بەینیان دەبات، دوای ئەوەی کە دروستکراو بوون، بە هۆی بەدیهێنانی خواوە. [لەو کاتە دیاریکراوەدا، کە داینـاوە، هەر کاتێک گەیشتنە، ئەوە نایانهێڵێ].

ئنجا لە تەفسیری: ﴿وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ عَمَّآ أُنذِرُواْ مُعۡرِضُونَ﴾ دا، هەندێک لە زانایانی دیکە دەڵێن: (**وَالَّذِينَ جَحَدُوا وَحْدَانِيَّة اللَّهِ عَنْ إِنْذَارِ اللَّه إِيَّاهُمْ مُعْرِضُونَ، لَا يَتَّعِظُونَ بِهِ، وَلَا يَتَفَكَّرُونَ فَيَعْتَبِرُونَ**)، واتە: ئەوانەی نکووڵیی دەکەن، لە یەکتایی خوا، دوای ئەوەی خوا ئەوانی ترساندووە و هۆشیار کردوونەوەو، پشتیان هەڵکردووەو، بیرناکەنەوە، تاکو پەند وەربگرن.

---

(١) جامع البيان، ج٢٦، ص٤.

## سەرنجێك:

ئێمە بەر لەوەی ئەم مەسەلەی یەکەمە بەجێ بهێڵین، با سەرنجێک لە ئایەتی دووەم بدەین کە دەفەرموێ: ﴿ تَنزِيلُ ٱلْكِتَـٰبِ مِنَ ٱللَّهِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَكِيمِ ﴾ :

ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە خوا ﷻ خاوەنی هەموو سیفەتە بەرزو پەسندەکانەو، لە هەموو کەم و کوڕیی و لەکەیەک بە دوورە، هەڵبەتە بەو ئەندازەیەی بەعەقڵ و هۆشی سنووورداری خۆمان تێیدەگەین، ئەگەرنا خوا ﷻ: پاکیی خوا، بەرزیی خوا، چاکیی خوا، جوانیی خوا، تەواویی خوا، زۆر زۆر لەوە گەورەترە کە هەمووی لە عەقڵ و هۆشی ئێمەدا جێی بێتەوە، هیچ گومانی تێدانیە، بەڵام هەتا هۆش و عەقڵی ئێمە دەبڕێ و، هەتا بۆی وەخۆ دەگیرێ و جێی دەبێتەوە، خوا بەرزەو، مەزنەو، پاکەو، چاکەو، جوانەو، تەواوەو، لە هەموو کەم و کوڕییەک بە دوورە، لێرەدا خوا ﷻ دوو سیفەتی خۆی دەخاتە ڕوو:

**یەکەم:** (عَزِيْز).

**دووەم:** (حَكِيْم).

١- کەواتە: ئەم قوڕئانە لە خوایەکی خاوەنی ئەوپەڕی عیززەتەوە هاتووەو دابەزیوە، هەروەها لە خوایەک کە خاوەنی ئەوپەڕی حیکمەتە، مانای وایە ئەم قوڕئانە خۆیشی پڕە لە عیززەت و حیکمەت و، مایەی عیززەت و حیکمەتە بۆ هەر کەسێک بیخوێنێ و لێی تێبگات و، کاری پێ بکات.

٢- ئەوەش وەنەبێ بەس قسەیەک بێ بکرێ، بەڵکو لە واقیعێکدا بەرجەستە دەبێ، هەموو ئەوانەی لەگەڵ ئەم قوڕئانە بەرزو مەزنەدا، کە کۆتا فەرمایشتی خوایە، بۆ مرۆڤەکان، دەبنە هاودەم و هاوڕاز، دەبنە هاوەڵی و دەیخوێنن و، بیری لێ دەکەنەوەو تێوەی ڕادەمێنن و، لێی تێدەگەن و کاری پێ دەکەن، بە ئەندازەی لێ تێگەیشتن و کارپێکردن و کارلێککردنیان لەگەڵیدا، عیززەت پەیدادەکەن و حیکمەتیش پەیدا دەکەن،

ئنجا ئەمە هەم بۆ تاک تاک ڕاستە، هەم بۆ کۆمەڵ و کۆمەڵگاکانیش ڕاستە، واقیعیش باشترین بەڵگەیە: گەلی عەرەب بەر لەوەی پێغەمبەری خاتەم موحەممەد ﷺ ئەم فەرمایشتە پڕ بەرەکەتەی خوایان پێ بگەیەنێ، چۆن بوون؟ لە ڕووی سیاسییەوە پەرش و بڵاوو، لە ڕووی ئابوورییەوە چینایەتیی و قڕیی و پڕیی، لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە لێک هەڵوەشاوە، لە ڕووی فیکرییەوە زۆر دواکەوتوو و بەجێماو، لە ڕووی ڕەوشتییەوە زۆر داڕووخاو، لە هەر ڕوویەکەوە تەماشایان بکەی زۆر بێ سەروبەر، تەنیا لە ڕووی قسەزانیی و شیعر گوتن و پەخشان و وتارو ڕەوانبێژیی و قسە پاراوییەوە، لەو ڕووەوە لە پێشەوە بوون و، ڕەنگە لەو بوارەدا لە پێش زۆربەی گەلانەوە بووبن، بەڵام دوای ئەوەی لەگەڵ قورئاندا، دەبنە هاودەم و هاوڕاز، ئەم قورئانە بەرزو مەزنە لە عەقڵ و دڵی ژمارەیەکیاندا جێی دەبێتەوەو، وەخۆ دەگیرێ و، فام دەکرێ و، کاری پێ دەکرێ، دەبینین گۆڕانێکی سەدو هەشتا (١٨٠) پلەیی بەسەر واقیعی ئەو نەتەوەیەدا دێ و، بە مانای ئەو دوو وشەیە دەبنە خاوەنی عیززەت، دوای زەبوونیی و زەلیلیی و داماویی و بە جێماویی و، دەبنە خاوەنی عیززەت و باڵادەستیی و دەسترۆیشتوویی، هەروەها دوای دواکەوتوویی لە ڕووی فیکرییەوە، دەبنە خاوەنی زانیاریی و حیکمەت، بە ماناو چەمکی فراوانی عیززەت و حیکمەت، ئێستاش لە دوای وانیشەوە، لە دوای کۆمەڵگای پێغەمبەرەوە ﷺ هەروا جیل بە جیل مسوڵمانان، نەتەوە بە نەتەوە، کۆمەڵگا بە کۆمەڵگا، تاک بە تاک، هەر کەسێک زیاتر دەستی بە قورئانەوە گرتبێ، پتر بۆتە خاوەنی عیززەت و خاوەنی حیکمەت، وەک پێغەمبەر ﷺ لە فەرمایشتێکدا دەفەرموێ: {**إِنَّ اللَّهَ يَرْفَعُ بِهَذَا الْكِتَابِ أَقْوَامًا، وَيَضَعُ بِهِ آخَرِينَ**} (**أخرجه أحمد: ٢٣٢، والدارمي: ٣٣٦٥، ومسلم: ٨١٧، وابن ماجه: ٢١٨، وأبو عوانة: ٣٧٦٢، وابن حبان: ٧٧٢**)، واتە: خوا بەم کتێبە کۆمەڵانێک بەرز دەکاتەوەو، کۆمەڵانێکیش نزم دەکاتەوە.

خـوا ﷻ ئێمــە لــەو کەســانە بگێــڕێ، کــە بــە هــۆی قورئانــەوە بــەرز دەبــن و، ئەوپــەڕی بەهــرەو ســوودی لــێ وەردەگــرن.

## كورتە باسێک لەبارەی
## حیكمەتی زۆر باسكرانی ئامانجی دروستكرانی گەردوونەوە

لەبەر تیشكی ئایەتی ژمارە (٣)دا: ﴿ مَا خَلَقْنَا ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَآ إِلَّا بِٱلْحَقِّ وَأَجَلٍ مُّسَمًّى وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ عَمَّآ أُنذِرُوا۟ مُعْرِضُونَ ﴾. ئەم كورتە باسە دەكەین و، ئەم كورتە باسەش لە دوو بڕگان پێک دێ:

### بڕگەی یەكەم:

خوای كاربەجێ، كارو قسەی بەجێ و پڕ حیكمەت نەبێ، لێی ناوەشێتەوە، گومانی تێدانیە، ئەمە لە بەڵگە نەویستەكانە، خوا ﷻ نە قسەیەک، نە كردەوەیەک، كە ئەوپەڕی حیكمەتی تێدانەبێ، ئەوپەڕیی دانایی تێدانەبێ، لێی ناوەشێتەوە، چونكە خوا ﷻ یەكێک لە سیفەتەكانی ئەوەیە كە زاناو كارزانە، لە چەند شوێنی قورئاندا خوا خۆی بە: (عَلِيْم وَحَكِيْم) ناساندوەو، سیفەتەكانی خوای پەروەردگاریش هەموویان لە لووتكەدان، دیارە بە نسبەت ئیدراک و تێگەیشتنی ئێمەوە باسی لووتكە دەكەین، ئەگەرنا سیفەتەكانی خوا بێ سنوورو ڕەهان و، كە دەگوترێ: خوا كاربەجێیە، واتە: ئەوپەڕی حیكمەت هی خوای پەروەردگارە و، كە دەگوترێ: خوا زانایە، واتە: ئەوپەڕی زانیاریی هی خوایە و، كە دەگوترێ: خوا بە بەزەیی و میهرەبانە، واتە: ئەوپەڕی بەزەیی و میهرەبانیی هی خوایەو ... هتد، هەموو سیفەتەكانی خوا لە ئەوپەڕی دان و، عەقڵی ئێمە دەركی سنوورەكەیان ناكات و بێ سنوورن و ڕەهان، سیفەتەكانی خوا هەموویان بێ سنوورو ڕەهان.

ئنجا ئەو ڕاستییە کە گەردوون بەسەرو خواریەوە بە هەق و حیکمەت دروستکراوە، بە لای کەمەوە لە حەڤدە (١٧) شوێنی قورئان و لە حەڤدە سوورەتاندا هاتوە، هەڵبەتە بەپێی ئەوەی من سەرنجم داوەو کەوتۆتە بەرچاوم، بەڵام ناشڵێم تەنیا لەو حەڤدە شوێنەدا، باسی ئەوە کراوە کە خوا ئەم دروستکراوانەی بە هەق و بە حیکمەت نەبێ، نەهێناونە دی، بەڵام من حەڤدە شوێنم کەوتوونە بەرچاو:

١- لە سوورەتی (**آل عمران**)دا، دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِينَ يَذْكُرُونَ ٱللَّهَ قِيَٰمًا وَقُعُودًا وَعَلَىٰ جُنُوبِهِمْ وَيَتَفَكَّرُونَ فِى خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَٰذَا بَٰطِلًا سُبْحَٰنَكَ فَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ﴿١٩١﴾ ﴾، واتە: ئەوانەی بە پێوەو بە دانیشتنەوەو لەسەر تەنیشتیان، یادی خوای دەکەن و، بیر دەکەنەوە لە دروستکرانی ئاسمانەکان و زەوی، دەرەنجام دەڵێن: پەروەردگارمان! ئەمەت (ئەم گەردوونەت) بە بەلاش و بە پووچ و هەوەنتەو بێ حیکمەت نەهێناوەتە دی، پاکیی بۆ تۆ، لە ئازاری ئاگر چەپاڵەمان بدە.

٢- لە سوورەتی (**الأنعام**)دا، دەفەرموێ: ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِىٓ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِٱلْحَقِّ ﴿٧٣﴾ ﴾، واتە: ئەو (خوا) ئەو زاتەیە کە ئاسمانەکان و زەوی بە هەق هێناونە دی، واتە: بە حیکمەت و بۆ ئامانجێک (یان بە چەندان حیکمەت بۆ چەندان ئامانج).

٣- لە سوورەتی (**یونس**)دا، دەفەرموێ: ﴿ هُوَ ٱلَّذِى جَعَلَ ٱلشَّمْسَ ضِيَآءً وَٱلْقَمَرَ نُورًا وَقَدَّرَهُۥ مَنَازِلَ لِتَعْلَمُوا۟ عَدَدَ ٱلسِّنِينَ وَٱلْحِسَابَ ۚ مَا خَلَقَ ٱللَّهُ ذَٰلِكَ إِلَّا بِٱلْحَقِّ ﴿٥﴾ ﴾، واتە: ئەو (خوا) ئەو زاتەیە کە خۆری کردوە بە تیشک و، مانگی ڕووناک کردۆتەوەو، چەند قۆناغی بۆ داناون، تاکو ژمارەی ساڵەکان و ژماردن، بزانن، خوا ئەوەی بە هەق نەبێ نەهێناوەتە دی.

٤- لە سوورەتی (**هود**)دا خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ وَكَانَ عَرْشُهُۥ عَلَى ٱلْمَآءِ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ﴿٧﴾ ﴾، واتە: ئەو (خوا) ئەو کەسەیە کە ئاسمانەکان و زەوی بە شەش ڕۆژان، (واتە: لە شەش قۆناغاندا)

هێناونە دی، لەو کاتەدا عەرشەکەی لەسەر ئاوێ بووە، تاکو تاقیتان بکاتەوە داخۆ کامەتان کردەوەی چاکترە، کەواتە: حیکمەتێ تێدایە کە خوا ئاسمانەکان و زەوی هێناونە دی و ئامانجێکیان لە پشتەوەیە.

٥- لە سوورەتی (**إبراهيم**)دا، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ بِالْحَقِّ ﴿١٩﴾﴾، واتە: ئایا نابینی، (واتە: نازانی، یان بە چاوی عەقڵ و دڵ نابینی) کە خوا ئاسمانەکان و زەوی بە هەق دروستکردوون، (نەک بە بەتاڵ و پووچ و بێ حیکمەت).

٦- لە سوورەتی (**الحجر**)دا، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَمَا خَلَقْنَا السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا إِلَّا بِالْحَقِّ وَإِنَّ السَّاعَةَ لَآتِيَةٌ فَاصْفَحِ الصَّفْحَ الْجَمِيلَ ﴿٨٥﴾﴾، واتە: ئێمە ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەی دەکەوێتە نێوانیشیانەوە، بە هەق نەبێ دروستمان نەکردوون، بێگومان کاتەکە (**ساعة**)ش دێ، {واتە: ئەو کاتەی کە تۆماری ئەم بوونەوەری ئێستای تێدا دەپێچرێتەوە، یاخود قیامەت}، دەجا تۆش (ئەی موحەممەد ﷺ) چاوپۆشیی جوان بکە، (لەو وردە مافانەی وەک مافی کەسیی دەکەونە لای بەرانبەرەکان).

٧- لە سوورەتی (**النحل**)دا، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ بِالْحَقِّ تَعَالَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٣﴾﴾، واتە: (خوا) ئاسمانەکان و زەوی بە هەق هێناونە دی، بەرزیی بۆ خوا لەوەی دەیکەنە هاوبەشی.

٨- لە سوورەتی (**الأنبياء**)دا، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَمَا خَلَقْنَا السَّمَاءَ وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا لَاعِبِينَ ﴿١٦﴾﴾، واتە: ئێمە ئاسمانەکان و زەوی و، ئەوەی دەکەوێتە نێوانیانەوە، بە گاڵتە دروستمان نەکردوون.

٩- لە سوورەتی (**المؤمنون**)دا، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَاكُمْ عَبَثًا وَأَنَّكُمْ إِلَيْنَا لَا تُرْجَعُونَ ﴿١١٥﴾ فَتَعَالَى اللَّهُ الْمَلِكُ الْحَقُّ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ رَبُّ الْعَرْشِ الْكَرِيمِ ﴿١١٦﴾﴾، واتە: ئایا پێتان وایە، ئێوەمان بە هەوەنتەو بێ حیکمەت دروستکردووەو، بۆ لای ئێمە ناگێردرێنەوە؟ بەرزیی بۆ خوای حوکمڕانی و هەق (کە شتی بێ حیکمەت و بێ جێ بکات) جگە لەو هیچ پەرستراوێک نیە، پەروەردگاری تەختی بەرێزو حورمەتە.

١٠- لە سوورەتی (**العنكبوت**)دا، خوا ﷻ دەفەرمویّ: ﴿ خَلَقَ ٱللَّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِٱلْحَقِّ ۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَءَايَةً لِّلْمُؤْمِنِينَ ﴿٤٤﴾ ﴾، واتە: خوا ئاسمانەکان و زەوی بە هەق دروستکردوون، لەوەدا نیشانە هەیە بۆ بڕواداران.

١١- لە سوورەتی (**الروم**)دا، خوا ﷻ دەفەرمویّ: ﴿ أَوَلَمْ يَتَفَكَّرُوا۟ فِىٓ أَنفُسِهِم ۗ مَّا خَلَقَ ٱللَّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَآ إِلَّا بِٱلْحَقِّ وَأَجَلٍ مُّسَمًّى ۗ وَإِنَّ كَثِيرًا مِّنَ ٱلنَّاسِ بِلِقَآئِ رَبِّهِمْ لَكَٰفِرُونَ ﴿٨﴾ ﴾، واتە: ئایا سەرنجیان نەداوەو بیریان نەکردۆتەوەو ڕانەماون، کە خوا ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەی دەکەویّتە نیّوانیانەوە، بە هەق و بۆ کاتیّکی دیاریکراو نەبێ، دروست نەکردوون؟ بەڵام زۆر لە خەڵکی بێبڕوان بە دیداری پەروەردگاریان.

١٢- لە سوورەتی (**ص**)دا، خوا ﷻ دەفەرمویّ: ﴿ وَمَا خَلَقْنَا ٱلسَّمَآءَ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا بَٰطِلًا ۚ ذَٰلِكَ ظَنُّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ۚ فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنَ ٱلنَّارِ ﴿٢٧﴾ ﴾، واتە: ئیّمە ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەی دەکەویّتە نیّوانیانەوە، بێ حیکمەت و بە هەوەنتە دروستمان نەکردوون، ئەوە گومانی ئەوانەیە کە بێبڕوان، (پێیان وایە دنیا شاری بێ خاوەنە)، سزای سەخت بۆ ئەوانەی بێبڕوان لە ئاگری دۆزەخ.

١٣- لە سوورەتی (**الزمر**)دا، خوا ﷻ دەفەرمویّ: ﴿ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِٱلْحَقِّ ﴿٥﴾ ﴾، واتە: خوا ئاسمانەکان و زەوی بە هەق دروستکردوون.

١٤- لە سوورەتی (**الدخان**)دا، خوا ﷻ دەفەرمویّ: ﴿ وَمَا خَلَقْنَا ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا لَٰعِبِينَ ﴿٣٨﴾ مَا خَلَقْنَٰهُمَآ إِلَّا بِٱلْحَقِّ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٣٩﴾ ﴾، واتە: ئیّمە ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەی نیّوانیانمان بە گاڵتەو یاریی دروست نەکردوون، تەنیا بە هەق دروستمان کردوون، بەڵام زۆربەیان (واتە: زۆربەی بێبڕوایان) نازانن، (هەیانە دەزانێ، بەڵام خۆی لێ گێل دەکات، لەبەر بەرژەوەندیی لێ تێک نەچوون).

١٥- لە سوورەتی (**الجاثية**)دا، خوا ﷻ دەفەرمویّ: ﴿ وَخَلَقَ ٱللَّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِٱلْحَقِّ وَلِتُجْزَىٰ كُلُّ نَفْسٍۭ بِمَا كَسَبَتْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿٢٢﴾ ﴾، واتە: خوا ئاسمانەکان و زەوی

بە هەق دروستکردوون، تاکو هەر کەسە سزاو پاداشتی خۆی وەربگرن، بێ ئەوەی ستەمیان لێ بکرێ.

**١٦**- لە سوورەتی (**الأحقاف**)دا، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ مَا خَلَقْنَا ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَآ إِلَّا بِٱلْحَقِّ وَأَجَلٍ مُّسَمًّى ۚ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ عَمَّآ أُنذِرُوا۟ مُعْرِضُونَ ﴿٣﴾ ﴾، واتە: ئێمە ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەی دەکەوێتە نێوانیان، بە هەق و حیکمەت نەبێ و بۆ کاتێکی دیارییکراو نەبێ، نەمان هێناونە دی، لە حاڵێکدا ئەوانەی بێبڕوان لەوەی پێی ترسێنراون، پشت هەڵکردوون، ڕوو وەچەرخێنەرن.

**١٧**- لە سوورەتی (**القيامة**)دا، کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ أَيَحْسَبُ ٱلْإِنسَٰنُ أَن يُتْرَكَ سُدًى ﴿٣٦﴾ ﴾، واتە: ئایا مرۆڤ پێی وایە وازی لێ دەهێنرێ و لێی ناپرسرێتەوە! (واتە: وانیە ئەم پرسیارکردنە بێگومان پرسیارکردنی نکووڵییلێکەرانەیە، واتە: وازی لێ ناهێنرێ و لێی دەپرسرێتەوەو سزاو پاداشتی چاوەڕێیە).

کەواتـە: ئەمـە حەڤـدە (١٧) شـوێن بـوون بـە لای کەمـەوە لـە قورئانـدا، ئـەو ڕاسـتییە ڕادەگەیەنـن کـە گـەردوون بەسـەرو خواریـەوە، یـان ئاسـمانەکان و زەوی و ئـەوەی دەکەوێتـە نێوانیـان، بـە هـەق و حیکمـەت نەبـێ دروسـت نەکـراون.

## بڕگەی دووەم: حیکمەتی ئەو زۆر باسکرانەی خستنە ڕووی ئامانج و مەبەستی بەدیهێنرانی گەردوون، چییە؟

ئەمیش لە دوو خاڵدا باس دەکەین:

**١)**- مشت و مڕ لە بارەی هەبوونی ئامانج (**هدف، غرض**) و نەبوونی لە کارەکانی خوادا، لە نێو زانایاندا هەربووەو ئێستاش هەیە و، پێشم وایە هۆکاری سەرەکیی مشت و مڕو ڕاجیاییەکە لێک حاڵیی نەبوونە.

بـە درێژایـی مێـژووی مسـوڵمانان لـە نێـو زانایـانی بنچینـەکانی ئاییـن (**أصُـول الدين**) دا، کـە بـە (**عُلَـماء الـكَلَام**) و (**المُتَكَلِّمـون**) و (**عُلَـماء العَقِيْـدَة**) نـاسراون، زانایانـێ کـە

لـە بابـەتی بووناسـیی و ئیـمان و عەقیـدە دەکۆڵنـەوە، مشـت و مـڕ هەبـووە لـەو بـارەوە، کـە ئایـا دەگونجـێ بڵێیـن: خـوا ﷻ ئامانجێکـی لەبەرچـاو گرتـوە لـە کـردنی کارێکـی دا، یـان دروسـتکردنی گەردوونـدا، یـان کارەکانی دیکـەدا، یـان ناگونجـێ؟

هەندێـک گوتوویانــە: ناگونجــێ وابڵێیــن، چونکــە ئەگــەر گوتمــان: خــوا ﷻ ئامانجێکــی لەبەرچــاو گرتــوە لــە کاتێکــدا، کارێکــی ئەنجامــداوە، بــۆ وێنــە: کــە پێغەمبــەرانی (**عَلَيْهِـمُ الصَّـلاةُ وَالسَّـلام**) نـاردوون، یــان یــەک یــەک کتێبــەکانی دابەزانـدوون، یـان ئـەم گەردوونـەی هێناوەتـە دی، ئەگـەر بڵێیـن: ئامانجێکـی ڕەچـاو کـردوە، مانـای وایـە خـوا ﷻ پێویسـتیی بـە هێنانـە دی ئـەو ئامانجـە هەیـەو، ئەوەش شایسـتەی خـوا نیـە، چونکـە خـوا ئاتاجـی جگـە لـە خـۆی نیـە، واتـە: خـوا سـیفەتی پێویسـتیی هەبـوون (احتیـاج)ی نیـە.

بەشـێکی دیکـە لـە زانایـان گوتوویانـە: کاری خـوا ناگونجـێ بـێ ئامانـج بێـت و، ناگونجـێ ئامانـج و و مەبەسـت لـە پشـت کارەکانی خـواوە نەبـێ، بـەڵام ئێمـە ناڵێیـن: ئــەو ئامانجــە پەیوەندیــی بــە خــوای پــەروەردگارەوە هەیــە، بەڵکــو پەیوەندیــی بـە دروسـتکراوەکانەوە هەیـە، بـۆ وێنـە: خـوا ﷻ کـە پێغەمبـەرانی (**عَلَيْهِـمُ الصَّـلاةُ وَالسَّـلام**) نـاردوون و کتێبـەکانی خـۆی دابەزانـدوون و ئامانجەکـەشی ڕوون کردۆتـەوە، دەفەرمـوێ: ﴿ رُّسُلًا مُّبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى ٱللَّهِ حُجَّةٌۢ بَعْدَ ٱلرُّسُلِ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا ﴿١٦٥﴾ ﴾النسـاء، واتـە: پێغەمبەرانێکـی دڵخۆشـکەرو ترسـێنەرن، تاکـو خەڵـک لـە دوای ڕەوانەکـرانی پێغەمبـەران (**عَلَيْهِـمُ الصَّـلاةُ وَالسَّـلام**) بەڵگەیـان لەسـەر خـوا نەبـێ، کەواتـە: پێغەمبـەران (**عَلَيْهِـمُ الصَّـلاةُ وَالسَّـلام**) بـۆ ئامانجێـک نێـردراون و کتێبـەکانی خـوا بـۆ ئامانجێـک دابەزێـنراون، کـە بریتیـە لـەوەی خەڵـک بیانـوو بـڕاو بکـرێ، بـەڵام ئـەو ئامانجـە پەیوەندیـی بـە مرۆڤەکانـەوە هەیـە، نـەک خـوا ﷻ پەکـی لەسـەری کەوتبـێ، هەڵبەتـە هەندێـک لـە زانایانیـش گوتوویانـە: دەبـێ وشـەی حیکمـەت بەکاربهێـنرێ، نـەک وشـەی (**غَـرَض**) واتـە: (**غَـرَض**) لـە کارەکانی خـوادا نیـە، بەڵکـو حیکمـەت هەیـە.

بەڵام بە بۆ چوونی من چ بڵێی: مەبەست (**غَرَضْ**) چ بڵێی ئامانج (**هَدَفْ**)، چ بڵێی ویستراو (**غَایَة**)، چ بڵێی حیکمەت، هەمووی دەچێتەوە نێوە ئەوە، کە کارەکانی خوا ﷻ لە جێی خۆیاندان و، کارەکانی خوا حیکمەت لە پشتیانەوە هەیە و، ئامانجێک دێننە دی، خوا لە کارەکانی خۆیدا شتانێکی بە ئامانج گرتوون، بەڵام ئەو شتانەی خوا بە ئامانجی گرتوون، بە دڵنیایی خوا لە جگە لە خۆی بێ نیازە: ﴿ وَمَن جَٰهَدَ فَإِنَّمَا يُجَٰهِدُ لِنَفْسِهِۦٓۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَغَنِيٌّ عَنِ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٦﴾ ﴾**العنكبوت**، بەڵام ئەو ئامانجانە، دروستکراوەکان پێویستییان پێیان هەیە، واتە: ئەگەر لە جیهانی مرۆڤ بەولاوەتر بچین، خوا کە شتەکانی هێناونە دی، ئەم گەردوونەی بەو پەڕی حاڵەتێکی سیستماتیک و ڕێک و پێک دروستکردووەو، هەر شتێک کە خوا خوڵقاندوویەتی، ڕێ و شوێنی بۆ داوە: ﴿ قَالَ رَبُّنَا ٱلَّذِيٓ أَعۡطَىٰ كُلَّ شَيۡءٍ خَلۡقَهُۥ ثُمَّ هَدَىٰ ﴿٥٠﴾ ﴾**طه**، چونکە هەر شتێک ئەگەر هیدایەت نەدرێ لە لایەن خواوەو، سیستمی بۆ دانەنرێ و، ڕێک و پێک بەڕێوە نەبردرێ، فەوزاو پاشاگەردانیی و بێسەروبەریی لە خوا ناوەشێتەوە، نابێ لە موڵکی خوادا بێ سەروبەریی و پاشاگەردانیی و ناڕێکیی هەبێ، کەواتە: خوا ﷻ ئامانج و مەبەست هەیە لە کارەکانیدا، بەڵام نەک ئامانج و مەبەستێک کە پەیوەست بن بە خۆیەوە، چونکە خوای پەروەردگار بێگومان نیازو پێویستی بە جگە لە خۆی نیە، بەڵام ئەو ئامانج و مەبەستانە، پەیوەندییان بە دروستکراوەکانەوە هەیە.

**٢)**- حیکمەتی زۆر باسکرانی ئەو ئامانجەش، بریتیە لە بەرچاو ڕوونکردنەوەو دڵنیا کردنەوەی مرۆڤ، لە بارەی بوون و ژیانیەوە، لە سۆنگەی ئەوەوە کە چوار هۆکار هەن، پێویستی کردوە کە خوا ﷻ بە لای کەمەوە لە حەڤدە ئایەتی موبارەکدا، باسی ئەو ڕاستییە بکات، کە هەر ڕاستییەک لە یەک ئایەتدا باسکرا بێت تەواوە، بەڵام ڕاستییەک خوا ﷻ لە حەڤدە شوێندا دووبارەی بکاتەوە، بە حەڤدە تەعبیری جۆراو جۆر، مانای وایە، خوا ﷻ زۆری مەبەست بووە، ئەو ڕاستییە بۆ خەڵک بخاتەڕوو، کە بریتیە لەوەی بەر چاویان ڕوون بێتەوەو دڵنیابن، لە بارەی بوون و ژیانەوە، کە بوون و ژیانی ئەوان

بە هەقەو، حیکمەتی تێدایەو، ئامانجی لە پشتەوەیە، ئنجا چوار هۆکار هەن کە پاڵنەرو هاندەری زۆر ڕوونکردنەوەی ئەو ڕاستییەن:

**هـۆکاری یەکـەم:** لەبـەر ئـەوەی مـرۆڤ بـۆ تاقیکردنـەوە خولقێـنراوە، بـوار هێڵدراوەتـەوە کـە مـرۆڤ، نەتوانـێ هەمـوو ئـەو ڕاسـتییانەی هـەن، وەخۆیـان بگـرێ و هەزمیـان بـکات، واتـە: زۆر نهێنیـی هـەن زۆر شـت هـەن، مـرۆڤ سـەری لێیـان دەرناچـێ، گومـانی تێدانیـە، وەک لـە مەوسـووعەی: (ئیـمان و ئیلحـاد)دا، باسـمان کـردوە، کـە یەکێـک لـە هـۆکارەکانی پەلکێـش کـرانی کەسـانێک بـەرەو ئیلحـاد، ئەوەیە کـە هەنـدێ شـت دەبینـن لـە ژیانـدا سـەریان لـە حیکمەتەکەیـان دەرناچێ، بـۆ وێنە: منداڵێـک کـە هـەر لـە دایـک دەبـێ بـە نوقصانیـی لـە دایـک دەبـێ، یاخـود کەسێک بەڵایەکـی بەسـەر دێ، نازانـێ بۆچـی؟ یـان لـە هەنـدێ لـە دروسـتکراوەکانی خـوادا حاڵـەتی نارێکیـی هەیـە، بـۆ وێنـە: ژیاندارێـک، ئاژەڵێـک دروسـت دەبـێ نوقصانیـی هەیـە، جگـە لـە جیهـانی مـرۆڤ، لـە هەنـدێ لـە شـتەکانی دیکـەدا، یـان خـوا ﷻ هەندێـک شـتی خوڵقانـدوون، کـە سـوودەکەیان بـۆ ئێمـە دیـار نیـە، وەک: وەک مـارو دووپشـک و میکـرۆب و ڤایـرۆس، کـە زیانەکەیـان دیـارە، بـەڵام سـوودەکەیان دیـار نیـە، هەروەهـا زۆر نهێنیـی دیکـە هـەن، کـە مـەرج نیـە عەقڵـی مـرۆڤ جێـی حەلکـردنی هەمـوو ئـەو مەتەڵانـەی بـوونی تێدابێتـەوە.

**هۆکاری دووەم:** بـۆ ئـەو زۆر جەختکردنەوەیـە، ئەوەیە کـە شـەیتانەکان بەردەوام دنـە دنـەی مـرۆڤ دەدەن و، خوتخوتـەی بـۆ دەکـەن و، خەیـاڵ و ئەندێشـەی خراپـی دەخەنـە عەقـڵ و دڵـەوە، لـە بـارەی خـواوە، لـە بـارەی ژیـانی خۆیـەوە، لـە بـارەی دەوروبەریـەوە، لـە بـارەی شـتەکانەوە، بۆیـە خـوا ﷻ بـە پێویسـتیی زانیـوە ئـەو هەمـووە جەخـت بکاتـەوە لەسـەر ئـەوە کـە ژیـان و بـوون، هـەق و حیکمەتیـان لـە پشـتەوەیەو، هەوەنتـە و گاڵتـە و بـێ ئامانـج نیـن.

**هۆکاری سێیەم:** هەبـوونی زۆر هـەورازو نشـێوو کـەم و کوڕیـی لـە ژیـانی مرۆڤـدا و، پرسـیار گەلێـک کـە مـرۆڤ سـەری لێیـان دەرناچـێ، هەڵبەتـە ئێمـە لـە شـوێنێکی

تەرخانکـراودا، کـە مەوسـووعەی: (درەوشـاوەیی ئیـمان و پووچەڵـی ئیلحـاد لەبـەر ڕۆشـنایی زگـماک و عەقـڵ و زانسـت و وەحیـی دا)یـە، زۆرێـک لـەو پرسـیارانەمان هەوڵـداوە، وەڵام بدەینـەوە، بـەڵام دیسـان پرسـیاری بـێ وەڵام و ئیشـکالی بـێ چارەسـەر، کـەم و زۆر هـەر دەمێنـن، لەبـەر ئـەوەی مـرۆڤ توانایـەکانی سـنووردارن و، عەقـڵ و هۆشـەکەی سـنوورداره، مـرۆڤ بۆیـە نەخوڵقێـنراوە هەرچـی نهێنیـی گـەردوون و ئاسـمان و زەوی هەیـە، بیزانـێ، بەڵکـو نەزانینـی زۆرێـک لـەو نهێنییانـە، ماددەیەکـە بـۆ پـێ تاقیکردنـەوەی مـرۆڤ، ئنجـا ئەگـەر مـرۆڤ هەمـوو شـتێکی زانیبایـەو لـە هەمـوو شـتێکدا، لـەو سـەریەوە هاتبایـەوە، ئازایەتیـی نەدەبـوو بـۆ خـوا ملکـەچ بـێ و، بەندایەتیـی بـۆ خـوا بـکات!

**هـۆکاری چـوارەم:** هەبـوونی بـوار بـۆ پێهەڵاچـوون و زیاتـر هەوڵـدانی مـرۆڤ، نـەک بکرێتـە حـازر خـۆری بـەر سـێبەر، خـوا ﷻ کارێکـی وایکـردوە لـە ژیـانی مرۆڤـدا، کـە مـرۆڤ ناچـار بـێ، زیاتـر هـەوڵ بـدات و، زیاتـر پێـی هەڵابچـێ، زیاتـر کار لەسـەر خـۆی بـکات و خـۆی مانـدوو بـکات، بـۆ ئـەوەی دەرکـی نهێنییـەکان و دەرکـی حیکمـەتی خـوا لـە کارەکانیـدا بـکات و، دەرکـی ڕاسـتییەکانی فەرمایشـتەکەی بـکات و، خـوا ﷻ دوو کتێبـی خسـتوونە بـەر دەسـتی ئێمـە، کتێبـی قوڕئـان کـە کتێبـی خوێنـدراوە (الکتـاب المقـروء)ی خوایـە و، کتێبـی گـەردوون کـە کتێبـی تەماشـاکراو (الکتـاب المنظـور)ی خوایـە، هـەردووک کتێبەکـەش بەڵگـەو نیشـانەی خـوا و ڕێنیشـاندەری خـوا ناسـین، بۆیـەش خـوا ﷻ ڕسـتەکانی قوڕئـانی ناونـاون (آیـات) نیشـانەکان: ﴿ تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱللَّهِ نَتْلُوهَا عَلَيْكَ بِٱلْحَقِّ ....﴿٦﴾ ﴾، **الجاثیـة**، واتـە: نیشـانە لەسـەر بەدیهێنەرایەتیـی و، پەروەردگارێتیـی و، خاوەندارێتیـی خـوا ﷻ، هەروەهـا دیـاردەو دیمەنـەکانی گەردوونیشی ناونـاون (**آیـات**): ﴿ وَجَعَلْنَا ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ ءَايَتَيْنِ ۖ فَمَحَوْنَآ ءَايَةَ ٱلَّيْلِ وَجَعَلْنَآ ءَايَةَ ٱلنَّهَارِ مُبْصِرَةً ﴿١٢﴾ ﴾**الإسراء**، واتـە: شـەوو ڕۆژمـان کردوونـە دوو نیشـانە، نیشـانەی شـەومان خەفـە کـردوەو نیشـانەی ڕۆژگارمـان کردۆتـە پێبینـەر، هەروەهـا: ﴿ وَكَأَيِّن مِّنْ ءَايَةٍ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ يَمُرُّونَ عَلَيْهَا وَهُمْ عَنْهَا مُعْرِضُونَ

﴿١٠٥﴾ ﴾يوسف، واتە: زۆر نیشانە هەن لە ئاسمانەكان و زەویدا، بەلایاندا ڕەت دەبن لە حاڵێكدا كە پشتیان تێكردوون، یان: ﴿ سَنُرِيهِمْ ءَايَٰتِنَا فِى ٱلْآفَاقِ وَفِىٓ أَنفُسِهِمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ ﴿٥٣﴾ ﴾فصلت، واتە: نیشانەكانی خۆمانیان پێشان دەدەین، لەمەودوا لە ئاسۆیەكاندا، (واتە: لە گەردوون داو) لە خودی خۆشیاندا، تاكو بۆیان دەربكەوێ كە ئەو (قورئان) یان (خوا) هەقە، (پێشتر تەفسیرمان كردوە).

كەواتە: ئەم چوار هۆكارە كە هەندێكیان تێكەڵكێشن، هۆكارن بۆ ئەوەی خوا ﷻ ئەو ڕاستییە لە حەقدە شوێن بە لای كەمەوە، لە قورئان دا دووپات بكاتەوە، كە گەردوون و مرۆڤ و ژیان، بە هەوەنتە نەخوڵقێنراون و، بە هەق هێنراونە دی و، حیكمەت و ئامانج لە پشتیانەوە هەیە، كە دیارە لە ئایەتەكەی سوورەتی (الجاثیة)دا، خوا ﷻ تاكو ڕاددەیەكی زیاتر لە ئایەتەكانی دی، ئەو حیكمەتە ڕوون دەكاتەوە كە دەفەرمووێ: ﴿ وَخَلَقَ ٱللَّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِٱلْحَقِّ وَلِتُجْزَىٰ كُلُّ نَفْسٍۭ بِمَا كَسَبَتْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿٢٢﴾ ﴾، واتە: خوا ئاسمانەكان و زەوی بە هەق هێناونە دی، هەروەها بۆ ئەوەش كە هەر كەسە سزاو پاداشتی خۆی بە تەواویی وەربگرێ و ستەمیشیان لێ ناكرێ.

مەسەلەی دووەم:

**دەرخستنی پووچەڵیی شیرک و، نەبوونی هیچ بەڵگەیەکی نەقڵیی و عەقڵیی لەسەری و، بە گومڕاترین کەس دانانی هاوبەشدانەران و، لە ڕۆژی دواییدا، بوونە دوژمن و حاشا لێکردنی پەرستراوەکانیان لێیان:**

خوا ﷻ دەفەرمووێ: ﴿قُلْ أَرَءَيْتُم مَّا تَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَرُونِى مَاذَا خَلَقُوا۟ مِنَ ٱلْأَرْضِ أَمْ لَهُمْ شِرْكٌ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ ۖ ٱئْتُونِى بِكِتَٰبٍ مِّن قَبْلِ هَٰذَآ أَوْ أَثَٰرَةٍ مِّنْ عِلْمٍ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٤﴾ وَمَنْ أَضَلُّ مِمَّن يَدْعُوا۟ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَن لَّا يَسْتَجِيبُ لَهُۥٓ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ وَهُمْ عَن دُعَآئِهِمْ غَٰفِلُونَ ﴿٥﴾ وَإِذَا حُشِرَ ٱلنَّاسُ كَانُوا۟ لَهُمْ أَعْدَآءً وَكَانُوا۟ بِعِبَادَتِهِمْ كَٰفِرِينَ ﴿٦﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە دە بڕگەدا:

١)- ﴿قُلْ أَرَءَيْتُم مَّا تَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ﴾، (دیارە دوێنراو، پێغەمبەری خاتەمە ﷺ) بفەرموو: ئایا دەبینن ئەوانەی لە جیاتی خوا، یان جگە لە خوا لێیان دەپاڕێنەوە، یاخود: پێشانم بدەن ئەوانەی جگە لە خوا، لێیان دەپاڕێنەوە.

٢)- ﴿أَرُونِى مَاذَا خَلَقُوا۟ مِنَ ٱلْأَرْضِ﴾، پێشانم بدەن، بۆم بخەنەڕوو چییان لە زەوی دروست کردوە!

٣)- ﴿أَمْ لَهُمْ شِرْكٌ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ﴾، یان ئایا بەشدارییان لە ئاسمانەکاندا هەیە؟!،

(أَرَأَيْتُم) زانایان بە گشتیی بە دوو جۆر لێکیان داوەتەوە:

**یەکەم:** بە مانا ڕوواڵەتییەکەی: ئایا بینیتان! ئایا زانیتان و بەچاوی عەقڵ و دڵ دیتتان؟.

**دووەم:** بەو مانایەی کە لێی هەڵدەهێنجرێ، (أَرَأَيْتُم) واتە: (أَخْبِرُونِي) واتە: دوای ئەوەی بینیوتانەو، زانیوتانە، ئنجا هەواڵم پێ بدەن، ئەوانە یەکسەر لازیمی مانایەکەیان لێگرتوە، دەرهاویشتەی مانایەکەی واتە: هەواڵم پێ بدەن، ﴿مَّا تَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ﴾، ئەوانەی

جگە لە خواو لە جیاتی خوا، لێیان دەپاڕێنەوە، (أَرُونِي)، پیشانم بدەن، ﴿مَاذَا خَلَقُوا مِنَ الْأَرْضِ﴾، چییان لە زەوی دروستکردوە، بە تەئکید لێرەدا (أَرُونِي: تَعْبِير تَسْخِيرٍ وَتَعْجِيز)، دەربڕینێکە بۆ گاڵتە پێکردن و دەستەپاچەیی پیشاندانیان، چونکە کوا دەتوانن چی پیشان بدەن، کە جگە لە خوا ﷻ هێناویەتە دی؟ وشەی: ﴿مَاذَا خَلَقُوا مِنَ الْأَرْضِ﴾، (مَاذَا) واتە: (مَا الَّذِي خَلَقُوهُ)، چییە ئەوەی ئەوان هێناویانەتە دی، چونکە دەڵێ: (ذَا: إِسْمُ إِشَارَةٍ نَابَ عَنِ الْمَوْصُولِ، وَأَصْلُ التَّرْكِيبِ: مَاذا الَّذِي خَلَقُوا، وَالإِسْتِفْهَامُ إِنْكَارِيّ أو تَوْبِيْخِيٌّ)، (مَاذَا) ئەصڵی خۆی، واتە: (مَا الَّذِي) چونکە (ذَا) ناوی ئاماژەیە، لە شوێنی (الَّذِي) دانیشتوە، ئەسڵی پێکهاتەکە ئاوایە (مَا الَّذِي خَلَقُوهُ) چییە ئەوەی هێناویانەتە دی؟ پرسیارکردنەکەش دەگونجێ بۆ نکووڵیلێکردن بێ، بەڵام باشتر وایە، بڵێین بۆ سەر زەنشتکردنە، چونکە ئەوان نکووڵیی لەوە ناکەن، کە ئەوانەی لە جیاتی خوا لێیان دەپاڕێنەوەو دەیانپەرستن، هیچیان نەهێناوەتە دی، ئەگەر بشڵێین بۆ نکووڵیلێکردنە، واتە: وەک کەسێک دانراون کە نکووڵیی بکەن، لەوەی پەرستراوەکانیان هیچیان نەهێناوەتە دی، [(قَالَ النُّحَاةُ إِنَّ (ذَا) بَعْدَ (مَا) أو (مَن الإِسْتِفْهَامِيَة) بِمَنْزِلَةِ (مَا الْمَوْصُولَة))]، (ذا) کە لە دوای (ما)ی پرسیارکردن یان (مَن)ی پرسیارکردنەوە دێ، لە جێی (مَا الْمَوْصُولَة)یە.

واتە: (مَاذا) یان (مَنْ ذا)، (ذا) کە لە دوای (ما)ەوە دێ، بۆ پرسیارکردنە، یاخود لە دوای (مَنْ)ەوە دێ، دیسان بۆ پرسیارکردنە، ئەوە لە شوێنی (ما الْمَوْصُولَة) دەبێ، واتە: (مَا الَّذِي) یان (من الذي).

کە دەفەرموێ: ﴿أَمْ لَهُمْ شِرْكٌ فِي السَّمَاوَاتِ﴾، (أَمْ: حَرْفٌ إِضْرَابٍ إِنْتِقَالِيٌّ، وَالإِسْتِفْهَام الْمُقَدَّرُ بَعْدَ (أَمْ)، إِنْكَارِيٌّ)، وشەی (أَمْ) زۆربەی زانایان دەڵێن: بریتییە لە هەمزەی پرسیارکردن و (بَلْ)، واتە: (بَلْ أَلَهُم شُرَكَاءُ فِي السَمَواتِ وَالأَرْض)، بەڵکو ئایا هاوبەشیان لە ئاسمانەکاندا هەن؟! هەندێکیش دەڵێن: (أَمْ) بە مانای هەمزەی پرسیارکردنە، بەڵام لێرەدا بۆ گواستنەوەیە، ئەو پرسیارەی لە دوای (أَمْ)ەوە دێ، پرسیارکردنێکی نکووڵیلێکەرانەیە، واتە: ئایا هاوبەشیان هەیە لە دروستکرانی ئاسمانەکاندا؟ بە تەئکید نەخێر! بۆیە دەفەرموێ:

٤)- ﴿ ٱئۡتُونِي بِكِتَٰبٖ مِّن قَبۡلِ هَٰذَآ ﴾، بۆم بێنن، کتێبێک لە پێش ئەمەوە، واتە: لە پێش قورئانەوە کتێبێک بێنن شتی وای گوتبێ، کە ئەو پەرستراوانە شتێکیان لە زەوی دروستکردوە، یاخود پشک و بەشیان هەیە، لە دروستکرانی ئاسمانەکاندا، کتێبێکم بۆ بێنن لە پێش ئەمەدا، شتی وای گوتبێ، واتە: بەڵگەیەکی نەقڵیی.

٥)- ﴿ أَوۡ أَثَٰرَةٖ مِّنۡ عِلۡمٍ ﴾، یان پاشماوەیەک لە زانیاریی، (أَثَارَة) بە زۆریی وا خوێندراوەتەوە، بەڵام هەندێکیان خوێندوویانەتەوە: (أَثَرَة)، هەندێکیشیان خوێندوویانەتەوە: (أُثْرَة)، بەڵام (الطبري) دەڵێ: جگە لە (أَثَارَة) دروست نیە، بە شێوازی دیکە بخوێنرێتەوە، ﴿ أَوۡ أَثَٰرَةٖ مِّنۡ عِلۡمٍ ﴾، (أي: بَقِيَّة مِنْ عِلْم)، واتە: شوێنەوارێک لە زانیاریيم بۆ بێنن، یان کتێبێکم بۆ بێنن لە پێش قورئاندا دابەزیبێ و ئەوەی تێدابێ، کە پەرستراوەکانی ئێوە بەشدارییان کردوە لە ئاسمان دا، یاخود شتێکیان لە زەوی دا خوڵقاندوە، ئەگەر کتێبتان بۆ نەهات، پاشماوەیەک لە زانیاریيم بۆ بێنن، (الأَثَارَةُ: البَقِيَّةُ مِنَ الشَّيء)، پاشماوەیەک لە شتێک، کە لێرەدا خوا ﷻ بواریان زیاتر پێ دەدات، یانی: ئەگەر بەڵگەی نەقڵییتان هێنا، باشە، ئەگەر نەتانهێنا، بەڵگەی عەقڵییش بێنن هەر باشە.

٦)- ﴿ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ﴾، ئەگەر ئێوە لە ڕاستانن، ئەمە بۆ زیاتر تیژکردن و هاندانیانە، کە زۆر بگەڕێن و هەوڵ بدەن، بەڵگەیەک لە وەحیی خوا بێنن، لە کتێبێکی خوادا، کە دایبەزاندۆتە سەر یەکێک لە پێغەمبەران، کە بێگومان شتی وانیە، یاخود ئەگەر بەڵگەی نەقڵییتان نەهێنا، بەڵگەی عەقڵیی بێنن، بەڵگەیەک لە زانست کە بەرهەمی عەقڵە بیهێنن، کە بە تەئکید نە بەڵگەی نەقڵیی لەسەر شیرک هەیەو، نە بەڵگەی عەقڵیی و، نە وەحیی ڕێی دەدات و نە عەقڵی سەلیم، بۆیە دەفەرموێ:

٧)- ﴿ وَمَنۡ أَضَلُّ مِمَّن يَدۡعُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَن لَّا يَسۡتَجِيبُ لَهُۥٓ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ ﴾، کێ گومڕاترە لە کەسێک لە جیاتی خوا، لە کەسێک دەپاڕێتەوە کە هەتا ڕۆژی قیامەت وەڵامی ناداتەوە؟! (مَنْ أَضَلُّ)، (مَنْ: الإِسْتِفْهَامِيَّة لِلإِنْكَار وَالتَّعْجِيْب) ئەم (مَنْ)ە، بۆ پرسیارکردنە، ئنجا هەم بۆ نکووڵییلێکردنە، هەم بۆ سەرسوڕماندنە، ﴿ وَمَنۡ أَضَلُّ مِمَّن يَدۡعُواْ مِن دُونِ

اللَّهِ ﴾، کێ گومڕاترە لە کەسێک کە لە جیاتی خوا لە کەسێک دەپاڕێتەوە کە تاکو ڕۆژی قیامەت وەڵامی ناداتەوە، ئەمە لێرەدا کە دەفەرموێ: هەتا ڕۆژی قیامەت، واتە: هەتا دنیا دنیایە، وەڵامی ناداتەوە، ڕۆژی قیامەتیش ئەوە نیە، وەڵامی بداتەوە، بەڵام یانی: ئەو بە تەمایە لە دنیادا لە فریای بێ، بەڵام تاکو دنیا بە کۆتا دێ، وەڵامی ناداتەوە، تاکو ڕۆژی قیامەت.

هەڵبەتـە کـە دەفەرمـوێ: ﴿ يَدْعُوا مِن دُونِ اللَّهِ مَن لَّا يَسْتَجِيبُ لَهُ إِلَىٰ يَوْمِ الْقِيَامَةِ ﴾، (مَنْ) بـۆ خـاوەن عەقـڵ و ئیدراکانـە، بـەڵام لێـرەدا خـوا ﷻ بەپێـی عەقڵـی هاوبـەش بـۆ خـوا دانـەرەکان، دواوە، کـە ئـەوان پێیـان وابـووە ئـەو بـت و صەنـەم و پەیکەرانە، جۆرێـک لـە عەقـڵ و هۆشـیان هەیـە، دوایـی دەفەرمـوێ:

٨)- ﴿ وَهُمْ عَن دُعَائِهِمْ غَافِلُونَ ﴾، [وێڕای ئەوەش] لە حاڵێکدا ئەوان لە پاڕانەوەی ئەوان بێئاگان، واتە: پەرستراوەکان لە پاڕانەوەی داواکارەکان، بتپەرستەکان بێئاگان، هەر ئاگاشیان لێ نیە، دیارە لەبەر ئەوەیە کە لێرەدا خوا ﷻ (**غافِلُون**)ی بۆ بەکارهێناون، چونکە لە ئایەتەکەی پێشێش دا (**مَنْ**)ی بۆ بەکارهێناون، کە بۆ خاوەن عەقڵانە.

کەواتـە: کـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَمَنْ أَضَلُّ مِمَّن يَدْعُوا مِن دُونِ اللَّهِ مَن لَّا يَسْتَجِيبُ لَهُ إِلَىٰ يَوْمِ الْقِيَامَةِ وَهُمْ عَن دُعَائِهِمْ غَافِلُونَ ﴾، واتـە: هیـچ کەسـێک گومڕاتـر نیـەو، حاڵەکـەشی سەرسـوڕهێنەرتر نیـە، لـە کەسـێک کـە لـە جیـاتی خـواو، جگـە لـە خـوا لـە کەسـێک و لـە شـتێک دەپاڕێتـەوە، کـە تاکـو ڕۆژی قیامـەت و ڕۆژی دوایـی وەڵامـی ناداتـەوە، تاکـو دنیـا دنیایـە، بەڵکـو هـەر لـە پاڕانەوەکەشـیان بێئـاگان.

٩)- ﴿ وَإِذَا حُشِرَ النَّاسُ كَانُوا لَهُمْ أَعْدَاءً ﴾، کاتێکیش خەڵک خڕ دەکرێنەوەو کۆدەکرێنەوە لە ڕۆژی دواییدا، لێشیان دەبنە دوژمن، واتە: پەرستراوەکان دەبنە دوژمنی پەرستەرەکان.

١٠)- ﴿ وَكَانُوا بِعِبَادَتِهِمْ كَافِرِينَ ﴾، نکووڵییش دەکەن لە پەرستنەکەیان، واتە: بێبڕوان بە پەرستنەکەیان، دەڵێن: ئێمە بڕوامان پێی نەبوو، نکووڵیی لێ دەکەن، کە نەدەبوو واتان کردبایە.

هەندێکیش گوتوویانە: ﴿وَإِذَا حُشِرَ ٱلنَّاسُ كَانُوا۟ لَهُمْ أَعْدَآءً﴾، ڕاناوەکەی دەچێتەوە بۆ پەرستەرەکان، واتە: ئەوانەی کە بتەکانیان پەرستوون و، پەرستراوەکانیان پەرستوون، دەبنە دوژمنی پەرستراوەکان، بەڵام زیاتر واپێدەچێ مەبەست ئەوە بێ کە پەرستراوەکان دەبنە دوژمنی پەرستەرەکان و لە پەرستنەکەشیان نکووڵیی دەکەن، ئەگەرنا دەشگونجێ بگوترێ: پەرستەرەکان نکووڵیی دەکەن لە پەرستنێ، کە پێشتر لە دنیادا بوویانە بۆ پەرستراوەکان.

کەواتە: لێرەدا ئەمە وەک زانایانی وتووێژ (**المُنَاظَرَة**)، دەڵێن: (**إِنْ كُنْتَ نَاقِلًا فَالصِّحَّة أَو مُدَّعِياً فَالدَّلِيْل**)، ئەگەر تۆ شتێک لە کتێبێکەوە نەقڵ دەکەی دەبێ سەنەدەکەی ڕاست بێ و، ئەگەر لاف لێدانێکیشت هەیە، دەبێ بەڵگە بێنیەوە، خوای پەروەردگار دەفەرموێ: فەرموون: ئەگەر نەقڵ دەکەن لە دینی خواو، بە ناوی دینی خواوە وا دەکەن، چونکە هاوبەش بۆ خوادانەرەکان ئیددیعای ئەوەیان دەکرد کە لەسەر ئایینی ئیبراهیمن، خوا ﷻ دەفەرموێ: کتێبێکم بۆ بێنن، کە لە پێش قورئاندا شتی وای گوتبێ، یاخود: ئەگەر دەتانەوێ بەڵگە بێننەوە، فەرموون زانیارییەکم بۆ بێنن، پاشماوەیەک لە زانست کە بەرهەمی عەقڵ بێ بۆم بێنن، کەواتە: لێرەدا خوا ﷻ بۆ پووچەڵکردنەوەی بیرۆکەی شیرک چەند شێوازێکی بەکارهێناون:

١)- کتێبێک لە پێش قورئاندا بێنن، کە شتی وای تێدابێ.

٢)- پاشماوەیەک لە زانست بێنن، کە بەرهەمی عەقڵ بێ.

٣)- ئێوە کە لە شتێک دەپاڕێنەوەو، لە کەسێک دەپاڕێنەوەو وەڵامتان ناداتەوە، تاکو دنیا دنیایە، تاکو قیامەت، هیچ کەس لە ئێوە گومڕاتر نیە.

٤)- ئەو پەرستراوانەی ئێوە لە پەرستنەکەی ئێوەو، لە داواکردنەکەی ئێوە بێئاگان.

٥)- کاتێکیش کە خەڵک کۆدەکرێتەوە لێتان دەبنە دوژمن.

٦)- نەک هەر لێتان دەبنە دوژمن، بەڵکو نکووڵییش دەکەن و، بێبەریش بەو پەرستنەی ئێوە کە پێشکەشی ئەوانتان کردوە.

## مەسەلەی سێیەم:

**تۆمەتبارکردنی بێبڕوایان بۆ قورئان بە جادوو و، بۆ موحەممەد ﷺ، بە قسە هەڵبەست بە ناوی خواوەو، بەرپەرچدانەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆیان (بە فێرکردنی خوا ﷻ) بە سێ بەڵگان:**

**١- ئەگەر قسە هەڵبەستێ بە ناوی خواوە، سزای دەدات.**

**٢- ئەو داهێنراوێک نیە، لە پێغەمبەراندا کە پێشینەی نەبێ.**

**٣)- شایەدێک لە گەلی جوولەکە، شایەدیی ڕاستگۆیی بۆ داوە.**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُنَا بَيِّنَٰتٍ قَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لِلْحَقِّ لَمَّا جَآءَهُمْ هَٰذَا سِحْرٌ مُّبِينٌ ﴿٧﴾ أَمْ يَقُولُونَ ٱفْتَرَىٰهُ ۖ قُلْ إِنِ ٱفْتَرَيْتُهُۥ فَلَا تَمْلِكُونَ لِى مِنَ ٱللَّهِ شَيْـًٔا ۖ هُوَ أَعْلَمُ بِمَا تُفِيضُونَ فِيهِ ۖ كَفَىٰ بِهِۦ شَهِيدًۢا بَيْنِى وَبَيْنَكُمْ ۖ وَهُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٨﴾ قُلْ مَا كُنتُ بِدْعًا مِّنَ ٱلرُّسُلِ وَمَآ أَدْرِى مَا يُفْعَلُ بِى وَلَا بِكُمْ ۖ إِنْ أَتَّبِعُ إِلَّا مَا يُوحَىٰٓ إِلَىَّ وَمَآ أَنَا۠ إِلَّا نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴿٩﴾ قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِن كَانَ مِنْ عِندِ ٱللَّهِ وَكَفَرْتُم بِهِۦ وَشَهِدَ شَاهِدٌ مِّنۢ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ عَلَىٰ مِثْلِهِۦ فَـَٔامَنَ وَٱسْتَكْبَرْتُمْ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٠﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە پازدە بڕگەدا:

١)- ﴿ وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُنَا بَيِّنَٰتٍ ﴾، واتە: [وێڕای ئەوە کە ڕابرد و حاڵیان وایە]، کاتێکیش ئایەتە ڕۆشنەکانی ئێمەیان بەسەردا دەخوێنرێنەوە، ئەمەش خستنەڕووی گومڕاییەکی دیکەیانە، وێڕای گومڕاییەکانی پێشێ و، گواستنەوەیە بۆ ڕوونکردنەوەی گومڕاییەکی دیکەو، سەرگەردانیی و سەر لێشێواوییەکی دیکەیان، وێڕای ئەوانەی پێشێ باسکران، کە بریتیە: لەوەی کاتێک ئایەتە ڕۆشنەکانی ئێمەیان بەسەردا بخوێنرێنەوە:

٢)- ﴿ قَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لِلْحَقِّ لَمَّا جَآءَهُمْ هَٰذَا سِحْرٌ مُّبِينٌ ﴾، ئەوانەی بێبڕوان بە هەقێک کە بۆیان هات دەڵێن: ئەمە جادوویەکی ئاشکرایە.

﴿ قَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لِلۡحَقِّ لَمَّا جَآءَهُمۡ ﴾، خـوا ﷻ دەیتـوانی بفەرمـوێ: (قَالُـوا) گوتیـان: بـەڵام بـۆ ئـەوەی دەرکـەوێ، کـە ئـەوە بێبڕواییەکەیانـە، ئـەو جـۆرە قسـانەیان پێـدەکات.

هەروەهـا کـە دەفەرمـوێ: ﴿ لِلۡحَقِّ لَمَّا جَآءَهُمۡ ﴾، خـوا ﷻ دەیتـوانی بفەرمـوێ: (وَإِذَا تُتْلَى عَلَيْهِـمْ آيَاتُنَـا بَيِّنَـاتٍ قَالُـوا لَهَـا، أو قَالُـوا للقُـرآنِ)، بـەڵام بۆیـە دەفەرمـوێ: ﴿ لِلۡحَقِّ لَمَّا جَآءَهُمۡ ﴾، واتـە: ئـەو ئایەتـە موبارەکانـەی کـە بەسـەریاندا دەخوێنرێنـەوە، هەقـن، کەچـی بـەو هەقەیـان گـوت: کـە بۆیـان هـات، ﴿ لِلۡحَقِّ لَمَّا جَآءَهُمۡ ﴾، (لَـمَّا) واتـە: هـەر لەگـەڵ هەقەکەیـان بـۆ هـات، گوتیـان: ﴿ هَٰذَا سِحۡرٞ مُّبِينٌ ﴾، ئەمـە جادوویەکی ئاشـکرایە، کـە دەفەرمـوێ: (لِلْحَـقِّ) ئـەم (ل): (لَامُ العِلَّـةِ وَلَيْسَـتْ لَامُ التَّعَدِيَـة)، بـە هەقیـان گـوت، لەبـەر خاتـری هـەق وایـان گـوت، وشـەی (حَقّ)یـش دیـارە مەبەسـت پێـی ئایەتەکانـن، بـەڵام خـوا ﷻ بـە هـەق تەعبیـری لێکـردوون، واتـە: ئـەو ئایەتانـە هەقـن و چەسـپاون و ڕاسـتن، کـە دەفەرمـوێ: ﴿ لَمَّا جَآءَهُمۡ ﴾، ئەمـە بـۆ دیارییکـردنی کاتی قسـەکەیانە، واتـە: هـەر لەگـەڵ هەقەکەیـان بـۆ هـات و ئایەتەکانیـان بەسـەردا خوێنرانـەوە، بەبـێ سـێ و دوو، بەبـێ تێفکریـن و تێوەڕامـان، یەکسـەر گوتیـان: ﴿ هَٰذَا سِحۡرٞ مُّبِينٌ ﴾، ئەمـە جادوویەکـی ڕوون و ئاشـکرایە، بێگومـان لێـرەدا (مُبِيْن) لـە (أَبَـانَ)ی (لَازِم)ەوە هاتـوە، (أَبَـان) یـانی: (ظَهَـر) دەرکـەوت، ئەمـە جادوویەکـی ڕوون و ئاشـکراو بـێ پێـچ و پەنایـە.

ئنجـا ئـەوە یەکـێ لـە قسـەکانیان، بـە نسـبەت قوڕئانـەوە ئـەوە هەڵوێسـتیان بـوو، ئـەدی بـە نسـبەت پێغەمبـەرەوە ﷺ بابزانیـن هەڵوێسـتیان چـۆن بوو؟.

٣)- ﴿ أَمۡ يَقُولُونَ ٱفۡتَرَىٰهُ ﴾، یان ئایا دەڵێن: هەڵیبەستوە؟ واتە: موحەممەد ﷺ قوڕئانی هەڵبەستوە، دیارە پرسیارکردنەکە بۆ نکووڵییلێکردنە، شوێنی نکووڵییلێکردنەکەش بریتیە: لە هۆکاری نکووڵییلێکردنەکە، واتە: ئەوە کە قوڕئان هەڵبەستراو بێ، نەک مەبەست ئەوە بێ کە وایان گوتوە، بەڵکو مەبەست ئەوەیە: بە هۆی ئەوەوە ئەو قسەیان کردوە، کە گوایە قوڕئان پێغەمبەر ﷺ هەڵیبەستوە!.

٤)- ﴿ قُلْ إِنِ ٱفْتَرَيْتُهُۥ فَلَا تَمْلِكُونَ لِى مِنَ ٱللَّهِ شَيْـًٔا ﴾، بڵێ: ئەگەر من هەڵمبەستبێ، ئێوە لە لایەن خواوە هیچ سوودێک بە من ناگەیەنن، واتە: لە بەرانبەر خوادا کە خوا ﷻ بیەوێ سزام بدات، هیچ سوودێکم پێ ناگەیەنن و ناتوانن هیچ بەرگرییەکم لێ بکەن، چونکە بێگومان خوا ﷻ چاوپۆشیی لەوە ناکات کەسێک بە ناوی ئەوەوە قسە بکات، هەر کەس بە ناوی دینی ئەوەوە بە ناهەق قسە بکات، سزای دەدات، کە دەفەرموێ: ﴿ فَلَا تَمْلِكُونَ لِى مِنَ ٱللَّهِ شَيْـًٔا ﴾، (شَيْئاً: مَفْعُولٌ لـتَمْلِكُونَ)، (شيئاً) بەرکاری (تملكون)یە، یانی: ئێوە هیچ شتێکتان بۆ من لە دەست نایەت لە بەرپەرچدانەوەی سزای خوا، ئەوەی سزام بدات لەسەر ئەوەی قسە بە ناوی ئەوەوە دەکەم و، قسەم هەڵبەستوە، بە ناوی دینی خواوە.

٥)- ﴿ هُوَ أَعْلَمُ بِمَا تُفِيضُونَ فِيهِ ﴾، ئەو زاناترە بەوەی ئێوە دەڕژێنە نێوی و، ئێوە بە نێوی دەکەون، (الإِفَاضَة: الإنْدِفَاعُ بِشِدَّةٍ، فَاضَ الإِنَاءُ: سَالَ مِنْهُ، وَأَفَاضَ الإِنَاءَ: أَسَالَهُ)، پێشتر لە شیکردنەوەی وشەکاندا، باسمان کرد (تُفِيضُونَ فِيهِ)، واتە: بە توندیی بە نێوی دەکەون و، دەڕژێنە نێوی، دەگوترێ: (فَاضَ الإِنَاءُ)، یانی: قاپەکە ئاوی لێ ڕژا، ئەگەر بگوترێ: (أَفَاضَ الإِنَاءَ) واتە: قاپەکەی هێندە پڕ کرد، ئاوی لێ ڕژا، لێرەدا حاڵی کافرەکان وێنا کراوە وەک کەسێک کە دەڕژێتە باتڵاغێکەوەو بە نێو ئاوێک دەکەوێ، واتە: ئێوەش ئەو درۆو دەلەسەو قسەو پڕوپاگەندانەی دەیانکەن، وەک باتڵاغێک و ئاوێک وایە، کە دەڕژێنە نێوی و، بە پێ خواسیی بە نێوی دەکەون و، خۆتانی پێدا دەدەن، بەڵام خوا ﷻ زاناترە بەوەی دەڕژێنە نێوی، واتە: ئەوەی ئێوە باسی دەکەن، خوا ﷻ پێی زاناترەو، ئەگەر گریمان وابووایە، بە دڵنیایی خوا ﷻ لە منی قبووڵ نە دەکردو، ئەو کاتەش سزای دەدام و هیچیشتان بۆ من پێ نەدەکرا.

٦)- ﴿ كَفَىٰ بِهِۦ شَهِيدًۢا بَيْنِى وَبَيْنَكُمْ ﴾، بەسە ئەو (خوا) شایەد بێ لە نێوان من و ئێوەدا، (شَهِيْد) بە مانای گەواهییدەر (شاهد)ەو، کەسێکە هەواڵ دەدات، لە بارەی واقیعێکەوە.

٧)- ﴿ وَهُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴾، ئەو (خوا ﷻ)یش لێبوردەی میهرەبان و بە بەزەییە، ئەمە هەم تەماع وەبەرنانە بۆ وان، کە وازبێنن و دەست هەڵبگرن لە کوفرو شیرک،

هەم دڵخۆشکردنی پێغەمبەری خاتەمە ﷺ، کە ئەوان هەرچەندە ئەو تۆمەتانەت بۆ هەڵدەبەستن، بەڵام نەخێر خوا لێبوردەیە لەگەڵ تۆ و بە بەزەییە، کەواتە: مانایەکەی ئاوای لێ دێتەوە: ﴿ قُلْ إِنِ ٱفْتَرَيْتُهُۥ فَلَا تَمْلِكُونَ لِى مِنَ ٱللَّهِ شَيْـًٔا ﴾، (أي: إِنِ افْتَرَيْتُهُ عَاقِبَنِي هُو عِقَابَاً، لَا تَمْلِكُونَ رَدَّهُ وَدَفْعَهُ عَنِّي، إذِ هَو لَا يُقِرُّ أَحَدَاً أنْ يُبَلِّغَ عَنْه، مَا لَمْ يَأمُرُهُ بِتَبْلِيغِه)، واتە: ئەگەر من قسەم بە ناوی خواوە ﷻ هەڵبەستبایە، خوا سزای دەدام، سزایەک کە ئێوە نەتاندەتوانی لە منی دووربخەنەوە، چونکە خوا ﷻ کەسێک شتێک ناوی ئەوەوە، بڵێ: کە فەرمانی پێنەکردوە، لێی بێ دەنگ نابێ و، لەسەر ئەوە نایچەسپێنێ، بەڵکو بەرپەرچی دەداتەوە، وەک لە سوورەتی (الحاقة)دا، دەفەرموێ: ﴿ وَلَوْ تَقَوَّلَ عَلَيْنَا بَعْضَ ٱلْأَقَاوِيلِ ﴿٤٤﴾ لَأَخَذْنَا مِنْهُ بِٱلْيَمِينِ ﴿٤٥﴾ ثُمَّ لَقَطَعْنَا مِنْهُ ٱلْوَتِينَ ﴿٤٦﴾ فَمَا مِنكُم مِّنْ أَحَدٍ عَنْهُ حَٰجِزِينَ ﴿٤٧﴾ ﴾، واتە: ئەگەر هەندێک قسەی بەدەمەوە هەڵبەستباین، ئێمە لای ڕاستیمان دەگرت، (قۆڵی ڕاستی، چونکە بە زۆریی وایە مرۆڤ بە دەستی ڕاستی بەرگریی لە خۆی دەکات)، دوایی ڕەگی ملیمان دەپەڕاند، ئنجا هیچ کام لە ئێوەش نەیدەتوانی بێتە پێشمان و، ببێتە پەردەو نێوان و، بەرگریی لێ بکەن.

لێرەدا (**محمد الطاهر بن عاشور**) قسەیەکی جوان دەکات دەڵێ: (**وَحِكْمَةُ عِقَابِ اللهِ لِمَنْ افْتَرَى عَلَيْهِ الكَذِبَ، بِخِلَافِ بَقِيَّةِ المَعَاصِي أَنَّ هَذَا يُفْضِي إلى اخْتِلَالٍ عَظِيْمٍ بِدُونِ أنْ يَشْعُرَ بِه النَّاسُ، فَيَتَصَدّوا لَهُ كَبَقِيَّةِ الذُّنُوبِ وَالمَعَاصِي**)[1].

واتە: حیکمەتی ئەوە کە خوا ﷻ ئەگەر کەسێک بە ناوی ئەوەوە قسە هەڵبەستێ و درۆ بکات، سزای دەدات لە دنیادا، جگە لە هەموو گوناهەکانی دیکە، {کە سزایەکانیان هەڵدەگرێ بۆ قیامەت}، لەبەر ئەوەیە کە درۆ هەڵبەستن بە ناوی خواوە، دەبێتە هۆی تێکچوونێکی مەزن، بێ ئەوەی خەڵک هەستی پێ بکات و، بیانەوێ بەرپەرچی بدەنەوە، وەک گوناهو تاوانەکانی دیکە کە خەڵک لێیان بێ دەنگ نابێ.

---

(١) التحرير والتنوير: ج٢٦، ص١٥.

چونکە کەسێ بە ناوی خواوە قسە بکات، ڕەنگە لەبەر ڕێزو حورمەتی خواو بە مەزنگرتنی خوا ﷻ، بڕوای پێ بکەن و، ڕاستیش ناکات، کەواتە: سەریان لێ تێکدەچێ، هەروەک بە داخەوە زۆر جاران لە بەرگی دیندا، دنیا خوراوەو خراپە کراوەو، خەڵک سەری لێ شێواوە، بۆیە کەسێک بە ناوی خواوەو ﷻ خۆی بکات بە وەکیلی خوا، شتێک بڵێ، خوا لێی قبووڵ ناکات، بۆیەش هەموو ئەوانەی بە درۆ لافی پێغەمبەرایەتییان لێ داوە، وەک (**مسيلمة الكذاب**) و (**الأسود العنسي**) و (**سجاح اليمامة**) و زۆری دیکە، بە درێژایی مێژوو، هەموویان خوا ﷻ ڕیسواو زەبوونی کردوون و، بە زۆریی هەر لە دنیاشدا، لە بەین چوون و کوژراون و سزادراون.

ئنجا خوا ﷻ شتێکی دیکە بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەفەرموێ:

٨)- ﴿قُلْ مَا كُنتُ بِدْعًا مِّنَ الرُّسُلِ﴾، [هەر بۆ بەرپەرچدانەوەی نکووڵییکردنیان پێغەمبەرایەتیی موحەممەد ﷺ دەفەرموێ:] پێیان بڵێ: من تازە پەیدابوویەک نیم لە پێغەمبەران، (**بِدْع: أي مُبْتَدَع أو بَدِيْع**)، (**مُبْتَدَع**) واتە: داهێنراو، (**بَدِيْع**) واتە: شتێکی ناوازە پەیداکراو، (**وَالبِدْعُ فِي كُلِّ شَيءٍ الأَوَّلُ، أَي: مَا أَنَا بِأوَّلِ رَسُولٍ**)، واتە: یەکەمین پێغەمبەر نیم و، یەکەمین کەس نیم خوا ﷻ ڕەوانی کردبم، من داهێنراوو پەیداکراوێک نیم، نامۆ بم، بەڵکو لە پێش مندا پێغەمبەرانی دیکە هاتوون و ڕابردوون.

٩)- ﴿وَمَا أَدْرِي مَا يُفْعَلُ بِي وَلَا بِكُمْ﴾، ناشزانم چی بە من دەکرێ و، چی بە ئێوەش دەکرێ! لێرەدا زانایان زۆر مشت و مڕیان کردوە، کە تۆزێکی دیکە ئاماژەی پێ دەدەم، بەڵام پێموایە ئەگەر هەر تەماشای ڕاستە مانای ئایەتەکەیان کرد بایە، پێویستیی نەدەکرد زۆر بەملاولادا بچن، کە هەندێکیان گوتوویانە: ئەم ئایەتە، نەسخ کراوەتەوە، بە ئایەتێکی دیکە لە سووڕەتی (**الفتح**)دا، وەک باسی دەکەین!.

ڕاستە مانای ئایەتەکە ئاوایە: من نازانم چی بە منیش و بە ئێوەش دەکرێ، واتە: نازانم سەرەنجامی دنیای من و سەرەنجامی دنیای ئێوەش چۆن دەبێ،

ئیدی باسی قیامەت نیە، کە بڵێ: من نازانم دەچمە کوێ لە قیامەتدا، خۆیشم چیم لێ دەکرێ و ئێوەش چیتان لێ دەکرێ! وای نەفەرموە، چونکە ئەوەی ئەوان بڕوایان پێی هەبووە، بەس دنیا بووەو ئەوەندە بڕوایان بە قیامەت نەبووە، تاکو پێغەمبەر ﷺ بفەرموێ: لە قیامەتێ منیش نازانم چیم لێ دێ و، ئێوەش چیتان لێ دێ!.

**(الحمدالله)** هەندێک تێگەیشتنم بۆ دێ، لەمیانی تەفسیرکردنەکەدا، ئێستا ئەوەم بۆ هات کە لێرەدا پێغەمبەر ﷺ بەپێی عەقڵی ئەوان قسە دەکات و، ئەوان تەنیا بڕوایان بە دنیا هەبووە، کە ئایا ئەوانیش لە دنیادا چییان لێ دێ و، پێغەمبەریش ﷺ چی لێ دێ؟ ئنجا ئەویش لەو بارەوەو لەو چوارچێوەیەدا قسەیان بۆ دەکات، واتە: نازانم، منیش چیم پێ دەکرێ و ئێوەش چیتان پێدەکرێ؟ ئایا من فەرمانم پێ دەکرێ لە نێوتاندا بمێنمەوە؟ یان کۆچ بکەم؟ ئایا خوا ﷻ بە دەستی ئێوە دەمفەوتێنێ، وەک هەندێ لە پێغەمبەران، یان نا؟ هەروەها نازانم ئێوەش خوای پەروەردگار چیتان لێ دەکات، هیدایەتتان دەدات، دوایی دێنە سەر ڕاستە شەقامی خوا، یاخود سزاتان دەداو، چۆنتان سزا دەدات؟ وەک گەلی عاد، گەلی سەموود، گەلی لووط، گەلی نووح، نازانم چۆنتان سزا دەدات و، چیتان لێ دەکات! ئەمە ئەو مانایەیەتی کە ڕێک دێتە زەینەوە.

١٠)- ﴿إِنْ أَتَّبِعُ إِلَّا مَا يُوحَىٰٓ إِلَيَّ﴾، من تەنیا شوێن ئەوە دەکەوم، کە بۆم سروش دەکرێ، من چیم پێ بگوترێ لە لایەن خواوەو، بۆم بنێردرێ، شوێن ئەوە دەکەوم.

وەک پێشتریش گوتمان: لە بارەی ئەم ئایەتەوە زانایان مشتومڕیان بووە، بۆ وێنە:

أ- هەندێکیان گوتوویانە: ئەم ئایەتە باسی قیامەت دەکات و، ئەو کاتە پێغەمبەر ﷺ نەیزانیوە لە قیامەتێ چارەنووسی خۆشی و، چارەنووسی خەڵکەکەش چی دەبێ، ئنجا ئەو کاتە کە لێی دیار نەبووە، خوای پەروەردگار لەسەر زمانی ئەو ئاوای فەرمووە: بڵێ: نازانم منیش چیم پێ دەکرێ (لە قیامەتدا)و ئێوەش چیتان پێ دەکرێ!

ئنجا گوتوویانـە: دوایـی کـە لـە سـوورەتی (**الفتـح**)دا، خـوا ﷻ ئـەو ئایەتـەی نـاردە خـوار: ﴿ لِّيَغْفِرَ لَكَ ٱللَّهُ مَا تَقَدَّمَ مِن ذَنۢبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ وَيُتِمَّ نِعْمَتَهُۥ عَلَيْكَ وَيَهْدِيَكَ صِرَٰطًا مُّسْتَقِيمًا ۝٢ ﴾، واتـە: بـۆ ئـەوەی خـوا ﷻ لـەو گوناهـەت کـە تێپەڕیـوەو ئـەوەش کـە دادێ، لـە هەمـوو گوناهەکانـت بتبـوورێ و بتبەخشـێ و، چاکـەی خـۆی لەسـەر تـۆ تـەواو بـکات و، بتخاتـە سـەر ڕاسـتە ڕێ، گوتوویانـە: ئـەم ئایەتـەی سـوورەتی (**الفتـح**) ئـەم ئایەتـەی ئێـرەی نەسـخ کردۆتـەوە!

بەڵام لە ڕاستییدا ئەو قسەیە، هیچ پاساوێکی نیەو وەک باسمان کرد.

**ب**- (حەسەنی بەصرایی) ڕەحمەتی خوای لێ بێ، قسەیەکی جوان دەکات دەڵێ: (**مَا أَدْرِي مَا يَصِيْرُ إِلَيْهِ أَمْرِي وَأَمرِكُم فِي الدُّنْيَا**)، واتە: من نازانم کاری من و کاری ئێوە لە دنیادا بە کوێ دەگات؟ پێغەمبەر ﷺ، ئەوەی خوا لێی ئاگادار نەکردبێتەوە،

**ج**- نەیزانیوە، (**إبن عجيبة**)ش لە تەفسیرە ناودارەکەی خۆیدا[1] دەڵێ: (**الأَوْفَقُ أَنَّ (مَا) فِي: ﴿ وَمَآ أَدْرِى مَا يُفْعَلُ بِى وَلَا بِكُمْ ﴾، عِبَارَةٌ عَمَّا عِلْمُهُ لَيْسَ مِنْ وَظَائِف النُّبُوَّة، بل هو مِنَ الحَوَادِثِ وَالوَاقِعَاتِ الدُّنيَوِيَّةِ، دُونَ مَا يَقَعُ فِي الآخِرَة، فَإِنَّ العِلْمَ بِذَلكَ مِنْ وَظَائِفِ النُّبُوَّة، وَقَدِ وَرِدَ بِهِ الوَحِيُ النَّاطِقُ بِتَفَاصِيلِ مَا يُفْعَلُ بِالْجَانِبَيْنِ**).

واتـە: گونجاوتـر وایـە کـە وشـەی (**مـا**) لـە: ﴿ وَمَآ أَدْرِى مَا يُفْعَلُ بِى وَلَا بِكُمْ ﴾دا، مەبەسـت پێـی ئەوەیـە کـە زانینەکـەی لـە ئەرکـەکانی پێغەمبەرایەتیـی نیـە، بەڵکـو ڕووداوەکانی کـە لـە دنیـادا ڕوو دەدەن، مەبەسـت پێـی ئەوەیـە، نـەک ئـەوەی لـە ڕۆژی دوایيـدا ڕوو دەدات، چونکـە ئـەوەی لـە ڕۆژی دوایيـدا ڕوو دەدات، لـە ئەرکـی پێغەمبەراتییـەو، وەحییـش زۆر بـە وردیـی و بـە ڕوونیـی باسـیکردوە، کـە هـەر کام لـە دوو لایـە چییـان پـێ دەکـرێ و چییـان لـێ دەکـرێ!

کـە پێغەمبـەر ﷺو شـوێنکەوتووانی باشـترین پاداشـتیان هەیـەو، ناحـەزو نەیارەکانیـشی سـەختترین سـزایان هەیـە، کەواتـە: مەبەسـت پێـی ژیـانی دنیایـەو،

---

(١) البحر المديد في تفسير كتاب الله المجيد: ج٧، ص٨٤.

وەک گوتم، بەس سەرنجدانی ئایەتەکەو سەرنجدانی ڕەوت و سەرنجدانی کەش و هەوایەکە، ئەو مانایە بەدەستەوە دەدات.

١١)- ﴿وَمَآ أَنَا۠ إِلَّا نَذِيرٌ مُّبِينٌ﴾، من تەنیا وشیار کەرەوەو ترسێنەرێکی ڕوونکەرەوەم، یاخود: ڕوون و ئاشکرام، ئەوانە دیارە داواکارییان لە پێغەمبەر ﷺ هەبووە، کە ئەوەیان بۆ بکات و ئەوەیان بۆ بکات و فڵان موعجیزەیان بۆ بێنێ، دوایی خوا ﷻ بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەفەرموێ: پرسیارێکی دیکەیان لێ بکە:

١٢)- ﴿قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِن كَانَ مِنْ عِندِ ٱللَّهِ وَكَفَرْتُم بِهِۦ﴾، بڵێ: هەواڵم پێ بدەن، یاخود: ئایا دەبینن، دەزانن، ئەگەر ئەو (قورئان)ە، لە لایەن خواوە بوو، ئێوەش پێی بێبڕوا بوون، (كَانَ) ڕاناوەکەی کە تێیدا شێردراوەیەو دەچێتەوە بۆ قورئان، واتە: ئەگەر ئەو قورئانە لە لایەن خواوە بوو.

﴿وَكَفَرْتُم بِهِۦ﴾، ئێوەش پێی بێبڕوابوون، لێرەدا وەڵامی مەرجەکە، چونکە (إنْ) (**شَرْطِية**)یە، وەڵامەکەی قرتێنراوەو، ئەویش دوو ئەگەری هەن:

**یەکەم:** دەگونجێ وەڵامەکەی ئەوە بێ: (**مَنْ أضَلُّ مِنْكُم**) کێ لە ئێوە گومڕاترە، بڵێ: ئایا دەبینن، ئەگەر ئەم قورئانە لەلایەن خواوە بێ و ئێوەش پێی بێبڕابوون، کێ لە ئێوە گومڕاترە؟

**دووەم:** وەڵامەکەی ئەوەیە: (**أَلَسْتُم ظَالِمِيْن**) ئایا ئێوە ستەمکارنین، چونکە هەر کام لەو دوو تەعبیرە، پێشتر هاتوون، هی یەکەمیان کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَمَنْ أَضَلُّ مِمَّن يَدْعُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَن لَّا يَسْتَجِيبُ لَهُۥٓ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ وَهُمْ عَن دُعَآئِهِمْ غَٰفِلُونَ ۝٥﴾، هی دووەمیش ئەوەیە کە خوا ﷻ باسی ستەمی ئەوانی کردوە، کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ۝١٠﴾، واتە: بە دڵنیایی خوا کۆمەڵی ستەمکاران، ڕاستە ڕێ ناکات، کەواتە: ئایا ئەگەر ئەم قورئانە لە لایەن خواوە بێ، ئێوەش پێی بێبڕوابوون، ئایا گومڕاو ستەمکارنین؟ بێگومان با، چونکە پرسیارکردنەکە، پرسیارکردنی نکووڵیلێکەرانەیە، بەڵام وەڵامی (**إنْ الشَّرْطِيَّة**)یە، قرتێنراوە، لەبەر ئەوەی بە سەلیقە دەزانرێ، کە دەفەرموێ:

﴿ وَكَفَرْتُم بِهِۦ ﴾، لێرەدا (و): (فِي مَوْضِعِ الحَالِ مِنْ ضَمِيْرِ أرَأَيْتُم)، (و) لەشوێنی حاڵ دایە لە ڕاناوی ئایا دەبینین! واتە: بڵێ: ئایا دەبینن ئەگەر (قورئان) لە لایەن خواوە بێ، لە حاڵێکدا کە ئێوە پێی بێبڕوابوون!

١٣)- ﴿ وَشَهِدَ شَاهِدٌ مِّنۢ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ عَلَىٰ مِثْلِهِۦ ﴾، شایەدێکیش شایەدیی دا، لە وەچەی ئیسرائیل (لە نەوەکانی یەعقووب عليه السلام) لەسەر وێنەی ئەوە، کە مەبەست پێی تەوراتە.

١٤)- ﴿ فَـَٔامَنَ وَٱسْتَكْبَرْتُمْ ﴾، ئنجا ئەو بڕوای هێناو ئێوەش خۆتان بەزلگرت، ئەگەر وابوو، بێگومان هیچ کەس لە ئێوە گومڕاتر نیە، یاخود: ئێوە زۆر ستەمکارن.

١٥)- ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾، بە دڵنیایی خوا کۆمەڵی ستەمکاران، ڕاستە ڕێ ناکات و، بە ئامانجیان ناگەیەنێ.

کە دەفەرموێ: ﴿ وَشَهِدَ شَاهِدٌ مِّنۢ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ عَلَىٰ مِثْلِهِۦ ﴾، (عَلَى مِثْلِهِ) لەسەر وێنەی ئەوە شایەدییدا، کە لە هۆی هاتنە خوارەوەکەیدا باسمانکرد، مەبەست لە شایەدێک (شاهد) (عبدالله بن سلام)ە، کە بڕوای بە تەورات بووەو، تەوراتیش وێنەی قورئانە، لەو ڕووەوە کە فەرمایشتی خوایە، یاخود مەبەست پێی زەبوورە، یان مەبەست پێی ئینجیلە، کە دیارە بە نسبەت عەبدوڵڵای کوڕی سەلامەوە (خوا لێی ڕازی بێ)، دەگونجێ لەو جوولەکانە بوو بێ، کە بڕوایان بە عیساش عليه السلام بووە، چونکە هەندێک لە بەنوو ئیسرائیل بڕوایان بە عیساش عليه السلام هەبووە، یاخود بە لای کەمەوە بڕوایان بە تەورات و بە زەبوور هەر هەبووە.

یاخود (عَلَى مِثْلِهِ) مەبەست پێی قورئانە، بەڵام وەک دەگوترێ: (مِثْلُكَ لَا يَبْخلُ، مِثْلُكَ لَا يَكْذِب)، وێنەی تۆ چرووکیی ناکات، وێنەی تۆ درۆ ناکات، واتە: وێنەکەشت چرووکیی و درۆ ناکات، چ جای خۆت! واتە: شایەدێک شایەدییدا لە بەنوو ئیسرائیل لەسەر قورئان کە ڕاستەو هەقە، ئنجا ئەو بڕوای هێناو، ئێوەش خۆتان بەزلگرت، بە دڵنیایی خوا کۆمەڵی ستەمکاران، ڕاستە ڕێ ناکات.

کـە دەفەرمـویّ: ﴿ وَشَهِدَ شَاهِدٌ ﴾، زۆربـەی هـەرە زۆری تەفسـیرەکان، دەڵێـن: مەبەسـت پێـی عەبدوڵـڵای کـوڕی سـەلامە، کـە لـەو بارەوەشـەوە لـە هـۆی هاتنـە خوارەوەکـەی دا، ڕیوایەتێکـمان هێنـا، کـە سـەعدی کـوڕی ئـەبی وەققـاص، گوتوویـەتی: هیـچ کەسـێکم نەبینیـوە لەسـەر زەوی بـڕوا، پێغەمبـەر ﷺ شـایەدیی بەهەشتی بـۆ بـدات، جگـە لـە لـە عەبدوڵـڵای کـوڕی سـەلام، کـە مسـوڵمان بـووەو، ئـەم ئایەتـەش لـە بـارەی ئـەوەوە هاتۆتـە خـوار، هەروەهـا ڕیوایەتێکـی دیکەشـمان هێنـا کـە: (**أحمـد و الطبري و وابـن حبـان و والطـبراني والحاكـم والسـيوطي**) هێناویانـەو، هـەردوو نووسـەری (**الإسـتيعاب في بيـان الأسـباب**)[1] هێناویانـەو گوتوویانـە: (**هـذا سـند صحيـح ورجالـه ثقـات**) ئەمـە سـەنەدێکی ڕاسـتەو پیاوەکانیـشی متمانـە پێکـراون، بـەڵام ڕایەکـی دیکـە هەیـە، دەڵـێ: کـە دەفەرمـویّ: ﴿ وَشَهِدَ شَاهِدٌ مِّنۢ بَنِىٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ عَلَىٰ مِثۡلِهِۦ ﴾، مـەرج نیـە مەبەسـت پێـی کەسـێکی دیارییکـراو بـێ، وەک عەبدوڵـڵای کـوڕی سـەلام، کـە بێگومـان بـەس ئـەو مسـوڵمان نەبـووەو، هـی دیکـەش هەبـوون مسـوڵمان بـوون، لـە زانایـانی جوولەکـەو، نەصرانیـی، بەڵکـو مەبەسـت پێـی هـەر شـایەدێکە شـایەدیی بـدات، لـە بەنـوو ئیسـڕائیل، چ عەبدوڵـڵای کـوڕی سـەلام و، چ جگـە لـە ئەویـش لـە جوولەکـەکان کـە دوایـی مسـوڵمان بـوون.

واتـە: شـایەدییدانی زانایـانی جوولەکـە لەسـەر ڕاسـتیی قوڕئـان، بەڵگەیەکـی بەهێزە بـۆ دەمکـوت کـردنی ئەوانـەی بـڕوا بـە قوڕئـان ناهێنـن، لەوانـەی شـارەزای کتێبـەکانی خـوا نیـن، وەک کافـرەکانی ڕۆژگاری پێغەمبـەرو ﷺ هاوبـەش بـۆ خوادانـەرەکان کـە نەشـارەزا بـوون، لـە کتێبـە ئاسـمانییەکان، ئـەوەش یەکێکـە لـە دوو مانایەکـەی (**أمیـن**): (**هُـوَ الَّـذِي بَعَـثَ فِي الْأُمِّيـينَ رَسُـولًا مِنْهُـمْ**)، (**أمیـن**): دوو واتـای هـەن:

**أ**- نە شارەزایان لە کتێبەکانی خوا.

**ب**- نە شارەزایان بە خوێندن و نووسین، ئنجا بە هەردوو واتایەکە، کۆمەڵگای ئەوسای پێغەمبەر ﷺ بە گشتیی، (**أمیین**) بوون و هەم لە کتێبە ئاسمانییەکان و هەم لە خوێندن

---

(١) ج ٣/ ص ٢٠٥، ٢٠٦

و نووسین نە شارەزا بوون، بەڵام زیاتر پێم وایە مەبەست پێی نەشارەزا لە کتێبە ئاسمانییەکانە، بۆ ئەوانێک کە نەشارەزا بوون لە کتێبە ئاسمانییەکان، وەختێک شارەزایەکی کتێبە ئاسمانییەکان شایەدیی دەدات لەسەر قورئان و بڕوای پێ دێنێ، زیاتر سەغڵەت دەبن و، زیاتر دەچنە ژێر نیشانەی پرسیارەوە، کە ئەو بەو هەموو شارەزاییی خۆیەوەو، بەوەوە کە عەقیدەی بووە بەو کتێبە پێشووە، کەچی ئێستا دەست لەو هەڵدەگرێ و، بڕوا بەو کتێبەی دیکەی خوای پەروەردگار دێنێ، لەبەر ئەوەی کتێبەکەی خۆی لادان و گۆڕانی تێدا کراوە، هەروەها چونکە بۆ کاتێکی دیاریکراو و بۆ کۆمەڵگایەکی دیاریکراو، نێردراوە، بەڵام ئەو کتێبە دەستی لێ نەدراوەو دەستی لێ نادرێ، بۆ ئێستاو بۆ دوای ئێستا، تاکو دنیا بە کۆتا دێ، دابەزێنراوە، بۆیە بڕوا بەوە دێنێ، کەچی ئێوە لە نەزانیی خۆتاندا دەمێننەوە، بێ ئەوەی شارەزایی کتێبە ئاسمانییەکانیش بن، هەر ئەوەشە کە وەک لە تەفسیرەکاندا هاتوە، هەندێک لە زانایانی جوولەکەی پاڵ پێوەناوە نکووڵیی بکەن، لەوە کە خوا هیچ کتێبێکی دابەزاند بێ، وەک خوا ﷻ لە سوورەتی (الأنعام)دا، کە کاتی خۆی تەفسیرمان کردوە، دەفەرموێ: ﴿وَمَا قَدَرُوا اللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِ إِذْ قَالُوا مَا أَنزَلَ اللَّهُ عَلَىٰ بَشَرٍ مِّن شَيْءٍ ۗ قُلْ مَنْ أَنزَلَ الْكِتَابَ الَّذِي جَاءَ بِهِ مُوسَىٰ نُورًا وَهُدًى لِّلنَّاسِ ۖ تَجْعَلُونَهُ قَرَاطِيسَ تُبْدُونَهَا وَتُخْفُونَ كَثِيرًا ۖ وَعُلِّمْتُم مَّا لَمْ تَعْلَمُوا أَنتُمْ وَلَا آبَاؤُكُمْ ۖ قُلِ اللَّهُ ۖ ثُمَّ ذَرْهُمْ فِي خَوْضِهِمْ يَلْعَبُونَ ﴿٩١﴾﴾ الأنعام، واتە: وەک پێویست ڕێزی خوایان نەگرتوە (و پێگەی بێ وێنەی خوایان دەرک نەکرد)، کە گوتیان: خوا هیچ شتێکی دانەبەزاندوە، پێیان بڵێ: ئەدی کێ ئەو کتێبەی دابەزاند کە مووسا ﷺ هێنای، ڕووناکیی و ڕێنمایی بوو بۆ خەڵک، دەتانکردە بەش بەش، لە لاپەڕانداو، (لە نامیلکاندا، دەتاننووسییەوە و)، هەندێکتان دەردەخست، زۆریشتان پەنهان دەکرد و، خۆتان و باب و باپیرانتان فێری ئەوەکران کە نەتاندەزانی، بڵێ: خوا (ئەو کتێبەی دابەزاندوە، وەک چۆن کتێبەکەی بۆ مووسا ﷺ دابەزاندوە)، دوایی لێیان گەڕێ با لە گومڕایی خۆیان دا هەر یاریی و گەمە بکەن.

## مەسەلەی چوارەم:

**خەیاڵکردنی کافرە خۆ بەزلگرەکان کە مادام ڕەش و ڕووتەکان پێش وان بڕوایان هێناوە بە قوڕئان، کەواتە: قوڕئان خێری پێوە نیەو، درۆیەکی دێرینە! بەرپەرچدانەوەشیان بەوە کە کتێبەکەی مووساش ﷺ کە پێشتر دابەزیوە پێشەواو بەزەیی خوا بوو، ئەم قوڕئانەش کتێبێکی ڕۆشنە بۆ ترساندنی ستەمکاران و دڵخۆشکردنی چاکەکاران:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَوْ كَانَ خَيْرًا مَّا سَبَقُونَآ إِلَيْهِ وَإِذْ لَمْ يَهْتَدُواْ بِهِۦ فَسَيَقُولُونَ هَٰذَآ إِفْكٌ قَدِيمٌ ﴿١١﴾ وَمِن قَبْلِهِۦ كِتَٰبُ مُوسَىٰٓ إِمَامًا وَرَحْمَةً وَهَٰذَا كِتَٰبٌ مُّصَدِّقٌ لِّسَانًا عَرَبِيًّا لِّيُنذِرَ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ وَبُشْرَىٰ لِلْمُحْسِنِينَ ﴿١٢﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە حەوت بڕگەدا:

١)- ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَوْ كَانَ خَيْرًا مَّا سَبَقُونَآ إِلَيْهِ ﴾، ئەوانەی بێبڕوابوون بەوانەی کە بڕوایان هێناوەو گوتیان: ئەگەر ئەو (قوڕئان)ە چاک بووایە، ئەوان پێش ئێمە نەدەکەوتنەوە (لە بڕواپێهێنانیدا).

٢)- ﴿ وَإِذْ لَمْ يَهْتَدُواْ بِهِۦ فَسَيَقُولُونَ هَٰذَآ إِفْكٌ قَدِيمٌ ﴾، ئنجا بەهۆی ئەوەوە کە ڕێی ڕاستگرتوو نەبوون (بە هۆی قوڕئانەوە) لەمەودوا دەڵێن: ئەمە درۆیەکی دێرینە، هەڵبەتە ئەم قسەیان لەوەوە هەڵدەقوڵێ، کە زۆر سەرسام بوون بە خۆیان و خەڵکی دیکەیان بەکەم گرتوە، بە تایبەت خەڵکی ڕەش و ڕووتی کە بڕوایان بە پێغەمبەر ﷺ هێناوە، وەک لە ئایەتەکەی پێشێش دا فەرمووی: ﴿ فَـَٔامَنَ وَٱسْتَكْبَرْتُمْ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٠﴾ ﴾، ئەو بڕوای هێناو ئێوە خۆتان بەزلگرت، ئنجا لە ئەنجامی ئەو خۆ بەزلگرییەیاندا، گوتوویانە: ئەگەر ئەم قوڕئان و ئیسلامە چاک بووایە، ئەو ڕەش و ڕووتە دواکەتوو و داماوانە، پێش ئێمە نەدەکەوتنەوە، ئێمە لەوان عاقڵترین، ئێمە لەوان باشتر تێ دەگەین، ئێمە لەوان باشتر بەرەو خێرو چاکە دەچین، کەواتە: ڕاناوی

کۆ (جمع) لە: ﴿ مَّا سَبَقُونَآ إِلَيۡهِ ﴾دا، (عَائِدٌ إلى غَيْرِ مَذْكُورٍ فِي الآيَة، لِكِنَّهُ مَذْكُورٌ فِي كَلَامِ الكُفَّارِ، وَهُمْ المُسْتَضْعَفُون)، ئەم ڕاناوە دەچێتە بۆ شتێک کە لە ئایەتەکەدا باس نەکراوە، بەڵام بە سیاق دەزانرێ لە قسەی کافرەکان داو، مەبەستیان چەوساوەکانە، وەک (بیلال و سوهەیب و زەنیرەو یاسیرو عەمماری کوڕی یاسیرو سومەییە)، خوا لێیان ڕازی بێ، کە یان کۆیلە بوون و، یان هەژارو نەدار بوون، یاخود غەریب بوون، وەک بیلال کە حەبەشەیی بووەو، سوهەیب کە ڕۆمیی بووە، بە چاوی کەم تەماشایان کردوون.

کە دەفەرموێ: ﴿ وَإِذۡ لَمۡ يَهۡتَدُواْ بِهِۦ ﴾، (إذ: ظَرْفٌ أُشْرِبَ مَعْنَى الشَّرْطِ، إذًا دَخَلَتِ الفَاء عَلَى جَوابِهِ، فَسَيَقُولُون هَذَا إفْكٌ قَدِيم)، (إذ) زەرفەو بۆ ڕابردوویە، واتە: کاتێک کە شتێکی تێدا ئەنجامدراوە، بەڵام لێرەدا مانای مەرجی خراوەتە نێو، هەر بۆیەش پیتی (ف) خراوەتە سەر وەڵامەکەی: ﴿ وَإِذۡ لَمۡ يَهۡتَدُواْ بِهِۦ فَسَيَقُولُونَ هَٰذَآ إِفۡكٌ قَدِيمٌ ﴾، واتە: (وإنْ لَمْ يَهْتَدُوا بِهِ)، بە هۆی ئەوەوەو لە ئەنجامی ئەوەدا کە لێی بەهرەمەند نەبوون وەک ڕێنمایی، ﴿ فَسَيَقُولُونَ هَٰذَآ إِفۡكٌ قَدِيمٌ ﴾، دەڵێن: ئەمە درۆیەکی دێرینە، وشەی (إفْك) بە مانای هەڵگێڕدراوە دێ، ئنجا لەبەر ئەوەی درۆش قسەیەکە هەڵدەگێڕدرێتەوەو ڕاست نیە، (إفْك) بە مانای درۆ بەکارهاتوە لە قورئاندا، هەروەها بە مانای شیرکیش هاتوەو، بە مانای ستەمیش هاتوەو، بە مانای کوفریش هاتوە، کەواتە: (فَسَيَقُولُون)، وەڵامی مەرجەکەیە، ﴿ وَإِذۡ لَمۡ يَهۡتَدُواْ بِهِۦ ﴾.

دەشگونجێ (إذْ) بۆ هۆکار دۆزیی (تعليل) بێ، یانی: لە ئەنجامی ئەوەدا کە بەهۆی قورئانەوە ڕێی ڕاستگرتوو نەبوون و لێی بەهرەمەند نەبوون، دەڵێن: ئەمە درۆیەکی دێرینە، وەک پێشینان گوتوویانە: (دەمی نایگاتێ دەڵێ: ترشە)، دوایی خوا ﷻ بۆ بەرپەرچدانەوەی ئەوەیان دەفەرموێ:

٣)- ﴿ وَمِن قَبۡلِهِۦ كِتَٰبُ مُوسَىٰٓ ﴾، لە پێش ئەم (قورئان)ەشدا، کتێبەکەی مووسا عليه السلام هەبوو، (کە تەوڕاتە).

٤)- ﴿إِمَامًا وَرَحْمَةً﴾، هەم پێشەوا بوو، هەم بەزەیی بوو.

ئەمـە بەرپەرچدانـەوەی نکووڵییکردنیانـە لـەوەی وەحیـی بـۆ موحەممـەد ﷺ بـێ، بـەوە کـە لـە پێـش وەحیـی نێـردران بـۆ موحەممـەددا ﷺ، وەحیـی بـۆ مووسـا ؏ هاتـوە، لـە پێـش کتێبەکـەی موحەممەدیـش دا ﷺ کـە قورئانـە، کتێـب بـۆ مووسـا ؏ دابەزێـنراوە، لـە قورئانـدا زۆرجـار بـاسی مووسـاو کتێبەکـەی کـراوە، چونکـە گـەلی جوولەکـە:

**یەکەم:** گەلێکی زۆر دێرین بوون، لە پێش ڕۆژگاری پێغەمبەردا ﷺ کە ئەو کاتە بە لای کەمەوە هەزارو پێنجسەد (١٥٠٠) ساڵ بەسەر تەمەنی مووساو دابەزێنرانی تەوراتدا تێپەڕیوە.

**دووەم:** گەلێکی زۆر دەستگرتووش بوون بە دینی خۆیانەوەو، تاڕاددەیەکی زۆر پاراستوویانە، هەڵبەتە کتێبەکەیان دەستکاریی کراوە، بەڵام زۆر دەمارگیربوون بۆ ئایینەکەی خۆیان و ناوداربوون، لە هەموو دنیاشدا ناویان هەبووە، بۆیە خوا ﷻ زۆر باسی مووساو باسی کتێبەکەی دەکات.

٥)- ﴿وَهَٰذَا كِتَٰبٌ مُّصَدِّقٌ﴾، ئەمەش کتێبێکی بەڕاستدانەرە، (**المُصَدِّقُ: المُخْبِرُ بِصِدْقِ غَيْرِهِ، وَحُذِفَ مَفْعُولُهُ لِيَشْمُلَ كُلَّ الكُتُبِ السَّمَاوِيَّة**)، نەیفەرمووە: بەڕاستدانەری چی و بەرکار (**مفعول به**)ەکەی قرتێنراوە، یانی: بەڕاستدانەرە بۆ هەموو کتێبەکانی خوا، کە پێش وی هاتوون، وەک لە شوێنەکانی دیکەدا فەرموویەتی.

٦)- ﴿لِّسَانًا عَرَبِيًّا﴾، بە زمانی عەرەبییە، کە دەفەرموێ: ﴿لِّسَانًا عَرَبِيًّا﴾، (**المُرَادُ عَرَبِيَّةُ أَلْفَاظِهِ لَا غَيْرُ**) واتە: بێژەکانی بە زمانی عەرەبیین، نەک نێوەڕۆکەکەی و مانایەکەی، بەو واتایە ئەگەر عەرەبیی پاڵ بدرێتە لای گەلی عەرەب، هەر ئەوەیە کە بێژەکانی بە زمانی ئەو نەتەوەیەن، نەک ماناو مەبەستەکانی، چونکە گەلی عەرەب گەلێکی زۆر بێسەروبەر بوون، ماناو مەبەستی وایان نەبووە کە خوای پەروەردگار لێیان وەربگرێ، بەڵام مەبەست ئەوەیە بێژەکانی بە زمانی عەرەبیین، باشتریش لەو واتایە ئەوەیە، کە بگوترێ:

﴿ لِّسَانًا عَرَبِيًّا ﴾، واته: زمانێكی ڕۆشن، نەک زمانی نەتەوەی عەڕەب، هەڵبەتە (عربي) لە شوێنی دیكەدا دەگونجێ بە زمانی نەتەوەی عەڕەبیش لێک بدرێتەوە، بەڵام لێرەداو لە زۆر شوێنی دیكەدا، بە مانای زمانێكی ڕۆشنە، چونكە (**راغب الأصفهاني**) دەڵێ: (**العَرَبِي: الفَصِيْح البيِّنُ مِنَ الكَلَامِ، يُقَالُ: مَا بِالدَّارِ عَرِيْبٌ أي: أَحَدٌ مُعْرِبٌ عَنْ نَفْسِهِ، وَامْرأةٌ عَرُوبَةٌ: مُعْرِبَةٌ بِحَالِهَا عَنْ عِفَتِهَا وَمَحِبَة زَوْجِهَا، جَمْعُهَا: عُرُبٌ: [عُرُبًا أتْرَابًا]**)[1].

واتـە: (**العـربي**) واتـە: زمانێكـی ڕوونی ڕۆشـن، دەگوتـرێ: (**مَـا بِالـدَّار عَرِيْـبٌ**) واتـە: كـەس لـە ماڵەكـە نیـە، كـە ئـەوەی لـە دەروونیدایـە دەری ببـڕێ، هەروەهـا دەگوترێ: (**امْـرَأَةٌ عَرُوبَـةٌ**) واتـە: بـە حاڵـی خـۆی تەعبیـر دەكات لـە پاكیـی و، خۆشەویسـتیی بـۆ هاوسـەرەكەی، كـە بـە (**عُـرُبَ**) كـۆ دەكرێتـەوە، خـوای پـەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ عُرُبًا أَتْرَابًا ﴿٣٧﴾ ﴾**الواقعة**، هەروەهـا ڕاغیـب، دەڵـێ: (**حُكْـمًا عَرَبِيـًا قِيْـلَ: مَعْنَـاهُ مُفْصِحًـا يُحِـقُّ الحَـقَّ وُيُبْطِـل البَاطِـلَ**)، واتـە: حیكمەتێكـی زۆر ڕوونـە، كـە هـەق دەچەسـپێنێ و ناهـەق دەپووچێنێتـەوە، كەواتـە: لێـرەدا كە دەفەرمـوێ: ﴿ لِّسَانًا عَرَبِيًّا ﴾، (لِسَـان) بە مانـای زمانێكـی ڕۆشـنە، ئنجـا ئەمـە حاڵـە بـۆ (**كِتَـاب**) یـانی: لـە حاڵێـک دا كتێبەكـە بـە زمانێكـی ڕۆشـن بـێ پێـچ و پەنـا هاتـوە، بۆچـی؟

٧)- ﴿ لِّيُنذِرَ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ وَبُشْرَىٰ لِلْمُحْسِنِينَ ﴾، تاكو ئەوانەی ستەمیان كردوە پێی بترسێنی و، موژدەو دڵخۆشییشە بۆ چاكەكاران، (**لِتُنْذِرَ بِهِ**) خوێنراویشەتەوە: (**لِيُنْذِرَ بِهِ**)، بۆ ئەوە پێی بترسێنێ، پێغەمبەر ﷺ وریا كەرەوەی خەڵكە بە گشتیی، تاكو بێبڕوایەكان بە تایبەتیی پێی بترسێندرێن و وریا بكرێنەوەو، موژدەشە بۆ چاكەكاران.

---

(١) ص٥٥٧.

## مەسەلەی پێنجەم و کۆتایی:

**ڕاگەیانـدنی ئـەو ڕاسـتییە کـە بـڕوادارانی دامـەزراو، نـە ترسـی داهاتـوو و، نـە پـەژارەو خەمـی ڕابردوویـان هەیـەو، خـاوەنی بەهەشـت دەبـن و، تێیـدا هەمیشـەیی دەبـن، وەک پاداشـتی کردەوەکانیـان:**

خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ قَالُواْ رَبُّنَا ٱللَّهُ ثُمَّ ٱسْتَقَٰمُواْ فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿١٣﴾ أُوْلَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلْجَنَّةِ خَٰلِدِينَ فِيهَا جَزَآءًۢ بِمَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ ﴿١٤﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە چوار بڕگەدا:

١)- ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ قَالُواْ رَبُّنَا ٱللَّهُ ثُمَّ ٱسْتَقَٰمُواْ ﴾، بە دڵنیایی ئەوانەی گوتیان: پەروەردگارمان خوایە، دوایی ڕاوەستاوو دامەزراویش بوون.

وشـەی (رَب) بـە مانـای بەدیهێنـەرو خـاوەن و مشـوورخۆرو پەرسـتراوو بەرنامـە دانـەرو، حوکمـڕان دێ، پەروەرردگارمـان خوایـە، واتـە: بەدیهێنـەرو، خـاوەن و، مشـوورخۆرو، پەرسـتراوو، پشـت پـێ بەسـتراوو، سەرپەرشـتیارمان و، پشـت و پەنامـان، خوایـە.

﴿ ثُمَّ ٱسْتَقَٰمُواْ ﴾، (ثُـمَّ: للتَّرَاخِـي الرُّتْبِـيّ)، (ثـم) بـۆ ڕیزبەندیـی پلـە پلەییـە، (**لإنَّ الإسْتِقَامَة أَشَقّ مِنْ حُصُولِ الإِيْمَان، لاحتِيَاجِهَا إِلى تَكَرُّر مُرَاقَبَة النَّفْسِ**)، لەبـەر ئـەوەی ڕاسـت وەسـتاویی و، نەلەخشـاویی، قورسـترە لـە پەیدابـوونی ئیـمان، چونکـە ڕاسـت وەسـتاویی و نـە لەخشـاویی و دامەزراویـی پێویسـتیی بـەوە هەیـە، کـە بـەردەوام چاودێریـی بکـرێ، ئینسـان بـەردەوام ئـاگای لـە خـۆی بـێ.

٢)- ﴿ فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴾، نە ترسیان لەسەرەو، نە خەمباریش دەبن، ترسیان لەسەر نیە بۆ ڕابردوو و، خەمباریش نابن لە داهاتوودا، بۆیە بۆ (**خَوْف**) فەرموویەتی: ﴿ فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ ﴾، چونکە ڕابردووەکە تێپەڕیوە، هیچ ترسیان لەسەر

نیە، بە نسبەت ڕابردووەوەو با نەترسێن، چونکە ئەوەی پەرێزی پاکە بێ باکە، بەڵام نەبوونی خەم و پەژارەی بە (فِعْلُ المُضَارِع) هێناوە، کە تازەبوونەوە دەگەیەنێ، لە داهاتوودا خەمبارو پەژارەدارو دڵتەنگ نابن.

٣)- ﴿أُوْلَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلْجَنَّةِ خَٰلِدِينَ فِيهَا﴾، ئەوانە هاوەڵانی بەهەشتن، بە هەمیشەیی تێیدا دەمێننەوە، واتە: هەمیشە لە بەهەشت دان، وشەی (أصْحَاب) کۆی (صَاحِب)ە، لە ئەصڵدا بە مانای شتێک دێ کە لە شتێک جیانابێتەوەو، دوایی بە مانای هاوەڵ و ڕەفیق دێ، بەڵام بە مانای خاوەنیش دێ (صَاحِبُ الدّار)، واتە: خاوەنی ماڵ و خانووەکە، لە سۆنگەی ئەوەوە کە خاوەنیش لە ئەو شتەی خاوەنیەتی جیا نابێتەوەو، ئنجا ئەوانە، چ هاوەڵی بە هەشت بن، چ خاوەنی بەهەشت بن، بە هەمیشەیی تێیدا دەمێننەوە.

٤)- ﴿جَزَآءَۢ بِمَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ﴾، لە پاداشتی ئەوەدا کە دەیانکردو، ئەنجامیان دەدا.

خـوا بـە لوتـف و کەرەمـی خـۆی ئێمـە لـەو کەسـانە بگێـڕێ کـە دەڵێـن: (رَبُّنَا اللـه)، دواییـش ڕاوەسـتاو نەلەخشـاو دەبـن لەسـەر گوتنـی ئـەو وشـەیەو، لەسـەر مانـاو چەمکـە فـراوان و گـەورەو گرنگـەکانی ئـەم وشـەیەو، لەسـەر کارکـردن بـەم وشـەیە، هـەم لـە ژیـانی تاکییـمان و، هـەم لـە ژیـانی خێزانیـی و، هـەم لـە ژیـانی کۆمەڵایەتیـی و، سیاسییمان دا، بـە دڵنیایـی گوتنـی: (رَبُّنَا اللـه) بەرنامەیـە بـۆ ژیـان، پەیڕەوێکـەو ڕێبازێکـە مـرۆڤ حاڵیـی دەکات، دەبـێ چـۆن بـژی و، تێیدەگەیەنـێ لـە کـوێ هاتـوەو، بۆچـی هاتـوەو، بـۆ کـوێ دەچـێ؟ ئەگـەر تـۆ بـەس خـوا پـەروەردگارت و خاوەنـت بـێ، بـەس خـوا بـە هەمـەکارەو سەرپەرشـتیارو پەرسـتراو مشـوورخۆری خـۆت بزانـی و، تەنیـا خـوا پشـت پـێ بەسـتراوت بـێ و، خـوای کاربەجێ بـە حوکمڕان و بـە بەرنامـە ڕێـژی خـۆت دابنێـی، ئـا ئـەوە لێـت حاڵیـی دەکات دەبێـت چـۆن بژی؟ لەبـەر تیشـکی ئـەو فەرمایشـتەدا کـە ناردوویـەتی و، ڕێبـازی ئـەو پێغەمبـەرەدا کـە جێبەجێکـردنی ئـەو فەرمایشـتەی پـێ سـپاردوەو، خـوا ﷻ لـەو کەسـانەمان بگێـڕێ کـە دەڵێـن: (رَبُّنَا اللـه)و دواییـش دامـەزراو نەلەخشـاو دەبـن، لەسـەر ئـەو ڕاسـتە

شـەقامەو مسـوڵمانەتیی و دینداریيەكـی ڕاسـت و سـاغ و هاوسـەنگانەی دوور لـە زێدەڕۆیـی و كورتهێنـان (**إفـراط وتفریـط**)و، سـەختگیریی و شـلگیریی دەكـەن و، هەمیشـە شـەرعڕەو دەبـن دوور لـە: توندڕەویـی و شـلڕەویی.

**سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.**

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـە لـە شـەش ئایـەت پێـک دێ، ئایەتـەکانی: (١٥ - ٢٠)، کـە پێنـج ئایەتیـان، ئایەتـەکانی: (١٥ - ١٩)، لـە بـارەی بـەراوردی نێـوان دوو جـۆرە کەسـەوەن، کـە پێچەوانـەی یەکدیـن و، یەکەمیـان: بـڕوادارە بـە خـواو بـە فریشـتەکانی و، بە ڕۆژی دوایـی و، بـە کتێبـەکانی و بـە پێغەمبـەران و، چاکەکاریشـە لەگـەڵ بـاب و دایکیـدا، وەک ئەنجامێکـی ئاسـایی و دەرەنجامێکـی سرووشـتیی ئیـمان و، سـەرەنجامیشی خێرە لـە دنیـاو دواڕۆژدا، دووەمیشـیان: بێبڕوایـەو، لەگـەڵ بـاب و دایکیشـیدا لاسـارەو، یاخییـەو، زیانبـارو مـاڵ وێرانیشـە لـە دنیـاو دواڕۆژدا.

دیـارە هـەر کەسـە لـەو دوو جـۆرە لـە ڕۆژی دواییـدا، پلـەو پێگـەی پـڕ بـە پێسـتی خـۆی پـێ دەدرێ و، سـتەم لـە هیـچ کامیـان ناکـرێ، نـە یەکەمیـان بـە کەمکردنـەوەی پاداشـتەکەی، نـە دووەمیـان بـە زیـاد کـردنی سـزایەکەی، زیـاد لە ئەنـدازەی پێویسـتی خۆی.

ئایـەتی کۆتاییـش ئایـەتی ژمـارە: (٢٠) لـە بـارەی بێبڕوایانێکـی خۆشـگوزەرانی خـۆ بەزلگرەوەیـە، کـە لـە قیامەتـدا سـزای ڕیسـواکەر دەچێـژن، بـە هـۆی خـۆ بەزلگریـی و، لادان و تاوانـەوە کـە لـە دنیـادا ئەنجامیانـداوە.

﴿ وَوَصَّيْنَا ٱلْإِنسَٰنَ بِوَٰلِدَيْهِ إِحْسَٰنًا ۖ حَمَلَتْهُ أُمُّهُۥ كُرْهًا وَوَضَعَتْهُ كُرْهًا ۖ وَحَمْلُهُۥ وَفِصَٰلُهُۥ ثَلَٰثُونَ شَهْرًا ۚ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ أَشُدَّهُۥ وَبَلَغَ أَرْبَعِينَ سَنَةً قَالَ رَبِّ أَوْزِعْنِىٓ أَنْ أَشْكُرَ نِعْمَتَكَ ٱلَّتِىٓ أَنْعَمْتَ عَلَىَّ وَعَلَىٰ وَٰلِدَىَّ وَأَنْ أَعْمَلَ صَٰلِحًا تَرْضَىٰهُ وَأَصْلِحْ لِى فِى ذُرِّيَّتِىٓ ۖ إِنِّى تُبْتُ إِلَيْكَ وَإِنِّى مِنَ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴿١٥﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ نَتَقَبَّلُ عَنْهُمْ أَحْسَنَ مَا عَمِلُوا۟ وَنَتَجَاوَزُ عَن سَيِّـَٔاتِهِمْ فِىٓ أَصْحَٰبِ ٱلْجَنَّةِ ۖ وَعْدَ ٱلصِّدْقِ ٱلَّذِى كَانُوا۟ يُوعَدُونَ ﴿١٦﴾ وَٱلَّذِى قَالَ لِوَٰلِدَيْهِ أُفٍّ لَّكُمَآ

أَتَعِدَانِنِيٓ أَنۡ أُخۡرَجَ وَقَدۡ خَلَتِ ٱلۡقُرُونُ مِن قَبۡلِي وَهُمَا يَسۡتَغِيثَانِ ٱللَّهَ وَيۡلَكَ ءَامِنۡ إِنَّ وَعۡدَ ٱللَّهِ حَقّٞ فَيَقُولُ مَا هَٰذَآ إِلَّآ أَسَٰطِيرُ ٱلۡأَوَّلِينَ ﴿١٧﴾ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ حَقَّ عَلَيۡهِمُ ٱلۡقَوۡلُ فِيٓ أُمَمٖ قَدۡ خَلَتۡ مِن قَبۡلِهِم مِّنَ ٱلۡجِنِّ وَٱلۡإِنسِۖ إِنَّهُمۡ كَانُواْ خَٰسِرِينَ ﴿١٨﴾ وَلِكُلّٖ دَرَجَٰتٞ مِّمَّا عَمِلُواْۖ وَلِيُوَفِّيَهُمۡ أَعۡمَٰلَهُمۡ وَهُمۡ لَا يُظۡلَمُونَ ﴿١٩﴾ وَيَوۡمَ يُعۡرَضُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ عَلَى ٱلنَّارِ أَذۡهَبۡتُمۡ طَيِّبَٰتِكُمۡ فِي حَيَاتِكُمُ ٱلدُّنۡيَا وَٱسۡتَمۡتَعۡتُم بِهَا فَٱلۡيَوۡمَ تُجۡزَوۡنَ عَذَابَ ٱلۡهُونِ بِمَا كُنتُمۡ تَسۡتَكۡبِرُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ بِغَيۡرِ ٱلۡحَقِّ وَبِمَا كُنتُمۡ تَفۡسُقُونَ ﴿٢٠﴾

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{هەروەها مرۆڤیشمان بە چاکەکاریی لەگەڵ باب و دایکیدا ڕاسپارد، دایکی بە ڕەنج و زەحمەت (لە سکیدا) هەڵیگرت و، بە ڕەنج و زەحمەتیش بووی (داینا)، هەروەها (لە سکدا) هەڵگرتنی و لە شیر بڕینەوەی (ماوەی) سی مانگی خایاند، هەتا کاتێکیش گەیشتە ئەوپەڕی پێگەیشتن و توانای و، تەمەنی گەیشتە چڵ ساڵ (لە خوا پاڕایەوە) گوتی: پەروەردگارم! وام لێبکە (بیخە دڵم) سوپاسی ئەو چاکەیەت بکەم، کە بە خۆم و بە باب و دایکمت داوەو، (وام لێبکە) کردەوەی چاکی وا بکەم، تۆ پەسندی بکەی، هەروەها لە وەچەکەمدا چاکسازییم بۆ بکەو (ڕۆڵەکانم بۆ چاک بکە)، بە دڵنیایی من بۆ لای تۆ گەڕاومەوەو، بێگومان من لە ملکەچانم (بۆ تۆ) ﴿١٥﴾ ئەوانە کەسانێکن باشترینی ئەوەی کردوویانە، لێیان وەردەگرین و، لە نێو هاوەڵانی بەهەشتدا خراپەکانیان دەبوێرین (ئەمەش) ئەو بەڵێنە ڕاستەیە کە پێیان درابوو ﴿١٦﴾ ئەو (جۆرە) کەسەش (زۆر خراپە) کە بە باب و دایکی گوت: بێزاریی (لە لایەن منەوە) بۆ ئێوە، ئایا گفتم پێدەدەن کە (لە گۆڕ) دەربهێنرێمەوە، لە حاڵێکدا کە سەدەکان لە پێش مندا ڕابردوون (و کەس لە گۆڕستان نەهاتۆتەوە)؟ ئەوانیش هاواریان

دەکردە خوا (دەیانگوت): هاوار بۆ تۆ، (سزا بۆ تۆ) بڕوابێنە! بێگومان بەڵێنی خوا چەسپاوە (ڕاستە)، ئەویش دەیگوت: ئەوە تەنیا ئەفسانەی ڕابردووانە ﴿١٧﴾ ئەوانە کەسانێکن قسە (و بڕیاری خوا)یان لەسەر چەسپاوە (کە دەبێ سزا بدرێن) بە هۆی بێبڕوایی و خراپەیانەوە، لە نێو ڕیزی کۆمەڵانێکی لە پێش واندا ڕابردوودا لە جندو مرۆڤ، بە دڵنیایی ئەوان زیانبار بوون ﴿١٨﴾ بۆ هەر کامیش لەوان، بەپێی ئەوەی کردوویانە پلەو پێگە (پڕ بە پێست)کان هەن، بۆ ئەوەی (خوا) بە تەواویی سزاو پاداشتی کردەوەکانیان بداتەوە، لە حاڵێکدا کە هیچ ستەمیان لێ ناکرێ ﴿١٩﴾ ئەو ڕۆژەش (زۆر سەخت و دژوارە) کە ئەوانەی بێبڕوان لەسەر ئاگر (ی دۆزەخ) ڕادەنوێنرێن (پێیان دەگوترێ:) لە ژیانی دنیاتاندا بژیوە خۆشەکانتانتان بڕاندن (تەواوتان کردن)و، لێیان بەهرەمەند بوون، بۆیەش ئەمڕۆ ئازاری ڕیسوایی دەدرێن، بە هۆی ئەوەوە کە بە ناهەق خۆبەزلگرییتان لە زەویدا دەکردو، بە هۆی ئەوەوەش کە لادان (و تاوان)تان دەکرد ﴿٢٠﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(کُرْهًا): (الكَـرْهُ وَالكُـرْهُ وَاحِـدٌ، أَوِ الكَـرْهُ: المَشَـقَّةُ الَّتِـي تَنَـالُ الإنْسَـانَ مِـنْ خَـارِجٍ فِيْـمَا يُحْمَـلُ عَلَيْـهِ بِإكْـرَاهٍ، وَالكُـرْهُ: مَـا يَنَالُـهُ مِـنْ ذَاتِـه)، (كَـرْه): بە مانـای ڕەنـج و زەحمەت و، بـە مانـای شـتێک کـە نەویسـتراوو ناخۆشویسـتراو بـێ، زۆرێـک لـە زانایـان گوتوویانـە: (كَـرْهُ وكُـرْهُ) واتایـان یەکـە، هەندێکیـش گوتوویانـە: (كَـرْه) ئـەو ڕەنـج و ناڕەحەتییەیـە کـە تـووشی مـرۆڤ دێ، لـە دەرەوەی خۆیـەوە دەخرێتـە سـەری، بـە ناچارکـران، (كُرْه) یـش بریتیـە لـەو ناڕەحەتییـەی مـرۆڤ وەک سرووشـت و خـودی خـۆی پێـی ناخۆشـە، نـەک کەسـێک لـە دەرەوە لەسـەری پێویسـت بـکات، بـۆ وێنـە: جـۆرە خواردنێکـی پـێ ناخۆشـەو، جـۆرە حاڵەتێکـی لـە زاتی خۆیـدا پـێ ناخۆشـە.

(وَفِصَـٰلُهُۥ): (الفِصَـالُ: التَّفْرِيْـقُ بَـيْنَ الصَّبِـيِّ وَالرَّضَـاع)، (فِصَـال): بریتیـە لـە شـیر بڕینـەوەی منـداڵ، منداڵـی شـیرە خـۆرە لـە مەمـک بڕینـەوەی، واتـە: وای لـێ بکـرێ کـە شـیری مەمکـی دایکـی نەمـژێ، شـیر نەخـوات، ئـەو قۆناغـە بگوزەرێنـێ، (فِطَـام) یـشی پـێ دەگوتـرێ، وەک (البوصـيري) دەڵـێ: (وَالنَّفْـسُ كَالطِّفْـلِ إنْ تُهْمِلْـهُ شَـبَّ عَـلَى حُـبِّ الرَّضَـاعِ، وَإنْ تَفْطِمْـهُ يَنْفَطِـم)، نەفـس وەک منـداڵ وایـە، ئەگـەر لێـی گەڕێـی دەبێتـە گەنـج هـەر مەمـک مژینـی پێخۆشـەو، هـەر شـیر خـوارادنی پـێ خۆشـە، بـەڵام ئەگـەر لێـشی وەبـڕی، لـێ دەبڕێتـەوە.

(أَشُدَّهُۥ): (أَشُـدَّ) زانایـان بـە دوو شـێوە شـییانکردۆتەوە، هەندێکیـان گوتوویانە: (أَشُـدَّ: جَمْـعٌ لَا وَاحِـدَ لَـهُ مِـنْ لَفْظِـهِ)، وشـەیەکە کۆیـە، بـەڵام تاکـی نیـە لەبێـژەی خـۆی، (بـە مانـای ئـەو پـەڕی توانـاو هێـز)، هەندێکیـش گوتوویانـە: (أَشُـدَّ) کـۆی (شِـدَّة)یە، وەک (أَنْعُـمْ وَنِعْمَـة)، (أَنْعُـمْ) چاکـەکان، (نِعْمَـة) چاکـە، بـەڵام (الـرَّازِي)، دەڵـێ: (أَنْعُـمْ جَمْـعُ

**نُعُمْ**)[1]، (**أَنْعُمْ**) کۆی (**نُعُم**)ە، نەک کۆی (**نِعْمَة**) بێ، گوتراویشە: تاکی (**أَشُدّ**) بریتیە لە (**شَدّ، مِثْلُ كَلْب وَأَكْلُب**)، هەندێکی دیکەش گوتوویانە: تاکی (**أَشُدّ**) بریتیە لە (**شِدّ**) وەک (**ذِئْبْ أَذْئُب**)، هەرچۆن بێ، (**أَشُدُّ**) چ تاکی هەبێ و، تاکەکەی (**شُدّ**) بێ، وەک (**نُعُم**)، یان (**شِدَّة**)ەبێ وەک (**نِعْمة**)، یاخود (**شَدّ**)بێ وەک (**كَلْب**)، یاخود (**شِدّ**)بێ وەک (**ذِئْب**)، یان وەک (**الرَّازِي**) دەڵێ: ڕاست نەبێ و (**أَشُدّ**) تاکی نەبێ، چونکە (**أنْعُمْ**) کۆی (**نُعُم**)ە، نەک (**نِعْمة**)، تاکو بڵێی: کۆی (**شِدَّة**) (**أَشُدّ**)ە، بەڵکو ناوێکی کۆ بێ و تاکی نەبێ، بە مانای ئەوپەڕی توانا و هێزە.

(**أَوۡزِعۡنِيٓ**): زانایان هەموویان بە (**أَلْهِمْنِي**) لێکیان داوەتەوە، واتە: خورپەم بۆ بکە، وام لێبکەو، وا دارم بکە، ئنجا (**وَزَعَهُ أي: كَفَّهُ، أَوْزَعَهُ بِالشَّيءِ: أَغْرَاهُ بِهِ**)، (**وَزَعَهُ: كَفَّهُ**) واتە: نەیهێشت، بەڵام (**أَوْزَعَهُ بِالشَّيءِ**) واتە: (**أغْرَاهُ بِه**) تیژی کرد لەو شتەو، هانیدا بۆی، دەگوترێ: (**اسْتَوْزَعْتُ الله شُكرهُ، فَأَوْزَعَنِي: اسْتَلْهَمْتُهُ أنْ أشْكُرَهُ فَألْهَمْنِي شُكْرَهُ**)[2]، واتە: داوام لە خوا کرد خورپەم بۆ بکات، سوپاسگوزاریی بکەم، ئەویش خورپەی بۆ کردم و سوپاسگوزارییم کرد، هەندێکیش گوتوویانە: (**أَوْزِعْنِي**) هەمزەکە بۆ لابردنی (**وَزَعَ**)یە، یانی: (**كَفّ**)، کەواتە: (**أَوْزِعْنِي**) واتە: وام لێبکە کە سوپاس نەکردنم تێدانەمێنێ و وام لێبکە سوپاسگوزار بم، چونکە هەمزەکە بۆ لابردنی مانای کردارەکەیە کە بە (**ثُلَاثِي**) دێ، (**وَزَعَهُ: كَفَّه**)، (**أَوْزَعَهُ**) واتە: نەهێشتنەکەی تێدا لابرد، ئنجا کە نەهێشتنی سوپاسگوزاریی تێدا لابرد، مانای وایە سوپاسگوزاریی تێدا هاتۆتە دی.

(**أُفّٖ**): (**أُفٌّ لَهُ: وَأُفًّا وَأُفَّةً، أي: قَذَرًا، وَأَفَّفَ تَأْفِيْفًا قَالَ: أُفّ**)، دەگوترێ: (**أُفًّا لَهُ وَأُفَّةً**) واتە: پیسیی (**أَفَّفَ تَأْفِيْفًا**) واتە: گوتی: ئوفف، (**أُفّ**)یش بە چڵکی گوێ دەگوترێ و، بە شتی پیس دەگوترێ، کەواتە: کە ئەو وشەیە بەکاردەهێنرێ، مانای وایە بێزاریی دەردەبڕێ لەو شتەی بەرانبەری بەکاردەهێنرێ، کە خوا

---

(١) مختار الصحاح: ص٣٣٢.

(٢) مختار الصحاح، ص٧٤٠.

دەفەرموێ: ﴿فَلَا تَقُل لَّهُمَآ أُفٍّ ﴿٢٣﴾﴾ الإسراء، ئـۆف بـە بـاب و دایکـت مەڵـێ، واتـە: بێزارییـان لـێ دەرمەبـڕە.

(يَسۡتَغِيثَانِ ٱللَّهَ): واتـە: هانـا دەبەنـە بـەر خـوا، هـاوار دەکەنـە خـوا، (الغَـوْثُ فِي النُّـصْرَةِ، وَالغَيْـثُ فِي المَطَـرِ، وَاسْـتَغَثْتُهُ: طَلَبْتُـهُ الغَـوْثَ أَو الغَيْـثَ)، وشـەی (غَـوْث) بـۆ یارمەتییدانـەو، وشـەی (غَيْـث) بـۆ بارانـە، (اسْـتَغَثْتُهُ) داوای یارمەتیـی و لـە فریـا هاتنـم لێکـرد، یاخـود داوای بـاران بارینـم لێکـرد.

(وَيۡلَكَ): (وَيْـل مِثْـلُ وَيْـح، إلاَّ أَنَّهَـا كَلِمَـةُ عَـذَابٍ، وَالوَيْـلُ: وَادٍ فِي جَهَنَّـمْ)[1]، (وَيْـل) وەک (وَيْـح)ە، بـەڵام وشـەی سـزاو ئـازارە (وَيلـك)، (وَيْحَـكَ): واتـە: بـێ قـەزا بـی، وەک لـە کوردەواریـی خۆمانـدا دەڵێیـن: (بێمـزەڕەت بـی)، یـان (ماڵ وێـران بی)، کـە مەبەسـت خـودی واتایەکـە نیـە، بەڵکـو ئـەوە جۆرێـک لـە نارەزایـی دەربڕینـە، (وَيْل) دۆڵێکـە، شـیوێکە لـە نێـو دۆزەخـدا.

(يُعۡرَضُ): واتـە: ڕادەنوێـنرێ، (عَـرَضَ الـشَّيءَ: أَظْهَـرَهُ فَظَهَـرَ)، واتـە: شـتەکەی عـەڕز کـرد، واتـە: دەری خسـت و دەرکـەوت، (عَرَضْنَـا جَهَنَّـمَ: أَبْرَزْنَـا) واتـە: دۆزەخـمان دیارخسـت، ئاشـکرا کـرد، (إسْـتَعْرَضَهُ: قَـالَ لَـهُ: اعْـرِضْ عَـلَيَّ مَـا عِنْـدَكَ)، واتـە: پێیگـوت: ئـەوەی لەلاتـە پێشـانم بـدە، (مَعْـرِض) ئـەو شـوێنەیە شـتی لـێ عـەڕز دەکـرێ، کـە بـە (مَعَـارِض) کـۆ دەکرێتـەوە، خەڵـک بـە هەڵـە دەڵێـن: (مَعـرَض) و ئەصڵـی خـۆی (مَعْـرِض)ە، واتـە: ئـەو شـوێنەی شـتی لـێ ڕادەنوێـنرێ و پێشـان دەدرێ.

(عَذَابَ ٱلۡهُونِ): (عَـذَاب): بـە مانـای ئـازارو سـزا دێ، (الْهُـوْنُ: مَصْـدَرُ هَـانَ عَلَيْـهِ الـشَّيْءُ يَهُـونُ، أَي: خَـفَّ، وَهَوَّنَـهُ اللـهُ: سَـهَّلَهُ وَخَفَّفَـهُ، وَأَهَانَهُ اسْـتَخَفَّ بِـهِ، وَالإِسْـمُ: الْهَوَانُ وَالْمَهَانَـةُ)[2]، (هُـوْن) چاوگـی (هَان)یـە، واتـە: سـووک بـوو، شـتەکەی لەسـەر سـووک بـوو، خـوا ﷻ ئاسـانی کـردو سـووکی کـرد، (أهانـه) بـە کـەم تەماشـای کـرد، ناوەکـەش بریتیـە لـە: (هَـوَانٌ وَالْمَهَانَـةُ) هەردووکیـان بـە مانـای بـە سـووک تەماشـاکردنن.

---

(١) مختار الصحاح، ص٧٤٠.

(٢) مختار الصحاح، ص٧٠٥.

## هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکان

دەربارەی هۆی هاتنە خواری ئەم ئایەتە موبارەکە، کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِى قَالَ لِوَٰلِدَيْهِ أُفٍّ لَّكُمَآ أَتَعِدَانِنِىٓ أَنْ أُخْرَجَ وَقَدْ خَلَتِ ٱلْقُرُونُ مِن قَبْلِى وَهُمَا يَسْتَغِيثَانِ ٱللَّهَ وَيْلَكَ ءَامِنْ إِنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ فَيَقُولُ مَا هَٰذَآ إِلَّآ أَسَٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿١٧﴾ ﴾.

**زانایان دوو بەسەرهاتیان گێڕاونەوە[1]:**

**أ)**- بەسەرهاتی یەکەمیان، کە بوخاریی هێناویەتی: یوسفی کوڕی ماهەک دەگێڕێتەوە دەڵێ: موعاویە، مەڕوانی کوڕی حەکەمی ڕاسپارد بوو، بەیعەت بۆ یەزیدی کوڕی وەربگرێ، لە خەڵکی مەدینەو لە شارەکانی دیکەش، ئەویش دەچێتە سەر مینبەر، دەڵێ: خوا لە بارەی یەزیدی کوڕیەوە شتی چاکی پێشانی موعاویە داوە، کە بەیعەتی بۆ وەربگرێ! (جارێ بۆ خۆشی هەر لە ژیاندابووە)، کە ببێتە حوکمڕانی مسوڵمانان، عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ئەبوو بەکری صیددیق خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ لەوێ دەبێ، دەڵێ: ئایا ئەمە سیستمی هیرەقلایەتییە؟ موعاویە بۆیە یەزید دادەنێ لەبەر ئەوەی کوڕیەتی، ئەگەرنا شایستە نیە، ئنجا مەڕوانی کوڕی حەکەم لە قسەکانیدا ئاماژە بەوە دەکات دەڵێت: (**سُنَّةُ أَبِي بَكْرٍ**)، یانی: ئەبوو بەکریش عومەری دانا، (خوا لێیان ڕازی بێ)،

---

(١) ڕیوایەتێکیان بە ژمارە (٤٨٢٧)دا، بوخاریی گێڕاویەتەوەو ڕیوایەتێکی دیکەیان: أخرجه النسائي في تفسيره: ٥١١، والخطّابي في غريب الحديث (ج٢،ص ٥١٧)، والحاكم في المستدرك (ج٤، ص ٤٨١)، والإسماعيلي في المستخرج كما في الفتح (ج٨، ص ٥٧٦)، وابن أبي خيثمة في تأريخه، وابن مردويه في تفسيره، كما في تخريج الكشاف (ج٣، ص٢٨٢)، وعبد بن حميد وابن المنذر في تفسيريهما كما في الدر المنثور (ج٧، ص٤٤٤) من طرق عن محمد بن زيان به قال الحاكم: هَـذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ عَلَى شَرْطِ الشَّيْخَيْنِ، وَلَمْ يُخْرِجَاهُ وتَعَقَّبَهُ الذهبي بقوله قلت: فيه انقطاع محمد لم يسمع من عائشة، وأخرجه ابن أبي حاتم في تفسيره، كما في فتح الباري (ج٨، ص٥٧٧)، وتفسير القرآن العظيم (ج٤، ص١٧١).

[عومەریش لە نێو شەش کەساندا کردی بە ڕاوێژ]، عەبدوڕڕەحمان دەڵێ: ئەبوو بەکر (هەروەها عومەریش) هیچ کام لە خزمانی خۆیان دا نەنا، {ئەبوو بەکر (خوا لێی ڕازی بێ) نەفەرێکی پێشنیار کرد، کە لە عەشیرەتی خۆی نەبوو، عومەر لە بەنی عەدیی بوو، بەڵام ئەبوو بەکر لە بەنی تەیم بوو، ئنجا لەبەر شایستەییش ئەوی هەر پێشنیار کردبوو، کەواتە: پێوان و قیاسکردنی هەڵوێستەکەی موعاویە بۆ سەر هەڵوێستی ئەبوو بەکر، شتێکی بێ جێیە، عومەریش (خوا لێی ڕازی بێ)، کەسێکی دیارییکراوی دانەنا، بەڵکو ڕایسپارد ئەو شەش کەسە، کە بیستبووی پێغەمبەر ﷺ لێیان ڕازییەو، بە شایستەی دەزانین، لە نێو خۆیاندا یەکێک دابنێن}، ئیدی مەڕوانی کوڕی حەکەم، گوتی: بیگرن، عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ئەبوو بەکریش (خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ)، چووە ژوورەکەی عائیشە (کە خوشکیەتی)، دیارە پێگەو ڕێزی عائیشەش وابوو (خوا لێی ڕازی بێ) نەتوانن بیگرن.

**ب)**- بەسەرهاتی دووەم کە (**النسائي والخطّابي والحاكم**) لە موحەممەدی کوڕی زیادەوە هێناویانە، دەڵێ: مەڕوانی کوڕی حەکەم دوای ئەوەی عەبدوڕڕەحمان قسەی کرد، گوتی: ئا ئەوەیە خوا ﷻ ئەو ئایەتەی لە بارەوە ناردۆتە خوار، کە دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِى قَالَ لِوَٰلِدَيْهِ أُفٍّ لَّكُمَآ أَتَعِدَانِنِىٓ أَنْ أُخْرَجَ وَقَدْ خَلَتِ ٱلْقُرُونُ مِن قَبْلِى وَهُمَا يَسْتَغِيثَانِ ٱللَّهَ وَيْلَكَ ءَامِنْ ﴿١٧﴾ ﴾، [باب و دایکی: کە ئەبوو بەکرو (**أم رومان**)ن، مسوڵمان بوون، بەڵام ئەو عەبدوڕڕەحمانە مسوڵمان نەبووەو، بەو شێوەیەی گوتوە، ئەو ئایەتە لە بارەی ئەوەوە هاتۆتە خوار]، بێگومان قسەکانی مەڕوانی کوڕی حەکەم، لە مزگەوتدا بوون و، ژوورەکان (حجرات)ی خێزانەکانی پێغەمبەریش ﷺ بەسەر مزگەوتەوە بوون، عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) بانگی کرد، گوتی: خوا ﷻ هیچی لە بارەی ئێمەوە نەناردۆتە خوار، جگە لە پاکیی من، {کە لە سوورەتی (**النور**)دا، خوا ﷻ شازدە (١٦) ئایەتی ناردوونە خوار، هەر ئەوەی ناردۆتە خوار}، هیچی لە بارەی ئێمەوە دانەبەزاندووەو ئەو قسەیە ڕاست نیە.

**ج**- لە ڕیوایەتێکدا هاتوە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) گوتی: من دەزانم ئەو ئایەتە لە بارەی کێوە هاتۆتە خوارو، ناوەکەی دەزانم، هەروەها لە ڕیوایەتێکدا هاتوە: کە

دایکمان عائیشە گوتی: خوا ﷻ نەفرینی لە بابی مەڕوان کردوە، ئەو کاتە مەڕوان لە سکی دایکیدا بووەو، ئەویش لەو نەفرینەی لێ پڕژاوە![1].

## مانای گشتیی ئایەتەکان

لێرەدا خوا ﷻ وێنە دێنێتەوە بە دوو جۆرە کەس، هەڵبەتە بە تاک باسیان دەکات، بەڵام وەک زۆربەی زانایانی ڕوونکەرەوەی ماناو مەبەستەکانی قورئان دەڵێن: مەبەست پێی دوو کەسی دیارییکراو نین، بەڵکو مەبەست دوو جۆرە کەسە، دوو کۆمەڵە کەسە، کە دژو پێچەوانەی یەکدین، جۆری یەکەمیان: ئەوەیە کە وەک خوا فەرمانی کردوە هەم بڕوادارە، هەم چاکەکاریشە لەگەڵ باب و دایکی دا.

جۆری دووەمیان: پێچەوانەی ئەوەیە کە خوا فەرمانی پێ کردوە، بێبڕواشەو، سپڵەو پێ نەزانیشە بەرانبەر بە باب و دایکی و، خراپەکاریشە لەگەڵیان، دەفەرموێ: ﴿وَوَصَّيْنَا ٱلْإِنسَٰنَ بِوَٰلِدَيْهِ إِحْسَٰنًا﴾، ئێمە مرۆڤمان ڕاسپارد کە چاکە لەگەڵ باب و دایکیدا بکات، ڕامانسپارد لەگەڵ باب و دایکی دا، چاکەکار بێت، ﴿حَمَلَتْهُ أُمُّهُۥ كُرْهًا وَوَضَعَتْهُ كُرْهًا﴾، باسی دایک دەکات بە تایبەت دەفەرموێ: دایکی بە ڕەنج و ناڕەحەتیی هەڵیگرتوە لە سکی خۆیداو، بە ڕەنج و ناڕەحەتییش دایناوەو بوویەتی، ﴿وَحَمْلُهُۥ وَفِصَٰلُهُۥ ثَلَٰثُونَ شَهْرًا﴾، تۆڵداربوونی دایکی پێی و، پاشان لە شیر گرتنەوەشی سیی (٣٠) مانگی خایاندوە، کەواتە: لێرەدا باسی لای کەمی تۆڵداربوونی ئافرەت دەکات، کە بریتیە: لە شەش مانگ، چونکە خوا ﷻ لە سووڕەتی (البقرة)دا، دەفەرموێ: ﴿وَٱلْوَٰلِدَٰتُ يُرْضِعْنَ أَوْلَٰدَهُنَّ حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِ ۖ لِمَنْ أَرَادَ

---

(١) ئێمە دواتر لە ژێر ناوونیشانی: (هەڵوەستەیەکی پێویست)دا دەقی ئەو سێ گێڕراوەیە دێنین.

﴿أَن يُتِمَّ ٱلرَّضَاعَةَ (٢٣٣)﴾، واتـە: دایـکان دوو سـاڵی ڕەبـەق شـیر دەدەن بـە منداڵەکانیان، بـۆ هـەر کەسێک، بیـەوێ مـاوەی شـیر پێـدان تـەواو بـکات، (کـە دوو سـاڵە)، ئنجا لـەو سـیی مانگـە، دوو سـاڵی لـێ جیابکـەوە، کـە بیسـت و چـوار مانگـە، شـەش مانـگ دەمێنێتـەوە، بـۆ لای کەمـی تۆڵداربـوون و دووگیـان بـوونی ئافـرەت، ئنجـا دەفەرمـوێ: لـە مـاوەی سـی (٣٠) مانگانـدا، هـەم پێـی تۆڵداربـووە، هـەم لـە شـیری بڕیوەتـەوە، ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ أَشُدَّهُۥ وَبَلَغَ أَرْبَعِينَ سَنَةً﴾، هەتـا کاتێـک ئـەو منداڵـە گەیشـتە ئەوپـەڕی توانـای خـۆی و، دوای ئـەوەش گەیشـتە تەمـەنی چـڵ سـاڵیی، ئەوپـەڕی توانـای واتـە: لـە ڕووی عەقـڵ و جەسـتەوە کامـڵ بـوو، ﴿وَبَلَغَ أَرْبَعِينَ سَنَةً﴾، واتـە: لـە دوای گەیشـتن بـە ئەوپـەڕی توانـاو تاقـەتی خـۆی، ماوەیەکـی پـێ دەچـێ، تاکـو دەبێتـە چـڵ سـاڵ، ﴿قَالَ رَبِّ أَوْزِعْنِىٓ أَنْ أَشْكُرَ نِعْمَتَكَ ٱلَّتِىٓ أَنْعَمْتَ عَلَىَّ وَعَلَىٰ وَٰلِدَىَّ﴾، گـوتی: پـەروەدگارم! وام لـێ بکـە، هانمبـدەو بیخـە دڵـم: ئـەو چاکەیـەی لەگـەڵ منـت کـردوە، لەگـەڵ بـاب و دایکمـت کـردوە، سوپاسـگوزاریی بـۆ بکـەم، ﴿وَأَنْ أَعْمَلَ صَٰلِحًا تَرْضَىٰهُ﴾، هەروەهـا خورپـەم بـۆ بکـەو بیخـە دڵـم، کـە کردەوەیەکـی بـاش بکـەم، تـۆ لێـی ڕازی بـێ و پەسـندی بکـەی، ﴿وَأَصْلِحْ لِى فِى ذُرِّيَّتِىٓ﴾، هەروەهـا لـە وەچەکەشـمدا، چاکسـازییم بـۆ بکـە، واتـە: ڕۆڵەکانـم صاڵـح و چـاک بکـە، ﴿إِنِّى تُبْتُ إِلَيْكَ وَإِنِّى مِنَ ٱلْمُسْلِمِينَ﴾، بـە دڵنیایـی مـن بـۆ لای تـۆ گەڕامـەوەو مـن لـە ملکەچانـم، (لـە ملکەچانـم بـۆ تـۆ).

﴿أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ نَتَقَبَّلُ عَنْهُمْ أَحْسَنَ مَا عَمِلُوا۟﴾، ئـا ئەوانـە ئـەو کەسـانەن، باشـترینی ئـەوەی کردوویانـە لێیـان وەردەگریـن، کـە کـردەوە چاکەکانـن، ئەوانـە باشـترین کردەوەیانـن و خـوا لێیـان وەردەگـرێ، ﴿وَنَتَجَاوَزُ عَن سَيِّـَٔاتِهِمْ﴾، چاوپۆشـیی دەکەیـن، لـە خراپەکانیـان یاخـود: خراپەکانیـان دەبوێرین و لێیـان دەگەڕێین، واتە: چاوپۆشـییان لـێ دەکەیـن و دەیـان بووریـن لـە خراپەکانیـان، مـادام چاکەکانیـان هێنـدە بـن، کـە تـا تـەرازووی چاکانیـان قورسـتر بـێ.

﴿ فِيٓ أَصۡحَٰبِ ٱلۡجَنَّةِۖ ﴾، لـە نێـو هـاوەڵانی بەهەشـتدا، یـان: لە نێـو خاوەنانی بەهەشـتدا دەبـن، ﴿ وَعۡدَ ٱلصِّدۡقِ ٱلَّذِي كَانُواْ يُوعَدُونَ ﴾، ئـەوەش ئـەو بەڵێنـە ڕاسـتەیە کـە پێشـتر پێیـان دەدرا، ئـەو بەڵێنـەی خـوا داویـەتی بەڵێنێکـی ڕاسـتەو، دێتـە دی.

ئـەو دوو جـۆرە مرۆڤـەی خـوا ﷻ لێـرەدا بەراوردیـان پێـدەکات، دوو جـۆری پێچەوانـەی یەکدیـن، هـی یەکەمیـان کـە ڕابـرد، مرۆڤێکـی خواناس و خـوا پەرسـت و بـڕوادارە، بۆیـە لەگـەڵ بـاب و دایکیشـیدا وەفـادارو چاکـەکارەو، لـە خـوا داوا دەکات یارمەتیـی بـدات، سوپاسـگوزار بـێ بـۆی و، سـوپاسی ئـەو چاکـەو نیعمەتـەی بـکات کـە لەگـەڵ خۆیشـیدا کـردووەو لەگـەڵ بـاب و دایکیشـدا و، داوای ئـەوەی لـێ دەکات یارمەتیـی بـدات کـردەوەی بـاش بـکات، کردەوەیەکـی بـاشی وا کـە خـوا پەسـندی بـکات، ئنجـا داوای چاکسـازیی دەکات لـە وەچەکەیـدا، دواییـش ڕایدەگەیەنـێ کە من بـۆ لای تـۆ گەڕامـەوەو لـە ملکەچانـم بـۆ تـۆ، خـوای پەروەردگاریـش بەپێـی ئـەوەی شایسـتەیەتی مامەڵـەی لەگەڵـدا دەکات، ئەویـش ئەوەیـە کـە کـردەوە باشـەکانی لـێ قبـووڵ دەکات، لـە خراپەکانیشـیان دەبـوورێ و دەیـان بوێـرێ و، دەیانخاتـە نێـو هـاوەڵانی بەهەشـتەوەو، ئـەوەش بەڵێنێکـی ڕاسـتە لـە لایـەن خـوای موتەعالـەوە پێیـان دراوەو دێتـە دی.

ئنجـا دێتـە سـەر جـۆری دووەمـی ئـەو مرۆڤانـە، لـە ڕووی مامەڵەیانـەوە لەگـەڵ خـواوەو لەگـەڵ بـاب و دایکیانـدا.

﴿ وَٱلَّذِي قَالَ لِوَٰلِدَيۡهِ أُفّٖ لَّكُمَآ ﴾، هەروەهـا ئـەو کەسـە کـە بـە بـاب و دایکـی گـوت: ﴿ أُفّٖ لَّكُمَآ ﴾، ئـۆف بـۆ ئێـوە، واتـە: مـن لـە ئێـوە بێـزارم، وەک بێـزی لـە بـاب و دایکـی ببێتـەوەو، بێزاریـی و نارەزایـی دەربـبڕێ لـە بـاب و دایکـی، ﴿ أَتَعِدَانِنِيٓ أَنۡ أُخۡرَجَ ﴾، ئایـا بەڵێنـم پێـدەدەن، دەربهێنرێمـەوە، واتـە: لـە گـۆڕ دەربهێنرێمـەوە دوای ئـەوەی مـردووم، ﴿ وَقَدۡ خَلَتِ ٱلۡقُرُونُ مِن قَبۡلِي ﴾، بـە دڵنیایـی سـەدەکانیش لـە پێـش منـدا ڕابـردوون؟ واتـە: ئـەو هەمـوو سـەدانە ڕابـردوون، ئـەو هەمـوو بەشـەرانە

نێژراون و بە خاک سپێردراون و مردوون، کەسیان لە گۆڕستان نەهاتوونەوە، ئایا من چۆن زیندوو دەکرێمەوە؟ ﴿ وَهُمَا يَسْتَغِيثَانِ ٱللَّهَ ﴾، ئەوانیش (باب و دایکی) هاواریان دەکردە خوا، پەنایان دەبردە بەر خوا، واتە: لە خوا دەپاڕانەوەو هاواریان تێدەبەست (کە هیدایەتی کوڕەکەیان بدات)، ﴿ وَيْلَكَ ءَامِنْ ﴾، هاواریان دەکردو دەیانگوت: ئەی خوایە هاوار! ئەو کوڕە چی لێهاتوە! پێشیان دەگوت: ﴿ وَيْلَكَ ءَامِنْ ﴾، سزای سەخت بۆ تۆ، یان هاوار بۆ تۆ، بڕوابێنە، ﴿ إِنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ ﴾، بە دڵنیایی بەڵێنی خوا ڕاستەو، چەسپاوە، ﴿ فَيَقُولُ مَا هَٰذَآ إِلَّآ أَسَٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴾، (ئەویش لە وەڵامیاندا)، دەڵێ: ئەمە تەنیا ئەفسانەی پێشینانەو، چیرۆک و بەسەرهاتی بێ بنەمای ڕابردووانە.

هەڵبەتە لێرەدا کە گوتوویەتی: سەدەکان ڕابردوون و کەسیان لە گۆڕستان نەهاتۆتەوەو، منیش دەرناهێنرێمەوە، ئەو وایزانیوە: هەر لە دنیادا پرۆسەی زیندووکرانەوەو، سزاو پاداشت ئەنجام دەدرێ، نازانێ بە پێی سیستمێک کە خوای کارزان داینـاوە، ژیانی دنیا تەنیا شوێنی تاقیکردنەوەیە، وەک فەرموویەتی: ﴿ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلْمَوْتَ وَٱلْحَيَوٰةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ۚ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْغَفُورُ ﴿٢﴾ ﴾ الملك، هەروەها لە سوورەتی (**الكهف**)دا، دەفەرموێ: ﴿ إِنَّا جَعَلْنَا مَا عَلَى ٱلْأَرْضِ زِينَةً لَّهَا لِنَبْلُوَهُمْ أَيُّهُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ﴿٧﴾ ﴾، بەڵێ، ژیانی دنیا شوێنی تاقیکردنەوەیەو، شوێنی ئەنجام وەرگرتنەوە نیە، ئنجا ئەگەر لە گۆڕستان خەڵک هاتبایەوەو گوتبایان: حاڵ و وەزعمان وابوو! ئەو کاتە بڕواهێنانی خەڵک دەبووە شتێکی ناچاریی، بەڵام نەخێر ئەم قۆناغەی ئێستا قۆناغی تاقیکرانەوەیە، قۆناغی پاداشتدرانەوەو سزادران، دوایی دێتە پێش کە ڕۆژی دواییەو، ڕۆژی سزاو پاداشت، ڕۆژی زیندووکرانەوەیە، نەک ئێستای ژیانی دنیا.

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ أُولَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ حَقَّ عَلَيْهِمُ ٱلْقَوْلُ فِىٓ أُمَمٍ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِم مِّنَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ ۖ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ خَٰسِرِينَ ﴾، ئا ئەوانە کەسانێکن، ئەو جۆرە کەسە، بۆیەش بە کۆ دەیهێنێ، ئەگەرنا پێشێ بە تاک فەرموویەتی، بەڵام مەبەست پێی جۆر

(نـوع)ە، نـەک یـەک مرۆڤـی دیارییکـراو، ئـا ئەوانـە کەسـانێکن، قسـەیان لەسـەر چەسـپاوە، واتـە: بڕیـاری خوایـان لەسـەر چەسـپاوە، کـە هـەر کەسـێک بێبڕوابـێ، دەبـێ سـزا بـدرێ، ئـەو بڕیارەیـان لەسـەر چەسـپاوە، ﴿فِيٓ أُمَمٍ﴾، لـە نێـو کۆمەڵانێکدا، ﴿قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِم﴾، کـە لـە پێـش وانـدا ڕابـردوون، ﴿مِّنَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ﴾، لـە جنـدو لـە مرۆڤـان بـوون، ﴿إِنَّهُمْ كَانُوا۟ خَٰسِرِينَ﴾، بـە دڵنیایـی ئـەوان زۆر زیانبـارن.

﴿وَلِكُلٍّ دَرَجَٰتٌ مِّمَّا عَمِلُوا۟﴾، بـۆ هـەر کامێکیـان چەنـدان پلـەو پێگـە هـەن، بـە هـۆی ئـەوەوە کـە کردوویانـە، بەهـۆی کردەوەکانیانـەوە، هـەر کامێکیـان پێگەیەکـی دیارییکـراوی هەیـە، لێـرەدا بـە دڵنیایـی ئەوانـەی بێبـڕواو خراپـەکارن شـوێنی ئـەوان دۆزەخـەو، دۆزەخ پلـەکان (**دَرَجـات**)ی تێدانیـەو، دەڕەکاتی تێدایـە، (**دَرَكات**)یـش بـۆ دابەزیـن و داکشـانە بـەرەو خـوار، کەواتـە: هـی ئـەوان دەرەکاتـە، وەک خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿إِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ فِي ٱلدَّرْكِ ٱلْأَسْفَلِ مِنَ ٱلنَّارِ وَلَن تَجِدَ لَهُمْ نَصِيرًا ﴿١٤٥﴾﴾ **النسـاء**، واتـە: بـە دڵنیایـی مونافیقـەکان لـە پلـەی ژێـرەوەی ئاگـری دۆزەخـدان، بـەڵام ئەمـە لێرەدا زاڵکـردنی پلـەی چاکەکارانـە بەسـەر هـی تاوانبارانـدا، بۆیـە بـە (**دَرَجـات**) هێناویـەتی، دەشـگونجێ دەرەجـە، هـەم بـۆ خـوارو هـەم بـۆ سـەر بەکاربهێـنرێ، ﴿وَلِيُوَفِّيَهُمْ أَعْمَٰلَهُمْ﴾، (خـوا ﷻ زیندوویـان دەکاتـەوە) تاکـو کردەوەکانیـان بـە تەواویـی بداتـەوە، واتـە: سزاو پاداشـتی کردەوەکانیـان بـە تەواویی بداتـەوە، ﴿وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ﴾، لـە حاڵێکـدا ئـەوان سـتەمیان لـێ ناکـرێ.

لـە کۆتایـی دا بـاسی سـەرەنجامی ئەوانـە دەکات کـە لـە دنیـادا هـەر بـە خۆشـگوزەرانیی و بـە ڕابـواردن دەیبەنـە سـەر، بـێ ئـەوەی سـەر هەڵبـڕن بـەرەو خـواو تەماشـا بکـەن، داخـۆ ئـەوەی پێـی ڕادەبوێـرن و پێـی دەگوزەرێنـن، حەڵاڵـە یـان حەرامـەو، پاکـە یـان پیسـە؟.

دەفەرمـوێ: ﴿وَيَوْمَ يُعْرَضُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ عَلَى ٱلنَّارِ﴾، ئـەو ڕۆژە کـە ئەوانـەی بێبـڕوان ڕادەنوێدرێـن لەسـەر ئاگـر، واتـە: ئاگریـان پێشـان دەدرێ، بۆیـە هەندێـک گوتوویانـە:

ئەمە لە شێوەی هەڵگەڕاوە (**مقلوب**)یە، واتە: (**تُعْرَضُ النَّار عَلَيْهِم**)، ئاگر بۆ وان ڕادەنوێنرێ، بەڵام دەشگونجێ ئەوان ڕابنوێنرێن و ببرێنە سوێی ئاگرەکەو تەماشای بکەن، ﴿ أَذْهَبْتُمْ طَيِّبَٰتِكُمْ فِى حَيَاتِكُمُ ٱلدُّنْيَا ﴾، {پێیان دەگوترێ:} خۆشیی و لەززەت و بژیوە خۆشەکانی خۆتان لە ژیانی دنیاتاندا بڕاند، کۆتاییتان پێ هێنان، ﴿ وَٱسْتَمْتَعْتُم بِهَا ﴾، بەهرەتان لێی وەرگرتن، ﴿ فَٱلْيَوْمَ تُجْزَوْنَ عَذَابَ ٱلْهُونِ ﴾، ئەمڕۆش سزای ڕیسوایی و زەبوونیی دەچێژن، ﴿ بِمَا كُنتُمْ تَسْتَكْبِرُونَ فِى ٱلْأَرْضِ ﴾، بە هۆی ئەوەوە کە خۆتان بەزلدەگرت لە زەویدا، ﴿ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ ﴾، بە ناهەق، هەڵبەتە خۆ بەزلگرتن لە زەویدا هەر بەناهەقە، بەڵام ئەوە بۆ زیاتر قێزەون پێشاندانی خۆ بەزلگرییەکەیانە، ﴿ وَبِمَا كُنتُمْ تَفْسُقُونَ ﴾، بەهۆی ئەوەشەوە کە لادانتان دەکرد، تاوانتان دەکردو، لاڕێ بوون، هەم بەهۆی خۆ زلگریی بەسەر بەندەکانی خواداو، هەم بەهۆی لادان و تاوانتانەوە لە بەرانبەر خواداو، لادانتان لە شەریعەتی خوا، تووشی ئەمڕۆژە بوون، ئنجا کە لەوێ خۆ بەزلگربوون، لێرە سزای ڕیسوایی و زەبوونیی دەچێژن.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

خـوا مرۆڤـی ڕاسـپاردوە بـە چاکەکاریـی لەگـەڵ بـاب و دایکیـدا، بـە تایبـەت دایکـی کـە بـە زەحمـەت و ناڕەحەتیـی زۆر بـە تـۆڵی هەڵیگرتـوەو دوایـی دایناوەو، مانـەوەی لـە تۆڵـداو شـیر پێـدانی سـیی مانگـی خایانـدوە، بۆیـە داوای لـە خـوا کـردوە کـە واداری بـکات بـە سوپاسـگوزاریی و کـرداری بـاش و، وەچەکـەی چـاک بـکات، ئـەو جـۆرە کەسـانەش خـوا ﷻ چاکەکانیـان وەردەگـرێ و لـە خراپەکانیـان دەبـوورێ، ئـەوەش بەڵێنێکـی ڕاسـتە، خـوا داویـەتی و بـە مسـۆگەریی دێتـە دی:

خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ وَوَصَّيْنَا ٱلْإِنسَٰنَ بِوَٰلِدَيْهِ إِحْسَٰنًا ۖ حَمَلَتْهُ أُمُّهُۥ كُرْهًا وَوَضَعَتْهُ كُرْهًا ۖ وَحَمْلُهُۥ وَفِصَٰلُهُۥ ثَلَٰثُونَ شَهْرًا ۚ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ أَشُدَّهُۥ وَبَلَغَ أَرْبَعِينَ سَنَةً قَالَ رَبِّ أَوْزِعْنِىٓ أَنْ أَشْكُرَ نِعْمَتَكَ ٱلَّتِىٓ أَنْعَمْتَ عَلَىَّ وَعَلَىٰ وَٰلِدَىَّ وَأَنْ أَعْمَلَ صَٰلِحًا تَرْضَىٰهُ وَأَصْلِحْ لِى فِى ذُرِّيَّتِىٓ ۖ إِنِّى تُبْتُ إِلَيْكَ وَإِنِّى مِنَ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴿١٥﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ نَتَقَبَّلُ عَنْهُمْ أَحْسَنَ مَا عَمِلُوا۟ وَنَتَجَاوَزُ عَن سَيِّـَٔاتِهِمْ فِىٓ أَصْحَٰبِ ٱلْجَنَّةِ ۖ وَعْدَ ٱلصِّدْقِ ٱلَّذِى كَانُوا۟ يُوعَدُونَ ﴿١٦﴾ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە چواردە بڕگەدا:

١)- ﴿ وَوَصَّيْنَا ٱلْإِنسَٰنَ بِوَٰلِدَيْهِ إِحْسَٰنًا ﴾، هەروەها مرۆڤمان ڕاسپارد بە چاکەکاریی لەگەڵ باب و دایکیدا.

وشـەی (إِحْسَـانًا) خوێندراویشـەتەوە: (حُسْـناً) هـەروەک لـە سـوورەتی (**العنكبـوت**) دا، بـەو شـێوەیە هاتـوە، لەوێـش دیسـان خوێندنـەوەی (إِحْسَـانًا)یش هـەر هاتـوەو هەریـەک واتایـان هەیـە، (**أي: وَصَّيْنَـاهُ أَنْ يُحْسِـنَ إِلَيْهِـمَا إِحْسَـانًا أَو حُسْـنًا**)، مرۆڤـمان

ڕاسپاردوە کە بە چاکەکاریی لەگەڵیاندا مامەڵە بکات، چاکەیان لەگەڵدا بکات، واتایەکی دیکەشی هەیە: (إِحْسَانًا مَفْعُولٌ بِهِ لِوَصَّيْنَا المضَمَّنِ مَعْنَى أَلْزَمْنَا)، یانی: (إحساناً) بەرکاری (وصَّينا)یە کە مانای (ألزمنا) {پابەندمان کردوە}ی خراوەتە نێو، لە ڕووی ڕێزمانییەوە ئەم ڕستە قورئانییە، بە دوو جۆر مانا دەکرێ:

**یەکەم:** (أي: وَصَّيْنَاهُ أَنْ يُحْسِنَ إِلَيْهِمَا إِحْسَانًا أو حُسْنًا)، ڕامانسپاردوە کە بە چاکەکردن چاکەیان لەگەڵدا بکات.

**دووەم:** لەسەرمان پێویستکردوە و پابەندمان کردوە، بە چاکە لەگەڵداکردنیان.

ئەو کاتەش (وَصَّيْنَا) هەم مانای ڕاسپاردن دەگرێتەوەو، هەم مانای پابەند کردن، ئەو بنچینەیەش لە زمانی عەرەبییدا پێی دەگوترێ: (قَاعِدَة التَّضْمِين) کە کردارێک عادەت نەبێ بە پیتێک بەرکاربخوازێ، ئەگەر بەو پیتە کە عادەت نیە بەرکاری پێ بخوازێ، یان پەکی لەسەری نەکەوتوە، بەو پیتە بەرکاری خواست، ئەو کاتە وێڕای مانا ئەصڵییەکەی خۆی، مانایەکی دیکەشی دەخرێتە نێو.

ئنجا خوا ﷻ ئەوە ڕووندەکاتەوە کە بۆچی مرۆڤی ڕاسپاردوە لەگەڵ باب و دایکیدا چاکە بکات و، پابەندی کردوە بە چاکەکاریی لەگەڵ باب و دایکیدا؟ دەفەرموێ:

**٢)- ﴿حَمَلَتْهُ أُمُّهُ كُرْهًا وَوَضَعَتْهُ كُرْهًا﴾**، دایکی بە ڕەنج و نارەحەتیی هەڵیگرتوە {لە سکی خۆیدا، کە پێی تۆلداربووە)، چونکە جاری وا هەیە ئافرەتێک زیاتر لە کۆرپەلەیەکی لە سکدایە، بۆیە وشەی دووگیان ڕێک نایەتەوە، ئەدی ئەو ئافرەتەی بە جارێک دوو منداڵی دەبێ، سێی دەبن، چواری دەبن، زیاتری دەبن!! لەبەر ئەوە واباشە بگوترێ: تۆلدار، هەڵبەتە وشەی ئاوس بەکاردەهێنرێ، بەڵام جاری وایە، ئەم وشەیە بە عورف مانایەکی خراپ دەگەیەنێ، بۆیە من بەکاری ناهێنم و زیاتر بۆ ئاژەڵ بەکاردەهێنرێ، هەرچەندە ئەگەر بۆ مرۆڤیش بەکاربهێنرێ، ئەگەر بە عورف مانای خراپی نەبێ، شتێکی ڕەوایە، (تۆل)یش واتە: سکی ئافرەت کە منداڵی تێدابێ، ئنجا یەکە، دووە، سێیە، چەندە،

خوا ﷻ دەفەرموێ: دایکی هەڵیگرتوە بە ناڕەحەتیی و داشیناوە هەر بە ناڕەحەتیی، وشەی (**كَرْهًا**)یش هەردووکیان خوێندراونەوەش: (**كُرْهاً**)، (**كَرْها وَكُرْهاً**) واتە: بە قورسیی و ناڕەحەتیی، هەردوو خوێندراوەکەش یەک واتایان هەیە.

٣)- ﴿ وَحَمْلُهُۥ وَفِصَـٰلُهُۥ ثَلَـٰثُونَ شَهْرًا ﴾، پێ تۆلدار بوونی و لە شیر بڕینەوەی لە ماوەی سیی مانگدا، واتە: سیی مانگی خایاندوە، (**الفَصْلُ وَالفِصَالُ كَالْفَطْمِ وَالفِطَام**)، (**فَصْل وفِصَال**) وەک (**فَطْمُ وفِطَام**)ن، واتە: لە شیر بڕینەوە، لە مەمک بڕینەوەی منداڵ.

لێرەدا زانایان ئەوەیان هەڵهێنجاوە کە کەمترین ماوەی تۆلداربوونی ئافرەت، حەملی ئافرەت بریتیە لە شەش مانگ، چونکە خوا ﷻ لێرەدا دەفەرموێ: لە سکدا هەڵگیرانی و لە شیر بڕانەوەی لە ماوەی سیی مانگدا، لە سووڕەتی (**البقرة**)شدا، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَٱلْوَٰلِدَٰتُ يُرْضِعْنَ أَوْلَـٰدَهُنَّ حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِ ۖ لِمَنْ أَرَادَ أَن يُتِمَّ ٱلرَّضَاعَةَ ﴿٢٣٣﴾ ﴾**البقرة**، دایکان دوو ساڵی ڕەبەق شیر دەدەن بە منداڵەکانیان، بۆ هەر کەسێ بیەوێ ماوەی شیر پێدان تەواو بکات، ئنجا ئەگەر ماوەی شیر پێدانی تەواو، بۆ هەر کەسێ بیەوێ ماوەکەی تەواو بکات، دوو ساڵ بێ، واتە: دوو دوازدە مانگیی کە دەکاتە بیست و چوار مانگ، بیست و چوار لە سیی مانگ دەربکرێ، دەمێنێتەوە شەش مانگ، کەواتە: دەگونجێ منداڵ بە شەش مانگیی لە دایک ببێ.

لەو بارەشەوە بەسەرهاتێک دەگێڕنەوە: ئافرەتێک بە شەش مانگیی تۆلدار دەبێ و دەیبەن بۆ لای حوکمڕانی مسوڵمانان، چەند ڕیوایەتێک هەن:

**أ**- هەندێک دەڵێن: بردوویانە بۆ لای عومەر (خوا لێی ڕازی بێ)، ئەو کاتە ئەو حوکمڕان و فەرماندەی بڕواداران بووە.

**ب**- هەندێک دەڵێن: بردوویانە بۆ لای عوسمان (خوا لێی ڕازی بێ) و، بە تەمابوون سزای بدەن، بەڵام دوایی لە ڕیوایەتێکدا دەڵێن: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ)، لە ڕیوایەتێکدا دەڵێن: عەلی کوڕی ئەبوو تالیب (خوا لێی ڕازی بێ)، کە لێیان

کۆڵیەوە، گوتی: دەگونجێ ئافرەت لای کەمی شەش مانگ کۆرپەی لە سکدا بێ و، بەڵگەی بەم ئایەتە هێنایەوە، بە بەراورد لەگەڵ ئەو ئایەتەی (٢٣٣)ی سوورەتی (**البقرة**)دا.

کە ئەوەش شتێکی ڕێک و ڕاستەو، لە ڕووی زانستییشەوە منداڵ جاری وا هەیە، بە شەش مانگیی، یان بە حەوت مانگیی، یان بە هەشت مانگیی دەبێ و، مەرج نیە حەتمەن بگاتە نۆ مانگیی، بەڵام دەڵێن: ئەگەر منداڵ بە شەش مانگیی کەمتر لە دایک ببێ، ناژی.

٤)- ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ أَشُدَّهُۥ ﴾، هەتا کاتێک کە گەیشتە تەواوی هێزو پێزی خۆی، (**أي: بَلَغَ كَمَالَ قُوَّتِهِ**).

٥)- ﴿ وَبَلَغَ أَرۡبَعِينَ سَنَةً ﴾، گەیشتە چڵ ساڵ، پێشتر باسی (**أشُدّ**)مان کرد، (**الأَشُدُّ: اشْتِدَادُ القِوى العَقْلِيَّة وَالجَسَدِيَّة، وَهُوَ جَمْعٌ لَا مُفْرَدَ لَهُ، أو جَمْعُ شِدَّة، أو جَمْعُ شَدّ أو شُدّ أو شِدّ**)، (**أَشُدّ**) بریتیە لە پێگەیشتنی هێزە عەقڵیی و، جەستەییەکان، هێزە دەروونیی و، ڕواڵەتییەکانی مرۆڤ، وشەی (**أشُدّ**) کۆیە، بەڵام تاکی لە بێژەی خۆی نیەو، هەندێکیش گوتوویانە: (**أَشُدّ**) کۆی (**شِدّة**)یە، وەک چۆن (**أَنْعُم**) کۆی (**نِعْمَة**)یە، هەندێکیش گوتوویانە: (**أَشُدّ**) کۆی (**شَدّ**)یە، یاخود کۆی (**شَدّ**)یان (**شُدّ**) یان (**شِدّ**)ەو، لەکاتی شیکردنەوەی وشەکاندا قسەمان لەبارەوە کردوە.

ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ أَشُدَّهُۥ وَبَلَغَ أَرۡبَعِينَ سَنَةً ﴾، ئەمە لێی وەردەگیرێ کە تەمەنی چل ساڵیی، لە پشت پێگەیشتنی دەروونیی و ڕواڵەتیی مرۆڤەوەیە، واتە: زیاترە، بۆیە زۆرێک لە زانایان گوتوویانە: (**أَشُدّ**) لە تەمەنی سیی ساڵیی زیاتر نیە، بگرە هەندێک هەژدە (١٨)یان داناوەو لە ئەندازەکەیدا ڕاجیاییان هەیە، هەندێکیش گوتوویانە: مەبەست لە (**أَشُد**) چڵ ساڵییە، چونکە مرۆڤ لە ڕووی عەقڵییەوە لە چڵ ساڵییدا کامڵ دەبێ، بۆیەش خوا ﷻ هیچ پێغەمبەرێکی لە تەمەنی چل ساڵیی کەمتر نەناردوە.

ئنجا ئەو کەسە کاتێک کە گەیشتە ئەوپەڕی تواناو پێگەیشتنی خۆی و گەیشتە تەمەنی چل ساڵیی.

٦)- ﴿قَالَ رَبِّ أَوْزِعْنِيٓ أَنْ أَشْكُرَ نِعْمَتَكَ ٱلَّتِيٓ أَنْعَمْتَ عَلَيَّ وَعَلَىٰ وَٰلِدَيَّ﴾، گوتی: پەروەردگارم! وادارم بکە، سوپاسی ئەو چاکەیەت بکەم، کە لەگەڵ منتدا کردووەو لەگەڵ باب و دایکمتدا کردوە، (**أَوْزِعْنِي**) هەموو توێژەرەوان، یان زۆربەی هەرە زۆریان بە (**أَلْهِمْنِي**)یان لێکداوەتەوە، واتە: ئیلهامم بۆ بکە، خورپەم بۆ بکە، کە سوپاسگوزاریی ئەو چاکەیەت بکەم، لەگەڵ خۆمتدا کردووەو لەگەڵ باب و دایکمتدا کردوە، بەڵام لە ئەسڵدا (**أَوْزِعْنِي**) لە (**وَزَعَ**)وە هاتوە، (**وَزَعَهُ: أي كَفَّهُ، وَأَوْزَعَهُ بِالشَّيء أغْرَاهُ بِهِ**)، (**وَزَعَهُ**) واتە: نەیهێشت، ڕێی لێ گرت، بەڵام (**أوْزَعَهُ**)، واتە: هانیدا لەو شتە کە لەسەری سوور بێ.

ئنجا ئایا مانای (**أَوْزِعْنِي**) چۆن دەبێتە (**أَلْهِمْنِي**)؟ پسپۆڕانی زمان گوتوویانە: (**الهَمْزةُ للإِزَالَةِ، أي: اجْعَلْنِي لَا أَكُفُّ مِنَ الشُّكْرِ**)، هەمزە کە چۆتە سەر (**وَزَعَ**) بۆ لابردنە، واتە: وام لێ بکە واز نەهێنم لە سوپاسگوزاریی، یاخود وام لێ بکە کە وازبێنم لە سپڵەیی و سوپاسگوزار بم، بە هەردوو دیویدا ڕاستە.

٧)- ﴿وَأَنْ أَعْمَلَ صَٰلِحًا تَرْضَىٰهُ﴾، هەروەها وام لێ بکەو وادارم بکە، یاخود: خورپەو ئیلهامم بۆ بکە، کردەوەیەکی باش بکەم، تۆ لێی ڕازیبی، تۆ پەسندی بکەی، (**تَرْضَاهُ: صِفَةٌ للعَمَلِ الصَّالِح**)، (**تَرضاه**) ئاوەڵناوی کرداری باشە، واتە: کردەوەیەکی وا کە تۆ پەسندی بکەی، یارمەتییم بدە، کردەوەی وا بکەم.

٨)- ﴿وَأَصْلِحْ لِى فِى ذُرِّيَّتِىٓ﴾، لە وەچەکەشمدا چاکسازییم بۆ بکە، (**الزَّمَخْشَرِي**) ئاوای لێکداوەتەوە: (**هَبْ لِي الصَّلَاحَ فِي ذُرِّيَتِي وَأَوْقِعْهُ فِيْهِم**)، واتە: چاکییم لە وەچەکەمدا پێ ببەخشەو بیخە نێویان، چاکییان بخە نێو، بۆیەش بەو تەعبیرە هێناویەتی، واتە: با چاکە بە نێویاندا بڵاوبێتەوە، بەڵام (**الشهاب الخفاجي**)، گوتوویەتی: (**ضُمِّنْ مَعْنَى اللُّطْفِ لِذَا عُدِّيَ بِ»فِي» أي: إلطَفْ بِي**)، گوتوویەتی: (**أَصْلِح**) لێرەدا مانای لوتفی خراوەتە نێو، واتە: (**إلطَفْ بِي**) لەگەڵم دا لەتیف بە، بۆیە بە (**فـي**) بەرکاری خواستوە، ئەگەرنا دەیفەرموو: (**أَصْلِح ذُرِّيَّتِي**)، بەڵام کە دەفەرموێ: ﴿وَأَصْلِحْ لِى فِى ذُرِّيَّتِىٓ﴾، لە وەچەکەمدا، لە

ڕۆڵەکانمدا چاکییم پێ ببەخشە، ئەمە مانای لوتفی خراوەتە نێو، واتە: لە وەچەکەمدا چاکییم پێ ببەخشەو، لە گەڵیشمدا بە لوتف بە، هەڵبەتە هەم قسەکەی زەمەخشەریی جوانە، هەم هی (**الشهاب الخفافي**)یش.

٩)- ﴿إِنِّي تُبْتُ إِلَيْكَ﴾، بە دڵنیایی من بۆ لای تۆ گەڕاومەوە، بێگومان گەڕانەوە بۆ لای خوا ﷻ، بە پابەندیی بە ئایین و شەریعەتەکەیەوە دەبێ و، بە پەیڕەویی کردن لە پێغەمبەرەکەی ﷺ.

١٠)- ﴿وَإِنِّي مِنَ الْمُسْلِمِينَ﴾، بە دڵنیایی من لە ملکەچانم، واتە: لە ملکەچانم بۆ تۆ، ئنجا ئەمە مانای بەهێزترە لەوە کە فەرمووبای: (**وَإِنِّي مُسْلِمٌ لَكَ**)، دەفەرموێ: ﴿وَإِنِّي مِنَ الْمُسْلِمِينَ﴾، واتە: من چوومە نێو قووڵایی ڕیزی ئەوانەوە کە بۆ تۆ ملکەچن.

١١)- ﴿أُولَئِكَ الَّذِينَ نَتَقَبَّلُ عَنْهُمْ أَحْسَنَ مَا عَمِلُوا﴾، ئا ئەو کەسانە، ئەوانەن کە ئێمە باشترینی ئەوەی کردوویانە، لێیان وەردەگرین، پەسندی دەکەین، وشەی (**نَتَقَبَّل**) خوێندراویشەتەوە: (**يُتَقَبَّلُ مِنْهُم**)، ئەو کاتە دەبێ بگوترێ: (**أَحْسَنُ**)، (**يُتَقَبَّل مِنْهُم أَحْسَنُ مَا عَمِلُوا**) لێیان وەردەگیرێ باشترینی ئەوەی کردوویانە.

لێرەدا دەپرسین: بۆچی خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿أُولَئِكَ الَّذِينَ نَتَقَبَّلُ عَنْهُمْ أَحْسَنَ مَا عَمِلُوا﴾، لە ئەصڵدا (**تَقَبَّل مِنْهُ**)، یان (**تَقَبَّل مِنْهُم**)، بەڵام لێرەدا بۆچی (**تَقَبَّل**) بە (**عَنْ**) بەرکاری خواستوە؟ وەڵام: (**لِتَغْلِيبِ جَانِبِ الْمَدْعُوِّ لَهُمْ، لِأنَّ دُعَاءَ الوَالِدَيْنِ لِلأَوْلَادِ كَنِيَابَةٍ عَنْهُمْ**)، لەبەر ئەوەی لایەنی داوا بۆ کراو زاڵکراوە، چونکە پاڕانەوەی باب و دایک بۆ ڕۆڵەکانیان، وەک ئەوەیە کارێک لە جیاتی ئەوان بکەن، کەواتە: کە دەفەرموێ: ﴿نَتَقَبَّلُ عَنْهُمْ﴾، واتە: پاڕانەوەی ئەو باب و دایکە، بۆ وەچەکانیان وەردەگرین، واتە: پاڕانەوەکەیان لێ وەردەگرین بۆ وەچەکانیان و لە جیاتی وەچەکانیان، لە جیاتی منداڵەکانیان.

١٢)- ﴿وَنَتَجَاوَزُ عَن سَيِّئَاتِهِمْ﴾، خراپەکانیشیان دەبوێرین، ئەمیش خوێندراوەتەوە: (**وَيُتَجَاوَزُ عَنْ سَيِّئَاتِهِم**)، خراپەکانیان دەبوردرێن و، دەبوێردرێن، چاوپۆشییان لێ دەکرێ.

١٣)- ﴿ فِيٓ أَصۡحَٰبِ ٱلۡجَنَّةِۖ ﴾، لە ڕیزی هاوەڵانی بەهەشت دان، واتە: دەچنە نێو هاوەڵانی بەهەشتەوە، یاخود: خاوەنانی بەهەشتەوە، وشەی (**أَصْحَاب**) کۆی (**صَاحِب**)ە، ئەویش لە ئەصڵدا بە مانای هاوەڵ و هاودەم و هاوڕازە، بەڵام دوایی دەشخوازرێتەوە بۆ مانای خاوەن، چونکە خاوەنیش لە شتەکەی جیانابێتەوە، وەک چۆن ڕەفیق لە ڕەفیق جیانابێتەوە.

١٤)- ﴿ وَعۡدَ ٱلصِّدۡقِ ٱلَّذِي كَانُواْ يُوعَدُونَ ﴾، ئەوە ئەو بەڵێنە ڕاستەیە، کە پێیان دراوە، (**وَعْدَ الصِّدْق: مَصْدَرٌ مُؤَكِّدٌ، أي: وَعَدَهُم الله الوَعْدَ الصِّدق**)، (**وَعْدَ الصِّدْق**) چاوگێکی جەختکەرەوەیە، خوا ﷻ بەڵێنی پێ داون، بەڵێنی ڕاست، واتە: ئەوەی خوا ﷻ دەیفەرموێ: گفت و بەڵێنی خوایەو، ڕێک و ڕاستە، کە لە دنیادا پێیان دراوە، لە دواڕۆژدا ئاوا بۆیان دێتە دی، ئەوە ئەو بەڵێنە بوو، کە پێیان دەدرا لە دنیادا، لێرەدا خوا ﷻ قسە لە بەهەشت و، لە قیامەتدا دەکات، واتە: ئەوە ئەو بەڵێنە بوو کە لە دنیادا، پێیان دەدرا، ئێستا ئەوە بەرجەستە بووە لە بەهەشت داو، لەو نازو نیعمەتەدا، کە خوا لە بەهەشتدا بۆ ئەوانی ڕەخساندوە.

شایانی باسە: ئێمە لە سوورەتی (**الإسراء**)دا، کورتە باسێکمان لە بارەی چاکە لەگەڵ باب و دایکەوەدا کردوە، بۆیە لێرەدا وا بە خێرایی بەسەریدا ڕۆیشتین.

### مەسەلەی دووەم:

**باسی مرۆڤی بێبڕوای سپڵە بەرانبەر بە باب و دایکی و، بە ئەفسانە دانانی ئایین و، سەرەنجام چەسپاندنی سزای خوا لەسەری، لە نێو کۆمەڵانێکی زۆری جندو مرۆڤ داو، دانانی هەر کەسە لە چاکان و لە خراپان، لە پێگەو لە پلەی تایبەتیی خۆیدا، بێ ئەوەی ستەمیان لێ بکرێ:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِى قَالَ لِوَٰلِدَيۡهِ أُفّٖ لَّكُمَآ أَتَعِدَانِنِيٓ أَنۡ أُخۡرَجَ وَقَدۡ خَلَتِ ٱلۡقُرُونُ مِن قَبۡلِي وَهُمَا يَسۡتَغِيثَانِ ٱللَّهَ وَيۡلَكَ ءَامِنۡ إِنَّ وَعۡدَ ٱللَّهِ حَقّٞ فَيَقُولُ مَا هَٰذَآ إِلَّآ أَسَٰطِيرُ ٱلۡأَوَّلِينَ ﴿١٧﴾ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ حَقَّ عَلَيۡهِمُ ٱلۡقَوۡلُ فِيٓ أُمَمٖ قَدۡ خَلَتۡ مِن قَبۡلِهِم مِّنَ ٱلۡجِنِّ وَٱلۡإِنسِۖ إِنَّهُمۡ كَانُواْ خَٰسِرِينَ ﴿١٨﴾ وَلِكُلّٖ دَرَجَٰتٞ مِّمَّا عَمِلُواْۖ وَلِيُوَفِّيَهُمۡ أَعۡمَٰلَهُمۡ وَهُمۡ لَا يُظۡلَمُونَ ﴿١٩﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە چواردە بڕگەدا:

١)- ﴿ وَٱلَّذِى قَالَ لِوَٰلِدَيۡهِ أُفّٖ لَّكُمَآ ﴾، ئەو کەسەش کە بە باب و دایکی گوت: بێزاریی بۆ ئێوە، لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِى قَالَ لِوَٰلِدَيۡهِ ﴾، (**الَّذِي**) لێرەدا دەبێتە بەرکار بۆ کردارێکی مەزەندە کراو، وەک: (**أُذْكُرْ الَّذِي قَالَ لِوَالِدَيْه**)، یاد بکەوە ئەو کەسەی بە باب و دایکی خۆی گوت، ﴿ أُفّٖ لَّكُمَآ ﴾، وشەی (**أُفٌّ**)، هەم بە (**أُفِ**) خوێنراوەتەوە: ﴿ أُفّٖ لَّكُمَآ ﴾، هەم بە (**أُفَّ**)و هەم بە (**أُفٌّ**)یش، واتە: سێ جۆرە خوێندنەوەی هەن: (**أُفِ، أفَّ، أفٌ**)، ﴿ أُفّٖ لَّكُمَآ ﴾، واتە: (**أَتَضَجَّرُ مِنْكُمَا**)، من لێتان بێزارم، پێشتر گوتمان: (**أُفٌّ**) لە ئەصڵدا بە چڵکی نێو گوێ دەگوترێ، کە شتێکی قێزەونە، کە تۆ بە کەسێک دەڵێی (**أُفٌّ**)، واتە: من لێت بێزارم، وەک چۆن لە شتی پیس بێزارم.

ئنجا هیچ گومانی تێدانیە، کە دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِى قَالَ لِوَٰلِدَيۡهِ أُفّٖ لَّكُمَآ ﴾، وەک پێشتریش گوتمان: مەبەست پێی کەسێکی دیاریکراو نیە، بەڵکو مەبەست پێی کۆمەڵێکەو جۆرە خەڵکێکە کە وان، لێرەدا واپێدەچێ مەبەست پێی ئەوانە بوو بێ، کە باب و دایکیان مسوڵمان بوون، بەڵام خۆیان مسوڵمان نەبوون و،

بـاب و دایکیـان هەوڵیـان لەگـەڵ داون، ئەوانیـش بـەو شـێوەیە مامەڵەیـان لەگـەڵ بـاب و دایکیانـدا کـردوە.

٢)- ﴿أَتَعِدَانِنِيٓ أَنۡ أُخۡرَجَ﴾، ئایا بەڵێنم پێ دەدەن دەربهێنرێمەوە؟ (**أتعِدَانِنِي**)، خوێندراویشەتەوە: (**أَتَعِدَانِّي**)، ئایا بەڵێنم پێ دەدەن، کە بە تەئکید لێرەدا هەمزەی ئیستیفهام بۆ نکووڵیلێکردن و سەرسوڕمانە، واتە: شتێکی نکووڵیلێکراوەو شتێکە مرۆڤ سەری لێ سوڕدەمێنێ، ئێوە بەڵێنم پێ بدەن، کە من دەربهێنرێمەوە، واتە: لە گۆڕ دەربهێنرێمەوەو زیندوو بکرێمەوە جارێکی دیکە.

٣)- ﴿وَقَدۡ خَلَتِ ٱلۡقُرُونُ مِن قَبۡلِي﴾، لە حاڵێکدا سەدەکان لە پێش مندا، ڕابردوون، واتە: خەڵکی ئەو هەموو سەدانە ڕابردوون و، هیچکەس نەهاتۆتەوە لە گۆڕستان!.

ئێمە لە هۆی هاتنە خوارەوەکەیدا دوو ڕیوایەتمان هێنان:

١- مەڕوانی کوڕی حەکەم ویستوویەتی عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ئەبوو بەکر (خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ)، تۆمەتبار بکات بەوەی ئەم ئایەتە لە بارەی ئەو و شێوەی مامەڵەی لەگەڵ باب و دایکییدا، ئەبوو بەکرو (**أُمُّ الرُّومان**)ەوە، خوا لێیان ڕازی بێ، هاتۆتە خوار، بەڵام دایکمان عائیشە بەرپەرچی داوەتەوەو، گوتوویەتی: خوا ﷻ لە بارەی ئێمەوە هیچی نەناردۆتە خوار، جگە لە پاکیی دەربڕینی من، ئەویش لە سوورەتی (**النور**)دا، کە پێشتر تەفسیرمان کردوە.

٢- لە ڕیوایەتێکی دیکەدا هاتوە کە عائیشە گوتوویەتی: بەڵام من دەزانم و ئاگادارم خوا نەفرینی لە بابی مەڕوان کردوە، لە کاتێکدا کە مەڕوان لە پشتی بابی دا بووە، واتە: ئەوەیان ڕاستە، بەڵام ئەوەی کە عەبدوڕڕەحمانی پێ تۆمەتبار دەکات، ڕاست نیە، بێگومانیش (**صديقة بنت الصديق**) (خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ) ڕاست دەکات و، مەڕوانیش درۆی کردوەو، مەرج نیە مەڕوانی کوڕی حەکەم بەس ئەو ناڕاستیی و درۆیەشی بوو بێ.

٤)- ﴿ وَهُمَا يَسْتَغِيثَانِ ٱللَّهَ ﴾، ئەوانیش پەنایان دەبردە بەر خوا ﷻ، داوای یارمەتییان لە خوا دەکرد، هانایان بۆ خوا دەبرد، واتە: لە چنگ ئەو کوڕەیان، هاواریان بۆ خوا دەبرد، کە هیدایەتی بدات.

٥)- ﴿ وَيْلَكَ ءَامِنْ ﴾، (پێیان دەگوت:) سزای سەخت بۆ تۆ، بڕوا بێنە! وشەی (**وَيْل**) بە مانای خراپە دێ و، بە مانای شتی ناشیرین دێ و، بە مانای ئازارو سزا دێ، (**وَيْلَكَ**) بە دڵنیایی لێرەدا واتە: (**وَيْلٌ لَكَ**) سزای سەخت بۆ تۆ، هاوار بۆ تۆ، (**آمِنْ**) بڕوا بێنە، (**أي: اتصِفْ بِالإِيْمَان**) ئیمان بکە خەسڵەتی خۆت.

٦)- ﴿ إِنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ ﴾، بە دڵنیایی گفت و بەڵێنی خوا ڕاستەو، چەسپاوە، واتە: بەڵێنی خوا کە کاتەکە (**سَاعَة**) دێ، یان قیامەت دێ، ئاخیر زەمان دێ، یاخود ڕۆژی زیندوو کرانەوەو سزاو پاداشت دێ، چەسپاوەو ڕاستە.

٧)- ﴿ فَيَقُولُ مَا هَٰذَآ إِلَّآ أَسَٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴾، ئەویش (لە وەڵامی ئەواندا)، دەیگوت: ئەمە تەنیا ئەفسانەی پێشینانە، وشەی (**أَسَاطِيْر**) لە قورئاندا زۆرجار دووبارە بۆتەوە، (**أَسَاطِيْر**) پێشتریش گوتوومانە: کۆی (**أسْطُورة**)یە، (**أي: القِصَّةَ وَغَلَبَ اسْتِعْمَالُهَا فِي القِصَّة البَاطِلَةِ أو الخُرَافَة**)، (**أسْطَورة**) بە مانای چیرۆک و بەسەرهات دێ، بەڵام زیاتر بەکارهێنراوە بۆ بەسەرهاتێکی پووچ و بێ بنەما، یاخود بۆ ئەفسانە.

ئنجا کە ئەو بەو شێوەیە لەگەڵ باب و دایکییدا ڕەفتار دەکات، خوا ﷻ دەفەرموێ:

٨)- ﴿ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ حَقَّ عَلَيْهِمُ ٱلْقَوْلُ ﴾، ئا ئەوانە، ئەو کەسانەن، قسەیان لەسەر چەسپاوە، واتە: بڕیاری خوایان لەسەر چەسپاوە، کە دەبێ سزا بدرێن، وەک جاری دیکەش باسمکردوە، بە داخەوە زۆر لە ڕوونکەرەوانی قورئان، لە مانای ئەم تەعبیرەدا کە لە قورئاندا چەند جارێک دووبارە بۆتەوە:

أ- لە سوورەتی (**الزمر**)دا،

ب- لێرەدا و لە چەند شوێنێکی دیکەدا هاتوە، بۆ وێنە: خوا ﷻ لە کۆتایی سوورەتی (**هود**)دا، دەفەرموێ: ﴿ وَتَمَّتْ كَلِمَةُ رَبِّكَ لَأَمْلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنَ ٱلْجِنَّةِ وَٱلنَّاسِ أَجْمَعِينَ ﴿١١٩﴾ ﴾،

فەرمایشتی پەروەردگارت تەواو بووە، کە فەرموویەتی: دۆزەخ لە جندو مرۆڤان تێکڕایان، پڕ دەکەم، دەیئاخنم لێیان، گوتوویانە: ئەوە ئەو فەرمایشتەو ئەو بڕیارەی خوا بەسەر ئەوانەدا، چەسپیوە، کە دەبێ ئەوانیش بچنە دۆزەخ!!.

بەڵام لە ڕاستییدا ئەو مانا لێکدانەوەیە زۆر هەڵەیە، چونکە ئەمە ئەوەی لێ وەردەگیرێ کە هەر کەسێ خوا بڕیاری بۆ دابێ، دەبێ بچێتە دۆزەخ، تازە هەر دەبێ بچێ! بەڵام ئایەتەکە وا نافەرموێ، بەڵکو دەفەرموێ: ئەوانە کەسانێکن قسە لەسەریان چەسپاوەو، بڕیار لەسەریان چەسپاوە، کام بڕیار؟ ئەو بڕیارە کە هەر کەسێک بێبڕوا بێ، خوا سزای دەدات، نەک ئەو بڕیارە کە پێش ئەوەی ئەوان بن، خوا بڕیاری بۆ دابن، ئەوانە دەبێ هی دۆزەخ بن!! بەڵێ خوا ﷻ زانیویەتی کێ دەچێتە دۆزەخ و کێ دەچێتە بەهەشت، بەڵام زانیویەتی کێ دەچێتە دۆزەخ، بە ویستی خۆی، لەبەر ئەوەی بێبڕوا دەبێ و ئەو کردەوە خراپانە دەکات، بەویستی خۆی، هەروەها زانیویەتی کێ دەچێتە بەهەشت، لەبەر ئەوەی ئیمان دێنێ و ئەو کردەوە چاکانە دەکات بە ویستی خۆی، لە ڕاستییدا بڕیاری خوا ئەوەیە، کە بێبڕوایان سزا دەدات، ئەوە ئەو بڕیارەی خوایە لەسەریان چەسپاوە، بەڵام ئەو بڕیارەی خوا بۆچی لەسەریان چەسپاوە؟ لەبەر ئەوەی خۆیان پێشەکییەکانیان ساز کردوون، کە بریتین لە بێبڕوایی و شیرک و ئیلحادو، دوور لە خوایی و خراپەکاریی، ئەو پێشەکییانە کە ساز دەکرێن، ئەو دەرئەنجامەیان بەدوا دادێ، کە بریتیە لە چوونە دۆزەخ، ئنجا لەبەر ئەوەی بەپێی سیستمی خوا دێتە دی و، ئەو پرۆسەیە بە گوێرەی سیستمێکە خوا ﷻ دایناوە، بۆیە خوا پاڵیداوەتە لای خۆی، ئەگەرنا ئەوەی دەچێتە دۆزەخ، بە هۆی کوفرو کردەوەی خراپی خۆیەوە، دەچێتە دۆزەخ، هەروەک ئەوەی دەچێتە بەهەشت، چوونە بەهەشتەکەی هۆکارەکەی بریتیە لە ئیمان و کردەوەی باشی خۆی، بەڵێ بەهەشت بریتی نیە لە نرخ و تێچوو و بەهای ئەوەندە ئیمان و ئەوەندە کردەوانەی ئەو بڕوادارانە بوویانن، بەهەشت لەوە گەورەترەو بەخششی خوایە، بەڵام ئەوانە هۆکارن و بەبێ هۆکار سازکردن، کەس نە دەچێتە دۆزەخ، نە دەچێتە بەهەشت.

٩)- ﴿ فِىٓ أُمَمٍ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِم مِّنَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ ﴾، لە نێو کۆمەڵانێک دا لە جندو مرۆڤ، کە بەرلەوان ڕابردوون، لە نێو کۆمەڵانێکدا، کە لە پێش ئەواندا، گوزەراون و تێپەڕیون، لە جندو مرۆڤ.

١٠)- ﴿ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ خَـٰسِرِينَ ﴾، بە دڵنیایی ئەوان زیانبارن، ئەمە دوو واتایان هەڵدەگرێ:

**أ**- کە ئەو بڕیارەیان لەسەر چەسپاوە، ئەوان زیانبارن، (**خَاسِر**) ناوی بکەر (**إِسْم فَاعِل**)ە، یانی: خۆی زیانەکەی کردوە.

**ب**- بڕیاری خوایان بەسەردا چەسپاوە، کە بە دڵنیایی ئەوان زیانبارن.

١١)- ﴿ وَلِكُلٍّ دَرَجَـٰتٌ مِّمَّا عَمِلُوا۟ ﴾، بۆ هەر کامێکیان چەندان پلە هەن، بە هۆی ئەوەوە کە کردوویانە.

(**من**) لە (**مِّمَّا عَمِلُوا۟**)دا:

**أ**- دەگونجێ (**مِنْ**) (**تَبْعِيضِيّة**) بێ و، مەبەست لە (**مَا عَمِلُوا**)، (**جَزَاءَ مَا عَمِلُوا**)بێ، واتە: بەهۆی سزاو پاداشتی ئەوەوە کە کردوویانە، هەر کامێکیان چەند پێگەو پلەیەکی هەن.

**ب**- دەشگونجێ (**مِنْ**) (**إبتدائية**) بێ، کە ئەو کاتە مەبەست لە (**مَا عَمِلُوا**) سزاو پاداشتی ئەوە نابێ، کە کردوویانە، بەڵکو خودی کردەوەکەیان دەبێ، واتە: لە ئەنجامی ئەوەدا کە کردوویانە، هەر کامێکیان چەند پلەو پێگەیەکی هەن.

ئەو تەنوینەی سەر (**وَلِكُلٍّ**): (**تَنْوِيْنُ «كُلٌّ» عِوَضٌ عَمَّا تُضَافُ إلَيْهِ «كُل» أي: لِكُلٍّ مِن الفَرِيْقَيْنِ: المُؤْمِنِ البَارِّ بِوَالِدَيْهِ، وَالكَافِر الجَامِعِ بَيْنِ الكُفْرِ وَالعُقُوقِ**)، ئەم تەنوینە قەرەبووی ئەوەیە، کە وشەی (**كُلّ**) پاڵی دەدرێتە لا، واتە: بۆ هەر کام لەو دوو کۆمەڵە، چ بڕوادارەو چاکەکارە کە لەگەڵ باب و دایکی دا، چ بێبڕوایە، کۆکەرەوەکەی نێوان کوفرو سەرپێچیی باب و دایکی، هەر کامێکیان چەند پێگەیەکیان هەن، (**دَرَجَات: مَرَاتِبْ، دَرَجَات لأَهْلِ الإِيْمَانِ، وَدَرَكَات لأهْلِ الكُفْر، وَهَذَا تَغْلِيْبٌ لِلْدَّرَجَاتِ عَلَى الدَّرَكَاتِ**)، کە دەفەرموێ: (**دَرَجَات**) واتە: هەر کامێکیان،

لەو کۆمەڵە چەند پێگەیەکیان هەن و، هەر کەسە لە پێگەی خۆیدایە، ئنجا بە نسبەت بڕوادارانەوە، پلەکان بەرەو بەرزیی دەچن و، بە نسبەت بێبڕوایانەوە پلەکان سەرەو ژێر دەبنەوە، دەگوترێ: بە پلیکانەدا چووە خوار، بە پەیژەدا یان بە قادرمەدا سەرکەوت، وەک خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ فِى ٱلدَّرْكِ ٱلْأَسْفَلِ مِنَ ٱلنَّارِ (١٤٥) ﴾ **النساء**، بێگومان مونافیقەکان لە پلەی ژێرەوەی ئاگردان، بۆیەش (**دَرَجَات**) بەکارهاتوە لەبەر زاڵکردنی پلەکان بۆ بەرزیی، بەسەر پلیکانەکانی بەرەو خواردا، کە بۆ بێبڕوایانن، دەشگونجێ (**دَرَجَات**) کە کۆی (**دَرَجَة**)یە، یانی: هەر کامێک پێگەی خۆی هەیە، ئنجا پێگەکەی بەرەو خوارێ، یان بەرەو سەرێ، گرنگ ئەوەیە وشەی (**دَرَجَة**) دەگونجێ هەردووکیان بگرێتەوە.

١٣)- ﴿ وَلِيُوَفِّيَهُمْ أَعْمَٰلَهُمْ ﴾، بۆئەوەی کردەوەکانیان بە تەواویی بداتەوە خوێندراویشەتەوە: (**وَلَنُوَفِّيَهُمْ أَعْمَالَهُمْ**)، بۆ ئەوەی هەر کامێکیان کردەوەکانیان، واتە: سزاو پاداشتی کردەوەکانیان بداتەوە، یان بیاندەینەوە، (ل)ی کە چۆتە سەر (**لِيَوَفِّيَهُم**)، (**عِلَّةٌ لِمَحْذُوفٍ دَلَّ عَلَيْهِ الكَلَام، أي قَدَّرْنَا جَزَاءَهُمْ عَلَى مَقَادِيرِ دَرَجَاتِهِمْ لِتَوْفِيَتِهِمْ جَزَاءَ أَعْمَالِهِمْ، أي: نُجَازِيْهِمْ تَامّاً وَافِياً لَاغَبْنَ فِيْهِ**)، واتە: (ل)ی (**لِيَوَفِّيَهُم**) هۆکارە بۆ شتێک کە قرتێنراوە، بەڵام قسەکە دەیگەیەنێ، واتە: سزاو پاداشتەکەیانمان بە چەند ئەندازەیەک بە پێی پێگەکانیان دیارییکرد، تاکو پاداشت و سزای کردەوەکانیان بدەینەوە بە تەواویی، هی هەر کەسە بە تەواویی بیدەین، بێ ئەوەی لێی کەم بکرێ.

١٤)- ﴿ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴾، لە حاڵێک دا ئەوان ستەمیان لێ ناکرێ، واتە: ئەوانەی سزا دەدرێن، ستەمیان لێ ناکرێ، کە زیاد لە تاوانی خۆیان سزا بدرێن، ئنجا لێرەدا دەگونجا بڵێین: چاکەکارانیش ستەمیان لێ ناکرێ، کە لە پاداشتیان کەم بکرێتەوە، بەڵام لەبەر ئەوەی سیاقەکە هەمووی لە بارەی کەسانێکەوەیە، کە خراپەکار بوون، بۆیە هەر سزا دێتە زەینەوە، کاتێک کە باسی ئەوان دەکرێ، بۆیە: ﴿ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴾، واتە: لە سزادانیاندا، ستەمیان لێ ناکرێ کە زیاد لە ئەندازەی شایستەی خۆیان سزا بدرێن.

## مەسەلەی سێیەم و کۆتایی:

**لـە کاتێکـدا بێبڕوایان لەسـەر ئاگـر ڕادەنوێنرێـن، یان ئاگریـان لەسـەر ڕادەنوێنرێ، سەرزەنشـت دەکرێـن لەسـەر ڕابـواردن و زێدەڕۆییـان لـە خۆشـگوزەرانییدا بـە حەرامیـی و، پێشـیان دەگوتـرێ: ئەمـڕۆ سـزای ڕیسـوایی دەچێـژن، بـە هـۆی خـۆ بەزلگریـی و لادانتانـەوە:**

خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿وَيَوْمَ يُعْرَضُ الَّذِينَ كَفَرُوا عَلَى النَّارِ أَذْهَبْتُمْ طَيِّبَاتِكُمْ فِي حَيَاتِكُمُ الدُّنْيَا وَاسْتَمْتَعْتُم بِهَا فَالْيَوْمَ تُجْزَوْنَ عَذَابَ الْهُونِ بِمَا كُنتُمْ تَسْتَكْبِرُونَ فِي الْأَرْضِ بِغَيْرِ الْحَقِّ وَبِمَا كُنتُمْ تَفْسُقُونَ ﴿٢٠﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە شەش بڕگەدا:

١)- ﴿وَيَوْمَ يُعْرَضُ الَّذِينَ كَفَرُوا عَلَى النَّارِ﴾، ئەو ڕۆژەی ئەوانەی بێبڕوان لەسەر ئاگر ڕادەنوێنرێن، ئاگریان پێشان دەدرێ، یاخود: ئەوان دەبرێنە سوێی ئاگرو ئاگرەکە دەهێنرێ بۆ لای ئەوان، دەڵێ: (**عَرَضَ الشَّيءُ: ظَهَرَ وَأشْرَفَ، عَرَضَ لَهُ أمْرٌ، وَعَرَضَ الشَّيءَ: أظْهَرَهُ أبْرَزَهُ، وَعَرَضَ الدَّابَّةَ عَلَى الحَوْضِ: سَامَها أنْ تَشْرَبَ، وَهُوَ مِنَ المَقْلُوبِ، وَعَرَضَ عَلَيْهِ الشَّيءَ: أرَاهُ إيَّاهُ**)، وشەی (**عَرَضَ الشَّيءُ**) واتە: ئەو شتە دەرکەوت، چووە سوێی، (**عَرَضَ لَهُ أمْرٌ**) شتێکی هاتە پێش و بۆی دەرکەوت، (**عَرَضَ الشَّيءَ**)، واتە: شتەکەی دەرخست و ئاشکرای کرد، دەگوترێ: (**عَرَضَ الدَّابَّةَ عَلَى الحَوْضِ**)، ئاژەڵەکەی بردە سەر حەوزەکە، واتە: بردی تاکو بخواتەوە، حەوزەکەی پێشانی ئاژەڵەکە دا، دەگوترێ: (**وَعَرَضَ عَلَيْهِ الشَّيءَ: أرَاهُ إيَّاهُ**) واتە: شتەکەی پێشاندا، ئەو ڕۆژە کە ئەوانە دەبرێنە سەر ئاگرو، ئاگریان پێشان دەدرێ.

٢)- ﴿أَذْهَبْتُمْ طَيِّبَاتِكُمْ فِي حَيَاتِكُمُ الدُّنْيَا﴾، {پێیان دەگوترێ:} بژیوە خۆشەکان و خۆشیی و لەززەتەکانی خۆتانتان تەواو کردن و بڕاندن، لە ژیانی دنیادا، (**أذْهَبْتُم**) خوێندراویشەتەوە: (**أأذْهَبْتُم**) ئایا بڕاندنتان؟ بەڵام (**أذْهَبْتُم**) هەواڵ پێدانە، واتە: بڕاندنتان و تەواوتان کردن، خۆشیی و لەززەتەکانتان لە ژیانی دنیاتاندا، تەواوکردن، (**أأذهبتم**) پرسیارکردنی سەرزەنشتکارانەیە.

٣)- ﴿ وَٱسْتَمْتَعْتُم بِهَا ﴾، بەهرەتان لێی وەرگرت و لێیان بەهرەمەند بوون.

٤)- ﴿ فَٱلْيَوْمَ تُجْزَوْنَ عَذَابَ ٱلْهُونِ ﴾، ئەمڕۆش سزای ڕیسوایی دەچێژن، خوێندراویشەتەوە: (عَذَابَ الهَوان)، مانای (**الهَوَانُ: الذُّلُ**) زەبوونیی و ڕیسوایی، ئەمە: (**مِنْ إضَافَةِ المَوْصُوفِ إلى الصِّفَة**)، (**عَذَابَ الهُون**)، واتە: (**هُونَ العَذَاب**) ڕیسواییەکە کە بریتیە لە سزاو ئازار.

٥)- ﴿ بِمَا كُنتُمْ تَسْتَكْبِرُونَ فِى ٱلْأَرْضِ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ ﴾، بە هۆی ئەوەوە کە بە ناهەق خۆتان لە زەویدا بەزلدەگرت.

بێگومان هەموو خۆبەزلگرتنێک هەر بە ناهەقە، بەڵام ئەمە لێرەدا بۆ زیاتر ناقۆڵاو دزێو پێشاندانی خۆ بەزلگرییەکەیانە.

٦)- ﴿ وَبِمَا كُنتُمْ تَفْسُقُونَ ﴾، بە هۆی ئەوەشەوە کە ئێوە لادان و تاوانتان دەکرد، واتە: لە فەرمانبەریی خوا دەردەچوون و، لە جادەی شەریعەت دەرچووبوون، واتە: بەهۆی دوو شتەوە، ئێوە ئەمڕۆ سزای ڕیسوایی دەچێژن:

**یەکەم** لە بەرانبەر بەندەکانی خوادا، خۆتان بەزلدەگرت.

**دووەم:** لە بەرانبەر خواشدا لادان و سەرپێچیی و تاوانتان دەکردو، لە جادەی شەریعەتێک کە خوا بۆی دانا بوون، لاتان دەدا.

لێرەدا خوا ﷻ بۆمان باسی ئەوانە دەکات کە بێبڕوا بوون و، بە هۆی بێبڕواییەکەیانەوە، ملیان داوەتەوە ڕابواردنی ناشەرعیی و خۆشگوزەرانیی، وەک کرمە گڵ خۆرکەیەک، وەک ئاژەڵێک سەریان هەر بەرەو خوار بووەو، جارێک سەریان بەرەو خوا بەرز نەکردۆتەوە، بپێچنەوە لە حەڵاڵ و حەرام، لە چاکەو خراپە، بەڵکو چۆنیان پێ خۆش بووە، وایانکردوە، وەک شاعیرەکە دەڵێ:

**ومَن أَباح النَّفسَ ماتهـواهُ — فإنَّمـا إلهـهُ هـواه**

خوا بە لوتف و کەرەمی خۆی ئێمە لەو کەسانە بگێڕێ، کە بەهۆی ئیمان و تەقواوە، وا تەماشای ژیانی دنیا دەکەن، کە شوێنی تێدا تاقیکردنەوەیەو، هەر

بەو ئەندازەیە لە نیعمەتە ماددییەکانی دنیادا چێژ وەربگرن و بەهرەمەند دەبن، کە ژیانی دنیایان پێویستی پێیەتی، نەک بەو ئەندازەیەی کەیفیان لێیەتی.

## هەڵوەستەیەکی پێویست لەبەردەم مشت و مڕێکیی نێوان مەڕوانی کوڕی حەکەم و (عبدالرحمن بن أبي بكر الصديق)دا لەسەر حوکمی میراتیی و بنەماڵەیی

بەڕێـــزان!

ئێمە لە دەرسی پێشوودا، لە هۆی هاتنە خواری ئەم ئایەتە موبارەکەی کە دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِى قَالَ لِوَٰلِدَيۡهِ أُفّٖ لَّكُمَآ أَتَعِدَانِنِيٓ أَنۡ أُخۡرَجَ وَقَدۡ خَلَتِ ٱلۡقُرُونُ مِن قَبۡلِي وَهُمَا يَسۡتَغِيثَانِ ٱللَّهَ وَيۡلَكَ ءَامِنۡ إِنَّ وَعۡدَ ٱللَّهِ حَقّٞ فَيَقُولُ مَا هَٰذَآ إِلَّآ أَسَٰطِيرُ ٱلۡأَوَّلِينَ ﴿١٧﴾ ﴾**الأحقاف**، چەمک و واتای دوو ڕیوایەتمان هێنا، لێرەدا بە باشی دەزانم دەقی سێ ڕیوایەتان لە سەرچاوەکانی خۆیانەوە بێنم:

**أ)- {عَنْ يُوسُف بْنِ مَاهَكَ قَالَ: كَانَ مَرْوَانُ عَلَى الْحِجَازِ اسْتَعْمَلَهُ مُعَاوِيَةُ، فَخَطَبَ فَجَعَلَ يَذْكُرُ يَزِيدَ بْنَ مُعَاوِيَةَ لِكَيْ يُبَايَعَ لَهُ بَعْدَ أَبِيهِ، فَقَالَ: لَهُ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ أَبِي بَكْرٍ رضي الله عنهما، شَيْئًا فَقَالَ: خُذُوهُ فَدَخَلَ بَيْتَ عَائِشَةَ، فَلَمْ يَقْدِرُوا عَلَيْهِ، فَقَالَ مَرْوَانُ: إِنَّ هَذَا الَّذِي أَنْزَلَ اللَّهُ فِيهِ: ﴿ وَٱلَّذِى قَالَ لِوَٰلِدَيۡهِ أُفّٖ لَّكُمَآ أَتَعِدَانِنِيٓ أَنۡ أُخۡرَجَ وَقَدۡ خَلَتِ ٱلۡقُرُونُ مِن قَبۡلِي وَهُمَا يَسۡتَغِيثَانِ ٱللَّهَ وَيۡلَكَ ءَامِنۡ إِنَّ وَعۡدَ ٱللَّهِ حَقّٞ فَيَقُولُ مَا هَٰذَآ إِلَّآ أَسَٰطِيرُ ٱلۡأَوَّلِينَ ﴿١٧﴾ ﴾الأحقاف، فَقَالَتْ عَائِشَةُ رضي الله عنها: مِنْ وَرَاءِ الْحِجَابِ: مَا أَنْزَلَ اللَّهُ فِينَا شَيْئًا مِنَ الْقُرْآنِ إِلَّا أَنَّ اللَّهَ أَنْزَلَ عُذْرِي} (أخرجه البخاري: ٤٨٢٧، وقد جمع الحافظ بن حجر رحمه الله رواية هذا الحديث في فتح الباري: ج٨، ص٥٧٦، ٥٧٧).**

واتە: یوسفی کوڕە ماهەک دەگێڕێتەوە کە مەڕوان، موعاویەی کرد بووی بە حوکمڕان لە حیجاز، وتاریدا یەزیدی کوڕی موعاویەی باسکرد، بۆ ئەوەی لە

دوای بابی پەیمانی بۆ وەربگیرێ، بەیعەتی بۆ وەربگیرێ، (کە بابی جارێ هەر لە ژیاندایە)، عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ئەبووبەکر قسەیەکی گوت (لە ڕیوایەتەکەی دیکەدا دەیهێنین، کە قسەکەی چی بووە)، مەڕوان گوتی: بیگرن، ئەویش چووە نێو ماڵەکەی عائیشە، (خوا لێی ڕازی بێ) و نەیانتوانی بیگرن (لەبەر حورمەت و ڕێزی عائیشە)، مەڕوان گوتی: ئەمە ئەو کەسەیە، کە خوا لە بارەیەوە ئەم ئایەتەی ناردۆتە خوار: ﴿وَٱلَّذِى قَالَ لِوَٰلِدَيْهِ أُفٍّ لَّكُمَآ أَتَعِدَانِنِىٓ أَنْ أُخْرَجَ وَقَدْ خَلَتِ ٱلْقُرُونُ مِن قَبْلِى وَهُمَا يَسْتَغِيثَانِ ٱللَّهَ وَيْلَكَ ءَامِنْ إِنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ فَيَقُولُ مَا هَٰذَآ إِلَّآ أَسَٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿١٧﴾﴾، عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) لە پشت پەردەوە گوتی: خوا ﷻ هیچ شتێکی لە قورئانێدا، لە بارەی ئێمەوە نەناردۆتە خوار، جگە لەوەی خوا ﷻ پاکیی منی لە قورئاندا دابەزاندوە، مەبەستی پێیان ئایەتەکانی: (١١ - ٢٦)ی سوورەتی (النور)ە، کە پێشتر تەفسیرمان کردوون، واتە: ئەو شازدە ئایەتە، بەو بۆنەوە هاتوونەتە خوار، کە تۆمەت بۆ عائیشە کرا بوو، بوختانی پێکرا، (خوا لێی ڕازی بێ)، خوا لە سەرووی حەوت ئاسمانانەوە پاکیی و چاکیی عائیشەو (صەفوانی کوڕی موعەتتەلی سەهمیی)یشی ڕاگەیاند.

**ب)- {عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ زِيَادٍ، قَالَ: لَمَّا بَايَعَ مُعَاوِيَةُ لِابْنِهِ يَزِيدَ، قَالَ مَرْوَانُ: سُنَّةُ أَبِي بَكْرٍ، وَعُمَرَ، فَقَالَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ أَبِي بَكْرٍ: سُنَّةُ هِرَقْلَ، وَقَيْصَرَ، فَقَالَ: أَنْزَلَ اللَّهُ فِيكَ: ﴿وَٱلَّذِى قَالَ لِوَٰلِدَيْهِ أُفٍّ لَّكُمَآ ﴿١٧﴾﴾ الأحقاف، قَالَ: فَبَلَغَ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، فَقَالَتْ: كَذَبَ وَاللَّهِ مَا هُوَ بِهِ، وَلَكِنْ «رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لَعَنَ أَبَا مَرْوَانَ وَمَرْوَانُ فِي صُلْبِهِ» فَمَرْوَانُ فَضَضٌ مِنْ لَعْنَةِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ}**[1].

---

(١ ) أخرجه النسائي في تفسيره: ٥١١، والخطّابي في غريب الحديث (ج٢،ص ٥١٧)، والحاكم في المستدرك (ج٤، ص ٤٨١)، والإسماعيلي في المستخرج كما في الفتح (ج٨، ص ٥٧٦)، وابن أبي خيثمة في تأريخه، وابن مردويه في تفسيره كما في تخريج الكشّاف (ج٣، ص٢٨٢)، وعبد بن حميد، وابن المنذر في تفسيريهما، كما في (الدر المنثور)، (ج٧، ص٤٤٤) من طرق عن محمد بن زيان به قال الحاكم: هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ عَلَى شَرْطِ الشَّيْخَيْنِ، وَلَمْ يُخْرِجَاهُ، وتَعَقَّبَهُ الذهبي بقوله قلت: فيه انقطاع محمد لم يسمع من عائشة، وأخرج ابن أبي حاتم في تفسيره كما في فتح الباري (ج٨، ص٥٧٧)، وتفسير القرآن العظيم (ج٤، ص١٧١).

واتــە: موحەممــەدی کــوڕی زیــاد دەڵــێ: دوای ئــەوەی موعاویــە پەیــمانی بــۆ کوڕەکــەی وەرگــرت، (واتــە: لەســەر زمــانی مــەڕوان)، مــەڕوان گــوتی: ئــەوە هەمــان ڕێبازی ئەبوو بەکرو عومەرە (خوا لێیان ڕازی بێ)، عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ئەبوو بەکر، (خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ)، گوتی: بەڵکو ڕێبازی هیرەقڵ و قەیصەرە، (واتە: حوکمی میراتیی و بنەماڵەیی)، مەڕوان گوتی: ئەمە ئەو کەسەیە خوا ﷻ لە بارەیەوە ئەم ئایەتەی دابەزاندوە: ﴿ وَٱلَّذِى قَالَ لِوَٰلِدَيْهِ أُفٍّ لَّكُمَآ ﴿١٧﴾ ﴾، کە ئەوە بە عائیشە گەیشتەوە (خوا لێی ڕازی بێ)، عائیشە گوتی: بە خوا درۆ دەکات، عەبدوڕڕەحمان ئەو کەسە نیە، کە خوا ئەو ئایەتەی لە بارەوە دابەزاندوە، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ لەعنەتی لە بابی مەڕوان کردوە، کە مەڕوان لە پشتی بابیدا بووە، کەواتە: مەڕوانیش نەفرینی خوای بەرکەوتوە.

دیارە مەڕوان کوڕی حەکەمە (**الحكم بن العاصي**) کە بە کافریی مردوە، دایکمان عائیشە گوتوویەتی: کە پێغەمبەری خوا ﷺ لەعنەتی لە حەکەم کردوە، ئەو مەڕوانەش لە پشتی ئەوە.

**ج)- {مِنْ طَرِيْقِ عَنْ إِسْمَاعِيلَ بْنِ أَبِي خَالِدٍ، قَالَ: إِنِّي لَفِي الْمَسْجِدِ حِينَ خَطَبَ مَرْوان، فَقَالَ: إِنَّ اللَّهَ تَعَالَى أَرَى أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ فِي يَزِيدَ رَأْيًا حَسَنًا، وَإِنْ يَسْتَخْلِفْهُ فَقَدِ اسْتَخْلَفَ أَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ، فَقَالَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ أَبِي بَكْرٍ: أَهِرَقْلِيَّةٌ؟! إِنَّ أَبَا بَكْرٍ وَاللَّهِ مَا جَعَلَهَا فِي أَحَدٍ من ولده، ولا أحدٍ مِنْ أَهْلِ بَيْتِهِ، وَلَا جَعَلَهَا مُعَاوِيَةُ فِي وَلَدِهِ إِلَّا رَحْمَةً وَكَرَامَةً لِوَلَدِهِ. فَقَالَ مَرْوَانُ: أَلَسْتَ الَّذِي قَالَ لِوَالِدَيْهِ: أُفٍّ لَكُمَا؟ فَقَالَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ: أَلَسْتَ ابْنَ اللَّعِينِ الَّذِي لَعَنَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَبَاكَ؟ قَالَ: وَسَمِعَتْهُمَا عَائِشَةُ، فَقَالَتْ: يَا مَرْوَانُ، أَنْتَ الْقَائِلُ لِعَبْدِ الرَّحْمَنِ كَذَا وَكَذَا؟ كذبتَ، مَا فِيهِ نَزَلَتْ، وَلَكِنْ نَزَلَتْ فِي فُلَانِ بْنِ فُلَانٍ. ثُمَّ انْتَحَبَ مَرْوَانُ، ثُمَّ نَزَلَ عَنِ الْمِنْبَرِ حَتَّى أَتَى بَابَ حُجْرَتِهَا، فَجَعَلَ يُكَلِّمُهَا حَتَّى انْصَرَفَ}**[1].

---

(١ ) وسكت عنه الحافظ في الفتح، وقال الهيثمي في مجمع الزوائد: (ج٥، ص ٤١)، رواه البزار إسناد حسن، قلنا فيه عبدالله البهي مختلف فيه، وفي التقريب صدوق يخطيء فالحديث بمجموعها إن شاءالله حسن على أقل الأحوال، والحديث ذكره السيوطي في الدر المنثور (ج٧،

واتــە: ئیســماعیلی کــوڕی ئەبــوو خالیــد لــە عەبدوڵــڵای بەهیــی دەگێڕێتــەوە، گوتوویــەتی: مــن لــە مزگــەوت بــووم، کاتێــک مــەڕوان وتاریــدا، گــوتی: خــوای بــەرز لــە بــارەی یەزیــدەوە بۆچوونێکــی بــاشی پێشــانی فەرمانــدەی بــڕواداران داوە، (مەبەســتی موعاویــە بــوو) و، ئەگــەر موعاویــە یەزیــد بــکات بە جێنشــین، ئەبــوو بەکــرو عومەڕیش خــوا لێیــان ڕازی بــێ، خەڵکیــان لــە دوای خۆیــان کردۆتــە جێنشــین، (کە ئەو قســەیە درۆ بــووە، ئەبــوو بەکــرو عومەڕ کەسیان تەعیــن نەکــردوە، دیاریی بکــەن، بەس پێشــنیاریان کــردوە)، بۆیــە عەبدوڕڕەحــمانی کــوڕی ئەبــوو بەکــری صیددیــق خــوا لــە خــۆی و بــابی ڕازی بــێ، گــوتی: ئایــا هیرەقلایەتییــە؟! (لــە ڕیوایەتێکــی دیکــەدا، گــوتی: ئــەوە ڕێبــازی هیرەقــل و قەیصــەرە؟!) بــە خــوا ئەبــوو بەکــر کــەسی لە ڕۆڵــەکانی خــۆی پێشــنیار نەکرد، کەســیشی لــە خزمــانی خــۆی پێشــنیار نەکــرد، {هەروەهــا عومەریــش (خــوا لێیــان ڕازی بــێ)، بــەڵام لێــرەدا هــەر بــاسی ئەبــوو بەکــری کــردوە}، بــەڵام موعاویــە تەنیــا بۆیــە لــە ڕۆڵــەکانی خۆیــدا، [کــە یەزیــدی کوڕیــەتی] داینــا، هــەروەک ڕێزلێگرتنــی کوڕەکــەی و ســۆز نوانــدن لەگــەڵ کوڕەکــەی، (واتــە: نــەک وەک دڵســۆزیی بــۆ مســوڵمانان)، مەڕوانیــش پێــی گــوت: تــۆ ئــەو کەســە نــی کــە کاتی خــۆی بــە بــاب و دایکــی گوتــوە: (**أُفٍّ لَّكُمَا**)؟ بێزاریــی بــۆ ئێــوە؟ عەبدوڕڕەحمانیــش لــە وەڵامیــدا گــوتی: ئــەدی تــۆ کــوڕی ئــەو مەلعوونــە نــی، کــە پێغەمبــەری خــوا ﷺ بابتــی نەفریــن لێکــردوە؟ {مەشــهوور بــووە کــە پێغەمبــەری خــوا ﷺ نەفرینــی کــردوە لــە (**حَكَم**)ی بــابی مــەڕوان، مــەڕوانی کــوڕی حەکــەم}، دەڵــێ: عائیشــەش (خــوا لێــی ڕازی بــێ)، گوێــی لــە قســەکانیان بــوو، بۆیــە گــوتی: ئــەی مــەڕوان! ئــەوە تــۆ ئــەو بێــژەرەی کــە وات بــە عەبدوڕڕەحــمان گوتوە؟ درۆ دەکــەی، (واتــە: بــە هەڵــەدا چــووی)، ئــەو ئایەتــە لــە بــارەی ئــەوەوە نەهاتۆتــە خــوار، بەڵکــو ئــەو ئایەتــە لــە بــارەی فــڵانی کــوڕی فــڵان هاتۆتــە خــوار، دەڵــێ: دوایــی مەڕوانیــش گریــانی لــە قــوڕگ مابــوو (زانی کــە وەزعەکــەی خراپــە)، لــە مینبــەر دابەزیــی و چــوو بــۆ لای دەرگای ژوورەکــەی عائیشــەو، هــەر قســەی لەگەڵــدا کــرد، (بــە حیســاب تاکــو ڕازیــی بــکات) دوایــی ڕۆیشــت.

---

٤٤٤)، وزاد نسبته لابن مردویه) انظر: الإستيعاب في بيان الأسباب: ج٣، ص ٢١٣، ٢١٤ .

بۆیـەش بـە گرنگیـی پێدانـەوە ئـەو سـێ ڕیوایەتـەم هێنـان، کـە هـەردووک نووسـەرەکەی کتێبـی: (**الإستيعاب في بيـان الأسـباب**)، واتـە: (**سـليم بـن عيـد الهـلالي، محمـد بـن مـوسى آل نـصر**) دەڵێـن: ئـەم دەقـەی سـێیەمیش بـە کـۆی ڕیوایەتـەکانی بـەلای کەمـەوە سـەنەدەکەی چـاک (**حسـن**)ەو، پشـتی پـێ دەبەسـترێ.

بەڵـێ بۆیـە ئـاوا بـە وردیـی هێنـام، چونکـە بـە داخـەوە حوکمـی میراتیـی و بنەماڵەیـی لـە ئیسـلام دا، لەسـەر دەسـتی موعاویـەی کـوڕی ئەبـوو سـوفیان و بـە دانانی یەزیـدی کوڕیـەوە، داهێـنرا، ئنجـا ئایـا کـێ بۆتـە دەلاڵـی ئـەو لادانـە؟ مـەڕوانی کـوڕی حەکـەم، مەڕوانیـش ئـەوە حاڵیـەتی، کـە دایکـمان عائیشـە (خـوا لێـی ڕازی بـێ) خـۆی و بابیـشی ناسـیون، ئنجـا لـە حیجـاز ئـەو بـووەو، لـە عێـراق یەکێکـی دیکـە بـووەو، لـە میصـر یەکێکـی دیکـە، لەوانـەی کـە پێـڕی موعاویـە بـوون، ئەوانـەی ماسـتاویان بـۆ کـردووەو، تەماعیـان تێیـدا هەبـووە کـە کارێکیـان پـێ بسـپێرێ، بـەڵام ئایـا هـاوەڵان (خـوا لێیـان ڕازی بـێ)، لـەوە بـێ دەنـگ بـوون؟ نەخێـر ئەوەتـا عەبدوڕڕەحـمانی کـوڕی ئەبـوو بەکـر (خـوا لـە خـۆی و بـابی ڕازی بـێ)، کـە پیاوێکـی هـەق بێژبـووە، دایکـمان عائیشـە (خـوا لێـی ڕازی بـێ)، ئـاوا بەرگریـی لێـی دەکات، بەڵـێ برایـەتی، بـەڵام پیاوێکی پیاوانـە بـووەو، یەکێـک بـووە لەوانـەی عـەلی کـوڕی ئەبوو تاڵیبیـش زۆر خۆشویسـتووەو، پشـتگیریی لێـی کـردوە لـە بەرانبـەر نەیارەکانیـدا، لەبـەر ئـەوەی دەیـزانی لەسـەر هەقـە، عەبدوڕڕەحـمان لێـی وەدەنـگ دێ، کـە لـە ڕیوایەتێکـدا دەڵـێ: ئـەوە ڕێبـازی قەیصـەڕو هیرەقلـە، لـە ڕیوایەتێکـی دیکـەدا دەڵـێ: (**أهرقليـة**)، ئایـا هیرەقلایەتییـە؟ بـاب حوکمڕانیـی مسـوڵمانان یەکسـەر بـۆ کوڕەکـەی دابنـێ و، بیـکات بـە میراتیـی و بنەماڵەیـی؟ کەواتـە: بـا بزانیـن ئـەو حوکمـی میراتیـی و بنەماڵەییـە، کـە لـە موعاویـەی کـوڕی ئەبـوو سـوفیانەوە داکەوتـوە، هیـچ پەیوەندیـی بـە ئیسـلامەوە نیـە، بەڵکـو پەیوەندیـی بـە هیرەقـل و قەیصـەڕو کیسـڕاوە هەیـەو، هاوەڵانیـش لێـی بـێ دەنـگ نەبـوون، حوسـێنی کـوڕی عەلییـش کـە لـە کەربەلا شـەهید دەبـێ و، هـاوەڵانی دیکەش عەبدوڵڵای کـوڕی عومـەڕ، کـە هـەر لـە (**صحيـح البخـاري**)دا هاتـوەو عەبدوڵڵا کـوڕی زوبەیـرو زۆری دیکـە لـە هـاوەڵانی دیکـە، (خـوا لێیـان ڕازی بـێ)، بـێ دەنـگ نەبـوون،

بەڵام شتەکەیان لەبەر نەڕۆیشتوە.

ئنجا هەندێک کەس من کە جار جار باسی موعاویەی کوڕی ئەبوو سوفیانم کردوە خوا لێی ببوورێ، کە گوتوومە هەڵەی بووە، لە ژێر کاریگەریی ئەو بیرۆکانەی کە لە کەنداوەوەو لەو وڵاتانەوە کە حوکمی بنەماڵەیی و میراتییان تەبەنیی کردوە، بە ناوی ئیسلامەوە، کە ئەو بیرۆکەیە لەوێوە ڕەواجی پێ دەدرێ، بەڵێ لە ژێر کاریگەریی ئەو بیرۆکانەدا، ڕەخنە لە بەندە دەگرن، دەڵێن: فلانکەس واو وای بە موعاویە گوتوە!! هیچم پێ نەگوتوە بەس دەڵێم: ڕەنگێکی ڕشتوەو ڕێیەکی داناوە، کە پێچەوانەی ئیسلامە، ڕەنگێکی ڕشتوە کە مسوڵمانان بە دەستیەوە گرفتارن، چاکەی دیکەی بوو ون، چاکەکانی بەجێی خۆی، بەڵام ئەو کارە خراپەشی بەجێی خۆی، کە ڕەنگێکی زۆر خراپی ڕشتوەو ئێستاش لەگەڵ دابێ: لە دەوڵەتانی کەنداوو مەغریب و ئوردن و کوێ و کوێ، هەمووی حوکمی میراتیی و بنەماڵەییە، بە درێژایی مێژوو هەردوو بنەماڵەی ئومەویی و عەبباسیی، دوایی بنەماڵەی عوسمانیی هەمووی حوکمی میراتیی و بنەماڵەیی بووە، هەموویشی ڕەنگە کە موعاویە ڕشتوویەتی.

پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێ: {**أَوَّلُ مَنْ يُغَيِّرُ سُنَّتِي رَجُلٌ مِنْ بَنِي أُمَيَّةَ**}[1]، واتە: یەکەمین کەس کە ڕێبازی من دەگۆڕێ، پیاوێکە لە بەنی ئومەییە، (**شيخ ناصرالدين الألباني**) سەنەدەکەی بە باش (حسن) داناوە، وەک من لە هەندێک لە کتێبەکانی خۆمدا، بە تایبەتی کتێبی: (هەڵوەشانەوەی پەرگیریی)، هەروەها

---

(١) قال الألباني في « السلسلة الصحيحة « ٤ / ٣٢٩، برقم: (١٧٤٩)، أخرجه ابن أبي عاصم في « الأوائل « ( ٧ / ٢ ): حدثنا عبيد الله بن معاذ حدثنا أبي حدثنا عوف عن المهاجر أبي مخلد عن أبي العالية عن أبي ذر أنه قال ليزيد ابن أبي سفيان: سمعت رسول الله ﷺ، فذكره، قلت: و هذا إسناد حسن، رجاله ثقات رجال الشيخين غير المهاجر و هو ابن مخلد أبو مخلد، قال ابن معين: «صالح»، وذكره ابن حبان في « الثقات «، وقال الساجي: «صدوق»، و قال أبو حاتم: « لين الحديث ليس بذاك و ليس بالمتقن، يكتب حديثه»، قلت: فمثله لا ينزل حديثه عن مرتبة الحسن. و الله أعلم ولعل المراد بالحديث تغيير نظام اختيار الخليفة، و جعله وراثة. و الله أعلم.

کتێبی: (چەند مەسەلەیەکی باوی سەردەم)دا، ئەو حەدیسەم بە تەخریجەوە هێناوە، ئەلبانیی لە: (**السلسلة الصحيحة**)ەکەی خۆیدا هێناویەتی و، گوتووشیەتی: ڕەنگە مەبەست پێی شێوەی هەڵبژاردنی حوکمڕان بێ، کە موعاویە دیاریی کرد، ئەو ناوی موعاویەی نەهێناوە، بەڵام ئایا کێ بووە کە ڕێبازی پێغەمبەری ﷺ لە ڕاوێژ (**شورى**)ەوە: ﴿ وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ ﴿٣٨﴾ ﴾**الشورى**، گۆڕی بۆ حوکمی میراتیی و بنەماڵەیی؟ بێگومان موعاویەی کوڕی ئەبوو سوفیان بوو، ئنجا چاکەکانی بەجێی خۆی، بەڵام ئەو کارە خراپەشی وەک کارە خراپەکانی دیکەشی بەجێی خۆی و، بە تەئکید ئیسلامیش زۆر لەوە مەزنترە کە ئێمە بە هۆی ڕەفتارو هەڵوێستی لاری کەسانێکەوە، لاری بخەینە بەرچاو، بە تایبەتی ئێستا لەم ڕۆژگارەدا چاکتر دەرکەوتوە، کە حوکمی خۆ سەپاندن و بنەماڵەیی و میراتیی، چ زەرێکی گەورەی داوە لە ئیسلام و مسوڵمانان؟!

لەم بوارو سیاقەش دا (**سيد قطب**) ڕەحمەتی خوای لێ بێ، قسەیەکی جوانی هەیە، دەڵێ: (**إِنَّ تَبْرِئَةَ الْأَشْخَاصِ لَا تُسَاوِي تَشْوِيهَ الْمَنْهَجِ**)، واتە: پاکانە کردن بۆ کەسەکان، یەکسان نیە لەگەڵ ناشیرین کردنی بەرنامەکەدا، یانی: بەرنامەکە با وەک خۆی بخرێتە بەرچاو، بەڵام کەسەکان کە خەتایان کردووەو لایانداوە لە بەرنامەکە، دەبێ بگوترێ: فڵانکەس لایداوەو خەتای کردوە، نەک بۆ پاساو داناوەی لادان و هەڵەو پەڵەی کەسەکان، بەرنامەکەش لار بکەین.

## کورتە باسێک لە بارەی
## بەهرە وەرگرتن لە ناز و نیعمەتی دنیاوە

ئـەم کورتـە باسـە لەبـەر ڕۆشـنایی ئایـەتی ژمـارە (٢٠)ی (**الأحقـاف**)دا کـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَيَوْمَ يُعْرَضُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ عَلَى ٱلنَّارِ أَذْهَبْتُمْ طَيِّبَٰتِكُمْ فِى حَيَاتِكُمُ ٱلدُّنْيَا وَٱسْتَمْتَعْتُم بِهَا فَٱلْيَوْمَ تُجْزَوْنَ عَذَابَ ٱلْهُونِ بِمَا كُنتُمْ تَسْتَكْبِرُونَ فِى ٱلْأَرْضِ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ وَبِمَا كُنتُمْ تَفْسُقُونَ ﴿٢٠﴾ ﴾ **الأحقـاف**، پێشـکەش دەکەیـن، ئەویـش لـە حـەوت بڕگـەدا، بـەڵام دوای پێشـەکییەکی کـورت:

بەڕێـــزان!

وەک پێشـەکییەکی کـورتی ئـەم کورتـە باسـە دەڵێـم: بەڕاسـتیی لـە بـواری بەهـرە وەرگرتـن لـە نـازو نیعمەتـەکانی دنیـا، یاخـود پشـت تێکردنیانـدا، هـەم تێپەڕانـدن هەیـە، هـەم بـە زایـەدان هەیـە، تێپەڕانـدن هەیـە، کـە کەسـانێک دێنـن وا ئیسـلام دەخەنـە بەرچـاو، کـە فەرمـانی کـردوە بـە شـوێنکەوتووانی بـاوەش بـە دنیـادا بکـەن، وەک چـۆن خەڵکـی دیکـەی دنیـا پەرسـت و دنیـا ویسـت، بـاوەشی پێـدا دەکـەن، لەسـەر حیسـابی دیـن و ئەخـلاق، یاخـود لەسـەر حیسـابی قیامـەت، کـە بێگومـان ئەوە تێپەڕاندنـە، هەروەهـا بەزایەدانیـش هەیـە، کـە کەسـانێکی دیکـە دێنـن بـە نـاوی دنیا بـە کەمگرتـن و خـوا پەرسـتیی و هەڵبـژاردنی ڕۆژی دواییـەوە، پشـت لـە دنیـا دەکـەن و مسـوڵمانان وا وادار دەکـەن، کـە پشـت لـە دنیـا بکـەن و دنیـا بـە هیـچ دابنێـن، وشـەی (**زهد**)یشـیان بـە هەڵـە مانـا کـردوە، وەک لـە کتێبـی: (ڕێـگای صاڵـح بـوون و بـەرەو خـوا چـوون)داو، لـە کتێبـی: (گیـانی ژیـان)و، لـە هەنـدێ لـە کتێبـەکانی خۆمـدا باسـم کـردوە، کـە گوتوویانـە: زوهـد واتـە: (دنیـا نەویسـتیی)، کـە ئەمـە هـەم لـە ڕووی زمانەوانییـەوە هەڵەیـە، هـەم لـە ڕووی شـەرعییەوە هەڵەیـە، وەک مـن وشـەی

(زهد) لە کوردییدا مانایەکەم ڕاستکردۆتەوە کە بریتیە: لە [دنیا بە کەمگرتن]، نەک وەک باوە: دنیا نەویستیی، چونکە ئیسلام ڕازیی نیە، مسوڵمان دنیای نەوێ، بەڵام دەڵێ: دەبێ دنیا بە کەم بگری، نەک نەتەوێ و فڕێی بدەی، چونکە دوایی پەکت دەکەوێ و، دنیاش بۆ ئەهلی کوفرو زوڵم دەکەوێتە گۆڕێ و مەیدانیان بۆ چۆڵ دەبێ، پێغەمبەران (**عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام**)یش کە لەگەڵ تاغووتەکاندا تێکگیراون، هەر لەسەر دنیاو لەسەر ئەوە کە کێ کاروباری دنیا هەڵسووڕێنێ؟ تێکگیراون، لەسەر قیامەت و لەسەر بەهەشتێ نەبووە، بەو واتایە کە هەر کامیان بڵێ: بەهەشت دەبێ بۆ ئێمە بێ، نەخێر دەبێ بۆ ئێوە نەبێ! بەڵکو لەسەر چاککردنی دنیا بووە، پێغەمبەران (**عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام**) هاتوون، دنیا چاک بکەن و ڕێکی بخەن، چاکسازیی سیاسیی و، ئابووریی و، کۆمەڵایەتیی بکەن، بەڵام تاغووت و حوکمڕانە خۆشگوزەران و خۆ بەزلگرو خۆ سەپێنەکان، ڕازیی نەبوون ئەو بەزم و بازاڕەیان لێ تێکبچێ، کە بە شێوەی ناشەرعیی پێکیان وەناوەو، سازیان کردوە، لەسەر ئەوە لەگەڵ پێغەمبەران (**عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام**) دا تێکگیراون، بۆیە دنیا نەویستیی لە ڕوانگەی شەرعەوە هەڵەیە، لە ڕووی زمانەوانییشەوە هەڵەیە، چونکە (**زُهْد**) بە مانای نە ویستنی شتێک نیەو، بە مانای بە کەم گرتنیەتی، بە بەڵگەی ئەو ئایەتە موبارەکە لە سوورەتی (**یوسف**) دا، کە دەفەرموێ: ﴿ وَشَرَوْهُ بِثَمَنٍۭ بَخْسٍ دَرَٰهِمَ مَعْدُودَةٍ وَكَانُوا۟ فِيهِ مِنَ ٱلزَّٰهِدِينَ ﴿٢٠﴾ ﴾**یوسف**، واتە: یوسفیان بە چەند درەمێکی کەم فرۆشت و، ئەوان تێیدا بە کەمگربوون، تێیدا لە بە کەم گران بوون، واتە: بە نرخێکی کەمیان فرۆشت و خوا خوایان بوو زوو لە کۆڵیان بێتەوە، نەک نەیانەوێ، بەڵکو بە کەمیان گرت.

ئێستاش بابچینە سەر حەوت بڕگەکانی ئەم کورتە باسە:

## ا)- خوا نازو نیعمەتی دنیای بۆ بەهرە وەرگرتنی مرۆڤان خوڵقاندوە:

هیچ گومـان لـەوەدا نیـەو، لـە چەنـدان ئایەتـدا خـوا ﷻ ئـەوەی ڕاگەیانـدوە کـە هەرچـی خوڵقاندوویەتـی لـە نـازو نیعمـەتی دنیـا، بـۆ بەهـرە وەرگرتنـی مرۆڤانـە.

أ)- بۆ وێنە لە سووڕەتی (**الأنعام**)دا، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ قَدْ خَسِرَ ٱلَّذِينَ قَتَلُوٓا۟ أَوْلَٰدَهُمْ سَفَهًۢا بِغَيْرِ عِلْمٍ وَحَرَّمُوا۟ مَا رَزَقَهُمُ ٱللَّهُ ٱفْتِرَآءً عَلَى ٱللَّهِ ۚ قَدْ ضَلُّوا۟ وَمَا كَانُوا۟ مُهْتَدِينَ ﴿١٤٠﴾ ﴾، واتە: بە دڵنیایی ئەوانەی ڕۆڵەکانی خۆیان بە نەفامیی و بەبێ زانیاریی کوشتن و، ئەوەی خوا وەک بژیو پێیدابوون لە خۆیانیان قەدەغە کرد، بە هەڵبەستن بە ناوی خواوە، ئەوانە گومڕا بوون و، لە ڕێی ڕاستگرتووان نەبوون.

ب)- هەروەها لە سووڕەتی (**الأعراف**)دا، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ قُلْ مَنْ حَرَّمَ زِينَةَ ٱللَّهِ ٱلَّتِىٓ أَخْرَجَ لِعِبَادِهِۦ وَٱلطَّيِّبَٰتِ مِنَ ٱلرِّزْقِ ﴿٣٢﴾ ﴾، واتە: (خوا ﷻ بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەفەرموێ:) بفەرموو: ئەو جوانییەی خوا بۆ بەندەکانی وەدەری هێناوەو، ئەو بژیوە پاک و چاکانەی بۆی ڕەخساندوون، کێ قەدەغەی کردوون؟!

کـەس مـافی نیـە، شـتە بـاش و پەسـندو خـۆش و بـە کەڵکـەکان، لـە بەنـدەکانی خـوا قەدەغـە بـکات، کـە لـە ئەصڵـدا خوا بـۆ ئـەوانی خوڵقانـدوون.

ج)- لە سووڕەتی (**المائدة**)دا، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تُحَرِّمُوا۟ طَيِّبَٰتِ مَآ أَحَلَّ ٱللَّهُ لَكُمْ وَلَا تَعْتَدُوٓا۟ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْمُعْتَدِينَ ﴿٨٧﴾ وَكُلُوا۟ مِمَّا رَزَقَكُمُ ٱللَّهُ حَلَٰلًا طَيِّبًا ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ٱلَّذِىٓ أَنتُم بِهِۦ مُؤْمِنُونَ ﴿٨٨﴾ ﴾، واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! ئەو بژیوە پاک و چاکانەی خوا بۆی ڕەوا کردوون، قەدەغەیان مەکەن و، سنوورشکێنیی مەکەن، بە دڵنیایی خوا سنوورشکێنانی خۆشناوێن، (واتە: ئەوانەی شتە پاک و چاکەکان قەدەغە دەکەن)، لەوەش کە خوا پێیداون و ڕەوایە(و پاک و چاکە، بخۆن) و، پارێز لەو خوایەتان بکەن، کە ئێوە پێی بڕوادارن، (پارێزی لێ بکەن و خۆتان لە شت قەدەغەکان مەدەن).

**٢)- خوا ﷻ گۆشتە قەدەغەکراوەکانی لە چوار شتاندا، کورت هەڵهێناون:**

واتــە: خــوا ڕایگەیانــدوە کــە تەنیــا ئــەو چــوار گۆشــتە قەدەغــەن، لــە ڕووی شــەرعییەوە، کــە ئەوانیــش بریتیــن لــە: گۆشــتی بــەراز، مــردارەوە بــوو، خوێــن، بــۆ جگــە لــە خــوا ســەربڕاو:

١- وەک لە سوورەتی (**البقرة**)دا، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ إِنَّمَا حَرَّمَ عَلَيْكُمُ الْمَيْتَةَ وَالدَّمَ وَلَحْمَ الْخِنزِيرِ وَمَا أُهِلَّ بِهِ لِغَيْرِ اللَّهِ فَمَنِ اضْطُرَّ غَيْرَ بَاغٍ وَلَا عَادٍ فَلَا إِثْمَ عَلَيْهِ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ (١٧٣) ﴾.

٢- هەروەها لە سوورەتی (**المائدة**)دا، هەمان شت دووبارە دەبێتەوە، کە لەوێدا ژمارەی قەدەغەکراوەکان زیاترە، بەڵام هەر دەچنەوە نێو ئەو چوار جۆرەوە، دەفەرموێ: ﴿ حُرِّمَتْ عَلَيْكُمُ الْمَيْتَةُ وَالدَّمُ وَلَحْمُ الْخِنزِيرِ وَمَا أُهِلَّ لِغَيْرِ اللَّهِ بِهِ وَالْمُنْخَنِقَةُ وَالْمَوْقُوذَةُ وَالْمُتَرَدِّيَةُ وَالنَّطِيحَةُ وَمَا أَكَلَ السَّبُعُ إِلَّا مَا ذَكَّيْتُمْ وَمَا ذُبِحَ عَلَى النُّصُبِ وَأَن تَسْتَقْسِمُوا بِالْأَزْلَامِ ذَٰلِكُمْ فِسْقٌ الْيَوْمَ يَئِسَ الَّذِينَ كَفَرُوا مِن دِينِكُمْ فَلَا تَخْشَوْهُمْ وَاخْشَوْنِ الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ الْإِسْلَامَ دِينًا فَمَنِ اضْطُرَّ فِي مَخْمَصَةٍ غَيْرَ مُتَجَانِفٍ لِّإِثْمٍ فَإِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ (٣) ﴾.

٣- لە سوورەتی (**النحل**)یش دا، دیسان خوا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّمَا حَرَّمَ عَلَيْكُمُ الْمَيْتَةَ وَالدَّمَ وَلَحْمَ الْخِنزِيرِ وَمَا أُهِلَّ لِغَيْرِ اللَّهِ بِهِ (١١٥) ﴾.

٤- لە سوورەتی (**الأنعام**)یش دا ڕوونتر، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ قُل لَّا أَجِدُ فِي مَا أُوحِيَ إِلَيَّ مُحَرَّمًا عَلَىٰ طَاعِمٍ يَطْعَمُهُ إِلَّا أَن يَكُونَ مَيْتَةً أَوْ دَمًا مَّسْفُوحًا أَوْ لَحْمَ خِنزِيرٍ فَإِنَّهُ رِجْسٌ أَوْ فِسْقًا أُهِلَّ لِغَيْرِ اللَّهِ بِهِ (١٤٥) ﴾، واتە: (خوا ﷻ بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەفەرموێ:) بڵێ: لەوەدا کە سروشم بۆلا کراوە، نابینم لەسەر هیچ بخۆرێک، گۆشتێک قەدەغە کرابێ، مەگەر: مردار بێ، یان خوێنی ڕێژراو، یان گۆشتی بەراز کە بێگومان پیسە، یان بەلادان بۆ جگە لە خوا سەر بڕابێ.

شایانی باسە: ئێمە لە سوورەتی (الأنعام)دا، باسێکی تێرو تەسەلمان، لە بارەی گۆشتە قەدەغە کراوەکانەوە کردوە، کە ئەم چوار گۆشتەن، لە رووی شەرعییەوە قەدەغەن، وەک قورئان دەفەرموێ، بەڵام لە فەرمایشتی پێغەمبەریش دا ﷺ باسی سێ جۆرە گۆشتی دیکەش کراوە، وەک لەم دوو فەرمایشتەدا دەبینرێ:

**فەرمووودەی یەکەم:** {**عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَوْمَ خَيْبَرَ عَنْ أَكْلِ كُلِّ ذِي نَابٍ مِنَ السِّبَاعِ، وَعَنْ كُلِّ ذِي مِخْلَبٍ مِنَ الطَّيْرِ**}، (**أخرجه مسلم: ٥١٠٣**)، واتە: ئیبنو عەبباس (خوا لێیان رازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە رۆژی خەیبەردا رێگریی کردوە لە خواردنی هەر خاوەن کەڵبەیەک لە درندان و، هەر خاوەن چرنووکێک لە باڵندان.

**فەرمووودەی دووەم:** {**عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَهَى يَوْمَ خَيْبَرَ عَنْ لُحُومِ الْحُمُرِ الأَهْلِيَّةِ**} (**أخرجه البخاري: ٤٢١٧**)، واتە: ئیبنو عومەر (خوا لێیان رازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە رۆژی خەیبەردا قەدەغەی کردوە لەوە کە گۆشتی کەری ماڵیی بخورێ.

هەرچەندە لەو بارەوە هەندێک لە زانایان مشت و مڕو راجیاییەکیان هەیە، بە تایبەت ئیمام مالیک.

ئەوانە بە دەقی قورئان و سوننەت، ئەدی بۆق و سیسرکەو، مارو، دووپشک و زیندەوەرو ژیانداراني دیکە؟!

ئەوانە هەموویان تەماشا دەکرێ: ئەگەر لە رووی زانستییەوە، لە رووی پزیشکییەوە، سەلمێنرا کە زیانیان هەیە، ئەو کاتە قەدەغە دەکرێن:

**یەک:** لەبەر ئەوەی زیانیان هەیەو، عەقڵیش لە چەندان ئایەت دا خوا باس دەکات کە دەبێ باش و خراپ و سوودبەخش و زیانبەخشەکانی پێ بزانرێن:

١- ﴿فَٱعْتَبِرُوا۟ يَٰٓأُو۟لِى ٱلْأَبْصَٰرِ ۝٢﴾ الحشر.

٢- ﴿ وَلَقَد تَّرَكْنَا مِنْهَآ ءَايَةًۢ بَيِّنَةً لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ ﴿٣٥﴾ ﴾**العنكبوت**، کەواتە: شتێک بە عەقڵ و بە عیلم دەرکەوت، کە خراپە، واتە: خراپەو قەدەغەیە، چونکە شەرع ئیعتیمادی لەسەر عەقڵە.

**دوو:** ئایەتە موبارەکەکەی سوورەتی (**الأعراف**)، ئایەتی ژمارە (١٥٧)، کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَيُحِلُّ لَهُمُ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ ٱلْخَبَٰٓئِثَ ﴿١٥٧﴾ ﴾**الأعراف**، واتە: هەرچی پاک و چاک و سوود بەخشە، بۆیان حەلاڵ دەکات و، هەرچی پیس و زیانبەخشە، لێیان قەدەغە دەکات، کەواتە: هەر شتێک سەلمێنرا کە پیس و زیانبەخشە، ئەم ئایەتە موبارەکە دەیگرێتەوەو، مانای وایە حەرامەو قەدەغەیە، هەر شتێکیش بە عەقڵ و عیلم دەرکەوت، کە پیس و زیانبەخشە، ئەوە خوای پەروەردگار ئەم دینەی بۆ خاوەن عەقڵان ناردوە، واتە: تەنیا خاوەن عەقڵان ئەرکدار (**مكلَّف**)ن، بە بەڕێوەبردنی و، هەر شتێک بە عەقڵ و عیلم دەرکەوت، زیانبەخش و پیس و خراپە، فەڕزە مرۆڤ خۆی لێ بە دوور بگرێ، بۆ وێنە: کەسێک بەرد بخوات، کەسێک گڵ بخوات و، کەسێک ڕەژوو بخوات، هەرچەندە دەقێکی شەرعیی سەربەخۆیان لەسەر نیە، بەڵام ئێمە دەقێکی گشتییمان هەیە، کە خوا ﷻ هەموو پیس و هەموو زیانبەخشەکانی قەدەغە کردوون و، بە پێی عەقڵیش هەروایەو عەقڵیش هەر وادەڵێ.

## ٣)- خوا ﷻ قەدەغەکردنی بەبێ بەڵگەی وەحیی، بە گوناهێکی زۆر زل داناوە:

دروست نیە مسوڵمانان لە خۆڕا شت قەدەغە بکەن، بڵێن: ئەو شتە نابێ ببێ لە ڕووی دینییەوە، بەڵام ئەگەر لە ڕووی زانستی پزیشکییەوە دەرکەوت، کە فڵان شتە زیانی هەیە، تەنانەت ئەگەر یەکێک لەو ئاژەڵانەش بێ، کە لە ئەصڵدا گۆشتەکەی ڕەوایە، بەڵام چونکە گیایەکی خواردوە، یاخود نەخۆشییەکی هەیەو گۆشتەکەی زیانی هەیە، بە عیلم و عەقڵ دەرکەوت، ئەوە فەڕزە دووریی لێ بکرێ، نەک لەو ڕووەوە کە دەقێکی شەرعیی سەربەخۆی لەسەرە،

بەڵکو بە بەڵگەی ئەوە کە دەقە گشتییەکەی ئایەتی (١٥٧)ی سوورەتی **(الأعراف)** دەیگرێتەوەو، لەو ڕووەشەوە کە هەر شتێک عەقڵی سەلیم و عیلم و زانست و واقیع، دەریانخست کە خراپە، بێگومان شەرعیش دەڵێ: خراپە.

ئنجا خوا ﷻ قەدەغەکردنی بێ بەڵگەی وەحیی، بە گوناهێکی زۆر زل داناوە، بۆ وێنە:

١- لە سوورەتی **(یونس)**دا، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ قُلْ أَرَءَيْتُم مَّآ أَنزَلَ ٱللَّهُ لَكُم مِّن رِّزْقٍ فَجَعَلْتُم مِّنْهُ حَرَامًا وَحَلَٰلًا قُلْ ءَآللَّهُ أَذِنَ لَكُمْ أَمْ عَلَى ٱللَّهِ تَفْتَرُونَ ﴿٥٩﴾ وَمَا ظَنُّ ٱلَّذِينَ يَفْتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ إِنَّ ٱللَّهَ لَذُو فَضْلٍ عَلَى ٱلنَّاسِ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَشْكُرُونَ ﴿٦٠﴾ ﴾، واتە: (خوا ﷻ بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەفەرموێ:) بڵێ: ئایا بینیوتانە ئەوەی خوا لە بژیو بۆی دابەزاندوون، لە خۆوە حەڵاڵ و حەرامتان تێیدا داناوە، {گوتووتانە: ئەوە حەرامەو، ئەوە حەڵاڵە}، بڵێ: ئایا خوا ﷻ مۆڵەتی داون، یاخود درۆ بەناوی خواوە دەڵێن، ئایا گومانی ئەوانە چییە، کە درۆ بە ناوی خواوە هەڵدەبەستن لە ڕۆژی دوایی دا؟ خوا ﷻ خاوەن بەخششە بەسەر خەڵکەوە، بەڵام زۆربەیان ناسوپاسن.

٢- هەروەها لە سوورەتی **(النحل)**دا، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَقُولُوا۟ لِمَا تَصِفُ أَلْسِنَتُكُمُ ٱلْكَذِبَ هَٰذَا حَلَٰلٌ وَهَٰذَا حَرَامٌ لِّتَفْتَرُوا۟ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَفْتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ لَا يُفْلِحُونَ ﴿١١٦﴾ ﴾، واتە: هەر بە وەسفکردنی زمانەکانتان بە درۆ مەڵێن: ئەمە حەڵاڵەو ئەمە حەرامە، تاکو سەرەنجام درۆ بە ناوی خواوە هەڵبەستن، (بە ناوی ئایینی خواوە)، بە دڵنیایی ئەوانەی درۆ، بە ناوی خواوە هەڵدەبەستن، سەرفراز نابن.

٣- دیسان لە سوورەتی **(الأنعام)**دا، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ قَدْ خَسِرَ ٱلَّذِينَ قَتَلُوٓا۟ أَوْلَٰدَهُمْ سَفَهًۢا بِغَيْرِ عِلْمٍ وَحَرَّمُوا۟ مَا رَزَقَهُمُ ٱللَّهُ ٱفْتِرَآءً عَلَى ٱللَّهِ قَدْ ضَلُّوا۟ وَمَا كَانُوا۟ مُهْتَدِينَ ﴿١٤٠﴾ ﴾، واتە: بە دڵنیایی زیانبار بوون، ئەوانەی منداڵەکانی (ڕۆڵەکانی) خۆیان کوشتن، بە نەفامیی و بێ زانیاریی و، ئەوەی خوا ﷻ بۆی ڕەوا کردبوون و، قەدەغەیان کرد، (ئەوانەی بە ناوی خواوە درۆیان هەڵبەست و قەدەغەیان کرد)، گومڕابوون و لە ڕێی ڕاستگرتووان نەبوون.

کەواتـە: شـت قەدەغەکـردن بەبـێ مۆڵـەت و ئیـزنی وەحیـی، بـە گوناهێکـی زۆر گـەورەو بێـڕەزا دانـراوە.

هەڵبەتـە لـە فەرمایشـتی پێغەرمیشـدا ﷺ هـەر هاتـوە، کـە خـوا ﷻ هەنـدێ شـتی پێویسـت کـردوەو، هەنـدێ شـتی قەدەغـە کـردوەو، هەنـدێ سـنووریشی دانـاون و، هەنـدێ شـتیش لێیـان بـێ دەنـگ بـووە، ئنجـا ئەوانـەی خـوا لێیـان بـێ دەنـگ بـووە، بـێ ئـەوەی لـە بیـری بچـێ، ئێـوەش لێیـان مەکۆڵنـەوە[1]، (بـۆ ئـەوەی بازنـەی قەدەغەکـراوەکان فـراوان نەبـێ)، ئێمـە لـە سـوورەتی (**المائدة**)دا، لـەو بـارەوە باسـێکی سـەربەخۆمان کـردوە، جگـە لـەوەی کـە لـە سـوورەتی (**الأنعام**)یشـدا باسـێکمان کـردوە.

## ٤)- ئەو ئایەتەی (الأحقاف) مەبەست پێی بێبڕوایانێکی بۆ خواردن ژیاوە:

چونکـە هەندێـک لـە زانایـان و توێـژەرەوانی قورئـان، ئـەم ئایەتەیـان وا تەفسـیر کـردوە، کـە ئیسـلام دژی ئەوەیـە مرۆڤـەکان خۆشـیی وەربگـرن لـە ژیانـداو، شـتە خۆشـەکان بخـۆن، یـان بەرگـی جـوان بپۆشـن، یـان جێگـەو ڕێگـەی باشـیان هەبـێ، یـان کـەل و پـەلی باشـیان هەبـێ، بـەڵام ئەمـە هیچـی وانیـەو، ئـەو ئایەتـەی سـوورەتی (**الأحقـاف**)، واتـە: ئایـەتی ژمـارە (٢٠) کـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَيَوْمَ يُعْرَضُ الَّذِينَ كَفَرُوا عَلَى النَّارِ أَذْهَبْتُمْ طَيِّبَاتِكُمْ فِي حَيَاتِكُمُ الدُّنْيَا وَاسْتَمْتَعْتُم بِهَا فَالْيَوْمَ تُجْزَوْنَ عَذَابَ الْهُونِ بِمَا كُنتُمْ تَسْتَكْبِرُونَ فِي الْأَرْضِ بِغَيْرِ الْحَقِّ وَبِمَا كُنتُمْ تَفْسُقُونَ ﴿٢٠﴾ ﴾، ئـەم ئایەتـە لـە بـارەی بێبڕوایانەوەیـە، بـە حـەوت بەڵگـەوەو هـەر لـە نێـو خـودی ئایەتەکـەدا:

١- ﴿ وَيَوْمَ يُعْرَضُ الَّذِينَ كَفَرُوا عَلَى النَّارِ ﴾، ئەو ڕۆژە کە ئەوانەی بێبڕوان ڕادەنوێنرێن لەسەر ئاگر، دۆزەخیان پێشان دەدرێ، یان ئەوان دەهێنرێنە سوێی دۆزەخ، کەواتە: ﴿الَّذِينَ كَفَرُوا ﴾، باس باسی بێبڕوایانە.

---

(١) {إنَّ اللهَ تَعَالَى فَرَضَ فَرَائِضَ فَلَا تُضَيِّعُوهَا، وَحَدَّ حُدُوداً فَلَا تَعْتَدُوهَا، وَحَرَّمَ أَشْيَاءَ فَلَا تَنْتَهِكُوهَا، وَسَكَتَ عَنْ أَشْيَاءَ رَحْمَةً لَكُمْ غَيْرَ نِسْيَانٍ فَلَا تَبْحَثُوا عَنْهَا} أخرجه الطبراني: ٥٨٩، قال الهيثمي (١/١٧١): رجاله رجال الصحيح. وأبو نعيم في الحلية (٩/١٧)، والبيهقي موقوفًا (١٠/١٢ رقم ١٩٥٠٩)، وأخرجه أيضًا: الدارقطني: (٤/١٨٤).

٢- ﴿أَذۡهَبۡتُمۡ طَيِّبَٰتِكُمۡ﴾، شتە خۆشەکانی خۆتانتانتان تەواو کردن، واتە: شتی خۆش ئەگەر بۆ ئەوانە هەبێ، تەنیا لە دنیادا هەیە، کەواتە: ئەوانە کەسانی بێبڕوان، ئەگەرنا بڕواداران لە قیامەتیشدا شتی خۆشیان هەیە.

٣- ﴿فِي حَيَاتِكُمُ ٱلدُّنۡيَا﴾، لە ژیانی دنیاتاندا، تەنیا بێبڕوایان بەس ژیانی دنیا شک دەبەن و دەڵێن: ژیان تەنیا ژیانی دنیایە، بەڵام بڕواداران دەڵێن: وێڕای ژیانی دنیا، ژیانی ڕۆژی دواییش هەیە.

٤- ﴿وَٱسۡتَمۡتَعۡتُم بِهَا﴾، ئێوە بەهرەتان لێ وەرگرتن، لەززەتتان لێ وەرگرتن، ئنجا ئەوە تەنیا بێبڕوایانن کە تاکە شوێنی بەهرە وەرگرتن و لەززەت لێ وەرگرتن بە دنیا دەزانن و، هەوڵیش دەدەن هەرچی زیاتر لەززەت و چێژ وەربگرن لە شتە ماددییەکان، بەڵام ئینسانی بڕوادار بۆ ئەوە ناژی کە بخوات، بەڵکو بایی ئەوەندە دەخوات کە بژی، ئنجا ڕستەی: ﴿وَٱسۡتَمۡتَعۡتُم بِهَا﴾، هەرچی خۆشیی و لەززەت بوو ئێوە بەهرەتان لێی وەرگرت، ئەوە تەنیا بەسەر بێبڕوایاندا دەچەسپێ.

٥- ﴿تُجۡزَوۡنَ عَذَابَ ٱلۡهُونِ﴾، ئەمڕۆ سزای ڕیسواکەرو زەبوونکەر دەچێژن، سزای زەبوونکەرو ڕیسواکەر، تەنیا بۆ بێبڕوایانە.

٦- ﴿تَسۡتَكۡبِرُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ بِغَيۡرِ ٱلۡحَقِّ﴾، بە هۆی ئەوەوە کە بە ناهەق خۆتان لە زەویدا بەزلدەگرت، ئەوەی بە ناهەق خۆی بەزلدەگرێ لە زەویدا، تەنیا بێبڕوایانن.

٧- ﴿وَبِمَا كُنتُمۡ تَفۡسُقُونَ﴾، بە هۆی ئەوەوەش کە ئێوە لادەربوون و لاتاندەدا، یانی: لە حوکمی عەقڵ، لە حوکمی زگماک، لە حوکمی شەریعەت لاتان دەدا، لە تەفسیرەکاندا نەمبینیوە بەم شێوەیە، ئەم بەڵگانە لە نێو خودی ئایەتەکەدا دەربهێنرێن، سوپاس و ستایشی خوای پەروەردگار دەکەین لەسەر هیدایەتی.

کەواتە: ئەم ئایەتە موبارەکە دەگونجێ بەکاربهێنرێ بۆ ئەوە، کە مسوڵمان نابێ ئامانجی ڕابواردنی ژیانی دنیا بێ، بەڵام نابێ وا بزانرێ کە ئیسلام دژی

ئەوەیە مسوڵمانان لەززەت وەربگرن و، خۆشیی وەربگرن لە ژیانی دنیادا، مادام لە ڕێیەکی حەڵاڵەوە بێ و، نەشکرێتە ئامانج، بەڵکو تەنیا وەک ئامرازێک و، بایی ئەوەندە کە ژیان پێویستیی پێیەتی، ئەگەر بەهرە لە لایەنە ماددییەکانی ژیانی دنیا وەربگیرێ، ئیسلام هیچ ئیشکالێکی لەگەڵ ئەوەدا نیە.

## ٥)- چەند دەقێکی سوننەت لەو بارەوە:

**أ)- {أَنَّ عُمَرَ ﷺ دَخَلَ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ وَهُوَ فِي مَشْرُبَتِهِ، حِينَ هَجَرَ نِسَاءَهُ قَالَ: فَالْتَفَتُّ فَلَمْ أَرَ شَيْئًا يَرُدُّ الْبَصَرَ إِلَّا أُهُبَاً، جُلُوداً مَعْطُونَةً، قَدْ سَطَعَ رِيحُهَا، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ! أَنْتَ رَسُولُ اللَّهِ وَخِيَرَتُهُ، وَهَذَا كِسْرَى وَقَيْصَرُ فِي الدِّيبَاجِ وَالْحَرِيرِ؟ قَالَ: فَاسْتَوَى جَالِسَاً، وَقَالَ: «أَفِي شَكٍّ أَنْتَ يَا ابْنَ الْخَطَّابِ؟ أُولَئِكَ قَوْمٌ عُجِّلَتْ لَهُمْ طَيِّبَاتُهُمْ فِي حَيَاتِهِمُ الدُّنْيَا»، فَقُلْتُ: اسْتَغْفِرْ لِي! فَقَالَ: «أَللَّهُمَّ اغْفِرْ لَهُ»} (أخرجه البخاري: ٢٤٦٨، ومسلم: ١٤٧٩، والترمذي: ٣٣١٨، والنسائي في الكبرى: ٢٤٤٢، ٩١٥٧، وابن حبان: ٤١٨٧، ٤٢٦٨، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا).**

واتە: ڕۆژێ عومەری کوڕی خەتتاب لە پێغەمبەری خوا ﷺ وە ژوور دەکەوێ، ئەو کاتەی دووریی گرتوە لە هاوسەرەکانی و، لێیان تووڕە بووە، لە شوێنێک بووە کە پێی گوتراوە: بانیژە (مَشْرُبة)، {ئاوو شتیان تێدا داناوە}، (عومەر ﷺ) گوتی: کە چوومە ژوورێ ئاوڕم دایەوەو چاوم گێڕا بە ژوورەکەدا، هیچ شتێکم نەبینی چاوی تێ هەڵبنگوێ، جگە لە هەندێک پێست (مەشکەو کوندە)، ئەوانیش بۆنیان لێ دەهات، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ تۆ پێغەمبەری خوای و باشترینی دروستکراوی خوای، ئەوە کیسراو قەیسەریش لە نێو پۆشاکی ئاوریشم دان؟ (لە خۆشگوزەرانیی دان)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ پاڵییدابوۆوە، هەڵسا دانیشت و فەرمووی: ئەی کوڕی خەتتاب! تۆ لە دوو دڵیی دای؟ ئەوانە کۆمەڵێکن، خۆشییەکانیان بۆ خراونە ژیانی دنیاوە (بۆیان پێشخراون)، منیش گوتم: داوای لێبوردنم بۆ بکە، ئەویش فەرمووی: خوایە لێی ببوورە.

**ب)- {عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، قَالَتْ اسْتَيْقَظَ النَّبِيُّ ﷺ ذَاتَ لَيْلَةٍ، فَقَالَ: سُبْحَانَ اللَّهِ مَاذَا أُنْزِلَ اللَّيْلَةَ مِنَ الْفِتَنِ، وَمَاذَا فُتِحَ مِنَ الْخَزَائِنِ، أَيْقِظُوا صَوَاحِبَاتِ الْحُجَرِ، فَرُبَّ كَاسِيَةٍ فِي الدُّنْيَا عَارِيَةٍ فِي الْآخِرَةِ} (أخرجه أحمد: ٢٦٥٨٧، والبخاري: ١١٥، والترمذي: ٢١٩٦).**

واتـە: ئوممـو سـەلەمە (خـوا لێـی ڕازی بـێ)، {دایکـی بـڕواداران هاوسـەری بەڕێـزی پێغەمبـەر ﷺ}، دەڵـێ: شـەوێک پێغەمبـەر ﷺ هەڵسـا خەبـەری بـۆوە، فەرمـووی: پاکیـی بـۆ خـوا، {وەک سەرسـوڕمان} ئـەم شـەو زۆر دەروازە کراونـەوە (لـە بەڵایـان)، ئنجـا فەرمـووی: ئافرەتـانی خـاوەن ژوورەکان، (واتـە: هاوسـەرانی پێغەمبـەر ﷺ) هەڵسـێنن بێداریـان بکەنـەوە، زۆر کـەس لـە دنیـادا پۆشـتەیە، بـەڵام لـە دواڕۆژدا ڕووتـە.

کەواتـە: بـا خـەم بخـۆن و، بزانـن ژیانـە دنیایەکەیـان چـۆن دەگوزەرێنـن و، وانەبن تەنیـا ژیـانی دنیـا ببینـن و دنیـا لـە بـاوەش بگـرن.

**ج)- {أَنَّ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ دَخَلَ عَلَى أَهْلِ الصُّفَّةِ، وَهُمْ يُرَقِّعُونَ ثِيَابَهُمْ بِالْأَدَمِ مَا يَجِدُونَ لَهَا رِقَاعًا، فَقَالَ: «أَنْتُمُ الْيَوْمَ خَيْرٌ أَمْ يَوْمَ يَغْدُو أَحَدُكُمْ فِي حُلَّةٍ وَيَرُوحُ فِي أُخْرَى، وَيُغْدَى عَلَيْهِ بِجَفْنَةٍ، وَيُرَاحُ عَلَيْهِ بِأُخْرَى، وَيُسْتَرُ بَيْتُهُ، كَمَا تُسْتَرُ الْكَعْبَةُ؟ قَالُوا: نَحْنُ يَوْمَئِذٍ خَيْرٌ، قَالَ: بَلْ أَنْتُمُ الْيَوْمَ خَيْرٌ}، (أخرجه المتقي الهندي في كنز العمال: ٦٢٢٧).**

واتـە: ڕۆژێـک پێغەمبـەر ﷺ دەچێتـە لای خەڵکـی صوففـە {کۆمەڵێـک لـە هـاوەڵان بـوون بـێ ژن و مـاڵ بـوون، سـەکۆیەک لـە تەنیشـت مزگەوتیـەوە بـووە، سـەربانێکی لەسـەر دروسـتکراوە، لەوێـدا ژیـاون، کـەم و زۆر، جـاری وا بـووەو سـەد بـوون دوو سـەد بـوون، تاکـو چـوار سـەد ڕۆیشـتوون}، کـە بەسـەریاندا چـوو، ئـەوان پۆشـاکی خۆیـان بـە چـەرم پینـە دەکـرد، پینـەی دیکەیـان نەبـوو، کـە لـە جینـسی پۆشـاکەکەی خۆیـان پینـە بکـەن، ئەویـش پێـی فەرمـوون و لێـی پرسـین: ئایـا حاڵـی ئەمڕۆتـان باشـترە، یـان هـی ئـەو کاتـەی یەکێکتـان بەیـانی بـە پۆشـاکێکەوەیەو، ئێـوارە پۆشـاکێکی دیکـە لەبـەر دەکات و، قاپـە خواردنێکـی بـۆ دێنـن، دوایـی قاپێکـی

دیکەی بۆ دێنن، (یەکێک تەواو دەبێ، یەکێکی دیکەی بۆ دێنن)و، دیواری ماڵەکەی دەپۆشرێ، وەک چۆن پەردە بۆ کەعبە دەکرێ؟! ئەوانیش گوتیان: ئێمە ئەو کاتی باشترین (خواردنی باش و، بەرگی باش و، ماڵ و جێگەو ڕێگای باش)، فەرمووی: بەڵکو ئێوە ئەمڕۆ حاڵتان باشترە.

## ٦)- چەند قسەیەکی هاوسەنگانەی زانایان لە بارەی چۆنیەتیی مامەڵەکردنەوە، لەگەڵ ژیانی دنیاو لەززەت و نیعمەتەکانی دا:

هەڵبەتە قسە لەو بارەوە زۆر زۆرن، بەڵام من حەوت قسەم وەک گوڵبژێرێک هێناون:

قسەکانی یەکەم تاکو پێنجەم، لە (**البحر المديد**)ی (**إبن عجيبة**)ەوە دێنم[1]:

**یەک:** کە قسەی خۆیەتی هی (**إبن عجيبة**)ە، کە یەکێک بووە لە عاریفە گەورەکان، وێڕای ئەوەی ڕوونکەرەوەی قورئان بووە، زانایەکی شارەزاش بووەو، لە بواری تەزکیەی نەفس و تەصەووفیشدا، پسپۆڕو کارامە بووە، یەکێک لە کتێبەکانی ئەم تەفسیرەیە: (**البحر المديد في تفسير القرآن المجيد**)، کتێبێکی دیکەشی هەیە: (**إيقاظ الهمم في شرح الحكم**)، کە حیکمەتەکانی (**أحمد بن عطاءالله الأسكندري**) تێدا شەرح کردوون، (**إبن عجيبة**)، دەڵێ:

**(مَـا زَالَـتِ الأَكَابِـرُ مِـنَ الأَوْلِيَـاءِ تَتَنَكَّـبُ الحُظُـوظَ وَالشَّـهَوَاتِ، مُجَاهَـدَةً لِنُفُوسِـهِمْ، وَتَصْفِيـةً لِقُلُوبِهِـمْ، فَـإِنَّ تَتَبُّـعَ الشَّـهَوَاتِ يُقَـسِّي القَلْـبَ، وَيَكْسِـفُ نُـورَ العَقْـلِ، كَـمَا قَـالَ الشَّـاعِر:**

**إِنَارَةُ العَقْلِ مَكْسُوفٌ بطَوْعِ هَوىً ... وعَقْلُ عَاصِي الهَوَى يَزْدَادُ تنْوِيرا.**

**هَـذَا فِي حَـالِ سَـيْرِهِمْ، فـإِذَا تَحَقَّـقَ وُصُولُهُـمْ، فَـلَا كَلَامَ عَلَيْهِـمْ، لأَنَّهُـمْ يَأخُـذُونَ مِـنَ اللـهِ، وَيَتَصَرَّفُـونَ بـهِ فِي أُمُورِهِـمْ كُلِّهَـا، فَـلَا حَـرَجَ عَلَيْهِـمْ فِي نَيْـلِ مَـا أَنْعَـمَ اللـهُ بـهِ عَلَيْهِـمْ، حَيْـثُ أَمِنُـوا ضَرَرَهُ).**

---

(١) البحر المديد في تفسير القرآن المجيد: ج٧، ص ٩٤، ٩٥.

واتـە: دۆسـتە گـەورەکانی خـوا عادەتیـان وابـووە، خۆیـان دوور گرتـوە لـە ئـارەزووەکان، وەک لەگـەڵ خـۆدا تێکۆشـان و سـافکردنەوەی دڵ و دەروونیـان، چونکە شـوێنکەوتنی ئـارەزووەکان، دڵ ڕەق دەکات و، ڕووناکیـی عەقڵیـش خەفـە دەکات، وەک شـاعیر گوتوویـەتی: (**إِنَـارَةُ العَقْـلِ مَكْسُـوفٌ بِطَـوْعِ هَـوىً ... وعَقْـلُ عَـاصِي الهَـوَى يَـزْدَادُ تَنْوِيـرا**)، ڕۆشـنایی عەقـڵ خەفـە دەبـێ بەهـۆی شـوێنکەوتنی ئـارەزووەوە، بەڵام عەقڵـی کەسـێک سـەرپێچیی ئـارەزوو خـۆی دەکات، بـەردەوام ڕۆشـنتر دەبێتـەوە.

ئەمـە لـە کاتی بـەرەو خـوا چوونیانـدا، بـەڵام هـەر کاتێـک گەیشـتنە شـوێنی مەبەسـت، ئـەو کاتـە قسـەیان لەسـەر نابـێ، چونکـە ئـەو کاتـە لـە خـوا وەردەگـرن، لـە هەمـوو هەڵسـوکەوتەکانیاندا بـە ئیلهامێـک، کـە لـە خـواوە بۆیـان دێ، مامەڵـە دەکـەن، بۆیـە ئـەو کاتـە ئـەوەی خـوا ﷻ لـە چاکـەی خـۆی پێیـان دەدات، هیـچ سـەغڵەتییان لەسـەر نابـێ، چونکـە ئـەو کاتـە دڵنیـا دەبـن، تـووشی زیـان نابـن.

مەبەستی ئەوەیـە کـە ئـەو کاتـە بـە ئـارەزووی نەفسـەوە ناخـۆن و، بـە ئـارەزووی نەفسـەوە ناپۆشـن و، بـە ئـارەزوو نەفـس، مـاڵ و حـاڵ پێکـەوە نانێـن، بەڵکـو لـە هەمـوو ئەوانـەدا، ڕەزامەندیـی خـواو بەرژەوەندیـی دنیـاو دواڕۆژو، سـوود گەیانـدن بـە خەڵـک، ڕەچـاو دەکـەن.

**دوو:** هەر مانایەکەی دێنم، لە ئیبڕاهیمی کوڕی ئەدهەمەوە گێڕدراوەتەوە: کە ڕۆژێک خواردنێک زۆر ساز دەکات، بەڵام چەند کەسێکی کەم بانگ دەکات، لە نێویاندا هەر کام لە (**الأوزاعي والثوري**) کە هەردووکیان سەر مەزهەب بوون، لە زانایانی گەورەو پێشەوایانی موجتەهید بوون، لە نێو ئەو کەسە کەمانەدا دەبن، کە دەعوەتیان دەکات (**الثوري**) پێی دەڵێ: ئایا ناترسی ئەمە زێدەڕۆیی بوو بێ؟ ئەویش دەڵێ: زێدەڕۆیی لە خواردنێدا نیە، بەڵکو لە بەرگ و پۆشاک و کەل و پەلدا هەیە، واتە: کەسێ بایی ئەوەندە بخوات کە پێویستیی پێی بێ، زێدەڕۆیی نیە.

هـەر لـەو سـیاقەدا ڕۆژێـک ئیبڕاهیمـی کـوڕی ئەدهـەم چەنـد درەمێـک بـە یەکێ لـە برایـەکانی دەدات، دەڵـێ: بچـۆ بـەم درەمانـە کـەرەو هەنگوینـمان بـۆ بکڕە،

لەگەڵ نـانی گەنـم، ئەویـش دەڵـێ: ئـەی ئەبـوو ئیسـحاق! ئـەم درەمانـە هەمووبـان کـەرەو هەنگویـن و نـانی گەنمیـان پـێ بکـڕم؟! (واتـە: زێدەڕۆیـی نیـە؟) ئەویـش دەڵـێ: **(ویحـك إذَا وَجَدْنَـا أَكَلْنَـا أَكْلَ الرِّجَـالِ، وَإِذَا عَدِمْنَـا صَبَرْنَـا صَبْرَ الرِّجَـالِ)**، واتـە: بـێ قـەزابی ئەگـەر لێـمان هەڵکـەوت پیاوانـە دەخۆیـن و، ئەگـەر نەشـبوو ئاتـاج بوویـن، پیاوانـە خۆڕادەگریـن، واتـە: حاڵـەتی هاوسـەنگ ئەوەیـە.

**سێ:** مەعرووفی کەرخیی ئەگەر خواردنی خۆشی بۆ بە دیاریی نێردرابایە، لێی دەخوارد، جارێک خواردنی خۆشی بە دیاریی بۆ نێردراو لێی خوارد، پێی گوترا: برایەکەت (**بِشْر الحافـي**) لەو جۆرە خواردنانەی نەدەخوارد، ئەویش قسەیەکی جوانی کرد، گوتی: (**أَخِي بِشْر قَبَضَهُ الوَرَعُ، وَأَنَا بَسَطَتْنِي المَعْرِفَة، وَإِنَّمَا أَنَا ضَيْفٌ فِي دَارِ مَوْلَايَ، إِذَا أَطْعَمْنِي أَكَلْتُ، وَإِذَا جَوَّعْنِي صَبَرْتُ، مَالِي وَللإِعْتِرَاضِ وَالتَّمِيِيز**)، مەعرووفی کەرخیی مەشهوورە کە یەکێک بووە لە زانا خواناس و پێشەوایەکان، گوتی: (**بِشْر**)ی برام، وەرع و خۆپاراستن لە قەدەغەو حەڕام، دەستی پێگرتۆتەوە، بەڵام من شارەزایی و زانیاریی دەستی پێکردوومەوە (لە خۆشییەکان بەهرە وەربگرم بە حەڵاڵیی)، ئنجا دوایی گوتی: من میوانم لە ماڵی گەورەو سەرپەرشتیاری خۆمدا، ئەگەر خواردنم بداتێ (بە حەڵاڵیی) دەخۆم و، ئەگەر برسییشم بکات، خۆڕاگر دەبم، من هەقی چیمە ڕەخنە بگرم و جیاکاریی بکەم!.

ئـەو قسـەی ئەویشـم پـێ جوانـە، مـرۆڤ نابـێ خـواردن لـە خـۆی بـکات بـە گرفـت و کێشـەیەک: چـی بخـۆم و چـی نەخـۆم؟ پێغەمبـەری خـوا ﷺ خـواردنی خۆشـیشی خـواردوەو، بەهـی ناخۆشـیش قەناعـەتی کـردوە، بـەڵام خـواردنی نەکـردوە بـە ئامانـج، ئەسـڵەن خـواردن زۆر لـەوە بچووکـترە کـە خەمـی لـێ بخـۆی و بیکـەی بـە ئامانـج، یـان ئـەوە ناخـۆم و ئـەوە دەخـۆم!!.

**چوار:** ئەمیش هەر قسەی خۆیەتی (**إبن عجيبة**)، دەڵێ: (**وَالحَاصِلُ أَنَّ النَّاسَ أَقْسَامٌ ثَلَاثَة: عَوَامٌ، لَا هِمَّةَ لَهُمْ فِي السَّيْرِ، وَإِنَّمَا قَنَعُوا أَنْ يَكُوْنُوا مِنْ عَامَّةِ أَهْلِ اليَمِيْنِ، فَهَؤُلَاءِ يَأخُذُوْنَ كُلَّ مَا أَبَاحَتهُ الشَّرِيْعَة، إذ لَا سَيْرَ لَهُمْ حَتَّى يَخَافُوا مِنْ تَخَلُّفِهِمْ، وَخَوَاصٌ، نَهَضَتْ هِمَّتُهُمْ إِلى اللهِ، وَرَامُوا الوُصُولَ إِلَيْهِ، وَهُمْ فِي السَّيْرِ لَمْ يَتَحَقَّق وُصُولُهُمْ، أَو مِنَ العُبَّادِ وَالزُّهَّادِ، يَخَافُونَ إِنْ**

**تَنَاوَلُوا المُسْتَلذَّاتِ أن تَفتَرَّ عَزَائِمُهُمْ، فَهَؤُلَاءِ يَتَأكَّدُ فِي حَقِّهِم تَرْكُ الحُظُوظِ وَالشَّهَوات، وَالقِسْمُ الثَّالِثُ: خَوَاصُّ الخَوَاصِّ، قَدْ تَحقَّقَ وُصُولُهُمْ، وَرَسَخَتْ أَقْدَامُهُمْ فِي الـمَعْرِفَة، فَهَؤُلَاءِ لَا كَلَامَ مَعَهُمْ، وَلَا مِيْزَانَ عَلَيْهِمْ).**

واتە: پوختەی قسان لە بارەی خواردن و خواردنەوەوە، خەڵک سێ بەشن:

١- خەڵکێکی گشتیی کە ئەوانە زۆر مەبەستیان نیە بەرەو خوا بچن، (خۆیان ماندوو بکەن و لە خوا نیزیک بن)، بەڵکو تەنیا بەوەندە قەناعەتیان کردوە کە لە هاوەڵانی دەستە ڕاست بن و، بە گشتیی ئەهلی بەهەشت بن، ئەوانە هەرچی شەریعەت بۆیان ڕەوا دەکات، وەری دەگرن، چونکە ئەوانە ڕۆیشتنیان نیە بەرەو خوا، تاکو بترسێن دوابکەون، بەهۆی سەرقاڵیی بە بەهرە وەرگرتن لە نیعمەتە حەڵاڵەکانی دنیاوە.

٢- خەڵکێکی تایبەتن، کە ئەوانە هیممەتیان بەرەو خوا هەڵیستاندوون و، دەیانەوێ بەرەو خوا بچن و، بە خوا ﷻ بگەن، (واتە: بە ناسینی خواو بە خۆشویستنی خوا بگەن)، ئەوانە جارێ بەرێوەن و نەگەیشتوونە ئامانج، یاخود خواپەرست و زاهیدەکانن، دەترسێن ئەگەر بێت و شتە خۆش و بەلەززەتەکان بەکاربێنن، عەزیمەتیان خاوبێتەوە، بۆ ئەوانە واچاکە، ئارەزووەکان واز لێ بێنن و خۆیان دوور بگرن.

٣- کەسانێکی تایبەتی تایبەتن، ئەوانە گەیشتوونە ئامانج و، پێیەکانیان چەسپیون لە ناسینی خوادا، ئنجا ئەوانە قسەیان لەسەر نیەو تەرازوویەکیان بۆ دانانرێ.

چونکە ئەوانە زۆرجاران خوای پەروەردگار بە ئیلهام و خورپەی نێو دڵ، ئاگاداریان دەکاتەوە، چی بخۆن و چۆن بخۆن؟ واتە: شارەزایی و بەرچاو ڕوونییەکەیان هێندە هەیە، لە شەریعەتداو، دڵەکەشیان هێندە ئاوەدانە بە نووری خوا، کە ڕێگرییان لێ دەکات، بە خوتخوتەی شەیتان بخۆن و بخۆنەوەو بپۆشن و ...هتد.

پێنج: (أبو حامد الغزالي)، دەڵێ: **(وَأَكْلِ الشَّهَوات لَا يُسَلِّم إلاَّ لِمَنْ نَظَرَ مِنْ مِشْكَاةِ الوِلَايَةِ وَالنُّبُوَةِ، فَيَكُونَ بَيْنَهُ وَبَيْنَ اللهِ عَلَامَةٌ فِي اسْتِرْسَالِه وَانْقِبَاضِه، وَلَا يَكُونُ ذَلِكَ إلاَّ بَعْدَ خُرُوجِ**

**النَّفْسِ مِنْ طَاعَةِ الهَوَى وَالعَادَةِ بالكُلِّيَّةِ، حَتَّى يَكُونَ أَكْلُهُ إِذَا أَكَلَ بِنِيَّةٍ، كَمَا يَكُونُ إِمْسَاكُه بِنِيَّةٍ، فَيَكُونُ عَامِلاً لَهُ فِي إِفْطَارِه وَإِمْسَاكِهِ).**

واتـە: خـواردنی ئـارەزووان، ناسەلـمێنرێ مەگەر بۆ کەسـێک لە دەلاقەی دۆسـتایەتیی خـواو پێغەبەرایەتییـەوە، تەماشـا بـکات، ئـەو کاتـە لـە لایـەن خـواوە، نیشـانەیەکی دەبێـت لـە دەسـتکراوەییدا، بۆ خۆشـیی و لەززەت وەرگرتـن، یاخود بۆ دەسـتگرتنەوەی، ئـەوەش نایەتـە دی، مەگـەر کاتێـک نەفس یەکجاریـی لـە فەرمانبەریـی هەواو ئـارەزوو و، عـادەت و نەرێـت دەربـازی بووبـێ، کـە بـە شـێوەیەک بـێ، خواردنەکـەی ئەگـەر خـواردی بـە نیەتـەوە بـێ و، نـە خواردنیـشی هـەر بـە نیەتـەوە بـێ، ئـەو کاتـە هـەم لـە کاتێکـدا دەخـوات و لـە کاتێکیشـدا کـە ناخـوات، نیـەتی بـاشی لـێ دێنـێ (و، وەک تاعـەت و عیبـادەت، ئـەو کارە ئەنجـام دەدات).

**شەش:** ئەوەش قسەیەکی حەکیمانەیە دەڵێن: مرۆڤەکان سێ جۆرن:

**١)**- دەژی هەتا بخوات (**يَعِيشُ حَتَّى يَأْكُل**).

**٢)**- دەخوات تاکو بژی، (**يَأْكُل لِيَعِيْش**).

**٣)**- دەژی تاکو خوا بپەرستێ و ڕازیی بکات، (**يَعِيشُ لِيَعْبُدَ الله وَيُرْضِيَه**)، کە ئەمە پەسندترین و بەرزترین و چاکترین جۆری مرۆڤە.

کەسێک بۆیە دەژی، تاکو بخوات، مانای وایە خواردنی کردۆتە ئامانج.

بـەڵام کەسـێک دەخـوات تاکـو بـژی، واتـە: هـەر بایـی ئەوەنـدە دەخـوات پێـی بـژی، ئەمـە حاڵەتێکـی میانجییـە.

ئـەوی دیکـە ئەصڵـەن لـە مەسـەلەی خـواردن و ئەوانـەدا دەچێتـە دەرێ و بۆیـە دەژی کـە خـوا بپەرسـتێ، ئـەو ناچێـت خـواردن بـکات بـە خەمێکـی گچکـەش چ جـای گـەورەو، بەڵکـو بۆیـە دەژی تاکـو خـوا بپەرسـتێ و، خـوای پـەروەردگار لـە خـۆی ڕازیـی بـکات.

**حەوت:** قسەیەکە لە (**سُقراط**)ەوە، کە ئەفلاتوون لە کۆمارەکەی خۆی (**جمهورية أفلاطون**) دا، هێناویەتی، تەرجەمەی عەرەبیی کراوەو من ڕێک مانا کوردییەکەی دێنم،[1] لە چاپی دووەم ساڵی (٢٠١٦)ی زایینی (**المحقق: عبدالسلام شاهين**) لەوێوە دەیهێنم:

دەڵـێ: سـوقرات گوتوویـەتی: پێکـەوە گونجاوییەکـی زۆر هەیـە، لـە نێـوان جـۆراو جـۆر کـردنی مۆسـیقاو، جـۆراو جۆریـی خواردنـدا، جـۆراو جۆریـی مۆسـیقا تاوانباریـی و خراپەکاریـی بـۆ نەفـس پەلکیـش دەکات، جـۆراو جۆریـی خواردنیـش نەخۆشـییان لـە جەسـتەدا پەیـدا دەکات، (وا پێدەچـێ مەبەسـتی لـە جـۆراو جۆریـی مۆسـیقا، ئـەو مۆسـیقاو ئاوازانـە بـن، کـە غەریـزە خراپـەکان لـە ئینسـاندا دەجووڵێنـن)، دوایـی دەڵـێ: زۆریـی خەسـتەخانەکان لـە نێـو کۆمەڵـگاداو، زۆریـی دادوەرەکان بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوەی ئـەو شـارەو، ئـەو کۆمەڵگایـە پەروەردەکـەی خراپـەو، بەڵگەیە لەسـەر ئاسـت نزمیـی دانیشـتووانی، چ بەڵگەیـەک بەهێزتـرە لەسـەر خـراپ پەروەردەیـی کۆمەڵگایـەک، کـە خەسـتەخانەو دادوەری زۆر تێدابـن، {هەڵبەتـە تاکـو خەسـتەخانە زیاتـر بـن، واتـە: نەخۆشـییان زیاتـرەو، هەتـا قازیـی و دادوەر زیاتـر بـن، مانـای وایـە کێشـەو گرفتیـان زیاتـرە، مانـای وایـە کۆمەڵگایەکـە دواکەوتـوە، مەبەسـتی ئەوەیـە}، دوایـی دەڵـێ: پێویسـتیی هەبـوون بـە چارەسـەری پزیشـکیی، عەیـب و کـەم و کوڕیـی نیـە، ئەگـەر بـۆ برینێـک بـێ، یـان بـۆ نەخۆشـییەک بـێ کـە لەگـەڵ کـەش و هـەوادا، پەیدادەبـێ، بـەڵام زۆر ناشـیرینە بـۆ ئێمـە پێویسـتییمان بـە چارەسـەر بـێ، هـی نەخۆشـێک کـە لـە تەمبەڵییـمان پەیدابـووەو، لـە جـۆری هەڵـەی ژیـان و گوزەرانمـان پەیدابـووە، ئـەو شـێوە ژیـان و گوزەرانـەی کـە بایـەکان و نەخۆشـییەکان پـڕی دەکـەن، هـەروەک چـۆن ئـاوی پیـس، باتـڵاغ پـڕ دەکات، ئـەو نەخۆشـیی و دەردو دوانـەش ژیانمـان پـڕ دەکـەن و، ئـاوی تـازە پەیـدا دەبـن بـۆ نەخۆشـییەکان، وەک: (**تطبّـل البطـن**) هەڵاوسـانی سـک، یاخـود هەڵامـەت (**زکام**)و ... هتـد.

---

(١) الجواهر في تفسير القرآن الكريم: ج: ١١ - ٢٦، ص: ١٤٨).

مەبەستی سوقرات ئەوەیە کە نەخۆش بوونی مرۆڤ بەهۆی تەنبەڵییەوەو، بەهۆی جۆراو جۆریی خواردنەوە، یان بەهۆی جۆری ژیانمانەوە کە لاماندا‌وە لە زگماک و لە عەقڵ و زانست، ئەوە عەیب و کەم و کوڕییەو، نیشانەو بەڵگەی ئەوەیە، ئەو کۆمەڵگایە کۆمەڵگایەکی دواکەوتوو و خراپە.

کە بەڕاستیی قسەکانیم پێ جوانن و، هەمووشیان دەچنەوە نێو چوارچێوەی ئەو ئایەتە موبارەکەی، کە ئێمە خەریکی توێژینەوەیینی، کە خوا ﷻ بە بیبڕوایەکان، دەفەرموێ: ﴿أَذْهَبْتُمْ طَيِّبَاتِكُمْ فِي حَيَاتِكُمُ الدُّنْيَا وَاسْتَمْتَعْتُم بِهَا فَالْيَوْمَ تُجْزَوْنَ عَذَابَ الْهُونِ بِمَا كُنتُمْ تَسْتَكْبِرُونَ فِي الْأَرْضِ بِغَيْرِ الْحَقِّ وَبِمَا كُنتُمْ تَفْسُقُونَ ﴿٢٠﴾﴾ الأحقاف.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسە هەشت (٨) ئایەت دەگرێتە خۆی، ئایەتەکانی: (٢١ - ٢٨)، هەمووشیان لە بارەی بەسەرهاتی هوودو گەلەکەی (عاد)ەوەن، کە لە شوێنێک ژیاون شوێنێکی لماویی بە (**الأحقاف**) ناوی هاتوەو، هوود گەلەکەی وشیار کردۆتەوەو، ترساندوونی و بانگی کردوون بۆ یەکتاپەرستیی، بەڵام ئەوان بێباکییان دەربڕیوەو، سەرەنجام بایەکی بەهێزیان لە دوو توێی هەورێکدا، بۆ نێردراوەو، هەموویانی لە بەین بردوون، تەنیا خانووبەرەکانیان ماون، بە چۆڵیی و خاڵیی.

هەروەها خوای باڵادەست سەرنجی کافرەکان ڕادەکێشێ، چ ئەوانەی ڕۆژگاری پێغەمبەر ﷺ، چ هی ئێستا، چ هی پێش ئێستا، چ هی دوای ئێستا، بۆ لای گەلانی دیکەی بێبڕواو هاوبەش بۆ خوا دانەری دەوروبەری کۆمەڵگایەکان کە فەوتێنراون و، پەرستراوە ساختەکانیشیان هیچ دادیان نەداون.

﴿وَٱذۡكُرۡ أَخَا عَادٍ إِذۡ أَنذَرَ قَوۡمَهُۥ بِٱلۡأَحۡقَافِ وَقَدۡ خَلَتِ ٱلنُّذُرُ مِنۢ بَيۡنِ يَدَيۡهِ وَمِنۡ خَلۡفِهِۦٓ أَلَّا تَعۡبُدُوٓاْ إِلَّا ٱللَّهَ إِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيۡكُمۡ عَذَابَ يَوۡمٍ عَظِيمٖ ﴿٢١﴾ قَالُوٓاْ أَجِئۡتَنَا لِتَأۡفِكَنَا عَنۡ ءَالِهَتِنَا فَأۡتِنَا بِمَا تَعِدُنَآ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿٢٢﴾ قَالَ إِنَّمَا ٱلۡعِلۡمُ عِندَ ٱللَّهِ وَأُبَلِّغُكُم مَّآ أُرۡسِلۡتُ بِهِۦ وَلَٰكِنِّيٓ أَرَىٰكُمۡ قَوۡمٗا تَجۡهَلُونَ ﴿٢٣﴾ فَلَمَّا رَأَوۡهُ عَارِضٗا مُّسۡتَقۡبِلَ أَوۡدِيَتِهِمۡ قَالُواْ هَٰذَا عَارِضٞ مُّمۡطِرُنَاۚ بَلۡ هُوَ مَا ٱسۡتَعۡجَلۡتُم بِهِۦۖ رِيحٞ فِيهَا عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴿٢٤﴾ تُدَمِّرُ كُلَّ شَيۡءِۭ بِأَمۡرِ رَبِّهَا فَأَصۡبَحُواْ لَا يُرَىٰٓ إِلَّا مَسَٰكِنُهُمۡۚ كَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡمُجۡرِمِينَ ﴿٢٥﴾ وَلَقَدۡ مَكَّنَّٰهُمۡ فِيمَآ إِن مَّكَّنَّٰكُمۡ فِيهِ وَجَعَلۡنَا لَهُمۡ سَمۡعٗا وَأَبۡصَٰرٗا وَأَفۡـِٔدَةٗ فَمَآ أَغۡنَىٰ عَنۡهُمۡ سَمۡعُهُمۡ وَلَآ أَبۡصَٰرُهُمۡ وَلَآ أَفۡـِٔدَتُهُم مِّن شَيۡءٍ إِذۡ كَانُواْ يَجۡحَدُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُواْ بِهِۦ يَسۡتَهۡزِءُونَ ﴿٢٦﴾ وَلَقَدۡ

أَهۡلَكۡنَا مَا حَوۡلَكُم مِّنَ ٱلۡقُرَىٰ وَصَرَّفۡنَا ٱلۡأٓيَٰتِ لَعَلَّهُمۡ يَرۡجِعُونَ ﴿٢٧﴾ فَلَوۡلَا نَصَرَهُمُ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ قُرۡبَانًا ءَالِهَةَۢۖ بَلۡ ضَلُّواْ عَنۡهُمۡۚ وَذَٰلِكَ إِفۡكُهُمۡ وَمَا كَانُواْ يَفۡتَرُونَ ﴿٢٨﴾ ﴾.

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{هەروەها (ئەی موحەممەد ﷺ!) یادی (هوودی) برای (گەلی) عاد بکەوە کە ترس و هۆشداریی بە کۆمەڵگایەکەی خۆیدا، لە حاڵێکدا (پێغەمبەرانی) ترسێنەرو وریاکەرەوە لە پێش دوو دەستیەوەو لە دوایەوە (لە نیزیکیەوەو لە دووریەوە لە کۆمەڵگاکانی دەوروبەریدا)، ڕابردبوون (پێیگوتن) کە جگە لە خوا مەپەرستن! من مەترسیی ئازاری ڕۆژێکی مەزنم لێتان هەیە ﴿٢١﴾ (گەلەکەی) گوتیان: ئایا هاتوویە لامان تاکو لە پەرستراوەکانمان هەڵمانگێڕیەوە (لامان بدەی)، دەجا ئەگەر لە ڕاستانی، ئەوەی بەڵێنمان پێدەدەی (و هەڕەشەمان پێی لێدەکەی) بۆمان بێنە ﴿٢٢﴾ (هوود) گوتی: زانیاریی (کاتی هاتنی ئەو سزایە)، بەس لە لای خوایەو، منیش ئەوەی پێی ڕەوانەکراوم (و پێمدا نێردراوە) پێتان ڕادەگەیەنم، بەڵام واتان دەبینم کۆمەڵێکن نەفامیی دەکەن (و بە نەزانتان دەزانم) ﴿٢٣﴾ ئنجا کاتێک ئەو (ئازارو سزا هەڕەشە پێلێکراو)ەیان بینی (وایانزانی) هەورێکە بەرەو ڕووی دۆڵ و شیوەکانیان دێ، گوتیان: ئەوە هەورێکە ئاومان بۆ دەبارێنێ! گوترا: بەڵکو ئەوە ئەو (سزا)یەیە، کە پەلەتان لێی دەکرد (بۆتانبێ) بایەکە ئازارێکی بە ئێشی تێدایە ﴿٢٤﴾ بە فەرمانی پەروەردگاری هەموو شتێک (کە بۆی دیارییکرابێ) دەفەوتێنێ، لە ئاکامدا وایان بەسەرهات بەس خانووبەرەکانیان (بە چۆڵیی) دەبینران، بەو شێوەیە سزای کۆمەڵی تاوانباران دەدەین ﴿٢٥﴾ بە دڵنیاییش ئەوەی ئەوانمان تێدا دەستڕۆیشتوو کردبوو (بەوانمان دابوو)، ئێوەمان تێدا دەستڕۆیشتوو نەکردوەو، بیستن و چاوەکان و عەقڵەکانمان بۆ ڕەخساندبوون، بەڵام بیستنیان و چاوەکانیان و عەقڵەکانیان هیچ سوودیان پێ نەگەیاندن، چونکە

نکووڵییـان لـە نیشـانەکانی خـوا دەکـردو، سـەرەنجام ئـەوەی گاڵتەیـان پێدەکـرد گەمـارۆی دان ﴿٢٦﴾ بـە دڵنیاییـش ئاوەدانییـەکانی دەوروبەرتانمـان لـە نێـو بـردن و، نیشـانەکانمان (بەشـێوەی) جـۆراو جـۆر خسـتنەڕوو، بەڵکـو بگەڕێنـەوە ﴿٢٧﴾ ئنجـا دەبووایـە ئەوانـەی لـە جیاتی خـوا بـە پەرستراویان گرتـوون، بـۆ نیزیککەوتنـەوە (لـە خـوا) سـەریان خسـتبانایە، بەڵکـو لێیـان بزربـوون! ئـەوەش (ئەنجامـی) درۆیەکەیـان و ئـەوە بـوو کـە هەڵیاندەبەسـت (گوایـە خـوا هاوبـەشی هـەن!) ﴿٢٨﴾ ].

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(بِٱلْأَحْقَافِ): (الأَحْقَـافُ: جَمْـعُ حِقْـفٍ، وَهُـوَ مِـنَ الرَّمْـل مائـلٌ، أو مسْـتَطيلَ، وَاحْقَوْقَفَ: مَـالَ حَتَّـى صَـارَ كَالْحِقْـفِ)، (أَحْقَـافُ) کـۆی (حِقْـف)ە، (حِقْـف) بـە تەپۆڵکـە لـمی درێژبـۆوە یاخـود لاربـۆوە دەگوتـرێ، دەگوتـرێ: (احْقَوْقَـفَ) واتـە: لاربـۆوە وەک تەپۆڵکـەی لم.

(خَلَتِ): (خَـلَا الزَّمَـانُ: مَـضَى وَذَهَـبَ)، واتـە: کاتەکـە تێپـەڕی، ڕابـرد، (قَـدْ خَلَـتْ مِـنْ قَبْلِهِـم): ڕابـرد لـە پێـش وانـدا.

(لِتَأْفِكَنَا): (أي: لِتَصْرِفَنَـا: لِتَصْرِفَنَـا مِـنَ الحَـقِّ إلى البَاطِـل)، (أَفْـك): بـە مانـای لادان دێ، کەواتـە: (لِتَأْفِكَنَـا) واتـە: بـۆ ئـەوەی لامـان بـدەی، لێـرەدا مەبەسـت لادانـە لـە هـەق بـۆ ناهـەق، دیـارە خۆیـان لەسـەر هـەق بینیـوەو، پێیـان وابـووە ئـەو خـوا بەیەکگرتنـەی هـوود ئـەوانی بـۆ بانـگ دەکات، شـتێکی ناهەقـە.

(عَارِضًا): (العَـارِضُ: البَـادِيُ عُرْضُـهُ)، (عـارض) ئەوەیـە تەنیشـتی دیـار بـێ، (عَـارِض): لێـرەدا بـە مانـای هـەور دێ، هەورێـک کـە بـە ئاسـماندا بـڵاو بووبێتـەوە، وشـەی (عَـارِض): بـۆ نەخۆشـییش بـەکاردێ و، بـۆ ڕوومەتیـش بـەکاردێ، دەگوتـرێ: (أَخَـذَ مِـنْ عَارِضَيْـهِ)، واتـە: لـەولای ڕیـشی گـرت، لێـی کەمکـردەوە.

(أَوْدِيَتِهِمْ): (الأَوْدِيَـة: جَمْـعُ وَادِي: المَوْضِـعُ الَّـذِي يَسِـيْلُ فِيْـه المَـاءُ، وَالمُفَـرَجُ بَـيْنَ الجَبَلَـيْنِ)، (أَوْدِيَـة) كـۆی (وَادِي)ە، (وَادِي): ئـەو شـوێنەیە ئـاوی پێـدا دەڕوات، دۆڵ و، شـیوو، هـەر دابڕاوابیـەک لـە نێـوان دوو چیایانـدا پێـی دەگوتـرێ: (وَادِي).

(مُمْطِرُنَا): واتـە: ئاومـان بـۆ دەبارێنـێ، دەگوتـرێ: (يَـوْمٌ مُطِيْر وَمَاطِر وَمُمْطِر، وَوَادِي مَطِـيْر، أَي: مَمْطُـور، مَطَـر فِي الخَـيْرِ، وَأَمْطَـرْ فِـي الـشَّر)، دەگوتـرێ: ڕۆژێکـی (مُطِـيْر وَمَاطِر وَمُمْطِـر)، هـەر سێکیان بـە مانـای ئـاودارن، مـەرج نیـە تەنیـا بـاران و بەفـر و تـەرزە بـێ، ڕۆژێـک کـە ئـاوی تێـدا لـە ئاسـماندا دەخـزێ، دەگوتـرێ: (وَادِي مَطِـيْر) شـیوێکی باراناویـی، (مطـر) بـۆ چاکـەو پێشـهاتی بـاش و، (أَمطـر) بـۆ خراپـەو پێشـهاتی بـەد بـەکاردێ.

(مَكَّنَّهُمْ): (المَـكَانُ: المَوْضـع الحَـاوِي لِلـشَّيء، مَكَّنْتُـهُ وَمَكَّنْـتُ لَـهُ فَتَمَكَّـنَ)، واتـە: توانـام پێـدا، هەردووکیـان یـەک مانایـان هەیـە، (مَكَّنْتُـه وَمَكَّنْـتُ)، توانـادارم کـردو، دەسترۆیشـتووم کـرد، (فَتَمَكَّـن)، واتـە: دەسترۆیشـتوو بـوو، تواناداربـوو.

(يَجْحَدُونَ): واتـە: نکوولّییـان دەکـرد، (الجُحُـودُ: نَفْـي مَـا فِي القَلْـبِ إِثْبَاتُـهُ، وَإِثْبَـاتُ مَـا فِي القَلْـبِ نَفيْـهُ)، (جُحُـود): ئەوەیـە کـە شـتێک لـە دڵـدا چەسـپابێ، تـۆ لایبـەری، یاخـود شـتێک لـە دڵـدا نەبـێ، تـۆ بیچەسـپێنی، واتـە: نکوولّییکـردن، ئنجـا نکوولّییکـردن لـە بـوون یـان لـە نەبـوون، لـە بـوونی شـتێک، یـان لـە نەبـوونی شـتێک، واتـە: دان پێـدا نەهێنـان، شـتێک بـزانی وایـەو دانی پێدانەهێنـێ، یاخـود شـتێک بـزانی وانیـە، کەچـی دانی پێـدا نەهێنـی کەوانیـە.

(وَحَاقَ بِهِم): (حَـاقَ: أَي: نَـزَلَ بِهِـمْ، وَأَصَابَهُـمْ، أَو أَحَـاطَ بِهِـمْ)، (حَـاقَ): بـە مانـای دابـەزی، تـووشی بـوو، دابەزیـە سـەری، هەروەهـا (حـاق): گەمارۆیـداو ئابلّووقەیـدا، بـە هـەردوو واتایەکـە دێ.

(وَصَرَّفْنَا): (أَي: نَوَّعْنَـا)، جـۆراو جۆرمـان کـرد، دەگوتـرێ: (الـصَّرْفُ: رَدُّ الـشَّيءِ مِـنَ حَالَـةٍ إِلى حَالَـةٍ، أو إِبْدَالُـهُ بِغَـيْرِهِ، وَالتَّصْرِيـفُ: كَالـصَّرْفِ إِلاَّ فِي التَّكْثِـيْر، وَتَصْرِيـفُ الرِّيَـاحِ

**هُـوَ صَرْفُهُـا مِـنْ حَـالٍ إلى حَـال**)، (**صَرف**): بریتیـە لـەوەی شـتێک لـە حاڵێکـەوە بگـۆڕی بـۆ حاڵێکـی دی، یاخـود بیگـۆڕی بـە شـتێکی دیکـە، ئـەو لابـەری و حاڵێکـی دیکـە بهێنیـە جێـی، (**تَصْرِیف**)یـش وەک (**صَرف**) وایـە، بـە مانـای گۆڕیـن و لادان دێ، بـەڵام (**تَصْرِیـف**) بـۆ زۆرییـە، (**صَرَفَ**) و (**صَرَّفَ**)، ئەگـەر بـە زیـاد کـراو (**مَزِیْـد**) بـێ، ماناکـەی بەهێزتـر دەبـێ، وەک (**قَتَـلَ، وقَتَّـلَ**)، (**تَصْرِیـفُ الرِّیَـاح**) ئەوەیـە کـە بایەکـە لـە حاڵێکـەوە بگـۆڕێ بـۆ حاڵێکـی دیکـە، بـەڵام وەک لـە جێـی دیکـەش گوتوومـە: بـەس ئـەوە نیـە، لـە حاڵێکـەوە بـۆ حاڵێکـی دیکـە بـێ، بەڵکـو لـە ڕووی چۆنیەتییـەوەو، لـە ڕووی چەندێتییـەوەو، لـە ڕووی ئـەو لایـەوە کـە لێـی هەڵـدەکات.

(قُرْبَانًا): (**القُرْبَـانُ: مَـا يُتَقَـرَّبُ بـهِ إلى اللـه**)، (**قُرْبَـان**): هـەر شـتێکە مـرۆڤ پێـی لـە خـوا نزیـک بـێ و، خـۆی پـێ لـە خـوا نزیـک بخرێتـەوە، (**وَصَـارَ فِي التَّعَـارُف اسْـمَاً لِلنَسِـيْكَةِ الَّتِـي هِـيَ الذَّبِيْحَـةُ وَجَمْعُـهُ: قَرَابِـيْن، وَيُسْـتَعْملُ للوَاحِـدِ وَالجَمْـع**)، (**قُرْبَـان**): لـە زاراوەی شـەرعدا، نـاوە بـۆ سـەر بڕینـی ئاژەڵێـک کـە بـە (**قَرَابِيْن**) کۆدەکرێتـەوە، جـاری وایـە (**قُرْبَـان**) بـۆ تـاک و بـۆ کـۆش بـەکاردێ، کـە لێـرەدا دەفەرمـوێ: (**قُرْبَانـاً آلِـهَةً**)، واتـە: پەرسـتراوانێکی خـۆ پـێ لـە خـوا نیزیـک خـراوە.

(ضَلُّوا عَنْهُمْ): (**ضَـلَّ الـشَّيءُ: ضَـاعَ وَهَلَـكَ، يَضِـلُّ ضَـلاَلًا**)، (**ضَـلَّ الشَّيءُ**): واتە: شـتەکە ون بـوو، بزربـوو، لەبەیـن چـوو، (**يَضِـلُّ ضَـلاَلاً**) ون دەبـێ، ون بـوون، دەگوتـرێ: (**أَرْضٌ مَضِلَّـةٌ وَمَضَلَّـةٌ، بِالْفَتْـحِ وَالكَسْرِ يُضَـلُّ فِيهَـا الطَّرِيْـق**)، زەوییەکـی (**مَضِلَّـة**) یـان (**مَضَلَّـة**) بـە سـەر (**فتح**) یـان بـە ژێـر (**کسرة**)، زەوییـەک ڕێـی تێـدا ون بکـرێ، واتـە: قووچکەو نیشـانەی وای لـێ نەبـن، بکرێنـە نیشـانە بـۆ ڕێیەکـە.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

سەرەتا دەڵێین: ئێمە بەسەرهاتی گەلی عادمان لە سووڕەتی (**هود**)دا، بە تەفصیل توێژیوەتەوە، لەوێ ڕەچەڵەکی هوود، ڕەچەڵەکی گەلی عاد، درێژەی بەسەرهاتی هوود ﷺ لەگەڵ گەلی عاددا، هوود چی پێگوتن و ئەوان چۆنیان وەڵام دایەوە؟ پاشان چۆنیەتیی سزادرانی گەلی عاد، بەو بایە، لەوێ بە تەفصیل باسمان کردوە، لێرەدا هەر لە قەدەر چەمک و واتای گشتیی ئایەتەکان، باسی دەکەین، بەڵام کەسێک بیەوێ درێژەی بەسەرهاتی هوود ﷺ لەگەڵ گەلەکەی عاددا، بزانێ دەبێ بگەڕێتەوە بۆ تەفسیری سووڕەتی (**هود**)، لەوێ ئەو بەسەرهاتەمان بە وردیی هێناوە، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَٱذۡكُرۡ أَخَا عَادٍ إِذۡ أَنذَرَ قَوۡمَهُۥ بِٱلۡأَحۡقَافِ﴾، هەروەها برایەکەی عاد، یاد بکەوە! کە خەڵکەکەی خۆی لە ئەحقاف ترساند، هۆشداریی پێدان و وریای کردنەوە، ﴿وَٱذۡكُرۡ﴾، هەم بە مانای بیهێنەوە بیر خۆت، هەم بە مانای باسی بکە، دێ، چونکە (**ذِکْر**) بە مانای هێنانەوە یاد، دێ و، بە مانای باسکردنی زمانیش، دێ، باسی برایەکەی گەلی عاد بکە، کە هوود ﷺ بووە، لەبەر ئەوەی لە ڕەچەڵەکدا لەوان بوو، یاخود یادی بکەوە کە خەڵکەکەی و گەلەکەی خۆی لە ئەحقاف کە شوێنێکی جوگرافیی زانراوەو، شوێنێکی لماویی بووە، ئەو خەڵکەی لێ ژیاون، ﴿وَقَدۡ خَلَتِ ٱلنُّذُرُ مِنۢ بَيۡنِ يَدَيۡهِ وَمِنۡ خَلۡفِهِۦٓ﴾، لە حاڵێکدا کە ورياکەرەوەو ترسێنەرەکان لە پێش دوو دەستیەوەو، لە دوایەوە ڕابردبوون، واتە: لە پێش دەستیەوە (کە لێی نزیک بوون)، یان لە دوایەوە (کە لێی دوور بوون)، ئەوەش لە ڕووی کاتەوە، یاخود لە ڕووی جوگرافییەوە، کە لێی نزیک بوون بۆ وێنە: گەلی (**سبأ**)و، گەلی (**تُبّع**) لە یەمەن، ئەوانەش کە لێی دوور بوون، وەک گەلی لووط و گەلی نووح و، گەلی فیرعەون لە میصر، ئەگەر لە پێش ئەوەوە بووبن، بەڵام واپێدەچێ گەلی عاد

لـە پێـش وان دا بـوو بـێ و، دەبـێ مەبەسـت ئـەو گەلانـە بـێ کـە لـە پێـش ئەوانـدا فەوتـاون.

ئنجـا چ لـە ڕووی کاتـەوە، لێیـان نیزیـک یـان دوور بووبـن، هەندێکیـان نیزیـک و، هەندێکیـان دوور، چ لـە ڕووی شـوێنی جوگرافییـەوە، هەردووکیـان دەگرێتـەوە، ﴿ أَلَّا تَعْبُدُوٓاْ إِلَّا ٱللَّهَ ﴾، خەڵکەکـەی خـۆی ترسـاندو هۆشـداریی پێـدان، ئنجـا ئایـا وریاکردنـەوەو ترسـاندنەکەی نێوەڕۆکەکـەی چـی بـوو؟ بریتـی بـوو لـەوە: جگـە لـە خـوا مەپەرسـتن، ﴿ إِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ ﴾، بـە دڵنیایـی مـن مەترسـیی ئـازاری ڕۆژێکـی مەزنـم، لێتـان هەیـە، ئایـا ئـەوان چییـان وەڵام دایـەوە؟

﴿ قَالُوٓاْ أَجِئْتَنَا لِتَأْفِكَنَا عَنْ ءَالِهَتِنَا ﴾، گوتیـان: ئایـا هاتوویـە لامـان، تاکـو لـە پەرسـتراوەکانمان لامـان بـدەی و هەڵـمان بگێڕیـەوەو، دوورمـان بخەیـەوە، لـەو هەقـەی ئێمـە لەسـەرینی، بـۆ ئـەو ناهەقییـەی ئێمـەی بـۆی بانـگ دەکـەی؟!، ﴿ فَأْتِنَا بِمَا تَعِدُنَآ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّـٰدِقِينَ ﴾، ئەگـەر لـە ڕاسـتانی، ئـەوەی بەڵێنـمان پـێ دەدەی و هەڕەشـەمان پـێ لـێ دەکـەی، بۆمـان بێنـە.

﴿ قَالَ إِنَّمَا ٱلْعِلْمُ عِندَ ٱللَّهِ وَأُبَلِّغُكُم مَّآ أُرْسِلْتُ بِهِۦ ﴾، (هـوود) فەرمـووی: زانیاریـی تەنیـا لـە لای خوایـە، واتـە: زانیاریـی کاتی هاتنـی ئـەو سـزایە، تەنیا لـە لای خوایە، ﴿ وَأُبَلِّغُكُم مَّآ أُرْسِلْتُ بِهِۦ ﴾، ئـەوەش کـە پێمـدا ڕەوانکـراوە، پێتـان ڕادەگەیەنـم، ﴿ وَلَـٰكِنِّيٓ أَرَىٰكُمْ قَوْمًا تَجْهَلُونَ ﴾، بـەڵام بەڕاسـتیی بـە کۆمەڵێکتـان دەبینـم، نەفامیـی دەکـەن.

﴿ فَلَمَّا رَأَوْهُ عَارِضًا مُّسْتَقْبِلَ أَوْدِيَتِهِمْ ﴾، ئنجـا کاتێـک بینییـان لـە شـێوەی هەورێکدا، بـە پانیـی بـەرەو شـیوو دۆڵەکانیـان دەهـات، ئـەو ناوچانـەی کـە تێیـدا نیشـتەجێ بـوون، ﴿ قَالُواْ هَـٰذَا عَارِضٌ مُّمْطِرُنَا ﴾، (خەیاڵپڵاویانکـرد)، گوتیـان: ئـەوە هەورێکـە ئاومـان بـۆ دادەبەزێنـێ، ﴿ بَلْ هُوَ مَا ٱسْتَعْجَلْتُم بِهِۦ ﴾، (هـوود عليه السلام پێـی گوتـن، یـان بـە زمانی حـاڵ، پێیـان گوتـرا، یـان خـوای پـەروەردگار پێـی فەرمـوون:) بەڵکـو ئـەوە ئەوەیـە کـە پەلەتـان لـێ دەکـرد، ئـەوە ئـازارو سـزایە، ﴿ رِيحٌ فِيهَا عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴾، بایەکـە ئازارێکـی بـە ئێـش و ژانی تێدایـە.

﴿ تُدَمِّرُ كُلَّ شَيۡءِۭ بِأَمۡرِ رَبِّهَا ﴾، بە فەرمانی پەروەردگاری هەموو شتێک وێران دەکات، لە بەین دەبات، ﴿ فَأَصۡبَحُواْ لَا يُرَىٰٓ إِلَّا مَسَٰكِنُهُمۡ ﴾، بە (ف)ی بەدواهاتن (تعقیب): یەکسەر دوا بە دوای ئەوە وایان لێهات، تەنیا خانووەکانیان دەبینران، نە دەبینران جگە لە خانووبەرەکانیان، واتە: قڕە بڕ بوون، وەک کوردەواریی دەڵێن: (چوێلەکە کوژیان نەما)، ﴿ كَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡمُجۡرِمِينَ ﴾، هەر بەو جۆرە کۆمەڵی تاوانباران سزا دەدەین.

کەواتە: ئەی تاوانبارانی ڕۆژگاری پێغەمبەر ﷺ و دوای ئەویش! ئێوەش بترسێن کە هەمان سزاتان بۆ بێ.

﴿ وَلَقَدۡ مَكَّنَّٰهُمۡ فِيمَآ إِن مَّكَّنَّٰكُمۡ فِيهِ ﴾، بە دڵنیاییی ئەوانمان دەستڕۆیشتوو کردبوو، تواناداریمان کردبوون، لە حاڵێکدا بە شێوەیەک کە ئێوەمان تێدا تواناداری دەستڕۆیشتوو نەکردوە، ﴿ وَجَعَلۡنَا لَهُمۡ سَمۡعٗا وَأَبۡصَٰرٗا وَأَفۡـِٔدَةٗ ﴾، بیستن و چاوەکان و عەقڵەکانیشمان پێدابوون، ﴿ فَمَآ أَغۡنَىٰ عَنۡهُمۡ سَمۡعُهُمۡ وَلَآ أَبۡصَٰرُهُمۡ وَلَآ أَفۡـِٔدَتُهُم مِّن شَيۡءٍ ﴾، بەڵام بیستنیان و چاوەکانیان و عەقڵەکانیان هیچ سوودی پێ نەگەیاندن، ﴿ إِذۡ كَانُواْ يَجۡحَدُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ ﴾، بە هۆی ئەوەوە کە نکووڵییان لە نیشانەکانی خوا دەکرد، ئەگەر کوفر چووە نێو عەقڵ و دڵی مرۆڤەوە، هەستەوەرەکانی مرۆڤ لەبەرانبەر ناسینی حەق دا، لە کار دەکەون، ﴿ وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُواْ بِهِۦ يَسۡتَهۡزِءُونَ ﴾، سەرەنجام ئەوەی گاڵتەیان پێدەکرد، گەمارۆی دان و دەوری دان، سزایەکە دابەزیە سەریان.

ئنجا خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدۡ أَهۡلَكۡنَا مَا حَوۡلَكُم مِّنَ ٱلۡقُرَىٰ ﴾، بە دڵنیاییی ئاوەدانییەکانی دیکە دەوری ئێوەمان لە بەین بردوون، ﴿ وَصَرَّفۡنَا ٱلۡأٓيَٰتِ لَعَلَّهُمۡ يَرۡجِعُونَ ﴾، نیشانەکانیشمان بۆ جۆراو جۆرکردن (بە زۆر جۆر نیشانەکانی خۆمان، موعجیزەکان و ئایەتە خوێنراوەکانی خۆمانمان بۆ خستنەڕوو)، بەڵکو بگەڕێنەوە، (واز لە خراپە بێنن و بۆ چاکە بگەڕێنەوە بۆ لای خوا).

﴿ فَلَوْلَا نَصَرَهُمُ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُوا۟ مِن دُونِ ٱللَّهِ قُرْبَانًا ءَالِهَةًۢ ﴾، ئەوانەی لە جیاتی خوا بە پەرستراویان گرتبوون، بۆ ئەوەی لە خوایان نیزیک بخەنەوە، دەبووایە سەریان بخەن و پشتیان بگرن، ﴿ بَلْ ضَلُّوا۟ عَنْهُمْ ﴾، بەڵکو لە کاتی تەنگانەدا لێیان ون بوون، شوێن بزر بوون، ﴿ وَذَٰلِكَ إِفْكُهُمْ وَمَا كَانُوا۟ يَفْتَرُونَ ﴾، ئەوەش درۆیەکەیان بوو و ئەوەی هەڵیاندەبەست (بە ناوی خواوە)، [گوایە: ئەوانە پەرستراون و، شەفاعەت و تکاو ڕەجایان بۆ لەلای خوا دەکەن و، لە خوایان نیزیک دەخەنەوە]، وەک لە سوورەتی (**الزمر**)دا، دەڵێ: ﴿ مَا نَعْبُدُهُمْ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَآ إِلَى ٱللَّهِ زُلْفَىٰٓ إِنَّ ٱللَّهَ يَحْكُمُ بَيْنَهُمْ فِى مَا هُمْ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى مَنْ هُوَ كَـٰذِبٌ كَفَّارٌ ﴿٣﴾ ﴾، بەس بۆیە دەیانپەرستین لە خوامان نزیک بخەنەوە.

ئنجا ئەو درۆیەی دەیانکردو ئەوەی بە ناوی خواوە هەڵیاندەبەست، ئەوەیان لێ ون بوو، ئەوەش سەرەنجامەکەیان بوو.

خوا ﷻ سەرەنجامی ئێمە خێر بکات، بەهۆی ئەوەوە، کە گوێ دەگرین بۆ بانگەوازو پەیامی خوا، بە دڵ و گیان لە باوەشی دەگرین، هەوڵدەدەین لێی تێبگەین و، کاری پێ بکەین.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**هوودی برای گەلی عاد، خەڵکەکەی خۆی کە لە ئەحقاف (بیابانی لماویی)دا نیشتەجێ بوون، هۆشیار کردەوە کە تەنیا خوا بپەرستن، کەچی ئەوان بەسەر سوڕمان و ڕەخنەوە، گوتیان: ئایا هاتووی کە لە پەرستراوەکانمان لامان بدەی؟ ئەگەر ڕاست دەکەی سزامان بۆ بێنە، ئەویش گوتی: من تەنیا پەیامی خواتان پێ دەگەیەنم و، کاتی هاتنی سزاش بەس خوا دەیزانێ، بەڵام من بە نەفامتان تێدەگەم:**

خوا ﷻ دەفەرمووێ: ﴿وَٱذۡكُرۡ أَخَا عَادٍ إِذۡ أَنذَرَ قَوۡمَهُۥ بِٱلۡأَحۡقَافِ وَقَدۡ خَلَتِ ٱلنُّذُرُ مِنۢ بَيۡنِ يَدَيۡهِ وَمِنۡ خَلۡفِهِۦٓ أَلَّا تَعۡبُدُوٓاْ إِلَّا ٱللَّهَ إِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيۡكُمۡ عَذَابَ يَوۡمٍ عَظِيمٖ ﴿٢١﴾ قَالُوٓاْ أَجِئۡتَنَا لِتَأۡفِكَنَا عَنۡ ءَالِهَتِنَا فَأۡتِنَا بِمَا تَعِدُنَآ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿٢٢﴾ قَالَ إِنَّمَا ٱلۡعِلۡمُ عِندَ ٱللَّهِ وَأُبَلِّغُكُم مَّآ أُرۡسِلۡتُ بِهِۦ وَلَٰكِنِّيٓ أَرَىٰكُمۡ قَوۡمٗا تَجۡهَلُونَ ﴿٢٣﴾﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە یازدە بڕگەدا:

١)- ﴿وَٱذۡكُرۡ أَخَا عَادٍ﴾، باسی برای عاد بکە، یاخود: یادی برای عاد بکەوە، وشەی (**وَاذْكُرْ**) هەم باسکردنی زمان، دەگەیەنێ: باسی بکە بە زمان و بیگێڕەوە، هەم بۆ یاد کردنەوەی بە دڵ و عەقڵیش بەکاردێ، ﴿أَخَا عَادٍ﴾، برایەکەی عاد، مەبەست پێی هوودە عليه السلام هەرچەندە لەم سوورەتە موبارەکەدا، ناوی نەهاتوە، بەڵام لە سوورەتی (**الأعراف**)دا: ﴿وَإِلَىٰ عَادٍ أَخَاهُمۡ هُودٗاۗ قَالَ يَٰقَوۡمِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنۡ إِلَٰهٍ غَيۡرُهُۥٓۚ أَفَلَا تَتَّقُونَ ﴿٦٥﴾﴾**الأعراف**، هەروەها لە سوورەتی (**الشعراء**)دا، خوا ﷻ باسی کردوەو، لە سوورەتی (**هود**)یش دا، کە هەر بە ناوی هوودەوەیە عليه السلام، لێرەدا کە خوا ﷻ دەفەرمووێ: باسی برای عاد بکە، برای

گەلی عاد، واتە: ئەو پێغەمبەرەیان ﷺ، کە لە ڕەچەڵەک و تۆرەمەی خۆیانەو، لەبەر ئەوەش کە پێشتر باسکراوە ناوی هوودە، لێرەدا بە پێویست نەزانراوە.

ئـەوە کـە دەفەرمـوێ: ﴿أَخَا عَادٍ﴾، (الأخُ: المُشَارِكُ فِي نَسَبِ القَبِيْلَةِ)، بـرا: لـە ڕووی ڕەچەڵەکـی هـۆزەوە هاوبەشـیان بـووە، دەگوتـرێ: (أَخُـو فُـلاَنٍ، أو أَخُـو بَنِـي فُـلاَن)، هەروەهـا (أخ) بـۆ هاوەڵایەتییـش بـەکاردێ، (الأخُ: الصَّاحِـبُ المُـلاَزِم)، بـرا: هاوەڵێـک هەمیشـە پەیوەسـت بـێ بـە کەسـێکەوە، یـان بـە کۆمەڵێکـەوە، واتـە: ئـەو کەسـەی هـەر لەگـەڵ گەلەکـەی خـۆی (عـاد)دا بـووە، ئنجـا چ باسـکردنەکە مەبەسـت پێـی باسـکردنی بـە زمـان بـێ، چ یـاد کـردنی بـە دڵ بـێ، خـوا ﷻ دەفەرمـوێ:

٢)- ﴿إِذْ أَنذَرَ قَوْمَهُۥ بِٱلْأَحْقَافِ﴾، کاتێک خەڵکەکەی خۆی لە ئەحقاف وریا کردەوە، (إِذْ) لێرەدا (إِسْمٌ للزَّمَانِ المَاضِي)، ناوە بۆ کاتی ڕابردوو، یاد بکەوە! کاتێک کە گەلەکەی خۆی ترساندو، هۆشیاری کردنەوە، (بالأَحْقَاف)، کە لە (أَحْقَاف) بوون، (أَحْقَاف) پێشتر گوتمان: کۆی (حِقْف)ە، (وَالحِقْفُ: الرَّمْلُ العَظِيْم، أو الرَّمْلُ المَائِل، أو الرَّمْلُ المسْتَطِيلُ)، بە تەپۆلکەیەکی لمی مەزن، یان تەپۆلکەیەکی لم کە لاربووبێتەوە، یان درێژبووبێتەوە، دەگوترێ، (حِقْف)یش کۆیەکەی (أَحْقَاف)ە، دیارە ئەو شوێنەی گەلی عادی لێ بووە، تەپۆلکەی لماویی لێ بوون، تەپۆلکەکانیش درێژو لاریش بوون، تەپۆلکەی لم، زیاتر بەهۆی باوە، کە با لم دێنێ و ڕایدەماڵێ لە شوێنێکەوەو کۆی دەکاتەوەو، لە شوێنێکدا بڵاوی دەکاتەوە، دروست دەبن.

٣)- ﴿وَقَدْ خَلَتِ ٱلنُّذُرُ مِنۢ بَيْنِ يَدَيْهِ وَمِنْ خَلْفِهِۦٓ﴾، لە حاڵێکدا کە ترسێنەرەکان، [مەبەست پێیان پێغەمبەرانن (عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام)]، وریاکەرەوەکانیان تێپەڕیبوون، گوزەرابوون لە پێش هەردوو دەستیەوەو لە دواشیەوە:

أ- لە پێش دوو دەستیەوە لە ڕووی کاتەوە، واتە: نیزیک لە کات و سەردەمی خۆیان، ﴿وَمِنْ خَلْفِهِۦٓ﴾، واتە: دوور لە کات و ڕۆژگاری ئەوان، ئەوە لە ڕووی کاتەوە.

ب- دەشگونجێ مەبەست پێی لە ڕووی جوگرافییەوە بێ، واتە: هەم لە پێشیەوە، هەم لە دوایەوە، پێغەمبەرانی دیکە (عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلاَم) ڕابرد بوون، بۆ گەل و کۆمەڵگاکانی دیکەدا، نێردرابوون.

ج- دەشگونجێ مەبەست لە پێش دەستی و لە دوایەوە، مەبەست پێی چوار دەورە بێ، نەک تەنیا پێشەوەو دواوە بێ، بەڵکو مەبەست چوار دەوربێ، ئەم تەعبیرە لە قورئاندا بەو واتایەش بەکارهاتوە، واتە: لە هەر چوار دەوریدا، پێغەمبەرانی دیکە (عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام) بۆ کۆمەڵگایەکانی دیکە نێردرابوون.

وشەی (النُّذُر: جَمْعُ نِذَارَة)، واتە: وریاکردنەوە، یان (نذر) کۆی (نذیر) ەو مەبەست پێی ئەو پێغەمبەرانەن (عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام) کە ئەرکیان وریاکردنەوەی خەڵک و وشیارکردنەوەو ترساندن و هۆشداریی پێدانیانە، کە خەڵکینە! ئێوە دەبێ بزانن کە لەم سەر زەوییەدا، دانراون، بۆچی دانراون و، چی چاوەڕێتان دەکات؟ ئنجا با بزانین نێوەڕۆکی پەیامەکەی چی بوو؟

٤)- ﴿أَلَّا تَعْبُدُوٓاْ إِلَّا ٱللَّهَ﴾، (هوود عليه السلام پێی ڕاگەیاندن بە گەلی عاد)، کە جگە لە خوا مەپەرستن، ﴿أَلَّا تَعْبُدُوٓاْ إِلَّا ٱللَّهَ﴾، ئەمە ڕوونکردنەوەی ئینزارەکەیە، ئەو ترساندن و ئاگادارکردنەوەیە بریتی بوو لەوە کە پێی ڕاگەیاندن، جگە لە خوا مەپەرستن.

٥)- ﴿إِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيۡكُمۡ عَذَابَ يَوۡمٍ عَظِيمٖ﴾، من مەترسیی ئازاری ڕۆژێکی مەزنم لێتان هەیە، یاخود لێتان دەترسێم لە ئازاری ڕۆژێکی مەزن.

﴿عَذَابَ يَوۡمٍ عَظِيمٖ﴾ :

أ- دەگونجێ مەبەست پێی ئەو ئازارە بێ، کە لە ڕۆژێکدا دێ، کە تێیدا بنبڕو قەلاچۆ دەکرێن.

ب- دەشگونجێ مەبەست پێی ئازارو سزای ڕۆژی قیامەت بێ، کە هەردووکیشیانیان بۆ مسۆگەر بوون، هەم سزای دنیاییان، دوایی بۆ هاتوەو، بە تەئکید سزای ڕۆژی دواییش

چاوەڕێیان دەکات، بۆیەش دەفەرموێ: ﴿يَوْمٍ عَظِيمٍ﴾، ڕۆژێکی مەزن، چونکە ئەو شتانەی لەو ڕۆژەدا ڕوو دەدەن، کارەساتی گەورەن، ڕووداوی گەورەن، ئەو هەموو مرۆڤانە زیندوو دەکرێنەوەو، دادگایی دەکرێن و، کۆدەکرێنەوەو، دەهێنرێن، ئنجا دوایی پاک و پیسیان لێک جیادەکرێتەوەو، بڕواداران بۆ بەهەشت بەڕێ دەکرێن و، بێبڕوایان و دەغەڵەکان و هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان بەرەو دۆزەخ، بەڕێ دەکرێن، ڕۆژێکی مەزنە، ئنجا هوود ﷺ کە ئاوای پێڕاگەیاندن، با بزانین ئەوان چییان گوت؟

٦)- ﴿قَالُوٓاْ أَجِئۡتَنَا لِتَأۡفِكَنَا عَنۡ ءَالِهَتِنَا﴾، گوتیان: ئایا هاتوویە لامان تاکو لە پەرستراوەکانمان لامان بدەی؟ ئەم پرسیارکردنە، بۆ نکووڵییلێکردنە (أَجِئْتَنَا)، ئایا هاتووی بۆ لامان، ﴿لِتَأۡفِكَنَا عَنۡ ءَالِهَتِنَا﴾، تاکو لامان بدەی لە پەرستراوەکانمان و هەڵمانگێڕیەوە؟، ئەو بانگەوازەی پێشتر بانگەوازی پێ نەکراوە، چوێنراوە بە هاتنی هاتوویەکەوە، کە پێشتر لەو شوێنە نەبووە، (أَجِئْتَنَا)، واتە: پێشتر لەوێ نەبووە، ئەگەرنا، هوود ﷺ هەر لە نێویاندا بووە، بەڵام لەو ڕووەوە کە پێشتر ئەو بانگەوازەی نەبووەو، ئەو پەیامەی پێ نەبووە، چواندوویانە بە کەسێکەوە کە لەوێ نەبووبێ و ئێستا هاتبێ بۆ لایان.

(أَجِئْتَنَا)، خوێندراویشـەتەوە: (أَجِيْتَنَا)، واتـە: بـە هەمـزەش خوێندراوەتـەوەو بـە یائیـش خوێندراوەتـەوە، کـە دەڵێـن: (لِتَأفِكَنَا)، دەڵـێ: **(الأَفْـكُ: بِفَتْحِ الهَمْـزَةِ: الـصَّرْفُ، وَأَرَادُوا بـِهِ تَرَكَهُـنَّ)** (أفـك)، یـانی: لادان، (لِتَأفِكَنَـا)، لامـان بـدەی، یـانی: بـۆ ئێمـە هاتووی تاکـو وازبێنیـن لـە پەرسـتراوەکانی خۆمـان.

٧)- ﴿فَأۡتِنَا بِمَا تَعِدُنَآ﴾، ئەوەی بەڵێنمان پێدەدەی، بۆمان بێنە، هەڵبەتە ئەوان هەڕەشەیان لێکراوەو، هوودیش بەڵێنی پێداون، کە ئەگەر دەست لە هاوبەش بۆ خوادانان، هەڵنەگرن، خوا لە دنیادا سزایان دەدات، هەڵبەتە پێشیگوتوون: سزای ڕۆژی دواییش چاوەڕێتانە، بەڵام لەبەر ئەوەی ئەوان بڕوایان بە ڕۆژی دوایی هەر نەبووە، باسی ئەوەیان هەر نەکردوە، ئەوەی کە ئەوان مەبەستیان بووە، لە ڕستەی: ﴿فَأۡتِنَا بِمَا تَعِدُنَآ﴾، [ئەوەی بەڵێنمان پێدەدەی بیهێنە]، سزای دنیایی بووە، چونکە بڕوایان بە قیامەت هەر نەبووە، بەڵام

زانیویانە کە لە دنیادا، دەگونجێ سزاو بەڵا ببێ، لێرەدا کە دەڵێن: (فأْتِنَا)، ئەم (ف)یە، بۆ لق لێکردنەوەیە: (فَرْعُوًا عَلَيْهِ هَذَا الطَّلَبْ تَعْرِيْضَاً بِالتَّكْذِيْب)، ئەو داواکارییەیان لێکردۆتەوە وەک لەبەرڕاهاویشتن، بەوە کە تۆ ڕاست ناکەی، ئەگەر ڕاست دەکەی ئەوەی بەڵێنمان پێدەدەی، ئەوەی هەڕەشەی پێ لە ئێمە دەکەی، بۆمان بێنە.

٨)- ﴿إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّـٰدِقِينَ﴾، ئەگەر تۆ لە ڕاستانی، پێشێ بە کنارە (كناية)و لەبەر ڕاهاویشتن، گوتوویانە: تۆ ڕاست ناکەی، بەڵام دوایی گوتوویانە: ﴿إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّـٰدِقِينَ﴾، ئەگەر تۆ لە ڕاستانی، واتە: تۆ ڕاست ناکەی، بۆیە ئەمە بەڕاشکاویی تۆمەتبار کردنی هوودە عليه السلام بەوەی کە ڕاستیان لەگەڵدا ناکات و، لە خۆوە قسەیەک دەکات! ئنجا بابزانین هوود عليه السلام لە بەرانبەر ئەو تۆمەتبارکردنەی ئەواندا، لە بەرانبەر ئەو شێوازە بێ نەزاکەتەی ئەواندا، چی دەڵێ؟

٩)- ﴿قَالَ إِنَّمَا ٱلْعِلْمُ عِندَ ٱللَّهِ﴾، هوود عليه السلام فەرمووی: زانیاریی تەنیا لەلای خوایە، (العِلْم) کە ئەلیف و لامی ناساندنی لەسەرە، بۆ (عهد)ە واتە: زانیارییەکە، زانیاریی هاتنی کاتی ئەو ئازارو سزایە، تەنیا لە لای خوایە، یاخود مەبەست لە (عِلْم) زانیارییە بە نادیارەکان، (العِلْم بِالمُغَيَّبَات)، واتە: زانیاریی شتە پەنهانەکان، کە یەکیان بریتیە: لە کاتی هاتنی ئەو سزاو ئازارە بۆتان، تەنیا لە لای خوایە ﷻ.

١٠)- ﴿وَأُبَلِّغُكُم مَّآ أُرْسِلْتُ بِهِۦ﴾، ئەوەی پێشی نێرراوم، پێتان ڕادەگەیەنم.

(وأبَلِّغُكُم) خوێندراویشەتەوە: (وأُبْلِغُكُم)، واتە: من نێردراوم کە پەیامی خواتان پێ ڕابگەیەنم و هۆشدارییتان پێ بدەم، بتانترسێنم، نەهاتووم کە کاتی هاتنی ئەو سزاو بەڵایەتان بۆ دەربخەم، ئەوە ئەرکی من نیە.

١١)- ﴿وَلَـٰكِنِّىٓ أَرَىٰكُمْ قَوْمًا تَجْهَلُونَ﴾، بەڵام من بە کۆمەڵێکی نەفامتان دەبینم، یان: بە کۆمەڵێک دەتانبینم، کە نەفامیی دەکەن، لێرەدا کە تەعبیرەکە بەو شێوەیە: ﴿وَلَـٰكِنِّىٓ أَرَىٰكُمْ قَوْمًا تَجْهَلُونَ﴾، کە دەشگونجێ فەرمووبایە: (وَلَكِنِّي أرَاكُمْ تَجْهَلُون)، وشەی (قَوْمَاً)

کە زیاد کراوە، یانی: نەزانیی بۆتە یەکێک لە ڕاگرەکانی کۆمەڵ بوونی ئێوە، ئێوە کۆمەڵێکن نەفامیی دەکەن، نەفامیی بناغەی بوونی ئێوەیە، نەفامییەکەشیان لە زۆر ڕووەوە بووە:

١- لەو ڕووەوە بووە کە هوود ﷺ یەکێک بووە لە خۆیان و زانیویانەو ناسیوویانە، کە پیاوی درۆ نیە.

٢- ئەوەی هوود ﷺ بۆی هێناون، عەقڵ و مەنتیق و زگماکی مرۆڤ پشتگیریی دەکەن و پشتڕاستی دەکەنەوەو، لەگەڵیدا جووتن.

٣- بابای عاقڵ ئاوا بە بێباکیی و بێ منەتیی لەگەڵ کەسێکدا کە پەیامێکی ناوازەی هێناوە، مامەڵە ناکات.

٤- خوا ﷻ هیچ کام لە پێغەمبەرانی (**عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام**) هەڵنەبژاردوون، مەگەر لە نێو خەڵک و کۆمەڵگایەکەی خۆیاندا، زۆر هەڵکەوتوو بوون لە ڕووی عەقڵ و تێگەیشتن و، لە ڕووی پاکیی پەرێزو، ڕەوشتی بەرزو، مەعدەنی پاک و چاکەوە.

ئەوانە هەموویان هاندەر بوون بۆ ئەوەی لێی وردبنەوەو یەکسەر ڕەفزی نەکەن، ئنجا ئەگەر عەقڵیان هەبووایە، هەر لە سەرەتاوە جگە لە خوایان نەدەپەرست و، ئەو پەرستراوانەیان نەدەپەرستن کە یان لە خوار خۆیانەوەن کە پەیکەرو دارو بەردو مانگ و خۆرو ئەستێرەکانن، یان وەک خۆیانن، کە مرۆڤە تاغووتەکان و حوکمڕانە خۆسەپێنەکانن، بۆیە دەفەرموێ: ﴿وَلَٰكِنِّيٓ أَرَىٰكُمۡ قَوۡمٗا تَجۡهَلُونَ﴾، (**تَجْهَلُون**)یش، بە (**فِعل المُضَارِع**) دێنێ، واتە: ئێوە بەردەوامن لەسەر نەفامیی کردن و، نەفامیی نواندن، ڕۆژ بە ڕۆژیش ئەو نەفامییە تێتاندا تازە دەبێتەوە.

### مەسەلەی دووەم:

**کاتێک سزایەکەیان لە شێوەی هەورێکدا بینی، کە بەرەو دۆڵ و شیوەکانیان دەهات، دڵخۆش بوون، ناوی پێوەبێ، بەڵام ئەو سزایە بوو کە پەلەیان لێکرد بوو، بایەکی وێرانکەرو فەوتێنەر بوو، کە سەرەنجام بەس خانووبەرەکانیان بە چۆڵیی مانەوەو، قڕەبڕ بوون:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿فَلَمَّا رَأَوْهُ عَارِضًا مُّسْتَقْبِلَ أَوْدِيَتِهِمْ قَالُوا هَٰذَا عَارِضٌ مُّمْطِرُنَا ۚ بَلْ هُوَ مَا اسْتَعْجَلْتُم بِهِ ۖ رِيحٌ فِيهَا عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٢٤﴾ تُدَمِّرُ كُلَّ شَيْءٍ بِأَمْرِ رَبِّهَا فَأَصْبَحُوا لَا يُرَىٰ إِلَّا مَسَاكِنُهُمْ ۚ كَذَٰلِكَ نَجْزِي الْقَوْمَ الْمُجْرِمِينَ ﴿٢٥﴾﴾.

### شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە هەشت بڕگەدا:

١)- ﴿فَلَمَّا رَأَوْهُ عَارِضًا﴾، کاتێک کە بینییان وەک هەورێکی پان، وشەی (**رأوه**) ڕاناوەکەی دەچێتەوە بۆ ئەو ئازارە بەڵێندراوە، (**العَذَاب المَوْعُود**)، یاخود: ﴿فَلَمَّا رَأَوْهُ﴾، ڕاناو بۆ چووە وە، پێشتر باس نەکراوەو، دەگونجێ بۆ ئازارە بەڵێندراوەکە بچێتەوە، دەشگونجێ بۆ باس نەکراوێک بچێتەوە، کە دوایی وشەی (**عَارِضًا**)، ڕوونی دەکاتەوە چییە؟ (**ف**) یەکەی سەر (**فَلَمّا**)ش بۆ لق لێکردنەوەیە لە قسەکانی پێشێ: (**أي: فَلَمّا أَرَادَ اللهُ عِقَابَهُمْ، أَرْسَلَ إِلَيْهِمْ رِيْحَاً فِي صُورَةِ سَحَابٍ، فَلَمّا رَأَوْهُ سَحَابَاً، قَالُوا: هَذَا عَارِضٌ مُمْطِرُنَا**)، کاتێک خوا ویستی سزایان بدات، بایەکی بۆ ناردن لە شێوەی هەورێکدا، کاتێک وەک هەور بینییان، گوتیان: ئەمە هەورێکە ئاومان بۆ دەبارێنێ، ئەو ڕستانەش بۆیە قرتێنراون، چونکە بە سەلیقە دەزانرێن.

٢)- ﴿مُّسْتَقْبِلَ أَوْدِيَتِهِمْ﴾، ڕووبەڕووی دۆڵ و شیوەکانیان دێ، (**العَارِضُ: السَّحَابُ المُعْتَرِضُ جَوَّ السَّمَاءِ أي: رَأَوْهُ كَالْعَارِضِ**)، (**عَارِض**): بریتیە لەو هەورەی کە جەووی ئاسمان دادەگرێ و پێیدا بڵاو دەبێتەوە، واتە: دیتیان لە شێوەی هەوردا، ئەگەرنا هەور نەبووە،

کە دەفەرموێ: ﴿ مُّسْتَقْبِلَ أَوْدِيَتِهِمْ ﴾، (إِسْتِقْبَال): بریتیە لە ڕوو کردن بەرەو لای شتێک، واتە: هەورەکەیان بینی دەڕۆیی و دەهات، ڕووبەڕووی دۆڵ و شیوەکانیان.

(أَوْدِيَة) کۆی (وَادِيَ)ە، وەک (أَنْدِيَة) کۆی (نَادِيَ)، دۆڵ و شیوەکەش مەبەست پێی ئەو شوێنەیە، ئەو خەڵکە لێیبوون، چونکە ئەوان دەشت و بیابان و چیاو چۆڵیشیان هەبوون، (أَوْدِيَتِهِمْ) واتە: ئەو شوێنانەی ئەوان لێیبوون، کە زۆرجار بەو شوێنەی هۆزێک، یان خەڵکێک تێیدا نیشتەجێ بوون، گوتراوە: (وَادِي)، مەرجیش نیە شیوێک بێ و ئاوی پێدا هاتبێ.

ئنجا کاتێک ئاوایان بینی:

٣)- ﴿ قَالُواْ هَٰذَا عَارِضٌ مُّمْطِرُنَا ﴾، گوتیان: ئەمە هەورێکە ئاو دابەزێنەرە بۆمان، (مُمْطِر: إِسْمُ فَاعِلٍ مِنْ أَمْطَرَ)، (أَمْطَر) واتە: بارانی باراندو، ئاوی دابەزاند، (هذا عارض مُمْطِرُنَا) واتە: ئەم هەورە دابەزێنەری ئاوە بۆمان.

٤)- ﴿ بَلْ هُوَ مَا ٱسْتَعْجَلْتُم بِهِۦ ﴾، بەڵکو ئەوە ئەوەیە، کە پەلەتان لێکرد، ئەمە: (مَقُوْلُ قَائِلٍ مَحْذُوفٍ)، گوتراوی بێژەرێکی قرتێنراوە، ئنجا یان مەبەست ئەوەیە خوا ﷻ فەرموویەتی، یاخود هوود عليه السلام گوتوویەتی، یاخود فریشتەکان گوتوویانە، گرنگ ئەوەیە ئەم تەعبیرە: ﴿ بَلْ هُوَ مَا ٱسْتَعْجَلْتُم بِهِۦ ﴾، واتە: ئەمە ئەو سزایەیە، کە پەلەتان لە هاتنی دەکرد.

٥)- ﴿ رِيحٌ فِيهَا عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴾، بایەکە ئازارێکی زۆر بە ئێش و ژانی تێدایە، لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿ رِيحٌ فِيهَا عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴾، (عَذَاب) کراوە بە شتە تێکراو (مَظْرُوف)ەکەو، (رِيْح) کراوە بە شتتێکراو (ظَرْف)، بایەکە ئازارێکی بە ئێشی تێدایە، واتە: ئەو بایە کراوە بە زەرفێک، وەک توورەکەیەک و، ئازارەکە کراوە بە ئەو شتەی لە نێو توورەکەکەدایە، بەڵام ئەو بایە هەر بایەکی ئاسایی نیە، بەڵکو ئازارو بەڵایەکی زۆر بە ئێشی تیدایە.

٦)- ﴿ تُدَمِّرُ كُلَّ شَيْءٍۭ بِأَمْرِ رَبِّهَا ﴾، بە فەرمانی پەروەردگاری هەموو شتێک دەفەوتێنێ، (تُدَمِّرُ) واتە: کاول و وێران دەکات، دەفەوتێنێ، ﴿ كُلَّ شَيْءٍ ﴾، هەموو شتێک، ﴿ بِأَمْرِ

رَبِّهَا ﴾، بە فەرمانی پەروەردگاری، ئنجا کە دەفەرمویٚ: هەموو شتێک کاول و وێران دەکات، ئەدی بۆچی زەویی و ئەو شوێنەی کە لێشیبوون، هەمووی وێران نەکردوە؟ مەبەست ئەوەیە هەموو شتێک کە پەروەردگار فەرمووبێتی، دەبێ وێران بکرێ، وێرانی دەکات، نەک هەموو شتێک بە ڕەهایی، واتە: هەموو شتێک کە پەیوەندیی بەوانەوە هەیە، هەر شتێک کە دەبێ بفەوتێ، تاکو ئەوانی پێوە بفەوتێنرێن، وەک خانووبەرەکانیان و جێگاو ڕێگەکانیان، بۆیە زانایان ئاوایان تەعبیر کردوە، دەڵێن: ﴿ تُدَمِّرُ كُلَّ شَيْءٍ بِأَمْرِ رَبِّهَا ﴾، (أي: **تُهْلِكُ كُلَّ شَيءٍ مِنْ شَأْنِهِ التَّدْمِيْرُ**)، هەر شتێک لە بەین دەبات و دەفەوتێنێ کە بۆ فەوتان بشێ، هەندێکی دیکە گوتوویانە: (**كُلَّ شَيءٍ، مُسْتَعْمَلٌ فِي كَثْرَةِ الأَشْيَاء**)، واتە: زۆر شتان لە بەین دەبات، هەموو ئەو شتانەی پەیوستن بەوانەوە، بەڵام بە فەرمانی پەروەردگاری نەبێ، نایکات، وە نەبێ ئەویش بەبێ مۆڵەت بێ.

(ب)ی سەر ﴿ بِأَمْرِ رَبِّهَا ﴾، (**بَاء السَّبَبِيَّة**)، بائی هۆکارییە، واتە: (**بِسَبَبِ أَمْرِ رَبِّهَا**)، بەهۆی فەرمانی پەروەردگاریەوە کە فەرمانی پێکردوە.

٧)- ﴿ فَأَصْبَحُوا لَا يُرَىٰٓ إِلَّا مَسَٰكِنُهُمْ ﴾، سەرەنجام وایان لێهات تەنیا خانووەکانیان دەبینران، (**فأَصْبَحُوا: صَارُوا**)[1]، نەک بە مانای ئەوە بێ بەڵایەکە، شەوێ لێیدابن، ئنجا ڕۆژێ وابووبێ و ڕۆژیان وا کردبێتەوە، چونکە خوای پەروەردگار لە سوورەتی (**الحاقة**) دا، لەو بارەوە دەفەرموێ: ﴿ سَخَّرَهَا عَلَيْهِمْ سَبْعَ لَيَالٍ وَثَمَٰنِيَةَ أَيَّامٍ ﴿٧﴾ ﴾، واتە: بایەکەی حەوت شەو و هەشت ڕۆژان لەسەر بەردەوام کردن، کەواتە: کە دەفەرموێ: ﴿ فَأَصْبَحُوا لَا يُرَىٰٓ إِلَّا مَسَٰكِنُهُمْ ﴾، یانی: وایان لێهات کە تەنیا خانووبەرەکانیان دەبینران، خوێندراویشەتەوە: (**لَا تَرَى إِلاَّ مَسَاكِنَهُم**)، ئنجا ئەگەر (**لَا يُرَى**) بێ، واتە: بکەرەکەی نادیارەو، ئەو کاتە (**مَسَاكِنُ**) دەبێتە جێداری بکەر، (**نَائِب الفَاعِل**)و بۆردار (**مَضمُوم**) دەبێ، ﴿ فَأَصْبَحُوا لَا يُرَىٰٓ إِلَّا مَسَٰكِنُهُمْ ﴾، بەڵام ئەگەر بە (**تَرَى**) بخوێندرێتەوە: (**فَأَصْبَحُوا لَا تَرَى إِلاَّ مَسَاكِنَهُم**)، ئەو کاتە (**مساكنهم**) دەبێتە بەرکار (**مفعول**)ی (**ترى**) و مانایەکەی ئاوای لێ دێ: وایان لێهات تۆ تەنیا خانووبەرەکانیانت دەبینی.

---

(١) أصبح، صار : بوو

٨)- ﴿كَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡمُجۡرِمِينَ﴾، هەر بەو شێوەیە، کۆمەڵی تاوانباران سزا دەدەین، (أي: مِثْلَ جَزَاءِ قَوْمِ عَادٍ، نَجْزِي الْمُجْرِمِيْنَ الأَخَرِيْن، وَهَذَا تَهْدِيْدٌ لـمُشْرِكِي مَكَّة وَغَيْرِهِمْ)، واتە: وەک سزای گەلی عاد، تاوانبارانی دیکەش سزا دەدەین، کە ئەمە هەڕەشەیە هەم بۆ ئەو کاتە بۆ کۆمەڵگای هاوبەش بۆ خوادانەر کە لە مەککە بوون، هەروەها بۆ هەموو کۆمەڵگایەکانی دیکەش، وەک دوایی باسی دەکەم لە کۆتایی تەفسیری ئەم ئایەتانەدا، زۆرجار توێژەرەوان ڕەحمەتی خوایان لێ بێ، ئایەتەکان تایبەت دەکەن بە خەڵکی مەککەوە، بەڵکو زۆرجار بە قوڕەیشەوەو بە دەوروبەریەوە، کە لە ڕاستییدا ئەوە تەسککردنەوەی چەمک و واتای فراوانی ئایەتەکانە، ئایەتەکان چەمک و واتاکەیان فراوانترە، بۆیە نابێ تەسک بکرێنەوەو بئاخنرێنە گۆشەیەکەوە، کە خوا ﷻ مەبەستی نەبووە!

پێشتریش گوتمان: ئێمە لە تەفسیری سوورەتی (**هود**)دا، بە تەفصیل باسی بەسەرهاتی هوودو گەلەکەی (عاد)مان کردووە، درێژەی چۆنیەتیی فەوتانی گەلی عاد، هەم لە سوورەتی (**الحاقة**)دا هاتوە، کە خوا دەفەرموێ: ﴿وَأَمَّا عَادٌ فَأُهۡلِكُواْ بِرِيحٖ صَرۡصَرٍ عَاتِيَةٖ ۝٦ سَخَّرَهَا عَلَيۡهِمۡ سَبۡعَ لَيَالٖ وَثَمَٰنِيَةَ أَيَّامٍ حُسُومٗاۖ فَتَرَى ٱلۡقَوۡمَ فِيهَا صَرۡعَىٰ كَأَنَّهُمۡ أَعۡجَازُ نَخۡلٍ خَاوِيَةٖ ۝٧ فَهَلۡ تَرَىٰ لَهُم مِّنۢ بَاقِيَةٖ ۝٨﴾**الحاقة**، دەفەرموێ: وەک بنکە دارخورمای کەوتوو، کەوتنە گۆڕێ، ئایا کەسیان لێ دەبینی، مابێ؟ کەسیان نەماو قڕەبڕ بوون.

هەروەها لە سوورەتی (**فصلت**)دا: ﴿فَأَمَّا عَادٞ فَٱسۡتَكۡبَرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ بِغَيۡرِ ٱلۡحَقِّ وَقَالُواْ مَنۡ أَشَدُّ مِنَّا قُوَّةًۖ أَوَلَمۡ يَرَوۡاْ أَنَّ ٱللَّهَ ٱلَّذِي خَلَقَهُمۡ هُوَ أَشَدُّ مِنۡهُمۡ قُوَّةٗۖ وَكَانُواْ بِـَٔايَٰتِنَا يَجۡحَدُونَ ۝١٥ فَأَرۡسَلۡنَا عَلَيۡهِمۡ رِيحٗا صَرۡصَرٗا فِيٓ أَيَّامٖ نَّحِسَاتٖ لِّنُذِيقَهُمۡ عَذَابَ ٱلۡخِزۡيِ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۖ وَلَعَذَابُ ٱلۡأٓخِرَةِ أَخۡزَىٰۖ وَهُمۡ لَا يُنصَرُونَ ۝١٦﴾.

هەروەها لە سوورەتی (**القمر**)دا: ﴿كَذَّبَتۡ عَادٞ فَكَيۡفَ كَانَ عَذَابِي وَنُذُرِ ۝١٨ إِنَّآ أَرۡسَلۡنَا عَلَيۡهِمۡ رِيحٗا صَرۡصَرٗا فِي يَوۡمِ نَحۡسٖ مُّسۡتَمِرّٖ ۝١٩ تَنزِعُ ٱلنَّاسَ كَأَنَّهُمۡ أَعۡجَازُ نَخۡلٖ مُّنقَعِرٖ ۝٢٠ فَكَيۡفَ كَانَ عَذَابِي وَنُذُرِ ۝٢١ وَلَقَدۡ يَسَّرۡنَا ٱلۡقُرۡءَانَ لِلذِّكۡرِ فَهَلۡ مِن مُّدَّكِرٖ ۝٢٢﴾.

مەسەلەی سێیەم:

**گەلی عاد توانای زیاتر لە هی کۆمەڵگای پێغەمبەریان ﷺ پێدرابوو، عەقڵ و بیستن و چاویشیان هەبوون، بەڵام لێیان بەهرەمەند نەبوون بە هۆی نکووڵییکردنیان لە نیشانەکانی خواوەو، سەرەنجام سزای هەڕەشە پێلێکراویان گەمارۆی دان:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ مَكَّنَّٰهُمْ فِيمَآ إِن مَّكَّنَّٰكُمْ فِيهِ وَجَعَلْنَا لَهُمْ سَمْعًا وَأَبْصَٰرًا وَأَفْـِٔدَةً فَمَآ أَغْنَىٰ عَنْهُمْ سَمْعُهُمْ وَلَآ أَبْصَٰرُهُمْ وَلَآ أَفْـِٔدَتُهُم مِّن شَىْءٍ إِذْ كَانُوا۟ يَجْحَدُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُوا۟ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ ﴿٢٦﴾ ﴾.

شیکردنەوەی ئەم ئایەتە بە پێزە، لە پێنج بڕگەدا:

١)- ﴿ وَلَقَدْ مَكَّنَّٰهُمْ فِيمَآ إِن مَّكَّنَّٰكُمْ فِيهِ ﴾، بە دڵنیایی ئەوانمان دەسترۆیشتوو کردبوو، توانادار کردبوو، بە شێوەیەک کە ئێوەمان تێیدا توانادار نەکردوە، (إِنْ) لێرەدا بە مانای (ما) لابەرە (مَا النَّافِيَة)یە، واتە: (فِيْمَا مَا مَكَّنَاكُمْ فِيْه)، بەڵام (ما) بەکارنەهاتوە بۆ ئەوەی لەسەر زمان قورس نەبێ، ئەوانمان توانادارو دەسترۆیشتوو کردبوو، بەشێوەیەک کە بە ئێوەمان نەداوە، یانی: تواناو ئیمکانیەت و دەسترۆیشتوویەکمان بەواندابوو، کە بە ئێوەمان نەداوە، ئەی کافرانی ڕۆژگاری پێغەمبەر ﷺو ئەو کۆمەڵگا دیارییکراوە! هەڵبەتە ئەوان یەکەمین دوێندراوەکان بوون، بەڵام چەمک و واتایەکەی تەنیا لەو چوارچێوەی ئەو کات و شوێنەدا، قەتیس ناکرێ، بەڵکو هی ئێستاش دوای ئێستاش دەگرێتەوە، مەگەر بەڵگەیەک و نیشانەیەک هەبێ، ناچارمان بکات، بڵێین: تەنیا مەبەست پێی کۆمەڵگای پێغەمبەرە ﷺ، کە لێرەدا تاکو ڕاددەیەک ئەو نیشانەیە هەیە، چونکە تواناو ئیمکانیەتێک کە بە شەری ئێستا هەیانەو، کۆمەڵگاکانی ئێستا، هەیانە لە هی گەلی عاد لە هەندێک ڕووەوە، یان لە زۆر ڕووەوە زیاترە، کەواتە: ئەوە بەسەر کۆمەڵگاکانی ئێستادا ناچەسپێ، لەو ڕووەوە ئەو نیشانەیە ناچارمان دەکات، بڵێین: مەبەست پێی کۆمەڵگایەکی دیارییکراوە، کە ئەو کاتە قورئانی تێدا دابەزێنراوە.

کـە دەشـفەرموێ: ئەوانمـان دەسترۆیشـتوو کردبـوو، لـە توانـاو دەسـەڵاتێکدا کـە ئێوەمـان تێیـدا دەسترۆیشـتوو نەکـردوە، واتـە: لـە شـێوەکەی و لـە جینسـەکەی، ئەگەرنـا هـەر خـودی ئـەوە کـە خـوا بـە گـەلی عـادی داوە، بێگومـان بـە خەڵکێکـی دیکـەی نـەداوە، تاکـو پێکـەوە بـەراورد بکرێـن! بـەڵام یـانی: لـە شـێوەو جینسـەکەیدا.

(**مَكَّنَّاهُـمْ: التَّمْكِيْنُ إِعْطَـاءُ المَكِنْـة وَهِـيَ القُـدْرَةُ وَالقُـوَّة، وَمَكَّـنَ مِـنْ كَـذَا وَتَمَكَّـنَ مِنْـه: قَـدَرَ عَلَيْـه**)، (**تَمْكِيْن**): بریتیـە لـە پێـدانی (**مَكِنَّـة**)، یـانی: دەسـتەڵات و توانـا، دەگوتـرێ: (**مَكَّـنَ مِـنْ كَـذَا وَتَمَكَّـنَ مِنْـه: قَـدَرَ عَلَيْـهِ**) واتـە: دەسـتەڵاتی بەسـەردا بـوو.

٢)- ﴿ وَجَعَلْنَا لَهُمْ سَمْعًا وَأَبْصَٰرًا وَأَفْـِٔدَةً ﴾، بیستن و چاوەکان و عەقڵەکانیشمان بۆ ڕەخساندبوون.

لێـرەدا مەبەسـت ئەوەیـە، (**أي: لَـمْ يَنْقُصُهُـمْ شَيءٌ مِـمَّا يَحْتَاجُوْنَـهُ لِإِدْرَاكِ الحَـقِّ**)، واتـە: هیـچ شـتێکیان کـەم نەبـوو، لـەوەی پێویسـتیان بـوو بـۆ دۆزینـەوەی هـەق.

خـوا ﷻ عەقڵـی پێدابـوون، گوێـی پێدابـوون، چـاوی پێدابـوون، هەمـوو ئـەو توانایانـەی پێدابـوون، کـە پەکیـان لەسـەریان دەکـەوێ، بـۆ دۆزینـەوەی هـەق و بـۆ پەیـبردن بـە هـەق، بـەڵام لەبـەر عینادیـی و کەللەڕەقیـی، لەبـەر دەمارگیریـی و، چونکـە زلـە زلەکانیـان بەرژەوەندییـان لـەو بـەزم و بـازاڕەدا هەبـووەو، خەڵکەکـەی دیکـەش کوێرانـە شـوێنیان کەوتـوون.

٣)- ﴿ فَمَآ أَغْنَىٰ عَنْهُمْ سَمْعُهُمْ وَلَآ أَبْصَٰرُهُمْ وَلَآ أَفْـِٔدَتُهُم مِّن شَيْءٍ ﴾، کەچی بیستنیان و، چاوەکانیان و عەقڵەکانیان، هیچ سوودیان پێ نەگەیاندن.

(**مِـنْ شَيءٍ**): (**مِـنْ: زَائِـدَةٌ للتَنْصِيْـصِ عَـلَى انْتِفَـاءِ الجِنْـسِ وشَيءٍ: الَمْجُـرور بِــ «مِـنْ» نَائِـبٌ عَـنْ المَفْعُولِ المُطْلَـقِ**)، واتـە: (**فَـمَا أَغْنَـى عَنْهُـمْ سَـمْعُهُمْ وَلاَ أَبْصَارُهُـمْ، وَلاَ أَفْئِدَتُهُـم شَـيْئَاً**)، بیسـتن و، چاوەکانیـان و، عەقڵەکانیـان هیـچ ئەندازەیـەک لـە سـوودیان پـێ نەگەیانـدن، (**مِنْ**)یـش زیـاد کـراوە بـۆ ئـەوەی جینـسی سـوود لـێ بینیـن لابـبرێ، ئنجـا:

(**شَيءٍ**) کە مەجروورە بە (**مِنْ**)، لە جێی بەرکاری ڕەها دانیشتوە، واتە: (**فَمَا أَغْنَى عَنْهُمْ شَيْئاً مِنَ الإِغْنَاءِ سَمْعُهُمْ وَلَا أَبْصَارُهُمْ وَلَا أَفْئِدَتُهُم**)، یانی: بیستن و چاوەکانیان و عەقڵەکانیان، هیچ جۆرە سوودێکیان پێ نەگەیاندن، نە کەم نە زۆر.

٤)- ﴿إِذْ كَانُوا۟ يَجْحَدُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ﴾، لە سۆنگەی ئەوەوە کە نکووڵییان لە نیشانەکانی خوا دەکرد، (**إِذْ**) لێرەدا بۆ (**ظَرْف**)ە، واتە: کاتێک کە ئەو شتەی تێدا ڕوودراوە، واتە: لە ماوەی نکووڵییکردنیان لە نیشانەکانی خوادا، هیچ سوودیان پێ نەگەیاندن، بەڵام لێرەدا (**إِذْ**) وێڕای ئەوەی (**ظَرْفَ**)ە، بۆ کاتی ڕابردوو، بە مانای تەعلیلیش دێ، واتە: بەهۆی ئەوەوە کە نکووڵییان دەکرد لە نیشانەکانی خوا، هەستەوەرەکانیان چ سوودیان پێ نەگەیاندن.

٥)- ﴿وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُوا۟ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ﴾، هەروەها ئەوەی گاڵتەیان پێ دەکرد، دەوری دان، ئنجا ئایا ئەوەی دەوری دان، ئازارو سزایەکە بوو، یان خودی ئەو بەڵایەی کە گاڵتەیان پێدەکرد، ئەوە دەوری دان؟ هەردووکیان ڕێ تێچوون، سزای ئەوە کە گاڵتەیان پێ دەکرد، یاخود هەر خودی گاڵتەپێکراوەکە، کە دۆزەخ، یان بەڵای خوا بوو، ئەوە دەوری دان و گەمارۆی دان.

(**حَاقَ**) هەم بە مانای (**نَزَلَ**) دێ، هەم بە مانای (**أَحَاطَ**) دێ، واتە: دابەزیە سەریان، یاخود دەورەی دان و گەمارۆیدان.

### پوختەی مانای ئەم ئایەتە موبارەکە:

ئەی بێبڕواینە! خوایەک ﷻ کە گەلی عادی لە ئێوە دەستڕۆیشتووترو تواناداترو دەسەڵات باڵاترو ژمارە زیاتر بوون، توانیویەتی بیانفەوتێنێ بە شتێکی نەبینراو، کە بایەو ئەوان تەماعیان تێیدا هەبوو، هەور بێ و بارانی پێوە بێت و ئاویان بۆ دابەزێنێ، ئەو خوایە ﷻ دەتوانێ ئێوەش بفەوتێنێ، کە تواناشتان لە هی ئەوان کەمترە.

## هەڵوەستەیەکی کورت لەسەر بێئیمانیی و کوژانەوەی چرای عەقڵ:

لێرەدا هەڵوەستەیەکی کورت دەکەین، لە بەرانبەر ئەم ڕستەیەدا، کە خوا ﷻ دەفەرموێ: بیستن و چاوەکان و عەقڵەکانیان هیچ سوودی پێ نەگەیاندن: ﴿إِذْ كَانُوا۟ يَجْحَدُونَ بِـَٔايَـٰتِ ٱللَّهِ﴾، بە هۆی ئەوەوە کە نکووڵییان دەکرد، لە نیشانەکانی خوا.!

لە ڕاستییدا کاتێک کە مرۆڤ ئیمانی نابێ و، بە ئیمانەوە تەماشای شتەکان ناکات، بە ئیمانەوە هەستەوەرەکانی خۆی بەکارناهێنێ، عەقڵی خۆی بەکارناهێنێ، چییەتی شتەکان ناکەوێتە بەر عەقڵی و بەرچاوی و بەرگوێی، بێگومان بڕواو قەناعەتی مرۆڤ، ئەگەر ڕاست بێ، یارمەتیی دەدات، کە باشتر لە شتەکان تێبگات، یاخود ببینێ و ببیستێ، قەناعەتی هەڵەی مرۆڤیش زۆر زیانی پێ دەگەیەنێ، کە شتەکان وەک خۆیان ببینێ، دەتوانین وێنەیەک بێنینەوە: بابایەکی نەخۆش بە تایبەتی کە گرانەتای لێ بێ، یان تای لێ بێ، کە ئاوی شیرین دەخواتەوە، وا دەزانی تاڵە، بێگومان ئاوەکە نەگۆڕاوەو تاڵ نیە، بەڵام ئەو میزاجی تێکچووە! کەسی وا هەیە تەماشای ئەو هەموو کەون و کائیناتە، دەکات، هیچی تێدا نابینێ، تەماشای خۆی دەکات، هیچ لە خۆیدا نابێنێ، بیکاتە بەڵگەو نیشانە کە خاوەنی هەیە، بەدیهێنەرو پەروەردگارێکی هەیە، مشوورخۆرێکی هەیە، دوایی دەچێ گڕ گڕ بە چییەوە گرفتار دەبێ؟ دەڵێ: ئەگەر خوا ﷻ ئەم کەون و کائیناتەی خوڵقاندوە بە باشترین شێوە، دوو پشک چ سوودی هەیە؟ مێشووله چ سوودی هەیە؟ مێش چ سوودی هەیە؟ ئەوانەی بۆچی دروستکردوون؟ ئەو هەموو شتانەی کەڵک و سوودیان هەیە، نایانکاتە نیشانە، بەڵام چەند شتێک دەبینێ و جارێ زانیارییەکەی وی، بۆی دەرنەکەوتوە سوودیان چییە؟ بێگومان زانست ڕۆژ بە ڕۆژ کە بەرەو پێشەوە دەچێ، حیکمەت و سوودی شتەکان زیاترو باشتر ئاشکرا دەبێ.

ئنجا خـوا ﷻ نەیفەرمـووە: هەرچـی خوڵقاندوومـە، هەمـووی بـۆ ئێـوە سوودبەخشـە، بـەڵام دەفەرمـوێ: هەرچـی لـە ئاسـمانەکان و زەویدایـە، بـۆ ئێـوەم دەسـتەمۆ کـردوە، بـەڵام خـوا ﷻ هەندێـک شـتی خوڵقانـدوە، تاکـو ئێمـەی پـێ تاقـی بکاتـەوە، وەک گێڕراوەتـەوە: جارێـک (**أبـو جعفـر المنصـور**)، دووەم حوکمـڕانی بنەماڵـەی عەبباسـییەکان، لەگـەڵ (**جعفـر الصـادق**)دا ڕەحمـەتی خـوای لـێ بـێ، دادەنیشـێ، مێشـێک چەنـد جارێـک دێ و لەسـەر دەم و چـاوی (**أبـو جعفـر المنصـور**) دەنیشـێ، ئەویـش دەری دەکات و چەنـد جارێـک ئـەوە دووبـارە دەبێتـەوە، ئەویـش دەڵـێ: ئـەی جەعفـەری صادیـق، خـوا مێشـی بۆچـی دروسـتکردوە (**لِمَ خلـق اللـه الذبـاب**)؟! ئەویـش دەڵـێ: (**لِيُـذِلَّ بـهِ الجَبَابِـرة**)، تاکـو خۆبەزلگـرەکانی پـێ زەبـوون بـکات، وەڵامێکـی زۆر پـڕ بـە پێسـت بـووە!

لـە ڕاسـتییدا خـوا ﷻ هەرچـی خوڵقاندوویـەتی هەمـووی لـە جێـی خۆیدایـە، بـەڵام بـە مەرجێـک ئینسـان بـە چـاوی ئیمانـەوە تەماشـای بـکات و، ئیـمان دەبێتـە هـۆی ئـەوە کـە ئینسـان چەشـمەندازی ڕوون بـێ و، هەسـتەوەرەکانی باشـتر دەرکـی ڕاسـتییەکان بکـەن، هـەروەک بـێ ئیمانییـش بـە پێچەوانـەوە: وا لـە مـرۆڤ دەکات شـتەکان وەک خۆیـان نەبینـێ و، شـەیتان شـوبهەو ئیشـکال و گـرێ و گۆڵـی زۆر بخاتە نێـو دڵ و دەروونیـەوە، هـەروەک چـۆن بابـای نەخـۆش ئـاوە شـیرینەکە دەخواتـەوە، لـە زاری تاڵـەو وەک ژەقنەبووتـە، کـە لـە واقیـع دا ئاوەکـە وەک خۆیـەتی، بـەڵام ئـەو میزاجـی تێکچـووە! دروسـتکراوانیش هەموویـان نیشـانەن، لەسـەر پەروەردگارێتیـی خـوا، وەک یەکێـک لـە خواناسـان گوتوویـەتی: (**وفِي كُلِّ شيءٍ لـهُ آيَـةٌ ... تَـدُلُّ عَـلَى أنَّـهُ وَاحِـدٌ**)، لـە هەمـوو شـتێکدا نیشـانەیەکی هەیـە، ئـەوە دەگەیەنـێ کـە خـوا ﷻ تاکـە، بـەڵام بەشـەر کـە دڵ و دەروونەکـەی کوفـری چۆتـێ، وێـڕای ڕووحـی، میزاجـی بیسـتن و دیـتن و عەقڵ و هۆشیشـی تێکـدەدا، شـتەکان بـە جۆرێکـی دیکـە دەکەونـە بەرچـاوو عەقـڵ و گوێـی.

## مەسەلەی چوارەم:

**هەواڵــدانی خــوا ﷻ بــە فەوتانــدنی ئاوەدانییــەکانی دەوروبــەری کۆمەڵــگای پێغەمبــەری خــوا ﷺ و کۆمەڵگایــەکانی دیکــەش، دوای پێشــاندانی نیشــانە جــۆراو جـۆرەکان، بەڵکـو بگەڕێنـەوەو، کاتێکیش سـزای خوایان بـۆ هاتوە، ئەو پەرسـتراوانەی بـە مەبەسـتی لـە خـوا نیزیـک کەوتنەوەیـان لـە خـوا، گرتبوویانـن، دادیـان نـەدان و سـوودیان پـێ نەگەیانـدن، بگـرە لێیان ونبـوون و، درۆو هەڵبەسـتنەکەیان ئاشـکرابوو و پـەردەی بەسـەرەوە نەمـا:**

خــوا ﷻ دەفەرمــوێ: ﴿ وَلَقَدْ أَهْلَكْنَا مَا حَوْلَكُم مِّنَ ٱلْقُرَىٰ وَصَرَّفْنَا ٱلْءَايَٰتِ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿٢٧﴾ فَلَوْلَا نَصَرَهُمُ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُوا۟ مِن دُونِ ٱللَّهِ قُرْبَانًا ءَالِهَةًۢ ۖ بَلْ ضَلُّوا۟ عَنْهُمْ ۚ وَذَٰلِكَ إِفْكُهُمْ وَمَا كَانُوا۟ يَفْتَرُونَ ﴿٢٨﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە شەش بڕگەدا:

١)- ﴿ وَلَقَدْ أَهْلَكْنَا مَا حَوْلَكُم مِّنَ ٱلْقُرَىٰ ﴾، بە دڵنیاییش ئاوەدانییەکانی دەوری ئێوەمان فەوتاندن، پیتی (و) گێڕەرەوەو بادەرەوە (عاطفة)ی ئەو ڕستەیە بۆ سەر ڕستەکانی پێشوو، (لَقَدْ) (ل) بۆ سوێندە، (قَدْ) بۆ دڵنیاکردنەوەیە، واتە: بە دڵنیاییەوە ئاوەدانییەکانی دەوروبەری ئێوەمان فەوتاندوون، ئنجا ئەمە بۆ کەسانێکە کە شارەزای مێژوونین و دڵنیانین، کە خوا ئەو گەلانەی فەوتاندوون، بەڵام بۆ کەسانێک کە شارەزابن و هەواڵیان بیستبێ، کە ئەو کۆمەڵگایانە فەوتاون، لەبەر ئەوەیە کە پەندیان لە فەوتێنرانی ئەو گەل و کۆمەڵگایانە، وەرنەگرتوەو، لە شوێنی کەسێک داندراون، کە شارەزایی و زانیارییان نەبووبێ، بە فەوتێندرانی ئەو گەل و کۆمەڵگایانە، لە لایەن خوای باڵا دەستەوە، بەو بەڵایەی ناردوویەتی، یاخود ڕەنگە زانیارییان بووبێ، کە ئەوانە فەوتاون، بەڵام گوتوویانە: ئەو بەڵایە هەر بەڕێکەوت بۆیان هاتوە، بۆ وێنە: گەلی نووح ﷺ کە تۆفان و لافاو لە

دژیان هەڵیکردوە، گەلی عاد کە بایەکی بەهێز لێیداون، گەلی سەموود، کە لەرزینەوەو بوومەلەرزەیەک لێیداون و...هتد.

کـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَلَقَدْ أَهْلَكْنَا مَا حَوْلَكُم مِّنَ ٱلْقُرَىٰ ﴾، (**حَوْلَكُـمْ**)، ئـەم ڕانـاوە دەگەڕێتـەوە بـۆ دوێـنراوەکانی ڕۆژگاری پێغەمبـەر ﷺ.

کەواتـە: هەمـوو ئـەو گەلانـەی لـە دەوروبـەری حیجـازو نیـوە دوورگـەی عەرەبیی بـوون، دەیانگرێتـەوە، وەک گـەلی (**سَـبَأ**)و، گـەلی (**تُبَّـع**) لـە یەمـەن و، گـەلی لـووط لـە شـام و، گـەلی عـادو سـەموود، بـە نسـبەت گـەلی سـەموودەوە لـە حیجـر، کـە دەکەوێتـە نێـوان نیـوە دوورگـەی عەرەبیـی و شـامەوە، هەروەهـا گـەلی عـاد لـە بیابـانی ئەحقـاف، ئەوانـە هەموویـان لـە ڕووی جوگرافییـەوە دەکەونـە دەوروبـەری کۆمەڵـگای مەککـە، کـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَلَقَدْ أَهْلَكْنَا ﴾، فەوتاندمانـن، بێگومـان مەبەسـت پێـی فەوتانـدن و قـڕە بـڕ کـردنی خەڵکەکەیانە، ئەگەرنـا ئاوەدانییـەکان دارو دیـوارەکان، نەفەوتێـنراون، واتـە: دانیشـتووانی ئـەو شـارو ئاوەدانییانەمـان فەوتانـدن.

٢)- ﴿ وَصَرَّفْنَا ٱلْـَٔايَـٰتِ ﴾، نیشانەکانیشمان جۆراو جۆر کردن، (**صَرَّفْنَا: نَوَّعْنَا وَمَعْنَى التَّصْرِيْفِ: التَّغيِيرُ وَالتَّبْدِيْلُ، لأَنَّهُ مُشْتَقٌّ مِنَ الصَّرْفِ، وَهُوَ الإِبْعَادُ وَكَنَّى بِهِ هُنَا عَنِ التَّبيينِ وَالتَّوْضِيْحِ، لأَنَّ تَعَدُّدَ الأَنْوَاعِ مُبيِّنٌ للشَّيءَ**)، مانای (**تَصْرِيْف**): لێرەدا گۆڕین و لادانە، چونکە وشەی (**تَصْرِيْف**) لە (**صرف**)ەوە هاتوە، کە بریتیە لە دوورخستنەوەو لادان، بەڵام لێرەدا ئەوە کنارەیە بۆ ڕوونکردنەوەو دەرخستن، چونکە جۆرەکانی شتێک، ئەو شتە زیاتر ڕوون دەکەنەوە، واتە: نیشانەکانمان بە جۆراو جۆریی خستنەڕوو، ئنجا نیشانەکان دەگونجێ:

١- مەبەست پێیان ڕستەکانی فەرمایشتی خوا بێ، کە خوا ﷻ:

أ- هەم وەک بەڵگە.

ب- هەم وەک بیرخستنەوە.

ج- هەم وەک هەڕەشە.

د- هەم وەک هاندان و گفت پێدانی پاداشت، بە هەموو شێوەکان، خوا ﷻ ئایەتە خوێنراوەکانی خۆی و فەرمایشتەکەی خۆی بۆ ڕوونکردوونەوە.

٢- دەشگونجێ مەبەست لە (**آيات**) نیشانەکانی خوابن ﷻ، کە بە هەر کام لە پێغەمبەران (**عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام**)ی داون، واتە: موعجیزەکانی پێغەمبەران کە نیشانەی ڕاستیی پێغەمبەران (**عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام**) بوون.

٣)- ﴿ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴾، {بۆیە ئایەت و نیشانەکانمان بۆ جۆراو جۆرکردن}، بەڵکو بگەڕێنەوە، ئەمە دوو واتای هەن:

أ- واز بێنن لەوەی لەسەرینی، واتە: (**مَجَازٌ عَنِ الإِقْلَاعِ عَمَّا هُمْ فِيْهِ**)، مەجازە بۆ دەست هەڵگرتن لەو حاڵەتەی لەسەرینی.

ب- (**يَرْجِعُون: يَرْجِعُونَ إِلى الله**)، بەڵکو بگەڕێنەوە بۆ لای خوا، وشەی (**لَوْلَا**) لێرەدا بۆ هاندانە، بەڵکو لە گوناهان بگەڕێنەوەو وازیان لێ بێنن، یاخود بەرەو خوا بگەڕێنەوە.

٤)- ﴿ فَلَوْلَا نَصَرَهُمُ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ قُرْبَانًا ءَالِهَةَۢ ﴾، دەبووایە ئەو پەرستراوانەی گرتبوویانن، جگە لە خوا، ئەو پەرستراوانەیان کە لە جیاتی خوا دەیانپەرستن، بۆ نزیک خستنەوەیان لە خوا، یارمەتییان دابان و سەریان خستبانایە، (**القُرْبَانُ: مَا يُتَقَرَّبُ بِهِ إِلى اللهِ، مِنْ طَاعَةٍ وَنَسِيْكَةٍ وَالجَمْعُ: قَرَابِيْن**)، (**قُرْبَان**) هەر شتێکە کە مرۆڤ، پێی لە خوا نزیک بکەوێتەوە، لە فەرمانبەریی و قوربانیی سەربڕین، کۆیەکەی (**قَرَابِيْن**)ە.

٥)- ﴿ بَلْ ضَلُّواْ عَنْهُمْ ﴾، بەڵکو لێیان ونبوون، یارمەتییان نەدان و پشتیوانییان نەکردن، پەرستراوەکانی کە لە جیاتی خوا دەیانپەرستن، تاکو لە خوایان نزیک بخەنەوە، لێیان ونبوون، نەک سەریان نەخستن، بەڵکو هەر لێشیان ونبوون، (**أي: غَابُوا، وَضَاعُوا**)، ونبوون و زایەبوون، (**ضَلَّ**)ە، یانی: (**ضَاعَ وغَابَ وفُقِدَ**) دێ، زایە بوو، پەنهان بوو، بزر بوو (**ضَلَّ**) ونبوو، بەڵام (**ضَلَّ عَنِ الطَّرِيْق**) لە ڕێگا ونبوو، (**أَضَلَّهُ**) ونی کرد، گومڕای کرد.

٦)- ﴿وَذَٰلِكَ إِفۡكُهُمۡ وَمَا كَانُواْ يَفۡتَرُونَ﴾، ئەوەش درۆیەکەیان و قسە هەڵبەستنەکەیان بوو، ﴿وَذَٰلِكَ إِفۡكُهُمۡ﴾، خوێنراویشەتەوە: (**وَذَٰلِكَ أَفَكَهُمْ**) ئەوە وایلێکردن هەڵگەڕێنەوەو، لابدرێن، هەروەها خوێنراوەتەوە: (**وَذَلِكَ أَفَّكَهُم**)، ئەوە وایلێکردن، ئەوە لایدان، ﴿وَمَا كَانُواْ يَفۡتَرُونَ﴾، هەروەها ئەوە بوو کە هەڵیاندەبەست.

## چەند وردەکارییەکی ئەم ئایەتە (٢٨):

ئـەم ئایەتـە چەنـد وردەکارییەکـی تێـدان، پێویسـتە بـاس بکرێـن، کـە دەفەرمـوێ: ﴿فَلَوۡلَا نَصَرَهُمُ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ قُرۡبَانًا ءَالِهَةَۢۖ بَلۡ ضَلُّواْ عَنۡهُمۡۚ وَذَٰلِكَ إِفۡكُهُمۡ وَمَا كَانُواْ يَفۡتَرُونَ ﴿٢٨﴾﴾، پێشـتر ماناکەیـمان کـرد، بـەڵام لـە ڕووی ڕێزمـانی عەرەبییـەوە، بـە پێـی ئـەوە کـە (**قُرْبَانـاً**) دەبێتـە چـی و، (**آلِــهَة**) دەبێتـە چـی؟ مانایەکـەی دەگۆڕێ و بـە گشـتیی دەتوانیـن، بڵێیـن: سـێ واتـای هـەن و بـە سـێ جـۆر لـە ڕووی ڕێزمـانی عەرەبییـەوە، دەگونجـێ مانـا بکـرێ:

١)- (**محمد الطاهر بن عاشور**)، دەربارەی ڕستەی: ﴿فَلَوۡلَا نَصَرَهُمُ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ قُرۡبَانًا ءَالِهَةَۢ﴾، دەڵێ: (**اتَّخَذُوا**) دوو بەرکاران دەخوازێ، بەرکاری یەکەم ڕاناوێکە دەگەڕێتەوە بۆ ناوی مەوصووڵ (**إسْمِ المَوْصُول**)، ﴿فَلَوۡلَا نَصَرَهُمُ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ﴾، واتە: (**الَّذِيْنَ اتَّخَذُوهُمْ**)، ئەوانەی کە گرتبوویانن، ﴿مِن دُونِ ٱللَّهِ﴾، جگە لە خوا گرتبوویانن، ﴿قُرۡبَانًا ءَالِهَةَۢ﴾، بە پەرستراویان گرتبوون، لە حاڵێکدا کە دەیانویست پێیان لە خوا نیزیک ببنەوە، بەرکاری دووەم دەبێتە: (**آلِهَة**)، (**اتَّخَذُوهم آلِهَة**)، (**قُرْبَاناً**)، دەبێتە حاڵ، واتە: ئەوانەیان بە پەرستراو گرتبوو، لە جیاتی خوا، لە حاڵێکدا کە دەیانویست پێشیان لە خوا نیزیک بکەونەوە.

٢)- (**أبو حَيَّان و أبو البَقَاء**)، دەڵێن: بەرکاری یەکەم قرتێنراوەو (**آلِهَة**)، بەرکاری دووەمە (**قُرْبَاناً**)یش، بریتیە لە: بەرکاری پێناویی (**مَفْعُولٌ لأجْلِهِ**).

**٣)- (إبنُ العَطِيَّة والعُوفِـي)**، گوتوویانه: {(**المَفْعُول الأَوَّل مَحْذُوف**) و (**قُرْبَاناً**)، (**مَفْعُول بِهِ الثَّانِي**) و (**آلِـهَة**)، (**بَدَل مِنْه**)}، واتە: بەرکاری یەکەم قرتێنراوەو (**قُرْبَاناً**)، دەبێتە بەرکاری دووەم و (**آلِهَة**)یش جێگرەوەی بەرکاری دووەمە.

(**الزمخـشري**) ڕەخنـەی لـەو بۆچوونـە گرتـوەو، ڕوونیـشی نەکردۆتـەوە لەبەرچـی و گوتوویـەتی: مانایەکـەی ڕێـک نایەتـەوە، ڕەنگـە وایزانیبـێ وەک بـۆ خـۆی (زەمەخشـەریی) زۆر شـارەزا بـووە لـە ڕەوانبێژیـی داو، کـە خـۆی دەیزانـێ لەبەرچـی ڕێـک نایەتـەوە، خەڵکیـش دەزانـێ!!

ئنجا (**محـي الديـن الدرويـش**) خـاوەنی تەفسـیری (**إعـراب القـرآن**)[1]، دەڵـێ: (**وَلَـمْ يُبَيِّنْـهُ وَنَحْـنُ نُبَيِّنُـهُ**)، ئـەو ڕوونی نەکردۆتـەوەو ئێمـە ڕوونی دەکەینـەوە، ئنجـا ئـاوای ڕوون کردۆتـەوە، دەڵـێ:

(**لَـوْ كَانَ قُرْبَانَـاً مَفْعُـولاً ثَانِيَـاً، وَمَعْنَـاهُ مُتَقَرَّبـاً بِهِـمْ، لَصَـارَ المَعْنَـى إلى أَنَّهُـمْ وبِّخُـوا عَلَى تَـرْكِ إتِّخَـاذِ اللـهِ مُتَقَرَّبَـاً، لَكِـنَ اللـهَ يُتَقَـرَّبُ إليْـهِ، وَلَا يُتَقَـرَّبُ بِـهِ لِغَيْرِه، فَإِنَّـهُ وَقَـعَ التَّوْبِيْـخُ عَـلَى نِسْـبَةِ الإلَهِيَّـةِ إلى غَـيْرِ اللـه تَعَـالَى، فَـكَانَ حَـقُّ الـكَلَامِ أَنْ يَكُـون (آلِهَـة) هُـوَ المَفْعُـول الثَّـانِي لَا غَـيْرَ**).

واتـە: ئەگـەر (**قُرْبَانَـاً**) ببێتـە بـەرکاری دووەم {مانایەکـەشی: (خـۆ لێوە نیزیکخسـتن) ە، یـانی: ئـەوەی خـۆی پـێ لـە خـوا نیزیـک دەخەیـەوە}، مانایەکـەی وای لـێ دەهـات کـە سەرزەنشـتکراون چونکـە خوایـان ﷻ بـە (خـۆ پێـوە نیزیکخـەر) گرتـوە، بـەڵام خـوا ﷻ خـۆی پـێ لـێ نیزیـک دەخرێتـەوە، نـەک بـە خـوا لـە شـتی دیکـە نیزیـک بکەویـەوە، کەواتـە: سەرزەنشـتە کـە لەبـەر ئـەوە بـووە، کـە جگـە لـە خـوا بـە پەرسـتراو گیـراوە، نـەک لەبـەر ئـەوەی خـوا بـە (**قُرْبَـان**) گیـراوە، بۆیـە دەبـێ (**آلِـــهَة**) بکرێتـە بـەرکاری دووەم.

---

(١) ج٩، ص:١٩٠، ١٩١.

ئنجا بـەرکاری یەکـەم، یـان قرتێـنراوە، یاخـود ڕاناوێکـە دەچێتـەوە بـۆ (**الذیـن**)ی (**إسْـم المَوْصُـوْل**)و بـۆ سـەر (**اتخـذوا**) کـە بریتیـە لـە (**هـم**)ی، (**اتَّخذوهـم**) ئەوانـەی شـارەزای زمـانی عەرەبیـی بـن، باشـتر لەمـە حاڵیـی دەبـن.

ئێمـەش جـار جـار خۆمـان لـە هەندێـک لـەو وردەکارییانـە دەدەیـن، لەبـەر ئـەوەی ئـەم تەفسـیرە دەمانـەوێ لـە هەمـوو ئاسـتەکاندا بەهـرەی لـێ وەربگیـرێ، بـە تایبـەتی هەندێـک لـە ڕستەکانی، کـە زیاتـر لـە واتایـەک هەڵدەگـرن، ئێسـتا ئەمـە کــە دەفەرمــوێ: ﴿ فَلَوْلَا نَصَرَهُمُ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ قُرْبَانًا ءَالِهَةَۢ ﴿٢٨﴾ ﴾،

(**اتَّخَـذُواْ**): شـتێکی زانـدراوە، لـە زمـانی عەرەبیـی دا، کـە دوو بـەرکاری دەوێـن، ئنجا بـەرکاری یەکەمیـان، یـان دەبـێ بڵێیـن: قرتێـنراوە، یـان دەبـێ بڵێیـن: دەگەڕێتـەوە بـۆ (**الَّذِیْـن**): یانـی: (**الذیـن اتخذوهـم**)، بـەرکاری دووەم، دەبـێ هـەر (**آلِهَـة**)، بـێ، چونکـە خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ئەوانـەی بـە پەرسـتراویان گرتبـوون لـە جیـاتی خـوا، تاکـو خۆیـان پـێ لـە خـوا نیزیـک بخەنـەوە، بۆچـی سـەریان نەخسـتن؟ بـەڵام ئەگـەر بگوتـرێ: (**قُرْبَانَـاً**) دەبێتـە بـەرکاری دووەم، واتـە: بۆچـی ئەوانـەی جگـە لـە خوایـان بـە خـۆ پـێ وە نیزیکخـەر سـەریان نەخسـتن؟ ئـەو کاتـەش ڕەخنـەو گلەیـی خـوای پـەروەردگار لـەوە دەبـێ کـە: بۆچـی جگـە لـە خوایـان بـە (**قُرْبَـان**) گرتـوە، دەبووایـە بـەس خـوا بـە (**قُرْبَـان**) بگـرن؟ بـەڵام بێگومـان مەبەسـت ئـەوە نیـە، چونکـە خـوا ﷻ ڕەخنـەی لـەوە نیـە، کـە بۆچـی بـەس خوایـان بـە (**قُرْبَـان**) نەگرتـوە؟ بەڵکـو ڕەخنەکـە لەوەیـە کـە بۆچـی جگـە لـە خوایـان کـردوە بـە (**آلِهَـة**)، ئەگەرنـا خـوا ﷻ ڕەخنـە لـەوە ناگـرێ: بۆچـی جگـە لـە خواتـان کـردوە بـە هـۆکاری لـە خـوا نیزیـک بوونـەوە، چونکـە خـوا ﷻ هەرگیـز ناکرێتـە هـۆکاری لـێ نیزیککەوتنـەوە (**قُرْبَـان**)، تاکـو خـوا ﷻ ڕەخنـە بگـرێ، کـە بۆچـی جگـە لـە خواتـان بـە (**قُرْبَـان**) گرتـوەو، بۆچـی بـەس خواتـان بـە (**قُرْبَـان**) نەگرتـوە؟ ئەسـڵی واتایەکـە: بۆچـی جگـە لـە خواتـان بـە (**آلِهَـة**) گرتـوە، تاکـو پێـی لـە خـوا نزیـک ببنـەوە؟!.

بەر لەوەی کە کۆتایی بە تەفسیری ئەم ئایەتانە بێنین، سەرنجێکی وردی (**محمد الطاهر بن عاشور**) لە تەفسیرەکەی خۆیدا[1] دەخەینە ڕوو:

دەڵێ: کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَذَٰلِكَ إِفْكُهُمْ وَمَا كَانُوا يَفْتَرُونَ﴾: (**أي: كَذِبُهُم، وَمَا كَانُوا يَفْتَرُون: أي: يَفْتَرُوْنَهُ ويَخْتَلِقُونَهُ، وَهَذَا نَوْعٌ خَاصٌ مِنَ الكَذِبِ، لِهَذَا هو عَطْفُ الْخَاصِّ عَلَى الْعَام، إِذ الإفْتِرَاءُ نَوْعٌ خَاص مِنَ الكَذِبِ، وَهُوَ ابْتِكَار الأخْبَارِ الكَاذِبَةِ، وَيُرَادِفُهُ الإخْتِلَاق، لِإنَّ زَعْمَهُم الأصْنَام شُرَكَاءَ للهِ كَذِبٌ، مَرْوِيٌّ مِنْ قَبْلُ، فَهُوَ إفْكٌ، وَأَمَّا زَعْمَهُمْ أَنَّهَا تُقَرِّبُهُمْ إلى اللهِ، فَذَلِكَ افْتِرَاء آخْتَرَعُوهُ**).

واتە: کە دەفەرموێ: ﴿وَذَٰلِكَ إِفْكُهُمْ وَمَا كَانُوا يَفْتَرُونَ﴾، ئەوەش درۆیەکەیانەو ئەوە بوو کە هەڵیاندەبەست، ئنجا ئایا (درۆ) لەگەڵ (هەڵبەستن)، لێک جیان؟ (**محمد الطاهر بن عاشور**) کە بە ڕاستیی تێبینیی و سەرنجی زۆر وردو جوانی هەن، دەڵێ: کە دەفەرموێ: ﴿وَذَٰلِكَ إِفْكُهُمْ وَمَا كَانُوا يَفْتَرُونَ﴾، (**إِفكٌ**) واتە: (**كَذِب**)، یانی: ئەوە درۆیەکەیان بوو، ﴿وَمَا كَانُوا يَفْتَرُونَ﴾، هەروەها ئەوەش کە هەڵیاندەبەست، (هەڵبەستن)یش جۆرێکی تایبەتە لە درۆ، کەواتە: ئەمە بادانەوەو گێڕانەوەی تایبەتە بۆ سەر گشتیی (**عَطْفُ الْخَاصِّ عَلَى الْعَام**)، چونکە هەڵبەستن جۆرێکی تایبەتە لە درۆ، کە بریتیە لە هەڵبەستنی هەواڵە درۆیەکان، (**إفْتِرَاء**)یش بە (**إخْتِلَاق**) مانا دەکرێ، واتە: هەڵبەستن و دروستکردن، چونکە ئەوە کە پێیان وابووە بتەکان هاوبەشن بۆ خوا، ئەوە درۆیەک بووەو پێشتر گێڕدراوەتەوە، بۆیە ئەوە پێی دەگوترێ: (**إِفكٌ**)، بەڵام ئەوە کە پێیان وابووە لە خوایان وەنیزیک دەخات، هەڵبەستنێک بووەو خۆیان هەڵیانبەستوە.

---

(١) التحرير والتنوير: ج٢٦، ص: ٥٦، ٥٧.

# سەرنجێک لەسەر گشتگیریی و فراوانیی مەبەستەکانی قورئان

پێشتر گوتمان: لە کۆتایی ئەم دەرسەدا سەرنجێک دەخەینەڕوو، لە بارەی ئەوەوە، کە زۆربەی ڕوونکەرەوانی قورئان ڕەحمەتی خوایان لێ بێ و خوا پاداشتیان بداتەوە، کاتێک ئایەتەکان تەفسیر دەکەن، چەمک و واتایەکەیان قەتیس دەکەن، لەسەر ئەو واقیعەی کە ئایەتەکانی تێدا دابەزیون و، سنوورداریان دەکات، واتە: بە زۆریی دەیانبەستنەوە بە مەککەوە، بە قورەیشەوە، بەو کاتەوە، بەو شوێنەوە.

بەڵام بێگومان مەگەر نیشانەو بەڵگەیەک هەبێ، ناچارمان بکات، بڵێین: ئەم ئایەتە یان ئەم سوورەتە، تایبەتە بەو شوێنەوەو بەو کاتەوەو بەو خەڵکەوە، ئەگەرنا ئاشکرایە خوا ئەم قورئانەی تەنیا بۆ ڕۆژگارێ کە تێیدا دابەزیوەو، بۆ ئەو کۆمەڵگایەی تێیدا دابەزێنراوە، نەناردوە، بەڵام بۆ وێنە:

أ- سوورەتی (قريش): ﴿لِإِيلَـٰفِ قُرَيْشٍ ﴿١﴾ إِۦلَـٰفِهِمْ رِحْلَةَ ٱلشِّتَآءِ وَٱلصَّيْفِ ﴿٢﴾ فَلْيَعْبُدُوا۟ رَبَّ هَـٰذَا ٱلْبَيْتِ ﴿٣﴾ ٱلَّذِىٓ أَطْعَمَهُم مِّن جُوعٍ وَءَامَنَهُم مِّنْ خَوْفٍۭ ﴿٤﴾﴾، ئەوە ڕوون و دیارە کە خوای پەروەردگار بە تایبەت بۆ هۆزی قورەیشیەتی، هەرچەندە لە پشت ئەوانەوەش خەڵکی دیکە دەگرێتەوە.

ب- کە بەسەرهاتی فیل باس دەکات: ﴿أَلَمْ تَرَ كَيْفَ فَعَلَ رَبُّكَ بِأَصْحَـٰبِ ٱلْفِيلِ ﴿١﴾ أَلَمْ يَجْعَلْ كَيْدَهُمْ فِى تَضْلِيلٍ ﴿٢﴾ وَأَرْسَلَ عَلَيْهِمْ طَيْرًا أَبَابِيلَ ﴿٣﴾ تَرْمِيهِم بِحِجَارَةٍ مِّن سِجِّيلٍ ﴿٤﴾ فَجَعَلَهُمْ كَعَصْفٍ مَّأْكُولٍۭ ﴿٥﴾﴾**الفيل**، ئەوە دیارە باسی ڕووداوێکی دیاریکراو دەکات و تایبەتە بەوەوە.

بەڵام لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ أَهْلَكْنَا مَا حَوْلَكُم مِّنَ ٱلْقُرَىٰ وَصَرَّفْنَا ٱلْـَٔايَـٰتِ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿٢٧﴾﴾**الأحقاف**، واتە: بە دڵنیاییی ئێمە ئاوەدانییەکانی دەوروبەری ئێوەمان

فەوتانـدوون و نیشـانەکانمان بـۆ جـۆراو جـۆر کـردوون، بەڵکـو بگەڕێنـەوە، ﴿ فَلَوْلَا نَصَرَهُمُ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ قُرْبَانًا ءَالِهَةَۢ بَلْ ضَلُّواْ عَنْهُمْ وَذَٰلِكَ إِفْكُهُمْ وَمَا كَانُواْ يَفْتَرُونَ ﴿٢٨﴾ ﴾الأحقـاف، ئنجـا دەبووایـە ئەوانـەی لـە جیـاتی خـوا بـە پەرسـتراویان گرتبـوون، تاکـو لـە خوایـان نزیـک بخەنـەوە، سـەریان خسـتبان و پشـتیان گرتبانایـە (نـەک سـەریان نەخسـتن)، بەڵکـو لێشـیان ونبـوون و، شـوێن بـزر بـوون، ئـەوەش درۆیەکەیـان بـوو و، ئەوەبـوو کـە هەڵیاندەبەسـت.

لێـرەدا هیـچ شـتێک ئێمـە ناچـار نـاکات، بڵێیـن: ئـەوە بـەس مەبەسـت پێـی خەڵکـی مەککەیـەو کۆمەڵـگای یەکەمـە، کـە قورئـانی تێـدا دابەزێـنراوە، چونکـە ئێمـەش ئێسـتا کـە دەیخوێنینـەوە: ﴿ وَلَقَدْ أَهْلَكْنَا مَا حَوْلَكُم مِّنَ ٱلْقُرَىٰ ﴾، ئێمـە ئاوەدانییـەکانی دەوروبـەری ئێوەمـان فەوتانـدوون، خـوا ﷻ لـە قورئانـدا بـۆی باسـکردووین، تۆفـانی نـووح کـە هەڵسـاوەو کەشـتییەکە لەسـەر چیـای جوودیـی نیشـتۆتەوە، دیـارە گـەلی نـووح لـەوێ فەوتـاون، هەروەهـا ئەکەدیـی و سـۆمەریی و کلدانیـی و ئاشـوورییەکان، لـە عێـراق فەوتـاون و، کاتی خـۆی ڕۆم و فـارس و یۆنـان لـە ئێـران و ئەورووپـاو شـام و، گـەلی عـادو ثەمـوود لـە حیجـازو، لـە میصرِ فیرعـەون و، گـەلی لـووط لـە فەلەسـطین و...هتـد، کەواتـە: ئێمـەش دوێنـدراو (**مخاطـب**)ی ئـەو ئایەتـە موبارەکانەیـن، کۆمەڵـگاکانی دەوروبـەری ئێمـەش، خـوای دادگـەر لـە مێـژوودا فەوتانـدوونی، کەواتـە: سـنووردارکردنی چەمـک و واتـای ئایەتـەکان و بەسـتنەوەیان بـە شـوێنێکی جوگرافیـی دیارییکـراو و، بـە کاتێکـی مێژوویـی دیارییکـراوەوە، پێچەوانـەی ئـەو ئامانـج و حیکمەتەیـە، کـە خـوای موتەعـال قورئانی بـۆ دابەزانـدوە: ﴿ ذِكْرٌ لِّلْعَٰلَمِينَ ﴿٨٧﴾ ﴾ص، کەواتـە: دەبـێ چەمـک و واتـای ئایەتـەکان، بـە پێـی فراوانیـی قورئـان و بەپێـی ئامانجـی نێـردرانی قورئـان، تەماشـا بکەیـن، نـەک لەبـەر ڕۆشـنایی کاتێکـی دیارییکـراوی مێژووییـداو، لـە چوارچێـوەی شـوێنێکی دیارییکراویـی جوگرافییـدا، کـە بـە داخـەوە زۆربـەی تەفسـیرەکان بـەو شـێوەیان کـردوەو، ئـەوەش بـە هەڵـە دەزانم، بەڵکـو دەبـێ قورئـان کـە خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: بـۆ هەمـوو مـرۆڤ و جنـدم نـاردوە،

کاتێـک ئایەتـەکان تەفسـیر دەکەیـن، مەگـەر نیشـانەیەک هەبـێ ناچارمـان بـکات، بڵـێ: فـڵان ئایەتـە، یـان فـڵان سـوورەتە، یـان فـڵان کۆمـەڵ ئایەتـە، لەگـەڵ فڵانـە کۆمەڵـگاو گەلیـەتی، چ ئێسـتا، چ ڕابـردوو، یـان لەگـەڵ فـڵان شـوێنە جوگرافییەیـەتی ئەگەرنـا دەبـێ چەمـک و واتـای ئایەتـەکان، فـراوان بکـرێ، تاکـو تێکـڕای زەوی و هەمـوو مرۆڤایەتیـی بگرنـەوە.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـە حـەوت (٧) ئایـەتی کۆتاییـە، ئایەتـەکانی: (٢٩ - ٣٥)، کـە چـوار بابەتیان گرتوونـە خۆیان:

**بابـەتی یەکـەم:** چـوار ئایـەتی: (٢٩ - ٣٢)ی بـۆ تەرخانکـراون، بـاسی نـاردنی خـوا بـۆ کۆمەڵێـک لـە جنـدو گوێگرتنیـان بـۆ پێغەمبـەر ﷺ کـە قورئـانی خوێنـدوە، پاشـان گەڕانەوەیـان بـۆ لای خەڵکەکەیـان و، بانگەوازکـردنی خەڵکەکەیـان بـۆ لای خـواو بـۆ لای قورئـان.

**بابـەتی دووەم:** ئایـەتی پێنجـەم دەگرێتـە خـۆی، ئایـەتی ژمـارە: (٣٣)، بـاسی دروسـتکرانی گەردوونـە وەک بەڵگـە لەسـەر توانایـی خـوا ﷻ، کـە دەتوانـێ مـردووان زینـدوو بکاتـەوەو، هەڵیانسـتێنێتەوەو بـۆ سـزاو پاداشـت درانەوەیـان.

**بابـەتی سێیەم:** ئایـەتی شەشـەم، ئایـەتی ژمـارە: (٣٤) گرتوویەتـە خـۆی، کـە بـاسی سـزادانی کافرانـەو، دانپێداهێنانیانـە بـە تـاوان و خراپەکانیـان لـە ڕۆژی دوایـی دا.

**بابـەتی چوارەم:** ئایـەتی حەوتـەم و کۆتایـی، ئایـەتی ژمـارە: (٣٥)، گرتوویەتـە خـۆی، کـە فەرمانکـردنی خوایـە ﷻ بـە پێغەمبـەری خاتـەم ﷺ، کـە وەک پێغەمبـەرانی خاوەن بڕیـارو عەزیمـەتی پتـەو، خۆڕاگـر بـێ و، پەلـە نـەکات لـە هاتنـی سـزا بـۆ بێبڕوایـەکان و، دڵنیـاش بـێ لـە ئاینـدەی ڕۆشـن و سـەربەرزانەی خـۆی و، داهاتـووی مەینەتبـارو خراپـی بێبڕوایـەکان، ئەگـەر هـەر لەسـەر بێبڕوایـی بمێننـەوە.

﴿وَإِذْ صَرَفْنَآ إِلَيْكَ نَفَرًا مِّنَ ٱلْجِنِّ يَسْتَمِعُونَ ٱلْقُرْءَانَ فَلَمَّا حَضَرُوهُ قَالُوٓا۟ أَنصِتُوا۟ ۖ فَلَمَّا قُضِىَ وَلَّوْا۟ إِلَىٰ قَوْمِهِم مُّنذِرِينَ ﴿٢٩﴾ قَالُوا۟ يَٰقَوْمَنَآ إِنَّا سَمِعْنَا كِتَٰبًا أُنزِلَ مِنۢ بَعْدِ مُوسَىٰ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ يَهْدِىٓ إِلَى ٱلْحَقِّ وَإِلَىٰ طَرِيقٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٣٠﴾ يَٰقَوْمَنَآ أَجِيبُوا۟ دَاعِىَ ٱللَّهِ

وَءَامِنُواْ بِهِۦ يَغْفِرْ لَكُم مِّن ذُنُوبِكُمْ وَيُجِرْكُم مِّنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٣١﴾ وَمَن لَّا يُجِبْ دَاعِيَ ٱللَّهِ فَلَيْسَ بِمُعْجِزٍ فِي ٱلْأَرْضِ وَلَيْسَ لَهُۥ مِن دُونِهِۦٓ أَوْلِيَآءُۚ أُوْلَٰٓئِكَ فِي ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٣٢﴾ أَوَلَمْ يَرَوْاْ أَنَّ ٱللَّهَ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَلَمْ يَعْيَ بِخَلْقِهِنَّ بِقَٰدِرٍ عَلَىٰٓ أَن يُحْـِۧيَ ٱلْمَوْتَىٰۚ بَلَىٰٓ إِنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴿٣٣﴾ وَيَوْمَ يُعْرَضُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ عَلَى ٱلنَّارِ أَلَيْسَ هَٰذَا بِٱلْحَقِّۖ قَالُواْ بَلَىٰ وَرَبِّنَاۚ قَالَ فَذُوقُواْ ٱلْعَذَابَ بِمَا كُنتُمْ تَكْفُرُونَ ﴿٣٤﴾ فَٱصْبِرْ كَمَا صَبَرَ أُوْلُواْ ٱلْعَزْمِ مِنَ ٱلرُّسُلِ وَلَا تَسْتَعْجِل لَّهُمْۚ كَأَنَّهُمْ يَوْمَ يَرَوْنَ مَا يُوعَدُونَ لَمْ يَلْبَثُوٓاْ إِلَّا سَاعَةً مِّن نَّهَارٍۭۚ بَلَٰغٌۚ فَهَلْ يُهْلَكُ إِلَّا ٱلْقَوْمُ ٱلْفَٰسِقُونَ ﴿٣٥﴾

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{هەروەها (ئـەی موحەممـەد ﷺ!)، یـاد بکـەوە! کاتێـک کۆمەڵێکـمان لـە جنـد ناردنـە لات گوێیـان بـۆ قورئـان هەڵخسـتبوو، کاتێـک ئامـادەی (قورئانخوێندنەکـە) بـوون، گوتیـان: کـش و مـات بـن و گـوێ ڕادێـرن، ئنجـا کاتێـک (قورئانخوێندنەکـە) تـەواو کـرا، ترسـێنەرانەو وریاکەرەوانـە گەڕانـەوە لای کۆمەڵەکەیـان ﴿٢٩﴾ گوتیـان: ئـەی کۆمەڵەکەمـان! ئێمـە گوێبیسـتی کتێبێـک بوویـن لـە دوای مووسـا دابەزێـنراوە، بەڕاسـتدانەری (کتێبـەکانی) پێـش خۆیـەتی، بـەرەو هـەق و بـەرەو ڕێـی ڕاسـت ڕێنمایی (خەڵـک) دەکات ﴿٣٠﴾ ئـەی کۆمەڵەکەمـان! وەڵامـی (داواکاریـی) بانگـەوازکاری (ڕێـی) خـوا بدەنـەوەو، بـڕوای پـێ بێنـن لـە (بەشـێکی)گوناهەکانتان دەتانبـووریٚ و، لـە ئازارێکـی بـە ئێـش دەتانپارێـزێ ﴿٣١﴾ هـەر کەسـێکیش وەڵامـی (داوای) بانگـەوازکاری (ڕێـی) خـوا نەداتـەوە، لـە زەویـدا دەستەوسـانکەر (ی خـوا) نیـەو، جگە لـەو (خوا)یش هیـچ سەرپەرشـتیاری نیـن، ئەوانـە لـە گومڕاییەکـی ئاشـکرادان ﴿٣٢﴾ ئایـا (بێبڕوایـەکان) (بـە چـاوی عەقـڵ و دڵ) نەیاندیـوە کـە ئـەو خوایـەی ئاسـمانەکان و زەوی هێناونـە دی و، بـە دروستکردنیشـیانەوە مانـدوو نەبـووە، توانایـە کـە مردووانیـش بژیەنێـتەوە؟

با، بێگومان ئەو لەسەر هەموو شتێک توانایە ﴿٣٣﴾ ئەو ڕۆژەش کە بێبڕوایان لەسەر ئاگر (ی دۆزەخ) ڕادەنوێنرێن (پێیان دەگوترێ:) ئایا ئەمە ڕاست و چەسپاو نیە؟ گوتیان: با، (خوا) فەرمووی: دەجا بە هۆی ئەوەوە کە بێبڕوابوون، ئازار (ی دۆزەخ) بچێژن ﴿٣٤﴾ (ئەی موحەممەد ﷺ!) وەک چۆن خاوەن عەزیمەتان (لێبڕاوان) لە پێغەمبەران خۆڕاگر (و پشوو درێژبوون) خۆڕاگربە، پەلەیان بۆ مەکە (سزایان بۆ بێ) ئەو ڕۆژە ئەوەی گفتیان پێدراوە (و هەڕەشەیان پێ لێکراوە) دەیبینن، وەک تەنیا کاتێک (ی کەم) لە ڕۆژێکدا (لە ژیانی دنیادا مابنەوە)، ئەمە گەیاندن (ی پەیامی خوایە)، ئایا جگە لە کۆمەڵی لادەران (کێ) دەفەوتێنرێ؟ ﴿٣٥﴾ }.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(صَرَفۡنَآ إِلَيۡكَ): واتە: ناردمانە لات، بۆ لای تۆ ناردمان، (**صَرَفْتُ الرَّجُلَ عَنِّي فَانْصَرَفَ، وَصَرَفَ اللهُ عَنْكَ الأَذَى: دَفَعَهُ**)، دەگوترێ: (**صَرَفْتُ الرَّجُلَ عَنِّي فَانْصَرَفَ**)، پیاوەکەم لە لای خۆم دوورخستەوەو دوورکەوتەوە، (**صَرَفَ اللهُ عَنْكَ الأَذَى**)، خوا ئازارت لێ سەرف بکات، واتە: لێت دوور بخاتەوە، کەواتە: (**صَرَفْنَا إِلَيْكَ**) ناردمانە لات.

(نَفَرٗا): (**النَّفَرُ: عِدَّةُ رِجَالٍ، وَكَذَا النَّفِيْرُ: مِنْ ثَلَاثَةٍ إِلى عَشَرَةٍ، وَقِيْلَ مِنْ ثَلَاثَةٍ إِلى عِشْرِيْن**)، (**نَفَرْ**) کۆمەڵێک لە پیاوان، هەروەها وشەی (**نَفِيْر**)یش، بە هەمان شێوە، هەندێک گوتوویانە: (**نَفَرْ**) لە سێیەوە تاکو دەیەو، هەندێک گوتوویانە: لە سێیەوە تاکو بیستە.

(يَسۡتَمِعُونَ): گوێ هەڵدەخەن، (**إِسْتَمَعَ لَهُ: أَصْغَى، وَكَذَا تَسَمَّعَ وَسَمَّعَ إِلَيْهِ**)، هەم (**تَسَمَّعَ**) و هەم (**سَمَّعَ**) لەگەڵ (**إِسْتَمَّعَ إِلَيْهِ**) هەموویان، واتە: گوێی بۆ هەڵخست، نەک تەنیا گوێ بگرێ، بەڵکو گوێ هەڵبخاو بێ دەنگ بێ.

(أَنصِتُوا): (الإنْصَاتُ: السُّكُوتُ وَالإسْتِمَاع)، (إنصـات): بریتیـه لـه بـێ دەنگیـی و گوێگرتنێکـی بـه گرنگیـی پێدانـەوە.

(قُضِیَ): (قَـضَى: أي حَكَـمَ، وَقَـدْ يَكُـونُ قَـضَى بِمَعْنَـى الفَـرَاغِ، تَقُـوْلُ: قَـضَى حَاجَتَـهُ، وَقَـضَى عَلَيْـهِ: قَتَلَـهُ لأَنَّـهُ فَـرَغَ مِنْـهُ)، (قُضِيَ): بـه مانـای تەواوبـوو، بـەڵام لێـرەدا (قَـضَى) واتـه: (حَكَـم) بڕیاریـدا، جـاری وایـه (قـضى) بـه مانـای لێبوونـەوە لـه شـتێک دێ، دەگوتـرێ: (قَـضَى حَاجَتَـهُ) کارەکـەی خـۆی تەواوکـرد، (قَـضَى عَلَيْـهِ: قَتَلَـهُ لأَنَّـهُ فَـرَغَ مِنْـهُ)، (قَـضَى عَلَيْـهِ) یـانی: کوشـتی، چونکـه تـەواوی دەکات، وەک خـوا ﷻ لـه بـارەی مووسـاوە ﵇ فەرموویـەتی: ﴿فَوَكَزَهُۥ مُوسَىٰ فَقَضَىٰ عَلَيْهِۖ قَالَ هَٰذَا مِنْ عَمَلِ ٱلشَّيْطَٰنِۖ إِنَّهُۥ عَدُوٌّ مُّضِلٌّ مُّبِينٌ ﴿١٥﴾﴾القصص، واتـه: مووسـا مسـتێکی لێـداو تـەواوی کـرد، واتـه: کۆتایـی پێهـات و ڕووحـی لـه جەسـتەی جیابـۆوە.

(وَيُجِرْكُم مِّنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ): چەپاڵەتـان دەدات، دەتانپارێـزێ لـه سـزایەکی بـه ئێـش، (أَجَـارَهُ اللـهُ مِـنَ العَـذَابِ، أي: أنْقَـذَهُ، وَاسْـتَجَارَهُ مِـنْ فُـلاَنٍ، فَأَجَـارَهُ)، (أَجَـارَهُ اللـهُ مِـنَ العَـذَاب) واتـه: خـوا دەربـازی کـرد لـه ئـازار، (وَاسْـتَجَارَهُ مِـنْ فُـلاَنٍ، فَأَجَـارَهُ)، فلانکـەس داوای پەنـادانی لـه کەسـێک کـرد، کـه لـه کەسـێک پەنـای بـدات، ئەویـش پەنـای دا، کەواتـه: (يُجِرْكُـمْ) دەربازتـان دەکات و پەناتـان دەدات.

(بِمُعْجِزٍ): دەستەوسـانکەر، (أَعْجَـزَهُ الـشَّيءُ: فَاتَـهُ، وَعَجَّـزَهُ تَعْجِيْـزاً، ثَبَّطَـهُ أو نَسَبَهُ إلى العَجْـزِ)، (أَعْجَـزَهُ الـشَّيءُ: فَاتَـهُ)، واتـه: ئـەو شـته لـه دەسـتی دەربـاز بـوو و، ڕۆیشـت، (عَجَّـزَهُ تَعْجِيْـزاً) واتـه: سسـتی کـرد، یاخـود پاڵیدایـه لای نەتوانیـن، بـێ توانـای کـرد.

(وَلَمْ يَعْىَ): (العِيُّ: ضِّـدُ البَيَـانِ، عَـيَّ فِي مَنْطِقِـهِ فَهُـوَ عَـيٌّ، وَالإعْيَـاءُ: عَجْـزٌ يَلْحَـقُ البَـدَنَ فِي المَـشْيِ، وَالعِـيُّ: عَجْـزٌ يَلْحَـقُ مِـنْ تَـوَلِّي الأَمْـرِ وَالـكَلاَم)، وشـەی (عِـيٌّ): پێچەوانـەی قسـه زانیـن و زمـان پاراوییـه، دەگوتـرێ: (عَـيَّ فِي مَنْطِقِـهِ فَهُـوَ عِـيٌّ)، لـه قسـەکەیدا بـێ توانـا بـوو، نەیتـوانی مەبەسـتی خـۆی دەرببـڕێ، بـەڵام (إعْيَـاء): ماندووبوونێـک و بـێ توناییەکـه، لـه ڕووی جەسـتەییەوە تـووشی مـرۆڤ دەبـێ، بـەڵام (عِـيٌّ): لـه نەتوانینێکـه لـه ڕووی قسـەکردن و، کاروبـار ڕاپەڕاندنـەوە تـووشی ئینسـان دێ.

(يُعۡرَضُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ عَلَى ٱلنَّارِ): ئەوانەی بێبڕوان لەسەر ئاگر ڕادەنوێنرێن، دەبرێنە سوێی، پێشانیان دەدرێ، دەگوترێ: (**عَرَضْتُ الشَّيءَ عَلَى البَيْعِ، وَعَلَى فُلَانٍ وَلِفُلَانٍ، وَالعَارِض: البَادِي عُرْضَةُ**)، دەگوترێ: (**عَرَضْتُ الشَّيءَ عَلَى البَيْعِ، وَعَلَى فُلَانٍ**)، شتەکەم بۆ فرۆشتن ڕانواند، یاخود بۆ فلانکەسم ڕانواند، یان لەسەر فلانکەسم ڕانواند: پێشانمدا، (**وَالعَارِضُ: البَادِي عُرْضَةُ**)، (**عَارِض**): بە کەسێک دەگوترێ لاملی خۆی پێشانبدا.

(أُوْلُواْ ٱلۡعَزۡمِ): (**العَزْمُ وَالعَزِيمَةُ: عَقْدُ القَلْبِ عَلَى إِمْضَاءِ الأَمْرِ**)، (**عَزْمُ وعَزِيمَة**): بریتیە لە دڵ چەسپاندن لەسەر تەواوکردن و ئەنجامدانی کارێک، دەگوترێ: (**عَزَمْتُ الأَمْرَ، وَعَزَمْتُ عَلَيْهِ، وَاعْتَزَمْتُ**)، واتە: (**عَزَمْتُ الأَمْرَ**) بڕیاری کارەکەم دا، (**وَعَزَمْتُ عَلَيْهِ**) بڕیارم لەسەردا، (**وَاعْتَزَمْتُ**) دڵی خۆم لەسەر چەسپاند، کەواتە: (**أُوْلُوا العَزْم**) واتە: خاوەنانی لێبڕان، خاوەنانی بڕیارو، خاوەنانی ویستی پتەو.

(لَمۡ يَلۡبَثُوٓاْ): (**لَبِثَ بِالمَكَانِ: أَقَامَ بِهِ مُلَازِمَاً لَهُ**)، واتە: لە شوێنەکە نیشتەجێ بوو، پەیوەست بوو بەو شوێنەوە، کەواتە: (**لَمْ يَلْبَثُوا**)، واتە: نەماونەوە لەوێ، پێیان نەچووە.

(بَلَٰغٌ ): ١- (**البُلُوغُ وَالبَلَاغُ: الإِنْتِهَاءُ إِلى أَقْصَى المَقْصُودِ، وَالمُنْتَهَى، مَكَانَاً أَو زَمَانَاً، البَلَاغُ: التَّبْلِيغُ، البَلَاغُ: الكِفَايَةُ**)، وشەی (**بَلَاغ**) بە سێ واتایان هاتوە: (**البَلَاغُ والبُلُوغ**): بە مانای گەیشتن بە ئەوپەڕی ئامانج و مەبەستێک، چ لە ڕووی کاتەوەو، چ لە ڕووی شوێنەوە، واتای دووەمی (**بَلَاغ**): بە مانای گەیاندنە، واتای سێیەمی (**بَلَاغُ**): بە مانای ئەوەیە شتێک بەس بێ بۆ شتێک.

## هۆی هاتنەخوارەوەی ئایەتەکان

هـۆی هاتنـە خـوارەوەی ئـەم ئایەتـە موبارەکانـە: ﴿وَإِذْ صَرَفْنَآ إِلَيْكَ نَفَرًا مِّنَ ٱلْجِنِّ يَسْتَمِعُونَ ٱلْقُرْءَانَ فَلَمَّا حَضَرُوهُ قَالُوٓا۟ أَنصِتُوا۟ ۖ فَلَمَّا قُضِىَ وَلَّوْا۟ إِلَىٰ قَوْمِهِم مُّنذِرِينَ ﴿٢٩﴾ قَالُوا۟ يَـٰقَوْمَنَآ إِنَّا سَمِعْنَا كِتَـٰبًا أُنزِلَ مِنۢ بَعْدِ مُوسَىٰ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ يَهْدِىٓ إِلَى ٱلْحَقِّ وَإِلَىٰ طَرِيقٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٣٠﴾ يَـٰقَوْمَنَآ أَجِيبُوا۟ دَاعِىَ ٱللَّهِ وَءَامِنُوا۟ بِهِۦ يَغْفِرْ لَكُم مِّن ذُنُوبِكُمْ وَيُجِرْكُم مِّنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٣١﴾ وَمَن لَّا يُجِبْ دَاعِىَ ٱللَّهِ فَلَيْسَ بِمُعْجِزٍ فِى ٱلْأَرْضِ وَلَيْسَ لَهُۥ مِن دُونِهِۦٓ أَوْلِيَآءُ ۚ أُو۟لَـٰٓئِكَ فِى ضَلَـٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٣٢﴾﴾ **الأحقاف**، لـەو بـارەوە ئـەم دوو گێڕدراوەیـە دێنیـن:

أ)- {عَنْ عَبدِ اللهِ ابْنِ مَسْعُودٍ ﷺ قَالَ: هَبَطُوا عَلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ وَهُوَ يَقْرَأُ الْقُرْآنَ بِبَطْنِ نَخْلَةٍ، فَلَمَّا سَمِعُوا، قَالُوا: أَنْصِتُوا، قَالُوا: صَهٍ، وَكَانُوا سَبْعَةً، أَحَدُهُمْ: زَوبَعَةُ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى: ﴿وَإِذْ صَرَفْنَآ إِلَيْكَ نَفَرًا مِّنَ ٱلْجِنِّ يَسْتَمِعُونَ ٱلْقُرْءَانَ فَلَمَّا حَضَرُوهُ قَالُوٓا۟ أَنصِتُوا۟ ۖ فَلَمَّا قُضِىَ وَلَّوْا۟ إِلَىٰ قَوْمِهِم مُّنذِرِينَ ﴿٢٩﴾ قَالُوا۟ يَـٰقَوْمَنَآ إِنَّا سَمِعْنَا كِتَـٰبًا أُنزِلَ مِنۢ بَعْدِ مُوسَىٰ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ يَهْدِىٓ إِلَى ٱلْحَقِّ وَإِلَىٰ طَرِيقٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٣٠﴾ يَـٰقَوْمَنَآ أَجِيبُوا۟ دَاعِىَ ٱللَّهِ وَءَامِنُوا۟ بِهِۦ يَغْفِرْ لَكُم مِّن ذُنُوبِكُمْ وَيُجِرْكُم مِّنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٣١﴾ وَمَن لَّا يُجِبْ دَاعِىَ ٱللَّهِ فَلَيْسَ بِمُعْجِزٍ فِى ٱلْأَرْضِ وَلَيْسَ لَهُۥ مِن دُونِهِۦٓ أَوْلِيَآءُ ۚ أُو۟لَـٰٓئِكَ فِى ضَلَـٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٣٢﴾﴾ الأحقاف}، (أخرجه ابن أبي شيبة: ج٤، ص٧٦، والحاكم في المستدرك: ج٢، ص٤٥٦، وَقَالَ: صَحِيحُ الإِسْنَادِ، والبيهقي في دلائل النبوة: ج٢، ص١٢٨، أبو نُعَيم في دلائل النبوة: ج٢، ص٣٠٤، كما في (الدّرّ المنْثُور) ج٧، ص٤٥٢، والإستِيعَاب في بَيانِ الأسباب ج٣، ص٢١٦).

واتـە: عەبدوڵڵای کـوڕی مەسـعوود ﷺ، دەگێڕێتـەوە، دەڵـێ: ئـەو کۆمەڵـە لـە جنـد دابەزینـە لای پێغەمبـەر ﷺ لـە کاتێکـدا کـە قورئـانی دەخوێنـد، لـە (بَطْـنِ نَخْلَـةَ)، {شـوێنێکە لـە نیزیـک مەککـە}، کاتێـک گوێیـان لـێ بـوو، گوتیـان: بـێ دەنـگ و کـش و مـات بـن، گوتیـان: وس بـن، نـۆ کـەس بـوون، یەکێکیـان (زَوْبَعَـة) بـوو، (یەکێـک لـە جنـد بـووە، ئـەوە نـاوی بـووە)، خـوا ﷻ بـەو بۆنـەوە ئـەو ئایەتانـەی دابەزانـدن.

**ب)- {عَنْ عَلْقَمَةَ قَالَ: قُلْتُ لِابْنِ مَسْعُودٍ ﷺ: هَلْ صَحِبَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ مِنْكُمْ أَحَدٌ لَيْلَةَ الْجِنِّ؟ قَالَ: مَا صَحِبَهُ مِنَّا أَحَدٌ، وَلَكِنَّا فَقَدْنَاهُ ذَاتَ لَيْلَةٍ، فَقُلْنَا: اغْتِيلَ، اسْتُطِيرَ، مَا فَعَلَ؟ قَالَ: فَبِتْنَا بِشَرِّ لَيْلَةٍ بَاتَ بِهَا قَوْمٌ، فَلَمَّا كَانَ فِي وَجْهِ الصُّبْحِ، إِذَا نَحْنُ بِهِ يَجِيءُ مِنْ قِبَلِ حِرَاءٍ، فَأَخْبَرْنَاهُ، فَقَالَ: «إِنَّهُ أَتَانِي دَاعِي الْجِنِّ، فَأَتَيْتُهُمْ فَقَرَأْتُ عَلَيْهِمُ الْقُرْآنَ»، فَانْطَلَقَ فَأَرَانَا آثَارَهُمْ وَآثَارَ نِيرَانِهِمْ}، (أخرجه الطيالسي: ج١، ص٤٧، وابن أبي شيبة: ج١، ص١٥٥، ومسلم: ٤٥٠، وأبو داود: ٨٥، والترمُذي: ١٨، ٤٢٥٨، وابن حبان: ١٤٣٢).**

واتە: عەلقەمە دەڵێ: بە ئیبنو مەسعوودم ﷺ گوت: ئایا شەوی جند هیچ کام لە ئێوە هاوەڵایەتیی پێغەمبەری خوای کرد ﷺ؟ عەبدوڵڵاش گوتی: هیچ کام لە ئێمە هاوەڵایەتییمان نەکرد، بەڵام شەوێک (پێغەمبەر ﷺ ) لێمان ونبوو، گوتمان: دەبێ پەنهانکوژ کرابێ، دەبێ ڕفێنرابێ، چی کرد؟! شەوێک کە کۆمەڵە خەڵکێک بە خراپترین شێوەی لێیان دەگوزەرا، ئاوا ئەو شەوە لە ئێمە گوزەرا، بەڵام لە ڕووی بەرەبەیاندا پێغەمبەرمان ﷺ بینی، لە لای ئەشکەوتی حیرائەوە دەهاتەوە، هەواڵمان پێدا کە ئێمە بۆ تۆ زۆر سەغڵەت بووین، چیت لێهات؟ فەرمووی: بانگەوازکاری جند هات، بۆ لام، (واتە: یەکێکیان هاتوە)، منیش چووم بۆ لایان قورئانم بەسەردا خوێندن، ئنجا پێغەمبەر ﷺ ڕۆیی شوێنەوارەکانی خۆیان و شوێنەواری ئاگرەکانیشیانی پێشان داین.

شایانی باسە: ڕیوایەتی دیکە هەیە کە **(إبن هشام)** لە **(السيرة النبوية)** داو، **(القرطبي)** لە تەفسیرەکەی خۆیدا[1]، هێناویانە، وردەکاریی زیاتر لەو بارەوە دەخاتەڕوو، کە پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێک لە تائیف گەڕاوەتەوە، کە لە سەرچاوەکانی سیرەی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە، بە شێوەیەکی زۆر ناشایست پێشوازییان لە پێغەمبەری خوا ﷺ کردوەو، بە شێوەیەکی زۆر نانەجیبانەو ناشایستیش بەڕێیان کردوەو، منداڵیان تێبەرداون، دوایی کە پێغەمبەری خوا ﷺ

---

(١) الجامع لأحكام للقرآن: ج ٢٦، ص١٦٥، برقم: ٥٥٠١، والسيرة النبوية لابن هيشام: ج: ٢، ص: ٢١ - ٢٣)، عن محمد بن كعب القرظي مرسلاً.

هاتۆتـەوە بـەرەو مەککـە، دیـارە شـەوەکەی لـە ئەشـکەوتی (**حـراء**) بـووە، بـە پێـی ئـەو ڕیوایەتـەو، لـەو کاتـەدا خـوای پـەروەردگار کۆمەڵێـک لـە جنـدی بـۆ لا نـاردوون، یـانی: کـە ئـەی مرۆڤـەکان (خەڵکـی **طائیـف**)! ئێـوە کەللەڕەقـن، ئێـوە نانەجیـبن، ئێـوە وەڵامـی پێغەمبـەری خاتـەم ﷺ نادەنـەوە، ئەوەتـا جنـد بەپێـی خۆیـان هاتـوون! کەئێـوە پێغەمبـەر ﷺ خـۆی دێ، بـۆ لاتـان و دەیـەوێ پەیامـی خواتـان پـێ ڕابگەیەنـێ، گوێـی بـۆ ناگـرن، کەچـی جنـد لـەو شـوێنە دوورەوە خۆیـان هاتـوون، بـە پێـی خۆیـان دوای ئـەوەی بیسـتوویانە، پێغەمبـەر ﷺ پەیدابـووە، ئەویـش بـە هـۆی ئـەوەوە کـە ئاسـمانیان پشـکنیوەو تەماشـایان کـردوە، ئێشـکگرێتیی و پاسـەوانیەتیی ئاسـمان زۆر مەحکـەم کـراوەو، وەک جـاران دەرفەتیـان نیـە، بچنـە سـەروو گـوێ لـە قسـەی فریشـتان بگـرن، گوتوویانـە: دیـارە گۆڕانکارییـەک بـووە لـە زەوی دا، ئیبلیـس چەنـد کۆمەڵـە جندێکـی نـاردوون، بگەڕێـن، داخـۆ چـی ڕوویـداوە لـە زەویـدا؟ تاکـو سـەرەنجام ئەوانـەی دەچـن بـۆ لای حیجـاز، ئـەو هەواڵـە دەبەنـەوەو دەڵێـن: ئـەوە ڕوویـداوە: کـە پێغەمبـەری کۆتایـی ﷺ هاتـوەو، پاسـەوانێتیی و ئێشـکچێتیی ئاسـمان مەحکـەم کـراوە پتر لـە جـاران، تاکـو جنـد نەتوانـن گـوێ لـە قسـەی فریشـتان بگـرن و، قسـەیەک کـە دەیهێنـن بـۆ کاهیـن و فاڵچییـەکان، لەگـەڵ وەحییـدا تێکـەڵ نەبـێ.

خـواش پشـتیوان بـێ، لـە کاتێکـدا دەگەینـە تەفسـیری سـوورەتی (**الجـن**)، لەوێـدا باسـێک لـە بـارەی جنـدەوە دەکەیـن، بۆیـە لێـرەدا هـەم لە هـۆی هاتنـە خوارەوەکەی دا، کـە دەگونجـێ وردەکاریـی زیاتـر بـاس بکـرێ و، هـەم لـە مانـای گشـتیی دا، کـە دوایـی دێینـە سـەری، بـە کورتیـی قسـەمان لێکـردوەو قسـەی لـێ دەکەیـن و، خـوا پشـتیوان بـێ کـە دەگەینـە تەفسـیری سـوورەتی (**الجـن**)، وێـڕای باسـێکی سـەربەخۆ لـە بـارەی جنـدەوە، لـە بـارەی چەمـک و واتـای ئـەم ئایەتانـەی ئێـرەو، چەمـک و واتـای ئایەتـەکانی سـوورەتی (**الجن**)یشـەوە، بـاس و خـواسی پێویسـت دەکەیـن.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

خـوا ﷻ لـە چـوار ئایـەتی یەکەمـدا، ئایەتـەکانی: (٢٩ - ٣٢)، بـاسی بابەتێـک دەکات، کـە بـۆ ئێمـەی مـرۆڤ، ئـەو بابەتـە دەچێتـە چوارچێـوەی جیهانـی پەنهـان و نادیـار (**غیـب**)ەوە، ئەویـش ئەوەیـە کـە خـوا ﷻ پێغەمبـەری خاتـەم موحەممـەد ﷺ و لـە پشـت ئەویشـەوە ئۆممەتەکـەی و، هـەر کەسـێک بیـەوێ ئـاگادار دەکاتەوە، کـە کاتی خـۆی کۆمەڵێـک لـە جنـدانی نـاردوون بـۆ خزمـەت پێغەمبـەر ﷺ کـە گـوێ لـە قورئـان بگـرن، ئنجـا دوای ئـەوەی ئامـادەی بـوون، بـێ دەنـگ بـوون و، دوای ئـەوەی قورئانەکەیـان گـوێ لێبـووە، گەڕاونـەوە بـۆ لای خەڵکەکەیـان و هەواڵیـان پێـداون، کـە لـە دوای مووسـا ؑ گوێبیسـتی کتێبێـک بـوون، دابەزیـوە، کـە بـەرەو هـەق و ڕاسـتە ڕێ، خەڵـک ڕێنمایـی دەکات و، داوایـان لـە خەڵکەکەیـان کـردوە کـە بـە دەم بانگـەوازو پەیامـی خـواوە بچـن، ئەگـەر وابکـەن، خـوا لـە گوناهەکانیـان دەیانبـوورێ و، لـە سـزاو ئـازاری بـە ئێـشی دۆزەخ چەپاڵەیـان دەدات، بـەڵام هـەر کەسێ وا نـەکات، ئـەوە دەستەوسـانکەری خـوا نیـە لـە زەویـداو، بێجگـە لـە خـواش سەرپەرشـتیارێکی نیـەو، ئەوانـە لـە گومڕاییـدان.

ئەمە چەمکی گشتیی ئەو چوار ئایەتەیە، کە خوا ﷻ دەفەرموێ:

﴿ وَإِذۡ صَرَفۡنَآ إِلَيۡكَ نَفَرٗا مِّنَ ٱلۡجِنِّ ﴾، یـاد بکـەوە! کاتێـک کۆمەڵێـک لـە جندمـان بـۆ لای تـۆ ڕەوانەکـردن، (نَفَـر) گوتوویانـە: لـە سـێ تاکـو دە (٣-١٠) و، هەندێـک گوتوویانـە: لـە سێ تاکـو بیسـت (٣-٢٠)، هەروەهـا ڕاجیایـی دیکـەش هەیـە، گرنـگ ئەوەیـە ئەوانـە کۆمەڵێـک لـە جنـد بـوون، خـوا ﷻ واداری کـردوون و وای لێکـردوون، بچـن بـۆ خزمـەت پێغەمبـەر ﷺ، ئنجـا وەک لـە هـۆی هاتنـە خوارەوەکەیـدا باسـمان کـرد، هەندێـک بەسـەرهات ئامـاژە بـەوە دەکـەن، ئـەو ڕووداوە ئـەو کاتـە بووبـێ کـە پێغەمبـەر ﷺ لـە تائیـف گەڕاوەتـەوە، هەندێکیـش دەڵێـن: نەخێـر، بەڵکـو پێشـتر

بـووەو دەگونجـێ لـە سـاڵانی سـەرەتای پێغەمبەراتیی موحەممـەددا ﷺ بووبـێ، گرنگ ئەوەیـە خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: کۆمەڵێـک لـە جندمـان ناردن بـۆ لای تۆ، ﴿يَسْتَمِعُونَ الْقُرْآنَ﴾، بـە گرنگیـی پێدانـەوە گوێیـان لـە قورئـان دەگـرت، ﴿فَلَمَّا حَضَرُوهُ قَالُوا أَنصِتُوا﴾، کاتێـک ئامـادەی بـوون، واتـە: ئامـادەی کـۆڕو مەجلیسـەکەی پێغەمبـەر ﷺ بـوون، ئەگـەر کـۆڕو مەجلیس بووبـێ و، یاخـود ئامـادەی پێغەمبەربووبـن ﷺ، لـەو کاتـەدا کـە هەنـدێ دەڵێـن: نوێـژی کـردوە، ئنجـا نوێـژی بەیـانی بـووە، یـان نـا؟ گرنـگ ئەوەیـە نوێژێکـی دەنـگ تێـدا بـەرز کـراوە بـووە، یاخـود مەبەسـت پێـی ئەوەیـە ئامـادەی قورئانخوێندنەکـە بـوون، ﴿قَالُوا أَنصِتُوا﴾، لـە نێـو خۆیانـدا بـە یەکدییـان گـوت: بـێ دەنگبن، کـش و مـات بـن، ﴿فَلَمَّا قُضِيَ وَلَّوْا إِلَىٰ قَوْمِهِم مُّنذِرِينَ﴾، کاتێـک تـەواو بـوو و بـڕا، واتـە: ئـەو قورئانخوێندنـەی پێغەمبـەر ﷺ تـەواو بـوو، گەڕانـەوە بـۆ لای کۆمەڵەکەیـان ئاگادارکەرەوانـەوەو وریاکەرەوانـەوە، گەڕانـەوە بـۆ لایـان، تاکـو بیانترسێنن و وریایـان بکەنـەوە.

﴿قَالُوا يَا قَوْمَنَا إِنَّا سَمِعْنَا كِتَابًا أُنزِلَ مِن بَعْدِ مُوسَىٰ﴾، گوتیـان: ئـەی خەڵکەکەمـان! ئـەی کۆمەڵەکەمـان! ئێمـە گوێبیسـتی کتێبێـک بوویـن لـە دوای مووسـا ﵇ دابەزێـنراوە، واتـە: لـە دوای کتێبەکـەی مووسـا (کـە تەوراتـە) دابەزێـنراوە، ﴿مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ﴾، بەڕاسـتدانەری ئەوەیـە کـە لـە پێشدەسـتیەوە بـووەو، هەرچـی کتێبێـک کـە لـە پێـش ئـەودا دابەزیـوە، هەمـووی بەڕاسـت دەزانـێ، وەک ئەصڵەکەیـان کـە کتێـب و فەرمایشـتی خـوان، ﴿يَهْدِي إِلَى الْحَقِّ﴾، بـەرەو هـەق و ڕاسـتیی و دادگەریـی و چاکیـی و حیکمـەت، ڕێنمایـی دەکات، ﴿وَإِلَىٰ طَرِيقٍ مُّسْتَقِيمٍ﴾، هەروەهـا بـەرەو ڕاسـتە شـەقام، هـەق وەک لایـەنی تیۆریـی و، ڕاسـتە ڕێ، وەک لایـەنی جێبەجێکـردن و بەرجەسـتەکردنی ئـەو هەقـە لەسـەر ئـەرزی واقیـع، ئیسـلام هەقێکـە کـە لـە قورئانـدا بەرجەسـتەیە، ڕاسـتە ڕێیەکیشـە کـە لـە ڕێبـازی پێغەمبـەردا ﷺ بەرجەسـتەیە، ئەویـش هـەر قورئانـەو پیـادە کـراوەو بەرجەسـتە کـراوە، وەک زۆرجـاران گوتوومانـە.

﴿ يَٰقَوْمَنَآ أَجِيبُواْ دَاعِيَ ٱللَّهِ ﴾، ئـەی کۆمەڵەکەمـان! ئـەی خەڵکەکەمـان! وەڵامـی بانگـەوازکاری خـوا بدەنـەوە، واتـە: ئـەو کەسـەی خـوا ناردوویـەتی بـۆ بانگکـردنی خەڵـک، ئێـوە وەڵامـی بدەنـەوە، ﴿ وَءَامِنُواْ بِهِۦ ﴾، بـڕواشی پـێ بێنـن، سـەرەتا بـە دەنگیـەوە بچـن، پاشـان دوای ئـەوەی تێدەفکـرن و ڕادەمێنـن و لە پەیامەکـەی حاڵیی دەبـن، بـڕوای پـێ بێنـن، ﴿ يَغْفِرْ لَكُم مِّن ذُنُوبِكُمْ ﴾، لـە گوناهەکانتـان دەتانبـووڕێ، ﴿ وَيُجِرْكُم مِّنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ ﴾، لـە ئازارێکـی بـە ئێشـیش چەپاڵـەو پەناتـان دەدات.

﴿ وَمَن لَّا يُجِبْ دَاعِيَ ٱللَّهِ ﴾، هـەر کەسـێکیش وەڵامـی بانگـەوازکاری خـوا نەداتـەوە، بانگەوازکارێـک کـە بـۆ لای خـوا، خەڵـک بانـگ دەکات، کـە موحەممـەدە ﷺ ﴿ فَلَيْسَ بِمُعْجِزٍ فِي ٱلْأَرْضِ ﴾، مسـۆگەر دەستەوسـانکەری خـوا نیـە لـە زەویـدا، یـانی: دەستەوسـانکەری خـوا نیـەو، لـە خـوا دەربـازو قوتـار نابـێ، ﴿ وَلَيْسَ لَهُۥ مِن دُونِهِۦٓ أَوْلِيَآءُ ﴾، هەروەهـا جگـە لـەو (جگـە لـە خـوا ﷻ) هیـچ سەرپەرشـتیاری نیـن، دۆسـت و پشـتیوان و مشـوورخۆری نیـن، ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ فِي ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴾، ئـا ئەوانـە، لـە گومڕاییەکـی ڕوون و ئاشـکرادان.

ئنجـا خـوا ﷻ لـە ئایـەتی دوای ئـەودا، ئایـەتی ژمـارە (٣٣)دا، بابەتێکـی دیکـە بـاس دەکات، کـە زۆرجـار لـە قورئانـدا باسـکراوە، ئەویـش بریتیـە لـەوە کـە خـوا ئاسـمانەکان و زەوی هێناونـە دی، بـێ ئـەوەی پێیانـەوە مانـدوو بـێ، ئنجـا خوایـەک ئـەوە توانایەکـەی بـێ، توانایەکـەی بـێ سـنوورەو دەشـتوانێ مـردووان زینـدوو بکاتـەوە:

دەفەرمـوێ: ﴿ أَوَلَمْ يَرَوْاْ أَنَّ ٱللَّهَ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَلَمْ يَعْيَ بِخَلْقِهِنَّ بِقَٰدِرٍ عَلَىٰٓ أَن يُحْـِۧيَ ٱلْمَوْتَىٰ ﴾، ئایـا نەیانبینیـوە، واتـە: بـە چـاوی عەقـڵ و دڵ، زانایـان دەڵێـن: (**الرُّؤْيَـةُ قَلْبِيَّـةٌ وَلَيْسـتْ بَصَرِيَّـة**)، چونکـە ئـەوە بـە چـاوی سـەر نابینرێ، کـە خـوا بـە دروسـتکردنی ئاسـمانەکان و زەوییـەوە مانـدوو نەبـووە، یاخـود: یـانی: (**أوَلَـمْ يَعْلَمُـوا؟ أوَلَـمْ يُدْرِكُـوا؟**)، ئایـا نەیانزانیـوە؟ ئایـا دەرکیـان نەکـردوەو نەیانفامیـوە؟ ﴿ أَنَّ ٱللَّهَ ٱلَّذِي

﴿ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ ﴾، کە ئەو خوایەی ئاسمانەکان و زەوی هێناونە دی، ﴿ وَلَمْ يَعْىَ بِخَلْقِهِنَّ ﴾، ماندوو و شەکەتیش نەبووە، بە دروستکردنیانەوە، ﴿ بِقَٰدِرٍ عَلَىٰٓ أَن يُحْـِۧىَ ٱلْمَوْتَىٰ ﴾، (ئایا نازانن کە ئەو خوایە) تواناداره، لەسەر ئەوەی مردووان بژیەنێتەوە؟ ﴿ بَلَىٰٓ ﴾، با، (تواناداره)، ﴿ إِنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴾، بە دڵنیایی ئەو لەسەر هەموو شتێک بە توانایە.

واتە: با هەر بۆ خۆیان ڕامێنن و تەماشا بکەن، مادام دان بە بوونی خوای بەدیهێنەرو پەروەردگاردا دێنن، نابێ مەسەلەی زیندووکرانەوەیان لێ عاسێ بێ، خوایەک بتوانێ ئەم گەردوونە، ئاوا بەو شێوەیە سیستماتیک و پڕ وردەکارییە بخوڵقێنێ، دەشتوانێ مردووانێک کە کاتی خۆی ژیانی پێداون، زیندوویان بکاتەوەو، دووبارە ژیانیان پێ بداتەوە، وەک چۆن لەسەرەتاوە مردوو بوون و، ژیانی پێداون، دەتوانێ دووبارە ژیانیان پێ بداتەوە.

ئنجا لە ئایەتی ژمارە (٣٤)دا، بابەتێکی دیکەی سێیەم باس دەکات و دەفەرموێ: ﴿ وَيَوْمَ يُعْرَضُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ عَلَى ٱلنَّارِ ﴾، هەروەها ئەو ڕۆژە کە ئەوانەی بێبڕوان ڕادەنوێنرێن لەسەر ئاگر، ﴿ أَلَيْسَ هَٰذَا بِٱلْحَقِّ ﴾، (پێیان دەگوترێ:) ئایا ئەمە هەق و ڕاست نیە؟! ﴿ قَالُوا۟ بَلَىٰ وَرَبِّنَا ﴾، گوتیان: با، بە پەروەردگارمان (ڕاستە)، ﴿ قَالَ فَذُوقُوا۟ ٱلْعَذَابَ بِمَا كُنتُمْ تَكْفُرُونَ ﴾، خوا ﷻ فەرمووی: کەواتە: ئازار بچێژن بە هۆی ئەوەوە کە بێبڕوابوون، (**تَكْفُرُون**) دەشگونجێ بە مانای سپڵەیی دەکەن، بێ، یانی: چونکە کوفرانتان دەکرد، بەڵام لەم ڕەوت (سیاق)ەدا باشتر دەگونجێ کە مەبەست ئەوە بێ، بە هۆی ئەوەوە کە ئێوە بێبڕوابوون، بەڵام ئێستا دانی پێدا دێنن.

بەڵێ: (**كَفَرُوا**)ی یەکەم: ﴿ وَيَوْمَ يُعْرَضُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ﴾، دەگونجێ بە مانای ئەوە بێ: ئەوانە کە سپڵەو ناسوپاسن، هەروەها (**تَكْفُرُوا**)ی دووەمیش، دەگونجێ بە مانای سپڵەیی ناسوپاسیی بێ، بەڵام بەپێی سیاق زیاتر ئەوە دێتە بەرچاو مەبەست بێبڕوایی بێ، واتە: بێبڕوابوون بە ڕۆژی دوایی و بە سزاو پاداشتی خوا.

لێرەدا کە ئەو پرسیارەیان لێ دەکرێ: ﴿أَلَيْسَ هَٰذَا بِالْحَقِّ﴾، کە ئەوە گوتراوی بێژەرێکە، بەڵام بێژەرەکە باس نەکراوە، ئنجا یان خوایە ﷻ، یاخود فریشتەکانن، کە ئەو پرسیارە دەکەن، ئایا ئەمە هەق و ڕاست نیە؟ ﴿قَالُوا بَلَىٰ وَرَبِّنَا﴾، گوتیان: با سوێند بە پەروەردگارمان، سوێندیشی لەسەر دەخۆن، بۆ جەختکردنەوەو زیاتر دڵنیاکردنەوەی بەرانبەر، کە ئێستا زۆر قەناعەتیان هاتوە، بەڵام بە داخەوە کاتەکەی گونجاو نیە!! ﴿قَالَ فَذُوقُوا الْعَذَابَ بِمَا كُنتُمْ تَكْفُرُونَ﴾، {خوا ﷻ یاخود ئەو بێژەرە}، فەرمووی: ئنجا مادام وایە ئازار بچێژن بەهۆی ئەوەوە، کە بێبڕوابوون کاتی خۆی، واتە: لە ژیانی دنیادا.

ئنجا دێتە سەر بابەتی چوارەم و کۆتایی لە ئایەتی ژمارە (٣٥)دا: ﴿فَاصْبِرْ كَمَا صَبَرَ أُولُوا الْعَزْمِ مِنَ الرُّسُلِ﴾، ئەم (ف)ە، بۆ بادانەوەو گێڕانەوەیە، بەڵام هاوکات پەیوەستیشە بە چەند ڕستەیەکەوە لە پێش خۆیدا، واتە: مادام کار بەو شێوەیە بێ و، ئەوانە ئاوا کەللەڕەق و عیناد بن و، دان بەو پەیامەی تۆدا نەهێنن، ﴿فَاصْبِرْ كَمَا صَبَرَ أُولُوا الْعَزْمِ مِنَ الرُّسُلِ﴾، خۆڕاگر بە، تۆش وەک چۆن خاوەن عەزمان لە پێغەمبەران خۆڕاگر بوون.

(**عزم**) ویستێکی مەحکەم و بڕیارێکی پتەو و لێبڕانێکی باشە، وەک پێشتر لە شیکردنەوەی وشەکاندا باسمان کرد، وشەی (**عَـزْمُ وعَزِيْمَـة**): چەسپاندنی دڵە لەسەر جێبەجێکرنی کارێک و لێبڕان بۆ کارێک و، ساغکردنەوەی دڵ لەسەر ئەنجامدانی کارێک، ﴿فَاصْبِرْ كَمَا صَبَرَ أُولُوا الْعَزْمِ مِنَ الرُّسُلِ﴾، یانی: ئەو پێغەمبەرانەی دڵی خۆیان چەسپاندوە لەسەر ئەنجامدانی ئەو ئەرکەی خوا پێی سپاردوون، تۆش وەک ئەوان خۆڕاگر بە، ﴿وَلَا تَسْتَعْجِل لَّهُمْ﴾، پەلەیان بۆ مەکە، واتە: پەلەیان بۆ مەکە سزایان بۆ بێ، سزایەک کە خوا هەڕەشەی پێ لێکردوون، ﴿كَأَنَّهُمْ يَوْمَ يَرَوْنَ مَا يُوعَدُونَ﴾، ئەو ڕۆژەی ئەوەی بەڵێنییان پێدراوە، یان هەڕەشەیان پێ لێکراوە، دەیبینن، وەک ئەوە وایە، ﴿لَمْ يَلْبَثُوا إِلَّا سَاعَةً مِّن نَّهَارٍ﴾، کە تەنیا کاتێکی کەم لە ڕۆژێدا مابنەوە، ﴿بَلَاغٌ﴾، ئەمە گەیاندنی پەیامە، یان ئەمە

کۆتایی ڕاگەیاندنی ئەو پەیامەیە، یان ئەمە بەس و تەواوە، چونکە (بَلَاغ) بە هەر سێ واتایەکە دێ: أ- بە مانای گەیاندن دێ و، ب- بە مانای کۆتایی دێ و، ج- بە مانای تەواویی دێ، ﴿فَهَلْ يُهْلَكُ إِلَّا ٱلْقَوْمُ ٱلْفَٰسِقُونَ ﴾، ئایا جگە لە کۆمەڵی لادەران کەسی دیکە دەفەوتێ؟ بەس ئەوانە دەفەوتێن کە لە ڕاستە ڕێ لادەدەن، هەروەک چۆن کەسێک کە لە ڕێی ڕاست لادەداو، تووشی کوێرە ڕێ و ڕێچکان دەبێ، یاخود سەیارەیەک کە لە ڕاستە شەقام لادەدات، دەکەوێتە نێو کەندەڵان و هەڵدێر، بە هەمان شێوەش: تەنیا ئەوانە دەفەوتێن کە لە ڕاستە شەقامی خوا لادەدەن.

پێشتریش ئاماژەمان بەوەدا کە زۆربەی هەرە زۆری توێژەرەوان، وەک دواییش باسی دەکەین، ﴿أُوْلُواْ ٱلْعَزْمِ مِنَ ٱلرُّسُلِ﴾، یان بە ژمارەیەکی دیارییکراو لە پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام) لێکداونەوە، کە هەندێکیان گوتوویانە: ئەو پێنجەن: (نووح و ئیبراهیم و مووسا و عیسا و موحەممەد)، واتە: ئەی موحەممەد! ﷺ تۆش وەک ئەو چوارە خاوەن عەزیمەت و ویستی پتەو مەحکەم بە، هەروەها هەندێکیان گوتوویانە: حەوتن و، هەندێکیان گوتوویانە: دەن و، هەندێکیان گوتوویانە: زیاتر یان کەمترن.

بەڵام بە بۆچوونی بەندە هەموو پێغەمبەران، خاوەنی عەزیمەت و ویستێکی مەحکەم بوون، لە مەسەلە گرنگەکانیشدا زیاتر تیشک دەخەینە سەر ئەوەی خوا ﷻ بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿فَٱصْبِرْ لِحُكْمِ رَبِّكَ وَلَا تَكُن كَصَاحِبِ ٱلْحُوتِ إِذْ نَادَىٰ وَهُوَ مَكْظُومٌ ﴿٤٨﴾﴾ القلم، بۆ حوکمی پەروەردگارت خۆت ڕابگرەو، وەک خاوەنی ماسییەکە مەبە، واتە: وەک یونوس مەبە، هەروەها کە خوا ﷻ لە بارەی ئادەمەوە دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ عَهِدْنَآ إِلَىٰٓ ءَادَمَ مِن قَبْلُ فَنَسِيَ وَلَمْ نَجِدْ لَهُۥ عَزْمًا ﴿١١٥﴾﴾ طه، بە دڵنیایی ئادەممان ڕاسپارد لەمەو پێش، کەچی لە بیری چوو و عەزممان پێوە نەبینی، لەوێدا وەڵامی ئەوە دەدەینەوە، کە مەبەست پێیان چییە؟

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**خـوا (عـز وجـل) ژمارەیـەک جنـدی ڕەوانـەی لای پێغەمبـەری خاتـەم موحەممـەد ﷺ کـردوون، بـۆ گوێگرتـن لـە قورئـان و، پـاش گـوێ هەڵخسـتن و وەرگرتنـی قورئـان، گەڕاونـەوە لای خەڵکەکەیـان و، بانگەوازیـان کـردوون بـۆ لای قورئـان و ئیسـلام و، موژدەشـیان بـە وەڵامـدەرەوانی بانگـەوازکاری لای خـوا داوە، بـە لێبـوردران و چەپاڵـەدران لـە سـزای بـە ئێـش، بـە پێچەوانەوەشـەوە: سـەرپێچیکاران لـە سـزای خـوا قوتـار نابـن و، لـە گومڕاییـش دان:**

خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿وَإِذْ صَرَفْنَآ إِلَيْكَ نَفَرًا مِّنَ ٱلْجِنِّ يَسْتَمِعُونَ ٱلْقُرْءَانَ فَلَمَّا حَضَرُوهُ قَالُوٓا۟ أَنصِتُوا۟ فَلَمَّا قُضِىَ وَلَّوْا۟ إِلَىٰ قَوْمِهِم مُّنذِرِينَ ﴿٢٩﴾ قَالُوا۟ يَٰقَوْمَنَآ إِنَّا سَمِعْنَا كِتَٰبًا أُنزِلَ مِنۢ بَعْدِ مُوسَىٰ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ يَهْدِىٓ إِلَى ٱلْحَقِّ وَإِلَىٰ طَرِيقٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٣٠﴾ يَٰقَوْمَنَآ أَجِيبُوا۟ دَاعِىَ ٱللَّهِ وَءَامِنُوا۟ بِهِۦ يَغْفِرْ لَكُم مِّن ذُنُوبِكُمْ وَيُجِرْكُم مِّنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٣١﴾ وَمَن لَّا يُجِبْ دَاعِىَ ٱللَّهِ فَلَيْسَ بِمُعْجِزٍ فِى ٱلْأَرْضِ وَلَيْسَ لَهُۥ مِن دُونِهِۦٓ أَوْلِيَآءُ أُو۟لَٰٓئِكَ فِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٣٢﴾﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە شازدە بڕگەدا:

١)- ﴿وَإِذْ صَرَفْنَآ إِلَيْكَ نَفَرًا مِّنَ ٱلْجِنِّ﴾، هەروەها یاد بکەوە کە کۆمەڵێک لە جندمان بۆ لات ناردن، (**إِذْ**) بۆ (**ظَرْف**)ە، کاتێک کە شتێک تێیدا ڕوویداوە لە ڕابردوودا، (**العَامِلُ فِي الظَّرْفِ مُقَدَّرٌ: وَاذْكُرْ إِذْ صَرَفْنَا**)، کاریگەر لە (ظرف)دا ئەندازەگیریی کراوە، یاد بکەوە! کاتێک کە ناردمانە لات، (**صَرْف**) بە مانای ناردن و ڕەوانە کردنە، ﴿نَفَرًا مِّنَ ٱلْجِنِّ﴾، (**نفر**) وەک گوتمان، ژمارەیەکە، لە بیست کەمتر بێ، یاخود زیاتر بێ، یاخود لە دە کەمتر

بێ، لەو بارەوە زانایان مشت و مڕیان هەیە، ﴿صَرَفۡنَآ إِلَيۡكَ نَفَرٗا مِّنَ ٱلۡجِنِّ﴾، (**أي: وَجَّهْنَا إِلَيْكَ نَفَرَاً مِنَ الجِنِّ، وَبَعَثْنَاهُمْ إِلَيْك**)، واتە: کۆمەڵێک لە جندمان ناردن بۆ لای تۆ و، ڕەوانەی لای تۆمان کردن.

٢)- ﴿يَسۡتَمِعُونَ ٱلۡقُرۡءَانَ﴾، بە گرنگیی پێدانەوە گوێیان بۆ قورئان گرتبوو، بە کوردیی پێی دەڵێن: گوێ هەڵخستن، ئنجا: ﴿يَسۡتَمِعُونَ ٱلۡقُرۡءَانَ﴾، (**فِي مَحَلِّ نَصَبٍ صِفَةٌ ثَانِيَة لِنَفَراً أو حَالٌ**)، (يَسۡتَمِعُونَ ٱلۡقُرۡءَانَ) لە شوێنی (**نصب**)دایەو دەگونجێ سیفەتی دووەم بێ بۆ ﴿نَفَرٗا مِّنَ ٱلۡجِنِّ﴾، یاخود حاڵ بێ، یانی: حاڵێکدا کە بە گرنگیی پێدانەوە، گوێیان هەڵخستبوو.

٣)- ﴿فَلَمَّا حَضَرُوهُ قَالُوٓاْ أَنصِتُواْ﴾، کاتێک ئامادەی بوون، گوتیان: کش و مات بن، (**حَضَرُوهُ: أي حَضَرُوا قَارِئَ القُرْآنِ**)، ئامادەی خوێنەرەوەی قورئان بوون، یاخود ئامادەی خودی قورئانەکە بوون، لە کاتێکدا دەخوێنرایەوە، واتە: ئامادەی قورئان خوێندنەکە بوون، ﴿قَالُوٓاْ أَنصِتُواْ﴾، لە نێوان خۆیاندا بە یەکدییان گوت: کش و مات بن، (**إنْصَات**) بریتیە: لە بێ دەنگییەک کە گوێگرتنی تێدابێ، واتە: بۆیە بێ دەنگ دەبین، تاکو چاک گوێی لێ بگرین، (**الطبري**) ئەم ئایەتە قورئانییە، یاخود ئەم چەند ڕستەیەی، ئاوا لێکداونەوە لە تەفسیرەکەی خۆیدا[1]، دەڵێ:

(**يَقُولُ تَعَالَى ذِكْرُهُ مُقَرِّعَاً كُفَّارَ قُرَيْشٍ بِكُفْرِهِمْ بِمَا آمَنَتْ بِهِ الْجِنّ {وَإِن صَرَفْنَا إِلَيْك} يَا مُحَمَّد ﴿نَفَرٗا مِّنَ ٱلۡجِنِّ يَسۡتَمِعُونَ ٱلۡقُرۡءَانَ﴾، ذُكِرَ أَنَّهُمْ صُرِفُوا إِلَى رَسُول اللَّه ﷺ بِالْحَادِثِ الَّذِي حَدَثَ مِنْ رَجْمِهِمْ بِالشُّهُبِ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، قَالَ: «لَمَّا بُعِثَ النَّبِيُّ ﷺ حُرِسَتِ السَّمَاءُ، فَقَالَ الشَّيْطَانُ: مَا حُرِسَتْ إِلَّا لِأَمْرٍ قَدْ حَدَثَ فِي الْأَرْضِ، فَبَعَثَ سَرَايَاهُ فِي الْأَرْضِ، فَوَجَدُوا النَّبِيَّ ﷺ قَائِمًا يُصَلِّي صَلَاةَ الْفَجْرِ بِأَصْحَابِهِ بِنَخْلَةَ، وَهُوَ يَقْرَأُ، فَاسْتَمَعُوا حَتَّى إِذَا فَرَغَ: ﴿وَلَّوۡاْ إِلَىٰ قَوۡمِهِم مُّنذِرِينَ﴾الأحقاف، إِلَى قَوْلِهِ: ﴿مُّسۡتَقِيمٖ ٣٠﴾الأحقاف**)[2].

---

(١) جامع البيان، ج٢٦، ص٣١.

(٢) جامع البيان: ٣١٢٧٧.

دەڵـێ: خـوا نـاوی هـەر بـەرزە، دەفەرمـوێ: وەک سـەر کۆنەکـردنی کافـرەکانی قورەیـش بەهـۆی بێبڕواییانـەوە، بـەوە سـەرکۆنەیان دەکات کـە جنـد بڕوایـان پـێ هێنـاوە، دەفەرمـوێ: یـاد بکـەوە! کاتێـک کۆمەڵێـک لـە جندمـان ناردنـە لای تـۆ (ئـەی موحەممـەد! ﷺ) کۆمەڵێـک لـە جنـد گوێیـان بـۆ قورئـان گرتبـوو، بـە گرنگیـی پێدانـەوە، باسـکراوە کـە بۆیـە نێـردراون بـۆ لای پێغەمبـەری خـوا ﷺ، بەهـۆی ئـەو ڕووداوەوە کـە ڕوویـداوە، ئەویـش بریتـی بـووە لـەوەی کاتـێ ویسـتوویانە گـوێ بگـرن لـە قسـەی فریشـتان، وەک جـاران، تیـر بـاران و بڵێسـە بـاران کـراون، سـەعیدی کـوڕی جوبەیـر خـوا لێـی ڕازی بـێ (کـە یەکێکـە لـە زانایـانی تابیعیـن) دەڵـێ: کاتێـک پێغەمبـەر ﷺ ڕەوانـە کـرا، ئاسـمان پاسـەوانیی کـرا، (یـان پاسـەوانییەکەی توندتـر کـرا، وەک لـە ئایەتەکـەدا ئامـاژەی پێکـراوە)، شـەیتان گـوتی: ئاسـمان ئێشـکچییەتیی تێـدا دانەنـراوە، مەگـەر لەبـەر ڕووداوێـک کـە لـە زەویـدا ڕوویـداوە، ئنجـا سـەربازەکانی خـۆی نـاردن، بـە زەویـدا بگەڕێـن، سـەرەنجام پێغەمبەریـان بینـی ﷺ نوێـژی بەیـانی بـە هـاوەڵانی دەکـرد لـە نەخلـە، لـەو کاتـەدا قورئـانی دەخوێنـد، ئەوانیـش گوێیـان بـۆ گـرت، تاکـو تـەواو بـوو، کاتێـک تـەواو بـوو، گەڕانـەوە بـۆ لای خەڵکەکەیـان ترسێنەرانەو ئاگەدارکەرەوانـە، ئایەتـەکان تاکـو دەگاتـە: ﴿ مُسْتَقِيمٍ ﴿٣٠﴾ ﴾ **الأحقـاف**، ئـەم ئایەتانـە بـەو بۆنەیـەوە هاتوونـە خـوار.

ئایەتەکە دەفەرموێ:

٤)- ﴿ فَلَمَّا قُضِيَ ﴾، کاتێک تەواو کرا، هەروەها خوێندراویشەتەوە: (**فَلَمَّا قَضَى**)، کاتێک پێغەمبەر ﷺ قورئانخوێندنەکەی تەواو کرد، ئەگەر بفەرموێ: (**قُضِيَ**) واتە: خوێندنەوەکەی قورئان تەواو بوو.

٥)- ﴿ وَلَّوْاْ إِلَىٰ قَوْمِهِم مُّنذِرِينَ ﴾، گەڕانەوە بۆ لای کۆمەڵەکەیان ئاگادارکەرەوانە، (**وَلَّوْا: انْصَرَفُوا مِنْ مَكَانِ الإِسْتِمَاعِ وَرَجَعُوا إِلَى مَكَانِهِمْ**)، لەو شوێنەی گوێیان لێ هەڵخستبوو، گەڕانەوە بۆ ئەو شوێنەی لێوەی هاتبوون.

ئنجـا ئـەوە کـە لـە نێـو خۆیانـدا گوتوویانـە: (**أَنْصِتُـوا**): (**إنصـات**) یـانی: بـێ دەنگییـەک بـە مەبەسـتی چـاک حاڵیـی بـوون، وەک لـەو فەرمایشـتەدا هاتـوە کـە بـاسی حەجـی ماڵئاوایـی (**حَجَّـةُ الـوِدَاع**) پێغەمبـەر دەکات ﷺ لـە جابیـری کـوڕی عەبدوڵـڵاوە گێڕدراوەتـەوە کـە پێغەمبـەر ﷺ پێـی فەرمـووە: {**إِسْـتَنْصِتِ النَّـاسَ**} (**أخرجـه البخـاري**: ١٢١، **ومسـلم**: ١١٨)، واتـە: خەڵـک بـێ دەنـگ بکـە، وایـان لـێ بکـە بـێ دەنـگ و کـش و مـات بـن، بـۆ ئـەوەی بـاش گوێبیسـتی قسـەکان بـن.

ئنجا ئەوانە کە گەڕانەوە بۆ لای خەڵکەکەیان:

٦)- ﴿ قَالُواْ يَٰقَوْمَنَآ إِنَّا سَمِعْنَا كِتَٰبًا أُنزِلَ مِنۢ بَعْدِ مُوسَىٰ ﴾، گوتیان: ئەی خەڵکەکەمان! ئەی کۆمەڵەکەمان! ئێمە گوێبیستی کتێبێک بووین، کە لە دوای مووسا ﷺ دابەزێنراوە، هەڵبەتە ئەمە مانای ئەو قسانەیە کە جند کردوویانن، ئنجا ئایا بە چ زمانێک دواون و، خەڵکی چ شوێنێک بوون، کامیان بووە قسەی کردوە؟ دیار نیە، گرنگ ئەوەیە ماناکەی ئەوە بووە، گوتوویانە: ئێمە گوێبیستی کتێبێک بووین، کە دوای مووسا دابەزێنراوە.

بۆچـی بـاسی کتێبەکـەی مووسـا کـراوە؟ چونکـە کتێبەکـەی مووسـا ﷺ، زانایـان دەڵێـن: دوایەمیـن کتێـب و پەیامـی خـوا بـووە، کـە یاسـاکانی تێدابـوون، چونکـە کتێبـەکانی دیکـەی کـە بـۆ پێغەمبـەرانی بەنـوو ئیسـرائیل هاتـوون، هـەر لـە داوود و سـولەیمانەوە بگـرە، تاکـو دەگاتـە زەکەرییـاو یەحیـاو عیسـا (**عَلَيْهِـمُ الصَّـلاةُ وَالسَّـلام**) لـە پەراوێـزی تـەورات دابـوون و هەموویـان شـوێنکەوتووی تـەورات بـوون، بەڵـێ خـوا زەبـووری بـە داوود داوەو، ئینجیـلی بـە عیسـا داوە (**عَلَيْهِـمُ الصَّـلاةُ وَالسَّـلام**)، بـەڵام هەردووکیـان بـە ڕاسـتدانەری تـەورات بـوون و، شـوێنکەوتووی تـەورات بـوون، بێگومـان هەنـدێ شـتی تایبەتیـان بـۆ هاتـوە، کـە ئەویـش هـەر ڕوونکردنـەوەی هەنـدێ شـت بـووە کـە لـە تەوراتـدا بـووە، یـان ڕاسـتکردنەوەی هەنـدێ شـت بـووە کـە لـە تەوراتـدا دەسـتکاریی کـراوە.

٧)- ﴿ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ ﴾، بەڕاستدانەری ئەوەیە، کە لە پێش دەستیەوەیەتی، ئەو کتێبە کە قورئانە، هەموو کتێبەکانی پێش خۆی - وەک ئەسڵەکەیان --- بە ڕاست دەزانێ.

٨)- ﴿ يَهْدِيٓ إِلَى ٱلْحَقِّ ﴾، ڕێنمایی خەڵک دەکات بۆ هەق، (**يَهْدِي**) واتە: (**يَهْدِي النَّاس**) خەڵک ڕێنمایی دەکات بەرەو هەق، لێرەدا هەق دەگونجێ مەبەست پێی بووناسیی و ئیمان و عەقیدەبێ.

٩)- ﴿ وَإِلَىٰ طَرِيقٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴾، هەروەها ڕێنماییان دەکات بۆ ڕاستە ڕێ، دەگونجێ ئەمەش مەبەست پێی پابەندیی و کردەوەی باش بێ، واتە: خەڵک ڕێنمایی دەکات، هەم هەق بناسن و بزانن، هەم بەو هەقەشەوە پابەندبن، کە لە ڕاستە شەقامی خوادا بەرجەستە دەبێ، کە پێغەمبەر ﷺ لە دوو توێی ڕێبازو سوننەتەکەی خۆیدا بەرجەستەی کردوە، کەواتە: ئیسلام تەنیا بەرنامەیەکی تیۆریی و فیکریی نیە، بەڵکو هاوکات لەگەڵ ئەوەدا، جێبەجێکردنێکی کردەییشە لەسەر ئەرزی واقیع.

١٠)- ﴿ يَٰقَوْمَنَآ أَجِيبُواْ دَاعِيَ ٱللَّهِ وَءَامِنُواْ بِهِۦ ﴾، ئەی خەڵکەکەمان! ئەی کۆمەڵەکەمان! وەڵامی بانگەوازکاری خوا بدەنەوەو بڕواشی پێبێنن، (**دَاعِيَ الله**) بانگەوازکاری خوا، دەگونجێ مەبەست پێی قورئان بێ، دەشگونجێ مەبەست پێی پێغەمبەر بێ، وەڵامی بدەنەوەو بڕوای پێ بێنن، بۆچی؟

١١)- ﴿ يَغْفِرْ لَكُم مِّن ذُنُوبِكُمْ ﴾، لە گوناهەکانتان دەتانبوورێ.

ئەگەر پیتی (**مِنْ**) زیاد کراو بێ بۆ جەختکردنەوە، واتە: لە هەموو گوناهەکانتان دەتانبوورێ، بەڵام ئەگەر (**مِن تَبْعِيضِيَّة**) بێ و بۆ هەندێک بێ، واتە: لە هەندێک لە گوناهەکانتان دەتانبوورێ، بەڵام ڕەنگە لە هەموو گوناهەکان تەنیا بە ئیمان هێنان نەبوردرێن، بەڵکو پێویستییان بە تەوبە کردن بێ، یاخود پێویستییان بە ڕەتکردنەوەی مافەکان بێ بۆ خاوەن مافەکان، بۆیە لە (**مِنْ**)ی خراوەتە سەر.

١٢)- ﴿ وَيُجِرۡكُم مِّنۡ عَذَابٍ أَلِيمٖ ﴾، پەناشتان دەداو دەتانپارێزێ لە ئازارێکی بە ئێش، کە مەبەست پێی ئازارو سزای دۆزخە، لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿ وَيُجِرۡكُم مِّنۡ عَذَابٍ أَلِيمٖ ﴾، ئەم (مِنْ)ەش، تەنیا بۆ ئەوەیە (يُجِرْكُمْ) بەرکاری پێ بخوازێ، بۆ (تَعْدِية)یە، دەگوترێ: (أَجَارَهُ مِنْ ظُلْمِ فُلان: مَنَعَهُ وَأَبْعَدَهُ)، واتە: پەنای داو، دووری خستەوە لەوەی فلانکەس ستەمی لێ بکات.

١٣)- ﴿ وَمَن لَّا يُجِبۡ دَاعِيَ ٱللَّهِ ﴾، هەر کەسێکیش وەڵامی بانگەوازکاری خوا نەداتەوە، ئەگەر قورئانە، ئەگەر موحەممەدە ﷺ کە هەردووکیان بۆ لای خوا خەڵکیان بانگ کردوە.

١٤)- ﴿ فَلَيۡسَ بِمُعۡجِزٖ فِي ٱلۡأَرۡضِ ﴾، دەستەوسانکەر نیە لە زەویدا، واتە: دەستەوسانکەری خوا نیە، کە لە سزاو جەزرەبەی دەرباز بێ و ڕابکات و، خوا دەستی پێڕانەگات، بۆیەش دەفەرموێ: (فِي الأَرْض) بۆ ئەوەی هەموو گۆشەو کەنارەکانی زەوی بگرێتەوە، بە هەر لایەکدا بچێ، دەستەوسانکەری خوا نیە و، لە چنگی خواو لە دەسەڵاتی قوتار نابێ.

١٥)- ﴿ وَلَيۡسَ لَهُۥ مِن دُونِهِۦٓ أَوۡلِيَآءُۚ ﴾، جگە لەویش هیچ دۆست و سەرپەرشتیاری نین، هیچ پشتیوان و مشوورخۆری نین.

١٦)- ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ فِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٍ ﴾، ئا ئەوانە لە گومڕاییەکی ئاشکرادان، واتە: نغرۆبوون لە گومڕایی دا.

لێرەدا (القرطبي) قسەیەک دەکات لە تەفسیرەکەی خۆیدا[1] دەڵێ:

(هَذِهِ الْآيَةُ تَدُلُّ عَلَى أَنَّ الْجِنَّ كَالْإِنْسِ فِي الْأَمْرِ وَالنَّهْيِ وَالثَّوَابِ وَالْعِقَابِ، وَقَالَ الْحَسَنُ: لَيْسَ لِمُؤْمِنِي الْجِنِّ ثَوَابٌ غَيْرَ نَجَاتِهِمْ مِنَ النَّارِ، يَدُلُّ عَلَيْهِ قَوْلُهُ تَعَالَى: ﴿ يَغۡفِرۡ لَكُم مِّن ذُنُوبِكُمۡ وَيُجِرۡكُم مِّنۡ عَذَابٍ أَلِيمٖ ﴿٣١﴾ ﴾، وَبِهِ قَالَ أَبُو حَنِيفَةَ قَالَ: لَيْسَ ثَوَابُ الْجِنِّ إِلَّا أَنْ يُجَارُوا مِنَ النَّارِ، ثُمَّ يُقَالُ لَهُمْ: كُونُوا تُرَاباً مِثْلَ الْبَهَائِمِ. وَقَالَ آخَرُونَ: إِنَّهُمْ كما يعاقبون فِي الْإِسَاءَةِ، يُجَازَوْنَ فِي الْإِحْسَانِ مِثْلَ الْإِنْسِ).

---

(١) الجَامِع لأحكَامِ القُرآن: ج٢٦، ص١٧٠.

واتـە: ئـەم ئایەتـە بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوە کـە جندیـش وەک مرۆڤـان، لـە فەرمـان پێکـران و قەدەغەکـران و پاداشـت و سـزادا، یەکسـانن.

بـەڵام حەسـەنی بەصڕایـی لێـی گێڕدراوەتـەوە کـە گوتوویـەتی: جنـد پاداشـتیان نیـە، ئـەوە نەبـێ کـە لـە ئاگـر چەپاڵـە دەدرێـن، چونکـە خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿يَغْفِرْ لَكُم مِّن ذُنُوبِكُمْ وَيُجِرْكُم مِّنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٣١﴾﴾ **الأحقاف**، لـە گوناهەکانتـان دەتانبـووریْ و لـە ئازارێکـی بـە ئێشـیش پەناتـان دەدات.

ئەبـوو حەنیفـەش هـەروای گوتـوەو گوتوویـەتی: جنـد (واتـە: جنـدە بـڕوادارەکان) پاداشـتیان نیـە، مەگـەر ئـەوە کـە لـە ئاگـر چەپاڵەبدرێـن و بپارێزرێـن، دوایـی پێیـان دەگوتـرێ: ببنـەوە گڵ و دەبنـەوە گڵ، وەک ئـاژەڵان.

بـەڵام ئەوانـەی دیکـە، گوتوویانـە: نەخێـر جندیـش وەک مرۆڤـان وەک چـۆن لەسـەر خراپـە سـزادەدرێن، لەسـەر چاکـەش پاداشـت دەدرێنـەوە.

منیش دەڵێم: بە دڵنیایی ڕای دووەمیان ڕاستە.

لێـرەش دا تەنیـا بەوەنـدە قسـە نەقڵکردنـەی **(القرطبـي)** لـەو بابەتـە دەگەڕێـم، چونکـە خـوا پشـتیوان بـێ، کاتێـک دەگەینـە تەفسـیری سـوورەتی **(الجـن)** لـەوێ قسـەی تێـرو تەسـەل لـەو بـارەوە دەکەیـن، هەروەهـا لـە تەفسـیری (الرحمن)یـش دا، کـە خـوای بـەرز سی و یـەک (٣١) جـار جنـدو مرۆڤـی بـە تەعبیـری: ﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ!﴾ دوانـدوون، کـە شـازدە (١٦) یـان لەبـارەی بەهەشـتەکانی خـواوەن کـە دەیانچنەتـێ!

مەسەلەی دووەم:

**دروستکردنی خوا بۆ گەردوون، بەبێ ماندوو و شەکەتبوونی، بەڵگەی تواناییەتی لەسەر زیندوو کردنەوەی مردووان:**

خوا دەفەرموێ: ﴿ أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّ اللَّهَ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَلَمْ يَعْيَ بِخَلْقِهِنَّ بِقَادِرٍ عَلَىٰ أَن يُحْيِيَ الْمَوْتَىٰ ۚ بَلَىٰ إِنَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴿٣٣﴾ ﴾.

شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە سێ بڕگەدا:

١)- ﴿ أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّ اللَّهَ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَلَمْ يَعْيَ بِخَلْقِهِنَّ ﴾، ئایا نەیانبینیوە، ئەو خوایەی ئاسمانەکان و زەوی هێناونە دی و، بە دروستکردنیشیانەوە ماندوو و شەکەت نەبووە.

بێگومان پرسیارکردنەکە بۆ نکووڵیلێکردنەوە، مەبەست لە (دیتن) زانیاری و، بینینی عەقڵیی و دڵییە، نەک بینینی چاو، بەڵام بۆیە خوا ﷻ وشەی (يَرَوْا) بەکاردێنێ و نافەرموێ: (أَوَلَمْ يَعْلَمُوا) لەبەر ئەوەی ئەو ڕاستییە هێندە بەرجەستەو نمایانە، وەک شتێک بە چاوی سەر تەماشای بکەی، ئاوا دیارە، هەم لێرەداو هەم لە شوێنەکانی دیکەش دا، کە خوا ﷻ لە جیاتی زانین (عِلْم)، دیتن (رُؤْيَة) بەکاردێنێ، لەبەر ئەوەیە کە ئەو شتە ئەوەندە بەرچاوەو ئەوەندە دیارو نمایانە، وەک شتێک کە بەچاوی سەر تەماشای دەکەی، ئاوا زەق و بەرچاوە، خوا ﷻ دەفەرموێ: ئایا نەیانزانیوە و نازانن کە ئەو خوایەی ئاسمانەکان و زەوی هێناونە دی و پێشیانەوە ماندوو نەبووە...

﴿ وَلَمْ يَعْيَ ﴾، خوێنراویشەتەوە: (وَلَمْ يَعِي)، (العَيُّ: التَّعْبُ وَعَجْزُ الحِيْلَةِ)، (عَيّ) بریتیەلە: ماندوو بوون و شەکەتیی و، پێبڕان و داماویی، خوا ﷻ لە بەرانبەر دروستکرانی ئاسمانەکان و زەویدا، نە پێیانەوە ماندوو بووەو، نە داماوە کە نەتوانێ دروستیان بکات، ئنجا خوایەک ئاوا بێ، ئایا نازانن:

٢)- ﴿بِقَٰدِرٍ عَلَىٰٓ أَن يُحۡـِۧيَ ٱلۡمَوۡتَىٰ﴾، كە توانادارە لەسەر ئەوەی مردووان بژێنێتەوە؟!، (بِقَادِرٍ): خوێندراویشەتەوە: (وَيَقْدِرُ عَلَى أَنْ يُحِيَ الْمَوْتَى)، دەتوانێ كە مردووانیش بژێنێتەوە.

٣)- ﴿بَلَىٰٓۚ إِنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ﴾، با، بە دڵنیایی ئەو لەسەر هەموو شتێک بە توانایە.

جێی سەرنج ئەوەیە كە خوا ﷻ بۆ ژیاندنەوەی مردووان، وشەی (قَادِر)ی بەكارهێناوە، بەڵام دوایی بۆ هەموو شتێک (كُلُّ شَئ) (قَدِيْر)ی بەكارهێناوە، واتە: (قَادِر عَلَى إحياء المَوْتَى، وَقَدِيْرُ عَلَى كُلِّ شَيء)، چونكە (قَادِر) واتە: تواندار، بەڵام (قَدِيْر)، ڕێژگەی زێدەڕۆییە واتە: زۆر تواندار، ئنجا زیندوو كردنەوەی مردووان بە نسبەت خوای پەروەردگارەوە، خوا لەسەری توانایە، بەڵام بۆیە دەفەرموێ: ﴿بَلَىٰٓۚ إِنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ﴾، با، ئەو لەسەر هەموو شتێک توانایە، دیارە هەموو شتێک بە قیاس و پێوانەی ئێمە، پێویستیی بە توانای زیاتر دەكات، چونكە هەموو شتێک، هەم زیندوو كردنەوەی مردووان دەگرێتەوە، هەم جگە لە ئەوەش دەگرێتەوە، بۆیە بۆ هی یەكەم سیفەتی (قَادِر)ی بەكارهێناوە، بەڵام بۆ هی دووەمیان (قَدِيْر)ی بەكارهێناوە.

وشەی (بَلَى) وەڵامی لابردن (نفـي)ی یەكەمە: ﴿أَوَلَمۡ يَرَوۡاْ أَنَّ ٱللَّهَ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ وَلَمۡ يَعۡيَ بِخَلۡقِهِنَّ بِقَٰدِرٍ عَلَىٰٓ أَن يُحۡـِۧيَ ٱلۡمَوۡتَىٰ﴾؟، ئایا نازانن كە خوا بە توانایە؟ لە كوردییدا (بَلَى) دەبێتەوە: با، ئەگەر بگوترێ: بەڵێ، یانی: بەڵێ بە توانا نیە، كە لە هەندێک لە تەفسیرە كوردییەكاندا ئەو جۆرە هەڵانە كراون، بەڵام (نَعم) یانی: بەڵێ، ئنجا تۆ لە جێی بەڵێ، بڵێی: با، یان لە جێی با، بڵێی: بەڵێ، مانایەكەی پێچەوانە دەبێتەوە، بۆ وێنە: ئەگەر بگوترێ: ئایا ئەو خواردنەت پێ خۆش نیە؟ ئەگەر بڵێی: بەڵێ، واتە: پێم خۆش نیە، بەڵام ئەگەر بڵێی: با، واتە: پێم خۆشە، (بَلَى) با، وەڵامی شتێكی لابراوە.

(يَعي) لە (عَيَ) لەسەر كێشی (رَضِيَ) و (عَيَّ)، (عَيَ بِالأَمْرِ وَعَيَّ، وَتَعَايَا، وَاسْتَعيَا، وَتعَيَّا)، واتە: چ بڵێی: (عَيَّ) چ بڵێی: (عَيَ) بەبێ گیرە، چ بڵێی (تَعَايَا)، چ بڵێی

(**اسْـتَعِيَا**)، چ بڵێیـی: (**تَعَيّـا**)، هەموویـان بـە مانـای: (نەیتـوانی ئامانـج بێنێـته دی)، یاخـود (لـە بەرانبەریـدا دەسـتە پاچـە بـوو)، یاخـود (نەیتـوانی پتـەوو قایمـی بـکات) دێـن.

## مەسەلەی سێیەم:

**ئەو ڕۆژە کە بێبڕوایان لەسەر ئاگر ڕادەنوێنرێن و پرسیاریان لێ دەکرێ، لە بارەی ڕاستیی سزای خواوەو، جگە لە دان پێداهێنان چارەیەکی دیکەیان نیە:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَيَوْمَ يُعْرَضُ الَّذِينَ كَفَرُوا عَلَى النَّارِ أَلَيْسَ هَٰذَا بِالْحَقِّ قَالُوا بَلَىٰ وَرَبِّنَا قَالَ فَذُوقُوا الْعَذَابَ بِمَا كُنتُمْ تَكْفُرُونَ ﴿٣٤﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە چوار بڕگەدا:

١)- ﴿ وَيَوْمَ يُعْرَضُ الَّذِينَ كَفَرُوا عَلَى النَّارِ ﴾، ئەو ڕۆژەی ئەوانە بێبڕوابوون لەسەر ئاگر ڕادەنوێنرێن، واتە، دەیانهێنینە سوێی ئاگری دۆزەخ و پێشانیان دەدەین، هەندێک لە ڕوونکەرەوان گوتوویانە: (**هَذَا مِنَ المَقْلُوب**)، واتە: ئاگرەکە پێشانی ئەوان دەدەین، ئاگرەکە بۆ وان ڕادەنوێنین، بەڵام دەشگونجێ ئەوانیش ڕابنوێنرێن و بهێنرێنە سوێی ئاگرەکە، (**عَرْض**) بە مانای ڕانواندن و پێشاندانە، (**مَعْرِض**) ئەو شوێنەیە کە شتی لێ ڕادەنوێنرێن، بە کوردیی دەگوترێ: پێشانگا ئەو شوێنەی خەڵک شتی لێ پێشان دەدات.

٢)- ﴿ أَلَيْسَ هَٰذَا بِالْحَقِّ ﴾، {ئەو ڕۆژەی ئەوانەی بێبڕوابوون لەسەر ئاگر ڕادەنوێنرێن و، ئاگری دۆزەخیان پێشان دەدرێ:}، ئایا ئەمە هەق نیە؟ بێگومان ئەوە گوتراوی بێژەرێکی قرتێنراوە، ئنجا بێژەرێکە خوای بەرزە، یاخود فریشتەکانن، دەڵێ: ئایا ئەمە ڕاست و چەسپاو نیە؟ پرسیارکردنەکەش پرسیارکردنی چەسپاندن و پەشێمانکردنەوەیە، لەسەر ئەوەی دەیانگوت و پێیان وابوو: سزاو پاداشت پووچەو حەقیقەتیان نیە، دەگوترێ: ئایا ئەمە ڕاست و چەسپاو نیە؟ ئەمە پرسیارکردنی نکووڵیلێکردن نیە، بەڵکو بۆ چەسپاندنەو بۆ پەشێمانکردنەوەیە، چونکە کە دەفەرموێ: ﴿ أَلَيْسَ هَٰذَا بِالْحَقِّ ﴾، ئەم (**هَذَا**)یە، ناوی ئاماژەیەو، ئاماژەیە بۆ ئەوەی دەیبینن لە ئازارو سزا، بۆیە ئەمە دەبێتە جۆرێک لە سەرزەنشت و گاڵتەپێکردن: ئایا ئەوە ڕاست و هەق نیە، کە لە پێش چاوتانە؟!.

٣)- ﴿قَالُواْ بَلَىٰ وَرَبِّنَا﴾، گوتیان: با، (هەق و ڕاستە)، سوێند بە پەروەردگارمان، هەر بەوەندەی ئیکتیفا ناکەن، دانی پێدابێنن و، دەڵێن: سوێند بە پەروەردگارمان ڕاستە، توێژەرەوانی قوڕئان باسیان کردوە، بۆچی وەڵامەکەیان بە سوێند خواردن، داکۆکیی لەسەر کردوەو جەختکردۆتەوە؟ هەندێکیان گوتوویانە: بۆیە وەڵامدانەوەکەیان بە سوێند جەخت لەسەر کردۆتەوە، ئومێدیان وابووە کە ئەگەر چاکی دان پێدابێنن، بەڵکو دەربازیان ببێ! بەڵام مسۆگەر خەیاڵ پڵاویان کردوە.

٤)- ﴿قَالَ فَذُوقُواْ ٱلْعَذَابَ بِمَا كُنتُمْ تَكْفُرُونَ﴾، فەرمووی: (ئەو بێژەرە کە ئەو پرسیارەی لێکردن، کە یان خوای بەرزی مەزنە، یاخود یەکێک لە فریشتەکانە)، ئازار بچێژن بە هۆی ئەوەوە کە بێبڕوابوون، (**فَذُوقُوا: قُرِّعَ عَلَى إِقْرَارِهِمْ**)، واتە: مادام دانتان پێداهێنا، دە ئازار بچێژن، بە هۆی ئەوەوە کە بێبڕوابوون.

## مەسەلەی چوارەم و کۆتایی:

**فەرمانکردنی خـوا ﷻ بـە پێغەمبـەر موحەممـەد ﷺ کـە وەک پێغەمبـەرانی لێبـڕاو (عَلَيْهِـمُ الصَّـلاةُ وَالسَّـلام) خـاوەن ویسـت و بڕیـاری پتـەوو خۆڕاگـر بـێ و، هەڵپـەو پەلـەی هاتنـی سـزا بـۆ بێبڕوایـان نـەکات، چونکـە ڕۆژی هاتنـی سـزا، بێبڕوایـان پێیـان وایـە، بـەس کاتێکـی کـەم لـە ژیـانی دنیـادا ماونـەوەو، جگـە لەلادەرانیـش کـەس سـەری بـە فەتـارەت ناچـێ، تەنیـا ئەوانـە لـە ڕێـی ڕاسـت لا دەدەن، سـەر بەفەتـارەت چـوو دەبـن:**

خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ فَاصْبِرْ كَمَا صَبَرَ أُوْلُواْ الْعَزْمِ مِنَ الرُّسُلِ وَلَا تَسْتَعْجِل لَّهُمْ كَأَنَّهُمْ يَوْمَ يَرَوْنَ مَا يُوعَدُونَ لَمْ يَلْبَثُواْ إِلَّا سَاعَةً مِّن نَّهَارٍ بَلَٰغٌ فَهَلْ يُهْلَكُ إِلَّا الْقَوْمُ الْفَٰسِقُونَ ﴿٣٥﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە بە پێزە، لە پێنج بڕگەدا:

١)- ﴿ فَاصْبِرْ كَمَا صَبَرَ أُوْلُواْ الْعَزْمِ مِنَ الرُّسُلِ ﴾، دەجا خۆڕاگربە وەک خاوەن عەزمان لە پێغەمبەران خۆیان ڕاگرت، بێگومان پیتی (ف)، کە بۆ گێڕانەوەو بادانەوەیە، پەیوەستیشە بە چەند ڕستەیەک لە پێش خۆیەوە، واتە: مادام حاڵ بەو شێوەیە بێ، کە ڕابرد، ئەوانە لەسەر عینادیی و سەرخەریی خۆیان بەردەوام بن و، هەر لەسەر بێبڕوایی خۆیان بن، کەواتە: خۆڕاگر بە وەک چۆن خاوەن عەزمان لە پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام) خۆڕاگر بوون.

(العَـزْمُ: نِيَـةٌ مُحَقَقَـةٌ عَـلَى عَمَـلٍ أَو قَـوْلٍ دُون تَـرَدُّدٍ)، (عَـزْم): بریتیـە لـە نیـازو مەبەسـتێکی سـاغکراوە بـۆ ئەنجامـدانی کارێـک، یاخـود قسـەیەک بەبـێ لەرەلـەرو دڵ دڵ دان، واتـە: دڵـی خـۆ سـاغکردنەوە لەسـەر ئەنجامـدانی کارێـک، کەواتـە: لێـرەدا خـوا ﷻ بـە پێغەمبـەری خاتـەم ﷺ دەفەرمـوێ: وەک ئـەو پێغەمبەرانـەی خـاوەنی

لێبـڕان بـوون بـۆ کارەکەیـان و، لـە کاتی ئەنجامـدانی ئەرکەکانیانـدا لێبـڕاو بـوون، خاوەنی بڕیـاری پتـەو بـوون، خـاوەن ویسـت و ئیـرادەی مەحکـەم بـوون، تـۆش وەک ئـەوان خۆڕاگربـە.

٢)- ﴿وَلَا تَسْتَعْجِل لَّهُمْ﴾، پەلە (ی هاتنی سزا)شیان بۆ مەکە.

(ل)ی (لَهُـم) لـە: ﴿وَلَا تَسْتَعْجِل لَّهُمْ﴾دا، (**لَامُ تُعَدِيَـةِ فِعْـلِ فِي الإسـتِعْجَال إلى مَفْعُـولِ لأَجْلِـه**)، لامـی خواسـتنی کـرداری (**تسـتعجل**)ە بـۆ بـەرکاری پێنـاو.

ئنجـا کـوا ئـەو بـەرکارە؟ (**مَفْعُـولُ تَسْـتَعْجِل مَحْـذُوفٌ دَلَّ عَلَيْـهِ المَقَـامُ: العَـذَابُ، أو الهَـلَاكَ، فَلَا تَسْـتَعْجِلِ العَـذَابَ، أو الهَـلَاكَ لَهُـمْ**)، بـەرکاری (**تسـتعجل**) قرتێـنراوە، حـاڵ و مەقـام دەیگەیەنـێ: ئـازار یاخـود فەوتانیـان بـۆ بـە پەلـە داوامەکـە، پەلـە مەکـە سـزاو ئازاریـان بـۆ بـێ، لەبەرچـی؟

٣)- ﴿كَأَنَّهُمْ يَوْمَ يَرَوْنَ مَا يُوعَدُونَ لَمْ يَلْبَثُوٓاْ إِلَّا سَاعَةً مِّن نَّهَارٍ﴾، {ئەمە هۆکار هێنانەوەیە بۆ ئەو قەدەغەکردنەی پێغەمبەر ﷺ لە پەلەکردنی هاتنی سزا بۆیان}، چونکە ئەو ڕۆژە ئەوەی بەڵێنی پێ دەدرێ و هەڕەشەیان پێ لێ دەکرێ دەیبینن، وەک ئەوە وایە، تەنیا کاتێکی کەم لە ڕۆژێ مابنەوە، واتە: کە ماوەیەک هاتنی ئەو سزایە، دوادەخرێ، کاریگەریی لەسەری نابێ و، هەر کات ئەو سزاو ئازارە هات، لە کاتێکدا دەبێ هێندە درێژ دەبێ کە ژیانی دنیایان هەمووی، وەک کاتێکی کەم لە ڕۆژێک، دێتە بەرچاو.

یـانی: ئـەو سـزاو ئازارەیـان کـە بـۆ دێ، لـە مـاوەو کاتێکـی هێنـدە درێژخایەنـدا دەبـێ، ژیـانی دنیایـان هەمـووی لـەلا دەبێتـەوە کاتێکـی کـەم لـە ڕۆژێـک، واتـە: کاتێکـی کـەم لـە ڕۆژێـک چەنـدە؟ ئەوانیـش هەمـوو تەمـەنی ژیـانی دنیایـان لـەلا ئەوەنـدە لـێ دێتـەوە، لـە چـاو ئـەو کاتـە زۆرەی تێیـدا سـزا دەدرێـن.

٤)- ﴿بَلَٰغٌ﴾، (ئەمە) گەیاندنە.

(**بَلَاغ: خَبَرُ مُبْتَدَأ مَحْذُوفٍ، أي: هَذَا بَلَاغ**)، (بلاغ) گوزارەی نیهادێکی قرتێنراوە، واتە: ئەمە گەیاندنە، یاخود (بَلَاغ) بە مانای تێرو تەواوو بەسە، یانی: ئەوەی گوترا، بەس و تێرو تەواوە بۆ هەر کەس عەوداڵی هەق و ڕاستییە.

٥)- ﴿فَهَلْ يُهْلَكُ إِلَّا ٱلْقَوْمُ ٱلْفَٰسِقُونَ ﴾، ئایا جگە لە کۆمەڵی لادەران کەسی دیکە دەفەوتێ؟ لێرەدا پرسیارکردنەکە، پرسیارکردنە بۆ لابردن (**نفي**)، واتە: جگە لە کۆمەڵی لادەران کەس نافەوتێ، بەڵام بە شێوەی پرسیارکردن هاتوە، ئایا جگە لەوان کێ دەفەوتێ؟ واتە: کەس نافەوتێ.

(**الفَاسِقُون**) دەگونجێ (أل)ی ناساندنەکە بۆ جینس بێ، واتە: تێکڕای لادەران دەفەوتێن، یاخود بۆ (عهد) بێ، واتە: ئەو لادەرانەی مەبەستن و قسەیان لە بارەوە دەکرێ، ئەوانە دەفەوتێن و سەریان بە فەتارەت دەچێ، بە دڵنیایی (**فَاسِق**) لێرەدا بە مانای دەرچوونی تەواوەتییە لە حوکمی زگماک و، لە حوکمی عەقڵ، لە حوکمی ئایین و بەرنامەو پەیامی خوا ﷻ.

## قسەیەک دەربارەی: (أُوْلُواْ ٱلْعَزْمِ)

لە کۆتایی ئەم دەرسەمانداو، لە کۆتایی تەفسیری ئەم سوورەتەشدا، ئەوەی بەڵێنماندا بوو قسەیەکی لە بارەوە بکەینەوە، بەڵێنەکەمان بە جێ دێنین، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ فَٱصۡبِرۡ كَمَا صَبَرَ أُوْلُواْ ٱلۡعَزۡمِ مِنَ ٱلرُّسُلِ وَلَا تَسۡتَعۡجِل لَّهُمۡۚ كَأَنَّهُمۡ يَوۡمَ يَرَوۡنَ مَا يُوعَدُونَ لَمۡ يَلۡبَثُوٓاْ إِلَّا سَاعَةٗ مِّن نَّهَارِۭۚ بَلَٰغٞۚ فَهَلۡ يُهۡلَكُ إِلَّا ٱلۡقَوۡمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ ٣٥ ﴾، واتە: خۆڕاگر بە وەک چۆن خاوەن عەزمان لە پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام) خۆڕاگر بوون...

ڕوونکەرەوانی قورئان ڕەحمەتی خوایان لێ بێ و خوا پاداشتیان بداتەوە، ئێمە لێیان بەهرەمەندین، بەڵام پێم ناخۆشە هەندێک شت کە پێم وایە زۆر ڕوونەو ئەوان یان ڕاجیایی تێدا دەکەن، بۆ وێنە: لێرەدا ئەگەر نەڵێم هەموویان، زۆربەی هەرە زۆریان دەڵێن: ﴿ أُوْلُواْ ٱلۡعَزۡمِ مِنَ ٱلرُّسُلِ ﴾، مەبەست پێیان چوار لە پێغەمبەرانە (عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام): (نووح و ئیبراهیم و مووسا و عیسا)، واتە: وەک ئەو چوارە، تۆش خۆڕاگر بە، هەروەها هەندێکیان دەڵێن: مەبەست حەوتیانە، یاخود پازدەیانە، یاخود هەژدەیانە، ئەوەش بە بەڵگە دێننەوە، لەسەر ئەوەی ئەو پێنجە خاوەن عەزمن، لەبەر ئەوەی هەم لە سوورەتی **(الشورى)** دا، خوای بەرز باسیان دەکات و دەفەرموێ: ﴿ شَرَعَ لَكُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا وَصَّىٰ بِهِۦ نُوحٗا وَٱلَّذِيٓ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ وَمَا وَصَّيۡنَا بِهِۦٓ إِبۡرَٰهِيمَ وَمُوسَىٰ وَعِيسَىٰٓۖ أَنۡ أَقِيمُواْ ٱلدِّينَ وَلَا تَتَفَرَّقُواْ فِيهِۚ ١٣ ﴾.

هەروەها لە سوورەتی **(الأحزاب)**یشدا، ئەو پێنجە پێکەوە هاتوون، خوا دەفەرموێ: ﴿ وَإِذۡ أَخَذۡنَا مِنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ مِيثَٰقَهُمۡ وَمِنكَ وَمِن نُّوحٖ وَإِبۡرَٰهِيمَ وَمُوسَىٰ وَعِيسَى ٱبۡنِ مَرۡيَمَۖ وَأَخَذۡنَا مِنۡهُم مِّيثَٰقًا غَلِيظٗا ٧ ﴾.

بـەڵام مـن پێـم وایـە -- وەک لـە کتێبـی شەشـەمی مەوسـووعەی: (**الإسـلام كـما يتجـلى في كتـاب اللـه**)، لـە بـاسی پێغەمبەرانـدا (**عَلَيْهِـمُ الصَّـلاةُ وَالسَّـلام**) باسـمکردوە -- ئـەو بۆچوونـە هەڵەیـە کـە بگوتـرێ: پێنـج لـە پێغەمبـەران (**عَلَيْهِمُ الصَّلاةُ وَالسَّلام**) یـان حەوتیـان، یـان هەژدەیـان، یـان چەندیـان خـاوەن عـەزم بـوون و، ئەوانـەی دیکـە خـاوەن عـەزم نەبـوون، چونکـە لێـرەدا کـە خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ فَٱصْبِرْ كَمَا صَبَرَ أُوْلُواْ ٱلْعَزْمِ مِنَ ٱلرُّسُلِ ﴿٣٥﴾ ﴾**الأحقـاف**، ئـەم (**مِـنْ**)ە، وەک چـۆن دەگونجـێ بـۆ هەندێـک (**تَبْغِيْـض**) بـێ، دەشـگونجێ بـۆ ڕوونکردنـەوە (**بيانيـة**) بـێ، واتـە: خۆڕاگـر بـە، وەک چـۆن پێغەمبـەرانی خـاوەن عـەزم (**عَلَيْهِـمُ الصَّـلاةُ وَالسَّـلام**) کـە هەموویـان خـاوەن عـەزم و لێبـڕان و دامەزراویـی بـوون، وەک چـۆن ئـەوان هەموویـان وابـوون، تـۆش وەک وان بـە.

بەڵگەشـم ئەوەیـە کـە لـە سـوورەتی (**الأنعـام**)دا، خـوا ﷻ نـاوی هـەژدە (١٨) لـە پێغەمبـەران (**عَلَيْهِـمُ الصَّـلاةُ وَالسَّـلام**) دێنـێ، بـە پێـی ڕیزبەندیـی ئایەتـەکان کـە باسـکراون، ئەمانـەن: (ئیبراهیـم، ئیسـحاق، یەعقـووب، نـووح، داوود، سـولەیمان، ئەیـووب، یوسـوف، مووسـا، هـاڕوون، زەکەریـا، یەحیـا، عیسـا، ئیلیـاس، ئیسـماعیل، ئەلیەسـەع، یونـووس، لـووط)، دوای ئـەوەی خـوا ﷻ نـاوی ئـەو هـەژدە پێغەمبـەرە (**عَلَيْهِـمُ الصَّـلاةُ وَالسَّـلام**) دێنـێ، دەفەرمـوێ: ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَى ٱللَّهُۖ فَبِهُدَىٰهُمُ ٱقْتَدِهْ ﴿٩٠﴾ ﴾**الأنعـام**، ئـا ئەوانـە کەسانێکن خـوا خسـتوونیە سـەر ڕێـی ڕاسـت، تـۆش بـە دوای ڕێـی ڕاسـتی ئـەوان بکـەوەو، بیانکـە بەسـەر مەشـق.

لێـرەدا خـوا ﷻ بـاسی ئـەو هەمـوو پێغەمبەرانـە (**عَلَيْهِمُ الصَّـلاةُ وَالسَّـلام**)، دەکات، کـە لـە نێویشـیاندا یونـوس عليه السلام هەیـە، ئـەو یونوسـەی خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ وَلَا تَكُن كَصَاحِبِ ٱلْحُوتِ ﴿٤٨﴾ ﴾**القلـم**، چونکـە هەندێـک لـە زانایـان ئەوەیـان بـە بەڵگـە هێناوەتـەوەو گوتوویانـە: خـوا ﷻ لـە سـوورەتی (**القلـم**)دا، دەفەرمـوێ: وەک خـاوەنی ماسـییەکە مەبـە! بـەڵام لێـرەدا خـوای کاربەجـێ یونوسـیش نـاو دێنـێ و دەفەرمـوێ: ئـەی پێغەمبـەر! ﷺ تـۆ بـە دوایـی ڕێ و شـوێنی ئـەوان بکـەوە.

کەواتـە: لـەوێ کـە دەفەرمـوێ: ﴿وَلَا تَكُن كَصَاحِبِ ٱلْحُوتِ﴾، یـانی: لـەو هەڵوێسـتە دیارییکـراوەی دا، وەک یونـوس مەبـە، نـەک بـە گشـتیی، ئەگەرنـا بـە گشـتیی دەبـێ چاوی لـێ بـکات، لـە نێـو هەمـوو پێغەمبـەران دا (عَلَيْهِـمُ الصَّـلاةُ وَالسَّـلام).

هەروەهـا لـە بـارەی ئادەمـەوە کـە خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿فَنَسِيَ وَلَمْ نَجِدْ لَهُۥ عَزْمًا ١١٥﴾ طـه، ئـادەم لـە بیـری چـوو، عەزمـمان پێـوە نەبینـی، واتـە: لـەو هەڵوێسـتە دیارییکـراوەی دا عەزمـمان پێـوە نەبینـی، نـەک بەگشـتیی خـاوەن عـەزم نەبـوو بـێ.

کەواتــە: لــە ڕاســتییدا هەمــوو پێغەمبــەران (عَلَيْهِـمُ الصَّـلاةُ وَالسَّـلام)، خــاوەن عەزمــن، بــەڵام بــە تەئکیــد هەندێکیــان عەزیمــەت و لێبڕاوییــان لــە هەندێکیــان زیاتـر بـووە، پێغەمبـەران (عَلَيْهِـمُ الصَّـلاةُ وَالسَّـلام)، هەموویـان لـە لووتکـەدان لـە هەمــوو شــتێکدا، بــەڵام لووتکەکانیــش بــەرزو بەرزتریــان هەیــەو، پێغەمبەرانیــش (عَلَيْهِـمُ الصَّـلاةُ وَالسَّـلام) هەموویـان لـە کـۆی مرۆڤایەتیـی تەواوتـرن و هەڵبژێـردراوی نێــو مرۆڤایەتییــن، بــەڵام ئەوانیــش لــە نێــو خۆیانــدا چــاک و چاکــترو بــەرزو بەرزتریــان هەیــە، وەک خــوا ﷻ دەفەرمــوێ: ﴿قُلِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ وَسَلَٰمٌ عَلَىٰ عِبَادِهِ ٱلَّذِينَ ٱصْطَفَىٰٓ ٥٩﴾ النمـل، واتـە: بڵـێ: سـتاییش بـۆ خـواو، سـەلام لەسـەر ئـەو بەندانـەی هەڵیبــژاردوون، یــانی: هەمــوو پێغەمبــەران (عَلَيْهِـمُ الصَّـلاةُ وَالسَّـلام) هەڵبــژاردەن.

هەروەهــا لــە ســوورەتی (الحــج)دا، خــوا ﷻ دەفەرمــوێ: ﴿ٱللَّهُ يَصْطَفِى مِنَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ رُسُلًا وَمِنَ ٱلنَّاسِ ٧٥﴾، واتـە: خـوا لـە فریشـتەکان و لـە مرۆڤانیـش، پێغەمبـەران (عَلَيْهِـمُ الصَّـلاةُ وَالسَّـلام) هەڵدەبژێـرێ، بەڵێ هەمـوو پێغەمبـەران (عَلَيْهِـمُ الصَّـلاةُ وَالسَّـلام) هەڵبـژاردەن، کەواتـە: دەبـێ هەمووشـیان ڕازاوەبـن، بـە هەمـوو سـیفەتە بـەرزەکان، لـە نێویانـدا سـیفەتی عەزیمـەت و دامەزراویـی و لێبڕاویـی و بـڕوا پتەویـی، کـە بەبـێ ئـەوە مـرۆڤ هیـچ کارێکـی بـۆ ناکـرێ.

لێرەشـدا دێینـە کۆتایـی سـوورەتی (الأحقـاف)، خـوا بـە لوتـف و کەرەمـی خـۆی یارمەتییـمان بـدات، کـە لـە فەرمایشـتەکەی زیاتـر ڕامێنیـن و وردبینـەوەو، باشـتر لێـی

تێبگەین، دوای لێ تێگەیشتنیش باشتر بە هۆیەوە پێ بگەین و، پێوەی پابەند بین، لە ژیانی تاکیی و، ژیانی خێزانیی و، ژیانی کۆمەڵایەتیی و سیاسیی داو، ئەم قورئانە بکەینە چرایەک وڵاتی خۆمانی پێ ڕۆشن بکەینەوەو، کارێک بکەین، ئەم خەڵک و وڵاتەی ئێمە و، هەر شوێنێک دەستمان دەیگاتێ، لە نوورو بەرەکەتی ئەم قورئانە، زیاتر بەهرەمەندی بکەین، بۆ ئەوەی کۆتایی بە نەهامەتییەکانیان بێ، کۆتایی بە هەموو ئەو نەخۆشیی و دەردانەیان بێ، کە لەسەر ئاستی تاکیی و خێزانیی و کۆمەڵایەتیی و سیاسیی، بە دەستیانەوە گرفتارو گیرۆدەن، وەك ژیانی دنیایان و، سەرەنجامیش لە بەرەکەت و بەرهەمی ئەوەدا: بەختەوەریی و سەرفرازیی ڕۆژی دوایی لە بەهەشتە ڕازاوە و نەبڕاوەکانی خوادا وەدەست بهێنن.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## دەستپێک

بەڕێـــــزان!

ئەمـڕۆ کـە (١٢/ی **جـمادي الثـاني**) سـاڵی (١٤٤١) کۆچییـە، بەرانبـەر (٢٠٢٠/٢/٦) ی زایینـی، لـە شـاری هەولێـر، خـوا پشـتیوان بـێ دەسـت دەکەیـن بـە تەفسـیرکردنی سـوورەتی (**محمـد**).

## پێناسەی سوورەتی (محمد) و بابەتەکانی

### یەکەم: ناوی ئەم سوورەتە:

ئەم سوورەتە، سێ ناوی بۆ بەکارهێنراون:

١- (**سورة محمد**). ٢- (**سورة القتال**). ٣- (**سورة الذين كفروا**).

بـەڵام نـاوی یەکەمیـان (**سـورةُ مُحَمَّـد**) لـە هەرسـێکیان باوتـرە، چونکـە نـاوی موحەممـەدی ﷺ تێـدا هاتـوە، لـە ئایەتـی ژمـارە (٢)داو، پێـش سـوورەتی (**آل عمـران**) و، پێـی نـاسراوە، واش پێدەچـێ کـە ئـەم سـوورەتە پێـش سـوورەتی (**آل عمـران**)، دابەزیبـێ، کـە سـوورەتی (**آل عمـران**) وەک کاتـی خـۆی باسـمان کـرد، لـە سـاڵی سـێیەمی کۆچییـدا، لـە دوای جەنگـی ئوحـود دابەزیـوە.

### دووەم: شوێنی دابەزینی:

بـە یەکدەنگیـی زانایـان، ئـەم سـوورەتە مەدینەییـە، بـەڵام لـە عەبدوڵـڵای کـوڕی عەبباسـەوە (**رضي اللـه عنهـما**) گێڕدراوەتـەوە کـە ئایەتـی: ﴿ وَكَأَيِّن مِّن قَرْيَةٍ هِيَ أَشَدُّ

﴿ قُوَّةً مِّن قَرْيَتِكَ ٱلَّتِيٓ أَخْرَجَتْكَ أَهْلَكْنَٰهُمْ فَلَا نَاصِرَ لَهُمْ ﴿١٣﴾ ﴾، لە ڕێی کۆچکردن بەرەو مەککە، بەر لە گەیشتن بە (حِراء) دابەزیوە.

گوتراویشە: ئەم سوورەتە دوای جەنگی بەدر دابەزیوە، هەروەها گوتراوە: پێش جەنگی ئوحوود، کەواتە: واپێدەچێ لە نێوان ساڵانی دووەم و سێیەمی کۆچیی دا دابەزیبێ.

## سێیەم: ڕیزبەندیی لە موصحەف و دابەزین دا:

لە دابەزینـدا، ڕیزبەندیی ئەم سوورەتە ژمارە (٩٦)، واتە: (٩٥) سوورەت لە پێش ئەم سوورەتەدا دابەزیون و، ئەمە نەوەدو شەشەمیان (٩٦)ەو، لە موصحەفدا (٤٧)ەو، لە پێش سوورەتی (**الرعد**)و، دوای سوورەتی (**الحديد**) دابەزیوە.

## چوارەم: ژمارەی ئایەتەکانی:

هەندێک لە زانایان ژمارەی ئایەتەکانییان بە چل (٤٠)و، زۆربەشیان بە سی و نۆ (٣٩) داناوە، هەندێکیشیان بە سی و هەشت (٣٨) دایاننـاون، بەڵام زیاتر ژمارە (٣٨) تەبەننیی کراوە، شایانی گوتنیشە: جاری وایە ژمارەیەک زۆرێک لە زانایان دایانناوە، وەک ژمارەی ئایەتەکانی سوورەتێک لە سوورەتەکان، بەڵام دوایی ژمارەیەکی دیکە کە کەمتر لە زانایان ڕایان لەسەری بووەو، تەبەننیی کراوە، گرنگ ئەوەیە هەمیشە لە بیرمان بێ، کە جیاوازیی ڕای زانایان لە ژمارەی ئایەتەکاندا، دەگەڕێتەوە بۆ کورتیی و درێژیی ئایەتەکان، ئایا ڕستەیەک لە کوێ کۆتایی پێ دێ و، لە کوێ دەست پێدەکات؟ ئەگەرنا زانایان نەک لەسەر ئایەتێک، بەڵکو لەسەر ڕستەیەک، بگرە لەسەر وشەیەک، بەڵکو لەسەر پیتێکی قورئانیش ڕاجیاییان نیە، مەگەر ڕاجیایی خوێندنەوە، ئەوە جیایە، کە خوێندنەوەکان (**قراءات**)یش هەموویان لە پێغەمبەری کۆتاییەوە ﷺ گێردراونەوە.

کەواتــە: ئەگــەر خوێندنەوەیــەک پیتێــک دەگــۆڕێ بــە پیتێــک، یــان ڕســتەی وا هەیــە، یــان وشــەی وا هەیــە، چەنــد جــۆرە خوێندنەوەیەکــی هــەن و، بــە پێــی جــۆری خوێندنــەوەکان، پیتــەکان دەگۆڕێــن، بــۆ وێنــە: ئەلیــف نامێنــی، یــان (ي) لــە کۆتاییــدا دەقرتێنــدرێ و، لــە شــوێنی وی ژێــر (**كسرة**) دادەنــرێ، ئــەوە هەمــووی لــە پێغەمبــەرەوە ﷺ گێڕدراوەتــەوەو، زانایــان لەســەر هەمــوو ئەوانــە یەکدەنگــن، مــادام ئــەو خوێندنەوەیــە، بــە تەواتــور بــە ئێمــە گەیشــتبێ.

## پێنجەم: نێوەڕۆکی:

نێوەڕۆکــی هەمــان نێوەڕۆکــی ســوورەتە مەدینەییەکانــە، پانتاییەکــی زۆری بــۆ باســی جەنــگ و، بەرەنگاریــی و، کوشــتار لــە نێــوان ئەهلــی کوفــرو ئەهلــی ئیســلامدا، تەرخانکــراوەو، بــەو بۆنەیەشــەوە باســی چەنــد مەســەلەیەکی پەیوەندییــدار کــراوە لــەم ســوورەتەدا، کــە دەتوانیــن دابەشــیان بکەیــن بــۆ پــازدە (١٥) مەســەلە:

١- لە ڕێ لادانی کافران و شوێنکەوتنیان بۆ باتیڵ، لە ئایەتەکانی (١ و ٢)دا.

٢- بڕواهێنانی مسوڵمانان و کرداری باشیان و، شوێنکەوتنیان بۆ هەق، لە ئایەتی (٢)دا.

٣- لە مل دانی کافران لە کاتی بەرەنگاریی و جەنگدا، لە ئایەتی (٤)دا.

٤- بە دیل گرتنی کافران، پاش کوشتاری خەست لێکردنیان و لە پەل و پۆخستنیان، لە ئایەتی (٤)دا.

٥- بە منەت یان قەرەبوو ئازادکردنی دیلەکانی کافران، کە لە جەنگدا دەگیرێن، لە ئایەتی (٤)دا.

٦- فەرمانکردنی ناڕاستەوخۆ بە کافران، کە سەرنجی مێژوو بدەن و، پەند لە گەلە کافرە فەوتاوەکان وەربگرن، لە ئایەتی (١٠)دا.

**٧-** ئاماژە بە وەدەرنانی کافران بۆ پێغەمبەر ﷺ لە شاری مەککەو، تۆڵە لێکردنەوەیان، لە ئایەتی (١٣)دا.

**٨-** وەسفی بەهەشتی بڕواداران و، ئاماژەیەک بە سزای کافران، لە ئایەتی (١٥)دا.

**٩-** باسی چەند هەڵوێستێکی دەغەڵ و دڵنەخۆشەکان، لە بەرانبەر پێغەمبەری خوا ﷺو قوڕئان و جەنگ و جیهاددا، لە ئایەتەکانی (١٦ - ٢٤)و ئایەتەکانی (٢٩ و ٣٠)دا.

**١٠-** ئاماژەیەک بە هەڵگەڕاوەکان، لە ئایەتەکانی (٢٥ - ٢٨)دا.

**١١-** ڕاگەیاندنی حەتمیی بوونی تاقیکردنەوەی بڕواداران، لە ئایەتی (٣١)دا.

**١٢-** ڕاگەیاندنی بێئاکامیی کاری بێبڕوایانی ناحەزو دوژمنکار، لە ئایەتەکانی (٣٢ و ٣٤)دا.

**١٣-** ئامۆژگاریی کردنی بڕواداران، کە بێهێزو پێز نەبن لە ڕووی کافراندا، لە ئایەتی (٣٥)دا.

**١٤-** خستنەڕووی کەم بایەخیی ژیانی دنیای ماددیی، بە مەبەستی هاندانی بڕواداران بۆ جەنگ و فیداکاریی، لە ئایەتی (٣٦)دا.

**١٥-** باسی بەخشینی ماڵ و سامان لە ڕێی خوادا بۆ جەنگ و فیداکاریی و، هەڕەشە کردن، کە ئەگەر بڕواداران کەمتەرخەم بن، خوا ﷻ دەیانگۆڕێ و، ئەوان لادەبات کەسانی دیکە دەهێنێ، لە ئایەتەکانی (٣٦ - ٣٨)دا.

## شەشەم: تایبەتمەندییەکانی:

ئـەم سـووڕەتە وەک هـەر کام لـە سـووڕەتەکانی دیکـە، چەنـدان تایبەتمەندیـی هـەن، کـە دەتوانیـن حەوتیـان وەک نموونـە لـێ بـاس بکەیـن:

**١)-** تەنیا ئەم سووڕەتە بە: (**الَّذِينَ كَفَرُوا**) دەستی پێکردوە، بۆیەش یەکێک لە ناوەکانی: سووڕەتی (**الَّذِينَ كَفَرُوا**)ە.

**٢)**- تەنیا ئەم سوورەتە لە سەرەتایەوە، ناوی (**محمد** ﷺ)ی تێدا هاتوە، لە ئایەتی ژمارە: (٢)دا، شایەنی باسیشە: لە هەموو قورئاندا سێ جاران ناوی (**محمد**)و، یەک جاریش ناوی (**أحمد**) هاتوە:

أ- ﴿ وَمَا مُحَمَّدٌ إِلَّا رَسُولٌ ﴾آل عمران: ١٤٤.

ب- ﴿ وَءَامَنُواْ بِمَا نُزِّلَ عَلَىٰ مُحَمَّدٍ ﴾محمد: ٢.

ج- ﴿ مُّحَمَّدٌ رَّسُولُ ٱللَّهِ ﴾الفتح: ٢٩.

د- ﴿ وَمُبَشِّرًا بِرَسُولٍ يَأْتِي مِنۢ بَعْدِي ٱسْمُهُۥٓ أَحْمَدُ ﴾**الصف**: ٦.

**٣)**- تەنیا لەم سوورەتەدا، باسی چۆنیەتیی مامەڵە لەگەڵ دیلەکانی کافران لە جەنگدا کراوە، کە دوو بژاردە دراونە دەستی ئیمانداران بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ دیلەکانی جەنگدا، کە بریتین لە: ﴿ فَشُدُّواْ ٱلْوَثَاقَ فَإِمَّا مَنًّۢا بَعْدُ وَإِمَّا فِدَآءً ﴾، ئایەتی ژمارە (٤)، دەفەرموێ: بەدیلیان بگرن و، کەلەپچەیان بکەن، دوایی یان بە منەت لەسەرکردن، واتە: بەبێ بەرانبەر بەریان بدەن، یاخود بە قەرەبوو، کە دوایی باسێکی تایبەت لەو بارەوە دەکەین.

**٤)**- تەنیا لەم سوورەتەدا، باسی چوار جۆرە خواردنەوەکانی بەهەشت کراوە، وەک چوار رووباری: ئاو و شیر و شەراب و هەنگوین، لە ئایەتی ژمارە (١٥)دا، لە قورئاندا زۆر باسی رووبارەکانی بەهەشت کراوە، بەڵام لێرەدا باسی چوار جۆرە خواردنەوەکانی بەهەشت کراوە.

**٥)**- تەنیا لەم سوورەتەدا باسی هاتنی نیشانەکانی ئاخیر زەمان (**أَشْرَاطُ السَّاعَة**) کراوە، لە ئایەتی ژمارە (١٨)دا، باسکراوە کە نیشانەکانی ئاخیر زەمان هاتوون: ﴿ فَقَدْ جَآءَ أَشْرَاطُهَا ﴾، ئەگەرنا لە سوورەتی (**الأنعام**) و، چەند سوورەتێکی دیکەدا، باسی نیشانەکانی رۆژی دوایی کراوە، بەڵام تەنیا لەم سوورەتەدا دەفەرموێ هاتوون، واتە: هەندێکیان هاتوون.

٦)- تەنیا لەم سوورەتەدا فەرمان بە پێغەمبەر ﷺ کراوە، بە زانینی تەنیا پەرستراوێتیی خواو، داوای لێبوردن کردن لە خوا، بۆ گوناهی خۆی و، بڕوادارانی پیاوو ئافرەت، لە ئایەتی ژمارە (١٩)دا: ﴿ فَاعْلَمْ أَنَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا اللَّهُ وَاسْتَغْفِرْ لِذَنبِكَ وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ ﴾.

٧)- چەند وشەو تەعبیرێک تەنیا لەم سوورەتەدا هاتوون، بۆ نموونە:

١- ﴿ أَضَلَّ أَعْمَالَهُمْ ﴾، لە ئایەتی ژمارە (١)دا، واتە: کردەوەکانی ون کردوون، زایە کردوون، بزر کردوون.

٢- ﴿ فَضَرْبَ الرِّقَابِ ﴾، لە ئایەتی ژمارە (٤)دا، واتە: لە گەردندان، واتە: بە لە گەردندان لە گەردنیان بدەن، کە مەبەست پێی کوشتن و پاکتاو کردنی کافرانە، لە کاتی ڕووبەڕوو بوونەوەو جەنگدا.

٣و٤- ﴿ وَأَصْلَحَ بَالَهُمْ ﴾، لە ئایەتی ژمارە (٢)داو، ﴿ وَيُصْلِحُ بَالَهُمْ ﴾، لە ئایەتی ژمارە (٥)دا، واتە: حاڵ و باڵ و کار وباریانی چاککرد، چاک دەکات.

٥- ﴿ ذَٰلِكَ بِأَنَّ اللَّهَ مَوْلَى الَّذِينَ آمَنُوا وَأَنَّ الْكَافِرِينَ لَا مَوْلَىٰ لَهُمْ ﴾، ئایەتی ژمارە: (١١)، واتە: ئەوەش بەهۆی ئەوەوە کە خوا دۆست و سەرپەرشتیاری ئەوانەیە بڕوایان هێناوەو، بێبڕوایان دۆست و سەرپەرشتیاریان نیە.

٦- ﴿ وَالَّذِينَ اهْتَدَوْا زَادَهُمْ هُدًى وَآتَاهُمْ تَقْوَاهُمْ ﴾، ئایەتی ژمارە (١٧)، ئەوانەی ڕێنمایی خوایان وەرگرتووە، ڕاستە ڕێییان گرتوە، خوا ﷻ ڕاستە ڕێ بوون و بەرچاو ڕوونییان بۆ زیاد دەکات و، پارێزکارییەک کە شایستەی ئەوانە، پێیان دەدات.

٧- ﴿ أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ الْقُرْآنَ أَمْ عَلَىٰ قُلُوبٍ أَقْفَالُهَا ﴾، ئایەتی ژمارە (٢٤)، لە زۆر شوێندا باسی ئەوە کراوە کە بۆچی سەرنجی قورئان نادەن؟ بەڵام تەنیا لێرەدا ئەم تەعبیرە هاتوە: ئایا سەرنجی قورئانیان نەداوە، یاخود دڵەکان قفڵیان لەسەرن؟

٨و٩- ﴿ أَضْغَانَهُمْ ﴾، لە ئایەتی (٢٩)داو، ﴿ أَضْغَانَكُمْ ﴾ لە ئایەتی (٣٧)دا، (**أضغان**) کۆی (**ضِغْنٌ**)ە، (**ضِغْن**) واتە: کینە، یاخود توڕەییەکی پەنگ خواردوو.

١٠- ﴿وَلَن يَتِرَكُمْ أَعْمَالَكُمْ﴾، ئایەتی ژمارە (٣٥)، ﴿وَلَن يَتِرَكُمْ﴾، (أي: وَلَنْ يَنْقُصَكُمْ)، کردەوەکانتان لێ کەم ناکاتەوە، بە زایە نادات، یاخود پاداشتی کردەوەکانتان کەم ناکاتەوە.

١١- ﴿وَإِن تَتَوَلَّوْا يَسْتَبْدِلْ قَوْمًا غَيْرَكُمْ ثُمَّ لَا يَكُونُوا أَمْثَالَكُم﴾، ئایەتی ژمارە (٣٨)، واتە: ئەگەر ئێوە پشت هەڵبکەن، کۆمەڵێکی دیکەی جیا لە ئێوە دەهێنێ و، دوایی ئەوان وەک ئێوە نابن.

کە دەگونجێ ڕووی دواندن لە مسوڵمانان بێ و، دەشکرێ ڕووی دواندن لە کۆمەڵگای ڕۆژگاری پێغەمبەر ﷺ بێ، کە ئەگەر بێت و ئەوان، باوەش نەگرنەوە بۆ هیدایەتی خوا، خوا ﷻ پەکی لەسەر کەس ناکەوێ، ئەوان لادەباو، خەڵکێکی دیکە دێنێ، بە هەردوو واتایەکان، ئەم ڕستە قورئانییە تەفسیر کراوە، وەک دوایی دەیگەینێ.

## حەوتەم: دابەشکردنی ئایەتەکان بۆ چەند دەرسێك:

ئەم سوورەتە موبارەکە بە هەر سی و هەشت (٣٨) ئایەتەکەیەوە، بۆ چوار دەرسان دابەش دەکەین، بەم جۆرە:

**دەرسی یەکەم:** ئایەتەکانی: (١ - ١١)، واتە: یازدە (١١) ئایەتی سەرەتای ئەم سوورەتە، باسی هەر کام لە بێبڕواو بڕواداران و، مامەڵەی خوای دادگەر لەگەڵیاندا، پاشان فەرمانکردنی خوا ﷻ بە مسوڵمانان کە لە دژی بێبڕوایان بجەنگن، لە کاتی بەرەنگاربوونەوەیاندا، باسی سەرەنجامی خێری بڕواداران و سەرەنجامی شوومی بێبڕوایان.

**دەرسی دووەم:** ئایەتەکانی: (١٢ - ١٩)، واتە: هەشت (٨) ئایەت، باسی پاداشتی ڕۆژی دوایی و، سەرەنجامی هەر کام لە بڕواداران و بێبڕوایان و، هەڵوێستی چەوتی بێبڕوایان لە بەرانبەر خوا ﷻو پێغەمبەردا ﷺو، چەند مەسەلەیەکی دیکەی پەیوەست بەوانەوە.

**دەرسی سێیەم:** ئایەتەکانی: (٢٠ - ٣١)، دوازدە (١٢) ئایەت، باسی دەغەڵ و دڵ نەخۆشەکان و هەڵوێستی نەرێنییان، لە بەرانبەر جەنگ و فیداکاریی داو سزای کاتی مەرگیان و، ناسێنرانیان بە هۆی نیشانەکانیان و، دەربڕینەکانیان و، هەڵسوکەوتەکانیانەوە.

**دەرسی چوارەم و کۆتایی:** ئایەتەکانی: (٣٢ - ٣٨)، حەوت (٧) ئایەت، باسی ئامۆژگاریی کردنی خوا بۆ بڕواداران و، هاندانیان بۆ جەنگ و فیداکاریی و بەخشین لە ڕێی خواداو، ترساندنیان کە ئەگەر بێت و بڕوادارانی شایستەو، هەڵگران و پەیڕەوانی شایستەی پەیامی خوا نەبن، خوا ﷻ ئەوان لا دەبات و کەسانی دیکە دەێنێ، کە دەشگونجێ ئەو هەڕەشەو ترساندنە، ڕووی لە کۆی کۆمەڵگای پێغەمبەر ﷺ بووبێ، بە تایبەتی بێبڕوایەکان کە ئەگەر بێت و ئەوانە لەسەر عینادیی و کەللە ڕەقیی خۆیان بەردەوام بن، خوا ﷻ ئەوان لادەبات و کەسانی دیکە دێنێ، یاخود هەر کاتێک دەستیان شل بێ لە پەیامی خوا، خوا ئەوان لادەبات و، گەل و نەتەوەکانی دیکە دەهێنێ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان لـە یـازدە (١١) ئایەتـی سـەرەتای سـوورەتی (**محمـد**) پێـک دێ، ئایەتەکانـی: (١ - ١١)، کـە تێیانـدا: سـەرەتا پێناسـەی هـەر کام لـە بێبڕوایـان و بـڕواداران و، چۆنیەتیـی مامەڵـەی خـوای دادگـەر لەگەڵیانـدا کـراوەو، هـۆکاری ئـەوەش خراوەتـەڕوو، کـە بۆچـی بـەو جـۆرە مامەڵەیـان لەگەڵـدا دەکات، هـەم بـڕواداران و، هـەم بێبڕوایـان؟

دواتـر خـوای کارزان فەرمانـی بـە مسـوڵمانان کـردوە، کـە لـە کاتـی بەرەنگاربوونـەوەی بێبڕوایانـدا (بێبڕوایانـی شـەڕ فـرۆش و دژایەتییکەر)، لـە گەردنیان بـدەن و، پـاش کوشـتاری خەسـت و خـۆڵ، بـە دیلیـان بگـرن و، دواتـر چ بـە منـەت و بـە خۆڕایـی و بـێ بەرانبـەر، چ بـە قەرەبـوو، بەرهەڵدایـان بکـەن.

پاشـان باسـی سـەرەنجامی خێـری کوژراوانـی ڕێـی خـوا کـراوەو، باسـی پشـتگیریی خـوا بـۆ بڕوادارانـی سـەرخەرو پشـتیوانی خـواو پەیامەکەی، لـە لایەکـەوەو، مەینەتیی و ڕەنجبـە خەسـاریی بێبڕوایـان لەلایەکـی دیکـەوە کـراوەو، لـە کۆتاییشـدا سـەرنجی هەمـوو لایـەک بـۆ مێـژوو ڕاکێـشراوە، کـە کۆمەڵـگا بێبڕوایـە پێشـووە فەوتێـنراوەکان، جێـی ئـەوەن دەرس و پەندیـان لێوەربگیـرێ، چونکـە بێبڕوایـەکان فەوتێـنراون و، بڕوادارانیـش سـەرخراون، هـۆکاری ئـەوەش سەرپەرشـتیی خـوا بـۆ بـڕواراداران و، بـێ خاوەنیـی و بـێ سەرپەرشـتیاریی بێبڕوایانـە.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَصَدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ أَضَلَّ أَعْمَٰلَهُمْ ۝١ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَءَامَنُواْ بِمَا نُزِّلَ عَلَىٰ مُحَمَّدٍ وَهُوَ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّهِمْ كَفَّرَ عَنْهُمْ سَيِّـَٔاتِهِمْ وَأَصْلَحَ بَالَهُمْ ۝٢ ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱلَّذِينَ

كَفَرُواْ ٱتَّبَعُواْ ٱلْبَٰطِلَ وَأَنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّبَعُواْ ٱلْحَقَّ مِن رَّبِّهِمْ كَذَٰلِكَ يَضْرِبُ ٱللَّهُ لِلنَّاسِ أَمْثَٰلَهُمْ ﴿٣﴾ فَإِذَا لَقِيتُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فَضَرْبَ ٱلرِّقَابِ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَثْخَنتُمُوهُمْ فَشُدُّواْ ٱلْوَثَاقَ فَإِمَّا مَنًّۢا بَعْدُ وَإِمَّا فِدَآءً حَتَّىٰ تَضَعَ ٱلْحَرْبُ أَوْزَارَهَا ذَٰلِكَ وَلَوْ يَشَآءُ ٱللَّهُ لَٱنتَصَرَ مِنْهُمْ وَلَٰكِن لِّيَبْلُوَاْ بَعْضَكُم بِبَعْضٍ وَٱلَّذِينَ قُتِلُواْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ فَلَن يُضِلَّ أَعْمَٰلَهُمْ ﴿٤﴾ سَيَهْدِيهِمْ وَيُصْلِحُ بَالَهُمْ ﴿٥﴾ وَيُدْخِلُهُمُ ٱلْجَنَّةَ عَرَّفَهَا لَهُمْ ﴿٦﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن تَنصُرُواْ ٱللَّهَ يَنصُرْكُمْ وَيُثَبِّتْ أَقْدَامَكُمْ ﴿٧﴾ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فَتَعْسًا لَّهُمْ وَأَضَلَّ أَعْمَٰلَهُمْ ﴿٨﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ كَرِهُواْ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأَحْبَطَ أَعْمَٰلَهُمْ ﴿٩﴾ أَفَلَمْ يَسِيرُواْ فِى ٱلْأَرْضِ فَيَنظُرُواْ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ دَمَّرَ ٱللَّهُ عَلَيْهِمْ وَلِلْكَٰفِرِينَ أَمْثَٰلُهَا ﴿١٠﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ مَوْلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَأَنَّ ٱلْكَٰفِرِينَ لَا مَوْلَىٰ لَهُمْ ﴿١١﴾ ﴾.

## مانای دەقا و دەقی ئایەتەکان

{بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە . ئەوانەی بێبڕوابوون و ڕێگریی (خەڵک)یان کرد لە ڕێی خوا، (خوا) کردەوەکانیانی بزر کرد (پووچەڵکردەوە) ﴿١﴾ ئەوانەش کە بڕوایان هێناوە و کردەوە باشەکانیان کردوون و، بڕوایان بەوە هێناوە کە بۆ سەر موحەممەد دابەزێنراوە، کە هەر ئەویش هەقە لە پەروەردگاریانەوە (هاتبێ) (خوا) خراپەکانی لێ سڕینەوەو، حاڵ و کاروباری چاککردوون ﴿٢﴾ ئەوەش لە سۆنگەی ئەوەوە، کە ئەوانەی بێبڕوان شوێن پووچیی و ناهەق کەوتوون و، ئەوانەی بڕواداریشن، شوێن هەقێک کەوتوون کە لە پەروەردگاریانەوەیە، بەو شێوەیە خوا وێنەکانیان بۆ خەڵک دێنێتەوە (تاکو پێیان لە ڕاستییەکان تێبگەن) ﴿٣﴾ ئنجا (ئەی بڕوادارینە!) (کە حاڵی بێبڕوایانی دوژمنتان ئاوایە) هەر کات بەرەنگاری بێبڕوایان بوونەوە (لە جەنگدا)، (پیشەتان ئەوەبێ) لە گەردنان بدەن، هەتا کاتێک لە پەل و پۆتان خستن، ئنجا دەستبەند (کەلەپچە لە دەست و پەلیان) توند بکەن، ئنجا دواتر یان چاکە بکەن (و بەبێ

بەرانبەر بەریان بدەن)، یان بە قەرەبوو (هەر بەو جۆرە بکەن)، تاکو جەنگ قورساییەکانی دادەنێ (و کۆتایی پێ دێ)، ئەوە بەو شێوەیە (کە باسکرا)و، ئەگەر خواش ویستبای (بەبێ جەنگی ئێوە لە دژی بێبڕوایان) بەسەریاندا زاڵ دەبوون، بەڵام (بۆیە جەنگی لەسەر پێویست کردوون) تاکو بە یەکدییتان تاقی بکاتەوەو، ئەوانەش کە لە ڕێی خوادا کوژراون، هەرگیز (خوا) پاداشتی کردەوەکانیان ون ناکات ﴿٤﴾ بێگومان ڕاستە ڕێیان دەکات و، حاڵ و کاروباریان چاک دەکات ﴿٥﴾ هەروەها دەیانخاتە بەهەشتەوە، کە پێی ناساندوون (بۆی باسکردوون چۆنە؟) ﴿٦﴾ ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! ئەگەر (بەرنامەو پێغەمبەری) خوا سەربخەن، سەرتان دەخات و پشتیوانتان دەبێ و، پێیەکانیشتان دەچەسپێنێ ﴿٧﴾ ئەوانەش کە بێبڕوان، سەرەنگرێ بوون (و، کەوتن) بۆ وان و (خوا) کردەوەکانیانی بزر کردن (و پووچەڵ کردنەوە) ﴿٨﴾ ئەویش لە سۆنگەی ئەوەوە، ئەو (پەیام)ەیان دزا[1] کە خوا دایبەزاندوە، ئیدی (خواش) کردەوەکانیانی هەڵوەشاندنەوە ﴿٩﴾ ئایا بە زەویدا نەڕۆیشتوون سەرنج بدەن! سەرەنجامی ئەوانەی پێش وان چۆن بوو، خوا فەوتاندنی و خانووبەرەکانیانی (کە شوێنەوارەکانیان ماون)، بەسەریاندا ڕووخاندن و، بۆ بێبڕوایانیش (لە هەر ڕۆژگارێکدا) وێنەی ئەو (سەرەنجامە شووم)انە هەن ﴿١٠﴾ ئەویش بە هۆی ئەوەوە کە خوا مشوورخۆرو سەرپەرشتیاری ئەوانەیە بڕوایان هێناوە، بەڵام بێبڕوایان هیچ دۆست و پشتیوانیان نیە ﴿١١﴾}.

---

(١) دزای: ڕقی لێبۆوە، دەیدزێ : ڕقی لێ دەبێتەوە

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(وَصَدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ): (الصُّـدُودُ وَالصَّـدُّ، قَـدْ يَكُـونُ انْصِرَافـاً عَـنِ الـشَّيءِ وَامْتِنَاعَـاً، وَقَـدْ يَكُـونُ صَرْفَـاً وَمَنْعَـاً)، وشـەی (صُـدُودُ و صَـدّ) جـاری وا هەیـە بـە مانـای لادان و سـەرپێچیی کردنـە لـە کارێـک، جـاری واش هەیـە بـە مانـای لادانـی خەڵـک و ڕێگریـی لێکردنیانـە لـە کارێـک، وشـەی (صَـدّ): هـەم بـە (لازم) هاتـوە، (صَـدَّ عَـنْ سَـبيلِ اللـه)، واتـە: خـۆی لایـدا، (امْتَنَـعَ) لامـل بـوو لـە ڕێـی خـوا، هەروەهـا بـە (مُتَعَدِّي)یـش هاتـوە: (صَـدَّ عَـنْ سَـبيلِ اللـه)، یانـی: (صـدَّ النَّـاسَ عَـنْ سَـبيلِ اللـه)، واتـە: خەڵکـی لـە ڕێـی خـوا لادا.

(أَضَلَّ أَعْمَٰلَهُمْ): کردەوەکانـی ون کـردوون و، زایـە کـردوون، (ضَـلَّ الـشَّيءُ: ضَـاعَ وَهَلَـكَ، يَضِـلُّ ضَـلاَلاً)، (وَالضَّالَـةُ: مَـا ضَـلَّ مِـنَ البَهِيْمَـةِ)، (ضَـلَّ الـشَّيءُ) واتـە: شـتەکە ون بـوو، زایـە بـوو، فەوتـا، (يَضِـلُّ ضَـلَالاً): ون دەبـێ، ون بـوون، (ضَالَـة) بـەو ئاژەڵـە دەگوتـرێ کـە ون بـووە لـە خاوەنەکـەی، (أَضَلَّ أَعْمَٰلَهُمْ) واتـە: کردەوەکانـی ون کـردوون و، بـێ سـەر وشـوێن کـردوون.

(وَأَصْلَحَ بَالَهُمْ): کار وبـاری چاککـردوون و حاڵـی باشـکردوون، (البَـالُ: ١- القَلْـبُ، يُقَـالُ: مَـا يَخْطُـرُ فُـلَانُ بِبِـالِي، ٢- رَخَـاءُ النَّفْـسِ، يُقَـالُ: فُـلَانٌ رَخِـيُّ البَـالِ، ٣- الحَـال، يُقَـال: مَـا بَالُـكَ؟ أي: حَالُـكَ)، وشـەی (بَـالُ) بـە سـێ واتایـان دێ:

١- بە مانای دڵ و مێشک دێ، دەگوترێ: (مَا يَخْطُر فُلَانُ بِبالِي) واتە: فڵانکەس بە زەینمدا نایەت، بە خەیاڵم دا نایەت.

٢- بە مانای حاڵخۆشیی دێ، دەگوترێ: (فُلَان رَخِيُّ البَالِ)، واتە: فڵانکەس حاڵی باشە لە ڕووی گوزەران و ژیانەوە.

٣- بە مانای حاڵ دێ، دەگوترێ: (مَا بَالُكَ)، یانی: (حَالُكَ) حاڵت چۆنە؟ بارودۆخت چۆنە؟

(يَضۡرِبُ ٱللَّهُ لِلنَّاسِ أَمۡثَٰلَهُمۡ): خـوا ﷻ وێنەکانیـان بـۆ خەڵکـی دێنێتـەوە، (**أمْثَـال**) لێرەدا کۆی (**مَثَـل**)ە، کـە بـە (**أمْثَال**) کـۆ دەبێتـەوە، (**وَمَثَـلُ الـشَّيء بفَتْحَتَيْن: صِفَتُـهُ**)، لێـرەدا: (**مَثَـلُ الـشَّيء**)، یـانی: وێنـەی شـتەکە، بـۆ وێنـە: دەفەرمـوێ: (**مَثَـلُ الجَنَّـةِ**)، واتـە: سـیفەتی بەهەشـت، لێـرەدا (**مَثَـلُ الـشَّيء**) ئەگـەر بـە دوو فەتحـە بـێ، واتـە: سـیفەتی ئـەو شـتە، وێنـەی ئـەو شـتە، واتـە: خـوا ﷻ وێنـەکان بـۆ خەڵکـی دێنێتـەوە تاکـو پێیـان لـە خۆیـان حاڵیـی بـن، هەروەهـا (**مَثَـل**) جاری وایـە بـە مانـای پەندیـش دێ، کـە بریتیـە لـە وێچواندنـی شـتێک بـە شـتێکی دیکـە، لـە سـەرەنجامیداو لـە حـاڵ و دۆخیـدا، وەک پێشـتر باسـمان کـردوە.

(لَقِيتُمُ): (**اللِّقَـاءُ: المُلَاقَـاةُ: مُقَابَلَـةُ الـشَّيءِ وَمُصَادَفَتُـهُ مَعَـاً**)، (لَقِيتُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ: **قَاتَلْتُـمُ الَّذِيْـنَ كَفَـرُوا**)، (**لِقَـاء**) و (**مُلَاقَـاة**)، بریتیـە لـە ڕووبـەڕوو بوونـەوە لەگـەڵ شـتێک داو، تـووش بوونیشـی پێکـەوە، (لَقِيتُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ)، واتـە: بەرەنـگاری ئەوانـەی بێبڕوابوون بوونـەوە، لەگەڵیانـدا بەشـەڕ هاتـن، جەنگتـان لـە دژ کـردن.

(أَثۡخَنتُمُوهُمۡ): دەگوتـرێ: (**ثَخُـنَ الـشَّيءُ، فَهُـوَ ثَخِـيْنٌ: غَلُـظَ، فَلَـمْ يَسِـل، وَلَـمْ يَسْـتَمِرَ فِي ذَهَابِـهِ، وَمِنْـهُ اسْـتُعِيْرَ أَثْخَنْتُـهُ ضَرْبَـاً، وأَثْخَنَتْـهُ الجِرَاحَـةُ: أَوْهَنَتْـهُ، يُقَـالُ: أَثْخَـنَ فِي الأَرْضِ قَتْـلاً**)، وشـەی (**ثَخُـنَ الـشَّيءُ، فَهُـوَ ثَخِـيْنٌ**)، واتـە: شـتەکە خەسـت بـوو، یـان خەسـتە، (**غَلُـظَ، فَلَـمْ يَسِـل**) واتـە: خەسـت بـوو، وابـوو نـەڕژێ، شـتێک شـل بـێ، دەڕژێ، بـەڵام کـە خەسـت بـوو ناجووڵـێ، لـە ڕۆیشـتنیدا بـەردەوام نەبـوو، خوازراوەتـەوە بـۆ (**أَثْخَنْتُـهُ ضَرْبَـاً**) واتـە: هێنـدەم لێـدا لـە پـەل و پـۆم خسـت، یـان دەگوتـرێ: (**أَثْخَنَتْـهُ الجِرَاحَـةُ**)، واتـە: برینداریـی کەواندیـی، لـە پـەل و پـۆی خسـت، (**أي: أَوْهَنَتْـهُ**) یانـی: بێهێـزی کـردو جووڵـەی بـاش نەهێشـت، (**أَثْخَـنَ فِي الأَرْضِ قَتْـلًا**) واتـە: زۆر کوشـتاری لە زەویـدا کـرد، دوایـی زیاتریـش ڕوونـی دەکەینـەوە.

(مَنًّۢا): (**مَـنَّ عَلَيْـهِ: أَنْعَـمَ، يُقَـالُ: الـمِنَّةُ تَهْـدِمُ الصَّنِيْعَـةَ**)، (**مَـنَّ عَلَيْـهِ**) واتـە: چاکـەی لەگـەڵ کـرد، دەگوتـرێ: (**الـمِنَّةُ تَهْـدِمُ الصَّنِيْعَـةَ**)، منەتکـردن چاکەکـردن هەڵدەوەشـێنێتەوە، کەسـێک چاکـە لەگـەڵ کەسـێک بـکات، بـەڵام دوایـی منەتـی

لەسەر بکات، بە چاوی دابداتەوە، چاکەکەی هەڵدەوەشێتەوەو، خێرەکەی نامێنێ، وەک خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿لَا تُبۡطِلُواْ صَدَقَٰتِكُم بِٱلۡمَنِّ وَٱلۡأَذَىٰ﴾ البقرة: ٢٦٤، واتە: چاکەو خێرەکانتان بە منەتکردن و ئازاردانی دڵی بابای چاکە لەگەڵدا کراو، هەڵمەوەشێننەوە.

(فِدَآءً): (الفِدْيَةُ وَالفِدَى وَالفِدَاء)، وشەکانی: (فِدْيَة و فِدَى و فِدَاء)، هەرسێکیان بە یەک واتان، واتە: قەرەبوو، دەگوترێ: (فِدَاهُ وَفَادَاهُ: أَعْطَى فِدَاءَهُ فَأَنْقَذَهُ)، (فِدَاهُ وَفَادَاهُ) واتە: قەرەبووەکەی داو دەربازی کرد.

(أَوۡزَارَهَا): (جَمْعُ وِزْرَ: الإِثْمُ وَالثِّقْلُ وَالكَارةُ وَالسِّلاح)، (أَوْزَار) کۆی (وِزْرَ)ە، (وِزْرَ)یش هەم بە مانای گوناه دێ، هەم بە مانای قورسایی دێ، هەم بە مانای ئەو کۆڵە پۆشاکە دێ، کە لەسەر پشت هەڵدەگیرێ، هەم بە مانای چەکیش دێ، دەڵێ: (الكَارَةُ: مَا يُحْمَلُ عَلَى الظَّهْرِ مِنَ الثِّيَابِ)، (كارة) ئەو پۆشاکەیە لەسەر پشت هەڵدەگیرێ، کۆڵە پۆشاک.

(ٱلۡوَثَاقَ): (الوَثَاقُ وَالوِثَاق: مَا يُشَدُّ بِهِ اليَدُ)، دەستبەندو، کەلەپچە، ئەوەی دەستی پێ دەبەسترێ، لە ئەصڵدا (وَثَاق)ە و (وِثَاق)یش بەکاردەهێنرێ، بەڵام لە قورئاندا ئەو وشەیە بەو شێوەیە نەخوێندراوەتەوە.

(لِّيَبۡلُوَاْ بَعۡضَكُم بِبَعۡضٍ): واتە: هەندێکتان بە هەندێکتان تاقی بکاتەوە، یانی: بە یەکدییتان تاقی بکاتەوەو، بجەربێنێ، دەگوترێ: (بَلَوْتُهُ: اخْتَبَرْتُهُ)، (بَلِيَ الثَّوْبُ بِلاً وَبَلَاءً: خَلَقَ)، پۆشاک کە شڕ دەبێ و کۆن دەبێ، دەگوترێ: (بَلِيَ الثَّوْبُ بِلاً وَبَلَاءً)، واتە: پۆشاکەکە شڕ بوو (بَلَوتُه: اخْتَبَرْتُه كَأَنِّي أَخْلَقْتُهُ مِنْ كَثْرة اخْتِبَارِي لَهُ)، (بَلَوتُهُ) بە مانای: تاقیم کردەوە، یانی: هێندە تاقیم کردۆتەوە شڕ و کۆن بووە.

(عَرَّفَهَا لَهُمۡ): (عَرَّفَهَا: جَعَلَهَا مَعْرُوفَةً لَهُمْ)، واتە: وای لێکردوون بیناسن، پێی ناساندوون، (وعَرَّفَهُ: جَعَلَ لَهُ عَرْفاً، أَي: رِيْحاً طَيِّباً، إِذَا عَرَّفَهَا لَهُمْ، أَي: طَيَّبَهَا وَزَيَّنَهَا)،

(**عَرَّفَهَا**) وەک چۆن بە مانای پێی ناساندوون، دێ، هەروەها بە مانای بۆی بۆنخۆش کردوون و بۆی ڕازاندوونەوەش، دێ.

(فَتَعْسًا لَّهُمْ): (**التَّعْسُ: أَلاَّ يَنْتَعِشَ مِنَ العَثْرَةِ، التَّعَسُ: الْهَلاَكُ، وَأَصْلُهُ الْكَبُّ، وَهُوَ ضِدُّ الإِنْتِعَاشِ**)، (**تَعْس**) ئەوەیە کە کەسێک کەوت هەڵنەستێتەوە، (**تَعْس**) هەروەها بە مانای لە بەین چوونە، ئەسڵی وشەی (**تَعْس**) بە واتای لەپەڕوو کەوتنەو پێچەوانەی (**انْتِعَاش**)ە، (**انْتِعَاش**) ئەوەیە کە ئینسان کەوت، هەڵسێتەوەو ببووژێتەوە.

(فَأَحْبَطَ أَعْمَالَهُمْ): (**حَبِطَ عَمَلُهُ: بَطَلَ ثَوَابُهُ**)، پاداشتەکەی نەماوەو زایە بووەو پووچەڵ بۆتەوە.

(دَمَّرَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ): خوا ﷻ بە سەریدا کاول کردوون، فەوتاندوونی، (**الدَّمَارُ: الْهَلَاكُ، دَمَّرَهُ اللَّهُ تَدْمِيراً وَدَمَّرَ عَلَيْهِ بِمَعْنًى**)، (**دَمَارُ**) بە مانای (**هَلَاكُ**) فەوتان، دێ، دەگوترێ: (**دَمَّرَهُ اللَّهُ تَدْمِيراً وَدَمَّرَ عَلَيْهِ**) هەردووکیان خوا ﷻ بەسەریدا کاول کرد، یان: خوا بە کاول کردن و ڕووخاندن ڕووخاندی، هەر بە مانای یەکن، واتە: فەوتاندی و لە بەینی برد، لەبەر ئەوەی کەسێک لە ژێر کەندەڵانێک بێ، لە بن ئەشکەوتێک بێ، لە بن خانوویەکدا بێ، خانوو و ئەشکەوت و کەندەڵانەکەی بەسەردا بڕووخێ، لە بەین دەچێ، لەوەوە ئەو تەعبیرەیان بەکارهێناوە.

(أَمْثَالُهَا): (**أَمْثَالُ: جَمْعُ مَثَل، مَثَلُ الشَّيءِ: صِفَتُهُ، مِثْل وَمَثَل: شِبْه وَشَبَه، وَالمثَلُ: مَا يُضْرَبُ بِهِ مِنَ الأَمْثَال**)، (**مَثَلْ**) بە مانای سیفەت و وەسف دێ، (**مِثْلُ ومَثَل**) وەک (**شِبْه وشَبَه**)ن، ئەو شتە وەک ئەو شتەیە، وێڕای ئەوەش (**مَثَل**) بە مانای پەندیش دێ، ئەو شتەی وەک پەند دەهێنرێتەوە، پەندیش بریتیە لەوە کە شتێک بەسەر کەسێک هاتبێ، تۆش کەسێکی دیکە بچوێنی بەو کەسەی ئەو شتەی بەسەر هاتوە، لەوەدا کە بەسەر ئەویش دێ.

(مَوْلَىٰ): (المَـوْلَى: الجَـارُ، وَالحَلِيْـفُ، وَالنَّـاصِرُ، وَالمُحِـبُّ، وَالمُدَبِّـرُ)، (مَـوْلَى): بـە مانـای دراوسـێ و هاوپەیـمان و پشـتیوان و خۆشەویسـت و مشـوورخۆرو سەرپەشـتیار، دێ، کـە دەفەرمـوێ: ﴿ ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ مَوْلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ﴾، ئـەوەش بـە هـۆی ئەوەوەیـە، کـە خـوا ﷻ سەرپەرشـتیاری ئەوانەیـە، بڕوایـان هێنـاوە، ﴿ وَأَنَّ ٱلْكَٰفِرِينَ لَا مَوْلَىٰ لَهُمْ ﴾، بـەڵام بێبڕوایـەکان، بـێ سەرپەرشـتیارن و، بـێ دۆسـت و پشـتیوانن.

خـوا ﷻ دوای ئـەوەی باسـی سـەرەنجام و بـە سـەر فەتـارەت چوونـی بێبڕوایـان دەکات و، بـاسی سـەرفرازیی و سـەرکەوتنی بـڕواداران دەکات، دەفەرمـوێ: ﴿ ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ مَوْلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ﴾، ئـەوەش بـە هـۆی ئەوەوەیـە کـە خـوا ﷻ دۆسـت و سەرپەرشـتیاری ئەوانەیـە بڕوایـان هێنـاوە، بـەڵام ئەوانـەی بێبـڕوان، بـێ دۆسـت و بـێ سەرپەرشـتیارو پشـتیوانن.

## ماناى گشتيى ئايەتەكان

ئـەم سـووڕەتە موبارەكـە وەك لـە پێناسـەكەيدا باسـمان كـرد، پانتاييەكـى زۆر تێيـدا بـۆ جەنـگ و ڕووبـەڕوو بوونـەوە لـە دژى بێبڕوايـان تەرخانكـراوە، هەڵبەتـە بێبڕواياننێكـى شـەڕفرۆش و دەسـتدرێژكار بـۆ سـەر ئيمانـداران، چونكـە وەك لـە زۆر لـە كتێبەكانمانـدا باسـمان كـردوە: لـە تەفسـيرى سـووڕەتى **(الأنفـال)** و سـووڕەتى **(التوبـة)**داو، لـە كتێبـى (هەڵوەشـانەوەى پەڕگيريـى)دا، كـە وێـڕاى ئـەوەى بـە كوردیـى نووسـيومانە، بـۆ زمانەكانـى: عەرەبيـى و توركيـى و فارسـيى و ئينگليزييـش وەرگێـڕدراوەو بڵاويـش كراوەتـەوە، باسـمان كـردوە، بناغـەى پەيوەنديـى ئەهلـى ئيسـلام لەگـەڵ نامسـوڵمانانداا، بريتيـە لـە ئاشـتيى و تەبايـى، مەگـەر ئـەوان ئـەو ئاشـتيى و تەباييـە تێكبـدەن و، دەسـتدرێژيى بكـەن، ئـەو كاتـە لـە بەرانبـەر مسـتدا، درێشـە ڕادەگيـرێ و، كـەس لـە شـەڕ شـەكرى نەبەخشـيوەتەوە.

ئنجـا لـەم يـازدە ئايەتـەى سـەرەتاى ئـەم سـووڕەتە موبارەكـەدا، خـوا ﷻ بـە خەسـت و خۆڵيـى باسـى ڕووبەڕووبوونـەوەى ئەهلـى ئيـمان و ئەهلـى كوفـر دەكات، بـەو شـێوەيە دەسـت پێـدەكات:

سـەرەتا خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: (بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ) بـە نـاوى خـواى بـە بەزەيـى بەخشـندە،

واتە:

دەستپێكردنم بە ناوى خوايە، ئەوەش مەبەست پێى ئەوەيە:

١ - ئەم كارە تەنها بۆ خوا دەكەم.

٢ - ئەم كارە بە پێى شەرعى خوا دەكەم.

٣ - ئەم کارە بە تواناو یارمەتیی خوای پەروەردگار دەکەم.

٤ - ئەم کارە بۆ هێنانەدی ڕەزامەندیی خوا ئەنجامی دەدەم.

﴿ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَصَدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ أَضَلَّ أَعْمَٰلَهُمْ ﴾، ئەوانـەی بێبڕوابـوون و لایانداوە لە ڕێـی خـوا، یاخـود خەڵکیـان لاداوە لـە ڕێـی خـوا، خـوا ﷻ کردەوەکانـی ون کـردوون، کردەوەکانـی بێئـاکام و بـێ ئەنجـام کـردوون، لێـرەدا کـە خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ﴾، کـە یەکێـک لـە ناوەکانـی ئـەم سـوورەتە، سـوورەتی: **(الذیـن کفروا)**یـەو، یەکێکـی دیکـە لـە ناوەکانـی بریتیـە لـە سـوورەتی **(القتـال)**.

ئنجـا ئـاوا دەسـت پێـدەکات، دەفەرمـوێ: ئەوانـەی بێبڕوابـوون، واتـە: بێبڕوابـوون بـە هەمـوو ئـەو شـتانەی پێویسـت بـوو بڕوایـان پـێ بهێـنرێ، بـێ بڕوابـوون بـە خـواو، بـە فریشـتەکانی خـواو، بـە کتێبەکانـی و، بـە پێغەمبەرانـی و، بـە ڕۆژیـی دوایـی و، بـە هەمـوو ئـەو شـتانەی کتێبـی خـواو پێغەمبـەری خـوا ﷺ هەواڵیـان پێـداون، ﴿ وَصَدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ﴾، هـەر بەوەنـدەش وازیـان نەهێنـاوە کـە خۆیـان بێبڕوابـن، بەڵکـو بـە کـردەوەش لـە ڕێـی خـوا لایانـداوە، یاخـود: خەڵکیشـیان لـە ڕێـی خـوا لاداوە، ئـا ئەوانـە: ﴿ أَضَلَّ أَعْمَٰلَهُمْ ﴾، خـوا ﷻ کردەوەکانـی زایـە کـردوون و، ون کـردوون، واپێدەچـی لێـرەدا: ﴿ أَضَلَّ أَعْمَٰلَهُمْ ﴾، مەبەسـت ئـەو پیـلان و فێـڵ و تەڵەکانـە بـێ، کـە لـە دژی ئەهلـی ئیسـلام ئەنجامیـان داون، لـە مـاڵ بەخشـین و خەڵـک کۆکردنەوەیـان و سـوپا سـازکردنیان، وەک بـۆ جەنگـی بـەدر کردیـان و، بـۆ جەنگـی ئوحـود کردیـان، خـوا ﷻ فێـڵ و پیلانـی ئەوانـی هەڵوەشـاندۆتەوەو، ون کـردوەو، کردوویەتـی بـە نەخشـی سـەر ئـاو.

﴿ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَءَامَنُواْ بِمَا نُزِّلَ عَلَىٰ مُحَمَّدٍ وَهُوَ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّهِمْ كَفَّرَ عَنْهُمْ سَيِّـَٔاتِهِمْ وَأَصْلَحَ بَالَهُمْ ﴾، بـەڵام ئەوانـەی بڕوایـان هێنـاوە، (بـە هەمـوو ئـەو شـتانەی پێویسـتە بڕوایـان پـێ بهێـنرێ)و چاکەکانیـان ئەنجام داون و، بڕواشـیان هێنـاوە بەوەی دابەزێنراوەتـە سـەر موحەممـەد ﷺ، کـە هـەر ئەویـش هەقـە لـە پەروەردگاریانـەوە،

بەس ئەوە ڕاست و هەقە، ئنجا ئایا خوا ﷻ چی بۆ کردوون؟ ﴿ كَفَّرَ عَنْهُمْ سَيِّـَٔاتِهِمْ ﴾، خوا ﷻ خراپەکانیانی لێ سڕیونەوەو، ﴿ وَأَصْلَحَ بَالَهُمْ ﴾، حاڵ و باڵیشی چاککردوون، حاڵ و باڵ چاککردنیش هەم نۆخژنی نێو دڵ و دەروونی پێداون، هەم لە ڕووی عەقڵییەوە، بەرچاو ڕوونیی پێداون، هەم لە ڕووی خێزانییەوە تۆکمەی کردوون، هەم لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە، پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانیانی قایم کردوون، هەم بەرەکەت و پێزی ماددیی و مەعنەویی، پێداون و، لە ڕووی تەبایی نێو خۆیان و، لە ڕووی عیززەت و زبریی لە بەرانبەر دوژمنیانەوە، خوا ﷻ حاڵی باش کردوون بە مانای فراوانی حاڵ باش بوون، بۆچی؟

﴿ ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ٱتَّبَعُواْ ٱلْبَٰطِلَ ﴾، ئەویش بە هۆی ئەوەوە کە ئەوانەی بێبڕوان، شوێن ناهەق کەوتوون و، شوێن شتی پووچ کەوتوون، کە بریتییە لە کوفرو شیرک و ستەم و خراپە، ﴿ وَأَنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّبَعُواْ ٱلْحَقَّ مِن رَّبِّهِمْ ﴾، بە هۆی ئەوەوەش کە ئەوانەی بڕوایان هێناوە، شوێن هەق کەوتوون، واتە: ئەو ئیمان و عەقیدەیەو، ئەو شەریعەتە هەق و چەسپاوەی لە پەروەردگاریانەوە هاتوە، ﴿ كَذَٰلِكَ يَضْرِبُ ٱللَّهُ لِلنَّاسِ أَمْثَٰلَهُمْ ﴾، بەو شێوەیە خوا ﷻ وێنەکانیان بۆ خەڵکی دێنێتەوە، بۆ ئەوەی بە هۆی وێنەکانیانەوەو، بە هۆی وەسفەکانیانەوەو، لە خۆیان حاڵیی ببن.

لەم سوورەتە موبارەکەدا، پێنج جاران وشەی (ذَٰلِكَ) هاتوەو، هەمووشیان ئاماژەن بەوە کە خوا ﷻ لەبەر فڵان شتە ئەوەی کردوە.

دوایی دەفەرموێ: ﴿ فَإِذَا لَقِيتُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فَضَرْبَ ٱلرِّقَابِ ﴾، ئنجا هەر کات بەوانەی بێبڕوان گەیشتن، واتە: لە جەنگدا پێیان گەیشتن و بەرەنگاریان بوونەوە، با لە گەردن دان پیشەتان بێ، زانایانی ڕێزمانی عەرەبیی گوتوویانە: (**فَاضْرِبُوا ضَرْبَ الرِّقَاب**)، لێ بدەن لە گەردنیان، واتە: بەو شێوەیەی چاکتر دەکوژرێن، لە شوێنی هەتەریان بدەن، لە شوێنی پێکوژرانیان بدەن، ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَثْخَنتُمُوهُمْ ﴾، هەتا

کاتێک کوشتاریی خەستتان لێ کردن و لە پەل و پۆتان خستن، ﴿فَشُدُّوا۟ ٱلْوَثَاقَ﴾، ئنجا دەستبەند توند بکەن، یانی: بە دیلیان بگرن و کەلەپچەیان بکەن، ﴿فَإِمَّا مَنًّۢا بَعْدُ وَإِمَّا فِدَآءً﴾، دوایی یان منەتیان لەسەر بکەن و بە بەلاش بەریان بدەن، یاخود بە قەرەبوو بەریان بدەن، ﴿حَتَّىٰ تَضَعَ ٱلْحَرْبُ أَوْزَارَهَا﴾، (هەر بەو شێوەیە لەگەڵیاندا مامەڵە بکەن) تاکو جەنگ قورساییەکانی خۆی دادەنێ و، کۆتایی پێ دێ، ﴿ذَٰلِكَ﴾، باس و خواس بەو شێوەیە، یاخود: بۆیە خوا ﷻ وایفەرمووە، یان بۆیە وای بۆ بڕیار داون، چونکە شایستەی ئەوەن، ﴿وَلَوْ يَشَآءُ ٱللَّهُ لَٱنتَصَرَ مِنْهُمْ﴾، ئەگەر خواش ﷻ ویستبای بەسەریاندا زاڵ دەبوو، تۆڵەی لێ دەستاندن، ﴿وَلَٰكِن لِّيَبْلُوَا۟ بَعْضَكُم بِبَعْضٍ﴾، بەڵام بە یەکدییتان تاقی دەکاتەوە، ﴿وَٱلَّذِينَ قُتِلُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ فَلَن يُضِلَّ أَعْمَٰلَهُمْ﴾، ئەوانەش کە لە ڕێی خوادا کوژراون، کردەوەکانیان زایەو ون ناکات.

خوێندراویشەتەوە: (**والَّذِينَ قَاتَلُوا فِي سَبِيلِ اللهِ**)، کە من ئەو خوێندنەوەیەم پێ باشترە، هەرچەندە خوێندنەوەی حەفص کە ئەو موصحەفەی بەردەستمان تەبەننیی کردوە، وانیە، بەڵام ئەم خوێندنەوەیە لەگەڵ ڕەوتەکەدا گونجاوترە: (**والذين قاتلوا في سبيل الله فَلَن يُضِلَّ أعمالهم**)، ئەوانەش کە لە ڕێی خوادا جەنگاون، کردەوەکانیان زایە ناکات، کردەوەکانیان بێ بەرهەم نابن، ﴿سَيَهْدِيهِمْ﴾، لەمەودوا زیاتر ڕاستە ڕێیان دەکات، ﴿وَيُصْلِحُ بَالَهُمْ﴾، حاڵ و باڵیشان چاک دەکات، بەڵام ئەگەر بە (**قُتِلوا**) بخوێندرێتەوە، دەبێ بڵێی: لە بەهەشتدا خوا ﷻ ڕێنماییان دەکات بۆ ڕێ و شوێنەکانی خۆیان و، لەوێ حاڵ و باڵیان چاک دەکات.

﴿وَيُدْخِلُهُمُ ٱلْجَنَّةَ عَرَّفَهَا لَهُمْ﴾، دەیانخاتە بەهەشتەوە، پێی ناساندوون.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِن تَنصُرُوا۟ ٱللَّهَ يَنصُرْكُمْ وَيُثَبِّتْ أَقْدَامَكُمْ﴾، ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! ئەگەر خوا ﷻ سەربخەن، (پەیامی خواو، پێغەمبەری خوا، سەربخەن)، خوا سەرتان دەخات و پێیەکانتان دەچەسپێنێ.

﴿ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فَتَعۡسٗا لَّهُمۡ وَأَضَلَّ أَعۡمَٰلَهُمۡ ﴾، ئەوانـەش کـە بێبـڕوان، نەگبەتیـی و بـێ خێریـی بـۆ ئـەوان، کەوتـن و هەڵنەسـتانەوە بـۆ ئـەوان، ﴿ وَأَضَلَّ أَعۡمَٰلَهُمۡ ﴾، کردەوەکانیشـی ون کـردوون، بـێ بەرهـەم و بـێ ئەنجـام کـردوون.

﴿ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ كَرِهُواْ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ ﴾، ئەویـش لەسـۆنگەی ئـەوەوە ڕقیـان لـەوە هەڵسـاوە کـە خـوا ﷻ دایبەزانـدووەو، ئەوەیـان دزا کـە خـوا دایبەزانـدوە، ﴿ فَأَحۡبَطَ أَعۡمَٰلَهُمۡ ﴾، بۆیـە کردەوەکانـی، (کـردەوە باشـەکانی) هەڵوەشـاندنەوە.

یـان مەبەسـت ئەوەیـە کـە خـوا کـردەوە خراپەکانیـان و نەخشـەو پیلانەکانیانـی بـە زایـەدان و ون کـردن، بـەڵام کـردەوە چاکەکانـی لـێ هەڵوەشـاندنەوەو، هـەر کردەوەیـەک نیـوەڕۆک و ڕووحـی ئیـمان و تەقـوای تێـدا نەبـێ، وەک شـیری بـێ هەویـن، هەڵدەبزڕکـێ.

﴿ أَفَلَمۡ يَسِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَيَنظُرُواْ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡ ﴾، ئایـا بـە زەویـدا نەڕۆیشـتوون سـەرنج بـدەن! سـەرەنجامی ئەوانـەی پێـش ئـەوان چـۆن بـوو؟ ﴿ دَمَّرَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِمۡ ﴾، خـوا ﷻ فەوتاندنـی، وەک کەسـێ کـە خانـووی بەسـەردا دەڕووخـێ، فەوتاندنـی، ﴿ وَلِلۡكَٰفِرِينَ أَمۡثَٰلُهَا ﴾، وێنـەی ئـەو سـەرەنجامە شـوومانەش لـە بۆسـەدان، بـۆ بێبڕوایانـی هەمـوو ڕۆژگارەکان.

﴿ ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ مَوۡلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾، ئەویـش بەهـۆی ئەوەوەیـە کـە خـوا ﷻ دۆسـت و سەرپەرشـتیاری ئەوانەیـە، کـە بڕوایـان هێنـاوە، ﴿ وَأَنَّ ٱلۡكَٰفِرِينَ لَا مَوۡلَىٰ لَهُمۡ ﴾، هەروەهـا بـە هـۆی ئەوەشـەوەیە، کـە بێبڕوایـان هیـچ سەرپەرشـتیارو دۆسـت و پیشـتیوانیان نین.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**بێبڕوایانـی خەڵـک لە ڕێـی خوا لادەر، خـوا ﷻ کردەوەکانیان پووچـەڵ دەکاتەوە، بـەڵام بڕوادارانـی کـردار بـاش، کـە بڕوایـان بـەو هەقـە هەیـە، دابەزێنراوەتـە سـەر موحەممــەد ﷺ، خــوا ﷻ خراپەکانیــان لــێ دەســڕێتەوەو، حــاڵ و باڵیــان چــاک دەکات، ئەویـش لـە سـۆنگەی ئـەوەوە کـە بێبڕوایـان شـوێن بـە تـاڵ و، بـڕواداران شـوێن هـەق کەوتـوون:**

خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَصَدُّوا۟ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ أَضَلَّ أَعْمَـٰلَهُمْ ۝١ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ وَءَامَنُوا۟ بِمَا نُزِّلَ عَلَىٰ مُحَمَّدٍ وَهُوَ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّهِمْ ۙ كَفَّرَ عَنْهُمْ سَيِّـَٔاتِهِمْ وَأَصْلَحَ بَالَهُمْ ۝٢ ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ٱتَّبَعُوا۟ ٱلْبَـٰطِلَ وَأَنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّبَعُوا۟ ٱلْحَقَّ مِن رَّبِّهِمْ ۚ كَذَٰلِكَ يَضْرِبُ ٱللَّهُ لِلنَّاسِ أَمْثَـٰلَهُمْ ۝٣﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە هەشت بڕگەدا:

١)- ﴿ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَصَدُّوا۟ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ أَضَلَّ أَعْمَـٰلَهُمْ﴾، ئەو کەسانەی بێبڕوان بوون و خەڵکیان لە ڕێی خوا لادا، کردەوەکانی ون کردوون.

(**كَفَروا**) یانی: بێبڕوا بوون بە هەموو ئەو شتانەی پێویست بوو بڕوایان پێ بهێنرێ.

﴿وَصَدُّوا۟ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾، واتـە: لـە ڕێـی خـوا لایانـدا، یاخـود: خەڵکیـان لـە ڕێی خوا لادا، ﴿أَضَلَّ أَعْمَـٰلَهُمْ﴾، خـوا ﷻ کردەوەکانیانـی ون کـردوون، پووچەڵکردوونـەوە، کـە دەفەرمـوێ: ﴿ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟﴾، ئەوانـەی بێبـڕوا بـوون، بێبڕواکانـی ڕۆژگاری پێغەمبـەر ﷺ دەگرێتـەوەو، بێبڕوایەکانـی هەمـوو ڕۆژگارەکانیـش دەگرێتەوە.

هەروەها ﴿ وَصَدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ﴾، چ بـە مانـای خۆیـان لاملییـان کـرد لـە ڕێـی خـواو لایانـدا، بـێ، چ بـە مانـای خەڵکیـان لاداو بوونـە پـەرچ و کۆسـپ لـە ڕێـی خـوادا، بێ، ە هەمـوو ئەوانـە دەگرێتـەوە، کـە بـە درێژایـی مێـژوو وایـان کـردوە، لـە هەمـوو کۆمەڵگاکانـی کـە پێغەمبـەران (عَلَيْهِـم الصَّلَاة وَالسَّلَام) بۆیـان هاتـوون، تاکـو دنیـا بـە کۆتـا دێ، ﴿ وَصَدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ﴾، خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: خەڵکیـان لـە ڕێـی خـوا لاداوە، توێژەرەوانـی قورئانیـش:

أ- هەندێکیان گوتوویانە: (صَدُّوهُمْ عَنِ التَّوْحِيْدِ) لە خوا بە یەکگرتن لایانداون.

ب- هەندێک گوتوویانە: (عَنِ المَسْجِدِ الحَرَام) لە مزگەوتی حەرام لایانداون.

ج- هەندێکیان گوتوویانە: (أنفقوا أموالهم لمعاداة الإسلام)، واتە: ماڵ و سامانی خۆیان خەرج کردوە بۆ دژایەتیی ئیسلام.

بـەڵام لـە ڕاسـتییدا: ﴿ وَصَدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ﴾، ئەگـەر (صـدّوا) مانـای (لازم)ی لـێ بگریـن: لـە ڕێـی خـوا لایانـداوە، خـوا بەیەکگرتـن و هەمـوو شـتەکانی دیکـەی ئیسـلام دەگرێتـەوە، کـە لاملییـان لێکـردوون، ئەگـەر مانـا (مُتَعَدِّي)یەکەشـی بگریـن کـە بـەرکار دەخـوازێ، واتـە: خەڵکیـان لاداوە لـە ڕێـی خـوا، ئنجـا ئـەو کاتـە ڕێـی خـوا، هـەم قورئـان دەگرێتـەوە، هـەم پێغەمبـەر ﷺ دەگرێتـەوە، بەندایەتیـی بـۆ خـواو خـوا بەیەکگرتـن دەگرێتـەوە، مزگەوتـی حـەرام دەگرێتـەوە، ئازاردانـی مسـوڵمانان دەگرێتـەوە، کـە بوونـە کۆسـپ و پـەرچ لـە بەردەمیانـدا، کـە نەهێڵـن بـڕوا بێنـن و، مـاڵ خەرجکردنـی خۆیـان دەگرێتـەوە بـۆ دژایەتیـی ئیسـلام و هەوڵـدان بـۆ کوژاندنـەوەی چـرای ئیسـلام و، هێـرش کردنـە سـەر دەوڵەتـی تـازە پێگرتـووی ئیسـلامیی لـە مەدینـەدا، هەمـوو ئەوانـە دەگرێتـەوە.

ئنجا ئەوانـە هەموویـان خـوا ﷻ چییـان لـێ دەکات؟ ﴿ أَضَلَّ أَعْمَٰلَهُمْ ﴾، خـوا ﷻ کردەوەکانـی هەڵوەشـاندوونەوە، پووچـەڵ کردوونـەوەو، ونکردوون.

ئەمەش زانایان دوو واتایان بۆ لێکداونەوە زانایان:

**یەکەم:** (ضَيَّعَ أَعْمَالَهُمْ الصَّالِحَة)، کردەوە باشەکانی پووچەڵ کردوونەوە.

**دووەم:** ئەو کردەوانەی ئەنجامیان داون بۆ دژایەتیی ئیسلام و مسوڵمانان، خوا ﷻ ئەو کردەوانەیانی بێ ئاکام و بێ ئەنجام کردوون.

زیاتریش مانای دووەمیانی دێتە زەینەوەو بە دڵەوە دەنووسێ، چونکە خوا ﷻ بۆ کردەوەی باش وشەی (أَحْبَطَ)ی بەکارهێناوە، بەڵام (أَضَلَّ أعمالهم) واتە: کردەوە خراپەکانی زایەکردوون، بێ بەرهەمی کردوون، بێ ئاکامی کردوون.

٢)- ﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَءَامَنُوا۟ بِمَا نُزِّلَ عَلَىٰ مُحَمَّدٍ﴾، بەڵام ئەوانەی بڕوایان هێناوە، {بڕوایان هێناوە بە خوا ﷻو، بە فریشتەکانی خواو، بە کتێبەکانی خوا، بە پێغەمبەرانی خوا، بە ڕۆژی دوایی و بە نەخشە دانان و جێبەجێکردنی خوا، قەدەرو قەزای خوا، بە هەموو ئەو شتانەی کتێبی خواو پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵیان پێداون}، چاکەکانیشیان ئەنجامداون، (چاکەکانیش دیسان چ پەیوەندییان بە نیازو خولیاکانی نێو دڵ و عەقڵەوە هەبێ، چ پەیوەندییان بە دەربڕینەکانی زمانەوە هەبێ، چ پەیوەندییان بە کردەوەی ئەندامەکانەوە هەبێ، لە چوارچێوەی هەڵسوکەوتی تاکیی و، هەڵسوکەوتی خێزانیی و، هەڵسوکەوتی کۆمەڵایەتیی و، هەڵسوکەوتی سیاسیی دا، هەمووی دەگرێتەوە)، هەروەها بڕوایان بەوەش هێناوە کە دابەزێنراوەتەوە سەر موحەممەد ﷺ.

کە بە دڵنیایی مەبەست پێی قوڕئانە.

ئەمە خوێندراویشەتەوە:

**أ-** (آمَنُوْا بِمَا أُنْزِلَ).

**ب-** (بِمَا نَزَّلَ).

**ج-** (بِمَا أَنْزَلَ)، بەو جۆرانەش خوێندراوەتەوە، بڕواشیان بەوە هێناوە کە دابەزێنراوەتە سەر موحەممەد ﷺ.

٣)- ﴿ وَهُوَ الْحَقُّ مِن رَّبِّهِمْ ﴾، لە حاڵێکدا ئەو (دابەزێنراوە)، هەق و چەسپاوو ڕاستە لەلایەن پەروەردگاریانەوە.

ئـەم تەعبیـرە کـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَهُوَ الْحَقُّ مِن رَّبِّهِمْ ﴾، (**جُمْلَـةٌ مُعْتَرَضَـةٌ بَـيْنَ الْمُبْتَـدأ وَالخَـبَرِ مُفِيْـدَةٌ لِحَـصْرِ الحَقِّيَّـة فِيْـهِ**)[1]، ئەمـە ڕسـتەیەکی نێواخنـە، لـە نێـوان نیهـادو گـوزارەداو، مانـای کـورت هەڵهێنانـی هـەق دەگەیەنـێ لـە قورئانـدا.

چونکـە: ﴿ وَالَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ وَآمَنُوا بِمَا نُزِّلَ عَلَىٰ مُحَمَّدٍ ﴾، ئەمـە هەمـووی نیهـاد (**مبتـدأ**)ە، ﴿ وَهُوَ الْحَقُّ مِن رَّبِّهِمْ ﴾، ڕسـتەیەکی نێواخنـە، ﴿ كَفَّرَ عَنْهُمْ سَيِّئَاتِهِمْ ﴾، ئەمـەش گـوزارە (**خـبر**)ی ئـەو نیهادەیـە کـە لـە پێشـەوە هاتـوە.

٤)- ﴿ كَفَّرَ عَنْهُمْ سَيِّئَاتِهِمْ ﴾، خراپەکانی لێ سڕیونەوە، (**أَزَالَهَا وَلَمْ يُؤاخِذْهُمْ بِهَا**)، خوا ﷻ خراپەکانی لێ لابردوون و بە هۆیەوە سزای نەداون.

ئنجا بۆچی کردەوەی بێبڕوایان ون و زایە دەبێ و، بێ بەرهەم دەبێ؟

ئـەوە یاسـایەکی خوایـە، لـە ژیانـی مرۆڤـدا دایناوە، کـە هـەر کردەوەیـەک لـە سـەر بناغـەی ئیـمان بـە خـوا نەبـێ، بـۆ ڕۆژی دوایـی پاداشـتی نابـێ، ئـەوە ئەگـەر مەبەسـت پێـی کارە باشـەکانیان بـێ، هەروەهـا بـە پێـی سیسـتم و یاسـای خـوا، هەمـوو ئەوانـەی دژایەتیـی خـوا ﷻ دەکـەن لـە دنیـادا، سـەرەنجام بـێ ئـاکام دەبـن، وەک دەگوتـرێ: (**لِلبَاطِـل جَوْلَـةٌ ثُـمَّ يَضْمَحِـلّ**)، باتـڵ تـۆزێ دێ و دەچـێ، بـەڵام دوایـی بـێ ئـاکام دەبـێ، بۆیـە خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ وَالْعَاقِبَةُ لِلتَّقْوَىٰ ﴾**طـه: ١٣٢**، یـان دەفەرمـوێ: ﴿ فَاصْبِرْ إِنَّ الْعَاقِبَةَ لِلْمُتَّقِينَ ﴾**هـود: ٤٩**، سـەرەنجام بـۆ تەقوایـە، سـەرەنجام بـۆ پارێزکارانـە، بەڵـێ خەڵکـی بـێ تەقـواش هەنـدێ دەسـتکەوتی دەبـن، بـەڵام سـەرەنجامەکەیان سـەر بـە فەتـارەت چـوون و ڕەنـج زایـە بوونـە.

٥)- ﴿ وَأَصْلَحَ بَالَهُمْ ﴾، هەروەها حاڵ و باڵیشی چاککردوون.

---

(١) روح المعاني للآلوسي: ج٢٠، ص٢٦٣.

ئەوانـەی بڕوایـان هێنـاوەو، کـردەوە باشـەکانیان ئەنجـام داون و، بڕوایـان بـەوە هێنـاوە کـە دابەزێندراوەتـە سـەر موحەممـەد ﷺ، کـە هـەر ئـەوەش هەقـە لـە پەروەردگاریانـەوە، خـوا ﷻ خراپەکانـی لـێ سـڕیونەوەو حـاڵ و باڵیشـی چـاک کـردوون، ﴿وَأَصْلَحَ بَالَهُمْ﴾، وشـەی (بَالَهُـمْ: أَمْرَهُـمْ أو شَـأْنَهُمْ أو حَالَهُـمْ)، و (وَالْبَـالُ: كَالْمَصْـدَرِ، مِثْـلُ الشَّـأْنِ، لاَ يُعْـرَفُ مِنْـهُ فِعْـل، وَلَا تَـكَادُ الْعَـرَبُ تَجْمَعُـهُ، إلاَّ فِي ضَرُورَةِ شِـعْرٍ، فَـإِذَا جَمَعُـوهُ قَالُـوا: بَـالَات)، ﴿وَأَصْلَحَ بَالَهُمْ﴾، دەگونجـێ بڵێـی (أَصْلَحَ أَمْرَهُـمْ) کاروبـاری چاککـردوون، یـان (أَصْلَحَ شَـأْنَهُمْ) حاڵـی چاککـردوون، یـان (أَصْلَحَ حَالَهُـمْ)، وشـەی (بَـال) وەک چـاوگ وایـە، وەک وشـەی (شَـأْن)، کـە هیـچ نەزانـراوە کـرداری هەبـێ، (بَال)یـش نەزانـراوە کـرداری هەبـێ و کـۆش ناکرێتـەوە، (شَـأْن) دیـارە بـە (شـؤون) کـۆ دەکرێتـەوە، بـەڵام (بَـال) کـۆ ناکرێتـەوە، مەگـەر لەبـەر ناچاریـی و لـە شـیعردا کـە بـە (بَـالَات) کـۆ دەکرێتـەوە، کەواتـە: ﴿وَأَصْلَحَ بَالَهُمْ﴾، واتـە: حـاڵ و باڵـی چاککـردوون، ئنجـا ئـەو حـاڵ و باڵـە:

أ- لە ڕووی عەقڵییەوە، هۆش و گۆشی باش کردوون.

ب- لە ڕووی دڵ و دەروونەوە، دڵ و دەروونی موڕتاح و ئاسوودە کردوون.

ج- لە ڕووی ڕەوشتەوە، ڕەوشتی بەرزو جوان کردوون.

د- لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە.

هـ- لە ڕووی خێزانییەوە.

و- لە ڕووی تۆکمەیی و تەبایی نێو خۆیانەوە، حاڵ و باڵی باش کردوون.

٦)- ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ٱتَّبَعُواْ ٱلْبَٰطِلَ﴾، ئەویش بە هۆی ئەوەوەیە، ئەوانەی بێبڕوان بە دوای ناهەق کەوتوون، واتە: بە دوای پووچ کەوتوون، شتێکی بێ بنەما، کە کوفرەو شیرکەو گوناهەو تاوانە، (ذَلِكَ إِشَارَةٌ إِلى كُلِّ مَا مَرَّ ذِكْرُهُ «مُبْتَدَأ» خَبَرُه ما يأتي بعده)، کە دەفەرموێ: (ذَلِكَ) ئەمە ئاماژەیە بۆ هەموو ئەوەی تێپەڕیوەو (ذَلِكَ) بە نیهاد دادەنرێ و، گوزارەکەی، ئەوەیە کە دوایی دێ کە دەفەرموێ: ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ٱتَّبَعُواْ ٱلْبَٰطِلَ﴾.

٧)- ﴿ وَأَنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّبَعُوا۟ ٱلْحَقَّ مِن رَّبِّهِمْ ﴾، هەروەها بە هۆی ئەوەوەیە، ئەوانەی بڕوایان هێناوە شوێن هەقێك کەوتوون لەلایەن پەروەردگاریانەوە.

وشـەی (حَـقّ) نـاوە بـۆ هەرچـی خـوا دایبەزانـدوە بـۆ پێغەمبـەر ﷺ، هـەروەک باتیـڵ نـاوە بـۆ هەمـوو ئـەوەی دژی ئاییـن و بەرنامـەی خوایـە، چ لـە ڕووی ئیـمان و عەقیدەکەیـەوە، پێـش ئـەوەش لـە ڕووی بوونناسـییەکەیەوە، چ لـە ڕووی شـەریعەت و کردەوەکانـەوە:

١- لە ڕووی بوونناسییەوە، هەق ئەوەیە کە خوا ئەم گەردوونەی هێناوەتە دی، بە مەبەستی تاقیکردنەوەی مرۆڤ، حیکمەتەکە ئەوەیە، کە ئەم گەردوونە هەموی ڕێک و پێکییەو، ژیانی مرۆڤیش نابێ ناڕێک و پێکیی بێ، ئنجا ئەگەر ژیانی مرۆڤ بەس ئەم ژیانی دنیایە بێ و، لێپرسینەوەو سزاو پاداشت نەبێ، ناڕێک و پێکییە، بەڵام گەردوونی خوا ناڕێک و پێکیی تێدانیە.

٢- لە ڕووی ئیمان و عەقیدەوە، هەق ئەوەیە بڕوا بە خوا بێنین، وەک تاکە بەدیهێنەرو، تاکە خاوەن و پەروەردگارو، تاکە پەرستراو و، بەندایەتیی بۆ بکرێ، پاشان بڕوا بهێنین بە فریشتەکانی خواو، بە کتێبەکانی خواو، بە پێغەمبەرانی خوا (**عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام**)، بە ڕۆژی دوایی.

٣- لە ڕووی شەریعەتەوە، هەق ئەوەیە، کە شەریعەتی خوا فەرموویەتی، حەڵاڵ و حەڕامەکانی کە شەریعەت دیاریی کردوون، خراپەو چاکەکان کە شەریعەت دیاریی کردوون، چ بۆ تاکەکان، چ بۆ خێزانەکان، چ بۆ کۆمەڵگایەکان، چ بۆ دەوڵەتەکان، پێویستە پابەندیی بە چاکەو حەڵاڵەکانی شەریعەتەوە بکرێ و، خۆ بپارێزرێ لە خراپەو قەدەغەکانی، کەواتە: هەق ئەوەیە خوا فەرموویەتی و ناردوویەتی، چ ڕاستەوخۆ لە قورئاندا، چ لە ڕێی پێغەمبەرەکەیەوە، وەک ڕێبازەکەی، باتیڵ و ناهەقیش ئەوەیە پێچەوانەی ئەوە بێ، کە خوا دایبەزاندوەو، چ لە ڕووی بوونناسیەوەو، چ لە ڕووی ئیمان و عەقیدەوە، چ لە ڕووی شەریعەت و کردەوەکانەوە.

٨)- ﴿كَذَٰلِكَ يَضْرِبُ ٱللَّهُ لِلنَّاسِ أَمْثَٰلَهُمْ﴾، بەو شێوەیە خوا ﷻ وێنەکانیان بۆ خەڵکی دەێنێتەوە، خاوەنی (التحرير والتنوير)[1] ئاوا ئەم ڕستە قورئانییە شیی دەکاتەوە: (**كَهَذَا التَّبْيِينِ يُبَيِّنُ اللَّهُ لِلنَّاسِ أَحْوَالَهُمْ، فَلَا يَبْقَوْا فِي غَفْلَةٍ عَنْ شؤون أَنْفُسِهِمْ مَحْجُوبِينَ عَنْ تَحَقُّقِ كُنْهِهِمْ بِحِجَابِ التَّعَوُّدِ، لِئَلَّا يَخْتَلِطَ الْخَبِيثُ بِالطَّيِّبِ، وَلِكَيْ يَكُونُوا عَلَى بَصِيرَةٍ فِي شؤونهم**)، واتە: بەو شێوە ڕوونکردنەوەیە خوا بۆ خەڵکی حاڵ و باڵیان ڕوون دەکاتەوە، تاکو لە بێئاگاییدا نەبن لە بارەی کاروباری خۆیانەوەو، پەردەپۆش نەکرێن لە بارەی تێگەیشتنەوە لە چییەتی خۆیان، بە هۆی پەردەی عادەت پێوەگرتنەوە، تاکو پیس و پاک تێکەڵ نەبن و، لە بارەی کار وباری خۆیانەوە بەرچاو ڕوون بن.

دیارە کە دەفەرموێ: ﴿كَذَٰلِكَ يَضْرِبُ ٱللَّهُ لِلنَّاسِ أَمْثَٰلَهُمْ﴾، (**وَالْأَمْثَالُ: جَمْعُ مَثَلٍ بِالتَّحْرِيكِ وَهُوَ الْحَالُ الَّتِي تُمَثِّلُ صَاحِبَهَا، أَيْ تُشْهِرُهُ لِلنَّاسِ وَتُعَرِّفُهُمْ بِهِ، فَلَا يُلْتَبَسُ بِنَظَائِرِهِ**)، وشەی (**أمثال**) کۆی (**مَثَل**)ە، کە بریتیە لەو حاڵەی خاوەنەکەی وێنا دەکات و دەیناسێنێ بە خەڵک و ناوداری دەکات، بۆ ئەوەی حاڵی ئەو لەگەڵ حاڵەکانی دیکەدا تێکەڵ نەبێ.

ئەمەش هەمووی ڕوونکردنەوەیە بۆ هۆکاری ئەسڵیی، کە بۆچی خوا ﷻ کردەوەی بێبڕوایان شوێن بزر دەکات و پووچەڵی دەکاتەوە، بەڵام حاڵی بڕواداران چاک دەکات، ئنجا کە حاڵی چاککردن، مانای وایە کردەوەکانیشیان چاک دەکات.

شایانی باسە: وشەی (**ذَٰلِكَ**) لەم سوورەتە موبارەکەدا، پێنج جاران دووبارە بۆتەوە، لە ئایەتەکانی: (٣ و ٩ و ١١ و ٢٦ و ٢٨)دا، کە بە زۆریی مەبەست پێی ئەوەیە: ئەوەی باسکرا بە هۆی ئەوەوەیەو ئەوە حیکمەتەکەیەتی، کە دەفەرموێ: ﴿كَذَٰلِكَ يَضْرِبُ ٱللَّهُ لِلنَّاسِ أَمْثَٰلَهُمْ﴾، دەتوانین ئاوا تەعبیری لێ بکەین: واتە: بەو شێوەیە کە باسکرا، حاڵی هەر کام لە بڕواداران و بێبڕوایان ڕوون دەکەینەوە، چ بە کورتیی، چ بە درێژیی، تاکو هەر کامێکیان بەرچاو ڕوون بێ، لە بارەی کار وباری خۆیەوە.

---

(١) ج٢٦، ص٧٧.

ئـەوەی باسـکرا لـەم سـێ ئایەتـە موبارەکـەدا، هەمـووی هاندانـی مسـوڵمانانەو، زەمینـە بـۆ خۆشـکردنیانە کـە جەنـگ بکـەن لـە دژی ئەهلـی کوفـرو، ئەمـە هەمـووی زەمینـە خۆشـکردنە، بـۆ ئـەوەی کـە دوایـی خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿فَإِذَا لَقِيتُمُ الَّذِينَ كَفَرُوا﴾ محمـد: ٤، واتـە: مـادام حـاڵ بـەو شـێوەیە، کەوابـێ هـەر کات بەوانـەی بێبـڕوان گەیشـتن و، بەرەنگاریـان بوونـەوە، ﴿فَضَرْبَ الرِّقَابِ﴾، لـە گەردنیـان بـدەن، واتـە: لـە شـوێنی پێکوژرانیـان بـدەن.

ئـەوەی لێـرەدا خـوا ﷻ بـۆ بێبڕوایـەکان و بـۆ ئیمانـداران باسـی دەکات، هـەر کامیـان بەسـێ سـیفەتان پێناسـەیان دەکات:

## یەکەم: بۆ بێبڕوایان:

١- سیفەتی یەکەمیان: ﴿الَّذِينَ كَفَرُوا﴾، بێبڕوان.

٢- سیفەتی دووەمیان: ﴿وَصَدُّوا عَن سَبِيلِ اللَّهِ﴾، خۆیان لە ڕێی خوا لادەدەن و، خەڵک لە ڕێی خوا لادەدەن.

٣- سیفەتی سێیەمیان: ﴿اتَّبَعُوا الْبَاطِلَ﴾، دوای باتیڵ و شتی پووچ و بێ بنەما کەوتوون، چ لە ڕووی بووناسیی، چ لە ڕووی ئیمان و عەقیدە، چ لە ڕووی بەرنامەی ژیانەوە، بەرنامەی ژیان لە ڕووی سیاسیی و ئابووریی و، کۆمەڵایەتیی و، هەڵسوکەوتەکان و، حەڵاڵ و حەرامەوە.

## دووەم: بۆ بڕواداران:

١- سیفەتی یەکەمیان: ﴿وَالَّذِينَ آمَنُوا﴾، ئەوانەی بڕوایان هێناوە، واتە: بڕوایان هێناوە بە هەموو ئەو شتانەی پێویستە بڕوایان پێ بهێنرێ.

٢- سیفەتی دووەمیان: ﴿وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ﴾، کردەوە باشەکانیان ئەنجام داون و، ئیمانیان بەوەش هێناوە کە دابەزێنراوەتە سەر موحەممەد ﷺ و، ئەویش هەر دەچێتەوە نێو

ئیمان، بەڵام ئەوە وەک زانایان دەڵێن: (**ذِكْرُ الخَاصِّ بَعْدَ العَام**)، باسکردنی تایبەتە لە دوای باسکردنی گشتیی.

٣- سیفەتی سێیەمیشیان: ﴿ٱتَّبَعُوا۟ ٱلْحَقَّ مِن رَّبِّهِمْ﴾، ئەو هەقەی لە پەروەردگاریانەوە هاتوە، شوێنی دەکەون و پەیڕەویی لێ دەکەن، کەواتە: سێ سیفەت بە سێ سیفەت، کە دژو پێچەوانەی یەکدین.

### مەسەلەی دووەم:

**فەرمانکردنی خوا بە بڕواداران کە لە کاتی بەرەنگاربونەوەدا، لە جێی پێ کوژرانی کافران بدەن و، پاش لە پەل و پۆ خستنیان، دەستبەندیان لێ توند بکەن و، دواتر بە منەت یان قەرەبوو بەریان بدەن، هەتا جەنگ تەواو دەبێ و، بشزانن کوژراوانی ڕێی خوا، کردەوەکانیان دەپارێزێ لە هەڵوەشانەوەو، ڕێنماییان دەکات و، حاڵ و باڵیان چاک دەکات و، دواییش لە دوارۆژدا دەیانخاتە ئەو بەهەشتەوە کە بۆی باسکردوون:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ فَإِذَا لَقِيتُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فَضَرْبَ ٱلرِّقَابِ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَثْخَنتُمُوهُمْ فَشُدُّوا۟ ٱلْوَثَاقَ فَإِمَّا مَنًّۢا بَعْدُ وَإِمَّا فِدَآءً حَتَّىٰ تَضَعَ ٱلْحَرْبُ أَوْزَارَهَا ۚ ذَٰلِكَ وَلَوْ يَشَآءُ ٱللَّهُ لَٱنتَصَرَ مِنْهُمْ وَلَٰكِن لِّيَبْلُوَا۟ بَعْضَكُم بِبَعْضٍ ۗ وَٱلَّذِينَ قُتِلُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ فَلَن يُضِلَّ أَعْمَٰلَهُمْ ﴿٤﴾ سَيَهْدِيهِمْ وَيُصْلِحُ بَالَهُمْ ﴿٥﴾ وَيُدْخِلُهُمُ ٱلْجَنَّةَ عَرَّفَهَا لَهُمْ ﴿٦﴾ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە نۆ بڕگەدا:

١)- ﴿ فَإِذَا لَقِيتُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فَضَرْبَ ٱلرِّقَابِ ﴾، ئنجا هەر کات بەرەنگاری ئەوانەی بێبڕوابوون بوونەوە، با پیشەتان لە گەردن دانیان بێ.

ئەم (ف)ە، وەک زانایان دەڵێن: (**الفَاءُ لتَفْرِيعِ هَذَا الكَلَامِ عَلَى مَا قَبْلَهُ**)، بۆ لق لێکردنەوە و جیاکردنەوەی ئەم قسەیە لە هی پێش خۆیەوەو پێیەوە پەیوەستە، واتە: مادام کافرەکان بەو شێوەیە بن، کەواتە: هەر کاتێک بەوانەی بێبڕوان گەیشتن و جەنگتان لە دژ کردن (**إِذَا لَقِيتُم الَّذِيْنَ كَفَرُوا وقاتلتموهم**) چونکە (**لَقِيتُم**) واتە: بەرەنگاریان بوونەوەو، مەبەست لە بەرەنگار بوونەوەش جەنگکردنە، کاتێک لە جەنگدا بەرەنگاری ئەوانەی بێبڕوان، بوونەوە، لە گەردنیان بدەن.

﴿ فَضَرْبَ ٱلرِّقَابِ ﴾، ئـەم تەعبیـرە کنارەیەکـی نـاودارە، بـۆ کوشـتن بە هەر شـێوەیەک کـە بـەر پـەل بکـەوێ، زانایـان دەڵێـن: لـە ڕووی ڕێزمانـی عەرەبییـەوە، ئەسـڵەکەی ئاوایـە، یانـی: (**فَاضْرِبُـوْا ضَرْبَ الرِّقَـابِ**)، لـێ بـدەن، لێدان لـە گەردنیـان، چونکـە مرۆڤ کـە لـە گەردنـی بـدرێ زووتـر تـەواو دەبـێ، واتـە: چـۆن زووتـر دەکوژرێـن وایـان لـێ بـدەن، ئەگەرنـا مـەرج نیـە هـەر خـودی لـە گەردنـدان فەرمانـی پێکرابـێ، بـا لـە نیوچەوانـی بـدات، لـە کەللـەی سـەری بـدات، لـە سـینگی بـدات، چـۆن زووتـر لـە پـەل و پـۆی دەخـات و دەیکـوژێ، بـا لـە شـوێنی هەتـەری بـدات، لـە شـوێنی پێکوژرانـی بـدات، (إذا) لـە (فَـإِذَا لَقِيتُـم)دا، («إذا» **ظَـرْفٌ لِلْمُسْـتَقْبَلِ مُضَمَّنَـةٌ مَعْنَـى الـشَّرْطِ، وَذَلِـكَ غَالِـبُ اسْـتِعْمالِها وَجَـوابُ الـشُّرْطِ قَوْلُـهُ:** ﴿ فَضَرْبَ ٱلرِّقَابِ ﴾)، (إذا) زەرفـە بـۆ ئاینـدە، باسـی کاتـی ئاینـدە دەکات، بـەڵام مانـای مەرجـی خراوەتـە نێـو، وەڵامەکەشـی بریتیـە لـە (**ضَرْبَ الرِّقَـاب**)، یـانی: هـەر کاتـێ پێیـان گەیشـتن، بـا پیشـەتان لێدانـی گەردنیـان بـێ، یەکێـک لـە توێـژەرەوان، دەڵـێ: ماناکـەی ئاوایـە: (**فَـإِذَا قَاتَلْتُـمُ الكُفَّـارَ فَجِـدُّوا فِـي قِتَالِهِـم، فَأمْعِنُـوا فِـي قَتْلِهِـمْ، حَتَّـى إذَا رَأيْتُـمْ، أنْ قَـدْ خَضَدْتُـمْ شَـوْكَتَهُم، فَـأْسِرُوا مِنْهُـمْ أُسْرَى**)، واتـە: ئەگـەر لـە دژی کافـرەکان جەنـگان، بـە جیددیـی لـە کوشـتاریان بخەفتێـن و جەنگـی باشـیان لـە دژ بکـەن و، زۆریـان لـێ بکـوژن، ئنجـا هـەر کاتـێ پێتـان وابـوو دڕک و بڕکـی ئەوانتـان شـکاندووە، لـە پـەل و پۆتـان خسـتوون، بـە دیلیـان بگـرن.

چونکە دوایی دەفەرموێ:

٢)- ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَثْخَنتُمُوهُمْ فَشُدُّواْ ٱلْوَثَاقَ ﴾، هەتا کاتێ ئەوانتان خستە حاڵەتی (**إثْخانْ**)ەوەو لە پەل و پۆتان خستن، ئنجا کەلەپەچەو دەستبەندیان توند بکەن، (**الإِثْخَانُ: الغَلَبَةُ لِأنَّهَا تَتْرُكُ المَغْلُوبَ كَالشَّيْءِ المُثْخَنِ، وَهُوَ الثَّقِيلُ الصَّلْبُ الَّذِي لا يَخِفُّ لِلْحَرَكَةِ**)، (**إثْخانْ**): بریتیە لە بەسەردا زاڵ بوون و شکاندن، چونکە کەسێک کە تێکدەشکێ، بابای تێکشکاو وەک شتێکی قورسی پتەوو خەست وایە، کە ناڕواو جووڵە ناکات، بە کوردیی دەتوانین بڵێین: (**إثْخانْ**): بریتیە لە: لە پەل و پۆ خستن)، واتە: هەر کات لە پەل و پۆتان خستن و واتان

لێکردن جووڵەیان نەمێنێ، یاخود دەستەوکەریان بۆ نەکرێ، داماوو دەستەو پاچەتان کردن، ﴿ فَشُدُّوا۟ ٱلۡوَثَاقَ ﴾، ئنجا کەلەپچەیان توند بکەن و دەستبەندیان مەحکەم بکەن.

﴿ فَشُدُّوا۟ ٱلۡوَثَاقَ ﴾، (**الوَثَاقُ: الشَّيْءُ الَّذِي يَوْثَقُ بِهِ، ويَجُوزُ فِيهِ كَسْرُ الواوِ، ولَمْ يُقْرَأْ بِهِ، وَهُوَ هُنَا كِنايَةٌ عَنِ الأَسْرِ**)، (**وَثاقٌ**): بریتیە لە شتێک کە دەستی پێ دەبەسترێ، یانی: دەستبەندو کەلەپچە، کە بە (**وِثَاق**)یش هاتوە، بەڵام بەم خوێندنەوەیە لە قورئاندا نەهاتوەو، بەس بە (**وَثاق**) خوێندراوەتەوە، ئەگەرنا لە ڕووی زمانی عەرەبییەوە (**وِثَاق**)یش هاتوەو مەبەست پێی بە دیل گرتنە، ئەگەرنا ئەگەر دەستیشی نەبەسترێن کە بە دیل گیرا، ئەوە بە دیل گیراوە، بەڵام بە زۆریی وابووە مرۆڤ کە بە دیل دەگیرێ، دەستبەندی لە دەست دەکرێ و کەلەپچەی دەکرێ، بۆ ئەوەی نەتوانێ دەست ببزێوێ و ئێستاش هەروایە.

٣)- ﴿ فَإِمَّا مَنَّۢا بَعۡدُ وَإِمَّا فِدَآءً ﴾، ئنجا دوایی، یان بە منەت بەریان بدەن، (بە خۆڕایی و بە بەلاش و بە هیممەت و چاکەیان لەگەڵ بکەن)، یاخود بە بەرانبەرو بە قەرەبوو بەریان بدەن.

شایانی باسە: کە دەفەرموێ: ﴿ فَضَرۡبَ ٱلرِّقَابِ ﴾، هەروەها: ﴿ فَشُدُّوا۟ ٱلۡوَثَاقَ ﴾، هەر کام لە: ﴿ ٱلرِّقَابِ ﴾، و ﴿ ٱلۡوَثَاقَ ﴾، (أل)ی ناساندنیان لەسەرە، ناساندنەکەش دوو حاڵەتی هەن:

أ- دەگونجێ بۆ (عهد) بێ، واتە: لە گەردنەکان بدەن (گەردنی کافرەکان) و، دەستبەندەکان توند بکەن، ئەو دەستبەندانەی ناسراون، کە دەستی بێبڕوایانیان پێ دەبەسترێن.

ب- (أل)ەکە قەرەبووی پاڵوەلادراو (**مُضَافٌ إِلَيْهِ**)یە، واتە: (**فَاضْرِبُوا رِقَابَهُمْ**)، (**فَشُدُّوا وَثَاقَهُم**)، لە گەردنی ئەوان (بێبڕوایەکان) بدەن، دەستبەندی ئەوان (بێبڕوایەکان) توند بکەن.

٤)- ﴿ حَتَّىٰ تَضَعَ ٱلۡحَرۡبُ أَوۡزَارَهَا ﴾، تاکو جەنگ قورساییەکانی دادەنێ، (**حَتَّى**) بۆ گەیشتنە بە ئامانجێک، واتە: لەسەر ئەو حاڵە بەردەوام بن، لەسەر کوشتارکردن لە بێبڕوایان لە

کاتی بەرەنگاربوونەوەداو، دواتریش دوای لە پەل و پۆ خستنیان و، دوای شکاندنی دڕکیان، کە لەپچە کردن و دەستبەند خستنە دەستیان و بە دیل گرتنیان، ﴿حَتَّىٰ تَضَعَ الْحَرْبُ أَوْزَارَهَا﴾، هەتا جەنگ قورساییەکانی دادەنێ، قورساییەکانی جەنگ، ئەو چەک و چۆڵەیە کە بەکاردەهێنرێ بۆ کوشتنی دوژمن، (أَوْزَار) کۆی (وِزْر)ە، (وِزْر) بە مانای قورسایی (ثِقل) دێ و، بە مانای گوناهیش دێ، بە مانای چەکیش دێ، ئنجا چ مەبەست چەک بێ، چ مەبەست قورسایی بێ، چ مەبەست گوناهیش بێ، گوناه بەو واتایەی لە جەنگدا بە مانا گشتییەکەی، گوناه دەکرێ، خەڵک دەکوژرێ، خەڵک ماڵوێران دەبێ، هەرچەندە ئەوەی بڕواداران دەیکەن، مادام لەسەر بناغەیەکی شەرعییەو لە کات و شوێنی خۆیدایەو، بە مەرجەکانی خۆیەوەیەتی، بۆ ئەوان گوناه نیە، بەڵام گرنگ ئەوەیە لە جەنگدا، زۆر ماڵوێرانیی و کوژران و برینداریی و سەقەت و کەمئەندام بوون و.... هتد پەیدادەبن.

کە دەفەرموێ: ﴿فَإِمَّا مَنًّا بَعْدُ وَإِمَّا فِدَاءً﴾، هەردووکیان: (مَنًّا) و (فِدَاءً)، (مَنْصُوبَانِ عَلَى الْمَفْعُولِيَّةِ الْمُطْلَقَةِ)، مەنصووبن لەسەر بەرکارێتیی ڕەها، یانی: (إِمَّا تَمُنُّونَ مَنًّا، وإِمَّا تَفْدُونَ فِدَاءً)، یان ئەوەتا بە منەتکردن، منەتیان لەسەر دەکەن و بە هیممەت بەریان دەدەن، یاخود قەرەبوویان لێوەردەگرن، بە قەرەبوو وەرگرتن بەریان دەدەن.

ئنجا ڕستەی: ﴿حَتَّىٰ تَضَعَ الْحَرْبُ أَوْزَارَهَا﴾، وەک چۆن بەو واتایە دێ، بەردەوام بن لەسەر ئەو حاڵەتە تاکو جەنگ قورساییەکانی خۆی دادەنێ، واتایەکی دیکەشی هەیە: (لأَجْلِ أَنْ تَضَعَ الحَرْبُ أَوزَارَهَا)، بۆ ئەوەی جەنگ قورساییەکانی دانێ و کۆتایی بێ، کەواتە: لێرەدا (حَتَّى) دوو واتای هەن:

یەکێکیان: لەسەر مانا ئەسڵییەکەی خۆیەتی، بەردەوام بن هەتا دەگاتە ئەو ئامانجەی جەنگ پێویست نامێنێ و، قورساییەکانی خۆی دادەنێ و، جەنگ کۆتایی پێ دێ.

واتای دووەم: لەسەر ئەو حاڵە بەردەوام بن لە پێناوی ئەوەدا کە جەنگ قورساییەکانی دانێ، یانی: وەک دەگوترێ: (**افْعَل هَكَذَا حَتَّى يَفْهَمُ الطَّرَفُ المُقَابِل شَجَاعَتَكَ**)، وا بکە تاکو بەرانبەرەکەت بزانێ تۆ ئازای، ئەمەش لێرەدا خوا ﷻ دەفەرموێ: لە گەردنیان بدەن دوای ئەوەی لە پەل و پۆتان خستن، ئنجا دەستبەند لە دەستیان توند بکەن، ﴿ حَتَّىٰ تَضَعَ ٱلۡحَرۡبُ أَوۡزَارَهَا ﴾، لە پێناوی ئەوەدا کە جەنگ قورساییەکانی دابنێ، چونکە ئەگەر بێبڕوایان پەل و پۆیان شکاو دڕکیان نەماو، شەڕیان بە مسوڵمانان نەفرۆشت، ئەو کاتە مانای وایە جەنگ لە ئارادا نامێنێ، چونکە لە ئەسڵدا مسوڵمانان کڕیاری جەنگ و شەڕو کوشتار نین، بەڵام شەڕێک کە بە ملیاندابێ، دەیکەن، کاتێ شەڕ بەری دەرگایان پێ دەگرێ، دەیکەن، کەواتە: ئێوە لەسەر ئەو شێوە مامەڵەیە لەگەڵ دوژمنەکانتاندا بەردەوام بن، لە پێناوی ئەوەدا جەنگ قورساییەکانی دابنێ.

٥)- ﴿ ذَٰلِكَ وَلَوۡ يَشَآءُ ٱللَّهُ لَٱنتَصَرَ مِنۡهُمۡ ﴾، ئەوەی باسکرا ئەوەیەو، ئەگەر خواش ویستبای بەسەریان دا زاڵدەبوو، تۆڵەی لێ دەستاندن، لە جیاتی بفەرموێ: (**انْتَصَرَ عَلَيْهِم**) کە (**انْتَصَرَ**) زیاتر بە (**عَلَى**) بەرکار دەخوازێ، بەڵام لێرەدا فەرموویەتی: (**انْتَصَرَ منهم**)، (**لِتَضْمِينِهِ مَعْنَى: الإِنْتِقَامَ**)، تاکو مانای تۆڵەسەندنەوەی بخاتە نێو، واتە: بەسەریاندا سەردەکەوت و تۆڵەی لێ دەستاندن.

٦)- ﴿ وَلَٰكِن لِّيَبۡلُوَاْ بَعۡضَكُم بِبَعۡضٖ ﴾، بەڵام (بۆیە خۆی ژێری نەخستوون و، تۆڵەی لێ نەستاندوون)، تاکو ئێوە بە یەکدی تاقی بکاتەوە، ﴿ وَلَٰكِن ﴾، بۆ (**اسْتِدْراك**)ە، یانی: بەڵام، واتە: بەڵام خوا ﷻ نەیویستوە تۆڵەیان لێ بستێنێ، تاکو ئێوە بە یەکدی تاقی بکاتەوە، ئەگەر ویستبای لە بەینی دەبردن، بەڵام لەو کاتەدا ئێوەی بڕوادار تاقی نەدەکرانەوە بە بێبڕوایەکان، کە ئایا غیرەت و ئازایەتیی و فیداکارییتان لە پێناوی دینی خوادا چەندە، چەندە بوێریی و ئازایەتییتان هەیە؟ هەروەها ئەوانیش بە ئێوە تاقی نەدەکرانەوە.

٧)- ﴿ وَٱلَّذِينَ قُتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ فَلَن يُضِلَّ أَعۡمَٰلَهُمۡ ﴾، ئەوانەی لە ڕێی خواشدا کوژراون، هەرگیز کردەوەکانیان زایە ناکات، خوێندراویشەتەوە: (**قَاتَلُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ**)، کە من ئەم

خوێندنەوەیەی دووەمم پێ ڕاسترە، (**والَّذِينَ قَاتَلُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَلَن يُضِلَّ أَعمَالَهم**)، ئەوانەی لە پێناو خوادا جەنگاون، هەرگیز (خوا ﷻ) کردەوەکانیان ون و زایە ناکات و، نادیدە ناگرێ.

٨)- ﴿ سَيَهْدِيهِمْ وَيُصْلِحُ بَالَهُمْ ﴾، بەڵکو زیاتر ڕاستە ڕێیان دەکات و، حاڵ و باڵیشیان چاک دەکات.

٩)- ﴿ وَيُدْخِلُهُمُ الْجَنَّةَ عَرَّفَهَا لَهُمْ ﴾، دەشیانخاتە بەهەشتەکەوە، کە بۆی باسکردوون، (ئەو بەهەشتەی پێشتر بۆیان باسکراوە) (أل)ەکە بۆ (عهد)ە، واتە: دەیانخاتە بەهەشتەکەوە، ﴿ عَرَّفَهَا لَهُمْ ﴾، کە پێی ناساندوون و بۆی باسکردوون، یاخود (**عَرَّفَهَا لَهُمْ: طَيَّبَهَا وَزَيَّنَهَا لَهُمْ**)، بۆی بۆن خۆشکردوون و بۆی ڕازاندوونەوە، چونکە (**تعريف**) دەگونجێ لە ناساندنەوە بێ، یانی: (**جَعَلَهَا مَعْرُوفَةً لَهُمْ**)و دەشگونجی لە (**عَرْفَ**)ەوە بێ، یانی: (**ذَاتَ عَرْفٍ لَهُمْ**)، (**عَرْف**) بە واتای بۆنخۆشیی و ڕازاوەیی دێ.

ئنجا ئەگەر بە (**قُتِلُوا**) بخوێنرێتەوە، ﴿ وَالَّذِينَ قُتِلُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ ﴾، کەواتە: ﴿ سَيَهْدِيهِمْ ﴾، لە مەودوا ڕاستەڕێیان دەکات، ﴿ وَيُصْلِحُ بَالَهُمْ ﴾، حاڵ و باڵیشان چاک دەکات، واتە: لە بەهەشتدا ڕێنماییان دەکات بۆ جێگەو ڕێگایەکانی خۆیان، وەک لە فەرمایشتی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە، کە فەرموویەتی بەهەشتییەکان لە قیامەتێ بە جێگاو ڕێگای خۆیان ئاشناترو شارەزاترن، لە یەکێکیان لە دنیادا کە دەچێتەوە ماڵی خۆی، لە دنیادا چەندە شارەزاو بەلەدە بچێتەوە ماڵی خۆی، ئیمانداران لە بەهەشتێ دا بە جێگاو شوێنی خۆیان شارەزاترن[1].

بەڵام ئەگەر بە (**قَاتَلُوا فِي سبيل الله**) بخوێنرێتەوە، {ئەوانەی لە پێناوی خوادا جەنگاون}، یانی: لە دنیادا خوا ﷻ زیاتر ڕاستە ڕێیان دەکات و، حاڵ و باڵی دنیاشیان چاک دەکات، بە مانای گشتگیرو فراوانی حاڵ و باڵ چاککردن، کە پێشتر باسمان کرد.

---

(١) والذي نفسي بيده لأحدهم أعرف بمكانه من الجنة....

لـە بـارەی ئـەم ئایەتـە موبارەکـەوە: ﴿ فَإِمَّا مَنًّۢا بَعْدُ وَإِمَّا فِدَآءً ﴾، دەڵێیـن: وەک دەبینیـن خـوا ﷻ دوای باسـکردنی کەلەپچەکـردن و دەسـتبەند خسـتنە دەسـتی دیلەکانـی کافـران لـە جەنگـدا، باسـی دوو حاڵەتـان دەکات، دەفەرمـوێ: (فإمامنـاً وإمافداءً) یـانی: (إمّـا تَمُنُّـونَ مَنًّـا وإمَّـا تَفْـدُونَ فِـدَاءً)، یـان منەتیـان لەسـەر دەکـەن و بـە خۆڕایـی بەریـان دەدەن، یاخـود قەرەبوویـان لێوەردەگـرن.

هەڵبەتـە ئێمـە دوایـی (کورتـە باسـێک دەربـارەی بەدیلگرتن لـە جەنـگ و چۆنیەتی مامەڵەکـردن لەگەڵیانـدا) دەخەینـە ڕوو، هەروەهـا (کورتـە باسـێک دەربـارەی بـە کۆیلەکردنـی مـرۆڤ لـەم ڕۆژگارەدا تاوانـەو دژی شـەریعەتە) دەخەینـە ڕوو.

## هەڵوەستەیەکی پێویست، لەبارەی هەڵوەشاندنەوەی نەسخکرانەوەی ئەو ئایەتەوە (محمد - ٤) :

هەنـدێ لـە زانایـان گوتوویانـە: ئـەم ئایەتـە نەسـخ بۆتـەوە، کـە دەفەرمـوێ: ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَثْخَنتُمُوهُمْ ﴾، هەتـا کاتـێ کـە شـڕو وڕتـان کـردن، لـە پـەل و پۆتـان خسـتن، کوشـتاریی خەسـت و خۆڵتـان لێکـردن، ﴿ فَشُدُّوا۟ ٱلْوَثَاقَ ﴾، ئنجـا دەسـتبەند تونـد بکـەن و بەدیلیـان بگـرن، ﴿ فَإِمَّا مَنًّۢا بَعْدُ وَإِمَّا فِدَآءً ﴾، ئنجـا دوایـی یـان بـە منـەت بەریـان بدەن، بـە هیممەت و بەبـێ بەرانبـەر، ﴿ وَإِمَّا فِدَآءً ﴾، یاخـود بـە قەرەبـوو بەریـان بـدەن، ئنجـا دیـل بـە دیلـە، یاخـود لـە بەرانبـەر پارەدایـە، یاخـود لـە بەرانبـەر کارێـک دایـە، خزمەتێـک دایـە کـە ئـەو دیلـە دەیـکات بـۆ مسـوڵمانان، وەک دوایـی باسـی دەکەیـن.

هەندێـک لـە زانایـان گوتوویانـە: ئـەم ئایەتـە نەسـخ بۆتـەوە، بـەڵام بـە چـی؟ لـەوەدا ڕای جیاوازیـان هەیـە، بـەڵام زۆربەیـان گوتوویانـە: بـە ئایەتـی ژمـارە (٥) ی سـوورەتی (التوبـة)، کـە پێشـتریش باسـمان کـردوە، لـە خـۆوە ناویـان لێنـاوە: (آیـة السَّـیْف) ئایەتـی شمشـێر لـە حاڵێکـدا وشـەی (سـیف) لـە هەمـو قوڕئانـدا نەهاتـوە، بـەڵام بێگومـان ئـەو ڕایـە پشـت ئەسـتوور نیـە، بـە هیـچ بەڵگەیـەک و

ئایەتـی ژمـارە (٥)ی لـە سـوورەتی (**التوبـة**)، وەک دواییـش باسـی دەکەیـن، باسـی بابەتێکـی دیکەیـە، باسـی هەڵوێسـتی مسـوڵمانانە لـە بەرانبـەر کافرانێـک و هاوبـەش بـۆ خـوا دانەرانێکـی پەیـمان شـکێندا، دوای ئـەوەی چـوار مانـگ مۆڵەتیشـیان دراوە، وەک لـە تەفسـیری سـوورەتی (**التوبـة**)دا، بـە تەفصیـڵ باسـمان کـردوە، هەروەهـا لـە تەفسـیری سـوورەتی (**الأنفال**)یـش باسـی ئـەو بابەتەمـان کـردوە، بـەڵام ئێـرە باسـی بابەتێکـی دیکەیـە، باسـی مامەڵەکردنـە لەگـەڵ دیلـی جەنگـدا، چـۆن مامەڵەیـان لەگەڵـدا دەکـرێ؟ کـە خـوا ﷻ دوو حاڵەتـی بـۆ دانـاون: یـان بـە خۆڕایـی بەربدرێـن، یاخـود بـە قەرەبـوو.

پێـم خۆشـبوو لێـرەدا ئـەم قسـەیەی (**الطبري**) بێنـم، لـە تەفسـیرەکەی خـۆی دا[1] دەڵـێ: (**وَالصَّوَابُ مِنَ الْقَوْلِ عِنْدَنَا فِي ذَلِكَ أَنَّ هَذِهِ الْآيَةَ مُحْكَمَةٌ غَيْرُ مَنْسُوخَةٍ، وَذَلِكَ أَنَّ صِفَةَ النَّاسِخِ وَالْمَنْسُوخِ مَا قَدْ بَيَّنَّا فِي غَيْرِ مَوْضِعٍ فِي كِتَابِنَا، أَنَّهُ مَا لَمْ يَجُزِ اجْتِمَاعُ حُكْمَيْهِمَا فِي حَالٍ وَاحِدَةٍ، أَوْ مَا قَامَتِ الْحُجَّةُ بِأَنَّ أَحَدَهُمَا نَاسِخُ الْآخَرِ، وَغَيْرُ مُسْتَنْكَرٍ أَنْ يَكُونَ جَعَلَ الْخِيَارَ فِي الْمَنِّ وَالْفِدَاءِ وَالْقَتْلِ إِلَى الرَّسُولِ ﷺ، وَإِلَى الْقَائِمِينَ بَعْدَهُ بِأَمْرِ الْأُمَّةِ، وَإِنْ لَمْ يَكُنِ الْقَتْلُ مَذْكُورًا فِي هَذِهِ الْآيَةِ، لِأَنَّهُ قَدْ أَذِنَ بِقَتْلِهِمْ فِي آيَةٍ أُخْرَى، وَذَلِكَ قَوْلُهُ:** ﴿فَاقْتُلُوا الْمُشْرِكِينَ حَيْثُ وَجَدْتُمُوهُمْ ﴿٥﴾﴾التوبة).

(**الطبري**) بـاس دەکات و لـە هەندێـک زانایانـەوە هەنـدێ شـوێنەواران دێنـێ، لـە هاوەڵانـەوەو، لـە تابیعینـەوە، کـە گوتوویانـە ئـەم ئایەتـە مەنسـووخە، بـەڵام دوای قسـەکردن لـەو بـارەوە دەڵـێ:

ڕای ڕاسـت لـە لای ئێمـە لـەو بـارەوە ئەوەیـە، ئـەم ئایەتـە موحکەمـە، (واتـە: کارپێکـراوەو حوکمەکـەی لابـراو نیـە)، ئەویـش بەهـۆی ئـەوەوە کـە سـیفەتی لابـەرو لابـراو، (ناسـخ ومنسـوخ)، وەک دواتـر لـە شـوێنێک لـەم کتێبەمانـدا، (واتـە: لـەم تەفسـیرەماندا)، ڕوونمـان کردۆتـەوەو، ئەوەیـە کـە نەگونجـێ دوو حوکمەکەیـان لـە

---

(١) جامع البيان، ج٢٦، ص٤٣.

حاڵێکـدا کۆببنـەوە، (دوو ئایـەت، دوو حوکمـی جیایـان تێـدا بـن و، نەگونجـێ لـە یـەک حاڵـدا کۆببنـەوە)، ئـەو کاتـە ئەگـەر تێـک بگیرێـن، دەڵێیـن: ئەمەیـان ئـەوەی لابـردوە، یاخـود بەڵگەیـەک هەبـێ لەسـەر ئـەوە کـە یەکێکیان لابـەری ئـەوی دیکەیە، بـەڵام لێـرەدا وا نیـە، نـە دوو حوکمەکـە تێکدەگیرێـن، نـە هیـچ بەڵگەیەکیـش هەیـە لـەو بـارەوە کـە ئەمیـان ئـەوی دیکـەی لابـردوە، چونکـە شـتێکی نەگونجـاو نیـە لـە بـاری منـەت لەسـەر دانـان و، فەرەبـوو وەرگرتـن و، هەروەهـا لـە کوشتنیشـدا پێغەمبـەر ﷺ سەرپشـک بکـرێ، هەروەهـا ئەوانـەی لـە دوای وی کاروبـاری میللـەت بەڕێـوە دەبـەن، سەرپشـک بکرێـن لـە نێـوان ئـەو سـێ بژاردەیـەدا، (ئـەو ئـەو سـێیەی هێنـاون) هەرچەنـدە کوشـتن لـە ئایەتەکـەدا بـاس نەکـراوە، بـەڵام خـوا ﷻ لـە شـوێنی دیکـەدا، لـە ئایـەتی دیکـەدا مۆڵەتـی داوە کـە بکوژرێـن، ئەویـش ئەوەیـە خـوای بـەرزی مـەزن دەفەرمـوێ: ﴿فَٱقْتُلُواْ ٱلْمُشْرِكِينَ حَيْثُ وَجَدتُّمُوهُمْ ﴿٥﴾﴾ التوبـة، واتـە: لـە هـەر شـوێنێک بـەر پەلتـان کەوتـن، هاوبـەش بـۆ خـوا دانـەرەکان، بکـوژن.

منیـش قسـەکەی تەبەریـیم هەمـووی بـە دڵـە، جگـە لـەو قسـەیەی دوایـی، کـە بـۆ خـۆی کوشـتن (قتل)یشـی زیـاد کـردوە بـۆ (مَـنّ) و (فِـداء)، ئنجـا بـۆ خۆشـی پاسـاوی بـەوە هێناوەتـەوە کـە هەرچەنـدە کوشـتن بـاس نەکـراوە لـە ئایەتەکـەدا، بـەڵام لـە شـوێنی دیکـەدا باسـکراوە، بـەڵام لـە ڕاسـتییدا ئـەوەی لـە شـوێنی دیکـەدا باسـکراوە، لـە بـارەی کوشـتنی دیلانـەوە نیـەو، لـە بـارەی کوشـتنی کافرانەوەیـە لـە جەنگـدا، بـا ئایەتەکـە بخەینـەڕوو بـۆ ئـەوەی زۆر جـوان ڕوون بێتـەوەو دەربکـەوێ کـە تەبەریـی ڕەحمەتـی خـوای لـێ بـێ، لـەوەدا نەیپێـکاوە، ئەمـەش ئایەتـی ژمـارە (٥) لـە سـوورەتی (**التوبـة**) کـە باسـی کوشـتنی دیلـی کافـران نـاکات، دەفەرمـوێ:

﴿ فَإِذَا ٱنسَلَخَ ٱلْأَشْهُرُ ٱلْحُرُمُ ﴾، ئنجا ئەگەر مانگە قەدەغەکراوەکان تێپەڕین.

مانگـە قەدەغەکـراوەکان ئەوانـەن کـە لـە ئایەتـی ژمـارە (٢)دا خـوای پـەروەردگار دەفەرمـوێ: ﴿فَسِيحُواْ فِي ٱلْأَرْضِ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ﴾، ئـەی هاوبـەش بـۆ خـوا دانـەرەکان،

کە پەیمانتان لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ هەیە! چوار مانگ مۆڵەتە بە زەویدا بڕۆن ئازادن، بۆچی؟ چونکە ئەوانە هەمیشە پەیمانیان هەڵدەوەشاندەوە، ئنجا مادام پابەند نابن بە پەیمانەکانتانەوە، فەرموون چوار مانگ مۆڵەتە، یان دەبێ پابەند بن بە شێوەیەک لایەنی بەرانبەر دڵنیا بکەن کە پابەند دەبن بە پەیمانەوە، یان پەیمان لە بەیندا نامێنێ.

ئنجا دەفەرموێ: ﴿ فَإِذَا ٱنسَلَخَ ٱلْأَشْهُرُ ٱلْحُرُمُ ﴾، ئنجا ئەگەر مانگە جەنگ تێدا قەدەغە کراوەکان و مۆڵەتدراوەکان تەواو بوون، ﴿ فَٱقْتُلُوا۟ ٱلْمُشْرِكِينَ حَيْثُ وَجَدتُّمُوهُمْ ﴾، لە هەر شوێنێک هاوبەش بۆ خوا دانەرەکانتان بەر پەل کەوتن، بیانکوژن، ﴿ وَخُذُوهُمْ ﴾، هەروەها بیانگرن، ﴿ وَٱحْصُرُوهُمْ ﴾، دیسان ئابڵووقەیان بدەن، ﴿ وَٱقْعُدُوا۟ لَهُمْ كُلَّ مَرْصَدٍ ﴾، لە هەموو بۆسەیەکدا بۆیان دابنیشن، ﴿ فَإِن تَابُوا۟ وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُا۟ ٱلزَّكَوٰةَ فَخَلُّوا۟ سَبِيلَهُمْ ﴾، ئنجا ئەگەر گەڕانەوەو نوێژیان کردو زەکاتیاندا، ڕێیان بەردەن و بەریان هەڵدەن، ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾، بە دڵنیایی خوا لێبووردەی بەبەزەییە.

کەواتە: لێرەدا ئەوەی تەبەڕیی دەڵێ: لە ئایەتی دیکەدا باسی کوشتنیان کراوە، باسی کوشتنی دیلان نەکراوە، بەڵکو باسی کوشتنی کافران کراوە لە جەنگدا، بەڵام چۆن مامەڵە لەگەڵ دیلدا دەکرێ؟ لە ڕاستییدا بە پێی ئایەتەکە تەنیا دوو حاڵەت هەن:

﴿ فَإِمَّا مَنًّۢا بَعْدُ وَإِمَّا فِدَآءً ﴾، دوایی یان بە منەت، بە هیممەت بەریان بدەن، بەبێ بەرانبەر، یاخود بە بەرانبەرو قەرەبوو.

## مەسەلەی سێیەم:

**دڵنیاکردنەوەی خوا ﷻ بۆ بڕواداران، کە ئەگەر پشتگیریی ئایین و پەیامی خوا بکەن، خوا ﷻ سەریان دەخات و، پێیەکانیان لە مەیداندا دەچەسپێنێ و دامەزراویان دەکات، ئەوانەی بێبڕواشن بەشیان فەوتان و ڕەنج بە خەسارییە، بە هۆی دزانیان[1] بۆ کتێبی خوا، ئەگەر سەرنجی مێژووش بدەن، دەزانن کە سەرەنجامی ناحەزانی ئایینی خوا، بەسماڵوێرانیی و خاکە سارپی بووە، هۆکارەکەیشی ئەوەیە کە خوا مشوورخۆرو سەرپەرشتیاری بڕوادارانەو، بێبڕوایانیش بێ سەرپەرشتیارو بێ مشوورخۆرن:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن تَنصُرُواْ ٱللَّهَ يَنصُرۡكُمۡ وَيُثَبِّتۡ أَقۡدَامَكُمۡ ﴿٧﴾ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فَتَعۡسٗا لَّهُمۡ وَأَضَلَّ أَعۡمَٰلَهُمۡ ﴿٨﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ كَرِهُواْ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأَحۡبَطَ أَعۡمَٰلَهُمۡ ﴿٩﴾ ۞أَفَلَمۡ يَسِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَيَنظُرُواْ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡۖ دَمَّرَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِمۡۖ وَلِلۡكَٰفِرِينَ أَمۡثَٰلُهَا ﴿١٠﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ مَوۡلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَأَنَّ ٱلۡكَٰفِرِينَ لَا مَوۡلَىٰ لَهُمۡ ﴿١١﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە سێزدە بڕگەدا:

١)- ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ ﴾، خوا ﷻ بانگی بڕواداران دەکات بە خۆشەویسترین نازناویان، کە ئەویش بریتیە لەوەی خوا ﷻ بە ئەهلی ئیمانیان لە قەڵەم دەدات، بێگومان هەر کەسێکیش لە لای خوا بە بڕوادارو، بە خاوەن ئیمان لە قەڵەم درا، مانای وایە هەموو ئەو موژدەو بەڵێنانەی خوا بە دۆستەکانی خۆی داون، بۆیان مسۆگەرو دەستەبەر دەبن، ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! واتە: بڕواتان بە هەموو ئەو شتانە هێناوە، کە پێویستە بڕوایان پێ بهێنرێ.

٢)- ﴿ إِن تَنصُرُواْ ٱللَّهَ يَنصُرۡكُمۡ ﴾، ئەگەر ئێوە خوا سەربخەن، خواش ﷻ سەرتان دەخات، ئەگەر پشتیوانیی لە خوا بکەن، خوا ﷻ پشتیوانییتان لێدەکات، بێگومان خواش ﷻ

---

(١) دزانیان: ڕق لێبوونەوەیان، کەڕهاندنیان، فڵان شتەم دەدزێ: ڕقم لێیەتی.

کە خاوەنی ئەوپەڕی دەسەڵات و باڵادەستییە، پێویستیی بە پشتیوانیی و پاڵپشتیی و سەرخستنی کەس نیە، بەڵام مەبەست پێی سەرخستنی ئایینەکەیەی و پێغەمبەرەکەیەتی ﷺو، سەرخستنی پەیامەکەیەتی.

ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿إِن تَنصُرُوا اللَّهَ يَنصُرْكُمْ﴾، ئەگەر خوا سەربخەن، خوا ﷻ سەرتان دەخات، ئەگەر پشتیوانی خوا بن، خوا ﷻ پشتیوانتان دەبێ، کەواتە: کاتێک پشتیوانیی لە پێغەمبەری خوا ﷺو لە پەیامی خواو لە کتێبی خوا دەکەن، بزانن کە پشتیوانییتان کردوە لە خوا ﷻ، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ هاتوە، ئەرکێک جێبەجێ بکات کە خوا پێی سپاردوەو، کتێبی خواش فەرمایشتی ڕاستەوخۆی خوایە.

هەڵبەتە: ﴿إِن﴾، لە ﴿إِن تَنصُرُوا اللَّهَ﴾دا، (**إن الشَّرْطِيَّة**)ی پێ دەڵێن، کە ئەصڵ لە (**إن الشَّرْطِيَّة**)دا کە دەچێتە سەر ڕستەیەک، ئەوەیە دڵنیایی نیە، مەرجەکە دێتە دی، تاکو دوایی بە مەرج گیراوەکەش بێتە دی، ﴿إِن تَنصُرُوا اللَّهَ يَنصُرْكُمْ﴾، ئنجا ئەگەر مەرجەکە نەیەتە دی، بە مەرجگیراوەکەش نایاتە دی، ئەگەر ئێوە خوا سەر نەخەن، خوا ﷻ سەرتان ناخات، بۆیەش ئەم تەعبیرە بەکارهێنراوە، کە ئاماژەیە بەوە: سەرخستنی خواو پشتیوانیی کردن لە خوا، زەحمەتیی و ڕەنج و لێبڕانی دەوێ، کەواتە: وا مەزانن هەروا شتێکی ئاسان و هاکەزاییە.

٣)- ﴿وَيُثَبِّتْ أَقْدَامَكُمْ﴾، (ئەگەر ئێوە پشتیوانیی لە خواو لە پەیامەکەی و لە پێغەمبەرەکەی بکەن)، (خوا ﷻ) پشتیوانییتان لێدەکات و پێیەکانیشتان دەچەسپێنێ.

پێ چەسپاندن، بێگومان وێناکردنە بۆ ئەوە کە خوا ﷻ ئەو بڕوادارانە ڕاگیراو دامەزراوو نە لەخشاو دەکات، چونکە کەسێک پێی بچەسپێ لە مەیداندا، واتە: پاشەکشە ناکات و ناکەوێ و بەردەوام دەبێ لە بەرهەڵستییکردن.

واتایەکی دیکەشی ئەوەیە، کە لێرەدا خوا ﷻ بەڵێن و موژدە دەدات، بە ئیمانداران: ئەگەر ئێوە پشتیوانیی لە ئایینی خوا بکەن، خوا دڵنیاییتان پێدەدات

لــە مســولّمانەتییتاندا، چونكــە وەک چــۆن كەســێ پێــی چەســپاو بــێ، نالەخشــێ، كەسـێكیش دڵنیایـی هەبـێ، ناجووڵـێ و نـا لەخشـێ.

٤)- ﴿ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فَتَعْسًا لَّهُمْ ﴾، ئەوانەش كە بێبڕوان، بێمرادیی و بێ ئاكامیی بۆ وان.

(**كفــروا**) واتــە: بێبــڕوا بــوون بــە هەمــوو ئــەو شــتانەی پێویســت بــوو بڕوایــان پــێ بێنــن، (**التَّعْـسُ: الشَّـقَاءُ وَيُطْلَـقُ عَـلَى عِـدَّةِ مَعَـانٍ: الْهَـلَاكُ، وَالْخَيْبَـةُ، وَالإِنْحِطَـاطُ، وَالسُّـقُوطُ، والعَثَـار**)، وشــەی (**تَعْـس**) بــە مانــای بــەد بەختیــی و بــێ مرادیــی و بــێ ئاكامیــی دێ، بــەڵام بــۆ چەنــد واتایــەک بەكاردەهێــنرێ بــە پێــی ئــەو ســیاقانەی تێیانــدا هاتــوە، وەک: فەوتــان و پەشــێمانیی و دابەزیــن و كەوتنەخــوارو هەڵەنگوتــن، چونكــە وشــەی (**تَعْـس**) یەكێــک لــە واتایەكانــی: هەڵەنگوتــن و كەوتنــە، ئنجا كەسـێک بخلیســكێ و هەڵبنگــوێ، مانــای وایــە مەزەنــدەی زۆری هەیــە بكــەوێ.

خــوا دەفەرمــوێ: ئەوانــەی بێبــڕوان، بــێ ئاكامیــی و بــێ مرادیــی بــۆ ئــەوان، لــە ڕووی ڕێزمانییــەوە زانایــان دەڵێــن: كــە خــوا ﷻ دەفەرمــوێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فَتَعْسًا لَّهُمْ ﴾، (**تَعْسًا**) لــە ڕووی ڕێزمانییــەوە دوو ئەگــەری هــەن:

**یەكەم:** مەنصووبە لەسەر حاڵەتی بەركاری ڕەها (**الْمَفْعُولِ الْمُطْلَقِ**)، یانی: (**فَتَعِسُوا تَعْسًالَهُمْ**)، بێ مرادن، بێ مرادیی بۆ ئەوان، كە ئەمیش بریتیە لە پاڵدانی چاوگ بۆ لای بكەرەكەی، وەک (**تَبًّا لَهُ، وَيْحًا لَهُ**) لێرەشدا مەبەست لەو پاڵدانە ئەوەیە: بێ مرادیی و بێ ئاكامیی هەر تایبەتە بەوانەوە.

**دووەم:** دەگونجێ (**تَعْسًا لَهُمْ**) خوازرابێتەوە بۆ دوعا كردن لێیان، تووک كردن لێیان، واتە: خوا ﷻ دەفەرموێ: بێ مرادیی بۆ ئەوان، یاخود: پێیان دەگوترێ: بێ ئاكامیی و بێ مرادیی و بەد بەختیی بۆ ئێوە.

٥)- ﴿ وَأَضَلَّ أَعْمَٰلَهُمْ ﴾، (سەربارەش خوا ﷻ) كردەوەكانی ون كردوون و، زایە كردوون، (**أَضَلَّ: ضَيَّعَ وَأَهْلَكَ**)، كردەوەكانی ون كردوون و، شوێن بزر كردوون.

وشەی: کردەوەکانیان (**أعمالهم**) دوو ئەگەران هەڵدەگرێ:

**یەکەمیان:** مەبەست کردەوە باشەکانیانە، کردەوە باشەکانیان پاداشتیان لەسەر وەرناگرنەوە، لەبەر ئەوەی بۆ خوایان ئەنجام نەداون و، تێکەڵیان کردوون لەگەڵ کردەوەی خراپ، کە پیلانگێڕیی و دژایەتییکردنە بۆ ئایینی خوا.

**دووەمیان:** مەبەست لە کردوەوەکانیان ئەو پیلان و فێڵ و نەخشانەن، کە دایاندەڕێژن و، دایاندەنێن بۆ دژایەتییکردنی ئیسلام و مسوڵمانان، خوا ﷻ دەفەرموێ: ئەو پیلان و فێڵانەیان، خوا ﷻ زایەیان دەکات و، ونیان دەکات، وەک یەکێک دەڵێ: بوو بە بڵقی سەر ئاو، یانی: دڵنیابن ئەی مسوڵمانان! پیلان و فێڵەکانیان وەک نەخشی سەر ئاو دەڕۆن، ئنجا خوا ﷻ ئەوەمان بۆ شی دەکاتەوە، بۆچی وایان لێ دەکرێ؟.

٦)- ﴿ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ كَرِهُوا۟ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ ﴾، ئەویش لە سۆنگەی ئەوەوە، ئەوە یان دەدزا، کە خوا دایبەزاندوە، دەگوترێ: فلانکەس فلانکەسی دەدزێ و ڕقی لێیەتی (**يَكْرَهُهُ**)، جاری واش هەیە، دژو پێچەوانەکەیشی: دەیحوببێنێ، خۆشیی دەوێ،

بەڵام دەیکەڕهێنێ واتە: دەیدزێ، یان کەیفی پێنایەت، بەهۆی ئەوەوەیە کە ئەوانە ئەوەیان دزاوە، خوا دایبەزاندوە، یانی: قورئان.

٧)- ﴿ فَأَحْبَطَ أَعْمَٰلَهُمْ ﴾، ئەویش کردەوەکانی هەڵوەشاندوونەوە، ﴿ فَأَحْبَطَ أَعْمَٰلَهُمْ ﴾، یانی: کردەوەکانیانی پووچەڵ کردوونەوە، (**الإِحْبَاطُ: الإِبْطَالُ وَالإِزَالَةُ، أي: جَعَلَهَا ضَائِعَةً لاَ نَفْعَ لَهُمْ مِنْهَا**)، واتە: کردەوە باشەکانیانی زایە کردوون، وای لێکردوە کە لێیان بەهرەمەند نەبن، لێرەدا (أَعْمَٰلَهُمْ) مەبەست پێی کردەوە باشەکانن.

کەواتە: ئەوەی پێشێ، زیاتر وا پێدەچێ مەبەست پێی نەخشەو پیلانەکانیان بێ، ﴿ وَأَضَلَّ أَعْمَٰلَهُمْ ﴾، خوا ﷻ کردەوە خراپەکانیانی ون کردوون، کردەوە باشەکانیشی پووچەڵ کردوونەوە، هەر کردەوەیەک هەوێن و هەناوی ئیمانی تێدا نەبێ، خوا بەیەکگرتنی تێدا نەبێ، بۆ خوا ئەنجامدان و، خوا پێ مەبەست بوونی تێدا نەبێ، وەک شیری بێ هەوێن هەڵدەبزڕکێ و نامەیێ.

ئنجا خـوا ﷻ سـەرنجیان ڕادەکێشـێ بـۆ مێـژوو، کـە دەگونجـێ ئەمـە مەبەسـت پێـی بێبڕوایـەکان بـێ:

٨)- ﴿أَفَلَمْ يَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ﴾، ئایا بە زەوییدا نەڕۆیون؟ ئایا (بێبڕوایان) بە زەویدا نەڕۆیشتوون، تەماشای مێژوویان نەکردوە؟ یاخود بە کردەوە بە زەویدا نەڕۆیشتوون و شوێنەواری گەلە پێشووەکان ببینن؟.

٩)- ﴿فَيَنظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ﴾، ئنجا سەرنج بدەن، سەرەنجامی ئەوانەی پێش وان چۆن بوو؟.

١٠)- ﴿دَمَّرَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ﴾، خوا بەسەریدا ڕووخاندن، خانووەکانیانی بەسەردا کاولکردن، یانی: خوا فەوتاندنی، چونکە (**دَمَّرهُم**) و (**دَمَّرَ عَلَيْهِم**) هەردووکیان بە مانای فەوتاندن دێن، خوا ﷻ فەوتاندنی و ڕووخاندنی و لە بەینی بردن، (**عُدِّيَ بـ عَلَى للمُبَالَغَة**)، بە (علی) بەرکاری خواستوە، لەبەر زێدەڕۆیی، یانی: خوا ﷻ زۆر جاران ئەوانەی بێبڕوان، کاولی کردوون و فەوتاندوونی، هەروەها بۆ ئەوەی ئەو واتایەش بگەیەنێ کە خوا فەوتاندوونی و جێ و ڕێیەکانیشی بەسەردا ڕووخاندوون، ﴿دَمَّرَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ﴾، یانی: ئەوانیشی فەوتاندوەو، خانووبەرەکانیشی بەسەردا ڕووخاندوون، وەک لە ئایەتی (٢٦)ی سووڕەتی (**النحل**)دا، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿فَأَتَى اللَّهُ بُنْيَانَهُم مِّنَ الْقَوَاعِدِ فَخَرَّ عَلَيْهِمُ السَّقْفُ مِن فَوْقِهِمْ وَأَتَاهُمُ الْعَذَابُ مِنْ حَيْثُ لَا يَشْعُرُونَ﴾، خوا ﷻ بیناکانی لە بناغەوە، هەڵتەکاندوون و سەقفەکەیان بەسەردا ڕماوەو، لە شوێنێکەوە سزاو ئازاریان بۆ هاتوە، کە هەستیان پێ نەکردوە.

١١)- ﴿وَلِلْكَافِرِينَ أَمْثَالُهَا﴾، وێنەشی (هی ئەو سزایە) زۆرن بۆ بێبڕوایان، واتە: وێنەی ئەو سەرەنجامە، یاخود وێنەی ئەو سزایە، ﴿أَمْثَالُهَا﴾، ڕاناوی (هـا) دەچێتەوە بۆ سەرەنجامە خراپەکە، یاخود دەچێتەوە بۆ سزایەک کە دەفامرێتەوە لەو سیاقە، یانی: (**وَلِلْكَافِرِيْنَ أَمْثَالُهَا مِنَ العَاقِبَة السَّيِّئَة أو من العقوبة**)، بۆ بێبڕوایان وێنەکانی سەرەنجامی خراپ یان سزا، هەن، (**أَمْثَالُهَا**) کۆی (**مَثَل**)ە، (**مَثَل**) واتە: وەک ئەو، (**أَمْثَالُهَا**) واتە: وێنەکانیان، واتە:

بۆ بێبڕوایان، هاو وێنانی ئەو سزایەی کە بەسەر ئەو گەلە پێشووانە هاتوە، لە بۆسەدان، یان وەک ئەو سەرەنجامە خراپەی بەسەریان هاتوە.

١٢)- ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ مَوۡلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾، ئەویش بە هۆی ئەوەوە کە خوا پشتیوان و دۆستی ئەوانەیە بڕوایان هێناوە، ئنجا خوا ﷻ کۆی ئەوە، هەمووی هۆکاردۆزیی (**تعليل**) دەکات، کە هۆکارەکەی چییە؟ ﴿ذَٰلِكَ﴾، ئەویش بە هۆی ئەوەوە: ﴿بِأَنَّ ٱللَّهَ مَوۡلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾، کە خوا ﷻ سەرپەرشتیاری ئەوانەیە، بڕوایان هێناوە، چونکە (**المَوْلَى: الوَلِيُّ وَالنَّاصِرُ وَالمُعِيْن**)، (**المَوْلَى**) بە مانای مشوورخۆرو سەرخەرو پشتیوان و هاوکار، دێ.

١٣)- ﴿وَأَنَّ ٱلۡكَٰفِرِينَ لَا مَوۡلَىٰ لَهُمۡ﴾، هەروەها بە هۆی ئەوەشەوەیە، کە بێبڕوایان سەرپەرشتیار و هاوکار و پشتیوانیان نیە.

لێرەدا ڕەنگە یەکێک بڵێ: لێرە خوا فەرموویەتی: کافرەکان سەرپەرشتیارو دۆست و پشتیوانیان نیە، بەڵام لە ئایەتی (٣٠)ی سوورەتی (**یونس**)دا، لە سیاقێکدا کە باسی کافرانە، دەفەرموێ: ﴿وَرُدُّوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ مَوۡلَىٰهُمُ ٱلۡحَقِّ﴾، واتە: گێڕدرانەوە بۆ لای خوا مەولای هەقیان، سەرپەرشتیارو مشوورخۆری هەقیان؟ دەڵێین: لێرەدا وشەی (**مَوْلَى**) بە مانای پەروەردگارو خاوەن دێ، چونکە وشەی (**مَوْلَى**) بە مانای خاوەن و سەرپەرشتیارو مشوورخۆر دێ و، بە مانای یارمەتییدەرو هاوکاریش دێ، کە بێگومان لە سوورەتی (**یونس**)دا، کە دەفەرموێ: گێڕدرانەوە بۆ لای خوا مەولای ڕاستەقینەیان، (**مَوْلَى**) لەوێ بە مانای خاوەن و پەروەردگار دێ.

## کورتە باسێک

## بە دیل گرتن لە جەنگداو، چۆنیەتیی مامەڵەکردن لەگەڵیاندا[(١)]

بەڕێـــزان! لە پێنج بڕگەدا ئەم کورتە باسەم کردوە، کە ئەمانە ناوونیشانەکانیانن:

١)- بناغەی مامەڵەی قەوارەیەکی ئیسلامیی لەگەڵ هاووڵاتییانی نامسوڵمانی بێ زەڕدا، چاکەکاریی و هاوکارییە.

٢)- هۆکاری جەنگکردن لە دژی نا مسوڵمان، دەستدرێژییانە، نەک کوفریان.

٣)- حوکمی قورئان بۆ دیلەکانی جەنگ لە نامسوڵمانانی شەڕفرۆش، نە بە کۆیلە کردنەو، نە کوشتن، بەڵکو بەردرانیانە، بە بەلاش یان بە قەرەبوو.

٤)- ناچارکردنی نامسوڵمانانی هاووڵاتیی لەم ڕۆژگارەدا، کە یان سەرانە (**جزية**) بدەن، یان نیشتیمانیان بەجێبێڵن، تاوان و ستەمەو، ماڵ سامانیشیان حەڕامە دەستکاریی بکرێ.

٥)- قەوارەی سیاسیی لە ئیسلامدا، دەبێ مایەی بەختەوەریی سەرجەم کۆمەڵگا بێ و ڕەحمەت بێ بۆیان، نەک بەڵاو گرفتاریی و زەحمەت.

### بڕگەی یەکەم: بناغەی مامەڵەی قەوارەیەکی ئیسلامیی لەگەڵ هاووڵاتییانی نامسوڵمانی بێ زەڕدا، چاکەکاریی و هاوکارییە:

ئایەتێـک، کـە لـەو بـارەوە کردوومانـە بـە بناغـەو جەوهـەری ئـەم بڕگەیـە، ئـەو ئایەتـە موبارەکـەی سـوورەتی (**الممتحنة**)یـە، خـوا دەفەرمـوێ: ﴿ لَّا يَنْهَىٰكُمُ ٱللَّهُ عَنِ ٱلَّذِينَ لَمْ يُقَٰتِلُوكُمْ فِى ٱلدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُم مِّن دِيَٰرِكُمْ أَن تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوٓاْ إِلَيْهِمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُقْسِطِينَ

---

(١) ئـەم کورتـە باسـەم ڕاسـتەوخۆ لـە کتێبـی (هەڵوەشـاندنەوەی پەرگیریـی) هێنـاوە، چاپـی دووەمـی، لاپـەڕە: (٣١٥- ٣٣٥)، بـەڵام بـە پوختیـی و گوشراویـی.

(٨)﴾، واتـە: خـوا ﷻ قەدەغەتـان نـاكات، لەوانـەی لەسـەر دینتـان لـە دژتـان نـە جەنـگاون و، لـە مـاڵ و حاڵـی خۆتـان وەدەریـان نەنـاون، چاكەیـان لەگەڵـدا بكـەن و، ئەندازەیـەک لـە مـاڵ و سامانی خۆتانیـان پـێ بـدەن (وەک هاوكاریـی)، بـە دڵنیایـی خـوا ﷻ بەخشـەرانی خـۆش دەوێـن، (واتـە: ئەوانـەی مـاڵ و سـامانی خۆیـان دەبەخشـن).

كەواتـە: بناغـەی مامەڵەكردنـی دەوڵـەت و كۆمەڵگایەكـی ئیسـلامیی، لەگـەڵ هاووڵاتییانـی نامسـوڵمانیدا، ئەوەیـە كـە لەگەڵیـان چاكـەكارو هـاوكار بـێ، چاكـەكار بێ لـە ڕووی مەعنەوییـەوەو، هـاوكار و دەسـتبارگر بـێ لـە ڕووی ماددییـەوە، بـەڵام بـە مەرجێـک ئـەو نامسـوڵمانانە، هاووڵاتییەكـی بـاش و بـێ زیـان بـن، لـە ڕووی ئاییـن و ژینـەوە، بەرانبـەر بـە مسـوڵمانان و كۆمەڵـگاو قەوارەكەیـان بێ زیـان و زەڕ بـن، كەواتە: هـەر قەوارەیەكـی سیاسـیی ئیسـلامیی لەسـەر جگـە لـەو بناغەیـە مامەڵـە لەگـەڵ هاووڵاتییانـی نامسـوڵمانان دا بـكات و، هـەر جـۆرە سـەتەمێكیان لـە هـەر ڕوویەكـەوە بخاتـە سـەرێ، بـە ئەنـدازەی دەسـتدرێژیی و سـتەمەكەی، لـە ئیسـلام لایـداوەو لـێ دووركەوتۆتـەوەو، بەیـداغ و ڕیـش و شـیعاریش، شـەفاعەتی بـۆ ناكـەن، چونكـە نـاوی بـێ نێـوەڕۆک و، شـیعاری بـێ كـردارو، ڕیشـی بـێ ئیـش، هیـچ ئیعتیبارێكیـان نیـە.

## بڕگەی دووەم: هۆكاری جەنگ كردن لە دژی نامسوڵمان، دەستدرێژییانە، نەك كوفریان:

دەتوانیـن لـەو بـارەوە ژمارەیەكـی زۆر دەق بێنینـەوە، هـەم ئایەتەكانـی قورئـان و، هـەم دەقەكانـی سـوننەت:

١- خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَقَٰتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ يُقَٰتِلُونَكُمۡ وَلَا تَعۡتَدُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُعۡتَدِينَ (١٩٠) ﴾البقرة، واتە: لە ڕێی خوادا دژی ئەوانە بجەنگن كە لە دژتان دەجەنگن و، دەستدرێژیی مەكەن، بە دڵنیایی خوا دەستدرێژكارانی خۆش ناوێن.

٢- هەروەها خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿إِلَّا ٱلَّذِينَ يَصِلُونَ إِلَىٰ قَوْمِۭ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُم مِّيثَـٰقٌ أَوْ جَآءُوكُمْ حَصِرَتْ صُدُورُهُمْ أَن يُقَـٰتِلُوكُمْ أَوْ يُقَـٰتِلُوا۟ قَوْمَهُمْ ۚ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَسَلَّطَهُمْ عَلَيْكُمْ فَلَقَـٰتَلُوكُمْ ۚ فَإِنِ ٱعْتَزَلُوكُمْ فَلَمْ يُقَـٰتِلُوكُمْ وَأَلْقَوْا۟ إِلَيْكُمُ ٱلسَّلَمَ فَمَا جَعَلَ ٱللَّهُ لَكُمْ عَلَيْهِمْ سَبِيلًا ﴿٩٠﴾﴾ **النساء**، واتە: (بۆتان هەیە لەگەڵ کافرانی جەنگ لە دژکەرتان بجەنگن)، جگە لە کەسانێک کە سەر بە کۆمەڵێکن، لە نێوان ئێوەو ئەواندا پەیمانێک هەیە، یان هاتوونە لاتان سینەیان تەنگ و سەغڵەتە، کە لە دژی ئێوە بجەنگن، یان لە دژی کۆمەڵەکەیان، ئەگەر خواش ویستبای بەسەر ئێوەیدا باڵا دەست دەکردن و لە دژتان دەجەنگین، ئنجا هەر کات ئەوان خۆیان لێ پاراستن، لە دژتان نەجەنگین و پەیامی ئاشتییان بۆ ناردن، خوا ڕێتان نادات لە دژیان بجەنگن.

٣- هەروەها خوا ﷻ لەو بارەیەوە دەفەرموێ: ﴿وَإِن جَنَحُوا۟ لِلسَّلْمِ فَٱجْنَحْ لَهَا وَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٦١﴾﴾ **الأنفال**، واتە: هەر کات نامسوڵمانانی شەڕ فرۆش، لای ئاشتییان گرت، تۆش لای ئاشتیی بگرەو، پشتیش بە خوا ببەستە، بێگومان ئەو بیسەری زانایە.

ئەم سێ فەرمایشتەی خوا ﷻ هەر کامیان دەقە، لەسەر ئەوە کە قەوارەی ئیسلامیی و، کۆمەڵگای مسوڵمانان بۆی نیە، جگە لە کافرانی شەڕفرۆش و سەنگەر گرتوو لە دژی ئیسلام و مسوڵمانان، دژی هیچ کافرێکی دیکە بجەنگێ.

کە ئەمەش ڕای زۆربەو جەماوەری زانایانە، کە ئەبوو حەنیفەو مالیک و ئەحمەدیان لە نێودان، ڕای بەرانبەریشی هی شافیعییە، ڕەحمەتی خوا لە هەموویان بێ و، (**إبن تيميّة**) لەو بارەیەوە نامیلکەیەکی نووسیوە بە ناوونیشانی: (**قَاعِدَة في قِتَالُ الكُفَّار هَلْ سببه المقَاتَلَةُ أو الكُفْر؟**)، کە سەرجەم لەو نامیلکەیەدا هەشت بەڵگەی هێناونەوە، بۆ ئیسپاتی ڕاستیی ئەو ڕایەی کە جگە لە کافرانی شەڕفرۆش، دروست نیە، جەنگ دژی هیچ کافرێکی دیکە بکرێ، کە ئێمە بە پوختکردنەوەوەوە و بە شێوەی دارشتنی خۆمان دەیانهێنین:

١- ئەو ئایەتە بە بەڵگە دێنێتەوە: ﴿ وَقَـٰتِلُواْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ يُقَـٰتِلُونَكُمْ وَلَا تَعْتَدُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْمُعْتَدِينَ ﴿١٩٠﴾ ﴾البقرة.

وەک دەبینین حوکمەکە بەوەوە پەیوەست کراوە کە ئەوان جەنگمان لە دژ دەکەن، کەواتە: هۆکاری جەنگ لە دژکرانیان (**عِلَّةُ القِتَال**)، جەنگ کردنیانە لە دژمان، نەک بێبڕواییان.

**٢**- لە سوننەت دا هاتوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە یەکێک لە جەنگەکاندا، بە لای ژنێکی کوژراودا ڕەتبوو، فەرمووی: {**مَنْ قَتَل هذه؟ مَا كَانَتْ هَذِهِ لِتُقَاتِل**} (**أخرجه أحمد: ١٦٣٥، وأبو داود: ٢٦٦٩، والنسائي في الكبرى: ٨٦٢٥، وابن ماجه: ٢٨٤٢، وابن حبان: ٤٧٨٩، والحاكم: ٢٥٦٥**)، کێ ئەمەی کوشتوە ئەمە جەنگی نەکردوە، (بۆچی کوژراوە)؟ کەواتە: هۆکاری کوشتنی کافران جەنگ کردنیانە.

**٣**- خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ لَآ إِكْرَاهَ فِى ٱلدِّينِ ﴾البقرة: ٢٥٦، واتە: ناچارکردن لە وەرگرتنی ئاییندا ڕەوا نیە، ئنجا ئەگەر بابای کافر لەسەر ئەوە کوژرابایە، کە مسوڵمان ببێ، ئەوە مەزنترین جۆری ناچارکردن لەسەر ئایین دەهاتە دی.

٤- خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ فَإِذَا لَقِيتُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فَضَرْبَ ٱلرِّقَابِ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَثْخَنتُمُوهُمْ فَشُدُّواْ ٱلْوَثَاقَ فَإِمَّا مَنًّۢا بَعْدُ وَإِمَّا فِدَآءً ﴾محمد: ٤، واتە: هەر کات بەرەنگاری کافران بوونەوە لە گەردندان پیشەتان بێ، هەتا کاتێک لە پەل و پۆتان خستن، ئەوجار بە دیلیان بگرن، پاشان یان بە چاکە یان بە قەرەبوو بەریان بدەن.

ئنجا ئەگەر تەنیا کوفر پاساوی کوشتنیان بووایە، نەدەبوو بەربدرێن.

**٥**- هەر کۆمەڵێک لە کافران ئامادەیی ئاشتیی دەربڕیبێ، پێغەمبەری خوا ﷺ جەنگی لەگەڵ نەکردوەو، هەرگیز دەستپێشخەری نەکردوە بۆ جەنگ، ئنجا ئەگەر تەنیا کوفر هۆکاری جەنگ و جیهاد بووایە، هەڵوێستەکەی بە جۆرێکی دیکە دەبوو.

٦- ئەگەر تەنیا کوفری کافران ڕەواکەر (مُبیح)ی کوشتنیان بووایە، پێغەمبەری خوا ﷺ سەعدی کوڕی موعازی بە ڕەزامەندیی هۆزی بەنوو قورەیزە، نەدەکردە دادوەر (حاکم)، داخۆ چییان لێ بکات؟ چونکە ئەگەر سەعد بڕیاری بەخشینیشی بۆ دابان، هەر جێبەجی دەکرا، ئنجا ئەگەر تەنیا کوفر پاساوی کوشتنیان بووایە، هەر لە سەرەتاوە دەیکوشتن.

٧- ئەگەر کوفری نامسوڵمانان بە تەنیا ڕەواکەری کوشتنیان بووایە، نەدەگونجا هیچ جۆرە کافرێک سەرانەی لێوەربگیرێ.

٨- بناغە لە کوشتنی مرۆڤەکاندا قەدەغەبوونە، با نامسوڵمانیش بن، خوا ﷻ تەنیا ئەوەندە ڕێی بە کوشتنی مرۆڤان داوە، کە پێویست بێ بۆ چاکبوونی خەڵک و کۆمەڵگا، هەر بۆیەش کوشتنی کافرێک کە زیانی بۆ مسوڵمانان نیە، بە بێ هۆکارێکی پێویستکەر، خراپەکارییەکە خواو پێغەمبەرەکەی حەزی لێ ناکەن.

دوایی ئیبنو تەیمییە لە کۆتاییەکەیدا، دەڵێ: (**إِنَّ الأَصْلِ هُوَ إِبْقَاءُ الكُفَّارِ وَتَقْرِيْرُهُم، لأَنَّ اللهَ تَعَالَى مَا أَرَادَ إِفْنَاءَ الخَلْقِ وَلَا خَلَقَهُمْ لِيُقْتَلُوا، إِنَّمَا أُبِيْح قَتْلُهُمْ لِعَارِضِ ضَرَرٍ وُجِدَ مِنْهُمْ، إلاَّ أَنَّ ذَلِكَ لَيْسَ جَزَاءً لَهُمْ عَلَى كُفْرِهِمْ، فَإِنَّ دَارَ الدُّنْيَا لَيْسَت مَحلَّ جَزَاءٍ بَلِ الجَزَاءُ فِي الآخِرَة**)[1]، واتە: بناغە لە مامەڵە لەگەڵ کافران دا، هێشتنەوەیان و دان بۆ پێداهێنانیانە، چونکە خوای بەرز نەیویستوە دروستکراوەکانی لە بەین بەرێ، بۆیەش دروستی نەکردوون کە بکوژرێن، بەڵکو کوشتنیانی بە ڕەوا داناوە لەبەر زیانێک کە لەوانەوە پەیدابووە، بەڵام ئەوە سزای ئەوان نیە، لەسەر کوفرەکەیان، چونکە مەنزڵگای دنیا شوێنی سزاو پاداشت نیە، بەڵکو شوێنی سزاو پاداشت ڕۆژی دواییە.

---

(١) قاعدة مختصرة في قتال الكفّار ومُداهنتهم، ص٨٧.

**بڕگەی سێیەم: حوکمی قورئان دەربارەی باری دیلەکانی جەنگ لە نامسوڵمانانی شەڕ فرۆش، نە بە کۆیلەکردنەو، نەکوشتن، بەڵکو بە چاکە مامەڵە لەگەڵ کردنیان و، پاشان بەردرانیانە بە چاکە یان بە قەرەبوو:**

پێشتر باسمان کرد کە نامسوڵمانانێکی بێ لایەن (محاید)، یاخود لاشەڕو ئاشتیخواز، بە هیچ جۆرێک دروست نیە، مسوڵمانان ئازاریان بدەن و، شەڕیان پێ بفرۆشن و گێچەڵیان پێ بکەن، بەڵام نامسوڵمانانێک کە دەستدرێژیی دەکەنە سەر مسوڵمانان و شەڕیان پێ دەفرۆشن و، گێچەڵیان پێ دەکەن، ئاشکرایە مسوڵمانان بۆیان هەیە بەرپەرچیان بدەنەوە، وەک خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿فَمَنِ اعْتَدَىٰ عَلَيْكُمْ فَاعْتَدُوا عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا اعْتَدَىٰ عَلَيْكُمْ﴾ البقرة: ١٩٤، واتە: هەر کەسێک دەستدرێژیی کردنە سەر، وەک دەستدرێژییکردنەکەی خۆی دەستدرێژیی بکەنەوە سەر، واتە: بەرپەرچی بدەنەوە.

هەڵبەتە لە جەنگیشدا بە زۆریی وایە، کوژراویش دەبن و دیلیش دەبن، ئنجا ئایا ئیسلام چ ڕێوشوێنێکی داناوە بۆ چۆنیەتیی مامەڵەکردنی مسوڵمانان لەگەڵ دیلانی کافراندا؟

شێوازی مامەڵەکردن لەگەڵ دیلدا و، ڕوونکردنەوەی لە پێنج خاڵدا:

**یەکەم: بە چاکە مامەڵەکردن لەگەڵ دیلدا:**

خوا ﷻ لە سوورەتی (الإنسان)دا، دەفەرموێ: ﴿وَيُطْعِمُونَ الطَّعَامَ عَلَىٰ حُبِّهِ مِسْكِينًا وَيَتِيمًا وَأَسِيرًا ﴿٨﴾ إِنَّمَا نُطْعِمُكُمْ لِوَجْهِ اللَّهِ لَا نُرِيدُ مِنكُمْ جَزَاءً وَلَا شُكُورًا ﴿٩﴾﴾، واتە: (بەندە باشەکانی خوا)، خواردنێک کە حەزیان لێیەتی، دەیبەخشن بە نەدارو هەتیوو دیل، (لە دڵی خۆیاندا پێیان) دەڵێن: بەس لەبەر ڕەزامەندیی خوا خواردنتان دەدەینێ، نە چاکە دانەوەو نە سوپاسگوزارییمان لێتان ناوێ، پێغەمبەریش ﷺ فەرموویەتی: [اسْتَوْصُوا بِالأُسَارَى خَيْرًا] (أخرجه الطبراني في الصَّغير: ٤٠٩)، واتە: لەگەڵ دیلاندا باش بن.

زانایانی ئیسلام هەموویان لەسەر ئەوە یەکدەنگن، کە پێویستە لە ڕووی خواردن و خواردنەوەو پۆشاک و جێگاو ڕێگاو، هەر پێداویستییەکی دیکەوە، مامەڵەی باش لەگەل دیلاندا بکرێ، ڕێزیان لێ بگیرێ و ئەزیەت نەدرێن، وەک ئەبوو یوسوف لە کتێبی (**الخراج**)، لاپەڕە: (١٤٩)دا گوتوویەتی: (**والأسِيْرُ مِنْ أَسْرَى الْمُشْرِكِيْن، لَابُدَّ أَنْ يُطْعَمَ وَيُحْسَنَ إليْهِ حَتَّى يُحْكَمَ فِيْه**)، واتە: دیل لە دیلەکانی هاوبەش بۆ خوا دانەران، پێویستە خواردنی پێ بدرێ و چاکەی لەگەڵدا بکرێ، تاکو بڕیاری لە بارەوە دەدرێ.

## دووەم: ئازادکردنی دیل بە چاکە لەگەڵکردن، یاخود بە قەرەبوو:

وەک ئایەتەکە دەفەرموێ: ﴿ فَإِذَا لَقِيتُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فَضَرْبَ ٱلرِّقَابِ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَثْخَنتُمُوهُمْ فَشُدُّوا۟ ٱلْوَثَاقَ فَإِمَّا مَنًّۢا بَعْدُ وَإِمَّا فِدَآءً ﴾محمد: ٤، کە پێشتریش مانامان کردوە، خوای دادگەر پاش فەرمانکردنی بە کەلەپچەکردنی کافرانی جەنگاوەرو، دەستبەند خستنە دەستیان و، بە دیل کردنیان، دەفەرموێ: ﴿ فَشُدُّوا۟ ٱلْوَثَاقَ ﴾، ئنجا دوایی تەنیا یەک ڕێگا دادەنێ بۆ چۆنیەتیی مامەڵەکردن لەگەڵ دیلەکاندا، ئەویش بریتیە ئازادکردن و بەردانیان، چ بە هیممەت، چ بە قیمەت.

چونکە وشەی ﴿ مَنًّۢا ﴾، یانی: چاکە لەگەڵ کردن و منەتبارکردنی بابای دیل، کە بە بەلاش و بێ بەرانبەر بەربدرێ و، هیچ شتێکی لە بەرانبەردا لێ وەرنەگیرێ، ﴿ فِدَآءً ﴾یش، واتە: بە قەرەبوو، ئنجا ئەو قەرەبووەش دیل بە دیل بێ، یان پارەو سامان بێ، یان خزمەتێک بێ بابای دیل پێشکەشی مسوڵمانانی بکات، وەک چۆن ئەو دیلانەی کافران کە لە جەنگی بەدردا، گیرابوون، هەندێکیان پارەیان نەبوو، قەرەبووەکەیان ئەوە بوو کە یەکی ژمارەیەک لە منداڵی مسوڵمانان فێری نووسین بکەن، وەک لەم دەقەدا هاتوە:

{**عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: كَانَ نَاسٌ مِنَ الْأَسْرَى يَوْمَ بَدْرٍ، لَمْ يَكُنْ لَهُمْ فِدَاءٌ، فَجَعَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِدَاءَهُمْ أَنْ يُعَلِّمُوا أَوْلَادَ الْأَنْصَارِ الْكِتَابَةَ**} (**أخرجه أحمد**:

٢٢١٦ **تعليق شعيب الأرنؤوط: حسن**)، واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ)، دەڵێ: خەڵکێک لە دیلەکانی جەنگی بەدر (هی هاوبەش بۆ خوا دانەرەکانی مەککە)، توانای ماددییان نەبوو، قەرەبوو بدەن، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەی بەقەرەبوو بۆ دانان، کە هەر کامیان ژمارەیەک لە منداڵی پشتیوانانەکان فێری خوێندن و نووسین بکات.

ئنجا وەک پێشتریش ئاماژەمان پێکرد، هەندێک لە زانایان گوتوویانە: ئایەتی ژمارە (٤)ی سوورەتی (**محمد**)، بە ئایەتی ژمارە (٥)ی سوورەتی (**التوبة**)، نەسخ کراوەتەوە، کە هەندێکیان بە ئایەتی شمشێر (**آية السيف**) ناوزەدیان کردوە، کە پێشتر ئەو ئایەتەشمان هێنا کە دەفەرموێ: ﴿ فَإِذَا ٱنسَلَخَ ٱلْأَشْهُرُ ٱلْحُرُمُ فَٱقْتُلُوا۟ ٱلْمُشْرِكِينَ حَيْثُ وَجَدتُّمُوهُمْ ﴾.

بەڵام بێگومان ئەم ڕایە هەڵەیە، چونکە ئایەتەکەی سوورەتی (**التوبة**) بە تایبەت لە بارەی عەرەبە هاوبەش دانەرەکانەوە هاتۆتە خوار، کە پەیمانیان لەگەڵ مسوڵماناندا هەبووە، بەڵام هەر دەرفەتێکیان لێ هەڵکەوتبایە، زەبریان لە مسوڵمانان دەوەشاندو، خەنجەری غەدریان لە پشتەوە لێدەدان، بۆیە خوا ماوەی چوار مانگ مۆڵەتی بۆ دانان، کە بیرێک بکەنەوە، پاش ئەو چوار مانگە، مسوڵمانان دەستکراوە دەبن بەرانبەریان، نەک لەبەر بێ ئیمانییان، بەڵکە لەبەر بێ پەیمانییان! (**إنهم لا أَيْمان لهم**)!

کەواتە: هیچ تێکگیرانێک لە نێوان ئایەتی ژمارە (٤)ی سوورەتی (**محمد**) و، ئایەتی ژمارە (٥)ی سوورەتی (**التوبة**)دا، نیە، هەروەها هەندێک لە زانایان پێیان وابوە کە ئایەتی ژمارە (٦٧)ی سوورەتی (**الأنفال**) لەگەڵ ئەم ئایەتی ژمارە (٤)ی سوورەتی (**محمد**)دا، تێکگیرانی هەیە، بەڵام ئەویش ڕاست نیە، چونکە ئایەتەکەی سوورەتی (**الأنفال**: ٦٧) ئاوایە: ﴿ مَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَكُونَ لَهُۥٓ أَسْرَىٰ حَتَّىٰ يُثْخِنَ فِى ٱلْأَرْضِ ﴾، واتە: هیچ پێغەمبەرێک بۆی نیە، دیلان بگرێ، هەتا دوژمن

لـه پـەل و پـۆ نەخـات لـه زەویـدا، مەبەسـت لـەم ئایەتـەش ئەوەیـە کـە نابـێ دیـل لـه دوژمنـی جەنـگاوەر بگیـرێ، هەتـا دڕکیـان نەشـکێنرێ و بـێ هێـز نەکرێـن.

کەواتــە: ئــەم ئایەتــە باســی حوکمــی مامەڵــە لەگــەڵ دیــلان دا نــاکات، وەک ئایەتەکــەی ســووڕەتی (محمــد)، بەڵکــو باســی حوکمــی بــە دیــل گرتنــی کافرانــی شــەڕکەرو، کاتــی بــە دیــل گرتنیــان دەکات، بۆیــە هیــچ جۆرێــک لــە تێکگیــران لــە نێوانیانــدا نیــە، چونکــە باســی دوو بابەتــی جیــاوازن:

**یەکەم:** کات و حوکمی بە دیل گرتنی کافرانی شەڕکەر، کاتێک ڕەوایە کافرانی شەڕکەر بە دیل بگیرێن، کە دڕکیان شکابێ و لە پەل و پۆ کەوتبن، نەک بە تەماعی وەرگرتنی قەرەبوو، هەر لە سەرەتاوە بە دیلیان بگرن.

**دووەم:** چۆنیەتیی مامەڵەکردن لەگەڵ دیلدا، کە تەنیا دوو حاڵەتی بۆ داناون و دەبێ هەر بەربدرێن، ئنجا یان بە هیممەت یان بە قیمەت.

بەڵکــو دەتوانیــن بڵێیــن: لــە نێــوان ئایەتــی (٦٧)ی (**الأنفــال**)و ئایەتــی (٤)ی (**محمــد**)دا، پەیوەندییەکـی یەکـدی تـەواو کـردن (**علاقـة تكاملیـة**) هەیـە، ئایەتـی (٦٧) ی (**الأنفـال**) دەفەرمـوێ: بۆتـان نیـە لـە کاتـی جەنگـدا دیـلان لـە دوژمنـان بگـرن بـە تەماعـی قەرەبـوو لـێ وەرگرتنیـان، کـە جـارێ دوژمنتـان بـێ دڕک و بـێ دەسـتەڵات نەکــردوون: ﴿ مَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَكُونَ لَهُۥٓ أَسْرَىٰ حَتَّىٰ يُثْخِنَ فِي ٱلْأَرْضِ ﴾، هیــچ پێغەمبەرێـک بـۆی نیـە، دیـلان بگـرێ، تاکـو کوشـتاری خەسـت و خـۆڵ لـە کافـران نـەکات و دڕکیـان نەشـکێنێ، بـەڵام ئایەتەکـەی سـووڕەتی (**محمـد**) دەفەرمـوێ: هـەر کاتێـک بەرەنـگاری دوژمـن بوونـەوەو، کوشـتارتان لێکـردن و لـە پـەل و پۆتـان خسـتن و بـێ دەسـتەڵاتتان کـردن، ئنجـا بـە دیلیـان بگـرن و پاشـانیش یـان بـە چاکـە یـان قەرەبـوو بەریـان بـدەن.

**سێیەم: ڕەوابوونی کوشتنی تاوانبارانی جەنگ:**

بۆیـەش پێغەمبـەری خـوا ﷺ ژمارەیـەک لـە کافرەکانـی هـەڵاواردوون، لـە بەخشـینی گشـتیی و، سـزای کوشـتنی بـۆ دەرکـردوون، لـە جەنگـی بەدریشـداو، لـە جەنگـی ئازادکردنـی مەککەشـدا، هـەر لەسـەر ئـەو بناغەیـەش بـووە کـە پێغەمبـەر ﷺ جەنگاوەرانـی هـۆزی بەنـی قەڕەیـزەی دوای ڕازیبوونیـان بـە دادوەریـی (**حكميّة**) ی سـەعدی کـوڕی موعـازو، بڕیـاری کوشـتن بـۆ درانیـان لـە لایەنـی سـەعدەوە، کـە خۆشـیان ڕازیـی بـوون، دادوەر و حەکـەم بـێ لـە بەینیانـدا، پێغەمبـەر ﷺ بڕیارەکـەی سـەعدی بەسـەردا جێبەجـێ کـردوون، چونکـە: {**الْمَـرْءُ مُؤَاخَـذٌ بِإِقْـرَارِهِ**}، (**أخرجـه البخـاري: ٣٠٤٣، ومسـلم: ١٧٦٨**)، واتـە: مـرۆڤ بـە دانپێنانـی خـۆی دەگیـرێ و، بـە هـۆی ئـەوەوە کـە ئـەوان لـە پشـتەوەڕا خەنجـەری غەدریـان لـە مسـوڵماناندا.

**چـوارەم: ڕاجیایـی زانایـان لـە بـارەی چۆنیەتـی مامەڵەکـردن لەگـەڵ دیلەکانـی جەنگـدا، بەڵگەیـە لەسـەر نەبوونی حوکمێکـی دیاریکراویی شـەریعەت لـەو بارەیەوە:**

هەرچەنـدە زۆربـەی زانایـان ڕایـان وابـووە کـە پێشـەوا و حوکمڕانـی مسـوڵمانان بـۆی هەیـە، یەکێـک لـەو چـوار بژاردەیـە دیاریـی بـکات بـۆ مامەڵەکـردن لەگـەڵ دیلەکانـی جەنگـدا، کـە بریتیـن لـە:

١- بەردان بە چاکەو بە هیممەت (**المَنّ**)و،

٢- بەردان بە قەرەبوو (**الفداء**)و،

٣- کۆیلەکردن (**الإسترقاق**)و،

٤- کوشتن (**القتل**).

بـەڵام ژمارەیـەک لـە زانایانیـش بـە بەڵگـەی ئایەتـی: ﴿ فَإِذَا لَقِيتُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فَضَرْبَ ٱلرِّقَابِ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَثْخَنتُمُوهُمْ فَشُدُّواْ ٱلْوَثَاقَ فَإِمَّا مَنًّۢا بَعْدُ وَإِمَّا فِدَآءً ﴾، گوتوویانـە: دروسـت نیـە دیلـی جەنـگ بکـوژرێ، بەڵکـو دەبـێ ئـازاد بکـرێ، چ بـە هیممـەت، چ بـە قیمـەت، لـە

نێو ئەو زانایانەشدا کە ڕایان وایە، هەر کام لە: (**عبد الله ابن عمر، عبدالله ابن عباس، الحسن البصري، عطاء، الضحاك، السدي، سعيد ابن الزبير، ابن سيرين، الشعبي، عمر بن عبدالعزيز**) هەن، هەمووشیان زاناو پێشەوای بەرجەستەن[1].

بەڵام ئەوەی ئەم ڕا جیاییە یەکلایی دەکاتەوە، ئەوەیە، کە ئایا کام لەو ڕایانە بەرژەوەندیی تێدایەو، لەگەڵ باوی سیاسیی نێودەوڵەتیی ئەو ڕۆژگارەدا گونجاوترە، چونکە هەر کام لە (**ابن قيم الجوزية**) ڕەحمەتی خوای لێ بێ و، (**القَرَافِي**) خوا لێی خۆشبێ، گوتوویانە حوکمە شەرعییەکان دوو جۆرن: جۆرێکیان گشتیی و چەسپاوو نەگۆڕن و وەک خۆیان دەمێننەوە، بەڵام جۆرێکی دیکەیان بە گوێرەی عادەت و نەریت و باوی کۆمەڵگاکان، گۆڕانیان بەسەردا دێ، هەڵبەتە جۆری دووەمیان کە پەیوەستن بە کات و شوێن و بە باوو نەریتەکانەوە، هەر کاتێک کات و شوێن و باوو نەریتەکان گۆڕان، دەبێ ئەوانیش بگۆڕێن، بەو بارەدا کە بەرژەوەندیی و دادگەریی باشتر دێتە دی.

ئنجا لەم ڕۆژگارەشماندا، لە ڕێکەوتننامە نێودەوڵەتییەکان (**الإتفاقات الدولية**)دا، بە تایبەت ڕێکەوتنامەی (جنێف) کە لە (١٢)ی ئابی (١٩٤٩)ی زایینییدا ئیمزا کراوە، هەموو جۆرە دەستدرێژیی کردنە سەر دیلێک قەدەغە کراوە، هەر لە جنێو پێدانەوە بگرە تاکو کوشتن[2]، ئنجا هەرچەندە ئێستاشی لەگەڵدابێ، ئەم ڕێکەوتننامە وەک پێویست جێبەجێ نەکراوە، بەڵام لە سۆنگەی ئەوەوە کە:

**یەک:** ڕێز لە مرۆڤ گرتن، یەکێکە لە پایەو بنەما سەرەکییەکانی شەریعەت: ﴿ وَلَقَدۡ كَرَّمۡنَا بَنِيٓ ءَادَمَ ﴾**الإسراء: ٧٠**، کوشتن و بە کۆیلەکردنی مرۆڤ، یان بە دیل گرتن و هەر جۆرە مامەڵەیەکی دیکەی ناشایستە، پێچەوانەی ڕێزو حورمەتی مرۆڤە.

---

(١) (المصنَّف لعبدالرزاق) بە ژمارە (٩٣٩٢) هەروەها (المغني لابن قدامة) بەرگی (١٣) لاپەڕە (٤٦-٤٧)، هەروەها (فقه الجهاد للدكتور يوسف القرضاوي) بەرگی دوو لاپەڕە (٩٧٧ - ٩٧٨)، هێناویانە.

(٢) بڕوانە: (آثار الحرب لوهبة الزحيلي)، لاپەڕە (٤٠٨).

**دوو:** لەبەر ئەوەی مەسەلەی مامەڵەکردن لە بواری هەڵسوکەوتەکاندایەو، لەو بوارەشدا بناغە ڕەواییەو، سەنگی مەحەک و پێوەریش هێنانە دی بەرژەوەندییە.

**سێ:** دیارە بەرژەوەندیی لەوەدایە کە مرۆڤەکان دەستدرێژییان نەکرێتە سەرو، مسوڵمانانیش لەگەڵ هەر هەوڵ و هەنگاوێک دابن، کە خێرو خۆشیی مرۆڤایەتیی تێدا بێ.

**چوار:** لە قورئاندا تەنیا باسی بەردان و ئازادکردنی دیلان کراوە، چ بێ بەرانبەرو چ بە بەرانبەر ﴿ فَإِمَّا مَنًّا بَعْدُ وَإِمَّا فِدَآءً ﴾، بۆیە دەبێ ئەو شێوە مامەڵەیەش کە کاتی خۆی لەسەر ئەو عورف و باوە بنیات نراوە بگۆردرێ، تاکو بە تەعبیری **(القرافي)** شتێک نەکەین کە پێچەوانەی کۆڕاو مایەی نەزانیی بە ئایین، **(خلاف الإجماع وجهالة بالدين)** بێ، وەک لە کتێبەکەی خۆی **(الإحكام في تمييز الفتاوى عن الأحكام، وتصرُّفات القاضي والإمام)**دا[1]، گوتوویەتی.

## پێنجەم: لە حاڵێکدا کە دوژمنانی مسوڵمانان بکەنە کۆیلە یان بکوژن، هەڵوێستی مسوڵمانان چی دەبێ؟:

وەک پێشتریش باسمان کرد، لە حاڵێکی وادا وەک پێغەمبەری خوا ﷺ وەک مامەڵەکردن لەگەڵ واقیعێکی سەپێنراوداو، وەک کاردانەوەو مامەڵەی هاوشێوە **(ردّ الفعل والمعاملة بالمثل)**، هەندێ مامەڵەی لەگەڵ کافرە شەڕکەرەکاندا دەکرد، کە لە کاتی ئاساییدا نەیدەکردن، ئێمەش لە حاڵێکی وادا لەسەر بنەمای مامەڵەی هاوشێوە بۆمان هەیە، ئەو جۆرە مامەڵانە لەگەڵ دیلەکانی دوژمنانمان بکەین، کە دەقێکی شەریعەت قەدەغەی نەکردبن، بە بەڵگەی: ﴿ فَمَنِ ٱعْتَدَىٰ عَلَيْكُمْ فَٱعْتَدُوا۟ عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا ٱعْتَدَىٰ عَلَيْكُمْ ﴾**البقرة: ١٩٤**، بەڵام ئەویش بە مەرجی چەسپێنراونی بەرژەوەندیی **(تحقيق المصلحة)**، ئەگەرنا ئەگەر زیان و خراپەی زیاتر بێ، ئەویش دروست نیە.

---

(١) ص٢١٨.

**بڕگەی چوارەم: ناچارکردنی نامسـوڵمانانی هـاووڵاتیی لاشـەڕ لەم ڕۆژگارەدا، کە یان سەرانە بدەن، یان ماڵ و حاڵیان بەجێبهێڵن، تاوان و ستەمەو، ماڵ سامانیشیان حەرامە دەستکاریی بکرێ:**

نامسـوڵمانانێک کـە کاتـی خۆی بوونەتـە هاووڵاتیی و ئەهلی مەنزڵگای مسـوڵمانان (**أهـل الـدار**) لـە دەوڵەتـی ئیسـلامییداو، لـە ڕۆژگاری خەلیفـە ڕاشـیدەکاندا خـوا لێیـان ڕازی بـێ، هـەر لـەو کاتـەوە، چ خـاوەن کتێبـەکان: کـە جوولەکـەو نەصرانییەکانـن بـە مسـۆگەریی و، بـە ڕای بەشـێک لـە زانایـان (**صابئـة**)ش دەگرنـەوەو، هەندێکیـان گوتوویانـە: مەجووسـیش دەگرنـەوەو، ئەگـەر ئەوانیـش نەگرنـەوە، پێغەمبـەر ﷺ فەرموویەتـی: مەجووسـەکانیش وەک خـاوەن کتێبـەکان مامەڵەیـان لەگەڵـدا بکـەن.

نامسـوڵمانانێکی ئـاوا، مـادام زیانـی ژیـن و دینییـان بـە مسـوڵمانان نەگەیاندبـێ و، لـە دژیـان نەجەنگابـن، پێویسـتە لەسـەر بناغـەی پەیـمان و ئەمانـی یەکـەم، مامەڵەیـان لەگەڵـدا بکـرێ، چونکـە خـوای دادگـەر لـە بەرانبـەر بێبڕوایانێکـی خـاوەن پەیمانـدا فەرموویەتـی: ﴿ إِلَّا ٱلَّذِينَ عَٰهَدتُّم مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ثُمَّ لَمْ يَنقُصُوكُمْ شَيْـًٔا وَلَمْ يُظَٰهِرُوا۟ عَلَيْكُمْ أَحَدًا فَأَتِمُّوٓا۟ إِلَيْهِمْ عَهْدَهُمْ إِلَىٰ مُدَّتِهِمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُتَّقِينَ ﴿٤﴾ ﴾التوبـة، واتـە: بێجگـە لـەو هاوبـەش دانەرانـەی پەیمانتـان لەگەڵـدا بەسـتوون، پاشـان هیـچ کـەم و کورتییـان لـە بارەتانـەوە نەبـووەو، دژی ئێـوە پشـتگیریی کەسـیان نەکـردوە، ئەوانـە پەیمانەکەیـان هەتـا کاتـی دیارییکراویـان بـە تەواویـی لەگـەڵ بەرنـە سـەر، بێگومـان خـوا پارێزکارانـی خـۆش دەوێـن.

کەواتـە: هـەر جـۆرە سـتەم و دەسـتدرێژییەک بـۆ سـەر ئـەو جـۆرە هاووڵاتییانـە کـە نـا مسـوڵمانن، بـۆ سـەر خوێنیـان، بـۆ سـەر نامووسـیان، بـۆ سـەر سـامانیان، بـۆ سـەر هێمنیـی و ئاساییشـیان تاوانێکـی زلـەو، سـزای خـوای تونـدی دادگەری لەسـەرە، لـە دنیـاو دواڕۆژدا، هەڵبەتـە ئەگـەر کەسـانێکیان پەیمانیـان شـکاندو، زیانیـان بـە مسـوڵمانان گەیانـد، ئـەو چەنـد کەسـە یـان ئـەو کۆمەڵـە، تەنهـا خۆیـان بەرپرسـیارن

و دووچاری سزاو تۆڵەش دەبنەوە، نەک هەموویان، چونکە: ﴿وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ﴾ **الأنعام: ١٦٤**، واتە: هیچ گوناهکارێک گوناهی کەسی دیکە هەڵناگرێ.

بۆ مەسەلەی سەرانە وەرگرتن لە خاوەن کتێبەکانی ئەم ڕۆژگارەش، دەڵێین:

**یەکەم:** قەوارەیەکی سیاسیی کە ڕەوایەتیی پێنەدرابێ لەلایەن مسوڵمانانەوەو، بە ڕێ و ڕەسمی شەرعیی نەهاتبێتە کایەوە، هەر بۆی نیە ئەصڵەن بوونی هەبێ، چ جای ئەو ڕەفتارانە بکات.

**دووەم:** ڕای ڕاست و بەڵگەدار - وەک لە بەرگی چوارەمی مەوسووعەی (ئیسلام و دەوڵەتداریی) هێناومانە - ئەوەیە کە سەرانە ئەگەر وەریش بگیرێ، تەنیا لەوانە وەردەگیرێ کە لە جەنگی دژی دەوڵەتی ئیسلامییدا، دەشکێن، یان واز لە جەنگ دێنن و، ئامادە دەبن ببنە هاووڵاتیی لە دەوڵەتی ئیسلامییدا، نەک لە هەر نا مسوڵمانێک، بە بەڵگەی ئەوەی کە سێ هۆزە جوولەکەکەی مەدینە (**بنو قینقاع، بنو النضیر، بنو قریظة**)، سەرانەیان لێ داوا نەکراوە، لەبەر ئەوەی لە سەرەتاوە جەنگیان نەکردوە دژی ئیسلام و مسوڵمانان.

**سێیەم:** لەسەر ڕای زۆرێک لە زاناو شەرعزانانی هاوچەرخ و، منیش ڕایەکەیانم پێ ڕاستە: لەم ڕۆژگارەدا نامسوڵمانانیش لە سایەی دەوڵەتەکانی جیهانی ئیسلامیی دا، هەر کات بەشداریی سەربازییان کردو، وەک مسوڵمانان بەشدارییان کرد لە بەرگریی کردن لە وڵاتدا، سەرانەیان لەسەر لادەچێ، چونکە سەرانە ڕەمزو هێمای هاووڵاتیی بوون و تەباییانە لەگەڵ دەوڵەتداو، بەسەربازییکردنیشیان ئەو ئامانجە دێتە دی، کاتی خۆیشی لە دەوڵەتی ئیسلامییدا ڕێککەوتنی لەو بابەتە، چەند جارێک لەگەڵ نامسوڵمانانی ئەوسای دەوڵەتی ئیسلامییدا کراوە، بۆ وێنە:

**أ**- (**جماعة الجراجمة**) کە نەسرانیی بوون، ڕێککەوتنێکی ئاوهایان لەگەڵ نوێنەری ئەبوو عوبەیدەی جەڕڕاح دا کردوە.

**ب**- (**سوید بن مقرّن**) کە یەکێک لە فەرماندەکانی عومەری کوڕی خەتتاب بووە، خوا لێی ڕازی بێ، ڕێککەوتنێکی ئاوای لەگەڵ (میرزبان) و ئەهلی (دهستان) و ئەهلی (جرجان)دا کردوە.

ج- هەروەها عوتبەی کوڕی فەرقەدیش لەگەڵ خەڵکی ئازەربایجان دا، هەمان ڕێککەوتنی کردوە، کە هەر کات هاوکاریی سەربازیی مسوڵمانانیان کرد، سەرانەیان لەسەر لادەچێ[1].

کۆتایی ئەم برگەی چوارەم، بەو فەرمایشتەی پێغەمبەر ﷺ دەهێنین، کە فەرموویەتی: {قَالَ اللَّهُ عَزَّوَجَلَّ: ثَلَاثَةٌ أَنَا خَصْمُهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، وَمَنْ كُنْتُ خَصْمَهُ خَصَمْتُهُ، رَجُلٌ أَعْطَى بِي، ثُمَّ غَدَرَ، وَرَجُلٌ بَاعَ حُرًّا، فَأَكَلَ ثَمَنَهُ، وَرَجُلٌ اسْتَأْجَرَ أَجِيرًا فَاسْتَوْفَى مِنْهُ، وَلَمْ يُوَفِّهِ أَجْرَهُ} **(أخرجه أحمد: ٨٦٧٧، تعليق شعيب الأرنؤوط : إسناده حسن)** واتە: خوا ﷻ فەرموویەتی، سێ کەس خۆم لەسەریان دەبمە داواکار (**مُدَّعي**) لە ڕۆژی قیامەتدا، هەر کەسێکیش من داواکاربم لەسەری، لێی دەبەمەوە: پیاوێک بە ناوی منەوە پەیمان بدات و بیشکێنێ و، پیاوێک مرۆڤێکی ئازاد بفرۆشێ و پارەکەی بخوات، پیاوێک کرێکارێک بە کرێ بگرێ و ئیشەکەی خۆی پێ بکات و، دوایی کرێیەکەی نەداتێ.

کەواتە: هەر کامێک لەو سێ ڕەفتارە، گوناهی زۆر گەورەن و سزای زۆر توندیان لەسەرە.

## ٥)- قەوارەی سیاسیی لە ئیسلامدا، دەبێ مایەی بەختەوەریی سەرجەم کۆمەڵگا بێ و ڕەحمەت بێ بۆیان، نەك بەڵاو گرفتاریی و زەحمەت:

قەوارەیەکی سیاسیی کە بە ناوی ئیسلام و مسوڵمانانەوە بنیات دەنرێ، دەبێ هەموو هەوڵ و تەقەلالای خۆی لەسەر ئەوە چڕ بکاتەوە، هەرچی زیاترو باشتر هاووڵاتییانی ژێر سایەی بە مسوڵمانان و نامسوڵمانانەوە، ئاسوودەو بەختەوەر بکات و کێشەو گرفتەکانیان چارەسەر بکات، تاکو بەرجەستەکەری ناوونیشانی

---

(١) ئەمە کتێبی (فتوح البلدان للبلاذري)، لاپەڕە: (٢١٧)و، (تأريخ الطبري) لە بەرگی دوو لاپەڕە (٥٣٠ و ٥٣٩)دا، و (فقه الجهاد)ی (دکتور یوسف القرضاوي) لاپەڕە (٨٥٠-٨٥١)، ئەوانەیان هێناوە.

پێغەمبەرەکەیـان بـێ ﷺ: ﴿ وَمَآ أَرْسَلْنَـٰكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَـٰلَمِينَ ﴿١٠٧﴾ ﴾**الأنبيـاء**، واتـە: تۆمـان تەنیـا بـە بەزەیـی بـۆ هەمـوو جیهانییـان نـاردوە، بۆیـە دەبـێ دەوڵەتـی ئیسـلامیی بـە شـێوەیەک بـێ کـە خەڵـک و جەمـاوەری ژێـر سـایەی، هەمیشـە بـۆ سـەلامەتیی و بەردەوامیـی، سـەرگەرمی پاڕانـەوەو نـزا بـن، نـەک بـە پێچەوانـەوە: خەڵـک و جەمـاوەر لـە پەنایـدا، تـرس و بیمیـان هەبـێ و، لـە دڵـە ڕاوکەدابـن و خـوا خوایـان بـێ ڕۆژێ زیاتـر سـێبەری شـوومی لەسـەریان لابچـێ، پێغەمبـەر ﷺ لـەو بـارەوە فەرموویەتـی: {**خِيَـارُ أَئِمَّتِكُـمُ الَّذِيـنَ تُحِبُّونَهُـمْ وَيُحِبُّونَكُـمْ، وَتُصَلُّـونَ عَلَيْهِـمْ وَيُصَلُّـونَ عَلَيْكُـمْ، وشِرَارُ أَئِمَّتِكُـم الَّذِيـنَ تُبْغِضُونَهُـمْ وَيُبْغِضُونَكُـمْ، وَتَلعَنُونَهُـمْ وَيَلْعَنُونَكُـمْ**} (**أخرجـه مسـلم: ١٦٥٥**)، واتـە: باشـترین پێشـەواو حوکمڕانانتـان، ئەوانـەن کە خۆشـتان دەوێـن و خۆشـیان دەوێـن و، نزایـان بـۆ دەکـەن و نزاتـان بـۆ دەکـەن و، خراپتریـن حوکمڕانانتـان ئەوانـەن، کـە ڕقتـان لێیانـەو ڕقیـان لێتانـە، نەفرینیـان لـێ دەکـەن و نەفرینتـان لـێ دەکـەن.

## كورتە باسێك

## بە كۆیلەكردنی مرۆڤ لەم ڕۆژگارەدا تاوانەو، دژی شەریعەتە[1]

ئەم كورتە باسە لە چوار بڕگەدا، دەخەینەڕوو:

**١)**- ئاوڕدانەوەیەك لە مێژوو.

**٢)**- ئیسلام چی لە سیستمی كۆیلایەتیی كرد؟

**٣)**- لە كەیەوە بڕیاری نەهێشتنی كۆیلایەتیی درا؟

**٤)**- ئایا لەم ڕۆژگارەدا دروستە مرۆڤ بكریتە كۆیلە؟

### بڕگەی یەكەم: ئاوڕدانەوەیەك لە مێژوو:

سەرجەم سەرچاوە مێژووییەكان پێمان دەڵێن: كۆیلایەتیی **(الرِّق، الإسْتِعْبَاد)**، لە لای ئۆممەت و كۆمەڵگا پێشووەكان، وەك میسرییەكان و، فارسەكان و، بابلییەكان و، ڕۆمەكان و، عەڕەبەكان، شتێكی باو بووە، هەروەها جوولەكایەتیی **(الیهودیة)**، بڕیاری لەسەر داوەو، نەصرانییەتیش دانی پێدا هێناوە، بگرە تێكڕای فەیلەسووفەكانی یۆنان وەك ئەفلاتوون و ئەڕەستۆو یاسازانەكانی ڕۆم وەك شیشرۆن و سینیكیش، سەلماندوویانەو بە شتێكی ئاساییان زانیوە، یەكەم جاریش ڕۆمەكان دیلەكانی جەنگیان كردوونە كۆیلە[2]، هەروەها كتێبەكانی جوولەكەو نەصرانییەكان بە ڕاشكاویی باسی ڕەوایەتیی كۆیلایەتییان كردوە، بۆیە ئێستاش

---

(١) ڕاستەوخۆ لە كتێبی هەڵوەشاندنەوەی پەڕگیریی (نقض التطرف)، وەری دەگرین، لاپەڕە: (٢٨٣ -- ٣٠٩)، چاپی دووەم.

(٢) هەموو ئەو زانیارییانە لە كتێبی: (الـرِّقُّ فِي الإسـلام)ی شەفیق پاشا، لاپەڕە: (٩ - ٢٧)، هەروەها (مدونة جستنیان) لاپەڕە (١١).

لـە (پەیمانـی کـۆن)دا کـە کتێبـی پیـرۆزی هـەر کام لـە جوولەکـەو نەصرانییەکانـە، ئـەم دەقـە هەیـەو دەیخوێنینـەوە، **(وَحِيْنَ تَتَقَدَّمُونَ لِمُحَارَبَةِ مَدِيْنَةٍ فَادْعُوهَا لِلصَّلْحِ أَوَّلاً، فَإِنْ أَجَابَتْكُمْ إِلَى الصُّلْحِ وَاسْتَسْلَمَتْ لَكُمْ، فَكُلُّ الشَّعْبِ السَّاكِنِ فِيهَا يُصْبِحُ عَبِيدَاً لَكُمْ)**[1]، واتـە: کاتێـک بـۆ شـەڕی شـارێک دەچـن، یەکـەم جـار بانگیـان بکـەن بـۆ صوڵـح، ئنجـا ئەگـەر صوڵحیـان کـردو ملکەچتـان بـوون، ئـەوە هەمـوو دانیشـتووانی دەبنـە کۆیلەتـان.

هەروەهـا ئێسـتاش لـە (پەیمانـی نـوێ)دا، کـە کتێبـی نەصرانییەکانـە، ئـەم دەقـە هەیـە دەیخوێنینـەوە: **(أَيُّهَا الْعَبِيدُ! أَطِيعُوا سَادَتَكُمُ الْبَشَرِيِّيـنَ بِخَوْفٍ وَارْتِعَادٍ مِنْ قَلْبٍ صَادِقٍ، كَمَنْ يُطِيعُ الْمَسِيحَ)**[2]، واتـە: ئـەی کۆیلـەکان! فەرمانبەریـی مرۆڤـە خاوەنەکانتـان بکـەن بـە تـرس و لـەرزەوەو بـە دڵێکـی ڕاسـتەوە، وەک ئـەو کەسـەی کـە فەرمانبەریـی مەسـیح دەکات.

کەواتـە: بـا بزانـری کتێبـی پیـرۆز **(الكتـاب المقـدس)**ی جوولەکـەو نەصرانییـەکان لە بـارەی کۆیلایەتییـەوە چـی دەڵـێ؟ پاشـان سـەرنجی قورئانیـش دەدەیـن لەو بـارەوە.

## بڕگەی دووەم: ئیسلام چی لە سیستمی کۆیلایەتیی کرد؟

کاتێـک ئیسـلام دوایـن نوسـخەی هیدایـەتی خـوا و، دوایـن بەرنامـەی خـوا بـۆ مرۆڤایەتیـی هـات، سیسـتمی کۆیلایەتیـی **(نظـام الـرق)**، چەنـدان سـەدە بـوو ڕەگ و ڕیشـەی بـە قووڵایـی مێـژووی بەشـەردا چـوو بـووە خـوارو، لـە نێـو سـەرجەم گـەل و وڵاتانـی دنیـادا شـتێکی بـاوو کارپێکـراو بـوو، بـە ئاسـایی و سرووشـتیی تەماشـا دەکـراو، بـە پایەیەکـی گـەورەی ژیانـی سیاسـیی و ئابووریـی و کۆمەڵایەتیـی کۆمەڵـگاکان

---

(١) التفسير التطبيقي للكتاب المقدس، العهد القديم، سفر التثنية، الإصحاح ٢٠، ص٣٩٢.

(٢) التفسـير التطبيقـي للكتـاب المقـدس، العهـد الجديـد، الرسـالة إلى المؤمنـين في أفسـس، السـادة والعبيـد، ص٢٥٣٢.

دادەنرا، وەک چۆن ئێستا سیستمی سەرمایەداریی، بە بناغەی زۆربەی قەوارە سیاسیی و کۆمەڵایەتیی کۆمەڵگاکانی ئەم ڕۆژگارە دادەنرێ، بۆیە نەدەگونجا ئیسلام لەلایەن خۆیەوە بە نووکە قەڵەمێک ئەو واقیعە پڕ ستەم و نامرۆڤانەیە بگۆڕێ، هەرچەندە هێندەی کێوێک لەسەر دڵی قورس بوو، کە مرۆڤەکان هەندێکیان هەندێکی دیکەیان بکەنە کۆیلەو کەنیزەک و، وەک کەل و پەل و ئاژەڵ، سەوداو مامەڵەیان پێ بکەن، بۆیە ئیسلام هەڵسا بە گۆڕینی ئەو واقیعە نا لەبارەو، بۆ ئەوەش سیاسەتێکی پلە پلەیی گرتە بەر بەم شێوەیەی خوارێ:

## هەنگاوەکانی چارەسەرکردنی ئیسلام بۆ سیستمی کۆیلایەتیی:

### ١- چارەسەری فیکریی:

لە سۆنگەی ئەوەوە کە هەڵسوکەوتەکان (التصرفات)، زادەی بۆچوونەکان (التَصَوُّرات)ن، ئەگەر بویسترێ هەڵسوکەوتێکی خراپ چاک بکرێ، دەبێ ئەو بیر و بۆچوونە چەوتەی کە لێوەی هەڵدەقوڵێ، چاک بکرێتەوە، ئیسلامیش بۆ بنبڕکردنی دیاردەی کۆیلایەتیی هەر وای کردوە، سەرەتا خوای بەرزی کاربەجێ لە چەندان ئایەتدا، ئە و ڕاستییەی ڕاگەیاند کە مرۆڤەکان هەموویان وەچەو زادەی باب و دایکێکن و، یەکسانن، بە پارێزکاریی بەرزیی و نزمییان تێدا پەیدادەبێ، بۆ وێنە: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَـٰكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَىٰ وَجَعَلْنَـٰكُمْ شُعُوبًا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓا۟ ۚ إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ ٱللَّهِ أَتْقَىٰكُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ ﴿١٣﴾ ﴾**الحجرات**، واتە: ئەی خەڵکینە! ئێمە ئێوەمان لە نێرو مێیەک وەدیهێناوەو، گێڕاومانن بە چەندان گەل و هۆز، تاکو پێک ئاشنا بن و، بێگومان بەڕێزترینتان لە لای خوا، پارێزکارترینتانە، بە دڵنیایی خوا زانای شارەزایە.

ئەوەش هەم بۆ ئەوەی کۆیلەکان بەر لە جەستەیان، ڕووح و ناخیان ئازاد بێ و، هەست بە ڕێزو حورمەتی هاوتاو یەکسانی خۆیان بکەن لەگەڵ گەورەکانیانداو، هەم گەورەکانیشیان بزانن کە هیچیان لەوان زیاتر نیەو هەموویان وەک یەکن.

### ٢- وشککردنی سەرچاوەکانی هاتنی کۆیلە:

پێش هاتنی ئیسلام جگە لە دیلەکانی جەنگ، لە چەند ڕێیەکی دیکەشەوە خەڵک دەکرانە کۆیلە:

**یەکەم:** قەرزدارێک کە قەرزەکەی پێ نەدرابایەوە، دەبووە کۆیلەی بابای خاوەن قەرز.

**دووەم:** ژنێک کە لە مێردی ڕایکردبایە، دەبووە کۆیلەی مێردەکەی.

**سێیەم:** دزیی کردن، بابای دز دەبووە کۆیلەی بابای دزیی لێکراو.

**چوارەم:** خۆ کردنە کۆیلەی کەسێکی دیکە، کەسێک بۆی هەبوو بە ویستی خۆی خۆی بکاتە کۆیلەی کەسێکی دیکە.

**پێنجەم:** زاڵبوونی هۆزێک یان نەتەوەیەک یان دەوڵەتێک، بەسەر یەکێکی دیکەداو بە کۆیلەکردنی خەڵکەکەی.

**شەشەم:** ڕاکردوو لە جەنگ، هەر کەسێک لە جەنگ ڕایکردبایە، دەیانکردە کۆیلەی دەوڵەت.

بەڵام ئیسلام جگە لە دیلی جەنگ، ئەویش بە شێوەیەکی کاتیی و بە ناچاریی، هەموو ڕێیەکانی دیکەی کە خەڵکیان پێ دەکرایە کۆیلە، بەستنی و، زۆربەی هەرە زۆری سەچاوەکانی کۆیلایەتییشی لە لایەن خۆیەوە وشک کرد.

### ٣- ئازادکردنی ئەو کۆیلانەی هەبوون:

ئیسلام چەند ڕێیەکی دانان بۆ ئازادکردنی کۆیلە، کە ئیمە سێ ڕێگای سەرەکییان لێ باس دەکەین:

**یەکەم:** دانانی هەشتیەکی زەکات بۆ ئازاد کردنی کۆیلان، وەک خوا ﷻ فەرموویەتی:
﴿إِنَّمَا ٱلصَّدَقَٰتُ لِلْفُقَرَآءِ وَٱلْمَسَٰكِينِ وَٱلْعَٰمِلِينَ عَلَيْهَا وَٱلْمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمْ وَفِى ٱلرِّقَابِ وَٱلْغَٰرِمِينَ وَفِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱبْنِ ٱلسَّبِيلِ فَرِيضَةً مِّنَ ٱللَّهِ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ

﴿التوبة، دیارە مەبەست لە ﴿ٱلرِّقَابِ﴾، کۆیلەکانەو، یەک لەسەر هەشتی زەکاتی هەموو مسوڵمانان خوای میهرەبان و دادگەر بۆ ئازادکردنی کۆیلانی تەرخان کرد.

**دووەم:** ڕێککەوتنی کۆیلەو خاوەنەکەی، لەسەر پێدانی ئەندازەیەک لە سامان بە خاوەنەکەی و خۆ کڕینەوەی، وەک خوا ﷻ لە سوورەتی (**النور**)دا دەفەرموێ: ﴿وَلْيَسْتَعْفِفِ ٱلَّذِينَ لَا يَجِدُونَ نِكَاحًا حَتَّىٰ يُغْنِيَهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ ۗ وَٱلَّذِينَ يَبْتَغُونَ ٱلْكِتَٰبَ مِمَّا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُكُمْ فَكَاتِبُوهُمْ إِنْ عَلِمْتُمْ فِيهِمْ خَيْرًا ۖ وَءَاتُوهُم مِّن مَّالِ ٱللَّهِ ٱلَّذِىٓ ءَاتَىٰكُمْ ۚ وَلَا تُكْرِهُوا۟ فَتَيَٰتِكُمْ عَلَى ٱلْبِغَآءِ إِنْ أَرَدْنَ تَحَصُّنًا لِّتَبْتَغُوا۟ عَرَضَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۚ وَمَن يُكْرِههُّنَّ فَإِنَّ ٱللَّهَ مِنۢ بَعْدِ إِكْرَٰهِهِنَّ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٣٣﴾﴾.

وەک دەبینین خوای زانا فەرمانی کردوە بە خاوەن کۆیلەکان، کە هەر کات کۆیلەکانیان داوای موکاتەبەیان لێکردن، لەگەڵیاندا بکەن، مادام تێیاندا ڕادەبینن و، هاوکارییشیان بکەن.

**سێیەم:** دانانی ئازادکردنی کۆیلەیەک، وەک سزاو کەفارەت بۆ چەند جۆرە گوناهو هەڵەیەک:

**یەکەم:** یەکێک لەوانە کوشتنی بە هەڵە، (**القتل الخطأ**): ﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ أَن يَقْتُلَ مُؤْمِنًا إِلَّا خَطَـًٔا ۚ وَمَن قَتَلَ مُؤْمِنًا خَطَـًٔا فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ ...﴿٩٢﴾﴾النساء.

**دووەم:** شکاندنی سوێند: ﴿لَا يُؤَاخِذُكُمُ ٱللَّهُ بِٱللَّغْوِ فِىٓ أَيْمَٰنِكُمْ وَلَٰكِن يُؤَاخِذُكُم بِمَا عَقَّدتُّمُ ٱلْأَيْمَٰنَ ۖ فَكَفَّٰرَتُهُۥٓ إِطْعَامُ عَشَرَةِ مَسَٰكِينَ مِنْ أَوْسَطِ مَا تُطْعِمُونَ أَهْلِيكُمْ أَوْ كِسْوَتُهُمْ أَوْ تَحْرِيرُ رَقَبَةٍ...﴿٨٩﴾﴾المائدة.

**سێیەم:** زیهارکردنی مێرد لە ژنی، واتە: پیاوێک بە ژنەکەی بڵێ: تۆ وەک پشتی دایکم وای، بیشوبهێنی بە دایکی: ﴿وَٱلَّذِينَ يُظَٰهِرُونَ مِن نِّسَآئِهِمْ ثُمَّ يَعُودُونَ لِمَا قَالُوا۟ فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مِّن قَبْلِ أَن يَتَمَآسَّا ۚ ذَٰلِكُمْ تُوعَظُونَ بِهِۦ ۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴿٣﴾﴾المجادلة.

### ٤- جوانترین مامەڵەکردن لەگەڵ کۆیلاندا:

بۆ نموونە: پێغەمبەر ﷺ فەرمانی بە مسوڵمانان کردوە کە وشەی (**عبد**) و (**أمة**) بۆ کۆیلەکانیان بەکارنەهێنن، وەک: کۆیلەو کەنیزەک، بەڵکو لە جیاتی

ئـەوە، (**فتـاي وفتـاتي**)، یـان (**غلامـي وجاريتـي**)، بەکاربێنـن، (**فتـاي وفتـاتي**)، بـە مانـای کـوڕو کچـی گەنـج و (**غـلام و جاريـة**)ش بـە هەمـان شـێوە، هەمـان مانايـان هەيـە: {**عَـنْ أَبِـي هُرَيْـرَةَ ﷺ أَنَّ رَسُـولَ اللَّـهِ ﷺ قَـالَ: «لاَ يَقُولَـنَّ أَحَدُكُـمْ عَبْـدِي وَأَمَتِـي كُلُّكُـمْ عَبِيـدُ اللَّـهِ، وَكُلُّ نِسَـائِكُمْ إِمَـاءُ اللَّـهِ، وَلَكِـنْ لِيَقُـلْ غُلاَمِـي وَجَارِيَتِـي، وَفَتَـايَ وَفَتَـاتِي»**} (**أخرجـه مسـلم: ٢٢٤٩**).

واتـە: ئەبـوو هورەيـرە ﷺ، دەڵـێ: پێغەمبـەر ﷺ فەموويەتـی: بـا يەكێـک لـە ئێـوە نەڵـێ كۆيلەكـەم و كەنيزەكەكـەم، هەمووتـان بەنـدەی خـوان، هەمـوو ئافرەتەكانيـش بەنـدەی مێينـەی خـوان، بەڵكـو بـا بڵێـن: غوڵامەكـەم و كچەكـەم، ياخـود كـوڕە گەنجەكـەم و كچـە گەنجەكـەم.

هەروەهـا پێغەمبـەر ﷺ فەرموويەتـی: {**إِخْوَانُكُـمْ خَوَلُكُـمْ، جَعَلَهُـمُ اللَّـهُ تَحْـتَ أَيْدِيكُـمْ، فَمَـنْ كَانَ أَخُـوهُ تَحْـتَ يَدَيْـهِ، فَلْيُطْعِمْـهُ مِـمَّا يَـأْكُلُ، وَلْيُلْبِسْـهُ مِـمَّا يَلْبَـسُ، وَلاَ تُكَلِّفُوهُـمْ مَـا يَغْلِبُهُـمْ، فَـإِنْ كَلَّفْتُمُوهُـمْ فَأَعِينُوهُـمْ عَلَيْـهِ**} (**أخرجـه البخـاري: ٢٤٠٧، ومسـلم ١٦٦١، وأبـو داود: ٥١٥٨، والترمـذي: ١٩٤٥، أبـن ماجـه: ٣٦٩**).

واتــە: برايەكانتــان خــوا ﷻ خســتوونيە بەردەســتی ئێــوە، (يــانی: بــە هــۆی سيســتمێكی سياســيی و كۆمەڵايەتييــەوە كــە سـايەو ســێبەرتانەو حوكمتــان دەكات، نـەک خـوا وای دانـا بـێ)، ئنجـا هـەر كەسـێک برايەكـەی لـە بەردەسـتی دا بـوو، بـا لـەو خواردنـەی خـۆی دەيخـوات، هەمـان خواردنـی پـێ بـدات، لـەو پۆشـاكەی بـۆ خـۆی دەيپۆشـێ، پۆشـاكی بـۆ بپۆشـێ و، بـا كارێكـی پـێ نەسـپێرێ بـۆی نەكـرێ و، ئەگـەر كارێكـی وای پـێ سـپارد، بـا بـۆ خـۆی هـاوكاری بـێ.

## بڕگەی سێیەم: لە کەیەوە بڕیاری نەهێشتنی کۆیلایەتیی درا؟

هەرچەنـدە ئيسـلام بـەردی بناغـەی نەهێشـتنی كۆيلايەتيـی دانـا، وەک پێشـتر باسـمان كـردو، بـە شـێوەيەكی پلـە پلەيـی و حەكيمانـە مامەڵـەی لەگـەڵ ئـەو واقيعـە

نەخوازراوو سەپێندراوە کردو، جگە لە ئەوەش، واتە: جگە لە ئەوەی ئیسلام کردی، نە مەنتیقیی بوو، نە واقیعیی و کردەییش بوو، بەڵام بە داخەوە لە ئەنجامی گۆڕانی شێوازی دانانی حوکمڕانانی مسوڵمانانەوە لە ڕاوێژەوە بۆ میراتیی و ڕەچەڵەکیی و، گەلێک جۆرە لادانی دیکەش کە لێرەدا دەرفەتی باسکردنیان نیە، سەرەنجام لە جیاتی ئەوەی مسوڵمانان لە ڕووی نەهێشتنی کۆیلایەتییەوە، خەڵکی دیکەی وڵاتان بخەنە ژێر کاریگەریی خۆیانەوە، ئەوانیش بڕیاری بە یەکجاریی نەهێشتنی ئەو دیاردە قێزەونە بدەن، کە بەر لە هەموو شتێک لەگەڵ بناغەی ئایینەکەیاندا کە خوا بەیەکگرتن (**توحید الله**)ە، تێکدەگیرێ، پاشان لەگەڵ ئەو ڕێزو حورمەتەشدا تێکدەگیرێ، کە خوا ﷻ لە مرۆڤی ناوە: ﴿وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِيٓ ءَادَمَ ﴿٧٠﴾﴾ **الإسراء**، بەپێچەوانەوە: مسوڵمانان کەوتنە ژێر کاریگەریی و هەژموونی کلتووری ڕزیوو دواکەوتوویی گەلانی دیکە، لە ڕۆم و فارس و هیندو چین و، لە وڵاتانی ئیسلامییشدا، وەک وڵاتانی دیکە، بازاڕی کۆیلەو کەنیزەکان، تاکو دەهات قەڵەباڵغتر دەبوو، هەتا سەرەنجام لە کۆنگرەی ڤیەننا ساڵی (١٨١٥)ی زایینی، دەوڵەتە ئەوڕووپاییەکان بڕیاری قەدەغە کردنی بازرگانیی کردن بە کۆیلانیان دا و، دوا ڕێککەوتنیش لەو بارەوە بریتی بوو لە: ڕێککەوتننامەی جنێف کە لە (١٩٥٦ /٩/٧)دا بە یەکجارەکیی بازرگانیی کردن بە کۆیلەی قەدەغە کرد[١].

شایانی باسیشە: دەوڵەتی عوسمانیی ئەو کاتە، ساڵی (١٨١٥ز)، پشتگیریی بڕیاری قەدەغەکردنی بازرگانیی بە کۆیلەوەی کردو، خۆشحاڵیی خۆی دەربڕی بۆ ئەو هەنگاوە، وەک لە (**آثار الحرب**)ی (**وهبة الزحيلي**)دا[٢] هاتوە.

---

(١) (تأريخ الفقه الإسلامي، ص٤٢).

(٢) لاپەڕە (٤١١-٤١٢).

## بڕگەی چوارەم: ئایا لەم ڕۆژگارەدا دروستە مرۆڤ بکرێتە کۆیلە؟

لە وەڵامدا بە ڕوون و ڕاشکاویی دەڵێین: نەخێر، لەبەر چی؟ بە لای کەمەوە لەبەر سێ هۆکاران:

**هۆکاری یەکەم:** وەک پێشتر باسمان کرد، ئیسلام وەک واقیعێکی سەپێنراوی ڕەتکراوە، مامەڵەی لەگەڵ دیاردەی کۆیلایەتییدا کردوە، سەرجەم سەرچاوەکانی هاتنی کۆیلەی وشک و چۆڕە بڕ کردن، تەنها ڕێی دیلەکانی جەنگی هێشتۆتەوە بە ناچاریی، لەسەر بنەمای مامەڵەی هاوشێوە (**المعاملة بالمثل**)دا، دیلەکانی جەنگیشی بە شێوەیەکی کاتیی بە کۆیلە گرتوون، چونکە نەدەگونجا سوپای ئیسلام دیلەکانی لەلایەن بەرانبەرەکانیانەوە بکرێنە کۆیلە، ئەوانیش دیلەکانیان بە بەلاش، یان بە قەرەبوو بەر بدەن، سەرەنجام ئەوە دەبوو بە جەنگێکی دەروونیی سەخت، کە ئیسلام دژ بە سوپایەکەی خۆی دەیکردو، هاندانێکیش دەبوو لە دژی ئەو ناحەزانەی کە ئەگەر نەکوژرێن، سەرەنجام ئازاد دەکرێن، دووبارە لە دژی تێ هەڵدەچنەوە، بۆیە عەقڵ و مەنتیق و، واقیع و بەرژەوەندیی، خوازیاری ئەوە بوون کە ئیسلام ئەو ڕێیە بە شێوەیەکی کاتیی بهێڵێتەوە.

**هۆکاری دووەم:** هیچ ئایەتێکی قورئان و، هیچ دەقێکی سوننەت نیە، کە فەرمان بکات بە کۆیلەکردنی هیچ مرۆڤێک، بەڵام چەندان ئایەت و دەقی سوننەت هەن، کە فەرمان دەکەن بە ئازادکردنی کۆیلە، بۆیە زۆر ڕاستە ئەگەر بگوترێ: ئیسلام ئازادکردنی کۆیلانی هێنا، نەک بە کۆیلەکردنی مرۆڤەکان، (**جاء الإسلام بالعتق، ولم يأت بالرِّق**)، ئیسلام ئازادکردنی کۆیلانی هیناوە، نەک بە کۆیلەکردنی مرۆڤەکان!

یەکێک لەو شوێنانەش کە باسی ئازاد کردنی کۆیلان دەکات ئەوەیە: ﴿ فَلَا اقْتَحَمَ الْعَقَبَةَ (١١) وَمَا أَدْرَاكَ مَا الْعَقَبَةُ (١٢) فَكُّ رَقَبَةٍ (١٣) ﴾البلد، ئەو کەسە دەرووی سەختی نەبڕیوە، تۆ چووزانی دەر ووی سەخت چییە؟ ئازادکردنی کۆیلەیەکە.

کەواتــە: ئازادکردنــی مرۆڤێــک لــە داوی کۆیلایەتیــی، کارێکــی هێنــدە گــەورەو گرنــگ بــووە لــە ڕووی قورئانــەوە، وەک برینــی دەروویەکــی ســەخت و، مایــەی ســەرفرازیی مــرۆڤ بــووە لــە ڕۆژی دواییــدا.

**هۆکاری سێیەم:** بۆ ئـەوە کـە دروسـت نیـە مـرۆڤ لـە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا بکرێتـە کۆیلـە، وەک پێشـتر باسـمان کـرد، ئسـلام هەمـوو سـەرچاوەکانی کۆیلایەتیـی وشـک کـردن و، هەمـوو ڕێیەکانـی گرتـن، بێجگـە لـە یـەک ڕێ، ئەویـش بریتـی بـوو لـە دیلەکانــی جەنــگ، ئەویــش بــە شــێوەیەکی کاتیــی، وەک کاردانــەوەو مامەڵــەی هاوشـێوە، یـانی: (ردُّ الفعـل والمعاملـة بالمثـل)، ئێمـە تەنیـا یـەک ئایەتمـان هەیـە لـە قورئانـدا، لـە بـارەی چۆنیەتیـی مامەڵـە کـردن لەگـەڵ دیلەکانـی جەنگـدا، کـە دوا حوکمـی ئیسـلامی تێدایـە لـەو بـارەوە، وەك خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ فَإِذَا لَقِيتُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فَضَرْبَ ٱلرِّقَابِ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَثْخَنتُمُوهُمْ فَشُدُّواْ ٱلْوَثَاقَ فَإِمَّا مَنًّۢا بَعْدُ وَإِمَّا فِدَآءً حَتَّىٰ تَضَعَ ٱلْحَرْبُ أَوْزَارَهَا ﴿٤﴾ ﴾**محمـد**، واتـە: ئنجـا هـەر کات بەرەنـگاری ئەوانـەی بێبـڕوان، بوونـەوە، لـە گەردنیـان بـدەن، [چونکـە چەکـی ئـەو کاتـە زیاتـر شمشـێر بـووە، مرۆڤیـش بـە لـە گـەردن درانـی لـە جەنـگ دا زووتـر دەکـوژرێ]، هـەر کاتێـک شـپرزەتان کـردن، کەلەپچەیـان بکـەن و بـە دیلیـان بگـرن، پاشـانیش یـان بـە خۆڕایـی و چاکـە لەگەڵـدا کـردن، یاخـود بـە قەرەبـوو (دیـل بەرانبـەر دیـل، یـان بـە پـارە) بەریـان بـدەن، هەتـا جەنــگ قورسـاییەکانی خــۆی دادەنــێ و کۆتایــی دێ.

وەک دەبینیــن: خــوای کاربەجــێ فەرمــان بــە بــڕواداران دەکات کــە لــە کاتــی بەرەنگاربوونــی دوژمنانــی بێبــڕوای شــەڕ فرۆشــدا، زەبــر لــەو شــوێنەیان بــدەن کــە زووتـر پێـی دەکوژرێـن و، پـاش لـە پـەل و پـۆ خسـتنیان، ئنجـا بـە دیلیـان بگـرن، دواییـش بـۆ شـێوازی مامەڵەکـردن لەگـەڵ دیلەکانـدا بـۆ چۆنیەتیـی بەردانیـان، تەنیـا د وو ڕێیـان دادەنـێ و سـێیەمیان نیـە، ﴿ فَإِمَّا مَنًّۢا بَعْدُ وَإِمَّا فِدَآءً ﴾، یـان منـەت باریـان بکـەن و، بەبـێ بەرانبـەر بەریـان بدەن، یاخـود بە بەرانبـەرو قەرەبـوو، قەرەبووەکەش

دەگونجێ دیل بە دیل بێ، دەشگونجێ ماڵ و سامان بێ، دەشگونجێ بابای دیل پارەی نەبێ، بەڵام هەر جۆرە خزمەتێک بێ پێشکەش بکات، وەک چۆن پێغەمبەر ﷺ بۆ ئەو دیلانەی جەنگی بەدر، کە ماڵ و سامانیان نەبووە، بەرانبەر بەوە بەری دان، کە منداڵەکانی پشتیوانان فێری نووسین بکەن، وەک لەم شوێنەوارەدا هاتوە:

**{عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: كَانَ نَاسٌ مِنَ الْأَسْرَى يَوْمَ بَدْرٍ لَمْ يَكُنْ لَهُمْ فِدَاءٌ، فَجَعَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِدَاءَهُمْ أَنْ يُعَلِّمُوا أَوْلَادَ الْأَنْصَارِ الْكِتَابَةَ} (أخرجه أحمد: ٢٢١٦ تعليق شعيب الأرنؤوط: حسن)**، واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ)، دەڵێ: خەڵکێک لە دیلەکانی جەنگی بەدر، هی هاوبەش بۆ خوا دانەرەکانی مەککە، توانای ماددییان نەبوو، قەرەبوو بدەن، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ قەرەبووەکە، ئەوەی بۆ دانان کە ژمارەیەک لە منداڵی پشتیوانانەکان فێری خوێندن و نووسین بکەن.

شایانی باسیشە: هەندێک لە زانایان وا لە ڕستەی: (فَشُدُّوا الْوَثَاقَ)، (دەستبەندیان توند بکەن)، حاڵیی بوون کە مانای کۆیلەکردن (**إسترقاق**)، بگەیەنێ، بەڵام بە دڵنیاییەوە ئەوە ڕاست نیە، چونکە کەلەپچە کردن (**شدُّ الوَثاق**)، تەنها بەندکردن دەگەیەنێ و، هیچ پەیوەندیی بە کۆیلەکردن (**إسترقاق وإستعباد**)ەوە نیە، بگرە ئەو ئایەتە بە ئاماژە کردن پێمان دەڵێ: بە کۆیلە کردن دروست نیە، چونکە خوا ﷻ دەفەرموێ: پاش بە دیل گرتنیان، یان بە چاکەو منەت کردن بەریان بدەن، یان بە بەرانبەر، کەواتە: هیچ شتێکی سێیەم، وەک کوشتن یان بە کۆیلە کردن، دروست نیە.

ئنجا یەکێک بۆی هەیە بپرسێ: مادام قورئان بۆ دیلەکانی جەنگ، تەنیا باسی بەردانیانی کردوەو، چ بە بەلاش و چاکەو، چ بە بەرانبەرو قەرەبوو، ئەدی بۆچی لە سوننەت و سیرەی پێغەمبەری خوادا ﷺ بە کۆیلەکردن (**إسترقاق**)، هەبووە؟

بە سێ قسە وەڵامی ئەو پرسیارو ئیشکالە دەدەینەوە:

**١)**- لەو جەنگانەدا کە پێغەمبەری خوا ﷺ دژی نامسوڵمانانی شەڕ فرۆش و پەیمان شکێن، لە بتپەرست و خاوەن کتێبەکان کردوونی، هیچ پیاوێک، یان نێرینەیەکی باڵغی نەکردۆتە کۆیلە، بەڵکو تەنیا ئافرەتان و منداڵانی بە کۆیلە کردوون، وەک (**إبن القيم**) گوتوویەتی: (**إِنَّ النَّبِيَّ ﷺ لَمْ يَسْتَرِقَّ فِي حَيَاتِهِ ذَكَراً بَالِغاً قَطُّ، وَإِنَّمَا اسْتَرَقَّ النِّسَاء وَالصِّبْيَان**)[1]، واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ هەرگیز لە ژیانیدا نێرینەیەکی باڵغی نەکردۆتە کۆیلە، بەڵکو تەنیا ئافرەتان و منداڵانی کردوونە کۆیلە.

بێگومان بە کۆیلەکردنی ئافرەتان و منداڵان بریتی بووە لە: حەواندنەوەیان و خستنیانە گەڵ خێزانە مسوڵمانانەکان، پاش نەمانی پیاوەکانیان و تێکچوونی شیرازەی خێزانەکانیان، کە بێگومان لەو ڕۆژگارەدا، هیچ بەدیلێک بۆ ئەو چارەسەرە ناچارییە نەبووە.

**٢)**- هەر کەسێکیش لە نامسوڵمانە شەڕ فرۆشەکان، دوایی مسوڵمان بووبێ، ئافرەت و منداڵەکانی بۆ ئازاد کراون، وەک پێغەمبەر ﷺ شەش هەزار (٦٠٠٠) لە ژن و منداڵە بە دیل گیراوەکانی هۆزی هەوازنی دانەوە پیاوەکانیان، پاش ئەوەی مسوڵمان بوون، هەروەها هەر کام لە خەڵکی مەککە کە پێی فەرموون: بڕۆن ئێوە بەردراون (**اذهبوا فأنتم الطُّلَقاء**) (**أخرجه البخاري: ٢٨٥١، ومسلم: ١٧٤٤**)، هەروەها خەڵکی خەیبەریشی بە چاکە بەرداو، هۆزی (**بنو المصطلق**)یش دوای ئەوەی پێغەمبەر ﷺ (**جورية بنت الحارث**)ی لێ بە هاوسەرگرتن خوا لێی ڕازی بێ، مسوڵمانان وەک ڕێزگرتن لەو خزمایەتییە، ژن و منداڵەکانیان بەردان، کە سەد خێزان بوون، ئەمیش لە (**سنن أبي داود**) دا لە ژمارە: (٣٩٣١) هاتوە.

**٣)**- وەڵامی سێیەم بۆ ئەو ئیشکالەی باسکرا، ئەوەیە کە ئەو هەڵوێستە لەلایەن پێغەمبەری خوا ﷺو پاشان چوار خەلیفە ڕاشیدەکانەوە، هەڵوێستێکی ناچاریی بووە، کە بار ودۆخی سیاسیی ئەو کاتی دەوڵەتانی دنیا، فەرزی کردوەو مامەڵەیەکی کاتیی

---

(١) زاد المعاد: ج٣، ص١١٥.

بووە، لەگەڵ ئەو نەریتە جیهانییەدا، کە بە نسبەت مسوڵمانانەوە، ئەو نەریتی مرۆڤ بە کۆیلە گرتنە، پێچەوانەو دژی دوو بنەڕەتی هەرە گەورەو گرنگی ئیسلامە، کە بریتین لە:

**١)**- تەنیا خوا پەرستن {**توحيد الله في العبادة (فاعلم أَنَّهُ لاَ إِلَهَ إلاَّ الله)**}، واتە: بزانە جگە لە خوا هیچ پەرستراوێک نیە، کە شایانی پەرستن بێ.

**٢)**- ڕێزو حورمەتی مرۆڤ گرتن (**تَكْرِيم الإِنْسَان**)، ﴿وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِيٓ ءَادَمَ﴾**الإسراء(٧٠)**، واتە: بیگومان ڕێزمان لە وەچەی ئادەم گرتوە، چونکە تەنیا خواپەرستن و خوا بە پەرستراو دانان، خوازیاری ئەوەیە کە مرۆڤەکان لە بەرانبەر خوادا یەکسان بن و، سەییدو کۆیلەیان لە نێودا نەبێ، هەروەها ڕێزو حورمەتی مرۆڤ گرتنیش، خوازیاری ئەوەیە کە هەموویان ئازادو سەربەست بن و، هیچ کەس ژێر دەست و کۆیلەی ئەوی دیکە نەبێ.

جگە لەوانەش کە باسمان کردن، ئێمە یازدە (١١) بەڵگەمان ڕیز کردوون، لەسەر ئەوە کە ناگونجێ مرۆڤ بە کۆیلە بکرێ:

**١)**- ئیسلام چ وەک بوونناسییەکەی (ontology) چ وەک ئیمان و عەقیدە، چ وەک شەریعەت، دژی کۆیلایەتیی و زەبوونیی مرۆڤە.

**٢)**- هیچ ئایەتێکی قورئان و، هیچ دەقێکی سوننەتیش نیە، فەرمان بە مسوڵمانان بکات دیلەکانی جەنگ لە کافران بکەنە کۆیلە.

**٣)**- ئەوەش کە لە سیرەی پێغەمبەری خوادا ﷺ و هی چوار خەلیفە ڕاشیدەکانیشدا هاتوە، ئەوپەڕی دروست و ڕەوا بوون (**الجواز والإباحة**)ی بە کۆیلە کردن دەگەیەنێ، وەک کاردانەوەو مامەڵەی هاوشێوە، بۆ دوژمنانێک کە ئەو کاتە بەو شێوەیە مامەڵەیان لەگەڵ دیلەکانی جەنگدا دەکرد.

**٤)**- هەروەها ئیسلام ئایینی ئیمان و عەقیدەی ڕاست و زگماکی ساغە، وەک خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًا فِطْرَتَ ٱللَّهِ ٱلَّتِي فَطَرَ ٱلنَّاسَ عَلَيْهَا لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ ٱللَّهِ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلْقَيِّمُ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٣٠﴾﴾**الروم**.

کەواتــە: خــوای زانــاو شــارەزا بەرنامــە پــاک و ڕاســتەکەی خــۆی کــە ئیســلامەو، زگــماک و سرووشــتی ســاغی مرۆڤــی، بــە دوو ڕووی ڕاســتییەک دانــاون، ئنجــا بێگومــان وێــڕای هــەر کام لــە عەقڵــی ســاغ و زگــماک (**فطــرة**)ی تەواویــش، نکوولیــی لــە کۆیلایەتیــی مرۆڤــەکان دەکــەن.

٥)- یەکەمین جار ئیسلام لەسەر زاری خەلیفەی دووەم (عومەری کوڕی خەتتاب)، ئەو ڕاستییەی وە بیر مرۆڤایەتیی هێنایەوە، کە مرۆڤەکان بە ئازادیی لە دایک دەبن و هیچ کەس بۆی نیە، بیانکاتە کۆیلەو ژێردەستەو بیانچەوسێنێتەوە، وەک عومەر بە والی میسر، عەمری کوڕی عاص و کوڕەکەی گوت: لە کاتێکدا کوڕەکەی والی میسر بە قامچیی لە کابرایەکی قیبتیی دابوو، چونکە ئەسپەکەی پێش ئەسپی وی کەوتبۆوە، لە غار غارێن و پێشبڕکێدا، پێی گوت: (**مُذْ كَمْ تَعَبَّدْتُم النَّاسَ، وَقَدْ وَلَدَتهُم أُمَّهَاتُهُم أَحْرَاراً؟**) (**كنز العمال**)[1]، واتە: لە کەیەوە ئێوە خەڵکتان کردوە بە کۆیلە؟ لە حاڵێکدا دایکیان بە ئازادیی هێناونیە دنیاوە؟!.

٦)- هەروەها زانایانی ئیسلام لەسەر ئەوە یەکدەنگن، کە لە کوێ و چۆن دادگەریی باشتر بچەسپێ و، بەرژەوەندیی بێتە دی، شەریعەت لەوێیە، هەر هۆکارو ئامرازو شێوازێ، چەسپاندنی دادگەریی و هێنانە دی بەرژەوەندیی پەکیان لەسەری بکەوێ، ئەوە پێویست دەبێ، بە پێی بنچینەی: (**مَا لَا يَتِمُّ الوَاجِبُ إلاَّ بِهِ، فَهُوَ وَاجِبٌ**)، هەر شتێک فەرزێک پەکی لەسەر بکەوێ، ئەویش فەرز دەبێ.

هەروەهــا بنچینــەی (**للوَسَـائِلِ حُكْـمُ المَقَاصِـد**)، ئامــڕازەکان حوکمــی ئامانجەکانیــان هەیــە، ئنجــا (إبــن القيــم) لــەو بــارەوە کــە دادگەریــی و بەرژەوەندیــی لــە کــوێ بــێ، شــەریعەت لەوێیــە، نووســیویەتی: (**فَـإذَا ظَهَـرَت أَمَـارَاتُ العَـدْلِ، وَأسْـفَرَ وَجْهُـهُ بِـأَي طَرِيْق كَانَ، فَثَـمَّ شَرْعُ اللـهِ وَدِيْنِـه**)[2]، واتــە: هــەر کاتێــک نیشــانەکانی دادگەریــی دەرکەوتــن و، بــە هــەر شــێوەیەک بــێ ڕووی دەرەوشــایەوەو، ئــەوە شــەرع و بەرنامــەی خــوا لەوێیــە.

---

(١) ج١٢، ص٨٧٣.

(٢) الطرق الحكمية في السياسة الشرعية، ص٢٣.

بێگومـان دادگەریـی و بەرژەوەندیـی گشـتییش، بـۆ مرۆڤایەتیـی لـەوە دایـە، کـە نـەک هـەر هیـچ کـەس نەکریتـە کۆیلـە، بگـرە بـە هیـچ شـێوەیەک سـتەمی لـێ نەکـرێ و نەچەوسـێنرێتەوەو، بـە پێچەوانـەوە: چەوسـاندنەوە کۆیلایەتیـی، گەورەترین سـتەمەو بێرەزاتریـن چەوسـاندنەوەیە بـۆ مرۆڤایەتیـی.

**٧)**- ئێمە چەندان ئایەتی قورئانی بە پێز دەبینین، کە فەرمان بە ئازاد کردن و ڕزگارکردنی کۆیلان دەکەن، بۆ وێنە:

ئایەتـی یەکـەم: ﴿لَّيْسَ ٱلْبِرَّ أَن تُوَلُّوا۟ وُجُوهَكُمْ قِبَلَ ٱلْمَشْرِقِ وَٱلْمَغْرِبِ وَلَٰكِنَّ ٱلْبِرَّ مَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةِ وَٱلْكِتَٰبِ وَٱلنَّبِيِّۦنَ وَءَاتَى ٱلْمَالَ عَلَىٰ حُبِّهِۦ ذَوِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَٰمَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينَ وَٱبْنَ ٱلسَّبِيلِ وَٱلسَّآئِلِينَ وَفِى ٱلرِّقَابِ ﴿١٧٧﴾﴾ البقـرة.

ئایەتـی دووەم: ﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ أَن يَقْتُلَ مُؤْمِنًا إِلَّا خَطَـًٔا ۚ وَمَن قَتَلَ مُؤْمِنًا خَطَـًٔا فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ وَدِيَةٌ مُّسَلَّمَةٌ إِلَىٰٓ أَهْلِهِۦٓ إِلَّآ أَن يَصَّدَّقُوا۟ ۚ فَإِن كَانَ مِن قَوْمٍ عَدُوٍّ لَّكُمْ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ ۖ ﴿٩٢﴾﴾ النسـاء.

ئایـەتی سـێیەم: ﴿لَا يُؤَاخِذُكُمُ ٱللَّهُ بِٱللَّغْوِ فِىٓ أَيْمَٰنِكُمْ وَلَٰكِن يُؤَاخِذُكُم بِمَا عَقَّدتُّمُ ٱلْأَيْمَٰنَ ۖ فَكَفَّٰرَتُهُۥٓ إِطْعَامُ عَشَرَةِ مَسَٰكِينَ مِنْ أَوْسَطِ مَا تُطْعِمُونَ أَهْلِيكُمْ أَوْ كِسْوَتُهُمْ أَوْ تَحْرِيرُ رَقَبَةٍ ﴿٨٩﴾﴾ المائـدة.

ئایـەتی چـوارەم: ﴿إِنَّمَا ٱلصَّدَقَٰتُ لِلْفُقَرَآءِ وَٱلْمَسَٰكِينِ وَٱلْعَٰمِلِينَ عَلَيْهَا وَٱلْمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمْ وَفِى ٱلرِّقَابِ ﴿٦٠﴾﴾ التوبـة.

ئایـەتی پێنجـەم: ﴿وَلْيَسْتَعْفِفِ ٱلَّذِينَ لَا يَجِدُونَ نِكَاحًا حَتَّىٰ يُغْنِيَهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ ۗ وَٱلَّذِينَ يَبْتَغُونَ ٱلْكِتَٰبَ مِمَّا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُكُمْ فَكَاتِبُوهُمْ إِنْ عَلِمْتُمْ فِيهِمْ خَيْرًا ۖ وَءَاتُوهُم مِّن مَّالِ ٱللَّهِ ٱلَّذِىٓ ءَاتَىٰكُمْ ۚ ﴿٣٣﴾﴾ النـور.

ئایـەتی شەشـەم: ﴿وَٱلَّذِينَ يُظَٰهِرُونَ مِن نِّسَآئِهِمْ ثُمَّ يَعُودُونَ لِمَا قَالُوا۟ فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مِّن قَبْلِ أَن يَتَمَآسَّا ۚ ذَٰلِكُمْ تُوعَظُونَ بِهِۦ ۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴿٣﴾﴾ المجادلـة.

ئایەتی حەوتەم: ﴿ فَلَا ٱقۡتَحَمَ ٱلۡعَقَبَةَ ﴿١١﴾ وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا ٱلۡعَقَبَةُ ﴿١٢﴾ فَكُّ رَقَبَةٍ ﴿١٣﴾ ﴾ البلد.

کەواتـە: ئیسـلام زۆر مەبەسـتی بـووە کـە دیـاردەی کۆیلایەتیـی نەمێنـێ و، ئـەو کۆیلانـەی ئـەو ڕۆژگارەش، ڕۆژگاری دابەزینـی قورئـان هەبـوون، لـە داوی کۆیلایەتیـی قوتـارو ئـازاد بـن.

٨)- هەروەها مادام خوا ستایشی خۆی کردوە لەسەر نەهێشتنی ستەمکاران، وەک لە سوورەتی **(الأنعام)**دا دەفەرموێ: ﴿ فَقُطِعَ دَابِرُ ٱلۡقَوۡمِ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْۚ وَٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٤٥﴾ ﴾، واتە: ئیدی کۆمەڵی ستەمکاران دوا بڕاو بوون و، ستایش بۆ خوای پەروەردگاری جیهانییان، بە دڵنیاییەوەش خەڵک و میللەتان کردنە کۆیلەو ژێر دەستیش، گەورەترین ستەمە.

٩)- هەروەها مادام خوای دادگەر سەرزەنشتی مسوڵمانان دەکات کە لە توانایاندایە چەوساوان ڕزگار بکەن، کەچی کەمتەرخەمیی دەکەن لە جەنگ و جیهاد کردندا، بۆ قوتار کردنیان، وەک خوای کاربەجێ و دادگەر فەرموویەتی: ﴿ وَمَا لَكُمۡ لَا تُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱلۡمُسۡتَضۡعَفِينَ ﴿٧٥﴾ ﴾ **النساء**، ئەوە چیتانە! لە پێناوی خوا (ڕازییکردنی خوا) و ڕزگارکردنی چەوساواندا جەنگ ناکەن؟! بێگومان کۆیلە بوونی مرۆڤیش خراپترین جۆری چەوساندنەوەیەتی.

١٠)- هەروەها فیرعەون کە نموونەی حوکمڕانی ملهوڕو خۆسەپێن و لە خوا یاخییە، گەلی بەنوو ئیسرائیلی کرد بووە کۆیلەو دەیچەوساندنەوە، وەک مووسا ﷺ لە وەڵامی ئەو قسەیەدا، کە دەڵێ لە ماڵی ویدا گەورە بووە، ﴿ قَالَ أَلَمۡ نُرَبِّكَ فِينَا وَلِيدٗا وَلَبِثۡتَ فِينَا مِنۡ عُمُرِكَ سِنِينَ ﴿١٨﴾ ﴾، گوتوویەتی: ﴿ وَتِلۡكَ نِعۡمَةٞ تَمُنُّهَا عَلَيَّ أَنۡ عَبَّدتَّ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ﴿٢٢﴾ ﴾ **الشعراء**، ئەو چاکەیەش کە بە چاوی منی دا دەدەیەوە، بە هۆی ئەوەوە بووە کە تۆ بەنوو ئیسرائیلت کرد بووە کۆیلە، واتە: ئەگەر لەبەر ئەوە نەبووایە کە دایکم مەترسیی کوژرانی منی بووە لەلایەن تۆوە، کە منداڵە نێرینەکانی بەنوو ئیسرائیلت سەردەبڕین و، مێینەکانیشت دەهێشتنەوە، من نەدەخرامە تابووتەوەو بە ئاودا نەدەدرام و، لەلایەن ئێوەوە نەدەگیرامەوەو، سەرەنجام لە ماڵی تۆدا بەخێو نەدەکرام.

کەواتە: بە کۆیلە کردنی خەڵک عادەتی فیرعەونەکانەو، دەربازکردنیشیان لە کۆیلایەتیی و ژێر دەستەیی، عادەتی پێغەمبەران (عَلَيْهِمُ الصَّلَاةَ وَالسَّلَام) بووە، چونکە مووسا ﷺ کە نێرراوە بۆ لای فیرعەون، خوا پێی فەرمووە: ﴿ فَأْتِيَاهُ فَقُولَا إِنَّا رَسُولَا رَبِّكَ فَأَرْسِلْ مَعَنَا بَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ وَلَا تُعَذِّبْهُمْۖ قَدْ جِئْنَٰكَ بِـَٔايَةٖ مِّن رَّبِّكَۖ وَٱلسَّلَٰمُ عَلَىٰ مَنِ ٱتَّبَعَ ٱلْهُدَىٰٓ ﴿٤٧﴾ ﴾طه، (خوا ﷻ فەرمووی) هەردووکتان (مووساو هاروون) بچنە لای فیرعەون، پێی بڵێن: ئێمە نێردراوانی پەروەردگارتین، دەجا بەنوو ئیسرائیلمان لەگەڵ بنێرەو مەیانچەوسێنەوە، بە دڵنیایی لە پەروەردگارتەوە نیشانەو بەڵگەمان بۆ هێناوی و، سەلامیش لەو کەسە بێ، شوێن ڕینمایی خوا دەکەوێ.

هەروەها خوا دەرباز کردنی بەنوو ئسرائیلی لە کۆیلایەتیی و ژێر دەستەیی فیرعەون، بە چاکەیەکی گەورەو بەرچاوی خۆی داناوە، وەک فەرموویەتی: ﴿ وَنُرِيدُ أَن نَّمُنَّ عَلَى ٱلَّذِينَ ٱسْتُضْعِفُواْ فِي ٱلْأَرْضِ وَنَجْعَلَهُمْ أَئِمَّةٗ وَنَجْعَلَهُمُ ٱلْوَٰرِثِينَ ﴿٥﴾ وَنُمَكِّنَ لَهُمْ فِي ٱلْأَرْضِ وَنُرِيَ فِرْعَوْنَ وَهَٰمَٰنَ وَجُنُودَهُمَا مِنْهُم مَّا كَانُواْ يَحْذَرُونَ ﴿٦﴾ ﴾القصص، واتە: دەشمانەوێ چاکە لەگەڵ ئەوانەدا بکەین کە لە زەویدا چەوسێنرانەوەو، لە زەویدا بیانکەنە پێشەواو، بیانگێڕین بە میراتگر، هەروەها لە زەویدا دەسترۆیشتوویان بکەین و، ئەوەی مەترسییان لێی هەبوو پێشانی فیرعەون و هامان و سەربازەکانیان بدەین.

١١)- مادام بەشەر سەرەنجام پاش دوازدە، سێزدە سەدەدا، دوای دابەزینی قورئان و، بانگی ئازادیی و یەکسانیی مرۆڤەکانی بە گوێی دنیادا دانی، گەیشتە ئەو ئاستە کە ئەوەی قورئان لە یەکەمین ڕۆژەوە ویستی بیکات، کە نەهێشتنی کۆیلایەتییەو بڕیاری لەسەر بدات و لە سەری ڕێک بکەوێ.

لەبەر هەموو ئەوانەی لەو یازدە بڕگەیەدا، کە ڕابردن، هاتن، بە هیچ شێوەیەک ڕەوا نیە بە ناوی ئیسلام و شەریعەتەکەیەوە، هیچ مرۆڤێک بکرێتە کۆیلەو، ئەوەی ڕێکخراوی داعش بەرانبەر ئافرەتە یەزیدییەکان کردی، کارێکی ستەم و ناڕەوا بووەو، هیچ بنەمایەکی شەرعیی نیەو، بە هەر بیانو و پاساوێکەوە کرابێ، ئیسلام لێی بێ بەرییەو، ماڵی قەڵبەو سەر بە خاوەنیەتی.

شایانی باسیشـە: هـەم خـودی بـە کۆیلەکردنـی ئافرەتـە یەزیدییـەکان، شـتێکی قەدەغەیـەو گوناهێکـی گەورەیـەو، هـەم فرۆشتنیشـیان قەدەغەیـەو سـتەمە، هەروەهـا چوونـە لاشـیان بـە نـاوی کەنیـزەک، بـە دەسـتدرێژیی و زینـا دادەنـرێ، واتـە: سـێ گونـاه و تاوانـی گـەورە، وێکـڕاو، لـە هەمووشـیان زلـترو بێزراوتـر، ئەوەیـە کـە بـە نـاوی ئیسـلامەوە جێبەجـێ بکـرێ.

لـە بـارەی گەورەیـی تاوانـی بـە کۆیلـە گرتـن و فرۆشـتنی مرۆڤـی ئـازادەوەش، نامسـوڵمان بـێ، یـان مسـوڵمان بـێ، با تەماشـای ئـەم فەرمایشـتەی پێغەمبـەر ﷺ بکەین:

{قَـالَ اللَّـهُ عَزَّوَجَـلَّ: ثَلَاثَـةٌ أَنَـا خَصْمُهُـمْ يَـوْمَ الْقِيَامَـةِ، وَمَـنْ كُنْـتُ خَصْمَـهُ خَصَمْتُـهُ: رَجُـلٌ أَعْطَـى بِي، ثُـمَّ غَـدَرَ، وَرَجُـلٌ بَـاعَ، حُـرّاً فَـأَكَلَ ثَمَنَـهُ، وَرَجُـلٌ اسْـتَأْجَرَ أَجِيـراً فَاسْـتَوْفَى مِنْـهُ، وَلَـمْ يُوَفِّـهِ أَجْـرَهُ} **(أخرجـه أحمـد: ٨٦٧٧، تعليـق شـعيب الأرنـؤوط : إسـناده حسـن)**

واتـە: خـوا ﷻ فەرموویەتـی، سـێ کـەس خـۆم لەسـەریان دەبمـە داواکار **(مدّعـي)** لـە ڕۆژی قیامەتـدا، هـەر کەسـێکیش مـن داواکاربـم لەسـەری، لێـی دەبەمـەوە: پیاوێـک بـە نـاوی منـەوە پەیـمان بـدات و بیشـکێنێ و، پیاوێـک مرۆڤێکـی ئـازاد بفرۆشـێ و پارەکـەی بخـوات و، پیاوێـک کرێکارێـک بـە کـرێ بگـرێ و ئیشـەکەی خـۆی پـێ بـکات و، دوایـی کرێیەکـەی نەداتـێ.

## وەڵامی دوو پرسیارو ئیشکال:

بـە پێویسـتی دەزانـم لـە بـواری بابـەتی: (ڕەوانەبـوونی بـە کۆیلەکـردنی مرۆڤـەوە)، وەڵامـی دوو پرسـیارو ئیشـکال بدەینـەوە:

**پرسـیاری یەکـەم: مـادام لـە ڕۆژگاری پێغەمبـەری خـوا ﷺو، لـە ڕۆژگاری چـوار خەلیفـە ڕاشـیدەکاندا، بـە شـێوەیەک لـە شـێوەکان بـە کۆیلـە کـردن ڕەوا بووبـێ، چـۆن دەڵێـی: لـەم ڕۆژگارەدا ڕەوا نیـە، ئایـا هیـچ دەقێـک ئـەو حوکمـەی نەسـخ کردۆتـەوە؟**

دەڵێین: مامەڵەی پێغەمبەر ﷺ و چوار خەلیفە ڕاشیدەکان، لەگەڵ ئەو مەسەلەیەدا لە ژێر فشاری واقیعی سیاسەتی نێو دەوڵەتیی ئەوسادا بووەو، مامەڵەیەکی کاتیی و ناچاریی و، کاردانەوەو مامەڵەی هاوشێوە **(رد فعل والمُعاملة بالمثل)** بووە، نەک حوکمێکی گشتیی شەریعەت تاکو گۆڕانی بەسەردا نەیەت، چونکە حوکمەکانی شەریعەت لە ڕووی چەسپان و گۆڕانەوە، دوو جۆرن:

**جۆری یەکەم:** حوکمی گشتیی و چەسپاوو، گۆڕان هەڵناگرن، وەک: فەرز بوونی نوێژو، زەکات و، قەدەغە بوونی شەراب و، سوود.

**جۆری دووەم:** حوکمی تایبەتیی و کاتیین و، گۆڕانیان بەسەردا دێ، وەک: حوکمەکانی بواری ئیداریی و سیاسیی و، تەنبێ کردن **(تعزیر)**، هەر بۆیەش مامەڵەی هەندێک لە چوار خەلیفەکان لەگەڵ هەندێ بابەتدا، لە هی ڕۆژگاری پێغەمبەر ﷺ جیا بووە، بۆ وێنە: پێغەمبەر ﷺ سەر زەمینی خەیبەری دابەش کرد، بەڵام عومەر خوا لێی ڕازی بێ، سەر زەمینی عێراقی دابەش نەکرد، ئنجا **(إبن قدامة)**، لەو بارەوە گوتوویەتی: **(لأنَّ النَّبِيَّ فَعَلَ مَا هُوَ الأَصَلحَ فِي زَمَنِه، وَعُمَر فَعَلَ مَا هُوَ الأَصَلح فِي زَمَنِه)**[1]، واتە: پێغەمبەر ﷺ ئەوەی کرد، کە بۆ ڕۆژگاری خۆی چاکتر بووەو، عومەریش ئەوەی کردوە کە بۆ ڕۆژگاری وی باشتر بووە.

هەروەها (ابن القیم) لەو بارەوە نووسیویەتی - کە من یەکسەر مانا کوردییەکەی دێنم - لە کتێبی: **(إغاثة اللهفان من مصائد الشیطان)**دا[2]: حوکمە شەرعییەکان دوو جۆرن: یەکەم: جۆرێکیان هەر لەسەر یەك حاڵەتن و گۆڕانیان بەسەردا نایەت، نە بە هۆی کاتەکانەوەو، نە بەهۆی شوێنەکانەوەو، نە بەهۆی کۆشش و ڕای پێشەوایانەوە، وەک پێویست بوونی ئەرکەکان و، قەدەغە بوونی قەدەغەکان و، ئەو سزایانەی بە شەرع بۆ تاوانەکان دانراون و، وێنەی ئەوانە.

---

(١) المغني ج٤، ص١٨٩.

(٢) ج١، ص٣٤٦.

**دووەم:** ئەوانە کە بە گوێرەی خوازیاری بەرژەوەندیی بۆیان، بە پێی کات و شوێن و حاڵ دەگۆڕێن، وەک ئەندازەکانی سزادانەکان، کە حوکمڕانەکان بە کۆششی خۆیان، وەک تەمبێ کردن (**تعزير**) دایان دەنێن و، جۆرەکانیان و سیفەتەکانیان، چونکە شەرعدانەر بە پێی بەرژەوەندیی جۆراو جۆریان دەکات.

هەروەهـا (**القَرَافِي**)یـش، لـەو بـارەوە مەسـەلەیەکی زۆر گرنـگ دەخاتـە ڕوو، کـە ئەویـش یەکسـەر مانـا کوردییەکـەی دێنـم، لـە (**الإحكام في تمييز الفتاوى عن الأحكام وتصرّفات القاضي والإمام**)دا[1]، دەڵـێ: وەک خۆیـان ئەنجامدانـی ئـەو حوکمانـەی کـە پەیوەسـتن بـە عـادەت و نەریتەکانـەوە، وێـڕای گۆڕانـی ئـەو عـادەت و نەریتانـە، پێچەوانـەی کـۆ ڕایـەو نەزانییـە لـە ئاینـدا، بەڵکـو هەرچـی لە شـەریعەتدا پەیوەسـت بـێ بـە عـورف و عادەتەکانـەوە، حوکمەکـە بـە پێـی گۆڕانـی عـورف و عادەتەکـەوە دەگـۆڕێ، بـۆ حاڵەتێـک کـە عـورف و باوەکـە دیخـوازێ، هەروەهـا ئەوەی بـە ڕەهایی دەگوتـرێ، لـە بـارەی وەسـییەتەکان و سـوێندەکان و تێکـڕای بابەتـە فیقهییەکانـەوە، کـە پەیوەسـتن بـە حوکـم و باوەکانـەوە، هـەر کات عـورف و بـاوەکان گـۆڕان، ئـەو حوکمانـەش کـە لـەو بوارانـەدان، دەگۆڕێـن.

کەواتـە: لـەم ڕۆژگارەمانـدا کـە عـورف و عـادەت و بـاوی سیاسـیی نێـو دەوڵەتیـی دنیـا، لـە بـواری مامەڵەکـردن لەگـەڵ دیلەکانـی جەنگـدا بـە تایبەتیـی و، بابەتـی بـە کۆیلەکردنـی مـرۆڤ دا بـە گشـتیی، گـۆڕاوە، وەک پێشـتر گوتمـان: لـە سـاڵی (١٨٥٦)ی زایینـی لـە کۆنگـرەی (جنێـف)دا، بڕیـاری کۆتایـی نێـو دەوڵەتیـی لـە بـارەی نەهێشـتنی بازرگانییکـردن بـە کۆیلانـەوە، دراوە، کەواتـە: ئێسـتا نـەک هـەر واقیعێکـی ناچارکـەر نیـە، وا لـە مسـوڵمانان و قـەوارە سیاسـییەکانیان بـکات، لـە کاتێکـدا ئاییـن و شـەریعەتەکەیان دژی بـە کۆیلەکردنـی مرۆڤـە، کـە لەسـەر بناغـەی مامەڵـەی هاوشـێوەو بـە ناچاریـی، بچنـە نێـو بـازاڕی بـە کۆیلـە کردنـەوە، بەڵکـو بـە پێچەوانـەوە، واقیعێکـی دیکـەی هانـدەر بـۆ ئازادیـی مرۆڤـەکان و، نەهێشـتنی

---

(١) ص ٢١٨ - ٢١٩.

کۆیلەیی هەیە، واتە: ئەو عورف و باوەی کاتی خۆی مسوڵمانانی ناچار کردوون، دیلەکانی جەنگ بە کۆیلە بکە، ئێستا گۆڕاوە.

کەواتە: وەک (القرَافِي)، گوتوویەتی: کۆڕا و تێگەیشتن لە ئایین، خوازیاری ئەوەن و مسوڵمانان پابەند دەکەن، ئەو هەڵوێست و حوکمە شەرعییەی کە کاتی خۆی بار ودۆخێکی واقیعی ناشەرعیی نەگونجاو ناچاریی کردوون، تەبەنیی بکەن، ئێستا بیگۆڕن، بە هەڵوێستێکی واو بە حوکمێکی دیکەی شەرعیی گونجاو، لەگەڵ شەریعەت و واقیعی ئێستای عورف و باوی دنیاداو، هیچ پێویستیی بە هەبوونی لابەر (ناسخ) نیە بۆ حوکمە پێشووەکە، چونکە حوکمە پێشووەکە حوکمێکی چەسپاوی شەریعەت نەبووە، بەڵکو بڕیارو هەڵوێستێکی ناچاریی و کاتیی بووە، بەرانبەر بە واقیعێکی ناشەرعیی نەخوازراوو، بە گۆڕانی واقیع و هەل و مەرجە ناچارکەرە نەخوازراوەکە، یەکسەر ئەو هەڵوێست و بڕیارە، پاساوی نەماوەو کۆتایی پێهاتوە، وەک هەر هەڵوێست و بڕیارێکی دیکەی هەڵقوڵاوی عادەت و هەل و مەرجی کۆمەڵگا.

**پرسیاری دووەم: ئایا لەم ڕۆژگارەدا لەسەر بناغەی مامەڵەی هاوشێوە (المعاملة بالمثل) ئەگەر ئەهلی کوفر دیلەکانی مسوڵمانانیان بە کۆیلە کردن، دروستە مسوڵمانانیش دیلەکانی ئەوان بە کۆیلە بکەن؟**

لە وەڵامدا دەڵێین: هەرچەندە ئیسلام بە سرووشت، وەک بوونناسیی و ئیمان و عەقیدەکەی و وەک شەریعەتەکەی، دژی کۆیلایەتییە، بەڵام وەک چۆن لە ڕۆژگاری پێغەمبەر ﷺ و چوار خەلیفە ڕاشیدەکانیدا، وەک کاردانەوەو، مامەڵەی هاوشێوە، بە ناچاریی ئەو بڕیارە نەخوازراوە دراوەو، ئەو هەڵوێستە ناچارییە تەبەنیی کراوە، ئێستاش بە هەمان شێوە، پێم وایە دەگونجێ ئەو هەڵوێستە بگیرێتەبەر، چونکە خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿فَمَنِ ٱعْتَدَىٰ عَلَيْكُمْ فَٱعْتَدُوا۟ عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا ٱعْتَدَىٰ عَلَيْكُمْ ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلْمُتَّقِينَ ﴿١٩٤﴾﴾ البقرة.

بـەڵام بێگومـان ئـەوە لـە حاڵێکدایـە، کـە مسـوڵمانان بەرژەوەندیـی لـە کاردانەوەو مامەڵـەی هاوشـێوەدا ببینـن، ئەگەرنـا ئەگـەر پێیـان وابـوو، زیانـی لـە قازانجـی زیاتـرە، ئـەو کاتـەش دروسـت نیـەو، مەرجیـش نیـە هەرچـی بێبڕوایـان لـە خۆیـان وەشـاندەوە، مسـوڵمانانیش لـە خۆیانـی بوەشـێننەوەو بـە شایسـتەی خۆیـان و ئاییـن و بەرنامـە تێـرو تەواوەکـەی خـوای کارزانی بزانـن.

**لە کۆتایی ئەم باسەدا:**

بـە باشـی دەزانـم لـە کۆتایـی ئـەم باسـەدا، قسـەیەکی کورتیـش لـە تەفسـیرە نایابەکـەی (**سـید قطـب**)ەوە، ڕەحمەتـی خـوای لـێ بـێ، (**في ظِـلال القـرآن**)، کـە ئەویـش هـەر لـە تەفسـیری ئایەتـی ژمـارە (٤)ی سـوورەتی (**محمـد**)دا، دوای چەنـد قسـەیەک دەڵـێ: (**والخلاصـة التـي ننتهـي إليهـا، أن هـذا النـص هـو الوحيـد المُتَضمِّـن حكـم الأسرى. وسـائر النصـوص تتضمـن حـالات أخـرى غـير حالـة الأسر، وأنـه هـو الأصـل الدائـم للمسـألة، ومـا وقـع بالفعـل خارجـاً عنـه، كان لمواجهـة حـالات خاصـة وأوضـاع وقتيـة، فقتـل بعـض الأسرى كان في حـالات فرديـة، يمكـن أن يكـون لهـا دائمـاً نظائـر؛ وقـد أُخِـذوا بأعـمال سـابقة عـلى الأسر، لا بمجـرّد خروجهـم للقتـال، ومثـال ذلـك أن يقـع جاسـوس أسـيراً فيحاكـم عـلى الجاسوسـية لا عـلى أنـه أسـير، وإنمـا كان الأسر مجـرد وسـيلة للقبـض عليـه.**

**ويبقـى الإسـترقاق، وقـد سـبق لنـا في مواضـع مختلفـة مـن هـذه الظـلال القـول: بأنـه كان لمواجهـة أوضـاع عالميـة قائمـة، وتقاليـد في الحـرب عامـة، ولم يكـن ممكنـاً أن يطبـق الإسـلام في جميـع الحـالات النـص العـام: فإمّـا مَنّـاً بعـد وإمّـا فـداءً .. في الوقـت الـذي يسـترق أعـداء الإسـلام مـن يأسرونهـم مـن المسـلمين، ومِـنْ ثَـمَّ طبّقـه الرسـول ﷺ في بعـض الحـالات فأطلق بعـض الأسـارى مَنّـاً، وفـادى ببعضهـم أسرى المسـلمين، وفـادى بعضهـم بالمـال، وفي حـالات أخـرى وقـع الإسـترقاق لمواجهـة حـالات قائمـة لا تعالـج بغـير هـذا الإجـراء**).

دەڵێ: ئەو پوختەیەی کە پێی دەگەین ئەوەیە کە ئەم دەقە تاکە دەقێکە حوکمی دیلەکانی جەنگی تێدایەو، دەقەکانی دیکە باسی حاڵەتەکانی دیکە دەکەن و، ئەم دەقە بناغەی هەمیشەییە لە مەسەلەکەداو، ئەوەی لە دەرەوەی ئەم دەقە ڕووی داوە، {واتە: وەک ئەم دەقە، گوتوویەتی، مامەڵە نەکراوە}، بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی هەندێ حاڵەتی تایبەت و بار ودۆخی کاتیی بووە، بۆ وێنە: کوشتنی هەندێک لە دیلەکان لە هەندێ حاڵەتی تاکیی دا، ئەوە هەمیشە وێنەیان دەبێ، کە ئەوانە بە هۆی تاوانی دیکەی پێش بە دیل گیرانیانەوە سزا دراون، نەک تەنیا لەبەر ئەوەی هاتوونە جەنگ {بەڵکو خوێنی خەڵک قەرزار بوون، یاخود تاوانی دیکەی وایان کردوون لە سەریان بکوژێن}، وێنەی ئەوە کە جاسووسێک بە دیلیی بکەوێتە دەستی دەوڵەت، (دەوڵەتی ئیسلامیی)، ئەو کاتە لەبەر جاسوسییەکەی دەکوژرێ، نەک لەبەر ئەوەی دیلە، بەڵکو بە دیل گرتنەکەی تەنیا ئامرازێک بووە.

دەمێنێتەوە مەسەلەی کۆیلە کردن، پێشتریش لە (**في ظلال**)دا، باسمان کردوە، بە کۆیلە کردن بۆ ڕووبەڕوو بوونەوە بووە لەگەڵ هەندێک بارودۆخی دنیایی ئەو کاتەو، هەندێک نەریتیی جەنگیی کە ئەو کاتە هەبووەو، ئیسلام بۆی نەگونجاوە لە هەموو حاڵەتاندا، ئەم دەقە گشتییە جێبەجێ بکات، (**فإمّا منأ بعد، وإما فداءً**)، لە حاڵێکدا کە دوژمنانی ئیسلام، مسوڵمانان دەگرن و دەیانکەنە کۆیلە، بۆیە پێغەمبەر ﷺ لە هەندێ حاڵەتدا، ئەوەی جێبەجێ کردوە، هەندێ لە دیلەکانی بە منەت و چاکە بەرداون و، هەندێکی بە قەرەبوو بەرداون و، هەندێکیان ماڵی لێوەرگرتوون و، هەندێک جاریش هەندێکی بە کۆیلە گرتوون بۆ چارەسەرکردنی واقیعێک کە بەو شێوە نەبووایە، چارەسەر نەدەکرا.

دوایی دەڵێ: (**ویحسن أن یکون مفهوماً أنني أجنح إلى هذا الرأي لأن النصوص القرآنیة واستقراء الحوادث وظروفها یؤیّده، لا لأنه یهجس في خاطري أن استرقاق الأسرى تهمة، أحاول أن أبرِّيء الإسلام منها! إن مثل هذا الخاطر لا یهجس في نفسي**

أبداً، فلو كان الإسلام رأى هذا، لكان هو الخير، لأنه ما من إنسان يعرف شيئاً من الأدب يملك أن يقول: إنه يرى خيراً مما يرى الله! إنما أنا أسير مع نص القرآن وروحه، فأجنح إلى ذلك الرأي، بإيحاء النص واتجاهه)[1].

واتە: پێویستە لێرەدا ئەوەش بزانرێ کە من بۆیە ئەو رایە هەڵدەبژێرم، چونکە دەقەکانی قورئان و، تێوە رامانی رووداوەکان و هەل و مەرجەکان، پشتگیریی ئەوە دەکەن، نەک لەبەر ئەوەی بە دڵمدا بێ، کە بە کۆیلەکردنی دیلان، تۆمەتێک بێ ئیسلامی لێ بەریی بکەم، هەرگیز ئەوەم بە زەیندا نایەت، ئەگەر زانیبام ئیسلام وا بە باش دەزانێ (دیارە ئەو کاتە وا باش بوو)، بێگومان هەر ئەوە چاک بوو، هەر کەسێک تۆزێک ئەدەبی هەبێ، ناتوانێ بڵێ: من شتێک بە باش دەزانم، چاکتر لەوەی خوا ﷻ فەرموویەتی!! بەڵکو من لەگەڵ دەقی قورئاندا دەڕۆم و، لەگەڵ رووحەکەیدا دەڕۆم، بۆیە ئەم رایە هەڵدەبژێرم، لەبەر ئەوەی هەم دەقەکە، هەم ئاراستەی ئیسلام ئەوە دەگەیەنێ.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

---

(١) في ظلال القرآن: ج٦، ص ٣٢٨٥.

# پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـە لـە هەشـت ئایـەت پێـک دێ، ئایەتـەکانی: (١٢ - ١٩)، کەچەنـد بابەتێکـی جـۆراو جۆریـان گرتوونـە خۆیـان، بـەڵام تـەوەری سـەرەکیی و سـوڕگەیان، بـاسی سـەرەنجامی هـەر کام لـە بـڕواداران و بێبڕوایانـە، لە دنیـاو دوارۆژداو، سـەرجەم حـەوت بابەتـن:

١- چوونە بە هەشتی بڕواداران و، چوونە دۆزەخی بێبڕوایان، لە ئایەتی (١٢)دا.

٢- هەڕەشەکردن لە کافرەکانی مەککە، کە پێغەمبەریان ﷺ وەدەرنا، بەوە کە خوا ﷻ ئاوەدانیی و کۆمەڵگاکانی لەوان بەهێزتری لە ڕابردوودا فەوتاندوون، لە ئایەتی (١٣)دا.

٣- بەراوردی نێوان بڕوادارانی بەرچاو ڕوون و، بێبڕوایانی ئارەزوو و پەرست، لە ئایەتی (١٤)دا.

٤- وەسفی بە هەشتێک کە پارێزکارانی دەچنە نێوو، وەسفی سزاو جەزرەبەی بێبڕوایان، لە ئایەتی (١٥)دا.

٥- باسی بەهرە وەرنەگرتنی بێبڕواو دڵنەخۆشەکان لە کۆڕو قسەی پێغەمبەر ﷺو، بە پێچەوانەوەش: زیادکردنی هیدایەتی بڕواداران و، پێبەخشرانی پاریزکاریی، ئایەتەکانی: (١٦ و ١٧).

٦- باسی هاتنی ئاخیر زەمان کە هەندێ لە نیشانەکانی دەرکەوتوون و هاتوون، لە ئایەتی (١٨)دا.

٧- بابەتی حەوتەم و کۆتایی، فەرمانکردنی خوا ﷻ بە پێغەمبەر ﷺ بە زانینی یەکتایی خوا لە پەرستنداو، داوای لێبوردن کردن بۆ خۆی و بڕوادارانی پیاوو ئافرەت، لە خوای لێبوردە بۆ هەڵەو کەم و کوڕییەکان، ئایەتی (١٩).

﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُدۡخِلُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُۖ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يَتَمَتَّعُونَ وَيَأۡكُلُونَ كَمَا تَأۡكُلُ ٱلۡأَنۡعَٰمُ وَٱلنَّارُ مَثۡوٗى لَّهُمۡ (١٢) وَكَأَيِّن مِّن قَرۡيَةٍ هِيَ أَشَدُّ قُوَّةٗ مِّن قَرۡيَتِكَ ٱلَّتِيٓ أَخۡرَجَتۡكَ أَهۡلَكۡنَٰهُمۡ فَلَا نَاصِرَ لَهُمۡ (١٣) أَفَمَن كَانَ عَلَىٰ بَيِّنَةٖ مِّن رَّبِّهِۦ كَمَن زُيِّنَ لَهُۥ سُوٓءُ عَمَلِهِۦ وَٱتَّبَعُوٓاْ أَهۡوَآءَهُم (١٤) مَّثَلُ ٱلۡجَنَّةِ ٱلَّتِي وُعِدَ ٱلۡمُتَّقُونَۖ فِيهَآ أَنۡهَٰرٞ مِّن مَّآءٍ غَيۡرِ ءَاسِنٖ وَأَنۡهَٰرٞ مِّن لَّبَنٖ لَّمۡ يَتَغَيَّرۡ طَعۡمُهُۥ وَأَنۡهَٰرٞ مِّنۡ خَمۡرٖ لَّذَّةٖ لِّلشَّٰرِبِينَ وَأَنۡهَٰرٞ مِّنۡ عَسَلٖ مُّصَفّٗىۖ وَلَهُمۡ فِيهَا مِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ وَمَغۡفِرَةٞ مِّن رَّبِّهِمۡۖ كَمَنۡ هُوَ خَٰلِدٞ فِي ٱلنَّارِ وَسُقُواْ مَآءً حَمِيمٗا فَقَطَّعَ أَمۡعَآءَهُمۡ (١٥) وَمِنۡهُم مَّن يَسۡتَمِعُ إِلَيۡكَ حَتَّىٰٓ إِذَا خَرَجُواْ مِنۡ عِندِكَ قَالُواْ لِلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡعِلۡمَ مَاذَا قَالَ ءَانِفًاۚ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ طَبَعَ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ وَٱتَّبَعُوٓاْ أَهۡوَآءَهُمۡ (١٦) وَٱلَّذِينَ ٱهۡتَدَوۡاْ زَادَهُمۡ هُدٗى وَءَاتَىٰهُمۡ تَقۡوَىٰهُمۡ (١٧) فَهَلۡ يَنظُرُونَ إِلَّا ٱلسَّاعَةَ أَن تَأۡتِيَهُم بَغۡتَةٗۖ فَقَدۡ جَآءَ أَشۡرَاطُهَاۚ فَأَنَّىٰ لَهُمۡ إِذَا جَآءَتۡهُمۡ ذِكۡرَىٰهُمۡ (١٨) فَٱعۡلَمۡ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ وَٱسۡتَغۡفِرۡ لِذَنۢبِكَ وَلِلۡمُؤۡمِنِينَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتِۗ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ مُتَقَلَّبَكُمۡ وَمَثۡوَىٰكُمۡ (١٩)﴾.

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{بــە دڵنیایــی خــوا ئەوانــەی بڕوایــان هێنــاوەو چاکەکانیــان کــردوون، دەخاتــە بەهەشــتانێکەوە ڕووباریــان بــە ژێــردا دەڕۆن، ئەوانــەش کــە بێبــڕوان، ڕادەبوێــرن و ئــاژەڵ ئاســا دەخــۆن و (ســەرەنجامیش) ئاگــر(ی دۆزەخ) نشــینگەیانە (١٢) زۆر ئاوەدانییشــمان فەوتانــدن و هیــچ پشــتیوانیان نەبــوو، لــە ئاوەدانییەکــەی تــۆی وەدەرنــا، هێزیــان توندتــر بــوو (١٣) ئایــا کەســێک لــە لایــەن پەروەردگاریــەوە لەســەر بەڵگەیەکــی ڕۆشــن بــێ، وەک کەســێکە کــردەوە خراپەکــەی بــۆ ڕازێنراوەتــەوەو، دوای ئارەزووەکانیــان کەوتــوون؟ (١٤) وێنــەی ئــەو بەهەشــتەی کــە گفــت بــە پاریــزکاران دراوە (بەمجۆرەیــە) ڕووبــار گەلێکــی تێــدان لــە ئاوێکــی (ســاف و ســازگارو) بــۆن نەکــردوو، ڕووبــار گەلێــک لــە شــیرێکی تــام نەگــۆڕاوو، ڕووبــار گەلێــک لــە شــەرابێکی بــە چێــژ بــۆ خۆرەوانــی و، ڕووبــار گەلێــک لــە هەنگوێنــی پاڵفتــە کــراوو، لــە هەمــوو جــۆرە میوەکانیــان هەیــەو، لێبوردنێــک لــە پەروەردگاریانــەوە، (ئنجــا ئایــا حاڵــی ئەوانــە) وەک هــی کەســێکە لــە ئاگــردا هەرمــاوەو، لــە ئاوێکــی کوڵاوو داغیــان پــێ دەخورێتــەوە، ڕیخۆڵەکانیان پچــڕ پچــڕ دەکات؟! (١٥) لەو (دەغەڵ)انــە هــی واشــیان هەیــە کــە (بــە ڕواڵــەت) گوێــت بــۆ هەڵدەخــات، هەتــا کاتێک لــە (کــۆڕی) لای تــۆ چوونــە دەرێ، بەوانــەی زانیارییــان پێــدراوە دەڵێــن: پێــش ئێســتا (پێغەمبــەر ﷺ) چــی گــوت؟ ئەوانــە کەســانێکن خــوا دڵیانــی مــۆر کــردوەو، کەوتوونــە دوای ئارەزووەکانیــان (١٦) ئەوانــەش کــە ڕێــی ڕاســتیان گرتــوە (خــوا) پــتر ڕاســتە ڕێــی کــردوون و پارێزکاریــی (شایســتەی) خۆشــیانی پێــداون (١٧) ئایــا (بێبــڕواو دڵنەخۆشــەکان) تەنیا چاوەڕێــی ئاخیــر زەمــان ناکــەن کــت و پــڕ بۆیــان بــێ، بــە دڵنیایــی (هەندێــک لــە) نیشــانەکانی هاتــوون، ئنجــا کاتێــک بۆیــان هــات چــۆن (و لە کــوێ) پەنــد وەردەگرن؟ (١٨) دەجــا (ئــەی موحەممــەد ﷺ!) بزانــە کــە جگــە لــە خــوا هیــچ پەرســتراوێک (ی شایســتەی پەرســتران) نیــەو، بــۆ گوناهــی خــۆت و پیــاوان و ئافرەتــانی بــڕوادار داوای لێبــوردن (لــە خــوا) بکــەو، خــواش شــوێنی هاتــن و چــوون و نشــینگەتان دەزانــێ (١٩)}

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(يَتَمَتَّعُونَ): (المَتَاعُ: كُلُّ مَا يُنْتَفَعُ بِهِ، عَلَى وَجْهٍ، فَهُوَ مَتَاعٌ وَمُتْعَة)، هەر شتێک بە شێوەیەک لە شێوەکان بەهرەی لێوەربگیرێ، پێی دەگوترێ: (مَتَاع ومُتْعَة)، (يَتَمَتَّعُونَ): واتە: ڕادەبوێرن و، چێژ و بەهرە وەردەگرن.

(مَثْوًى): (الثَّوَاءُ: الإِقَامَةُ مَعَ الإسْتِقْرَار)، (ثَوَاء): بریتیە لە مانەوە لە شوێنێک لەگەڵ نیشتەجێ بووندا، کەواتە: ﴿مَثْوًى﴾: واتە: نشینگەو، شوێنی نیشتەجێ بوون.

(وَكَأَيِّن): (تَدُلُّ عَلَى كَثْرَةِ العَدَدِ، بِمَعْنَى كَمِ الخَبَرِيَّة، كَأَيِّن مُرَكَّبٌ مِنَ الكَافِ وَ «أين» بِمَعْنَى «كَمْ» الخَبَرِيَّة)، (كَأَيِّن) زۆریی ژمارە دەگەیەنێ، بە مانای (كَمْ) ە، ﴿وَكَمْ أَهْلَكْنَا مِن قَرْيَةٍ ﴿٥٨﴾﴾ القصص، (كَأَيِّن) و (كَم) لە ڕووی واتاوە لە یەک نیزیکن، ﴿وَكَأَيِّن﴾: لە (ک) پێک هاتوە لەگەڵ (أيْنَ)و، بە مانای (كَمْ)ی خەبەریی دێ.

(مَّثَلُ): (مَثَل، وَمِثْل: شَبه وَشِبه، صِفَةٌ)، ﴿مَّثَلُ الْجَنَّةِ﴾، (صِفَةُ الجَنَّة، وَصْفُ الجَنَّة)، (مَثَل ومِثْل)، وەک (شَبَه وَشِبْه)، واتاکەیان بەو شێوەیە.

(غَيْرِ ءَاسِنٍ): (أي: غَيْرِ آجِنٍ، أَسِنَ وَأَسَنَ فَهُوَ آسِنْ، وَأَسَنَ المَاءُ وَأَجَنَ تَغَيَّرَ طَعْمُه وَرِيْحُه)، ﴿ءَاسِنٍ﴾، واتاکەی زۆر نیزیکە لە (آجِن)، دەگوترێ: (أَسَنُ المَاءُ وَأَسِنَ، مِثْلُ أَجِنَ المَاءُ فَهُوَ آجِنْ فَهُوَ آسِن)، (آسِن وَآجِنْ)، هەردووکیان ناوی بکەر (اسْمُ فَاعِل)ن، لە (أَسَنَ وَأَجَنَ)، یاخود لە (أَسِنَ وَأَجِنَ)، هاتوون، (وَأَسِنَ المَاءُ وَأَجَنَ: تَغَيَّرُ طَعْمُهُ وَرِيْحُهُ)، ئاوە کە تام و بۆنی گۆڕا، کە دەفەرموێ: ﴿مِّن مَّآءٍ غَيْرِ ءَاسِنٍ﴾، ڕووبار گەلێک لە ئاوێکی سازگار کە تام و بۆنەکەی نەگۆڕاوە.

(لَذَّةٍ): (يُقَالُ: شَرَابٌ لَذٌّ وَلَذِيذٌ بِمَعْنَى، وَاللَّذَّةُ وَاحِدَةُ اللَّذَّات)، (شَرَابٌ لَذٌّ وَلَذِيذٌ)، بە یەک واتان، خواردنەوەیەکی خۆش، بە چێژ، (اللَّذَّةُ)، تاکی (اللَّذَّات)ە، ئەو شتانەی چێژ لێوەرگیراون.

(مُصَفًّى): (صَفَّاهُ تَصْفِيَةً، وَالصَّفَاءُ ضِدُّ الكَدَرِ، وَصَفْوَةُ الشَّيْءِ: خَالِصُهُ)، (صَفَّاهُ تَصْفِيَةً)، واتە: پاڵاوتی و دەیپاڵێوێ، (صَفَاء)، دژی (كَدَر)ە، (كَدَر) واتە: لێڵیی، (صَفَاء)، واتە: ڕوونیی و بێ خڵتەیی، (وَصَفْوَةُ الشَّيْءِ: خَالِصُهُ)، (صَفْوَةُ الشَّيْء)، واتە: هەڵبژاردەی ئەو شتە.

(أَمْعَآءَهُمْ): (جَمْعُ مِعَى: الْمُؤْمِنُ يَأْكُلُ فِي مِعَىً وَاحِد)، وەک لە فەرموودەی پێغەمبەردا ﷺ هاتووە، (أَمْعَاء)، کۆی (مِعَى)ە، واتە: ڕیخۆڵە، لە حەدیسی پێغەمبەردا ﷺ هاتووە، ئیماندار لە یەک ڕیخۆڵەدا دەخوات، بەڵام کافر لە حەوت ڕیخۆڵاندا دەخوات، بەو واتایەی بڕوادار زووتر تێر دەبێ و قەناعەتی دێ، لە کاتی خواردندا، لەبەر ئەو حاڵەتە مەعنەوییەی هەیەتی، بەڵام بابای بێبڕوا ئەو حاڵەتە ئیمانیی و ڕووحییەی نیە، لەبەر ئەوەی هەموو گرنگییدان و جێی بایەخی، بریتیە لە خواردن.

(ءَانِفًا): (آنِفاً: سَالِفاً أَو مُبْتَدَأً)، (آنِفاً) ئەوەی پێشتریێ، یاخود سەرەتا، (آنِفاً يُرَادُ بِهَا السَّاعَةُ الَّتِي أَقْرَبُ الأَوْقَاتِ، وَانْتِصَابُهُ عَلَى الظَّرفِيَّة)، (آنِفاً) ئەو کاتەی کە نزیکترین کاتە، لەو کاتەوەی قسەی تێدا دەکرێ و، مەنصووب بووە لەسەر زەرف بوون، لەبەر ئەوەی (ظرف)ەو ناوی کاتە، وەک لە کوردیی دا دەگوترێ: هەر ئێستا چی گوت؟ یان پێش ئێستا چی گوت؟.

(بَغْتَةً): (البَغْتُ: مُفَاجَأَةُ الشَّيْءِ بَحِيْثُ لاَ يُحْتَسَب)، (بَغْت): بە شێوەیەک کتوپڕ هاتنی شتێکە، کە چاوەڕێ نەکرێ.

(أَشْرَاطُهَا): (أَشْرَاطُ: جَمْعُ الشَّرَط: العَلاَمَة)، (أَشْرَاط) کۆی (شَرَط)ە، واتە: نیشانە، بەڵام (شُرُوط)، کۆی (شَرْط)ە، مەرج، (شُرُوط)، مەرجەکان.

(فَأَنَّىٰ لَهُمْ): (أَنَّى: بَحْثٌ عَنِ الحَالِ وَالمَكَان، وَهُوَ بِمَعْنَى: كَيْفَ وَأَيْنَ)، (أَنَّى)، لە بارەی حاڵ و شوێنەوە دەکۆڵێتەوەو، بە مانای: چۆن و لە کوێ، دێ.

(ذِكْرَىٰهُمْ): (الذِّكْرَى، كَثْرَةُ الذِّكْرِ، وَهُوَ أَبْلَغُ مِنَ الذِّكْرَ)، (ذِكْرَى): بریتیە لە زۆر یاد کردن، یان زۆر بیرکەوتنەوە، کە مانایەکەی بە هێزترە لە (ذِكْر).

(مُتَقَلَّبَكُمْ): (التَّقَلُّبُ التَّصَرُّفُ، وَالمُتَقَلَّبُ مَكَانُ التَّقَلُّبِ)، (تَقَلُّب): بە مانای هەڵسوکەوت کردن و هاتن و چوون دێ، (مُتَقَلَّبْ)، شوێنی تێدا هەڵسوکەوت کردن و هاتن و چوون.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

وەک لە پێناسەی ئەم دەرسەدا گوتمان: لەم هەشت ئایەتە موبارەکەدا، خوا ﷻ حەوت بابەت باس دەکات، ئنجا هەیانە بە ئاماژەو کورتیی و، هەیانە زیاتر ڕوونی دەکاتەوە، دوای ئەوەی لە یازدە (١١) ئایەتی پێشوودا، خوا ﷻ باسی ئەوەی کرد، ئەوانەی بێبڕوان، خەڵک لە ڕێی خوا لادەدەن و، خواش کردەوەکانیان زایە دەکات، واتە: پیلان و فێڵەکانیان بێ ئاکام و بێ بەرهەم دەکات، پاشان باسی بڕوادارانی کردو باسی ئەوەی کرد، بۆچی کردەوەی بێبڕوایان بێ ئاکام و بێ بەرهەمەو، هی بڕواداران جێی خۆی دەگرێ؟ دوایی فەرمانی کرد بە بڕواداران کە لە کاتی ڕووبەڕوو بوونەوەدا، لە ملی کافران بدەن و، دوای ئەوەی لە پەل و پۆیان خستن، ئنجا بە دیلیان بگرن و، پاش بە دیل گرتنیان، بە منەت و بە بەلاش بەریان بدەن، یاخود بە بەرانبەر.

پاشان خوا ﷻ باسی سەرەنجام و ئاکامی چاکی بڕوادارانی کردو، دوایی باسی سەرەنجامی شوومی بێبڕوایانی کردو، سەرنجیانی ڕاکێشا بۆ مێژوو و، ئەو ڕاستییەشی خستە ڕوو، کە خوا ﷻ ئەوانەی پێشتر لە بەینی بردوون، ئەو

جۆرە سزایە، یان ئەو جۆرە سەرەنجامە، ئێستاش لە بۆسەدایەو، بێبڕوایانێک کە وەک بێبڕوایانی پێشوو دەکەن، لەگەڵ پەیامی خوا ﷻ و پێغەمبەردا ﷺ، دەبێ چاوەڕێی هەمان جۆرە سەرەنجام، یاخود سزا بکەن.

ئنجا خوا ﷻ دێتە سەر باسی ئەوەی چۆن بڕوادارانی کردار باش دەخاتە بە هەشتانێک، کە ڕووبارانیان بە ژێردا دەڕۆن، بەڵام بێبڕوایانێک کە لە دنیادا بە شێوەیەک دەگوزەرێنن، وەک چۆن ئاژەڵ دەلەوەڕێ، ئەوانیش ئاوا دەگوزەرێنن و، سەرەنجامیان ئاگرە، خوا ﷻ دەفەرموێ:

﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُدْخِلُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ﴾، بە دڵنیایی خوا ئەوانەی بڕوایان هێناوەو کردەوە چاکەکانیان ئەنجام داون، دەیانخاتە چەند باخێکەوە کە ڕووباریان بە ژێردا دەڕۆن، واتە: ڕووبارەکان بە ژێر درەختەکانیاندا دەڕۆن، یاخود ڕووبارەکان هەر لەوێوە سەرچاوە دەگرن، وەک دواتر باسی دەکەین، ﴿وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟﴾، بەڵام ئەوانەی بێبڕوابوون، ﴿يَتَمَتَّعُونَ وَيَأْكُلُونَ كَمَا تَأْكُلُ ٱلْأَنْعَٰمُ وَٱلنَّارُ مَثْوًى لَّهُمْ﴾، ڕادەبوێرن و دەخۆن، وەک چۆن ئاژەڵ دەخوات، بۆیە ئاگریش شوێنی حەوانەوەو نشینگەیانە، واتە: لێرەدا خوا ﷻ باسی سەرەنجامی بڕواداران و بێبڕوایان دەکات، بەڵام وێڕای ئەوەش کە باسی سەرەنجامە شوومەکەیان دەکات، ئەو ڕاستییەش دەخاتەڕوو، کە خوا ﷻ بۆچی تووشی ئەو سزایەی کردوون؟ ﴿يَتَمَتَّعُونَ وَيَأْكُلُونَ كَمَا تَأْكُلُ ٱلْأَنْعَٰمُ وَٱلنَّارُ مَثْوًى لَّهُمْ﴾، لەبەر ئەوەی ڕادەبوێرن و، بەهرە وەردەگرن لە لەززەتەکانی دنیاو، دەخۆن وەک چۆن ئاژەڵ دەخوات، بۆیە سەرەنجام و نشینگەشیان ئاگرە.

﴿وَكَأَيِّن مِّن قَرْيَةٍ هِىَ أَشَدُّ قُوَّةً مِّن قَرْيَتِكَ ٱلَّتِىٓ أَخْرَجَتْكَ أَهْلَكْنَٰهُمْ فَلَا نَاصِرَ لَهُمْ﴾، ئنجا ڕوو دەکاتە پێغەمبەر ﷺ، لێرەدا دوێنراو (**مخاطب**) پێغەمبەری خاتەمە، دەفەرموێ: زۆر ئاوەدانیی کە هێزیان توندتر بوو لەو ئاوەدانییەی تۆی وەدەرنا، تۆی ناچار کرد بە جێی بهێڵی، ﴿أَهْلَكْنَٰهُمْ﴾، ئێمە ئەوانمان فەوتاند، قڕەبرمان کردن،

﴿ فَلَا نَاصِرَ لَهُمْ ﴾، هیـچ پشـتیوان و هاوکارێکیشـیان نەبـوو، واتـە: ئاوەدانییەکـەی تـۆش ئەگـەر لەسـەر ئـەو حاڵـەی ئێسـتا تێیـدان لـە دژایەتیـی تـۆو خـوا ﷻ، دەبـێ چاوەڕێـی هەمـان جـۆرە سـزاو سـەرەنجامی شـووم بکـەن.

﴿ أَفَمَن كَانَ عَلَىٰ بَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّهِۦ ﴾، ئایا کەسێک کە لە لایەن پەروەردگاریەوە لەسەر بەڵگەیەکـی ڕۆشـنە، بەرچـاو ڕۆشـنە، ﴿ كَمَن زُيِّنَ لَهُۥ سُوٓءُ عَمَلِهِۦ ﴾، وەک کەسـێک وایـە: کـردەوە خراپەکـەی خـۆی بـۆ ڕازێنراوەتـەوە، ﴿ وَٱتَّبَعُوٓاْ أَهْوَآءَهُم ﴾، کەوتوونـە شـوێن ئارەزووەکانیشـیان؟ بـە دڵنیاییـەوە وەک یـەک نیـن، بۆیـە ئـەو پرسـیارکردنە سەرزەنشـتکارانەو نکووڵییلێکارانەیـە.

ئنجا خـوا ﷻ باسـی ئـەو مەنزڵگایـە دەکات کـە بـۆ ئەهلـی ئیمان دانـراوە، کـە خـوا ﷻ هـەر بـە بـاخ یـان باخـەکان نـاوزەدی دەکات، واتـە: باخچـەو گـوڵ و گوڵـزار، دەفەرمـوێ: ﴿ مَّثَلُ ٱلْجَنَّةِ ٱلَّتِى وُعِدَ ٱلْمُتَّقُونَ ﴾، وێنـەی ئـەو باخـەی بەڵێنـدراوە بـە پارێـزکاران، واتـە: پارێـزکاران بەڵێنیـان پێـدراوە بیچنەتـێ، (**مَثَلُ الجنة**)، واتـە: (**صِفَـة الجَنَّـة**)، واتـە: حاڵەتـی ئـەو بـاخ و گوڵـزارە، ئـەو بەهەشـتە بـەو شـێوەیە: ﴿ فِيهَآ أَنْهَٰرٌ مِّن مَّآءٍ غَيْرِ ءَاسِنٍ ﴾، لەوێـدا ڕووبـار گەلێکـی تێـدان لـە ئاوێکـی بـۆن نەکـردو، تـام و بـۆن و ڕەنـگ نەگـۆڕا و، بەڵکـو ئاوێکـی زوڵاڵ و سـاف و سـازگار، ﴿ وَأَنْهَٰرٌ مِّن لَّبَنٍ لَّمْ يَتَغَيَّرْ طَعْمُهُۥ ﴾، هەروەهـا ڕووبـار گەلێکـی تێـدان لـە شـیرێک تامەکـەی نەگـۆڕاوە، ﴿ وَأَنْهَٰرٌ مِّنْ خَمْرٍ لَّذَّةٍ لِّلشَّٰرِبِينَ ﴾، دیسـان ڕووبـار گەلێـک لـە شـەڕابێک کـە زۆر بـە چێـژە بـۆ خۆرەوانـی، بـە پێچەوانـەی شـەڕابی دنیـا کـە مایەی سـەر ئێشـەو سـەر خۆشـیی و ئـازارە بـۆ ئەوانـەی دەیخۆنـەوە، ﴿ وَأَنْهَٰرٌ مِّنْ عَسَلٍ مُّصَفًّى ﴾، هەروەهـا ڕووبـار گەلێکـی تێـدان، لـە هەنگوینێکـی پاڵفتـە، واتـە: کەڕەشـانی تێـدا نیـەو مێـشی مـردوو تێدانیـە، هەنگوینێکـی سـاغ و سـاف و پاڵفتـە کـراوە، ﴿ وَلَهُمْ فِيهَا مِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ ﴾، هەروەهـا بـۆ ئـەوان لـە هەمـوو جـۆرە میوەکانـی تێدایـە، ﴿ وَمَغْفِرَةٌ مِّن رَّبِّهِمْ ﴾، لێبوردنیـش لـە پەروەردگاریانـەوە، ئەوانـی پێشـێ هەموویـان لـەززەت و خۆشـیی ماددیـی بـوون، ئەمەشـیان لەززەتێکـی مەعنەوییـە کـە پەروەردگاریـان دەفەرمـوێ: لێـم بـوردن و

لێتان ڕازییم و چاو پۆشییم لێکردن، ئنجا ئایا بەهەشتێکی ئاواو سەرەنجامێکی ئاوا، وەک حاڵی کەسێک وایە: ﴿كَمَنْ هُوَ خَٰلِدٌ فِي ٱلنَّارِ﴾، ئایا کەسانێک لەو بەهەشتە دان، حاڵیان وەک حاڵی کەسێک وایە، کە هەر ماو دەبێ لە ئاگردا، ﴿وَسُقُوا۟ مَآءً حَمِيمًا﴾، هەروەها لە ئاوێکی داغ و کوڵاویان پێ نۆش دەکرێ، پێ دەخورێتەوە، ﴿فَقَطَّعَ أَمْعَآءَهُمْ﴾، یەکسەر ڕیخۆڵەکانیان دەبڕێ، واتە: ڕیخۆڵەکانیان داغان دەکات، پچڕ پچڕ دەکات، بێگومان وەک یەک نین.

ئەم ئایەتە موبارەکەش وردەکاریی زیاتری پێویستەو، دوایی لە مەسەلە گرنگەکاندا باسی دەکەین.

ئنجا خوا ﷻ دێتە سەر بابەتێکی دیکە: ﴿وَمِنْهُم مَّن يَسْتَمِعُ إِلَيْكَ﴾، هەروەها لە دەغەڵ و دڵنەخۆشەکان هەیە گوێت بۆ هەڵدەخات، واتە: بە ڕواڵەت گوێت بۆ ڕادەگرێ بە گرنگیی پێدانەوە، گوێت بۆ هەڵدەخات، ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا خَرَجُوا۟ مِنْ عِندِكَ﴾، هەتا کاتێک لە لای تۆ چوونە دەرێ، ﴿قَالُوا۟ لِلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ مَاذَا قَالَ ءَانِفًا﴾، بەوانەیان گوت کە زانیارییان پێدراوە، ئەرێ پێش ئێستا چی گوت؟ یان ئێستا چی گوت؟ (آنفاً) واتە: نیزیکترین ماوە کە لە ئێستاوە نیزیکە، ﴿أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ طَبَعَ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ﴾، ئەوانە کەسانێکن خوا مۆری بەسەر دڵیانەوە ناوە، هەڵبەتە لێرەدا کە گوتوویانە: چی گوت؟

١)- ئەگەری هەیە لەبەر ئەوەی بە دڵ گوێیان نەگرتوە، هەرچەندە بە ڕواڵەت خۆیان واپێشان داوە کە گوێیان گرتوە، بە گرنگیی پێدانەوە، بەڵام لەبەر ئەوەی دڵی لەگەڵدا نەبووە، حاڵیی نەبوون، بۆیە پرسیویانە: چی گوت؟ چونکە ئەوانە ژیانی ماددیی و گرنگیی پێدانی ماددیی بەسەریاندا زاڵ بووەو ویستووشیانە تێ بگەن، بەڵام ئەو حاڵەتە ئاژەڵیی و ماددییەی تێیدا ژیاون، بۆتە پەردەیەک کە باش لە شتەکان حاڵیی نەبن.

٢)- یاخود مەبەستیان توانج و پللار بووە، واتە: شتێکی نەگوت جێگای بایەخ پێدان بێ، بۆیە خوا ﷻ دەفەرموێ: ئەوانە خوا دڵی مۆر کردوون، ﴿وَٱتَّبَعُوٓا۟ أَهْوَآءَهُمْ﴾، کەوتووشنە شوێن ئارەزووەکانیان.

﴿ وَالَّذِينَ اهْتَدَوْا زَادَهُمْ هُدًى ﴾، بەڵام ئەوانەی ڕێی ڕاستیان گرتوە، خوا ﷻ ڕاستە ڕێتریان دەکات، یاخود ڕاستە ڕێ گرتنیان بۆ زیاد دەکات، ﴿ وَآتَاهُمْ تَقْوَاهُمْ ﴾، پاریزکارییەکیش کە شایستەی ئەوانە پێیان دەدات.

﴿ فَهَلْ يَنظُرُونَ إِلَّا السَّاعَةَ أَن تَأْتِيَهُم بَغْتَةً ﴾، ئایا چی چاوەڕێ دەکەن جگە لە کاتەکە، ئاخیر زەمان، جگە لەو کاتەی ئەو ژیانەی تێدا کۆتایی دێ، کت و پڕ بۆیان بێ، ئایا جگە لە بە کت و پڕی هاتنی ئاخیر زەمان، چاوەڕێی چی دیکە دەکەن؟ ﴿ فَقَدْ جَاءَ أَشْرَاطُهَا ﴾، بە دڵنیایی نیشانەکانی هاتوون، واتە: هەندێ لە نیشانەکانی هاتوون، کە یەکێکیان هاتنی پێغەمبەری کۆتاییە موحەممەد ﷺو، یەکێکیان دابەزاندنی دوا پەیامی خوایە ﷻ، لەگەڵ کۆمەڵێ نیشانەی دیکەدا، وەک: لەتبوونی مانگ، هەروەها ئەوە کە مادام خوا مرۆڤەکانی هێناونە دی و، چاکەو خراپەیان لێ واقیع دەبێ، دەبێ کاتێکیش بێ ئەو ژیانە بپێچرێتەوەو، ژیانێکی دی بێتە پێش، تاکو چاکەکاران بە پاداشتی خۆیان و، خراپەکاران بە سزای خۆیان بگەن، ﴿ فَأَنَّىٰ لَهُمْ إِذَا جَاءَتْهُمْ ذِكْرَاهُمْ ﴾، هەرکات هات چۆن، یاخود: لە کوێوە بیریان دەکەوێتەوە؟ چۆن پەند وەردەگرن؟ ئەگەر ئێستا پەند وەرنەگرن، کاتێ کە دنیا کۆتا دێ، لەو کاتەدا چۆن پەند وەردەگرن؟!

دەشگونجێ لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿ فَأَنَّىٰ لَهُمْ إِذَا جَاءَتْهُمْ ذِكْرَاهُمْ ﴾، مەبەست ئەو ئاخیر زەمانە بێ کە بۆ هەر کامێکیان دانراوەو، ڕۆژێک دێ گیانیان دەکێشرێ، ئەم ژیانە دنیاییە بە جێ دێڵن، لەو کاتەدا چۆن بیریان دەکەوێتەوەو پەند وەردەگرن؟

لە کۆتایی دا خوا بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ دەفەرموێ: ﴿ فَاعْلَمْ أَنَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا اللَّهُ ﴾، واتە: مادام ئەوەی ڕابرد بەو شێوەیە، کەواتە: بزانە کە جگە لە خوا هیچ پەرستراوێک نیە، هیچ پەرستراوێک نیە شایستەی پەرستن بێ، ﴿ وَاسْتَغْفِرْ لِذَنبِكَ ﴾، داوای لێبوردنیش بۆ گوناهەکەت بکە، ﴿ وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ ﴾،

هەروەها داوای لێخۆش بوونیش لە خوا بکە، بۆ گوناهی پیاوان و ئافرەتانی بڕوادار، ﴿ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ مُتَقَلَّبَكُمْ وَمَثْوَىٰكُمْ ﴾، هەروەها خوا ئەو شوێنەی تێیدا دێن و دەچن و ئەوەی نشینگەتانەو تێیدا نیشتەجێ دەبن، ئەویش دەزانێ.

هەڵبەتە وشەی (**ذنب**)، وەک دواییش باسی دەکەین، کە بۆ پێغەمبەری خاتەم ﷺ بەکاردێ، چەمکەکەی زۆر جیایە لەوە کە بۆ ئێمەو مانان و خەڵکی دیکە بەکاردێ، چونکە پێغەمبەران (**عَلَيْهِمُ الصَّلَاة وَالسَّلَام**)، چواندنی ئەرکێک کە پێویست بووبێ لەسەریان، یان کردنی کردەوەیەک کە زانیبیان سەرپێچییە پارێزراو بوون، کەواتە: (**ذَنْب**)، بۆ ئەوان چەمک و واتایەکی دیکەی هەیە، بۆ وێنە: لە بۆچوونێکدا نەیانپێکابێ، یان جۆرە بێ ئاگاییەکیان بەسەردا هاتبێ، وەک لە پێغەمبەرەوە ﷺ هاتوە، کە فەرموویەتی: بێگومان تەم بەسەر دڵم دادێ و، لە ڕۆژێ دا سەد جار داوای لێبوردن لە خوا دەکەم، {**إِنَّهُ لَيُغَانُ عَلَى قَلْبِي، وَإِنِّي لأَسْتَغْفِرُ اللَّهَ فِي الْيَوْمِ مِائَةَ مَرَّةٍ**} (**أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ: ٢٧٠٢**)، (**غَيْن**)، بە مانای تەمی بێئاگایی، واتە: لەبەر ئەوەی دڵم جار جار بێئاگایی بەسەردا دێ، من ڕۆژێ سەد جاران داوای لێبوردن لە خوا دەکەم، بۆ ئەو بێئاگاییەی بەسەر دڵم دا دێ، نەک ئەو گوناهو تاوانەی خەڵکی دیکە دەزانن گوناهیشەو دەیکەن، بە دڵنیایی پێغەمبەران (**عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ**) لەوە پارێزراو بوون.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**بڕوادارانـی چاکـەکار جێگایـان بەهەشـتەو، بێبڕوایانیـش وەک ئـاژەڵ ڕادەبوێـرن و دەخـۆن لـە دنیـاداو، سەرەنجامیشـیان ئاگـری دۆزەخـە:**

خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُدۡخِلُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُۖ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يَتَمَتَّعُونَ وَيَأۡكُلُونَ كَمَا تَأۡكُلُ ٱلۡأَنۡعَٰمُ وَٱلنَّارُ مَثۡوٗى لَّهُمۡ ١٢﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە سێ بڕگەدا:

١)- ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُدۡخِلُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ﴾، بە دڵنیایی خوا ﷻ ئەوانەی بڕوایان هێناوەو چاکەکانیان کردوون، دەیانخاتە چەند باخ و گوڵ و گوڵزارێکەوە، ڕووباریان بە ژێردا دەڕۆن.

٢)- ﴿وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يَتَمَتَّعُونَ وَيَأۡكُلُونَ كَمَا تَأۡكُلُ ٱلۡأَنۡعَٰمُ﴾، بەڵام ئەوانەی بێبڕوان، ڕادەبوێرن و بەهرە وەردەگرن و دەخۆن، وەک چۆن ئاژەڵ دەخۆن.

٣)- ﴿وَٱلنَّارُ مَثۡوٗى لَّهُمۡ﴾، ئاگریش نشینگەیانەو شوێنی تێدا نیشتەجێ بوونیانە.

لێرەدا پرسیارێک دەکرێ:

ئایـا تەنیـا بێبڕوایـان بەهـرە وەردەگـرن و، لـە نـازو نیعمەتـی ماددیـی دنیـا دەخـۆن؟ بێگومـان بڕوادارانیـش هـەروان، ئـەدی بۆچـی خـوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يَتَمَتَّعُونَ وَيَأۡكُلُونَ كَمَا تَأۡكُلُ ٱلۡأَنۡعَٰمُ﴾؟

وەڵامەکەی ئەوەیە: کە لە ڕاستییدا چێژ وەرگرتن و بەهرە وەرگرتن لە نازو نیعمەتی دنیا، شتێکی گشتییە، بەڵام بڕواداران زۆر بە لایانەوە گرنگ نیە، واتە: نەیانکردۆتە ئامانج و، جێی بایەخیان نیە:

**یەکەم:** لەبەر ئەو حاڵەتە مەعنەویی و ئیمانییەی هەیانە.

**دووەم:** بەهۆی ئەوەوە کە بەراوردی دەکەن لەگەڵ نازو نیعمەتی بەهەشتداو، هی دنیایان پێ شتێکی بچووک و کەم بایەخە، بەڵام بێبڕوایەکان پێیان گرنگترین و گەورەترین شتەو، دەیکەنە ئامانجی ژیانیان، چونکە هەرئەوەندە شک دەبەن و، ئەوان حاڵەتێکی ڕووحیی مەعنەوییان نیە کە لە ئیمانەوە پەیدادەبێ و، وا لە مرۆڤ دەکات غەریزەکانی خۆی کونتڕۆڵ بکات، وا لە مرۆڤ دەکات: تام و چێژە مەعنەوییەکان کە لە ئیمانەوە پەیدادەبن، لە تاعەتەوە دەستگیر دەبن و هەستیان پێ بکات، بەڵام بێبڕوایان وەک چۆن ئاژەڵان حاڵەتی ئیمانیی و مەعنەویی و تاعەت بۆ خوا ئەنجامدانیان نیە، ئەوانیش هەر بەو شێوەیەن.

لێرەدا بە باشی دەزانم، بۆ ڕوونکردنەوەی چەمک و واتای ئەو ئایەتە موبارەکە، ئەو قسەیەی (الطبري)، بێنین کە پێم وایە زۆر جوان ڕوونی کردۆتەوە، لە تەفسیرەکەی خۆیدا[1]: (إِنَّ اللَّه لَهُ الْأُلُوهَة الَّتِي لَا تَنْبَغِي لِغَيْرِه، يُدْخِلُ الَّذِينَ آمَنُوا بِاللَّهِ وَبِرَسُولِهِ بَسَاتِين تَجْرِي مِنْ تَحْت أَشْجَارهَا الْأَنْهَار ، يَفْعَل ذَلِكَ بِهِمْ تَكْرِمَةً عَلَى إِيمَانِهِمْ بِهِ وَبِرَسُولِهِ.، وَقَوْله : ﴿وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يَتَمَتَّعُونَ وَيَأْكُلُونَ كَمَا تَأْكُلُ ٱلْأَنْعَٰمُ﴾، يَقُول جَلَّ ثَنَاؤُهُ: وَالَّذِينَ جَحَدُوا تَوْحِيد اللَّه، وَكَذَّبُوا رَسُولَهُ ﷺ يَتَمَتَّعُونَ فِي هَذِهِ الدُّنْيَا بِحُطَامِهَا وَرِيَاشهَا وَزِينَتهَا الْفَانِيَة الدَّارِسَة، وَيَأْكُلُونَ فِيهَا غَيْر مُفَكِّرِينَ فِي الْمَعَاد، وَلَا مُعْتَبِرِينَ بِمَا وَضَعَ اللَّه لِخَلْقِهِ مِنْ الْحُجَج الْمُؤَدِّيَة لَهُمْ، إِلَى عِلْم تَوْحِيد اللَّه وَمَعْرِفَة صِدْق رُسُله، فَمَثَلُهُمْ فِي أَكْلهمْ مَا يَأْكُلُونَ فِيهَا مِنْ غَيْر عِلْم مِنْهُمْ بِذَلِكَ، وَغَيْر مَعْرِفَة، مِثْل الْأَنْعَام مِنْ الْبَهَائِم الْمُسَخَّرَة الَّتِي لَا هِمَّة لَهَا إِلَّا فِي الِاعْتِلَاف دُونَ

---

(١) جامع البيان: ج٢٦، ص٤٨-٤٩.

غَـيْرِهِ، يَقُـولُ جَـلَّ ثَنَـاؤُهُ: ﴿وَٱلنَّارُ مَثْوًى لَّهُمْ﴾، وَالنَّـار نَـار جَهَنَّـم مَسْـكَن لَهُـمْ، وَمَـأْوَى، إِلَيْهَـا يَصِـيرُونَ مِـنْ بَعْـدِ مَمَاتهِـمْ).

واتـە: ئـەو خوایـەی ﷻ پەرسـتراوێتیی هـەر بـۆ ئـەوەو بـۆ جگـە لـەو ناگونجـێ، ئەوانـەی بڕوایـان هێنـاوە بـە خـۆی و بـە پێغەمبەرەکـەی، دەیانخاتـە چەنـد بـاخ و بێسـتانێکەوە کـە ڕووبـار بـە ژێـر درەختەکانیـدا دەڕۆن، ئەوەشـیان بۆیـە بـۆ دەکات، وەک ڕێزگرتـن لێیـان کـە ئیمانیـان هێنـاوە بـە خـۆی و بـە پێغەمبەرەکـەی، بـەڵام ئەوانـەی نکووڵییـان کـردوە لـە یەکتایـی خـواو، پێغەمبەرەکـەی خوایـان بـە درۆ دانـاوە، ئەوانـە لـەم ژیانـە دنیاییـەدا، شـتەکانی دنیـا لـە جوانییەکـەی و خۆشـییەکانی و لەززەتـەکانی، کـە دەبڕێـن و کۆتاییـان دێ، بەهـرە وەردەگـرن و لێیـان دەخـۆن، بـێ ئـەوەی بیـر بکەنـەوە لـە ڕۆژی دوایـی و، بـێ ئـەوەی بیـر بکەنـەوە لـەو بەڵگانـەی خـوا لـە دروسـتکراوەکانی خۆیـدا دایـنـاون، کـە دەیانگەیەنـنـە زانیاریـی خـوا بـە یەکگرتـن و لـە زانینـی ڕاسـتیی پێغەمبـەران.

ئنجـا لـەوەدا لـە خواردنیانـدا لـەوەی دەیخـۆن بـە بـێ زانیارییـان بـە خـوا ﷻ و بەبـێ ناسـینیان بـۆ پێغەمبـەران (**عَلَيْهِـمُ الصَّـلَاةُ وَالسَّـلَام**)، وەک ئـاژەڵ وان، ئـەو ئاژەڵانـەی کـە بەسـتەزمانن و دەسـتەمۆ کـراون لەلایـەن مرۆڤـەوە، تەنیـا شـوێنی بایەخیـان بریتیـە لـە لـەوەڕان و، سـەرەنجامیش جێگەیـان ئـەو شـوێنەی کـە تێیـدا نیشـتەجێ دەبـن و، ئـەو شـوێنەی پەنـای پـێ دەبـەن و، لـە دوای مردنیـان بـۆی دەچـن، بریتیـە لـە ئاگـر.

کە دەفەرموێ: ﴿مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَـٰرُ﴾، (مِنْ) لە، ﴿مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَـٰرُ﴾دا، دوو واتای هەن:

أ- یانی: ڕووبارەکان بە ژێر دارو درەختەکانی ئەو بەهەشتەدا دەڕۆن.

ب- یانی: ئەو ڕووبارانە ڕێک لە ژێر ئەو درەختانەوە دێن، نەک لە شوێنێکی دیکەوە بێن و هەڵبقوڵن، ئەم تێبینییە (**فخر الدين الرازي**) لە تەفسیرەکەی خۆیدا هێناویەتی[1].

---

(١) ج١٤، ص٤٧.

واتـە: دەگونجـێ چ لێـرەو چ لـە شـوێنەکانی دیکـەی قورئانـدا مەبەسـت لـە: ﴿ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ ﴾، ئـەوە بـێ کـە ڕووبـارەکان بـە ژێـر درەختەکانـدا دەڕۆن.

دەشـگونجێ: ﴿ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ ﴾، مەبەسـت پێـی ئەوەبـێ کـە ئـەو ڕووبارانـە هـەر لـە ژێـر درەختەکانـەوە سـەرچاوە دەگـرن، نـەک لـە شـوێنی دیکـەوە بێـن و جۆگـەو جۆباریـان بـۆ هەڵبەسـترابێ.

دیسـان (**فخرالديـن الـرازي**) لـە تەفسـیری ئـەو ئایەتـە موبارەکـەدا، کـە دەفەرمـوێ: ئەوانـەی بێبـڕوان، ئـاوا بـەوە شـێوەیە دەخـۆن و، دەلەوەڕێـن، سـێ شـتان بـاس دەکات و دەڵـێ: لـە سـێ شـتدا بێبڕوایـەکان لـە ئـاژەڵ دەچـن:

**یەکەم:** ئاژەڵ تەنیا ئەوەی بە لاوە گرنگە بخوات و، هیچی دیکە، بێبڕوایەکانیش هەروان.

**دووەم:** ئاژەڵەکان ئەوەی دەیخۆن، نایکەنە بەڵگە لەسەر خوای بەدیهێنەر، بێبڕوایەکانیش بە هەمان شێوەن.

**سێیەم:** ئاژەڵەکان لەوەڕو ئالفیان دەدرێتێ تاکو قەڵەو بن، بێئاگان لەوەی کە تاکو قەڵەوتر بن، لە سەربڕان نیزیکترن، بێبڕوایەکانیش بە هەمان شێوە، نازانن کە هەتا تەمەنیان هەڵدەکشێ، زیاتر لە مەرگ و ئەو سزایەی چاوەڕێیان دەکات، لە پاش مەرگ نیزیکتر دەکەونەوە.

یەکێـک لـە زانایـان قسـەیەکی جـوان دەکات، دەڵـێ: (**إِنَّ المُؤْمِـنَ لاَ يَخْلُـو أَكْلُـهُ مِـنْ ثَـلاَثٍ: أولاً الـوَرْعُ عِنْـدَ الطَّلَـبِ، ثانيـاً: وَاسْـتِعْمَالُ الأَدَبِ، ثالِثـاً: وَالأَكْلُ للسَـبَبِ، وَالكَافِـرُ لاَ يَخْلُـو مِـنْ ثَـلاَثٍ: أولاً: يَطْلُـبُ للنَهْمَـةِ، ثانيـاً: يَـأْكُلُ لِلشَـهْوَةِ، ثالثـاً: وَيَعيـشُ فِي غَفْلَـةَ**).

واتـە: بـڕوادار لـە خواردنەکەیـدا لـە سـێ شـتان خاڵیـی نابـێ، هەمیشـە ئـەو سـێ حاڵەتـەی هـەن:

**یەکەم:** کاتێک دەگەڕێ بە دوای خواردندا، خۆپارێزیی هەیە لە حەڕام و قەدەغە.

**دووەم:** لە کاتی خواردندا، ئەدەب و ڕێزو ئەو ڕەوشتە جوانانە بەکاردێنێ کە پێویستن.

**سێیەم:** بە هۆکار نەبێ ناخوات، واتە: تاکو برسیی و تینوو نەبێ ناخوات و ناخواتەوە، نەک هەر بۆ کەیف و ئارەزو و بخوات.

بێبڕواش هەمیشە ئەو سێ حاڵەتەی هەن، لە کاتی خواردنیدا:

**یەکەم:** لەبەر نابەرچاو تێریی هەر داوا دەکات، هەرچەندە هەشیبێ، بەڵام هەر داوا دەکات.

**دووەم:** لەبەر ئارەزوو دەخوات، نەک لەبەر ئەوەی پێویستیی پێیەتی.

**سێیەم:** لە بێئاگاییشدا دەژی، واتە: ئاگای لە خواو خەڵک نیەو، ئاگای لەو سەرەنجامە نیە کە چاوەڕێی دەکات.

هەروەها دەشگونجێ بڵێین: خەڵک سێ جۆرن:

١- هەیە بۆیە دەژی تاکو بخوات.

٢- هەیە بۆیە دەخوات تاکو بژیی، هەر ئەوەندە دەخوات تاکو بژی.

٣- هەشە بۆیە دەژی تاکو بەندایەتیی بۆ خوا بکات، بێگومان ئەمەیان باشترین جۆرە مرۆڤەو، لە ڕاستییدا تەنیا ئەم لێی دەوەشێتەوە پێی بگوترێ: مرۆڤێکە جێنشینی خوایە.

## مەسەلەی دووەم:

**خوای کارزان گەلێک ئاوەدانیی بە هێزتر لەو ئاوەدانییەی کە پێغەمبەر ﷺ ناچاری بە جێهێشتن کرد، فەوتاندوون و هیچ کەسیشیان لە فریا نەهاتوە:**

خوا ﷻ دەفەرمویٚ: ﴿ وَكَأَيِّن مِّن قَرْيَةٍ هِيَ أَشَدُّ قُوَّةً مِّن قَرْيَتِكَ ٱلَّتِيٓ أَخْرَجَتْكَ أَهْلَكْنَٰهُمْ فَلَا نَاصِرَ لَهُمْ ﴿١٣﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە دوو بڕگەدا:

١)- ﴿ وَكَأَيِّن مِّن قَرْيَةٍ هِيَ أَشَدُّ قُوَّةً مِّن قَرْيَتِكَ ٱلَّتِيٓ أَخْرَجَتْكَ أَهْلَكْنَٰهُمْ ﴾، زۆر ئاوەدانیی کە هێزیان زیاتر بوو، لەو ئاوەدانییەی تۆی وەدەرنا، تۆی ناچار کرد بەجێی بهێڵیی، فەوتاندمانن و قرە بڕمان کردن، واتە: خەڵکی ئاوەدانییەکانمان فەوتاند.

٢)- ﴿ فَلَا نَاصِرَ لَهُمْ ﴾، هیچ جۆرە هاوکارو یارمەتییدەرێکیان نەبوو.

وشەی (**القریة**)، زۆر جار باسمان کردوە، یانی: ئاوەدانیی گەورە، شاری قەڕەباڵغ، نەک بە مانا عورفیی و باوەکەی ئێستای: گوندو لادێ، لە قوڕئاندا (**قریة**) بە مانای شاری گەورەو قەڕەباڵغە، بەڵکو یانی: شارو دەوڵەت، کاتی خۆی هەر شارێکی گەورەی قەڕەباڵغ، شوورەیەکی بۆ کراوەو دەرگاو دەروازەی هەبوون و، دەوڵەت لە نێو ئەو شارەدا بووە، ﴿ وَكَأَيِّن مِّن قَرْيَةٍ هِيَ أَشَدُّ قُوَّةً مِّن قَرْيَتِكَ ٱلَّتِيٓ أَخْرَجَتْكَ أَهْلَكْنَٰهُمْ ﴾، زۆر ئاوەدانییمان فەوتاندوون، کە بەهێزتر بوون لەو ئاوەدانییەی تۆی دەرکرد (کە مەبەست پێی مەککەیە)، ﴿ أَهْلَكْنَٰهُمْ ﴾، واتە: ئێمە دانیشتووانی ئەو ئاوەدانییانەمان فەوتاند، ﴿ فَلَا نَاصِرَ لَهُمْ ﴾، (ناصر): ناوی بکەر (**اسم فاعل**)ە و مەبەست پێی جینسی یارمەتییدەرو هاوکارە، چونکە لە دوای (لا)ی لابردنی تێکڕا (**نفي الجنس**)ەوە هاتوە، ﴿ فَلَا نَاصِرَ لَهُمْ ﴾، هیچ جۆرە هاوکارو یارمەتییدەرو پشتیوانێکیان نەبوون.

لێرەدا پرسیارێک دەکرێ:

ئایا خەڵکی مەککە پێغەمبەریان وەدەرنا، یان پێغەمبەر ﷺ بۆ خۆی شارەکەی بە جێهێشت؟

دەڵێین: ﴿أَخْرَجَتْكَ﴾، (أي: اضطروُك للخروج)، واتە: تۆیان ناچار کرد، بە جێی بهێڵی، دوای ئەوەی پێغەمبەر ﷺ زانی پیلانیان بە دەستەوە هەیە بۆ کوشتنی و، دوای ئەوەی ئەو پەیام و بانگەوازەی پێبوو، گەیاندیانە بن بەست، پێغەمبەری خوا ﷺ خۆی ناچار بینی مەککە بە جێی بهێڵێ، لەو بارەوە کە چۆن پێغەمبەر ﷺ بە ناچاریی ئەو شارەی بەجێهێشتوە، ئەم دەقە دێنین:

**{عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ وَقَفَ النَّبِيُّ ﷺ عَلَى الْحَزْوَرَةِ فَقَالَ: عَلِمْتُ أَنَّكِ خَيْرُ أَرْضِ اللَّهِ وَأَحَبُّ الْأَرْضِ إِلَى اللَّهِ، وَلَوْلَا أَنَّ أَهْلَكِ أَخْرَجُونِي مِنْكِ، مَا خَرَجْتُ } (أخرجه أحمد: ١٨٧٣٩، تعليق شعيب الأرنؤوط: حديث صحيح).**

واتە: ئەبوو هورەیرە ﷺ دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ (کاتێک لە مەککە دەردەچێ بەرەو ئەشکەوتی (ثور) ئاورێک لە مەککە دەداتەوە) لەسەر حەزوورە وەستاو فەرمووی: بە دڵنیایی دەزانم تۆ باشترین و خۆشەویسترین وڵاتی لە لای خوا، ئەگەر دانیشتووانت منیان وەدەر نەنابایە، لێت دەرنەدەچووم.

کەواتە: پێغەمبەر ﷺ بە ویستی خۆی لە شاری مەککە چۆتە دەر، بەڵام دوای ئەوەی لە لایەن بێبڕواو هاوبەش بۆ خوا دانەرەکانەوە، ناچار کراوە.

### مەسەلەی سێیەم

**کەسانێک کە لە لایەن پەروەردگاریانەوە لەسەر بەڵگەی ڕوونن و، بەرچاو ڕوونن، وەک کەسانێکی خراپە بۆ ڕازێنراوەی ئارەزوو پەرست نین:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ أَفَمَن كَانَ عَلَىٰ بَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّهِۦ كَمَن زُيِّنَ لَهُۥ سُوٓءُ عَمَلِهِۦ وَٱتَّبَعُوٓاْ أَهْوَآءَهُم ﴿١٤﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە دوو بڕگەدا:

١)- ﴿ أَفَمَن كَانَ عَلَىٰ بَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّهِۦ كَمَن زُيِّنَ لَهُۥ سُوٓءُ عَمَلِهِۦ ﴾، ئایا کەسێک کە لەلایەن پەروەردگاریەوە لەسەر بەڵگەیەکی ڕۆشنە، وەک کەسێکە کە کردەوە خراپەکەی بۆ جوانکراوە؟ (الإستفهامُ لإنكارِ المُمَاثَلَةِ اللَّتي يَقْتَضِيها حَرْفُ التَّشْبيه)، ﴿ أَفَمَن كَانَ عَلَىٰ بَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّهِۦ كَمَن زُيِّنَ لَهُۥ سُوٓءُ عَمَلِهِۦ ﴾، پرسیارکردن بۆ نکوولّییکردنە، لە وەک یەک بوونێک، کە پیتی وێچواندن دەیخوازێ، واتە: ئەو دوو جۆرە کەسە، وەک یەک نین، پێشێ دەفەرموێ: ﴿ أَفَمَن كَانَ عَلَىٰ بَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّهِۦ ﴾، لێرەدا بە تاک هێناویەتی، (الإِفْرَادُ باعْتِبَارِ اللَّفْظِ وَالجَمْعِ باعْتِبَارِ المَعْنَى)، تاککردنەوەکە بە هۆی ڕەچاو کردنی بێژەکەوەیە، بەڵام کۆکردنەوەکەی بە ڕەچاوکردنی ماناکەیەوەیە.

(على)، لە: ﴿ عَلَىٰ بَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّهِۦ ﴾دا، (على: للإستعلاء المجازي: بمعنى التَّمَكُّن)، (على)، بۆ بەرز بوونەوەی مەجازییەو مەبەست پێی توانا بە سەر داشکان و چاک سەقامگیربوونە لەسەر شتێک، واتە: کەسێک ئەو بەڵگەو بەرچاو ڕوونییەی لە پەروەردگاریەوە بۆی هاتوە، باش لێی تێگەیشتوە، وەک چۆن کەسێک سواری وڵاخێک دەبێ و کۆنترۆڵی دەکات، ئەوانیش بەو شێوەیە دەستیان لەو هیدایەت و بەرچاو ڕوونییەو ئەو بەڵگانەی پەروەردگاریان گیر بووە، بێگومان بڕوادار بەرچاو ڕوون و دڵنیایە، بەڵام بێبڕوا بەرچاو لێڵەو لە گێژاودایە، وەک لە سوورەتی (الأنعام)، ئایەتی ژمارە (١٢٢) دا، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ أَوَمَن كَانَ

مَيۡتٗا فَأَحۡيَيۡنَٰهُ وَجَعَلۡنَا لَهُۥ نُورٗا يَمۡشِي بِهِۦ فِي ٱلنَّاسِ كَمَن مَّثَلُهُۥ فِي ٱلظُّلُمَٰتِ لَيۡسَ بِخَارِجٖ مِّنۡهَاۚ كَذَٰلِكَ زُيِّنَ لِلۡكَٰفِرِينَ مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴿١٢٢﴾﴾، واتـە: ئایـا کەسـێ مـردوو بـووەو زیندوومـان کردۆتـەوەو، ڕووناکییـمان پێـداوە، لـە نێـو خەڵکیـدا پێـی دەڕوات، وەک کەسـێک وایـە کـە لـە تاریکیـی دایـەو لێشـی دەربـاز نابـێ؟ بـەو شـێوەیە ئـەوەی بێبڕوایـان دەیکـەن، بۆیـان ڕازێنراوەتـەوە.

مەبەسـت لـە: ﴿عَلَىٰ بَيِّنَةٖ مِّن رَّبِّهِۦ﴾ لەسـەر بەڵگەیـەک لـە پەروەردگاریانـەوە، یـانی: بەرچـاو ڕوونیـی و ڕێ پێزانیـن، کـە هـەم بوونناسـیی دەگرێتـەوە، هـەم ئیـمان و عەقیـدە، هـەم پەرستشـەکان، هـەم ڕەوشـتە بـەرزەکان، هـەم بـاری کەسـێتیی، هەم ئەدەبـە کۆمەڵایەتییـەکان، هـەم شـێوەی بەڕێوەبردنـی کۆمەڵـگاو ژیـان و گـوزەران، ئەوانـەی بێبـڕوان، خـوا ﷻ بـەوە پێناسـەیان دەکات کـە لـە لایـەن پەروەردگاریانـەوە بەڵگـەدارو بەرچـاو ڕوون کـراون ڕۆشـنایی و دڵنیاییـان پێـدراوە، لـە هەمـوو ڕوویەکـەوەو بـە هەمـوو شـێوەیەک.

﴿كَمَن زُيِّنَ لَهُۥ سُوٓءُ عَمَلِهِۦ﴾، ئایـا کەسـێکی خـاوەن بەڵگـەی خوایـی بەرچـاو ڕوون، وەک کەسـێک وایـە کـە کـردەوە خراپەکـەی خـۆی بـۆ ڕازێنراوەتـەوەو جـوان کـراوە؟ لـە حاڵێکـدا کـە ئـەوە خراپتریـن کردەوەیـە، کەچـی ئـەو زۆر بـە جـوان و چاکـی دەبینـێ!!.

٢)- ﴿وَٱتَّبَعُوٓاْ أَهۡوَآءَهُم﴾، کەوتوونە شوێن ئارەزووەکانیشیان؟ بێگومان ئەو پرسیارکردنە، پرسیارکردنی نکووڵییلێکەرانەیە، واتە: بە دڵنیایی ئەو دوو جۆرە کەسە وەک یەک نین، چونکە بابای بێبڕوای کردەوەی خراپی خۆ بۆ جوانکراو:

**أ-** لە ڕووی تیۆرییەوە، چەشمەندازی وا لێڵ بووە، بیرو بۆچوونی تێکەڵ و پێکەڵی وا کەوتۆتە گێژاوەوە، خراپەکانی خۆی بە چاک دەبینێ

**ب-** لە ڕووی کردەییشەوە، کەوتۆتە شوێن ئارەزووەکانی، وەک لە سوورەتی **(النجم)**دا، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا ٱلظَّنَّ وَمَا تَهۡوَى ٱلۡأَنفُسُۖ وَلَقَدۡ جَآءَهُم مِّن رَّبِّهِمُ

ٱلْهُدَىٰٓ ﴿٢٣﴾، ئەوانە تەنیا شوێن گومان دەکەون و، ئەوەی نەفسەکان دەیخوازن، لە حاڵێکدا ڕێنماییشیان لە پەروەردگاریانەوە بۆ هاتوە.

لێرەدا خوا ﷻ دەیەوێ سەرنجمان ڕابکێشێ بۆ ئەوە کە مرۆڤی بڕوادار بەرچاو ڕوونە، ئەو بەرچاو ڕوونییەش بەڵگەیەکە، بەرچاوی ڕوون کردۆتەوەو لە لایەن پەروەردگاریەوە بۆی هاتوە، بەڵام بابای بێبڕوا کردەوەکەی خۆی بۆ ڕازێنراوەتەوەو، کەوتۆتە شوێن ئارەزووی، واتە: لە **هەوای** خوا خۆی بێ بەش کردوەو، کەوتۆتە شوێن هەوای خۆی، بەڵام مرۆڤی بڕوادار لە لایەن پەروەردگاریەوە خراوەتە سەر ڕاستە ڕێیەک، کە بەرچاو ڕوونەو دەزانێ:

لە کوێوە هاتوە؟

بۆچی هاتوە؟

بۆ کوێ دەچێ؟

حەڵاڵ چییە؟

حەرام چییە؟

چاکە چییە؟

خراپە چییە؟

دۆست کێیە؟

دوژمن کێیە؟

پێویستە چۆن بژیی؟

ژیانی تاکیی و، خێزانیی و، کۆمەڵایەتیی و، سیاسیی خۆی، پێویستە چۆن بەڕێوە بەرێ؟

خـوا ﷻ بـە هـۆی ئـەو ئاییـن و بەرنامـەو پەیامـەوەی بـۆی نـاردوە، خسـتوویەتە سـەر بەرچـاو ڕوونیـی، ئـەوی دیکـەش: بـە پێچەوانـەوە لـە گێژاودایـەو، کەوتۆتـە شـوێن ئـەوەی نەفسـی بیخـوازێ و ئـارەزووی لێیـە، بێگومـان خـواش ﷻ مرۆڤـی وا خوڵقانـدوە، بتوانـێ بکەوێتـە شـوێن هیدایەتـی خـواو، دەشـتوانێ بکەوێتـە شـوێن ئارەزووەکانـی خـۆی، ئـەو دوو جـۆرە توانایـە دراون بـە مـرۆڤ، تاکـو تاقـی بکرێتەوە، ئـەوەی ئیمانـدار بـێ، بەهـۆی ئیمانەکەیـەوە دەکەوێتـە شـوێن بەرنامـەو ڕێنمایـی خـوا، ئـەوەی دیکـەش بەهـۆی بێبڕواییەکەیـەوە، دەکەوێتـە شـوێن ئـارەزووی خـۆی و کـردەوەی خراپـی.

## مەسەلەی چوارەم:

**بەهەشتی بەڵێندراو بە پارێزکاران، ڕووبارەکانی: ئاوی ساف و، بێ بۆن و، شیری تام نەگۆڕاوو، شەرابی بە چێژو، هەنگوینی پاڵفتەو، هەموو جۆرە میوەیەکی تێدایە، سەرباریش لێبوردنی خوا، بێبڕوایانیش لە نێو بلێسەی ئاگردان و، ئاوی کوڵاویان پێ دەخورێتەوە، کە ڕیخۆڵەکانیان پچڕ پچڕ دەکات:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ مَّثَلُ ٱلْجَنَّةِ ٱلَّتِى وُعِدَ ٱلْمُتَّقُونَ ۖ فِيهَآ أَنْهَٰرٌ مِّن مَّآءٍ غَيْرِ ءَاسِنٍ وَأَنْهَٰرٌ مِّن لَّبَنٍ لَّمْ يَتَغَيَّرْ طَعْمُهُۥ وَأَنْهَٰرٌ مِّنْ خَمْرٍ لَّذَّةٍ لِّلشَّٰرِبِينَ وَأَنْهَٰرٌ مِّنْ عَسَلٍ مُّصَفًّى ۖ وَلَهُمْ فِيهَا مِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ وَمَغْفِرَةٌ مِّن رَّبِّهِمْ ۖ كَمَنْ هُوَ خَٰلِدٌ فِى ٱلنَّارِ وَسُقُوا۟ مَآءً حَمِيمًا فَقَطَّعَ أَمْعَآءَهُمْ ﴿١٥﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە دە بڕگەدا:

١)- ﴿ مَّثَلُ ٱلْجَنَّةِ ٱلَّتِى وُعِدَ ٱلْمُتَّقُونَ ﴾، سیفەت و وێنەی ئەو بەهەشتەی بەڵێندراوە بە پارێزکاران، (**المَثَلُ: الحَالُ العَجيب**)، (المَثَل) حاڵەتی سەرسامکەر، یانی: حاڵی سەرسوڕهێنەری ئەو بەهەشتە ئاوایە.

هەروەها (**مَثَل**) بە مانای سیفەتیش دێ، یانی: سیفەتی ئەو بەهەشتە کە بەڵێندراوە بە پارێزکاران، بەو شێوەیە.

٢)- ﴿ فِيهَآ أَنْهَٰرٌ مِّن مَّآءٍ غَيْرِ ءَاسِنٍ ﴾، [خوێندراویشەتەوە: (**أَسِنٍ**)]، ڕووبار گەلی ئاوی تێدان، لە ئاوێک کە (تام و ڕەنگ و بۆنی) نەگۆڕاوە، ئنجا (آسِن) لە (**أَسَن**)ەوە هاتوە، یان لە (**أَسِن**)ەوە، (**أَسِنَ يَأْسَنُ، وَأَسَنَ يَأْسِنُ، مِثْلُ أَجَنَ الماءُ يأْجِنُ، أَسِنَ الماءُ، أو أَسَنَ الماء، أي: تَغَيَّرَ لَوْنُهُ وطَعْمُهُ وَرِيحُهُ**)، ئاوەکە ڕەنگ و تام و بۆنی گۆڕا، ئنجا خوا ﷻ دەفەرموێ: ئەو ڕووبارانەی لە بەهەشتدا هەن لە ئاوێکن، کە تام و ڕەنگ و بۆنی نەگۆڕاوە، ئاوەکەی بەو شێوەیە.

٣)- ﴿ وَأَنْهَٰرٌ مِّن لَّبَنٍ لَّمْ يَتَغَيَّرْ طَعْمُهُۥ ﴾، هەروەها ڕووبارگەلێکی تێدان لە شیرێک، کە تامەکەی نەگۆڕاوە.

٤)- ﴿ وَأَنْهَٰرٌ مِّنْ خَمْرٍ لَّذَّةٍ لِّلشَّٰرِبِينَ ﴾، دیسان ڕووبار گەلێکی تێدان لە مەی (شەراب)ێک کە بۆ خۆرەوانی زۆر بە چێژە، دەڵێ: (لَذَّة: تأْنِيث اللَّذُّ أي: اللَّذِيذ، وَهُوَ وَصْفٌ وَلَيْسَ اسْمًا)، (لَذَّة)، مێینەی (لذُّ)، یانی: بە تام و چێژ، ئەویش وەسفە، نەک ناو بێ.

٥)- ﴿ وَأَنْهَٰرٌ مِّنْ عَسَلٍ مُّصَفًّى ﴾، هەروەها ڕووبار گەلێک لە هەنگوینێکی پاڵفتە، (المصَفَّى: الَّذِي خَلُصَ مِمَّا يُخَالِطُ العَسَلَ، مِنْ بَقَايَا الشَّمْعِ وَالنَّحْلِ)، (مُصَفَّى)، واتە: پاڵفتە کراو و پاککراوە لەو شتانەی کە تێکەڵ بە هەنگوین دەبن، وەک پاشماوەکانی مێوو هەنگەکان (هەنگی مردوو).

٦)- ﴿ وَلَهُمْ فِيهَا مِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ ﴾، دیسان بۆ ئەوان لەوێدا لە هەموو جۆرە میوەکان هەیە، ﴿ ٱلثَّمَرَٰتِ ﴾، ئەلیف و لام (الـ)ی ناساندنی لە سەرەو بۆ جینسە، واتە: هەرچی جۆری میوەیە بۆ ئەوان لەوێدا هەیە.

٧)- ﴿ وَمَغْفِرَةٌ مِّن رَّبِّهِمْ ﴾، هەروەها بۆ ئەوان لەوێدا لێبوردن و چاوپۆشیی لە پەروەردگاریانەوە، هەیە.

٨)- ﴿ كَمَنْ هُوَ خَٰلِدٌ فِى ٱلنَّارِ ﴾، (ئایا کەسێک لە شوێنێکی ئاوایە)، وەک کەسێک وایە کە لە ئاگردا هەرماوەو بە هەمیشەیی دەمێنێتەوە؟ لێرەدا بە تاک (**مفرد**) هێناویەتی، وەک ڕەچاوکردنی بێژەی (مَنْ)، بەڵام دوایی دەیکاتە کۆ (**جمع**) بە ڕەچاوکردنی مانایەکەی:

٩)- ﴿ وَسُقُوا۟ مَآءً حَمِيمًا ﴾، هەروەها لە ئاوێکی کوڵاوو داغیان پێ دەخورێتەوە، پێ نۆش دەکرێ.

١٠)- ﴿ فَقَطَّعَ أَمْعَآءَهُمْ ﴾، ئنجا یەکسەر ڕیخۆڵەکانیان پچڕ پچڕ دەکات، (**الأَمْعَاء: جَمْعُ مِعًى ومَعِي**)، (**مِعَى وَمَعِي**)، واتە: ڕیخۆڵەو بە (**أَمْعَاء**) کۆ دەبنەوە.

لێرەشدا دیسان لە لایەکەوە بە تاک دەیهێنێ: ﴿ كَمَنْ هُوَ خَٰلِدٌ فِى ٱلنَّارِ ﴾، دوایی کۆی دەکاتەوە: ﴿ وَسُقُوا۟ مَآءً حَمِيمًا ﴾، (**الإِفْرَادُ باعْتِبَارِ اللَّفْظِ وَالجَمْع باعتِبارِ المَعْنَى**)، تاککردنەکەی بە ڕەچاو کردنی بێژەکەیە، بەڵام کۆ کردنەکەی بە ڕەچاو کردنی مانایەکەیەتی.

## چەند وردەکارییەکی ڕەوانبێژیی لە ئایەتی ( ١٥ / محمد )دا:

**یەک:** (**الزَّمَخْشَرِي**)، لە بارەی سەرەتای ڕستەکەوە: ﴿ مَّثَلُ ٱلْجَنَّةِ ٱلَّتِى وُعِدَ ٱلْمُتَّقُونَ ﴾، دەڵێ: (**هُوَ كلامٌ فِي صُورَةِ الإثبَاتِ ومَعنىً النَّفي والإنْكار، لِانطِوائِهِ تَحْتَ حُكْمِ كَلَامٍ مُصَدَّرٍ بِحَرْفِ الإنكَارِ وَدُخُولِهِ فِي حَيِّزِه، وَانخِراطِهِ فِي سِلكِهِ، وَهُوَ قَوْل تَعَالَى:** ﴿ أَفَمَن كَانَ عَلَىٰ بَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّهِۦ ﴾، **فَكَأَنَّهُ قِيْلَ: أَمَثَلُ الجَنَّةِ كَمَنْ هُوَ خَالِدٌ فِي النَّارِ؟ أَي: كَمَثَلِ جَزَاءِ مَنْ هُوَ فِي النَّارِ**)، ئەمە (**محي الدين درويش**) لە تەفسیرەکەی خۆی دا[1] لێی دەخوازێتەوەو دەڵێ:

(**الزمخشري**)، گوتوویەتی: ئەم تەعبیرە (کە خوا ﷻ دەفەرمووێ: وێنەی بەهەشتێک کە بەڵێندراوە بە پارێزکاران، ئنجا باس دەکات کە ڕووباری ئاوی تێدایە کە ساغ و سافەو، شیرێک کە تامەکەی نەگۆڕاوەو، شەرابێک کە چێژە بۆ خۆرەوانی، هەنگوینێکی پاڵفتە کراوو، هەموو جۆرە میوەیەک، دوایی دەفەرمووێ: ﴿كَمَنْ هُوَ خَـٰلِدٌ فِى ٱلنَّارِ ﴾، وەک کەسێک وایە کە لە ئاگردا بە هەمیشەیی دەمێنێتەوە؟)، قسەیەکە لە شێوەی چەسپاندن (**إثبات**) دایە، بەڵام بە مانای لابردن و نکوولیلێکردنە، چونکە چۆتە ژێر حوکمی قسەیەکەوە کە بە پیتی نکوولیلێکردن دەستی پێ کردووەو، چۆتە نێو بازنەکەیەوە، ئەویش ئەوەیە کە خوای بەرز دەفەرمووێ: ﴿ أَفَمَن كَانَ عَلَىٰ بَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّهِۦ كَمَن زُيِّنَ لَهُۥ سُوٓءُ عَمَلِهِۦ ﴾، وەک لێرەدا گوترابێ: ئایا وێنەی ئەو بەهەشتە، وەک ئەوە وایە کە لە ئاگردا هەمیشەیی دەبێ، واتە: وەک سزای کەسێک وایە، کە لە ئاگردا هەمیشەیی دەبێ؟!.

ئنجا ئەمە (**محي الدين الدرويش**)یش لە ئیبنول مونەییر (**إبن المنيِّر**) خواستوویەتەوەو دەڵێ: پێویستە یەک وشەی دیکە بۆ تەعبیرەکەی زیاد بکرێ: (**أَمَثَلُ سَاكِنِ الجَنَّةِ، كَمَنْ هُوَ خَالِدٌ في النَّارِ؟ أَي: كَمَثَلِ جَزَاءِ مَنْ هُوَ خَالِدٌ في النَّارِ**)، ئایا وێنەی نیشتەجێ بووی بەهەشت، وەک کەسێک وایە کە لە ئاگردا

---

(١) إعراب القرآن: ج٩، ص٢٠٩.

هەمیشـەیی دەبـێ، واتـە: ئایـا پاداشـتی کەسـێک کـە لـە بەهەشـتدا نیشـتەجێیە، وەک سـزای کەسـێک وایـە کـە لـە ئاگـردا هـەر مـاوە؟ بێگومـان نەخێـر.

کەواتـە: **(الزمخشري)** خاوەنـی تەفسـیری **(الكشـاف)**، ئـەم ئایەتـە دەبەسـتێتەوە بە ئایەتـی پێـش خۆیـەوە کـە دەفەرمـوێ: ﴿ أَفَمَن كَانَ عَلَىٰ بَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّهِۦ كَمَن زُيِّنَ لَهُۥ سُوٓءُ عَمَلِهِۦ وَٱتَّبَعُوٓاْ أَهْوَآءَهُم ﴾، ئایـا کەسـێک کـە لـە لەلایـەن پەروەدگاریـەوە لەسـەر بەڵگەیەکـی ڕۆشـنە، وەک کەسـێک وایـە کـە خراپەکـەی بـۆ ڕازێندراوەتـەوەو، کەوتوونـە شـوێن ئارەزووەکانیـان؟ دەڵـێ: تەعبیرەکـەی دواتریـش ﴿ مَّثَلُ ٱلْجَنَّةِ ﴾، لـە شـێوەی ئیسـپات و چەسـپاندن دا هاتـوە، بـەڵام مەبەسـت پێـی نکووڵییلێکردنـە، واتـە: بـە دڵنیایـی پاداشـتی کەسـانێک کـە پارێـزکارن و دەچنـە نێـو ئـەو بەهەشـتانە، وەک سـزای ئەوانـەی لـە ئاگـردان، پێکـەوە بەرانبـەرو بـەراورد ناکرێـن و وەک یـەک نیـن.

**دوو:** لە ڕووی ڕێزمانییەوە، **(مَثَلُ الجَنَّةِ الَّتِي وُعِدَ المُتَّقُونَ)**، هەمووی نیهاد (مبتدأ) ەو گوزارە (خبر)ەکەی قرتێندراوە، وا تەقدیر دەکرێ: **(مَثَلُ الجَنَّةِ الَّتِي وُعِدَ المُتَّقُونَ، جَنَّةٌ فِيها أَنْهَارٌ مِن مَاءٍ غَيْرِ آسِن)**، کەواتە: **(مَثَلُ الجَنَّةِ الَّتِي وُعِدَ المُتَّقُونَ)**، هەمووی نیهادەو گوزارەکەی بریتیە لە: **(جَنَّةٌ فِيها أَنْهَارٌ مِن مَاءٍ غَيْرِ آسِن)**، باخێک کە ڕووبارانێکی ئاو زوڵاڵ و نەگۆڕاویان تێدان.

**سێ:** خوا ﷻ ئەو بەهەشتەی بۆ پارێزکارانی داناوە، هەم نازو نیعمەتی ماددیی تێدا باس کراون، بە پێنج بڕگەو، هەم ناز و نیعمەتی مەعنەوییش، بە یەک بڕگە:

**أ-** ناز و نیعمەتە ماددییەکان:

**١)-** ﴿ أَنْهَٰرٌ مِّن مَّآءٍ غَيْرِ ءَاسِنٍ ﴾، ڕووبار گەلێک لە ئاو، ئاوێکی ساف و زوڵاڵ، کە تام و ڕەنگ و بۆنی نەگۆڕاوە.

**٢)-** ﴿ وَأَنْهَٰرٌ مِّن لَّبَنٍ لَّمْ يَتَغَيَّرْ طَعْمُهُۥ ﴾، ڕووبار گەلێک لە شیر کە تامی نەگۆڕاوە، تامی تێک نەچووە.

٣)- ﴿ وَأَنْهَٰرٌ مِّنْ خَمْرٍ لَّذَّةٍ لِّلشَّٰرِبِينَ ﴾، ڕووبار گەلێک لە مەی (شەڕاب) کە چێژدارو بە چێژە بۆ خۆرەوانی.

٤)- ﴿ وَأَنْهَٰرٌ مِّنْ عَسَلٍ مُّصَفًّى ﴾، ڕووبار گەلێک لە هەنگوین، هەنگوینێکی پاڵفتە.

٥)- ﴿ وَلَهُمْ فِيهَا مِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ ﴾، لە هەموو جۆرە میوەیەک بۆ ئەوان لەوێدا هەیە.

ب- لە ڕووی مەعنەوییشەوە: ﴿ وَمَغْفِرَةٌ مِّن رَّبِّهِمْ ﴾، لێبوردنێکی گەورەو شایستە لەلایەن پەروەردگاریانەوە، چونکە نەزانراو (**نكرة**) بوونی (**مغفرة**) لەم ڕەوت (**سياق**)ەدا ئەوە دەگەیەنێ.

بێگومان باشترین جۆری ئاو، ئەو ئاوەیە کە تام و بۆن و ڕەنگی نەگۆڕا بێ، بۆیە دەفەرموێ: ﴿ أَنْهَٰرٌ مِّن مَّآءٍ غَيْرِ ءَاسِنٍ ﴾.

باشترین جۆری شیریش ئەوەیە کە تامی نەگۆڕابێ و تێکنەچووبێ، بۆیە فەرموویەتی: ﴿ وَأَنْهَٰرٌ مِّن لَّبَنٍ لَّمْ يَتَغَيَّرْ طَعْمُهُۥ ﴾.

هەروەها باشترین جۆری شەڕاب ئەوەیە کە ئازارو سەر ئێشەو سەرخۆشیی بەدوادا نەیەت، بۆیە دەفەرموێ: ﴿ وَأَنْهَٰرٌ مِّنْ خَمْرٍ لَّذَّةٍ لِّلشَّٰرِبِينَ ﴾.

دیسان باشترین جۆری هەنگوینیش، ئەوەیە کە کەڕەشان و مێوو مێشی مردووی تێنەکەوتبێ و ساف و ساغ بێ: ﴿ وَأَنْهَٰرٌ مِّنْ عَسَلٍ مُّصَفًّى ﴾.

باشترین جۆری میوەش ئەوەیە، کە هەموو جۆرەکانی میوە بن، نەک تەنیا جۆرێک یان دوو جۆر، یان چەند جۆرێکی دیاریکراو: ﴿ وَلَهُمْ فِيهَا مِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ ﴾.

**چوار:** لە بارەی: ﴿ وَمَغْفِرَةٌ مِّن رَّبِّهِمْ ﴾ەوە، (**فخرالدين الرازي**) پرسیارێکی ورووژاندوە دەڵێ: پارێزکاران تاکو لێبوردنی پەروەردگاریان نەبینن، ناچنە بەهەشت، ئەدی یانی چی خوا ﷻ دوای ئەوەی باسی نازو نیعمەتەکانی بەهەشت دەکات، دەفەرموێ: ﴿ وَمَغْفِرَةٌ مِّن رَّبِّهِمْ ﴾؟

هەڵبەتە بە بۆ چوونی من وەڵامی پرسیارەکەی هێندە زەحمەت نیە، ئەویش ئەوەیە کە بگوترێ:

خوا ﷻ وێڕای ئەوەی ئەو نازو نیعمەتە ماددییانەیان دەداتێ، پێشیان دەفەرموێ: چاوپۆشییم لێتان کردو لێتان ڕازییم، وەک خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿وَرِضْوَانٌ مِّنَ اللَّهِ أَكْبَرُ ﴿٧٢﴾﴾التوبة، ڕازیی بوونێک لە خواوە گەورەترە، واتە: گەورەترە لە بەهەشت و لەوەی کە لە بەهەشتدا هەیە، بەهەشتیش بۆیە خۆشە، چونکە ئەو شوێنەیە کە خوا بەهۆیەوە لە مرۆڤەکان ڕازیی دەبێ و دەیانخاتە ئەوێوە.

بەڵام بە هەرحاڵ ئەو وەڵامێکی هێناوە دەڵێ: ﴿وَمَغْفِرَةٌ مِّن رَّبِّهِمْ﴾، (أي: **لاَ قَبِيْحَ عَلَى الآكِلِ وَالشَّارِبِ، بَلْ مَسْتُورُ القَبَائِحِ مَغْفُورٌ**)، دەڵێ (**غفر**) بە مانای پۆشینە: عادەت وایە کە کەسێک شتێک دەخوات یان دەخواتەوە دوایی پاشەڕۆکی دەبێ، کە دەفەرموێ: ﴿وَمَغْفِرَةٌ مِّن رَّبِّهِمْ﴾، یانی: بڵێی پەروەردگاریان دەیانپۆشێ و ئەو خواردن و خواردنەوانەی لە بەهەشتدان، پاشەڕۆکیان نابێ و وانابێ پێی ناشیرین و قێزەون بن.

بەڵام وەک گوتم: خوا ﷻ زۆر جاران باسی ڕەزامەندیی خۆی دەکات و، باسی لێبوردەیی خۆی دەکات، باسی ڕەحمەت و بەزەیی خۆی دەکات و، باسی بەخششی خۆی دەکات، هەموو ئەو وشانە (**رضوان، مغفرة، رحمة، فضل**)، بەکاردێنێ، ئنجا هەرچەندە چوونە بەهەشت کۆتا قۆناغە، بەڵام خوا ﷻ لە شوێنی دیکەش دا، ئەو باس و خواسانە پاش و پێش دەکات، وەک لە فەرمایشتێکی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە: خوا ﷻ چەند جارێک بە بەهەشتییەکان دەفەرموێ: چیتان دەوێ؟ ئەوانیش دەڵێن: هەرچی پێویستە پێتداوین، دوای ئەوەی چەند جارێک دووبارەی دەکاتەوە، بە تایبەتیی بۆ شەهیدان، دەڵێن: داوامان هەر ئەوەیە جارێکی دیکە بچینەوە بۆ ژیانی دنیا لە پێناوی تۆدا

بجەنگێـن و بکوژرێـن، خـوای پەروەردگاریـش پێیـان دەفەرمـوێ: ئـەوە لێتـان ڕازیـی بـووم و، هەرگیـز لێتـان تـوورە نابـم[1].

کەواتـە: ئێمە لە بەهەشـتیش پێویسـتیمان بـە ڕەزامەندیی و لێبوردەیی و بەخشـش و بەزەیـی خـوا ﷻ هـەر هەیـە، بەڵکـو بەهـۆی ئـەو سـیفەتانەی پـەروەرگارەوە، ژیانـی بەهەشـت و بەهەشـتییەکان، تـام و چێـژی هەیـەو بەردەوامیـش دەبـێ.

(١) {عَـنْ أَبِي سَـعِيدٍ الْخُـدْرِيِّ قَـالَ: قَـالَ رَسُـولُ اللَّـهِ صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ: " إِنَّ اللَّـهَ يَقُـولُ لِأَهْلِ الْجَنَّـةِ: يَـا أَهْـلَ الْجَنَّـةِ. يَقُولُـونَ: لَبَّيْـكَ رَبَّنَـا وَسَـعْدَيْكَ. فَيَقُـولُ: هَـلْ رَضِيتُـمْ؟ فَيَقُولُـونَ: وَمَـا لَنَـا لَا نَـرْضَى، وَقَـدْ أَعْطَيْتَنَـا مَـا لَـمْ تُعْـطِ أَحَـدًا مِـنْ خَلْقِـكَ؟ فَيَقُـولُ: أَنَـا أُعْطِيكُـمْ أَفْضَـلَ مِـنْ ذَلِـكَ. قَالُـوا: يَـا رَبِّ، وَأَيُّ شَيْءٍ أَفْضَـلُ مِـنْ ذَلِـكَ؟ فَيَقُـولُ: أُحِـلُّ عَلَيْكُـمْ رِضْـوَانِي فَـلَا أَسْـخَطُ عَلَيْكُـمْ بَعْدَهُ أَبَـدًا "} (أخرجـه البخـاري: ٦٥٤٩)

## مەسەلەی پێنجەم:

**لـە بێبڕوایانـی دەغـەڵ کەسـانێک هـەن گـوێ بـۆ پێغەمبـەر ﷺ هەڵدەخـەن (دەگـرن)، بـەڵام هەرکـە چوونـە دەرێ، لـە زانایـان دەپرسـن: ئـەرێ ئێسـتا چـی گـوت؟ ئەوانـە خـوا ﷻ مـۆری بەسـەر دڵیانـەوە نـاوە، بـەڵام ڕێـی ڕاسـتگرتووان زیاتـر بەرچـاو ڕوونییـان پـێ دەدات و پارێزکارییەکیـش شایسـتەی ئەوانـە، پێیـان دەبەخشـێ:**

خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ وَمِنْهُم مَّن يَسْتَمِعُ إِلَيْكَ حَتَّىٰٓ إِذَا خَرَجُوا۟ مِنْ عِندِكَ قَالُوا۟ لِلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ مَاذَا قَالَ ءَانِفًا ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ طَبَعَ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ وَٱتَّبَعُوٓا۟ أَهْوَآءَهُمْ ﴿١٦﴾ وَٱلَّذِينَ ٱهْتَدَوْا۟ زَادَهُمْ هُدًى وَءَاتَىٰهُمْ تَقْوَىٰهُمْ ﴿١٧﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم دوو ئایەتە، لە شەش بڕگەدا:

١)- ﴿ وَمِنْهُم مَّن يَسْتَمِعُ إِلَيْكَ ﴾، هەیانە گوێ بۆ تۆ هەڵدەخات، (**مِنْهُم، أي: مِنَ الكَافِرِينَ المُنَافِقِيْن**)، لە بێبڕوایانی دەغەڵ و مونافیق، بەچی دەزانین ئەوانە کافرە مونافیقەکانن؟ چونکە دەفەرموێ:

٢)- ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا خَرَجُوا۟ مِنْ عِندِكَ ﴾، هەتا کاتێک لە لای تۆ چوونە دەر.

بێگومـان ئەوانـەی چوونـە مەجلیسـی پێغەمبـەرەوە ﷺ ئـەو دەغـەڵ و دووڕووانـە بـوون، کـە خۆیـان بـە مسـوڵمان پێشـان داوە، کافـران نەهاتوونـە مەجلیـس و کـۆڕی پێغەمبـەرەوە ﷺ! (**الإِسْـتِمَاعُ: أَشَـدُّ السَّـمْعِ وَأَقْـوَاهُ، أي: يُظْهِـرُونَ الإِهْتِـمَامَ بِكَلَامِـكَ، وَهَذَا مِـن اسْـتِعْمَالِ الفِعْـلِ بِمَعنـى إِظهـارِهِ**)، (إستماع)، بریتیـە لـە: توندترین شـێوەی گوێگرتن و بەهێزترینـی، واتـە: وا پێشـان دەدەن کـە زۆر گرنگیـی بـە قسـەکەی تـۆ دەدەن، لێـرەدا ئـەم وشـەیە ئـەو کـردارەی بەکارهێـنراوە، مەبەسـت پێـی ڕواڵەتەکەیـەتی و دەرخسـتنیەتی، نـەک خـودی کردەوەکـە، واتـە: ئـەوان بـە دڵ و بـە گیـان و بایـەخ

پێدانــەوە، گوێیــان نەگرتــوە، بــەڵام خۆیــان وا پیشــان داوە، کــە بــە دڵ و بــە گیــان گوێــی لــێ دەگــرن، ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا خَرَجُوا۟ مِنْ عِندِكَ ﴾، (يَعنـي: **حتَّـى إذا غـادَروا مَجلِسَـكَ في المَسْجِدِ وَغَيرِه**)، واتـە: هەتـا کاتێـک کـە مەجلیـس و کـۆڕی تۆیـان بـە جێهێشـت، کـە پێغەمبـەر ﷺ لـە مزگـەوت و جگـە لـە مزگـەوت دانیشـتوە، ئەوانیـش لـەو بازنەیـەی کـۆڕو مەجلیسـە چوونـە دەرێ.

٣)- ﴿ قَالُوا۟ لِلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ مَاذَا قَالَ ءَانِفًا ﴾، بەوانەیان گوت: کە زانیارییان پێدراوە، ئەرێ ئێستا چی گوت؟ واتە: بە هاوەڵانیان گوتوە، هاوەڵانێک کە شارەزاتر بوون زۆر لە خزمەتی پێغەمبەر ﷺو کۆڕو مەجلیسی دا دانیشتوون: ئەرێ ئێستا چی گوت؟ (آنِفاً، أي: **وَقْتاً قَرِيْباً مِنْ زَمَنِ التَّكَلُّم، وَلَمْ تَرِد إلاَّ مَنْصُوبَةً عَلَى الظَّرْفِيَّة**)، (آنِفاً)، هەر بە مەنصووبی هاتوە، لەبەر ئەوەی زەرفە، (وەک توورەکەیەک ناوی کاتە، شتێکی تێدا ئەنجام دەدرێ)، (آنفا)، ئەو کاتەیە لەو کاتەوەی قسەی تێدا دەکرێ، زۆر نزیکە، یانی: هەر ئێستا و پێش ئێستا چی گوت؟ ئەو پرسیارکردنەش سێ ئەگەری هەن:

**یەکەم:** دەگونجێ بۆ پرسیارکردنی ڕاستەقینە بێ، واتە: مەبەستیان بووبێ کە پێغەمبەر ﷺ چی گوت؟ لەبەر ئەوەی خۆ بە زلگرتن و لە خۆ ڕازیی بوون، ڕێی لێ گرتبوون و بوو بووە پەردەیەک، کە باش لە فەرمایشتەکانی پێغەمبەر ﷺ تێ نەگەن، بۆیە ناچار بوون بپرسن: ئەرێ چی گوت؟ تێ نەگەیشتین!

**دووەم:** دەگونجێ بۆ بە کەم تەماشا کردن بێ، واتە: ئەو قسانە چی بوون! هیچ نەبوون، ئەوە چی گوت؟ جاری وایە تۆ بە کەسێک دەڵێی: ئەوە چی گوت؟ یانی: ئەو قسەکەی هیچ نیە، بێ بایەخەو بێ نێوەڕۆکە، شایستەی گوێ لێگرتن نیە.

**سێیەم:** ئەگەریش هەیە مەبەست پێی گاڵتە پێکردن بووبێ، واتە: ئەو قسانە چین دەیکەن، ئەرێ ئەوە چی گوت؟! وەک گاڵتە پێکردن، کەواتە: هەم دەگونجێ بۆ بە پرسیاکردنی ڕاستەقینە بێ، هەم دەگونجێ بۆ بە کەم تەماشاکردن بێ، هەم دەگونجێ بۆ گاڵتە پێکردن بێ، بۆیە خوا ﷻ دەفەرموێ:

٤)- ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ طَبَعَ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ ﴾، ئەوانە کەسانێکن خوا ﷻ مۆری بەسەر دڵەوە ناون، واتە: وەک چۆن نامەیەک مۆر دەکرێ و دادەخرێ، تازە هیچی دیکەی تێدا نانووسرێ، دڵی ئەوانەش تازە بەستراوەو، هیدایەتی ناچێتێ.

٥)- ﴿ وَٱتَّبَعُوٓاْ أَهْوَآءَهُمْ ﴾، هەروەها کەوتوونە شوێن ئارەزووەکانی خۆیان، کەواتە: هەم لە ڕووی عیلمییەوە تێکچوون و دڵیان هیدایەت وەرناگرێ، هەم لە ڕووی کردەییەوە تێکچوون و بە دوایی ئارەزوو دەکەون.

٦)- ﴿ وَٱلَّذِينَ ٱهْتَدَوْاْ زَادَهُمْ هُدًى وَءَاتَىٰهُمْ تَقْوَىٰهُمْ ﴾، (بەڵام بە پێچەوانەوە) ئەوانەی ڕێی ڕاستگرتوون، (کە بڕوادارانن، خوا ﷻ) ڕێنماییان بۆ زیاد دەکات، یاخود ڕێی ڕاست گرتنیان بۆ زیاد دەکات و، پارێزکارییەکیش کە شایستەی خۆیانە، پێیان دەدات، واتە: هۆکارەکانیان بۆ ئاسان دەکات.

کەواتـە: ﴿ وَٱلَّذِينَ ٱهْتَدَوْاْ زَادَهُمْ هُدًى وَءَاتَىٰهُمْ تَقْوَىٰهُمْ ﴾، مانایەکـەی دەگونجـێ ئـاوا تەعبیـری لـێ بکـرێ: (**وَالَّذِيـنَ قَبِلُـوا هُـدَى اللـهِ، لَطَـفَ اللهُ بِهِـمْ، فَزادَهُـم هُـدًى ورَسَّـخَ الإيمَـانَ فِي قُلوبِهِـم، ووَفَّقَهُـم للتَّقْـوَى**)، واتـە: ئەوانـەی ڕێنمایـی خوایـان وەرگرتـوە، خـوا لوتفـی لەگـەڵ کـردوون، ڕێنمایـی و ڕاسـتە ڕێـی بـۆ زیـاد کـردوون، ئیمانـی زیاتـر لـە دڵـدا چەسـپاندوون و، واشـی لـێ کـردوون پارێزکاریـی وەک سـیفەتێکی ڕۆچـوو لـە خۆیانـدا بەکاربێنـن.

کەواتـە: لـەم دوو ئایەتـە موبارەکـەدا، خـوا ﷻ بەراوردێـک دەکات لـە نێـوان بێبڕوایانـی دەغـەڵ و بڕوادارانـی ڕاسـتەقینەداو، بێبڕوایانـی دەغـەڵ بـە دوو سـیفەتان وەسـف دەکات:

١- لە ڕووی زانیارییەوە، دەفەرموێ: ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ طَبَعَ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ ﴾، ئەوانە کەسانێکن خوا ﷻ مۆری بەسەر دڵەوە ناون، واتە: هیچ زانیاریی وەرناگرن.

٢- لە ڕووی کردەوەی باشیشەوە: ﴿ وَٱتَّبَعُوٓاْ أَهْوَآءَهُمْ ﴾، کەوتوونە شوێن ئارەزووەکانی خۆیان، لە جیاتی ئەوەی بکەونە دوایی شەریعەت، کە بێگومان هەم مۆر بە دڵەوە نران

و، هەم کەوتنە بە شوێن ئارەزووەکانیان، هەردووکیان بەرهەمی ئەو کوفرو نیفاق و دەغەڵییەن کە لە دڵیاندا جێگیر بووە.

هەروەها بڕوادارانیش، خوا ﷻ بە دوو وەسفان، وەسفی کردوون:

**١-** ﴿ زَادَهُمْ هُدًى وَءَاتَىٰهُمْ تَقْوَىٰهُمْ ﴾، واتە: لە ڕووی تێفکرین و زانیارییەوە، خوا ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر ڕێنمایی و ڕاستە ڕێ بوونیان بۆ زیاد دەکات.

**٢-** لە ڕووی کردارییشەوە، سیفەتی تەقوایان پێدەدات، تەقواش بریتیە لە پابەندیی بەوەوە کە خوا ﷻ فەرموویەتی، (**سلْبَاً وَإِيجَابَاً**) واتە: پابەندبن بە شەریعەتی خواوە، هەرچی شەریعەت قەدەغەی کردوە، خۆیانی لێ بە دوور بگرن و، هەرچی شەریعەت فەرمانی پێکردوە، جێبەجێی بکەن.

### مەسەلەی شەشەم:

**بێبڕوایان جگە لە هاتنی ئاخیر زەمان بە کت و پڕیی، نابێ چاوەڕێی هیچی دیکە بکەن، چونکە بەشێک لە نیشانەکانی هاتوون و، هەر کاتێکیش ڕوویدا، ناتوانن پەند وەربگرن و ڕاستییەکانیان بیر بکەوێتەوە:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ فَهَلْ يَنظُرُونَ إِلَّا ٱلسَّاعَةَ أَن تَأْتِيَهُم بَغْتَةً ۖ فَقَدْ جَآءَ أَشْرَاطُهَا ۚ فَأَنَّىٰ لَهُمْ إِذَا جَآءَتْهُمْ ذِكْرَىٰهُمْ ﴿١٨﴾ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە سێ بڕگەدا:

١)- ﴿ فَهَلْ يَنظُرُونَ إِلَّا ٱلسَّاعَةَ أَن تَأْتِيَهُم بَغْتَةً ﴾، ئنجا چاوەڕێی چی دەکەن جگە لە کاتەکە، ئاخیر زەمان، کە کتوپڕ بۆیان بێ!

لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿ فَهَلْ يَنظُرُونَ إِلَّا ٱلسَّاعَةَ أَن تَأْتِيَهُم بَغْتَةً ﴾، **(الإِسْتِفْهَامُ مَشُوبٌ بِتَهَكُّمٍ، وَهُوَ إِنْكَارِيٌّ مُوَجَّهٌ إِلى الرَّسُولِ، وَالْمُرَادُ بِهِ غَيْرُهُ)**، واتە: ئایا چاوەڕێی چی دەکەن، جگە لە ئاخیر زەمان، ئەو کاتەی دنیای تێدا کۆتا دێ، ئەم پرسیارکردنە تێکەڵە لەگەڵ گاڵتە پێکردن و، پرسیارکردنی نکووڵیلێکەرانەیە، ڕووی کردۆتە پێغەمبەر ﷺ و مەبەست پێی جگە لەوە.

کە دەفەرموێ: ﴿ أَن تَأْتِيَهُم بَغْتَةً ﴾: **(حَالٌ مِنَ السَّاعَةِ)**، واتە: ئەمە حاڵە لە **(ساعة)**، چاوەڕێی چی دەکەن کە ئەو ئاخیر زەمانە بۆیان بێ؟ لە ناکاوو بێ ئەوەی پێشەکیی هەبن و، بە پلە پلەیی نایەت و کتوپڕ دێ.

٢)- ﴿ فَقَدْ جَآءَ أَشْرَاطُهَا ﴾، بە دڵنیایی نیشانەکانی هاتوون، واتە: هەندێ لە نیشانەکانی هاتوون، ئەو نیشانانەی هاتوون کە خەڵک بزانێ ئاخیر زەمان دێ، زانایان لەو بارەوە زۆر قسەیان کردوون، بۆ وێنە:

١- یەکێک لە نیشانەکان ئەوەیە کە خوا مرۆڤی خوڵقاندوون و، ئەوانیش چاک و خراپیان تێدایە، ئەوەش خوازیاری ئەوەیە دەبێ لێپرسینەوەو سزاو پاداشت هەبێ، واتە: هەر دروستکرانی مرۆڤ، یەکێکە لە نیشانەکان هاتنی ئاخیر زەمان و قیامەت.

٢- دابەزاندنی قورئان.

٣- ناردنی پێغەمبەری کۆتایی ﷺ کە لە دوایی ئەو هیچ پێغەمبەری دیکە نایەن.

٤- لەت بوونی مانگ، وەک لە صەحیحی بوخاریی و صەحیحی موسلیم دا[1] هاتوە.

ئەوانە چەند نیشانەیەکن کە هاتوون، ئەو کاتەی خوا ﷻ ئەوەی فەرمووە.

هەڵبەتـە دواییـش لـە فەرمایشـتی پێغەمبـەردا ﷺ هاتـوەو، باسـی نیشـانەی دیکەشـی کـردوون، ژمارەیـەک لـە وردە نیشـانەکانیش هاتـوون، ئـەوەش کـە لـە فەرمایشـتێکدا هاتـوە کـە دەفەرمـوێ: ئاخیـر زەمـان نایـەت تاکـو دە (١٠) نیشـانان نەبینـن، ئەوانـە جـارێ بـە تەئکیـد نەهاتـوون، چونکـە هـەر کاتێـک ئـەو نیشـانانە سـەرەتایان دەسـتی پێکـرد، وەک چۆن ملوانکەیـەک دەپچڕێ و دەنکەکانـی بەدوایدا دەکـەون، ئـاوا نیشـانە گـەورەکان بـە دوایـی یەکـدا دێـن.

ئنجا ئێمـە لـە هـەر کام لـە تەفسـیری سـوورەتی (**الأنعـام**)دا، لـەو شـوێنەی باسـی هاتنـی ئاخیـر زەمـان دەکات، ئایـەتی (١٥٨).

هەروەهـا لـە سـوورەتی (**الأعراف**)یشـدا، دیسـان باسـێکمان کـردوە لـە بـارەی نیشـانەکانی ڕۆژی دواییـەوە.

لـە سـوورەتی (**الأنعـام**) لـە تەفسـیری ئـەو ئایەتـەدا کـە خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿هَلۡ يَنظُرُونَ إِلَّآ أَن تَأۡتِيَهُمُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ أَوۡ يَأۡتِيَ رَبُّكَ أَوۡ يَأۡتِيَ بَعۡضُ ءَايَٰتِ رَبِّكَۗ يَوۡمَ يَأۡتِي بَعۡضُ

---

(١) [عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: انْشَقَّ الْقَمَرُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ شِقَّتَيْنِ، فَقَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: « اشْهَدُوا »] (أخرجه البخاري: ٢٦٣٦)

ءَايَٰتِ رَبِّكَ لَا يَنفَعُ نَفْسًا إِيمَٰنُهَا لَمْ تَكُنْ ءَامَنَتْ مِن قَبْلُ أَوْ كَسَبَتْ فِىٓ إِيمَٰنِهَا خَيْرًا ۗ قُلِ ٱنتَظِرُوٓا۟ إِنَّا مُنتَظِرُونَ ﴿١٥٨﴾ ﴾، واتـە: ئایـا چاوەڕێـی چـی دەکـەن، کـە فریشـتەکان بێـن، یـان پـەروەردگارت بـێ، یـان هەنـدێ لـە نیشـانەکانی پـەروەردگارت بێـن، ئـەو ڕۆژەی هەنـدێ لـە نیشـانەکانی پـەروەردگارت دێـن، هیـچ کەسـێک سـوود لـە بـڕوا هێنانەکـەی نابینـێ کـە پێشـتر بـڕوای نەهێنابـێ، یـان بـە پێـی بـڕوا هێنانەکـەی کـردەوەی باشـی نەکردبـێ، بڵـێ: چـاوەڕێ بـن ئێمـەش چاوەڕێیـن.

لـە سـوورەتی (الأعراف)یـش لـە تەفسـیری ئـەو ئایەتـەدا، کـە خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلسَّاعَةِ أَيَّانَ مُرْسَىٰهَا ۖ قُلْ إِنَّمَا عِلْمُهَا عِندَ رَبِّى ۖ لَا يُجَلِّيهَا لِوَقْتِهَآ إِلَّا هُوَ ۚ ثَقُلَتْ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ لَا تَأْتِيكُمْ إِلَّا بَغْتَةً ۗ يَسْـَٔلُونَكَ كَأَنَّكَ حَفِىٌّ عَنْهَا ۖ قُلْ إِنَّمَا عِلْمُهَا عِندَ ٱللَّهِ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٨٧﴾ ﴾، لەوێشـدا لـەو بـارەوە کورتـە باسـێکمان کـردوە.

٣)- ﴿ فَأَنَّىٰ لَهُمْ إِذَا جَآءَتْهُمْ ذِكْرَىٰهُمْ ﴾، لە کوێ، یاخود: چۆن کاتێک ئاخیر زەمانیان بۆ هات، کتوپڕ، بیریان دەکەوێتەوە، یان: پەند وەردەگرن؟ کە دەفەرموێ: ﴿ فَأَنَّىٰ لَهُمْ إِذَا جَآءَتْهُمْ ذِكْرَىٰهُمْ ﴾، (يَعْني: كَيْفَ وَمِنْ أَيْنَ لَهُمُ التَّذَكُّرُ والإتِّعَاظُ بَعْدَ مَجيئِهَا؟)، چۆن و لە کوێوە پەند وەردەگرن و بیر دەکەنەوە، کاتێک کە هات، تازە فریای هیچ شتێک ناکەون، پێغەمبەریش ﷺ لەو بارەوە دەفەرموێ: {بُعِثْتُ أَنَا وَالسَّاعَةَ كَهَاتَيْنِ وَأَشَارَ بِالوُسْطَى وَالسَّبَّابَةِ} (أخرجه البخاري: ٦٥٠٤، مسلم: ٢٩٥١، الترمذي: ٢٢١٤)، واتە: من و ئاخیر زەمان ئاوا هاتووین، ئاماژەی کرد بە پەنجەی نێوەڕاستی و پەنجەی شایەتمانی.

## مەسەلەی حەوتەم و کۆتایی:

**فەرمانکردنی بە پێغەمبەر ﷺ کە بەردەوام بێ لەسەر زانینی یەکتایی خوا لە پەرستانیداو، داوای لێبوردن کردنی لە خوا، بۆ گوناهی خۆی و بڕوادارانی پیا وو ئافرەت و، زانینی ئەوەش کە خوا ﷻ جموجۆڵ و هەڵس و کەوت و نشینگەکانیشیان دەزانێ:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ فَٱعۡلَمۡ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ وَٱسۡتَغۡفِرۡ لِذَنۢبِكَ وَلِلۡمُؤۡمِنِينَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتِۗ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ مُتَقَلَّبَكُمۡ وَمَثۡوَىٰكُمۡ ١٩ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە سێ بڕگەدا:

١)- ﴿ فَٱعۡلَمۡ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ ﴾، بزانە کە جگە لە خوا، هیچ پەرستراوێک نیە، واتە: بەردەوام بە لەسەر ئەوە، نەک تاکو ئێستا نەیزانیوەو ئێستا بزانێ، واتە: بەردەوام بە لە دەرککردنی ئەو ڕاستییە، کە جگە لە خوا ﷻ هیچ کەسێک و هیچ شتێک شایستەی پەرستران نیە.

٢)- ﴿ وَٱسۡتَغۡفِرۡ لِذَنۢبِكَ وَلِلۡمُؤۡمِنِينَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ ﴾، داوای لیبوردنیش بۆ گوناهی خۆت و بۆ گوناهی پیا وانی بڕوادارو ئافرەتانی بڕواداریش بکە.

ئەمە گرنگیی پێدانە بە ئافرەتانی بڕوادار لەم مەقامەدا، چونکە لە هەر شوێنێک دا خوا ﷻ فەرمووبێتی: **(مؤمِنون)** یان **(آمنوا)** یان **(مؤمنین)** مەبەست پێی هەردوو ڕەگەزی نێر و مێیە، بەڵام لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿ وَلِلۡمُؤۡمِنِينَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ ﴾، ئەمە زیاتر گرنگیی پێدانە بە ڕەگەزی مێ، بە ئافرەتانی بڕوادار.

٣)- ﴿ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ مُتَقَلَّبَكُمۡ وَمَثۡوَىٰكُمۡ ﴾، خواش ﷻ دەزانێ ئەو شوێنەی جموجۆڵ و هەڵسوکەوتی تێدا دەکەن و نشینگەشتان، **(المتَقَلَّب: اسْم مَكَان)**، **(متَقَلَّب)** ناوی شوێنە، ئەو شوێنەی تێیدا دێن و دەچن، دەشگونجێ: چاوگی میمیی بێ، واتە: هەڵسوکەوت

و هاتن و چوونی ئێوه دەزانێ، ﴿ وَمَثْوَىٰكُمْ ﴾، **(المثوى: المرجع والمئال)**، ئەو شوێنەی مرۆڤ بۆی دەگەڕێتەوە، تێیدا پشوو دەدات و، تێیدا نیشتەجێ دەبێ.

لە بارەی ئەوەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێکراوە، داوای لێبوردن بۆ گوناهی خۆی و، بۆ گوناهی پیا وانی بڕوادارو ئافرەتانی بڕوادارێش بکات، پێشتر باسمان کرد کە گوناهی پێغەمبەر ﷺ مەبەست پێی ئەو گوناهە نیە، بەو چەمک و واتایەی بۆ خەڵکی دیکە، بەکاردێ، شتێک دەزانن خوا پێی ناخۆشەو دەشیکەن، بەڵکو مەبەست پێی جۆرێک لە بێئاگایی و، جۆرێک لە هەڵسوکەوت بووە کە پێغەمبەر ﷺ تێیدا نەپێکاوەو، بۆ مەقامی بەرزی ئەو بە گوناه دانراوە، ئەگەرنا لە ڕاستییدا کاتێک مرۆڤ کۆشش دەکات و لە ئیجتیهادەکەیدا نایپێکی، پاداشتی هەر هەیە، پاداشتێک و، ئەگەر بیپێکێ، دوو پاداشتی هەن، بەڵام بۆ پێغەمبەر ﷺ مەقامی هێندە بەرز بووە، ئەو وردە شتانەش بۆ ئەو بە گوناه لە قەڵەم دراون، لەو بارەوە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {**إِنِّي لَأَسْتَغْفِرُاللهَ فِي اليَومِ سَبْعِينَ مَرَّةً**} **(أخرجه الترمذي: ٣٢٥٩، وعبدالرزاق: ٢ج، ص١٨٢، والبيهقي في الشعب: ٤٣٧، وَأَصْلُهُ عِنْدَ البُخَارِيّ)** واتە: من ڕۆژی حەفتا جار داوای لێبوردن لە خوا دەکەم.

کە دەفەرموێ: ﴿ فَٱعْلَمْ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ ﴾:

**١)**- یانی: لەسەر خوا بە یەکگرتن بەردەوام بە، وەک: **(إِهْدِنَا الصِّرَاطَ المُسْتَقِيم)**، ڕێی ڕاستمان پێشان بدەو، بمانخە سەر ڕێی ڕاست، واتە: بەردەوامان بکە لەسەر ڕێی ڕاست.

**٢)**- یاخود: **(زِد عِلْمَاً فِي تَوحِيدِكَ، وَارْتَقِ فِي دَرَجَاتِ الإِيْمَان)**، لە خوا بە یەکگرتنەکەتدا زانیاریی دیکە زیاد بکەو، بە پلەکانی ئیماندا زیاتر سەربکەوە.

**٣)**- واتایەکی دیکەی ئەوەیە: با خوا ﷻ تاکە پەنات بێ و، لە کاتی تەنگانەدا تەنیا پەنا بەو بگرە.

**(الطبري)**[1] دەڵێ: **(فَاعْلَم يَا مُحَمَّد! أَنَّهُ لا مَعْبودَ تَنْبَغِي أَو تَصْلُحُ لَهُ الأُلوهَةُ، وَيَجوزُ لَكَ وَلِلخَلقِ عِبَادَتُهُ إلاَّ اللهُ الَّذِي هُوَ خَالِقُ الخَلْقِ، وَمَالِكُ كُلِّ شَيءٍ يَدِينُ لَهُ**

---

(١) ج٢٦، ص٥٤-٥٥.

بِالرُّبُوبِيَّةِ كُلُّ مَا دُونَهُ، وَسَلْ رَبَّكَ غُفْرَانَ سَالِفِ ذُنُوبِكَ وَحَادِثِهَا، وَذُنوبَ أَهْلِ الإِيمَانِ بِكَ مِنَ الرِّجَالِ وَالنِّسَاءِ)، واتە: ئەی موحەممەد! بزانە هیچ پەرستراوێک نیە، شایستەی بەندایەتیی بۆ کران بێ و، بۆ تۆو دروستکراوەکانی دیکە، شایستەی ئەوە بێ بەندایەتیی بۆ بکەن، جگە لە خوا، کە بە دیهێنەری بە دیهێنراوەکانەو، خاوەنی هەموو شتێکەو، جگە لە خۆی هەموو شتێک بۆی ملکەچەو، تۆ داوای لێبوردن بۆ هەڵەو کەم و کوڕییەکانی ڕابردو و و تازەی خۆت بکە، هەروەها بۆ گوناهو تاوانەکانی ئیمانداران، کە بڕوایان بە تۆ هێناوە لە پیاوان و ئافرەتان.

کۆتایی ئەم دەرسەشمان بەم دەقە دینین:

{عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ سَرْجِس قَالَ: أَكَلْتُ مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ فَقُلْتُ: غَفَرَاللهُ لَكَ يَا رَسُولَ اللهِ، فَقَالَ لَهُ صَاحِبِي: هَلِ اسْتَغفَرَ لَكَ النَّبِيُّ ﷺ قَالَ: نَعَم ولَكَ، ثُمَّ قَرَأَ: ﴿وَٱسۡتَغۡفِرۡ لِذَنۢبِكَ وَلِلۡمُؤۡمِنِينَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتِۗ﴾، ثُمَّ تَحَوَّلْتُ فَنَظَرتُ إِلى خَاتَمِ النُّبُوَّةِ بَيْنَ كَتِفَيْهِ جُمْعَاً عَلَيْهِ خِيلانٌ، كَأَنَّهُ الثَّالِيلُ}، (أخرجه مسلم: ٢٣٤٦، والترمذي في الشمائل: ٢٣، والنسائي: ٥١٦)، واتە: عەبدوڵلای کوڕی سەرجیس (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ خواردنم دەخوارد، پێم گوت: ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ خوا لێت ببوورێ، دوایی هاوەڵەکەم پێی گوت: ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ داوای لێبوردنی بۆ تۆ کرد؟ گوتی: بەڵێ، بۆ تۆش، ئنجا ئەو ئایەتەی خوێندەوە: ﴿وَٱسۡتَغۡفِرۡ لِذَنۢبِكَ وَلِلۡمُؤۡمِنِينَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتِۗ﴾، {یانی: مادام خوا ﷻ فەرمانی پێ کردوە، دیارە فەرمانی خوای جێبەجێ کردوە}، دواتر خۆم سووڕاند تەماشای مۆری پێغەمبەرایەتییم کرد، لە نێو هەردوو شانی پێغەمبەردا ﷺ بوو، وەک پارچە گۆشتێکی هەڵتۆقیو، خاڵی پێوە بوون، خاڵەکان وەک بالووکەی گچکە بوون.

## کورتە باسێک دەربارەی پێویست بوونی پەیداکردنی زانیاریی لە بارەی تەنیا پەرستراوێتیی خواوە

ئـەم کورتـە باسـە، لـە ژێـر ڕۆشـنایی ئـەو ڕسـتە بـە پێـزەی ئـەو ئایەتـە موبارەکـەی ژمـارە: (١٩)دا، کـە پێشـتر تەفسـیرمان کـردو، شـیمان کـردەوە، پێشـکەش دەکەیـن، کـە دەفەرمـوێ: ﴿ فَٱعْلَمْ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ ﴾، بزانـە کـە جگـە لـە خـوا ﷻ هیـچ پەرسـتراوێک نیـە، واتـە: هیـچ پەرسـتراوێک نیـە شـایانی پەرسـتن بـێ.

ئەم کورتە باسە، لە سێ بڕگەدا دەخەینە ڕوو:

### ا)- لەسەر پێغەمبەر ﷺ پێویستکراوە، کە زانیاریی بە یەکتایی خوا لە پەرستراوێتیی دا هەبێ:

لێرەدا پرسیارێک دەکرێ:

ئایـا موحەممـەد ﷺ هـەر لـە سـەرەتاوە، بـەر لـەوەی وەحییشـی بـۆ بـێ، نەیزانیوە کـە خـوا ﷻ تاکـە بەدیهێنـەرو پـەروەردگارو خـاوەن ئـەم گەردوونـەو دروسـتکراوانە، بـە سـەرو خواریانـەوەو بە مرۆڤیشـەوە؟

بـە دڵنیایـی، بـا، زانیویـەتی، بـەڵام ئایـا ئـەو پێغەمبـەرە سـەروەرە ﷺ ئـەوەی کـە لـە ڕێـی وەحییـەوە نەبـێ نازانـرێ، لـە بـارەی تەنیـا پەرسـتراوێتیی خـواوە زانیویەتـی؟ بـە تەئکیـد نەخێـر، چونکـە ئەگـەر موحەممـەد ﷺو، پێغەمبەرانـی دیکـە، ئـەوەی لـە دوای وەحییـەوە نەبـێ نەیانزانیـوە، پێـش وەحییـش زانیبایـان، کەواتـە: گرنگیـی و بایەخـی وەحیـی لـە چیـدا بـوو؟ بۆیـەش ئـەو قسـەیە دەکـەم، چونکـە هەندێـک کـەس کـە عاتیفـەو سـۆز بەسـەر عەقـڵ و لۆژیکیانـدا زاڵ دەبـێ، پێیـان وایـە ئـەوە نوقسـانییە پـاڵ بدرێتـە لای پێغەمبـەری خاتـەم ﷺ کـە بگوتـرێ: بـەر لـەوەی خـوا

بیکاتە پێغەمبەرو وەحیی بۆ بنێرێ، ئەو شتانەی زانینیان پەکی لەسەر وەحیی کەوتووە، نەیزانیون، بەڵام دەبێ ئەوە لە شتە ئاشکراو بەڵگە نەویستەکان بێ، چونکە ئەگەر پێغەمبەر ﷺ و هەموو پێغەمبەرانی دیکە (**عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام**) بەبێ سروش بۆ کران و بەبێ ئەوەی خوا پەیامی تایبەتی خۆیان بۆ بنێرێ، ئەو شتانەیان زانیبایە، کە لە ڕێی وەحییەوە نەبێ نازانرێن، ئەو کاتە خوا ﷻ وەحیی بۆ نەدەناردن، بەڵام خوا ﷻ لە سوورەتی (النساء)دا دەفەرموێ: ﴿إِنَّآ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ كَمَآ أَوْحَيْنَآ إِلَىٰ نُوحٍ وَٱلنَّبِيِّـۧنَ مِنۢ بَعْدِهِۦۚ وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰٓ إِبْرَٰهِيمَ وَإِسْمَٰعِيلَ وَإِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ وَٱلْأَسْبَاطِ وَعِيسَىٰ وَأَيُّوبَ وَيُونُسَ وَهَٰرُونَ وَسُلَيْمَٰنَۚ وَءَاتَيْنَا دَاوُۥدَ زَبُورًا ﴿١٦٣﴾ وَرُسُلًا قَدْ قَصَصْنَٰهُمْ عَلَيْكَ مِن قَبْلُ وَرُسُلًا لَّمْ نَقْصُصْهُمْ عَلَيْكَۚ وَكَلَّمَ ٱللَّهُ مُوسَىٰ تَكْلِيمًا ﴿١٦٤﴾ رُّسُلًا مُّبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى ٱللَّهِ حُجَّةٌۢ بَعْدَ ٱلرُّسُلِۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا ﴿١٦٥﴾﴾، مەبەستم ئەو دێڕەی دواییە کە دەفەرموێ: بۆیە وەحییمان ناردوە بۆ تۆش و بۆ نووح و بۆ هەموو پێغەمبەرانی دیکە (**عَلَيْهِم الصَّلَاةُ وَالسَّلَام**)، کە لە دوای نووحەوە هاتوون، کە ناوی دوازدەیان دێنێ لەو سیاقەدا، بۆ ئەوەی خەڵک لە دوای ڕەوانەکرانی پێغەمبەران، بەڵگەی نەبێ لەسەر خوا ﷻ، بەڵام لێرەدا کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿فَٱعْلَمْ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ﴾، واتە: لەسەر ئەو زانیارییەی هەتە بەردەوام بە، یاخود ئەو زانیارییە زیاتر بکە، بە بیرکردنەوەی زیاترو، بە تاعەت ئەنجامدانی زیاترو، بە ملکەچیی زیاتر بۆ خواو، بە زیاتر تەماشاکردنی دروستکراوەکانی خواو تێڕامانیان و، بە زیاتر سەرنجدانی هەردووک کتێبی بینراوو بیستراوی خوا، کە زیاتر جێی سەرنج و تەماشان، زیاتریش داوا لە خوا بکە، کە زانیارییت بۆ زیاد بکات، وەک خوا ﷻ لە سوورەتی (طـه)دا، دەفەرموێ: ﴿وَقُل رَّبِّ زِدْنِى عِلْمًا ﴿١١٤﴾﴾، واتە: بشڵێ: پەروەردگارم زانیارییم بۆ زیاد بکە.

هەڵبەتە زانیارییش بە یەکتایی خواو تەنیا پەرستراوێتیی خوا، یەک شت نیەو، پلە پلەیە، هەمیشە خواش ﷻ پێغەمبەرانی (**عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام**) بە

گشتیی و بە تایبەتی سەروەرو پێشەوایان موحەممەد ﷺ هەڵناوەو هانداوە، کە لە هەموو شتێکدا بگاتە لووتکەیەکی هەرە بەرز، کە بۆ مرۆڤ شایستەیەو، لە توانای مرۆڤدایە.

ئەوە بە نسبەت موحەممەد ﷺ خۆیەوە، ئەدی بە نسبەت ئۆممەتەکەیەوە؟

خوای پەروەردگار لە سوورەتی (**الأعراف**)، لە ئایەتی (١٥٨)دا، دەفەرمویّ: ﴿ قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنِّى رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيْكُمْ جَمِيعًا ٱلَّذِى لَهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ يُحْىِۦ وَيُمِيتُ فَـَٔامِنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِ ٱلنَّبِىِّ ٱلْأُمِّىِّ ٱلَّذِى يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ وَكَلِمَٰتِهِۦ وَٱتَّبِعُوهُ لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ ﴿١٥٨﴾ ﴾، مەبەستم دێری کۆتاییە: شوێنی بکەون بەڵکو ڕێی ڕاست بگرن.

هەروەها لە سوورەتی (**النور**)دا خوا ﷻ دەفەرمویّ: ﴿ قُلْ أَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُوا۟ ٱلرَّسُولَ فَإِن تَوَلَّوْا۟ فَإِنَّمَا عَلَيْهِ مَا حُمِّلَ وَعَلَيْكُم مَّا حُمِّلْتُمْ وَإِن تُطِيعُوهُ تَهْتَدُوا۟ وَمَا عَلَى ٱلرَّسُولِ إِلَّا ٱلْبَلَٰغُ ٱلْمُبِينُ ﴿٥٤﴾ ﴾، مەبەستم ڕستەی: ﴿ وَإِن تُطِيعُوهُ تَهْتَدُوا۟ ﴾یە، ئەگەر گوێڕایەڵیی و فەرمانبەریی پێغەمبەر ﷺ بکەن، ڕێی ڕاست دەگرن، کەواتە: ئۆممەتەکەشی لەسەری پێویستەو، هەرچی پێغەمبەری خاتەم ﷺ پێی پابەند کراوە، ئۆممەتەکەشی بە هەمان شێوە، مەگەر بە نیشانەو بەڵگەیەکی ڕوون و بێ چەندو چوون، تایبەت کرابێ بە پێغەمبەرەوە ﷺ، ئەگەرنا پێغەمبەر ﷺ سەر مەشقی ئۆممەتەکەیەتی.

هەروەها خوا ﷻ دەفەرمویّ: ﴿ قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ ٱللَّهَ فَٱتَّبِعُونِى يُحْبِبْكُمُ ٱللَّهُ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٣١﴾ ﴾ **آل عمران**، بڵێ: ئەگەر خواتان خۆشدەویّ، شوێنم بکەون، خواش خۆشیدەوێن، کەواتە: هەم لەسەر پێغەمبەری خاتەم ﷺ پێویست بووەو، هەم لەسەر ئۆممەتەکەشی کە هەرچی زیاتر، هەوڵی بەدەست هێنانی زانیاریی بدەن، لە بارەی تەنیا پەرستراوێتیی خواوە، پەرستن وەک پێشتریش باسمان کردوە، بە چەمک و واتای ڕاستەقینەو فراوانی، واتە:

١- ئەوپەڕی خۆشویستن.

٢- ئەوپەڕی بە مەزن و گەورەگرتن.

٣- ئەوپەڕی بە بەرزگرتن.

٤- ئەوپەڕی ملکەچیی بۆ کردن.

٥- ئەوپەڕی پشت پێ بەستن.

٦- ئەوپەڕی سام و هەیبەت بەرانبەر هەبوون.

هەر کەسێک و هەر لایەنێک ئەو شتانەت بۆی هەبێ، بگرە یەکێک لەوانەت بۆی هەبێ، ئەوە پەرستنە، بەڵام بۆ خوا ﷻ دەبێ هەموو ئەو شتانەت تەنیا بۆ ئەو بێ، ئنجا بە ڕاستیی خوات پەرستوە، هەڵبەتە ئەوپەڕی مل بۆ کەچکردنیش، واتە: هەوڵدان بۆ هەرچی زیاتر پابەندیی بە شەریعەت و بەرنامەکەیەوە، بە هەردوو باری کردن و نەکردندا، بە هەردوو باری ئەنجامدان و وازلێهێناندا، ئەنجامدانی ئەرکەکان و، وازلێهێنان لە گوناهو تاوان و قەدەغەو خراپەکان، بەڵام لێرەدا پرسیارێکی دیکە دەکرێ.

ئایا ئەو زانیارییە بە تەنیا پەرستراوێتیی خوا، بە چەمکە ڕاستەقینەو فراوانەکەی پەرستن، تەنیا یەک شتە؟

بۆ وێنە: تەنیا بیرکردنەوەی عەقڵە؟ یاخود تەنیا ئەوەیە کە لە ڕێی وەحییەوە دەستگیر دەبێ؟ یاخود تەنیا لە ڕێگای تێوەڕامانی کتێبی گەردوونەوە؟ یان تەنیا لە ڕێی سەرنجدانی کتێبی بیستراوو خوێنراوەی خواوە ﷻ؟

بە دڵنیایی نەخێر، بە تەنیا هیچ کام لەوانە نیە، بەڵکو هەموو ئەوانەیەو هەندێ شتی دیکەش، کە دوایی تیشکیان دەخەینە سەر، گرنگ ئەوەیە مرۆڤ زانیاریی بۆ پەیدابێ لەو بارەوە کە تەنیا خوا پەرستراوە، ئنجا ئەو زانیاریی و بەرچاو

ڕوونییەو، ئەو دڵنیاییە لە چ ڕوویەکەوەیە؟ بەس لە ڕێی عەقڵەوەیە؟ یان بەس لە ڕێی نەقڵەوەیە؟ ئنجا کە لە ڕێی عەقڵیشەوەیە، ئایا تەنیا بە بیرکردنەوەی ڕووت و فەلسەفییانەو مەنتیقییانە، واتە: بیرکردنەوەی تەجریدیی، یاخود بە بیرکردنەوەو وێڕای سەرنجدان لە دروستکراوەکان و بەکارهێنانی پێنج هەستەکان، هەروەها لە ڕێی نەقڵیشەوە: تەنیا لە ڕێی قورئان و سوننەتەوە؟ یاخود بە بەهرە وەرگرتن لە پەیامەکانی دیکەش، کە خوا بۆ پێغەمبەرانی دیکەی (**عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَام**) ناردوون، کە خوا پێغەمبەری خاتەمی ﷺ پێیانەوە مولزەم کردووە، دەفەرموێ: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَى ٱللَّهُۖ فَبِهُدَىٰهُمُ ٱقۡتَدِهۡۗ قُل لَّآ أَسۡـَٔلُكُمۡ عَلَيۡهِ أَجۡرًاۖ إِنۡ هُوَ إِلَّا ذِكۡرَىٰ لِلۡعَٰلَمِينَ ۝٩٠﴾ **الأنعام**، واتە: ئەوانە کەسانێکن خوا ﷻ ڕاستە ڕێی کردوون، شوێن ڕاستە ڕێکرانی ئەوان بکەوەو بەهرەیان لێوەربگرە؟! بێگومان ئەوەش دەگرێتەوەو، هەندێ شتی دیکەش دەگرێتەوە کە دوایی ئاماژەی پێ دەکەین، گرنگ ئەوەیە کە خوا ﷻ دەفەرموێ: بزانە کە بێجگە لە خوا پەرستراوێکی دیکە نیە، پێویستە لە هەموو ئەو ڕێگایانەی کە زانیارییان لێوە وەدەست دەهێنرێ، مرۆڤ هەوڵبدات ئەو زانیاریی و دڵنیاییەی خۆی و، ئەو بەرچاو ڕوونییەی خۆی زیاتر بکات، لە بارەی تەنیا پەرستراوێتیی خواوە ﷻ.

## ٢)- گەورەیی و بەرزیی پێگەی وشەی: (لاَ إِلهَ إِلاَّ اللهُ):

پێغەمبەر ﷺ لە فەرمایشتێکدا دەفەرموێ: {**مَنْ كَانَ آخِرُ كَلَامِهِ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ دَخَلَ الْجَنَّةَ**} (**أخرجه أحمد: ٢٢١٨٠، وأبو داود: ٢٩٤٥، والحاكم: ١٢٩٩، وقال: صحيح الإسناد**)، واتە: هەر کەسێک دوا قسەی کە لە دنیادا دەردەچێ، بریتی بێ لە گوتنی وشەی: (لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ)، [بێجگە لە خوا هیچ پەرستراوێکی دیکە نیە، شایستەی پەرستران بێ]، دەچێتە بەهەشت.

هەر بۆیەش لە فەرمایشتی دیکەی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە دەفەرموێ: {**لَقِّنُوا مَوْتَاكُمْ قَوْلَ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ**} (**أخرجه أحمد: ١١٠٠٦، وعبد بن حميد: ٩٧٣، وأبو داود:**

**٣١١٧، وابـن حبـان: ٣٠٠٣، عـن أبي سـعيد، وأخرجـه مسـلم: ٩١٧، وابـن ماجـه: ١٤٤٤)،** واتـە: بـە دڵنیاییـەوە ئەوانـەی خەریکـی مردنـن (نـەک مەبەسـت پێـی مـردووەکان بـێ، ئەوانـەی خەریکـی مردنـن و، بـەرەو مـەرگ دەچـن و، لـە سـەرە مـەرگ دان، لـە گیانـەڵا دان)، (لآ إِلَـهَ إِلاَّ اللَّهُ)یـان فێـر بکـەن، [پێیـان بڵێـن ئـەو وشـەیە دووبـارە بکەنـەوەو، بیریـان بخەنـەوە].

## ٣)- ئایا زانیاریی هەبوون پەکی لەسەر زانستی بنچینەکانی ئایین، زانیاریی ئیمان و عەقیدە، کەوتوە؟!:

(**علـم الـكلام**) و (**الفقـه الأكـبر**) و (**أصـول الديـن**)، ئەوانـە هەموویـان ناوونیشـانن، بـۆ ئـەو زانیارییـەی کـە زانایـان لـە ژێـر ناوونیشـانی ویـدا، لـە ئیـمان و عەقیـدەی ئیسـلامیان کۆڵیوەتـەوە، ئنجـا ئایـا زانیاریـی هەبـوون بـە یەکتایـی خـوا، پەکـی لەسـەر(**علم الـكلام**) کەوتـوە؟ ئایـا ئـەو قسـەیە ڕاسـتە کـە هـەر کەسـێک لـە ڕێـی زانسـتی کەلامـەوە هـەوڵ نـەدات خـوا بناسـێ و، هـەوڵ نـەدات ڕاسـتییەکانی ئیـمان و عەقیـدە وەربگـرێ، بـەو ڕاسـتییانە، نـاگات؟

هــەر زوو دەڵێیــن: نەخێــر، وا نیــە، چونکــە ڕێــی بــەرەو خــوا چــوون و ڕێــی خواناســیی، ئنجــا خواناســیی، چ ناســینی بەدیهێنەرایەتیــی و پەروەردگاریــی و خاوەندارێتییەکەی، چ ناسـینی ناوو سـیفەتەکانی، چ ناسـینی تەنیا پەرسـتراوێتییەکەی، هەروەهــا ناســینی فریشــتەکانی و، ناســینی کتێبەکانــی و، ناســینی پێغەمبەرانــی (**عَلَيْهِـم الصَّلَاةُ وَالسَّلَام**)و، ناسـینی دیـدارو بـە خزمـەت گەیشـتنی لـە ڕۆژی دواییـدا، واتــە: ڕۆژی دوایــی و، زانینــی نەخشــەو ئەنــدازە گیرییەکــەی بــۆ دروســتکراوەکانی، پەکـی لەسـەر زانسـتێک نەکەوتـوە کـە لـە ژێـر ناوونیشـانێکی تایبەتـدا بـێ، بـەڵام بـە مسـۆگەریی پەکـی لەسـەر ئـەوە کەوتـوە، کـە مـرۆڤ لـە ڕێـی وەحییـەوە بەرچـاوی ڕوون بکرێتــەوە، لــە ڕێــی خــوای پــەروەردگارەوە بــەر چــاوی ڕوون بکرێتــەوە، لــە دوو توێـی وەحییـدا بـۆ زانینـی ئـەو شـتانەی لـە ڕێـی وەحییـەوە نەبـێ نازانرێـن،

بەڵام دوای ئەو شا ڕێیە کە بەس ئەوە ڕێیە، کە ڕێی شەریعەت و وەحییە، ئایا کۆمەڵێکی دیاریکراو لە زانایانی ئیسلام بۆیان هەیە، بڵێن: لە ڕێی ئێمەوە نەبێ بە ناسینی یەکتایی خواو تەنیا پەرستراوێتی خوا ناگەن؟ یاخود لە ڕێی ئێمەوە نەبێ بە زانین و دەرککردنی ڕاستییەکانی ئیسلام ناگەن؟ لە ڕاستییدا هیچ کۆمەڵێک لە مسوڵمانان بۆیان نیە، ئەوە بڵێن، تەنیا یەک کەس بۆی هەبووە ئەوە بڵێ، ئەویش پێغەمبەری خوا ﷺ بووە، کە بێگومان لە ڕێی پێغەمبەری خواوە ﷺ نەبێ، ئێمە نەدەستمان لە وەحیی گیر دەبوو، نە دەستمان لە ڕوون کردنەوەی وەحیی و چۆنیەتیی جێبەجێکردنی وەحیی ئەوەی پەیوەندیی بە لایەنی کردەوەییەوە هەبووەو گیر دەبوو، ئەوە جیاییە، بەڵام لە دوای پێغەمبەر ﷺ ئیسلام لە هیچ کەسدا کورت هەڵنەهاتوەو، تێگەیشتن لە قورئان و ڕێبازی پێغەمبەر ﷺ لەسەر هیچ کەس تاپۆ نەکراوەو لە هیچ کەس دا کورت هەڵنەهاتوە، زانایانی ئەهلی کەلام بن، زانایانی ئەهلی تەصەووف بن، ئەوانەی لەم ڕۆژگارەدا نازناوی سەلەفیی هەڵدەگرن، یاخود نازناوی ئیسلامیی هەڵدەگرن، یاخود هەر نازناوێکی دیکە هەڵدەگرن، بۆ وێنە: نازناوی میراتگرانی پێغەمبەر ﷺ هەڵدەگرن، ڕەحمەتی خوا فراوانەو لە دەستی هیچ کەسدا کورت هەڵنەهاتوەو، لەسەر هیچ کەس تاپۆ نەکراوە، ڕێی بەرەو خوا چوون، وەک زانایانی خوا ناس، گوتوویانە: (**الطُّرُقُ إلى اللهِ بِقَدَرِ أَنْفَاسِ الخَلاَئِق**)، ڕێیەکان بەرەو خوا، بە ئەندازەی هەناسەکانی دروستکراوەکانن، واتە: ڕێیەکان بەرەو خوا چوون یەکجار زۆرن، بەڵام ئەو ڕێیانەی بەرەو خوا چوون، دەبێ لە چوارچێوەی شەریعەتدا بن، مەبەستم ئەوەیە هیچ کۆمەڵێک لە زانایان بۆیان نیە بڵێن: لە ڕێی ئێمەوە نەبێ و، بە چەمک و تەعبیرەکانی ئێمە نەبێ، بە ڕسوومات و شێوەکانی ئێمە نەبێ، ناگەنە ئامانج و مەبەست.

لەو بارەوە با هەندێ قسە لە زانای ناوداری ئیسلام و پێشەوای بەرجەستەی ئیسلام (**أبو حامد الغزالي**)، کە بە (**حجة الإسلام**) بە ناوبانگ بووە، لە کتێبێکیدا بە ناوی: (**فيصل التفرقة بين الإسلام والزندقة**)دا، کە لە تەفسیری (**روح المعاني**) ی

(سید محمود الألوسي البغدادي)[1]، دەیهێنین، هەندێ قسەی زۆر بە نرخ دەکات، هەڵبەتە (الألوسي)یش تاکو ڕاددەیەک قسەکانی کورت کردوونەوە، بەڵام ئەو جێیانەی کورتی کردوونەوە، دیاریی کردوون.

(أبو حامد الغزالي)، دەڵێ: (مِنْ أَشَدِّ النَّاسِ غُلُوًّا وَانحِرافًا، طَائِفَةٌ مِنَ المُتَكَلِّمِينَ كَفَّرُوا عَوامَّ المُسلِمِينَ وَزَعَمُوا أَنَّ مَن لا يَعرِفُ الكَلامَ مَعرِفَتَنا، وَلَم يَعرِفِ الأَدِلَّةَ الشَّرعِيَّةَ بِالأَدِلَّةِ الَّتِي أَحْرَزنَاها، فَهُوَ كَافِرٌ، فَهَؤلاءِ ضَيَّقُوا رَحْمَةَ اللهِ تَعَالى الوَاسِعَة عَلَى عِبَادِهِ، أَوَّلاً: جَعَلُوا الجَنَّةَ وَقْفاً عَلَى شِرذِمَةٍ يَسِيرَةٍ مِنَ المُتَكَلِّمِين، ثانياً: ثُمَّ جَهِلُوا مَا تَواتَرَت بِهِ السُّنَّةُ، إذ ظَهَرَمِن عَصرِ الرَّسول الله ﷺ وَعَصْرِ الصَّحابَة رضوان الله تعالى عليهم أجمعين حُكمُهُم بِإسلامِ طَّوائِفَ مِنْ أَجْلافِ العربِ، كَانوا مَشغُولونَ بِعبادَةِ الوَثَنِ، وَلَم يَشْتَغِلُوا بِتَعليمِ الدَّلائِلِ، وَلَو اشْتَغَلوا بِهَا لَم يَفْهَمُوهَا، وَمَن ظَنَّ أَنَّ مَدرَكَ الإِيمَانِ: الكَلامُ وَالأدِلَّةُ المُحَرَّرَةُ، والتَّقسِيمَاتُ المُرَتَّبَةُ، فَقَد أَبعَدَ).

واتە: لە لادەرترین و ڕۆچووترین کەس کۆمەڵێک لە زانایانی (علم الکلام)ن، (لە بیرمەندان) کە مسوڵمانانیان بە گشتیی بە کافر داناوەو پێیان وەبووە، هەر کەسێک زانستی کەلام نەزانێ، وەک ئێمە دەیزانین، هەر کەسێک بەڵگە شەرعییەکان نەزانێ، بەو شێوە کە ئێمە بەدەستمان هێناون، بە بێبڕوا دادەنرێ! ئا ئەوانە بەزەیی فراوانی خوایان لەسەر بەندەکانی تەسک کردۆتەوە:

**یەکەم:** بەهەشتیان تاپۆ کردوە لەسەر کۆمەڵێکی کەم لە زانایانی کەلام.

**دووەم:** لەوە بێئاگا بوون کە لە ڕێبازی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە، لە ڕۆژگاری پێغەمبەر ﷺو ڕۆژگاری هاوەڵانی دا، خوا لێیان ڕازیی بێ، دەرکەوتوە کە حوکمیان کردوە بە مسوڵمان بوونی کۆمەڵە کەسێک لە عەرەبە خێڵەکییەکان، کە سەر گەرمی بتپەرستیی بوون و، سەرگەرمی بەڵگەکانی دینداریی و خواناسیی نەبوون، ئەگەر سەرگەرمیشیان بوونایە، لێیان تێنەدەگەیشتن، ئنجا هەر کەسێک پێی وابێ لە ڕێی عیلمی کەلامەوە

---
(١) ج١٣، ص(٢٩٧ - ٢٩٨).

نەبێ، دەرکی ئیمان ناکرێ و، لە ڕێی بەڵگەکان و لە ڕێی ئەو دابەش کردنانەوە نەبێ، کە زانایان و پسپۆڕانی ئەو بوارە دایانناوە، دەرکی ئیمان ناکرێ و ئیمان نازانرێ، زۆر دوور کەوتۆتەوە.

دوایـی دەڵـێ: ڕاسـت نیـە، بەڵکـو ئیـمان ڕاسـتییەکە کـە خـوای بـەرز دەیخاتـە دڵـی بەندەکـەی خـۆی، وەک بەخششـێک و خەڵاتێـک لەلایـەن خۆیـەوە، دوایـی چەنـد ڕێیـەک ڕووندەکاتـەوە کـە لـە ڕێـی ئـەو ڕێیانـەوە، دەگونجـێ مـرۆڤ ئیمانـی بـۆ پەیـدا ببـێ.

دەڵـێ: **یەکـەم:** (**تَـارَةً بِتَنَبُّـهٍ فِي البَاطِـنِ لا يُمْكِـنُ التَّعبِـيرُ عَنْـهُ**) جارێـک بەهـۆی ئـەوەوە کـە مـرۆڤ لـە دەروونـەوە بێـدار دەبێتـەوە، بـە شـێوەیەک کـە ناتوانـێ دەری ببـڕێ و ڕوونـی بکاتـەوە، لـە دەروونـەوە بـەرەو خـوا ناسـیی و تەنیـا خـوا پەرسـتیی بێـدار دەبیتـەوە.

بـەڵام پێـم وایـە ئەگـەر (**أبـو حامـد الغـزالي**)، لـە جیاتـی ئـەم تەعبیـرە گوتبـای: (**تَـارَةً عَـن طَرِيـقِ الفِطْـرَةِ الَّتـي فَطَـرَ اللـهُ النَّـاسَ عَلَيْهَـا**)، تەعبیرەکـەی زۆر چاکـترو ڕێکـتر دەبـوو، واتـە: بەهـۆی ئـەو زگماکـەی کـە خـوا خەڵکـی لەسـەر سروشـتاندوە، وەک پێغەمبـەر ﷺ دەفەرمـوێ: {**مَـا مِـنْ مَوْلُـودٍ إلاَّ يُولَـدُ عَـلَى الْفِطْـرَةِ، فَأَبَـوَاهُ يُهَوِّدَانِـهِ، أَوْ يُنَصِّرَانِـهِ، أَوْ يُمَجِّسَـانِهِ**} (**أخرجـه البخـاري: ١٢٩٢، ومسـلم: ٢٦٥٨، وأبـو داود: ٤٧١٤**)، هەمـوو لـە دایـک بووەیـەک لەسـەر زگماکـی خواپەرسـتیی و خواناسـیی لـە دایـک دەبـێ، دوایـی بـاب و دایکـی (واتـە: ژینگـەو دەور وبـەر) دەیکەنـە جوولەکـەو دەیکەنـە نەصرانیـی و، دەیکەنـە مەجووسـیی.

**دووەم:** (**وَتَارَةً بِسَبَبِ رُؤيَاً فِي المَنَامِ**)، هەروەها جارێک بە هۆی خەونێکەوە کە لە خەودا دەیبینێ.

دەڵێـم: ڕاسـتە زۆر کـەس لـە خەونـدا شـتێکی بـۆ دەردەکـەوێ، یاخـود هۆشـیار دەکرێتـەوەو، بەرچـاو ڕوونیـی پـێ دەدرێ و، دەبێتـە هـۆی هیدایەتـی، هیدایەتـی

گشتیی کە یەکسەر لە کوفرەوە بۆ ئیسلام بگوازێتەوە، یاخود هیدایەتێکی جوزئیی، کە هەندێک ڕاستیی بۆ دەربکەون لەو ڕێیەوە.

**سێیەم:** (**وَتَارَةً بِمُشَاهَدَةِ حَالِ رَجُلٍ مُتَدَيِّنٍ، وَسِرايَةِ نُورِهِ إِلَيهِ عِندَ صُحبَتِهِ وَمُجَالَسَتِهِ**)، جارێکیش بە هۆی دیتنی حاڵی پیاوێکی دیندارو، چوونی ڕووناکییەکەی بۆ لای وی، بە هۆی هاوەڵایەتیی و لێ نیزیکیی و، بەهۆی لەگەڵ دانیشتنیەوە.

ئەوەش هەر ڕاستە، هاوەڵان زۆرجار بە هۆی ئەوەوە کە بە خزمەت پێغەمبەر ﷺ گەیشتوون و بە دیداری شاد بوون، دڵیان ڕۆشن بۆتەوەو، لە دوای پێغەمبەریش ﷺ هەر کەسە بە پێی خۆی، وەک لە فەرمایشتی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە کە دۆستانی خوا ئەوانەن: {إِذَا رُؤُوا ذُكِرَ اللهُ}، (**أخرجه النسائي في الكبرى: ١١٢٣٥، والبزار: ٥٠٣٤**)، هەر کاتێک بیبنران، خوا ﷻ بکەوێتەوە یاد.

**چوارەم:** (**وَتَارَةً بِقَرِينَةِ حَالٍ، فَقَد جَاءَ أعرَابِيٌّ إِلى رَسول الله ﷺ جَاحِداً لَهُ مُنْكِراً، فَلَمَّا وَقَعَ بَصَرُهُ عَلى طَلْعَتِهِ البَهِيَّةِ، وَغُرَّتِهِ الغَرِيرَةِ السَّنِيَّةِ، فَرَآهَا يَتَلَئلَؤُ منها نُورُ النُّبُوَّةِ، قَالَ: وَاللهِ مَاهَذا وَجهُ كَذَّابٍ...**)، جارێکیش بە هۆی نیشانەی حاڵ و دیمەنەوە، (وێنە دێنێتەوەو دەڵێ:) جارێک عەرەبێکی خێڵەکیی هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ نکووڵیی لێ دەکردو، بڕوای پێی نەبوو، بەڵام کاتێک چاوی بە ڕەنگ و ڕووی درەوشاوەی کەوت و شێوەی نوورانیی بینی، کە ڕووناکیی پێغەمبەرایەتیی لە دەم و چاویدا دەدرەوشێتەوە، گوتی: بە خوا ئەمە ڕووی پیاوی درۆزن نیە، ئیدی پرسیاری لێکرد کە ئیسلامی پێشان بدات، ئەویش ئیسلامی بۆ خستە ڕوو، ئەویش مسوڵمان بوو.

یەکێکی دیکە هاتە خزمەتی گوتی: سوێندت دەدەم بە خوا، خوا تۆی ناردوە؟ پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: بەڵێ، سوێند بە خوا، خوا منی بە پێغەمبەرایەتیی ناردوە، ئەویش بەهۆیەوە کە سوێندی بۆ خوارد بە ڕاستی داناو، مسوڵمان بوو.

ئنجا دەڵێ: وێنەی ئەمانەش کە زۆر لەوە زیاترن بژمێردرێن، هیچ کام لەمانە نەچووە سەر گەرمی فێربوونی زانستی کەلام ببێ و، بەڵگەکان شارەزا بێ،

بەڵکو ڕووناکیی ئیمان بەهۆی ئەو بەڵگانەوە چۆتە دڵیانەوە، تیشکێکی سپی دەرکەوتوە، دوایی وردە وردە ئەو تیشکە زیاد بووەو، هەر زیاتر درەوشاوەتەوە بە هۆی زیاتر بینینی ئەو حاڵە مەزنانەو، بە هۆی زیاتر خوێندنەوەی قورئانەوەو، بە هۆی پاککردنەوەی دڵ و دەروونەکانەوە.

دوایی دەڵێ: (**وَلَيْتَ شِعْرِي! مَنْ نَقَلَ عَنْ رَسولِ اللهِ ﷺ وَعَنِ الصَّحَابَةِ إِحْضَارَهُ أَعْرَابِيًّا أَسْلَمَ، وَقَوْلَهُ الدَّلِيل عَلَى أَنَّ العَالَمَ حَادِثٌ، لِأَنَّهُ لايَخْلُوا عَنِ الأعْرَاضِ، وَمَا لا يَخْلوا عَنِ الحَوَادِثِ، فَهُوَ حَادِثٌ، وَأَنَّ اللهَ تَعَالَى عَالِمٌ بعِلْمٍ وَقَادِرٌ بِقُدْرَةٍ، كِلاَهُمَا زَائِدٌ عَلَى الذَّاتِ، لا هُوَ وَلاَ غَيْرُهُ، إلى غَيْرِ ذَلِكَ مِنْ رُسُوم المُتَكَلِّمِين**)، دەڵێ: خۆزگە زانیبام، کێ نەقڵی کردوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺو، لە هاوەڵانەوە خوا لێیان ڕازی بێ، یەکێک لەو عەرەبە خێڵەکییانەی مسوڵمان بووە، بانگی کرد بێ، وەرە ئەو بەڵگەیەت فێر بکەم لەسەر بوونی خوا، کە ئەو گەردوونە پەیدابوویە، چونکە لە ڕووداوەکان خاڵیی نیەو، هەر شتێک لە ڕووداوەکان خاڵیی نەبێ، پەیدابوویە، هەروەها ئەوەی فێر کردبێ کە خوا زانایە بە زانیارییەک و، توانایە بە توانینێک و، هەر کام لە زانیارییەکەی و توانایەکەی زێدەن لە خودی خواو، ئەو سیفەتانە (**لاَ هُوَ وَلاَ غَيْرُهُ**)، نە خودی خوای پەروەردگارن و، نە جگە لە خواشن، جگە لەو قسانەی دیکە کە زانایانی کەلام دەیانکەن.

هەڵبەتە: (**لاَ هُوَ وَلاَ غَيْرُهُ**)، واتە: سیفەتەکانی خوا نە خودی زاتن، بە ئیعتیباری ئەوە کە ئەو سیفەتانە بوونیان نەبێ و، جگە لە خودیشن، بەو ئیعتیبارە کە لە زات جیا بن، کە ئەمە وردەکارییەکی هەیە، ئێرە شوێنی ڕوونکردنەوەی نیە.

دوایی (**أبو حامد الغزالي**) دەڵێ: (**وَلَسْتُ أَقُولُ لَمْ تَجْرِ هَذهِ الألفَاظُ، على أَلْسِنَةِ الذين أسلموا، بَل لَم يَجرِ أَيضًا مَا مَعنَاه مَعنى هذه الألفَاظِ، بل كَانَ لا تَنْكَشِفُ مَلْحَمَةٌ إلاَّ عَن جَمَاعَةٍ مِن أَجلافِ يُسلِمُونَ تَحتَ ظلالِ السُّيوفِ، وَجمَاعَةٍ مِن أُسارى يُسلِمونَ واحِدًا وَاحِدًا بَعدَ طُولِ الزَّمانِ أَو عَلى القُربِ، وَكَانُوا إذا نَطَقُوا بِكَلِمَةِ الشَّهَادَةِ عُلِّموا الصَّلاةَ وَالزَّكَاةَ، وَرُدُّوا إلى صِنَاعَتِهِم مِن رِعَايَةِ الغَنَمِ أَو غَيْرِهَا**)،

دەڵـێ: مـن ناشـڵێم ئـەو بێژانـە بەسـەر زمانـی ئەوانـەدا نەهاتـوون کـە مسـوڵمان بـوون، بەڵکـو مانایەکانـی ئـەو بێژانـەش هـەر بـاس نەکـراون، بەڵکـو هـەر جەنگێـک کـە بـووە لـە نێـوان ئیسـلام و ئـەو عەرەبـە خێڵەکیيانـەدا، مەگـەر چـۆن، ئەگەرنـا ژمارەیەکیـان لـێ مسـوڵمان بـوون، (ئـەو وا دەڵـێ)[1] لـە ژێـر سـێبەری شمشـێرداو، کۆمەڵێـک لـە دیلـەکان هاتـوون، یـەک یـەک و، دوایـی پێـی چـووە، یاخـود یەکسـەر مسـوڵمان بـوون، ئنجـا کاتێـک کـە وشـەی شـایەتمانیان گـۆ کـردووەو شـایەتمانیان هێنـاوەو، نوێژیـان فێـر کـراوەو، زەکاتیـان فێـر کـراوەو، دوایـی گێردراونـەوە بـۆ پیشـەکەی خۆیـان، ئەگـەر مـەڕ لەوەڕانـدن بـووە، یـان هـەر شـتێکی دیکـە بـووەو، چوونـەوە بـەر کارو کاسـبیی خۆیـان.

دوایـی (**أبـو حامـد الغـزالي**)، دەڵـێ: (**نَعَـم لَسْـتُ أُنْكِـرُ أَنَّـهُ يَجُـوزُ أَنْ يَكُـون ذِكْـرُ أَدِلَّـةِ المُتَكَلِّمِـنَ أَحَـدَ أَسـبَابِ الإِيمَـانِ فِي حَـقِّ بَعـضِ النَّـاسِ، وَلَكِـنْ ذَلِـكَ لَيْـسَ بِمَقْصُـورٍ عَلَيْـهِ، وَهُـوَ نَـادِرٌ أَيْضَاً**)، واتـە: بەڵـی مـن نکوڵیـی لـەوە ناکـەم، کـە ڕەنگـە باسـکردنی بەڵگەکانـی زانایانـی کـەلام، یەکێـک لـە هۆکارەکانـی بـڕوا هێنـان بـێ، بـۆ هەنـدێ کـەس، بـەڵام هـەر لەسـەر ئـەوە کـورت نەهاتـوەو، ئـەوەش شـتێکی دەگمەنـە.

دوای چەنـد قسـەیەک دەڵـێ: (**وَالحَـقُّ الصَّرِيـحُ أَنَّ كُلَّ مَـنِ اعْتَقَـدَ أَنَّ مَـا جَـاءَ بِـهِ الرَّسُـولُ ﷺ وَاشْـتَمَلَ عَلَيـهِ القُـرْآنُ حَـقٌّ، اعْتِقَـادَاً جَزْمَـاً فَهُـوَ مُؤْمِـنٌ، وَإِنْ لَـمْ يَعْـرِف أَدِلَّتَـهُ**)، واتـە: هەقـی ڕوون و ڕاشـکاو ئەوەیـە کـە هـەر کەسـێک قەناعـەت و بـڕوای وابـێ: ئـەوەی پێغەمبـەر ﷺ هێناویەتـی و ئـەوەی قوڕئـان گرتوویەتـە خـۆی هەقـەو، قەناعـەت هێنانێکـی وا کـە دڵـی لەسـەر دامـەزراو بـێ، بـە بـڕوادار لە قەڵـەم دەدرێ، بـا بەڵگەکانیـش نەزانـێ.

(**فَالإِيْمَـانُ المُسـتَعَارُ مِـنَ الدَّلائِـلِ الكَلامِيَّـةِ، ضَعِيْـفٌ جِـدَّاً مُـشْرِفٌ عَـلَى التَّزَلـزُلِ بِـكُلِّ شُـبْهَةٍ، بَـلِ الإِيمَـانُ الرَّاسِـخُ إِيْمَـانُ العَـوَامِ الحَاصِـلِ فِي قُلُوبِهِـم فِي الصِّبـا بِتَواتـرِ السَّـمَاعِ، وَالحَاصِـلِ بَعْـدَ البُلُـوغِ بِقَرَائِـن لاَ يُمْكِـنِ العِبَـارَةُ عَنْهَـا**)، واتـە: ئیمانـی خـوازراو لـە بەڵگـە

---

(١) ئەو تەعبیرە بە ڕەهایی ڕاست نیە.

ئیمانییەکانەوە، ئیمانێکی بێهێزەو هەمیشە لەرزۆکە، بە هەر شوبهەیەک ڕووی تێ بکات، بەڵکو ئیمانی ڕاست و دامەزراو، ئیمانی ئەو خەڵکە گشتییەیە کە لە دڵیاندا پەیدا دەبێ و، هەر بە منداڵیی کە بە تەواتور ڕاستییەکانی ئیسلامیان پێ دەگەن و، دوای ئەوەی باڵغیش دەبن بە چەند نیشانە و بەڵگەیەک کە ناگونجێ تەعبیریان لێ بکرێ، پتر دەچەسپێ.

بەڵام من تێبینییم هەیە لەسەر هەندێک لە قسەکانی ئەبوو حامید (ڕەحمەتی خوای لێ بێ).

پوختەی ڕای من لەو بارەوە ئەوەیە کە ئەوەی خوا ﷻ فەرمانی پێ دەکات: ﴿ فَاعْلَمْ أَنَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا اللَّهُ ﴾، بزانە بێجگە لە خوا هیچ پەرستراوێک نیە، ئا ئەو زانین و دەرککردنە کە: تەنیا خوا تاکە پەرستراوە، بێگومان ئەوە فەرزە، بەڵام ئایا زانیاریی خوا ناسیی و ئیمان بەس ئەوەیە کە کۆمەڵە زانایەک گوتوویانە: زانایانی عیلمی کەلام، یان زانایانی تەزکیەو تەصەووف، یان زانایانی سەلەفیی ناو، یاخود ئەوانەی پێیان دەگوترێ: ئەهلی مینبەرو میحراب، یاخود فڵان جۆرە زانا؟ بە دڵنیایی نەخێر.

هەروەها ئایا زانیاریی تەنیا ئەوەیە کە بە پێنج هەستەکان و لە ڕێی سەرنجدانی عەقڵەوە پەیدا دەبێ؟ یان تەنیا زانیاریی وەحیی هەیە لەو بارەوە؟ بێگومان نەخێر، بەڵکو لەو بوارەدا جۆرە زانیاریی دیکەش هەن، هەرچەندە زانیاریی وەحیی ساغترین و بێ خەڵەترین و ڕاسترین و چاکترین زانیارییە، بەڵکو هەر بەراورد ناکرێ لەگەڵ زانیارییەکانی دیکەدا.

زانیارییەکی دیکەش ئەو زانیارییەیە کە خوا لە ناخی مرۆڤدا دایناوە، ئەو خواناسییە زگماکە ڕاست و ڕوونە، وەک لە سوورەتی (الروم)دا، خوا ﷻ دەفەرمووێ: ﴿ فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًا ۚ فِطْرَتَ اللَّهِ الَّتِي فَطَرَ النَّاسَ عَلَيْهَا ۚ لَا تَبْدِيلَ

لِخَلْقِ ٱللَّهِ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلْقَيِّمُ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٣٠﴾﴾، واتــە: ڕووی خــۆت ڕێــک بکــە بەرانبــەر بــە ئاییــن (ئاییــنی خــوا) بــە ســاغبووەوەی و پاکیـی، هەمـان ئـەو زگماکـەی خـوا خەڵکـی لەسـەر سروشـتاندوە، گـۆڕان نیـە بـۆ دروسـتکراوی خـوا، ئـا ئـەوە ئایینـی ڕاسـتە، بـەڵام زۆربـەی خەڵـک نازانـن، واتـە: ئـەو زگماکـەی خـوا خەڵکـی لەسـەر خوڵقانـدوە، لەگـەڵ ئـەو ئایینـەی خـوا ناردوویەتـی، شـەریعەت و فیتـڕەت، دوو ڕووی دراوێکـن، کەواتـە: ئـەو زانیارییـەش کـە لـە نـاخ و خواڕسـکی مرۆڤدایـە، بـە نسـبەت خـوا ناسـییەوە، جۆرێکـی دیکەیـە.

دیسـان ئـەو زانیارییـەی لـە ڕێـی فریشـتەکانەوە بـۆ مـرۆڤ خورپـەو ئیلهـام دەکـرێ.

هەروەها ئەوەی کە لە ڕێی خەونەوە بۆ مرۆڤ وەدی دێ.

هەروەهـا لـە هـەر ڕێگایەکـی دیکـەوە، گرنـگ ئەوەیـە مـرۆڤ ئـەو زانیاریـی و بەرچـاو ڕوونیـی و دڵنیاییـەی لـە بـارەی خـوای تـاک و پاکـەوە بـۆ پەیدابـێ، بـەڵام بگوتـرێ: حەتمـەن دەبـێ بـەس لـە فـڵان ڕێگـەوە بـێ، یـان فـڵان کەسـەوە بـێ، یـان ڕێیەکـی تایبـەت و باریکـە ڕێیـەک، بە دڵنیایی ئەوە ڕاسـت نیـەو لـەوەدا بە گشـتیی پشـتگیریی قسـەکانی (**أبـو حامـد الغـزالي**)، دەکـەم ڕەحمەتـی خـوای لـێ بـێ، بەزەیـی خـوا زۆر لـەوە فراوانـترە کـە بـە باریکـە ڕێیەکـدا نەبـێ، خـوا ناسـیی و ئیـمان وە دەسـت نەیـەت، بـەڵام بێگومـان ڕاسـتە شـەقامی شـەریعەت، ئـەو ڕاسـتە ڕێیەیـە کـە دەبـێ هەمـووی لـەو چوارچێوەیـەدا بـێ، بـەڵام لـەو چـوار چێوەیـەدا، ئێمـە پابەنـد نەکراویـن کـە بـەس بـە دوای کۆمەڵێکـی تایبـەت لـە زانایـان بکەویـن، کـە لـە بـارەی ئیـمان و عەقیـدەوە کۆڵیویانەتـەوە، هـەروەک پابەندکراویـش نیـن، کـە تەنیـا بە دوای کۆمەڵێـک لـە زانایـان بکەویـن، کـە لـە بـواری تەزکیـەی نەفـس دا پسـپۆڕییان هەیـە، یاخـود بـە دوای کۆمەڵێـک لـە زانایـان بکەویـن، کـە ناوونیشـانێکی تایبەتیـان هەیـە، بەڵکـو ئێمـە پابەنـد کراویـن کـە بـە دوای شـەریعەت بکەویـن، بـەڵام تێگەیشـتنی

هیچ کام لەو کۆمەڵە زانایانە، بۆ ئێمە پابەندکەر نیە، تاکە تێگەیشتنێک کە بۆ ئێمە پابەندکەر بێ، لە بارەی ئایین و بەرنامەی خواوە، چ ئیمانەکەی، چ شەریعەتەکەی بریتیە لە: تێگەیشتنی پێغەمبەری خاتەم ﷺ.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسە لە دوازدە ئایەت پێک دێ، ئایەتەکانی: (٢٠ - ٣١)، تەوەری سەرەکییان، باسی هەڵوێستی نەرێنییانەی دەغەڵ و دڵنەخۆشەکانە لە بواری جەنگ و ڕووبەڕوو بوونەوەداو، بەو بۆنەیەش باسی هەڵگەڕاوان لە ئیسلام، بە هۆی کەین و بەینیانەوە لەگەڵ بوغزێنەرانی کتێبی دابەزێنراوی خوا (قورئان)ەوە و، باسی سەرەنجامی شوومیان لە کاتی سەرە مەرگ و گیانەڵادا، کراوەو، جەختکراوەتەوە لە سەر ئەوە کە خوا بڕواداران هەر تاقی دەکاتەوە، تاکو تێکۆشەران و خۆڕاگران لە مەیدان دا دەربکەون و، لە کەسانی ترسنۆک و دەغەڵ جوێ بنەوە.

﴿وَيَقُولُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَوْلَا نُزِّلَتْ سُورَةٌ ۖ فَإِذَآ أُنزِلَتْ سُورَةٌ مُّحْكَمَةٌ وَذُكِرَ فِيهَا ٱلْقِتَالُ ۙ رَأَيْتَ ٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ يَنظُرُونَ إِلَيْكَ نَظَرَ ٱلْمَغْشِىِّ عَلَيْهِ مِنَ ٱلْمَوْتِ ۖ فَأَوْلَىٰ لَهُمْ ﴿٢٠﴾ طَاعَةٌ وَقَوْلٌ مَّعْرُوفٌ ۚ فَإِذَا عَزَمَ ٱلْأَمْرُ فَلَوْ صَدَقُوا۟ ٱللَّهَ لَكَانَ خَيْرًا لَّهُمْ ﴿٢١﴾ فَهَلْ عَسَيْتُمْ إِن تَوَلَّيْتُمْ أَن تُفْسِدُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ وَتُقَطِّعُوٓا۟ أَرْحَامَكُمْ ﴿٢٢﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَعَنَهُمُ ٱللَّهُ فَأَصَمَّهُمْ وَأَعْمَىٰٓ أَبْصَٰرَهُمْ ﴿٢٣﴾ أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلْقُرْءَانَ أَمْ عَلَىٰ قُلُوبٍ أَقْفَالُهَآ ﴿٢٤﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱرْتَدُّوا۟ عَلَىٰٓ أَدْبَٰرِهِم مِّنۢ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ ٱلْهُدَى ۙ ٱلشَّيْطَٰنُ سَوَّلَ لَهُمْ وَأَمْلَىٰ لَهُمْ ﴿٢٥﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَالُوا۟ لِلَّذِينَ كَرِهُوا۟ مَا نَزَّلَ ٱللَّهُ سَنُطِيعُكُمْ فِى بَعْضِ ٱلْأَمْرِ ۖ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ إِسْرَارَهُمْ ﴿٢٦﴾ فَكَيْفَ إِذَا تَوَفَّتْهُمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ يَضْرِبُونَ وُجُوهَهُمْ وَأَدْبَٰرَهُمْ ﴿٢٧﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمُ ٱتَّبَعُوا۟ مَآ أَسْخَطَ ٱللَّهَ وَكَرِهُوا۟ رِضْوَٰنَهُۥ فَأَحْبَطَ أَعْمَٰلَهُمْ ﴿٢٨﴾ أَمْ حَسِبَ ٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ أَن لَّن يُخْرِجَ ٱللَّهُ أَضْغَٰنَهُمْ ﴿٢٩﴾ وَلَوْ نَشَآءُ لَأَرَيْنَٰكَهُمْ فَلَعَرَفْتَهُم بِسِيمَٰهُمْ ۚ وَلَتَعْرِفَنَّهُمْ فِى لَحْنِ ٱلْقَوْلِ ۚ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ أَعْمَٰلَكُمْ ﴿٣٠﴾ وَلَنَبْلُوَنَّكُمْ حَتَّىٰ نَعْلَمَ ٱلْمُجَٰهِدِينَ مِنكُمْ وَٱلصَّٰبِرِينَ وَنَبْلُوَا۟ أَخْبَارَكُمْ ﴿٣١﴾﴾.

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{هەروەها ئەوانەی بڕوایان هێناوە دەڵێن: خۆزگە سووڕەتێک دابەزیبایە (فەرمانی تێدا بە جەنگ کرابایە)، ئنجا کاتێک سووڕەتێکی مەحکەم (و مانا ڕۆشن) دابەزیی و، باسی جەنگی تێدا کرا، ئەوانەی دڵیان نەخۆشیی تێدایە، دەیانبینی (لە ترس و حەژمەتان) وەک لە هۆش خۆ چوو لە بیمی مردن (بە چاو ئەبڵەقیی) تەماشات دەکەن! دەجا سزای هەرە سەخت بۆ ئەوان ﴿٢٠﴾ (دەبووایە) فەرمانبەریی و قسەیەکی پەسند (بکەنە پیشە)، ئنجا هەر کات کار گەیشتە قایمە، ئەگەر لەگەڵ خوادا ڕاستیان کردبایە، بۆ وان باشتر بوو ﴿٢١﴾ (ئەی دڵنەخۆشینە!) ئایا نیزیک نیە کە پشتتان هەڵکرد(و ڕووتان لە ئیسلام وەرگێڕا) تێکدان و خراپەکاریی بکەن لە زەویداو، پەیوەندییەکانی خزمایەتییتان بپچڕن! ﴿٢٢﴾ ئا ئەوانە کەسانێکن خوا نەفرینی لێکردوون (سەرەنجام) کەڕی کردوون و چاوەکانیشیانی کوێر کردوون ﴿٢٣﴾ ئایا (ئەوانە) لە قورئانێ ڕانامێنن، یان دڵەکان (ی ئەوان) قفڵەکانی خۆیانیان لە سەرن؟ ﴿٢٤﴾ بێگومان ئەوانەی دوای ئەوەی ڕێی ڕاستیان بۆ ئاشکرا بووە، پاشەو پاش (بەرەو دواوەیان) هەڵگەڕاونەوە، شەیتان (ئەو ڕەفتارەی) بۆ جوانکردوون و ڕستی (هیوای خراپی) بۆ درێژ کردوون ﴿٢٥﴾ ئەویش بە هۆی ئەوەوە بە وانەیان گوت کە ئەوەی خوا دایبەزاندوە، دەیانـدزێ (کەیفیان پێی نایەت): لە هەندێک کاردا بە قسەتان دەکەین، خواش (قسەو ڕەفتار) پەنهانکردنەکەیان دەزانێ ﴿٢٦﴾ ئنجا ئایا (حاڵیان) چۆن دەبێ کاتێک فریشتەکان گیانیان دەکێشن؟ لە ڕوویان و لە پشتەوەیان دەدەن (زەبر لە هەموو جێیانیان دەسرەوێنن) ﴿٢٧﴾ ئەوەش لە سۆنگەی ئەوەوە شوێن ئەوە کەوتوون، کە خوای تووڕە کردوەو ڕەزامەندییەکەییان دزاوە، ئیدی ئەویش کردەوە (باشە) کانی هەڵوەشاندوونەوە ﴿٢٨﴾ بەڵکو ئایا ئەوانەی دڵیان نەخۆشیی تێدایە، پێیان

وایـە کـە هەرگیـز (خـوا) کینەکانیـان ئاشـکرا نـاکات (ناخاتـە گـۆڕێ)! ﴿٢٩﴾ (نـەک هـەر کینـەو بوغـزی دەروونیـان دەخەینـەڕوو) بەڵکـو ئەگـەر بمانـەوێ ئەوانـت پێشـان دەدەیـن و، بـە نیشـانە (و قیافە)یـان دەیانناسـی و، بـە دڵنیایـی بـە ئـاوازو شـێوازی قسـەش دەیانناسـی و، خـواش کردەوەکانتـان (هـی هەمـوو لایەکتـان) دەزانـێ ﴿٣٠﴾ مسـۆگەریش تاقیتـان دەکەینـەوە، تاکـو تێکۆشـەران لـە نێوتانـداو، خۆڕاگـران بزانیـن و، هـەواڵ (و هەڵوێست)ەکانیشـتان تاقـی بکەینـەوە ﴿٣١﴾}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(**سُورَةٌ مُّحۡكَمَةٌ**): واتـە: سـوورەتێکی مانـا ڕۆشـن، (**المُحْكَمُ: مَا لاَ يَعْرِضُ فِيهِ شُبْهَةٌ مِنْ حَيْثُ اللَّفْظِ، وَلاَ مِنْ حَيْثُ المعْنَى**)، (**مُحْكَم**): هـەر قسـەیەکە هیـچ شـوبهەو تـەم و مژێکـی نایەتـە سـەرێ، نـە لـە ڕووی بێژەکەیـەوە، نـە لـە ڕووی واتاکەیـەوە، مانـا ڕۆشـن.

(**ٱلۡمَغۡشِيِّ عَلَيۡهِ**): (**غَـشِيَ عَـلَى فُـلاَنٍ: إذَا نَابَـهُ مَـا غَـشِيَ فَهْمَـهُ**)، (**غَـشِيَ عَـلَى فُـلاَن**): ئەگـەر حاڵەتێکـی بەسـەردا هـات، کـە عەقڵـی داپۆشـێ، واتـە: بـێ هـۆش بـێ، یـان حاڵێکـی بەسـەردا بـێ، ئـەوەی بـۆی دەگوتـرێ، چـاک لێـی تـێ نـەگات، ﴿يَنظُرُونَ إِلَيۡكَ نَظَرَ ٱلۡمَغۡشِيِّ عَلَيۡهِ مِنَ ٱلۡمَوۡتِۖ﴾، بابایەکیـش کـە عەقڵـی دەپـۆشرێ و سەراسـیمە دەبـێ، چـاوی ئەبڵـەق دەبـن، بۆیـەش خـوا فەرموویـەتی: بـە چـاوی ئەبڵقـەوە تەماشـات دەکـەن.

(**فَأَوۡلَىٰ لَهُمۡ**): ئەمە دوو واتای هەن:

أ- (**أولى: أي أَنْفَعُ وَأَقْرَبُ لَهُم**)، بە سوودترو نیزیکترە بۆ ئەوان.

ب- ﴿فَأَوۡلَىٰ لَهُمۡ﴾: لە وەیلەوە هاتوە، واتە: سزای سەختتر بۆ ئەوان، وەک لە شوێنی دیکەدا، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿أَوۡلَىٰ لَكَ فَأَوۡلَىٰ ٣٤ ثُمَّ أَوۡلَىٰ لَكَ فَأَوۡلَىٰٓ ٣٥﴾ القيامة، کە بێگومان ئەوە هەڕەشەیە.

(**فَإِذَا عَزَمَ ٱلۡأَمۡرُ**): (**عَـزَمَ الأَمْـرُ، يَعْنِـي: إِذَا جَـدَّ الجِـدُّ**)، کـە کار گەیشـتە قایمـەو بـە کـردەوە شـتێک هاتـە پێـش، (**العَـزْمُ وَالعَزِيمَـة: عَقْـدُ القَلْـبِ عَـلَى إِمْضَـاءِ الأَمْـرِ**)، (**عَـزْم وعَزِيمَـة**): چەسـپاندنی دڵـە لەسـەر جێبەجێکردنـی کارێـک.

(**عَسَيۡتُمۡ**): (**عَسَى: طَمَعٌ وتَرَجٍّ**)، (**عسى**): بۆ ئومێدەوار بوون و، بە هیوا بوون بەکاردێ.

(**سَوَّلَ لَهُمۡ**): بـۆی جـوان کـردوون، بـۆی ڕازاندوونـەوە، (**التَّسْـوِيلُ: التَّزْيِـينُ، تَزْيِـينُ النَّفْـسِ لِـمَا تَحْـرِصُ عَلَيْـهِ**)، هەندێکیـش: ﴿سَوَّلَ لَهُمۡ﴾ یـان بـە: (**سَـهَّلَ لَهُـم**) مانـا کـردوە، واتـە: بـۆی ئاسـان و سـانا کـردوون، کـە بریتیـە: لـەوەی نەفـس شـتێکی زۆر حـەز لـێ بـێ، لـە پێـش چـاوی جـوان دەبـێ و ڕازاوە دەبـێ، بـا خراپیـش بـێ.

(**وَأَمۡلَىٰ لَهُمۡ**): (**الإِمْـلاَءُ: الإِمْـدَاد**)، ﴿وَأَمۡلَىٰ لَهُمۡ﴾، ڕسـتی بـۆ درێـژ کـردوون، یـان هاوکاریـی کـردوون، (**المُـدَّةُ الطَّوِيلَـة: مَـلاَوَةٌ مِـنَ الدَّهْـر**)، ماوەیەکـی درێـژ پێـی دەگوتـرێ: (**مَـلاَوَةٌ مِـنَ الدَّهْـر**)، لەبـەر ئـەوەی ماوەکـە درێـژ بۆتـەوە.

(**أَضۡغَٰنَهُمۡ**): (**جَمْـعُ ضِغْـن وَضَغَـنْ: الحِقْـدُ الشَّـدِيد**)، (**أَضْغَـان**): کـۆی (**ضِغْـن**)، یـان (**ضَغْـن**)ەو، هەردووکیـان بـە مانـای بوغـزو کینەیەکـی تونـد کـە لـە دڵـدا جێگیـر دەبێ.

(**بِسِيمَٰهُمۡ**): (**السِّـيْمِيَاءُ وَالسِّـيمَاء: العَلاَمَـة**)، (**سـيمياء وسِـيماء**)، هەردووکیـان بـە مانـای نیشـانە دێـن، واتـە: تـۆ بـە نیشـانەکانیان دەیانناسـی.

(**لَحۡنِ ٱلۡقَوۡلِ**): ئـاوازو شـێوازی قسـە، (**اللَّحْـنُ: صَرْفُ الـكَلاَمِ عَـنْ سَـنَنِهِ الجَـارِي**)، (**لَحْـن**): بریتیـە لـەوەی قسـە لـە ڕاسـتە ڕێـی خـۆی لا بـدرێ، (**أَلْحَـنُ بِحُجَّتِـهِ: أَلْسَـنُ وَأَفْصَـحُ**)، پێغەمبـەر ﷺ لـە فەرمایشـتێکیدا دەفەرمـوێ[1]: دوو کەسـتان دێـن بـۆ لای

---

(١) (أَنَّ أُمَّهَـا أُمَّ سَـلَمَةَ رَضِيَ اللَّـهُ عَنْهَـا زَوْجَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ أَخْبَرَتْهَـا، عَـنْ رَسُـولِ اللَّـهِ صَلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ، أَنَّـهُ سَـمِعَ خُصُومَـةً بِبَـابِ حُجْرَتِـهِ، فَخَـرَجَ إِلَيْهِـمْ فَقَـالَ : « إِنَّمَـا أَنَـا بَـشَرٌ، وَإِنَّـهُ يَأْتِينِـي الْخَصْـمُ، فَلَعَـلَّ بَعْضَكُـمْ أَنْ يَكُـونَ أَبْلَـغَ مِـنْ بَعْـضٍ، فَأَحْسِـبُ أَنَّـهُ صَـدَقَ، فَأَقْضِيَ لَـهُ بِذَلِـكَ، فَمَـنْ قَضَيْـتُ لَـهُ بِحَـقِّ مُسْـلِمٍ، فَإِنَّمَـا هِـيَ قِطْعَـةٌ مِـنَ النَّـارِ، فَلْيَأْخُذْهَـا أَوْ فَلْيَتْرُكْهَا)(أخرجـه البخـاري: ٢٣٣٦)

مـن، یەکێکتـان ڕەنگـە بەڵگەکـەی باشـترو چاکـتر بخاتـە ڕوو، واتـە: ڕۆشـنتر قسـە بـکات و، زمـان پاراوتـرو ڕەوانبێژتـر بـێ، بـا هەقیشـی نەبـێ، هەقـی پـێ دەدەم، بـا بزانـێ کـە ئـەو هەقـەی پێـی دەدەم لەبـەر ئـەوەی بـە ڕواڵـەت وادەزانـم لەسـەر هەقـە، لـە واقیعـدا نابێتـە هەقـی، بەڵکـو پارچەیەکـە لـە ئاگـر بـۆی دەبـڕم.

(وَنَبْلُوَا أَخْبَارَكُمْ): (بَـلاَهُ: جَرَّبَـهُ وَاخْتَـبَرَهُ)، (بَـلاَهُ) واتـە: تاقیکـردەوە، جەڕبانـدی، ﴿وَنَبْلُوَا أَخْبَارَكُمْ﴾، واتـە: هەواڵەکانتـان تاقیدەکەینـەوەو، دەجەڕبێنیـن.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

دوای ئـەوەی لـە ئایەتەکانـی پێشـوودا، خـوا ﷻ پێکـەوە بەرەنگاربوونـەوەی ئەهلـی ئیـمان و ئەهلـی کوفـرو، سـەرەنجامی بـاش و پـڕ خێـرو بەرەکەتـی ئەهلـی ئیـمان و، سـەرەنجامی پـڕ شـەرمەزاریی و ڕیسـوایی و مەینەتباریـی دنیـاو دواڕۆژی ئەهلـی کوفـری کـرد، هەروەهـا دوای ئـەوەی خـوا ﷻ باسـی پاداشـتی بڕوادارانـی کـرد، ئـەو بەهەشـتەی دەیچنـێ و، باسـی سـزای سـەختی بێبڕوایانـی کـرد.

دوایـی باسـی هەڵوێسـتی دڵنەخۆشـەکانی کـرد، کـە لـە کـۆڕو مەجلیسـی پێغەمبـەردا ﷺ بـە ڕواڵـەت بـاش گـوێ دەگـرن، بـەڵام دوایـی، یـان بـە توانـج و پـلارو گاڵتەپێکردنـەوە، یاخـود هـەر بـە ڕاسـتیی دەڵێـن: پێـش ئێسـتا چـی گـوت؟

پاشـان خـوا ﷻ هۆشـداریی دا بـە هەمـوو لایـەک، کـە ڕۆژی دوایـی نیزیکـە، بـە تایبەتـی قۆناغـی ئاخیـر زەمـان، چاوەڕێـی چـی دەکـەن! جگـە لـەوەی کـت و پـڕ بۆیـان بـێ، چونکـە هەنـدێ لـە نیشـانەکانی دەرکەوتـوون؟!

دواییـش فەرمانـی بـە پێغەمبـەری خاتـەم ﷺ کـرد، کـە زانیاریـی خـۆی زیاتـرو قووڵـتر بـکات، دەربـارەی بـە تەنیـا پەرسـتراوێتیی خـوا، یاخـود بـەردەوام بـێ لەسـەر

ئەو زانیارییە قووڵ و فراوانەی خۆی و، لە پشت ئەویشەوە فەرمانی بە ئۆممەتی پێغەمبەر ﷺ کرد، کە لە بارەی خوا بە یەکگرتن و تەنیا خوا پەرستییەوە، زانیاریی خۆیان زۆر بکەن و، فەرمانی بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ کرد، داوای لێبوردن بکات بۆ گوناهەکانی خۆی، کە بە نسبەت ئەوەوە هەڵەو کەم و کوڕیین، هەروەها بۆ گوناهی بڕواداران، لە پیاوان و ئافرەتان، داوای لێبوردن لە خوا بکات.

دوای ئەوە، خوا ﷻ باسی هەڵوێستی کەسانێکی دەغەڵ و دڵنەخۆش دەکات، کە چۆن لە حاڵێکدا بڕواداران خوا خوایانەو بە تامەزرۆییەوە، چاوەڕێن سوورەتێکی تازە دابەزێ، یان چەند ئایەتێک دابەزن و، باسی ئەرکێکی دیکەی شەرعییان تێدابێ، بە تایبەت بەرەنگاربوونەوە لەگەڵ ئەهلی کوفرداو جەنگ و فیداکاریی، کەچی ئەوان کاتێک سوورەتێکی وا دادەبەزێ، چاویان ئەبڵەق دەبن لە ترس و بیم! خواش ﷻ ڕوویان تێدەکات و بە پرسیارکردنەوە دەفەرموێ: ئەگەر ئێوە پشتی تێبکەن و پشت هەڵبکەن، سەرەنجام خراپەکاریی دەکەن لە زەویداو، پەیوەندییە خزمایەتییەکان دەپچڕێنن.

پاشان باسی هەڵوێستی نەرێنییان لە بەرانبەر قورئاندا دەکات کە: بۆچی لێی ورد نابنەوە، یاخود دڵیان قفڵی لێ دراوە!

دوایی باسی ئەوەیە، کە چۆن کەین و بەینیان هەیە، لەگەڵ ئەهلی کوفردا، پاشان ئەوانە سەرەنجامیان چۆن دەبێ لە کاتێکدا فریشتەکان گیانیان دەکێشن، باسی هەموو ئەو مەسەلانە لەم دوازدە ئایەتە موبارەکەدا هەیە.

سەرەتا خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَيَقُولُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَوۡلَا نُزِّلَتۡ سُورَةٞ﴾، ئەوانەی بڕوایان هێناوە دەڵێن: خۆزگە سوورەتێک دابەزیبایە، ﴿لَوۡلَا﴾، لە ئەصڵدا بە مانای (هلا)یەو، بۆ هاندانە، واتە: دەبووایە، بەڵام بێگومان بڕواداران شت بۆ خوا پێشنیار ناکەن، بڵێن: دەبووایە وابێ و، دەبووایە وا نەبێ، کەواتە: لێرەدا ﴿لَوۡلَا﴾، مانای تەمەننا و خۆزگە خواستنی خراوەتە نێو، واتە: ئاوات

و خۆزگـە دەخـوازن، بـە تامەزرۆییـەوە دەڵێـن: خۆزگـە سـوورەتێک دابەزیبایـە، ئنجا ئـەو سـوورەتە کـە دابەزیبایـە چـۆن بووایـە؟ لـە دێـڕی دواییـدا دەریدەخـات کـە سـوورەتێکی مانـا ڕۆشـن بـێ و، باسـی جەنـگ و جیهـادو ڕووبەڕووبوونـەوەو فیداکاریـی تێدابـێ، ئنجـا لەبـەر ئـەوەی لـە ڕسـتەی دواییـدا، ئـەو وەسـف و پێناسـەیەی ئـەو سـوورەتە هاتـوە، لـە ڕستەی یەکـەم دا، خـوای کارزان و قسـەزان بـە پێویسـتی نەزانیـوە ئـەو وەسـف و پێناسـەیە بفەرمـوێ، بـەس دەفەرمـوێ: ئەوانـەی بـڕوادارن، گوتیـان: خۆزگـە سـوورەتێک دابەزیبایـە.

﴿ فَإِذَآ أُنزِلَتۡ سُورَةٞ مُّحۡكَمَةٞ وَذُكِرَ فِيهَا ٱلۡقِتَالُ ﴾، ئنجـا هـەر کاتێـک سـوورەتێکی موحکـەم، واتـە: ڕۆشـن و پتـەو لـە ڕووی بێـژەو واتـاوە، کـە هیـچ درزو کەلێنـی تێـدا نەبـێ، یاخـود لێڵییـەک لـە مانـاو بیژەکەیـدا نەبـێ، دابەزێـنرا ﴿ وَذُكِرَ فِيهَا ٱلۡقِتَالُ ﴾، باسـی جەنگیشـی تێـدا کـرا.

ئەگـەر سـوورەتێکی ئـاوا دابـەزێ، ﴿ رَأَيۡتَ ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٞ ﴾، ئەوانـە دەبینـی کـە دڵیـان نەخۆشـیی تێدایـە، ئـەم تەعبیـرە خـوای پەنهانـزان بـۆ مونافیقەکانـی بەکارهێنـاوە، وشـەی (المنافقـون) هاتـوە لـە قورئانداو، ئەم وشـەیەش هاتـوە، وا پێدەچێ مونافیقـەکان ئەوانـە بـن، بـە تەواویـی نیفـاق لـە دڵ و دەروونیانـدا جێگیـر بـووەو، سـەرتاپای بوونیانـی داگرتـوە، بـەڵام ئەوانـەی دیکـە، نەگەیونـە ئـەو ڕادەیـە، چونکـە خـوا ﷻ لـە یـەک سـیاقدا باسـی هەردووکیـان دەکات، بـۆ وێنـە لـە سـوورەتی (الأنفـال) دا، دەفەرمـوێ: ﴿ إِذۡ يَقُولُ ٱلۡمُنَٰفِقُونَ وَٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ غَرَّ هَٰٓؤُلَآءِ دِينُهُمۡۗ وَمَن يَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱللَّهِ فَإِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٞ ﴿٤٩﴾ ﴾، واتـە: کاتێـک کـە مونافیقـەکان و ئەوانـەی دڵیـان نەخۆشـیی تێدایـە، دەڵێـن: ئەوانـە ئایینەکەیـان هەڵیخەڵەتانـدوون، هـەر کەسـیش پشـت بـە خـوا ببەسـتێ، بـە دڵنیایـی خـوا زاڵـی کارزانـە.

کەواتـە: ئەوانـە دوو جـۆرە کەسـی موخەننـەت و دەغەڵـن، بـەڵام لێـک جیـان، ئنجـا لێـرەدا خـوا ﷻ باسـی ئەوانەیـان دەکات کـە دڵ و دەروونیـان نەخۆشـیی

نیفاقی چۆتەتێ، بەڵام مەرج نیە سەرتاپای بوونی داگرتبن، وەک چۆن کەسێ تووشی نەخۆشییەک دەبێ، بەڵام جارێ تەشەنەی نەکردوە، کە هەموو بوونی داگرتبێ، دەگونجێ ئاسانتر چارەسەر بکرێ، ئەوانەیان کە دڵیان نەخۆشیی تێدایە، دەیانبینی: ﴿يَنظُرُونَ إِلَيْكَ نَظَرَ الْمَغْشِيِّ عَلَيْهِ مِنَ الْمَوْتِ﴾، تەماشات دەکەن، سەرنجت دەدەن، وەک تەماشاکردنی کەسێک بە هۆی مردنەوە، بێهۆشیی بەسەردا هاتبێ، واتە: کەوتۆتە حاڵی خۆی و لە گیانەڵا دایە، چاوەکانی ئەبڵەق بوون، بە چاوی ئەبڵەق و سەراسیمەیی تەماشات دەکەن، هێندە دەترسێن، لەبەر ئەوەی خۆیان بە مسوڵمان لە قەڵەم دەدەن و، مسوڵمانانیش مولزەم کراون لەم سوورەتەدا کە جەنگ و فیداکاریی بکەن، ئەوان لە ترسان چاویان ئەبڵەق بوون، بە سەراسیمەیی تەماشات دەکەن، ﴿فَأَوْلَىٰ لَهُمْ﴾، سزای هەرە سەخت بۆ ئەوان، ﴿طَاعَةٌ وَقَوْلٌ مَّعْرُوفٌ﴾، دەبووایە پیشەی ئەوان فەرمانبەریی و قسەی پەسند بێ، ﴿فَإِذَا عَزَمَ الْأَمْرُ﴾، ئنجا کاتێک کارەکە دەچەسپێ، کار دەگاتە قایمە، واتە: (إذَا جَدَّ الجِدُّ)، کاتێک ئەو ئەرکەی خوا ﷻ دەیەوێ بە بڕوادارانی بسپێرێ، دەچەسپێ و بڕیاری لەسەر دەدرێ، ﴿فَلَوْ صَدَقُوا اللَّهَ لَكَانَ خَيْرًا لَّهُمْ﴾، ئەگەر لەگەڵ خوادا ڕاستییان کردبایە، بۆ ئەوان باشتر بوو، لەگەڵ خوادا ڕاستیان کردبایە، کە دەڵێن: ئێمە بڕواداریـن و دەڵێن: ئێمە خوای پەروەردگارمان لە خۆمان و، لە هەرچی هەمانە خۆشتر دەوێ، دوای خواش ﷻ پێغەمبەری خوا ﷺ هێندەو هێندە خۆشمان دەوێ! ئەگەر لەو قسانەدا لەگەڵ خوادا ڕاستیان کردبایە، بۆ ئەوان باشتر بوو.

﴿فَهَلْ عَسَيْتُمْ إِن تَوَلَّيْتُمْ﴾، ئایا نیزیکەو لەوانەیە، کە ئێوە پشت بکەنە ئیسلام! ﴿أَن تُفْسِدُوا فِي الْأَرْضِ﴾، کە خراپەکاریی بکەن لە زەویدا، تێکدان بکەن، ﴿وَتُقَطِّعُوا أَرْحَامَكُمْ﴾، پەیوەندییە خزمایەتییەکانیشتان بپچڕێنن!

واتایەکی دیکەی: ﴿فَهَلْ عَسَيْتُمْ إِن تَوَلَّيْتُمْ﴾، ئایا نیزیکە ئەگەر ئێوە کارتان پێ سپێردرا، بوونە حوکمڕان و کاربەدەست بەهۆی ئەو حوکمڕانیی و کاربەدەستییەوە،

خراپەو تێکدان بکەن لە زەویداو پەیوەندییە خزمایەتییەکانتانیشتان بپچڕێنن، ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَعَنَهُمُ ٱللَّهُ ﴾، ئا ئەوانە کەسانێکن، خوا ﷻ نەفرینی لێکردوون، واتە: دووری خستوونەتەوە لە ڕەحمەتی خۆی، ﴿ فَأَصَمَّهُمْ وَأَعْمَىٰٓ أَبْصَٰرَهُمْ ﴾، ئنجا کەڕی کردوون و چاوەکانیشیانی کوێر کردوون.

یانی: خوا ﷻ لە بەزەیی خۆی دووری خستوونەوە، بە هۆی ئەو کردەوانەیانەوە، واتە: خۆیان پشت لە ئیسلام دەکەن و، خواش لە بەزەیی خۆی دووری خستوونەوە، واتە: نەفرینەکەی خوا، کاردانەوەو دەرهاویشتەی دوورکەوتنەوەی خۆیان و پشتکردنە ئیسلامی خۆیانە، هەروەها دەرهاویشتەی تێکدانی ئەوانە لە زەویداو، پچڕاندنی پەیوەندییە خزمایەتییەکانیانە، بۆیە خوا ﷻ نەفرینی لێکردوون، ئنجا لە ئەنجامی نەفرین لێکراندا: ﴿ فَأَصَمَّهُمْ وَأَعْمَىٰٓ أَبْصَٰرَهُمْ ﴾، کەڕی کردوون و، چاوەکانیشیانی کوێر کردوون، واتە: هەستەوەرەکانی وا لێکردوون کار نەکەن و، گوێیان هەق نەبیستێ و، چاویان هەق نەبینێ و، عەقڵ و دڵیان هەق نەفامێ.

﴿ أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلْقُرْءَانَ أَمْ عَلَىٰ قُلُوبٍ أَقْفَالُهَآ ﴾، ئایا لە قورئانێوە ڕانامێنن؟ یاخود دڵانێک قفڵەکانی خۆیانیان لێدراون، ﴿ قُلُوبٍ ﴾، بە نەزانراو **(نكرة)** هاتوە، واتە: دڵانێکی پیسی پشت لە خوا، قوفڵەکانی خۆیانیان لێدراون، ئەو قوفڵانەی شایستەی ئەوانن، لێیان دراون، بۆیە لە قورئان تێ ناگەن، ئایا لە قورئان ڕانامێنن؟ یان لێی ڕادەمێنن، بەڵام دڵەکانی ئەوان دڵانێکن، قوفڵیان لێدراون و، لە بەرانبەر هیدایەت و فەرمایشتی خوادا، گاڵە دراون و داخراون؟!.

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱرْتَدُّواْ عَلَىٰٓ أَدْبَٰرِهِم ﴾، بە دڵنیایی ئەوانەی لەسەر پاشوانیان هەڵگەڕاونەوە، پاشەو پاش هەڵگەڕاونەوە، **(أدبار)**، کۆی **(دُبُر)**ە، یانی: پاشەوەی مرۆڤ، پشتی، واتە: پاشەو پاش هەڵگەڕاونەوە، ﴿ مِّنۢ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ ٱلْهُدَى ﴾، دوای ئەوەی ڕێنماییان بۆ ڕۆشن بۆتەوە، ڕێی ڕاستیان بۆ ڕۆشن بۆتەوە، ئەوانە چۆنن؟ ﴿ ٱلشَّيْطَٰنُ سَوَّلَ لَهُمْ وَأَمْلَىٰ لَهُمْ ﴾، ئەوانە شەیتان بۆی جوان کردوون،

ڕستی هیـوای نـاڕەوای بـۆ درێـژ کـردوون، ئـەو هیـواو ئاواتانەی ناشـەرعیین، شـەیتان ڕستی هیـوای بـۆ درێـژ کـردوون و، خراپەشـی بـۆ زیـاد کـردوون.

ئنجـا لـە ئەنجامـی چییـدا، شـەیتان ئـاوا زەفـەری پـێ بـردوون؟ ﴿ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَالُواْ ﴾، ئـەوەش بـە هـۆی ئـەوەوە کـە گوتیـان: ﴿ لِلَّذِينَ كَرِهُواْ مَا نَزَّلَ ٱللَّهُ ﴾، بەوانـەی ئەوەیـان دەدزێ کـە خـوا دایبەزانـدووە، ڕقیـان لـەوە هەڵدەسـتێ کـە خـوا دایبەزانـدوە، کـە قورئانـە، پێیـان گوتـن: ﴿ سَنُطِيعُكُمْ فِي بَعْضِ ٱلْأَمْرِ ﴾، ئێمـە لـە مـەودوا لـە هەنـدێ لـە کاروبـاردا فەرمانبەرییتـان دەکەیـن، گوێڕایەڵییتـان دەکەیـن، ﴿ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ إِسْرَارَهُمْ ﴾، خـواش قسـە پەنهانکردنـی ئـەوان و، ڕەفتـار پەنهانکردنـی ئـەوان دەزانـێ، هەڵبەتـە ئەمـە خوێندراویشـەتەوە: (أَسْرَارَهُـمْ)، واتـە: خـوا پەنهانەکانیـان دەزانـێ.

﴿ فَكَيْفَ إِذَا تَوَفَّتْهُمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ يَضْرِبُونَ وُجُوهَهُمْ وَأَدْبَٰرَهُمْ ﴾، واتـە: حاڵیـان چۆن دەبـێ کاتێـک فریشـتەکان گیانیـان دەکێشـن و، لـە دەم و چاویـان و لـە پشتەوەشـیان دەدەن؟ دەشـگونجێ مەبەسـت ئـەوە بـێ کـە لـە هەمـوو جەسـتەیان دەسرەوێنـن، زەبریـان تـێ دەسرەوێنـن، لـە هەمـوو لایانیـان دەدەن.

ئەگـەر مەبەسـتیش ڕوویـان و پشـتەوەیان بـێ، یـانی: لـە دەم و چاویـان دەدەن، چونکـە بـەرەو کوفـرو نیفـاق ڕۆیشـتوون و، لـە پشـتەوەیان دەدەن، چونکـە پشـتیان لـە ئیسـلام و هیدایەتـی خـوا کـردوە.

﴿ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمُ ٱتَّبَعُواْ مَآ أَسْخَطَ ٱللَّهَ وَكَرِهُواْ رِضْوَٰنَهُۥ ﴾، ئـەوەش بەهـۆی ئـەوەوە کـە شـوێن ئـەوە کەوتـوون، خـوای تـووڕە کـردوەو، ڕەزامەندیـی خواشـیان دزاوە، واتـە: ڕەزامەندیـی خوایـان ڕق لـێ بۆتـەوەو کەیفیـان پـێ نەهاتوە، ﴿ فَأَحْبَطَ أَعْمَٰلَهُمْ ﴾، خـواش ﷻ کردەوەکانـی هەڵوەشـاندوونەوەو، پووچـەڵ کردوونـەوە، واتـە: کـردەوە باشـەکانی کـە ئەنجامیـان داون، لەبـەر ئـەوەی ئیمانیـان تێـدا نیـە، وەک شـیری بـێ هەوێـن، چـۆن دەترشـێ و هەڵدەبزرکـێ، خـوا کردەوەکانـی هەڵوەشـاندوونەوە، لەبـەر ئـەوەی هەوێـن و جەوهـەری ئیمانیـان تێـدا نیـە.

﴿ أَمْ حَسِبَ ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ أَن لَّن يُخْرِجَ ٱللَّهُ أَضْغَـٰنَهُمْ ﴾، ئایا ئەوانەی دڵیان نەخۆشیی تێدایە، پێیان وایە خوا کینەو بوغزەکانیان ئاشکرا ناکات و دەرناهێنێ؟ ئایا پێیان وایە هیچکەس نایانناسێ و تێیان ناگات؟ ئایا پێیان وایە دەگونجێ هەروا دیزە بە دەرخۆنە بکەن، لەو هەموو کینەو بوغزەی لە دڵیاندا هەیە، بەرانبەر بە مسوڵمانان؟ واتە: ئەگەر وا بیر بکەنەوە، بە هەڵە داچوون، پرسیارکردنەکە پرسیارکردنی نکووڵیلێکەرانەیە.

﴿ وَلَوْ نَشَآءُ لَأَرَيْنَـٰكَهُمْ ﴾، نەک هەر کینەو بوغزو ڕقی نێو دڵیان دەردەخەین و دەیخەینە گۆڕێ، بۆ ئەوەی مسوڵمانان بیانناسن، تاکو سەرەنجام لە خراپەکارییان پارێزراو بن، بەڵکو ئەگەر ویستبامان ئەوانمان پێشانی تۆ دەدات، ﴿ فَلَعَرَفْتَهُم بِسِيمَـٰهُمْ ﴾، تۆش بە نیشانەو قیافەی خۆیان دەتناسین، ﴿ وَلَتَعْرِفَنَّهُمْ فِي لَحْنِ ٱلْقَوْلِ ﴾، بە دڵنیاییەوە ئەگەر پێشانیشت نەدەین، بە هۆی ئاوازو شێوازی قسە کردنیانەوە، دەیانناسی، ﴿ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ أَعْمَـٰلَكُمْ ﴾، خواش کردەوەکانتان دەزانێ، هی هەموو لایەکتان بە چاک و خراپەوە.

لە کۆتاییدا خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَلَنَبْلُوَنَّكُمْ ﴾، بە دڵنیایی و بە جەختکردنەوە تاقیتان دەکەینەوە، ﴿ حَتَّىٰ نَعْلَمَ ٱلْمُجَـٰهِدِينَ مِنكُمْ وَٱلصَّـٰبِرِينَ وَنَبْلُوَا۟ أَخْبَارَكُمْ ﴾، تاکو تێکۆشەران لە ئێوەو خۆڕاگرانتان بزانین، ﴿ وَنَبْلُوَا۟ أَخْبَارَكُمْ ﴾، هەروەها هەواڵ و دەنگ و باسەکانتان تاقی بکەینەوە، واتە: ئەو هەواڵانەی دەیاندەن و دەڵێن: ئێمە ئیمانمان بە خواو بە ئیسلام هەیە، ئنجا چ ڕاست بکەن، وەک ئەهلی ئیمان، چ درۆ بکەن، وەک ئەهلی نیفاق، خوا ﷻ ئەو هەواڵانەی دەیاندەن، تاقییان دەکاتەوە، کام هەواڵە ڕاستەو کام هەواڵ ڕاست نیە؟

یاخود: ﴿ وَنَبْلُوَا۟ أَخْبَارَكُمْ ﴾، هەواڵ و دەنگ و باسی ئێوە ڕوون دەکەینەوە، وەک لە سوورەتی (**یونس**)دا دەفەرموێ: ﴿ تَبْلُوا۟ كُلُّ نَفْسٍ مَّآ أَسْلَفَتْ ﴾، ئەمڕۆ هەر کەسێک چی پێشخستوە، بۆی دەردەکەوێ و ڕوون دەبێتەوە، چونکە شت کە

تاقـی دەکرێتـەوە، ڕوون دەبێتـەوە، ئەگەرنـا (**بَـلاَء و بَلْـو**)، بـە مانـای تاقییکردنـەوە دێ، بـەڵام لـە ئەنجامـی تاقییکردنـەوەدا، شـت دەردەکـەوێ.

کەواتـە: ﴿ وَنَبْلُوَاْ أَخْبَارَكُمْ ﴾، واتـە: هەواڵەکانتـان ڕادەگەیەنیـن چیتـان کـردوەو چۆنتـان کـردوە؟ بـەڵام مـن ئـەو واتایەشـم لێگـرت، کـە دەگونجـێ مەبەسـت پێـی ئـەو قسـەو هەڵوێسـتانەی ئـەوان بـێ، کـە وەک هەواڵێـک لـە خۆیانیـان دەردەخـەن، خـوا ﷻ لـە ئەنجامـی هەڵوێستەکانیاندا، هەواڵەکانیشـیان دەجەڕبێنـێ و، دەریدەخـات، داخـۆ هەواڵـی کامیـان کـە لـە بـارەی خۆیـەوە دەیـدات، ڕاسـتەو، کامیشـیان هەواڵەکـەی ڕاسـت نیـەو درۆیـە؟

# مەسەلە گرنگەکان

## مەسەلەی یەکەم:

بڕواداران خوازیاری دابەزینی سوورەتێکن، کە باسی جەنگ و جیهادی تێدا بکرێ، کەچی کاتێک سوورەتێکی مانا ڕۆشن لەو بارەوە دادەبەزێ، دڵنەخۆشان لە ترس و حەژمەتان چاویان ئەبڵەق دەبن، لە حاڵێکدا فەرمانبەریی و، قسەی پەسندو، لە کاتی کار گەیشتنە قایمەشدا، ڕاستکردن لەگەڵ خوادا، بۆ وان باشتر بوو، نیزیکیشە ئەو جۆرە کەسانە لە کاتی پشت هەڵکردندا (یان کاربەدەست بووندا)، مل بدەنە خراپەکاریی و پچڕاندنی پەیوەندیی خزمایەتیی، کە بێگومان ئەوانە نەفرین لێکراوی خواو، کەڕو کوێر کراو دەبن، ئنجا ئایا ئەوانە لە قورئانێ ڕانامێنن، یاخود دڵیان قفڵ دراوەو گاڵە دراوە؟:

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَيَقُولُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَوۡلَا نُزِّلَتۡ سُورَةٞۖ فَإِذَآ أُنزِلَتۡ سُورَةٞ مُّحۡكَمَةٞ وَذُكِرَ فِيهَا ٱلۡقِتَالُ رَأَيۡتَ ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٞ يَنظُرُونَ إِلَيۡكَ نَظَرَ ٱلۡمَغۡشِيِّ عَلَيۡهِ مِنَ ٱلۡمَوۡتِۖ فَأَوۡلَىٰ لَهُمۡ ۝٢٠ طَاعَةٞ وَقَوۡلٞ مَّعۡرُوفٞۚ فَإِذَا عَزَمَ ٱلۡأَمۡرُ فَلَوۡ صَدَقُواْ ٱللَّهَ لَكَانَ خَيۡرٗا لَّهُمۡ ۝٢١ فَهَلۡ عَسَيۡتُمۡ إِن تَوَلَّيۡتُمۡ أَن تُفۡسِدُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَتُقَطِّعُوٓاْ أَرۡحَامَكُمۡ ۝٢٢ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَعَنَهُمُ ٱللَّهُ فَأَصَمَّهُمۡ وَأَعۡمَىٰٓ أَبۡصَٰرَهُمۡ ۝٢٣ أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلۡقُرۡءَانَ أَمۡ عَلَىٰ قُلُوبٍ أَقۡفَالُهَآ ۝٢٤﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە یازدە بڕگەدا:

١)- ﴿وَيَقُولُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَوۡلَا نُزِّلَتۡ سُورَةٞ﴾، واتە: ئەوانەی بڕوایان هێناوە، دەڵێن: خۆزگە سوورەتێک دابەزیبایە، (لَولَا للتَّحْضِيْضِ، وَهُنَا بِمَعْنَى التَّمَنِّي)، هەرچەندە (لَوْلا)

لە بنەڕەت دا بۆ هاندانە، بەڵام لێرەدا بە مانای خۆزگە خواستنە، کە دەفەرموێ: ﴿لَوْلَا نُزِّلَتْ سُورَةٌ﴾، واتە: دەبوایە، یان خۆزگە سوورەتێک دابەزیبایە، سەرەتا سوورەتەکە باس نەکراوە چۆن بێ، بەڵام دوایی خوا ﷻ باسیکردوە، (**حُذِفَ وَصفُ السُّورَةِ فِي قَوْلِهِم لِدَلَالَةِ مَا بَعْدَهُ عَلَيْهِ**)، بۆیە لە باسی ئەواندا کە خۆزگەیان خواستوەو سوورەتێک دابەزێ، وەسفەکەی قرتێندراوە، چونکە ڕستەی دوایی دەیگەیێنێ.

٢)- ﴿فَإِذَآ أُنزِلَتْ سُورَةٌ مُّحْكَمَةٌ وَذُكِرَ فِيهَا ٱلْقِتَالُ﴾، هەر کاتێک سوورەتێکی موحکەم، واتە: مانای ئایەتەکانی ڕۆشن بێ و، هیچ مانای دیکە هەڵنەگرێ، تەم و مژ نە بەسەر بێژەکانیەوە هەبێ، نە بەسەر واتاکانیەوەو، ڕۆشن و مەحکەم و قایم، باسی جەنگیشی تێدا بکرێ، کاتێک سوورەتێکی وا دابەزی:

٣)- ﴿رَأَيْتَ ٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ﴾، ئەوانەی دڵیان نەخۆشیی تێدایە، دەیانبینی، دڵیان نەخۆشیی تێدایە، واتە: کوفر لە دڵی خۆیاندا پەنهان دەکەن، خوا ﷻ لێرەدا کوفری وەک نەخۆشیی داناوەو، کە لە دڵ و دەروونی مرۆڤ دەدات، بۆیە خوا ﷻ بەم تەعبیرە ناساندوونی و نەیفەرمووە: (**رَأَيْتَ المُنَافِقِينَ، رَأَيْتَ الَّذِينَ نَافَقُوا**)، بۆیەش وایفەرمووە، چونکە دیارە ئەو نەخۆشیی کوفرو نیفاقە، تەواو لە دڵیاندا نەچەسپاوە، کە سەرتاپای بوونیان دابگرێ، بەڵکو لە دڵی داون و دڵی نەخۆش کردوون، یان لەبەر ئەوەی لەو سەرەتایەوە، چونکە ئەوانە لەگەڵ ئەهلی ئیماندا تێکەڵ بوون، خۆیان وا پێشان داوە، کە مسوڵمانن و مسوڵمانان کەمتر ناسیویانن و، دەرکیان کردوون، بۆیە بەو تەعبیرە هێناویەتی، بەڵام دواتر لەساڵانی دواتردا حاڵەتی نیفاق زیاتر بوو و، ئاشکرا بوو، بۆیە خوای پەروەردگار لەو بارەوە سوورەتێکی دابەزاند بە ناوی: (**المنافقون**).

٤)- ﴿يَنظُرُونَ إِلَيْكَ نَظَرَ ٱلْمَغْشِىِّ عَلَيْهِ مِنَ ٱلْمَوْتِ﴾، تەماشات دەکەن وەک تەماشاکردنی کەسێک، بە هۆی مردنەوە بێهۆشیی بەسەردا هاتوە،

﴿ٱلْمَغْشِىِّ عَلَيْهِ مِنَ ٱلْمَوْتِ﴾، (**المُحْتَضَرِ الَّذِي يُغْشَى عَلَيْهِ، عَلَى فَهْمِهِ**)، ئەو کەسەی لە گیانەڵادایەو بێ هۆشیی بەسەر عەقڵ و هۆشییدا هاتوە.

یاخـود: ﴿ نَظَرَ ٱلْمَغْشِيِّ عَلَيْهِ مِنَ ٱلْمَوْتِ ﴾، (يَعْنِـي: يَنْظُـرونَ إِلَيْـكَ نَظَـرَ المُتَحـيِّرِ بِحَيْـثُ يَتَّجِـهُ إِلى صَـوبٍ وَاحِـد)، وەک بابایەکـی سەراسـیمە کـە چـاو تەنیـا لەسـەر یـەک شـوێن چـڕ دادەگـرێ، ئـاوا تەماشـات دەکـەن.

هەڵبەتــە لێــرەدا خــوا ﷻ دەفەرمــوێ: ﴿ فَإِذَآ أُنزِلَتْ سُورَةٌ مُّحْكَمَةٌ وَذُكِرَ فِيهَا ٱلْقِتَالُ ﴾، هـەر کاتێـک سـوورەتێکی مانـا ڕۆشـن دابـەزی و باسـی جەنگـی تێـدا کـرا، واتـە، سـوورەتەکە تەنیـا باسـی جەنـگ و جیهـاد نیـە، بەڵکـو لـە نێـو مەبەسـتەکاندا کـە تێیـدا هاتـوون، باسـی جەنـگ و جیهادیـش هاتـوە، ئەوانـە بـەو جـۆرە تەماشـات دەکـەن، دیـارە لـە تـرس و حەژمەتـان، چونکـە ئەوانـە دەزانن کـە خۆیان بە مسـوڵمان لـە قەڵـەم داوەو، دەشـزانن ئـەو سـوورەتەی باسـی جەنـگ و جیهـادو فیداکاریـی دەکات، مسـوڵمانانی پێـوە پابەنـد دەکرێـن، ئەوانیـش تـازە لـە نێـو مسـوڵماناندا خۆیـان گرفتـار دەکـەن، بـە ئـەو ئەرکـەوە، دەشترسێن لـە ئەنجامدانـی ئـەو ئەرکـە، بۆیـە چاویـان ئەبڵـەق دەبـن لـە ترسـان، وەک بابایـەک لـە کاتـی گیانـەڵادا بـێ، چۆن چـاوی ئەبڵـەق دەبـێ، چـاو ناترووکێنـێ، ئەوانیـش بـەو شـێوەیان لـێ دێ، بۆیـە خـوا ﷻ دەفەرمـوێ:

٥)- ﴿ فَأَوْلَىٰ لَهُمْ ﴾، (ئەمە هەڕەشەیە)، سزای هەرە سەخت بۆ وان، هەندێک گوتوویانە: ئەمە ڕێژگەی هەڵبژاردن (**صيغة التفضيل**)ە، لە (**وَيل**)، کە بە مانای (سزا) یە، واتە: سزای سەختتر بۆ ئەوان، یاخود: (**أَولَى لَهُم: قَارَنَهُم وَقَرُبَ مِنْهُم مَا يَكْرَهُون**)، واتە: لەگەڵیان بێ و لێیان نزیک بێ، ئەوەی ئەوان پێیان ناخۆشەو کەیفیان پێی نایەت، کە بریتیە لە سزا.

٦)- ﴿ طَاعَةٌ وَقَوْلٌ مَّعْرُوفٌ ﴾، فەرمانبەرییەک و قسەیەکی پەسند، ﴿ طَاعَةٌ وَقَوْلٌ مَّعْرُوفٌ ﴾، لە ڕووی ڕێزمانییەوە بە نیهاد (**مبتدأ**) دادەنرێ، ئەدی گوزارە (**خبر**)کەی چییە؟ قرتێندراوە، واتە: (**طَاعَةٌ وقَولٌ مَعروفٌ خَيرٌ لَهُم**)، فەرمانبەرییەک و قسەیەکی پەسند، باشتر بوو بۆ ئەوان.

دەشـگونجێ: ﴿طَاعَةٌ وَقَوْلٌ مَّعْرُوفٌ﴾، گـوزارە (خـبر) بـێ، نیهـاد (**مبتدأ**)ەکـەی قرتێنـدرا بـێ، یانـی: (**الأَمْرُ: طَاعَـةٌ وقَـولٌ مَعـروفٌ**)، واتـە: کاری ڕاسـت، فەرمانبەریـی و قسـەی پەسـندو باشـە، ئەگـەر ویسـتبایان بـە مسـوڵمانی ڕەشـیدو عاقـڵ لـە قەڵـەم بدرێـن، دەبـوو ئـاوا بکـەن.

٧)- ﴿فَإِذَا عَزَمَ ٱلْأَمْرُ﴾، هەر کاتێک کار گەیشتە قایمە، ﴿عَزَمَ ٱلْأَمْرُ﴾، یانی: (**إذَا جَدَّ الجِدُّ**)، کار گەیشتە شوێنی خۆی و، هاتە سەر جێبەجێکردن و بڕیاری لەسەردرا.

(**إذَا**) زەرفێکـە بـۆ داهاتـوو، ﴿ٱلْأَمْرُ﴾، (أل)ەکـەی بـۆ ناسـاندنە، واتـە: کاری جەنـگ گەیشـتە قایمـە، یاخـود (أل)ەکـە قەرەبـووی پـاڵ وەلادراوە (**تعویـض عـن المضـاف إلیـه**)، ﴿فَإِذَا عَزَمَ ٱلْأَمْرُ﴾، (**أي: إذَا عَـزَمَ أمرهُـم**)، هـەر کات کارەکەیـان، (**أمـر القتـال**)، کاتێـک کاری جەنـگ بڕیـاری لەسـەر دراو، عەزمـی لەسـەر جـەزم کـرا.

٨)- ﴿فَلَوْ صَدَقُوا۟ ٱللَّهَ لَكَانَ خَيْرًا لَّهُمْ﴾، ئەگەر لەگەڵ خوادا ڕاستیان کردبایە، بۆ ئەوان باشتر بوو، ﴿فَلَوْ صَدَقُوا۟ ٱللَّهَ﴾، ئەمە وەڵامی (**إذا**)یە، چونکە (**إذا**)، لێرەدا مانای مەرجی خراوەتە نێوو وەک (**إن الشرطیة**) وایەو وەڵامی دەوێ، وەڵامەکەی ئەوەیە: ﴿فَلَوْ صَدَقُوا۟ ٱللَّهَ﴾، ئەگەر کاتێ کار گەیشتە قایمە، کاری جەنگ و جیهادو بڕیاری لەسەر درا، لەگەڵ خوادا ڕاستیان کردبایە، بۆ خۆیان باشتر بوو.

٩)- ﴿فَهَلْ عَسَيْتُمْ إِن تَوَلَّيْتُمْ﴾، ئایا نیزیکە ئەگەر پشتتان هەڵکرد: ﴿عَسَيْتُمْ﴾، خوێندراویشەتەوە: (**عَسِیتُمْ**)، نیزیکە، ڕەنگە ﴿إِن تَوَلَّيْتُمْ﴾، ئەگەر ئێوە پشتتان هەڵکرد، پشتتان کردە ئیسلام و پەیامی خوا.

١٠)- ﴿أَن تُفْسِدُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ﴾، [ئایا زۆر نزیک نیە، کە ئێوە پشتتان هەڵکرد]، تێکدان بکەن لە زەویدا؟!.

١١)- ﴿وَتُقَطِّعُوٓا۟ أَرْحَامَكُمْ﴾، هەروەها پەیوەندییە خزمایەتییەکانیشتان بپچڕێنن؟ ﴿وَتُقَطِّعُوٓا۟﴾، خوێنراویشەتەوە: (**تَقْطَعُوا**)، ﴿وَتُقَطِّعُوٓا۟﴾، یانی: زۆر بیپچڕێنن، (**تَقْطَعُوا**)،

یانی: بیپچڕێنن، یانی: زۆر ئەگەری هەیەو نیزیکە ئێوە سەرەنجام ئاوا بکەن، بە هۆی پشتکردنتانە ئیسلامەوە.

واتایەکی دیکەی: ﴿ تَوَلَّيۡتُمۡ ﴾، ئایا نیزیکە کە ئێوە ببنە حوکمڕان و، کاربەدەست، کارتان بکەوێتە دەست، خراپە کاریی بکەن لە زەویداو، پەیوەندییە خزمایەتییەکانیشتان بپچڕێنن، هەندێک لە توێژەرەوانیش ئەو مانایەیان لێ گرتوە، هەردووک مانایەکان دێن، بەڵام زیاتر وا پێ دەچێ مانای (**تَوَلَّيْتُمْ: أَعْرَضْتُم**)، واتە: پشتتان هەڵکردو، پشتتان کردە ئیسلام، ئەم مانایە زیاتر لەگەڵ ئەم ڕەوتەدا بگونجێ.

کە دەفەرموێ: ﴿ فَلَوۡ صَدَقُواْ ٱللَّهَ ﴾، ئەگەر قسەیەکی ڕاستیان لە خزمەت خوادا کردبایە، قسەی ڕاست (**صدق**)یش ئەوەیە پێکەڵپێک بێ و بچەسپێ لەگەڵ ئەوەی لە واقیعدا هەیە، واتە: ئەگەر لە قسەکەیاندا کە دەڵێن: بڕواداریـن ڕاستیان کردبایە، یان کە دەڵێن: ئێمە ئامادەی جەنگ و جیهادین لە پێناوی خوادا، ئەگەر ڕاستیان کردبایە، بۆ ئەوان باشتر بوو.

١٢)- ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَعَنَهُمُ ٱللَّهُ ﴾، ئەوانە کەسانێکن خوا ﷻ نەفرینی لێکردوون، ئەمە دوو ئەگەری هەن:

أ- دەگونجێ ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ﴾، ئەوانە بچێتەوە بۆ: ﴿ ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ ﴾، ئەوانەی دڵیان نەخۆشیی تێدایە، خوا ﷻ نەفرینی لێکردوون.

ب- دەشگونجێ بچێتەوە بۆ: ﴿ أَن تُفۡسِدُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَتُقَطِّعُوٓاْ أَرۡحَامَكُمۡ ﴾، (**أي: المُفسِدينَ فِي الأَرْضِ والقَاطِعينَ للرحِم**)، کەسانێک کە خراپە کاریی و تێکدان دەکەن لە زەویداو، پەیوەندییە خزمایەتییەکانیش دەپچڕێنن، خوا ﷻ نەفرینی لێکردوون و، لە بەزەیی خۆی دووری خستوونەوە.

لێرەدا کە خوا ﷻ کە دەفەرموێ: ئایا نزیکە ئەگەر ئێوە پشتتان هەڵکرد لە ئیسلام، سەرەنجام تێکدان بکەن لە زەویداو، پەیوەندییەکانتان بپچڕێنن؟

چونکە ئەم سوورەتە موبارەکە، هەندێک لە زانایان دەڵێن: پێش جەنگی ئوحود دابەزیوە، وەک هەواڵدان بەوەی کە لە جەنگی (ئوحود)دا مونافیق و دڵنەخۆشەکان بە قیادەی عەبدوڵڵای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلوول، پشت لە جەنگ و جیهاد دەکەن و، پێغەمبەری خوا ﷺ، لەو تەنگانەیەدا پشت بەردەدەن، دەگونجێ ئەوە هەواڵدان بێ بە نادیارو، دەشگونجێ هەواڵدان بێ بە واقیع، کە ئێوە واتان کرد، ئەگەر ئەمە لە گەرمە گەرمی جەنگی ئوحودو لەو کاتی ڕووبەڕوو بوونەوانەدا دابەزیبێ.

شایانی باسە: هەندێک لە زانایان گوتوویانە: لێرەدا خوا ﷻ ئاماژەی کردوە بە ئومەوییەکان و عەبباسییەکان کە دوایی لە بەینی خۆیاندا کە دەبنە حوکمڕان و کاربەدەست، دەکەونە دژایەتییکردنی یەکدیی و پەیوەندیی خزمایەتیی لەگەڵ یەکدا پچڕاندن و، خوێنی یەکدی ڕشتن، بە تایبەتیی لە دژی بنەماڵەی پێغەمبەر ﷺ.

بەڵام پێم وایە ئایەتەکە بە گشتیی دەدوێ و، هەم ئەوەش دەگرێتەوە، هەم جگە لە ئەوەش دەگرێتەوە، بۆیە نابێ بگوترێ: بە تایبەت مەبەست پێی ئومەوییەکان و عەبباسییەکانە، کە هەردووکیان بنەماڵەی پێغەمبەر ﷺیان ئازار داوەو، زانایانیان ئازار داوە، جگە لە بنەماڵەی پێغەمبەریش ﷺ، هەر کەسێک فەرمانی بە چاکەو قەدەغەی خراپە کرد بێ، ئەگەر حەسەنی بەصریی بووە، سەعیدی کوڕی جوبەیر بووە، عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ئەشعەس بووە، وێڕای گەورە پیاوانی بنەماڵەی پێغەمبەر ﷺ، کە فەرمانیان بە چاکەو ڕێگرییان لە خراپە کردوە، بە کورتیی هەر کەسێک قسەی هەقی بۆ کردبن و، لە دژیان ڕاوەستا بێ، بەشی لێدان و پێدادان و سجن کردن و کوشتن و هەڵواسین بووە.

بێگومان ئەم ئایەتە موبارەکانە چەمک و واتاکەیان نابێ، ببەسترێتەوە بە ڕووداوێکی مێژوویی، یاخود قۆناغێکی مێژوویی، یان کۆمەڵگایەکی دیارییکراوەوە، بەڵکو هەر کەسێ پشتی کردە خواو پەیامی خوا، سەر بۆ ئەوە دەکێشێ کە

تێکدان و خراپەکاریی بکات لە زەویداو، پەیوەندییەکانی خزمایەتییش بپچڕێنێ، پێشینانیشمان گوتوویانە: لەو کەسە بترسێ کە لە خوا ناترسێ.

١٣)- ﴿فَأَصَمَّهُمْ وَأَعْمَىٰٓ أَبْصَـٰرَهُمْ﴾، ئنجا (خوا) کەڕی کردن و چاوەکانیانی کوێر کردن.

یانی: لە ئەنجامی نەفرین لێکرانی خوادا بۆیان، کەڕ دەبن و، کوێر دەبن، واتە: هەم گوێیان هەق نابیستێ و، هەم چاویشیان هەق نابینێ و، عەقڵ و هۆشیشیان باش لە هەق تێ ناگات، لە ئەنجامی گوناهکردن دا، ئینسان هەستەوەرەکانی تێک دەچن.

١٤)- ﴿أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلْقُرْءَانَ﴾، ئایا لە قورئانەوە ڕانامێنن، لێی ورد نابنەوەو سەرنجی نادەن؟.

١٥)- ﴿أَمْ عَلَىٰ قُلُوبٍ أَقْفَالُهَآ﴾، یاخود دڵەکان قفڵەکانیانیان لەسەرن؟ یانی: ئەوانە خاوەن دڵانێکن، چەند دڵێکی تایبەت کە قفڵی خۆیانیان لێ دراوە؟ ئەو پرسیارکردنە، پرسیارکردنە بۆ سەرسوڕماندن لە حاڵی ئەوان، ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿أَمْ عَلَىٰ قُلُوبٍ أَقْفَالُهَآ﴾، بۆیە: ﴿قُلُوبٍ﴾، بە نەزانراو (**نكرة**)، هاتوە، چونکە بۆ جۆرێک لە دڵانە، یانی: ئەوان خاوەنی جۆرێک لە دڵانن کە قفڵەکانی خۆیانیان لێدراون، پێشتر گوتمان: ﴿تَوَلَّيْتُمْ﴾، ئەگەر تێپەڕکار (**متعدِّي**) بێ، (**أي: تَوَلَّيْتُم الأمر**)، کاروبارتان بە ئەستۆوە گرت، بوونە بەرپرس و کار بە دەست، بەڵام ئەگەر: ﴿تَوَلَّيْتُمْ﴾ لازیم بێ، (**تولَّى: أَعْرَض**)، پشتی تێکردو ڕووی لێ وەرگێڕا، (**تولَّى**)، وێڕای (**متعدِّي**) بە مانای (لازم)یشی هاتوە، کە بەرکار نەخوازێ، (**تولَّى: أعرض**)، کەواتە: ئەگەر مانای (لازم)ی لێ بگیرێ، کە ئێمە ئەو ڕایەمان زیاتر پەسەند کردو لەگەڵ سیاقی ئایەتەکاندا باشتر دەگونجێ، واتە: ئەگەر ئێوە پشتتان کردە ئایین و بەرنامەی خواو پشتتانە کردە قورئان، سەرەنجام سەرتان بەوە دەگات کە تێکدان و خراپە کاریی بکەن لە زەویدا بە گشتیی، بە تایبەتییش پەیوەندیی خزمایەتیی و نیزیکییتان بپچڕێنن، دیارە کەسانێکیش وابن، خوا ﷻ نەفرینیان لێ دەکات و لە بەزەیی خۆی دووریان دەخاتەوەو، لە ئەنجامی نەفرین لێکرانی خواشدا

هەم کەڕ دەبن، هەم کوێر دەبن، واتە: هەم گوێیان هەق نابیستێ، هەم چاویشیان هەق نابینێ و، عەقڵ و هۆشیشیان باش لە هەق تێ ناگات، لە ئەنجامی گوناهکردندا، ئینسان هەستەوەرەکانی تێک دەچن، هەر بۆیەش خوا ﷻ دوایی دەفەرموێ: ﴿ أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلْقُرْءَانَ أَمْ عَلَىٰ قُلُوبٍ أَقْفَالُهَآ ﴿٢٤﴾ ﴾، ئایا ئەوان لە قورئان ڕانامێنن؟ یان دڵانێک قفڵەکانی خۆیانیان لەسەرن، خاوەنی چەند دڵێکن، قفڵی تایبەتیی خۆیانیان لێ دراوەو، دڵێکیش قفڵی لێبدرێ، بە دڵنیایی مانای وایە هیچ شتێکی ناچێتە نێوی.

شایانی باسە: ئێمە لە کاتی تەفسیرکردنی سووڕەتی (**الإسراء**)دا، لە کورتە باسێک دا باسی گرنگیی پەیوەندیی خزمایەتییمان کردوە، هەروەها تاوان و خراپەی پچڕاندنی پەیوەندیی خزمایەتیی، لەوێشدا ئەم فەرموودەیەمان هێناوەو لێرەش، دووبارە دەیهێنینەوە:

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {**إِنَّ اللَّه تَعَالَى خَلَقَ الخَلْقَ، حَتَّى إِذَا فَرَغَ مِنْهُمْ، قَامَتِ الرَّحِمُ فَتعلَّقَتْ بِحِقْوِ الرَّحْمَنِ فَقَالَ: مَه؟ قَالَتْ: هَذَا مقَامُ الْعَائِذِ بِكَ مِنَ الْقَطِيعَةِ، قَالَ: نَعَمْ، أَتَرْضِي أَنْ أَصِلَ مَنْ وَصَلَكِ، وَأَقْطَعَ مَنْ قَطَعَكِ؟ قَالَتْ: بَلَى، قَالَ: فَذَلِكَ لَكِ، ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللَّه ﷺ اقْرَؤُوا إِنْ شِئْتُمْ:** ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَعَنَهُمُ ٱللَّهُ فَأَصَمَّهُمْ وَأَعْمَىٰٓ أَبْصَٰرَهُمْ ﴿٢٣﴾ أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلْقُرْءَانَ أَمْ عَلَىٰ قُلُوبٍ أَقْفَالُهَآ ﴿٢٤﴾ ﴾} (**أخرجه البخاري: ٥٩٨٧، ومسلم: ٢٥٥٤**).

واتە: پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: خوای بەرز دوای ئەوەی دروستکراوەکانی دروست کردن، لێیان بوووەو، خزمایەتیی دەستی لە بەر پشتێنی خوای خاوەن بەزەیی نا، (یانی: پەنای بردە بەر خوا، ئەمە تەعبیرێکی ڕەمزییە)، خوا ﷻ فەرمووی: چییە، چیت دەوێ؟ گوتی: ئایا ئەم پێگەو حاڵەتە هی ئەوەیە من پەنات بێنمەبەر لەوەی بپچڕێنرێم؟ خوا ﷻ فەرمووی: بەڵێ، ئایا ڕازیی دەبی هەر کەسێک تۆ بگەیەنێ، منیش بیگەیەنم بە بەزەیی خۆم و، هەر کەسێک تۆ بپچڕێنێ، منیش بیپچڕێنم لە بەزەیی خۆم؟ گوتی: با، خوا ﷻ فەرمووی:

ئـەوە بـۆ تـۆ، پێغەمبـەر ﷺ دوایـی فەرمـووی: ئەگـەر دەشـتانەوێ ئەمـە بخوێننـەوە: ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَعَنَهُمُ ٱللَّهُ ... ﴾.

هەڵبەتـە ئـەوەی لـە فەرمایشـتەکەدا هاتـوە، ئایەتەکـەش ئـەوە دەگەیەنـێ کـە لـە ئەنجامـی پچڕاندنـی خزمایەتییـداو، تێکـدان لـە زەویـدا، نەفریـن و لەعنەتـی خـوا دادەبـەزێ بـۆ سـەر ئـەو جـۆرە کەسـانەو، کەڕیشـیان دەکات و کوێریشـیان دەکات، عەقـڵ و هۆشیشـیان وای لـێ دێ، وەک قفڵـی لێدرابـێ و لـە هـەق تـێ نەگـەن.

## کورتە باسێک دەربارەی

## چەسپانی حوکمی ئەو ئایەتانە بەسەر یەزیدی کوڕی موعاویەدا

ئـەو ئایەتـەی پێشـتر تەفسـیرمان کـرد کـە دەفەرمـوێ: ﴿ فَهَلْ عَسَيْتُمْ إِن تَوَلَّيْتُمْ أَن تُفْسِدُوا فِي الْأَرْضِ وَتُقَطِّعُوا أَرْحَامَكُمْ ﴿٢٢﴾ ﴾، واتـە: ئایـا نیزیکـە کـە هـەر کاتێـک پشـتتان هەڵکـرد، واتـە: پشـتتان کـردە ئیسـلام و بەرنامـەی خـوای پـەروەردگار، تێکـدان و خراپەکاریـی لـە زەویـدا بکـەن و، پەیوەندییەکانـی خزمایەتییتـان بپچڕێنـن.

ئـەوە ئەگـەر (**تولّيتـم**)، بـە مانـای (**أعرضتم**)بـێ، واتـە: پشـتتان هەڵکـرد، ئـەو کاتـە دەگوتـرێ: (**تـولّى**)، کردارێکـی (لازم)ە، یـانی: بـەرکاری نـاوێ.

بـەڵام ئەگـەر (**تـولّى**) کردارێکـی بەرکارخـواز (**مُتَعَدِّي**) بـێ، ئـەو کاتـە (**تَوَلَّيْتُـم**)، بـە مانـای ئەگـەر بوونـە حوکمـڕان و بەرپرس.

واتـە: ئایـا نزیکـە هـەر کات بوونـە بەرپـرس، تێکـدان لـە زەویـدا بکـەن و، پەیوەندییەکانـی خزمایەتییتـان بپچڕێنـن؟

هەڵبەتـە (**تَولّيتـم**): چ بـە مانـای (**أَعْرَضْتُـم**) پشـتتان هەڵکـرد بـێ، چ بـە مانـای کار وەئەسـتۆ گرتـن بـێ، لـە هـەردوو حاڵەتەکـەدا، ئـەم ئایەتـە دەگونجـێ بەسـەر (یزیـد)دا بچەسـپێ، چونکـە یەزیـد هـەم پشـتی لـە ئیسـلام کـردوە کـەم و زۆر، هـەم کاروباریشـی بـە ئەسـتۆوە گرتـوە، واتـە: بـە هـەردوو واتایەکـەی (**تَولّيتـم**) بەسـەر حاڵەتەکـەی یەزیـددا دەچەسـپێ، چونکـە: هـەم بـە شـێوەیەک لـە شـێوەکان پشـتی لـە ئیسـلام کـردوەو، هـەم کار وباریشـی بـە ئەسـتۆوە گرتـوەو حوکمڕانـی مسـوڵمانان بـووە، بـەڵام ئایـا چـۆن چـۆنی چەمـک و واتـای ئـەو ئایەتـە بەسـەر یەزیـدی کـوڕی موعاویـەی کـوڕی ئەبـوو سـوفیانی کـوڕی حـەڕب دا، دەچەسـپێ و بـە چ بەڵگەیـەک؟ لـە سـێ بڕگـەدا وەڵامـی ئـەو پرسـیارە دەدەینـەوە:

## بڕگەی یەکەم: بەڵگەی قورئان و سوننەت لەو بارەوە:

بێگومان ئایەتەکانی قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ بە ناوهێنان و بە ڕاشکاویی باسی یەزیدو جگە لە یەزیدیشیان نەکردوە لە حوکمڕانە لادەرەکان، بەڵام ئایا هیچ ئایەت هەن و هیچ فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺ یان دەقی سوننەت هەن، کە چەمک و واتایەکەیان بەسەر یەزیدو وێنەی یەزیددا بچەسپێ و بیگرنەوە؟ ئەم بڕگەیە لە سێ خاڵدا دەخەینە ڕوو و وەڵامی ئەو پرسیارەش دەدەینەوە:

(**محمود الآلوسي**) لە تەفسیرەکەی خۆی (**روح المعاني**)دا[1]، لەو بارەوە قسەی کردوەو ئەو سێ خاڵەی کە دەیانهێنم لەم بڕگەی یەکەمەدا، هەموویان بە کورتکردنەوەوە، لەو تەفسیرەی ئەو وەردەگرین:

**خاڵی یەکەم:** **(وَاسْتَدَلَّ بالآية عُمر بن الخطاب رضي الله تعالى عنه، على منع بيع أم الولد، روى الحاكم في المستدرك وَصَحَّحَهُ، وابنُ المنذر عَنْ بُريدة قال: كُنت جالساً عِنْدَ عُمرَ، إذ سمعَ صَائِحاً، فسأل، فقيل: جَارية من قُريش تُبَاعُ أُمُّهَا، فأرسل يدعو المهاجرين، والأنصار، فلم تمض ساعة حتى امتلأت الدار والحجرة، فحمد الله تعالى وأثنى عليه، ثُمَّ قال: أَمَّا بَعْدُ، فهل تعلمونه كان مِمَّا جاء به مُحَمَّد ﷺ القطيعة؟! قالوا: لا، قَالَ: فَإِنَّهَا قد أَصْبَحَت فيكم فَاشِيَةً، ثُمَّ قَرَأَ: ﴿ فَهَلْ عَسَيْتُمْ إِن تَوَلَّيْتُمْ أَن تُفْسِدُوا فِي الْأَرْضِ وَتُقَطِّعُوا أَرْحَامَكُمْ ﴿٢٢﴾ ﴾، ثُمَّ قَالَ: وَأَيُّ قَطيعَةٍ أَقطَعُ مِن أَن تُبَاعَ أُمُّ امرِئٍ فِيْكُمْ؟ قَالُوا: فَاصنَع مَا بدا لَكَ، فَكتب في الآفاق أن لاَ تُبَاعَ أُمُّ حرٍّ، فَإِنَّها قَطيعَةُ رَحِمٍ، وَإِنَّهُ لا يَحِلُّ).**

واتە: بوڕەیدە کە یەکێکە لە هاوەڵان خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: من لە لای عومەری کوڕی خەتتاب (خوا لێی ڕازی بێ)، دانیشتبووم، گوێی لە دەنگی

---

[1] ( ١ ) ج١٣، ص(٣٠٨-٣١١).

بانگ کەرێک بوو، ئەویش پرسیاری کرد (ئەو بانگ کەرو جارچییە چی دەڵێ؟) پێی گوترا: کچێکە لە قورەیش دایکی دەفرۆشرێ، {چونکە (**جارية**)، هەم بە مانای کەنیزەک دێ، هەم بە مانای کچی تازە پێگەیشتووش دێ، واتە: پیاوێک لە قورەیش لەگەڵ کەنیزەکێکدا هاوسەرگیریی کردوە، یان بە شێوەیەک لە شێوەکان چۆتە لای بە حەڵاڵیی و کچێکی لێی بووە، ئەو کاتەش دایکەکە پێی دەگوترێ: (**أمُّ الوَلَد**)، دایکی رۆڵە، هەر کاتێک پیاوێکی ئازاد لەگەڵ ئافرەتێکی کەنیزەکدا هاوسەرگیریی کرد، یان منداڵیان کەوتە بەین، ئەو دایکە ڕاستەوخۆ ئازاد دەبێ و پێی دەگوترێ: (**أمُّ الوَلَد**)، ئنجا ئەو کچە، یان ئەو کەنیزەکەی لە دایکێک بووە، دایکەکە کەنیزەکە، بەڵام بابی ئازادە لە قورەیش، جاڕ دراوە دایکەکەی بفرۆشرێ}، عومەر خوا لێی ڕازی بێ، بانگی کۆچکەران و پشتیوانانی کرد، سەعاتێکی پێ نەچوو تاکو ماڵەکەو ژوورە تایبەتییەکەش پڕ بوون، کاتێک هاتن ستایشی خوای بەرزی کردو، مەدح و سەنای کردو، دوای ئەوە گوتی: ئایا دەزانن لەوەدا کە موحەممەد ﷺ هێناویەتی پچڕاندنی پەیوەندیی خزمایەتیی تێدا بێ؟ گوتیان نەخێر، گوتی: بەڵام ئێستا ئەوە لە نێو ئێوەدا باوەو بڵاوە، دوایی ئەوە ئایەتەی خوێندەوە کە دەفەرموێ: ﴿ فَهَلْ عَسَيْتُمْ إِن تَوَلَّيْتُمْ أَن تُفْسِدُوا فِي الْأَرْضِ وَتُقَطِّعُوا أَرْحَامَكُمْ ﴿٢٢﴾ ﴾.

ئنجا گوتی: چ پچڕاندنی خزمایەتییەک پچڕێنەرترە لەوە کە دایکی یەکێک لە خۆتان بفرۆشرێ؟ (واتە: یەکێک لە خۆتان کە بابی ئازادە، دایکی با کەنیزەکیش بێت، بفرۆشرێ؟) گوتیان: تۆ چیت پێ چاکە ئاوا بڕیار بدە، ئەویش نووسی بۆ شاران و، بۆ ئاسۆیەکان کە لەمەودوا دایکی هیچ مرۆڤێکی ئازاد نەفرۆشرێ، (چ کچ بێ، چ کوڕ بێ)، چونکە ئەوە پچڕاندنی پەیوەندیی خزمایەتییەو، ئەوەش ڕەوا نیە.

کەواتە: عومەر (خوا لێی ڕازی بێ)، ئەم ئایەتەی کردۆتە بەڵگە لەسەر ڕێگرتن لە فرۆشتنی دایکی مرۆڤێکی ئازاد کە لە بابێکی ئازاد بووە، با ئەو

دایکە کەنیزەکیش بووبێ، کە ئەویش بنچینەیەکی شەرعییەو پێی دەگوترێ: (**أمُّ الوَلَد**)، واتە: دایکی مرۆڤێکی ئازاد، کە ڕاستەوخۆ ئازاد دەبێ.

**خاڵی دووەم:** (**وَاسْتَدَلَّ بِهَا أَيْضاً عَلَى جَوَازِ لَعْنِ يَزِيد عَلَيْهِ من الله تعالى ما يستحق، نقل البرزنجي في «الإشاعة»، والهيثمي في «الصواعق» أن الإمام أحمد لَمَّا سَألَه ولده عبد الله عن لعن يزيد؟ قال: كيف لا يُلْعَنُ مَنْ لعنه الله تعالى في كتابه! فقال عبد الله: قد قَرَأْتُ كِتَابَ الله عز وجل، فَلَمْ أجِد فِيهِ لَعْنَ يَزِيد! فَقَال الإمَامُ: إنَّ الله تعالى يَقُولُ: ﴿ فَهَلْ عَسَيْتُمْ إِن تَوَلَّيْتُمْ أَن تُفْسِدُوا فِي الْأَرْضِ وَتُقَطِّعُوا أَرْحَامَكُمْ ﴿٢٢﴾ ﴾، وَأَيُّ فَسَادٍ وَقَطيعَةٍ أَشَدّ مِمَّا فَعَلَهُ يَزِيد؟!**).

واتە: هەروەها ئەم ئایەتە بە بەڵگە هێنراوەتەوە لە سەر ڕەوایی نەفرینکردن لە یەزید، لەلایەن خواوە، ئەوەی لەسەر بێ کە شایستەیەتی، کە هەر کام بەرزنجیی لە کتێبی (**الإشاعة**)داو، (**ابن حجر الهيثمي**)، لە کتێبی (**الصواعق**)دا، هێناویانە کە ئیمام ئەحمەد کاتێک عەبدوڵلای کوڕی پرسیاری لێ دەکات لە بارەی نەفرین کردنەوە لە یەزید، (ئایا در وستە یان نا؟) ئیمام ئەحمەد دەڵێ: چۆن نەفرین لە کەسێک ناکرێ، کە خوای بەرز لە کتێبی خۆیدا نەفرینی لێکردوە؟ عەبدوڵلاش دەڵێ: کتێبی خوام ﷻ هەمووی خوێندۆتەوەو نەفرین کردن لە یەزیدم تێدا نەبینیوە! ئیمام ئەحمەد دەڵێ: خوای بەرز فەرموویەتی: ﴿ فَهَلْ عَسَيْتُمْ إِن تَوَلَّيْتُمْ أَن تُفْسِدُوا فِي الْأَرْضِ وَتُقَطِّعُوا أَرْحَامَكُمْ ﴿٢٢﴾ ﴾، ئنجا ئایا چ تێکدانێک و پچڕاندنێکی پەیوەندیی خزمایەتیی، بەهێزترە لەوەی یەزید کردی؟!

ئاشکرایە یەزید لە سەردەمی خۆیدا سوپایەکەی دەوری شاری مەدینەیان گرتوەو، سێ ڕۆژان ئەو شارەی بۆ ڕەوا کردوون، هەرچی دەکەن لەگەڵ خەڵکەکەیدا بیکەن! سەرەنجام دەستدرێژیی کراوەتە سەر ئافرەتان و خەڵکیان کوشتوە....هتد، دیسان لەسەردەمی ئەودا کەعبە بە مەنجەنیق ڕووخێنراوە، زۆر شتی دیکەی خراپی کردوە، کە سەرچاوە مێژووییەکان هێناویانن، ئنجا ئیمام ئەحمەد گوتوویەتی: ئەو ئایەتە موبارەکە ئەویش دەگرێتەوە.

**خاڵی سێیەم:** (وَهُـوَ مَبْنِـيٌّ عَـلَى جَـوَازِ لَعْـنِ العَـاصِي المعـيَّن مـن جماعـة لُعِنُـوا بالوَصْـفِ، وفِي ذَلـك خـلاف، فالجمهـور، عـلى أَنَّـهُ لاَ يَجُـوز لَعْـن المعـيَّن فاسِـقاً، كَانَ أو ذِمِّيَّاً، حَيَّاً كَانَ أَو مَيّتَاً، وَلَـمْ يُعْلَـمْ مَوْتُـهُ عَـلَى الكُفْـرِ، لاحتِمَال أَنْ يختـم لـه، أو ختـم لـه بالإسـلام، بخـلاف مَـنْ عُلِـمَ موتُـهُ عـلى الكفـر كأبي جهـل، وَذَهَـبَ شـيخ الإسـلام السـراج البَلْقِيْنـي إلى جـواز لعـن العـاصي المعـيَّن لحديـث الصحيحـين: «إِذَا دَعَـا الرَّجُـلُ امرَأَتَـهُ إِلى فِرَاشِـهِ، فَأَبَـت أَن تَجِـيء، فَبَـاتَ غَضبَـانَ، لَعَنَتْـهُ المَلائِكَـةُ حَتَّـى تُصبِـح»[١].

**وَفِـي الزَّوَاجِر: لَوِ اسْتَدَلَّ لِذَلِكَ بِخَبَرِ مُسْلِمٍ:**

**أَنَّـهُ ﷺ مَـرَّ بِحِـمَارٍ وسُـمَ فِي وَجهِـهِ، فَقَـالَ: «لَعَـنَ اللهُ مَـنْ فَعَـلَ هَـذَا»[٢] لَـكَانَ أَظهَـرُ، إِذِ الإِشَـارَةُ بِهـذا صَرِيحَـةٌ فِي لَعـنِ مُعَيَّنٍ، إلاَّ أَن يُـؤَوَّلَ بِـأَنَّ المُـرَاد الجِنـسُ، وَفيـهِ مَـا فِيـهِ).**

واتـە: ئـەوە (کـە ئـەو ئایەتـە بەسـەر یەزیـددا بچەسـپێ)، بنیـات دەنـرێ لەسـەر ئـەوە کـە ئایـا ڕەوایـە نەفریـن بکـرێ لـە سـەرپێچییکارێکی دیارییکـراو لـە میانـی کۆمەڵێکـدا، کـە بـە هـۆی ئـەو وەسـفەوەی تێیانـدا هەیـە، نەفرینیـان لێکـراوە؟ لـەو بـارەوە ڕاجیایـی هەیـە، (بـۆ وێنـە: بابایەکـی شـەڕاب خـۆرەوە کـە لـە فەرمـوودەی پێغەمبـەردا ﷺ هاتـوە، نەفرینـی کـردوە لـە شـەڕاب خـۆرەوان بـە گشـتیی، ئایـا شـەڕاب خۆرەوەیەکـی دیارییکـراو، دروسـتە نەفرینـی لـێ بکـرێ، لەبـەر ئـەوەی ئـەو وەسـفەی تێدایـە؟)[٣] زۆربـەی زانایـان ڕایـان وایـە دروسـت نیـە سـەرپێچییکارێکی دیارییکـراو نەفرینـی لـێ بکـرێ، ئنجـا ئـەو سـەرپێچییکارە لادەر بـێ، یاخـود لـە خـاوەن کتێبـان بـێ، (واتـە: مسـوڵمانێکی لادەر، یاخـود نامسـوڵمانێکی خـاوەن کتێـب بـێ)، زینـدوو بـێ، یـان مـردوو بـێ، مـادام نەزانرابـێ کـە لەسـەر کوفـر مـردوە، لەبـەر ئـەوەی ئەگـەری هەیـە، لـە سـەرە مەرگـدا بگەڕێتـەوە، یاخـود کۆتایـی بـە ئیسـلام

---

(١) رواه البخاري: ٣٥٦٠، ومسلم: ١٤٣١ عن أبي هريرة ﷺ.

(٢) رواه مسلم: ٢٠٠١، ١١٧

(٣) نێوان کەوانەکان زیادەی خۆمە، بۆ ڕوونکردنەوەی مەبەست.

هاتبێ، بە پێچەوانەی کەسێکەوە کە بزانرێ لەسەر کوفر مردوە، وەک ئەبوو جەهل، بەڵام شێخی ئیسلام (**السراج البلقيني**) گوتوویەتی: دروستە سەرپێچییکاری دیارییکراو نەفرینی لێ بکرێ، لەبەر ئەو فەرمایشتەی لە صەحیحی بوخاریی و موسلیم دا هاتوە: کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمویێ: (**إِذَا دَعَا الرَّجُلُ امرَأَتَهُ إِلَى فِرَاشِهِ فَأَبَت أَن تَجِيءَ فَبَاتَ غَضبَانَ، لَعَنَتهُ الْمَلَائِكَةُ حَتَّى تُصبِح**)[1]، هەر کاتێک پیاو ئافرەتەکەی خۆی بانگ کرد بۆ سەر جێگا، ئەویش سەرپێچیی کرد، پیاوەکەش لێی تووڕە بوو، فریشتەکان تاکو ڕۆژ دەبێتەوە نەفرینی لێ دەکەن.

بەڵام (**ابن حجر الهيثمي**)، لە کتێبی (**الزَّوَاجر**)دا، گوتوویەتی: ئەگەر ئەوە بە بەڵگە بهێنرێتەوە کە لە صەحیحی موسلیم دا هاتوە، ئاشکراترەو بەڵگەکەی ڕوونترە لەسەر ئەوە، کە دەفەرمویێ: (**أَنَّهُ ﷺ مَرَّ بِحِمَارٍ وُسِمَ فِي وَجهِهِ، فقَالَ: لَعَنَ اللهُ مَن فَعَلَ هَذَا**)، پێغەمبەر ﷺ بە لای کەرێکدا تێپەڕی کە دەم و چاوی نیشانەدار کرابوو، (داخ کرابوو، وەک نیشانەیەک)، فەرمووی: (نەفرینی خوا لەو کەسە بێ کە ئاوای کردوە)، چونکە ئاماژە کردن بەوە شتێکی ڕوون و ئاشکرایە کە کەسێکی دیارییکراو، ئەو کەرەی داخ کردوەو دەم و چاوی نیشانەدار کردوە، مەگەر بەوە تەئویل بکرێ کە مەبەست تێکڕا (جنس)ی ئەو کەسانە بووە، (کە ئاوا وڵاخ داخ دەکەن و نیشانە داری دەکەن)، بەڵام ئەوەش ئەوەی تێدایە کە تێیدایە.

لەو بارەشەوە دەگونجێ بگوترێ: ئەگەر مەبەست جینسیش بێ، ئەویش یەکێکە لەو جنسە، ئنجا مەرجیش نیە ئەو مەبەستی پێ جینس بێ، چونکە ئاماژەی کردوە بۆ کەرێکی دیارییکراو، کە دەم و چاوی داخ کراوە، لە لایەن کەسێکی دیارییکراوەوە.

ئەمە برگەی یەکەم بۆ ڕوونکردنەوەی چۆنیەتیی دەلالەتی ئایەتەکان و فەرمایشتەکانی پێغەمبەر ﷺ لەسەر ئەو مەبەستەی گوتمان: کە بریتیە لە ڕەوایی، یان ناڕەوایی نەفرین لێکرانی یەزیدی کوڕی موعاویە.

---

(١) پێشتر (تخريج) کراوە.

## بڕگەی دووەم: ڕای زانایان لە بارەی ڕەوایی و ناڕەوایی نەفرین لێکرانی یەزیدی کوڕی موعاویەوە:

١- یەکێکیان کە هەر ئالووسیی خاوەنی تەفسیری (**روح المعاني**)ە، دەڵێ: (**وَعَلَى هَذَا القَوْلِ لا تَوَقُّفَ فِي لَعنِ يزيد لِكثرَةِ أَوصَافِهِ الخَبِيثَةِ، وَارتِكابِهِ الكَبَائِرَ فِي جَمِيعِ أَيَّامِ تَكْلِيفِهِ، وَيَكْفِي مَا فَعَلَهُ أيَّام اسْتِيلائِهِ، بِأَهلِ المَدِينَةِ، وَمَكَّةَ، فَقَد رَوى الطبراني بحديثٍ حسن: {أَللَّهُمَّ مَنْ ظَلَمَ أَهْلَ المَدِينَةِ، وَأَخَافَهُم، فَأَخِفْهُ، وَعَلَيْهِ لَعْنَةُ اللهِ وَالملائِكَةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِين، لاَ تُقْبَلُ مِنْهُ صَرفٌ وَلا عَدلٌ}**[1]).

ئالووسیی چەند قسەیەک دەکات دوایی دەڵێ: بینا لەسەر ئەم قسەیە: نابێ بوەستین لە نەفرین لێکردنی یەزیددا، لەبەر ئەوەی سیفەتی پیسی خراپی زۆر بوون و، گوناهی گەورەی زۆر کردوون، لە هەموو ڕۆژەکانی ژیانیدا، ئەوەندەی بەسە لە کاتێکدا حوکمڕانیی زەوت کرد، ئەوەی بە خەڵکی شاری مەدینەو شاری مەککەی کرد.

(باسی نەکردوە چی پێ کردوون؟ بەڵام لە سەرچاوە مێژووییەکاندا هاتوە کە بۆ سوپایەکەی خۆی بە تایبەت خەڵکی مەدینەی ڕەوا کردوە، دەکوژن؟! زینا دەکەن، هەتا زینایان لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر لە ئافرەتاندا کردوەو، خەڵکێکی زۆریان کوشتوەو، خوێنێکی زۆریان ڕشتوەو، ماڵ و سامانی زۆری خەڵکیان داگیر کردوە)[2]، دەڵێ (**الطبراني**) بە سەنەدێکی باش (**حسن**) هێناویەتی کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {**أَللَّهُمَّ مَنْ ظَلَمَ أَهْلَ المَدِينَةِ، وَأَخَافَهُم فَأَخِفْهُ، وَعَلَيْهِ لَعْنَةُ اللهِ وَالملائِكَةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِين، لاَ تُقْبَلُ مِنْهُ صَرفٌ وَلا عَدلٌ**}، واتە: ئەی خوایە! هەر

---

(١) رواه الطبراني في الكبير: ٦٦٣٦ عن السائب بن خلاد، وأورده الهيثمي في المجمع: ج٣، ص٣٠٧، وَأَوْرَدَهُ الألباني في «الصحيحة»: ٣٥١، ولكنّه من حديث عبادة بن صامت، وَصُحِّحَ حَدِيثُ سائب بن خلاد، عند المنذري في الترغيب والترهب: ١٢١٥.

(٢) نێوان کەوانەکان، زیادەو ڕوونکردنەوەی خۆمە.

کەسێک ستەمی لە خەڵکی مەدینە کردو ترساندنی بیترسێنەو، نەفرینی خواو فریشتەکان و، تێکڕای خەڵکی لەسەر بێ، فەرزو سوننەتی لێوەرناگیرێ.

کەواتە: پێغەمبەر ﷺ بەو شێوەیە دوعای کردوە لە هەر کەسێ، ستەم لە خەڵکی مەدینە بکات و بیانترسێنێ، ڕەفتارەکەی یەزیدیش لەو بارەوەو ئەوەی لە ڕۆژگاری یەزیدداو بە فەرمانی ڕاستەوخۆی وی، بە خەڵکی مەدینە کراوە، ستەم و ترساندن و تۆقاندن و دەستدرێژییەکی بێڕەزای جۆراوجۆر بووە، کە مرۆڤ شەرم دەکات هەمووی وەک خۆی باس بکات!! گوناهیشیان بەس ئەوەبوو کە ئامادەنەبوون بەیعەت بە یەزید بدەن!!

٢- (**عبدالرحمن ابن الجوزي**)، کە کتێبێکی هەیە بە ناوی: (**السرُّ المصون**)، واتە: (نهێنیی پارێزراو)، ئەویش لەو کتێبەیدا زۆر شتی لەو بارەوە هێناوە، کە من کورتی دەکەمەوەو شوێنی مەبەست دێنم، دەڵێ:

**(مِنَ الإعتِقاداتِ العامَّةِ الَّتِي غَلَبَت على جَماعَةٍ مُنتَسِبِينَ إلى السُّنَّةِ أَن يَقُولوا: إنَّ يَزِيدَ كَانَ عَلى صَوابٍ، وَإِنَّ الحُسَينَ أَخطَأَ في الخُرُوجِ عَلَيهِ، وَلَو نَظَروا في السِّيَرِ لَعَلِموا كَيفَ عُقِدَت لَهُ البَيعَةُ، وَأُلزِمَ النَّاسُ بِها، وَلَقَد فُعِلَ في ذَالِكَ كُلُّ قَبيحٍ، ثُمَّ لَو قَدَّرنا صِحَّةَ عَقدِ البَيعَةِ، فَقَد بَدَت مِنهُ بَوَادٍ كُلُّهَا تُوجِبُ فَسخَ العَقدِ، وَلا يَمِيلُ إلى ذَالِكَ إلاَّ كُلُّ جَاهِلٍ عَامِّيُّ المَذهَبِ، وَأَنا أقولُ الَّذي يَغلِبُ عَلى ظَنِّي: أنَّ الخَبِيثَ لَم يَكُن مُصَدِّقًا بِرِسَالَةِ النَّبِيِّ ﷺ وَأَنَّ مَجموعَ مَا فَعَلَ مَعَ أَهْلِ حَرَمِ اللهِ تَعالى، وَأهلِ حَرَمِ نَبِيِّهِ ﷺ وَعِترَتِهِ الطَّيِّبِينَ الطَّاهِرِينَ فِي الحياةِ وَبعدَ المَمات، وَمَا صَدَرَ مِنْهُ مِنَ المَخَازِي، لَيسَ بِأَضعَفَ دِلالَةً عَلى عَدَمِ تَصدِيقِهِ مِن إلقَاءِ وَرَقَةٍ مِن مُصحَفِ الشَّرِيفِ فِي قَذَرٍ، ولا أظُنُّ أنَّ أمرَهُ كَانَ خَافِيَاً عَلى أَجِلَّةِ المُسلِمِينَ إذَّاكَ، وَلكِنَّهُ كَانوا مغلوبِينَ مقهورِين، وَأَنا أذهَبُ إلى جَوازِ لَعنِ مِثلِهِ عَلَى التَّعْيِينِ، وَلَو لَم يُتَصَوَّر أن يَكونَ لَهُ مَثَلٌ مِنَ الفَاسِقِين، وَالظَّاهِرُ أنَّهُ لَمْ يَتُبْ، وَاحتِمَالُ تَوبَتِهِ أَضْعَفُ مِن احتِمَالِ إيمَانِهِ).**

واتـە: لـە بیـرو بۆچوونـە هەڵـەکان کـە زاڵبـووە بەسـەر کۆمەڵێـک خەڵکـدا، کـە پـاڵ دەدرێنـە لای ئەهلـی سـوننەت، (واتـە: جەمـاوەری مسـوڵمانان)، ئەوەیـە کـە دەڵێـن: یەزیـد لەسـەر ڕاسـتیی بـووە، حوسـەین هەڵـەی کـردوە کـە لـە دژی یاخیـی بـووەو دەرچـووە!! بـەڵام ئەگـەر تەماشـای سـەرچاوەکانی مێژوویـان بکردایـە، دەیانزانـی کـە یەزیـد چـۆن بەیعەتـی پێـدراوەو، چـۆن خەڵکـی پێـوە پابەنـد کـراوە، کـە لـەو بـارەوە هەمـوو کارێکـی ناشـیرین ئەنجـام دراوە، (ڕاسـتیش دەکات، وەک لـە شـوێنی دیکـەو لـە بۆنـەی دیکـەدا، ئـەوەم باسـکردوە کـە موعاویـە پێنـج سـاڵ پێـش مردنـی خـۆی، بـە زۆرو بـە ترسـاندن و تۆقانـدن پەیمانـی لـە خەڵـک وەرگرتـوە بـۆ یەزیـدی کـوڕی)[1]، ئنجـا ئەگـەر گریـمان ئـەو بەیعەتـەش کـە پێیـدراوە ڕاسـت بووبـێ، (گریـمان بـە ڕاسـتمان دانـا)، دوایـی شـتی وای لـێ دەرکەوتـون، هەموویـان مایـەی ئـەوەن ئـەو گرێبەسـتەی بوویەتـی لەگـەڵ مسـوڵماناندا هەڵبوەشـێتەوەو، هیـچ کەسـێک بـڕوای وانیـە کـە حوکمڕانیـی یەزیـد ڕەوا بووبـێ، مەگـەر نەزانێـک کـە بۆچوونەکـەی بۆچوونێکـی نەزانانـەو عەوامانەیـە.

مـن دەڵێـم: ئـەوەی کـە بەسـەر گومانمـدا زاڵـە ئەوەیـە کـە ئـەو پیسـە، (واتـە: یەزیـد) بـڕوای بـە پەیامـی پێغەمبـەر ﷺ نەبـووەو، تێکـڕای ئـەوەی کردوویەتـی لەگـەڵ خەڵکـی حەڕەمـی خـوای بـەرزدا (واتـە: خەڵکـی مەککـە)و خەڵکـی حەڕەمـی پێغەمبەرەکـەی دا ﷺ (واتـە: خەڵکـی مەدینـە)و لەگـەڵ وەچـەو خزمانـی پـاک و چاکـی پێغەمبـەردا ﷺ، چ لـە حاڵەتـی ژیانیانـداو، چ لـە دوای مردنیشـیان.

ئنجـا ئـەوەی لێـی دەرکەوتـوە لـەو شـتانەدا کـە مایـەی سـەر شـۆڕینی، دەلالەتیان لەسـەر ئـەوە کـە بـڕوای نەبـووە، بێهێزتـر نیـە لـە دەلالەتـی فرێدانـی پەڕێکـی قوڕئان بـۆ نێـو پیسـایی، (واتـە: وەک چـۆن دەلالەتـی فرێدانـی پەڕێکـی قوڕئـان بـۆ نێـو پیسـاییەک، ئـەوە دەگەیەنـێ کـە ئـەو کەسـە بـڕوای بـە قوڕئـان نیـەو، کردەوەکـەی بـە کوفـر لـە قەڵـەم دەدرێ، ئـەوەی یەزیدیـش کردوویەتـی لـە فڕێدانـی پەڕێکـی

---

(١) زیادەی خۆمە.

قورئـان بـۆ نێـو پیسـایی، دەلالەتەکـەی لـەوە کەمـتر نیـە)[1]، پێشـم وانیـە کـە کاری وی شـێردراوە بووبـێ، لـە زانایـان و پێشـەوایانی ئیسـلام لـەو کاتـەدا، بـەڵام ئـەوان ناچـار بـوون و بـێ دەسـەڵات کـراون.

مـن پێـم وایـە کـە نەفریـن کـردن لـە بابـای وەک یەزیـد بـە دیارییکراویـی، دروسـتە، هەرچەنـدە مەزەننـەو وێنـا ناکـرێ، وێنـەی ئـەو هەبووبـێ لـە نێـو فاسـقانداو، ئـەوەش زیاتـر دێتـە بەرچـاو کـە تۆبـەی نەکردبـێ، ئەگـەری گەڕانـەوەو تۆبـە کردنەکـەی، لـە ئەگـەری بـڕوا هێنانەکـەی بێهێزتـرە.

**٣-** ئالووسیی دەڵێ: (**وَمِمَّنْ صَرَّحَ بِلَعْنِهِ: جلال الدين السيوطي عَلَيْهِ الرَّحْمَة**)، لەو زانایانەی کە بە ئاشکرا نەفرینیان لێکردوە: (**جلال الدين السيوطي**)یە ڕەحمەتی خوای لێ بێ.

**٤-** هەروەها ئالووسیی زانایەکی دیکەی چوارەمیش دێنی، دەڵێ: (**وَقَالَ العَلاَّمَة تَفْتَازَانِي: لاَ نَتَوَقَّفُ فِي شَأْنِهِ بَلْ فِي إِيْمَانِه، لَعْنَةُ اللهِ عَلَيْهِ وَعَلَى أَنْصَارِهِ وَأَعْوَانِهِ**)، واتە: زانای بەرز (**تفتازاني**)یش دەڵێ: ئێمە ناوەستین لە بارەی وییەوە، بەڵکو لە بارەی بڕوا هێنانیشیەوە، بەڵکو نەفرینی خوای لێ بێ و، لەسەر پشتیوانەکان و هاوکارەکانیشی[2].

## ٣)- بڕگەی سێیەم: ڕای خۆمە:

من ڕای خۆم لە دوو خاڵدا دەخەمە ڕوو:

**یەکەم:** پێم وایە حوکمی ئایەتەکان و فەرموودەکان، زۆر بە ڕوونیی یەزید دەگرێتەوەو، وێنەی یەزیدیش دەگرێتەوە، واتە: هەر کەسێکی دیکە، وەک ویی کردبێ، لە حوکمڕانە ستەمکارو خۆسەپێن و بێ بەندو بارو لادەرەکان، ئایەتەکان و فەرمایشتەکانی پێغەمبەر ﷺ هەموو ئەوانە دەگرنەوەو، لە ڕاستییدا خوا ﷻ کە ئاوای فەرمووەو، پێغەمبەر ﷺ

---

(١) زیادەی خۆمە.

(٢) ئـەوەی هێناومـە، وەك پێشـتریش ئامـاژەم پێـدا: (الألـوسي) لـە تەفسـیرەکەی خـۆی (روح المعـاني)، بەرگـی (١٣)، جوزئـی (٢٦)، لاپـەڕە (٣٠٩)، تاکـو (٣١١)دا، هێناویەتـی.

کە ئاوای فەرمووە، بۆ ئەوە بووە هەر کەسێک وابکات، ئەو هەڕەشەیەو ئەو حوکمە بیگرێتەوە.

**دووەم:** پێم وایە مادام پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: {**لَيْسَ الْمُؤْمِنُ بِالطَّعَّانِ، وَلَا اللَّعَّانِ، وَلَا الْفَاحِشِ، وَلَا الْبَذِيءِ**} (**أخرجه الترمذي: ١٩٧٧، وأحمد: ٣٨٣٩، ٣٩٤٨، وابن حبان: ١٩٢، انظر صَحِيح الْجَامِع: ٥٣٨١، الصَّحِيحَة: ٣٢٠، عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ** ﷺ)، واتە: بڕوادار تانە لێدەرو، نەفرینکەرو، قسەی ناشیرینکەرو، زمان شڕ نیە.

بۆیە نەفرین کردن لە یەزیدو، لە هەر جۆرە کەسێکی دیکەی وەک ئەویش، بە پەسند نازانم، نەک لەبەر ناڕەوا بوونی، یان لەبەر ئەوەی ئایەتەکانی قورئان، ئەو ئایەتانەی باسمان کردن و، دەقەکانی سوننەت نایگرنەوە، بەڵکو لەبەر ئەوەی نەفرەت کردن نابێ، سیفەتی مسوڵمان بێ، بە پێی ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەر ﷺ.

## مەسەلەی دووەم:

**باسی کەسانێکی هەڵگەڕاوە لە ئیسلام بە خوتخوتەی شەیتان و، بەهۆی بەڵێندانیانەوە بە کەسانێکی ناحەزی ئیسلام، کە لە هەندێک کاردا بەقسەیان بکەن و، لە سەرە مەرگیشدا فریشتە زەبریان تێدەسرەوێنن، چونکە دوای شتانێکی تووڕەکەری خوا کەوتوون و، ڕەزامەندیی خوایان دزاوەو، خواش چاکەکانی پووچەڵ کردوونەوە:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱرْتَدُّوا۟ عَلَىٰٓ أَدْبَـٰرِهِم مِّنۢ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ ٱلْهُدَى ٱلشَّيْطَـٰنُ سَوَّلَ لَهُمْ وَأَمْلَىٰ لَهُمْ ﴿٢٥﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَالُوا۟ لِلَّذِينَ كَرِهُوا۟ مَا نَزَّلَ ٱللَّهُ سَنُطِيعُكُمْ فِى بَعْضِ ٱلْأَمْرِ ۖ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ إِسْرَارَهُمْ ﴿٢٦﴾ فَكَيْفَ إِذَا تَوَفَّتْهُمُ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةُ يَضْرِبُونَ وُجُوهَهُمْ وَأَدْبَـٰرَهُمْ ﴿٢٧﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمُ ٱتَّبَعُوا۟ مَآ أَسْخَطَ ٱللَّهَ وَكَرِهُوا۟ رِضْوَٰنَهُۥ فَأَحْبَطَ أَعْمَـٰلَهُمْ ﴿٢٨﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە نۆ بڕگەدا:

١)- ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱرْتَدُّوا۟ عَلَىٰٓ أَدْبَـٰرِهِم مِّنۢ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ ٱلْهُدَى ﴾، بە دڵنیایی ئەوانەی لەسەر پاشوانیان هەڵگەڕاونەوە، دوای ئەوەی ڕێنماییان بۆ ڕوون بۆتەوە، (أدبار)، کۆی (دُبر)ە، واتە: پشتەوە، بە باری پشتەوەدا ڕۆیشتوونەوە، بۆچی خوا ﷻ ئەو تەعبیرەی بەکارهێناوە؟ لەبەر ئەوەی کەسێک کە هەڵدەگەڕێتەوە، بەرەو لای دواوە دەچێ، بۆیە وشەی هەڵگەڕانەوە پاڵدراوەتە لای پشتەوەکان، وشەی (عَلَى)شی بۆ زیاد کراوە: ﴿ ٱرْتَدُّوا۟ عَلَىٰٓ أَدْبَـٰرِهِم ﴾، تاکو بزانرێ کە ئەو ئەو هەڵگەڕنەوەیە زۆر باش چەسپاوە، لە لای پشتەوە، وەک خوا ﷻ دەفەرموێ: (**عَلَى صِرَاطٍ مُستَقِيم**)هود، واتە: ئەو کەسە لەسەر ڕاستە شەقام چەسپاوە.

﴿ مِّنۢ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ ٱلْهُدَى ﴾، دوای ئەوەی ڕێنمایی و ڕێی ڕاستیان بۆ ڕوون بۆتەوە، ئەوانە چۆنن؟

٢)- ﴿ٱلشَّيْطَٰنُ سَوَّلَ لَهُمْ﴾، شەیتان ئەو هەڵگەڕانەوەیەی بۆ جوان کردوون، بۆی ڕازاندوونەوە، یان بۆی ئاسان کردوون، (سَوَّل)، هەم بە مانای (زَيَّن)و، هەم بە مانای (سَهَّل)ش دێ، بۆی جوان کردوون، بۆی ڕازاندوونەوەو، بۆشی ئاسان کردوون.

٣)- ﴿وَأَمْلَىٰ لَهُمْ﴾، (الإملاءُ: الإمْدَادُ وَالإمْهَال)، (إملاء)، بە مانای بۆ درێژ کردن و، مۆڵەت دان و، هاوکاریی کردن دێ، ﴿وَأَمْلَىٰ لَهُمْ﴾، شەیتان هاوکاریی کردوون و، ڕستی بۆ درێژ کردوون و، مۆڵەتی داون، ﴿وَأَمْلَىٰ لَهُمْ﴾، خوێندراویشەتەوە: (وأُمْلِيَ لَهُم)، واتە: مۆڵەتدراون و ڕستیان بۆ درێژ کراوەو، هەروەها خوێندراویشەتەوە: (وَأُمْلِي لَهُم)، واتە: ڕستم بۆ درێژ کردوون و دەرفەتم داون.

٤)- ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَالُوا۟ لِلَّذِينَ كَرِهُوا۟ مَا نَزَّلَ ٱللَّهُ سَنُطِيعُكُمْ فِى بَعْضِ ٱلْأَمْرِ﴾، ئەویش بە هۆی ئەوەوە کەسانێک کە ئەوەیان دەدزا، خوا دایبەزاندوەو ڕقیان لێی بوو (کە قوڕئانە)، پێیان گوتن: لەمەودوا لە هەندێک کاردا بە قسەتان دەکەین.

ئنجا ئایا ئەوانەی کە ئەوەیان دزاوە، کە خوا دایبەزاندوەو ڕقیان لێی بووەو کەیفیان پێی نەهاتوە، کێن؟ دوو ئەگەری هەن:

أ- دەگونجێ مەبەست پێی جوولەکەکان بێ، بە نسبەت ئەو کاتەوە.

ب- دەشگونجێ مەبەست پێی هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان بێ، لە خەڵکی مەککە.

بەڵام بە نسبەت ئێستاو دوای ئێستاوە، کە بە دڵنیایی قوڕئان بەس بۆ ئەو کاتە نەهاتوە، هەموو ئەوانەی ئەوەیان دەدزێ کە خوا دایبەزاندوەو، ڕقیان لەو قوڕئانەیە کە خوا دایبەزاندوە، هەموویان دەگرێتەوە، چ خاوەن کتێب بن، چ بێ کتێب بن، هەر نەتەوەو هەر زمانێک بن و، لە هەر شوێنێک بن.

کە دەفەرموێ: ﴿سَنُطِيعُكُمْ فِى بَعْضِ ٱلْأَمْرِ﴾، لە مەودوا لە هەندێ کاردا بە قسەتان دەکەین، (الأمر: شأن الشِّرك وما يُلائِم أهلَه)، ﴿فِى بَعْضِ ٱلْأَمْرِ﴾، واتە: لە هەندێک کاردا، هەندێک کارەکە چییە؟ ئەوەیە پەیوەندیی بەو خەڵکەوە

هەبـووە، کـە بەڵێنیـان پێـدراوە، ئنجـا ئەگـەر جوولەکـە بـوون، هاوبـەش بـۆ خـوا دانـەر بـوون، پێیـان گوتـوون: بـە قسـەتان دەکەیـن لـە هەندێـک شـتدا، کـە ئـەوان مەبەسـتیان بـووە، نەشـیان گوتـوە: (**فِي كُلِّ أُمـور**)، تاکـو قسـەیەک نەکـەن، بۆیـان نەکـرێ، هەروەهـا تاکـو خۆیـان پابەنـد نەکـەن بـە شـتێکەوە، دوایـی کەشـف بـن و هەمـوو کـەس تێیـان بـگات، بـەڵام ئەگـەر لـە هەندێـک کاردا بـێ بـە پەنهانکاریـی، بـە قسـەیان بکـەن، کەشـف نابـن و ناناسرێـن.

٥)- ﴿وَاللَّهُ يَعْلَمُ إِسْرَارَهُمْ﴾، خواش پەنهانکردنەکەیان دەزانێ، واتە: چ قسە پەنهان بکەن، چ ڕەفتار پەنهان بکەن، خوا ﷻ دەیزانێ.

﴿إِسْرَارَهُمْ﴾، خوێندراویشەتەوە: (**أَسْرَارَهُم**)، خوا نهێنییەکانیان دەزانێ.

(**أسرار**)، کـۆی (**سِرّ**)ە، واتـە: خـوا پەنهانەکانیـان دەزانـێ و، نهێنییەکانیـان دەزانـێ، بـەڵام (**إِسْرَار**) چاوگـە، واتـە: پەنهانکردنەکەیـان دەزانـێ، ئنجـا چ قسـە پەنهـان بکـەن، چ کـردارو ڕەفتاریـان پەنهـان بکـەن، خـوا دەیزانـێ و پێـی ئـاگادارە، لێـرەدا زانایـان گوتوویانـە: دەبـێ مەبەسـت پێـی کـێ بـێ؟ مەبەسـت لـەو جـۆرە کەسـانە کـە خـوا ﷻ باسـیان دەکات: هەڵگەڕاونـەوەو، لەسـەر پاشـوانیان، بـەرەو پاشـەوە ڕۆیشـتوونەوەو، دوای ئـەوەی ڕێـی ڕاسـتیان بۆ ڕۆشـن بۆتەوە، شـەیتانیش ئـەو کارەی بـۆ جـوان و ئاسـان کـردوون، پاشـان هاوکاریـی کـردوون و ڕسـتی بـۆ درێـژ کـردوون، ئـەو هەڵگەڕانەوەشـیان دەرەنجامـی ئـەوە بـووە، کـە بەوانەیـان گوتـوە، ڕقیـان لـەوە بـووە، خـوا ﷻ بـۆی دابەزانـدوون، لـە هەنـدێ کاردا بـە قسـەتان دەکەیـن، ئایـا ئەوانـە کـێ بـوون؟ زانایـان سـێ ئەگەریـان بـۆ دانـاون:

**یەکەم:** دەگونجێ مەبەست پێی کەسانێک لە دەغەڵ و مونافیقەکان بێ، کە بڕوایەکی ڕاستەقینەیان هێناوە، بەڵام دوایی بەهۆی ئیمان بێهێزییەوە، یان بە هۆی شوبهەو ئیشکالێکەوە کە بۆیان دروستبووە، یان بە هۆی بەرژەوەندییەکی دنیاییەوە کە پێچەوانەی ئیمان و پێچەوانەی ئیسلام بووە، لێی هەڵگەڕاونەوە.

**دووەم:** دەگونجێ مەبەست پێی تێکڕای ئەو مونافیق و دەغەڵانە بێ، کە بڕیاریان داوە لەسەر کوفر بمێننەوە، دوای ئەوەی بەشداریی پێغەمبەر ﷺو مسوڵمانانیان کردوە لە کۆڕو مەجلیسیانداو، لە نوێژیانداو، لە کار و چالاکییەکانیاندا، بەڵام دڵی خۆیان لەسەر ئەوە ساغ کردۆتەوەو، لە لای خۆیانەوە بڕیاریان داوە، کە لێبڕاوانە لەسەر کوفری خۆیان بەردەوام بن.

**سێیەم:** دەشگونجێ مەبەست پێی کۆمەڵێک لە مونافیقەکان بووبێ، کە بەشداریی مسوڵمانانیان نەکردوە لە جەنگ دا، لە حاڵێکدا کە زانیویشیانە ئەوە ئەرکێکی ئیسلامەو، هەقە، واتە: لەگەڵ ئەوەشدا لەگەڵ کارەکانی دیکەی مسوڵمانان بەشدار بوون، بەڵام لە جەنگ و جیهادو ڕووبەڕوو بوونەوەی دوژمناندا، بەشدارییان نەکردوە هەرچەندە بە هەقیان زانیوە.

دوایی خوا ﷻ لە بارەی سەرەنجامی ئەوانەوە دەفەرموێ:

٦)- ﴿ فَكَيۡفَ إِذَا تَوَفَّتۡهُمُ ٱلۡمَلَـٰٓئِكَةُ ﴾، ئنجا ئایا حاڵ و کاریان چۆن دەبێ، کاتێک فریشتەکان دەیانمرێنن! ﴿ فَكَيۡفَ ﴾، ئنجا کە لێرەدا خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ فَكَيۡفَ إِذَا تَوَفَّتۡهُمُ ٱلۡمَلَـٰٓئِكَةُ ﴾، حاڵیان چۆن دەبێ کاتێک کە فریشتەکان دەیانمرێنن، مانای وایە هەر لە یەکەم مەنزڵگای ڕۆژی دواییەوە، کە مردنە، لە وێوە ئازارو سزا و ئەشکەنجە بۆ بێبڕوایان دەست پێ دەکات، ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿ فَكَيۡفَ ﴾، ئەمە بۆ سەرسوڕماندنە، واتە: حاڵێکی زۆر خراپیان دەبێ، وابێ، سەرت لێی سوڕبمێنێ، دوایی باس دەکات کە فریشتەکان گیانیان دەکێشن چییان لێ دەکەن؟

٧)- ﴿يَضۡرِبُونَ وُجُوهَهُمۡ وَأَدۡبَـٰرَهُمۡ ﴾، لە دەم و چاویان دەدەن و لە پشتەوەشیان دەدەن، هەم لە ڕوویان دەدەن و، زەبریان تێ دەسرەوێنن و، هەم لە پشتشیان زەبر دەسرەوێنن، بۆچی خوا ﷻ ئەو دوو لایەی دیاریی کردوون؟

**یەکەم:** ئەو دەم و چاوەی پاراستوویانە لە زەبری شمشێر، ئەگەر بچن بۆ جەنگ و جیهادو لەگەڵ ئەهلی کوفردا، ڕووبەڕوو ببنەوە، فریشتە لەو دەم و چاوەیان دەدەن،

ئەو پشتەیان کە ئەگەر بەشداریی جەنگ ببوونایە، لە ترسان پشتیان لە دوژمن دەکرد، لەو پشتەشیان دەدەن، کە لە ئەگەری بەشداربوونیان دا، ئەوانە پاشیان (پشتیان) دەکردە دوژمن.

**دووەم:** واتایەکی دیکەی: ﴿يَضْرِبُونَ وُجُوهَهُمْ وَأَدْبَارَهُمْ﴾، واتە: لە هەموو لایەکیان دەدەن، زەبر لە هەموو لایەکیان دەسرەوێنن، کەسێک بە یەکێک دەڵێ: لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای، لە پێش و دواییدا، یانی: لە هەموو لایەکیدا.

٨)- ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمُ اتَّبَعُوا مَا أَسْخَطَ اللَّهَ وَكَرِهُوا رِضْوَانَهُ﴾، ئەوەش بەهۆی ئەوەوە شوێن ئەوە کەوتوون، کە خوای تووڕە کردوە، {کە بریتیە لە شیرک و، کوفرو، نیفاق و، شوێن ئەو شتانە کەوتوون کە مایەی تووڕە بوونی خوان ﷻ}و ڕقیشیان لە ڕەزامەندیی خوا بووە، واتە: ڕقیان لەو هۆکارانە بووە، کە مایەی ڕازییکردنی خوان، کە لە ئیسلام و کارو ئەرکەکانی ئیسلامدا بەرجەستەن.

کە دەفەرمووێ: ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمُ اتَّبَعُوا مَا أَسْخَطَ اللَّهَ﴾، واتە: ئەو مردنە سامناکە، ئەو سزاو ئازارە، کە فریشتەکان لە سەرە مەرگدا لە دەم و چاویان دەدەن و، لە پشتیان دەدەن، بەهۆی ئەوەوەیە کە ئەوانە شوێن ئەوە کەوتوون، خوای تووڕە کردوەو، ڕقیشیان لە ڕەزامەندیی خوا بووە، یانی: لەو کارانەی ڕەزامەندیی خوایان بۆ دەستەبەر دەکەن، بۆیە خوا ﷻ کردەوەکانی لێ هەڵوەشاندوونەوە، کەواتە: شوێن کەوتنی ئەو شتانەی، مایەی تووڕە کردنی خوان، پێویستکەری ئەوە بووە، لە دەم و چاویان بدرێ، هەروەک ڕق هەڵسانیان لەو شتانەی جێگای ڕەزامەندیی خوان و، پشتتێکردنیان لە ڕەزامەندیی خوا، هۆکاری ئەوە بووە، لە پشتیان بدرێ.

٩)- ﴿فَأَحْبَطَ أَعْمَالَهُمْ﴾، ئنجا (بۆیە خوا ﷻ) کردەوەکانی لێ هەڵوەشاندونەوەو، کەواتە: شوێن کەوتنی ئەو شتانەی مایەی تووڕە کردنی خوان، پێویستکەری ئەوە بووە لە دەم و چاویان بدرێ، هەروەها ڕق هەڵسانیان لەو شتانەی جێگای ڕەزامەندیی

خوان و، پشتتێکردن لە ڕەزامەندیی خوا، هۆکاری ئەوە بووە، لە پشتیان بدرێ و، لە ئاکامیش دا: هەڵوەشانەوەی کردەوەکانیشیان و پووچەڵکردنەوەی کردەوە باشەکانیان، بە جۆرێک نەتوانن لێیان بەهرەمەند بن لە ڕۆژی دواییدا.

## مەسەلەی سێیەم:

**موونافیقـە دەروون ناسـاغەكان خەیـاڵ پـڵاو دەكـەن، ئەگـەر پێیـان وابـێ خـوا بوغـزو كینـەی دەروونیـان دەرناخـات، بەڵكـو ئەگـەر خـوا ﷻ بیـەوێ بـە قیافـەو دیمەنیـان دەناسرێـن و، مسـۆگەر پێغەمبـەری خـوا (موحەممـەد ﷺ) بـە شـێوازو ئـاوازی قسـەیان دەیانناسـێ و، خـواش كردەوەكانیـان دەزانـێ، بەدڵنیاییـش دەیانجەڕبێنـێ، تاكـو لـە نێویانـدا تێكۆشـەرانی فیـداكارو خۆڕاگـران دەزانـێ و، هـەواڵ و هەڵوێسـتەكانیان بـێ پـەردە دەخاتـەڕوو:**

خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ أَمْ حَسِبَ الَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ أَن لَّن يُخْرِجَ اللَّهُ أَضْغَانَهُمْ ﴿٢٩﴾ وَلَوْ نَشَاءُ لَأَرَيْنَاكَهُمْ فَلَعَرَفْتَهُم بِسِيمَاهُمْ ۚ وَلَتَعْرِفَنَّهُمْ فِي لَحْنِ الْقَوْلِ ۚ وَاللَّهُ يَعْلَمُ أَعْمَالَكُمْ ﴿٣٠﴾ وَلَنَبْلُوَنَّكُمْ حَتَّىٰ نَعْلَمَ الْمُجَاهِدِينَ مِنكُمْ وَالصَّابِرِينَ وَنَبْلُوَ أَخْبَارَكُمْ ﴿٣١﴾ ﴾.

## شیكردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە حەوت بڕگەدا:

١)- ﴿ أَمْ حَسِبَ الَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ أَن لَّن يُخْرِجَ اللَّهُ أَضْغَانَهُمْ ﴾؟، بەڵكو ئایا ئەوانەی دڵەكانیان نەخۆشییان تێدایە، پێیان وایە: خوا كینەكانیان وەدەرنانێ و دەرناخات؟ زانایان هەندێكیان (أم) یان بە (بَل) لێك داوەتەوەو، هەندێكیش گوتوویانە: هەم مانای (بَل) و، هەم مانای (أ) هەمزەی پرسیاركردن دەگەیەنێ، واتە: بەڵكو ئایا ئەوانەی دڵیان نەخۆشیی تێدایە، پێیان وایە خوا كینەكانیان نەخاتە دەرێ؟ ئەو كینەو بوغزانەی لە دڵ و دەروونیاندان! ئەو نەخۆشییە بریتیە لە دوو دڵیی و، نیفاق و، شیرك و، كوفر، بەڵام بە پێی ڕەوت زیاتر مەبەست پێی: دوو دڵیی و دەغەڵییە.

﴿ أَن لَّن يُخْرِجَ اللَّهُ أَضْغَانَهُمْ ﴾، واتـە: كـە هەرگیـز لـە داهاتوودا كینـەو بوغزەكانیان كـە بەرانبـەر ئیسـلام و مسـوڵمانان هەیانـە، خـوا ﷻ نەیانخاتـە گـۆڕێ، ئـەو كینـەو بوغزانەیـان بـۆ پێغەمبـەری خـوا ﷺ و مسـوڵمانان كەشـف نـەكات؟ (أَضْغـان)،

کـۆی (ضِغـن)، یـان (ضَغـن)ە، واتـە: کینـە (**الحِقـد**)، کـە بریتیـە لـە: پەسـتییەک و ڕق لێبوونەوەیەکـی پەنهـان لـە نێـو دڵـدا، (**ما يُضْمَرُ مِنَ المَكـرُوهِ**)، ئـەو خراپەیـەی لـە دڵـدا پەنهـان دەکـرێ (**ضِغـن**) و (**ضَغـن**)، بریتیـە لـە: شـتی خـراپ کـە پەنهـان دەکـرێ، یـان (**غِـشّ**) یـانی: ناپاکیـی، یـان (**حَسـد**) واتـە: ئیرەیـی، یـان (**حِقـد**)، واتـە: کینـە، یـان (**عَـداوة**)، دوژمنایەتیـی زانایـانی ڕوونکـەرەوەی قورئـان، بـە هەمـوو ئـەو واتایانەیـان هێنـاوە، کـە ڕەنگـە لـە هـەر سـیاقێک دا مانایـەک یـان زیاتـر بێتـە زەینـەوە، چونکـە هەنـدێ وشـە کـە خـوا ﷻ لـە قورئانـدا بـە کاری هێنـاون، چەنـد واتایـەک بـە دەسـتەوە دەدەن، هەندێکیـان مانـای ڕاسـتەقینەیانەو، هەندێکیـان مانـای خوازراویانـە، یـان مانـای مەجازییانـە، بـەڵام بـە پێـی سـیاقەکان، یەکێـک لـەو مانایانـە زیاتـر زاڵ دەبـێ، کـە مەبەسـت بـێ.

٢)- ﴿وَلَوْ نَشَآءُ لَأَرَيْنَـٰكَهُمْ﴾، ئەگەر ویستبامان ئەوانمان پێشانی تۆ دەدا.

ئەمە لێرەدا دوو واتای هەن:

أ- (**أي: لأَرَيْنَاكَ أَشْخَاصَهُم فَعَرَفْتَهُم**)، خودی ئەو کەسانەمان پێشانی تۆ دەداو دەتناسین.

ب- یاخود: (**لذَكَرنا لَكَ أَوصَافَهُم فَعَرَفْتَهُم بِهَا**)، سیفەتەکانیانمان بۆت ڕوون دەکردنەوە کە بەو سیفەتانە بیانناسی.

٣)- ﴿فَلَعَرَفْتَهُم بِسِيمَـٰهُمْ﴾، ئەو کاتە تۆ بە نیشانەیان دەتناسین، (ل)ی سەر: ﴿لَأَرَيْنَـٰكَهُمْ﴾، کە دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ نَشَآءُ لَأَرَيْنَـٰكَهُمْ﴾، ئەو لام (ل)ە، وەڵامی: ئەگەر ﴿وَلَوْ﴾ە، ئەگەر ویستبامان پێشانمان دەدای، سەرەنجام بە هۆی نیشانەیانەوە دەتناسین، (**سيما وسِمياء: العَلاَمَةُ الملاَزِمَة وَأَصْلُهُ: أَسْمَى مِن الوَسْمِ، وَهُوَ جَعْلُ سِمَةٍ للشيء**)، (**سيما، وسمياء**)، نیشانەیەکە کە پەیوەست بێ بە شتێکەوە، ئەصڵەکەشی لە (**وَسْم**)ەوە هاتوە، ئەویش لە (**أسمی**)یە، واتە: شتێک بکرێتە نیشانە بۆ شتێک.

٤)- ﴿وَلَتَعْرِفَنَّهُمْ فِى لَحْنِ ٱلْقَوْلِ﴾، بە دڵنیایی تۆ بە هۆی لادانی قسەوە دەیانناسی، یان بە هۆی ئاوازی قسەوە، یان شێوازی قسەوە، ئاشنایان دەبی، وشەی: ﴿لَحْنِ﴾، بە

هەر سێ واتایەکە هاتوە، (**اللَّحْنُ: النَّغْمَةُ، وَاللَّحْنُ: الأُسْلُوبُ، وَاللَّحْنُ: الكَلاَمُ الَّذِي يَكُونُ عَلَى غَيْرِ ظَاهِرِه، لِيَفْطِنَ لَهُ مَنْ يُرَادُ أنْ يَفْهَمَهُ، دُونَ أَنْ يَفْهَمَهُ غَيْرُه**)، وشەی (**لَحْن**)، هەم بە مانای ئاواز دێ، هەم بە مانای شێواز دێ، هەم بە مانای قسەیەک دێ، کە ڕواڵەتەکەی مەبەست نەبێ، ئەو کەسەش کە دەویسترێ تێیبگات، تێی بگات، بێ ئەوەی خەڵکی دیکە لێی حاڵیی بێ.

دەفەرموێ: تۆ لە ئاوازی قسەیان، یان لە شێوازی قسەیان و، یان لە بادانی قسەیانەوە، دەیانناسی.

٥)- ﴿وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ أَعۡمَٰلَكُمۡ﴾، خواش بە گشتیی کردەوەکانتان دەزانێ، کردەوەکانتان دەزانێ هی هەموو لایەک بە چاک و خراپەوە.

کە دەفەرموێ: ﴿وَلَتَعۡرِفَنَّهُمۡ فِي لَحۡنِ ٱلۡقَوۡلِۚ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ أَعۡمَٰلَكُمۡ﴾، (**إحْتِرَاسٌ مِمَّا يَقْتَضِيهِ مَفْهُومُ (لَو نَشَاءُ لأَرَيْنَاكَهُم) مِنْ عَدَمِ وُقُوعِ مَشْيئَةٍ لإِرَائَتِهِ إِيَّاهُم بِنُعوتِهِم، أي: إنْ لَمْ نُرِكَ إيَّاهُم بِسِيمَاهُم، فَلَتَقَعَنَّ مَعرِفَتُكَ بِهِم مِن لَحْنِ كَلاَمٍ بِإلهامٍ يَجعَلُهُ اللهُ لِرَسُولِهِ**)، ئەوە بۆ خۆ پاراستنە لەوەی چەمکی ئەو فەرمایشتە دەیخوازێ، کە پێشێ فەرمووی: ﴿وَلَوۡ نَشَآءُ لَأَرَيۡنَٰكَهُمۡ﴾، (ئەگەر ویستبامان ئەوانمان پێشانی تۆ دەدات)، کە خوا ﷻ نەیویستوە ئەوانی پێشان بدات بە سیفەتەکانیان، کە وانەزانرێ بە هیچ جۆرێ خوا ﷻ ئەوانی پێشانی پێغەمبەر ﷺ نەداوە، واتە: ئەگەر ئەوان پێشانی تۆ نەدەین، بە نیشانەکانیان، بە دڵنیایی ناسینی تۆ بۆ ئەوان هەر دێتە دی، بە هۆی ئاوازو شێوازی قسەیانەوە، یاخود بە هۆی لادانی قسەیانەوە بەخورپە و ئیلهامێ کە خوا ﷻ بۆ پێغەمبەری خۆی ﷺ دەیرەخسێنێ.

٦)- ﴿وَلَنَبۡلُوَنَّكُمۡ حَتَّىٰ نَعۡلَمَ ٱلۡمُجَٰهِدِينَ مِنكُمۡ وَٱلصَّٰبِرِينَ﴾، بە جەختکردنەوەوە، ئێمە تاقیتان دەکەینەوە، تاکو تێکۆشەران لە ئێوەو خۆڕاگران بزانین.

دەگونجێ (**جهاد**) مەبەست پێی جەنگ و کوشتار بێ، دەشگونجێ مەبەست پێی هەر جۆرە تێکۆشانێکی دیکە بێ.

﴿وَٱلصَّٰبِرِينَ﴾، هەروەها خۆڕاگران لە ئێوە، تاقیتان دەکەینەوە تاکو تێکۆشەران لە نێو ئێوەدا دەزانین و، خۆڕاگران لە نێو ئێوەدا دەزانین، خۆڕاگران لەسەر جەنگ و جیهادو جگە لە جەنگ و جیهادییش.

٧)- ﴿وَنَبْلُوَاْ أَخْبَارَكُمْ﴾، هەواڵەکانیشتان دەجەڕبێنین، تاقییدەکەینەوە، واتە: هەواڵەکانتان و هەڵوێستەکانتان دەردەخەین، (**البَلْو: الإِخْتِبَارُ وتَعَرُّفُ حَالِ الشَّيء**)، (**بلو**): بریتیە لە تاقیکردنەوەو زانینی حاڵی شتێک.

کە دەفەرموێ: ﴿حَتَّىٰ نَعْلَمَ﴾، (**حَتَّى حَرْفُ انْتِهاءٍ، فَمَا بَعْدَهَا غَايَةٌ لِلفِعْلِ الَّذِي قَبْلَهَا، وَهِيَ هُنَا مُسْتَعْمَلَةٌ فِي مَعْنَى لاَمِ التَّعْلِيلِ**)، (**حتى**): پیتێکە بۆ کۆتایی شتێک بەکاردێ، ئنجا ئەوەی لە دواوەی دێ، ئامانجە بۆ ئەوەی لە پێشیەوە باسکراوە، کە لێرەدا (**حتى**)، بەکارهێنراوە بە مانای لامی هۆکار دۆزیی (**لام التعليل**)، یانی: (**لِنَبلُوَنَّكُمْ لِنَعْلَمَ المُجَاهِدِينَ مِنْكُم**)، بەڵام بۆچی (**حَتَّى**) بەکارهاتوە؟ یانی: ئەو تاقیکردنەوەیە بەردەوام دەبێ، تاکو سەرەنجام ئەوانەتان کە تێکۆشەرن و فیداکارن و، ئەوانەشتان کە خۆڕاگرن، دەزانین و دەردەکەون، یانی: بە زمانی حاڵ، یان لە واقیعدا دەردەکەون، ئەگەرنا خوا ﷻ هەر دەیانزانێ، ﴿وَنَبْلُوَاْ أَخْبَارَكُمْ﴾، هەروەها هەواڵەکانیشتان دەزانین، لەسەر ئەرزی واقیع هەواڵەکانتان دەردەکەون، تاکو بۆ خەڵک دەردەکەون و لە واقیعدا بەرجەستە دەبن.

﴿وَلَنَبْلُوَنَّكُمْ﴾، خوێنراویشەتەوە: (**يَبْلُوَنَّكُم**)، هەروەها ﴿حَتَّىٰ نَعْلَمَ﴾، خوێندراوەتەوەش: (**حَتَّى يَعلَمَ**)، و ﴿وَنَبْلُوَاْ﴾، خوێندراوەتەوەش: (**وَيَبْلُوَا**) بە هەموو شێوە خوێندنەوەکان هاتوون، واتە: تاقییتان دەکەینەوە، تاکو ئەو هەواڵانەی کە بە هۆیانەوە ستاییش دەکرێن، یاخود سەرزەنشت دەکرێن، دەردەکەون، ئێمە لێتان ناگەڕێین ئاوا وەک ماش و برنج تێکەڵ بن، بەڵکو تاقیتان دەکەینەوە، تاکو پاک و پیستان، چاک و خراپتان لێک دەکەینەوەو، ئەم ئایەتە وەک ئەو ئایەتەی سوورەتی (**آل عمران**) وایە، کە خوا ﷻ دەفەرموێ:

﴿ مَّا كَانَ ٱللَّهُ لِيَذَرَ ٱلْمُؤْمِنِينَ عَلَىٰ مَآ أَنتُمْ عَلَيْهِ حَتَّىٰ يَمِيزَ ٱلْخَبِيثَ مِنَ ٱلطَّيِّبِ ۗ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُطْلِعَكُمْ عَلَى ٱلْغَيْبِ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَجْتَبِى مِن رُّسُلِهِۦ مَن يَشَآءُ ۖ فَـَٔامِنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ ۚ وَإِن تُؤْمِنُوا۟ وَتَتَّقُوا۟ فَلَكُمْ أَجْرٌ عَظِيمٌ ﴿١٧٩﴾ ﴾، واتە: ناگونجێ خوا لە بڕواداران بگەڕێ، وەک ئەو حاڵەی کە ئێوە لەسەرینی، ﴿ حَتَّىٰ يَمِيزَ ٱلْخَبِيثَ مِنَ ٱلطَّيِّبِ ﴾، لێرەدا شتێک قرتێندراوە بە سیاق دەزانرێ، واتە: تاقیتان دەکاتەوە، تاکو پیس لە پاک جیا دەبێتەوەو، ناشگونجێ خوا ﷻ ئێوە لە پەنهان ئاگادار بکات، بەڵام خوا ﷻ لە پێغەمبەرانی خۆی هەڵدەبژێرێ، هەر کەسێ بیەوێ، (واتە: هەڵیاندەبژێرێ بۆ جەنگ و جیهادو فیداکاریی)، دەجا ئێوەش بڕوا بێنن بە خواو، پێغەمبەرانی خواو، ئەگەر بڕوابێنن و پارێز بکەن، پاداشتێکی مەزنتان هەیە.

عادەت و سوننەتی خوا وابووە لە ژیانی بەشەردا کە لێ نەگەڕێ خەڵک بە تێکەڵ و پێکەڵیی بمێنیتەوە، نەزانرێ کێ چۆنە؟ کێ بایی چەندە؟ کێ چەندەی ئیمان پێیە؟ کێ ئیمانی هەیەو کێ نیەتی؟ بەڵکو خوا ﷻ ڕووداوو پێشهاتەکان دێنێتە پێش، کارو کردەوەکان دێنێتە پێش، تاکو سەرەنجام وەک گوتراوە: لە بوارێدا، لاقی ڕەش و سپی دەردەکەوێ، لە تەنگانەو سەغڵەتییاندا، هەر کەسە جەوهەرو چییەتی خۆی دەردەخات.

خوای پەروەردگار بە لوتفی خۆی، یارمەتییمان بدات هەمیشە شتی باشمان لێ دەربکەوێ، بە تایبەتی لە تەنگانانداو، وامان لێ بکات بە هۆی تاقیکردنەوەکانەوە زیاتر ساغ و پتەو بین، پاک و چاک بین، هەواڵ و هەڵویستەکانمان مایەی سەربەرزییمان بن، لە دنیاو دوارۆژدا، نەک مایەی عەیبدارییمان.

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئـەم دەرسـەمان لـە حـەوت (٧) ئایـەتی کۆتایـی سـوورەتی (محمـد) پێـک دێ، ئایەتەکانـی: (٣٢ - ٣٨)، کـە تـەوەری سـەرەکییان باسـی بەرەنـگار بوونـەوەی بێبڕوایانـی شەڕفرۆشـەو، هاندانـی بڕوادارانـە لـەو بـارەوە:

١- چ بە بێهێزو ڕەنجەڕۆو دەستخەڕۆ پێشاندانی کافران، لە دنیاو دوارۆژدا.

٢- چ بە هۆشداریی پێدانی بڕواداران، کە کردەوەکانیان پووچەڵ نەکەنەوەو لە خۆیان وریابن.

٣- چ بە کەم بایەخ پێدانی ژیانی دنیای و ماددیی، خوا ﷻ ژیانی دنیا بە کەم بایەخ دەخاتەڕوو، تاکو ئەوەش هاندەر بێ بۆ مسوڵمانان بۆ فیداکاریی و، دەستیان بە دنیاوە نەبێ و، گوریس لە بن ڕانەخەن و، باوەشی پێدا نەکەن.

٤- چ بە هۆی خستنەڕووی ئەوە، کە خوا ﷻ لەگەڵ بڕواداران دایەو، پاداشتیان کەم ناکاتەوە، هی کردەوە باشەکانیان.

٥- چ بە خستنەڕووی ئەو ڕاستییە، کە خوا ﷻ جگە لە کەمێک ماڵ و سامانیان لێ داوا ناکات بیبەخشن.

٦- چ بە هەڕەشە لێکردنیان، کە ئەگەر پشت بکەنە ئیسلام، خوا ﷻ پەکی ناکەوێ و، کەسانێکی دیکە دێنێ، کە وەک ئەوان نابن، پشت لە ئیسلام بکەن و، پشت لە ئەرکەکانی سەرشانیان بکەن، کە ئایین و بەرنامەی خوا بۆیان دیاریی دەکات.

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَصَدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَشَآقُّواْ ٱلرَّسُولَ مِنۢ بَعۡدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ ٱلۡهُدَىٰ لَن يَضُرُّواْ ٱللَّهَ شَيۡـٔٗا وَسَيُحۡبِطُ أَعۡمَٰلَهُمۡ ﴿٣٢﴾ ۞ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ

﴿وَلَا تُبۡطِلُوٓاْ أَعۡمَٰلَكُمۡ ﴿٣٣﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَصَدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ثُمَّ مَاتُواْ وَهُمۡ كُفَّارٞ فَلَن يَغۡفِرَ ٱللَّهُ لَهُمۡ ﴿٣٤﴾ فَلَا تَهِنُواْ وَتَدۡعُوٓاْ إِلَى ٱلسَّلۡمِ وَأَنتُمُ ٱلۡأَعۡلَوۡنَ وَٱللَّهُ مَعَكُمۡ وَلَن يَتِرَكُمۡ أَعۡمَٰلَكُمۡ ﴿٣٥﴾ إِنَّمَا ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَا لَعِبٞ وَلَهۡوٞۚ وَإِن تُؤۡمِنُواْ وَتَتَّقُواْ يُؤۡتِكُمۡ أُجُورَكُمۡ وَلَا يَسۡـَٔلۡكُمۡ أَمۡوَٰلَكُمۡ ﴿٣٦﴾ إِن يَسۡـَٔلۡكُمُوهَا فَيُحۡفِكُمۡ تَبۡخَلُواْ وَيُخۡرِجۡ أَضۡغَٰنَكُمۡ ﴿٣٧﴾ هَٰٓأَنتُمۡ هَٰٓؤُلَآءِ تُدۡعَوۡنَ لِتُنفِقُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ فَمِنكُم مَّن يَبۡخَلُۖ وَمَن يَبۡخَلۡ فَإِنَّمَا يَبۡخَلُ عَن نَّفۡسِهِۦۚ وَٱللَّهُ ٱلۡغَنِيُّ وَأَنتُمُ ٱلۡفُقَرَآءُۚ وَإِن تَتَوَلَّوۡاْ يَسۡتَبۡدِلۡ قَوۡمًا غَيۡرَكُمۡ ثُمَّ لَا يَكُونُوٓاْ أَمۡثَٰلَكُم ﴿٣٨﴾﴾.

## مانای دەقاو دەقی ئایەتەکان

{بە دڵنیایی ئەوانەی بێبڕوا بوون و، خەڵکیان لە (بەرنامەو) ڕێی خوا لاداو، سەرپێچیی پێغەمبەریان کرد، دوای ئەوەی ڕاستە ڕێیان بۆ ڕوون بوو بۆوە، یەک تۆز (هیچ ئەندازەیەک)، زیان بە خوا ناگەیەنن و، کردەوەکانیشیان پووچەڵ دەکاتەوە ﴿٣٢﴾ ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! فەرمانبەریی خوا بکەن و، فەرمانبەریی پێغەمبەر بکەن و، کردەوەکانتان پووچەڵ مەکەنەوە ﴿٣٣﴾ بێگومان ئەوانەی بێبڕوابوون و ڕێگریی (خەڵک)یان کرد لە ڕێی خوا، دوایی لە حاڵێکدا مردن کە بێبڕوابوون، هەرگیز خوا لێیان نابووریّ ﴿٣٤﴾ ئنجا (ئەی بڕوادارینە!) بێهێز مەبن و، (لایەنی بەرانبەر) بانگ مەکەن بۆ ئاشتیی، لە حاڵێکدا ئێوە لە بەرزترانن و، خواش لەگەڵتانەو، کردەوەکانیشتان کەم ناکات ﴿٣٥﴾ بە دڵنیایی ژیانی دنیا یاریی و خافڵانەو، ئەگەر بڕواش بێنن و پارێز بکەن، پاداشتەکانتان دەداتێ و (خەرجکردنی سەرجەم) سامانەکانیشتان لێ داوا ناکات، بەڵکو داوای کەمێک لە ماڵ و سامانتان لێ دەکات ﴿٣٦﴾ ئەگەر بە جەختکردنەوە (ماڵ و سامانەکانتان) لێتان داوا بکات، ڕژدیی دەکەن و کینەکانیشتان (لە بەرانبەر فەرمانکردن بە خەرجکردن دا) لێتان (لە دڵ و دەروونتان) دەردێنێ ﴿٣٧﴾ ئەها (ئێستا) ئێوە بانگ دەکرێن، لە

ڕێـی خـوادا ببەخشـن، کەچـی هەتانـە چرووکیـی دەکات و، هـەر کەسـیش چرووکیـی بـکات، بەرانبـەر بـە (سـوودی) خـۆی ڕژدیـی دەکات و، خـواش بـێ نیـازەو، ئێـوەش هـەژارن و ئەگـەر پشـتیش هەڵبکـەن، (خـوا) کۆمەڵێکـی دیکـەی جگـە لـە ئێـوە دەکاتە جێدارتـان، ئنجـا ئـەوان وەک ئێـوەش نابـن (٣٨)}.

## شیکردنەوەی هەندێک لە وشەکان

(وَشَآقُّواْ ٱلرَّسُولَ): واتـە: سـەرپێچییان کـرد لـە پێغەمبـەر ﷺ (**الشِّـقَاقُ: المُخَالَفَـةُ وكَونُـكَ فـي شِـقٍّ غَـيرِ شِـقِّ صَاحِبِـكَ، أو مِـنْ : شَـقِّ العَصَـا بَيْنَـكَ وَبَيْنَـهُ**)، (**شِـقَاق**): بـە مانـای سـەرپێچیکردن، یـان ناکۆکییکـردن دێ، ئەویـش ئەوەیـە کـە تـۆ لـە لایـەک بـی، جگـە لـە لای بەرانبەرەکـەت، یاخـود لـەوەوە هاتـوە، کـە گۆچـان لـە بەینتانـدا بشـکێنرێ، لـەت بکـرێ.

(وَلَا تُبۡطِلُوٓاْ أَعۡمَٰلَكُمۡ): کردەوەکانتـان هەڵمەوەشـێننەوە، پووچـەڵ مەکەنـەوە، (**بَطَـلَ، بُطُـولاً، وَبُطْـلاً وبُطْلَانَـاً: ذَهَـبَ دَمُهُ بُطْـلاً: هَدَراً، والإبْطَالُ: إفْسَـادُ الـشَّيء وَإزَالَتُـهُ**)، دەگوترێ: (**بَطَـلَ، بُطُـولاً، وبُطْـلاً وبُطْلَانَـاً**)، واتـە: پووچـەڵ بـۆوەو، پووچـەڵ بوونـەوە، دەگوتـرێ: (**ذَهَـبَ دَمُـهُ بُطْـلاً**)، واتـە: خوێنەکـەی بـە بـەلاش چـوو، پووچـەڵ بـوو، (**إبطـال**): بریتیـە لـە تێکـدان و لابردنـی شـتێک و پووچەڵکردنـەوەو بـێ ئێـوەڕۆک کردنـی.

(فَلَا تَهِنُواْ): (**الوَهْـنُ: ضَعْـفٌ مِـنْ حَيْـثُ الخَلْـقِ والخُلُـقِ**)، (**وَهـن**): بریتیـە لـە بێهێزیـی لـە ڕووی جەسـتەوەو، لـە ڕووی ئـاکارەوە، (فَلَا تَهِنُواْ)، واتـە: (**فَـلا تَضْعُفُـوا**)، بێهێـز مەبـن، چ لـە ڕووی جەسـتەیی و ڕواڵەتـەوە، خۆتـان بێهێـز پیشـان بـدەن، چ لـە ڕووی دەروونـەوە تێـک بشـکێن.

(ٱلسَّلۡمِ): (**السَّـلْمُ: الصُّلْـحُ، والسِّـلْمُ والسَّلْمُ: إسْـمٌ بـإزَاءِ الحَـرْبِ**)، وشـەی (**سَـلم**): بـە مانـای ئاشـتەوایی و صوڵـح دێ، (**سِـلْم و سَـلْم**)، لـە بەرانبـەری جەنگـدا دێ.

(وَأَنتُمُ ٱلۡأَعۡلَوۡنَ): واتـە: ئێـوە بەرزتـرن، (**العُلُـوّ: الإرْتِفَـاعُ، وَالأَعْـلَى: الأَشْرَف، عَـلاَ يَعْلُـو عُلُـوًّا، وهُـوَ عَـالٍ، وَعَـلِيَ يَعْلَى عَـلاَءً**)، (**عُلُـوًّا**): بـە مانـای بەرزیـی دێ، (**أَعْـلَى**)، بـە مانـای باشـتر دێ، وەک چـۆن بـە مانـای بەرزتـر دێ، بـە مانـای باشـتریش دێ، دەگوتـرێ: (**عَـلاَ يَعْلُـو عُلُـوًّا، وَهُـوَ عَـالٍ**)، بەرزبـوو، بـەرز دەبـێ، بـەرز بوونـەوە، ئـەو بـەرزە، هەروەهـا (**عَـلِيَ يَعْـلَى عَـلاَءً**)، ئەمیـش هـەر بـە مانـای بـەرز بـوو، بـەرز دەبـێ، بـەرز بوونـەوە.

(وَلَن يَتِرَكُمۡ): (**لَـن يَنْقُصَكُـم**)، واتـە: لێتـان کـەم نـاکات، (**وَتَرتُـهُ: أَصَبْتُـهُ بِمَكـرُوهٍ**)، (**وَتَرتُـهُ**): خراپەیەکـم بەسـەر هێنـا، لێـرەدا بـە مانـای (**لَـنْ يَظْلِمَكُـم أُجُـورَ أَعْمَالِكُـم فَيَنقُصَكُـم ثَوَابَهَـا**)، کـە دەفەرمـوێ: ﴿وَلَن يَتِرَكُمۡ أَعۡمَٰلَكُمۡ﴾، واتـە: ستەمتان لێنـاکات، کـە لـە پاداشـتی کردەوەکانتـان کـەم بکاتـەوە، دەگوتـرێ: (**وَتـرْتُ الرَّجُـلَ: أي: قَتَلْـتُ لَـهُ قَتِيْـلاً، أو أَخَـذْتُ لَـهُ مَـالاً غَصْبَـاً**)، (**وَتـرتُ الرَّجُـلَ**): واتـە: کوژراوێکـم لـێ کوشـت، یاخـود مـاڵ و سـامانەکەیم بـە زۆر لـێ زەوتکـرد.

(لَعِبٞ): (**لَعِـبَ فُـلاَنٌ إِذَا كَانَ فِعْلُـهُ غَـيْرَ قَاصِـدٍ مَقْصِـدَاً صَحِيْحَـاً**)، (**لَعِـب**): بـە کوردیـی دەڵێیـن: یاریـی و گەمـە، (**لَعِـبَ فُـلاَنٌ**)، ئەگـەر کەسـێک کردەوەکـەی ئامانجـدار نەبـێ، ئامانجێکـی بـاش و ڕاسـتیی لـە پشـتەوە نەبـێ، دەگوتـرێ: گەمـە و یاریـی دەکات.

(وَلَهۡوٞ): (**مَـا يَشْـغُلُ الإنْسَـانَ عَـمَّا يُهِمُّـهُ وَيَعْنِيـهِ**) (**لَهْـو**): بریتیـە لـەوەی مـرۆڤ بێئـاگا بـکات و لـە شـتێک بیخافڵێنـی کـە بـە لایـەوە گرنگـە، واتـە: شـتێکی لاوەکیـی کـە مـرۆڤ سـەرقاڵ بـکات، لـە شـتێک کـە بـە لایـەوە گرنگـەو جێـی مەبەسـتە.

کەواتە: (**لَعِب**): بە یاریی و گەمە دێ، (**لَهُو**): بە مانای خافڵان دێ.

(فَيُحۡفِكُمۡ): (**الإحْفَـاءُ فِي السُّـؤَالِ: الشـدّة فِي الإلْحَـاحِ بالمُطَالَبَـةِ، أَحْفَيْـتُ الدَّابَّـةَ: جَعَلتُهَـا حَافِيَـاً**)، (**الإحْفَـاءُ فِي السُّـؤَالِ**)، ئەوەیـە کەسـێک زۆر داوای شـتێک لـە کەسـێک بـکات، زۆر داوای لێبـکات و مکـوور بـێ لـە سـەری و، دەگوتـرێ: (**أَحْفَيْـتُ الدَّابَّـةَ**)، واتـە: ئاژەڵەکـەم پـێ خـواس کـرد، کـە وڵاخ و ئێسـترو جـاری وایـە کەریـش، ناڵیـان لـە

بنی پێیان داون، ئنجا ئەگەر ناڵی وڵاخەکەی لێکردبێتەوەو، کە لەجێی پێڵاوی مرۆڤە، ئەوە پێی گوتراوە: (**أَحفَيتُ الدَّابَّةَ**)، وڵاخەکەم و، ئاژەڵەکەم پێخواس کرد، ئنجا کەسێک زۆر داوای شتێک لە کەسێک دەکات، وەک ئەوە وایە پێڵاوەکەی یان بەرگەکەی لێستاندبێ و، زۆری شت لێ داوا کردبێ.

(تَبْخَلُوا): (**البُخْلُ: إِمْسَاكُ المُقْتَنِيَاتِ عَمَّا لاَ يَحِقُّ حَبْسُهَا عَنْهَا، وَيُقَابِلُهُ الجُودُ**)، (**بُخل**): بریتییە لە دەست پێوە گرتنی ئەو شتانەی کە نابێ دەستیان پێوە بگیردرێ و، دەبێ ببەخشرێن، پێچەوانەی (**بُخْل**)، کە بە کوردیی دەڵێین: چرووکیی، یان ڕژدیی یان دەست نووقاندن، پێچەوانەکەی و بەرانبەرەکەی بریتییە لە: دەستکراوەیی و بەخشندەیی.

(يَسْتَبْدِلْ): (**الإِبْدَالُ وَالتَّبْدِيلُ والتَّبَدُّلُ والإِسْتِبْدَالُ: جَعْلُ الشَّيءِ مَكَانَ آخَر، وَهُوَ أَعَمُّ مِنَ العِوَضِ، فَإِنَّ العِوَضَ هُوَ أَنْ يَصِيرَ لَكَ الثَّانِي بِإِعْطَاءِ الأَوَّلِ**)، (يَسْتَبْدِلْ)، واتە: دەگۆڕێ، لادەبات، ئنجا (**إِبْدَالُ وتَبْدِيلُ وتَبَدُّلُ وإِسْتِبْدَال**)، مانای هەرچواریان، ئەوەیە کە تۆ شتێک لە جێی شتێکی دیکە دابنێی، ئەوە گشتییترە لە قەرەبوو (**عِوَض**)، کە ئەوەیە دووەم بێتە هی تۆ، بە هۆی ئەوەوە کە تۆ یەکەم دەبەخشی، بڵێی: ئەو شتەم بدەیەو، ئەو شتەت دەدەمێ، ئەوە قەرەبوو (**عوض**)ە، بەڵام (**إِبْدَالُ وتَبْدِيلُ وتَبَدُّلُ وإِسْتِبْدَال**)، ئەوەیە کە شتێک بگۆڕی بە شتێک، ئنجا چ دووەمت بێتە دەستێ، یان نا.

## مانای گشتیی ئایەتەکان

خـوا ﷻ لـە کۆتایـی سـوورەتی (**محمـد**)دا، وەک لـە پێناسـەی ئـەم دەرسـەش دا باسـمان کـرد، هـەم بۆمـان باسـی بێبڕوایانـی خەڵـک لـە ڕێـی خـوا لادەرو سـەرپێچیکار بـۆ پێغەمبـەر ﷺ دەکات، دوای ئـەوەی ڕێـی ڕاسـتیان بـۆ ڕۆشـن بۆتـەوە، کـە ئەوانـە زیـان بـە خـوا ﷻ ناگەیەنـن و، خـوا ﷻ کـردەوە باشەکانیشـیان لـێ پووچـەڵ دەکاتـەوە.

هـەم فەرمـان بـە بـڕواداران دەکات، کـە فەرمانبەریـی خـواو پێغەمبەرەکـەی بکـەن و، ئاگاداریـش بـن شـتێک نەکـەن، کردەوەکانیـان پووچـەڵ بکـەن.

دوایـی خـوا ﷻ چەند شـتێک دەفەرمـوێ، کە هەموویـان هانـدان و ورە وەبەرنانن بـۆ مسـوڵمانان، لـە بـواری جەنـگ و فیداکاریـی داو، هاندانیانـن بـۆ بەخشـینی هـەم سـەریان، هـەم ماڵیـان، لـە پێنـاو بـەرز ڕاگرتنـی بەیداغی ئیسـلامدا.

خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَصَدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ﴾، بـە دڵنیایـی ئەوانەی بێبڕوابـوون و لـە ڕێـی خوایـان لادا (خەڵکیـان لـە ڕێـی خـوا لادا)، واتـە: بێبڕوابـوون بـە هەمـوو ئـەو شـتانەی دەبـوو بڕوایـان پـێ بێنـن، یـان بـە یەکێـک لـەو شـتانە بێبـڕوا بـوون، چونکـە ئیـمان ئەوەیـە بـڕوا بـە هەمـوو ئـەو شـتانە بێنـی، کـە پێویسـتە ئیمانیـان پـێ بهێـنرێ، ئنجـا دەبیـە بـڕوادار، بـەڵام بێبڕوایـی، ئەگـەر بـە یەکێـک لـەو شـتانەی پێیـان دەبێتـە ئیمانـدار، بێبـڕوا بـێ، ئـەو مرۆڤـە دەبێتـە بێبـڕوا، واتـە: بێبڕوایـی پەکـی لەسـەر ئـەوە نەکەوتـوە بـە هەمـوو ئـەو شـتانە بێبڕوابـێ، کـە دەبـێ بڕوایـان پـێ بهێـنرێ، بـەڵام بڕواهێنـان (**إيمـان**) بـە هەمـوو شـتەکان نەبـێ، نایەتـە دی.

خـوا ﷻ دەفەرمـوێ: ئەوانـەی بێبـڕوا بـوون و لـە ڕێـی خوایـان لادا، یاخـود خەڵکیـان لادا، چونکـە: (صَـدَّ)، هـەم بـە لازیـم هاتـوە، ﴿ صَـدَّ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ﴾، (**أي:**

إنْحَرَفَ وإنْصَرَفَ) لایدا، هەم بە (مُتعدِّي)یش هاتوە، یانی: (صَرَفَ عَنْ سَبيلِ اللهِ، وَحَرَّفَ عَنْ سَبيلِ اللهِ)، واتە: خەڵکی لاداو هەتڵە کرد لە ڕێی خوا، لێرەدا مانای دووەمیان زیاتر وا پێدەچێ مەبەست بێ، ﴿وَشَآقُّواْ ٱلرَّسُولَ مِنۢ بَعۡدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ ٱلۡهُدَىٰ﴾، دووبەرەکێیان لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ کردو سەرپێچییان لێ کرد، دوای ئەوەی ڕێی ڕاستیان بۆ ڕوون بۆوە، تا ئەوانە: ﴿لَن يَضُرُّواْ ٱللَّهَ شَيۡـٔٗا﴾، بە هیچ ئەندازەیەک زیان بە خوا ﷻ ناگەیەنن، ﴿وَسَيُحۡبِطُ أَعۡمَٰلَهُمۡ﴾، لە مەودوا (خوا ﷻ) کردەوە باشەکانیان پووچەڵ دەکاتەوە، ئەو کردەوە باشانەی بە ڕواڵەت باش بوون، ئەگەر نوێژەو لەگەڵ مسوڵماناندا دەیکەن، ئەگەر ڕۆژووە، دەیگرن، ئەگەر جەنگ و جیهادە، دەیکەن، ئەگەر ماڵە، دەیبەخشن، هەموو ئەو کردەوە بە ڕواڵەت باشانە، چونکە ئەوانە هەوێنی ئیمانیان تێدانیە، بەڵکو بە پێچەوانەوە ژەهرو میکرۆبی شیرک و کوفرو نیفاقیان تێدایە، هەموو ئەوانە خوا ﷻ کردەوەکانیان پووچەڵ دەکاتەوە، کە بێگومان لە خودی خۆیاندا پووچەڵن و، خوا پاداشتیان ناداتەوە.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ﴾، ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! (بە هەموو ئەو شتانەی پێویستە بڕوایان پێ بهێنرێ)، فەرمانبەریی خوا ﷻ بکەن و فەرمانبەریی پێغەمبەر ﷺ بکەن، واتە: خوا ﷻ چی دەفەرموێ، جێبەجێی بکەن و، ئەوەش کە پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموێ، بە قسەی بکەن و جێبەجێی بکەن، ﴿وَلَا تُبۡطِلُوٓاْ أَعۡمَٰلَكُمۡ﴾، کردەوە (باشە)کانیشتان هەڵمەوەشێننەوە، واتە: پووچەڵ مەکەنەوە، جاری وایە کردەوەی باش، بە پێچەوانەکەی خۆی پووچەڵ دەبێتەوە، وەک لە سوورەتی (البقرة)دا، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تُبۡطِلُواْ صَدَقَٰتِكُم بِٱلۡمَنِّ وَٱلۡأَذَىٰ كَٱلَّذِي يُنفِقُ مَالَهُۥ رِئَآءَ ٱلنَّاسِ وَلَا يُؤۡمِنُ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِۖ فَمَثَلُهُۥ كَمَثَلِ صَفۡوَانٍ عَلَيۡهِ تُرَابٞ فَأَصَابَهُۥ وَابِلٞ فَتَرَكَهُۥ صَلۡدٗاۖ لَّا يَقۡدِرُونَ عَلَىٰ شَيۡءٖ مِّمَّا كَسَبُواْۗ وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿٢٦٤﴾﴾، ئەی ئەوانەی بڕواتان

هێناوە! خێرو بەخشینەکانتان بە هۆی منەت کردن و ئازاردانی دڵی بابای چاکە لەگەڵدا کراوو پێبەخشراوەوە، هەڵمەوەشێننەوە...

دوایی دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَصَدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ثُمَّ مَاتُواْ وَهُمْ كُفَّارٌ فَلَن يَغْفِرَ ٱللَّهُ لَهُمْ ﴾، بە دڵنیاییەوە ئەوانەی بێبڕوا بوون و، خەڵکیان لە ڕێی خوادا لاداوە، دواییش مردوون لە حاڵیکدا کە بێبڕوا بوون، ئەوانە هەرگیز خوا لێیان نابووریٚ، واتە: با خەیاڵ پڵاو نەکەن، لەبەر ئەوەی هەندیٚ کردەوەی باش دەکەن بە ڕواڵەت، میوانداریی دەکەن، ماڵ دەبەخشن، هاوکاریی دەکەن، هەندێک چاکە دەکەن، پێیان وابیٚ خوا ﷻ بەوە دەیانبووریٚ، مادام بێبڕوا بوون و خەڵکیان لە ڕێی خوادا لاداوە، ئەگەر بە کافریی مردبن، هەرگیز خوا لێیان نابووریٚ.

ئەمەش بۆ زیاتر تیژکردنی مسوڵمانانە لەسەر ئیمان و، خۆپاراستنیانە لە کوفرو هەڵوەشانەوەی کردەوەکانیان و، بۆ بەرچاو ڕوونییانە لە بارەی نەیارو ناحەزەکانیانەوە، کە ئەوان دەست بە تاڵن و دەست خاڵیین لە ڕۆژی دواییداو، خراپترین سەرەنجامیان هەیە، بۆیە لێیان مەترسن و شەرمیان لیٚ مەکەن و لێیان بیٚ باک بن.

بۆیە دوایی دەفەرموێ: ﴿ فَلَا تَهِنُواْ وَتَدْعُوٓاْ إِلَى ٱلسَّلْمِ ﴾، ئێوە بێهێز مەبن (ئەی مسوڵمانینە! لە ڕووی جەستەییەوە بێهێزیی پێشان مەدەن و مەکڕووزێنەوەو مەلاڵێنەوە، لە ڕووی دەروونییەوەش خۆتان بە بێهێز مەزانن، (**الوَهنُ: الضَّعْفُ خَلْقًا أو خُلُقًا**)، (**وَهْن**): بریتیە لە بێهێزیی لە ڕووی ڕواڵەت و جەستەیی، یاخود لە ڕووی دەروونیی مەعنەوییەوە، خوا ﷻ کە دەفەرموێ: بێهێز مەبن، واتە: خۆتان بە بێهێز پێشان مەدەن، قسەیەکی وا مەکەن و هەڵوێستێکی وا مەنوێنن، بەرانبەرەکەتان بە بێهێزتان بزانیٚ، ﴿ وَتَدْعُوٓاْ إِلَى ٱلسَّلْمِ ﴾، کە سەرەنجام: بانگ بکەن بۆ ئاشتیی، دوژمنێک کە سەنگەری لێگرتوون، بڵێن: وەرە با ئاشتیی بکەین، لە ڕاستییدا ئاشتیی و ئاشتەوایی بە خەڵکی بەهێز دەکریٚ، نەک بە خەڵکی

بێهێز، کاتێک تۆ لە حاڵەتێکی بێ هێزییدای و، خۆت بە بێهێز دەزانی، ئەگەر بانگی بەرانبەرکەت بکەی بۆ ئاشتیی، مەرجەکانی خۆیت لە سەر فەرز دەکات، بۆیە دەفەرموێ: ﴿ وَأَنتُمُ ٱلۡأَعۡلَوۡنَ ﴾، بانگی بەرانبەرەکەتان مەکەن بۆ ئاشتیی لە حاڵێکدا ئێوە بەرزترن، ئەمە دوو واتای هەن:

أ- لە حاڵێکدا ئێوە باڵادەستن، لە بەرانبەرەکەتان مەپاڕێنەوە، بڵێن: وەرن با ئاشتیی بکەین!.

ب- لە حاڵێکدا ئێوە لە ڕووی مەعنەوییەوە بەهێزترن، خاوەنی بووناسیی و تێڕوانینێکن، بەس ئەوە بووناسیی و تێڕوانینی ڕاست و دروستە، خاوەنی ئیمان و عەقیدەیەکن، خاوەنی پەرستشێکن، خاوەنی ڕەوشتێکن، خاوەنی بەرنامەیەکن، کە تەنیا ئەوە بەرنامەیە، لە حاڵێکدا کە ئێوە، ئاوا بەرزترن، بگرە هەرە بەرزن، بانگی بەرانبەرەکەتان مەکەن بۆ ئاشتیی، ﴿ وَٱللَّهُ مَعَكُمۡ ﴾، خواش لەگەڵتانە، ﴿ وَلَن يَتِرَكُمۡ أَعۡمَٰلَكُمۡ ﴾، کردەوەکانیشتان لێ کەم ناکاتەوە، واتە: پاداشتی کردەوەکانتان لێ کەم ناکاتەوە، ستەمتان لێ بکات.

هەڵبەتە ئەم ئایەتە موبارەکە شیکردنەوەی زیاتری دەوێ و، لە مەسەلە گرنگەکاندا زیاتر شیی دەکەینەوە، کە ئایا خوا ﷻ بە موتڵەقیی لە مسوڵمانانی قەدەغە کردوە، بانگی بەرانبەرەکانیان بکەن بۆ ئاشتیی؟ یاخود ئەمە حاڵەتی تایبەتیی خۆی هەیەو، ئایەتەکەی سوورەتی (**الأنفال**)یش، کە دەفەرموێ: ﴿ وَإِن جَنَحُواْ لِلسَّلۡمِ فَٱجۡنَحۡ لَهَا وَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱللَّهِۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ ﴾، ئەگەر ئەوان باڵیان شۆڕ کرد بۆ ئاشتیی، تۆش باڵی بۆ شۆڕبکەو، پشت بە خوا ببەستە.

ئەویش حاڵ و مەقامی خۆی هەیە، هەندێک لە زانایان گوتوویانە: ئەم ئایەتە ئەوەی سوورەتی (**الأنفال**)ی نەسخ کردۆتەوە، هەندێکیش گوتوویانە: ئەوەی سوورەتی (**الأنفال**) ئەمەی نەسخ کردۆتەوە! بەڵام لە ڕاستییدا ئەو قسانە هیچیان ڕاست نین، وەک دوایی باس دەکەین، بە داخەوە هەندێک لە توێژەرەوانی قورئان زۆر داڵغەیان بەوەوە لێداوە ئایەتێک بدۆزنەوە، بڵێن: ئەو ئایەتە فلان ئایەتەی نەسخ کردۆتەوە، یان ئەو ئایەتە نەسخ کراوەتەوە بە فلان ئایەت!!.

ئێستاش لەگەڵدابێ هەندێک کەس مەراقیەتی، بڵێ: فلان ئایەتە فلانی نەسخ کردۆتەوە، یان فلان ئایەتە نەسخ کراوەتەوە بە فلان ئایەتە، لە حاڵێکدا ئەمە خاڵێکی بێهێزە، کە فەرمایشتێکی خوا ﷻ فەرمایشتێکی دیکەی خوای پێ نەسخ بکەی!! بە هەر حاڵ ئێمە لە شوێنی خۆی بە تەفصیل باسمان کردوە، لە تەفسیری سووڕەتی (**البقرة**)داو، تاکو ئێستاش کە گەیشتووینە ئێرە، یەک ئایەتمان نەهاتۆتە بەرچاو ناچار بین بڵێین: ئەو ئایەتە نەسخ کراوەتەوە، یان ئەو ئایەتە نەسخکەرەوەیە بۆ فلان ئایەتەی دیکە[1].

لە کۆتاییدا خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ إِنَّمَا ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا لَعِبٌ وَلَهْوٌ ﴾، بە دڵنیایی ژیانی دنیا، تەنیا گەمەو خافڵانە، یاریی و خافڵانە، یانی: لە ڕووە مادییەکەیەوە، کەواتە: باوەشی پێدا مەکەن و، ژیانی دنیا گوریسی لە بن ڕامەخەن، با واتان لێ نەکات بە هۆی دەست پێوەگرتنی دنیاو ڕابواردنی دنیاوە، کە وەک گەمەو خافڵانی منداڵان وایە، لە بەرانبەر دوژمنانتاندا دەستەوکەر نەکەن و بە چۆک دابێن، ﴿ وَإِن تُؤْمِنُوا۟ وَتَتَّقُوا۟ ﴾، ئەگەر بڕوا بێنن و پارێز بکەن، ﴿ يُؤْتِكُمْ أُجُورَكُمْ ﴾، پاداشتەکانی خۆتانتان بە تەواویی دەداتێ، ﴿ وَلَا يَسْـَٔلْكُمْ أَمْوَٰلَكُمْ ﴾، هەموو ماڵ و سامانەکەشتان لێ داوا ناکات بیبەخشن، (کەمێکتان لێ داوا دەکات)، ﴿ إِن يَسْـَٔلْكُمُوهَا فَيُحْفِكُمْ ﴾، ئەگەر (خوا) ماڵ و سامانەکانتان هەمووی لێ داوا بکات و، بە جەختکردنەوەو، بە مکووڕیی داواتان لێ بکات، ﴿ تَبْخَلُوا۟ ﴾، ئێوە چرووکیی و ڕژدیی دەنوێنن، ﴿ وَيُخْرِجْ أَضْغَٰنَكُمْ ﴾، ئەو کاتەش کینەکانتان دەردەخات، واتە: ئەگەر خوا ماڵ و سامانەکانتان هەمووی لێ داوا بکات بیبەخشن، دوایی ڕقتان هەڵدەستێ لە ماڵ بخشین، لەبەر ئەوەی خۆتان ئاتاج و نەدار دەکەونە گۆڕێ، بۆیە خوا ﷻ وای نەکردوەو واناکات لەگەڵتان.

---

(١) لە بابەتی: (قورئانی مەزن لە نۆزدە تەوەردا) کە لە شێوەی کتێبێکی سەربەخۆدا چاپ کراوەو، لە چاپی دووەمیشی دا دەکرێتە پێشەکی کۆی ئەم تەفسیرەو، لە سەرەتای بەرگی یەکەم دا دادەنرێ، وردتر لە بارەی نەسخەوە دواوین.

﴿هَٰٓأَنتُمۡ هَٰٓؤُلَآءِ تُدۡعَوۡنَ لِتُنفِقُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾، ئەوەتا ئێوە بانگ دەکرێن، کە لە ڕێی خوادا ببەخشن، واتە: هەندێ لە ماڵ و سامانەکانتان لە ڕێی خوادا ببەخشن، ﴿فَمِنكُم مَّن يَبۡخَلُ﴾، کەچی هەتانە لەو کەمەش دا ڕەزیلیی و چرووکیی دەکات، ﴿وَمَن يَبۡخَلۡ فَإِنَّمَا يَبۡخَلُ عَن نَّفۡسِهِۦ﴾، هەر کەسیش چرووکیی بکات، بەرانبەر خۆی چرووکیی دەکات، بە زیانی خۆی ڕژدیی و چرووکیی دەکات و، لە پاداشتی خۆی کەم دەکاتەوە، ﴿وَٱللَّهُ ٱلۡغَنِيُّ وَأَنتُمُ ٱلۡفُقَرَآءُ﴾، خواش دەوڵەمەندو بێ نیازەو، ئێوەش هەژارو نەدارن، ﴿وَإِن تَتَوَلَّوۡاْ﴾، ئەگەر پشتیش هەڵکەن و، ڕو و وەرگێرن لە ئیسلام، بەهۆی ماڵ نەبەخشینەوە، بە هۆی جەنگ و جیهاد نەکردنەوە، پشت لە ئیسلام بکەن، یان پشت لە هەر ئەرکێکی شەرعیی بکەن، کە کەوتۆتە سەرشانتان، ﴿يَسۡتَبۡدِلۡ قَوۡمًا غَيۡرَكُمۡ﴾، خوا ﷻ کۆمەڵێکی جیا لە ئێوە دەهێنێ، ئێوە لادەبات و ئەوان دێنێ و شوێنی ئێوەیان پێ دەگرێتەوە، ﴿ثُمَّ لَا يَكُونُوٓاْ أَمۡثَٰلَكُم﴾، دوایی ئەوان وەک ئێوە نابن، کە ئەرکە شەرعییەکانیان باش ئەنجام نەدەن و، پشت لە ئەرکە شەرعییەکان بکەن.

کەواتە: بترسێن لەوەی خوا ﷻ ئێوە لابەرێ و، کەسانێکی دیکەی لە ئێوە باشتر بێنێ، خوا ﷻ پەکی لەسەر هیچکەس ناکەوێ.

## مەسەلە گرنگەکان

### مەسەلەی یەکەم:

**بێبڕوایانی لادەرو، خەڵک لادەر لە ڕێی خواو، سەرپێچیکاری پێغەمبەر ﷺ، دوای بۆ ڕۆشن بوونەوەی ڕاستە ڕێ، هیچ زیانێک بە خوا ﷻ ناگەیەنن و، کردەوەکانیشیان پووچەڵ دەکاتەوە:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَصَدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَشَآقُّواْ ٱلرَّسُولَ مِنۢ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ ٱلْهُدَىٰ لَن يَضُرُّواْ ٱللَّهَ شَيْـًٔا وَسَيُحْبِطُ أَعْمَٰلَهُمْ ﴿٣٢﴾ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە سێ بڕگەدا:

١)- ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَصَدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ﴾، بێگومان ئەوانەی بێبڕوا بوون و خەڵکیان لە ڕێی خوا لادا.

پێشتریش گوتمان: (صَدٌّ) هەم بە مانای (لایدا) دێ، هەم بە مانای (خەڵکی لادا) دێ، هەم بە مانای (إنصَرَفَ)، هەم بە مانای (صَرَفَ غَيره).

﴿ سَبِيلِ ٱللَّهِ ﴾ش، یانی: ڕێبازی خوا، کە مەبەست ئەو بەرنامەیە بە پێغەمبەری کۆتایی دا ﷺ ناردوویەتی.

ئایا مەبەست لەوانەی بێبڕوان و خەڵکیان لە ڕێی خوا لاداوە، کێیە؟ بە دڵنیایی هەر کەسێ خەڵک لە ڕێی خوا لابدات، خۆشی پێشتر لادەرە، لە ڕێی خوا: (مَنْ كَانَ صَارِفًا عَنْ سَبيلِ اللهِ، فَهُوَ مُنْصَرِفٌ بِالأَولَى عَنْ سَبيلِ اللهِ)، ئنجا ئایا مەبەست پێیان کێیە؟

١- هـەندێک لە زانـایان گوتوویانە: مەبەست پێی خـاوەن کتێبەکانە، بە تـایبەتیی جوولەکەکان.

٢- هەندێکیش گوتوویانە: مەبەست پێی هاوبەش بۆ خوادانەرانی مەککەو دەورووبەریەتی.

٣- هەندێکیش دەڵێن: مەبەست پێی بێبڕوایەکانە بە گشتیی.

بـەڵام بـە پێـی ئـەو سـیاق و کـەش و بارودۆخـە کـە ئایەتەکانـی تێـدا هاتوونـە خـوار، مانـای سـێیەمیان زیاتـر دێتـە زەینـەوە، کـە مەبەسـت پێـی کـۆی ئەوانەیـە بێبـڕوان، چ جوولەکـە چ نەصرانیـی چ مەجووسـیی و چ صابیئـە، چ بـێ کتێـب بـن، کـە بتپەرسـتەکانن، چ ئەوانـە بـن کـە بڕوایـان بـە هیـچ شـتێک نیـە، کـە مولحیـدو زەندیقـەکان دەگرێتـەوە.

٢)- ﴿ وَشَآقُّواْ ٱلرَّسُولَ مِنۢ بَعۡدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ ٱلۡهُدَىٰ لَن يَضُرُّواْ ٱللَّهَ شَيۡـٔٗا ﴾، (ئنجا ئەوانە هەر بەوەندە وازیان نەهێناوە کە خۆیان بێبڕوان بن و، خەڵکیش لە ڕێی خوا لابدەن، بەڵکو) سەرپێچیی و بەربەرەکانێی پێغەمبەریشیان کردوە، دوای ئەوەی ڕێی ڕاستیشیان بۆ ڕۆشن بۆتەوە، ئەوان هەرگیز هیچ زیانێک لە خوا نادەن.

﴿ وَشَآقُّواْ ﴾، (**المُشَاقَّةُ: المُخَالَفَـةُ والعِصْيَـان**): (**مُشـاقّة**) بریتیـە لـە سـەرپێچییکردن و یاخیـی بـوون، (**المُشَـاقَّةُ أو الشِّـقَاقُ هُـوَ أَنْ تَكُـونَ أَنْـتَ فِي شِـقٍّ، وَطَرَفُـكَ المُقَابِـلُ فِي شِـقٍّ آخـر**)، (**مُشـاقة وشـقاق**) ئەوەیـە: تـۆ لەلایـەک بـی و، بەرانبەرەکەشـت لەلایەکـی دیکـە بـێ، کەسـانێک کـە بـەو شـێوەیەن، کـە لێـرەدا خـوا ﷻ چـوار سـیفەتی خراپـی لـێ هەڵـداون:

**یەکەم**: بێبڕوا بوون بە هەرچی کە پێویست بووە ئیمانی پێ بێنن، ئەوان پێی بێبڕوا بوون، چونکە خوا ﷻ بە ڕەهایی فەرموویەتی: ﴿ كَفَرُواْ ﴾.

**دووەم**: خۆیان لە ڕێی خوایان لاداوەو خەڵکیشیان لاداوە: ﴿ وَصَدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ﴾.

**سێیەم**: بەربەرەکانێی پێغەمبەریان کردوەو سەرپێچییان لێکردوە: ﴿ وَشَآقُّواْ ٱلرَّسُولَ ﴾.

**چوارەم:** ﴿مِنۢ بَعۡدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ ٱلۡهُدَى﴾، دوایی ئەوەی کە ڕێی ڕاستیشیان بۆ ڕۆشن بۆتەوە، یانی: دژایەتییەکەیان بۆ پێغەمبەری خوا ﷺو، خەڵک لە ڕێ لادانەکەیان و، بێبڕواییەکەیان، پێش هەموو شتێک، بە هۆی نەزانییەوە نەبووەو بە هۆی بێ ئاگاییەوە نەبووە، بەڵکو دوای ئەوە بووە کە ڕێی ڕاستیان بۆ ڕۆشن بۆتەوە، (**تَبَيُّنُ الهُدى: ظُهورُ الإسلامِ وَمَعرِفَتُهُ**)، (**هدى**) یانی: ڕێی ڕاست، (**تَبَيُّنُ الهُدى**) مەبەست پێی دەرکەوتنی ئیسلامەو ناساندنی ئیسلامە.

ئنجا کەسانێک بەو شێوەیە بن: ﴿لَن يَضُرُّواْ ٱللَّهَ شَيۡـٔٗا﴾، بە دڵنیاییەوە هەرگیز، هیچ زیانێ بە خوا ناگەیەنن.

{﴿شَيۡـٔٗا﴾: **مفعول مُطْلَقٌ لِـ(يَضُرُّوا) والتنوين للتقليل، أي: أَقَلَّ ضَرَرٍ، والمَقصُود الإِضْرَارُ بِدِينِ اللهِ**}، کە دەفەرموێ: ﴿لَن يَضُرُّواْ ٱللَّهَ شَيۡـٔٗا﴾، هەرگیز زیان بە خوا ناگەیەنن، ﴿لَن﴾ەکە، کرداری ﴿يَضُرُّواْ﴾ی پێ (**منصوب**) بووە، ﴿ٱللَّهَ﴾: بەرکار (**مفعول به**)ەکەیەتی و ﴿شَيۡـٔٗا﴾، بەرکاری ڕەها (**مفعول مطلق**)ە، بۆ ﴿يَضُرُّواْ﴾، تەنوینی سەر ﴿شَيۡـٔٗا﴾، بۆ کەمکردنەوەیە، واتە: کەمترین زیان ناگەیەنن، بە خوا ﷻ، کە مەبەست پێی زیانگەیاندنە بە ئایین و بەرنامەی خوا.

بێگومان لێرەدا کە دەفەرموێ: هیچ زیان بە خوا ناگەیەنن، ئەگەر مەبەست پێی خوا بێ، بێگومان هیچ زیانێکی پێ ناگەیەنن، بەڵام ئەگەر مەبەست پێی ئایین و بەرنامەی خوا بێ، واتە: ئەو زیانەی پێ ناگەیەنن کە پەکی بخەن و نەهێڵن بڵاوبێتەوە، بەڵام بە دڵنیایی زیان و ئازار دەگەیەنن، بە پێغەمبەر ﷺو بە بڕواداران و، دەبنە کۆسپ و پەرچ لە بەردەم ئیسلامدا، بۆیە دەبێ ورد بین! ئەگەر مەبەست پێی زیانگەیاندن بە خوا بێ، بێگومان هیچ جۆرە زیانێک بە خوا ناگەیەنن، بەڵام لە مانایەکەیدا دەبێ بگوترێ: ﴿لَن يَضُرُّواْ ٱللَّهَ﴾، {(**أي لَن يَضُرُّوا دِينَ اللهِ**)، أو (**رَسولَ اللهِ**)، أو (**كِتابَ اللهِ**)}، بێگومان دەبێ بەو شێوەیە واتا بکرێ، واتە: هیچ جۆرە زیانێکی پێ ناگەیەنن، پەکی ئایینی خوا بخەن

و نەهێڵن بڵاوبێتەوە، یان: پەکی پێغەمبەر ﷺ بخەن و ڕێ نەدەن ئەرکی خۆی جێبەجێ بکات، یان: پەکی قورئان بخەن و نەهێڵن ڕۆشناییەکەی بڵاوبێتەوە، ئەوەیان لە دەست نایەت، بەڵام بێگومان جگە لەوە، زیانیان لە دەستهاتوەو نکووڵیی لێناکرێ.

٣)- ﴿وَسَيُحْبِطُ أَعْمَالَهُمْ﴾، بە دڵنیایی (خوا) کردەوەکانیشیان پووچەڵ دەکاتەوە، (**الإِحْبَاطُ: الإِبْطَالُ وَالإِزَالَة**)، (**إِحْبَاط**): هەڵوەشاندنەوەو، پووچەڵکردنەوەو لابردنە، ئایا مەبەست لە: ﴿أَعْمَالَهُمْ﴾، چییە؟ دوو ئەگەری هەن:

أ- دەگونجێ مەبەست پێی کردەوە ڕێک و باشەکانیان بێ، (**وَسَيُحْبِطُ أَعْمَالَهُمُ الصَّالِحَةِ**)، کردەوە باشەکانیان هەڵدەوەشێنێتەوە، چونکە ئەوانەش هەر چۆن بێ، کردەوەی چاکیان هەربووە: بەخشینیان کردوە، قسەیەکی خێریان کردوە، چاکەیەکیان کردوە، چونکە بتپەرستەکان و خاوەن کتێبەکانیش، بە پێی ئایینی خۆیان چەند پەرستیشێکیان ئەنجام داون و، هەندێ ڕەوشتی باشیان لە خۆیان دا هێناونە دی، خوا ئەوانەیان لێ هەڵدەوەشێنێتەوە، چونکە ئەو کردەوە باشانەیان، لەبەر ئەوەی کوفرو نیفاق و شیرکیان تێکەڵە، وەک خواردنێکی باش وان، کە ژەهری تێدا کرابێ.

ب- دەشگونجێ مەبەست لە کردەوەکانیان، ئەو هەوڵ و کۆششانەیان بێ، کە لە دژی ئیسلام و مسوڵمانان ئەنجامیان داون، واتە: ئەو هەوڵ و کۆششانەیان، خوا ﷻ پووچەڵیان دەکاتەوەو بێ ئاکامیان دەکات، بەو واتایە کە ئەو هەوڵ و کۆششانەیان نابنە هۆی هێنانە دی، ئەو ئامانجە گڵاوەی لە دڵیان گرتوە، کە بریتیە لە کوژاندنەوەی چرای خواو، نەهێشتنی ئایینی خواو، ڕێی لێگرتنی بڵاوبونەوەی پەیامی خوا.

## مەسەلەی دووەم:

**فەرمانکردن بە بڕواداران کە فەرمانبەریی خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ بکەن و وریابن! کردەوە باشەکانیان پووچەڵ نەکەنەوە، بە هۆی هەڵسوکەوت و ڕەفتارێکەوە، کە پێچەوانەی ئیمان و ئیسلامە:**

خوا  دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَلَا تُبْطِلُوٓاْ أَعْمَٰلَكُمْ ﴿٣٣﴾﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە دوو بڕگەدا:

١)- ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ﴾، ئەی ئەوانی بڕواتان هێناوە! فەرمانبەریی خواو فەرمانبەریی پێغەمبەر بکەن، یانی: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە بە هەموو ئەو شتانەی پێویستە بڕوایان پێ بهێنرێ! ﴿أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ﴾، فەرمانبەریی و گوێڕایەڵیی خوا بکەن و فەرمانبەریی و گوێڕایەڵیی پێغەمبەر بکەن، واتە: ئەوەی خوا ﷻ پێتان دەفەرموێ: جێبەجێی بکەن و، ئەوەی پێغەمبەر ﷺ پێتان دەفەرموێ: جێبەجێی بکەن، فەرمانبەریی خواو پێغەمبەرەکەی، ئەوەیە: کە فەرمانەکانیان جێبەجێ بکرێن و، قەدەغە کراوەکیانیان دوورییان لێ بکرێ.

٢)- ﴿وَلَا تُبْطِلُوٓاْ أَعْمَٰلَكُمْ﴾، هەروەها کردەوەکانتان هەڵمەوەشێننەوە، پووچەڵ مەکەنەوە، کردەوەکان، مەبەست پێیان کردەوە باشەکانن، چونکە بە مسۆگەریی لە ئیمان بەس کردەوەی باش هەڵدەقوڵێن، مەگەر کەسێ لەگەڵ ئیمانەکەیدا ڕاست نەکات.

## کورتە سەرنجێک لەسەر هەڵوەشانەوەی کردەوەی باش

بەڕێـــــزان! ئەم کورتە سەرنجە دوو بڕگەیە:

### ا) کردەوەی باش بە چی پووچەڵ دەبێتەوە؟

بێگومـان کـردەوەی بـاش بـە بێبڕوایـی و بـە هەندێـک لـە گوناهـە گـەورەکان هەڵدەوەشـێتەوە، ئـەوە کـە بـە بێبڕوایـی کـردەوەکان هەڵدەوەشـێنەوە، گومانـی تێدانیـە، چونکـە کوفـر وەک تەورێـک وایـە، ئەسـڵی درەختـی ئیـمان و کـردەوەی بـاش لـە ڕیشـەوە دەبـڕێ، بۆیـە خـوا ﷻ لـەو شـوێنانەدا کـە باسـی هەڵگـەڕاوەکان دەکات، چ لـە سـوورەتی (**البقـرة**)دا، چ لـە سـوورەتی (**محمـد**)و، چ لـە شـوێنەکانی دیکـەدا، بـە زۆریـی وایـە قەیـدی ئـەوەی دەخاتـە سـەر، کـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَمَاتُواْ وَهُمْ كُفَّارٌ ﴾**البقـرة: ١٦١**، ﴿ فَيَمُتْ وَهُوَ كَافِرٌ ﴾**البقـرة: ٢١٧**، دەفەرمـوێ: (لـە کاتێکـدا بمـرن کـە بێبـڕوان)، (بـە بێبڕوایـی بمـرێ)، ئەوانـە کردەوەکانیـان هەڵدەوەشـێنەوەو، بـەڵام وێـڕای کوفـرو شـیرک، کـە بێگومـان شـیرکیش جۆرێکـە لـە جۆرەکانـی کوفـر، هـەروەک ئیلحادیـش جۆرێکـە لـە جۆرەکانـی کوفـر، بەڵـێ وێـڕای کوفـر، کـردەوە باشـەکان، هەموویـان نـا، بەڵکـو هەندێکیـان و، بە هەندێـک لە گوناهـە گەورەکانیش، کـە ڕێـک پێچەوانـەو دژی خۆیانـن، هەڵدەوەشـێنەوە، بـۆ وێنـە:

خـوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تُبْطِلُواْ صَدَقَٰتِكُم بِٱلْمَنِّ وَٱلْأَذَىٰ ﴾**البقرة: ٢٦٤**، واتـە: ئـەی ئەوانـەی بڕواتـان هێنـاوە! خێـر کردنەکانتـان، (بەخشـینەکانتان) بـە هـۆی منەتکـردن و ئازاردانـەوە، هەڵمەوەشـێننەوە، کـە هاوکاریـی کەسـێک دەکـەی و چاکەیەکـی لەگەڵـدا دەکـەی، ئەگـەر منەتـی لەسـەر بکـەی، ڕووبـەڕوو، یاخـود ئـازاری بـدەی پاشـەملە، واتـە: باسـی بکـەی و پێـی بگاتـەوە، کـە دڵـی پێـی ئـازار

بدرێ، چ بە منەتکردنی ڕووبەڕوو، چ بە ئازاردانی پاشەملە، ئەو خێرو چاکەو بەخشینەت، هەڵدەوەشێتەوە، ئەگەرنا لە ئەسڵدا چاکەکان خراپەکان دەسڕنەوە، وەک خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلْحَسَنَٰتِ يُذْهِبْنَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ﴾ هود: ١١٤، بە دڵنیایی چاکەکان خراپەکان لادەبەن.

هەروەها پێغەمبەر ﷺ لە فەرمایشتێکدا دەفەرموێ: {**وَأَتْبِعِ السَّيِّئَةَ الحَسَنَةَ تَمْحُهَا**} (**أخرجه الترمذي: ١٩٨٧، وَصَحَّحَهُ الألباني في «صحيح الجامع»: ٩٧**)، بە دوای خراپەدا چاکە بکە، دەیسڕێتەوە.

ئنجا ئەوە کە چاکەکان خراپەکان دەسڕنەوە، هیچ گومانی تێدا نیە، بەڵام هەندێک جاریش هەندێک لە خراپان - بە تایبەتی گوناهە گەورەکان - هەندێک لە چاکەکان هەڵدەوەشێننەوە، بۆیەش دەڵێم: هەندێکجار، چونکە بۆ وێنە: کەسێ قەتڵێک دەکات، زینایەک دەکات، دزییەک دەکات، شەڕاب دەخواتەوە، ڕاست نیە بگوترێ: هەرچی کردەوەی باش هەیەتی، هەڵوەشاوەتەوە، هەروەک هەموو چاکەیەکیش، هەموو خراپەیەک لا نابات، بەڵکو ئەو چاکەو خراپانەی کە دژو پێچەوانەی یەکدیین، یەکدی لادەبەن، بۆ نموونە: ماڵ بەخشین بە منەتکردن و ئازاردانی بابای ماڵ پێ بەخشراو، هەڵدەوەشێتەوە، چونکە ڕێک دژیەتی، ماڵ پێ بەخشین، چاکە لەگەڵ کردنیەتی، بەڵام منەت لەسەرکردن و ئازاردانی، ڕێک دژی ئەوەیەو، هەڵیدەوەشێنێتەوە، هەروەها کوفر ڕێک دژی ئیمانەو هەڵیدەوەشێنێتەوە، شیرک ڕێک دژی خوا بە یەکگرتنەو هەڵیدەوەشێنێتەوە، ڕیابازیی ڕێک دژی تاعەت و کار بۆ خوا ئەنجامدانە، ڕیابازیی واتە: سەرنج ڕاکێشانی خەڵک بە شتێک کە بۆ خوا دەکرێ، بۆیە هەڵیدەوەشێنێتەوە، بەڵام وەک گوتمان: نە هەموو خراپەیەک، هەموو چاکەیەک هەڵدەوەشێنێتەوەو، نە هەموو چاکەیەکیش هەموو خراپەیەک دەسڕێتەوە، بەڵکو ئەوانەی ڕێک دژو پێچەوانەی یەکدیین، یەکدی لادەبەن ئەوەشم نەبینیوە لە تەفسیرەکاندا، ڕەنگە زانایانیش باسیان کردبێ، بەڵام ئەوەی گوتم، لە کۆی ئایەتەکانی قورئان و دەقەکان سوننەت، دەگونجێ هەڵبهێنجرێ.

## ٢- ئایا دروستە کردەوەی پەسند (مندوب، مسنون، تطوّع) بپچڕێنرێ؟:

(القرطبـي) لـە تەفسـیرەکەی خۆیـدا؛ لێـرەدا شـتێک هەڵدەهێنجـێ، لـەم ئایەتـە موبارەکـە[1] دەڵـێ: (إحتَـجَّ عُلَمَاءُنـا وَغَيْرُهُـم بِهَـذهِ الآيَـةِ، عَـلَى أنَّ التَّحَلُّـلَ مِـنَ التَّطَـوُّعِ صَلاةً كَانـت أَو صَوْمًـا بَعـدَ التَّلَبُّـسِ بِهَـا، لا يَجُـوزُ لأَنَّ فِيـهِ إبطَـالَ العَمَـلِ، وَقَـد نَهَـى اللهُ عَنـهُ) واتـە: زانایانـی ئێمـە، (واتـە: زانایانـی مالیکیـی مەزهـەب)و، جگـە لەوانیـش، ئـەم ئایەتەیـان بـە بەڵگـە هێناوەتـەوە، لەسـەر ئـەوە کـە دوای دەسـتکردن و چوونـە نێـو خـوا پەرسـتیی خۆبەخشـانە، ئنجـا نوێـژ بـێ، یـان ڕۆژوو بـێ، دوایـی ئـەوەی دەسـتی پێکـراوە؛ دروسـت نیـە، بپچڕێـنرێ، چونکـە دەبێتـە هـۆی هەڵوەشـانەوەی کـرداری بـاش و، ئـەوەش قەدەغەکـراوە.

بـەڵام شـافیعیی ڕەحمەتـی خـوای لـێ بـێ؛ جگـە لـە ئەویـش گوتوویانـە: (المُـرَادُ بِذَلِـكَ إبطَـالُ ثَـوَابِ العَمَـلِ المَفْـرُوضِ، فَنُهِـيَ الرَّجُـلُ عَـن إحبَـاطِ ثَوابِـهِ، فَأَمَّـا مَـا كَانَ نَفْـلاً فَـلا، لأَنَّـهُ لَيسَـت وَاجِبًـا عَلَيـهِ) واتـە: مەبەسـت لێـرەدا هەڵوەشـاندنەوەی پاداشـتی کردارێکـی پێویسـتەو، کردەوەیـەک کـە پێویسـت کرابـێ، ئەوەیـە کـە پیـاو قەدەغـە کـراوە لـەوەی پاداشـتەکەی هەڵوەشـێنێتەوە، (هەڵبەتـە ئافرەتیـش، هەروایـە بـەڵام قسـەکە وا هاتـوە)، بـەڵام ئەگـەر کـردەوە کـە زیـادەو پەسـند (نفـل و منـدوب) بـێ، ئـەوە نایگرێتـەوە، چونکـە مـرۆڤ جێبەجێکردنـی کـردەوە پەسـەندەکانی لەسـەر پێویسـت نیـە.

هەڵبەتە هەر کام لە دوو ڕایەکان، هەر یەکە لە لایەکەوە، ڕێی تێدەچێ.

بـەڵام مـن پێـم وایـە ڕایەکـەی مالیـک و زانایەکانـی دیکـە کـە گوتوویانـە: کـرداری پەسـەندو مەندووبیـش، ئەگـەر دەسـتت پێکـرد، نابـێ هەڵیبوەشـێنیەوەو، ئـەوە ڕاسـترە، بـەڵام دەبـێ ئـەو قەیـدەی بخرێتـە سـەر: (بـە مەرجێـک ناچـار نەبـێ)،

---

(١) الجامع لأحكام القرآن: ج١٦، ص٩٩.

هەڵبەتە ئەگەر زۆر ناچار بێ، فەرزیشی بۆ هەیە ببیڕێ، بەڵام مەبەستم لە ناچاریی، یانی: ناچارییەکی وا نەبێ کە پێویست بکات سوننەتی بۆ ببڕێ، ئەگەرنا ناچاریی وا هەیە پێویست دەکات فەرزیشی بۆ کۆتایی پێ بێنێ و هەڵبوەشێنێتەوە، لەبەر ئەوەی شتێکی لە خۆی پێویستتر هاتۆتە پێش، یاخود زیانێکی زۆر گەورە خەریکە بێتە پێش، بۆ وێنە: کەسێک نوێژێکی فەرز دەکات و، مارێکی بۆ دێ لەو کاتەدا، یاخود کەسێک لەوێیە مارێک بۆی دەچێ پێوەی بدات، دیارە مەرجیش نیە نوێژەکەی ببڕێ، بەڵکو ئەگەر بتوانێ مارەکە لە کۆڵ خۆی یان لە کۆڵ ئەو کەسە بکاتەوە، یان منداڵێ بکەوێ بچێتە نێو ئاگرێکەوە، ئەگەر بتوانێ ئەو کارەش بکات و نوێژەکەشی نەبڕێ، ئەوە باشترە، بەڵام ئەگەر بەبێ بڕینی نوێژەکەی بۆی نەکرێ، ئەو کارە ئەنجام بدات، دەبێ بیکات، یان بۆ وێنە: کەسێک بەڕۆژووە، بەڵام کارێکی دیکەی پێویست ڕووی تێدەکات، کە ئەگەر ڕۆژووەکە نەشکێنێ، ئەو کارە پێویستەی بۆ جێبەجێ ناکرێ، ئنجا خێرو پاداشتی ئەو کارە پێویستەش گەورەترە لە هی ڕۆژووەکەی، ئنجا ئەگەر ڕۆژووەکەی سوننەت بێ، یان فەرز بێ، ئەو کاتە بۆی هەیە وبگرە سوننەتە یان فەرزە، ڕۆژووەکەی بشکێنێ، بۆ ئەوەی ئەو کارە پێویستترەی کە بەبێ ئەوە بۆی ئەنجام نادرێ، ئەنجامی بدات، یاخود بۆ ئەوەی ئەو زیانە گەورەیە لە خۆی دووربخاتەوە، بۆ نموونە: دوژمنێک هێرشی بۆ دەکات و بەبێ شکاندنی ڕۆژووەکەی، یان بڕینی نوێژەکەی، بۆی ناکرێ بەرگریی لە خۆی بکات.

## مەسەلەی سێیەم:

**بێبڕوایانی خەڵک لە ڕێی خوا لادەر، مادام بە بێبڕوایی بمرن، هەرگیز خوا لێیان نابوورێ:**

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَصَدُّوا۟ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ثُمَّ مَاتُوا۟ وَهُمْ كُفَّارٌ فَلَن يَغْفِرَ ٱللَّهُ لَهُمْ ﴿٣٤﴾ ﴾.

## شیکردنەوەی ئەم ئایەتە، لە سێ بڕگەدا:

١)- ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَصَدُّوا۟ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ﴾، بە دڵنیایی ئەوانەی بێبڕوابوون و خەڵکیشیان لە ڕێی خوا لاداوە.

٢)- ﴿ ثُمَّ مَاتُوا۟ وَهُمْ كُفَّارٌ ﴾، ئنجا مردوون لە حاڵێکدا کە بێبڕوا بوون، واتە: بە کافرێتیی و بێبڕوایی مردوون.

٣)- ﴿ فَلَن يَغْفِرَ ٱللَّهُ لَهُمْ ﴾، ئەوانە هەرگیز خوا لێیان نابوورێ و چاوپۆشییان لێ ناکات.

ئەم ئایەتە موبارەکە تەواوکەری ئەو مەبەستەیە کە لە ئایەتی ژمارە (٣٢)دا هاتوە، کە لە ئایەتی ژمارە (٣٢)دا، خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَصَدُّوا۟ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَشَآقُّوا۟ ٱلرَّسُولَ مِنۢ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ ٱلْهُدَىٰ لَن يَضُرُّوا۟ ٱللَّهَ شَيْـًٔا وَسَيُحْبِطُ أَعْمَٰلَهُمْ ﴿٣٢﴾ ﴾، واتە: ئەوانەی بێبڕوا بوون و خەڵکیان لە ڕێی خوا لاداوەو، سەرپێچییان کردوەو، بەربەرەکانێی پێغەمبەریان ﷺ کردوە، دوای ئەوەی ڕێی ڕاستیان بۆ ڕۆشن بۆتەوە، هیچ زیانێک لە خوا ﷻ نادەن و، کردەوە باشەکانیشیان پووچەڵ دەکاتەوە، یاخود: هەوڵەکانیان بێ ئاکام و بێ ئەنجام دەکات.

ئەوە بە نسبەت حاڵەتی دنیاییان، بە نسبەت حاڵەتی قیامەتییان، ئەم ئایەتە ڕوونی دەکاتەوە: بە دڵنیایی ئەوانەی بێبڕوا بوون و خەڵکیشیان لە ڕێی خوا لاداوەو بە کافرێتییش مردوون، هەرگیز خوا لێیان نابوورێ.

لـە سـوورەتی (البقـرة)دا هـەر ئـەم بابەتـە هاتـوە بـە تەعبیرێکـی دیکـە، خـوا ﷻ باسـی هـەوڵ و تێکۆشـانی بێبڕوایـەکان دەکات، لـە دژایەتییکردنـی ئیسـلام و مسـوڵمانانداو دەفەرمـوێ: ﴿ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلشَّهْرِ ٱلْحَرَامِ قِتَالٍ فِيهِ ۖ قُلْ قِتَالٌ فِيهِ كَبِيرٌ ۖ وَصَدٌّ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَكُفْرٌۢ بِهِۦ وَٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ وَإِخْرَاجُ أَهْلِهِۦ مِنْهُ أَكْبَرُ عِندَ ٱللَّهِ ۚ وَٱلْفِتْنَةُ أَكْبَرُ مِنَ ٱلْقَتْلِ ۗ وَلَا يَزَالُونَ يُقَـٰتِلُونَكُمْ حَتَّىٰ يَرُدُّوكُمْ عَن دِينِكُمْ إِنِ ٱسْتَطَـٰعُوا۟ ۚ وَمَن يَرْتَدِدْ مِنكُمْ عَن دِينِهِۦ فَيَمُتْ وَهُوَ كَافِرٌ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ حَبِطَتْ أَعْمَـٰلُهُمْ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْـَٔاخِرَةِ ۖ وَأُو۟لَـٰٓئِكَ أَصْحَـٰبُ ٱلنَّارِ ۖ هُمْ فِيهَا خَـٰلِدُونَ ﴿٢١٧﴾ ﴾، واتـە: لـە بـارەی مانگـی حەرامـەوە، جەنـگ تێداکردنـی لێـت دەپرسـن؟ بڵـێ: جەنـگ تێداکردنـی گەورەیـە، (واتـە: گوناهێکـی گەورەیـە)، بـەڵام خەڵـک لادان لـە ڕێـی خـواو بێبـڕوا بـوون و خەڵـک لادان لـە مزگەوتـی حـەڕام و لـێ دەرکردنـی خەڵکەکـەی، لـە لای خـوا گەورەتـرەو، فیتنـەش لـە قەتـڵ گەورەتـرە.

{لـە کوردەوارییـدا دەگوتـرێ: فیتنەیـی کـرد، واتـە: دوو زمانیـی کـرد، وا دەزانـن لێـرەدا مەبەسـت ئەوەیـە، بـەڵام نـا، (الفِتنَـة)، لێـرەدا بـە پێـی ئـەم سـیاقە، واتـە: خەڵـک ئـازاردان و هەڵگێڕانـەوەی بـڕواداران لـە بـڕوا، لـە ژێـر ئەشـکەنجەو ئـازاردا، واتـە: هەڵگێڕانـەوەی خەڵـک و، گێڕانـەوەی لـە ڕێـی خـوا، گەورەتـرە لـە کوشـتن}.

دوایـی دەفەرمـوێ: ﴿وَلَا يَزَالُونَ يُقَـٰتِلُونَكُمْ حَتَّىٰ يَرُدُّوكُمْ عَن دِينِكُمْ إِنِ ٱسْتَطَـٰعُوا۟ ﴾، کافـرەکان بـەردەوام لـە دژتـان دەجەنگـن، تاکـو لـە دینەکەتـان هەڵتانبگێڕنـەوە، ئەگـەر بتوانـن، ﴿وَمَن يَرْتَدِدْ مِنكُمْ عَن دِينِهِۦ فَيَمُتْ وَهُوَ كَافِرٌ ﴾، هـەر کەسـێک لـە ئێـوە لـە ئایینەکـەی هەڵگەڕێتـەوەو، لـە حاڵێکـدا بمـرێ کـە بێبڕوایـە، ﴿فَأُو۟لَـٰٓئِكَ حَبِطَتْ أَعْمَـٰلُهُمْ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْـَٔاخِرَةِ ﴾، ئـا ئەوانـە کردەوەکانیـان لـە دنیـاو دواڕۆژدا هەڵوەشـاونەوە، ﴿وَأُو۟لَـٰٓئِكَ أَصْحَـٰبُ ٱلنَّارِ ۖ هُمْ فِيهَا خَـٰلِدُونَ ﴾، هەروەهـا ئەوانـە هاوەڵانـی ئاگـرن، یـان خاوەنانـی ئاگـرن، کـە تێیـدا هەمیشـەیی دەبـن.

### مەسەلەی چوارەم و کۆتایی:

**ڕێگرییکردن لە بڕواداران، کە بەبێ پاساو داوای ئاشتیی بکەن لەگەڵ دوژمنانیاندا، لە حاڵێکدا خوایان لەگەڵەو، پاداشتی کردەوەکانیان کەم ناکاتەوەو، ژیانی دنیاش گەمەو خافڵانەو، خواش ماڵ و سامانیان هەمووی لێ داوا ناکات، بە جۆرێک هیچیان بۆ نەهێڵێ و وایان لێ بکات، ڕقیان لە بەخشین بێ و، بێگومانیش بابای چرووک، زیان لە خۆی دەدات، خواش بێ نیازەو، ئەگەر مسوڵمانانیش پشت لە ئیسلام بکەن، خوا بە کۆمەڵێکی دیکەیان دەگۆڕێ و وەک وانیش نابن:**

﴿ فَلَا تَهِنُوا۟ وَتَدْعُوٓا۟ إِلَى ٱلسَّلْمِ وَأَنتُمُ ٱلْأَعْلَوْنَ وَٱللَّهُ مَعَكُمْ وَلَن يَتِرَكُمْ أَعْمَٰلَكُمْ ﴿٣٥﴾ إِنَّمَا ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا لَعِبٌ وَلَهْوٌ ۚ وَإِن تُؤْمِنُوا۟ وَتَتَّقُوا۟ يُؤْتِكُمْ أُجُورَكُمْ وَلَا يَسْـَٔلْكُمْ أَمْوَٰلَكُمْ ﴿٣٦﴾ إِن يَسْـَٔلْكُمُوهَا فَيُحْفِكُمْ تَبْخَلُوا۟ وَيُخْرِجْ أَضْغَٰنَكُمْ ﴿٣٧﴾ هَٰٓأَنتُمْ هَٰٓؤُلَآءِ تُدْعَوْنَ لِتُنفِقُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ فَمِنكُم مَّن يَبْخَلُ ۖ وَمَن يَبْخَلْ فَإِنَّمَا يَبْخَلُ عَن نَّفْسِهِۦ ۚ وَٱللَّهُ ٱلْغَنِىُّ وَأَنتُمُ ٱلْفُقَرَآءُ ۚ وَإِن تَتَوَلَّوْا۟ يَسْتَبْدِلْ قَوْمًا غَيْرَكُمْ ثُمَّ لَا يَكُونُوٓا۟ أَمْثَٰلَكُم ﴿٣٨﴾ ﴾.

### شیکردنەوەی ئەم ئایەتانە، لە حەقدە بڕگەدا:

١)- ﴿ فَلَا تَهِنُوا۟ وَتَدْعُوٓا۟ إِلَى ٱلسَّلْمِ ﴾، ئنجا بێهێز مەبن و تەنبەڵیی مەکەن و داوای ئاشتیی بکەن!

(**الوَهنُ: الضُّعفُ والعَجْزُ، وهُوَ هُنَا مَجازٌ عَن طَلَبِ الدَّعَةِ**)، (**وهن**): لە ئەسڵدا بە مانای بێهێزیی و نەتوانین دێ، لێرەدا بە مەجاز مەبەست پێی ئیسراحەتخوازیی و پاڵدانەوەو خۆماندوو نەکردنە، واتە: ئێوە بێهێز مەبن و ئیسراحەتخواز مەبن، کە بە هۆی ئەوەوە بانگی بەرانبەرەکانتان بکەن بۆ ئاشتیی و تەبایی، لە حاڵێکدا کە ئەوان سەنگەریان لێگرتوون، کە دەفەرموێ: ﴿ فَلَا تَهِنُوا۟ وَتَدْعُوٓا۟ ﴾،

(**تدعوا**)، پەیوەستە بە پیتی قەدەغە (**نهي**)وە، یانی: (**وَلاَ تَدْعُوا إِلى السَّلْمِ**) بانگەواز مەکەن بۆ ئاشتیی.

٢)- ﴿وَأَنتُمُ ٱلْأَعْلَوْنَ﴾، لە حاڵێکدا کە ئێوە بەرزترن، واتە:

أ- ئێوە بەرزترن بە بەڵگە، یان بە هۆی ئیمانەوە، یاخود سەرەنجامی چاک لە گرەوی ئێوە دایە، وەک خوا فەرموویەتی: ﴿وَٱلْعَٰقِبَةُ لِلْمُتَّقِينَ﴾**القصص: ٨٣**، ﴿وَٱلْعَٰقِبَةُ لِلتَّقْوَىٰ﴾**طه: ١٣٢**.

ب- لە حاڵێکدا کە ئێوە باڵا دەست و دەستڕۆیشتوون و توانای جەنگ کردنتان هەیە، داوای ئاشتیی و تەبایی لە بەرانبەرەکانتان مەکەن، کە شەڕتان پێ دەفرۆشن و سەنگەریان لێگرتوون.

یەکێک لە زانایان دەڵێ: مەبەست لێرەدا ئەوەیە کە مسوڵمانان خۆیان بە دەستەوە نەدەن، بە هۆی خولیای بێهێزییەوە، ئەویش بە هۆی ئەوەوە کە زیانەکانی ئەو خەیاڵ و خولیایانە بێننە بەرچاوی خۆیان، چونکە خەیاڵ و خولیا خراپەکان، ئەگەر ئینسان لە کۆڵ خۆییان نەکاتەوەو لە خۆییان دوورنەخاتەوە، وردە وردە لە دڵیدا جێگیر دەبن، تاکو دەبن بە سیفەتێکی ڕۆچوو تێیدا.

٣)- ﴿وَٱللَّهُ مَعَكُمْ﴾، بە دڵنیایی خواش لەگەڵ ئێوەدایە، واتە: خوا ﷻ لەگەڵتاندایە بە سەرخستن، بە مشوور لێخواردن و، بە سەرپەرشتییکردن، ئەگەرنا خوا ﷻ لەگەڵ هەموو دروستکراوەکانیدایە، بەڵام لێرەدا مەبەست لەگەڵدابوونێکی تایبەتە (**مَعِيَّةٌ خَاصَّة**).

٤)- ﴿وَلَن يَتِرَكُمْ أَعْمَٰلَكُمْ﴾، هەرگیزیش (خوا) کردەوەکانتان لێ کەم ناکاتەوە، واتە: پاداشتی کردەوەکانتان لێ کەم ناکاتەوە، (**وَتَرَهُ، يَتِرَهُ، وَتْرًا: نَقَّصَهُ حَقَّهُ**)، واتە: مافەکەی لێ کەم کردەوە، وشەی (**وتِرَ**) لە فەرمایشتی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە: {**الَّذِي تَفُوتُهُ صَلَاةُ الْعَصْرِ، كَأَنَّمَا وُتِرَ أَهْلَهُ وَمَالَهُ**} (**أخرجه البخاري: ٣٦٠٢، ومسلم: ٢١٨٦**)، واتە: ئەو کەسەی نوێژی عەسری دەفەوتێ، وەک ئەوە وایە کەس وکارو ماڵ و سامانەکەی فەوتاندبێ.

ئنجا خـوا ﷻ دوایـی بـۆ ئـەوەی زیاتـر هانیان بـدات لەسـەر خەبـات و فیداکاریی و بەرخـۆدان، دەفەرموێ:

٥)- ﴿إِنَّمَا ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا لَعِبٌ وَلَهْوٌ﴾، بە دڵنیایی ژیانی دنیا، تەنیا گەمەو خافڵانە، ﴿لَعِبٌ﴾، بە مانای یاریی دێ:

١- هەندێ لە زانایان گوتوویانە: جیاوازیی نێوان ﴿لَعِبٌ وَلَهْوٌ﴾، ئەوەیە کە: ﴿لَعِبٌ﴾، یارییەکە بە جەستە دەکرێ، بەڵام: (لَهو)، واتە: خافڵان و، بە دڵ دەکرێ.

٢- هەندێکیش گوتوویانە: (**اللَّعِبُ بِآلَةٍ، واللَّهوُ بِدونِها**)، (**لَعِب**): ئەوەیە بە ئامێرێک بکرێ، بەڵام (**لهو**): ئەوەیە کە بەبێ ئامێریش بکرێ.

٣- هەندێکیش گوتوویانە: بە پێچەوانەوە: (**لَعِب**) ئەوەیە بە بێ ئامێر بێ، بەڵام (**لَهُو**) ئەوەیە بە ئامێر بێ.

٤- هەندێکیش گوتوویانە: (**لَعِب**): ئەوەیە بێ ئاگات نەکات لە شتێکی گرنگتر، بەڵام (**لَهُو**) ئەوەیە بێ ئاگات بکات و، بتخافڵێنێ لە شتێک کە لە خۆی گرنگترە.

﴿إِنَّمَا ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا لَعِبٌ وَلَهْوٌ﴾، واتـە: ژیانێـک کـە گەمـەو خافـڵان بـێ، حەیفـە باوەشـی پێـدا بکـەن و، بـە هـۆی بـاوەش پێداکردنـی ئـەو ژیانـە دنیاییـەوە، ئێـوە ڕووحـی فیداکاریـی و بەرخـۆدان لـە خۆتاندا بمرێنـن، داوای سـەلامەتیی و بێمزەڕەتیی بکـەن، لـە حاڵێکـدا ئیسـلام پێویسـتیی بـە فیداکاریـی و، خوێـن بەخشـین و مـاڵ و سـامان بەخشـین هەبـێ.

٦)- ﴿وَإِن تُؤْمِنُوا۟ وَتَتَّقُوا۟ يُؤْتِكُمْ أُجُورَكُمْ﴾، ئەگەر بڕواش بێنن و پارێز بکەن، پاداشتەکانی خۆتانتان دەداتێ، واتە: پاداشتی خۆتانتان بە پڕ بە پێست و بە تەواویی دەداتێ.

٧)- ﴿وَلَا يَسْـَٔلْكُمْ أَمْوَٰلَكُمْ﴾، هەموو ماڵ و سامانەکانیشتان لێ داوا ناکات، ئەمە لێرەدا واتە: (خوا) هەموو ماڵ و سامانەکانتان لێ داوا ناکات بیبەخشن، بەڵکو هەندێکیتان لێ داوا دەکات.

هەندێکیش لە زانایان ئاوایان لێکداوەتەوە: ﴿وَلَا يَسْـَٔلْكُمْ أَمْوَٰلَكُمْ﴾، واتە: ئەوەی کە لێتان داوا دەکات، ماڵ و سامانی ئێوە نیە، بەڵکو هی خۆیەتی پێیداون، بێگومان ئەم مانایەش دەگرێتەوە، بەڵام ئەم مانایە زیاتر مانایەکی مەعنەویی و ڕووحانییە، بەڵام مانا ڕواڵەتیی و ئاساییەکەی ئەوەیە کە باسمان کرد، واتە: هەموو ماڵ و سامانەکانتان لێ داوا ناکات.

٨)- ﴿إِن يَسْـَٔلْكُمُوهَا فَيُحْفِكُمْ تَبْخَلُوا۟﴾، ئەگەر هەموو ماڵ و سامانەکەتان بە مکووڕیی لێ داوا بکات، چرووکیی دەکەن، (**أَحْفَاهُ فِي المَسأَلَةِ: لَمْ يَتْرُكْ شَيْئاً مِنَ الإِلْحَاحِ**)، واتە: زۆر سوور و مکووڕ بوو، هیچ جۆرە جەختکردنەوەیەکی بەجێ نەهێشت نەیخاتە نێو داواکارییەکەیەوە.

کەواتە: ﴿إِن يَسْـَٔلْكُمُوهَا﴾، ئەگەر ماڵ و سامانەکانتان هەموو لێ داوا بکات، ﴿فَيُحْفِكُمْ﴾، واتە: زۆر سوور بێ لەسەر داواکردن، یاخود: ﴿فَيُحْفِكُمْ﴾، واتە: هیچیان بۆ نەهێڵێتەوەو، هەموویتان لێ داوا بکات، ﴿تَبْخَلُوا۟﴾، ئەو کاتە ئێوە چرووکیی دەکەن و چنگ قووچاو دەبن.

٩)- ﴿وَيُخْرِجْ أَضْغَـٰنَكُمْ﴾، سەربارەش ڕق و کینەشتان دەردێنێ، واتە: ڕق و کینەتان تێدا پەیدا دەکات بەرانبەر بەو داواکارییە، خوێندراویشەتەوە: (**وَنُخْرِجِ أَضْغَانَكُم**) ئەو کاتە کینەکانتان دەردێنین و لە دڵتاندا ئاشکرا دەبن، ﴿أَضْغَـٰنَكُمْ﴾، کۆی (**ضِغْن**)، یان (**ضَغن**)ە، کە بە مانای کینەو، دژایەتیی و، ڕق لێهەڵسانێکی پەنهان دێ، (**أَي: إِذَا سَأَلَكُم إِنْفَاقَ أَموالِكُم كُلِّهَا، تَمْنَعُوا المالَ و تُظهِرَوا والعِصيَانَ**) ئەگەر بێت و هەرچی ماڵ و سامانتانە لێتان داوا بکات و بیبەخشن، لەو حاڵەتەدا، ماڵ و سامانەکانتان نابەخشن و سەرپێچیی لە خۆتاندا دەردەخەن.

١٠)- ﴿هَـٰٓأَنتُمْ هَـٰٓؤُلَآءِ تُدْعَوْنَ لِتُنفِقُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾، ئەها! ئەوە ئێوەن بانگ دەکرێن، بۆ ئەوەی لە ڕێی خوادا ببەخشن، واتە: ماڵ و سامان لە ڕێی خوادا ببەخشن، تاکو بتوانن جەنگ و جیهاد بکەن لە پێناوی خواداو، بەرگریی بکەن لە دین و ژینی خۆتان، لە وڵات و میللەتی خۆتان.

١١)- ﴿فَمِنكُم مَّن يَبْخَلُ﴾، کەچی هەتانە چرووکیی دەنوێنێ، دەست دەنووقێنێ.

١٢)- ﴿وَمَن يَبْخَلْ﴾. هەر کەسێکیش ڕژدیی و چرووکیی بکات.

١٣)- ﴿فَإِنَّمَا يَبْخَلُ عَن نَّفْسِهِ﴾، بە دڵنیایی بە زیانی خۆی چرووکیی دەکات، (**البُخْلُ: إِمْسَاكُ مَا يَنْبَغِي إِنْفَاقُهُ**)، (**بخل**) گرتن و نەبەخشینی ئەو ماڵەیە کە پێویستە ببەخشرێ، (**عُدِّيَ يَبْخَلُ بِـ «عن» لِتَضْمِينِهِ مَعْنَى الإِمْسَاكِ، أي: يُمْسِكُ الخَيْرَ وَالفَضْلَ عَنْ نَفْسِهِ، بِسَبَبِ البُخْلِ فَيَمنَعُها الأجرَ و الثَّوَابَ بِبُخلِهِ**)، بۆیە وشەی (**يَبْخَلُ**) بە (**عَنْ**) بەرکاری خواستوە، تاکو مانای دەست پێوەگرتنی بخرێتە ئێو، واتە: هەر کەسێک چرووکیی بکات و دەست بەو ماڵەوە بگرێ و نەیبەخشێ، خێرو چاکە لە خۆی دەگرێتەوە بە هۆی چرووکییەکەیەوەو، سەرەنجام خۆی بێبەش دەکات لە پاداشتی خوا، بە هۆی چرووکییەکەیەوە.

وشەی (**يَبخَل**) جاری واش هەیە بە (**على**) بەرکار دەخوازێ، (**بَخَلَ عَلَيْهِ، يَبْخَلُ عَلَيْهِ**)، واتە: چرووکیی نواند لە بەرانبەری داو پێی نەبەخشی.

١٤)- ﴿وَاللَّهُ الْغَنِيُّ﴾، بە دڵنیایی خوا ﷻ دەوڵەمەندو بێ نیازە، (أل)ی سەر: ﴿الْغَنِيُّ﴾، بۆ جینسە، واتە: تەواویی بێ نیازیی هی خوای موتەعالە.

١٥)- ﴿وَأَنتُمُ الْفُقَرَاءُ﴾، ئێوەش هەرچی هەژارو ئاتاجیی هەیە لە ئێوە دایە.

دیسان (أل)ی سەر (**الفقرآء**) بۆ جینسە، واتە: تێکڕای هەژاریی و ئاتاجیی لە ئێوە دایە.

١٦)- ﴿وَإِن تَتَوَلَّوْا يَسْتَبْدِلْ قَوْمًا غَيْرَكُمْ﴾، ئەگەر ئێوەش پشت هەڵبکەن، خوا ئێوە بە کۆمەڵێکی دیکە دەگۆڕێ، یانی: ئێوە لادەبات و خەڵکێکی دیکە دێنێتە شوێنی ئێوە، (**التَّوَلِّي: الرُّجُوعُ والإِعْرَاض**)، ﴿تَتَوَلَّوْا﴾ یانی: ئەگەر پشت هەڵبکەن و بگەڕێنەوە، ﴿يَسْتَبْدِلْ قَوْمًا غَيْرَكُمْ﴾ کۆمەڵێکی دیکەی جیا لە ئێوە دێنێتە شوێنی ئێوە.

١٧)- ﴿ثُمَّ لَا يَكُونُوا أَمْثَالَكُم﴾، دواییش ئەوان وەک ئێوە نابن، ئەوانەی دەیانهێنێ، وەک ئێوە نابن، ئاوا سەرپێچیی بکەن، یاخود: چرووکیی و ڕژدیی بنوێنن، لە بەخشینی ماڵ و سامانیاندا.

# پێنج وردە سەرنج

لێرەدا پێویستە پێنج وردە تێبینی بخەینە ڕوو، بەر لەوەی کۆتایی بە تەفسیری سوورەتی (محمد) بێنین:

١)- کە دەفەرموێ: ﴿فَلَا تَهِنُوا﴾، (ف)ەکە، پەیوەندیی بە ڕابردووەوە هەیە، واتە: مادام خوا ﷻ پیلان و فێڵی کافرەکان هەڵبوەشێنێتەوەو، کردەوەکانیان پووچەڵ بکاتەوەو، لەگەڵ بڕواداراندا بێ، پشتیان بگرێ، سەرپەرشتییان بکات، کەواتە: ئەی بڕوادارینە! بێهێز مەبن، چونکە هۆکارەکانی هێزو پێز، هەموویان بۆ ئێوە ڕەخسێنراون و، هۆکارەکانی بێهێزیی و بێپێزیی لە بەرانبەرەکانتاندا هەن، کەواتە خۆ پێ بێهێز بوونی ئێوە، شتێکی نالۆژیکییە.

٢)- کە دەفەرموێ: ﴿وَتَدْعُوا إِلَى السَّلْمِ وَأَنْتُمُ الْأَعْلَوْنَ﴾، یانی: بێهێز مەبن، کە بانگەشە بکەن بۆ ئاشتیی لە حاڵێکدا کە ئێوە بەرزترن، دەگونجێ (بەرزتر) مەبەست پێی ئەوە بێ: مادام ئێوە ئیماندارن و، لەسەر ڕێیەکی هەقن، بە بەڵگەو ئیسپاتەوە، ئێوە بەرزترن.

واتایەکی دیکە: مادام ئێوە دەستڕۆیشتوو و باڵادەستن و بەهێزترن، داوای ئاشتیی مەکەن، زانایانیش لە بارەی حوکمی ئەو ئایەتەوە، ڕا جیاییان هەیە، (القرطبي)[1] سێ ڕای هێناون لەو بارەوە:

١- ڕایەك ئەوەیە: ئەم ئایەتە نەسخ کەرەوەیە بۆ قسەی خوای بەرز، کە دەفەرموێ: ﴿وَإِن جَنَحُوا لِلسَّلْمِ فَاجْنَحْ لَهَا وَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ ۚ إِنَّهُ هُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ ﴿٦١﴾﴾ **الأنفال**، واتە: ئەگەر دوژمنە بەرانبەرەکانت، باڵیان شۆڕکرد بۆ ئاشتیی، تۆش باڵی بۆ شۆڕ بکە، لێرەدا خوا ﷻ ڕێی گرتوە لە مەیلکردن بە لای ئاشتیی و صوڵح و پێکهاتندا، کەواتە: ئەم ئایەتە، ئایەتی ژمارە: (٦١)ی سوورەتی (**الأنفال**)ی نەسخ کردۆتەوە.

---

(١) الجامع لأحكام القرآن: ج١٦، ص٢٠٠.

**٢**- هەندێکیش گوتوویانە: بە پێچەوانەوە، ئەم ئایەتە کە دەفەرموێ: داوای ئاشتیی مەکەن، بە ئایەتی ژمارە (٦١)ی سوورەتی **(الأنفال)** نەسخ بۆتەوە، چونکە لەوێ دەفەرموێ: ئەگەر بەرانبەرەکانت مەیلی ئاشتییان کرد، تۆش مەیلی بۆ بکە، بەڵام لێرەدا دەفەرموێ: بانگەشەی ئاشتیی مەکەن، لە حاڵەتێک ئێوە بەرزترن.

**٣**- هەندێکی دیکەش گوتوویانە: ﴿وَإِن جَنَحُواْ لِلسَّلْمِ فَٱجْنَحْ لَهَا﴾، ئەمە تایبەتە بە کۆمەڵێکەوە کە دیارییکراو بوون، مادام ئەوان داوای ئاشتییان کرد، تۆش لەگەڵ واندا ئاشتییخوازبە، بەڵام ئەمەیان کە دەفەرموێ: ﴿فَلَا تَهِنُواْ وَتَدْعُوٓاْ إِلَى ٱلسَّلْمِ وَأَنتُمُ ٱلْأَعْلَوْنَ﴾، ئەمەیان گشتییە، بۆیە دروست نیە، مەگەر بە ناچاریی، ئاشتەوایی لەگەڵ ئەهلی کوفردا بکرێ، لە کاتێکدا ئەوان شەڕ فرۆشن، ئەویش لە حاڵێکدا - دروستە -- کە مسوڵمانان نەتوانن بەرهەڵستییان بکەن، منیش ئەم ڕایەی سێیەمم پێ ڕاستە.

**٣)**- لە بارەی مەنسووخ نەبوونی ئایەتی (٣٢)ی (محمد)ەوە، **(الشوكاني)** قسەیەکی جوان دەکات، لە تەفسیرەکەی دا بە ناوی: **(فتح القدير)**[1]، دەڵێ: **(وَلَا يَخْفَاكَ أَنَّهُ لَا مُقْتَضِي لِلْقَوْلِ بِالنَّسْخِ، فَإِنَّ اللَّهَ سُبْحَانَهُ نَهَى الْمُسْلِمِينَ فِي هَذِهِ الْآيَةِ عَنْ أَنْ يَدْعُوا إِلَى السَّلْمِ ابْتِدَاءً، وَلَمْ يَنْهَ عَنْ قَبُولِ السَّلْمِ إِذَا جَنَحَ إِلَيْهِ الْمُشْرِكُونَ، فَالْآيَتَانِ محكمتان، ولم يتواردا عَلَى مَحَلٍّ وَاحِدٍ حَتَّى يُحْتَاجَ إِلَى دَعْوَى النَّسْخِ، أَوِ التَّخْصِيصِ)**، واتە: لێت شاردراوە نیە، کە هیچ قسەیەک خوازیاری ئەوە نیە، بڵێین نەسخێک لە ئارادایە، چونکە خوای بەرز لەم ئایەتەدا لە مسوڵمانانی قەدەغە کردوە، کە لە سەرەتاوە دەستپێشخەر بن بۆ ئاشتیی، بەڵام ڕێی لێ نەگرتوون، ئەگەر بەرانبەرە هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان، داوای ئاشتییان کرد، ئەوانیش مەیلی ئاشتیی بکەن، کەواتە: هەردوو ئایەتەکان لە جێی خۆیاندان، [(واتە: هەم ئایەتی ژمارە: (٦١)ی سوورەتی **(الأنفال)**و، هەم ئایەتی ژمارە: (٣٢)ی سوورەتی **(محمد)**)]، چونکە هەردووکیان لە بارەی یەک بابەتەوە نەهاتوون، تاکو ناچاری بانگەشەی نەسخ بین، یاخود تەنانەت تایبەتکردن **(تخصيص)** بین.

---

(١) ج٥، ص٥٠.

بێگومـان منیـش دەڵێـم: صوڵحـی حودەیبییـەو غەیـری صوڵحـی حودەیبییـە، بەهێزتریـن بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوە کـە لـە کاتـی گونجـاوو پێویسـتدا، هـەر کات مسـوڵمانان بـە چاکیـان زانـی، ئاشـتەوایی بکـەن.

٤)- لە بارەی ئەم ئایەتە موبارەکەی کۆتاییەوە، کە دەفەرموێ: ﴿إِن يَسْـَٔلْكُمُوهَا﴾، (أي: يَسئَلكُم أموَالَكُم كُلَّها)، ئەگەر داواتان لێ بکات، هەموو ماڵەکەتان ببەخشن، ﴿فَيُحْفِكُمْ﴾، (أي: يُجهِدْكُم و يُلْحِف عَلَيْكُم بِمَسْأَلَةِ جَمِيعِهَا)، واتە: ئەرکتان بخاتە سەرو نارەحەتتان بکات، بەوەی داوای هەموویتان لێ بکات، (الشوكاني) لە (فتح القدير)دا[1]، دەڵێ: (يُقالُ: أَحفى بِالمَسأَلَةِ و أَلحَفَ أي: أَلَحَّ بِمعنى وَاحد)، واتە: (أَلحَفَ) و (أَحْفَى) و (أَلَحَّ) هەر سێکیان یەک واتایان هەیە، (المُحْفِي: المُسْتَقْصِي فِي السُّؤالِ، والإِحْفَاءِ: الإستِقصَاءُ فِي الكَلامِ، وَمِنه: إِحْفَاءُ الشَّارِبِ، أي: إستِئصَالُهُ، وجَوَابُ الشَّرطِ: قَولُهُ لا تَبخَلُوا، أي: إنْ يَأْمُرْكُم بِإِخْرَاجِ جَميعِ أموالِكُم، تَبخَلوا بِهَا و تَمتَنِعوا عَن الإمتِثالِ).

واتـە: (مُحفِـي) کەسـێکە لـە داواکردنـدا زۆر ڕۆبچـێ، (إِحْفَـاء): بریتیـە لـەوەی مـرۆڤ بیگەیەنێتـە ئەوپـەڕی لـە قسـەکردندا، (إِحْفَـاءُ الشَّـارِبِ)، ئەوەیـە ئینسـان سـمێڵی زۆر تەنـک و کـورت بکاتـەوە، یاخـود لـە ڕیشـەوە هەڵیکێشـێ، بـەڵام وەڵامی مەرجەکـە کـە دەفەرمـوێ: ﴿إِن يَسْـَٔلْكُمُوهَا فَيُحْفِكُمْ﴾، بریتیـە لـە: ﴿تَبْخَلُوا﴾، واتـە: لـەو حاڵەتـەدا ئێـوە چرووکیـی دەنوێنـن و ئامـادە نابـن فەرمانبەریـی بکـەن، بۆیـە خـوای پـەروەردگار ئەوەتـان لـێ داوا نـاکات.

٥)- لە بارەی ئەوەوە کە دەفەرموێ: ﴿وَإِن تَتَوَلَّوْا يَسْتَبْدِلْ قَوْمًا غَيْرَكُمْ ثُمَّ لَا يَكُونُوٓا أَمْثَٰلَكُم﴾، زۆربەی تەفسیرەکان ئەم دەقەیان هێناوە، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {لَو كَانَ الإيمَانُ مَنُوطاً بِالثُّرَيَّا لَنَالَهُ رِجَالٌ مِن فَارِس} (أخرجه البخاري: ٤٨٩٨، ومسلم: ٢٥٤٦، والترمذي: ٣٢٦٠) واتە: ئەگەر ئیمان هەڵواسرابایە بە سورەییاوە، (واتە: ئەستێرەی کۆ، کۆو تەرازوو)، پیاوانێک لە گەلی فارس دەیانتوانی بەدەستی بێنن.

---

(١) ج٥، ص٥٠.

هەڵبەتـە وشـەی گـەلی فـارس، ئـەوان بەکاریـان هێنـاوە بـۆ هەمـوو ئـەو گەلانـەی لـە ئێـران و، لـە دوای ئێرانـەوە بـوون، واتـە: هـەم فـارس، هـەم کورد، هـەم ئەفغـان و...، ئـەو گەلانەیـان زۆربـە پـێ گرتوونـەوە، بـەو وشـەیە.

لێرەش دا کۆتایی بە تەفسیری سوورەتی (محمد) ﷺ دێنین.

لـە خـوای پـەروەردگارش داواکارم، هەرچـی زیاتـر عەقڵ و دڵـمان ڕۆشـن بکاتـەوە، بـە ڕووناکیـی و بەرەکـەتی خـۆی، کـە لـە ئیمانـدا بەرجەسـتەیەو، یارمەتییـمان بـدات هەرچـی زیاتـر ئاشـنا بیـن بـە ڕێبـازو سـوننەتی پێغەمبـەر ﷺ کـە ئەویـش هـەر بریتیـە لـە بەرجەسـتە کـردن و جێبەجـێ کـردنی قورئـان، لـە ژیـانی تاکیـی و خێزانیـی کۆمەڵایەتیـی خۆیـدا.

سُبْحَانَكَ اللّٰهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# ناوەڕۆک



## تەفسیری سوورەتی (الدخان)

## تەفسیری سوورەتی (الجـاثیـة)

## تەفسیری سووڕەتی (الأحقاف)

## تەفسیری سووڕەتی (محمــــد)